# بەرگریکردن لە گەلێك

راکردن لەراستینەی کۆمەڵگا زۆر لەوە زەحمەتترە کە مەزەندە دەکرێت. بەتایبەتیش بۆ ئەو کۆمەڵگایەی رەچەڵەك کە تاکێك بیت تێیدا. پێشینیان گوتوویانە: خوویەك گرتت، بەشیری تەرکی ناکەی تا پیری، واتە ئەو قۆناغەی پێشبڕکێی کۆمەڵایەتی کە لە نزیك تەمەنی حەوت ساڵان لە میانەی دایك دەستپێدەکات تاوەکو حەفتا ساڵی بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت. لە بواری زانستییەوە دەستنیشانکراوە کە دایك هێزی سەرەکی و بنەڕەتی بەکۆمەڵگابوونە. یەکەم تاوانم دەرهەق بە کەسێتی خۆم، بە گومان تەماشاکردنی ئەم مافەی دایك و پێشوەخت بڕیاردانی خۆم بوو سەبارەت بە کۆمەڵایەتیبوونم. بە بوێری هەنگاونانم بۆ ژیانێکی تەنیایی بێ دایك و باوکی ئەو کۆمەڵگایەی مرۆڤایەتی کە بە گوێرەی دەستنیشانکردنە زانستییەکان ئافراندنێکی تایبەتی زیاتر لە بیست ملیار ساڵ پێش ئێستایە، تەنیا ئەمە سەربەخۆ بابەتێکە پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە. ئەگەر ئاگادارکردنەوە بەردەوامەکانی دایکم و هەوڵەکانی خنکاندنم بەهەند وەرگرتبوایە، لەوانەیە ڕێگای ئەو تراژیدیایانە نەدەکرایەوە کە دووچاریان هاتم. بەڵام دایکم ڕەمزی پاشماوەی هەرە بێچارەی کۆتاییەکانی کەلتووری هەزاران ساڵەی ژنە خوداوەند بوو کە لە لێواری لەناوچوون دایە. سەرباری ڕەوشی منداڵیم، بە ئەندازەیەك لەم ڕەمزە نەترسام و پێویستیم بە خۆشەویستییەکەشی نەبینی و دوودڵ نەبووم لەوەی هەست بە ئازادی خۆم بکەم. بەڵام تەنانەت بۆ ساتێکیش ئەوەم لەیاد نەچوو کەتاکە مەرجی ژیانم شەرەف و کەرامەتەکەیەتی، واتە بە پاراستنی ئەم شەرەف و کەرامەتە تێپەڕ دەبێ. ناموس و کەرامەتەکەییم دەپاراست، بەڵام بەو شێوەیەی کە خۆم بە ڕاستم دەزانی، لەدوای ئەم وانەیە ئیتر دایك بۆ من بوونی نەبوو. لە کاتێکدا ئەم پاشماوەیەی خوداوەندی ژن لەبیرم دەسڕایەوە، هیچ کاتێك بەپێویستم نەبینی لێپرسینەوە بکەم ئاخۆ لەبارەی منەوە هەست بەچی دەکات. ئەمەش جیابوونەوەیەکی زاڵمانەیە،ئەمە ڕاستییەك بوو. نازانم بڵێم کەهانەتەکانی یاخود نزا خراپەکانی،لەساتەوەختەکانی تراژیدیا فوورسەکان دەهاتەوە یادم. ئەم پێشبینیانە هێندە ڕاست بوون تەنانەت لێهاتووترین زاناکانیش نەیاندەتوانی دەستنیشانی بکەن. یەکێك لەڕاستییە گەورەکانی ئەو دەستنیشانکردنەی بوو کەدەیگووت " زۆر باوەڕی بە برادەرەکانت دێنی، بەڵام هەر بە تەنیا دەمێنیتەوە ". بەڵام ڕاستی منیش ئەوەبوو کە خۆم پەیوەندی کۆمەڵایەتیبوونم لەگەڵ برادەرو هاوڕێکانم دەبەست.

هەڵبەستنی چیرۆکی ژیانم بەمجۆرە دەستپێدەکات. گەر دایکم بشیخواستبایە کۆمەڵگایەکی نەبووپێشکەشی منی بکات، لەمێژبوو پەرتەوازە کرابوو. ئەوەی ئەو دەیخواست جێدەست (قولپ)یکی ژیان بوو. خۆی نەیدەتوانی بەدەستیبێنێ، دەیخواست بەمنی بدات.چیرۆکی باوك هەرچەندە جیاوازی هەبێ، بەڵام هاوشێوەی ئەوبوو.ڕاستینەی ئەم خێزانەی تێیدا چاوم بە دونیا هەڵهێنا، بەمشێوەیە هەڵمدەسەنگاند کەبێ بانگەشەترین میراس و پاشماوەی کولتووری تیرە بەرابیەکانی باب و باپیرانە کە زۆر بەلاوازی و پەرتەوازەیی ماونەتەوەو دەخوازێ خۆی بسەپێنێ. بەهیچ شێوەیەك بەگەرمی پێشوازیم لە کۆمەڵگای فەرمی و دەوڵەت نەدەکرد کە لەگەڵ چوونم بۆ قوتابخانەی سەرەتایی ئاشناییم لەگەڵ پەیدا کرد، بە گەرمی لێیان نزیك نەبوومەوە. هیچ شتێکیشی لێتێنەگەیشتم. لە ڕواڵەتدا تا دوا قۆناغی قوتابخانەی زانستە سیاسییەکانی کۆنترین زانکۆی تورکیا هەر بە نمرەی زۆر باشە بەرزبوومەوە. ئەو قوتابخانە و ژیانە شۆڕشگێڕییەی دواتر هەڵمبژارد ئامۆژگارییەکانی چەرخی دەستاڕێکی بێڕەحم بوو. گەر هەر لە سەرەتاوە ئارەزوو و بژاری شاخم بەبناخە وەرگرتبایە دەشیا بتوانم تراژیدیاکان بپچڕێنم. بەڵام ئەندێشەی ڕزگارکردن و پێگەیاندن و خولقاندنی هەڤاڵان دەرفەتی بەم حەزەم نەدا. کاتێك خۆم هەڵدایە هەردوو دەرگای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای شارستانییەتەکەمان، لەناو زەمینەی لێکدانەوە سەهۆڵ ئاساکانی

(بەستەڵەکەکانی) سەرمایە ـ قازانج خۆم بەرووتوقووتی دەدۆزییەوە. لەم خاڵەدا ئیتر هیچ هێزێك منی بەرێوەنەدەبرد. تەنانەت هیچ شتێکم نەبوو لێم برفێنن. هەبوونیشی سەرنجمی رانەدەکێشا. لەم قۆناغەدا هەندێ لە هەڤاڵانم لەناو کڵپەی ئاگر خۆیان سووتاند. چەندین کورو کچی مەرد و ئازا ئامادەبوون هەموو شتێکیان بکەنە قوربانی. هەرگیز ناتوانرێ نکوڵییان لێبکرێت. بەرخودانی زۆر گەورە و شکۆداریان ئەنجامدا. گرێدانێکی بێ هاوتایان نیشاندا. بەڵام تەواوی ئەم هەوڵانەش لە دژوارترکردنی تەنیاییەکەم بەولاوە هیچ ئەنجامێکی دیکەی لەگەڵ خۆی نەدەهێنا.

کاتێك ئەربابەکانی هەموو کیشوەرەکان بە یەك دەنگ چارەسەریان لەوەدا بینی لە رێگای پیلانگێرییەکدا رادەستم بکەنەوەو لە دوورگەی ئیمرالی بگیرسێمەوە، ئەوەم بە بیردا هاتەوە کە جارێکی دیکە چیرۆکێکی ئەفسانەیی دووبارەو نوێ دەکرێتەوە، کاتێ خوداوەندی یۆنان زیۆس پرۆمیتۆسی نیوخوداوەند لەتاشەبەردەکانی چیای قەفقاسیا دەبەستێتەوە و رۆژانە پارچە پارچە جگەری دەرخواردی هەڵۆ دەدات. بەڵێ ئەو پرۆمیتۆسەی کە لەپێناو مرۆڤایەتی ئاگر, ئازادی لە خوداوەندەکان رفاند! وەکو بڵێی ئەفسانەکە لە شەخسی مندا بەراستی پراکتیزە دەکرا.

لەوانەیە لە دەستەی گشتی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا پرسێکی وەها بە مێشکیاندا بێ  ئایا ئەم چیرۆکە کورتەی ژیان و بەرگرینامە چ جۆرەپەیوەندییەکیان بەیەکەوە هەیە. لەمیانەی ئەم بەرگرینامەیەدا دەخوازم پەیوەندییەکە روونبکەمەوە.ئامانجێکی دیکەی گرنگم ئەوەیە کە لەم رێگایەوە خوازیارم بیسەلمێنم کە پەیوەندی سەرمایە ــ قازانج لە بژاردەترین سیحرباز سیحربازترە، لە ستەمکارترین خوداوەندی حوکم بێرەحمترە.هیچ سەدەیەك وەك سەدەی بیستەم خوێناوی و بێرەحم نەبووە. من نەوەی  ئەم سەدەیە بووم و پێویستە شیبکەمەوە. لەناو ئەو تۆز و دووکەڵە بێ هاوتایەی قورسایی ئایدۆلۆژی شارستانیەتی رۆژئاوا ئافراندوویەتی, زۆر زەحمەتە ئەم راستییە بخەینە ژێر شیتەڵکارییەك کە دەرکی پێبکرێت. رزگاربوون و دەرکەوتن لەناو تۆری سیحر باز ــ جادووگەر  هێندە سانایی نییە. لەم گەمەیەی دواییدا ئەم دیاردەیەش دووچاری ونکردن و  دۆراندن دەکەن کە تورك (وەك گەل)ی پێ دەڵێن. ئەوەی لەدواوە دەهێڵرێتەوە مرۆڤایەتیەکی خڵتەیە کە ناتوانرێ تێیدا بژی.

لەدۆخێکی وەهادا بەهەندوەرگرتنی دەستەی گشتی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا,بەراستیش ئەگەر هێزێکی دادگاییکردن بێت, ئەوا پێشکەشکردنی بەرگرینامەیەك لەوانەیە واتادار بێت, لەم دوو سەد ساڵەی دوایی رۆژهەڵاتی ناوین لەناو چەرخی کۆنترۆڵی شارستانییەتی ئەوروپا دەسورێتەوە. ئەوەی لە رۆژگاری ئەمرۆماندا لەئارادایە بەتەواوی گێژاوو (کائیوس) و تراژیدیای رۆژانەیە. دادوەرەکان, ئەربابەکان ــ ئەفەندییەکان بەردەوام بریارەکانییان یەکلایەنەیە. لەرواڵەتدا مافداری لەمیانەی تەرازووی دادەوە لەلایان پێوانە دەکرێ و بلاودەکرێتەوە. بەڵام ئەوەی لە بەرامبەر قازانج و بەهای وەرگیراو بلاو کراوەتەوە لە راستیدا سزایە.

بەرامبەر بەو شەر و ناهەقی و ستەمکارییانەی شوێنپەنجەی خۆی بوو. شارستانیەتی ئەوروپا, یەکێتی ئەوروپا و هێزە دادوەرییەکەی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا و دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپای ئاواکردووە. گەر دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا ناخوازێ تەنیا وەك ناوێك بمێنێ پێویستە بەشێوەیەکی راست دەستنیشان بکات چییە و کێیە لەکەسایەتی مندا دادگایی دەکرێت. ئەوەی لەسەرەتاوە پێویستە بزانرێ ئەوەیە، چاکەیەك کە لە چوارچێوەی مافەکانی تاك بێ نابێ بەرامبەر ئەو گۆشەگیرییە قورسە بێت کە ئێستا بۆ ساڵی شەشەمی دەچێ. هەڵوێستێکی بەمجۆرە هەم بەرامبەر  بەکەسێتی من، هەم بەرامبەر بەو گەلەی نوێنەرایەتی دەکەم (گەلی کورد) دەبێت بە سزایەکی کۆنکرێتی. لە بەرگرینامەکەمدا لێپرسینەوە سەبارەت بەم سزایە دەکەم. ئاشکرایە کە هەڵوێستێکی زۆر دوور لە لۆژێکی باو و مافداری فەرمییم نیشانداوە. ناچاربووم بەمشێوەیە پێشکەشی بکەم. بەلانی کەم روونکردنەوە و ئاشکراکردنی تراژیدیای ئەو گەلانەی لەژێر حوکمی ئەوروپا دەژین.

تەنانـەت بـە ئەنـدازەی  تریەیـەکی دلّـیش بێـت ڕۆڵ بیـنین لـە پێـشکەشکردنی چارەسـەری, پێویـستە وەڵامـی ئـەم ڕووداو و بەسەرهاتانە بێت. بەتایبەتیش ڕێگا نـەدان بـەو تراژیـدیا نوێیانـەی کـە ڕێـچکەیان کراوەیـە، گرێـدراوی هێـزی بەرگرینامـە و وەڵامەکەی بەرامبەری دەبێـت. بـۆ ئـەم ئامانجـە پێویـستی تـاوتوێکردن و شـۆڕبوونەوە بـۆ نـاو مێـژووی کۆمـەڵگاو دیاردەکـانی ڕۆژهەڵاتی ناوین و گەلی کوردم بینی لەسەر بنەمای رەخنەدان و ئەزموون وەرگرتن لە مێژووی نزیکی گەلی کورد پێشخستنی شرۆڤەیەکی نوێ سـەبارەت بـە بزووتنـەوەی (PKK) وەك فاکتـەرێکی نـوێ پێویـستە بەهەنـد وەربگیرێت گرنگـی و بایـەخی تایبەتی خۆی هەیە، لە حاڵەتی شیکردنەوە و چارەسەر کردنیشدا لەسەر بنەمای ئەزموون وەرگرتن لە رابـردوو کێـشەی کـورد بە چارەسەری دەگەیەنێت، ئەویش کاریگەری تەواوی لەسەر ڕۆژهەڵاتی ناوین دەکات.

بناخەی شێوەی هاوچەرخی تراژیدیای عەرەب ئیسرائیل لەمیانەی ڕێکەوتننامەی سایکس ــ بیکۆی سالّی (1916ز) دانـرا کە بەجۆرێك لەجۆرەکان پرۆژەی ڕۆژهەڵاتی ناوینی ئەو قۆناخە بوو. لەڕواڵەتدا بەهیچ شێوەیەك ئەم گۆڕانکارییە ترسناکەی نەکردبووە ئامانجی خۆی کە لەم ڕۆژگارەماندا ڕوودەدەن، پێکهاتە ـ قەوارە ـ سیاسەییەکانی دیکەش کەئاواکران، وەك ئـامرازی چارەسـەری بیریـان لێکرابـۆوە. لەڕاستیدا ئـەوەی ئەنجامـدرا، سـوافکردنێکی نـوژەنی کایـە و نـەریتی کۆمـەڵگای دەوڵەتگـەرایی دەسـپۆتیزمی ڕۆژهــەڵاتی نـاوین بـوو بــە ماددەیــەکی بریقــەدار, ئــەم سـواقە لــە ڕۆژگـاری ئــەمڕۆمان تەپەتــەپی دێـت و دەکەوێ،ئەوەی دەرکەوتەڕوو نەریتی دەوڵەتی بێچارە بوو کە پاشخانی دەسپۆتە پووچەکانی هێزی ئەتنیکی بەلانی کـەم پێـنج هەزار سالّی بوو. لەگەڵ  کـەوتنی ئـەو سوافکارییە ئـەوا بـەناو رەوتـە سیاسی و رۆشـنبیرە چـەپڕەو و راسـتڕەو، میللیگـەرا ــ ئیسلامیگەرەکانیش لایەنێکی جیاوازیان لەگەڵ ئەم راستییە کۆمەڵایەتییە ـ سیاسـییەدا نـەبوو. بەشـی ڕۆژهـەڵاتی نـاوین لـەو قەیرانە گشتییەی کۆمەلّگای سەرمایەداری کە بەهێزترین هەڵمەتی جیهانگیری بە خۆیەوە دەبینێت، بەڵێ بەشـەکەی بـەواتای ووشە "گێـژاوە"یـە قۆناغـەکانی گێـژاوە یـان کـائیوس خەسـڵەتی تایبـەت بـەخۆی هەیـە. نوێنـەرایـەتی ئـەو نێوەنـدە ــ مـەودا زەمەنیە ـ هەستیارە دەکات کە ئەو یاسایانەی واتا و بەها بە بونیادە کۆنەکان دەدەن هەڵدەوەشێنەوە, لـەجیاتی ئـەو هـی نـوێ سەرهەڵدەدەن. هەوڵەکانی هێزەکانی ژیان بۆ واتاو پێکهاتـەی نـوێ ئـەوە دیـاری دەکـەن کـە لـەم" نێوەنـدە " ئافرێنـەرەدا چـی سەرهەڵدەدات.  لەئەدەبیاتی سەردەمدا ئەم هەولاّنە بە  تێکۆشانی ئایدیۆلۆژی, سیاسی و ئەخلاقی ناو دەبرێت.

گەلی کورد لەژێر باری خراپی ئەو نەریتە بێڕەحمـەی سـەردەمی قەیرانـەوە هـەنگاو بـۆ نـاو قۆنـاخی گێـژاوە دەهاوێـژێ و بەردەوام هەست بە کولتووری کوشتار دەکات, کە وەك شمشێر بەردەوام لەسەر ملیانە. ئەگەر لەڕێگای هەڵوێستێکی هەسـتیاری واتادار و بونیادگەرایی  ئاراستە نەکرێن، ئەوا زۆر بە سانایی بۆ فاکتەری شەڕ و پێکدادانێکی خەست دەگۆڕێن کـە تراژیـدیای عەرەب ــ ئیـسرائیل تێپـەڕدەکات. ئـەو تایبەتمەندێتییـە کۆمەڵایەتیانـەی  لـەژێر حـوکمی دەوڵـەتی دەسـپۆتیزمدا لـە پـەلوپۆ کەوتووە و پارچە پارچە بووە, بەرامبەر بە هەموو جۆرە فاکتەر و هۆکارێکی دەرەوە گونجاوو لەبار دەکات. هەڵبەتـە لـەبواری نەریتــە باوەکانیــشدا ئــەم شــێوازانەی بــەڕێوەبردن وەك قــەدەرێك  و تیۆرییــەکی نــەگۆڕ  تێدەگــەن. بــەڵام کاتێــك هێــزی هەژموونگەرایی و سەرکێشی جیهانگیری ئەمریکا لەمیانەی پرۆژە نوێکەی سەبارەت بەڕۆژهەڵاتی ناوین کوردان وەکو فاکتـەری سەرەکی دەبینێ  قۆناخ هەستیار تردەبێت. ئەمریکا کە لەڕێگای تاقیگەراییەکی قەبا سیاسـەت بـەڕێوە دەبـات، هـەروەکو چـۆن لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا کۆمەلّگای ڕۆژهەڵاتی نـاوین ڕێگـا لـەپێش تراژیـدیا دەکاتەوە،گـەر بەزانینـەوە بێـت یـان نـەزانین وەهـا دیارە ڕۆژەڤێك دەسەپێنێ کەکۆتاییەکەی نازانرێ و دیار نییە0 ئەوەی یەکێتی ئەوروپا ئـەنجامی بدات،لەبەدواچـونێکی گرانـی ئـەم قۆنـاغـە بەشـێوەیەکی واقیعـی و بـەگوێرەی مەرجـەکانی قـازانـج بـەولاوە هـیـچ جـۆرێکی دیکـە نـابێ. چـەمکی دەوڵـەتی دەسپۆتیك نەریتێکی وەهای نییە کوردان وەك دیاردەیەك ببینێ و بە دۆسـتایەتی لێـی نزیـك بێتـەوە." سـەری بـەرز کـردەوە، سەرکوتی بکە"  تاکە سیاسەتی دیاریکراوە. لەگەڵ ئەمەش دا بەردەوام نەریتی "بنەماڵەگەرێتی" کورد لە ئارادا دەهێڵرێت کـە

تا قوڕگ کەوتۆتە نێو خیانەت و بە کرێگیراوێتی. وەك تایبەتمەندێتی و پێداویستییەکی کەسایەتی و کارەکتەرەکەیان بە ئەندازەی ئەوەی لەگەڵ چەمکەکانی دەوڵەتی خۆجێی دەسپۆتن, لەگەڵ ئەربابە ئیمپریالییە نۆێکانیشیان لە بەڕێوەبردنی هیچ جۆرە هاوکارییەکی بێ پرەنسیپانە دوودڵ نابن. ئەو دیاردەیەی کورد کە ماوەتەوە،پارچە پارچە کراوە،چەندەی بڵێی تەسك کراوەتەوە، لەولاتری نەزانیشەوە دووچاری قڕکردنی هزری و پێکهاتەشی هاتووە، خانەکانی وردە خێزانەکانە. تەنانەت ئاگاداری ئەمەشی نییە کە "چۆن دەبێت بە هی خۆی". لەگێژاوە (کائیوس)ی ڕۆژهەلاتی ناویندا دەتوانرێ بۆ هەموو ئامانجێك سوود لەم کوردە تەواوکەرە وەربگیرێت، تا دەگاتە بەکار هێنانیان لە پەیڕەویکردنی شێوازی دڕندانە، تەنانەت لە ئاواکردنی ڕۆژهەلاتی ناوینێك کە شایستەی ژیان بێت تاوەکو دوایی ئامرازێکی لەبارو گونجاوە. ئەگەر کوردان لەوەلامدانەوەیەکی گەوهەری دیموکراتییانە بۆ پرسیاری " چۆن دەبن بە هی خۆیان" سەرکەوتن بەدەستبهێنن، بێگومان دەبن بەیەکێك لەهێزە پێشەنگەکانی ڕزگاربوونێکی سەرکەوتوانە لەو ئاژاوەییەی لەئارادایە. نەك تەنیا بۆ خۆیان، بەڵکو بەسەر شانسی بەرەواژوو کراوی سەرجەم گەلە بێبەختەکانی ناوچەدا سەردەکەون. دەتوانن کۆتایی بە ئاماری خوێناوی و بێڕەحمی نەریتی شارستانیەتی پێنج هەزار ساڵە بهێنن. بەم شێوەیە دەتوانن کۆتایی بە ڕەچەڵەکی ئەڕبابەکانی شارستانییەت بێنن کە خۆیان ڕێگایان بۆ کردنەوە و بەشێوەیەکی کوێرانە خزمەتیان کردن, لەجیاتی ئەوەیش دەتوانن ڕۆڵێکی گرنگ لەچاخی ڕەسەنێتی ئازادی گەلاندا ببینن.

لەدۆخێکی پێچەوانەدا ئەگەر هەڵمەتەکانی ئەفەندیەکانی ـ شارەزایانی ئیمپریالی درێژخایەنی قووڵبێتەوە و ژێرکەوێت، ئەوا لەناوچەدا لە ڕۆڵی هێزی " کوشتن ومردن" ڕزگاری نابێت, تەنانەت ڕۆڵەکەیان ڕەوشی فەلەستین ــ ئیسرائیل تێپەڕدەکات و تەواوی ناوچەکە دەگرێتەوە. ئەوەی ئێستا ڕوودەدات لەچەخماخەی پێکدادانە گەورە کان زیاتر هیچ مانایەکی دیکەی نییە. کاتێك تەماشای گەمەکانی دەوڵەتی فەلەستینی ــ ئیسرائیلی بکەین, ئەوا بۆ زانینی ئاییندەی گەمەکانی " دەوڵەتی کوردی" پێویستی بەکاهینێتی نییە. پێویست دەکات زۆر بەباشی جیاوازی نێوان بەرگری ڕەوای چەکداری و ئەو توندوتیژییە ببینرێت کەوەك ئامرازێکی چارەسەری و ئاواکردنی دەوڵەت بەکاردەهێنرێت.

هەربۆیە کاتێك وابەستەی ناوەندی دەوڵەت نەبێ و گرێکوێرەی گێژاو بۆ ماوەیەکی درێژ وەك شێوازێکی ژیان بۆ خۆی پەسەند نەکات ئەوا شێوازێکی واقیعی چارەسەری پێڕەوی ئاشتی و دیموکراتییانە ژیانییە. پێویستە بەمەزنی بیرکردنەوە لە باری قووڵی واتا و پێکهاتەی خولقێنەران ئەنجام بدرێت و بەئەشقەوە جێبەجێ بکرێت و وەك پیرۆزترین هەوڵ ببینرێت. لەم بەرگرینامەیەدا هەوڵ دەدەم هەم ئەو ئێش و ئازارانە کەم بکەمەوە کەلەژێر بەرپرسیارێتی(PKK) وە خولقاوە، هەم وەك ئەوەی ئەزموونێکی مەزنی ڕەخنەدانی بەدەستهێناوە ئەم بژارەی چارەسەری ڕووندەکەمەوە.

هەرچەندە قۆناخی دادگاییکردنی ئیمرالی لە هەلومەرجی نالەبار بەڕێوەچوو، بەلام دیسان ئەو هەڵسەنگاندنەی خۆم ڕاست دەبینم کە وەك لێگەڕینێکی ئاشتی و دیموکراتی بەناوم کرد. ئەو قۆناخە بەهای وەرچەرخانێکی چۆنایەتی هەبوو. قۆناخێك بوو هەم هۆشیاری هەم هەوڵەکانی پێویستی دەستبەردانێکی بە پرەنسیپانەی لە لێگەڕینەکانی کۆمەڵگای دەوڵەتگەرایی و پایەداری چڕبۆوە. لەو قەناعەتەدام کە وانەی ئەزموونبەخشی قۆناخە زەحمەتەکانم بەدەستهێنا. بەرخودانم بەرامبەر هەردوو هەڵوێستی دەست لەخۆبەردانێکی نامەردانە و بەرخودانێکی قەبا و کوێرانە کرد، ئەو بەرگرینامەی پێشمخست لەگەڵ ئەوەی رۆڵێکی گرنگ لە وەرچەرخانی تورکیادا دەبینێ، ئەوەی هەرە زێدە وشیارانە سوودی لێ وەرگرت ڕێکخستنەکەی (AKP) پارتی دادو گەشەپێدان بوو. سەرباری هەموو هەوڵ و کۆششەکانم کە دەمخواست ئەو هێزە چەپڕەوانە سوودی لێ ببینن کە پێویست بوو دیموکرات بن, بەلام سوود لێوەرنەگرتنیان دەشێ وەك زیانێکی مەزن هەڵسەنگێنرێ. لەجیاتی چەپڕەوەکان، ڕاستڕەوەکان گفتوگۆیان سەبارەت بە دیموکراسی دەکرد. بێگومان لەئەنجامدا لایەنی سەرکەوتوو ئەوانن.

ئامانجی سەرەکی بەرگرینامەی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا، بەراوردکردنی شارستانییەتی خۆرئاوا و خۆرهەلاتی ناوین و شکاندنەوەی ئەگەری گۆڕانکارییەکان ـ بەتایبەتی بۆ کوردان ــ بوو بەلایەنی بژاری دیموکراتییانە. پاشەکشێی (PKK) بۆ باشوور (کوردستانی عێراق) پێویستییەکی ئەم هەلۆێستە بوو. گۆڕانکارییەکان و داگیرکاری ئەمریکاش راستی ئەم هەلۆێستە ڕووندەکاتەوەو دەیسەلمێنێ. هەلۆێستەکانی سەبارەت بە ڕۆژهەلاتی ناوین کەلەسەرتاسەری جیهان گفتوگۆ دەکرێ، لەم بەرگرینامەیەدا بە فراوانی دەستنیشانکراوە. ڕۆژ بە دوای ڕۆژ زیاتر گرنگییەکەی دەردەکەوێ، هەلۆێستێکی وەها جێگای باس نییە کەبە شێوەیەکی ووشك دوژمنایەتیەکی پاشڤەڕۆیانەی شارستانییەتی ڕۆژئاوا بکرێ یاخود تەسلیمکاریەتێکی هەرزان نیشان بدرێت. بە وریایی و تایبەت هەوڵ دراوە بەهای کۆتێزی (سەنتێزی)، خولقکاری و تایبەتبوونەکەی نیشان بدرێت.

لەوبەرگرینامەیەی کە بۆ دادگای ئەسینا پێشکەشکراوە بە کارامەیی پێویستی چۆنییەتی تاوتوێکردنی مەسەلەیەکی بەرجەستەکراوو ئەو ڕەوشە نیشان دەدرێت کە ڕژێمی ئۆلیگارشی گەلانی تێخستووە. جارێکی دیکە هەوڵ دراوە گرنگی سەیرکردنی کێشە مێژووییەکان سەبارەت بە گەلانەوە دەستنیشان بکرێت. ئەم بەرگرینامەیەی دواییش ناوەڕۆکی تەواوکاری بەرگرینامەکانی دیکە لەخۆوە دەگرێت. لەبواری سیاسی و مافداری یەکبوونی تورکیا و ئاسیای بچووك لەگەڵ یەکێتی ئەوروپا، واتا قۆناخی دەستپێکردنی یاداشتنامەی (مذكرة) ئەندامێتی ڕەچاو دەکات. لەپێشەوەچوونێکی سەرکەوتووانەی قۆناخدا کێشەی کورد ڕۆڵی پێشەنگی دەبینێ. دەشێ پێوانە سیاسی، دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ وەك پێوانە بنچینەییەکانی چارەسەری ئەم کێشەیە ببینرێ.

بەلام وەك حکومەت و دەوڵەت تورکیا لەجیاتی ئەوەی بڕیارەکەی لەناواخنییەوە سەرچاوە بگرێت، وەك ناچارییەکی دەبینێ. ئەم هەلۆێستە لەگەڵ ئەوەی ترسی باوی تورکیا بەرامبەر ڕۆژئاوا نیشان دەدات، ئەوا هەلۆێستێکی ئازادیخوازانەی لە ناواخنییەوە سەرچاوە بگرێت بەرامبەر ئەم کێشەیە نەك هەر تەنیا زیانی لێناکەوێتەوە، بەڵکو دەبێ هەوڵی ئەوە بدات و دەرکی پێ بکات کە سوودێکی مەزن و سەرکەوتنی لە دواوەیە.

ئیتر دەبێ کۆتایی بەبڕیاری بەکارهێنانی کارتی کورد بهێنرێ کە لەسەردەمی ئاواکردنی کۆمار بە مەسەلەی موسڵ ــ کەرکوك لەنێوان تورکیا و ڕۆژئاوا دەستپێکرد. چونکە لەمانەوەی شۆڕشەکانی کۆماریی بەوابەستەیی و گەندەڵبوونی ئۆلیگارشی، هەروەکو لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا دەبینرێ لە گۆڕانی ناوەرۆکەکەی بەولاوە هیچ ئەنجامێکی دیکەی لێنەکەوتۆتەوە. بەبایەخەوە تاوتوێکردن و گرتنەدەستی سەنتێزی کۆماری دیموکراتی و هاولاتی کوردی ئازاد و ئاراستەگرتن بەرەو چارەسەری یەکپارچەیی ڕاستەقینە و دیموکراتیزە بوون فەراهەم دەکات. بژاری دیموکراتی و مافەکانی مرۆڤی شارستانیەتی ڕۆژئاواش دەرفەت بەهەلۆێستێکی لەمە جیاواز تر نادات. کاتێك پێوانەکانی مافداری (مافپەروەری) پەیڕەوکراو ڕەچاو بکرێت، شیمانەیەکی وەها ناکەم بەڕشتی چاو پێداخشانەوەیەك بە مافەکانی مندا ئەنجام بدرێت. هەروەها زەمینەی سیاسی ــ ئابووری بنەمای دۆزەکەو هێزی ڕاستینەی پیلانگێڕی زۆر لەسەرەوەی هێزی یاسایە، هەروەکو دەزانرێ خودی یاساناسی ـ مافپەروەری ـ ئەو سیاسەتەیە کە بۆماوەیەکی درێژە بە ڕێساو دامەزراوەکان بەستراوەتەوە، ئەم تایبەتمەندییە بۆ دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپاش لەجێگای خۆیدایە، بەلام دیسان بەکارهێنانی مافی بەرگریکردن ئەرکێکی ئاکاری و سیاسی و یاساییە، لەو باوەڕەدام کە ئەو شەڕەی بەرگریکردن کە شەش ساڵە بەردەوامە هەم لەبواری واتا هەم لەبواری پێکهاتە زۆر لە سەرووی بەرگریکردنە ئایدۆلۆژی ـ کردارییەکانی پێشترە. ئەوانەی دەخوازن خەڵك بەسزای مردن دادگایی بکەن دەبێ بتوانن خۆشیان دادگایی بکەن. هەروەها ئەوانەی دەخوازن بەرگری لە خەڵك بکەن دەبێ سەرەتا بزانن چۆن بەرگری لەخۆیان بکەن. ئەوانەی دەخوازن خەڵك ئازاد بکەن دەبێ سەرەتا بتوانن خۆیان ئازاد بکەن. بەمجۆرەشن ئەو منداڵانەی کە بەئازادی لەدایك نەبوونە، دەشێ مافی لەدایك بوونی ئازادانەیان ببێتە ڕاستییەك.

## بەشی یەکەم

### راستینەی کۆمەڵگا و تاك

وەك تاکێك لـە کاتێکدا بەتـەنیا لـەژێر هەلومـەرجی قورسـی گۆشـەگیریدا لـەناو رەوشـی دەستبەسـەری و دیلیـدا دەژیـم، لەلاکەی دیکەشەوە درێژە بە بەرگری یاسایی خۆم دەدەم. لەساڵی شەشـەمدام. لەمێـژوودا بینینـەوەی دۆزێکی قورسـی سیاسـی هاوشێوەی ئەمە هێندە درێژخایەن بووبێت ئاستەمە یان سانایی نییە. تاوەکو ئەم ساتەوەختەش دیارنییە کە چەندەی تریشی پێدەچێت، بەڵام بەسووربوونەوە وەك رێسایەك ئەوە بەسەر دۆزەکە دەسەپێنرێ گوایە پشت بەسەر لێدانی تاکێك دەبەستێ، جێگا بەفاکتەرە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان نادرێت، زۆر روون و ئاشکرایە کـە ئـەم هەڵوێـستەی دادگـای مـافی مرۆڤـی ئـەوروپا کەموکورتی مەزن لەخۆیەوە دەگرێت و لەگەڵ خۆیدا دەرفەت بۆ دادگاییکردنێك دەرەخسێنێ کە ناعادیلانەیە.

لە کاتێکدا بە وریاییەوە دۆزەکەم دەخرێتە چوارچێوەی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا, هەروەکو بڵێی هەموو لایەنـە سیاسـی و کۆمەڵایەتییەکانی بەرکەنار کرا. ئاشکرایە ئەم هەڵوێستە پێویستی شاردنەوەی بەشێکی گرنگی راستییەکانی بینـی. کاتێك تاك لە کۆمەڵگا دادەبڕێنرێ، پێی دەگوترێ "دەیکـەم بـەخاوەنی مـاف" واتـە دادگاییکردنەکەشی لەسـەر ئـەم بنەمایـە ئـەنجام دەدەم، ئەمـە سـەرەکیترین بابەتـە و پێویـستە روونبکرێتـەوە و ئاشـکرا بکرێت, ئـەم هەڵوێـستە نـاوەڕۆکی شارسـتانی ئـەوروپا پێکدەهێنێت. تەنانەت تەواوی بەرگرینامەی یەکەمم بۆ ئاشکراکردنی ئەم راستینەیە تەرخانکرد، دیسان دووبارەی ناکەمـەوە. بەڵام باسکردنی پوختەیەکی پێویستە.

بەکۆمەڵگابوون هەلومەرجی هەبوونی جۆری مرۆڤە، دابڕانی لەو جۆرە پریماتە فامیلی هەرە نزیك بە مرۆڤی پـێش خـۆی و بوونی بە مرۆڤ، راستینەیەکی هەرە نزیکی زانستی کۆمەڵناسییە کە بـەمرۆڤبوون هاوتـەریبی بەکۆمـەڵگابوون پێـشکەوتووە، بەڵام ژیانی بەتەنیا و لەدۆخی کۆمەڵ, چەندە بەجودا و داتاشراوی واتا تاوتوێ بکرێت، دیاردەیەکە ناتوانرێ لـەلێواری تیـۆری بسەلمێنرێ، تاکی بەتەنیا بوونی نییە. دەشێ تاکێك هەبووبێت کە کۆمـەڵگای نەماوە،رووخاوە،بـەڵام بـەلانی کـەم ئـەو تاکـە لـە میانـەی یادەوەرییـەکانی کۆمەڵـە رووخاوەکـەی لەسـەر پێیـان ماوەتـەوە. لەرێگـەی ئـەم بیرەوەریانـەوە بەکۆمـەڵگابوونی مەسـەلەیەکی ساتەوەختییە، بـەهێزبوونی جۆری مـرۆڤ تـەواو گرێـدراوی ئـەو پەیوەندییەیـە کەلەگـەڵ ئاسـتی کۆمەڵایـەتی بەستوویەتی، لاواز کردنی تاك, دڕندانەترین شێوازی بەکۆیلەکردن, ئـەو ئاسـتەی تـەنیایی یـە کـە بەسـەریدا سـەپێنراوە, ئـەو

گۆشەگیرییەی کەتێیدا دەژی، مێگەڵە کۆیلەکان، بازرگانە گوندییەکان و کارکەرانی شار دیسان کۆمەڵگایەکن، ناوەناوە یاخی دەبن و خۆیان وەبیردێتەوە، لەلایەکی تریشەوە تەنیایی فێرکەرێکی بێ وێنەیە، فۆناخی خەڵوەتگرتنی تەواوی پێخەمبەر و بیریارە بەناوبانگەکان ئەم راستییە نیشان دەدات. تاکێتی تاك (کەسێتی تاك) تادوایی زاراوەیەکی پڕلە ناکۆکییە. لایەنێکی رووخسارەکەی لەدژی کۆمەڵگا هەر وەکو بڵێی لە زنجیرەکەی ڕزگاری دەبێ و بەسەربەستی دەگات، ئەو رێسایەی کە کۆمەڵگا پشت بەتوندوتیژی نەبەستێت بە ئەخلاق ـ ئاکارـ بەناو دەکرێت. تاکێتی تاك فشار بۆ ئەم ئەخلاقە دێنێت. راستتر تاکێتی شارستانییەتی ئەوروپا لەگەڵ لاوازکردنی ئەخلاق گەشە دەکات. لەکاتێکدا پێشەنگایەتی کۆمەڵگا لەشارستانییەتی ڕۆژهەڵات بە بناخە دادەنرێت، لە شارستانی ڕۆژئاوا تاك پێشەنگە، لەم پێناسەیەی تاك دوو ئەنجامی جیاواز دەردەکەوێت : لەکاتێکدا تاکی دەسەڵاتداری داگیرکاری بۆ پلە و پایەی ئیمپراتۆرییەتی بەرز دەبێتەوە و تاکی چەوساوە و ژێردەست لەنێو قووڵترین کۆیلایەتیدا دەژی، شتێکی ڕێکەوت نییە لەناو ئەو کۆیلایەتییە گشتگیر و قووڵکراوەی سیستەمی سەرمایەداری لە هەموو ئاستەکانی کۆمەڵگا بڵاویکردۆتەوە رووخساری دڕندانەی سەدەی بیستەمی لێبکەوێتەوە.

سیستەمێك بەها مەعنەوییە بنچینەییەکانی لەدەست دابێت و بەم بڵاوییە خاوەن ئەرباب (ئەفەندی) بێت هیچ شتێك نییە لەپێناو چاوچنۆکی و قازانج پەیڕەوی نەکات.

ئەو تەنیایی و دەستبەسەرییەی تێیدا دەژیم گرێدراوی ئەم پێکهاتە گشتییەی سیستەمی گۆشەگیرییە. گەر کۆمەڵگاو گەل خرابنە ڕەوشێك " خاوەنی خۆیان نەبن "، ئەمە بەو واتایە دێت کەلەگەڵ هاتنە دونیا و لەدایکبوون مەحکومی تەنیاییەکی لاوازکراوی. بەو ڕادەیە خاوەنی خۆت نەبی، هی خۆت نەبی، لەگەڵ کۆمەڵگایەکی دیکە دەبیت بەیەك.بەڵام ئەو کاتە ئیتر خاوەنی خۆت نیت. یان تەنیاییەکی سەرسام، یاخود تەسلیمبوون بەواقیعێکی دیکە. ئەوەیە ئەو دوو لایەنییە(دوالیزم) مەترسیدارەی بەتەڵەزگەی کورد ناوم برد.

هەروەکو بڵێی لەناو جۆرەکانی مردن یەکێکیان هەڵبژێرە. لەڕۆژگاری ئەمرۆماندا جیاوازیی و هاوبەشێتییەکانی " ئەوی دیکە " زۆر گفتوگۆی لەسەر دەکرێت. ئەمە هەڵوێستێکی ڕاستە کە بەشێوەیەکی دڵخوازی خولڤاندنی جیاوازییەکانی دەوڵەمەندێتی کۆمەڵایەتی لەڕێگای هاوبەشیکردن لەگەڵ ئەوەیدیکە پێشدەکەوێت. بەڵام سیاسەتی نەخشە بۆکێشراوی هاوچەشنکردنیان و هاوشێوەکردنیان جیاوازترە. ئەویش پاکتاوکاری, قڕکردن و تواندنەوەی ئەتنیکە، دوورخستنەوەیەتی لە خاوەنداریێتی خودی خۆی.

ئەمجۆرە سیاسەتەیە کە بەردەوام لەسەر دیاردەی کورد پەیڕەوکراوە. سەرچاوەی ئەمەش دەسەڵاتی ــ بیۆلۆژی ((ئەو دەسەڵاتەی پشت بەخستن و بەکارهێنانی ئارەزووەکانی مرۆڤ دەبەستێت بۆ دەست بەسەرداگرتنی بەتایبەتیش لایەنی زایەندی)) و نەژادپەرستی و فاشیزمی سەدەکانی بیستەم و نۆزدەهەمە : هەموو جۆرە چەمکێکی دەسەڵاتی تۆتالیتارە (گشتگیری تاکڕەو). کاتێك ئامانجی ئاواکردنی نەژاد و نەتەوەیەکی بەهێزە, ئاکام هێرشکاری و پەلاماردان و شەڕە. بێگومان سەرچاوەی ئەمە بۆ قۆناخی ئاواکردنی یەکەمین کۆمەڵگای پلەداری (هیرارشی) دەگەڕێتەوە. بەڵام بوونی بەسیاسەتێکی بەرفراوان و بە سیستەمکراوی دەوڵەت، تایبەت بە سەدەی بیستەمە.

هەردوو شەڕی جیهانی و, شەڕەخۆجێیی و ناوچەییە بێ ژمارەکان، تەنیا ئەمانە شارستانیەتی ئەوروپا بەتایبەتیش یەکێتی ئەوروپایان ناچارکرد کە سەبارەت بە نۆرمەکانی یەکێتی ئەوروپا و پرەنسیپەکانی هاوفکر بن و بن بەیەك. ئەوەی ئەمرۆ ئەوروپا تێیدا دەژی بەجۆرێك لەجۆرەکان ڕەخنەدانە بەرامبەر بە مرۆڤایەتی. تاکێك کە لە زنجیرەکەی دابڕا بێت, دەسەڵاتێکی دەوڵەت کە لەدژی بەها مەعنەوی (مۆراڵ) ییەکان پێشبکەوێت هیچ خراپەکارییەك نامێنێ ئەنجامی نەدات. بەتایبەتش کاتێك چاوچنۆکی کەڵەکەکردنی سەرمایەی قازانج کۆڵەکەکەی پێکبێنێت. دادگاییکردنم لەژێر سایەی ئەم

هەلومەرجەدا، تەنانـەت ئـەو پیلانگێڕییـەی لەژێریـدا شـاراوەیە بەرکـەناریش بکرێـت، بـەهۆی ئـەوەی کۆمەڵگایـەك دەکرێتـە خـاوەن داواکـاری کەبانگەشـەی خـۆی لەدەسـتداوە، هـەروەها لەبەرئـەوەی ئەمـەیان چـالاکییەکی ریـشەدارە لەبەرامبـەر ئـەو سیستەمەی کەوتۆتە ناو چاوچنۆکی قازانج و فیزی هێزەوە، قورسترین سزا دەکاتە پێویستییەك و (بەپێویـست دەبـینێ) ئەمـە دەسەپێنرێ.

لەکوێ بڵێی کۆمەڵگاکەم، کوانێ کەلتوورەکەم؟ کوانێ زمانی زگماکیم(زمانی دایك)؟ کوانێ ئازادیم؟ ئەمە دەبێتە یاخیبوون و جوداخـوازی و خیانـەتکردن لەنیـشتمان. لەشارسـتانیەتی عوسمانیەکانـدا تـاوانی بـەمجۆرە بـوونی نـەبووە, بەگـشتی لـەناو سیـستەمی گـشتیی قـەومی تورکیـشدا ئـەمجۆرە تاوانــە بــوونی نییــە. ئــەم تاوانانــە داهێنانــەکانی دەســەڵاتی ــ بیۆلــۆژی و نەژادپەرستی و فاشیزم و رژێمەکانی دیکەی دەسەڵاتی تۆتالیتاری شارستانیەتی ئەوروپایەو، لەسـەدەی بیـستەم بـۆ سیـستەمی دەوڵەتی تورك گواستراوەتەوە, هەموو لایەکی جیهان بەشی خۆی لەمە وەرگرتووە. گەر تاوانێکم هەبێ، لەخۆوە گرتنی هەندێ لـە میکرۆبـەکانی ئـەم کولتـوورەی شـەڕو دەسـەڵاتە, هـەر وەکـو فـەرمانی قورئـان بـۆ باوەڕمەنـدەکان،منیش هاوشـێوەی ئـەوە دەسەڵاتی دەوڵەتم لەپێناو ئازادی، شەڕیشم لەپێناو دەسەڵاتی دەوڵەت بە پێویست بینی و کەوتمە ناو ئەم یارییەوە.

ئەمە نەخۆشییەکە هیچ ئازادیخوازێك نەیتوانیوە خۆی لێ ڕزگار بکات، لەسەر ئەم بنەمایـە نـەك هـەر بەتـەنیا بەرامبـەر سیستەمی زاڵ، بەڵکو بەرامبەر تێکۆشانی ئازادیش تاوانبارم کە هەموو شتێکی خۆم لەپێناویدا کردە قوربانی، تەنیا لـە بـواری تیۆری رەخنەدانی ئەوە نـادەم، بـەڵکو لەپراکتیکـە رەسـەنەکەی تەنیاییـشمدا تـاوەکو ئـەنجامگیربوون درێـژەی پێـدەدەم. بـەڵام سیستەم چۆن حیسابی ئەم تاوانەی دەدات کە بەزۆرەملێ و فێڵبازی، کۆمەڵگایەك، گەلێك لە خاوەنداریێتیکردنی خـۆی بێبـەش دەکات ؟ گەر دادگاییکردنەکە عادیلانە بێت پێویستە بەشێوەیەکی هاوسەنگ و یەکسان گوێ لەبانگەشەکانی هەردوولا راستە و بـەگوێرەی ئەمـەش بـە بڕیارێـك بگـەن. دادوەرییـەك پەیوەنـدی خـۆی لەگـەڵ زانـست پـچڕاندبێت, هـەرگیز عادیلانـە نابێـت. ئاشکرایە پەنابردنە بەر زانستی کۆمەڵناسی دەبێتـە چـەکی سـەرەکیم. بـەو ڕادەیـەی لەڕێگایـەوە ڕۆشـندەبمەوە، بەڕێوەچوون لەسەر ڕێگای ڕاست، پێویستیەکی بوون بەمرۆڤی خاوەن کەرامەتە.

سیستەمێك بەمشێوەیە حوکم لەسەر کۆمەڵگا بەڕێوە ببات، ئەو تێکدان و داڕووخانەی بەرامبـەر سروشـت ئـەنجامی دەدات هەرگیز ناتوانرێ پـشتگوێ بخـرێ و نـەبینرێ. هەڵوێـستێکی ئیکۆلـۆژی و فێمێنیـستی (ژینگەناسـی و ژنناسـی) خـاوەنی هێـزی ئاشنا کردنمانە بەو ژیانە سروشتییەی کۆمەڵگا کە لە دەستدراوەو ونبـووە، بەشـێوەیەکی راسـت پێناسـەکردنی دیموکراسـی کـە بـژاری سیاسـی گەلانــەو نیـشاندانی هێـزی چارەسـەری لەسـەرووی بابەتـە بەکاریگەرەکانــەوە دێـت. لەکاتێکـدا شـەپۆلی نـوێی جیهـانگیری هەڵــسووڕانی سەربەســتانەی کــاڵا کــە وەکــو بابــەتێکی (فەتیــشیزم) پەرســتنی لێکــردووە, وەك تاکــە بــژارێك دەڕازێنرێتەوەو بە پولداری پێشکەشی دەکات، لەڕاستیدا دەبێ بـزانین کـۆنترین دزی و زەوتکاری پێـشکەش دەکـات و هەربۆیـە پێویستە بژاری دیموکراسی و ژینگەخوازی خۆمان زیاتر ڕوونبکەینەوە و وەك ئاڵای ژیانی نوێمان بیـشەکێنینەوە. کاتێـك بـەم چەشنە بانگەشەکانی یەکسانی و ئازادی مێژوو دەکەینە هەنووکەیی و شایستەی پراکتیزەکردن. بەمـەش دەیـسەلمێنین کـەهیچ هەنگاوێك بەفیڕۆ نەچووە کە لەم پێناوەدا هاویشترابێت, هەروەکو چۆن شتێکی لە سروشتدا هـەبێت کۆتـایی پێنایـەت و لـەناو ناچێت, بەهایەکیش کە بۆ کۆمەڵگا خولقێنرابێت لەناو ناچێ و کۆتایی پێنایەت.

دووبارە بەدەستەوەگرتنی کۆمەڵگا لە بەرگرینامەکەمدا, بەو قووڵاییە فەلسەفییەوە گرێدراوە کە بەدەسـتمهێناوە, لـەبواری زانستی کۆمەڵایەتی(کۆمەڵناسی) لـە ڕۆژگـاری ئەمرۆشمانـدا پێویـستە فەلـسەفە هـەمان ڕۆڵـی سـەردەمی قۆنـاخی لـەدایکبوون ببینێ. لە بەرامبەر ئەو زانـستەی ئاوێتـەی دەسـەڵات بـووە گەڕانـەوە بـۆ فەلـسەفە، پرەنـسیپی پێهـەڵگرتنی کۆمـەڵگای ئـازادە,

لەئـەنجامی نموونـە بـێ شـوومارە مێـژوویی و هەنووکییـەکان ڕوونبۆتـەوە کـە ئـەو دیموکراسـییەی فەلـسەفە پاڵپـشتی نـەبێت گەندەڵ دەبێت و لەدەستی دیماگۆژەکاندا دەبێتە ناڕەسەنترین ئامرازی بەڕێوەبردنی گەلان.

ڕێگای ئاستەنگکردنی ئەم ڕەوشە لایەکی ئەخلاقە، لایەکەی دیکەشی زانستە، بـەڕێوەبردنی تێکۆشـانی سیاسـییە لەمیانـەی نەریتـەوە کـە پارچـەیەکی جیانەکراوەیـەتی، بـەم بەرپرسـیارێتییەوە دەتـوانین لـەناو قـەیرانی سیـستەمدا, بەپـشتبەستن بـە یەکسانی و ئازادی کاروانێکی ژیان و دونیاکەی بخولقێنین.

أ ـ کۆمەڵطای سروشتی

پەیوەندی نێوان کۆمەڵگاو سروشت بوارێکە تادێت کۆمەڵناسی تێیدا قاڵ دەبێتەوە, هەرچـەندە لـەبواری گشتیدا کاریگـەری ژینگە لەسەر کۆمەڵگا روون و کراوەیە، بەڵام لێکۆڵینەوەی بەشێوەیەکی زانستی و بوونی بە بابەتێکی فەلسەفی شتێکی نوێیە, دوای دەرکەوتنی ئەنجامی کارەساتەکانی کاریگەری سیستەمی کۆمـەڵگا لەسـەر ژینگـە ئـەم پەیوەندییـە پەرەیـسەندووە, کاتێك لێکۆڵینــەوە ســەبارەت بــە سەرچـاوەی کێـشەکە بکرێـت, ئــەو سیــستەمە باڵادەسـتانەی کۆمــەڵگا رووبــەڕوومان دەبنــەوە کــە بەشـێوەیەکی زۆر مەترسـیدار پێـچەوانەی سروشـت کەوتوونەتـەوە, نـامۆبوون بـە ژینگـەی سروشـتی لـەژێر ئـەم ناکۆکییـە ناوخۆییانـەی کۆمـەڵگا شاراوەیە کـە هـەزاران ساڵ بـەردەوام بـووە; لەمیانـەی یەکلابوونـەوەی زانـستی ئاشـکرابووە کەچـەندە ناکۆکییـە ناوخۆییـەکانی کۆمـەڵگا و شـەڕو پێکدادانـەکان پەرەبـسەنێت بـەو ئەندازەیـەش پێـچەوانەبوون بەرامبـەر سرووشـت زیـادی کــردووە. پــارۆلای(دروشمــی) ڕۆژگــاری ئــەمڕۆمان زاڵبــوون بەســەر سرووشــت, بێڕەحمانــە دەستبەســەرداگرتنی سەرچاوەکانی و چەوساندنەوەیەتی. باس لە درندەیی و کێویبوونی سروشت دەکرێت. مـسۆگەر ئەمـە هـیچ راستییەکی نییـە, لەو کێشانەی سەبارەت بە ژینگەوە دیارە, ئەو مرۆڤەی بەرامبەر هاو ڕەگەز و جۆری خۆی بووە بەدرندە, بەرامبەر سروشتیش کەوتۆتە نێو درندانەترین ڕەوشەوە, هیچ جۆرە بوونەوەرێك بەئەندازەی مـرۆڤ جۆرەکانی رووەك و ئـاژەڵی لـەنێو نـەبردووە. بەو خێراییەی ئێستا درێژە بەکاری لەناوبردن بـدات, ڕووبـەرووی کێشەی مرۆڤێـك دەبینـەوە کەناتوانێت خـۆی لـەوە ڕزگـار بکات هاوشێوەی دیناسۆر کۆتایی بە ڕەچەڵەکەکەی نەیەت. بەخێرایی زیادبوونی دانیشتوان و گەشـەکردنەکەی و بـەکارهێنانی تەکنۆلۆژیا بە شێوەیەکی خراپ, کە کردەوەی ڕووخێنەرانەی ئێستای مـرۆڤ سنوورێکی بـۆ دانـەنرێت,دوای ماوەیـەك کـەزۆری پێناچێ ژیانی مرۆڤ دەگاتە قۆناخێك کەئیتر ناتوانێ بەردەوام بێ.

ئـەم راستینەیەش لـە پێکهاتـەی نـاوەوەی کۆمـەڵگا بـەهۆی زیـادبوونی شـەڕوپێکدادانەکان, شـێوە هـەرە مەترسـیدارەکانی بەڕێوەبەرایـەتی سیاسـی, زیـادبوونی بێکـاری, کۆمەڵگایـەکی لەمەعنـەویات دابڕێنـراو و مرۆڤایەتیـەکی بـەرۆبۆتکراو وەکـو دیناسۆری لێدێت, تاوەکو بە شێوەیەکی راست فاکتەرەکانی ئەمجۆرە پێشکەوتنەی کۆمـەڵگا دەستنیـشاننەکرێت, ئـەوا نـاتوانرێ ڕوونکردنــەوەی تیــۆری راســت و ڕێگاکــانی چارەســەرکردنی شــەڕە باوەکــانی مەدەنییــەت و چــین و نەتــەوەکان بدۆزرێتــەوە. لـەڕۆژگاری ئەمڕۆمانـدا کاتێـك سۆسـیۆلۆژی نـاتوانێ بـە ئەنـدازەی " ئـایین " یـش وەڵامـی کێـشەو گرفتـەکان بداتـەوە, ئـەوا لێپرسینەوەی کۆمەڵناسی, تەنانەت لێپرسـینەوەی تـەواوی پێکهاتـە زانـستییەکانیش دەکاتـە ناچارییەك. مـادام زانـست هێنـدە پێشکەوتووە، ئـەی ئـەم هـەموو شـێتایەتییە بۆچـی؟ ئەگـەر تـەنیا ئامـاری خوێنـاوی سـەدەی بیـستەم لەگـەڵ تـەواوی مێـژووی مرۆڤایەتی بەراورد بکەین, هەموومان دەزانین چەندین قات زیاترە, کەواتـە لەپێکهاتـەی زانستیـشدا کـەموکوڕی و هەڵـەی زۆر ڕشت و بەهێنـد لـە ئارادایـە، دەشـێ هەڵـەو چـەوتییەکان لـە دەستنیـشانکردنی زانـست نـەبێت. لەوانەیـە لـە پێـڕەو و شـێوازی بەکارهێنان بێت, بەڵام ئەمە زانست و زاناکان لەژێر باری بەرپرسیارێتی ڕزگار ناکات.

ئێرە شوێنی گفتوگۆکردنێکی قووڵ سەبارەت بەم مەسەلە و تایبەتمەندێتیانە نییە. وەك قەناعەتی خۆم. پێگەی زاناکان و دەزگاکانیان, هەم لە بواری ئەخلاقی هەم بـاوەڕی زۆر لەڕەوشـی وابەسـتەیی راهیبـەکانی پادشاییەتیە سـەرەتاییەکانی میـسرو میزۆپۆتامیـا پاشکەوتووترن و دوور لـەگیانی بەرپرسـیارێتین. پێغەمبـەرەکان و ئایینـەکانی نـەریتی ئیبراهیمـی کەبەرامبـەر

ڕەچەڵەکی پادشایەتی فیرعەون و نەمروود سەریانهەڵدا لە بواری ئاکار و باوەڕیدا ڕۆڵێکی مەزنیان لەگەشەکردنی مرۆڤایەتیدا بینی. ئەم ڕۆڵە لایەنی پۆزەتیفی نەریتی ڕاهیبەکانە. هەرچی ئەوەی ئەم زانایانە ئەنجامیانداوە کەلەژێر فەرمانی دەسەڵاتدان, بەردەوام ئامرازەکانی قرکردن دەخەنە دەست شێتەکانی دەسەڵات و هەرە دواییش بۆمبای ئەتۆمی بەسەر مرۆڤایەتیدا تەقاندەوە, کەواتە هەڵەیەکی سامناك لە پەیوەندی نێوان دەسەڵات ــ زانستدا هەیە. وەك بەرهەمێکی کۆمەڵگا دەتوانین زانست بەبەهادارترین دەسکەوت هەڵسەنگێنین. بەڵام ڕێگاکردنەوەی لەپێش ئەو هەموو کارەساتانە هەرگیز ناتوانرێ ڕوونبکرێتەوە, هەر بۆیە زاناکان بەمشێوەیە پەسندناکەین, تەنانەت لێشیان نابوورین, تاوەکو ڕوونکردنەوەی ئەم ناکۆکییە لە پێشینەیە نەدۆزینەوە. ئەوە ڕەوشێکەو دەرکی پێدەکرێت کەبۆچی پێویستە لێپرسینەوە سەبارەت بە سۆسیۆلۆژی و زانستەکانی دیکە ئەنجام بدەین. تاوەکو سیستەم حیسابی ئەوە نەدات کە لە کوێ گەمەی مەزنی پەیڕەو کردووە و هەڵەی سەرەکیی ئەنجامداوەو ئایینەدەی مرۆڤی خستۆتە ناو قۆناخێك کەپڕ لەنادیاری و لایەنی شاراوەیە, چەندەی دەمانەوێت باهێندە تیۆری و پراکتیکی ڕزگاری, ئازادی و یەکسانی پێشبخەین, لەئەنجامدا لەرەوشی ئاوکێشان بۆ ئاشی سیستەمی زاڵیی کۆمەڵگا ڕزگارمان نابێت.

یەکێك لەبانگەشە گرنگەکانی بەرگرینامەکەم هەوڵی دەستنیشانکردنی ڕۆڵی ئەم ناکۆکییە سەرەکییەیە لەبناخەکانی شارستانیەتی ئەوروپا. تاوەکو ئەم ناکۆکییە ڕۆشننەکرێتەوە ئەوا کەموکورتییە مەترسیدارەکانی دیکەی سیستەم بەناکامی دەستنیشان دەکرێت. سیستەمی ڕۆژئاوا لەهەموو سیستەمەکانی دیکە زیاتر لەخاڵە گرنگ و ژیانییەکاندا خۆی دەشارێتەوە, ئەم سیستەمە لەسەرجەم سیستەمەکانی دیکە زیاتر لە ڕێگای پڕوپاگەندەوە چەواشەکاری هزرو مەعنەویاتی پەرەپێداوە. ئەوە بەرکەنار بکەین کە نوێنەرایەتی ئازادترین چاخ بکات, سەلماندنی وەکو چاخێك کە پێشکەوتووترین کۆیلایەتی تێدا نیشان دەدرێت هێندە ئاستەم نابێت. هەر لەبەر ئەم هۆکارە بەپێویستم زانی کە شێوەکانی کۆمەڵگا بە گوێرەی خۆم لەیەکتر ببەستمەوە. بەقەناعەتی خۆم پەنام بۆ شێوازێکی واتاداری ڕوونکردنەوە بردووە.

مەبەستم لە کۆمەڵگای سروشتی سیستەمی ئەو مرۆڤانەیە کە لەو سەردەمە زەمەنییە درێژخایەنەدا ژیاون کە بە دابڕانی لەجۆری مرۆڤی سەرەتایی (پریمێتەکان) دەستپێکرد و تا دەرکەوتنی کۆمەڵگای پلەداری بەردەوام بوو. ئەم کۆ مرۆڤانە ژمارەکەیان لەنزیکی 20ــ 30 کەس بوون و بەگشتی بە تیرەی سەرەتایی (قلان) بەناو دەکرێت, بەهۆی ئەو ئامرازە بەردینیانەی بەکاریان دەهێنا بەمرۆڤایەتی سەردەمی پالئۆ لیتیك (چاخی بەردینی کۆن) و نیئۆلیتیك (چاخی بەردینی نوێ) بەناو دەکرێت. ئەو بەرهەمە ئامادانەی لەڕێگای کۆکردنەوە و نێچیرکردن لەسروشت دەستیان دەکەوێت خۆراکەکەیان پێکدێنێ, بەواتایەکی تر لەڕێگای بەرهەمە ئامادەکانی سروشت ژیان بەسەردەبەن. ئەمەش گوزەرانێکی هاوشێوەی جۆری ئاژەڵە نزیکەکانە. هەربۆیە باس لە کێشەیەکی کۆمەڵایەتی ناکەین. تیرە (تیرە بەراییە) کە بەردەوام لە لێگەڕیندا دەبێ, کە دۆزییەوە یان کۆی دەکاتەوە یاخود ڕاوی دەکات. چەندە دۆزینەوەی ئاگرو ئامرازەکان پەرە دەسەنێ بەرهەمەکانیش زیاد دەبێت, چەندە بەرهەم زیاد بکات بەو ئەندازەیەش وەك جۆر خێراتر گەشەدەکات و مەوداکەی لەگەڵ پریمیتەکان دەکرێتەوە. ڕێسا سروشتییەکانی پەرەسەندن و گەشەکردن دەستنیشان دەکات.

کێشەیەکی سەبارەت بە کۆمەڵگا پێویستی بەڕوونکردنەوە هەبێت, دەشێ دەرهەق بە هزر و شێوازی گوزارە کردن بێت. لەکامە قۆناخی زهنییەتدا مرۆڤ شێوەی گرت بابەتێکە تائێستاش گرنگی خۆی پاراستووە. وەڵامی پرسیاری وابەستە بەمە گرنگە، ئایا پێویستە گرنگی لەپێشینە بدرێتە زهنییەت،یاخود پێکهاتە و ئامرازەکانی ؟.

ئەم دوالیزمە لەژێر چەمکەکانی فەلسەفەی ئایدیالیزمی و ماتریالیزمی شاراوەیە کە بە درێژایی مێژوو بەردەوام بووە. ئەوەی " کوانتۆم " و" کۆزمۆس" وەك دوا ئاستەکانی زانست پێی گەیشتوون هەڵوێستی زۆر سەیرمان پێشکەش دەکەن. وەك

بوارەکـانی پارچـە بـچووکەکانی ئـەتۆماڵت و فیزیـای شـەپۆلەکان, کوانتـۆم گۆڕەپـانی زۆر جیـاواز تـری کردۆتــەوە. بـە دەستنیشانکردنی وەکو سیستەمی هەسـت و بـژاری ئـازاد گەیـشتووە تادەگاتـە ڕێـساکانی لەساتەوەختێکدا بـوون بـە دوو شـت، هەرگیز بـەهۆی پێکهاتـەی مـرۆڤ نـاتوانرێ نادیـاری بـە تـەواوی تێپـەڕبکرێت. چـەمکی ماددەی بێ گیـان و قـەبا بەتـەواوەتی بەرکـەنارکراوە. بەپێـچەوانەوە گـەردوونێکی ئـازاد و تـادوا ڕادە زینـدوو ڕووبـەڕوومان دەبێتــەوە. لێـرەدا ئـاڵۆزی و لـوغزی ڕاستەقینە لە مرۆڤدایە، بەتایبەتیش لە دۆخی زهنییەت لەئارادایە. باس لەکەوتنە ناو ئایدیالیزم و خودگەراییبووندا ناکـەین. ناکەوینە ناو ئەم گفتوگۆ فەلسەفیانەی زۆر جار باسکراون. بەتـەواوی دەرك بـەوە دەکرێـت کـە سـنوورەکانی کوانتـۆم ڕێگای لەپێش ئەو هەموو هەمەڕەنگییەی گەردوونکردەوە.

ئـیتر لـەولاوەی پارچـە بچوکەکانی ئـەتۆم، ئـەو ڕووداوانـەی لـە قۆنـاخی وردە ــ شـەپۆلەکان ڕوودەدەن, سـەرباری ئـەوەی لەسەرەتا تایبەتمەندێتی " زیندوویی" هەیە, دەبینین کە هەموو جۆرەکانی بوونەوەری پێکهێناوە. کاتێك باسـی هەسـتگەرایی کوانتۆم دەکەین مەبەستمان ئەمەیە. لەڕاستیشدا دەشێ ئەو هەموو هەمەڕەنگییە سروشتییە تەنیا لەڕێگای ژیرییەکی مەزن و بژاری ئازادییەوە فەراهەم ببێ. چۆن دەتوانرێ تائەم ڕادەیـە ڕووەك, گوڵ, بوونـەوەر و ژیـری مـرۆڤ لـەم مـاددە بـێ گیـان و قەبایە بئافرێنرێ ؟ هەرچەندە بگووترێ کە زیندە چالاکییەکەی لەسەر بنەمای گەردەکان پێکهاتووە, تاوەکو ڕوونـەکرێتـەوە کە گەردەکان لە ئەتۆم پێکدێن, ئەتۆمیش لە پارچە وردەکانی ئەتۆم، پارچە وردەکانیش لەسیستەمی شەپۆلە ــ وردەکـان و تـا دەگاتە دوایی، ئەوا بەشێوەیەکی تۆکمە نـاتوانین هەمـەڕەنگی سروشـتی ڕۆشـنبکەینەوە. دەتـوانین هـەمان شـێوازی شـیتەڵکاری سەبارەت بە کۆزمۆسیش ئەنجامبدەین. ئـەو ڕووداوانـەی لـە دوا سـنوورەکانی ــ گەرهـەبێت ــ گـەورەیی گـەردوون ڕوودەدەن, هاوشێوەی ئەو ڕووداوانەیە کەلە گۆڕەپانی کوانتۆم ڕوودەدەن. لێرەدا چـەمکێکی زینـدووی گـەردوون ڕووبـەڕوومان دەبێتـەوە. ئایـا دەشـێ خـودی گـەردوونیش لەمیانـەی هـزر و ماددەکەیـەوە بوونـەوەرێکی زیندوونـەبێ. ئەمـە پرسـیارێکە و تادێـت لـە بوونەوەرزانیدا گفتوگۆی دەرهەق دەکرێت. ئەو مرۆڤەی لـە ناوەڕاسـتی کوانتـۆم و کۆزمـۆس وەسـتاوە, " میکرۆکۆزمـۆس" ی پێـدەڵێن. ئـەو ئەنجامـەی دەرکـەوتووە وەهایـە: گـەر دەخـوازی هـەردوو قۆنـاخ, واتـە ئەگـەر دەخـوازی لـەکوانتۆم و کۆزمـۆس تێبگەی مرۆڤ شیبکەرەوە, لەڕاستیدا مرۆڤ بکەری بابەتیانەی هەموو تێگەیشتنەکانە.

چەندە زانیاریمان هەبێت گشتی بەرهەمی مرۆڤە, لە کوانتۆم تاوەکو دەگاتە کۆزمۆس زانیاری تـەواوی بـوار و گۆڕەپانـەکان لەلایـەن مرۆڤـەوە پێـشخراوە. ئـەوەی لـە بناخـەدا پێویـستە بخرێتـە ژێـر ڕۆشـنایی و لێکۆڵینـەوەوە، قۆنـاخی تێگەیـشتن (دەرکپێکردن)ی مرۆڤە. لەواتایەکدا ئەمە مێژووی 20 ملیـار ساڵەی پەرەسـەندنی گەردوونـە کـەتا ئێـستا تـوانراوە پێـوادنگ بکـرێ. لەڕاستیـشدا مـرۆڤ میکرۆکۆزمۆسـە. چـونکە سیـستەمی کوانتـۆمی تێـدا بەڕێوەدەچێـت, لەپارچـەکانی ئـەتۆماڵت و شـەپۆلەکان تادەگاتـە پێـشکەوتووترین زینـدە چـالاکییەکانی DNA مێـژووی پەرەسـەندنی مـاددە دەبیـنین, جگـە لەمـەش دەتـوانرێ لـە نـزمترین پەرەسـەندنەکانی ڕووەك و ئاژەڵەکانـەوە تـا دەگاتـە مـرۆڤ مێـژووی تـەواوی قۆناخـەکانی گەشـەکردن ببینرێ. لەبواری زانستی زۆر چاك دەبینرێ کـە کۆرپەلـەیی مـرۆڤ تـەواوی قۆناخـەکانی پەرەسـەندنی زینـدەوەرزانی دووبارە دەکاتەوە و گەورە دەبێ, زۆر دواتر کۆمەڵگا, پەرەسەندن تەواو دەکات. لە میانەی پەرەسەندنی کۆمەڵگاوە زانست توانیوویـەتی بەو ئاستەی ئەمڕۆ بگات. هەر بۆیە کە دەڵێن مرۆڤ پوختەیەکی گەردوونە حوکمدانێکی زانستیانەیە.

گەر شرۆڤەکانمان سەبارەت مرۆڤ زیاتر بەرەو پێشەوە ببەین دەتوانین ئەم ئەگەر و شیمانانە مەزەندە بکەین: تەواوی ئـەو ماتریالانە (کەرەستە)ی مرۆڤی لێپێکهاتووە, ئەگەر تایبەتمەندێتییەکانی زیندوویی, هەستکردن و ئازادیی نەبووایە, ئـەوا وەك گوزارەی کۆی تەواوی ئەم تایبەتمەندییانە مرۆڤ زینـدوویی هەسـت و ئازادییەکەی, پـەرەی نەدەسـەند, شـتێك کـەخۆی نـەبێ, شتێکی دیکەی لێ بەرهەم نایێ, ئەم دەستنیشانکردنە چەمکی ماددەی بێ گیان پووچدەکاتەوە, بێگومان ئەگەر ئۆرگانیزاسیۆن

و كۆمەلگەی جۆری مرۆڤ نەبووایە, بوونەوەری(هۆشمەند) خاوەن زانیاری گەشەی نەدەكرد. بەلام گەر تایبەتمەندێتی زانیاری, هەست پێكردن, واتاداری و ئازادیخوازی ئەم ماتریالانە نەبێ كە لە كۆمەلگا و ئۆرگانیزاسیۆنەكان رۆڵ دەبینێ ئەوا زانیاریش بوونی نەدەبوو, شتێك لە ناوەڕۆكدا نەبێ بۆچی بخولقێنرێ ؟ ئەم هەڵسەنگاندنە نە تەواو وەك ڕەنگدانەوەیەكی ساكارانەی سروشتی دەرەوەیە, نەوەك شرۆڤەیەكی وەها واقیعی دەبینێ كە مرۆڤ لە میانەی فیكرێكی هاوشێوەی دەسكارت بووە بەخاوەن زانیاری, بۆچوونی زیاتر نزیكی ڕاستی ئەوەیە كە تایبەتمەندێتییەكانی پێكهاتەی هەردوو قۆناخی كوانتۆم و كۆزمۆس لەمرۆڤیشدا دەژی, هەڵبەتە بەگوێرەی تایبەتبوونی خۆی ئەم یاسایانە بەڕێوە دەچێت. قۆناخەكان لەمرۆڤدا دەدركێنێ و ئاماژەی پێدەكرێت. ئەو ئەنجامەی دەردەكەوێت, تێگەیشتنی تۆكمەی گەردوون بەتێگەیشتنی تۆكمەی مرۆڤ تێپەڕ دەبێت. دادوەری بەناوبانگی فەلسەفە" خۆت بناسە"  ئەم ڕاستییە دێنێتە زمان. زانین یاخود ناسینی خۆت بناخەی تەواوی زانینەكانی دیكەیە. بەبێ ناسینی خۆت  تەواوی زانیارییەكانی دیكە كەبەدەستی دێنی لەلادانێك بەولاوە زیاتر تێپەڕ ناكات. هەربۆیە بەبێ ناسینی خود تەواوی ئەو دەزگاو هەڵسوكەوتانەی لە كۆمەلگای مرۆڤدا سەریهەڵداوە ناتوانێ لەبینینی ڕۆڵێكی لادەر و چەواشەكارانە ڕزگاری ببێت, ئەو زانیاریانەی پشت بە زانیاری خودی مرۆڤەوە نابەستێ, كارەكتەری چەوسانەوە, خوێناوی, ناكۆك و نائاسایی تەواوی ئەو سیستەمانەی كۆمەلگا كە ڕێگای لەپێش دەكاتەوە, سەرچاوەكەی بۆ ئەم زانیارییە شلۆقە دەگەڕێتەوە. لە دۆخێكی وەهادا كاتێك دەڵێین بۆ قۆناخی گەشەكردنێكی سروشتییانەی پەسەندكراوی كۆمەلگای مرۆڤ پێویستە سەرچاوەی خۆی لە زانیارییە تایبەتەكانی خودی خۆیەوە وەربگرێت, كەواتە باس لە سەرەكیترین ڕێسای گەردوونی و كۆمەلگا دەكەین.

لەسەر بنەمای ئەو ئەگەرانە دەتوانرێ چی لەبارەی پێكهاتەی گەوهەری زانیاری مرۆڤی كۆمەلگای سروشتی بگوترێت؟ بەلانی كەم مرۆڤی كۆمەلگای سروشتی بەیەكەوە لەگەڵ ئەندامەكانی تیرە سەرەتاییەكەی (قلان) بەشێوەیەك گرێدراوی ڕێسای ژیانن كەبەبێ ئەو نابێت. ئەندامێكی تیرە ژیانێكی جیاواز و جیاكارتری لەگەڵ ئەندامانی دیكە نابێت, بیر لەژیانێكی دەرەوەی تیرە ناكاتەوە، دەتوانێ نێچیروانی بكات, تەنانەت دەتوانێ (هۆڤێتی) مرۆڤخۆریش بكات. بەلام ئەمانە هەمووی لەپێناو گوزەرانی تیرەیە, ڕێسای ژیان لەناو تیرەی سەرەتایی بەشێوەی " یان هەموو یان هیچ " تەواوی پێدراوە كۆمەلایەتیەكان جەخت لەسەر ئەم تایبەتمەندێتییەی تیرە بەراییەكان دەكەنەوە. تیرەی سەرەتایی كۆی مرۆڤەكان و خودی كەسایەتییە.  تاكەكان بەجیا لەوە ناتوانن بیر لەكەسایەتی و حوكمێكی تازە بكەنەوە, گرنگیی تیرە بەراییەكان لە یەكەمین و سەرەكیترین شێوازی بوونی مرۆڤ شاراوەیە.  شێوەیەكی كۆمەلگای بێ جیاكاری, بێ چین و بێ پلەدارییە و ئاشنای چەوسانەوە نییە,  بەملیۆنان ساڵ بەردەوام بووە. ئەو ئەنجامەی لێدەردەكەوێت : وەك كۆمەلگا پەرەسەندنی جۆری مرۆڤ  بۆ ماوەیەكی درێژخایەن لەجیاتی پەیوەندییەكانی بالادەستی پشت بە پرەنسیپی هاوكاری دەبەستێ. وەك " دایكێك" كە سروشتی لەباوەشی خۆیدا گەورە كردووە لەبیری خۆیدا بەجێی دەكات, یەكبوون لەنێوان خۆیان و لەگەڵ سروشت بە بنچینە دادەنرێت. تەوتەم ڕەمزی هۆشیاری تیرەی سەرەتایی (قلان)ە. لەوانەیە تەوتەم یەكەمین ڕێسای بەبیرۆكەكردنی واتایی (داتاشراوی ــ مجرد) بێت. ئەو ڕێسایەی وەك ئایینی تەوتەمیش هەڵدەسەنگێنرێ یەكەمین پیرۆزی و سیستەمی تابۆش پێكدێنێ. تیرە لەبەهای سمبۆلی تەوتەمدا خۆی پیرۆز دەكات. لەم ڕێگایەوە بەیەكەم زاراوەی ئەخلاق دەگەن. زۆر باش لەو هۆشیارییەدان كە كۆی تیرە سەرەتاییەكان نەبێت ژیان بەردەوام نابێت. لەدۆخێكی وەهادا بوونەوەرە كۆمەلایەتییەكان پیرۆزن, وەك شكۆدارترین بەها دەكرێن بەسەمبۆل و دەپەرسترێن. هێزی باوەڕی ئایینیش لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. ئایین دەبێتە یەكەمین فۆڕمی (بچمی) هۆشیاری كۆمەلگا. لەگەڵ ئەخلاق  یەكپارچەیە. هەنگا و بەهەنگاو لەهۆشیارییەوە بۆ باوەڕیەكی وشك دەگۆڕێ. ئیتر هۆشیاری كۆمەلگا بەشێوەی پەرەپێدانی فۆڕمی ئایین دەبێت, ئایین بەم تایبەتمەندێتییەوە سەرچاوەی یەكەمین بیری

سـەرەکی کۆمـەڵگا و نەریتـە ڕیـشەدار و ئەخلاقییەکەیـەتی, کۆمـەڵگای تـیرەی بـەرایی چـەندە لـەڕێگای پراکتیکەکەیـەوە هۆشـیارییەکەی گەشـەبکات, بـەردەوام ئەمـە بەتەوتـەم واتـە بەتوانـستەکانی خۆیـەوە دەبەسـتێتەوە. هەرچـی سـەبارەت بـە ڕاسـتینەی تەوتەمــە کـەوەك سـەمبۆلێکە، چـەندەی دەچـێ ڕەوشـی سـەرکەوتووی کۆمەڵـەی (کـۆی) مرۆڤـەکان، بـەردەوام پیرۆزکردنیش لەگەڵ خۆی دێنێ. پیرۆز دەبێتە هێزی شتە پیرۆزەکە, هەرچی پیرۆزییە دەبێتە هێزی کۆمەڵگا.

پیرۆزیـی ئـەو هێـزەی لەگـەڵ کۆمـەڵگا پێکهاتووە بەشـێوەیەکی ئاشـکراتر خـۆی لـە سـیحربازیدا نیـشاندەدات. سـیحربازی تاقیکردنەوەی بەهێز بوونی کۆمەڵگایە. چونکە ئاستی هۆشیاری کە لەئارادایە تەنیا بە شێوەی سیحربازی پراکتیـزە دەکرێت. سیحربازی دایکی زانستیشە. ژن زانا و بیریاری ئەم شێوازەی کۆمەڵگایە کە بەردەوام چاودێری سروشت دەکات, لە ڕێیەوە ژیـان دەدۆزێتـەوە, لـەدایکبوون (زاوزێ) دەناسـێ. ژمـارەی زۆری سـیحربازە ژنـەکان گوزارشـتی ئـەم ڕاسـتییەیە. وەك پێویـستییەکی ژیانی کرداری ژن زۆر بەباشی ئاگاداری ئـەو ڕووداوانەیـە کەلـەناو کۆمـەڵگای سروشـتیدا ڕوودەدەن. لەتـەواوی ئـەو پەیکـەر و ئامرازانەی لەم قۆناخەدا بۆمان ماوەتەوە شۆێنپەنجەی ژن دەبینرێ. قلان (تیرەی بەرایی)یەکێتیەکە لەچواردەوری ژن ـ دایك پێکهاتووە. منـداڵبوون و بـەخێوکردنی ناچاری ڕەوشـی باشـترین کۆکـەرەوەی بەرهـەم و دایـانێتی دەکـات. منـداڵ تـەنیا دایـك دەناسـێ. هێشتا پیاو هیچ کاریگەرییەکی لەجۆری موڵکایەتی لەسەر ژن نییە. هەروەکو چۆن نـەدەزانرا ژن لەکامـە پیـاو بـووە بە دووگیان, بەڵام دەزانـرا کـە منداڵـەکان لەکامـە ژنـن. ئـەم ناچارییە سروشـتییە هێزێکـی کۆمـەڵگای پـشت ئەسـتوور بـە ژن فەراهەم دەکات. لەخۆوەگرتنی کارەکتەری مێیینـەیی زۆربەی بابەتـەکانی لـەم قۆناخـە بـەناو کـراون, بەڵگەیـەکی دیکـەی ئـەم ڕاسـتییەیە. جـەنگاوەری و کاریگـەری زاڵبـوونی پیـاویش کـە زۆر دواتـر پێـشدەکەوێت, لەتایبەتمەنـدێتی ڕاوکردنـی ئاژەڵـە بەهێزەکانی ئەم قۆناخە سەرچاوە دەگرێت. تایبەتمەندێتییـە جەسـتەییەکان (فسیۆلۆژییەکان)ی پیـاو زیـاتر ناچـاری ئـەوەی دەکات لەشوێنە دوورەکان لەنێچیر بگەڕێت, تیرە لە هەڕەشەو مەترسییەکان بپارێزێت. ئـەم ڕۆڵانـەی کـە پێگـەی دیـاریکراو و یەکلایکەرەوەی نەبوو, ئەوەش ڕووندەکاتەوە کە بۆچی پیاو بەداخوراوی ماوەتـەوەو بێکاریگـەربووە, پەیوەنـدی تایبـەت لـەناو تیرەپێشنەکەوتووە, ئەوەی لەڕێگەی کۆکردنەوەو ڕاوکردن دەستدەکەوێت هـی هەمووانـە. منداڵـەکان مـوڵکی سـەرجەم تیرەیـە. نـەپیاو نـەژن هێـشتا نـەکراوە بـەموڵکی تایبـەت, بـەناوکردنی ئـەم شـێوازەی کۆمـەڵگا بەکۆمۆنـەی سـەرەتایی بـەهۆی ئـەم تایبەتمەندێتی یە سەرەکیانەیەتی.

وەك ئەنجام فۆرم و بچمی (قلان) تیرەی سەرەتایی: زەمینەی لەدایکبوونی کۆمەڵگا و یەکـەمین زاکیرەوپێشکەوتنی بابەتـە سەرەکیەکانی هۆشیاری و بـاوەڕی یـە. ئـەوەی وەك ئاسـەوار لـەدوای ماوەتـەوە ئـەو ڕاستیەیە کەکۆمەڵگایـەکی تەندروست و تۆکمە دەبێ بەژینگـەی سروشـتی و هێـزی ژن پـشت ئەسـتوور بـێ : شـێوازی بـوون ودەرکـەوتنی مـرۆڤ لەمیانـەی هاوکاریـەکی بەهێزی بێ فشارو چەوسانەوە بەدیهات. لەواتایەکدا مرۆڤایەتی ئاوێتەو پێکهاتەی ئـەم بـەها بنچینەییانەیە, مەزنـدەکردنی لەناوچوون و ونبوونی ئەم ئەزموونە کۆمەڵایەتییە ملێۆنـان سـاڵی خایانـدووە بەهەڵەداچوون و ناماقوڵیـەوە. هـەروەکو چـۆن هیچ شتێ لەسروشت لەناو ناچێت، ئەم مەیلە زیاتر بەشێوازی بوونی کۆمەڵایەتی بەردەوامی بەهەبوونی هێزی خۆی دەدات.

تایبەتمەندێتیـەکی گـرنگ کەزانـست دەستنیـشانیکردووە ئەوڕاسـتیانەیە کـەدەڵێ: پێـشکەوتنێکی دواتـر بێتـە ئـاراوە پەرەسەندنی پێش خۆی لەخۆوە دەگرێت. ئەمـە ڕاسـت نییـە کـەدەڵێن دژەکـان یـەکتری لـەناو دەبـەن و وەها پـەرە دەسـێنن. ئەوەی لەم ڕێسایەی دیالێکتیکدا ڕوودەدات، ئەوەیە تێز (بیرۆکـە) و دژە تێـز(دژە بیرۆکـە) لـەناو پێکهاتەیـەکی دەوڵەمەنـدتری سەنتێز(کۆتێز) درێژە بەهەبوونی خۆیان دەدەن.

پەرەسەندنی بەهاکانی قلان لەناو کۆتێزە نوێکانیشدا بەردەوام دەبێت. گەر لەڕۆژگاری ئەمڕۆشمانـدا بابەتـەکانی یەکسانی و ئازادی هێشتا لەنرخ و بەهای مەسەلە سەرەکیەکاندان ئەوا بۆ ئەمە قەرزاری ڕاستینەی ژیانی تـیرە سـەرەتاییەکانین. تـاوەکو

یەكسانی و ئازادی لەرەوشێكی هۆشیاری و هۆشمەندیدا نەكرێن بەبابەتگەرایی، ئەوا بەدۆخی سروشتی خۆی لەناو شێوازی ژیانی تیرە بەراییەكان شاراوەیە. كاتێ یەكسانی و ئازادی لەدەست بدرێت ئەو بیرۆكانەی بەنهێنی لەبیری كۆمەڵگادا دەژین لەگەڵ بەسەرچوونی كات بەخێراییەكی زیاتر خۆیان دەپەیڤن و سەرلەنوێ و لەئاستێكی بەرزدا وەك پرەنسیپە سەرەكیەكانی كۆمەڵگایەكی پێشكەوتوو خۆیان دەسەپێنن, چەندە كۆمەڵگا پەرەسەندنێكی راست نیشانی دەوڵەت و سیستەمی پلەداری بدات، ئەوا ئازادی و یەكسانی بەشێوەیەكی بێ ئامان ئەم دەزگایانە چاودێری دەكات. ئەوەی لەبنچینە (گەوهەر) دا كاری چاودێری ئەنجام دەدات خودی كۆمەڵگای (قلان) تیرەی سەرەتاییە.

ب ـ كۆمەڵگای پلەداری دەوڵەتگەرایی

**ـ لەدایك بوونی كۆمەڵگای كۆیلایەتی**

بەگوێرەی ئەو پێوانانەی دابەشكردنی زەمەنی كۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەبنەما دەگرێت, دەكرێ بە چەندین شێوەی جیاواز ئەنجامبدرێن. گەر فۆرمە سەرەكییەكانی هزر بەبنەما دابنرێ, ئەوا سەردەمەكانی میتۆلۆژیای قەبا, میتافیزیا, چاخی زانستی پۆزەتیف دابەشكردنێكی گرنگ و بایەخدارە. هەروەها پێوانەكانی چینایەتیش بە بنەما دابنرێت, ئەوا لە مێژە دابەشكردنی لەشێوەی كۆمۆنەی سەرەتایی, كۆیلەداری, دەرەبەگایەتی, سەرمایەداری و سۆسیالیزم ئەنجامدراوە, جیاكردنەوە و دابەشكردنیش لەسەر بنەمای مەدەنییەتەكان (شارستانییەتەكان) لەمێژوودا پەیڕەوكراوە. بەڵام ئەو پێودانگەی لە دابەشكردنی قۆناخەكاندا من گونجاوی دەبینیم ئەو ناوەڕۆكەیە كە بەهای فەلسەفی ـ زانستی قورس و لەپێشە, پرەنسیپی هەڵسووڕانی چەرخی گشتی گەردوون بەبنەما دەگرێت. پەیڕەوكردنی سێكوچكەی تێزو دژەتێزو كۆتێز (سەنتێز)ی هیگل كە بەردەوام بەكاریهێناوە و كردوویەتی بە فەلسەفەی سەرەكی خۆی, زیاتر قۆناخەكان ئاشكرا دەكات و ڕۆشنیان دەكاتەوە, تەواوی پێكهاتەكانی گەردوون لەمیانەی بونیادێكی ناكۆك و ناوەڕۆكێكی دوالیزمی(دوولایەنە) جووڵە دەستەبەردەكات. هەڵبەتە ئەم جموجۆڵە جووڵەیەكی میكانیكی قەبا نییە, بەڵكو دۆخی جولانەوەیەكی ئافرێنەرە و لە ناوەڕۆكدا گۆڕان و هەمەڕەنگی بەدەستدێنێ. بۆ نموونە دەشێ گەردوون بە دوالیزمی هەبوون ـ نەبوون دەستپێكردبێت. ڕووبەڕووبوونەوەی یەكتری هەبوون و نەبوون پێكهاتەیەكی نوێیە،خودی جوڵەیە. تاوەكو نەبوون هەبوونی نەبێت, بوون ناكرێتەوە, ناكەوێتە جووڵەوە. لە ناوەڕۆكدا هەبوون, بەرخودانی بوونە بەرامبەر بە نەبوون. لەكاتێكدا هەبوون هەوڵی لەناوبردنی نەبوون دەدات, یاخود بەپێچەوانەوە كاتێك نەبوون هەوڵی لەناوبردنی هەبوون دەدات, مەیلی سێیەم، گەردوون دێتە ئاراوە كەوەك كۆتیز و پێكهاتەیەكە. هەڵوێستێكی هاوشێوەی ئەمەش دوالیزمی پارچەوردەكان ـ شەپۆلە. لەگەڵ ئەوەی پارچەی ورد یاخود شەپۆل بەتەنیا نابێ. ئەوا تەنیا لەدۆخی پەیوەندیدار بوون بەیەكتری دەتوانن جموجۆڵ بكەن و پێكهاتەكە بكەن بە كۆتێز(سەنتێز).

دیسان دوالیزمی (دوولایەنی) هاوشێوە بوون ـ هەمەڕەنگی ئەنجامی هاوشێوە دەخولقێنێ. هاوشێوەبوون تەنیا لەڕێگای هەمەڕەنگییەوە دەتوانێ هەبوونی خۆی بسەلمێنێ. گەر هەمەڕەنگی نەبێت هاوشێوەبوونیش جۆرێك لە هیچ و نەبوونە. نزیكی كام دیاردە بینەوە هەمان ڕەوش دەبینین. جیاوازییەكی دیكەی دەركی پێدەكرێت دوالیزمی ڕەوشی زیندوویی ـ بێ گیانی (گیانلەبەری ـ بێ گیان)یە. جیاواز لە گەردوونی زیندووی گشتی, لە ئاكامی گەشەكردنی جووڵەی دەوڵەمەندی هەسارەكەمان زەمینەیەكی زیندوو لەدایك دەبێ كە لە سنوورێكی جیاوازی چەندایەتی و زەمینەی ماددە لەمیانەی زیندە چالاكی خۆیەوە خۆی دەئافرێنێ, لێرەدا ڕاستینەی سنوور نەناسی پەرەسەندنی گەردوون تاكو ئێستاش نوێنەرایەتی پێهەلگرتنێك دەكات كە لەلایەن زانستەوە شینەكراوەتەوە, چەندەی دەچێ ڕۆشنكردنەوەی تەواوی دیاردەی زیندوویی دەبێتە سەرەكیترین بابەتی زانست. نەخشەی جینی و كلۆنكردن (كۆپیكردنی بوونەوەر) بەواتای شیكردنەوە و چارەسەركردنی ئەم دیاردە نایەت. دیسان ڕێكخستنەوەی گەردەكانیش كەڕێگای لەپێش زیندوویی كردەوە بەتەنیا ناتوانێ دیاردەكە ڕوون و ئاشكرا

بێت, بێگومان بۆ زیندووگەرایی ناوەند و کەشێکی (ئاتمۆسفەر و هیدرۆسفەر) گونجاو و سیستەمی گەردەکان پێویستە. بەڵام ئەمە تەنیا بەردەکانی بونیادی زیندووگەراییە, سیستەمی ماددی (بابەتی)یەتی. ئەوەی گرنگترە پەیوەندی ئەم سیستەمە ماددییەیە لەگەڵ ئەو راستینانەی زیندوو و واتایین و ماددی نین، گرنگترین و زەقترین هەڵەی ماتریالیزمی قەبا وەکو یەکتر بینینی دیاردەیی واتاو زیندوویی بوو لەگەڵ رێکخستنی سیستەمی ماددی. تەنانەت لە تیۆری فیزیای کوانتۆمیشدا ئەم لێکچووانەش دەڕووخێنرێ. شێوازێکی روونکردنەوە دەسەپێنرێ کەلەهەست دەچێ. لەناو بوونەوەرە زیندووەکاندا دۆخی ژیری مرۆڤ (مێشك) رەوشێکی زۆر سەیرتر وەردەگرێت، دەتوانرێ خودی مرۆڤ وەك پێگەیشتووترین سروشت پێناسە بکرێت کە بیر لەخۆی دەکاتەوە, ئەوەی زۆر گرنگترە, بۆچی سروشت پێویستی ئەوە دەبینێ بیر لەخۆی بکاتەوە؟ سەرچاوەی ڕاستەقینەی توانستی بیرکردنەوەی مادده تاوەکو کوێ درێژدەبێتەوە؟ کاتێ ئەم پرسیارانە دەوروژێنین مەبەستمان خولقاندنی گرفتی گەڕان بەدوای خوداوەندێکی نوێ نییە. دیاردەکانی گەردوون, هەبوون و سروشتی پێدە گووترێت, وەك ئەو بابەتانەی لەمیانەی دیدگا گشتی و قەبەکانمان ڕۆشن ناکرێنەوە, لەسەرووی ئەوانەوە پێویستییان بە شیکردنەوە هەیە. ڕوو بەڕووی چەمکێکی جیهانبینی (پارادیگما)ی وەهای گەردوونین کە زۆر دەوڵەمەندە, خولقێنەرە, هەمەڕەنگە و لەپێشکەوتندا سنوور نەناسە. چەمکی گەردوونی قۆناخە جیاوازەکانی مرۆڤایەتی, بۆنموونە پارادیگماکانی(جیهانبینی) میتۆلۆژیا, میتافیزیك و زانستی پۆزەتیف, تێگەیشتن و هەڵسوکەوتی زۆر جیاوازی ژیان ڕووبەڕوومان دەکەنەوە. لە میتۆلۆژیا هەموو شتێك خوداوەندێکی تایبەتی هەیە, لە میتافیزیکیاش یەکەمین هۆکارەکانی جووڵە یاخود ڕوانگەی خودا زاڵە: لە زانستی پۆزەتیفیشدا هەوڵدەدرێ هەموو شتێك لەڕێگای ماتریالیزمی وشك (ڕەها) ڕوونبکرێتەوە. فەلسەفەی پەرەسەندن لەسەر هێڵی ڕاست و هۆکارێتی توخمی بەرتەسك پێشدەخرێت. هەڵبەتە ئەگەر هەڵوێستەکانی جیهانی ئاژەڵەکانی ژێرتر بزانرێ, زۆر سەیر دەبێ. تۆ بڵێی خشۆکەکان, باڵندە و شیردەرەکان بەچ هەستێك تەماشای دەوروبەریان و دەرەوە بکەن ؟ هەر وەکو پەندە گەلەرییەکە دەڵێ " هەروەکو چۆن گا تەماشای شەمەندەفەر دەکات " بەڕاستی لێکچواندنێکی سەیرە, تۆ بڵێی تێڕوانینی بەرد و وردیلەکانی قوم, چۆن بێت ؟ ئەوانیش ڕاوەستەیەکیان هەیە. وەکو یەکپارچەیی گەردوون و سروشت هەڵوەستەیەکە. تەنانەت هەڵوەستەیەکە لەدۆخی جووڵەیەکی بەردەوامدایە.

ئەم ڕوونکردنەوانەی سەبارەت بە بابەتگەرایی ئەنجامی دەدەم لەم پێناوەیە, چونکە هەبوون و ڕەوشی مرۆڤایەتیش دیاردەیەکە. گەر بەشێوەیەکی گشتی داتاشراوی ـ واتایی پێشبخەین, ئەوا دەبینین کەلەسەرەتاوە تاوەکو دوایی وەك دیاردەیەك بەردەوامی بە هەبوونی خۆی دەدات. ئەو پرسیارە گرنگەی ڕووبەڕوومان دەبێتەوە ئەوەیە, کە تێز و دژە تێز و کۆتێزی ئەم دیاردەیە ئاوا بکەین. گەر مرۆڤ و کۆمەڵگا وەکو ئەو هەبوونانە پێناسە بکەین کەهێزی واتایان زۆر بەرزە, ئەمە بەو مانایە دێت کە دوالیزمی سەرەکی ئەم دیاردەیە و کۆتێزی کۆتایی دەستنیشان دەکرێت و گەیشتن بە زانستییانەترین بابەتگەرایی دێت, مادام مرۆڤین, هێندە لەگەڵ مرۆڤ پەیوەندیدارین و پێیەوە خەریکین, لە دۆخێکی وەهادا دیالەکتیکی (دیالەکتیك = گفتوگۆی دوالیزم) سەرەکی ئەم بوونەوەرە بەکام ئاقاردا دەچێ, بەئاراستەی کامە کۆتێزی شیمانە بۆکراو بەرەو پێش دەچێ یاخود وەردەچەرخێ؟ پێویستە وەك سەرەتایەك و هەنگاوێکی لە پێشینە زانستە کۆمەڵایەتییەکان ئەم بیرۆکەو بابەتگەراییە شیبکاتەوەو ئەنجامی بدات. هەڵوەستەی مرۆڤ کەلەناو پێکهاتەی گشتیی گەردووندا سەیرترین بوونەوەرە, تاوەکو ئەم شیکردنەوە سەرەکییانە سەبارەت بە بابەتی ڕامانەکان نەکرێت بە زانستێکی ڕاستی کۆمەڵایەتی ناگات. لەم دۆخەدا ئەوەی ئەنجام دەدرێت خنکاندنە لەناو جیهانی دیاردە بێ سنوورەکان. ئەمەش یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی ئەو ئاڵۆزییەی ناو کۆمەڵناسییە.

ئەو رامان و ئەگەر و تیۆریانەی سەبارەت بە دیاردەی کۆمەڵایەتی, هەر لەچاخەکانی میتۆلۆژیاوە دەستییپێکرد, لە میانەی ئایینە تاکخوداییەکان و فەلسەفەی میتافیزیك ئاڵۆزتر بوو, لەڕێگای زانستی پۆزەتیفیشەوە گرێکوێرەی لێبەسترا, ئەمەش نەك تەنیا بۆ ڕوونکردنەوەی ڕووداوەکان تێرناکەن و بە ناتەواوی دەمێننەوە, بەڵکو بەهەڵەی گەورەش پڕ کراونەتەوە, ئەم ڕوونکردنەوانەوەی سەبارەت بە دیاردەی کۆمەڵایەتی پێشخراوە کاریگەرییەکی یەکلاکەرەوەی لەوەدا هەبوو قۆناخێکی چەوسانەوەو خوێناوی سەرمایەداری باڵی بەسەر مرۆڤایەتیدا بکێشێ, گەر مرۆڤایەتی بەشێوەیەکی راست کۆمەڵگابوون شیتەڵ نەکات کە بچمی هەبوونی خۆیەتی, ئاشکرایە کۆتاییەکەی دیناسۆرێتییە (بەدایناسۆربوونە). لەدوای هەردوو شەڕی جیهانی سەرباری ئەوەی لێگەڕینێکی نووژەنی لای زاناکان لە ئارادابوو, بەڵام ئەمانە هەوڵێکی لاواز بوون و لە دەستنیشانکردنی هەندێ راستی سنووردار تێپەڕیان نەکرد. تەنانەت قوتابخانە نموونەییەکانی لە شێوەی مارکسیزمیش لەپاڵ ڕۆڵە سنووردارەکانیان بۆ چارەسەری, بەتایبەتی جیهانی چەوساوەو سەرکوتکراوەکان کە لەژێر ناویان دەجووڵایەوە, بەچەمکێکی نوێی سیاسەت و دۆگما گرێدراو لەکردنی بە یەدەگی سیستەمی دەسەڵاتداری کۆمەڵگا بەولاتر ڕۆڵێکی دیکەی نەبینی, ڕاستتر ئەوەیە کە بانگەشەو پراکتیزەکردنی نموونەیی بوونی خۆی سەرکەوتوو نەبوو.

بەدەستنەهێنانی سەرکەوتنی زیاتری چەندین قوتابخانەی زانستە کۆمەڵایەتییەکان بەرامبەر بە گروپی ئایینی و فەلسەفییەکانی چاخەکانی یەکەم و ناوین, لە ڕۆڵیان بەرامبەر ڕووداوەکان زۆر باش دەرکی پێدەکرێت. کۆمەڵناسی و دەزگاکانی ڕۆڵ و بەرپرسیارێتییەکی لەپێشینەیان هەیە لە گەیشتنی شەڕەکان بۆ ئاستی جینۆساید, چاوچنۆکییە بەربڵاوەکانی قازانج و تێکدانی سروشت و پیسکردنی ژینگە. کۆمەڵناسی (سۆسیۆلۆژیا) و دەزگاکانی بەشێوەیەك لە خزمەتی دەسەڵاتی سیاسی و شەڕەکاندا بوون کە لەگەڵ هیچ قۆناخێکی مێژوودا بەراورد ناکرێت, هەر بۆیە بەرپرسیاری سەرەکییە. ڕانەگرتنی شەڕەکان و دەسەڵاتی سیاسی, بەرپەرچنەدانەوەی چاوچنۆکی قازانجی بێسنوور, نەك تەنیا ئیفلاسکردنی کۆمەڵناسی و دەزگاکانی, بەڵکو خیانەتەکەی بەرامبەر بە مرۆڤایەتی دەسەلمێنێ. هەر بۆیە پێویستە بەرامبەر گرفتە سەرەکییەکانی مرۆڤایەتی چەمك و پێکهاتەیەکی نوێ و تێری کۆمەڵناسی وەك خەباتێکی بەها دار و پێشەنگ جێگای خۆی لە ڕۆژەڤدا بگرێت. تەنیا بەم شێوەیە دەشێ چالاکی و ڕێکخستنی شوێن و گۆڕەپانی ڕاست بدۆزینەوە.

پێویستە لەم چوارچێوەیەدا هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو چەمکەی کۆمەڵناسی بکرێت کە دەخوازین پێشیخەین. دەبێ بەگوێرەی ئەم ڕاستەڕێیە و ئەگەرە شیمانە بۆکراوەکان لەچوارچێوەی تاقیکردنەوە ببینرێ. ئەم هەوڵانەی چەندە دەچێ زیاد دەبن, دەشێ لەمیانەی بە دەزگابوون تواناکارییەکانی چارەسەری زیاد بکات. پێویستە لەسەر ئەم بنەمایە نزیکی تاقیکردنەوەی هەرەگشتی سەبارەت پێشخستنی بابەتگەرایی ببینەوە.

لەبەشەکەی پێشتردا هەوڵمدا ڕوونیبکەمەوە کە لەدۆخی یەکەمی چڤاتی مرۆڤایەتی لەچوارچێوەی کامە پێناسە دەتوانین بڵێین " کۆمەڵگای سروشتی ". هەروەها چەمکی نزیکبوونەوەکانی خۆمانم سەبارەت بەگەردوون خستەڕوو. بەپێی زەمەن و شوێن بڵاوبوونەوەی شێوازە ڕێکخستنییە کۆمەڵایەتییەکانی تیرە سەرەتاییەکان (قڵان) هەروەها هەنگاو بە هەنگاو بوونی بەخاوەن قەبارەو هەمەڕەنگی پێویستییەکی سروشتەکەیەتی. لەو پێدراوانەی لەبەر دەستدان دەستنیشان دەکرێت کە لەئاستی پیاوان ناڕەحەتییەك بەرامبەر ئەو کۆمەڵەیە پێشکەوتووە کە لەدەوروبەری ژن ـ دایك گەورە بووە و ناسنامەی خۆی تۆکمە کردووە. ئەو منداڵ و پیاوانەی لەدەوروبەری ژن کۆبووبوونەوە, بەتایبەتیش ئەو پیاوانەی بەمەبەستی یارمەتیدانیان هۆگریان بوون, دەبووە هۆی ئیرەیی و تووڕەبوونی پیاوانی دیکە.

گرنگتر ئەوەیە ژن ـ دایك سیستەمی ماڵیکردن پێشدەخات. خواردن و جلوبەرگ و پێداویستییەکانی دیکە لەسیستەمی ماڵیکردن کۆدەکرێتەوە. لە ڕێگای تێڕوانینەکانیان دەبن بە ژنی سیحرباز و زانا. چەندە ژمارەیەکی زۆری منداڵ و پیاوی

دۆست (نزیك) بەم سیستەمە ببەستێتەوە, بەو ڕادەیە ژن ـ دایکێکی بەهێزە. کولتوورێکی ژن لەگەشەکردن دایە کە ناتوانرێ جڵەو بکرێ. بەڵگەکانی لەبەردەستدان, سیستەمی بەربڵاوی ئاینی خواوەندە ژن, توخمە مێینەکانی زمان و پەیکەرەکان نیشانەی ئاشکرای بەرزبوونەوەی هێزی ژنە. بەشێکی گرنگی پیاوان بەشێوەیەکی سروشتی دووری ئەم سیستەمەن. ئەوانەی ژن ــ دایك بەسوودمەندیان نابینێ, بەتایبەتیش بەساڵاچووەکان لە دەرەوەی ئەم سیستەمە دەمێننەوە. ئەم ناکۆکییەی کەلەسەرەتا زۆر لاواز بوو چەندەی دەهات پەرە یدەسەند. پێشکەوتنی نێچیروانی شانبەشانی دەرخستنەپێشی هێزی جەنگاوەری پیاو زانیارییەکانیشی زیاد دەکات.

لەسەر ئەم بنەمایە پیاوە یەختیارە (تەمەندارە) بەرکەنار کراوەکان بەرەو ئایدۆلۆژیایەکی باڵادەستی هەنگاو دەهاوێژن و پەرەدەسەنن. بەتایبەتیش ئایینی " شامانیزم " بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش ئەم دیاردەیەمان نیشاندەدات. شامانەکان زیاتر نوێنەرایەتی نموونە سەرەتاییەکانی راهیبێتی دەکەن. بەشێوەیەکی زۆر سیستەماتیك بەرامبەر ژنان دەکەونە جوڵەو دەخوازن سیستەمی ماڵ پێشبخەن. بەرامبەر سیستەمی ماڵداری کەپێشتر ژن ــ دایك پێشیخستبوو لەمیانەی ئەو مۆڵگە ساکارانەی بەشێوەی نیو دڕندەپەنای بۆدەبەن پیاو دەتوانێ لەڕێگای شامانیزمەوە سیستەمێکی ماڵ پێکبهێنێ. ڕێککەوتنی پیاوە یەختیارە خاوەن ئەزموونەکان لەگەڵ شامانەکان، گۆڕانکارییەکی زۆر گرنگە لەمیانەی ئەو فشارە ئایدیۆلۆژییەی دەیخەنە سەر ئەو کوڕە گەنجانەی لەگەڵیاندان و چەندە دەچێ ڕێگەیان لەناو کۆمرۆڤەکان بەهێزتر دەبێت. ئیتر ناوەڕۆکی بەهێزبوونی پیاوان دەبێتە جێی گرنگی و بایەخپێدان.پاراستنی تیرە(قلان) لەبەرامبەر دەرەوەو تەنانەت بۆ نێچیروانیش ناوەڕۆکێکی سەربازی هەیەو پشت بەکوشتن و بریندارکردن دەبەستێت. ئەمەش سەرەتای دەستپێکردنی کولتووری شەڕە. کاتی مان ــ نەمان جێگای باس بێت،پێویستی وابەستەبوون بەدەسەڵات وپلەداری لەگەڵ خۆی دێنێ. بەتواناترین کەس، قسەو دەسەڵاتەکەی دەیگەیەنێتەپێگەی پایەدارترین کەس. دەستپێکردنی کلتورێکی جیاوازجێگای باسە کەبەرامبەر کولتوری ژن ــ دایك بالابوونی پێشخستووە. ئەم گۆڕانکارییەی پلەداری و دەسەڵات کەپێش کۆمەڵگای چینایەتی ڕوویدا یەکێك لەخاڵە هەرەگرنگەکانی وەرچەرخانی مێژوویی پێکدێنێ. لەبواری ناوەڕۆك لەکولتووری ژن ـ دایك جیاوازترە، لەم کولتوورە سەرەتا شێوازی کۆکردنەوەی بەرهەم, دواتریش بەرهەمهێنانی دانەوێڵە پەیرەو دەکرێت, ئەمانەش چالاکی ئاشتیانەن وپێویستییان بەشەڕ نییە. هەرچی چالاکی نێچیروانی پیاوانە پێویستی بەکولتووری شەڕە و پشت بەدەسەڵاتێکی توند دەبەستێ. ئەنجام ڕیشە داکوتانی دەستڕۆیی باوکسالارییە.

لەکۆمەڵگای باوکسالاریدا پێکهاتەی پلەداری و دەسەڵات بنچینەیی یە, بابەتی (هیرارشی) پلەداری واتا بەخشینە بەیەکەمین نموونەی چەمکی بەڕێوەبەرایەتی ئەو دەسەڵاتەی لەگەڵ دەسەڵاتی پیرۆزی شامان بوو بەیەك. ئەو دەزگایەی دەسەڵات کەبەپێی بەسەرچوونی کات لەسەر کۆمەڵگا بەرزدەبێتەوە چەندەی گۆڕانکاری وپێشکەوتنەکان بەلایەنی جیابوونەوەی چینایەتیەوە چڕدەبێتەوە بۆ دەسەڵاتی دەوڵەت دەگۆڕێ و وەردەچەرخێ. هەرچی دەسەڵاتی پلەدارییە تایبەت بەکەسایەتییە و نەبووە بەدەزگا. هەربۆیە بەئەندازەی بەدەزگابوونی دەوڵەت هەژموون و کاریگەری لەسەر کۆمەڵگا نییە. هەمئاهەنگی و گونجاوی نیوەی خۆبەختییە. وابەستەبوون لەرێگای بەرژەوەندیەکانی گەلەوە دیاری دەکرێت. بەڵام ئەوقۆناخەی دەستپێکراوە بۆ لەدایکبوونی دەوڵەت کراوەیە. کۆمەڵگای کۆمۆنەی سەرەتایی بۆماوەیەکی درێژخایەن بەرامبەر ئەم قۆناخە بەرخودان دەکات, ئەوەی بەرهەمی لەژێر دەستی خۆی داکۆکردۆتەوە تەنیا کاتێك لەگەڵ ئەندامانی دیکەی کۆمەڵگا هاوبەشێتی بکات و بەسەریاندا دابەش بکات ڕێزو وابەستەبوون بەرامبەر دەسەڵاتەکەی نیشان دەدرێت. بەچاوی تاوانەوە تەماشای کەڵەکەکردنی بەرهەم دەکرێت. باشترین کەس ئەوەیە کەتواناکاریەکانی (بەرهەمەکان) دابەش دەکات. چەمکی مەردایەتی کەتائێستاش لەناو کۆمەڵەکانی تیرەو هۆزەکاندا باوە سەرچاوەی خۆی لەم نەریتە بەهێزەی مێژوو

وەردەگرێت. تەنانەت جەژنەکانیش بەجۆرێ لەمەراسیمەکانی دابەشکردنی بەرهەمە زیادەکان دەستی پێدەکرد. لەسەرەتا کۆمرۆڤەکان (کۆمەڵەکان) کەڵەکەکردنیان وەکو گەورەترین مەترسی لەسەرخۆیان دەبینی و بەرخودان لەبەرامبەری کرابوو بەبناخەی چەمکی ئایینی و ئەخلاقی. بەشێوەیەکی بەهێز بینینی شوێنپەنجەی ئەم نەریتە لەسەرجەم فەلسەفە ئەخلاقی ـ ئایینیەکان هێندە زەحمەت نییە. کاتێك پلەداری دەسکەوتی بەسوود و جوامێری تێدا هەبوو کۆمەڵگا ئەرێ و پەسەندی دەکا. لەم بوارەدا پلەداری ڕۆڵێکی ئیجابی و سوودمەند دەبینێ.

ناوەڕۆکی پلەداری پشت ئەستوور بەژن ـ دایك تاکو ئێستاش لەتەواوی کۆمەڵگاکان وەك دەسەلات و هێزێکی مەزن پەسەند دەکرێ, ئەمەش بنەمای مێژوویی و بابەتی " دایك"ە. چونکە دایك لەناو سەختترین هەلومەرجیشدا فاکتەرێکی پێشەنگی منداڵبوون و بەخێوکردنییەتی. ئەو کولتوورە پلەداری و دەسەلاتەی لەسەر ئەم بنەمایە پێکهاتووە، هەڵبەتە پەیوەندی و پەیوەستبوونێکی مەزن بەخۆیەوە دەبینێ. ئەگەر تارۆژگاری ئەمرۆشمان بناخەی هەبوونی کۆمەڵگا پێك دێنێت، ئەمەش بەڵگەی سەلمێنەری بەهێزی چەمکی (بیرۆکە)ی دایکە. هەروەکو مەزندە دەکرێ ئەمە تەنیا بۆ تایبەتمەندێتی داتاشراوی (واتایی) بیۆلۆژی زاوزێ (منداڵبوون) ناگەڕێتەوە.پێویستە دایکەخوداوەند وەك گرنگترین بیرۆکە و دیاردەی کۆمەڵگا دەرکی پێبکرێت. تەواو بەڕووی دیاردەی دەوڵەت داخراوە, سەرجەم ئەو تایبەتمەندێتیانە لەناواخنی خۆی دەگرێت کەدەوڵەت ناخولقێنن. لەچوارچێوەی ئەم پێناسەیە کۆمەڵگای سروشتی وەك تێزی سەرەتایی هەبوونی مرۆڤ هەڵسەنگێنین واقیعی یە. لەسەربنەمای پشتبەستن بەم تێزە مرۆڤایەتی دەستی بەئاواکردنی (خولقاندنی) هەبوونی خۆی کردووە. ئەوەی پێشتر ژیانێکی ئاژەڵیانەیە, هەرچی ئەوەی دواترە ئەو پێشکەوتنەی شێوەی کۆمەڵگای دەوڵەتگەراو پلەدارییە کەلەسەربنەمای دژایەتیکردنی دەرکەوت, هەڵبەتە کارەکتەری دژەبیرۆکە (دژەتێز) لەم قۆناخە سەرچاوەی خۆی لە سەرکوتکردن و دواخستنی بەردەوامی کۆمەڵگای سروشتی وەردەگرێت. هەروەکو چۆن کۆمەڵگای سروشتی وەك تێز لەهەموو گۆڕەپانەکانی نیشتەجێبوونی مرۆڤ پەیڕەو دەکرا, لەبواری زەمەنیشدا وەك پێشەنگ تاوەکو کۆتاییەکانی سەردەمی نیئۆلیتیك سیستەمێکی کۆمەڵایەتی بەکاریگەرە, وەك ڕاستینەیەکی سەرکوتکراویش تاوەکو ڕۆژگاری ئەمرۆمان لەتەواوی پارچەو شانەکانی کۆمەڵگا درێژە بەهەبوونی خۆیان دەدەن, لەبابەتە سەرەکییە کۆمەڵایەتیەکانیشدا ئەم بەردەوامییە ڕوون و ئاشکرایە, چەندین دیاردەو بیرۆکەی کۆمەڵایەتی لەجۆری خێزان, هۆز, دایك, برایەتی, ئازادی, یەکسانی, برادەرێتی, هاورێتی, جوامێری, هاوکاری, جەژنەکان, ئازایەتی وپیرۆزی,...هتد لەم سیستەمە کۆمەڵایەتییە بۆمان ماوەتەوە, بەرامبەر ئەمەش تایبەتمەندێتی کۆمەڵگای دەوڵەتگەراو پلەداری کەتا دواڕادە ئەم سیستەمەی سەرکوتکردو دوایخست, تایبەتمەندێتییەکان بەڕادەیەکی هەرە زێدە بەردەوامییان پێدەدات, پێگەی دژە تێز (دژە بیرۆکە) لەم تایبەتمەندێتییەی وەردەگرێت. بەناویەکداچوونی هەردوو سیستەمی (کۆمەڵگا) کۆمەڵایەتیش تا دوا ڕادە بەگوێرەی یاساکانی دیالەکتیك گونجاون.

لێرەدا مەسەلەیەکی دیکەی گرنگ کەپێویستی بەرەچاوکردنە, تێگەیشتنمانە سەبارەت بە دیالەکتیك. چونکە پەیوەندی تێز و دژەتێز لە جۆری یەکتر لەناوبردن نییە, بەڵکو لەشێوەی کارەکتەری (سەرکوتکردن و دواخستن) پەرەدەسەنێ. هەروەکو لە سروشتدا ڕوودەدات, لەتەواوی سیستەمەکانی کۆمەڵگاشدا کاتێك دەگەنە دۆخی بیرۆکە ـــ دژەبیرۆکە (تێز ـــ دژەتێز) بەیەکەوە یەکتری دەگوازنەوە. بێگومان تێکۆشانی نێوانیان ڕێگا لەپێش گۆڕانکاری گرنگ و بایەخدار دەکاتەوە. هیچ کاتێك تێز لەدۆخی کۆنی خۆی نامێنێت, بەلام دژەتێزیش بەتەنیا و بەشێوەیەکی ڕەها ناتوانێ بەهایەك قووت بدات کەدەستپێکەری خۆیەتی. تەنیا لەمیانەی خۆراك لێوەرگرتنی دەتوانێ گەشەبکات.

لەم خاڵەدا زیاترکردنەوەو ڕۆشنکردنەوەی دیالەکتیك سوودمەند دەبێت, لەقۆناخی مارکسیزمی دۆگماییدا لەناو کۆمەڵگا تێز و دژەتێز بەشێوەی لەناوچوون (لەناو بردنی یەکتر) شرۆڤە کرا. ئەم شێوازەی شرۆڤەکردن لەراستیدا یەکێك لە هەڵە

تیۆرییە بنچینەییەکانە. لەسەرجەم زانستەکاندا، لەسەرووی هەمووشیانەوە زیندەوەرزانی (بایۆلۆژی) ئـەو تایبەتمەندێتییـەی ڕەچاودەکرێ، لایـەنی یـەکتر بـەخێوکردنی دیاردەکانـە لـە کـاتی گۆڕانکـاری و وەرچـەرخاندا. ڕەوشـی لەشـێوەی پاکتـاوکردنی یەکتری زۆر دەگمەنە و دۆخێکـی شـازە. ئـەوەی زاڵـە بیرۆکـەو بابەتـەکانی تیـژ و دژەتیـژن کـە یـەکتری بـەخێو دەکـەن و، تیـر خـۆراك دەکـەن. گوزارشـتی هـەرە سـادەی ئەمـە دوالیزمـی (دووانـەی) منـداڵ ــ دایکـە. منـداڵ لـەناو ڕەوشـی ئـەم ناکۆکییـە گەشەدەکات کە لەگەڵ دایکیدا هەیەتی، بەڵام ناتوانین شرۆڤەیەکی وەهـا پێـشخەین کـە منـداڵ دایـك لـەناو ببـات. هەرچۆنێك بێت دەتوانرێ وەك بەردەوامکردنی ڕەچەڵەك (نەوە) هەڵسەنگێنرێ کە لەڕێگای یەکتر بەخێوکردنـەوە ئەنجامـدەدرێت. خـاڵی هەرە زەق و ئەوپەڕگەری نموونەی مار و مشکە. ئەوەی لێرەشدا ڕوودەدات، پاراستنی هاوسـەنگییە لـەنێوان زاوزێـی بێـسنووری مـشك و زیـادبوونی بەدەگمـەنی مـار. ئەگـەر مـار نەبووایـە لەوانــەبوو مـشك ڕۆڵێکـی زۆر لـە دیناسـۆرەکانی خـراپتر و تێکدەرانەتریان بینیبووایە. ڕۆژ بەدوای ڕۆژ زیاتر دەرکی پێدەکرێت کە بوونەوەرەکانی سروشت هیچ یەکێکیان بێواتـا نییـە. هەر یەکەو واتایەکی تایبەت و دیاریکراوی ژینگەپارێزی هەیە. بەڵام دیسان دەشێ بیرۆکەو بابەتی " خاڵی لوتکـە " و سـنوورە ڕەهاکان (موتلەقەکان) لەچوارچێوەی مەبەستێکی زۆر سنووردار وەك چەمك و بیرۆکە بەکاربهێنرێ. ئـیتر تـەواوی زانـستەکان هەستییان بەو تایبەتمەندێتییە کردو بینیـان کـە یاسـای بنـچینـەیی سروشـت بەشـێوەی پەیوەندییـەکی دوولایەنـەی بەرامبـەر پەرەدەسێنێ.

کاتێـك سیـستەمەکانی کۆمــەڵگا هەڵدەســەنگێنین، ئـەو گۆڕانکارییـەی خوازیـارین ئـەنجامی بـدەین، سـەبارەت بەچـۆنێتی ڕەفتارکردنـە بەرامبـەر بەبیرۆکـە و بابەتـەکانی " ڕێکـەوت ــ صـدفە" و " پێویـستی ــ چـرورە " ە. چـەمکی هۆکارگـەرایی (السببیة)ی ڕووکەشی و پێشکەوتنی بەردەوامی ڕاستەهێڵ ئاسای سیستەمی هـزری ڕۆژئـاوایی کـە ڕیـشەکەی خـۆی لـە چـەمکی یاسای خودایی دەبینێتەوە، لەگەڵ ئەو پێشکەوتنانەی لەئاکامی تیۆری فیزیایی کوانتۆم و کۆزمۆس هاتـەئاراوە کەلـە سـەرەتا هـەوڵی ڕوونکردنەوەیانمانـدا ئـیتر لەکارکـەوتووە و پـەیڕەو نـاکرێ. لـە دیالـەکتیکی پەرەسـەندن " زەمـەنی ڕاگـوزاری گێـژاو" لەهەموو دیاردەیەکدا سەرهەڵدەدات. پێشکەوتنی گەورەی ئەم " نێوەندە زەمەنییە" ڕاگوزاریە دەکاتـە پێویـستییەك. ئەمـەش نیـشاندەدات کەپێـشکەوتنی بـەردەوامیی ڕاسـتەهێڵ، هەڵوێـستێکی میتـافیزیکی و داتاشـینێکی واتـایی هزرییـە. بـەردەوام لەمەودای زەمەنیی ڕاگوزارەدا پێشکەوتنێکی ڕاستەهێڵ ئاسا مسۆگەر نییەو ئاستەمە. دەشێ پەیوەندییەکانی چەندین فاکتـەر لەم مەودا زەمەنییەدا ڕێگا لەپێش پێشکەوتنێکی هەمەلایەن و بێژمار بکەنەوە.

لەناو کۆمەڵگای مرۆڤدا ئەم نێوەندانە بەناوچەی قەیران بەناو دەکرێ. ئاستی تێکۆشانی ئەم هێزانەی بەهۆیـەوە کاریگـەر دەبـن چـۆنییەتی ئـەو پەرەسـەندنە کۆمەڵایەتییـە دیـاری دەکـەن کەلەئـەنجامی قـەیران دێتـەئاراوە، ئەگـەری دەرکـەوتنی ژمارەیەکی زۆری سیستەمەکان هەیـە، هـەروەکو چۆن دەشێ بـۆ پێـشەوە بـێ، ئەگـەری هەیـە بـەرەو دواوەش بێت. ئاشکراشـە چەمك و بابەتی پێشکەوتوو ـ دواکـەوتوو ڕێژەییـە. پێـشکەوتنی بـەردەوام لەگـەڵ بـیردۆزی گەردوونیـشدا نـاگونجێ و ناکۆکـە. ئەگەر ئـەم پرەنـسیپە ڕاسـتبووایە بانگەشـەی میتافیزیـك ڕاسـت و ڕەوان دەبـوو. باسـکردنی ڕاسـتییەڕەهاکان (موتەلەقـەکان) لەگـەڵ پرەنـسیپی پێکهـاتنی (ئـاوابوونی) گـەردوون نـاگونجێ. سروشـت لـەڕێگای ڕەهاگـەرایی گەشـەناکات، ڕەهاگـەرایی واتـە نەگۆڕی و لێکچوون. شێوازی هەبوونی ئێمە دەیسەلمێنێ کە شتی لەمجۆرە نییـە. لـەڕێگای تایبەتمەنـدێتی یاسـاکانی زانـستی فیزیا و کیمیا و زیندەوەرزانی دەتوانرێ ببینرێ کە یاساییبوونەکەی سروشت پشت ئەستوور بەمـەودا زەمەنییـەکانی قـەیران ــ گێـژاو سـەبارەت بـە پەرەسـەندنێکی ڕاسـت بەرامبـەر مـرۆڤ لـەدۆخێکی زۆر نەرمدایـە، هەرچـی لەکۆمـەڵگای مرۆڤدایـە یاساگەرایی خۆڕسك خاوەن کارەکتەرێکی ئێجگار نەرمە. ئەمەش بەو واتایە دێت کە ماوەی ڕاگوزاری یاسا، ژمارەیـەکی زۆری یاسای نوێ بەخۆیەوە دەبینێ. گرێـدراوی ئەمـەش پێـشکەوتن و ئاسـتی ئـازادی، ئـەو هەمەڕەنگییـە گرنگـە ئاشکرا دەکات کـە

لەکۆمەڵگای مرۆڤدا هەیە, نەرمبوون ئازادیی لەگەڵ خۆی دێنێ, ئازادییش هەمەڕەنگی دەخولقێنێ. لەم چواچێوەیەدا مرۆڤ بوونەوەرێکی سەیر و سەمەرەی سروشتە کە هەرە زێدە و بەشێوەیەکی چڕ یاساییبوونی خۆی فەراهەم دەکات. هەر بۆیە کۆمەڵگای مرۆڤیش لەهەمان ئاستی چڕبوون و ژمارەی زۆری دەوڵەمەندییدا یاساکانی خۆی پێکدەهێنێت.

لەڕێگەی ئەم ئەگەر و شیمانەوە دەخوازم ئەم مەسەلە (تایبەتمەندێتییە) بسەلمێنم: یاسایەکی وەها نییە بڵێ لەئاکامی کۆمەڵگای سروشتییەوە ناچارییە (پێویستی یە) کۆمەڵگای دەوڵەتگەرایی و پلەداریی بێتەئاراوە. دەشێ مەیلێکی بەم چەشنەهەبێ, بەڵام ناچاریبوونی ئەم مەیلە و بەبێ پچڕان بەردەوامبوونی, بەتەواوی ئەگەر و گریمانێکی هەڵەیە. هەر وەکو چۆن لە بەشەکانی داهاتوودا جێبەجێ روونیدەکەمەوە. بەڵام لێرەدا ئاماژە بەوە دەکەم کە دەستنیشانکردنی مارکسیزم سەبارەت بە ناچاربوونی (حەتمییەتی) پێشکەوتنی کۆمەڵگای چینایەتی یەکێك لەهەڵە گەورەکانە. ئەمە پێشوەخت بەجێهێشتنی سۆسیالیزمە بۆ حاکمیەتی چینایەتی. ئەم هەڵەیە هۆکاری سەرەکییە بۆ ئەو رەوشەی مارکسیزم بە درێژایی مێژووی 150 ساڵ تێیکەوت و بوو بەیەدەگی سەرمایەداری. بینینی دەوڵەت, چینەکان و توندوتیژی وەکو فاکتەرە ناچاریی و دەستلێبەرنەدراوەکانی گەشەکردن و پێشکەوتنی کۆمەڵگا, بچووککردنەوەی تەنانەت بەنەبوون و هیچ لە قەڵەمدانی ئەو بەرخودانە زەبەلاحەی کۆمەڵگای سروشتییە کەتارۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە, ئەمەش هەر لەخۆڕا بەدیاری پێشکەشکردنی مێژووە بەهێزە ستەمکارەکان. بینینی هەبوونی چینەکان وەك چارەنووسێك (قەدەرێك)، لەوانەیە بەبێ هەستپێکردن ببێت بە ئامرازی دەستی ئایدیۆلۆگەکانی چینە دەسەڵاتدار و ستەمکارەکان, لەم بوارەوە بەناوی ژێردەست و چەساوەکان ڕۆڵێکی هەرە مەترسیدار دەبینێ. هەر وەکو بڵێی مێژوو لەژێر رەحمی داگیرکردن و زەوتکاری ئەمجۆرە رەوتە ئایدیۆلۆژی و سیاسییانە بەجێهێڵراوە.

پلەداری و جیاوازی چینایەتی توانیویانە پەرەسەندن بەخۆیانەوە ببینن. بەڵام ئەم گۆڕانکارییە ناچاری نییە, پلەداری و پشتبەستن بەدەوڵەتبوون لەمیانەی ئەو هێزانەوە بەدیهات کە گەورەترین ستەمکاری و تەفرەدانیان پەیڕەوکردووە. بەرامبەر ئەمانەش هێزە سەرەکییەکانی کۆمەڵگای سروشتی بەرخودانێکی درێژخایەن و نەپساوەیان نیشانداوە, بەردەوام سنووردارکراوەو لە بەرتەسکترین گۆڕەپان و کەلەبەر تەنگەتاوکراوە. بەهیچ شێوەیەك نەخراوەتە هەندێ گۆڕەپان و ناوەندەوە تەنیا سنووردارکردن و بینینی تەواوی کۆمەڵگا لەکەسایەتی چین و پلەداری دەوڵەت, لەمیانەی سەرەکیترین سیاسەت و پڕوپاگەندەکانی سیستەمی ستەمکار فەراهەمکراوە, ئەو گەمەیە (لەیستۆك)ی قەدەری پێدەڵێن دەبێتە ئەدرەسی میتافیزیکی ئەم پراکتیکە. تەنانەت هیچ رەوتێکی ئایینی ـ مەزهەبی ـ فەلسەفی و زانستی نەماوە نەکەوتبێتە ناو ئەم گەمەیە. ئەمەش ئەنجامی فشاری زەبەلاحی جەستەیی و هزری هەزاران ساڵەی ئایدیۆلۆژیای راهیب و دەوڵەتی پادشا خوداوەندەکان و سیاسەت و پڕوپاگەندەکانییانە. ئەوەی هاتووە بەگوێرەی خۆی ناوی رێبازی میتۆلۆژی, فەلسەفی و زانستی لێناوە. ئەو خاڵەی پێیگەیشتووین چوار چوار رەوشی هەنووکەیی ئەو ئایدۆلۆژیا و زانستانەیە کەبەدەوڵەتبوونە. چەندە لەم بوارەدا هەڵوەستە لەسەر ڕۆڵی مارکسیزم بکرێت لە جێگای خۆیەتی. هەنگاو بەهەنگاو هەوڵدەدەم ئەم لەیستۆکانە و ڕۆڵەکانیان روونبکەمەوە.

سیستەمیماڵیکردنی تایبەت بە دایك ـ ژن یەکەمین قوربانی کۆمەڵگای پلەداری بوو. ژن لەسەرووی ئەو توێژانەوە دێت کەلەناو سیستەمی کۆمەڵگا دەچەوسێنرێتەوە. جێنەگرتنی ئەم قۆناخە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان کەبە شێوەیەکی بەرفراوان بەر لەمێژوو لەئارادابوو, سەرچاوەی خۆی لەو بەها جێگیرانەی کۆمەڵگای پیاوسالاری وەردەگرێت کە زۆر ریشەدارە. هەنگاو بەهەنگاو کشانەوەی ژن لە کۆمەڵگای پلەداری و لەدەستدانی تەواوی تایبەتمەندێتییە کۆمەڵایەتییە بەهێزەکانی خۆی, سەرەکیترین شۆڕشی چەواشەیە کەلەناو کۆمەڵگادا ئەنجامدراوە. تەنانەت ئەگەر لەخێزانێکی هەژاری زەحمەتکێشی ڕۆژی

ئەمرۆمان لێکۆڵینەوە لەسەر ڕەوشی ژن بکرێت, ناشێ ئێستاش بەترسەوە پێشوازی لەئاست و ڕەهەندەکانی ئەم فشار و فریودانە نەکرێت بەبیانووی هۆکاری زۆر بێواتاو هەزران. مانەوەی تاوانەکانی ئەشق و ناموس لەژێرپاوانی پیاو، نیشانەیەکی بچووکی ئەو ڕووداوانەیە کە لە ئارادان. گرێدانی ئەم قۆناخە بەجیاوازی جەستەیی (فسیۆلۆژی) دەبێتە ڕیشەدارترین و سەرەکیترین هەڵە. لەپەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا ڕۆڵی جەستە یاخود یاساکانی پەیڕەو ناکرێت، دەکرێت پەیوەندی دوولایەنەی تایبەتمەندێتییەکانی نێرینەو مێینە لەگەڵ یەکتردا هەڵبسەنگێنرێت، ئەم تایبەتمەندێتیەش لای هەموو جۆرە بوونەوەرەکان لەئارادایە. بەشێوەیەکی بنچینەیی بەهۆی فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکانەوە کولتووری دایك ــ ژن خراوەتە ژێر حاکمییەتەوە. ئەو فشار و ئایدیۆلۆژیانەی پەیڕەوکراوە تەواو لەم پێناوەدا بووە. ڕوونکردنەوەی ئەمە لەڕێگای هۆکارە سایکۆلۆژی و ئارەزووە زایەندییەکانەوە چەواشەکاری و لادانێکی مەترسیدارە.

ئەو پیاوەی لە ڕێگای ڕاوکردنەوە بەهێزبووەو گروپێکی لە دەوروبەری خۆی ڕێکخستووە دوای ئەوەی بەباشی هەست بەم هێزەی خۆی دەکات، دەوروبەریش ناچاری پەسەندکردنی دەکات, وردە وردە سیستەمی ماڵیکردن (ماڵداری)ی دایك ــ ژن ی خستۆتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، ئەم قۆناخە تاوەکو ئاواکردنی یەکەمین دەوڵەتشارەکان بەردەوام بووە، بێهاوتاترین ڕوونکردنەوەی ئەمە لە دەوڵەتشارەکانی سۆمەردا دەبینین. تابلێت (تابلۆ)ە نووسراوەکان بەزمانێکی سەرنجڕاکێشی شیعر ئامێزانە باس لەم ڕاستینەیە دەکەن. داستانی خوداوەندە ژنی شاری ئورگ ئینانا زۆر سەرنجڕاکێشە کە ئاواکردنی دەوڵەتشاری سۆمەرییەکانی دەستپێکرد. ئەم داستانە قۆناخێکمان دێنێتە بەرچاو کە کولتووری ژن و کولتووری باوکسالاری هێشتا لەناو هاوسەنگیدا بوون، یادگاری قۆناخێك دەگێڕێتەوە کە زۆر بەدژواری تێپەڕبووە. وەك خواوەندە ــ ژنی شاری ئورگ دەچێتە کۆشکی خوداوەندی شاری ئەریدۆ ئەنکی، لەڕێگای پێڕەوو شێوازی جیاوازەوە وەرگرتنەوەی ئەو 104 " ما ــ ME " یەی پێشتر هی خۆی بوو لێی زەوتکرابوو, دواتریش گەڕانەوەی بۆ شاری خۆی ئورگ. ئەم داستانە ڕۆڵی کلیل دەبینێ لە ڕوونکردنەوەی ئەو قۆناخەدا، مەبەستی لە "ما" کان دۆزینەوە (داهێنانە) سەرەکیەکانی شارستانییەتە، ئینانا بە سووربوونەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە ئەم داهێنانە تایبەت بەخوداوەندە ـ ژنە، ڕۆڵی خوداوەندی پیاو " ئەنکی " لەم دۆزینەوانەدا نەبووە, بەزۆرداری و تەڵەکەبازی لێی دزراوەو ڕفێنراوە. تەواوی هەوڵەکانی ئینانا لەم پێناوەدایە کەدووبارە کولتووری خوداوەندە ـ ژن بگەڕێنێتەوە دەست خۆی.

شیمانە دەکرێت ئەم داستانە خۆی لە ساڵانی 3000 پێش زایین باس کرابێت ــ قۆناخێکە هێشتا هێزی ژن ــ دایك لەهاوسەنگیدایە. لەدوای ئەم مێژووەوە کە ئەم کولتوورە هەنگاو بەهەنگاو بەرەو دواوە دەچێت دووچاری بێ ڕەحمییەکی وەها دەکرێت، دواتر ژن لە ڕیفۆرمی نیپوری ناوەندی شارستانییەتی ئەوکات (ئێستا نیویۆرك) خۆی لەو سۆزانیخانەیە دەبینێتەوە کە " موساککەتین " ی پێدەڵێن، لەلایەك لە زیگورات (زەقورە)ی ڕاهیبەکانی سۆمەر حەرەمسەرا بۆ خۆیان ئاوا دەکەن، بۆ گەلیش سۆزانیخانە دادەنرێت. لە داستانی ئەنوما ئەلیش کە لە ساڵانی 2000 ی پێش زایین نووسراوە، خوداوەندە ژن تیامات ئیتر نوێنەرایەتی ئەو ژنە دەکات کەجادوگەرێکی سامناکە و پێویستە پارچە پارچە بکرێت. چیرۆکێکی سامناك، ئەو تاوانبارکردنە (مەحکومکردنە) نیشاندەدات کە ئەنجامدراوە، ئیتر دواتر ئایینە تاکخوداییەکان و سیستەمی کۆمەڵگای بۆرژوا ئەوەیان تەواوکرد, ژنیان وەك فاکتەرێکی دەنگخۆشی و جوانی و ڕازاندنەوە خستە قەفەسێکەوە، لەلایەن خودی سیستەمە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکان پروپاگەندەیەکی ئایدیۆلۆژی چڕو بەرفراوان سەبارەت بەو ڕەوش و ستاتۆیە دەکرێ کە ژنی تێخزێنراوە. ئەمەش تا ئاستێکی وەها پێشخراوە تەنانەت خودی ژنانیش ئەم ڕەوشە بەقەدەر ناو ببەن و جێبەجێکردنی پێداویستییەکانی وەك پێویستییەکی قەدەر لەقەڵەم دەدەن. ئایینە تاکخوداییەکان بەفەرمانی خوا دەبینێ. فەلسەفەی یۆنانیش ژن وەك هۆکارێکی (فاکتەرێکی) لاوازی نیشادەدات. هەموو جۆرە هەڵوێست و تەماشاکردنێکی بچوککردنەوە و

هەزران بینینی لەجۆری پارچە ماددەیەکی قەبا و ئەو کێڵگەیەی پیاو دەیکێڵێ شایستەی دەبینرێ. تاوەکو ئەو ستاتۆیەی ژن شیتەڵ نەکرێت کەلەگەڵ سیستەمی پلەداری دەستپێکرد ناتوانرێ دەوڵەت و ئەو پێکهاتەی کۆمەڵگای چینایەتی روونبکرێتەوە کە پشتیان پێبەست. لەبەر ئەم هۆکارەشە ناتوانرێ لە سەرەکیترین بەهەڵەداچوون رزگاربین. ژن نەك وەك رەگەز,بەڵکو وەك مرۆڤ لەکۆمەڵگای سروشتی دابرێنراو مەحکومی کۆیلایەتییەکی گشتگیرکرا. تەواوی کۆیلایەتییەکانی دیکە گرێدراو بە کۆیلایەتی ژن پێشدەخرێت. هەربۆیە تاوەکو کۆیلایەتی ژن شینەکرێتەوە کۆیلایەتییەکانی دیکەش شیتەڵ ناکرێت.

کۆیلایەتی ژن تێپەڕ نەکرێت کۆیلایەتییەکانی تریش بەلاوە نانرێت. ژنە بلیمەت و بەتوانای کۆمەڵگای سروشتی بە هەزاران ساڵ لەناو کولتووری خوداوەند ـ دایکدا ژیاوە. ئەو بەهایەی بەردەوام شکۆدارکراوە خوداوەندە دایکە. لە دۆخێکی وەهادا بەرفراوانترین و درێژخایەنترین کولتووری کۆمەڵگا چۆن سەرکوتکراو کرا بە بولبولە جوان و ڕەنگاو ڕەنگەکەی ناو قەفەس؟ دەشێ پیاوان لەپێناو ئەم بولبولە لەهۆشی خۆیان بچن، بەڵام ئەو ژنە دیلێکە تاوەکو ئەم دیلێتیە درێژخایەن و قووڵە تێپەڕ نەکرێت، هیچ سیستەمێکی کۆمەڵگا ناتوانێ باسی یەکسانی و ئازادی بکات. ئەو حوکمدانە ڕاستە کە دەڵێ : ئاستی یەکسانی و ئازادی ژن ئاستی ئازادی و یەکسانی کۆمەڵگا دیاری دەکات. تاوەکو ئێستا مێژوویێکی ڕاست و دروستی ژن نەنووسراوە، لەهیچ زانستێکی کۆمەڵایەتیدا بەشێوەیەکی ڕاست و واقیعی شوێنی ژن دەستنیشاننەکراوە. تەنانەت ئەوەی دەڵێ رێزێکی زۆرم بەرامبەر ژن هەیە بەو ڕادەیەی ژن ببێتە ئامرازێکی پێکهێنانی حەسرەتەکانی, ئەمە وەك حوکمێك دیار دەکات. لە دەرەوەی لایەنی زایەندی (سێکسی) لە ڕۆژگاری ئەمرۆشماندا هیچ پیاوێك ژن وەکو دۆست نابینێ و پەسەندی ناکات. دۆستایەتی تەنیا لەنێوان پیاوان پەیرەو دەکرێت. بەژنێك بڵێی دۆست، واتە ڕۆژی دووەم سکانداڵی سێکسییە، دۆزینەوە یان خوڵقاندنی پیاوێك ئەمجۆرە هەڵوێستەی تێپەڕ کردبێت دەبێ وەکو یەکێك لەهەنگاوە سەرەکییەکانی ئازادی هەڵسەنگێنرێ. هەوڵدەدەم شیکردنەوەکانی سەر ئەم بابەتە زیاتر قووڵبکەمەوە.

پێویستە بەبایەخەوە باسی ئەو فشارو وابەستەیی بوونە بکرێت کە لەکۆمەڵگای پلەداری بەساڵاچووە بەئەزموونەکان لەسەر لاوان ئەنجامیان داوە, ئەو بابەتەی بەناوی ژەرۆنتۆکراسی (ئەو سیستەمەی گەورەیی تەمەن خاوەن قسەیە) لە ئەدەبیات (وێژە) تێپەڕ دەبێت ڕاستیەکە.

لەکاتێکدا لەلایەك ئەزموون بەساڵاچووەکە بەهێز دەکات, لەلایەکی دیکەوە چەندەی دەچێ بەساڵاچووەکە لاواز و بێهێزی دەکات. ئەم تایبەتمەندییەبەساڵاچووەکان ناچار دەکات لاوان بخەنە خزمەتی خۆیانەوە. هزریان (زەینیان) پڕدەکەن و ئەم میکانیزمە پێشدەخەن. تەواوی جموجۆڵەکانیان بەخۆیانەوە دەبەستنەوە. باوکسالارێتی هێزێکی گەورە لەم دیاردەیەش وەردەگرێ، هێزی جەستەیی لاوان بەکاردێنێ و داخوازییەکانی خۆیان جێبەجێ دەکەن. ئەم گرێدانەی سەر لاوان، قووڵبۆتەوە و تاوەکو ئەمرۆ بەردەوامە. باڵابوونی ئەزموون و ئایدیۆلۆژی وەها بەسانایی ناشکێت. داخوازی لاوان بۆ ئازادی سەرچاوەی خۆی لەم دیاردە مێژووییە وەردەگرێت. لەزانا بەساڵاچووەکانی سەردەمی کۆن تاوەکو زانایان و دەزگا زانستییەکانی ڕۆژگاری ئەمرۆ ژیانیترین و هەستیارترین و ستراتیژیترین لایەنی زانیاری لە لاوان دەشارنەوە. ئەوانەی پێشکەشی دەکرێت ئەو زانیاریانەن کە سڕی دەکات و وابەستەبوونیان هەمیشەیی دەکات. کاتێ زانیاریشیان پێشکەش بکرێت ئامرازەکانی جێبەجێکردنیان پێشکەش ناکرێت. فریودان و دواخستنی بەردەوام تەکنیکێکی نەگۆڕی بەڕێوەبەرایەتییە. ئەو ستراتیژ و تەکتیکانەی سیستەمەکانی فشار و پروپاگەندەی ئایدیۆلۆژی و سیاسی لەسەر ژنانی پەیرەو دەکەن، هەمان شت بەرامبەر لاوانیش بەڕێوەدەبەن. داواکاری بەردەوامی لاوان بۆ ئازادی بەهۆی سنوورەکانی تەمەنی جەستەیی (فسیۆلۆژی) نییە، سەرچاوەی خۆی لەم ڕەوشە تایبەتەی فشاری کۆمەڵایەتی وەردەگرێت. بابەتەکانی مەیخۆری, نەزان و خوێنگەرم، ئەو

دەستەواژە تایبەتانەی پروپاگەندە کردنن کە بۆ بچووکردنەوەی لاوان هەڵبەستراون. ڕاستەوخۆ گرێدانیان بە ئارەزووە زایەندییەکان, ڕاکێشانیان بۆ ناو سەرکەشی و یاخیبوون و بەستنەوەیان بەدۆگما وشك و ئەزبەرەکان گرێدراوی جێگیرکردنی سیستەم و ڕێگرتنە لەپێش بەکارهێنانی وزە و توانای لاوان بەرامبەر بەسیستەم.

ئەو لاوانەی کەوتوونەتە سەر ڕێی کاروانی ئازادی جڵەوکردنیان ئاستەمە. لاوان لەسەرووی ئەو توێژانەوە دێن کە بەڵای سەری سیستەمن. لەبەرئەوەی بەدرێژایی مێژوو ئەمە باش دەزانرێ, لەژێر ناوی پەروەردە لە قوربانیکردنی لاوانەوە تاوەکو ئەو کردەوە و پەیڕەوانەی بەئەقڵ و خەیاڵدا نایەت هەر هەمووی لەسەر لاوان بەڕێوە دەبردرێت. دوای ژن ئەو ڕەوشەی لاوان تێیخراون ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوە دەبینێ لەبەرزبوونەوەی کۆمەڵگای پلەداری. لەخۆڕانییە ئەو سیستەمەی لاوان دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە خۆی وەك بەهێزترین سیستەم دەبینێ. دواتر تەواوی سیستەمەکانی کۆمەڵگای دەوڵەتگەرایی پەیڕەو و کردەوەیەکی هاوشێوە بەسەر لاوان دەسەپێنن. ئەو لاوەی بەمجۆرە هێزی شۆڕاوەتەوە دەتوانرێ هەموو ئیش و کارێکی پێبکرێت،شەڕیشی لەناو دابێت, دەتوانێ قورسترین ئیشوکار بۆخۆی بکات بەپیشە. لە پێشەوە دەخرێتە ناو قورسترین کار. بەکورتی پەیوەندی لاوازی بەساڵاچووەکان و بەهێزی لاوان و پاشکۆکردن و بەرۆژەڤکردنیان بەبێ ئەوەی هیچ لە خێرایی و چڕبوونەوەی خۆی لە دەستبدات کراون بە ئامرازی درێژەپێدان و بەردەوامکردنی سیستەمی باڵادەست. دووبارە پێویستە جەختی لەسەر بکەمەوە : لاوێتی مەسەلەیەکی جەستەیی نییە, بەڵکو ڕووداوێکی کۆمەڵایەتییە, ئەمەش وەکو مەسەلەی ژنێتی جەستەیی نییە, بەڵکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە. شۆڕبوونەوە بۆ ناو سەرچاوە و گەیشتن بەڕیشەی ئەم چەواشەکارییانەی سەبارەت بەم دوو ڕووداوە (دیاردە) دەکرێت و ڕۆشنکردنەوەیان سەرەکیترین ئەرکی زانستی کۆمەڵناسییە.

پێویستە منداڵانیش بخرێنە ناو ئەم چوار چێوەیەوە، هەڵبەتە ئەوەی ژنان و لاوان دیل بکات, بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ منداڵانیش دەخاتە ژێر ئەو سیستەمەی کە خوازیارێتی. ئاشکراکردنی ئەو لایەنە خوار و نادروستانەی هەڵوێستی کۆمەڵگای دەوڵەتگەرایی و پلەداری بەرامبەر منداڵان بەهۆی ڕەوشی دایکەوە گرنگی و بایەخێکی مەزنی هەیە. پەروەردە نەکردنی منداڵان بەشێوەیەکی ڕاست, تەواوی ئاراستە کۆمەڵایەتییەکانی دواتر دەخاتە ناو خواری و تەڵەکەبازییەوە. سیستەمێکی پەروەردەیی تایبەت بەمنداڵان لەسەر بنەمای فشار و تەڵەکەبازییەکی بەکاریگەر ئاوا دەکرێت. هەوڵدەدرێت لە ڕێگای پێڕەوی جیاواز و هەمەلایەنەوە لەناو لانکەوە بکرێن بەپاشکۆو گرێدراوی سیستەم. گووتەی خووێك گرتت بەشیری تەرکی ناکەی بە پیری، ئاماژە بەو ڕاستینەیە دەکات. هەڵوێستی ئازادانەی کۆمەڵگای سروشتی بەردەوام وەك خەیاڵێك بۆ منداڵان دەمێنێتەوەو ڕێگایان پێنادرێ لەناو ئەم خەیاڵانە بژین. یەکێك لەئەرکە ڕەسەنەکان ئەوەیە وابکرێ منداڵان بەگوێرەی خەیاڵە سروشتییەکانیان بژین. پێویستە جارێکی دیکەش جەختی لەسەر بکرێتەوە : ناتوانرێ وەها سەیر بکرێ کە بەهێزبوونی پەیوەندی باوکسالارێتی پێویستی و ناچاری بوو. هەروەها شیمانە دەکرێت کە پێویستییەکی یاسا بووەو پێهەڵگرتنێکی سادە نییە، لەبەر ئەوەی قۆناخێکی بنچینەیی ئاراستەی جیابوونەوەی چینایەتی و بەدەوڵەتبوونە، پێویستە بەبایەخەوە هەڵوەستەی لەسەر بکرێت. ئەو پەیوەندییەی لە دەوروبەری ژن ــ دایك هەبووە لە پەیوەندییەکی هێز و دەسەڵات زیاتر, لەسەر شێوازی هاوکاری ئورگانیك بووە، ئەمەش بەگوێرەی ناوەڕۆکی کۆمەڵگای سروشتی گونجاوە. خواربوون و لەڕێ لادان لەئارادانییە. بەرامبەر دەسەڵاتی دەوڵەت داخراوە، بەهۆی پێکهاتە ئۆرگانییەکەی پێویستی پەنابردنە بەر فشار و فێڵبازی (درۆ) نابینێ. ئەم خاڵە ئەوەش ڕووندەکاتەوە کە بۆچی شامانیزم زیاتر ئایینێکی پیاوانە. لە نزیکەوە تەماشای شامانیزم بکرێت، یەکسەر دەرکی پێدەکرێت کە پیشەیەکە لایەنی خەڵەتاندن و نمایشکردنی هێز تێیدا لەپێشە. لەپێناو دەسەڵاتێکی فێڵبازانە بەوریایی و هەستیارییەوە سیستەمی هێز و میتۆلۆژی ڕێکدەخرێت, تاوەکو بەسەر سادەیی کۆمەڵگای سروشتی بڵاوبکرێتەوە. ئیتر شامان لەسەر ئاراستەی بوون بەراهیب و پیاوی ئایینی دەڕوات. پەیوەندییەکانی لەگەڵ باپیرە

بەساڵاچووەکە بەلای ڕێککەوتن دەچێ. بۆ زاڵبوونێکی تەواو پێویستییان بە پیاوە ڕاوچییە بەهێزەکان هەیە. ئەو گروپەی هەرە زێدە باوەڕی بەهێز و تواناکاری ڕاوکردن هەیە، مەیلی بوون بەیەکەم چەکەرەی سەربازی هەیە. چەندەی دەچێ بەهاو تواناکاری لەژێر دەستی ئەم سێیانەدا کۆدەبێتەوە. وردە وردە لەڕێگای فێڵبازییەوە دەوروبەری ژن ــ دایك چۆڵ دەکرێت. پێبەپێ سیستەمیماڵیکردن دەخرێتە ژێر کۆنترۆڵەوە. لەسەرەتا ژن هێزی کاریگەری سەر پیاوان بوو، قسەی دەڕۆیشت، وردە وردە دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی دەسەڵاتی نوێ.

ئاواکردنی یەکەمین دەسەڵاتی بەهێز لەسەر ژن شتێکی ڕێکەوت نییە. ژن هێز و وتەبێژی کۆمەڵگای ئۆرگانیکە. ئەگەر ئەوە بەلاوە نەنرێت باوکسالارێتی سەرکەوتن بەدەست ناهێنێ. بۆ ئەولاتریش بچین، ناتوانێ بۆ بەدەزگابوونی دەوڵەت هەنگاو بهاوێژێ. تێپەڕکردنی هێزی ژن ـ دایك مانایەکی ستراتیژی هەیە. هەروەکو لەپێدراوەکانی سەردەمی ئاواکردنی شارەکانی سۆمەر دەیبینین ئەم قۆناخە زۆر بەدژواری تێپەڕ دەبێت. شێوەی ژنی لیلیت ــ حەوا کە لەئایینە تاکخوداییەکان ڕەنگدەداتەوە، بەشێوەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێشانە تایبەتمەندییەکانی قۆناخ نیشان دەدات. لیلیت ئەو ژنەیە کە ملکەچی پەسەند ناکات، حەواش ئەو ژنە نیشاندەدات کە تەسلیم بووە، ئەو بانگەشەیەی کە دەڵێ لە پەراسووی پیاو دروستکراوە ئەو پێوانەیە کەئاستی پاشکۆیەتی و وابەستبوونەکەی نیشاندەدات. لەلایەکی دیکەشەوە تەواوی جوێن و تایبەتمەندێتییەکانی نەعلەتی، بوختان، جادووگەری، دۆستی شەیتان و هاوشێوەکانی دەخرێنە پاڵ لیلیت، نیشاندەدات و دەسەلمێنێ کە کێشمەکێشی و ململانێیەکی مەزن لەئارادا بووە، کولتوور و هزر و باوەڕییەکانی هەزاران ساڵەی ئەم بوارەمان دەداتە دەست. تاوەکو سەراوژێربوونی کۆمەڵایەتی ژن شینەکرێتەوە بەشێوەیەکی ڕاست دەرك بەو تایبەتمەندێتییە سەرەکیانەی کولتووری کۆمەڵگای پیاوسالاری ناکرێت کە دواتر سەریهەڵدا. بەڵێ بەمجۆرە تەنانەت ناتوانرێ بیر لەدامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی پیاوێتیش بکرێتەوە. دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی پیاو دەرکی پێنەکرێت دەزگای دەوڵەتیش شیناکرێتەوە. ناتوانرێ ڕاست پێناسەی کولتووری " دەسەلات "و " شەڕ " بکرێ کە گرێدراوی دەوڵەتن. هۆکاری هەڵوەستەکردنی بەردەوامامان لەسەر ئەم بابەتە لەپێناو پێشخستنی ڕوونکردنەوەیەکی ڕاستە سەبارەت بە کەسایەتی ـ ئیلاهی مەترسیدار و هەموو جۆرە چەوسانەوە و سنوور دانان و ڕۆح کێشان... هتد کە وەك ئەنجامێکی جیابوونەوەی چینایەتی سەریهەڵدا. گەر بەچەمکی پیرۆزی تەماشای نەفرەتکردنی مرۆڤایەتی ـ دەسەلاتی سیاسی دەوڵەت ـ بکرێت، کەواتە قێزەونترین شۆڕشی چەواشە بەرامبەر زهنی مرۆڤ ئەنجامدراوە، ئەوەش کەڕوویداوە ناوزەدکردنی بەفاکتەری ناچاری (پێویستی) پێشکەوتن ــ مارکسیزمیش لەناودا ــ مەترسیدارترین شۆڕشی چەواشەیە مسۆگەر گەر لەملایەنەوە مێژوو بەپارزنگی ڕەخنەدان تێپەڕ نەکرێت و ڕاست نەکرێتەوە، ئەوا تەواوی ئەو شۆڕشانەی بەرپا دەکرێن لەوە ڕزگاریان نابێت کە لەماوەیەکی کورتدا بۆ شۆڕشی چەواشە نەگۆڕێن.

سەرەتا ژنان لەگەڵ ئەویش ڕووخانی جیهانی کۆمەڵگای سروشتی لاوان و منداڵان ئاواکردنی پلەداریەك لەسەر بنەمای هێزو فێڵبازی (میتۆلۆژیا) بوو بەشێوەی زاڵی کۆمەڵگای نوێ، لەگەڵ ئەم قۆناخەشدا بەشێوەیەکی تێکچڕژاو شۆڕشێکی چەواشەی ڕیشەیی ڕوودەدات : قۆناخی پێچەوانەبوون لەگەڵ سروشت و چوون بەلای تێکدانەوە. ئەمە ئەگەر و گریمانێکی ڕاست نییە کە شێوازی نێچیروانی و جەنگاوەری نەبێت کۆمەڵگا ناتوانێ بژی و بەردەوام بێت. ژمارەی ئەو گیانلەبەرانەی گۆشتخۆر نین بەهەزاران جار لەوانە زیاترە کە گۆشتخۆرن. ژمارەیەکی کەمی جۆرەکانی ئاژەڵ بە گۆشت دەژی یان خۆراکی گۆشتە. کاتێك بە قووڵیی تەماشای سروشت بکرێ بۆ بەردەوامی ژیانی ئاژەڵ بەر لەهەموو شتێك پەردەیەکی دەوڵەمەندی دارستان و گیا پێکهاتووە. گەشەکردنی ئاژەڵێتی ئەنجامێکی گەشەکردنی ڕووەك و دانەوێڵەیە. پەیوەندی دیالەکتیکی بەمشێوەیە. چونکە یەکەم ئاژەڵ ئاژەڵێکی دیکەی نییە تابیخوات. ئەو لەڕێگای گژوگیا گوزەران دەکات. پێویستە بەچاوی لەڕێ

لادان تەماشای خواردنی گۆشت و گوزەرانکردن لەسەر گۆشت بکرێت. گەر هەموو ئاژەڵەکان یەکتریان بخواردایە ئەوا بەهیچ شێوەیەك جۆری ئاژەڵی زیندوو پەیدانەدەبوو. چونکە ئەمە پەرەسەندنێکی پێچەوانەو ناکۆکە لەگەڵ رێسای گەردوون. بەردەوام لەرێ لادان و لەرێ دەرکەوتنی مەیلە سەرەکییەکانی سروشت بەردەوام روودەدات, بەڵام کاتێ لەرێ لادانەکان بخەینە شوێنی رەوشە بنچینەییەکە، پەیوەست بەکام جۆر بێت, رەچەڵەکی ئەمجۆرە وشك دەبێت. بەو مەرجەی کە کۆمەڵایەتی نین، زەقترین و سەرنجڕاکێشترین گوزارەی ئەم دیاردەیە ئەو رەوشەیە کە دوو رەگەزەکان (نێرەمووکەکان) تێیدا دەژین. هەموو کەسێك نێرەمووك (دوورەگەز) بێت، واتە لە نێوان پەیوەندی هۆمۆ سێکسی (پەیوەندی سێکسی لەگەڵ هەمان رەگەز)دا رەچەڵەکی مرۆڤ هەر لەخۆیەوە وشك دەبێ، تەنانەت ئەم کورتە روونکردنەوەیەش زۆر بەباشی ئاماژە بەو لادان و چەواشەکاریە دەکات کە بۆ پەرەسەندنی کۆمەڵگا پشبەستن بە نێچیروانی و جەنگاوەری وەکو ناچار پیەك بینیوە. نەك تەنیا لە بواری ماددی (بابەتی)، بەڵکو ئەنجامە مەعنەویەکانی کولتووری کوشتن زۆر قورسترە, ئەم کۆمەڵەیەی " کۆ مرۆڤەی" کوشتنی ئاژەڵ و هاو رەگەزەکانی خۆی کردووە بە کولتوورێکی شێوازی ژیان (جگە لە پاراستنی ناچاری) ئیتر بۆ پێشخستنی ئامێری شەڕ پێشخستنی هەموو جۆرە ئامراز و ئامێر و سیستەمی دەزگاکان بەبناخە دادەنێت، لەکاتێکدا دەوڵەت وەکو سەرەکیترین دەزگای هێز ئامادە دەکرێت، ئەوا تیروکەوانی شەڕ، مزراق و تەورەکان وەکو بەنرخترین بەها دەدۆزرێنەوەو پێشدەخرێن. پەرەسەندنی ئەو کۆمەڵگا باوکسالارییەی لەناو کۆمەڵگای سروشتی دایك سەریهەڵدا. وەك مەترسیدارترین لادانی (چەواشەکاری) مێژوو, ناوەڕۆکی ئەو شێوازانەی کوشتن و چەوسانەوەشە کە تا رۆژگاری ئەمرۆمان هاتووە. ئەمە لەولاوە بمێنێ کە ئەم پەرەسەندنە قەدەرێك یان هەلومەرجێکی پێویست و ناچاری پێشکەوتن بێ، تەواو رەوشێکی لادان و شێواندنە.پێشکەوتنێکە لەجۆری پادشایەتی شێر دەچێ، هەروەها بەدیالەکتێکی مار و مشك دەچێ. هەر لە ئێستاوە ناوزەدکردنی تیۆرییەکانی دەوڵەت بە تیۆری مار ــ مشك، هەڵسەنگاندنێکی زیاتر نزیك بەڕاستییە. نازناوی بەشێکی زۆری پیاوان شێرە. تایبەتمەندێتییەکە حەز دەکەن بەمجۆرە بن. دەپرسم بۆ خواردنی کێ ؟.

سەرباری زانیاریە سنووردارەکانم لەم رۆژانەدا بیستم کە بەشی دوایی فیلمی گەڕانەوەی پادشا ــ فیلمی پادشای ئەنگوستیلەکان ــ (خەڵاتی ئۆسکاری وەرگرتووە) ناوەڕۆکی فیلم وەك رەمزی دەسەڵات لەناوبردنی ئەنگوستیلەیە. مەزەندەکاریە کە لەئەمریکا چاوەڕوان دەکرا. لەوانەیە بەهۆی کەوتنی دەمامکی دەسەڵات، وەك تەگبیرێکی پێشوەخت و قۆناخێکی شوشتنەوەی مێشکە بۆ بەرێوەبردنی کردەوەی وردکارانەتری جیهانگیری. قۆناخی پێکهێنانی چەمك و تیۆری جیهانبینی نوێیە. دەشێ ئامادەکارییان هەبێت. ئاقڵمەندەکان زۆر باش دەزانن کاتێ رووی راستەقینەی دەسەڵاتی کلاسیك ئاشکرا بێت، هیچ هێزێکی نامێنێ. ئەوهێزە دەسەڵاتدارانەی جیهان بەرێوەدەبەن وەك پێویستییەکی ئیلاهیبوونیان ـ ئاگاداری هەموو شتێکن، لە قورئان باس لەوە دەکرێت کە خودا بەقەد تاڵە موویێك نزیکە ــ جێبەجێکردنی پێویستییەکان بەبێ کەموکورتی بە سەرەکیترین ئەرکی خۆیان لەقەڵەم دەدەن.

ئەو وێستگەیەی کولتووری شەڕ و نێچیروانی پێیدەگات رێکخستنی سەربازییە، رێکخستنی سەربازی بەئەندازەی پەرتەوازەبوونی کۆمەڵگای سروشتی و ئەتنیك (خێڵ ــ ئەتنیك) پەرەدەسەنێ. لەکاتێکدا رێکخستنەکانی دەوروبەری ژن ــ دایك پەیوەندییەکانی رەچەڵەك، بۆهێڵی و خزمایەتی پێشدەخات, رێکخستنی سەربازی ئەو پیاوە بەهێزانە بەبنەما دەگرێت کە لەم پەیوەندییانە دابڕاون. ئاشکرایە ئیتر هیچ شێوەیەکی کۆمەڵگای سروشتی ناتوانێ بەرامبەر ئەم هێزە بوەستێ. توندوتیژی کۆمەڵایەتی ـ پەیوەندی مەدەنیشی پێدەگوترێت ـ کەوتۆتە ناو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان. ئەو هێزەی رۆڵی دیاریکراو دەبینێ خاوەنەکانی توندوتیژین. بەمجۆرە رێگای موڵکایەتی تایبەتیش دەکرێتەوە. ئەم مەسەلەیە دەرکی پێدەکرێت کە توندوتیژی بناخەی موڵکایەتی پێکدێنێ. لەرێگای توندوتیژی و خوێنڕشتنەوە دەستبەسەرداگرتنی موڵك،

بەشێوەیەکی ئەوپەڕگەری هەست و سۆزی منێتی بەهێز دەکات. تاوەکو زاڵبوون لەسەر پەیوەندییەکان نەبێ، ناتوانرێ ئامرازی توندوتیژی پەرەی پێبدرێ و بەکاربهێنرێ. هەرچی حوکمکردنە گرێدراوی خاوەنداریێتی بوونە.پەیوەندییەکی دیالەکتیکی خاوەنداریێتی ناوەڕۆکی حوکمکردن پێکدێنێ.خاوەنداریێتیش بکەری (گەوهەری) تەواوی سیستەمەکانی موڵکایەتییە. ئیتر ئەو قۆناخە دەستپێدەکات کە بەچاوی موڵك تەماشای کۆمەڵە، ژن، منداڵ، لاوان، نێچیروانی بەبەرهەم و کۆکردنەوەی بەروبووم بکرێت. بەهەموو شکۆمەندییەکەوە پیاوی بەهێز یەکەمین قەڵەمبازی خۆی ئەنجامدەدات. کەمێك ماوە ببێ بە پادشای ــ خواوەند. ئیتر لەهزر و مێشکی ئەو مرۆڤانەی بەڕێوە دەبردرێن شامان ــ راهیب بۆ پێکهێنانی میتۆلۆژیای قۆناخی نوێ دەستبەکارە. ئەو کارەی پێویستە ئەنجامبدرێ، بەجێکردنی ئەم کارە نوێیەیە کەوەك پێشکەوتنێکی شکۆمەندانەیە. شەڕی مەشروعیەت بەلانی کەم بە ئەندازەی شەڕێکی ڕووت پێویستی بە هەوڵ و کۆشش هەیە. پێویستە باوەڕییەکی وەها لە هزری مرۆڤدا جێگیر بکرێت کە بەهای یاسایەکی ڕەها (موتلەق)ی هەبێت. تەواوی پێدراوە سۆسیۆلۆژییەکان ئەوە نیشاندەدەن کە بیرۆکەو زاراوەی "خودای حوکمدار" لەم قۆناخە دروستکراوە, پەیوەندی حوکمکردن (زاڵبوون) لە باوەڕی (تەوتەم) دا نییە کەهاوکاتی کۆمەڵگای سروشتییە. وەك سەمبۆلی (قلان) تیرە تابۆیە وپیرۆزە. ژیانی قلان چۆن بێت بابەتی سەمبۆلکردنیش بەم شێوەیە ڕەنگدەداتەوە. تاوەکو بەشێوەیەکی توندوتۆڵ و بەڕێساو ژیانی ڕێکخستنی قلان (تیرەی سەرەتایی) گرێنەدرێت ناتوانێ بیر لە ژیان بکاتەوە. هەربۆیە وەك ڕەنگدانەوەی هەرە باڵا و شکۆداری هەبوونی خۆی، تەوتەم بە پیرۆز و تابۆ (دەستلێنەدراو) لەقەڵەم دەدرێت. ڕێزو حورمەتی بەرامبەر نیشان دەدرێ. هاوشێوەی سوودبەخشترین شتومەك و ئاژەڵ و ڕووەك لەقەڵەم دەدرێت. ئەو شتەی لە سروشتدا ژیان بە قلان دەبەخشێ چی بێت ئەوا باوەڕی پێدەکرێت و بە سەمبۆل دادەنرێت. بەمجۆرە کۆمەڵگای سروشتی ئایینەکەشی لەگەڵ سروشت یەکپارچەیە. سەرچاوەیەکی ترس نییە، بەڵکو فاکتەرێکی بەهێزکردنە. کەسایەتی و هێز دەبەخشێ.

ئەو خودایەی لەکۆمەڵگای نوێ بەرزکراوەتەوە تەوتەم تێپەڕ دەکات، پەردەپۆشی دەکات. لەبەرزایی شاخەکان، قووڵایی دەریا و ئاسمان لە شوێنەکەی دەگەڕێن, جەخت لەسەر هێزی حاکم دەکاتەوە. چەندە بەچینی ئەفەندیەکان ــ ئەربابەکان ــ دەچێت کە تازە لەدایکبوون !. لەتەورات ـ لە ئینجیل و قورئانیش ـ ناوێکی خودا (ڕەب)ە کە بەواتای ئەفەندی دێت. چینی نوێ خۆی دەکات بە ئیلاهی و لەدایکدەبێت. یەکێکی تر لەبەناوبانگترین ناوەکانی خوا " ئەل " "ئەلۆهیم " بەواتای شکۆمەندی دێت، مژدەی ئەو باپیرە شێخە دەدات کەلای تیرەکانی بیابان پیرۆز و بەرزە. لە تەواوی پەرتووکە پیرۆزەکان لە دایکبوونی باوکسالاریێتی و خودای نوێ، بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش بەناویەکدا چوونە. ئیلیادەی هۆمیرۆس, رامایانای هیندییەکان و کالاڤالای فینینەکان هەر هەمووی بەم شێوەیەیە. تاوەکو مەشروعیەتی کۆمەڵگای نوێ لەهزردا بەجێنەکرێت شانسی ژیانی زەحمەتە. هیچ یەکینەیەکی کۆمەڵگای بەڕێوەبراو بەبێ باوەڕهێنان بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بەڕێوە نابردرێت. کاریگەری توندوتیژی لە بەڕێوەبردندا کاتی یە. باوەڕی هەمیشەیی و بەردەوامی لەگەڵ خۆی دێنێ. لەبەرئەوەی نموونەی مێژوویی سۆمەر یەکەمین نموونەی ڕەسەنی نووسراوەیە، لێکۆڵینەوەی زۆر سەیرە، خوڵقاندنی خودا لای سۆمەریەکان زۆر دڵڕفێن و سەیرە, بە تایبەتیش ڕووخانی خوداوەندی ــ دایك و باڵادەستبوونی خوداوەندی ــ باوك ناوەڕۆکی تەواوی داستانەکان پێکدێنێت، ململانێی ئینانا و ئەنکی, تیامات و مەردۆك لەسەرەتا تا کۆتایی بەسەر داستانەکاندازاڵدەبێت. لێکۆڵینەوەی سۆسیۆلۆژی ئەو داستانەی دواتر لەتەواوی داستانەکانی دیکەو تەنانەت لەپەرتووکە پیرۆزەکانیش ڕەنیگداوەتەوە, زانیاری گرنگمان پێشکەش دەکات. لەخۆڕا نییە مێژوو بەسۆمەریەکانەوە دەستپێدەکرێت. شیتەڵکردنەوەی ئایین, داستانە ئەدەبییەکان، یاسا، دیموکراسی و دەوڵەت لەسەر بنەمای پشتبەستن بەتابلێتە نووسراوەکانی سۆمەریەکان لەوانەیە یەکێك لەو ڕێگا سەرەکییە نزیکانە بێت کە دەتوانێ کۆمەڵناسی ناچاری ئەنجامدانی پێکهەلگرتنێك بکات. ئەو

شۆڕشە چەواشەیەی زهنییەتی باوکسالاری بەخۆیەوە بینی، لەوانەیە گەورەترین هەوڵی شێواندن و لەڕێ دەرخستن بێ کەمێژوو بەخۆیەوە دیوە. بەشێوەیەك ڕیشەی خۆی لەهزری مرۆڤ و کۆمەڵگادا کوتاوە, تەنانەت بەکەناری سڕینەوەو نەهێشتنی ئەم کاریگەرییەدا نەڕۆیشتووین، هێشتا ڕاهیبەکانی سۆمەر حوکمی ئێمە دەکەن. ئەو دەزگایانەی تایبەت بەدەوڵەت ئافراندنیان و ئەو خوداوەندانەی وەك گوزارشتی مەشروعیەت وێناکران بەبێ هیچ چاوتروکاندنێك ئێمە بەڕێوەدەبەن و بەسەر ڕوانگەی ڕامان و چەمکەکانمان زاڵن. وتەی ئەلبێرت ئەنشتاین " پارچەکردنی هێزی فێربوون (خوو) و نەریتەکان لەپارچەکردنی ئەتۆم زەحمەتترە " هەروەکو بڵێی سەبارەت بەم پەیوەندییانە گوتراوە. ئەمە تەنیا گووتە نییە، ئەی نابینرێ لە ئێراقی لانکەی لەدایکبوونی شارستانییەت و دەوڵەت، وڵاتی کۆشکە پیرۆزەکانی ڕاهیبە سۆمەریەکان " زیگۆراتەکان " کە لەنێوان هەردوو ڕووباری دیجلە و فوراتە چی ڕوودەدات، لەسەردەمی ئەم داهێنانەوە تاوەکو ئێستا بەبێ پشوودان ئەو شەڕ و چەوسانەوەیە بەردەوامە کە ناکەوێتە چوارچێوەی هیچ پێوانەیەکی مرۆڤایەتی. کەواتە لەولاوە بمێنێ کە کۆمەڵگای باوکسالاری و بەدەوڵەتبوونی لەبەرژەوەندی مرۆڤایەتی و خزمەتی دابێت, بەڵکو گەورەترین بەڵای سەرە. ئەم ئامرازە نوێیە هەندێ جار وەکو تۆپە بەفرین, هەندێ جاری دیکەش وەك تۆپە ئاگرین, دەوروبەری خۆی دەسووتێنێ و گەورە دەبێ و هەسارە پیرۆزەکەمان دەخاتە ڕەوشێکەوە کە ئیدی دەرفەتی ژیان و دانیشتنی تێدا نەمێنێ. پەرتووکی پیرۆز (تەورات) سەرهەڵدانی دەوڵەت وەك دەرکەوتنی دڕەندەیەك لە دەریا (لێڤی ئاتۆن) نیشاندەدات. کەواتە لایەنێکی پەرتووکی پیرۆزیش ڕاستییە گەورەکەی دەستنیشان کردووە. چۆنییەتی بەرەنگار بوونەوە و دەرهەق دەرکەوتنی لێڤی ئاتۆن وەك مەترسییەکی سەرەکی جەختی لەسەر کراوەتەوە. دەڵێ ئەم جانەوەرە (دڕندەیە) کۆنترۆڵ نەکرێت هەموو کەسێك دەخوات.

ئەو کولتوورە کۆمەڵایەتییەی هەوڵمدا بەشێوەیەکی شەماتیك (قالبگەرایی) نیشانی بدەم, بە باشترین شێوە دەتوانرێ بنەما مێژوویی و جوگرافییەکانی لە بنارەکانی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس ـ تۆڕۆس و پێدەشتەکانیان ببینرێ. بەشێوەیەکی چڕ و بەرفراوان شوێن پەنجە بەهێزەکانی کۆمەڵگای سروشتی دەبینرێ کە لەدەوروبەری ژن ـ دایك پێشکەوت و لە ساڵانی 20000 پ.ز بەدواوە واتە لەدوای کۆتاییهاتنی دواترین قۆناخی سەهۆڵبەندی پەرەسەندنی بەخۆیەوە بینی. لەئامرازەکانی ئاشی دەست, چنین, سیستەمی ماڵیکردن و پەیکەرەکاندا شوێنپەنجەی ژن دەبینرێ. کارەکتەری مێینەی پێکهاتەی ژن، ژن بوونی یەکەمین خوداوەندەکان شوێنپەنجەی بەهێزی ئەو کۆمەڵگا سروشتییەی پێوەیە کە بەدایك پشت ئەستوورە.

تێبینی دەکرێ لە ساڵانی 4000 پ. ز دەسەڵاتی پیاوسالاری خێرایی بە گەشەکردنی خۆی داوە. لەگەڵ بەهێزبوونی دەستوپێوەندە سەربازییەکانی کۆمەڵگای نوێ، ئیتر بەشێوەیەکی بەرفراوان ئاسەوار و شوێنپەنجەی قڕکردن و ملکەچکردن دەبینرێ، تاکو ئێستاش بەردەوامی هەبوونی عەشیرەتەکان گەواهی بەدژواری تێپەڕبوونی ئەو قۆناخەیە. باوکسالارێتی بەرەو ئەوێ بڵاو دەبێتەوە، جیابوونەوەی چینایەتی و بەدەوڵەتبوون دێنێتە ئاراوە. ساڵانی 3000 ی پ. ز گەواهی لە دایکبوونی یەکەمین دەوڵەتشارەکانە, بریقەدارترین نموونەی شاری ئورگە. داستانی گلگامێش لەگەوهەری خۆیدا داستانی ئاواکردنی شاری ئورگە. دەتوانرێ بگووترێ گەورەترین شۆڕشی مێژوو لەچوار دەورەی ئەم کولتوورەی شار هاتۆتە ئاراوە. پێکهاتەی ئینانا ـ ئەنکی بە زمانێکی جوان و ڕەونەقداری شیعر ئامێزانە کێشمەکێشی نێوان کۆمەڵگای ژن ـ دایك و کۆمەڵگای باوکسالاری نیشاندەدات. داستانی گلگامێش گوزەرکردنێکی بێهاوتای یەکەمین نموونەی ڕەسەنی قۆناخی قارەمانێتییە کە لەهەر کۆمەڵگایەك نموونەکەی بینراوە. یەکەمین ململانێی نێوان شار ـ بەربەر لێرەدا دەبینین. هێشتا ژن دوورە لەوەی دۆڕاندبێتی, بەڵام پیاوی بەهێز لەڕێگای دەستوپێوەندی سەربازی هەنگاو بەهەنگاو کۆمەڵگا فێری حوکمڕانی خۆی دەکات.

لە میانەی پێکهاتەی ئایدیۆلۆژیای دەزگای ئایینی و یەکەمین بنەماڵەی خانەدان و کۆشکەکانی، بەرە بەیانی کۆمەڵگای شارستانی هەڵدێ.

ج ــ كۆمەڵطای دەوڵەتطەرا ــ ئێکهاتنی کۆمەڵطای کۆیلایەتی

کۆمەلگای پلەداری ئـەو ئەلْقەیـە پێکـدێنێ کـە دەکەوێتـە نێوان کۆمـەلگای سروشـتی و کۆمـەلگای دەولەتگـەرایی کـە پـشت بــەجیاوازی چــینایەتی دەبەســتێ. نــاوەڕۆکی کەســایەتی (کارەکتــەری) دەســتڕۆیی، ســنورداربوونی داروەدەســتەی ســەربازی بەکەسێتییەوە تایبەتمەنـدێتی نموونـەی قۆناخـە. بـەدەزگابوونی دەسـتڕۆیی گوزارشـت لـە وەرچـەرخانێکی چۆنایەتی دەکات. بەشێوەیەکی بنچینەیی لەڕاستیدا کە دەولەت بەدەزگا دەبێت ئـەو دەستڕۆییەیە کـە هەمیـشەییبوون بەدەسـتدێنێ. لەکاتێکدا مەترسیدارترین ئـامراز لـە مێـژوودا دەشـێ دەزگـای دەولـەت بـێ تـا ئێـستاش ئـەو تایبەتمەندێتییـەی خـۆی دەپـارێزێ کـە دیاردەیەکە بەسنورداری دەرکی پێدەکرێت. هەمەڕەنگی ئەو بەرژەوەندییانەی بەجێی دەگەیەنێ و ئـەو کولتـوورەی لـەخۆوەی دەگرێت ڕۆڵێکی سەرەکی لەمەدا دەبینێ. هەرشـتێکی لەبارەیـەوە دەگوترێ یـان دەنووسـرێ زیـاتر دەولـەت دەکـات بـە لـوغز و نهێنی و تێنەگەیشتنی بەهێز دەکات، تەنیا بینینی دەولەت وەك ئامرازێکی توندوتیـژی چـەندە بەهەلەداچوونە، ئـەوا کردنـی بە بابەتی دەستڕۆیی پیرۆزیش بەو ئەندازەیە خزمەت بە شاردنەوەی ڕووداوەکان دەکات. شیکردنەوەکانی دەولەت ئـەو بابەتـە سـەرەکیانە پێکـدێنێت کـە تـاوەکو ئێـستاش کۆمەلناسـی نـەیتوانیوە وەلامیـان بداتـەوە و لەهـەقیان دەربکـەوێت. تـاوەکو بەشـیکردنەوەی گـشتگیری دەولـەت نەگـەین، نـاتوانرێ هەلوێـستێکی چارەنووسـسازانە بەرامبـەر هـیچ کێـشەو دیاردەیـەکی کۆمەلایەتی نیشانبدرێت, لەم شیتەلکاریەدا وەك باوەڕییەکی خۆم ئەوە نیشاندەدەم کە هەلەی سەرەکی شۆڕشگێڕێکی گـەورەی وەك لینینیش سەرچاوەکەی لەشیکردنەوەی دەولەتدا شاراوەیە.

ئەوەی لەو شیکردنەوەیەدا خراوەتەڕوو زۆر سنوردارەو ناشێ لەڕێگایـەوە پێناسـەیەکی تـەواو دەرهـەق بـەدیاردەی دەولـەت بکرێ. پێویستە کەمێك زیاتر دەولەمەند بکرێ، لەبەرئـەوەی نموونـەی سۆمەر ڕەسـەنەکەیانە و بەلگـە نووسـراوەکانی لەبـەر دەستمانداین ناچارین بەردەوام ڕەچاوی بکەین. کاتێك دەزگای دەولەت و فیکرەکەی پێناسە دەکەین، دەبێ دەسـت لـەو چـەمکە بەردەین کە دەلێ یـەکێك (دەولـەتێك) ئـاوا کـرا، یـەکێکیان ڕووخێنـرا، یـاخود یـەکێکی نـوێ لـە جێگـای ئـاواکرا. دیـسان دەبـێ تەماشای شێوە جیاوازەکانی دەولەت و مەودای نێوان ئەو کۆمەلانە بکرێت کەجێگای خـۆی لـەناویان گرتـووە، چونکە چـەمکی باسـکردنی ژمارەیـەکی زۆری دەولـەت مەترسـی هەنـد و رشـت لەخۆیـەوە دەگرێـت. پێشخستنی بیرۆکەیـەکی گـشتی بـەمجۆرە کەدەولەت, واتەکۆمەلگایەك لەناو کۆمەلگا, یان کۆمـەلگای دووەم لـەناو کۆمـەلگای یەکـەم، یـاخود بەواتایـەکی دیکـە کۆمەلـەی سـەرەوەی کۆمـەلگای ژێـر دەشـێ سـوودبەخش بێـت. هەلوێـستی دووەمـی سـوودبەخش دەشـێ هەلـسەنگاندنی بێـت بەشـێوازی دیاردەیەك بێت کە وەك بیرۆکەو دەزگا کاریگەری پارچەبوون و هەمیشەیی لەسەر کۆمەلگای ژێر هەیـە. هەلوێستێکی دیکـەی تەواوکار ئەوەیە نەك وەکو هەر دەسەلاتێك بەلکو پەیپێبردن و دەرکپێکردنی وەکو دەستڕۆییەکی بنچینەیی سیاسی ـ سەربازی واقیعیترە. پێناسەکانی زانا ئایینی، فەلسەفی و زانستییەکان سەبارەت بەدەولەت لەبەرئەوەی وابەسـتەی شێوازەکانی تێڕوانین و بەرژەوەندییەکانی خۆیانە چەندەی بلێی لە بابـەتیبوون دوورە. هـەروەها تـەنیا گرنگـی بەلایـەنێکی دەدەن. کـاتێکیش زیـان بەبەرژەوەنـدییان بگەیـەنێ هـەروەکو نـەفرەتلێکردن دەکەونـە نـاو دیدگایـەکی خودگـەرایی و ڕاسـتینەی دیاردەکـە دەخەنـە لایەکـەوە، هەرچـی هەلوێـستی شۆڕشـگێڕەکانە کـاتێ دەیـڕوخێنن ڕووخاوەکـە بـەخراپ لەقەلـەم دەدەن, ئـەوەی تـازەش ئـاوای دەکـەن بەچـاك، ئەمــەش تـادوا ڕادە بـۆ چـەمکی ئـەخلاقی هەلپەرسـتی قۆزتنـەوە کراوەیـە. دیـاردەی دەولـەت ئـامرازێکی کۆمەلایـەتی وەهایـە بـەردەوام ئـەو تایبەتمەندێتییانـە نیـشاندەدات کـە بەتایبـەت دامەزرێنـەرە بەرپرسـیارەکەی ئەگـەر فەیلەسوفیش نەبێت ئـەوا بـەدوای هێـزی ڕاکێشانی دەسـەلاتی دەخـشێنێ کەبەرگـەی ناگیرێـت. ئـەوەی هـەولی بـەخاوەنبوونی دەدات لەهۆشی خۆی دەچوێنێ, یان بـەرەو ئیلاهیبـوون یـاخود بـەرەو فرکردنـی دەبـات. کاتێك دەولـەت پێناسـە دەکرێ ئـەوا

ناوەکانی پادشایەتی، کۆماری، دیموکراسی، مۆنارشی، ئۆلیگارشی، دیکتاتۆری دەسپۆت، کۆیلەداری، دەرەبەگایەتی، سەرمایەدار، نەتەوەیی، یەکپارچەیی و فیدراڵی و هاوشێوەکانیان دەرککردن بە ناوەڕۆکەکەی ئاستەمتر دەکات.

لەکاتێکدا ڕاهیبەکانی (کاهینەکان) سۆمەر بەرەو دەزگابوونێکی هاوشێوەی دەوڵەت دەچوون، ئەوەی ئەنجامیاندا لەوانەیە لەڕێگایەوە واقیعیترین زانیاریان سەبارەت بە دەوڵەت پێشکەشی ئێمە کردبێ. سەرەتا پەرستگای بەناوی زیگورات (زەقورە) ئاوا دەکات، بەرەو ئاسمان بەرزی دەکاتەوە، نهۆمی ژوور بۆ خوداوەند، نهۆمی ژێریش بۆ بەندەکان جیا دەکاتەوە. بەشەکانی ناوینیش بۆ نوێنەری چینەکانی ناوین دەکاتەوە. زەوی و خانووەکانی دەوروبەری پەرستگا وەکو پاشکۆیەك وایە. ئامرازەکان (تەکنیکەکان)ی بەرهەمهێنان لە بەشێکی پەرستگا دەخرێتە عەمبارەوە. بەتایبەتی حیساب بۆ بەرهەمە بەپیتەکان دەکەن. ئاشکرایە کە ئەم دامەزراندنە کۆمەڵگایەکی نوێیە. لەهەمانکاتدا وەکو پوختەیەکی فاکتەرەکانی (ئەندامەکانی) کۆمەڵگای سروشتی و پلەداری پێشووترە. پارچە سوودمەندەکانی ئەم کۆمەڵگایانە و ئەو کۆمەڵگا نوێیە وەردەگرێ کەخوازیاری ئاوا کردنین : هەرچی ئەو پارچانەن کە بێ سوودن و دەبن بەکۆسپ بەرکەنار دەکرێن، تەواو وەك ئەندازیاری کۆمەڵگایەکی پیرۆز کاردەکات. دوای ئەوەی ئامرازەکە ئاوا دەکات سەرەتا هەموو کەسێك ڕازییەو خۆشحاڵە, دۆخێکی لە شێوەی جەژن جێگای باسە، چەرخی مەزن ئاواکراوە : لەڕێگای ئاوەکانی ڕووباری دیجلە ـ فورات، هەروەکو بڵێی وەرچەرخانێکە بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا بەرهەمێکی زۆر دەخوڵقێنرێت. ئایا جەژنێکی لەمە گەورەتر بۆ مرۆڤایەتی دەبێت؟ ئەگەر گەورەترین ئیلاهیبوون ئەم ڕێکخستنە (سیستەمە) نەبێت ئەی چییە؟ بێگومان کە پێکهاتە بێهاوتاکەی بنارەکانی زاگرۆس ــ تۆرۆس، واتە کۆمەڵگای سروشتی نئۆلیتیك خۆراکی سەرەکی بەم دامەزراوە (پێکهاتە) نوێیە دەبەخشێ. بەهەزاران ساڵ ئامرازەکانی بەرهەمهێنان رووەك و جۆرەکانی ئاژەڵ لەم ناوچانە لەدەوروبەری ژن ــ دایك کراوە بە کولتوورێك. دەستڕەنگینی ڕاهیبەکان لەوەدایە، بەشێوەیەك کە کۆمەڵگایەکی سەروو لەمانە پێکبێنێ سەر لەنوێ ڕێکیدەخاتەوەو لەحەوزەی خوارووی ڕووباری فورات لە میانەی تەکنیکی ئاودێریەوە لە شێوازی نوێی بەرهەمهێناندا سەرکەوتن بەدەستدێنێ. داهێنانە سەرسوڕهێنەرەکەی مێژوو لە ناوەڕۆکی خۆیدا بەمشێوەیە لەقۆناخەکانی تر زیادکردنی نهۆمی دیکەیە بۆ ئاواییەکە یاخود دووبارە کردنەوەیەتی لەسەر بناخەی نوێ.

شوێنی ئەو کۆمەڵگایە نوێیە شارە. ئەو شوێنەی بەکۆمەڵگای شارستانی و مەدەنی و ژیاری ناودەبرێت بەئەندازەی هێزی مرۆڤایەتی گۆڕانکاری شۆڕشگێڕانەی مەزنی لەپێکهاتەی بەرهەمی مادديش دروستکرد، ڕاستتر بڵێین بەگوێرەی کۆمەڵگای سروشتی بناخەی شۆڕشێکی گەورەی چەواشەکاری پێکدێنێت. هێشتا هێزی دەوڵەتی ــ شار دوورە لەوەی شیتەڵکرابێت، سیستەمی مێشك، نووسین و چەندین پیشەو هونەری پێشخستووە، بەڵام بەرامبەر کامە بەها؟ حوکمدان لەسەر ئەوەی شۆڕشی شارە یاخود شۆڕشی چەواشەیە، کامەیان ڕاستە، تاوەکو ئێستا بەڕادەیەك گرنگی و بایەخی خۆی پاراستووە کەپێویستی بە تێفکرینێکی گشتگیر هەیە. نابێ لەبیر بکرێ کە چەندین قەڵەمبازی مێژوویی، ئایینە تاکخوداییە مەزنەکانیش لەسەرووی هەموویانەوە بەرامبەر ئەم پێکهاتەیە ئەنجامدراوە. لەو فشارەی بەهەشت زیاترە کە ڕەچەڵەکی مرۆڤی تێخستووە و لەدۆزەخ دەچێت، نموونەکانی تا ڕۆژگاری ئەمرۆمان هاتوون ڕوونیدەکەنەوە کە ئەو ژیانەی هێناویەتی بۆ بەشێکی کەم بەهەشتە بۆ ئەوانی دیکەش هەمووی دۆزەخە، کۆمەڵگای دەوڵەتی ــ شار خاوەن ناوەڕۆکێکی وەهایە کە لەهەموو لایەکەوە بانگێشی حوکمڕانی موڵکایەتی و فشار دەکات. فێرکردن و ڕاهێنانی مرۆڤی کۆمەڵگای سروشتی بۆ ئەو سیستەمە بەسانایی بەدینەهاتووە. لەلایەك حوکمڕانیکردنی زهنی تەواوی مرۆڤەکانی شار لەڕێگای خوداوەندە تۆقێنەرەکان, لەلایەکی دیکەشەوە پێشکەشکردنی ژن وەك ئامرازێکی لەرێ دەرخستن ـ یەکەمین سۆزانی ــ دوو پێڕەوی ژیانی ئەم سیستەمەن. بە ئەندازەی

چاودێری و کۆنترۆڵی ڕۆژانە پەسەندکردنی و سەپاندنی بەندایەتی تەنیا لەڕێگای ئەم دەزگا ڕیشەییانەوە مەیسەر دەبێت هەردوو دەزگاش تایبەتمەندییەکانی ئەفیۆنی ڕیشەیی لەخۆوە دەگرن.

کۆمەڵگای دەوڵەتشار لەمیانەی ئەو پێکهاتەیەی لەدەوروبەری یەکەمین نموونەی ڕەسەن پێکهات، لەقۆناخی دواتردا لەهەموو گۆڕەپان و بوارەکان پێکهاتەی بەرهەمهێنانی تۆکمە دەبێت. لەسۆمەر لەدایکبووەو لەوێش ونبووە. ئەو پێکهاتەو زهنیەتەیە کە بەشێوەی ئەڵقە یەك لەدوای یەکەکانی زنجیرەیەك تاڕۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە. نموونەی شارەکانی میسر، هیتیت و یۆنان بەردەوامییەکی کەمێك گۆڕاوی ئەو نموونە ڕەسەنەن. لەمیانەی بەڵگە مێژووییەکانەوە چەندە دەچێ دەسەلێنرێ ئەم پێکهاتە سیانییە وەك ئەڵقەی یەکەم نموونە ڕەسەنەکەی سۆمەریان بەبنەما گرتووە. هەرچی ئەوانەی دواتر هاتنە سەر ئەم ئەڵقە سیانییە وەك ئەڵقەکانی چین، هیند و ڕۆما دەگاتە ئاستی گەردوونی. لەبەرئەوەی ئامانجمان نووسینی مێژوو نییە لەسەر ئەم قۆناخە ناڕۆین. ئەوەی دەخوازین بیسەلێنین تاقانەیی و هەمیشەیی دەوڵەتە. تاقانەیی بەواتای هەبوون، هەمیشەییبوون لەبواری زەمەن لەدەوڵەتدا زۆر چالاکە. بەناوکردنی دووبارەبووەکان بەدامەزراوەی دەوڵەت هێندە شیتەڵکارانە نییە. چەندین جار شیکردنەوەی هەمان ناوەڕۆك واتایەکی وەها پێشناخات، تەنیا دووبارە بوونەوەیە.

کاتێك لەنزیکەوە لێکۆڵینەوە سەبارەت بەنموونەی سۆمەر بکرێ دەبینرێ کە هەر لەسەرەتاوە دوو کردەوە لەکۆمەڵگای دەوڵەتدا بەناویەکدا چووە :

یەکەمیان دەوڵەت وەك ئامرازی فشار و دەستڕۆیی، دووەمیان دەوڵەت وەك سیستەمی بەرهەمی گەلەری کەگوزەرانی تەواوی شار دابین دەکات. ئەم ناوەڕۆکە دووانەیەی وەك ناکۆکی سەرەکی دەوڵەت بەردەوام مرۆڤەکان خەریك دەکات, نەلەگەڵی دەبن, نەلەدژی. فشار وەك ئامرازێکی حوکمڕانی دەزگایەکە کە بەرگەگرتنی زەحمەتە، بەڵام وەك ئامرازی ئاسایشی گشتی و بەرهەمهێنان ئامرازێکی ژیانییە. لێرە کێشەی سەرەکی ئەوەیە ئایا هەر لەسەرەتاوە ئاسایشی گشتی و بەرهەمهێنان پێویستی بەفشار و دەستڕۆیی هەیە یاخود نا. ئایا بەبێ بوونی دەوڵەت ناشێ ئاسایشی هاوبەشی کۆمەڵگاو بەرهەمهێنان مەیسەر بکرێت؟ گەر فەراهەم بێت، ئەوکاتە وەك ئامێری توندوتیژی پێویستی بە دەوڵەت نییە. خاڵی ژیانی کێشەکە لێرەدایە. هەروەکو بڵێی برێك ماددەی بێهۆشکەر بخەیتە ناو خواردنێکی باش, دەوڵەت کراوە بە دەزگایەك کە وەك ئامرازێکی مەزنی بەرژەوەندیپەرستی وایە. وردەکاری سیستەمی دەوڵەتی راهیب بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەم جیاوازییەی پەردەپۆش کردووەو ڕێگای لەپێش دەرکەوتنی توێژێکی مشەخۆر کردۆتەوە. تەنانەت تیۆریزانێکی ئەنارشیستی وەکو " باکۆنین " یش کە دەوڵەت وەك " خراپی" یەکی ڕەها (موتڵەق) دەبینێ، گوتوویەتی ئەمە خراپییەکی ناچاری و پێویستە. مارکسیزمیش وەکو قۆناخێکی پێویستی هەڵسەنگاندووە. هەروەکو لە شیکردنەوەکانی دواتردا بەوردی نیشانی دەدەم، کەدەوڵەت وەك ئامرازی فشار و توندوتیژی نەئامرازێکی ناچاری پێشکەوتنە نەخراپییەکی ناچاریشە. هەر لەسەرەتاوە ئامرازێکی بێواتاو بەڵایە، هیچ ناچاریەك نییە و تا دەچێ بۆ چەتەیەکی تاڵانکار دەگۆڕێ. ڕاسترین پێناسە ئەوەیە کە لەیەکەم ڕۆژی لەدایکبوونییەوە وەك ئەو تەنە نەخۆشییەی کۆمەڵگا هەڵسەنگێنرێ کەپێویستە ڕیسواو گۆشەگیر بکرێ، لێبکرێتەوەو فڕێبدرێ. هەڵسەنگاندنی وەکو ئامرازی بەرهەمهێنان و ئاسایشی هاوبەشی کۆمەڵگاو ئامرازێکی کۆمەڵایەتی کە بەواتای کلاسیك بەدەوڵەت بەناو ناکرێت هەڵوێستێکی ڕاسترە. هەروەکو چۆن لەبەشی داهاتوودا بەشێوەیەکی گشتگیرتر پێناسەی دەکەم و ڕوونیدەکەمەوە, ئەوا بەناوکردنی ئەم شێوازەی پێکهاتەی کۆمەڵگا بە (دیموکراسی) گونجاو ترو واقیعی دەبێت. دەشێ نموونەی سەرەتایی دیموکراسی لەو پلەدارییە سوودبەخشە ببینین کە لە کۆمەڵگای سروشتی لەئارادایە. ئەو بەساڵاچووە بەئەزموون و ژن ــ دایکەی بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی ئەو کۆمەڵانە فەراهەم دەکەن کەپشت بەکەڵەکەکردن و موڵکایەتی نابەستن, تا دواڕادە پێویستن و فاکتەری سوودبەخشن. ڕێزگرتنی خۆبەخشانەی کۆمەڵە (کۆمرۆڤ) بەرامبەر ئەم ئەندامانە

لەئاستێکی بەرزدایە.بەڵام کاتێك گرێدانی خۆبەخشانە بۆ دەسترۆیی و سوودمەندی بۆ بەرژەوەندیپەرستی دەگۆڕدرێت, ئەو ڕەوشە خراپ بەکاردەهێنرێ. هەموو کاتێك ئامرازی توندوتیژی بێواتا لەسەر سەری کۆمەڵگا دەتەقێتەوە. پەردەپۆشکردن و خۆدەمامکدانی ئامێری توندوتیژی لەمیانەی بەڕێوەبەرایەتییەکانی ئاسایشی هاوبەش و بەرهەمی کۆمەڵکاری، گەوهەری سەرجەم ڕژێم و سیستەمەکانی فشار و چەوسانەوە پێکدێنێ. بێخێرترین پێکهاتەی دۆزراوەتەوە ئەمەیە. دۆزینەوەیەکی وەهایە کە تەواوی شێوەکانی کۆیلایەتی، فۆرمە مەترسیدارەکانی میتۆلۆژی و ئایینی، خوداکان و سیستەمەکانی قڕکردن و خاپوورکردن و لەناوبردنەکان لەگەڵ خۆی دێنێ کە دواتر پێشخران.

کاتێك مارکسیزم سەرهەڵدان و لەدایکبوونی ئەم قۆناخە ڕووندەکاتەوە، لەدەرکەوتنی کۆمەڵگایەکی پێشکەوتووخواز لەناو هەناوی کۆمەڵگا کۆنە دواکەوتووەکە ڕۆڵی مامانێتی بە (توندو تیژی) دەبەخشێ. ئەم هەڵوێستەی کەهەموومان لەگەڵیدا هاوفیکربووین لەڕیشەوە تەواوی چەمکەکانی دیموکراسی و ـــ شۆڕشی ـــ دەوڵەت، کردەوەکانی ڕێکخستن ـــ چالاکی سەقەتکردووین. وابزانم تا ئێستا تێپەڕکردنی ئەم ڕەوشە لەڕێگای ڕەخنەدانێکەوە لەم چوارچێوە فراوانەدا نەبۆتە شانسی هیچ یەکێك لە ڕەوتەکانی ئازادی و یەکسانی. هەر ڕەوت و تەریقەت و دەوڵەتێکی ئاواکراو و بزووتنەوە سیاسییەکان کەبەناوی گەلان و چەوساوەکان پێکهێنراون بەهۆی ئەم چەمکە سەقەتەوە لەوە ڕزگاریان نەبووە ڕێگا لەپێش ئەنجامی پێچەوانە نەکەنەوە.

هەروەکو لەلێکچواندنی " لێڤی ئاتۆن " یش دەرکی پێدەکرێت لەڕاستیدا نەریتی دەوڵەت وەك ئامرازی حوکمڕانی (فەرمانڕەوایی) جانەوەرێکە لەخوێن و چەوساندنەوە تێرنابێت، هەرخانەیەکی بوونەوەرێکە لەسەر خوێن دەژی. لەچەندین نموونەدا دەبینین کە ئەم جانەوەرانە تەنانەت ئەو کەسانەی بەچاوی خاوەنیش تەماشای دەکەن بەبێ چاو تروکاندن بەهادارترین بوونەوەرەکانی لەنێو دەبات، دەیانکاتە قوربانی، تەواوی نەریتە ئەخلاقییەکانی کۆمەڵگا وەك باگووردان " ڕۆڵا " دەشێلێ و دەیانپلیشێنێتەوە. لەکاتێکدا سوڵتانێکی عوسمانییەکان بۆ سەلامەتی دەوڵەت لەشەوێکدا حەڤدە برای خۆی دەخنکێنێ، دەردەکەوێت ئەوەی خاوەنی ئەم ئامرازەیە زۆرباش دەزانێ پێویستیی ئەو ڕێسایەی جێبەجێکردووە کەپێیەوە گرێدراوە. تەواوی مێژووی ڕۆما، مێژووی ئێران، لەژێر سایەی ئایدیۆلۆژیەکانی دەمامککردن ونمایشکردنی نموونە لەژمارە نەهاتووەکانی مێژووی دەوڵەت کەئامرازی توندوتیژی ئارەزووەمەندانەیە وەك ئەرکێك لەقەڵەم دەدەن. لە قووڵاییدا لێکۆڵینەوە سەبارەت بەو زهنییەت و دەزگا کۆمەڵایەتییانەی دیاردەی دەوڵەت شێوەی پێداون گرنگی و بایەخێکی مەزنی هەیە، نامۆبوونی زهنییەت لەسروشت،ئەو جیابوونەوە چینایەتییانەی ئەقڵ و خەیاڵ بۆی ناچێت, چەندین ڕێکخستنی تایبەت و دەزگابوونە سەربازییەکان هەمووی داهێنانەکانی ئەو ئامێرەی توندوتیژین. لەو کولتوورەی کە کاروخەبات بەگێلی لەقەڵەمدەدات و دەسکەوت و تاڵان شکۆدار دەبینێ، لەچەمکێکی خودایی کەبەردەوام فەرمانی بەجێگەیاندنی داواکارییەکانی دەدات, تادەگاتە ئۆتۆپیا ساختەکانی بەهەشت و دۆزەخ، کە گشتی جیهانی مشەخۆرەکانە، وەکو شکۆدارترین سوڵتان، قەیسەر، شێخ، دەجال و ئیمپراتۆر بۆ ئاستی خوداوەند بەرزو شکۆمەندکراون. ئەو خوێنەی هەزاران ساڵە بە لێشاو دەڕێژن بەناوی ئەم شکۆمەندییە بێ ناوەڕۆکانەوە بووە.

بەخشینی ناوەڕۆکێکی شۆڕشگێڕی بەئامێری خۆسەپاندن لەڕاستیدا هیچ جیاوازی لەگەڵ بەخشینی ڕۆڵی شۆڕشگێڕانە بەشێر نییە. لەکاتێکدا پێناسەی دەوڵەت لەلایەکەوە بەمشێوەیە پێشدەخرێ, نکۆڵیکردنی کاریگەرییەکانیان لەسەر شێوەگرتنەکانی کۆمەڵگا بەرەو ئەنارشیزم دەچێت. لەهەردوو لایەنەوە دەوڵەت دیاردەیەکەو لە گووتنی دوا قسەدا بەردەوام ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی هەبووە. تاوەکو ئەم لایەنانەی نەخرێتەڕوو ئەوا ڕێگا لەپێش پێناسەیەکی زۆر ناتەواو دەکەینەوە. ئەوەی پێویستە هەوڵی ئەنجامدانی بدەین جیاکردنەوەی لایەنە بێواتاکانی دەسەڵاتی دەوڵەتە لەگەڵ لایەنە

پێویستەکانی، نابێ وەك خراپیەکی پێویست و ناچاری یاخود وەك پێکهاتەیەکی شکۆدارو پیرۆز هەڵوەستە لەبەرامبەر ئەم دیاردەیە بکەین. گەورەترین هەڵەکانی ژیری (هزری) مرۆڤ لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم هەڵوێستە یەکلایەنانەیە.

کاتێك دەڵێین تایبەتمەندێتی بنەڕەتی دەوڵەت وەك خۆی ماوەتەوە, ئاشکرایە کە نەمانخواستووە بڵێین دووچاری گۆڕانکاری شێوە نەهاتووە. بەپێچەوانەوە هاوشێوەبوونی ناوەڕۆك گۆڕانکاری بچم دەکاتە پێویستییەك، تەنانەت ئەم پرەنسیپە دیالەکتیکییە سەبارەت هەموو دیاردەیەك لەجێی خۆیدایەو پەیڕەو دەکرێت. چاودێریکردن و لێوردبوونەوەی دەوڵەت لەکۆمەڵگای کۆیلەداری کە تێیدا بەقوولی و بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بەردەوام بوو زانیارییەکانمان دەوڵەمەندتر دەکات.

پوختەترین دۆخی دەوڵەتەکانی کۆیلەداری لە یەکەمین کۆمەڵگای سۆمەر و میسر دەبینین. فۆرمەکانی دەوڵەتی کۆیلەداری سۆمەر و میسر گۆڕانکاری ڕیشەییان لەشێوازەکانی بەدەزگابوونی ئابووری, کۆمەڵایەتی و هزری و پێشکەوتنی کۆمەڵگا بەجێکردووە. جیهانی هزری (زهنی) کۆمەڵگای سروشتی پشت بەچەمکی سروشتی زیندوو دەبەستێ. هەموو دیاردەیەکی سروشت بەخاوەن ڕۆح (گیان) دادەنرێت. ڕۆح بەو تایبەتمەندییە دادەنرێت کە زیندووبوون مەیسەر دەکات. لەچەمکی ئایینی تەوتەمەیشدا هێشتا چەمکێکی خودایی بەمشێوەیە پێشنەخراوە کە لێیان جیاوازتر بێت و لەدەرەوە حوکمڕانیان بکات. گرنگییەکی مەزن بەڕێککەوتن لەگەڵ ڕۆحەکانی سروشت, واتە ڕێککەوتن لەگەڵ هێزەکانی سروشت, بایەخی پێدەدرێت. بەپێچەوانەبوونەوەی یەکسانە بەمردن. کاتێك ئەمە تاکە ڕوانگەبێ بۆ سروشت پێویستییەکی نائاسایی بۆ خۆگونجاندن دەردەکەوێتەروو. بەگوێرەی سەرەکیترین پرەنسیپی ژینگەناسی ڕووبەڕووی ژیان بووینەتەوە. پێچەوانەکەوتنەوەی ژیانی کۆمەڵگا لەگەڵ هێزەکانی سروشت بابەتێکە هەرەزێدە لێی دەترسێ و خۆی لێ بەدوور دەگرێ. کاتێك ئایین و ئەخلاق پێشدەخەن ئەو پرەنسیپە سەرەکییەی ڕەچاو دەکرێت پرەنسیپی کۆکبوونە لەگەڵ ژینگە و هێزەکانی سروشت. ئەم پرەنسیپەی ژیان هێندە لە قووڵایی هزر بەجێبووە, وەك نەریتی ئایین و ئەخلاق لەلای سەرەوە جێگیر دەکرێت. لەڕاستیدا ئەمە بەجێکردنی پرەنسیپی لێشاوێکی گشتی ژیانی سروشتییە لەکۆمەڵگای مرۆڤ. هیچ پێکهاتەیەك (بوونەوەرێك) نییە دەوروبەر (ژینگە)ی خۆی بەبنەما نەگرێت. لادانە کورتخایەنەکانیش لەگەڵ لێشاوەکە لەژێر هەلومەرجە نوێکانی ناوەوەو دەرەوە لەگەڵ قۆناخ دەبێتەیەك؛ لەدۆخێکی پێچەوانەدا بەتەواوی لە دەرەوەی سیستەم دەمێنن و هەبوونی خۆیان لەدەستدەدەن. گرنگی پرەنسیپی ژینگەناسی لە کۆمەڵگای مرۆڤدا سەرچاوەی خۆی لەم بابەتە سەرەکییەی سروشت وەردەگرێت.

پێکهاتنی کۆمەڵگای دەوڵەتگەرایی کۆیلەداری لەم پرەنسیپە ژیانییەوە ڕێگا لەپێش لادانێکی جددی دەکاتەوە. پێکهاتنی کێشەی ژینگە و سروشت پەیوەندییەکی توندی لەگەڵ دەستپێکردنی شارستانییەت و کۆمەڵگاکەی هەیە. شارستانییەتی کۆمەڵگای چینایەتی ئەو کۆمەڵگایەیە کە لەگەڵ سروشت ناکۆکە. هۆی سەرەکی ئەم کێشە دیاردەگەراییە پەیوەندی بە جیهان و چەمکی زهنیەتی کۆیلەداری کۆمەڵگای نوێوە هەیە کە لەڕێگای شۆڕشێکی چەواشە پێکهات. لە کۆمەڵگای سروشتیدا تەواوی ئەندامانی کۆمەڵە (کۆمرۆڤ) لە ناو یەکپارچەیی ژیان بە شێوەیەکی ئۆرگانیك جێگای خۆیان دەگرن. باوەڕی و هەرستەکانیان هاوبەشە. بیرۆکە و چەمکەکانی خەڵەتاندن و درۆ بە هیچ شێوەیەك سەریهەڵنەداوە. هەروەکو بڵێی بە زمانی منداڵێتی لەگەڵ سروشت دەپەیڤن. فەرمانڕەوایی کردنی سروشت، بە خراپ بەکارهێنانی، لە لایەن یاسا کۆمەڵایەتییە نوێکان واتە لە لایەن ئایین و ئەخلاقەوە بە گوناح و تاوان ـ تابۆ و خراپە ـ دادەنرێت.

ئەوەی لە کۆمەڵگای دەوڵەتی کۆیلەداری پێچەوانە کراوەتەوە ئەم چەمکە ئەخلاقی و ئایینییە بنچینەییەیە.

بۆ بەدەستهێنانی مەشروعیەتی کۆمەڵایەتی بە ئەندازەی توندوتیژی پێویستی خۆی بە تەڵەکەبازیش نیشاندەدات. ئاستەمە تەنیا لە ڕێگای توندوتیژییەوە سیستەمی کۆیلەداری بەڕێوە ببردرێت. تاوەکو کۆمەڵگا بە باوەڕی ریشەیی گرێنەدرێت ناتوانن بەردەوامی بە سیستەم بدەن.

بەڵێ دۆزینەوە ئایدیۆلۆژییە سەرەکییەکەی راهیبەکانی سۆمەر و میسر لەم قۆناخە بوو کە ئیتر تەواوی مێژووی گرتەوە و کاریگەرییەکانی تا رۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە. ئەو بابەتە نوێیانە و شێوازی بیرکردنەوە (ئەفسانە) کە دایانهێناوە سەرەکیترین ئامرازی مەشروعیەتکردنی سیستەمە. سەرەکیترین تایبەتمەندێتی ئەم میتۆلۆژیانە میتۆلۆژی واتە چیرۆك، ئەفسانە بەشێوەیەکی کاملانە جیهانی خوداوەند واتە جیهانی ئەفەندیە تازە هەڵکشاوەکان شکۆمەند دەکات و دەیشارێتەوە. فەرمانڕەوایەتی پێکهێنراوی چینی کۆیلەداری لەگەڵ ئیلاهیبوون بە ناویەکدا چووە. هەروەکو چۆن ئەفەندیە ــ ئەربابە ــ نوێکان بە بێکارکردن تەنیا لە میانەی فەرمانڕەوایەتی خاوەنی ژیانێکی تەخت ـ کۆشکی بێ هاوتان، وەك گریمان (پێکهاتە) سەمبۆلییەکەیان ـ رەمزیەکەیان ــ خواوەندەکانیش بەم شێوەیە لەسەرووی تەواوی هێزەکانی سروشت جێگیر دەکرێت. حوکمڕانی کۆمەڵایەتی رەنگدانەوە و کاریگەری کردۆتە سەر حوکمڕانی سروشت. ئایینی خوداوەندەکان زاڵ کراوە کە فەرماندەکاتە سەر ئایینی رۆحگەرایی سروشتی. لە جیاتی روونکردنەوەی قۆناخە سروشتییەکان لە ڕێگای رۆحەکانەوە روونکردنەوە لە میانەی خوداوەندەکان دەبێتە ریشەدارترین گۆڕانکاری زهنی.

لەجیاتی شۆڕش بەناوکردنی وەك شۆڕشی چەواشە هۆکاری خۆی هەیەو دەرکی پێدەکرێت. چونکە تایبەتمەندی دەستپێکردنی مەترسیدارترین و خراپترین قۆناخی هەیە لەمێژوودا. کەمێك بە قووڵایی ڕۆشنکردنەوەی بابەتەکە سوود و بایەخێکی ژیانیی هەیە. چەمکی سروشتی زیندوو بابەتێکە لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا لەلایەن دەوروبەرەکانی زانست گفتوگۆی لەسەر دەکرێت. کاتێك " تیۆری فیزیایی کوانتۆم " مان پێناسەکرد بەکورتی ئاماژەمان پێکردبوو. لەڕاستیدا ئەگەر بەشێوەی کۆمەڵگای سروشتیش نەبێت، یەکێك لە روانگە شۆڕشگێڕییەکان پەسەندکردنی ئەوەیە کەهەموو دیاردەیەکی سروشتی کرداری خۆی ـ ئەو یاسایەی لەناویدا دەجوڵێتەوە، ئاستی واتایی بوون ــ هەیە. ئەو زیندە چالاکییەی گەوهەری ماددیکراو بەڕێوەدەبات، ئەو وزەیەیە کەخاوەنێتی. وزە ئەو ڕاستینەیە کەمادده نییە: لە واتایەکدا رۆحی ماددەیە. هەموو ڕۆژێك ئەنجامدانی کرانەوە بۆ سروشت لەمیانەی جۆرە جیاوازەکانی وزەوە، بۆ ئاستێك بەرزدەبێتەوە کەقەت نەبینراوە. کاتێك دەڵێین ئایندە دەبێتە (نانۆ تەکنۆلۆژی ــ تەکنۆلۆژیای ورد) فیزیای کوانتۆم، مەبەست ئەو گۆڕانکاریەیە. لەئەنجامدا هەرچەندە جیاوازیش بێت, شێوازی کۆمەڵگای یەکەم لەمیانەی ئاڕاستەی سروشتی خۆیەوە لەناو هەماهەنگی دایە، لەڕێگای چەمکێکی ڕاست و ژینگەناسیەوە ژیان بەبنەما دەگرێت. لەکاتێکدا کێشەی ژینگە وەکو گەورەترین هەڕەشە لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ڕووبەڕووی مرۆڤایەتی دەبێتەوە، ئەمە ڕاستینەی دابڕانە لەم پرەنسیپە سەرەکییە. زهنییەت و شێوازی بەرهەمهێنانی شارستانییەتی کۆمەڵگای چینایەتی بناخەی ئەم دابڕانە پێکدێنێ.

دووەمین مەسەلەی گرنگ بەباتەکە، ئەنجامدانی قەڵەمبازێکی مەزن و مەترسیداری دابڕانی پەیوەندی نێوان ژیری سۆزداری و ژیری ئەنالیتیك (پۆزەتیڤیست)ە. ژیری سۆزداری ژیری تایبەتی تەواوی گیانلەبەرەکانە. بەواتایەك ئەو زیندە بکەرەی تایبەت بە قۆناخە سروشتیەکانە, واتە لەجێگای هزرە. ژیری سۆزداری لەپێشکەوتنی زنجیرەی پەرەسەندن بەرەو جۆری مرۆڤ مەیلێك دیار دەکات کەبەرەو ژیری ئەنالیتیکی دەچێ. بژاردنی خێراتر لەژیری ئەنالیتیك، وادەکات توانستی ئەنجامدانی گۆڕانکاری لەلا بەهێز بێت. بەڵام لایەنی شێواندن و بەلادابردن ئاستێکی هاوشێوەی هەیە. سەرباری ئەوەی ژیری سۆزداری ساکارە, خاوەنی دڵنیاییەکی تایبەت بەئارەزووەکانی ناواخنە. ئەمەش واتای گۆڕینی کاردانەوە مەرجدارەکانە بۆ بێ مەرجەکان. سەرباری ئەوەی ئارەزووەکان سادەترین شێوەکانی فێربوونە, بەڵام پێکهاتەی ئارام و جێگیرن. بەرهەمی ئەزموونی

هەزاران ساڵانن. هەربۆیە زوو هەڵناخەڵەتێن. تایبەتمەندێتییەکی دیکەیان, لەگەڵ ژیان لەناو پەیوەندییەکی توندوتۆڵدان. لەساتی خۆیدا پەرچەکردار بەرامبەر ئەو هەلومەرجە ناوخۆیی و دەرەکیانە نیشاندەدەن کە هەڕەشە لە ژیان دەکەن یاخود پەیوەندیداری دەکەن. بەڵام ئەم لایەنەیان وادەکات بەخێرایی ڕۆڵی ژیری ئەنالیتیك بگێڕن. دیسان ئەوەی بۆ ژیان بەبناخە بگیرێت ژیری سۆزدارییە. شرۆڤە ناکات، دەژێنێ. شرۆڤەکردن چەندە پەرەیسەندبێ، ئاستی لادانیش بەو ئەندازەیە زیاددەبێت. هەرچی ژیری ئەنالیتیکە شرۆڤەی زیاتر پێشدەخات و هەوڵدەدات لایەنی نوێ و شێوەی هەڵسوکەوت بەژیری سۆزداری ببەخشێ, زیاتر تایبەت بەجۆری مرۆڤە پێگەیشتووەکانە. هەروەکو دەزانرێ ژیانی جۆری مرۆڤ بەشێوازی کۆمەڵایەتی گرێدراوی ئاستی گەشەکردنی ژیری زانستی " ئەنالیتیك " یە. بەڵام لەبەرئەوەی لەلایەنی سۆز بێبەشە دوای ئەوەی فێری کولتووری شەڕو دەسەڵات کرا، ژیری ئەنالیتیك سامناك دەبێت، گوزارەی هەرە زەق و بەرچاوی ئەم ژیرییە لەشەڕە وێرانکارەکانی قۆناخی نزیکدا نیشاندرا. لەبەرئەوەی بەشێوەی سیستەمی ئامێرێك کاردەکات, لەسۆزەکانی ئێش, ترس و خۆشەویستی بێبەشە و ئاشنانەبوونی بەپەیوەندی و بەناوداچوونی مەسەلەکان ئەم تایبەتمەندێتییە بکوژ و ماڵوێرانکاریەی مەترسیدارتر دەکرد. بەرامبەر ئەمەش کاتێك بەهەمئاهەنگی لەگەڵ ژیری سۆزداری کار بکات ڕۆڵێکی دیاریکراو دەبینێ لەپێکهێنانی تاك و کۆمەڵگای تەندروستانەی خاوەن توانستێکی بەرزی شیکردنەوە.

ئەوەی لە کۆمەڵگای دەوڵەتی کۆیلەداری ڕوویداوە دابڕانی گەورەی نێوان ئەم دوو جۆرە ژیرییەیە. بۆیە یەکەمین جارە لەئاستێکی بەرزدا ڕووبەڕووی ژیری و مێشکی چینایەتین کە لەژیری سۆزداری کۆمەڵگای سروشتی دادەبڕێ و تەنیا لەهونەری فشار و چەوسانەوە قاڵدەبێتەوە. ئەمە گۆڕانکاری و پێشکەوتنێکە ڕێگا لەپێش ئەنجامی زۆر مەترسیدار دەکاتەوە. زێدە ــ بەرهەمی زیاتری بەرهەمهێنانی کۆیلەداری کە پشت بە زێدە ـ بەرهەمی سەردەمی کۆمەڵگای نئۆلیتیك پێشکەوتووە زەمینەی ماددی (بابەتی) ئەم پێکهاتە چینایەتییەیە. تەنیا لەڕێگای بەڕێوەبردنی بەرهەمهێنان تاڕادەیەکی مەزن دەستبەسەر بەرهەمەکاندا دەگرێت. ئەوکاتە نۆرە دەگاتە سەر خولقاندنی ڕەوشی زهنییەتی نوێ بۆ پاراستنی ئەم چەشنە بەرهەمهێنانە. ئەو میتۆلۆژییە خوداوەندییە نوێیانەی حوکمڕانی دەکەن ئەنجامی لێگەڕینی ئەم زهنییەتەیە. قۆناخێکی ڕیشەیی ژیری ئەنالیتیکی جێگای باسە. دۆزینەوەی ڕێساکانی بەڕێوەبردنی بەندەکان و نیشاندانی وەکو فەرموودەکانی خودای جاویدانی بابەتێکە ئەمجۆرە ژیرییە بەفراوانی کاری لەسەر دەکات. گەورەیی ڕاهیبەکانی سۆمەر و میسر بۆ گرنگی و بایەخی مەزنی ئەم بابەتە دەگەڕێتەوە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا. ژیرییە دابڕاوەکانیان لە کۆمەڵگای سروشتی و ژیان سیستەمێکی گریمانەی میتۆلۆژی زەبەلاحی خوڵقاندووە. بۆ ئەوەی بەندەکان باوەڕ ی بەوە بێنن سیستەمێکی ئەفسووناوی پەرستگا و پەیکەرەکانیان ئافراندووە. لەجیاتی ئایینە ڕۆحگەراییەکانی کۆمەڵگای سروشتی کە بێ هەڕەشە و مەترسی بوو, ئەو ئایینە بەجێکرا کە فیکری خوداوەندی حوکمڕان بەبنەمادەگرن و ملکەچکردنی هەمیشەیی کۆمەڵگا پەرەپێدەدەن. هەستی ترسیان چەواشەکردووە، بەوردەکاری و گرنگیپێدانەوە لەبەندەکانیان گەیاندووە بۆچی پێویستە لەخوداوەند بترسێن و گەر ڕەچاوی فەرموودەکانی بکەن چۆن خەڵات وەردەگرن. بۆ یەکەمین جار ئەو ئۆتۆپیایانەیان دۆزیوەتەوە کە ناوەڕۆکەکەی بەهەشت و دۆزەخی تێدایە. لەڕاستیدا لەپێناو هەمئاهەنگی گشتگیری چینی نوێی ئەفەندی (ئەرباب)ەکان سیستەمێکی ئایدیۆلۆژی پێشدەخرێت کەمیتۆلۆژیبوونی شێوازی هزر لەگەڵ ڕۆحی قۆناخ گونجاوە. ئایینی زیندووگەرایی (ئاینمیزم) لەڕاستیدا یەکسانیخواز و ئازادیخوازە. هەرچی ئایینە نوێیە میتۆلۆژیەکەیە ئایینێکی چینایەتی، نایەکسانی و کۆیلەدارییە. فەرمانی ملکەچکردنی ڕەها و بەبنچینەگرتنی خوداوەندەکان ـ ئەربابەکان ـ دەفەرمووێت، ئەم شۆڕشە چەواشەکاریەی لە مێژوودا دژ بەزهنییەت ئەنجامدرا لەڕاستیدا یەکێکە لە قەڵەمبازە هەرەگەورەکانی ژیری ئەنا لیتیك: گەشەکردنی مێشکی چینایەتییە. ئیتر لەمەودوا مێژوو, ئەدەبیات (وێژە)، هونەر، مافپەروەری و سیاسەت لەمیانەی ئەم هزرەی چینایەتی سەرلەنوێ

دەخولقێندرێتەوە. لە میتۆلۆژیای سۆمەر و میسر دۆخی ڕەسەن و هەرە بەهێزی ئەم قۆناخە دەبینین. ئیتر ئایدیۆلۆژیای چینی باڵادەست و چەوسێنەر کەوتۆتە ڕاستەڕێی بوون بەکۆمەڵگای باڵا و کۆمەڵگای دەوڵەتگەری. هەر هەنگاوێکی لەم بوارەوە بهاوێژری بەناوی تەواوی کۆمەڵگا ئەنجام دەدرێ، دەکرێتە مولکی تەواوی کۆمەڵگا. ئایدیۆلۆژیای خوداوەندی دایك کە لەکۆمەڵگای سروشتی ماوەتەوە, چەندەی دەچێ دەچەوسێنرێتەوەو بێناوەڕۆك دەکرێ و دووچاری توانەوە دەبێ، دەخرێتە خزمەتی سیستەمی خوداوەندی پیاو. هەروەکو بەکارهێنانی ژن لەخزمەتی پیاودا.

سەرەتای سۆزانیبوونی تایبەت و گشتی تەواوی ئەندامە ئازاد و یەکسانەکانی کۆمەڵگای سروشتی بۆ چینی بەندە نوێکان دەگۆڕدرێت. داستانێکی (ئەفسانەیەکی) سۆمەری دەڵێ مرۆڤ لەپیسایی خوداوەندەکان دروستکراوە. دیسان بۆ یەکەمین جار لەئەفسانەکانی سۆمەری باس لەوە دەکرێت کە ژن لەپەراسووی پیاو دروستکراوە. بەڕاستی میتۆلۆژیای سۆمەری سەرکەوتنێکی نائاساییە, کاریگەری کردۆتە سەر تەواوی میتۆلۆژیاکانی کەدواتر هاتوون، یەکەمین سەرچاوەی ئایینی تاکخودایی و وێژە و مافپەروەری (یاساناسی) بووە. تایبەتمەندی گلگامێش کە لەداستان ئاماژەی پێدەکرێت، کاریگەرییەکی هاوشێوەی لەسەر تەواوی داستانەکانی جیهان نیشانداوە. لەبەرئەوەی بونیادی زهنی سۆمەریەکان بابەتی شیتەڵکاری گشتگیرمان نییە، بەڵام وەکو ناوەڕۆك ئەوە دیاردەکات کە مێژوو و شارستانییەت تەنیا لەڕێگای فشار دەستی پێنەکردووە، بەڵکو ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە کە بونیادی زهنی سۆمەریەکان سەرچاوەی سەرەکی ژێری ئەنالیتیکیانەیە. پێویستە لەم ژێرییەدا لەسەرچاوەی هزری میتافیزیکی بگەڕێین کە دواتر پێشکەوت. دەستەیەك ئەفەندی (ئەرباب) باڵا لەژیانی کۆشکە بەهەشت ئاساکان تەنیا ڕۆژی خۆیان بەسەر نابەن، بەڵکو بناخەی جیهانی ئەو ئەفسانەو ئۆتۆپیایانە دادەنێن کەبەردەوام مرۆڤایەتی دەخەڵەفێنێ و سەرگەرمی دەکات. ئەوەی لێرەدا پێکدێت بەدەزگاکردنی درۆی کۆمەڵگای گەورەو جێگیرکردنییەتی لەزهنییەتی تەواوی مرۆڤایەتیدا: ئەمەش لەڕێگای هەموو جۆرەکانی ئەفسانە، داستان، پەرستگا، قوتابخانەکان ئەنجامدەدرێ.

ئەو شۆڕشە چەواشەیەی وەك وەرچەرخانی ڕیشەیی زهنییەت لەمێژوودا لەکۆمەڵگای سۆمەر هاتەئاراوە، لەسەرەتادا کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی ناوین، لەڕیشەوە جیهانبینی (پارادیگما)ی تەواوی مرۆڤایەتی گۆڕیوە. کۆمەڵگای سروشتی زیندووە، چەمکی تایبەت بەگەردوون و سروشت هەمەڕەنگ و ئافرێنەرە. سروشت وەك دێوێکی زۆردار نابینێ. وەکو دایکێکی دەبینێ. وشەی " ئامارگی " کە لەزمانی سۆمەریەکاندا واتای ئازادی دەبەخشێ, لەهەمانکاتدا بەواتای گەڕانەوە بۆ دایکیش دێت. تەنانەت ئەم بیرۆکەیەش بەشێوەیەکی زۆر باش ناوەڕۆکی ئەم دژە شۆڕشەی زهنییەت ڕووندەکاتەوە. هەرچی لەڕوانگەی میتۆلۆژیای نوێدایە گەردوون و سروشت پڕن لەخوداوەندە سزادەرەکان. ئەو خوداوەندانەی بۆ دەرەوەی سروشت بەرزکراونەتەوەو چەندەی دەچێ خۆی حەشار دەدات ــ لە ڕاستیدا دەسپۆتە چەوسێنەر و زۆردارەکان ــ هەروەکو بڵێی سروشتیان وشك کردووە. چەمکی سروشت و ماددەی مردوو پێشدەخرێت. هەروەکو ئەو بەندانە (کۆیلانەی)ی لەپیسایی خوداوەندەکان دروستکراون تەواوی بوونەوەرو گیانلەبەرانیش بچووك و نزم دەکرێنەوە. ئەم پارادیگمایە (جیهانبینییە) چەندە دەچێ قووڵدە بێتەوە، تەنانەت دەبێ وەکو هۆکاری ڕەوشی ئیفلیجی زهنییەتی کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی ناوینی ڕۆژگاری ئەمرۆمان و ڕێگرتن لەبەردەم هاتنەوە هۆشی خۆی ببینرێ. ئەوروپا لەڕێگای تێپەڕکردنی ئایینی مەسیحی بەریفۆرم و شۆڕشی کۆپەرنیك توانی ئەم پارادیگمایە بشکێنێ. یەکێك لەبلیمەتەکانی ڕێنێسانس جیۆردانۆ برنۆ بەهۆی بەرگری بەهێزی لەچەمکی سروشتی زیندوو بەزیندوویی سووتێنرا. لەبەرئەوەی ئەم پارادیگمایە ڕەنگدانەوەی کاریگەری خۆی نەکردۆتە سەر کۆمەڵگاکانی وڵاتانی وەکو چین و ژاپۆن بەشێوەیەکی خێراتر لەگەڵ گۆڕانکاریە پۆزەتیفەکان ڕادێن. چەمکی گەردوونی زیندوو ڕۆڵێکی سەرەکی لەمەدا دەبینێ. هەروەها شێوازی هزری فەلسەفی و تێپەڕکردنی میتۆلۆژیاکانی سۆمەر و میسر لەجیاتی ئەو بەبنەماگرتنی گریمانە میتافیزیکی و دیالەکتیکییەکان ڕۆڵێکی هاوشێوەی لەگەشەکردنی شارستانییەتی گریك ــ

ڕۆما بینی. لەکاتێکدا وەك بیرۆکەو چوارچێوە دەوڵەت لە منداڵدانی پەرستگای ڕاهیبەکان پێکدێت، بەڵام ئەوەی لەبنەڕەتدا دەیکات بەدەزگا و هێزی دەسەڵات ئەنجوومەنی پیرانی کۆمەڵگای پلەداری و دەستوپێوەندی بەرپرسیارە سەربازیەکانن. دەسەڵاتی دەوڵەت لەمیانەی پەیوەندی و ناکۆکییە چڕو درێژخایەنەکانی نێوان ئەم سێکۆچکەیە دیاری دەکرێت. کاتێك سەرەتا پادشای ـ راهیب باڵادەستبوو چەندەی دەچێ سەرەتا ئەنجوومەنی پیران جێگای دەگرێتەوە، دواتریش ئەوکاتەی هێز دەبێتە بڕیاری یەکلاییکردنەوە باڵادەستی بەرپرسی سەربازی پێشدەکەوێت. لەداستانی گلگامێشدا ئەم قۆناخە بەزمانێکی میتۆلۆژی شیعر ئامێزانە باس دەکرێت. خودی گلگامێش نوێنەرایەتی بەرپرسی سەربازی و قارەمانەکە دەکات، ڕاهیبە ژن و پیاوەکانی جارانیش زۆر بێ هێز کەوتوون. هەرچی ئەنکیدۆیە وەك یەکەمین نموونەی ئەو سەربازە کۆکراوانە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە کە لەدەرەوەی عەشیرەت لەناو بەربەرەکان هەڵبژێردراوە. ڕێکخستنێکی دەرەوەی خزمایەتی پێشدەکەوێت. کاریگەری ئەفسووناوی هێز، هەم بۆ یەکەمین جار ڕێگا لەپێش ملکەچکردنی بەرامبەر دەکاتەوە, لە هەمانکاتیشدا وەك خاوەن بەرهەمی زێدە ڕێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە خۆی وەك پادشای ـ خوداوەند بناسێنێ. ئەو قۆناخە دەستپێدەکرێت کە خۆپەرستی مرۆڤ خۆی وەکو گەورەترین ڕابگەیەنێ. ئیتر سروشت و کۆمەڵگا وەك بەرهەمێکی پادشای ــ خوداوەند نیشاندەدرێ. تەواوی میتۆلۆژیەکان گرنگی بە لەپێشینەیی ئەم باسە دەدەن. چەمکی " خاوەنی هەموو شتێك خوداوەندە " سەرچاوەی خۆی لەمیتۆلۆژیای سۆمەر و میسر وەرگرتووە. لەرێگای ئەم سەرچاوەو ماتریالانەوە لەناو پەرتووکە پیرۆزەکاندا ڕەنگدەداتەوە. بەمجۆرە دەسەڵاتی دەوڵەت دەکرێت بەبێ کۆتایی. چەمکی دەوڵەتی هەتاهەتایی کە تائێستا وەکو دروشم دەوترێتەوە سەرچاوەی خۆی لەمەوە وەردەگرێت. گەر دەوڵەت گەشەی نەکردبوایە، بەتایبەتی لەڕێگای میتۆلۆژیاوە پڕچەك نەکرابووایە, لە دەزگایەکی سادەی چەتە، یاخود ڕێکخستنێکی چەتە بەولاوە تێپەڕی نەدەکرد. سوودبەخشی دەسەڵاتی دەوڵەت بۆ قۆناخ وایکردووە هاوشێوەی دەزگایەکی خودایی نائاسایی ببینرێ و لەتەواوی هزرەکاندا جێگیر و زاڵ بکرێت. لەم واتایەدا دەشێ وەکو وردەکارترین ڕێکخستنی زەوتکردن ببینرێ. لەم خاڵەدا هێزی ئایدیۆلۆژیا ڕووبەڕوومان دەبێتەوە. وادەکات ئەم ڕێکخستنە گەورەیەی زەوتکردن وەکو دەزگایەکی پیرۆزیی فەرموودەی خودایی بناسرێت. لەشوێنێکدا چەندە دەسەڵاتی دەوڵەت شکۆدار دەکرێ و بەشان و باڵی هەڵدەدرێ، دەبێ بزانین لەوێدا دزی و بەرژەوەندیپەرستییەکی مەزن شاردراوەتەوە. پادشا ـ خوداوەندەکان کاتێك خۆیان پێشکەش دەکەن، ئاگاداری ئەم ڕاستییەن و بەم شێوەیە بەدەزگا دەبن. کۆشکە ڕەونەقدار و جوانەکان، دارودەستە سەربازیەکانی لەبەهێزترین کەس پێکهاتوون. هەواڵگرییەکی باش, حەرەمسەرایەکی بەکاریگەر، خانەدانێکی بەناوبانگ، داری ڕەچەڵەك کە لەکام خوداوەندەوە هاتووە، وەزیرە ماستاوچییەکان و بەندایەتیکردن فاکتەرە سەرەکی و ژیانییەکانی ئەم بەدەزگابوونەن. لە بنەڕەتدا گۆڕستانی ئەهرامەکان کۆشکی جیهانێکی بەردەوامە. جلوبەرگ، گۆپاڵ و مۆرەکەیان ئەو مروارییانەن کە لێیان کەم نابێ. ئیتر ئەو ئەرکەی دەکەوێتە سەرشانی بەندەکان و تەواوی ئەندامانی کۆمەڵگا سوپاسگوزاری و پەرستنی بەردەوامی ئەم دەزگا ئیلاهییە گەورەیەیە. سەبارەت بەخاسیەتەکانی خوداوەند لەپەرتووکە پیرۆزەکان، ژمارەی زۆری چەمك و بیرۆکەکان هەم دووبارەکردنەوە, هەم شێوازێکی گۆڕاوی لاساییکردنەوەی ناو تایبەتمەندێتییەکانی یەکەمین پادشا ــ خوداوەندەکانی سۆمەر و میسرە کە لەکاتی مردنیان ــ ڕاستتر کاتی چوونیان بۆ دونیای دیکە ـ تەواوی داروەستەکەی بەزیندوویی لەگەڵیاندا ژێرخاك دەکرێن. چونکە داروەستە لەئەندامەکانی جەستەی پادشا جیاوازتر نابینرێ. لەگۆڕنانیان لەگەڵ جەستە بنەڕەتەکە بۆ ئەوەیە لە دونیای دیکە خزمەت بکەن. ئەو ڕەچەڵەکەی دەمێنێتەوە بۆ بەردەوامکردنی بنەچەی پادشایە. وشەی (جاویدانی) تا ڕادەیەك بەمشێوەیە ئافرێنراوە. لەم نموونەدا زۆر بەرچاوە کە لەگەڵ دابڕانی ژیری ئەنالیتیك لەڕاستییەکان چۆن کۆمەڵگای وەرچەرخاندووە. تەنیا ئاواکردنی ئەهرامێك پێویستی بەخەباتی، تەنانەت مردنی سەدان و هەزاران کۆیلە هەیە. دەسەڵاتی دەوڵەتی ئاواکراو بوومەلەرزەیەکی هەرە

هەمیشەیی و وێرانکارە کە بەسەر جۆری مرۆڤدا دەتەقێتەوە. ئیتر پێکهاتنی بیرۆکەکانی ستەم، مەحشەر، فریادڕەس لەفەرهەنگی زمانی مرۆڤایەتیدا جێگای گرتووە. وەك جەنگاوەرانی ئازادی کەسایەتی پێغەمبەرایەتی لەژێر ئەم هەلومەرجەدا شێوە دەگرێت. پێغەمبەرەکان وەکو فریادڕەسە مەزنەکانی مرۆڤایەتی لەو کارەساتە گەورەیەدا سەرهەڵدەدەن. سەرچاوە دیسان کۆمەڵگای سۆمەرە.

شانبەشانی لە دەستدانی کۆمەڵگای سروشتی ئەو توێژەی بەڕادەیەکی مەزن زیانبەخش دەبێ ژنانن. میتۆلۆژیای سۆمەری هاوشێوەی شیوەنی ژنە دۆڕاوەکانە. باوەڕی ئینانا هەم شوێنپەنجەی کۆمەڵگای پێشووتری، تەوەرەی ژن لەخۆوە دەگرێت، هەم ڕەنگدانەوەی تێکۆشانێکی مەزنە بەرامبەر کۆمەڵگای پیاوسالاری. لەکاتێکدا بەشی زیاتری خوداوەندە یەکەمینەکانی دەوڵەتشار لەبنەڕەتدا ژن بوون، لەگەڵ تێپەڕبوونی کات جێگای خۆیان بۆ خوداوەندە پیاوەکان بەجێدێڵن. دیسان پەرستگاکان لەسەرووی ئەو دەزگایانەوە دێن کە ئامادەکاری خستنی ژنیان کردووە. پەرستگاکان کە لەسەرەتادا لەژێر دەسەڵاتی ڕاهیبە ژنەکانی باوەڕی خوداوەندە ــ دایك ئینانادا بوون، هەنگاوبەهەنگاو دەستیان بەسەرداگیرا، زەوتکران وگۆڕان و کران بەسۆزانیخانە. سیستەمی ماڵیکردنی کۆمەڵگای سروشتی کە لەدەوروبەری ژن ــ دایك پێشکەوتبوو دەزگایەکی جیاوازە. هەروەکو چۆن ژن خاوەنی نەبوو، لەهەمانکاتدا دایك ــ ژن بەڕێوەبەری منداڵەکان و ئەو پیاوەیە کە خوازیارێتی. بەواتا کلاسیکییەکە دەزگای ژنایەتی ـ مێردایەتی پێشنەکەوتووە. شێوەگرتنی کۆمەڵگای پیاوسالاری لەسەر بنەمای دەزگای دەوڵەت ـ خێزانی باوکسالاری ژێر بەڕێوەبەرایەتی پیاو بڵاو دەبێتەوە. دەزگای خێزان یەکەمین شێوەگرتن بەدەست دێنێ و لەمیانەی گۆڕینی ناوەڕۆك تاڕۆژگاری ئەمرۆمان هاتووە. هەروەکو چۆن پیاو خاوەنی ژنە، ئەوا منداڵەکانیش هی ئەون. چەندەی دەچێ ژن لەهێز دەخرێ و دەکرێتە موڵك. ئەو خێزانەی ژن دەچێتە ناوی لەناوەڕۆکدا قەفەسێکە. دەستنیشانکردنێکی هاوبەشی زانا کۆمەڵناسیەکان (سۆسیۆلۆگەکان) ئەوەیە کە بە ئەندازەی ئەو خێزانەی لەژێر بەڕێوەبەرایەتی پیاو دایە جۆرێکی دیکەی کۆیلایەتی نییە کە هێندە قووڵیی و هەمیشەییبوونی بەدەستهێنابێ. بۆ شیکردنەوەی ئاستی کۆیلایەتی کۆمەڵگا مسۆگەر دەشێ لەڕێگای شیتەڵکاریەکی هەمەلایەنی ئاستی کۆیلایەتی ژنەوە بەدیبێت. ئەوەی لەژندا ئەنجامدراوە تەنیا وابەستەییبوونی هزری و کرداری نییە، تەواوی هەستەکانی، هەڵسوکەوتە جەستەییەکانی، شێوازی دەنگی، پۆشینی جلوبەرگ بە شێوازی کۆیلایەتی یەوە گرێدراوە. ئەڵقەلەلووتی،گوارە لەگوێی،بازن لەمەچەك و خڵخاڵ لەگۆزینگەکانی بەستراوەتەوە. ئەمانە سەمبۆلی زنجیری کۆیلایەتین. لەچاخەکانی ناوین پشتێنەی پاکیزەییش دەبەستێ. چەمکێکی یەکلایەنەی ناموس و ئەخلاق دەسەپێنرێ. لەلایەنی ئایدیۆلۆژییەوە ژن دەکرێ بەهیچ. هەموو بەهاکانی دەستی زەوتدەکرێ، خۆیشی دەکرێ بەموڵك، نەختی بۆ دادەنرێت (نرخی بۆ دادەنرێ).

کۆیلایەتی ژن کە لەبنەڕەتدا سەرچاوەی خۆی لە کۆمەڵگای سۆمەری وەردەگرێت، بابەتێکی دەستلێنەدراوە. ئەو وابەستبوونەی لەکۆمەڵگای پلەداری دەستپێکردووە، بەپەرستگای ڕاهیبدا تێپەڕ دەکرێت، دەئاخنرێتە کابینەی پیاو، دەخرێتە ناو قورسترین ستاتۆ و کۆتایی پێدێت. ئەوەی لەو قۆناخەوە تاوەکو ڕۆژگاری ئەمرۆمان پێشخراوە هەمیشە ئەم ستاتۆیە بووە.

بابەتی سەرەکی ئەدەبیات، پەروەردە، ئەخلاق ئەوەیە کە بەهەموو هەست و هەڵسوکەوتێکەوە ـ هێزی هزری دەخرێتەوە نزمترین ئاست ـ ژن چۆن خزمەتی پیاوەکەی دەکات، پیاوی کۆیلە بەهۆی بەشداریکردنی لەبەدەستهێنانی زێدە ــ بەرهەم و بەکارهێنانی هێزی بازووی ستاتۆی بەدەستهێناوە. کۆیلایەتی خاوەن ناوەڕۆکی ئابووری لەپێشە. هەرچی ژنە بەتەواوی ڕۆح و جەستە و هزری دەکرێتە کۆیلە. ئەگەر پیاوی کۆیلە سەربەست بکرێت، دەشێ ببێتە مرۆڤێکی ئازاد، بەڵام ئەگەر ژنێك سەربەست بکرێت دەبێتە بابەتی کۆیلایەتییەکی لەمە خراپتر. تەنانەت ئەم ڕاستییەش قووڵیی کۆیلایەتی ژن نیشاندەدات.

چاودێرێکی هەستیار کاتێ تەماشای ژن بکات لەهەستکردن بەوە زەحمەتی نابینێ کە هەرشتێکی بەگوێرەی داخوازی و خزمەتکردنی پیاو شێوەی گرتووە. لەشێوازی دەنگ تا بەڕێوەچوونی، لەتیڕوانینی تاوەکو دانیشتنی, هەروەکو بڵێی دەڵێ " من لەنێوبردراوم ". گرنگترین هۆکاری پێشنەخستنی شروڤەکاری سەبارەت کۆیلایەتی ژن، برسێتی زایەندی پیاوو ڕۆحی ئارەزوو شکاندنی دیکتاتۆریانەیە. نموونەی سەرەتایی پادشا ـ خوداوەندی کۆمەڵگا لەناو خێزان، وەك خاوەنی ژن پیاوە. تەنیا مێرد نییە بەڵکو مێردە ـ خوداوەندە. ئەم ناوەڕۆکە بەبێ ئەوەی هیچ لەگەوهەری خۆی ون بکات تاڕۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە.

کۆمەڵگای دەوڵەتی کۆیلەداری لەبواری ئابووری لەشێوەی کارگەیەکی گەورە وایە, لەبواری تەکنیك و خاوەنداریێتی لەکارگە هاوچەرخەکان جیاوازترە. کۆیلەکان بەشێوەی مێگەل دەخرێنە ناوکار. لەئاسەوارە کۆنەکانی چاخی دێرین دەرك بەوە دەکرێت کە لەکشتوکاڵ, کوورەکانی خەڵووزی بەردین و بیناسازیەکان ڕەنجێکی چەندە مەترسیداری کۆیلەکان خەرجکراوە. بەڕێوەبەرایەتی کۆیلەکان لەبەڕێوەبەرایەتی ئاژەڵ دژوارترە. کۆیلە ئاژەڵێکە کاردەکات. بابەتی موڵکایەتییە. تەنیا ئامرازێکی بەرهەمهێنانە. کۆیلەکان لەدەرەوەی چوارچێوەی مافداریدان. هەروەکو بڵێی کەرەستەیەکی بێ هەست و سۆزن. ئەو شێوەیەی ژیری ئەنالیتیك لەپیاودا پێیگەیشتووە لەڕاستی کۆیلەدا سەرنجڕاکێش و بەرچاوترە.

لەکۆمەڵگای دەوڵەتی کۆیلەداری دەزگای موڵکایەتیش دەستپێکردنێکی بەهێزو کاریگەر ئەنجام دەدات. ناوەڕۆکی سیستەم پشت بەموڵككردنی هەرشتێکی کۆمەڵگای ژێر دەبەستێت لەلایەن کۆمەڵگای باڵاوە. پادشا ــ خوداوەند و یارمەتیدەرەکانیان خاوەنی هەموو شتێکن. خاوەنداریێتی ئەنجامی سروشتی زاڵبوونە. کاتێ خۆپەرستی مرۆڤ دەرفەتی گەشەکردنی دۆزیەوە، تایبەتمەندێتییەکی سنوورنەناس لەخۆوە دەگرێت. نەبوونی فاکتەرەکانی سنووردانان لەقۆناخی ئاوابوونی سیستەمدا ڕێگا لەپێش باوەڕی پادشا ـ خوداوەند دەکاتەوە. سیستەمی موڵکایەتی کە کۆمەڵگای سروشتی ئاشنای نەبوو، لەموڵکایەتی دەوڵەت دەستپێدەکات و تادەگاتە خێزان, دزە بۆ ناو هەموو دەزگایەك دەکات. هەستی موڵکایەتی لەهەر کەسێکدا دەخولقێنێت. موڵکایەتی بەبناخەی دەوڵەت دادەنرێ، پیرۆز دەکرێت. ئیتر ئەوەی پێویستە لەمەودوا بکرێت بەموڵككردنی تەواوی جیهانە. سنوورەکانی دەوڵەت, زەویەکانی خانەدان وەك سنووری نیشتمان لەژێر ناوی جیاوازدا تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان وەکو بەرەکەتی خودا لە من منێتی مرۆڤەکاندا دەنەخشێنرێ. لەڕاستیدا وەك سەرچاوەیەکی بەرژەوەندیپەرستی موڵکایەتی دزێتی یە. ئەو دەزگایەیە کە هەرەزێدە هاوکاری کۆمەڵکاری کۆمەڵگای تێکداوە. بەڵام بۆ گوزەرانی کۆمەڵگای باڵا وەك دەزگایەکی سەرەکی ژیانییە. هەوڵدراوە کۆمەڵگای سروشتی وەك دۆخێکی خۆخۆیی کۆمەڵگای ژینگەناسی پێناسە بکرێت. گەشەکردنی کۆمەڵگای دەوڵەت لەبواری قووڵایی و فراوانییەوە و پێ بەپێ دواخستنی کۆمەڵگای ژینگەناسی، یەکێك لە ناکۆکییە کۆمەڵایەتییە سەرەکییەکانە کەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوامە. چەندە ناکۆکی ناوخۆی کۆمەڵگا زیاد بووبێت، ناکۆکییەکانی لەگەڵ ژینگەی دەرەوەشدا بەهەمان ئەندازە زیاد دەبێت. زاڵبوون بەسەر مرۆڤ، زاڵبوون بەسەر سروشتیش لەگەڵ خۆیدا دێنێ. ئاشکرایە سیستەمێك بەزەیی بەمرۆڤدا نەیەتەوە لە ئەنجامدانی هەموو جۆرە خراپەکاریەك بەرامبەر سروشتیش دوودڵ نابێت. فەرمانڕەوایی و فەتحکردن وەك بەرچاوترین دیاردە جێگای خۆیان لەئەخلاقی چینی باڵادەستدا دەگرن. زاڵبوون بەسەر سروشت بەئەندازەی زاڵبوون بەسەر مرۆڤ وەك مافێك و هەڵسوکەوتێکی ڕەسەن دەبینرێ. سروشتی زیندوو پیرۆزی کۆمەڵگای سروشتی بەنەبوو (هیچ) داناوە. هەروەکو دوژمنێك فەتح جێگای باسە. کاتێك ئەم بیرۆکانە لەسەر هزر و ڕەفتاری کۆمەڵگای دەوڵەتگەرایی زاڵ دەبێ ئیتر تاوەکو دوایی ڕێگا لەپێش ئەم کارەساتانەی ژینگە دەکرێتەوە کە لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا گەیشتۆتە ئاستێکی بەرز.

ئەم هەڵسەنگاندنەی سەبارەت بەپێناسەکردنی قۆناخی ئاوابوونی کۆمەڵگای دەوڵەتگەرایی ئەنجامدرا پێویستە تێر ببینرێ. ئەو بابەتەی جێگای سەرنجڕاکێشانە، لەوانەیە بپرسن بۆچی نالێین کۆمەڵگای کۆیلەداری و بیرۆکە و دەستەواژەی

کۆمەڵگای دەوڵەتی کۆیلەداری بەکاردەهێنن. لەو باوەڕەدام کاتێك دەوڵەت وەکو کۆمەڵگای سەروو (باڵا) تاوتوێ بکرێ ئەوا بەکارهێنانی ئەم دەستەواژەیە بەرجەستەترە و خزمەت بەئامانج دەکات. دەوڵەت نەبێ ناتوانرێ بیر لەکۆیلەداری بکرێتەوە. مەرجی سەرەکی هێزی دەوڵەتە. دەوڵەت دەزگایەکی داتاشراو (واتایی) نییە. ڕێکخستنی هاوبەشی کەسانێکە کە بەسەر ئامرازەکانی فشار و چەوسانەوە زاڵبوونەو زەوتیانکردووە. ئاسایشی گشتی و خزمەتگوزارییە گشتییەکان کە بۆ هەموو کەسێك پێویستە, دەبێ وەك ئەو خزمەتەی یارمەتیدان ببینرێ کە ڕێکخستنی ڕاستەقینە پەردەپۆشی دەکات و لەناو کۆمەڵگا ڕێگا لەپێش مەشروعییەت (ڕەوابوون) دەکاتەوە. بیانووێکی دیکەی گرنگی ناوزەدکردنی بەکۆمەڵگای دەوڵەت بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە فۆڕمی کۆمەڵگای دەربەگایەتی و سەرمایەداری بەپشتبەستن بەهەمان دەوڵەت ئاوابوون و درێژە بەهەبوونی خۆیان دەدەن. دەزگای هاوبەش و ژیانی گروپەکانی فشار و چەوساندنەوە ڕێکخستنێکە وەك دەوڵەت. بۆ فشار و چەوسانەوە هیچ دەزگایەك هاوشێوەی دەوڵەت بە کاریگەر و بەرهەمدار نەبووە.

لەکاتێکدا فۆڕمی ڕەسەنی کۆمەڵگای دەوڵەتی کۆیلەداری زیاتر نموونەکانی سۆمەر و میسرن، ئەوا نموونەکانی هیتیت، چین و هیند کە ئەڵقەی دووەمن دووبارەن. ئەو دەزگایانەی لە ناوەڕۆکدا هەمان شتن لەڕێگای گۆڕانکاری شێوە سەر لەنوێ خۆیان دەکەنەوە خاوەن ڕۆڵ. بەشێوەیەکی تایبەت نموونەی ئێران و گریك ــ ڕۆما لەبواری هزریدا وەرچەرخانێکی گرنگی بەدەستهێناوە. لەمیانەی شێوەی هزری فەلسەفی لەسەر ڕاستەڕێی ئەخلاقی ئازادی پێشکەوتنی گرنگی بەدیهێناوەو نەرمبوونێکی سنووردار لەدەزگای کۆیلایەتی هاتۆتە ئاراوە. سیستەم لەسالانی 1000 ــ 300 پ. ز شێوەی کلاسیکی خۆی وەرگرتووە. لەساڵانی نێوان 2000 ـ 1000 لەنێو قۆناخی پێگەیشتندا ژیاوە. ساڵانی نێوان 3000 ــ 2000 پ. ز قۆناخی ئاوابوونی سەرەتاییە.

لەقۆناخی کۆیلەداری کە وەك سیستەمی بنچینەیی شارستانییەتی چینایەتییە بێگومان مرۆڤایەتی بەردەوامی بە پەرەسەندنی خۆیداوە. ئەوەی هەموو شتێك دیاری دەکات سیستەمی کۆیلەداری نییە. ناتوانین شۆڕشی شار وەك بەرهەمێکی سیستەمی کۆیلەداری ببینین. گەر دەوڵەت و کۆیلەداریش نەبن دەشێ شار گەشە بکات. زۆر نموونەی ئەو شارانە دەبینرێ کە نەبوونەتە دەوڵەت. ئەو نووسین، بیرکاری، زانست و پیشە هەمەجۆرەکان، بیناسازی و لقەکانی هونەر کە گرێدراو بەشار پەرەیانسەند، لە قەڵەمدانیان وەك پێویستییەکی سیستەمی کۆیلەداری هەڵەیەکی ترسناکە. مارکسیزمیشی لەناودا بێت، چەندین قوتابخانەی خاوەن روانگە لەم بوارەدا کۆیلەداری وەکو سلێنگی پێشکەوتن هەڵدەسەنگێنن، ئەمەش هەڵەو چەوتییەکی ڕیشەیی لەخۆوە دەگرێت: ڕاستتر ئەوەیە کەدانەبڕانی زانست و هونەر لەدەسەلات دەسەلمێنێ. زانست و هونەر لەسەرووی ئەو بەهایانەوە دێن کەدەسەلاتی دەوڵەت خستوویەتیە ژێرکۆنترۆڵی خۆی. هەم بۆ ئەوەی پەرەسەندنی ئازادانەیان ئاستەنگ بکات، هەم بۆ ئەوەی بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی خۆی بەکاریان بێنێ، پێویستییەکی زۆریان بەمە هەیە. مێژوو ئەوە نیشان دەدات کە نەك پێشکەوتنی زانست و هونەر لەئەنجامی سیستەمی کۆیلەداری بووە، با ئەمە لەولاوە بمێنێ، بەلکو کۆسپ و ڕێگریەکی جددی بۆ دروستکروون. بەپێی ئەو لێگەڕێن و دۆزینەوانەی ئەنجامدراوە سالانی نێوان 6000 ــ 4000 پ.ز کەهێشتا دەوڵەتی کۆیلەداری لەئارادا نەبوو, دەتوانرێ تەنیا لەگەڵ سالانی 1600 تاوەکو 1900 ی زایینی بەراورد بکرێت، ئەوەی لەماوەی نێوان هەردوو قۆناخ واتە 5000 ساڵی نێوانیان ئەنجامدراوە سنووردارە. هەروەکو دەزانرێ لەماوەی نێوان 1600 ــ 1900 ی زایینی زانست و هونەرەکان بەرهەمی تاکن. ئەوەی دەوڵەت کردوویەتی وەکو هەرجاران، بەردەوام قۆرخیکردووە.

هەرچەندە هزری ئەنالیتیکی گرێدانێکی زۆری بەئاوابوونی شار هەبێت، بەلام دیسان ئەوەی ئەم شێوازە هزرەی لەسەر بنەمای بەرژەوەندییە چینایەتییەکان شێواندووە کۆمەڵگای دەوڵەتی کۆیلەدارییە. ئەگەرنا ئەوەی هزری ئەنالیتیکی پێشخستووە کۆیلەداری نییە. ئەوەی سیستەمی کۆیلەداری ئەنجامیداوە لەمیانەی ئەم شێوازەی هزر جیهانێکی مەزنی درۆ

بەرهەمدێنێ و وەکو دێوەزمەیەك بەسەر زهنی مرۆڤ دادەڕوخێ. گرێدانی پەرەسەندنی زانست و هونەر کە کولتووری هاوبەشی مرۆڤایەتین, گرێدانیان بەسیستەمی کۆیلەداری و فۆرمەکانی دیکەی کۆمەلگای چینایەتی هەلّەیە. مەگەر دەتوانرێ بە دیاردەی زانست ـ دەسەلاّت گرێبدرێت، دەشێ ئەمەش بەو بالاّدەستییەی دەولّەت ببەسترێتەوە کە لەسەر زانست و هونەر هەیەتی. ئەنجامدانی ئەمجۆرە هەلّسەنگاندنانە بەناوی بزووتنەوەکانی یەکسانی و ئازادی گەر بەئەنقەست و زانیاریش نەبێت ئەوا بەبێ هەستکردن دەبێتە ئەنجامێکی وابەستەبوون بەجەمسەری دەسەلاّت. ئەگەر مارکسیزم ـــ لینینزمیش ئەم هەلّسەنگاندنە ئەنجام بدات بەمجۆرەیەو ئەم داوەریە(حوکمدانە)ی لەبەرامبەردا ناگۆڕێت. لەبەشەکانی داهاتوو هەولّدەدەم بە فراوانی ڕوونیبکەمەوە کەمارکسیزم ـ لینینزم بەتەواوەتی خۆی لەجەمسەری زانستی ـ دەسەلاّتی حوکمڕان ڕزگار نەکردووە، ئەمەش یەکێك لەهۆکارە سەرەکییەکانی ڕووخانی سۆسیالیزمی بونیادنراو بووە. لەسالاّنی نێوان 250 پ ز ـ 500 ی زاینی بەشێوەیەکی گشتی فۆرمی کۆمەلگای کۆیلەداری کەوتۆتە ناو قەیران و وەك فۆرمێکی سەروو بەبالاّبوونی کۆمەلگای دەرەبەگایەتی ئەنجامگیربوو. لەدەرەوە پەلاماری " بەربەر " ەکانی خاوەن تایبەتمەندێتی کۆمەلگای سروشتین، لەناوەوەش گەندەلّبوونی سیستەم و تێکۆشانی ئایینی مەسیحی ڕۆلّ و کاریگەرییەکی یەکلاکەرەوەیان هەبووە, بەلاّم ئەوەی هەلّوەشاوەتەوە دەولّەت نییە, بەلّکو شێوە کۆیلەداریەکەیەتی. دەولّەت خۆی بەهێزتر دەکات و بەفۆرمی دەولّەتی دەرەبەگایەتی دەگات.

د ـ كۆمةلَطاى دةولَةتطةرايى دةرةبةط

**کۆیلایەتی پێگەیشتوو**

لەمێژوودا بینینی دەولّەت وەکو زهنییەت و لێشاوی بەدەزگابوون گرنگی و بایەخێکی مەزنی هەیە. پێناسەکانی دەولّەت کە پشت بەبیرۆکەو دیاردەکانی وەکو بەرەبەیان ـــ ئاوابوون، بەخێرایی ئاوادەکرێ و دەڕووخێنرێ، سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی لەلایەن چینەکان یان گروپەکان یان پشتبەستوو بەبیرۆکە ئایینی و نەتەوەییەکان، لەجیاتی ئەوەی لەڕاستینەی دیاردەیی دەولّەت نزیکمان بکاتەوە، دەمانخاتە نێو چەمکێکی دابڕاوو لێلّ. دەولّەت وەك سەرەکیترین سیستەمی بیرۆکەکانی کۆمەلگا و ڕاستینەی دەزگای هەمیشەیی، لێکچواندنی لەگەلّ ئەو تۆپەبەفرینە یان تۆپی ئاگرین کە چەندەی دەچێ گەورە دەبێ و جارجار دەوروبەری دەبەستێ, جارجاریش دەسووتێنێ, دەشێ فێرکەر و ئەزموونبەخشتر بێت. دەولّەت لەسەردەمی یەکەمین ئاوابوونییەوە تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان زیاد و هەمەڕەنگ بووە، بەلاّم هەروەکو چۆن لەبواری ناوەڕۆکەوە نەگۆڕاوە لەهەمانکاتدا دووچاری ڕاوەستان و پچڕان نەهاتووە. ئەمە ڕاستینەیەکی بەم چەشنەیە. تەنانەت ناتوانین باس لەپچڕانێکی دوو خولەکیش بکەین. پچڕان ڕوودات دەکەوێتە قۆناخی لەناوچوونەوە.

ئەم مەسەلەیە (بابەتە) هاوشێوەی جیابوونەوەی ڕۆحە لەجەستە. خولەکێك دوای ئەوەی ڕۆح لەجەستە جیادەبێتەوە، ئیتر ئەو جەستەیە ناتوانێ بەردەوامی بەهەبوونی (زیندوویی) خۆی بدات. خولەکێك دواتر ناتوانین بانگی ڕۆح بکەین و بیخەینەوە نێو جەستە. دەولّەتیش هەبوونێکی زیندووی بەمجۆرەیە. هەرچی بەدەستهێنانی هەمەڕەنگی و قەبارەیە دەتوانین لەجۆرەکانی فامیل (خێزان)ی بچوێنین. دەشێ لەفامیلی هەمان ڕووەك یاخود ئاژەلّ چەندین جۆری هەمەڕەنگ و قەبارەی

بەرفراوانی کۆ پێکبێت. بەڵام تایبەتمەندێتییە بنەڕەتییەکان وەك خۆی دەمێنێ، باسکردنی جۆری باشتر یان خراپتر، لەگەڵ هەمان شێوازی ڕوونکردنەوە ناکۆك نییە.

کاتێك لینین دەیگوت: " دەوڵەتی پرۆلیتاریا بەرامبەر بە دەوڵەتی بۆرژوا " وایزانیبوو پێناسەیەکی ڕاست و دروستی کردووە, بەڵام وەك فۆرمێکی کۆمەڵایەتی دەوڵەتی پرۆلیتاریا (کارکەران) نابێت. لەسەردەمی سپارتاکۆسەوە زۆر کەس ئەمەیان تاقیکردەوە، بەڵام هەمووی مایەپووچ بوو. تەنانەت ئەزموونی سۆڤیەتیش سەرباری ئەوەی یەك لەسێی جیهانی گرتەوە, بەڵام لەپەرتەوازەبوونێکی لەخۆوە ڕزگاری نەبوو. هەروەکو چۆن لەبەشی پەیوەندیداردا بەشێوەیەکی بەرفراوانتر هۆکارەکانی ڕووندەکەینەوە، لەبنەڕەتدا فۆرمی دەوڵەت فۆرمی ژیانی گروپ و چینە چەوسێنەر و ستەمکارەکانە. بەمشێوەیە پێکهێنراوە. ناشێ ببێتە فۆرمی یەکسان و ئازادی ئەو گروپ و چینانەی دووچاری ستەم و چەوسانەوە هاتوون. هەروەکو چۆن ناوەڕۆکی بەگوێرەی ئەمە گونجاو نییە، ڕووخسارەکەشی پێچەوانەی ئازادی و یەکسانییە.

ئەو تۆپە ئاگرین و بەفرینەی لەسەردەمی سۆمەریەکانەوە کەوتەڕێ چەندەی چوو گەورە بوو، چەندین پێدراو هەن دەیسەلمێنن کەنموونەکانی ئەمریکای لاتین و, چینیش لەناویدا, تەواوی نموونەکان لەڕێگای ئەم مۆدێلەوە تێرخۆراك کراون. بێگومان لەڕێگای تواناکاری و کەرەستەی ناوچەکانی خۆیان تێرکراون. بەڵام ئەو نموونەی لەبواری هزر و دەزگابووندا ئیلهامی لێوەرگیراوە لەئاستێکی مەزندا دەوڵەتی ڕاهیبی سۆمەرە، پەسەندکردنێکی زانستی گشتییە کە ئەم مۆدێلەی سۆمەری ڕاستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ ڕۆڵی سەرچاوەی ئیلاهی بینیوە. بەپشتبەستن بەپێدراوە زانستییەکان لێکۆڵینەوەی ئەم قۆناخە کاری مێژوونووسانە. ئەوەی پێویستە ئێمە ئەنجامی بدەین خوێندنەوەیەکی ڕاستی لوغز و ڕۆحی بابەتەکەو ڕوونکردنەوەیەتی. مۆدێلی سەرەتایی کۆیلەداری دەوڵەت کەلە سۆمەر و میسرەوە دەستیپێکردبوو، لەئاستی ژێرتریش لە هیتیت، میدیا، ئێران، هیند، چین، گریك ـ ڕۆما و ئاستەك و لەوان ژێرتریش لەزەمەن و شوێنی جیاواز سەریانهەڵداوە, هاوشێوەی نموونەی فامیل کە گەورەو زیاد دەبێ لەگەڵ فۆرمی فیۆداڵی (دەرەبەگایەتی) دا دەگاتە قۆناخی پێگەیشتنی خۆی. تا ئەم قۆناخە هەوڵیداوە دزەی ناو تەواوی خانەو گەردەکانی کۆمەڵگای سروشتی بکات، چەندین گۆڕەپانی نوێی کردۆتەوە و بەدەستهێناوە، توانیوێتی چەوساندنەوە و ملکەچکردن بکاتە هونەرێکی مەزن و بە ڕەونەق. لەڕاستیدا ئەوەی لەژێر ناوی هونەری " سیاسەت " و " سەربازی " ئەنجامدراوە, بەکارهێنانێتی لەهونەری کوشتنی سیستەماتیك و ستەمکاری و هەموو جۆرە کارەکانی چەوسانەوە. ئەو هونەرە سەرەکیانەی بۆ ئامادەکردنی بناخەی مەشروعییەتی ئەم هونەرە پەنایان دەبردرێتە بەر ئەو چالاکی و کردەوە هەمەجۆرانەن کە میتۆلۆژیا و داستان، تاڕادەیەك ناوەڕۆکی پەرتووکە پیرۆزەکان، پەیکەر، وێنە و مۆسیقا لەسەرروویانەوە دێن. بێگومان لەدایکبوونی ئەم هونەرانە داهێنانێکی چینی کۆیلەدار نییە. بەڵام ئەمەش ڕاستییەکی زانراوە کە بۆ ڕاهێنان و گونجاندنیان لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی خۆیان زیرەکییەکی باشیان نیشانداوە: هونەری لەڕیشەوە گۆڕینی زهنییەتی مرۆڤە. ئەمەش لەمیانەی بەکارهێنانی ئامرازە سەرەکییە ماددی و مەعنەوییەکانی ژیان کە بەرەنجی مەزنی هەزاران ساڵەی مرۆڤایەتی خولقێنراوە. لێرەدا ڕۆڵ و بەشداری و خولقکاری ئەرێنی سیستەمی کۆیلەداری جێگای باس نییە، بەڵکو شێواندن و چەواشەکردنی لەئارادایە. گەر دووبارەش بێت جارێکی دیکە بەگرنگییەوە سەرنجڕاکێشان بۆ ئەو شرۆڤە چەوتانەی بەناوی ئازادی و یەکسانی پێشخران، ئەرکێکی ئازادیخوازی و یەکسانی مرۆڤایەتییە کە پێویستە بەردەوام جێبەجێبکرێت.

با بەکورتی سەرنج بدەین کەتاوەکو گەیشتن بە قۆناخی دەوڵەتی دەرەبەگایەتی چی ئاخێنراوەتە ناو دەزگای دەوڵەت: لەکاتی مردنی پادشا ـ خوداوەندەکانی سۆمەر و میسر بەهەزاران خزمەتکاری ژن و پیاو بەزیندوویی لەگەڵیاندا ژێرخاك کراون, تاوەکو لەدونیای دیکە خزمەتیان بکەنەوە. بۆ دروستکردنی هەر گۆڕستانێك بەسەدان هەزار کۆیلە تامردن کاریان

پێکراوه. لەکاتێکدا گۆشەیەکی بەهەشت بۆ گروپێکی ناوەندی دەسەڵات ئاوا دەکرێ، ئەوانەی دیکە مامەڵەیەکی لەمێگەلی ئاژەڵ خراپتریان لەگەڵ کراوه. لەبەرامبەر هەرپێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی وەك تیره، هۆز کە بەرامبەر کۆیلایەتی سەریان هەڵدابێت، فڕکردن وەکو سیاسەتێکی بنەڕەتی دەستنیشانکراوه. ئاواکردنی قەڵا و شورا لە کەللەسەری مرۆڤ وەك کارێکی شکۆمەندانه لەقەڵەمدراوه. هونەری کوشتنی بەپیلانکراو کە هیچ لایەنێکی سروشتی تێدا نییە بۆ یەکەمین جار لەناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دایانهێناوه. بەشێوەیەکی سەرکەوتوو ژنیان خستۆته نێو قەفەسەوه، تەواوی خەیاڵە سروشتییەکانی منداڵانیان کۆت و بەندکردووه. خەڵکیان ناچارکردووه لەژێر ناوی ئازادی لەقووڵایی دارستان،شاخ و بیابان بڵاو ببنەوه و بژین. کۆیلەکان نەك تەنیا لەمیانەی ڕەنجەکانیان بەڵکو بەتەواوی جەستەکەیان کراونەتە ئامرازی بەرهەمهێنانی ئابووری. لەژێری ئەنالیتیکەوه میتۆلۆژیایەکی ڕەونەقداری پڕ لەدرۆ و تەڵەکەبازییان ئافراندووه. هەروەکو بڵێی توندوتیژی ڕووت و چەوساندنەوه ئەربابەکان تێر ناکات، ئەوا فشار و چەوساندنەوەی مەعنەوی جیهانی خوداوەندی ڕاهیبەکانیش لە زهنییەتی مرۆڤایەتیدا کراوه بەسەرەکیترین فاکتەری باوەڕ و پەرستن. وایانکردووه ئەخلاق و هونەر بەردەوام بەشکۆدار و جوان نیشانیان بدات. لەجیاتی ئەوەی ژینگەی سروشتی و کۆمەڵگای مرۆڤ بەچەمکی گەردوونی زیندوو تێر بکەن، بەو خوداوەندانەی ژێر خاك و ئاسمان پڕیان کردۆتەوه کە بێ گیانن و سزادەرن. لەکاتێکدا بۆ گروپی ئەفەندییەکان هەرگیز بیر لەنەداری ناکرێتەوه, گروپەکانی دیکە هەمیشە لەئەنجامی نەخۆشی و برسێتی تێکشکاون. تەنانەت بۆ ڕابواردن و کات بەسەر بردنیش مەراسیم و یاریەکانی کوشتنی مرۆڤیان بەبنەما گرتووه.

دەتوانرێ ئەم تابلۆیە هەمەڕەنگتر بکرێ. بەڵام لەمیانەی تەواوی یادگاری و پاشماوەکانی لەبەرچاوان و هزرمان دایە, کەناوەڕۆکی دەوڵەتی کۆیلەداری بەم شێوەیە پڕکراوەتەوه, بەبێ هیچ شازبوونێك شێوەی هەر دەوڵەتێکی بچووك یان مەزن ــ کەلەتەواوی نێوەندە زەمەنییەکان سەریانهەڵداوه، لەوە بەدوور نەماوه کە پێویستییەکانی ئەم تابلۆ گشتییە پێکبێنن و بەگوێرەی خۆی شتێکی تەڤلی بکات، ئەمەشی وەك پێویستی هونەری سیاسی و سەربازی خۆی لەقەڵەمداوه. ئەگەر تەنیا کردەوەکانی ئیمپراتۆرەکانی ڕۆما و بێزەنت ڕیزبەند بکرێ، ئەوا گەر بەرگەگرتنی ویژدان و مێشکی مرۆڤی ناوین بێنینە بەرچاو بەرامبەر ئەو تابلۆ مەترسیدارەی دەردەکەوێتە روو، ئەوکاتە کەمێکیتر ڕاستی ڕۆشندەبێتەوه. کاتێك پەرتووکی پیرۆز دیاردەی دەوڵەتی کۆیلەداری بە (لێڤی ئاتوون) بەناو دەکات، پێناسەیەکی ڕاستە.

لێکۆڵینەوەی شیکارەکانی ئەم شێوەیەی کۆمەڵگای دەوڵەت پێویستییەکی بابەتەکەمان نییە، بەڵام هەروەکو دەزانین لەئەنجامی بەرخودان و هێرشی دەرەوەی تیرە بەناو بەربەرەکان کە تایبەتمەندێتی کۆمەڵگای سروشتی لەخۆوە دەگرن لەهێز کەوتوون. چین و هیند و ئێران لە ڕۆژهەڵات, ئیمپراتۆریەتەکانی ڕۆما لەڕۆژئاوا وەك ناوەندەکانی شارستانییەتی کۆیلەداری، لەئەنجامی بەرخودان و پەلاماری جەرمەن، هۆن و ئەسکیتەکان لە باکوور, عەرەب و بەربەرەکان لەباشوور و ئەو تیرە و قەومانەی لەژێر ناوی جیاوازدان، خراونەتە ڕەوشێك ناتوانن وەکو جاران درێژە بەهەبوونی خۆیان بدەن. ناوبردنی ئەو تیرانە بە (بەربەر) پێویستییەکی بیرۆکەو وێژەی کۆیلەدارییە. لەناوەڕۆکدا بەناوکردنی ئەم گروپانە وەك هێزی شۆڕشگێڕی سەرەکی ئەو پێشکەوتنەی نزیك بەئازادییان هێناوەتە ئاراوه واقیعیترە. جیاواز لەجەماوەری ڕاستەقینە هەڵسەنگاندنی بەرپرسیاری خێڵ و هۆزەکان کەلاسایی ئەربابە کۆیلەدارەکان دەکەنەوه بایەخێکی زۆری هەیە. هەرچی لەناوەوەیە لێشاوە ڕۆحگەرا ییە ئایینیەکانی مانیزم و ئیسلامییەت و مەسیحییەت لەسەرروویانەوه دێن و زیاتر پشت بەهەژاران و ئازادیخوازان دەبەستن، بناخەی سیستەمی کۆمەڵگای کۆیلەداری کۆڵیوه و وایان لێکردووه توانای بەردەوامکردنیان نەمێنێ.

هەرچەندە زەحمەتە بگوترێ ئەو جوڵانەوانە ڕەوتێکی هۆشمەندانەی یەکسانی و ئازادین، بەڵام ئەوە مسۆگەرە لەگەوهەری خۆیاندا خوازیارن لەکۆیلایەتی ڕزگاریان بێت. ڕزگاری و فریادڕەسی بەرچاوترین بابەتن. ناوەکەی دیکە حەزرەتی عیسا

(مەسیح) فریادڕەسە. خودی " مانی " حەواریەکی ئاشتی و هەمەڕەنگییە. ئیسلامییەت وەك واتای وشە، مانای تەسلیمبوون بە ئاشتی دێت. ئەو داواکاریە سەرەکییانەی لەهەڵوەشانەوەی سیستەم ڕۆڵ دەبینن ئاشتی و ڕزگار بوونە. فۆرمیلەی ئایینیان بەهۆی پێکهاتەی هزری قۆناخ ناچارییە، هەربۆیە ڕێکردنەوەیەکی سنوورداریان بۆ ئاشتی و ڕزگاری مەسەلەیەکە دەرکی پێدەکرێت.

ئاشکرایە قوتابخانە ڕۆحگەرایی، ئایینی، مەزهەبی و فەلسەفییەکان کە لەژێر سێبەری ئیمپراتۆریەتەکان ژیاون، هەم لەبواری هزری هەم سیاسی و سەربازی کاریگەری سیستەمیان دەکرێتە سەر. جارێکی دیکە ناتوانن کۆیلەداری کلاسیك ئاوا بکەنەوە. چونکە بەدژواری نەفرەتیان لێکردووە، باش دەیناسن، بەڵام نازانن چۆن و چی ئاوا دەکەن. چەندین کەسایەتی کە لەئاستی هونەردا سیستەمی کۆیلەدارییان پەسەند کردووە لەبواری سیاسییەوە ئەم ئایینانە پەسەند دەکەن و زەحمەتی نابینن لەوەی بیکەنە بنگەی مەشروعییەت (ڕەوابوون)ی خۆیان.

لەم چوارچێوەیەشدا قوستەنتینی مەزن لە ساڵی 312 ی زایینی لەسەر بنەمای پەسەندکردنی ئایینی مەسیحی دەکەوێتە ڕۆما، خۆی وەك ئیمپراتۆری نوێ ڕادەگەیەنێ، پایتەخت بۆ ئەستەنبۆڵی ڕۆژگاری ئەمڕۆ دەگوازێتەوە، لەساڵی 325 یش مەسیحییەت وەك ئایینی فەرمی ڕادەگەیەنێ. ئەو ئایینەی 300 ساڵ لەگەڵ کۆیلایەتی لەناو شەڕو پێکدادانـدا بوو، لەگەڵ سیستەمی کۆیلەداری ڕێکدەکەوێ. خودی " مانی" یش دەکەوێتە ژێرپاراستنی شاپووری دووەمین ئیمپراتۆری گەورەی خانەدانی ساسانی. هەرچی حەزرەتی محەممەدە کە ڕادیکالترە، تا ڕادەیەکی مەزن لەسەر بنەمای میراسی تیۆلۆژیای مەسیحی و یەهودی و ئیمپراتۆریەتی ساسانی و بیزەنتی بناخەی سیستەمی خۆی دادەنێت. هەمووشیان (ئایینەکان) بە بەرنامە تێکۆشان لەبەرامبەر سیستەمی کۆیلەداری کلاسیکدا دەکەن، هێزی بەزاندنی ئەم سیستەمە نیشاندەدەن. بەڵام ئەو قاڵبە گشتییانەی خزاونەتە ناوی قاڵبی ڕاهیبەکانی دەوڵەتی سۆمەرییە. کەمێك نەرمتری دەکەن و دەیکەن بە ئامرازیك مرۆڤایەتی بتوانێ بەرگەی بگرێت. ئەگەر تا نوێکردنەوەی کۆمەڵگای سروشتی بە گوێرەی هەلومەرجی نوێ بەخەیاڵ و هزریشیاندا تێپەڕ نابێت، نەك لەژێر ناوی سیستەمی کۆیلەداری، بەڵکو کۆمەڵگای سروشتی لەژێرناوی بتپەرستی مەحکوم دەکەن. تەنانەت ئەم لایەنانەشی بەسە بۆئەوەی نیشانمان بدات کە ئەم دیاردە نوێیەی دەوڵەت ئەو دۆخە کۆنەیە کە ڕووخساری گۆڕیوە. هەرچی کۆمەڵە بەربەرەکانن کەنزیکی کۆمەڵگای سروشتین، لەڕێگای ئەو سەرپەرشتیارانەی لەمێژەوە بۆتە خاوەن شەرەفی ئاشنابوون بەسیستەمی کۆیلەداری، لەپەسەندکردنی فۆرمی نوێی دەوڵەت ڕزگاریان نابێت کە بەرگەی دەگیرێت. ئەو قۆناخە کە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا سەردەمی سەراوژێربوونێکی مەزنە، نزیکەی سەدەکانی پێنجەم و شەشەم هاتە ئاراوە. قۆناخێکی هاوشێوەی ئەمە لەسەدەکانی شەشەم و پێنجەمی پێش زایین، لەمیانەی پێهەڵگرتنی فەلسەفی و ئەخلاقی بودا، کۆنفۆشیۆس، زەردەشت و سوقرات لەبەرامبەر زهنییەتی کلاسیکی کۆیلایەتی سەریهەڵدا. ئەنجامی ئەم جولانەوانە، بەدیهاتنی پێشکەوتنی فۆرمی نوێ بوو لەسیستەمی کۆمەڵایەتی چین، هیندستان، ئێران و گریك.

لەم چەشنە پێشکەوتنە مێژووییانە مارکسیزم ڕۆڵی دیاریکراو بە ئامرازەکان و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان دەبەخشێ، ڕۆڵێکی لاوەکی بەشەڕی زهنی دەسپێرێ. هەروەها قورسایی پێویست ناداتە تێکۆشانی گروپە ئەتنی و ئایینیەکان، وەك شرۆڤەی دۆگمایانەی پێڕەوی دیالەکتیکی، تێگەیشتنی مێژوو لەمیانەی ئەم هەڵوێستانە یەکپارچەیی نابێت و لێی دوورە. تاوەکو ئەم جوڵانەوە گەورەیەی کۆمەڵگا نەبینرێ کە بەواتای سیاسەت و زهنییەت دێت، ئەوا تێگەیشتنی ڕاستی لەمیانەی شرۆڤەی ئابووری سنوردار دەبێت. ئەگەر واتایەك بەجوڵانەوەی کۆمەڵە گەورەکان نەدرێت و وەك هێزێکی گۆڕانکاری قورسایی بدرێتە تەکنۆلۆژیا و پێکهاتەی بەرهەمهێنان، ئەوا بەبێ هەستکردن ڕێگا لەپێش مەحکومبوون بەچوارچێوەی دەوڵەت دەکاتەوە. تاوەکو جوڵانەوە مەزنە ئایینی و ئەتنییەکان (ڕاستینەی هۆز، خێڵ و قەوم) شیکار نەکرێت ئەوا

شرۆڤەکردنی مێژوو هەم لەبواری پێڕەو، هەم ناوەڕۆك ڕێگا لەپێش هەڵەی جددی و پشتگوێخستن دەکاتەوە. ئەم ڕاستینەیە ڕۆڵێکی مەزنی هەیە لەبێ بەرهەمی و بەنەزۆکی مانەوەی ئەو شرۆڤە مێژووییانەی لەڕێگای پێڕەوی مارکسیزمەوە ئەنجامدراون و ڕێگایان لەپێش ئاکامی چەوت کردۆتەوە. کاتێك دەڵێین ئەو ئایدیالیزمە بەلاوە بنێین کە پشت بەشکۆدارکردنی کۆمەڵگای باڵای باو دەبەستێ، بەپێچەوانەوە لەمیانەی چارەسەری پێکهاتەی تەسکی چینایەتی و ئابووری خراوەتە ناو ماتریالیزمی (قەبا) وە.

کێشەیەکی دیکەی مێژوویی و کۆمەڵایەتی پێویستی بە ڕۆشنکردنەوە هەیە، سەبارەت بەوەیە کاتێ دەڵێین ڕابردوو تێپەڕ بکەین، پێویستە چی لەمە تێ بگەین. ئەو یاسایەی گەشەکردن کە گۆڕانکاری سروشت و پەرەسەندنی زیندەوەرزانی سەلماندوویانە، ئەوەیە کە دیاردەیەکی پێشووتر لەدیاردەیەکی دواتر بەردەوام دەبێت. بۆ نموونە ئەتۆمێکی هایدرۆجین کاتێك لەگەڵ هایدرۆجینێکی تر یەکدەگرێت، دەبێ بە هیلیۆم. واتە هایدرۆجین لە هیلیۆمدا بەردەوام دەبێت. ئەگەر ئەتۆمی هیلیۆم بتەقێتەوە دیسان هایدرۆجین پەیدا دەبێتەوە. بەڵام ئەگەر گۆڕانکاری چۆنایەتی بەشێوەی هیلیۆم بێت ئەم ڕاستینەیە دەبێتە دیاردەیەکی دیکە. کەوتنەسەریەکی ئەڵقەکان لە زیندەوەرزانیدا قۆناخێکی هاوشێوەی ئەمەیە، ئەڵقەی پێشوو لەگەڵ ئەوەی دواتر تێکەڵن. گۆڕانکاریەکی هاوچەشنی ئەمە لەکۆمەڵگاشدا هەیە. کۆمەڵگای باڵا، کۆمەڵگای ژێر لەناواخنی خۆی دەگرێت. بەڵام پێچەوانەکەی ڕاست نی یە. کۆمەڵگای ژێر، کۆمەڵگای سەروو ناگرێتە ناوخۆی، چونکە دیاردەی نوێ لەئارادا نییە. هەربۆیە کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی لەمیانەی ئەو بارە نوێیانەی سیستەمی کۆیلەداری شێوە دەگرێت کە لەئەنجامی هێرشەکانی دەرەوە و ناوەوە بەدەستیهێناون. چەندین بەهای سیستەمی کۆیلەداری لەخۆدا دەگرێت. نەك وەکو شێوەکانی جاران بەڵکو وەك ئەو فۆرمە نوێیانە لەژیاندان کە لەئەنجامی سەنتێزی بەها نوێکان ئاواکراوە, لەنێو نەچووە. بەڵکو شێوەی گۆڕیوە و بەردەوامی بەهەبوونی خۆی دەدات. هەر لەسەر ئەم بنەمایەشە کە سیستەمی کۆیلەداری ڕۆما بەتازە خوێنی مەسیحییەکان و بەربەرەکان هێزی خۆنوژەنکردنەوەی بەدەستهێناوە، تەنیا لەمیانەی ئەم شێوازەوە دەتوانرێ دیالەکتیك لەناو دۆگمادا نەخنکێنرێ و لەمیانەی پراکتیزەکردنی بەگوێرەی قۆناخی مێژوویی، ڕێگا لەپێش تێگەیشتنێکی ڕاست بکاتەوە.

بەرامبەر بەکۆمەڵگای سروشتی لەسیستەمی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتیشدا وەرچەرخانی زهنی بە قووڵایی بەردەوام دەکات. لەڕێگای ژێری ئەنالیتیکەوە کرانەوەی مەزن ئەنجامدراوە. هەم شێوەی هزری ئایینی، هەم شێوەی هزری فەلسەفی، زهنییەتی زاڵی کۆمەڵگای نوێ پێکدێنن. هەردوو شێوەی هزریش دووبارە لەفاکتەرە وەرچەرخاوەکانی کۆمەڵگای کۆندا زاڵ دەبن. هەروەکو چۆن کۆمەڵگای سۆمەری بەهاکانی کۆمەڵگای نئۆلیتیکی لەسیستەمی نوێی خۆیدا کرد بەسەنتێزێك, کۆمەڵگای دەرەبەگایەتیش بەها مەعنەویەکانی پێکهاتەی ناوەوەی سیستەمی کۆن و دەوروبەرەکانی دەرەوەی ــ چینە چەوساوە و ئەتنیکەکانی بەرخودان دەکەن ــ کردووە بەسەنتێز. لێشاوی کرداری لەم قۆناخەدا ڕۆڵی دیاریکراوی هەیە, لە واتایەکدا پراکتیك وەك هێزێك بوونی ئافرێنەری زەمەنە. زەمەن (کات) ئەو پراکتیکەیە کە ئەنجامدراوە. هزری کۆنی میتۆلۆژیانە بەبیرۆکەی فەلسەفی و ئایینی تایبەتمەندێتییەکانی نوژەن دەکاتەوە. لەجیاتی فرەخوداوەندی بێ هێز و لاواز، هێزی ئیمپراتۆریەتی هەڵکشاو بەشێوەی پەرەسەندنی قۆناخێك بەرەو خودای هەرە گەورە دەڕوات کە نوێنەرایەتی هێزی گەردوونی دەکات. ئەو ڕووداوانەی لەژیانی ماددی ـ کۆمەڵایەتی ڕوودەدەن، لەزهنییەتیشدا بەرامبەرەکەی خۆی دەدۆزێتەوە. بەشێوەیەکی بەرامبەر یەکتری بەهێزکردن لەئارادایە. لەئایینەکاندا لەجیاتی فرەخودایی بەجێبوونی ئایینی تاکخودایی، پەیوەندی بەم قۆناخەوە هەیە. ئیتر پراکتیکی هەزاران ساڵەی دەوڵەت بیرۆکەی پادشا ــ خوداوەندی داماڵیوە. بەتایبەتیش سەنتێزی ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوا کە بە ئەسکەندەر دەستیپێکرد، لەم بوار و واتایەدا قۆناخێکی گرنگە. ئەسکەندەر کەبە هزری ئەرستۆ پێگەیشتووە و جۆشدراوە، تەواو پەی بە فیکری پادشای ــ خوداوەند بردووە. بەتایبەتیش خۆی وایکردووە

نووسەرەکانی دەوروبەریشی هەست بەساختەیی ئەم فیکرە بکەن. بەرامبەر ئەمەش بۆ پاراستنی دەسترۆیی خۆی بەکاریدێنێ، ئیلاهیبوونی خۆی جاڕدەدات. لەڕێگای توندوتیژییەوە ئیلاهیبوونی خۆی بەسەر ئەسینادا دەسەپێنێ کە بەرخودانی دەکرد. ئیتر لە سەردەمی ئیمپراتۆرەکانی ڕۆما باوەڕی پادشای ــ خوداوەند لەدوا قۆناخەکانی خۆیدا دەژی. لەکاتی مردنی پادشا، بەچوونە ئاستی خوداوەند بەناو دەکرێ، ئەمەش نیشاندەدات کە وردە وردە مەودای جیاوازی کراوەتەوە.

کارەکتەری سێیانەی چەمك و بیرۆکەی خوداوەندی حەزرەتی عیسا لەمێژوودا ڕێگای لەپێش سەراوژێربوونی مەزن کردۆتەوە. ئەو شۆڕشە زهنییەی لەگەڵ عیسادا دەستپێکرد پێشکەوتنێکی گەورەیە. نوێنەرایەتی ئەو قۆناخە مەزنەی تێپەڕ بوون دەکات لەنێوان پادشا ـ خوداوەندەکان و مرۆڤەپادشاکان.

تا ئەوکاتە پادشاکان خۆیان وەك خوداوەند پێشکەش دەکرد، حەزرەتی عیساش کەدەیخواست لاسایی پادشای قودس بکاتەوە، لەژێر ئەم کاریگەریە لەجیاتی خودا وەکو کوڕی خوا دەجوڵێتەوە. بیرۆکەی کوڕی خودای پەرتووکی پیرۆز لەڕاستیدا واتایەکی قووڵی سۆسیۆلۆژی هەیە. لەجیاتی خودا بوون بەکوڕەکەی گۆڕانکاری و پێشکەوتنێکی نوێیە. (ڕۆح ئەلقەدوس) ڕۆحی پیرۆز بەواتای ڕەچەڵەکی خوداوەند دێت.

حەزرەتی عیسا کە لەناو پێکهاتەی هزری ئەو سەردەمە سەریهەڵداوە، لەناوەڕۆکدا هەوڵی ئەنجامدانی ریفۆرمکردنی ئەم پێکهاتە دەدات. هەربۆیە هەم لای ڕۆما, هەم لای یەهودییەکان ڕێگا لەپێش گۆڕانکاری باوەڕییە ئاینییەکانیان دەکاتەوە. لەخاچدانی حەزرەتی عیسا لەئەنجامی ڕێککەوتنی نێوان والی ڕۆما و پادشای قودس سەرچاوەی خۆی بۆ تایبەتمەندێتی شۆڕشگێڕی ئەم پێهەڵگرتنە پێشکەوتنخوازە دەگەڕێتەوە. ئاپۆرا بێکار و هەژارەکانی جەماوەری ئەو سەردەمەو زانا ئایینیەکانی ئاستی ژێر و فەرمانبەرەکانی دەوڵەت پەیوەندی بەرامبەر عیسا نیشاندەدەن. هەڵبەتە حەزرەتی عیسا لەڕۆژێکدا سەریهەڵنەداوە. پەیوەندی لەگەڵ تەریقەتی (ئەسەنی) بەهێزی ئەوکاتە هەیە. هەروەها خەلافەتی لەدەست حەزرەتی یەحیا وەرگرتووە کە وەك پێغەمبەرێك دەناسرێت. بەر لە خاچدانی عیسا، "یەحیا" سەر دەبڕدرێت. لەم قۆناخەدا بەشێوەیەکی بەردەوام جەماوەری بێکار و نەزان لەفراوانبوون دایە. بەکورتی قۆناخێکی قەیرانی گرنگی سیستەمی کۆیلەداری لەئارادایە. ئەو شۆڕشە هزرییەی لەشێوەی مەسیحییەتە ئەنجامی پەرەسەندنێکی چەند سەد ساڵەیە. بەجۆرێك لەجۆرەکان لەبزووتنەوە سۆسیالیست، سۆسیال دیموکرات و مارکسیستەکانی قۆناخی نزیك دەچن. مەسیحییەت پەلهاوێشتنێکی هاوشێوەی ڕۆمای نیشانداوە، هەروەکو بڵێی لەسەر ئاسەوار و وەك سێبەری ئەو جوڵاوەتەوە. دەتوانرێ وەك یەکەمین و گشتگیرترین پارتی هەژارانیش ببینرێ. نەك ئەتنیك بەڵکو مرۆڤپەروەری (هیومۆنیزم)ی بەبنەماگرتووە. لەم بوارەشەوە لەسەر ڕێچکەی کۆزمۆپۆلیتی (فرە ڕەگەزی) ڕۆما بەڕێوەچووە. گرنگترین بانگەشەکانی بەرخودان بەرامبەر ئیمپراتۆرەکانی ڕۆما گووتەی ئیمپراتۆر نابێ بەخوداوەند. خوداوەندی باوك هەیە عیساش کوڕەکەیەتی. لەم ڕستەیەدا هەڵوەشانەوەی زهنییەتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما ئامانجە. ئەو شەڕانەی لەڕووخساردا ئایینین لە ناوەڕۆکدا شەڕی سیاسین. سەرەتا لە میانەی فیداکاری گەورەی حەواریەکان،دواتریش عەزیز و عەزیزەکان، ڕاهیبە ژن و پیاوەکان زهنییەتی مەعنەوی ڕۆما فەتح دەکرێت. لەڕێگای قوستەنتینی گەورە فەتحی سیاسی تەواو دەبێت. ئیتر مەسیحییەت ئایدیۆلۆژیای فەرمی دەوڵەتی نوێی بێزەنتییە.

لەسەرەتاوە تاکۆتایی شەڕێکی دژواری ئایینزایی بەڕێوە براوە. ئەمە پێشبڕکێیەکە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوامە. کە لەناوەڕۆکدا شەڕی بەرژەوەندیپەرستی چین و پێکهاتە ئەتنییە جیاوازەکانە.

لەتیۆلۆژییەکان وەکو بابەتێك باس دەکرێت کە: مەسیحییەت وەك مەزهەبێکی موسەوی پێشکەوتووە, موسەویەت (یەهودی)یش سەرچاوەی خۆی لەنەریتی بەهێز و مەزنی حەزرەتی ئیبراهیم وەردەگرێ کە بەرامبەر پادشا ـ خوداوەندەکانی

سۆمەر و میسر سەریهەڵداوە، ئەم نەریتە لەڕێگای حەزرەتی موسا پێهەڵگرتنی ئەنجامداوە، لەدوای ئەڵقە مەزنەکانی داود و ئەشعیا هەروەکو باس دەکرێ لە ڕێگای حەزرەتی عیسا بەردەوام بووە. دوا مەزهەبیشی دەبێتە ئیسلام.

جوڵانەوەی پێغەمبەرەکان سەرباری ئەوەی لایەنی هزرییان (زهنیان) لەپێشە، بەڵام لایەنی سیاسی کۆمەڵایەتیشیان بەهێزە. بەبەراورد لەگەڵ کۆیلایەتی سەرەتایی (پادشا خوداوەندەکان) نەرمترن و بەدوای سیستەمێك دەگەڕێن توانای ژیانی تێدا بێت و بەرگەی بگیرێت، بەشێوەیەکی دژوار کاریگەری میتۆلۆژیای سۆمەری و میسریان کراوەتە سەر. بەڵام وا لەقەڵەم دەدەن کەزۆربەی گریمانەکانی میتۆلۆژیا و چەمکی خوداوەند تا ڕادەیەکیش لەژێر کاریگەری کات سەردەمیان بەسەر چووە. وەکو چۆن هەیە بەردەوامکردنی کۆیلەداری سەرەتایی وەك سیستەمێك دەبینرێ کە بەرگەی ناگیرێ.

هەروەها ڕێگادان بەپێکهاتنی بازرگان و پیشەکاران و بەدەستهێنانی گۆڕەپانێکی تایبەت بۆ پەرەسەندنی چینایەتییان دەکرێتە ئامانج، هەربۆیە کەرەستەی ئایدیۆلۆژی لەمیتۆلۆژیە کۆنەکان دەدۆزێتەوە. لەبەرئەوەی لەتوێژەکانی ژێرەوەی شار هاتوون، جێگای خۆیان لە کۆمەڵگای سروشتی ناوچە لادێییەکاندا دەگرن.

لەتوێژەکانی وردە ـ بۆرژوای ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دەچن. وەك پێویستییەکی پێکهاتەکەیان ناشێ خاوەن ئایدیۆلۆژیایەکی ڕیشەیی سەربەخۆبن, چاوەڕوانی دەکرێت ئایدیۆلۆژیایەکی پارچە پارچەیان هەبێت. ئەو زهنییەتەی گریمان و وێنایان کردووە بەواتایەك ئایدیۆلۆژیای چینی ناوینە.

هەم لەچینی باڵا, هەم چینی ژێر ئایدیۆلۆژیایەکی تێکەڵە جێگای باسە. چینی ژێر بیرۆکەکانی بەڕێوەبەرایەتی چینی بەڕێوەبەرێتی باڵای خستۆتە سەر بیرۆکەکانی ئازادی و یەکسانی گروپە ئەتنیکییەکان و سیستەمی زهنییەتی خۆیان کردووە بەڕاستییەکی نەریتی باو و توانیویانە سەرکەوتووانە بیکەنە کولتوورێکی جیاواز.

شێوەی ئیسلامی نەریت زیاتر جێگا بەژیری ئەنالیتیك دەدات. بەتەواوەتی لەبانگەشەی پادشای ــ خوداوەند دابڕاوە. لەجیاتی ئەوەی حەزرەتی عیسا وەك کوڕی خوا ببینرێ وەك پەیامبەر (پێغەمبەر)یکی خودا پێناسە دەکرێت، بەشێوەیەکی بەهێز و لێهاتووانە جیاوازی نێوان مرۆڤ ـ خودا دەستنیشان دەکات.

بانگەشەی سەرەکی پەرتووکی پیرۆز " قورئان " چەمکی گەردوونی خودایە, وێناکردنێکی زۆر داتاشراو (واتا ــ مجرد)یی خودا جێگای باسە. بەجۆرێك لە جۆرەکان وەك وزەی گەردوون دەرکی پێدەکرێت. بەڵام لایەنی قورسی ئەم بیرۆکەیە پەیوەندیەکەیەتی لەگەڵ ڕاستینەی کۆمەڵگا, پەیوەندیەکی توندوتۆڵ لەنێوان تاکانەیی بیرۆکەی داتاشراو و ناوەندیبووی دەوڵەت و چەمکی نوێی خودای داتاشراو لەئارادایە. پەرەسەندنی " ئەل " لەڕێگای ئەڵلا بە بەهێزترین شوێنگە گەیشتووە.

لەبنەڕەتدا تیۆلۆژیای سۆمەری بەدوا قۆناخی خۆی گەیشتووە. ماجەڕای خوداوەندەکان کە بەپێکهاتە میتۆلۆژیەکان دەستپێکرد، لەگەڵ بوونی خودایەك کۆتایی پێهات کە هەر فەرمووده‌یەکی یاسایە. کاتێك لەم چوارچێوەیەدا هەڵوەستە بەرامبەر بیرۆکەی حەزرەتی محەمەد بکرێ کە دواپێغەمبەرە، ئەوا هەندێ هۆکار دەبینرێ کە دەرکیان پێدەکرێ، ئیتر میتۆلۆژیای سۆمەری بەشێوەیەك ناوەڕۆکەکەی پووچکراوەتەوە, ناتوانرێ بۆ ئایینی دیکە بەکاربهێنرێ. میتافیزیای قۆناخ پێشدەخرێت. ئەو پراکتیکە کۆمەڵایەتییەی زیادیکردووە، زیاتر سروشتی ناسیوە، ئیتر هەنگاوی ناوە بەشێوەیەکی زانستیانە قۆناخی سروشتی پێناسە بکات. هەربۆیە پێکهاتەی زهنییەتی سیستەمی دەرەبەگایەتی گەیشتۆتە ئەو خاڵەی بڵێ جیهانی کارو جیهانی ئایین لەیەکتر جیاوازن. نوێنەرایەتی خودا لەسەر زەوی و سێبەری خودا (ظل الله) بەگوێرەی زهنییەتی مرۆڤایەتی گونجاوترە. ئیتر ئاستەمە خەڵك باوەڕ بە بیرۆکەی مرۆڤی خوداوەند بێنێ. ئەنجامی مرۆڤ نابێتە خوداوەند, خوداوەندیش نابێتە مرۆڤ، بۆچوونێکی هاوبەشە تەواوی ئایینە کاملەکان پێیگەیشتوون. ئیتر ڕوونکردنەوەی سروشت لەجیاتی بیرۆکە خوداییەکان، بەبیرۆکەکانی هزر ــ مێشك ئەنجام دەدرێت. ژیانی دونیایی و ئاخیرەتی زۆرباش لێك

جیادەکرێنەوە. بەڵام دیسان چەمکێکی خوداوەندی وەها جێگای باسە کە بەشێوەیەکی بەهێز درێژە بەهەبوونی خۆی دەدات، تەواوی جوڵەکانی مرۆڤ کۆنترۆڵ دەکات، وەڵامی کارە باش و خراپەکان دەداتەوە.

لەبنەڕەتدا ڕەنگدانەوەیەکی دەزگای دەوڵەتی داتاشراو و بەسەنتەربوو بەشێوەیەکی چڕوپڕ لەگەڵ بیرۆکەی خوداوەند بەناویەکدا چوونە. کاتێك لەسەدەی 19 یەمدا دەگوترێ دەوڵەت شێوەی بەرجەستەبوونی خوداوەندە ئەوا بەشێوەیەکی ئاشکراتر دان بەم ڕاستییە دادەنرێت. پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لەنێوان بیرۆکەی ئەو دەوڵەتەی کە بەتەواوی لەکەسایەتی پادشاکان دابڕاوە و کەوتۆتە ڕەوشێکی داتاشراوی و بەپێکهاتەیەکی بەهێزی ناوەندی گەیشتووە لەگەڵ ئەو ئایینە تاکخوداییانەدا کە بەهێزن و بوونەتە خاوەن پێکهاتەیەکی ناوەندی. ئایینەکانی مەسیحییەت و ئیسلام تیۆریەکی دەوڵەتی ناوەندی پێشدەخەن ـ هەربۆیە دەبینین ئەو دەوڵەتە ئیسلامییەی لەسەردەمی ژیانی حەزرەتی محەمەددا پێشکەوت لەگەڵ دەوڵەتی خودایی پاپا ئەم تیۆریە پراکتیزە دەکەن.

نوێکردنەوەی بیرۆکەو دۆگماکانی زهنییەتی کۆن لەگەڵ میتۆلۆژیای کۆن و فەلسەفەو ئەخلاقی یۆنان و زەردەشت لەناو یەکدان. پێکەوەلکانی هەرسێکیانە لە وێنەکانی بەهەشت و دۆزەخ تا دەگاتە چەمکی گەردوونی، لەکاری باش و خراپ تاوەکو گریمانەی فریشتە و جنۆکە، لەشێوەکانی پاراستن تادەگاتە ڕێساکانی مافپەروەری، سەرچاوەی سەرەکییان میتۆلۆژیای سۆمەر و فەلسەفەی گریك و ئەخلاقی ئازادی زەردەشتە.

ئەم زهنییەتە لەسەدەی چوارەمی زایینی تاوەکو سەدەی پانزدەهەم ڕۆڵێکی پێشەنگایەتی ئایدیۆلۆژی دەبینێ. لەگۆڕەپانە سەرەکییەکانی شارستانییەت درێژە بەباڵادەستی خۆی دەدات. لەهەموو کیشوەرەکان لەسەرووی هەمووشیانەوە لەئەوروپا بڵاودەبێتەوە. تەنیا لەگەڵ ڕێنسانسی سەدەی پانزدەهەم، واتە لەئەنجامی دەستپێکردنی شۆڕشێکی زهنی نوێ دەکەوێتە ناو قۆناخی دواکەوتن. بەڵام ئاستەمە بگوترێ ئەم زهنییەتەی چاخی ناوین بەتەواوی تێپەڕ کرا. لەژێر ڕووخساری نوێدا هەوڵدەدات لەچەندین گۆڕەپاندا لەسەرووشیانەوە ڕۆژهەڵاتی ناوین، درێژە بەهەبوونی خۆی بدات.

بەدەزگابوونی سیاسی و سەربازی کۆمەڵگای دەوڵەتی دەرەبەگایەتیش، نوێنەرایەتی قۆناخێکی هاوشێوەی قۆناخی پێگەیشتن دەکات, تاوەکو دوایی دەوڵەت باوەڕی و متمانە بەخۆی دەکات. پیرۆزترین هەبوونی خودایە لەسەر زەوی. سەربازەکانیشی جەنگاوەری خودان, دەمامکی پیرۆزیی زۆر بەچاکی جێگیرکراوە.

یەکەمین هێز سیاسیەکانن, دووەمیان نوێنەرایەتی ئایین و سێیەمیشیان سەربازی و چوارەمیان بیرۆکراسییە. دەزگا سەرەکییەکانی دەوڵەت باش جێگیربووە. لەگەڵ چوون و هاتنی خانەدانەکانیش دەوڵەت هیچ لەبەهای دەزگاکانی ونناکات. ئەوەی سەرەکییە دەزگایە نەك خانەدان (بنەماڵە). هەمان دۆخ بۆ تاك و کەسێتیەکانیش لەجێگای خۆیەتی. دیسان سەرزەوی وەك ئەو موڵکە دەبینرێ کەلەلایەن خوداوەندەوە پێشکەشکراون. دەبێ بەندەکان(کۆیلەکان) ڕازیبوون بەرامبەر ئەمە نیشانبدەن و تەنانەت بەردەوام سوپاسی خودا بکەن. بەرگی پیرۆزیی کراوەتە بەرجەنگەکان, ئەمە بەناوی سیستەمی خودایی ئەنجامدەدرێت. سەرباری ئەوەی گفتیار (موخاتەبە)ی سەرجەم ئازادی و یەکسانی و مرۆڤایەتیکراوە, بەڵام دەسکەوت سەدان دەزگای سەرەکی چەوسانەوەیە کەلەم بوارەدا درێژە بەکۆیلایەتی کلاسیك دەدات. سوپاکانیان بەشێوەیەك ئامادە دەکرێن کە بەسیستەم و هەمیشەیی بن. لەمێژە لەجەنگاوەرێتی دەستەوپێوەند بۆ دەزگای سوپا هەنگاونراوە. سیستەمی سوپای پارس، ڕۆما و هێلینیەکان بەبنەما دەگیرێت و لەبواری چەندایەتی و چۆنایەتی سوپاگەورەکانی چاخی ناوین ئاواکراوە. ئەسپ و شمشێر سەمبۆلی سوپای ئەم قۆناخەیە. بەهەموو شکۆداری و گەورەییەکیەوە سەردەمی دەزگای سوارچاکی و جوامێری لەئارادایە.

بیروکراسی بەدەزگابووە. ستاتۆی وەزیر و فەرمانبەرەکان دیاریکراوە. چینەکانی سەربازی و زانست لێکجیاکراونەتەوە. باج بەبنەمایەکی پتەو گرێدراوە. هەواڵنێری و هەواڵگری وەکو دەزگایەك بڵاوبۆتەوە. وەك شێوەیەکی بەرهەمهێنان بیر لەشەڕ دەکرێتەوە, فەتحکاری سەرچاوەی گرنگی بەدەستهێنانی قازانجە. فەتحکردنی خاك و زەوی نوێ واتای بەرهەمی ـ زێدەی نوێتر دەبەخشێ. بەهێزترین دەوڵەت ئەو دەوڵەتەیە کە بەباشترین شێوە دەجەنگێ و فەتحکاری دەکات. ژیان و گوزەران لەسەر خوێن و چەوسانەوە سنوور ناناسێ, شەڕکردن بەناوی خودا تەنیا بەفەتحکردنی تەواوی دونیا ئەنجامگیر دەبێ. ئەمەش بەواتای جیهادێکی گەردوونی و هەتاهەتایی دێت. لەوە زیاتر کرانەوەی سیستەمی دەوڵەتگەرایی نابێ, واتە لەوەزیاتر پێناگات. ئیتر گەیشتۆتە دوا قۆناخی گەورەبوون. ئەمەش بەو واتایە دێت کەدەزگای دەوڵەت لەناو قۆناخی مێژوویی گەیشتۆتە قۆناخی پێگەیشتن. قۆناخی دواتر تەنیا دەشێ ڕەوشی قەیران بێ.

لەژیانی کۆمەڵایەتیدا بەندایەتی وەك ڕەوشێکی سروشتی لەقەڵەم دەدرێت, کە لەخوداوە هاتووە. ڕەوشی بەندایەتی دۆخێکی زگماکی ژیانە و شتێك نییە دوایی دروست کرابێت. مرۆڤ بەبەندایەتی لەدایك دەبێ و دەمرێ. جگە لەبەندایەتی بیر لەشێوەیەکی دیکەی ژیان ناکرێتەوە. لەلایەك خودا لەلاکەی دیکەش بەندەکانی هەن, فریشتە و پێخەمبەرەکانی ناوەڕاست، ئەو پەیامبەرانەن کە فەرمانەکان دێنن. گەر وەریگێڕیتە سەر زمانی کۆمەڵناسی خودا نوێنەرایەتی ئەو دەسەڵاتە داتاشراوەی دەوڵەت دەکات کە بەدەزگابووە و فریشتەکان نوێنەرایەتی سوپای فەرمانبەرانن، پێخەمبەر و فریشتە سەرەکیەکانیش نوێنەرایەتی وەزیرەکانن, واتە ڕەمزی بیروکراسیەتی باڵایە. بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا لەمیانەی سیستەمێکی سامناکی سەمبۆڵەکان بەڕێوە دەبرێت.

پەیوەندیەکی توندوتۆڵ لەنێوان بەڕێوەبەرایەتی سەمبۆلی و کرداری لەئارادایە. تاوەکو پەیوەندی نێوان بەڕێوەبەرایەتی ڕەمزی و پراکتیکی شیکار نەکرێت بە تێگەیشتنێکی تەندروستانەی کۆمەڵگا ناگەین.

ئەگەر دەخوازین بەڕێوەبەرایەتی ڕووتی کۆمەڵگا تێبگەین ئەوا پێویستە ئەو پەردەخوداییەی سیستەمی پەنتائۆن ـ سەری لابرێ. ئەوکاتە دەبینرێ کە هەزاران ساڵە لەژێر ناوی پیرۆزیی ڕووخساری قێزەون و ستەمکارانەی چەوسێنەر و زۆردارەکان شاراوەیە.

بەندایەتی کۆمەڵگا تەنیا دیاردەیەکی چینایەتی نییە. جگە لەدەسپۆت ـ کە ئەویش دیلی سیستەمە, هەموو کەسێك واتە سەرجەم چینە کۆمەڵایەتییەکان گرێدراون. سیستەمێکی شاراوەی ملکەچکردن هەیە کەلەهی سیستەمی کۆیلایەتی قووڵترە. نەرمبوون بەواتای قوڵبوونی سیستەمیش دێت. پارادیگمای سەرەکی کۆمەڵگا سیستەمێکی بەندایەتییە کە سەرەتاو دوایی نییە. لەئەزەلەوە تا هەتاهەتایی ئەم دوو بیرۆکەیە زیاتر تایبەت بە قۆناخی پێگەیشتنی دەوڵەتە ـ هەروەکو خۆی سیستەم بەردەوام دەبێت. شوێنی تاقیکردنەوە و گۆڕانکاری پەیوەندی بەدونیای دیکە (ئاخیرەت)ەوە هەیە، نەك تەنیا سەرهەڵدانی کرداری، بەڵکو بەڕۆح و فیکریش دژایەتیکردنی سیستەم گەورەترین گوناحە (تاوانە). باشترین بەندایەتی بۆ ئەو کەسەی بەرەهایی (موتلەقی) عیبادەت دەکات,خودی بەهێزی و شەرەفمەندییە. ئەو بوونەوەرانەی لەسەردەمی کۆمەڵگای سروشتی و سەردەمی قارەمانێتی قۆناخی ئەرێنی پلەداری بە باشترین شێوە خزمەتی کۆ مرۆڤ (کۆمەڵگا)یان دەکرد، لەسەردەمی بەندایەتی وەك کەسایەتی شەیتانی و مەترسیدار و تاوانبار بەرامبەر بەخوداوەندەکان نەفرەتی لێدەکرێت. وەك چەمك و بیرۆکە شەیتانیبوون سەبارەت بەو گروپانەی مرۆڤ پێشدەخرێت کە کۆیلایەتی پەسەند ناکەن. ئەم بیرۆکەیە, کە سەرچاوەکەی لەڕۆژهەڵاتی ناوینە, سەبارەت بەو گروپانەی گەل بەکاردەهێنرێ کە لەگەڵ سیستەم نابن بەیەك. هەربۆیە ئەو کوردانەی ناکەونە نێو سیستەمی تاکخودایی و گرێدراوی نەریت و کەلەپووری سروشتی ژیانن بەشەیتانپەرستەکان بەناو دەکرێن. پەرستنی شەیتان لەلایەن ئەو توێژەی کوردان چەندەی بڵێی واتادارە.

بەچاوی سیستەمی کۆیلەداری سەردەمی پێگەیشتن، جیهان شوێنێکە هەر ساتێك گوناهی تێدا ئەنجامدەدرێت، پێویستە خۆی لەژیان بپارێزێ. چەندە خوازیاری ژیان بیت بەو ئەندازەیە گوناهکار دەبیت. بەهەموو شتێکەوە ئامادەبوون بۆ مردن پێگەیشتووترین شێوەی ژیانە. لە کاتێکدا ئەم هەڵوێستە سروشت وەك ماددەیەکی مردوو دەبینێ کەپێویستە هەرگیز نزیکی نەبنەوە، ئەوا لەسەرەتاوە خولقکاری کردووە بە بابەتێکی مەحاڵ، ناشێ بەندەکان بیر لە چەمکی سروشتی زیندوو بکەنەوە. لەبنەڕەتدا شوێنپەنجەی فشار و چەوسانەوەیەکی سامناك لەبنەمای لەدایکبوونی ئەم سیستەماتیکە هەیە. یەکەمین هۆکاری دەروونی کە ئەمڕۆش ڕۆژهەڵاتی ناوین ناتوانێ بێتەوە هۆشی خۆی ئەمجۆرە هەڵوێستەیەتی بەرامبەر سروشت. بەرامبەر ئەمەش بۆ چینی ئەرباب دونیایەکی زیندووی وەها لەسەر ئەم خاکە جێگای باسە کە وەك بەهەشتە. ئەرباب و خوداوەندەکان کە هەمان ناوی ـ ڕەب ـ یان هەڵگرتووە ـ واتە توێژی بەڕێوەبەرایەتی ژیانێکی وەها دەگوزەرێنن تادوایی پێیخۆشحاڵن و هاوشێوەی چیرۆکەکانی هەزارو یەك شەوەیە. چیرۆکەکانی هەزار و یەك شەوە گێڕانەوەی میتۆلۆژییانەی سیستەمی پێگەیشتووی چاخەکانی ناوینە.

لەڕەوشی ناو قەفەسی ژندا تەنیا گۆڕانکاری لە دەنگ و ڕازانەوە جێگای باسە. لە ئاستێکی خەیاڵیدا کە باوەڕ ناکرێت قووڵکردنەوە و شاردنەوەی کۆیلایەتی جێگای باسە. ژنی چەرخەکانی ناوین دووچاری دووەمین شکاندنەوەی مەزنی کولتووری ڕەگەزی هاتووە. لەکاتێکدا لە کولتووری خوداوەندە ژن ئینانا ـ عەشتاری قۆناخی لەدایکبوونی دەوڵەتی کۆیلەداری یەکەمین یەکەمین شکاندنەوەی مەزنی کولتووری ڕەگەزی دەبینرێ، ئەوا لە قۆناخی پێگەیشتنی سیستەم لە کەسایەتی نموونەکانی مریەمی خۆشکی موسا، ژنی حەزرەتی محەمەد عایشە، دووەمین شکاندنەوەی ڕەگەزی دژ بە ژن دەبینرێ. هەروەکو چۆن هیچ شوێنپەنجەیەکی خوداوەندی ژن نەماوە، وەکو نزیکترین شوێن (ستاتۆ) لە شەیتان دەبینرێ. نیشاندانی بچووکترین ناڕەزایی، خۆی دەبێت بەشەیتان. هەر ساتێك دەشێ ڕۆحی خۆی بفرۆشێتە شەیتان. پیاو لاڕێ بکات. ڕەوشی جادووگەرێتیەکەی پێویست دەکات لە ناو کلپەی ئاگر بسووتێ. کولتوورێکی کوشتنی بەکۆمەڵ جێگای باسە کە بەزیندەبەچاڵکردنی کیژۆڵان دەست پێدەکات، تا دەگاتە لەرێدەرخستنی زایەندی و ڕەجمکردن. ئەو ڕەوشەی کۆیلایەتی کە لە ناو کۆمەڵگادا قووڵبۆتەوە و بە هەزاران ساڵ تەشەنەی کردووە و گەیشتۆتە ئاستێك بەرگەی ناگیرێت. لە ڕاستیشدا تاوەکو ژن شیتەڵ نەکرێت دەرك بە ئاستی کۆیلایەتی سیستەمیش ناکرێت. ئەو ئەڵقانەی بەهەموو شوێنێکەوە کراون، کەلوپەلەکانی ڕازانەوە و نەخت، ڕەنگدانەوەی کولتووری کۆیلایەتییە. هەروەکو بلێی زمانی بڕاوە، بێ فکر هێشتراوەتەوە. ستاتۆی ژن وەك دایکێکی وشك یاخود وەك کێلگەیەکە کە پیاوان چۆن بخوازن بەمجۆرە بەکاری دێنن. لە مێژە لە بابەتێکی زیندوو و بکەر دەرچووە، کراوە بە ئامرازێك (تەواوکەر)، شوێنپەنجەیەکی خوداوەندە ژنی کۆمەڵگای سروشتی نەماوە. هیچ شوێنەوارێکی ئەو ژنە زانا و بلیمەت و بەڕێوەبەر نەماوە کە منداڵان و لاوان و پیاوان لە دەوروبەری کۆدەبوونەوە.

ڕەوشی منداڵان و لاوانیش زیاتر لە ژن دەچێت. بەرلەوەی منداڵی سروشتی تەمەنی بگاتە حەوت ساڵان سیستەمی بەندێتی گشتی ڕۆحی کێشاوە. لە میانەی پێڕەوە فێرکارییە ئاساییەکانی سیستەمەوە لە قۆناخی هەرزەکاریدا کەسایەتییەکی چوارچواری دروستکرا و دەخولقێنرێ. پێشتر هەموو هەڵوێستێکی پێوانە (ئامادە) کراوە. تەنانەت لە ئاستی وشەشدا بیر لە ئازادی ناکرێتەوە. دەتوانین بەشێوەیەکی گشتی ئەو قۆناخە وەکو سڕینەوەی ڕۆح و هزری کۆمەڵگا هەڵسەنگێنین. تەنیا دەنگ و زایەڵەی دروشمەکانی، الله، شمشێر، نالی ئەسپی بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵگای باڵا جێگای باسە. تەواوی داستانەکان درامای مردن و فەتحکاریان تێدا بەدی دەکرێ. لەوانەیە زێدەڕۆیی لەم تابۆیەدا هەبێ. بەڵام بە شێوەیەکی گونجاو ڕاستی ناوەڕۆکی دەروونی قۆناخ شیدەکاتەوە. سیستەمی کلاسیکی جێگیرتر جێگای سیستەمی کۆیلەداری سەردەمی دێرینی گرتەوە. دەوڵەت و ئەو کۆمەڵگایەی نوێنەرایەتی دەکات، لە بەرزترین ئاستی خۆیدایە، واتە لە قۆناخی پێگەیشتندایە. تەواوی بابەت و دەزگا

سەرەکییەکانی تایبەت بە سیستەم ئاوا کراون. مزگەوت، کلێسا و حەورا رۆژانە لە میانەی بانگدان و زایەڵەی زەنگ پیرۆزیی سیستەم رادەگەیەنن. دەوڵەتی سەرمایەداری کە لەمەبەدواوە دەرفەتی گەشەکردنی بۆ دەرەخسێ چەندە خۆی بەهێزیش نیشان بدات، دیسان قۆناخی دوای قەیرانی کۆمەڵگا پێکدێنن. هەروەکو دەزانرێ شکۆدارترین قۆناخ بە دوای چارەسەرکردن و تێپەڕکردنی قۆناخەکانی قەیرانەوە دێت. ئەم یاسا گشتییەی سروشت بەزیادیشەوە بۆ قۆناخەکانی کۆمەڵگا بەجێیە و پەیڕەو دەکرێت.

چاخی ناوین بابەتەکانی رەنجبەری، شار، گوندمان هێندە بەکار نەهێنا کە شێوەیەکی دیکەی بابەتەکانە. لەبەر ئەوەی پەیڕەوی شیکاری چینایەتی و ئەنجامەکانیان دەزانرێ پێویستی دووبارەکردنەوەمان نەبینی. بێگومان لەڕێگای ئەم پێڕەوشە دەکرێ هەندێ راستی دیار بکرێن. دەشێ رەنجبەر، گوندی، بازرگان، شارستان، پیشەکار، زانا و هونەرمەندەکان وەك توێژە هەمەڕەنگەکانی کۆمەڵگا بەناو بکرێت. دەشێ ئامرازی بەرهەمهێنانی خاك، هەروەها پەیوەندییەکانی موڵکایەتی سەبارەت بە خاك، ئەو مافدارییەی پێشدەکەوێ، پێویستی بە تاوتوێکردنێکی گشتگیر هەبێت. لەبەر ئەوەی بوونی خاك بە گرنگترین ئامرازی بەهەمهێنان، شەڕوپێکدادانەکانی فەتحکاری خاك بە بنەما دەگرن و بایەخداربوونی چینی ناوین، دەشێ رۆڵێکی باش لە پێشکەوتنە کۆمەڵایەتییەکاندا ببینێ، پێویستە بەگرنگی و بایەخ پێدانەوە تاوتوێ بکرێ. بەڵام لەبەر ئەوەی ئامانجی ئێمە پێناسەیەکی گشتی دەوڵەتی بە بنەما دەگرت. لایەنە پەیوەندیدارەکانی تابلۆ و چوارچێوەمان دیار کرد.

ئەو فاکتەرانەی رێگای لەپێش هەڵوەشانەوەی سیستەمی دەوڵەتی کۆیلەداری کردەوە بە شێوەیەکی سەرەکی لە ناوەوەن. بۆ هەڵوەشانەوەی پێویستی بەهێرشەکانی هێزە ئەتنیکییەکانی دەرەوە و ئایینی دیکەی ناوەوە نییە. توانستەکانی هەڵوەشانەوە لەناوەوە بە گوێرەی پێویست کەڵەکە بووە. ئاستی سەرووی ئەتنیك (خێڵ) و توێژی ناوینی بۆرژوا تازە هەڵکشاوەکان وەك ئەو توێژانەی بەناوی مەزهەبی ئایینی و قەومی جیاواز سەرهەڵدەدەن ئەو هێزە سەرەکیانەن کە بەرامبەر مۆنارشی موتلەقگەرایی چینی ناوینی شار بە تایبەت بۆرژوای بازرگانی، یەکتر دەبڕن، دەوڵەتی نەتەوەیی و کۆمەڵگای سەرمایەداری دەئافرێنێ کە خاڵێکی وەرچەرخانی مەزنە لە مێژوودا. ئەو قۆناخەی لەسەدەی پانزدەهەمەوە تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە وەك کۆمەڵگای سەروو دواقۆناخی دەوڵەت لە خۆوە دەگرێت. ئیتر ئاستی پێشکەوتنی هزر و تەکنۆلۆژیای ماددی رێکخستنەکانی شێوازی دەوڵەت بۆ کۆمەڵگا وەك قۆناخێکی دەزگایی بێواتا و کۆت و بەندەکانی پێ دەبینێ.

## کۆمەڵگا و دەوڵەتی سەرمایەداری ـ قەیرانی شارستانییەت

کاتێك لینین دەڵێت:" لە قۆناخەکانی قەیرانی گشتیدا مەسەلەی سەرەکی دەوڵەت و شۆڕشە" راستە و لەسەرهەقە. چاوەڕوانی پێناسەیەکی راستی سەبارەت دەوڵەت و کۆمەڵگای لێدەکرا. تەواوی توێژە چەوساوە و ستەملێکراوەکانی سەدەی بیستەم وەك پێکهەڵگرتنێکی پێخەمبەران باوەڕییان پێی هێنا بوو. لە هزر و چالاکییەکانی خۆیدا دڵسۆز بوو، بە توانا بوو. چەندەی بڵێی لە پێناسەی راستیش نزیك ببۆوە. بەڵام دیسان ئەوەی وەك بوونەوەرێکی ئەفسووناوی نەناس بەرامبەر لینینیش درێژەی بەخۆیدا و مایەپووچی کرد، دەوڵەتە. بۆ تەواوی پێخەمبەر، بلیمەت، فەیلەسوف و زاناکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان هەروەکو بڵێی دەوڵەت دۆخێکی "دوولایەنەی کوانتۆم"ی نمایشکردووە. ئەمەیە دوو لایەنەی "شوێنی دیاردە بزانی زەمەنەکەی نازانی، زەمەنەکەی بزانی شوێنەکەی نازانی". هەندێ فەیلەسوف ئەمە بە "دوالیزمی نادیاری" بەناو دەکەن. وەك پێشکەوتووترین هەستیاری دەشێ بۆ "زانین" ببێتە پرەنسیپێك. منیش باوەڕی بەوە دەکەم یاخود دەزانم: لە ساتەوەختی زانین دەخولقێی. واتەلەبەر ئەوەی زانین، فێربوون، پێکهاتن و خولقاندن، سەرباری هەوڵ و کۆششی زۆرم نەمتوانی چارەسەری بۆ رەوشی (نیوزانین) زانستی نیوەچڵ بدۆزمەوە. بەلام ئەمە دوالیزمێکە لە سنوورەکانی ماکرۆ و میکرۆی گەردووندا سووڕدەخواتەوە. لە نەوازەترین پێکهاتەکانی گەردوندا هەبوونی خۆی نیشان دەدات.

باوەڕناکەم دەوڵەت دیاردەیەکی بەم شێوەیە بێت. هەروەکو چۆن ئەنگلس بەشێوەیەك دانایانە هەستی پێکردووە، بۆیە دەڵێ ڕۆژێك دێت، دەوڵەت، وەك کەلوپەلەکانی خلۆکە دەهاوێژرێتە ناو زبڵدانی مێژوو و لە یەکێك لە شتەکۆنەکانی مۆزەخانە بەولاوە نابێتە شتێکی دیکە. هەموو بێ شانسییەکە ئەوەیە نازانرێ خاوەنی راستەقینەی کێیە، هەروەها وەك پێویستییەکی ناوەڕۆکەکەی نازانرێ لە کوێ و چۆن پێکهاتووە، هەروەها لەبەر ئەوەی کاتێ خاوەنیشی دەبێ بۆ راستینەیەکی جیاوازتر لە گۆڕێ، ئەوا تێگەیشتنی ئاستەم دەبێت. بەمجۆرە نمایشێکی وەها دەخولقێنێ. هەروەکو بڵێی "دوالیزمی کوانتۆمە".

ئێمە لەناو سەرمایەداریدا دەژین. ئەمریکای هێزی دینامیزمی سەرمایەداریش لەبەرپاکردنی شەڕێکی بچووککردنەوەی دەوڵەت لە سەرتاسەری جیهان دوودڵ نەبووە. لە فیلمی پادشای ئەنگوستیلەکان کە باسم کرد کاتێك ئەنگوستیلە لە نێو دەبردرێت، لەبنەڕەتدا رەخنەکردنە لەو دەسەلاتە زێدەڕۆییەی بوە بە کۆسپێکی گەورە. بەڵام وەك دەوڵەت بەمەش ناوەستێ و هەموو دونیا دەپێچێتەوە. کەواتە کێشە و گرفت لە لوتکەی کۆمەڵگای باڵا وەکو خۆی بەردەوامە. بەهەرحاڵ رەوشی دەوڵەتەکانی دیکەش کە پێویستە هەریەکە و لە ئاستی ویلایەتێکدا بن بە شێوەیەکی پڕشنگدارتر شیکار نەکراوە. هیچ حکومەتێك نییە سەبارەت بە بابەتی دەوڵەت بیری لە ریفۆرم نەکردبێتەوە. لایەنی نامۆ و سەرسوڕهێنەری ئەوەیە، هەر ریفۆرمێك لەدژوارکردنی قەیران بەولاوە هیچ ئەنجامێکی دیکە لەگەڵ خۆیدا ناهێنێ. ئامانجی دواماجەرای رۆژهەڵاتی ناوینیش "پرۆژەی ریفۆرمی رۆژهەڵاتی ناوینی گەورە"یە. لە رۆژەڤی تەواوی جیهاندایە: بەڵام نازانرێ ئەو مەودایەی بڕاوە بەرەوپێشەوە دەچێ یان بەرەو دواوە، چارەسەری پێشدەکەوێت یاخود بێچارەیی قووڵتر دەبێتەوە.

بەباوەڕی من تەواوی ئەم دەستنیشانکردن و هەڵواسراوی و نادیارییانە، لە بنچینەدا سەرچاوەی خۆی لە هەمان کێشەوە دەگرێت، واتە سەرچاوەی خۆی لە ترسی پێناسەکردنی دەوڵەت سەرچاوە دەگرێت. رەوشی ئەو کۆمەڵناسانەی کە پێویستە پێناسە پێش بخەن زۆر لە رەوشی راهیبە سۆمەرییەکان لە پێشتر نییە کە هەوڵیاندەدا لەرێگای جوڵەی ئەستێرەکانەوە چارەنووسی مرۆڤەکان دیاری بکەن. لەکاتێکدا تەنیا ئاماری سەرسامی سەدەی بیستەم سەدجار لە ئاماری تەواوی شەڕوتوندوتیژییەکانی مێژوو خوێناویترە، لە راستیدا لەوە درەنگ نەماون کە چەندین بەرگ پەرتووکی پڕ لە درۆ بەرهەم بێنن سەبارەت بەو بەرهەمە لابەلایەی سیستەم کە گوایە تیرۆری تاك و رێکخراوانی پێدەڵێن. هەروەکو بڵێ تەواوی ئەو توندوتیژییە رێکخراوەی ئەنجامیانداوە بۆ دەرك نەکردنە بە دەوڵەت و لێ تێنەگەیشتنی فەراهەم دەکات. تەنانەت باشترین نیازپاکەکانیش ئاستی پێناسەکردنیان لە پێناسەکردنی فێڵ لە میانەی تاڵە مویەکەوە تێپەڕ نابێت. لەژێر ناوی پێڕەو راستینەی یەکپارچەیی دیاردەی پارچە پارچەدەکەن و هەڵوەستەیەکی وەها نیشان دەدەن هەروەکو بڵێی ئاگادار نین دیاردەکانیان خستۆتە دۆخێك کە نەناسرێنەوە.

لایەنی سەیری مەسەلەکە، وادیارە پێناسەنەکردنی راستی دەوڵەت لەسەر خودی دەوڵەتیش بۆتە بەڵا. دەوڵەت کە هەندێ جار لەرێگای خۆشاردنەوە، جاری دیکەش لە میانەی سەرنج راکێشی، بەزۆریش بە تۆقاندن و سزادان خۆی وەها لێدەکات نەناسرێت، بووە بە بناخەی قەیرانی کۆمەڵگا. ئەگەری ئەوە نییە هەموو گۆشەکانی جیهان ئەم ناوەڕۆکەی قەیران نەبینرێ. تەنانەت ئەو رووداوە رۆژانەییانەی لە میزۆپۆتامیای خواروو روودەدات کە لانکەی لەدایکبوونی دەوڵەتە، هەروەکو بڵێی تۆڵە لە رابردوویەکی نەفرین لێکراو دەکاتەوە. هەروەکو ئەوەیە سەری مار کلکە درێژەکەی خۆی بگەزێت و پێیەوە بدە. هەروەکو ئەوەیە کە بە زمانی پەرتووکی پیرۆز (تەورات) دەگوترێت، لێڤی ئاتۆن لەو شوێنەی لێی لەدایك بووە بە کلکی خۆیەوە دەدات، هەروەکو بڵێی شەڕی لەناوبردنی خۆی بەرێوە دەبات.

هەروەکو تەواوی سیستەمە چەوسێنەر و سەرکوتکەرەکان ئەوا لەدایکبوونی سەرمایەداریش بێ دەوڵەت نابێ. دوگماتیزمی سیستەمی دەرەبەگایەتی ناوەڕۆکێکی ئایینی هەبوو. هەرچی هی دەوڵەتی کۆیلایەتی سەردەمی کۆنە میتۆلۆژییە. لەکاتێکدا

لەیەکێکیان خوداوەند بە تایبەتی لە کەسایەتی پادشا یاخود خانەدان بەرجەستە بووە، لەوەی دواتر خوداوەند لە بوونی داتاشراوی دەوڵەت خۆی شاردەوە و نوێنەرایەتی کرا. چاخەکانی زهنییەتی مرۆڤایەتی ئەمەی بە پێویست دەبینی.

کاتێك دەگەینە کۆتاییەکانی سەدەی دوانزدەهەم لە پێکهاتەی زهنییەتی ئایینی ئیسلام، فەلسەفە وزانست بەرامبەر دۆگما ئایینییەکان ژێر دەکەون. بەفەرمی دەرگاکانی ئیجتیهاد دادەخرێ و قاڵبە دۆگماییەکان وەکو تۆڕەکانی نەزانی راست و چەپ زهنییەتی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوینی دەپێچایەوە. هەرچی ئەوروپایە هەر لە سەدەی دوانزدەهەمەوە لەمیانەی میراسی رۆژهەڵات و گریك کە گۆڕانکارییان تێدا کردبوو بناخەکانی شۆڕشی هزرییان دادەنا. سەرباری سەرجەم لایەنەکانی سەرکوتکاری ئایینی مەسیحی، بەڵام لە لایەکیشەوە مەراقی زانین و فێربوونی دەکوڵا. تێپەڕکردنی ئەو دۆگمایانەی ئایینی مەسیحی کە بۆ شرۆڤەکراوە بوو بۆ ئەو پاشماوە و یادگارییانەی کۆمەڵگای سروشتی هێشتا زیندوو هێندەی راستینەی ئوممەتی ئیسلام زەحمەت نەبوو. هەروەکو چۆن بیرەوەرییە تازەکانی کۆمەڵگای سروشتی سەردەمانێك بەرامبەر ئیمپراتۆریەتی رۆما تێکنەشکا، بەرامبەر دۆگماتیزمی مەسیحیش تێکناشکێ و بەرامبەر چەمکی مادەی مردووی سەبارەت چەمکی سروشت بە روانگەیەکی زیندوو و ئومێدبەخشی دەرهەق بە سروشت دەگات. چەندین تیۆری لەبارەی هۆکارەکانی سەرکەوتنی سەرمایەداری لە رۆژئاوای ئەوروپا لەئارادایە. بە گوێرەی باوەڕی من سەرەکیترین هۆکار دۆگماتیزمەکەی هێندەی ئەوەی رۆژهەڵاتی ناوین ریشەی دانەکوتاوە، دەرفەتی ئەمەی نەبینیوە، ئەنگیزاسیۆن (دادگا ئایینیەکانی پاپا) سێ توێژی سزادا: ئەمانە هەرەتیکەکان (گومڕا مەزهەبییەکان)، سیمیاچیەکان (پێشەنگەکانی زانست)، جادوگەرەکان (پاشماوەی ژنە بلیمەتەکان). سێیەمین بوونەوەر پانزەهیری دۆگماتیزم بوو. زهنییەتی رێنساس لە ناو خۆڵە مێشی سووتاندنی بە هەزارانی ئەم سێ توێژە لە دایك دەبوو.

لەم قۆناخەدا کە یەکێك لە گەورەترین شۆڕشە هزرییەکانی تێدا بەدیهات لەدایکبوونی سیستەمی کۆمەڵگای سەرمایەداری قەدەرێك نەبوو، مسۆگەربوون سەرمایەداری لەخۆوە نەدەگرت. بەلام چۆن بوو سوودی لەم شۆڕشە وەرگرت و توانی ببێتە سیستەمێکی زاڵ؟

لە مێژوودا ئاواکردنی پەیوەندی لەسەر بنەمای راستەهێڵ و مسۆگەری لەنێوان شۆڕشە زهنییەکان و سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان، شێوازێکی باوەڕی و هزرە کە بە بایەخەوە پێویستی هەڵوەستە لەسەرکردنی هەیە. ئەمەش رەنگدانەوەی شێوەی هزری زانستی چەمکی "اللوح المحفوظ" ی پەرتووکی پیرۆزە. گوزارەی "چی نووسراوە بەسەرت دێت" دیاردەکات کە ئەم شێوازەی باوەڕی دۆگماتیکە تا چ رادەیەك بڵاوکراوەتەوە. ئەوەی هەوڵماندا ئەنجامی بدەین و بەشیکردنەوەکاندا بە تایبەت جەختمان لەسەر کردەوە، پەیوەندی ئەم چەمکەیە لەگەڵ چەمکی بەڕێوەبەرایەتی ئیرادەی دەوڵەتگەرایی پلەدارییە. هەڵوێستێکە وەك یاسایەکی ئیلاهی سەپاندنی سیستەمی "فەرمان" لەسەر کۆمەڵگا بە بناخە دەگرێت. دەبێ وەکو یاسا و رێبەرنامەیەك بیری لێ بکرێتەوە. نەریتی هەزاران ساڵە رێگای لە پێش دەرکەوتنی مۆدێلێکی پێشکەوتنی هێڵداری کردەوە کە بە "چاخی زێڕین" دەستپێدەکات و لەگەڵ "مەعشەر" و "بەهەشت ــ دۆزەخ" تەواو دەبێت، هزری قەدەرگەرایی پێویستییەکی ئەم چەمکەیە.

ئەمەش لەجیهانی ئیسلامدا گفتوگۆیەکە لەنێوان لایەنگرانی موعتەزیلە و لەوحی ــ مەحفوزگەران بڵێسەی سەندووە. ریشەی ئەم چەمکە زۆر کۆنە, کەپێویستی بەگفتوگۆی ئازاد نابینێ و ئەلتەرناتیفی ئیرادەی خاوەن بڕاری هەمەڕەنگ بێواتا دەکات, بۆ سەردەمی میتۆلۆژیەکان دەگەڕێتەوە. کە باوەڕی وایە خودا میتافیزیکەکان (سەرووی سروشت) هەموو رووداوەکانی خولقاندووە و بەڕێوەشیان دەبات، واتە بەفەلسەفەی ئایدیالیزمەوە بەردەوام دەبێت. هەرچی شێوەی ئێستای شارستانییەتی ئەوروپایە کە بەرێنیسانس دەستپێکرد چەمکێکی پێشکەوتنی تەخت و رێکە. لەبنەڕەتدا ریشەی باوەڕی بەهێزی قۆناخی

ڕۆشنگەری بە (پێشکەوتن) و باوەڕی مارکسیزم بەڕۆیشتنی ناچاری بەرەو کۆمۆنیزم، بۆ ئەم شێوازە دۆگماکییانەی فیکر دەگەڕێتەوە.

ئەتۆمالتی، واتە ئەو دیاردانەی تیۆرییەکانی فیزیای کوانتۆم سەلماندوویەتی هێزی ئەم شێوازەی هزری تێکشکاندووە. پێشکەوتنەکانی سروشت و کۆمەڵگا بەشێوەی هێڵێکی ڕاست و بەردەوام نییە، بەڵکو لەزەمەنی گێژاودا، ڕاستینەی پێشکەوتنێکە لەجیهانی ئەتۆمالتی کە بۆبژاری هەمەڕەنگ کراوەیە و خاوەنی بژاری ئازادانەیە، وەك یەكێك لە شۆڕشە گەورەکانی هزر رووبەڕوومان دەبێتەوە. لەڕاستیدا بەبێ پێویستی بینینی فیزیای ئەتۆمالتی، لەڕێگای هەست و گریمانەکانیش دەتوانین بەم شێوازەی هزر بگەین. لەجیهانی تەواوی ڕووداوو دیاردەکاندا ئەگەر هێزێکی پێشکەوتن لەئارادا نەبێ کە جێگا بۆ بژارە ئازادەکان جێبهێڵێ، ئەوا ئەو ئەنجامەی دەردەکەوێت ناتوانێ هەمەڕەنگی بێ سنووری گەردوون ـ سروشت ڕوونبکاتەوە.

هەمەڕەنگی پێویستییەکی ئازادییە. هەڵوێست و نزیکبوونەوەی هێڵکاری ـ ڕاست و تەخت وەك یەکبوون لەگەڵ خۆی دێنێ هەربۆیە هەڵنەبژاردن دەسەپێنێ.

ئەم شێوازە هزرە فەلسەفی و زانستییە بۆئەوە بەسەردەکەینەوە، چونکە هەڵوێستێکی خولقکارانەی بۆ ئەم قۆناخە بەدەستهێنا کەلە سەدەی پانزدەهەم خێراتربوو و بەسەرکەوتنی سەرمایەداری ئەنجامگیر بوو. بەکورتی دەبوو سەرکەوتنی سەرمایەداری قەدەرێك نەبێ. پێویستە هۆکارەکانی سەرکەوتنی سەرمایەداری هەڵسەنگاندنێکی زیاتر نزیك بەڕاستی بۆ بکرێت. ئەو مارکسیزمەی کاریگەری لەئێمەکرد کاتێك سەرمایەداری و شێوەکانی پێشووتری کۆمەڵگای چینایەتی وەك " هێڵی ناچاری پێشکەوتنی مێژوو " ڕاگەیاند، بەبێ هەستپێکردن، بەپێچەوانەی ئومێد و بڕواکەیان گەورەترین کۆمەکی بەو سەرمایەداریە کردووە کە زۆر بەرامبەری جەنگا.لەگەوهەری ئەو بۆچوونانەی لەم بەرگرینامەیەدا ئاماژەم پێیانکردووە ئەو شێوە بڕوایەم شاراوەیە کە " لەتەواوی سیستەمەکانی کۆمەڵگا,مارکسیزمیشی لەناودا بێت، هەروەکو شێوە سەرەکییەکانی هزر ئاماژەی پێدەکەن، پرەنسیپێکی ناچاری بوونی نییە ". سەبارەت بەشێوەکانی کۆمەڵگای سەروو (باڵا) بێت یاخود دەوڵەت، بانگەشەکانی " پێشکەوتنی ناچاری " ئاماژەپێکراو شوێنپەنجەی ئەو پروپاگەندە فەرمیانە لەخۆوە دەگرێت کە هەزاران ساڵە بەردەوامە. چەمکی قەدەرگەرایی کۆن لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لەژێر ناوی " یاسا ناچاریەکانی کۆمەڵگا " لەژێرپەردەیەکی زانستیانە درێژەی پێدەدرێت.

دینامیزمی وەرچەرخانی کۆمەڵگا بەشێوازێکی جیاوازتر کاردەکات، تەنیا لەسەر بنەمای گێڕانەوەی بۆ پێکهاتەکانی سەرخان و ژێرخان ناتوانرێ ڕوونبکرێتەوە، وەرچەرخان و گۆڕانکارییەکان لەژێر سایەی فاکتەری زۆر ئاڵۆز بەدیدێن. بەتایبەتی شرۆڤەی دۆگماییانەی ماتریالیزمی دیالەکتیکی کە کاریگەری کردۆتە سەر بەشێکی زۆری ڕۆشنبیرە هاوچەرخەکان، هەروەکو لەهەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو سەلمێنرا واقیعی نەبووە، هیواو خەیاڵی ئەوانەی شکاندووە کەهیوایان پێیهەبوو, لەجیاتی گرێدانی سیستەمە مێژووییەکانی کۆمەڵگا بەیاسا ناچارییەکان، پەیوەستکردنیان بەشێوازی تێکۆشانی هەڵوەستە ئایدیۆلۆژی و سیاسی و ئەخلاقییەکان هەڵوێستێکە زیاتر چارەسەری لەگەڵ خۆی دێنێ.

لەدیاردەکانی کۆمەڵگا و تاکەکانی مرۆڤدا یاساییبوون هەم زۆر نەرمە, هەم خاوەنی ئەو تایبەتمەندیانەیە کە بەخێرایی دەتوانێ وەرچەرخان ئەنجام بدات. یاساییبوونە وشکەکانی لەدیاردەکانی فیزیا، کیمیاو زیندەوەرزانی دەبینرێ، تەنیا لەسنوورەکانی فیزیا، کیمیا و زیندەوەرزانی پەیڕەو دەکرێ, ئەوانەی دیکە لەلایەن پێکهاتەی مێشکی مرۆڤ و دیاردەی کۆمەڵگا دیاری دەکرێن. لەبەر ئەم هۆکارانە گرێنەدانی مرۆڤ و کۆمەڵگا بەچەمکە قەدەرگەراییەکان, سەبارەت بە شانسی سەرکەوتن و تواناکارییەکانی گرنگی و بایەخێکی مەزن لەخۆوە دەگرێت. پێشداوەریەکانی پێشوەخت بێت یاخود داوەریە قەدەرگەراییەکانی سەبارەت بەئاکام، دینامیزمی خولکاری ئازاد کۆت و بەند دەکات. کاتێك کۆمەڵناسی جێگای باس بێت, ئەوا

پێویسته بەردەوام ئەوەمان لەبەرچاوان بێت كه بەشێكی زۆری ئەوەی باسدەكرێت سیستەمی كۆمەڵگای زاڵە, كەهەزاران ساڵە تەشەنە دەكات و لەهەر قۆناخێكیشدا دەمامكێكی جیاواز دەپۆشێت و لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا لەژێرپەردەی زانستگەرایی ڕۆڵی لایەنێك دەبینێ.

لەم چوارچێوەیەدا هەڵسەنگاندنی پەیوەندی نێوان كۆمەڵگای سەرمایەداری و شۆڕشی زهنییەتی ڕێنسانس كەلەسەدەی پانزدەهەمەوە قووڵایی و خێراییەكی مەزنی بەخۆیەوە بینی ئەوا ڕۆشنكەرەوەتر دەبێت. ئەو دوو تایبەتمەندێتییەی كۆمەڵگای ئەوروپای ڕۆژئاوا ڕۆڵێكی كاریگەری لەسەرهەڵدانی زهنییەتی ڕێنسانسدا هەبووە. لاوازی كولتووری دەوڵەت و یادگارییە تازەكانی زهنییەتی كۆمەڵگای سروشتی هەلومەرجی گونجاویان بۆ پێكهاتنی هزری خوڵقكاری ئازاد ڕەخساندووە.

دۆگما وشكەكانی ئایینی مەسیحی نەیتوانیوە ئەم هەلومەرجانە كۆتگیر بكات و بیانوەستێنێ، لەئەنجامی پەلاماری ــ كریستیانەكان ـ كاریگەری یەكگرتووانەی كولتووری زانیاری ڕۆژهەڵاتی ناوین و كولتووری گریك ـ ڕۆما، كاتێك لەگەڵ هەمان هەلومەرج یەكانگیر بوو، ئەوا دەرفەتی شكاندنی دۆگمای ئایینی مەسیحی ڕەخسا. قۆناخی مەزهەبگەرایی ئایینی مەسیحی سەدەی سێزدەهەمیش هەم ئەنجامی ئەم گۆڕانكاریانەیە, هەم وەكو هۆكاریش ڕۆڵی بینیوە، مەزهەبەكانی دۆمینیكان و فرانسیسكان پێشكەوتنێكن شایستەی سەرنجدانە. لەم قۆناخەدا مەزهەبگەراییەكانی هاوشێوەی ئەمە لە ئیسلامیەتدا دەركەوت و سەركوتكران (موعتەزیلە، موشركینە).

بەشداری چاودێرەكانی جیهانی نوێش گرنگە كە دۆزینەوە جوگرافییەكان فەراهەمیان كردووە. ئەم پێشكەوتنە دوولایەنانە، واتە لاوازی كولتووری دەوڵەت و بیرەوەریەكانی كۆمەڵگای سروشتی و میراسی ئەرێنی موسوڵمانێتی و مەسیحی و یەهودی وەك كولتوورێكی ڕیشەیی بەكاریگەرە ــ سەنتێزی كولتووری گریك ــ ڕۆما و دۆزینەوە جوگرافییەكان زهنییەتی ڕێنسانس دەخوڵقێنێ، دەتوانین ڕێنسانس وەك سێیەمین تێگەیشتنی مەزنی مێژووی مرۆڤایەتی هەڵسەنگێنی. یەكەمیان قۆناخی زهنییەتی نئۆلیتیكە كە لەساڵانی 4000 پ. ز لەحەوزەكانی ناوەوەی زنجیرە چیای زاگرۆس ــ تۆڕۆس گەیشتە لوتكە. لەم قۆناخەدا دەبینین تەواوی ئامرازە تەكنیكیەكان ئامادەن بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی بەرەو شارستانییەت بپەڕێتەوە. خلۆكە, تەونكاری، ئامرازەكانی كێڵان، گوندی گەورە و دیاریكردنی زمانەكان, پێكهاتە خێڵەكییەكان (ئەتنییەكان) و داستانەكانی قارەمانێتی لەدەوروبەری هێزە گەورەكەی بەرهەمهێنان ژن ـ دایك سەیروسەمەرە دەخوڵقێنن.

لەبنەڕەتدا ئایینی خوداوەندە ژن شكۆداربوونێكی گەورەی زهنییەتە، پیرۆزكردنی تایبەتمەندی خوڵقكاری ژنە، تەواوی دۆزینەوەكانی لەم قۆناخە بۆمان ماوەتەوە ئەم ڕاستییە پشتڕاست دەكاتەوە، وشەی ستار كەئێستاش بەواتای ئەستێرە دێت لەكولتوور و زمانی ئەو سەردەمە (ئاریان) بەواتای خوداوەندەژن دێت. لەزمانی كوردی ئەمڕۆی ناوچەكەشدا یا ستار كەبەواتای (یائەڵڵا) دێت, گوزارشتی هێزی باوەڕ و عەزیمەت و سەرسوڕمانێكی مەزنە. ئەمە هەبوونێكی هێندە كۆنە، ئەگەر بەشێوەیەكی كەمێك جیاوازتریش بێت لەتەواوی زمانە بەڕیشە ئاریانییەكاندا بەردەوامی بەهەبوونی خۆی دەدات، دەڵێن كەیەكەمین بەهەشتی دونیا لەم كەوانەیە خوڵقێنراوە. لەبواری بەرهەمهێنان و ژیانی كۆمەڵایەتییدا مرۆڤایەتی بەسەدان دۆزینەوەی (یەكەمین) بەخۆیەوە دەبینێ. ئامێرو قاڵبە مۆسیقییەكانی ئەو قۆناخە تائێستاش لە قووڵاییدا كاریگەری پەشێوی و بەلەرزی خۆی بەتوندی لەڕۆحمان پێچاوە. لێكۆڵینەوەكانی ئەنجامدراون نیشاندەدەن كە لێرەوە بۆ دۆڵی دیجلە و فوراتی خواروو و نیل بڵاوبۆتەوە، ئەم كولتوورەش ڕێگای لەپێش شارستانییەتی سۆمەر و میسر كردۆتەوە.

دووەمین قۆناخی گەورەی زهنییەت لەساڵانی 600 تا 300 ی پێش زایین لەهەردوو كەناری دەریای ئیجە بەدیهاتووە. ئەمە قۆناخێكە كەبەرامبەر میتۆلۆژیای كۆیلەداری زهنییەتی فەلسەفەو زانست پێهەڵگرتنێكی مەزنی ئەنجامدا. بە" سەدەكانی دانایی " یش ناو دەبرێت. لەڕاستییدا ئەوروپای ڕۆژئاوای ئەو قۆناخە ئەنادۆڵی ڕۆژئاوایە. زایەڵەی شەپۆلەكانی

شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتە لەکەنارەکانی دەریای ئیجە. ئەو ڕۆڵەی مەسیحییەت لەئەوروپا بینی، شارستانییەتەکانی هیتیت، ماد، میسر و گریت بەیەکەوە ئەم ڕۆڵە دەبینن. لێرەشدا ڕیشەیینەبوونی نەریتی دەوڵەت, هەبوونی بەهێزی کولتووری کۆمەڵگای سروشتی و جوگرافیای جوان و بەرهەمهێن و هەبوونی نائاسایی دەریا و دوورگەکان فاکتەری بەکاریگەری لەدایکبوونی زهنییەتی نوێن. هەروەکو لەپاشماوەکانی " تروادە" ش تێدەگەین بێگومان وەك ئابووری بازرگانی مەزنی ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوا فاکتەرێکی گرنگە.

بەر لەهەموو شتێك ئەم دوو ڕێنێسانسە گەورەیە لەبناخەی ڕێنێسانسی ئەوروپای ڕۆژئاوادا شاراوەیە. تاوەکو ڕێنیسانسی بنارەکانی زاگرۆس ــ تۆڕۆس تێنەگەین ڕێنیسانسی کەنارەکانی ئیجە تێناگەین، ڕێنسانسی کەنارەکانی ئیجەش تێنەگەین ڕێنسانسی ئەوروپای ڕۆژئاوا تێناگەین. ئەگەر قووڵتری بکەینەوە، گەر پەلهاویشتنی شۆڕشی نئۆلیتیکی ئاریانی کەوانەی زاگرۆس ـ تۆڕۆس نەبێ لەبواری زمان و کولتوور کە لەسالانی 5000 ـ 4000 پ. ز لەچینەوە بەرەو ئەوروپا، لەئەفریقیای باکوور بەرەو قەفقاسیا، ئەوا لەمیانەی کۆمەڵگا نئۆلیتیکییەکانی ئەم ناوچانە زەحمەتبوو لەپێکهاتنی شارستانییەتەکانی دواتر تێبگەین. تێگەیشتنی لێشاوی زنجیرەئاسای مێژوو لەم بوارەدا سەبارەت بەتێگەیشتنی شۆڕشە مەزنەکانی زهنییەت و پێکهاتە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکان بایەخێکی گەورەی هەیە. بۆ ئەوە ئاماژە بەم بابەتانە دەکەم: بۆ ئەوروپاییەك و نەوەکەی باسی شارستانییەت بکەی، هەرە زێدە گریك ــ ڕۆما و ڕێنیسانسی بەئەقڵدا دێت، هەروەها مەسیحییەتیش, لەکاتێکدا پێشکەوتنەکانی ئەم ناوچەیە تەنیا دوو وێستگەی ڕەوتی پیرۆزی ڕووباری شارستانییەتە کە بەهەزاران ساڵە لەبنی فۆناخەکانی شارستانییەت دەدات و دەوروبەری فراوان و پێشەکەی دەکاتەوە و سەرووشی شکۆدار دەکات و بەردەوامە.

گرنگترین تایبەتمەندێتییەکانی زهنییەتی ڕێنێسانس، بەدەستهێنانەوەی ڕۆحی مرۆڤە کە چاخی ناوین ونی کردبوو. چەندە دەکرێ گەڕانەوەیە بۆ ئەو سروشت و دونیایەی بەخراپ لە قەڵەمدرابوو، هەروەها دابڕان لەدۆگماو متمانەکردن بەژیری مرۆڤە. هەر لەسەردەمی ڕاهیبەکانی سۆمەرەوە پاوانی زانین خراوەتە ژێر پاوانخوازی دەوڵەت و کراوەتە یەکێك لە ئامرازە سەرەکییەکانی بەهێزبوون. تەنیا زێدە ــ بەرهەمەکان ئامرازە لێهاتووەکانی بەرهەمهێنان نییە, تەنانەت سوودمەندترین زانیاری و خاوەنەکانیشی یەکسەر بۆ دەزگای دەوڵەت دەگوازرێنەوە. دەرفەت و ڕێگا بەزانستی نوێ نادرێ گۆڕەپانی ئازاد بخولقێنێ. گۆڕەپانی زانستی ئازاد بەواتای کۆمەڵگایەکی نوێ دێت. وەك پێویستییەکی سروشتی دەوڵەتی کۆیلەداری ئەمجۆرە پێکهاتانە وەك هەڕەشەیەك دەبینێ و لەگەڵ پەلاماردانی یان دەستی بەسەردا دەگیرێ یاخود لەنێو دەبردرێت.

لەم فۆناخەدا خستنەگەڕی ئەنگیزاسیۆن لەلایەن کلێساوە واتادارە. کاتێك تاك ڕۆح بەدەستدێنێ ئازاد دەبێ. ئەوانەی زیاتر وەك گومڕا و لادەرە مەزهەبییەکان دادگایی دەکرێن، ئەو بیرمەندە ئازادانەن کە دژی دۆگماتیزمی ئایینین، هەرچی ئەو ژنانەی بە جادووگەر بەناو دەکرێن بۆ ئەوە دادگایی دەکرێن چونکە ناسنامەی مەسیحیبوون هەڵناگرن، هەرچی سیمیاچیەکانن ئەوانەن کە جگە لەمانە بەدوای زانیاری جیاوازتر دەگەڕێن. هەرسێ ڕەوتیش ناوەڕۆکێکی وەهایان هەیە دەتوانن کون لە دۆگماتیزم بکەنەوە. لەکاتێکدا ڕەوتە هونەریەکان ژیان بەهەموو جوانی خۆیەوە نیشاندەدەن، زهنییەتی سروشت و ماددەی مردوو بەرکەنار دەکرێت، نیگارکێشان، مۆسیقا، بیناسازی و ئەدەبیات هەم وەك ناوەڕۆك هەم وەك شێوە سەرلەنوێ شێوە بەڕۆحی تاك دەداتەوە. ئەو تاکەی هزر و ڕۆحی تازەی بەدەستهێناوە، بەواتای ئەو مرۆڤە زیندووە دێت کە لە بەرگەکەی خۆیدا جێی نابێتەوە. لەڕێگای ئەم تاکە تەنیا هەوڵی فەتحکردنی جوگرافیا نادرێت، بەڵکو هەوڵی فەتحکردنی (بەدەستهێنانی) سروشتیش دەدرێت.

لەهەمانکاتدا قۆناخ بۆ وێناکردنی ئۆتۆپیای نوێ هاندەر و وروژێنەرە. جلوبەرگە کۆنەکانی بۆنابێت، بەڵام لەبەر ئەوەی هەلومەرجی ماددی (بابەتی) ڕێگانادەن، تەنیا ئۆتۆپیا سیستەمکراوەکان ئاوا دەکرێن, ناخوازرێ جارێکی دیکە بۆ کەشەدژوارەکەی دونیای کۆن بگەڕێنەوە. بەتەواویش نازانن چۆن دەرگای جیهانێکی نوێ دەکرێتەوە.

ئەم لێگەڕینە، لێگەڕین بەدوای زانست و فەلسەفەی نوێ دەکاتە ناچارییەك. چەندە دابڕان لەدونیای کۆن بەدیبێت، بەو ئەندازەیە بەڕووی جیهانی نوێدا دەکرێتەوە. لەکاتێکدا لەشێوازی ئایینی بەرەو فەلسەفە دەکرێتەوە لەدەرگای شۆڕشی زانستی کۆپەرنیك دەدات. لەمیانەی دوالیزمی مادده ـ ڕۆح ی دۆسکارت کەدەڵێ خوداوەند تێکەڵ بە مەسەلەکان نەکەین, بەیەکەمین بناخەی شۆڕشی فەلسەفی دادەنرێت. گالیلۆش لەمیانەی بەجێکردنی پێوانە لەزانستدا بەهێزترین کۆمەك بە قۆناخی زنجیرئاسای شۆڕش دەکات. " نیوتن " یش بەبێ گەڕانەوە بۆ خوداوەند, لەمیانەی پشتبەستن بە یاساکانی گەردوون هێزێکی مەزنی بەزانست بەخشی. ساڵانی نێوان سەدەکانی پانزدەهەم و حەڤدەهەم قۆناخی ڕیشە داکوتانی شۆڕشی فەلسەفی و زانستی و هونەرییە. سەرباری چەرخی ئەنگیزاسیۆن کەراوەستان نازانێ، لەڕێگای مەزهەبی پرۆتستانتی گورزێکی دیکە بەر دۆگماتیزمی کلێسای وشك دەکەوێ. ئایین سەبارەت بە باوەڕی کەسێتی تاك بەسەربەستی دەگات. دابڕان لەکلێسا لەناوەڕۆکدا دابڕانە لەدەسەڵاتی دەوڵەت، کلێسای کاسۆلیکی هەم خۆی خودی دەوڵەتە، هەم قەڵغانێکی گەورەی پێچان و پاراستنی دەوڵەتی دەرەبەگایەتییە. بەبێ کلێسا بیر لەدەوڵەت ناکرێتەوە. لەبنەڕەتدا کلێسا بەناوی دەوڵەت شەڕدەکات.

ئازادکردنی تاك لەلایەن شۆڕشی زهنییەوە، هەڵوەشاندنەوەی بەندایەتیکردنی دەوڵەتە. هەرچەندە لەژێر ڕووخساری مەزهەبی جیاوازیش ئەنجامبدرێت، ئەوەی ڕووخاوە مەشروعییەتی دەوڵەتی دەرەبەگایەتییە. پێشکەوتنەکەی سەدەی هەژدەهەم بەرفراوانبوونی بناخەی گەلەری ڕێنیسانسە، شۆڕشی زهنی لەهزر و ئومێد و ڕۆحی گروپێك مرۆڤ تێپەڕبووەو بنکەیەکی جەماوەری بەدەستهێناوە. هەروەکو ئاینێکی نوێ ـ موسڵمانێتی, مەسیحی ـ بەجەماوەری خۆی گەیشتووە. هەبوونی جەماوەرێکی ئازادی بەم شێوەیە لەهەموو وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا بۆ دەوڵەتی کلێسای کاسۆلێکی (ڕوهبان) و دەوڵەتی پادشایی هەڕەشەیەکی مەزنە. ئیتر زەحمەتە لەڕێگای ئەنگیزاسیۆن لەهەق ئەم جەماوەرە دەربکەوێت. شەڕ پێویستە. شەڕەکانی سەد ساڵ (ئەڵمانیا) شەڕی گوڵ (فەڕەنسا) شەڕی 30 ساڵەی گوندیەکان لەفەرەنسا و ئەڵمانیا, ئەم ڕاستینەیە نیشاندەدەن. ئەوەی بەرامبەر نەتەوە وشیاربووەکانی ئەوروپا تێکشکا کلێسای کاسۆلیك و شێخەکانی پادشایەتی بوون. شۆڕشی 1640 ی ئینگلتەرا, 1779 ی ئەمریکا, 1789 ی فەڕەنسا سەردەمی سەرکەوتنی دەوڵەت و مەزهەبە نەتەوەییەکان دەستپێدەکات.

سەرلەنوێ چاوپێداخشانەوەی پێناسەکانی شۆڕش، سەبارەت بەچارەسەرکردنی قۆناخەکانی قەیران بەلایەنی مەیلی دیموکراتییانە بایەخدارە. هەڵسەنگاندنی شۆڕشەکانی ئەوروپا وەك " شۆڕشەکانی بۆرژوا " بەرهەمێکی هەڵوێستی تەسکی چینایەتی مارکسیزمە, لەژێر ناوی بەپرۆلیتاربوون, هەروەکو بڵێی دیاریەکە پێشکەش بەبۆرژوازی دەکرێت، بەڵگەنەویستە کەشرۆڤەی دۆگماییانەی ماتریالیزمی دیالەکتیکی کاریگەریەکی گەورەی لەمەدا هەبوو. هەروەکو چۆن ئەمە لەمیانەی چەمکی " لەوحی مەحفوز " ی مێژوویی و هێڵێکی ڕاستبووە بەبڕیار، ئەوا گەر وەکو شێوەی گوازراوەی باوەڕی قەدەرگەرایی بۆ سەردەمی نوێ هەڵسەنگێنین، ئەوا زیاتر نزیکی ڕاستی بەرجەستە دەبینەوە، تاوەکو ئەم دۆگماتیزمە تێپەڕ نەکرێت کەخۆشم لەژێر قورسایی کاریگەریەکەیدا ژیاوم، ئەوا ناتوانین ناوەڕۆکی دەوڵەمەندی نائاسایی ڕاستی شیبکەینەوە.

لەهیچ پەرتووکێکی چینی سەرمایەداری بۆچوون, تیۆری و بەرنامەیەك سەبارەت بە شۆڕشەکانی ئینگلیز ــ ئەمریکا و فەڕەنسا نانووسرێ. ئەوانەی لەم شۆڕشانە ڕۆڵیان بینیوە خۆیان وەك نوێنەری چینی بۆرژوا ڕانەگەیاندووە ــ زۆربەی جەماوەری بەشداربووی ئەم شۆڕشانە لەهەژاران بوون و داواکاریەکانی یەکسانی ــ ئازادییان بەرزکردبۆوە. ئەگەر بانگەشە

بکرێ چینی بۆرژوا بزووتنەوەکانی ڕێنیسانس، ریفۆرم و ڕۆشنگەری پێشووتریان بەبناخەگرتبوو ئەوا زێدەڕۆییەکی مەزنە. کاتێك وەك چین بۆرژوا بەرزەبۆوە، لەکەڵەکەکردنی سەرمایەی پشتبەستوو بە قازانج بەولاتر بیری لە شتێکی دیکە نەدەکردەوە. بێگومان لەزانینی ئەوەدابوو کە ئەورێگایەی بەرەو قازانج دەچێ پەیوەندی بەهێزی دەوڵەتەوە هەیە، بۆ کاریگەری خستنە سەر دەسەڵات و دەستبەسەرداگرتنی لەنێو هەوڵ و کۆششدا بوو. بەڵام بەواتایەکی تایبەت تیۆری و پراکتیکێکی شۆڕشی لەبەردەستدا نەبوو. هەلومەرجە بابەتییەکانی بناخەی شۆڕشیان پێکدەهێنا بەرهەمی پەرەسەندنێکی درێژخایەنی مێژوو بوو. وەك فاکتەرە خودیەکان(سۆبژێکتەکان)یش بیرمەند و سیاسییە ئاکتیفەکان پارتییەك یان پرۆگرامێکی تایبەتی شۆڕشی بۆرژوایان نەبوو. لەناو ڕەوشی چالاکیدابوون. لەلایەن هەندێك دەوڵەمەندەوە دەپارێزران. زۆربەشیان خاوەن کارەکتەرێکی دەرەبەگایەتی بوون، ئەو دەوڵەمەندانەبوون کەخولیاو پەیوەندییان بەزانست و هونەرەوە هەبوو. ئەو داواکاریانەی زیاتر دەردەخرانەپێش بەگشتی حەسرەتەکانی دونیایەکی یەکسان و ئازاد و مرۆڤپەروەرانەبوو.

تەواوی ئۆتۆپیا نووسراوەکان دژی سەرمایەداری بوون. لەدۆخێکی وەهادا چۆنبوو ئەم بیرمەند و ملیتانانە بەبۆرژوا لە قەڵەمدران، شۆڕشەکانیش بوو بە شۆڕشی بۆرژوا؟ بۆرژوازی وەك چینی نوێی قۆناخ ئەویش هەمان هەنگاوی هاوێشت کەهێزەکانی خوازیاری حوکمڕانی ئەنجامیدەدەن، یان بەتەواوەتی یاخود بەنیوەچڵی دەسەڵاتی گرتەدەست، وەکو دەزانین لەم هەنگاوەیدا سەرکەوت. دەبێ باش بزانرێ کە تەواوی هێزە دەوڵەتگەرایی و پلەدارییەکان بەپشتبەستن بەو هونەرەی سیاسەتی پێدەڵێن هەزاران جار گەیشتۆتە دەسەڵات و لێی کەوتووە، بەڵام کاتێك ئەم ئامرازە لەبارەی تاڵان و چەوسانەوە بەبێ پچڕان درێژەی بەهەبوونی خۆیدا، ئەوا ئەو هێزە هاوشێوەیەی تازە بەرزەبێتەوە بەجۆرێکی دیکە هەڵسوکەوت ناکات. سەرجەم شۆڕشەکان بەرهەمی گەلانن. جار ناجار هێزە کۆنەکان یاخود هێزە پلەدارە دەوڵەتگەراییەکان بەشداری چالاکییەکانی گەلان دەکەن. بەتایبەتیش لەڕۆژانی سەرکەوتنی شۆڕش زۆر زیر و ئاکتیفن. لەبەکارهێنانی داواکاریەکانی چەوساوەکان شارەزان. لەتەواوی شۆڕشەکاندا ئیتر سەرکەوتوو بێت یاخود نا، هیچ کاتێك هەوڵی بەمشێوەیە کۆتایی پێنایەت، بۆنموونە کاتێك حەزرەتی عیسا بیری لەچالاکی خۆی دەکردەوە، بیری لەوە نەکردبۆوە کەئیمپراتۆریەتی بێزەنتی ئاوا بکرێت، تەنانەت لە ناوەڕۆکدا دژی باوەڕی ئیمپراتۆریەت بوو. بەڵام ئەو بزووتنەوەیەی ڕێگای لەپێشکردەوە نەیتوانی خۆی بپارێزێ و نەبێتە ئامرازی ئەو فۆرمەی دەوڵەت، کە بووە شانۆی تەڵەکەبازترین ئیمپراتۆریەت. حەزرەتی محەمەدیش کە بە فیکرو کردار ئەرستۆقراتییەتی مەککەی بەلاوەنا، نەیتوانی خۆی ڕزگار بکات و نەبێتە ئامرازی " ئەمەوییەکان " لە قڕکردنی ئەهلی بەیت و ئاواکردنی ئیمپراتۆریەتی خۆیان. هیچ کەسێك بانگەشەی ئەوە ناکات کەحەزرەتی محەمەد نەخشەی ئاواکردنی ئیمپراتۆریەتێکی دەرەبەگایەتی دانابوو. دەتوانرێ هەزاران نموونەی هاوشێوە بهێنرێتەوە، لەوانەیە بگوترێ " لەدۆخێکی وەهادا هیچ شۆڕشێك نییە کە گەلان تێیدا سەرکەوتوو بووبن ". لەکاتێکدا ئاماژە بەوە دەکەین کە لەبەشەکانی داهاتوودا بەشێوەیەکی بەرفراوان ئەم بابەتە تاوتوێ دەکەین، ئەوە ڕووندەکەینەوە کە پێویستە ئەم دیاردەیە بەشێوەیەکی جیاواز شیکار بکرێت. لێرە تەنیا دەڵێین نە هەوڵ و کۆششی گەلان بەفیڕۆ چووە، نەکێشەی دەسەڵاتیش چارەسەرکراوە، ئامانجی سەرەکی ئەم بەرگرینامەیە کردنەوەو پچڕانی ئەم گرێکوێرەیەیە. گرنگترین وانە کەپێویستە وەربگیرێت، تێگەیشتن و زانینی ئەوەیە کە کونکردنی ئایدیۆلۆژیای زۆرداری توندو ڕەقترین قەڵغانی کۆمەڵگایە.

داواکاریەکانی وەکو " ئازادی، برایەتی، یەکسانی " کە تایبەتمەندێتی گشتی شۆڕشەکانی ئەوروپایە، هەمان ناوەڕۆکی هەیە لەگەڵ ئەو داواکاریانەی کە لەسەردەمی ئاواکردنی پلەداریەوە لەبەرامبەر هێزە زۆردارو چەوسێنەرەکان بەرز دەکرایەوە، هەروەکو چۆن دەسەڵاتی دەوڵەت وەکو ئەڵقەکانی زنجیرە پێشکەوتنی بەخۆیەوە دیوە، بزووتنەوەکانی گەلانیش بەرامبەر بەمە خاوەنی مێژووی پەرەسەندنی تایبەت بەخۆیانن. لەمیانەی دوو دیاردەی دیالەکتیکی پەیوەندی و ناکۆکی بەردەوام

لەنێو کارتێکردن لە سەریەکتریدان. تاوەکو ئەم دوالیزمەی دیالەکتیکی کۆمەڵگا لە قۆناخی پێشکەوتنی مێژوویبدا لەنێو تایبەتبوون و گشتگیری خۆیدا نەبینرێن، ئەوا زۆر زەحمەتە لەمیانەی گشتگیرییە داتاشراوەکاندا سەرەتا دەرك بەقۆناخەکانی شۆڕش بکرێ،لەسەرووی هەمووشیانەوە ئاستەمە دەرك بەوەرچەرخانە سەرەکییەکانی کۆمەڵگاش بکرێت.

نەتەوەو کۆمەڵگای سەرمایەداری کەفۆرمی سەرەکی تایبەت بەشارستانییەتی ئەوروپان شانبەشانی ئەوەی لەگەڵ یەکتر لەنێو پەیوەندیدان، یەکتری ناکەن بەپێویستی ناچاری و پێکهاتەی نەتەوە و شێوەگرتنی کۆمەڵگای سەرمایەداری خاوەن لۆژیك (مەنتیق)ی جیاوازن. شێوەگرتنیان لەهەمان قۆناخدا بەو واتایە نایێت کەخاوەنی هەمان لۆژیکن، کاتێ بۆرژوا خۆی وەك هێزی پێشەنگی نەتەوە نیشاندەدات, ئەوا لەنزیکەوە پەیوەندی بەئامانجە ئایدیۆلۆژی و سیاسی و ئابووریەکانەوە هەیە. ئەم پەیوەندییانە لەبواری ئایدیۆلۆژی " میللیگەرایی " ە, لەبواری سیاسی و ئابووریش " لیبرالیزم " ە. چەکی نموونەیین بۆ کارتێکردنە سەر دەوڵەت و گەل. وێناکراوو، ئامرازی رەکلام و پڕوپاگەندەن. زۆرباش دەزانین کە هەرە زێدە بۆرژوازی لەمیانەی ئەم ئامرازانەوە خۆی گەیاندە دەسەڵات و بەردەوامی پێدا. لە بزووتنەوەکانی ڕێنیسانس, ریفۆرم و ڕۆشنگەری کە ئەوروپایان کرد بەئەوروپا جێگای ئەم ئامرازە ـ دروشمانە زۆر سنوردارە. هەرچی کاتێ بەرەو سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم دێین دەبینین ئەمانە وەکو گەردەلوول دەوروبەر ڕادەپێچن بیرۆکەو چەمکی " پرۆلیتاریا " و " کۆمۆنیزمی " توێژە چەوساوەو ستەملێکراوەکانیش بەهەمان شێوە بەکار دەهێنرێت. وەك پێویستییەکی ناوەڕۆکەکەی لەهونەری سیاسەتدا هەمان سەرکەوتن نیشان نادەن.

بەگرنگی پێدانەوە دەخوازم ئەوە بڵێم: شۆڕشەکان کە لەوەرچەرخانی کۆمەڵگادا ساتەکانی شکاندنەوەی گرنگ و سەرلەنوێ ئاواکردنن، لەمیانەی لۆژیکی پێکهاتە ڕاسترەو و چەپڕەوەکانی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم دەرکیان پێناکرێت. بەشێوەیەکی ڕاست بەناوی مرۆڤایەتی پێناسەکردنی ئەم بزووتنەوە گەورانەی فیداکاری هێشتا بایەخی خۆی پاراستووە. لەمیانەی تەماشاکردنی فیداکاریتی ملیۆنەها کەس لەپێناو شۆڕشی ڕوسیا و شێوازی هەڵوەشانەوە و ئاکامەکانی, دەرك بەوە دەکرێت کە تاچ ڕادەیەك پێویستی بەسەرلەنوێ پێناسەکردنەوە هەیە. دوای ئەوەی لەم دووسەد ساڵەی دوایی بەناوی هاوچەرخبوون ـــ مۆدێرنتی ئێش و خوێن و توندوتیژییەکی بێسنووری دەریائاسا هاتەئاراوە, بەتایبەتیش لەمیانەی سەرسامییەکانی دووەمین جەنگی جیهانی ئامرازەکانی بەتوندوتیژی و ئایدیۆلۆژی دەمامکدراون بەشێوەیەکی سنووردار بۆ ڕۆژەڤی گفتوگۆ کرانەوە.

پێویستە لەم چوارچێوەیەدا دەرك بەڕاستینەی بۆرژوا بکەین کەفۆرمی سەرەکی سەرمایەدارییە. بەگووتەی چینێکی نوێی زۆرداری و چەوسانەوە باس لەشتێکی تایبەت ناکرێت، تایبەتمەندێتییەکی تەواوی چینەکانی دەسەڵات ئاماژەیان پێدەکرێت تایبەتبوونی چینی بۆرژوا لەوەدایە, بەرامبەر بەکۆمەڵگابوون تاکرەوێتی پێشخست, لەبەرزترین ئاستدا ژیری ئەنالیتیکی بەکارهێنا و لەهەڵوەشانەوەی ئەو تۆڕە ئەخلاقییەدا سەرکەوت کەهیچ هێزێکی دیکەی دەسەڵات نەیتوانیبوو ئەنجامی بدات. کۆمەڵگای سروشتیش دوای هەڵوەشانەوەی لەسەرەتادا بەتوندی دژی کۆکردنەوەی بەهابوو بەلایەنی کۆمەڵگادا. ئەوەی هەرە زێدە بەها کەڵەکەبووەکانی پەرتەوازە کردبووایە بەبەهادارترین تاك لەقەڵەمدەدرا. ئاگاداری مەترسییەکانی ئەم کەڵەکەبوونانە بوو. دوای تێپەڕبوون بۆ کۆمەڵگای پلەداری و دەوڵەتبوون توانرا بەهاکان کەڵەکە بکرێت. ئەم کەڵەکەبوونە هەم ئەو قۆناخەی دەستپێکرد کەڕێگای لەپێش ئاواکردنی ئەم هێزە کردەوە, لەهەمانکاتدا ئەم هێزە قۆناخی ئاماژەپێکراوی خولقاند، لۆژیکی پەرچەکرداری یەك لەدوای یەك بەمشێوەیە هاتەئاراوە. ئەوەی زۆرترین بەهای کۆکردۆتەوە, هێزی دەسەڵاتبوو. کاتێك لەنزیکترەوە تەماشا بکرێت دەبینرێ کە کەڵەکەکردن جۆرێکی دزیکردنە لەکۆمەڵگا. لەبەرئەوەی ناتوانرێ بەبێ کۆمەڵگا بیر لەبەها بکرێتەوە, بەمشێوەیە بوو. لەگەڵ تێگەیشتنێکی ڕاست سەبارەت بەکۆمەڵگای سروشتی سەرەکیترین

پرەنسیپی ئاکاریشی دیاری دەکرد، مادام دەستنیشانکەری سەرجەم بەهاکان کۆمەڵگایە لەدۆخێکی وەهادا بەبێ ڕەزامەندی ئەو ـ جگە لەبەرژەوەندی خۆی ئەوا کۆکردنەوەی تاك و گروپ ـ بۆ بەهاکان ـ نابێت.

لەبنەڕەتدا ئەوەی لەتەواوی شەڕەکاندا دەبینرێ, تاڵان و دەسکەوت بێ ڕەچەڵەککردنی ئەم چەمکەیە لەکۆمەڵگای چینایەتی. دەسەڵاتداران (خاوەنەکانی دەسەڵات) بۆ ئەوەی یەکتری لاواز بکەن بێبەشکردنی یەکتری لەبەهاکان وەك پرەنسیپێکی سەرەکی پەیرەو دەکەن. سەبارەت بەسەرچاوەی سەرەکی هێز بەهەڵەدا ناچن. سەرباری ئەوەی نموونە سەرەتاییەکانی بۆرژوا, توێژە پیشەکار و بازرگانەکان لەسەرەتای هەر شارستانییەتێکدا بوونیان هەیە، بەردەوام بەمەترسی دەبینرێن و کۆنترۆڵ دەکرێن. کۆنترۆڵکردنیان بەردەوام بوو, زووبەزوو لەڕووبەڕووبونەوەی تاڵان ڕزگاریان نەدەبوو. هێزی دەوڵەتی دەرەبەگایەتی و کۆیلەداری,جگە لەکۆیلە و ڕەنجبەرەکان بەردەوام بەگومان تەماشای پێکهاتنی توێژی سێیەمیان دەکرد و کۆنترۆڵی خۆیان کەم نەدەکردەوە، مێژووی شارستانییەت جگە لەچینی بەندە پێکهاتەیەکی دیکەی ناکۆك بەسروشت دەبینی. دیدگایەکی جیهانبینی و ئەخلاقێکی جێگیری ئەم سیستەمە هەیە پشت ئەستوور بەڕاستینەی چینی بۆرژوا تا شارستانییەت بەردەوامە، شەڕ و دەسەڵات ڕێسای بنەڕەتی تایبەتی خۆی هەیە. ئەو هاوسەنگییەی لەناوەخۆیدا ئاواکراوە ناوەڕۆکێکی وەهای هەیە هەزاران ساڵ دەتوانێ بەردەوام ببێ. سەرباری ئەوەی توندوتیژی و مافیەروەری لەبەڕێوەبردنی کۆمەڵگادا بوونیان هەیە، بەڵام خاوەن توانستێکی سنورداری پراکتیزەکردنن، لەبنەڕەتدا تۆڕی (بونیادی) ئەخلاق کۆمەڵگای لەسەرپێیان ڕادەگرت. سەرباری ئەوەی هێزەکانی دەسەڵات بەردەوام ئەخلاقیان موتوربە (تەقلیم) دەکرد، بەڵام توانی ئەم تایبەتمەندێتییەی خۆی بپارێزێ. بەرامبەر قەبارەی کۆمەڵگا پێگەی کەمایەتییەکانیش زەمینەیەکی گونجاوی بۆ ئەمە دەرەخساند.

لەگەڵ لەدایکبوونی چینی بۆرژوا ئەم هاوسەنگییە گەورەیەی ڕووخاند. ئەمە هەم وەك هێزی دەسەڵات هەم هێزی چەوسانەوە چینێکە لەدۆخێکی وەهادایە کۆمەڵگا بارەکەی پێ هەڵناگیرێت و بەرگەی ناگرێت. لەپێناو بەدیهێنانی دەسەڵات و چەوسانەوەی خۆی ناچار بوو تەواوی کۆمەڵگا لەخزمەتی خۆیدا بەکاربێنێ، لەبەر ئەم هۆیە مارکسیزم مافداربوو کە وەك دوا چینی دەسەڵات و چەوسانەوەی ڕاگەیاند. وەك چینێك پێشکەوتنی بەردەوام گرێدراوی پەرتەوازە بوونی کۆمەڵگایە، هەربۆیە سەرەتا پێویستی بەدڕاندنی تۆڕی ئەخلاق هەیە کە پارێزەرێکی سەرەکییە. تاوەکو ئەو تۆڕەی ئەخلاق نەپچڕێنرێ و فڕێنەدرێ کە هەستی ئازادی و یەکسانی کۆمەڵگای سروشتی هەیە کۆمەڵگای سەرمایەداری پێکنایەت. ئەوەی مارکس لە مانیفیستۆی کۆمۆنیزم وەکو " بۆرژوازی هەرچ پاشماوەیەکی کۆن هەبوو هەمووی گەسکداو سڕیەوە " ئاماژەی پێکردبوو لەگەڵ ئەوەی ڕاستبوو ئەمە چالاکییەکی شۆڕشگێڕانە نەبوو, چالاکییەکی ڕووخێنەر و دژی کۆمەڵگایە. کۆمەڵگا خستنە ناو ڕەوشێکی بێ پاراستن جموجوڵێکی شۆڕشگێڕانە نییە، هەرچی بێت بزووتنەوەیەکی دژی مرۆڤایەتییە, هێزی دەسەڵات و چەوسانەوەی دەستی بۆرژوازی نەخۆشی شێرپەنجەیە کە دزەی کردۆتە ناواخنی کۆمەڵگا. بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوان شێرپەنجەی تاك و ئایدز و نەخۆشییە هاوشێوەکانی لەگەڵ شێرپەنجەی کۆمەڵگا دەستنیشان بکەین پێویست ناکات زانابین. کاتێك لەهەلو مەرجەکانی لەدایکبوونی کۆمەڵگای سەرمایەداری هۆبزپێویستی دەسەڵات (دەوڵەت) وەك " ڕێگرتن لەوەی مرۆڤ ببێتە گورگی یەکدی " هەڵدەسەنگێنێ. ئەمە دەستنیشان کردنێکە پێچەوانەکەی ڕاستە. سەرمایەداری بۆ ئەوە دەسەڵاتی خۆی دەپارێزێ تاوەکو مرۆڤ بکاتە گورگی مرۆڤ. لەڕاستینەی هاوچەرخدا نەك تەنیا مرۆڤ بەرامبەر یەکدی تەنانەت بەرامبەر تەواوی سروشت بووە بەگورگ، دوای ئەوەی دەستی بەسەر ئەو دەسەڵاتەدا گرت کەهێزێکە بەدوای زێدەترین قازانج و کەڵەکەکردندا دەگەڕێ و ئاکامەکەی هاربوون لەگەڵ خۆی دێنێ, لەناو سروشت و کۆمەڵگای ئەم چینە چ شتێکی دیکە دەهێڵێ کە بەکاربهێنرێ؟.

بابەتەكانی وەكو بەها, قازانج, رەنج هاوبەشێتی ئیمپریالیزم و شەڕ كەچەندەی بلێی ماركسیزم شییكردوونەتەوە. ئەوا لەم چوارچێوەیەدا تێگەیشتنی ڕۆڵەكەی لە سەرمایەداریدا ئەزموونبەخشە، بیرۆكەی " دەجال دێت " كە نزیكی سەردەمی مەحشەرەو لەپەرتووكە پیرۆزەكاندا ئاماژەی پێدەكرێت تابلێی لەگەڵ ڕاستینەی ئەم چینە گونجاو دەبینرێ.

هیچ سیستەمێكی كۆمەڵگا بەو ئەندازەیە بەرامبەر ڕیشەكانی كۆمەڵگاو ژینگە سروشتییەكەی نەبۆتە هێزی هێرشبەری وتێكدان. ڕاستینەی چینی بۆرژوا كە فاشیزم و میللیگەراییەكی نەژادپەرستی لە دیاردەی نەتەوە خولقاند, لەدیاردەی زاڵبوون بەسەر سروشت كارەساتی هێناكاراوەو لەئەنجامی دیاردەی قازانج بێكارییەكی بێ سنووری ئافراند, ئیتر لەقۆناخی خۆخواردندایە.

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ناوەڕۆكی خۆی لەدەستدەدات و لەنێو دەچێت. شۆڕشی دژ بەخۆی نەك پرۆلیتاریا بەڵكو خۆی ئەنجامیدەدات، زەمەنی نوێی كۆمەڵگا ـ كۆمەڵایەتی ئەم ڕاستینە چینایەتییە ناتوانێ بەردەوام بێ، هەربۆیە لەسەر بنەمای هەڵوەشانەوەی دەتوانێ خۆی بپارێزێ.

لەبەرئەوەی بەرگرینامەكەمان ناوەڕۆكی تێز لەخۆوە دەگرێ، سەرمایەداری لەنێو دۆخ و پێگەیەكی وەهادا نییە سیستەمەكانی پێشووتر لەخۆوە بگرێت, بەدەوڵەتبوونی, گرێدانی زانست و هونەر بەدەسەڵات, بوونی بەئیمپریالیست، پێشكەوتنە لاسەنگەكەی و لەسەرووی هەمووشیانەوە شەڕەكەی, قۆناخە سەرەكییەكانی بخاتەگەڕ و هەڵسوڕێنێ. گرنگ ئەوەیە لۆژیكی بنەڕەتی ئەم قۆناخانە بخرێتەكار كەهەریەكەیان دەبێتە بابەتی پەرتووكێك.

لەبواری جیاوازتریشدا دەتوانرێ پێناسەكانمان سەبارەت بەچینایەتی پێشبخرێت. ڕووخاندنی سۆسیالیزمی بونیادنراو, بزووتنەوەكانی ڕزگاری نیشتمانی و دەوڵەتەكانیان خستنەڕەوشی هێزی یەدەگ بۆ خۆی و نیشاندانی توانای بەكارهێنانی سۆسیال دیموكراتەكان ئەركداری و چالاكبوونێكی گرنگە. لەڕێگای زانست و تەكنۆلۆژیا و بەكارهێنانی كۆمەڵگای مرۆڤ لەبێواتاترین بابەتەكانی ڕەكلامكردن توانیوێتی قازانج بەدەستبێنێ, نیشاندانی توانای بەكارهێنانی چالاكییە هونەری و وەرزشییەكان وەكو ماددەی بێهۆشكەر, دەرخستنی پرۆلیتاریا و ڕۆشنبیران لەڕەوشی یاخیبوون و خستنە ڕەوشێك لەپێناو كار لێی بپارێتەوە، پووچەڵكردنی ناوەڕۆكی هەرشتێكی ناوی پیرۆزی لەسەرە لەجیاتی جیهانی زیندووی ڕێنێسانس بەجێگیركردنی دیدگای ڕۆبۆتیانە, ئەمانە هەمووی تواناكانی ڕاستینەی چینی نوێی باڵا دەستە.

قووڵایی ناوەڕۆكی دەزگایی لەسەرووی ئەم نوێكاریانەوە دێت كەسەرمایەداری بۆ پێكهاتەی دەسەڵاتی گواستەوە. لەسیستەمی دەسەڵاتی وابەستە بەكەس پەڕینەوە بۆ سیستەمی كەس، پارتی، تەنانەت كۆمەڵگاكان ئەنجامدراوە. ناوەڕۆكی نادیاری و داتاشراوی دەسەڵات پێشخراوە. ئایدیۆلۆژیا, سیاسەت و ئابووری لەمەدا خاوەن ئەركێكی چەند جار زیاترە. لەمیانەی ئەو میللیگەراییەی بیرۆكەی نەتەوە بەرهەمهێنراوە، سەرجەمی نەتەوە لەو بڕوایە دایە كەدەسەڵات سەربەخۆیەتی, بەم شێوەیە باوەڕی پێهێنراوە. لەناوەڕۆكدا هیچ كاتێك دەسەڵات نابێتە هی نەتەوەیەك, لەهەموو شوێن و كاتێكدا توێژێكی كەمینەی گروپە ئەتنیی و خانەدان و نەتەوەكان خاوەنی ڕاستەقینەی دەسەڵاتن. بەڵام سیستەمێكی وەها ئاوا دەكرێت تادەگاتە نزمترین ئاستی چەوسێنراوەكان. لەواتایەكدا هەر تاكێك خۆی بەخاوەنی دەسەڵات دەزانێ. لەخێزانێكی هەرە ژێردا مێردێكی هەرەندار زۆر بەسانایی دەتوانێ بەرامبەر ژنەكەی, خۆی وەكو " ئیمپراتۆرێكی بچووك ببینێ ". بەشێوازی ئەڵقەكانی زنجیرە ژنیش بەرامبەر بەمنداڵەكانی هەمان ڕۆڵ دەبینێ، ئەی منداڵان؟ ئەوانیش كەگەورەبوون لەئەرێكردنی هەمان سیستەم زیاتر دەتوانن شتێك بكەن؟ بەم شێوەیە ئاواكردنی زنجیرەی دەسەڵاتدارێتی تایبەتمەندێتییەكی سیستەمە.

پارتەكانیش وەكو تاك بەگوێرەی دەسەڵات ئاواكراون. ئەركی سەرەكییان گواستنەوەی دەوڵەتە بۆ كۆمەڵگا، كۆمەڵگایە بۆ دەوڵەت. خودی كۆمەڵگاش كراوە بەموڵكی دەوڵەت. وەك ئەو خوداوەندەی هیچ نابینرێت سواری سەری كۆمەڵگا و هەر

شوێنێکی بووه. زهنییەتی دەسەڵات کە ئایدیۆلۆژیا خوڵقاندوویەتی لەوانەیە گەورەترین درۆزن و تەڵەکەباز بێ، ئەرکی هونەری سیاسەت ئەو خۆ بەخاوەن بینینەی دەوڵەتە کەسەبارەت بە کۆمەڵگا باسمانکرد و باوەڕهێنان بەپێویستی خزمەتکردن و لەناوەڕۆکدا پێشکەشکردنی لێهاتووترین دیماگۆژیەتی سیاسییە. هەروەکو مەزەندە دەکرێت سیاسەت ئامرازی گەیشتنە دەسەڵات نییە. ئامرازی پاراستن و بڵاوکردنەوەو هەمیشەییکردنی دەسەڵاتە, بەتایبەتی ڕۆڵی سیاسەت بەرامبەر بەدیموکراسی بەمجۆرەیە. زەحمەتە بتوانین باس لە دیاردەیەك بکەین کەهێندەی هونەری سیاسەت نکوڵی لەدیموکراسی بکات، هەروەکو دەزانرێ لەسەردەمی ئەسیناوە سیاسەت واتای نکۆڵیکردنی دیموکراسی بووە، لەهەموو کاتێك زیاتر ئابووری لەگەڵ دەسەڵات ئاوێتەبووە. بەڕێوەبەرایەتی ئابووری ئابوریی‌ەکی سیاسییە. لەسەردەمێکدا دەژین کەهیچ تاك و گروپێك نییە لەڕێگای چەکی ئابووریەوە نەهێنرێتە سەر ڕێگا. هیچ بەهایەك نییە دراو (پارە) لێی نەکاتەوە. هیچ هێزێك نییە دەستەمۆی نەکات و نەیخاتە ژێرڕکێفی خۆی، بەرچاوترین دروشمی ئەم قۆناخەن.

ئەو پێناسەیەی سەبارەت بەگەوهەری دەسەڵاتداریّتی پێشبخرێت دەتوانرێ زیاتر سەبارەت بەدەوڵەتی نەتەوەیی پێشبخرێت، دەوڵەتی نەتەوەیی شێوەی هاوچەرخی بیرۆکەکانی راهیب, خانەدان, دەوڵەتی ئایینییە کە لەچاخی دێرین ماونەتەوە. ئەو مۆرانەن کە لە ناوەڕۆکی دەسەڵاتدراون. لەقۆناخی گەشەکردنی سەرمایەداری سنوورێك بەنەریت و زمانی هاوبەش دەورە درابێت، ئەو سیحرە جوگرافیانەن کە بۆ کەڵەکەکردنێکی نموونەیی هەڵدەبژێردرێت، نەك چەمکی نیشتمانی پیرۆز، بەڵکو گۆڕەپانی گونجاو بۆ قازانج و کەڵەکەبوون بەبنەما دادەنرێت. ئەم گۆڕەپانەی لەبەرامبەر ڕکابەرەکانی دەرەوەی داخراوە بۆ گەرەنتیکردنی کەڵەکەکردنی سەرمایەو بەهێزکردنی دەسەڵات نموونەییە. لەدایکبوونی میللیگەرایی ئاکامێکی ئەم پێشکەوتنە بابەتییە (مادییە) بوو.

دواکەوتنی زهنییەتی ئایینی لەمیانەی عەلمانییەت (دونیاییبوون) پێویستیی پەردەیەکی ئایدیۆلۆژی نوێ نیشاندەدات. بەهۆی گرێدانی ئایدیۆلۆژیای میللیگەرایی بەدیاردەی نەتەوەوە خێرا پەرەدەسێنێ. میللیگەرایی کەپێویستە لەناوەڕۆکدا وەك شێوەیەکی پێشکەوتووتری سۆزی ئەتنیکی (خێڵەکی) کۆن بیری لێبکرێتەوە خزمەتی باوەڕییەك دەکات کەجێگای ئایین و سۆزی خێڵەکی گرتۆتەوە. لەناوەخۆدا جێگا بەئەتنیکی جیاواز، ئایینزاکان و فاکتەرە ئایینی و ئایدیۆلۆژییە هەمەڕەنگەکان دەدات، بەڵام هەرچی لەدەرەوەیە کاتێ بەرامبەر دیاردەو سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان فشار و چەوسانەوە دەستپێدەکات, میللیگەرایی گەیێنرایە چەمکی نەژادی باڵا. چەمکی ئایینی باڵای سەردەمێك جێگای خۆی بۆ نەتەوە ــ نەژادی باڵا بەجێهێشت. ئەو کۆمەڵگایەی زهنییەتی زانستی ڕۆشنیکردبۆوە دیسان میللیگەرایی هاوشێوەی ئایین بەرەو تاریکی دەبات. سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم کەسەدەی زهنییەتی میللیگەرایی بوون، لەمیانەی چەمکی شەڕی پیرۆزەوە ڕۆڵی ئامرازی مەشروعییەتکردن و لەباربوونی هەمووجۆرە شەڕ و توندوتیژییەکیان بینی کە کۆمەڵگایان تێوە دەگلاند. هەروەکو چۆن سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەم وەك سەردەمی لەدایکبوونی نەتەوەکان دەناسرێت, ئەوا سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم بووە قۆناخی خرۆشان و هاربوونی میللیگەرایی.

لەسەردەمی میللیگەرایی کە لەدووەمین شەڕی جیهانیدا دەسەڵاتی دەوڵەت گەیشتە لوتکە، لە ئاکامی ئەو نەهامەتییەی ڕێگای لەپێشکردەوە بوو بەدەستپێکردنی قەیرانی کۆتایی و گشتی سەرمایەداری. دەرك بەوەکرا کەمرۆڤایەتی ناتوانێ لەڕێگای میللیگەراییەوە بەیەکەوە بژی. پێشوەخت کەوتنی سیستەم بۆ ناو قۆناخی قەیران تەنیا بەواتای لەدەستدانی هێزەکەی نایەت. ڕێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە زیاتر ڕێساکان نەناسێ و بەرەو مەترسی هاربوون بچێ.

سەرهەڵدانەکانی ساڵی 1968 بەرفراوانترین ڕەخنەکردن بوو بەرامبەر بەسیستەم، ئەو سەرمایەدارییەی بەچەمکێکی دەستڕۆیی تۆتالیتاریانە گەیشتبوو. ئینجا ئەمە شێوەی فاشیزم بێت یاخود سۆسیالیزمی بونیادنراو، بەمجۆرە دەیسەلماند کە

ناتوانێ بەردەوام بێ. نەبوونی توانای بەردەوامبوون واتای قەیرانە. مرۆڤایەتی لەناو ئەمەدا ژیاوە, ئەو قۆناخەی دەتوانین ــ گێژاویشی پێبڵێین زۆر لەڕێنێسانس جیاوازترە. لەکاتێکدا ڕێنێسانس دەرکەوتن و ڕزگاربوون بوو لەکۆمەڵگای دەرەبەگایەتی، ئەو قۆناخەی سەرمایەداری لە 1970 کانەوە تێیکەوتووە ئاژاوەیە. هێزو ناوەرۆکی ئەو تێکۆشانانەی بەرپێوەدەبرێن دیاری دەکەن کە چ جۆرە نوێبوون و جیاوازییەك دێتەئاراوە. ئەوەی پێویستە سەرنجی بدرێتێ، ئەو گۆڕانکاریەیە کە ئەو قۆناخە سەبارەت بەجیهانبینی (پارادیگمای) سەرەکی دونیا لەگەڵ خۆیداهێناوە. پەرتبوون و توانەوەی سەرجەم بەها ئەخلاقییەکانی پێکهاتەی ناو کۆمەڵگا, پڕکردنی هەموو زهنییەتەکان لەلایەن میللیگەراییەوەو لەدەرەوەش ئەنجامەکانی تێکدانی سروشت و پیسکردنی ژینگە تێڕوانینێکی بێ ئامانج، بێ باوەڕ, بێ ئومێد، بێ خولیا، خۆڵەمێشی و هاوشێوەبوونێکی ڕۆبۆتیانە سەبارەت بەدونیا بلاودەکەنەوە. دڵەڕاوکێ، تووڕەیی، نەفرەت، توندوتیژی، ئارەزووپەرستی، تەنیایی تاك، بێ نرخی کۆمەڵایەتی، لۆژیکی پەیوەندی بەرژەوەندیپەرست، بێ وەفایی، بێبەریبوون لە مرۆڤدۆستی، تاکرەوێتی زێدەڕۆ، هەرچەندەی دەچێ ژیان واتای پیرۆزی خۆی لەدەستدەدات، ئەمانە هەمووی سایکۆلۆژیا و هەلومەرجی کۆمەڵایەتی گێژاو پێکدێنن. تەنیا لەزەمینە و هەلومەرجی بەمجۆرەدا لێگەڕینی ڕیشەیی نوێ سەرهەڵدەدات.

بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا سیستەمی فشاری نەتەوەیی ــ چینایەتی و ئیمپریالیزمی دەسەڵاتی سەرمایەداری بەو گەورەییە دەگات کە سەرتاپای دونیا بگرێتەوە، شوێنێك نەماوە داگیرنەکرابێت, لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا ئەم ڕاستییە ڕوودەدات. ستەمکاری لەسەر بنەمای نەتەوەیی، چینایەتی، ئەتنیکی, ئایینی و ڕەگەزی, تواندنەوە و تەنانەت جینۆساید لەمێژوودا گەیشتۆتە بەربلاوترین قۆناخی خۆی. ئەو سەردەمەیە کەهەرە زێدە مرۆڤ دەبێتە گورگی یەکتری. ئەگەر سەبارەت بەپراکتیکی ئیمپراتۆریەتیش تەماشای بکرێت، لەرێگای ئەمریکاوە گەیشتۆتە دوا قۆناخی خۆی، لەدوا قۆناخی ئیمپراتۆریەتداین. لەلایەنی تیۆریەوە ئەم بەرپۆەبەرایەتییە، دەسەڵاتی دەوڵەت سنووری شارێك, دواتر وڵاتێك, نەتەوەیەك تێپەڕ دەکات. لەتاکەکەسێکدا قاڵدەبێتەوە و بەردەوام پەلدەهاوێژێ و بلاودەبێتەوە، دوایش ڕادەوەستێ و بەرەو دواوە دەگەڕێتەوەو دەگاتە قۆناخی داڕووخان، بەم قۆناخانە تێپەڕدەبێ، جێگیربوونی لەناو سیستەمی کۆمەڵگادا کاریگەریەکی زنجیرە ئاسا دەخولقێنێ. هەر دەسەڵاتێکی نوێ ناچار دەکرێت لەسەر شوێنپێی ئەوانەی پێشتر ببێت بەئیمپراتۆریەت. ئەم بەردەوامییە مێژووییەی لەسالانی 2350 ـ ی پێش زایین ـ لەمێژووی نوسراودا باسدەکرێت ــ لەلای سۆمەریەکان بنەماڵەو بنەچەی ئەکەدییەکان دەستیپێکرد, لەرۆژگاری ئەمرۆشماندا بنەماڵەی " بۆش " ی دەوڵەتی ئەمریکا بەردەوام دەکات، لایەنی سەیری مەسەلەکە لەو گۆڕەپانەی (ناوچەیەی)یەکەمین ئیمپراتۆیەتی تێدا لەدایکبوو دوا ئیمپراتۆریەتیش لەنێو پێکداداندایە، کەواتە لێرەدا بیر لەوپەندە بکەینەوە کە دەڵێ " گیا لەسەر بنجی خۆی شیندەبێتەوە ".

لەڕاستینەی ئیمپراتۆریەتدا چەمکی سەربەخۆیی تەواوی دەوڵەت،نەتەوە و کۆمەڵگا جێگای نابێتەوە. ڕاستتر ئەوەیە، سەربەخۆیی تەواو ئایدیالیزە دەکرێت، بەڵام زۆر بەدەگمەن خاوەن تایبەتمەندێتی پراکتیزەکردنە. واقیعی زاڵ وابەستەبوونێکە لەچوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی بالا دەست، دەشێ ئاستەکان جیاواز بن، بەڵام شێوەی زاڵی ڕاستینەکە ناگۆڕێ. ئەو ئیمپراتۆریەتەی نزیکەی 4350 ساڵە لەسەر پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان بەکاریگەرە چەندین گروپی دەسەڵاتداری ورد و درشت لەنزیکترین هاوپەیمانەوە تادەگاتە بێنرخترین دەوڵەتی دەستکەلا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بێت یان ناڕاستەخۆ لەمیانەی هەژموونگەرایی دەوڵەت و لەچوارچێوەی ئەو سنوورەی لەئارادایە لەنێو ڕەوشی وابەستەییدان. لەسەردەمی دەوڵەتی نەتەوەیی کەبانگەشەی سەربەخۆیی دەکات، ئەم ڕاستینەیە لەجێگای خۆیدایەو سەربەخۆبوونێکی تەواو لەهێزی هەژموونگەرا، گەمەو بانگەشەی سیاسی میللیگەراییە بۆ کاریگەری خستنە سەر کۆمەڵگا. کەدەگوترێ هەژموونگەرا واتە خاوەنداریێتی بەهێزترین زهنییەت، دەسەلات، هێزی سەربازی و پێکهاتەی سیاسی و ئابووری، واتە خاوەنداریێتی زانست و

تەکنۆلۆژیا. لەبەرئەوەی قەوارەی ئەمریکی لەگەڵ ئەم پێناسەیە کۆکە، یەکەمین هێزی هەژموونگەرایی ئەمڕۆمانە. بەڵام تەواوی قەیرانەکانی سیستەم، شێوەی بەڕێوەبردن و دەرئەنجامەکانی لەسەرووی ئەم لایانەوە دێن کەکێشەو گرفتن.

هەرە زێدە شیکردنەوەی تایبەتمەندێتییەکانی سیستەمی کۆمەڵگا لەژندا بەهای ئەزموونبەخشی بەرزە. بابەتێك کەپێویستە لەسەرەتاوە ئاماژەی پێبکرێت ئەوەیە بەشێوەیەکی سەربەخۆ لێکۆڵینەوەی هەر دیاردەیەکی کۆمەڵگا لەژێر جیاکارییە سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، کولتووری و... هتد مەترسی جددی لەخۆوە دەگرێت. ئەو کۆمەڵگایانەی لەدۆخێکی یەکپارچەیی مێژووییدا بەردەوام لەنێو پێکهاتەبووندا دەژین تەواوی سەرخان وژێرخانیان وەکو پارچەکانی کاتژمێرێك بە یەکپارچەیی کاردەکەن. نەخۆشی دابەشکردن بۆ پارچەی ورد، سەرچاوەی خۆی لەتایبەتمەندێتی لەدەستدانی یەکپارچەیی دیاردەکانی زانستگەرایی ڕۆژئاوا وەردەگرێت. لەبواری زانستیش کاتێ ئەم هەڵوێستە بەکاردەهێنرێت کەسەبارەت بەتێگەیشتنی ڕاستی زەحمەتی دەردەخات، ئەوا پشتگوێ نەخستنی یەکپارچەیی زۆر بایەخدارە. پێویستە ژن وەکو پووختەیەکی سەرجەم سیستەمەکان ببینرێ و بەم شێوەیەش شیتەڵبکرێت.

هەروەکو چۆن سەرمایەداری لوتکە و بەردەوامی تەواوی کۆمەڵگا ئیستسمارکارەکانە، ژنیش لەلوتکەدا لەناو کاریگەرێتی کۆیلایەتی تەواوی ئەم سیستەمانە دەژی. تاوەکو لەو ژنە تێنەگەین کە لەژێر فشاری چەوسانەوەو ستەمکاری کۆنترین و قاڵبۆوەترین کۆمەڵگای دەوڵەتگەرایی و پلەداری شێوەی گرتووە، ناتوانین بەشێوەیەکی ڕاست کۆمەڵگا پێناسە بکەین. ڕێگای تێگەیشتنێکی ڕاست سەبارەت بەکۆیلایەتی ئەتنیك، نەتەوەو چین بەپێناسەکردنی ژن تێپەڕ دەبێت، دوای ئەوەی دەرك بەوەکرا کە بەری ڕۆژ بەبێژنگ ناگیرێ ئەوا کۆمەڵناسی سەبارەت بە ژن هەوڵی پێشخستنی هەندێ لێکۆڵینەوەیدا کەئەویش تایبەتە بەدواچارەکی سەدەی بیستەم. بزووتنەوەی فێمێنیستی و ژینگەپارێزی وایانکردووە مێژوو و کارەکتەری ڕەگەزی تێکدانە مەترسیدارەکانی شەڕو دەسەڵاتەکان فیکری لێبکرێتەوەو تاوتوێ بکرێت. تەنانەت ئەم بابەتەش کارەکتەری ڕەگەزی ئەو زانستانە دیاردەکات کەدەبوایە هەرە زێدە بابەتی بن، لەسەرووشیانەوە کۆمەڵناسی. زانست ڕەگەزگەراییە.

شرۆڤەکردنی ئەرێییانەی ژن بۆ بەشەکەی دواتر بەجێدێڵم. با تەماشا بکەین سەرمایەداری چی بۆ کۆیلایەتی باوو نەریتی هێناوە. پێویستە باش ئەمە دەستنیشان بکەین کە بەدیهێنانی ئازادی لەگەڵ ناوەڕۆکی سەرمایەداری ناکۆك و پێچەوانەیە. ئەو بانگەشەیەی دەڵێ لەبەرئەوەی سەرمایەداری نەریتی باوو خەرەکی دڕاندووە، ئەو زنجیرەیەی دەوروبەری ژنیش پچڕاوە، شێواندنێکە و لایەنی فریودانی لەپێشە. پەیوەندی هێزە زۆردارەکان لەگەڵ ئازادی لەچوارچێوەی ئەوەدایە کە " چۆن بەپێڕەوی وردو قەباتر درێژە بەستەمەکەم بدەم"، ئەو ژنەی چەندین داستانی ئەشقی لەبارەوە نووسراوە لەگەڵ ئەو ژنەی دووچاری قەباو قێزەوەنترین کۆیلایەتی هاتووە هەمان شتن. ژن لەنموونەی ئەو کەنارییەیە کەخراوەتە قەفەسەوە ــ موڵکی ژێر دەسەڵاتی پیاو ــ. لەوانەیە خۆشەویست بێ، بەڵام دیلە، هەروەکو چۆن کاتێك چۆلەکە سەربەست دەکرێت بەبێ ئاوڕدانەوە بۆ دواوە دەفڕێ و دەڕوات، ئەگەر ژنیش تۆزێك هۆشیار بکرێتەوەو بزانێ شوێنێکی ئازاد هەیە پەنای بۆ ببات، هیچ ماڵ، کۆشك، دەوڵەمەندێتی، هێزو کەسایەتییەکی مرۆڤ نامێنێ لێی ڕانەکات. ئەو وزە و زەمینەیەی بەجێهێشتنی هەمووانی هەیە، هیچ بوونەوەرێك بەئەندازەی ژن مەحکومی دیلێتی نەکراوە. جێگیرنەبوونی سەرجەم شیکارە کۆمەڵایەتییەکان، نەتوانینی بەڕێوەبردنی نەخشە و بەرنامەکان تەنانەت دەرکەوتنی گۆڕانکارییەکانی بەدەر لەمرۆڤایەتی، پەیوەندی خۆی بەئاستی کۆیلایەتی ژنەوە هەیە، هەربۆیە تاوەکو چارەسەری کێشەی ژن نەکرێت و، یەکسانی و ئازادی بەدی نەیەت، ئەوا چارەسەرییەکی تۆکمەی هیچ دیاردەیەکی کۆمەڵگا و یەکسانی ـ ئازادی فەراهەم نابێت.

دوای ئەو زیادکردنانەی سەرمایەداری خستییە سەر سیستەم، بینینی ڕووخساری ژن لەئاستی بەکاڵاکردن زیاتر لەڕاستیمان نزیك دەکاتەوە. زۆر چاك دەزانین لەسەردەمی کۆیلەداری کۆن هەرە زێدە ژن لەبازاڕەکاندا دەکڕا و دەفرۆشرا. لەکۆیلایەتی

دەرەبەگایەتیشدا ئەم ڕەوشە بەشێوەی کەنیزەکی (جاریە) بەبەرفراوانی درێژەی پێدرا. لێرەدا ئەوەی وەك یەکپارچە فرۆشراوە ژنە. نەخت شێوەیەکی بەرژەوەندیپەرستی سیاسییە کە لەناو خێزاندا ڕەنگ دەداتەوە. هەرچی لەسەردەمی سەرمایەدارییە وەك قەساب لاشە بۆ چەندین پارچە لێك جیا دەکرێتەوە، هەربەشێکیش نرخی تایبەتی خۆی هەیە. لەقژیەوە تا پاژنەی پێی، لە سنگیەوە تا ڕانەکانی، لەورگی تا دەگاتە ئۆرگانی زایەندی، لەباوەشیەوە تا ئەژنۆکانی، لە پشتییەوە تا پووزی، لەچاوەکانی تا لێوەکانی، لەگۆناکانی تا ملی، پارچە پارچە دەکرێ و هیچ شوێنێك نامێنێ نرخی بۆ دانەنێن. بەداخەوە هەر تەنیا ئەم پرسیارە ماوە بە ئەقڵیاندا بێت ئایا ڕۆحی هەیە یان نا؟ ئەگەر هەبێت نرخەکەی چەندە؟. لەبواری مێشکیشدا بە " کەم ئەقڵە ئەزەلیەکە " دەبینرێ. کاڵای ئارەزووبەخشی سۆزانیخانە تایبەت و گشتییەکانە. ئامێری منداڵ دروستکردنە. لەدایکبوونی منداڵ, کەزەحمەتترین ئەرکە, بەڕەنج لەقەڵەم نادرێت.لەتەواوی دەزگا ئابووری, کۆمەڵایەتی، سیاسی و سەربازییە گرنگەکان جێگاگرتنیان سەمبولییە. کەرەستەی ژیانیی و دەستلێبەرنەدراوی ڕەکلامەکانە. ڕەگەزەکەی تاکە هەبوونێکە کەهەرە زێدە دەکرێتە کاڵا و لەبازاڕەکاندا نمایش وپێشکەش دەکرێت، هەرە زێدە دەکرێتە بابەتی جنێودان, لێدان و کوتان. هەرە زێدە دەکرێتە ئامرازی درۆی ئەشق، پێشوازی لەهەموو شتێکی خۆی دەکات. ئەو ناسنامەیە بۆ ئەوەی قسە بکات, زمان و وشە و سیستەمێکی تایبەتی دەنگ شێوەی پێدەدرێت. ئەو مرۆڤەیە کە بەمرۆییبیانە هاوڕێیەتی لەگەڵدا ناکرێت. ئەو مرۆڤەیە کە تەنانەت لەلایەن بژاردەترین پیاویشەوە دووچاری هێرشی سۆزداری دەبێتەوە. ئیتر ژن بابەتێکە کە هەموو پیاوێك وەك ئیمپراتۆر خۆی بەسەردا دەسەپێنێ.

دەتوانرێ پێناسەکە دەوڵەمەندتر بکرێت، لایەنی سەیری ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کەکۆمەڵگای پیاوسالاری وەها لەقەڵەم دەدات کەدەتوانێ لەگەڵ ژنێك بژی کەناسنامەیەکی پڕ لەم تایبەتمەندێتییە نێگەتیڤانەی هەیە. کەواتە بەکۆیلەیەکی خۆگونجێن لەقەڵەم دەدرێت، لەبنەڕەتدا ژیانێکی هاوبەش لەگەڵ دیاردەیەك لەناو ئەم خراپەکاریانە ڕێکخرا بێت, بۆ مرۆڤێك, بۆپیاوێکی شەرەفمەند زۆردارییەکی سامناك و نارەسەنێتییە، هەرچەندە ئەفلاتوون بۆئەوە ڕەخنە بگرێت کە بەتەواوەتی ژنی لەدەوڵەت و کۆمەڵگا بەدەرنا، ئەم تایبەتمەندێتییە سووك و نارەسەنانە لەهەڵوێستەکەیدا زاڵە، ئەم بابەتەی لای زۆر لەفەیلەسووفەکان دەبینرێ پێویستە بەڕاستی بخوێندرێتەوە. بۆنموووونە لای نیتشە بەڕێوەبردنی ژیانێکی هاوبەش لەناو ئەم تایبەتمەندێتییانەدا هاوسەرێتی تێکدەدات. لەدۆخێکی وەهادا بۆچی وابەستەبوون بەژن لەناو کۆمەڵگاکاندا زۆر بەهێزە؟. چونکە ئەم کۆمەڵگایانە خراون، چونکە پیاو خراوە. ئەمە سەرچاوەکەی بۆ تایبەتمەندێتی بەناویەکداچووی کۆیلایەتی دەگەڕێتەوە. کۆیلەیەکی هێندە بەسوود هەڵبەتە بۆئەو مرۆڤانەی لەکۆیلایەتی ڕاهێنراون, دەبێتە ئەو هاوبەشێتییەی هەرە زێدە بەدوایدا دەگەڕێن. هەربۆیە ژنی نابووتکراو، کۆمەڵگای نابووتکراوە، پیاوی داڕووخێنراوە، هەڵبەتە شانەی گونجاو بۆ سەری گونجاوە. بەکورتی تاوەکو دیاردەی ژنێتی بەشێوەیەکی لێهاتوانە ڕۆشننەکرێتەوە، دایك ـ ژنێتی, ئازادی, کۆمەڵگای سروشتی و ژنێتی ئازاد و هۆشمەندی شارستانییەتی چینایەتی ئاوێتەی یەکتر نەکرێن, ئەوا هاوڕێیەکی هاوسەنگی ژیانی هاوبەش ناخولقێندرێ. هاوشێوەی ژنێتی ـ پیاوێتیش سەرلەنوێ ئاوانەکرێتەوە ئەوا ئەم بەیەکەوەبوونە فەراهەم نابێت.

لەچەندین دیاردەی جیاوازی بەتایبەت وەکو پیاو، خێزان، کار، فەرمانبەرێتی، هەروەها پەروەردە، تەندروستی، مافپەروەری و چەندین بواری دیکە دەتوانین شێوازی بەڕێوەبردن و ئاواکردنی سەرمایەداری لەبوارەکانی کۆمەڵگادا ببینین. ئەگەر پێناسەیەکی کورت سەبارەت خێزان بکەین، بچووکترین گەرد, خانەی سیستەمی ماڵە کەدەزگای سەرەکی کۆمەڵگای دەوڵەتگەرایی و پلەدارییە، ڕەنگدانەوەی ئیمپراتۆری باڵا لەخێزان " ئیمپراتۆری بچووکە " ئەو تەڵەزگە بنەڕەتییەیە کەکۆیلایەتی کۆمەڵگا نیشانی دەدات. کۆیلایەتی ناو خێزان گەرەنتی بنەڕەتی کۆیلایەتی کۆمەڵگایە، هەروەکو بڵێی ڕۆنە و

کاتژمێر بەکاتژمێر سەر لەنوێ سیستەم لەناو خێزاندا بەرهەم دەهێنرێتەوە. باری هەرە قورسیش دەکەوێتە سەر خێزان. خێزان گوێدرێژە هەرە هێمن و خۆگونجێنەرەکەی کۆمەڵگای دەوڵەتگەرایی و پلەدارییە، بەردەوام دەتوانی سواری بیت، باری خۆتی پێ هەڵگریت، بەزەقی ڕەنگدانەوەی شوێنپەنجەی سیستەمی سەرمایەداری پەرتەوازە بوو لەخێزاندا هۆی ئەم پەیوەندییە توندوتۆڵەی نێوانیانە.

هێندە پێویست ناکات بڵێین ئابووری سەرمایەداری. خودی سەرمایە ناوەڕۆکی ئابوورییە، لەبنەڕەتدا سیستەمێکی ئیستیسمارگەرا و پێشبڕکێی دڕندانەیە، لەپێناو قازانج هەموو شتێك دەکات. هیچ دیاردەیەکی کۆمەڵگا نەماوە نەیکردبێ بەکاڵا. ئەو کۆمەڵگایەی کرابێتە کاڵا، ئەو کۆمەڵگایەیکە دەخوازرێ زەوتبکرێ، کۆمەڵگایەکی بەمجۆرە تەمەنی خۆی پڕکردۆتەوە، هەربۆیە سیستەمێکە پێویستە لەنێو ببرێت.

بۆئەوەی تەمەنی خۆی درێژ بکات لەڕێگای زانست و هونەرەوە سیستەم لەناو هەوڵ و کۆششێکی نائاساییدایە. پێچەوانەی شیمانەکان، ئەم هەوڵانە بۆ پێشخستنی زانست و هونەر ـ تەکنۆلۆژیاشی لەناودا ـ نییە، هێزی نائاسایی زانست و هونەر بۆ بەردەوامکردنی ڕەوشی پووچبوونی خۆیەتی، ئەو شێوازەمان دێنێتەوە یاد کە بۆ چاککردنەوەی نەخۆشێك کە گەیشتۆتە دوارۆژانی ژیانی، تەواوی تواناکارییەکانی زانست و تەکنۆلۆژیا دەخرێتەگەڕ. لەم قۆناخانەی سیستەمەکاندا، زانست و هونەر ڕۆڵێکی دیاریکراو دەبینن لەوەی لەناو گێژاودا سیستەمێك پێکبێنن کەخۆی بونیادبنێتەوەو توانای ژیانی تێدا هەبێت.

ئەمەش بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە شوێنگەی سەرمایەداری لەناو سیستەمەکانی زۆرداری دوا سیستەمە. ئەو سیستەمەی لەسەردەمی کۆمەڵگای پلەدارییەوە شانەی خۆی هەبووە، سوودی لەو زەمینەیەی ئازادی وەرگرت کە ڕێنێسانس ڕەخساندبووی، کەوتە ڕەوشێکی پێشەنگی، ئەمەش وایکرد تەواوی وزەو تواناکاریەکانیشی دەربکەوێتە ڕوو. هەم لەبواری شێوە هەم ناوەڕۆك ئەگەری ئەوە نابینرێ کەزیاتر پێشبکەوێ. هیچ بوارێکی کۆمەڵگا و سروشت نەماوە کەبەکارنەهێنرابێ، ئەوەی ئەنجامدراوە لایەنی چەندایەتی تێپەڕ نەکردووە. هێندە پشتبەستنی بە لەیستۆکی زێدەڕۆیی بەرامبەر کۆمەڵگا سەرچاوەکەی بۆ پراکتیزەکردنی بێ هاوتایی توندوتیژیی دەگەڕێتەوە، کە تەنانەت گەیشتە ئاستی تەقاندنەوەی بۆمبای ئەتۆمی، هیچ سیستەمێك نەبووە بەو ئەندازەیە لەگەڵ توندوتیژی بەناویەکدا بچێت و بەڕێوە بچێ.

پێشکەوتن لەئارادا نییە، تەنیا دابەزین و سەرکەوتن جێگای باسە. لەحاڵەتێکدا ئەم هەلومەرجە کۆمەڵایەتییە زاڵەی لەئارادایە بەلاوە نەنرێت، لێگەڕینی نوێبوونەوە، ئومێد، ئاراستەگرتن و دۆزینەوەی توانستی خولکاری تاك بنبەستبووە.

لەبواری شێوەدا لەدونیای ئێمەدا ئەو خاك و کۆمەڵگا نوێیانە بوونیان نییە کە بتوانن ئەو سەرمایەدارییە دەرباز بکەن کەئەمریکا ڕێبەرایەتی دەکات. ئەوروپا لەقۆناخی ڕەخنەدانی خراپەکارییە گەورەکانی سیستەمدایە، ناچارە تادوایی بەمشێوەیە بڕوات، لەئەمریکای لاتینیش هەلومەرجە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکانی بوون بەئەمریکای دووەم لەئارادا نییە، چارەنووسییان بەکۆتاییەکەی ئەمریکاوە گرێدراوە، ئەفریقیاش دواجار لەڕەوشێکی هاوشێوەدایە، ڕۆژئاوای کەنارەکانی ئۆقیانۆسیش، چین و ژاپۆن هەرە زێدە بۆ بەردەوامبوونی سیستەم دەتوانن ڕۆڵی یارمەتیدەری ئەمریکا ببینن. بۆ سیستەمێکی نوێی سەرمایەداری خولقکار، نەخاوەن بانگەشەن نەتواناکاری. دەشێ ببن بەباشترین پراکتیزەکاری ئەمریکا. ڕوسیا لەبواری ستراتیژی ژێرکەوتنی سۆڤییەتی پەسەندکردووە، بەیارمەتی ئەمریکا پێشکەوتنی وەك سیاسەتێکی نوێ دەستنیشانکردووە.

ئەوەی دەمێنێتەوە ڕۆژهەڵاتی ناوینی بە بەڵایە. شتێکی ڕێکەوت نییە کەڕۆژهەڵاتی ناوین لەمیانەی جوگرافیا و کەلتوورەکەی بووە بەبەڵایەکی سەرەکی. خانە ڕیشەدارەکانی کۆمەڵگا لێرانەیە. ڕەگی دەستپێکەر و درێژەپێدەرانی شارستانیەت لێرانەن، خوداوەندەکانیان خەڵکی ئێرەن. زوو یان درەنگ کوڕ دەگەڕێتەوە یانەی باوك، سەرلەنوێ چاو

بەحیسابەکانی ماڵدا دەخشێنرێتەوە. ئەو ڕۆڵەی شایستەی هەڵکەوتەی ئەمریکایە، ئیتر لەمیانەی پرۆژەی ڕۆژهەڵاتی ناوینی گەورە کەوتۆتە قۆناخی پراکتیزەکردنەوە، ئەو پەیوەندی و ناکۆکییانەی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر قاڵدەبێتەوە ئەوە دیاردەکەن کە ئاژاوە (کائیوس) چی لێ دەکەوێتەوە.

ئەوەی لەئێستاوە دەتوانرێ بگووترێ ئەوەیە کە گۆڕانکاری و پێشکەوتنەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین لەدوایی‌دا بەرەو هەڵوەشانەوەی سیستەم دەچێ، هەربۆیە زۆر گرنگە و پێویستی بەشیکردنەوەیەکی ڕاستە، خاڵەکانی شکانەوەی ناکۆکییەکان ئەو گۆڕەپان و بوارانەیە کە گێژاو ـ قەیرانی تێدا قاڵبۆتەوە. ئەم ناوچانەش بەزۆری ئەرکی منداڵدان و بێشکە بۆ نۆژەنبوون دەبینن. لەپاشماوەکانی پەرستگای ڕاهیبی سۆمەردا ئایا ئەمجارە گۆڕستانی ئەو شارستانییەتە ئامادە دەکرێ کە خۆی هێنایە دونیاوە؟

بەشي دووەم

کۆمەڵطاي ذينطەيي ـ ديموكراتي

**أ/ ناوەڕۆکی مێژوویی بەها دیموکراتی و کۆمەڵکاریەکانی کۆمەڵگا**

یەکێك لەکەموکورتییە هەرەسەرەکییەکانی کۆمەڵناسی نیشاننەدانی جەمسەری بەرامبەرەکەی ئەو کۆمەڵگایانەیە کە گرێدراوی دەوڵەت و پلەدارن و پێویست بوو بەدرێژایی مێژوو لەناو دوالیزمێکی دیالەکتیکیدا بژین. هەروەکو بڵێی مێژوو بێ ناکۆکییەو بریتییە لەپێشکەوتنی ڕاستەهێڵ ئاسای سیستەمی باڵادەستی کۆمەڵگا. هەروەکو لەپێشکەوتنی هەردیاردەیەکدا دەبینرێ ئەوا بەدرێژایی مێژوو کۆمەڵگای دەوڵەت و پلەداریش لەمیانەی ناکۆکی لەگەڵ بەهاکانی کۆمەڵگای سروشتی پێشدەکەوێ کەرۆڵی دژەکەی دەبینێ. لەگەڵیدا بەخێودەکرێ، گەورەدەبێ، گەشەدەکات و هەمەڕەنگ دەبێ. نابێ هێزی کۆمەڵگای سروشتی بچووك ببینرێ. ئەم کۆمەڵگایە ڕۆڵی ڕەگی خانەی بنچینەیی دەبینێ. هەروەکو چۆن تەواوی شانەکان لەخانەی ریشەیی پەیدادەبن، کۆمەڵگای سروشتیش دەزگاکانی لێدەکەوێتەوە. هەروەها دیسان وەکو چۆن ئۆرگان و سیستەمەکان لەخانە و شانەکان پێکدێت، ئەوا دەزگا سەرەتاییەکانی کۆمەڵگای سروشتی ــ دەزگا سەرەتاییەکانی پلەداری ــ ئۆرگانە پێشکەوتووەکانی دیکەو سیستەمە کۆمەڵایەتییەکانی لێدەکەوێتەوە. لەوانەیە کۆمەڵگای سروشتی سەرکوتبکرێت، دوابخرێت و سنووری بۆ دابنرێت، بەڵام هەرگیز لەناو نابرێت. چونکە لەدۆخێکی وەهادا لەڕەوشی بەکۆمەڵگابوون دەردەخرێت. ئەنجامنەدانی ئەم دەستنیشانکردنە لەلایەن کۆمەڵناسیەوە کەموکورتییەکی گەورەیە. ئەوەی پلەداری و دەوڵەت بەخێودەکات ڕاستینەی پێکهاتنی کۆمەڵگای سروشتییە, کە بۆملیۆنان ساڵ دەگەڕێتەوە. دەشێ دوالیزمی دیالەکتیکی چۆن و بەچ شێوەیەکی دیکە سەرهەڵبدات؟ ئەنجامدانی شیتەڵکاری کۆمەڵگا لەمیانەی تێڕوانینی چینایەتی بەرتەسك یاخود ئامرازە ئابوورییەکان، بەو واتایەدێت کەهەر لەسەرەتاوە خودی ڕاستی و فاکتەرە سەرەکییەکەی لەدەرەوە بەجێدێڵێ. ئەم خەتاگەورەیە، خەڵەتێنەرەو بەچەوتی ئەنجامدراوە. بەتایبەتیش هەڵوێستێکی خاوەن بانگەشەی وەك مارکسیزم کەوا مەزەندەیان دەکرد گوایە ئەو کۆمەڵگا سروشتییەی بەکۆمۆن بەناویان دەکرد هەروەکو بڵێی هەزاران ساڵ پێش ئێستا تەمەنی تەواو بووە، وەك سیستەمێکی لەناوچوو تاوتوێیان دەکرد, ئەم ڕەوشە نەرێنییەی قووڵترکردۆتەوە.

هیچ کاتێك کۆمـەڵگای سروشتی کۆتـایی پێنـەهاتووە. سـەرباری ئـەوەی دژەکـانی خۆشـی بـەخێوکرد بـەڵام لـەنێو نـەچوو. بـەردەوام تـوانی خـۆی بئـافرێنێ. وەك کۆڵەکـەی ئـەتنیك، کۆیلـەو رەنجبـەرەکان، وەك زەمینـەی تێپـەڕکرنی جیابوونـەوەی چینایەتی کارکەری و هەڵکشانی کۆمەڵگای نوێ، وەك کۆمەڵگای رەوەندی بیابـان و دارسـتانەکان، وەك گونـدی ئـازاد و خێزانـی خـاوەن قـەوارەی دایـك، سـەرباری تـەواوی تێکـدان و خراپەکارییـەکان وەك ئـەخلاقی زینـدووی کۆمـەڵگا هەربـەردەوام بـووە. بەپێچەوانەی ئەگـەرەکان تـەنیا تێکۆشـانی بەرتەسـکی چینایەتی دینـامیزمی پێشکەوتنی کۆمـەڵگا نییـە، بـەڵکو بـەرخودانی مەزنی بەهاکانی کۆمـەڵگای کۆمۆنـە. نکۆڵیکردن لەتێکۆشـانی چینایەتی راسـت نابێت. ئـەو تـەنیا یەکێکـە لەدینامیزمـەکانی مێژوو. ئەوەی رۆڵی سەرکێشی دەبینێ رەوەندەکانی دارستان، شاخ و چۆڵەوانییە کە بەردەوام گەریدەن. فۆرمی جوڵانەوەی کـە پێی ژیاون ئەتنیکە. ئەتنیك هێزی بەرگەگرتنی هێرشە بێڕەحمەکانی هەزاران سـاڵ و زەحمەتییـە سروشـتییەکان و لەسـەرپێ مانەوەیە. ئەخلاقەکەیان کولتووری بەرخودان و داستانەکان و زمان و بەهامرۆییە پاك و رەسەنەکەیانە کە خولقاندوویانە.

یـەکێك لـەو گیروگرفتانـەی هـەرە زێـدە گفتوگۆیـان لـەبارەوە دەکـرێ قەیرانـەکانی سـەرمایەدارییە کەچۆن سیسـتەمێکی لێدەکەوێتـەوە. لـەدوای یەکـەمین شـەڕی جیهـانیش قـەیران دەرکـەوت. شۆڕشـی بەلـشەفیك لەنزیکـەوە پەیوەنـدی بەشیکردنەوەکانی لینینەوەوە هەیە کە لـەم بارەیـەوە ئەنجامیـداوە. هەرچی دووەمـین شـەڕی جیهانییـشە نیـشانیدا کەقـەیران کۆتـایی پێنـەهاتوەو کارەکتەرەکـەی دەخـستەوەروو. سـەرمایەداری خـۆی کـۆکردەوە سـەریەك. لەئـەنجامی دووەمـین شۆڕشـی زانـستی ـ تـەکنۆلۆژی تـابلێی قەڵـەمبازی بەخۆیـەوە بـینی. ئـەم پێهەڵگرتنـە کورتخایەنانـە نـەیانتوانی ببنـە کۆسـپ لـەپێش گەورەبوونی درزی قەیرانی سیستەم. لەدوای 1970کان، لەگەڵ رووخانی یەکێتی سۆڤیەت، لەجیاتی ئەوەی قـەیرانی سیـستەم سووك بێت، قورستربوو. بەشێوەیەکی بابەتی وەها سەلمێنرابوو کە ئەزموونی سۆڤێت باری سیستەمی سووککردووە.

لەم قۆناخەدا لەرێگای رکابەرەکانی سیستەم شرۆڤەکانی لیبرالی نوێ سەبارەت بەچۆنییەتی چارەسەرکردنی قەیران دیسان زیندوو بۆوە. ئایا نیولیبرالیزم بەڕاستی کاریکاتێرێکی رابردووە یاخود هەروەکو بانگەشەی بۆ دەکات لـەژێرناوی " جیهـانگیری " نوێبوونەوەیـەکی راسـتەقینەیە؟ لەکاتێکـدا ئـەم گفتوگۆیانـە بەهـەموو خێراییـەکی خـۆی بـەردەوام بـوو، لـەدوای قـەیرانی سۆسیالیزمی بونیـادنراو ئەلتـەرناتیفی گـەلان زیـاتر خـۆی سـەپاند. ئـەو گرژییـەی نێـوان ئـەمریکا، یـەکێتی ئـەوروپا، ژاپـۆن، پێکـدادانی بـاکوور ــ باشـوور و جەمـسەرگەرییە کۆمەڵایەتییـەکانی لەزیادبوونـدا بـوون, سیـستەمیان بـەرەو کـوێ دەبـرد؟ رەوتـەکانی ژینگـە و ژنناسـی و کولتوورییـەکان، وەك ئەکتـەری نـوێ دەکەوتنەگـەڕ. چـەندەی دەچوو بـەهای چارەنووسـسازی مافەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگای مەدەنی زیادی دەکرد. چەپ کەوتبووە ناو هەوڵەکانی خۆنوێکردنەوە. لەلایەك گفتوگۆکانی یانەی " داڤۆس " ی دەوڵەمەندەکان، لەلایەکی دیکەشەوە گفتوگۆکانی  یانـەی (پۆرتـۆ ــ ئالـەگرای) هـەژارەکان پێـشبینی دونیایـەکی چۆنیان دەکـرد؟ ئاسـتی رووکەشـی گفتوگۆکـان لەبەسـەربردنی رەوشـی رۆژانـەیی زیـاتر تێپـەڕی نـەدەکرد. بەسیـستەمبوون و پێشبینی تیۆری، لەلایەن هەردوولایەنیشەوە ناتەواوبوو. جموجۆڵێکی بە بەرنامەو نەخشە بۆکێشراو سنووردارببوو. بـەکورتی لایەنگرانی یەکسانی ـ ئازادی کۆمەڵگا بۆ دەرکەوتنێکی سەرکەوتووانە لەقـەیران نـە زانیاریـان و نەپێکهاتەکەشـیان بـەگوێرەی پێویست تێریان نەدەکرد. ئەو لیبرالیزمەی چەندین شەپۆلی لـەجۆری شۆڕشـە گـەورەو مێژووییـەکانی 1848، 1871، 1917 گـەلان و زەحمەتکێـشانی بـەرەو سـەراب بـرد، بۆئـەوەی جارێکی دیکـە لـەناو ئـاوە تازەکـانی بـەناو لیبرالیزمـی نـوێ نـەخنکێ پێویستە نەکەوێتە ناوهەمان هەڵەوە. ئەوەی بۆسەرلەنوێ ئاواکردنەوەی کۆمەڵگاو هێزی زانیـاری راسـت پێویـستە دۆزینـەوەی پێوانەکانی سەرکەوتنە. بەتایبەتیش لەرۆژهەڵاتی ناوین کەرۆژانە ناکۆکییـەکان زیـاتر قووڵدەبنـەوەو قـەیران و پێکدادانـەکان بەشێوەیەکی شێتانە لەئارادان، پێویستبوو بژاری گەلان واتاداربێت و پێکهاتەکەی رۆشنبکرێتەوە. بەرامبەر ئـەو قەیرانـەی بـە 11 ی ئەیلول دەناسرێ و هەڵمەتی نوێی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا کـە نـاوەڕۆکێکی قـووڵی پیلانگێـڕی هەیـە، پێویـستە

گەلان بژاری خۆیان لەرەوشی ئامادەباشیدا دابنێن. پێویستە چەپکە بـژارێکی وەهایـان لەدەسـتدابێت، جـارێکی دیکـە نەکەونـە نـاو بەهەڵداچوونی ریـشەییەوە. تـاوەکو نەبنـە پینـەی پێکهاتـە رزیوەکـانی سیـستەم. مێـژوو چاوەڕوانی وەڵامێکـی دڵنزمانـە (متواضع)ی جددی بوو کـە تەفرەدەرنـەبێ. بەشـێوەیەکی تۆکمـە دەرگاکـانی بەرامبـەر ئـەم دووبارەبوونەوانـە دادەخـست کـە تاقیکراوەنەتەوەو هیچ ئومێدێك نابەخشن.

لەم بەرگرینامەیـەدا دۆزینـەوەی وەڵامـی ئـەو پرسـیارانەم بەئـەرکی سـەرەکی خـۆم زانـی کـە ماوەیـەکی درێـژبوو بـەدوای وەڵامەکانیدا دەگەڕام. هەم راستینەی ژیانی سەختی گەلی کـورد کـە مـسۆگەر پێویـستبوو شایـستەی بـین، هـەم ئـەو گرفتانـەی جولانەوەی (PKK) دووچاری هاتبوو، کە بزووتنەوەیەکە خۆی لەژێر بەرپرسیارێتی پێشەنگایەتی دەبینێ دۆزینەوەی هێـزی واتاو ئامرازەکانی پێکهاتەیان لەسەرمن دەکرد بەپێویستییەك. لەکاتێکدا ئەم رۆحەی بەرپرسـیارێتی لەخۆمـدا دەبیـنم, تـەواو دەرك بەوەدەکەم کە لەکەسایەتی گەلەکەماندا، پێویـستە لـەولاوەی نەتـەوە بـەناوی بـژاری تـەواوی گـەلان هەڵسوکەوت بکـەم. ڕوانگەیەکی مرۆڤپەروەرانە و سروشت (گەردوون)م لەسەربنەمای تەواوی هەڵوێستەکانم بەجێکرد کەچەمکی تەسـکی کـۆنی " وڵاتپـارێزی و ئەنتەرناسـیونالیزم " تێپـەڕدەکات. هەربـەم ئامانجـە بـوو بۆچـوونەکانم سـەبارەت بەکۆمـەڵگای دیمـوکراتی و ژینگەیی بۆ گفتوگۆکردن و هەڵسەنگاندن پێشکەشکرد.

بەرلەهـەموو شـتێك ئـەو پرسـیارەی لەسـەرووی هەمووانـەوە پێویـستی بەوەڵامدانـەوە هەیـە سـەبارەت بەوەیـە پێویـستە چوارچێوەی تیۆریمان چی بێت، نەبوونی تیۆری ئەنجامێکی چۆنی لێدەکەوێتەوە؟ تیۆرییە ناتەواو و چەوتەکان بەرەو کوێمان دەبەن؟ پێویستە تایبەتمەندێتییەکانی چوارچێوەی تیۆری تۆکمەو کۆك لەگەڵ ئامانجەکان کامانەبێت؟

لەگەڵ ئەوەی گووتەیەکە بووە بەمۆدێل باس لەوەدەکرێت کە لەسەردەمی " کۆمەڵگای زانیاری" دەژین. ئەم گووتەیـە بـەو واتایەدێت ئەگەر هێزی زانیاری پێویست نەبێت، نەك تەنیا ناتوانرێ گرفتەکانی واتـاو پێکهاتـەی دیاردەیـەك چارەسـەربکرێت کەگیروگرفتی لەجۆری وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی هەیە، تەنانەت چارەسەرکردن و بەڕێوەبردنی دیاردە ئاساییەکانیش سەختە. تەنیا چارەسەرکردنی پراکتیکییانە و بەڕێوەبردن هەوڵێکە بەزۆری ئەنجامەکەی دۆڕاندنە. هەرچی سـەرکەوتنێکی گرێـدراوی شانسە بەردەوام ئەو مەترسییە لەخۆوە دەگرێت کە زوو یان درەنگ خاوەنەکەی بەرەو ژێرکەوتن ببات. هەرچـی ئـەو ژیـان و بەڕێوەچوونەیە کەلێی راهاتووین، پێبەپێ بەواتای لەدەستدانی ژیانی راستەقینە دێت. ژیـانی راسـتەقینە تـەنیا بەڕێوەچوون نییە، بەڵکو بەرێوەچوونێکی خێرایە.

هەربۆیە کاتێك کۆمەڵگاکانی فەیران لەلایەن ئەو رێنومایییە تیۆریانەوە رۆشـن و ئاراسـتەنەکرێن کـە لێهاتووەو بـەگوێرەی ئامانجەکانـە، ئـەوا شـیمانەیەکی لەپێـشە کـە هەوڵـە سـەرەکییەکانی وەرچـەرخان پووچـەڵ بێتـەوەو ئـەنجامی پێـچەوانەی لێبکەوێتەوە. لەمجۆرە قۆناخانەی مێژوودا بوونمان بە شاهێدی چڕبوونەوەی بۆچوونە گـەورەکان، سەرچـاوەی خـۆی لـەمجۆرە تایبەتمەندێتییانەی راستینەکە وەردەگرێت. لەسـەرهەڵدانی شارسـتانییەتەکاندا، بەرلـەپێکهاتنی سیـستەمە نوێکـان و دواتـری, بوونمان بەشاهێدی بۆچوونی گەورەو رێبازەکانی باوەڕی دیسان لەبەر هەمان هۆیە.

لەبەرئـەوەی لەسـەدەی بیـستەمدا مارکـسیزم ــ لینینیـزم مـۆرکی خـۆی لەنـەریتی رکابـەرێتی دا پێویـست دەکـات بەچـڕی هەڵوەسـتەی لەسـەربکەین. تـاوەکو هەڵـەی بنـچینەیی ئـەم چـەمکە نەدۆزینـەوە, کـەوەك کـەس کاریگـەری زۆری لەسـەرمنیش هەبوو, ناتوانرێ سەری رێگا بگیردرێتە بەر، دەبووایە بەرلەوەی 70 ساڵی بەسەردا تێپەڕێت دەرکی پێکرابووایە.

ئەو چـەمك و تێڕوانینـەم سـەبارەت بەسیـستەم کەهەولمـدا وەك کۆمـەڵگای دیمـوکراتی و ژینگـەیی بیکـەم بەبابەتگـەرایی، بەشێوەیەکی بنەڕەتی پێکهێنانی لەدەرەوەی دەسـەڵاتی دەوڵـەت وەك نـاوەرۆکی هەڵوێـستی تیۆریم دەستنیـشانی دەکـەم. نـەك تـەنیا لەدەرەوەی چەمکی دەسەڵاتی سیستەمی سەرمایەداری، گەرانی چارەسـەری لەدەرەوەی تـەواوی دەسـەڵاتە کلاسـیکییەکانی

دەوڵەتی پلەداری کۆمەڵگا دەوڵەتگەراکان، ناوەڕۆکی ڕێنومایییە تیۆریەکانمە. تەواو پێچەوانەی مەزەندەکان ئەم هەڵوێستە خەیاڵی نییە، تادوا ڕادە هەڵوێستێکی تیۆری گرێدراو بەراستینەی کۆمەڵگایەو وەك گرنگترین دەسکەوتی تێکۆشانی خۆمی دەبینم. لەگەڵ ئەوەی بنەماکانی کەسێتیم و کۆمەڵگاکەم ڕۆڵی لەگەیشتنم بەو هێزە تیۆرییە هەیە، بەڵام فاکتەری سەرەکی لەناو تەواوی پێکهاتە سیستەماتیکەکەیدا توانای تێگەیشتنمە سەبارەت بەکۆمەڵگای مێژوویی. توانای دەرککردنیشم بۆ تایبەتمەندێتییەکانی تێکۆشانەکەم و سەرکەوتنم لەبوون بەخاوەن بەرپرسیارێتی دەگەڕێتەوە. شوێنگەی دەیان ساڵ خەڵوەتگا، زیندانەکان، خیانەت و ئێش و ئازارەکان لەپێکهاتنی ئایینە مەزنەکان و ڕێبازەکانی هزردا بەڵگەنەویستە. بەهاکانی کۆمەڵگای سروشتی، ئەتنیك و شەڕی هەژاران و زەحمەتکێشان لەپێناو پاراستنی هەبوونی خۆیان جێگایەکی دەستلێبەرنەدراوی لەم پێکهاتەیەی هزردا هەیە. ئاشکرایە کە دەرککردن بەرووداوە گرنگەکانی دەوروبەری دەسەڵاتی سیاسی مێژوویی وەك هێلکاری هەمیشەیی نابێتە بناخەی مێژووییمان. دەشێ تەنیا لەدەرککردنی گشتگیرانەی سیستەم و وانەلێوەرگرتنی بەهایەکی هەبێ.

ئەو مێژووەی پێویستە بەبناخەی بگرین مێژووی ئەوانەیە کە لەجەمسەری دژدا بەرامبەر پێشکەوتنی کۆمەڵگای چینایەتی و پلەداری جێگای خۆیان دەگرن. تەواوی مێژووە سیاسی و فەرمییەکان یان بەهیچ شێوەیەك باسی ئەم مێژووە ناکەن، یاخود وەك گروپێکی ئاژاوەگێڕ، مرۆڤگەلێکی نەزان و مێگەلێك لەقەڵەمیان دەدەن کەبۆ ئامانجەکانیان شایستەی هەمووجۆرە بەکاربردنێکن. ئەم مێژووە بەو ئەندازەیەی کە وشك، داتاشراو و ئایدیالیستە، چەمکێکی سۆزداری زۆردارانەشە. مێژوومان بەکۆمەڵگای سروشتی دەستپێدەکات و لەمیانەی پشتبەستن بەهەموو جۆرە هزرو چالاکییەکانی ئەتنیك، چین و ڕەگەزی چەوساوە دەبەستێت کەبەرامبەر پلەداری و دەسەڵاتی سیاسی ڕادەوەستێ.

لەکاتێکدا بەمجۆرە بناخەی مێژوویی تیۆریەکەمان پێناسە دەکەین، ڕەهەندە گرنگەکەی دیکەی پێویستی لەخۆوەگرتنی بەرزترین ئاستی هێزی زانینی کۆمەڵگایە. ئەگەر چەمکی ڕاستی مێژووییمان لەگەڵ بەرزترین ئاستی زانین ئاوێتەنەکەین، ئەوا ناتوانین بەشێوەیەکی لێهاتووانە هێزی تێگەیشتن و شێوازی ئاواکردنمان دەستنیشان بکەین. دەبێ وەکو ڕاستینەیەکی بنچینەیی تێکۆشانی ئایدیۆلۆژی دەرك بەوە بکەین کەتیۆرییەك ئاسۆی زانینی توانستی تەواوی سیستەم وەرنەگرێت ئەوا ناتەواوەو لەتوانەوە لەناو ئاسۆی تیۆرییە دژەکاندا ڕزگاری نابێت.

بەم شێوەیە دانانی چوارچێوەی تیۆری سەبارەت بەسیستەمی کۆمەڵگای دیموکراتی و ژینگەیی یەکەم هەنگاوە. چەندە گەوهەرەکەی پڕبکەین و پراکتیکەکەی پێشبخەین، ئەو سیستەمەی پێشدەکەوێت بەو ئەندازەیە ئازاد و یەکسان دەبێت. پێشبینی دەکرێت سیستەمێك کە لەم بوارەدا پێشدەکەوێت نەسیستەمی پلەداری و دەوڵەتگەرایی کۆنە، نە سیستەمی کۆیلایەتی کۆمەڵگای دۆڕاو و چەوساوەو سەرکوتکراوە. سیستەمێکی ئەخلاقییە کە پەیوەندییەکی دیالەکتیکی شایستەی بەڕێوەچوونی لەگەڵ سروشت ئاواکردووە، لەناوخۆیدا پشت بەستەمکاری نابەستێت و ڕاستەوخۆ لەڕێگای دیموکراسییەوە بەرژەوەندی هاوبەش دەستنیشان دەکات.

ناوەڕۆکی کۆمەڵکاری پێکهاتنی هەبوونی کۆمەڵگا خەسڵەتێکی تایبەت بەناوەڕۆکە نەك ڕواڵەت. دەیسەلمێنێ کە کۆمەڵگا تەنیا بەشێوازی کۆمەڵکاری (کۆمۆنە) دەتوانێ بەردەوام بەهەبوونی خۆی بدات. لەدەستدانی ناوەڕۆکی کۆمەڵکاری بەواتای دەرکەوتن لەرەوشی بەکۆمەڵگابوون دێت. هەر گۆڕانکارییەکی دژ بە بەهاکانی کۆمەڵکاری بەواتای لەدەستدانی چەندین بەهای کۆمەڵگادێت. لە دۆخێکی وەهادا هەڵسەنگاندنی ژیانی لەشێوەی کۆمەڵکاری وەك شێوەی سەرەکی ژیان واقیعییە. بۆ دەرککردن بەو بڕوا چەوتانە هێندە بەسووربوونەوە جەخت لەسەر ئەم ڕاستییە دەکەین: بەگوێرەی گووتەی شارستانییەت، ئەوەی کۆمەڵگا دەژێنێ و بەرزیدەکاتەوە پلەداری و بەهاکانی دەسەڵاتە. ئەوەی لەناواخن جێگیردەبێت بەردەوامی بەقۆناخی دواتر

دەدات. دەتوانرێ بگووترێ بەو ئەندازەیەی ئەم چەمکە کۆنترینیانە ئەوا یەکەم درۆی گەورەو سیستەماتیکە کە هەرەزێدە زهنی داگیرکردووە، چەندەی کۆمەڵگا ناچاری باوەڕهێنان بەم بانگەشەیە دەکرێت ئەوا ڕەوابوون بەو قۆناخەش دەدات کەدژی کۆمەڵگایە. ئەمە بانگەشەیەکی هێندە بەهێزە، تەنانەت لەرۆژگاری ئەمڕۆشماندا کەس نییە بڕوای پێ نەبێ. سەرەڕای ئەوەی سیستەمی کۆمەڵکاری شێوازی لەدایکبوونی هەبوونی کۆمەڵگایە، بەهای ژیان و شکۆدارکردن، کردنی بەموڵکی پلەداری و هێزی دەسەڵات, لەسەرووی ئەو ناکۆکییانەوە دێت کە پێویستی بەشیتەڵکردن هەیە. ئەم گووتەیە کە چەواشەکاری مێژووی کۆمەڵگای ئەنجامداوە دەبێتە فۆرمی چەمکی سەرەکی تەواوی سەرخانەکان, لەسەرووی هەمووشیانەوە مێژوو، ئەدەبیات و سیاسەت. لەکۆتاییدا شێوازی ڕاستەقینەی لەدایکبوونی کۆمەڵگا بۆ شتێکی بێ زمان و بێ قسە وەردەچەرخێ.

تاوەکو کۆمەڵگای سەرەتایی لە ناوزەدکردنی " سەرەتایی " رزگاری نەبێت ئەوا تەواوی دەستنیشانکردنەکانی کۆمەڵناسی لەبیناکردن لەسەر بناخەیەکی چەوت رزگاری نابێت. دیسان پێویستە بۆ نموونەی خانەی بنچینەیی بگەڕێینەوە. بەگوێرەی ئەو خانانەی سەرجەم هەمەڕەنگییەکانی بەدەستهێناوە دەشێ خانەی سەرەکی سەرەتایی بێت. بەڵام ئەم سەرەتاییبوونە بەواتای سەرەتاییبوون و دواکەوتوویی نییە کە پێویستە تێپەڕبکرێت، یەکەم بەواتای بنەڕەتبوون سەرەتاییە. تاوەکو بەمشێوەیە تەماشای بەهاکانی کۆمەڵگای  کۆمەڵکاری (کۆمۆنە) نەکرێت, ئەوا تەواوی دەزگاکانی دیکە بەشێوەیەکی بێ بناخە لەناو بێواتابوونێکی جددی هەڵدەسەنگێنرێت.

کەواتە ئەگەر بخوازین لەتێکۆشانی کۆمەڵایەتییدا بەپرەنسیپ بین، بەر لەهەموو شتێك پێویستە بەرامبەر شێوازی پەیدابوونی کۆمەڵگا بەڕێزبین و بەشێوەیەکی واقیعی سەیری بکەین. نەك تەنیا لەشیتەڵکارییەکانی کۆمەڵگا هاوچەرخ و رادیکاڵەکان, بەڵکو لەپراکتیکەکەشیاندا راکردن لەکۆمەڵکاری هەیە. ئەگەر بگووترێ خۆی تایبەتە، فیکرەکەی کۆمەڵکارییە ئەمە خەڵەتاندنە. ئەمە ئەنجامێکی بێبەشکردنی کۆمەڵگای سیستەمی سەرمایەدارییە لەئەخلاق. تەنانەت تاوەکو کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم ئەتنیك (تیرە ــ خێل ــ گەل) لەدەرەوەی  کۆمەڵناسی بینرا. بەلانی کەم تاوەکو بەئەندازەی دەسەڵاتی سیاسی بەها بەئەتنیك نەدرێ، ئەوا شیمانە ناکرێت واتا بەگرفتەکانی کۆمەڵگا بدرێت و بەرەو چارەسەری راست هەنگاو بهاوێژرێت. فۆرمی ناوەڕۆکی کۆمەڵکاری بەشێوەیەکی هەرەچڕ لەئەتنیکدا گوزارشتی لێدەکرێت. کاتێك ئەتنیك لەئارادا نەهێڵین چی کۆمەڵگا دەمێنێتەوە؟ تاوەکو دوێنێ تەواوی رێبازە هاوچەرخەکانی فیکر ــ مارکسیزمیشی لەناودا ــ گەوهەری ئەتنیکیان وەك فۆرمێك هەڵدەسەنگاند کە کلاسیکە و هیچ رۆڵێکی نییە. ناوەڕۆکی کۆمەڵکاری وەك گەوهەرێکی قێزەون و تایبەت بەکۆنەپەرستی نیشاندەدرا. تا وایلێهات چەندە تاکرەوێتی دەربکەوێتە پێش و لەسەر بەهاکانی کۆمەڵگا زاڵبێت، بەو ئەندازەیە گرنگ و بەکەرامەت لەقەڵەم دەدرێ. کاتێك دەڵێین بە بەراورد کردن لەگەڵ راهیبەکان, زانا کۆمەڵناسییەکان زۆرخراپن، باس لەمەسەلەیەکی زۆر گرنگ دەکەین. راهیب وەك کەسێکی لەپێش و خاوەن هەست، هەروەکو چۆن بیردەکاتەوەو باوەڕی دێنێ لەگەڵ کۆمەڵگاو لەپێناویدا دەژی. راستی و راستنەبوونی زانیاریەکەی پێوانەی سەرەکی نییە. پێوانەی سەرەکی گرێدانێتی بەکۆمەڵکاری کۆمەڵگا. هەرچی " زانای کۆمەڵناسی " یە، راستی زانیاریەکەی هەرچییەك بێت، کۆمەڵکاری کۆمەڵگا بەبنەما ناگرێت. وەکو ئەندامێکی تەکنیکی نزیکی مەسەلەکە دەبێتەوە. کارەساتیش بەمشێوەیە دەستپێدەکات. بەگشتی تەواوی زاناکان, بەتایبەتیش زاناکانی کۆمەڵناسی, تاوەکو دان بەپیرۆزی کۆمەڵکاری کۆمەڵگادا نەنێن و تامردن پێیەوە گرێدراو نەبن ئەوا بەشێوەیەکی عادیلانە لەناوزەدکردنی "چینی گەورەی بێ ئەخلاقەکان " رزگاریان نابێت. ئەگەر گرێدراوی کۆمەڵکاری کۆمەڵگا بووانایە، ئەوا شەڕو دەسەڵات، چەوسانەوەو بەکاربردن نەدەگەیشتە ئەو ئاستانەی لەئارادایە. ئایا دەتوانرێ بۆمبای ئەتۆمی بەکامە کۆمەڵگاگەراییەك روونبکرێتەوە؟

هەستیارترین قۆناخی پێشکەوتنی کۆمەڵگای کۆمەڵکاری ئەو سەرەتاییەیە کە تووشی پێکهاتەی پلەداری هات. ئاراستەیەك پێویستە کە لەئەزموونی کەڵەکەبوونی کۆمەڵگا بەرەو دەوڵەمەندی واتا، لەوێشەوە بەرەو زمان و بەسەمبۆلکردن بچێت. لەرێگای ئایینی تەوتەمەوە ئەم قۆناخە پیرۆز دەکرێت. گرنگی ئایین بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بۆ کۆمەڵگا رۆڵی یەکەمین ناسنامەی بینیوە. ئەمەش دۆخی هۆشیاری سەرەتاییە. پیرۆزی ئەم شێوەیەی هۆشیاری بەتایبەت بۆ خودی ژیانی کۆمەڵگا دەگەڕێتەوە. دابڕان لەژیانی پریماتی ئاژەڵی، یەکەم جیاوازی واتاش لەگەڵ خۆیدا دێنێ، نوێبوونی جیاوازییەکە رۆڵی هەژاندن دەبینێ. یەکەمین تایبەتمەندێتییەکانی لەناواخنی خۆی دەگرێت. لەتەواوی هەنگاوە ئەرێنییەکانی پراکتیکی کۆمەڵگا رێگا لەپێش پێشکەوتنە بەجۆش و خرۆشەکان دەکاتەوە. ئەم رەوشە ئەو هۆشیاریەیە کەزیادبووە. ئەو قۆناخەیە کە هۆشیاری زمانگرتن و فێربوونی قسە لەگەڵ خۆیدا دێنێ، زمان گرتنیش ناولێنانە، هەرچی ناولێنانیشە بەسمبۆلکردن لەخۆوە دەگرێت. بۆ بەبەرهەمبوونی پراکتیکی قۆناخی هۆشیاری گرنگییەکی ژیانی هەیە. تا دێ بەبێ ئەو لەسەرپێ راوەستان زەحمەت دەبێت. یەکسەر هەست بەخراپی خەسڵەتەکانی ژیانێکی بێ هۆشیاری دەکرێت. سیفەت شانبەشانی پێشکەوتنی چۆنایەتی و جیاوازی هۆشیاری بەرێوە دەچێت. دیاردەی ئایین تەواوی گرنگی و پیرۆزی خۆی لەم قۆناخە هەستیارەی ژیان وەردەگرێت، هەر لەسەرەتاوە ناکۆکییەك لەهەناوی خۆیدا لەخۆوە دەگرێت. لەبەرئەوەی گوزارشتی یەکەمین ناسنامەو هۆشیاری کۆمەڵگابوون بوو بەبێ ئەو ژیان زەحمەتە. لەلایەکی دیکەوە لەبەر ئەوەی سەبارەت بەپیرۆزی و تابۆگەرایی " دەستلێنەدراوی " گۆڕەپانی قەدەخەکراو ـ زنجیرەیەك رێسا لەخۆوە دەگرێت دەرهەق بە داهاتوو موحافەزەکارە. بەرامبەر بەفاکتەرە نوێکانی هۆشیاری داخراوە. بەم تایبەتمەندێتییەی کۆسپ دەخاتە بەردەم پێشکەوتن. هەر لەبەر ئەمەشە لەسەرەتاوە فرە ئایینی دەبێتە دۆخێکی ناچاری. فرە ئایینی و فرە خودایی گوزارشت لەزیادبوونی جیاوازی هۆشیاری دەکات، ئەرێنییە. لەئایینداسەرەتا روونکردنەوەی هەموو شتێك بە رۆحگەرایی (ئانیمیزم)، ئەنجامێکی پارادیگمای کۆمەڵگاو دیدگای سروشتییە، ئەرێنییە. پێبەپێ بەرەو گەورەترین رۆح دەچێ، لەوێشەوە تێپەڕبوون بەرەو خوداییبوون بەسمبۆلکردنی قاڵبوونەوەی تایبەتبوونی کۆمەڵگاو بەدەستهێنانی ناسنامەیە. سەرەتا خوداوەند خودی کۆمەڵەکەیە (کۆمرۆڤەکانە).

چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم سەبارەت بە ئیلهامی خودایی سەیرە. هەروەکو دەزانرێ حەزرەتی ئیبراهیم لەمیانەی سەرهەڵدانی بەرامبەر بەپەنتائۆن (گروپی خودایی) نەمروودەکان و پادشا خوداوەندەکانی بابل و ئاشوورو شکاندنی بتەکان رێبەرایەتی یەکێك لەگرنگترین شۆڕشە زهنییەکانی مێژووی کردووە. بەڵام تیرەی عیبرانی کە حەزرەتی ئیبراهیم رێبەرایەتی دەکات، تەنانەت یەك دانەرۆژیش بەبێ خوداوەند نابێت. ئیتر ئەم خوداوەندە ناشێ تەوتەمی قۆناخی سەرەتاییش بێت. چونکە سەرهەڵدانێکی شۆڕشگێڕانە بەرامبەر بتپەرستی (بتگەرایی) ئەنجامدراوە. هەرچی خولقاندنی سەمبۆلی نوێیە زەحمەتە. پێویستی بەدەوڵەمەندییەکی نوێی واتا هەیە. بەکورتی پێویستی بەگۆڕانکارییەکی رادیکاڵانەی ئایین هەیە. مسۆگەر بەسیستەمی ئایینی و خودایی قۆناخ کاریگەردەبێت. بەڵام بەخێرایی پێویستی بەو ئازادییە هەیە کە خۆی هەڵگرتنی و بۆ نوێبوونەوە ناچارییە. قۆناخی خەڵوەتگا لەسیستەمی پێخەمبەرایەتی راوەستەیەکی باو و نەریتییە، ئامانجی گەیشتنە بەچڕبوونەوەی واتا. ئەو هزرە نوێیانەی لەزهنییەتدا وشیاردەبنەوە، بابەت و شێوەکانیان بەئیلهام و سروش (وەحی) بەناو دەکرێت. وەحی زیاتر دەنگی خودای داتاشراوە (مجرد). داتاشراویی، نیشاندەدات کە لەسیستەمی واتایی دواکەوتوویی بتگەرایی، بۆ سیستەمێکی پێشکەوتووتری واتا هەنگاو هاوێشتراوە. حەزرەتی ئیبراهیم کەلەم قۆناخەدا ژیاوە بناخەکانی ئایینی خۆی دادەنێت. شیمانە دەکرێت لەقۆناخێکدا کە گیروگرفتەکانی ژیان تەنگەتاوی زۆری دروستکردووە لەخەڵوەتدایە، وەڵامی دەنگی باو دەداتەوە. ئیبراهیم دەڵێ " تۆکێی؟ "، خاوەن دەنگ وەڵامدەداتەوە من" یاه ــ وە"م, واتای "ئەوە". ئەمە بەواتای خاوەنی دەنگ دێت، لایەنی سەیرتری مەسەلەکە ئەوەیە وشەی "ڤا ئەڤ" لەزمانی کوردی بەواتای " ئەو " دێت. ئەو

لێکۆڵینەوانەی سەبارەت بەریشەی زمانی عیبرانی کراوە نیشاندەدات کەزۆر کاریگەری زمانی ئاریانی لەسەرە, کەبناخەی زمانی کوردییە. ئەگەر ئەوە رەچاوبکەین کەباوەڕی ئیبراهیمی لەناوچەی ئورفا زۆر بەهێزە، تەنانەت دەتوانین بەشوێنی لەدایکبوونی نەریتی پێخەمبەرێتی بەناوبکەین، ئەوا ریشەی ئەم پێشکەوتنە زیاتر رۆشندەبێتەوە. چونکە ناوچەکە شوێنێکە هەرە زێدە کولتووری ئاریانی و سامی تێکەڵ بەیەکتر بوونە. هەربۆیە تێکەڵەی سامی ـــ ئاریانی زمانی عیبری، کاریگەری کردۆتە سەر کولتوورە ئایینییە تازە لەدایکبووەکە. هەروەکو دەزانرێ یاە ـ وەه دواتر دەبێتە یاهۆڤا، لە یاهۆڤاش بۆ یەهودی دەگۆڕدرێ. هەرچی ئیسرائیل و ئەڵلایە ئەنجامی رەنگدانەوەی ئەم پێشکەوتنەیە لەسەر کولتووری سامی.

هۆکاری ئەم باسە کورتەی سەرەوە بۆ ئەوەیە کە لەمیانەی نموونەیەکی زانراو باشتر دەرك بەپێشکەوتنی کۆمەڵگای کۆمەڵکاری بکرێت. کەبەسەر ئەم باسە تێپەڕدەبین باهەڵوێستێکی کۆمەڵناسی سەبارەت بەبابەتی " ئەڵلا " بێنینەوە کە پەیوەندی بەمەسەلەکەوە هەیە. ئەو بابەتەی بەسەدان ساڵە مێشك و دڵی مرۆڤی بەخۆیەوە خەریك کردووە وشەی " ئەل " ی سامی رەگەکەی پێکدێنێ. " ئەل " وێنەو شێوەیەکی خوداییە. شیمانە دەکرێت ساڵانی 2000 ی پێش زایین لەلایەن کەنعانییە سامییەکانەوە بەرهەمهێنرابێت. تیرەی کەنعانی لەو قۆناخەی کەلەناوچەی نیو بیابان ـــ نیو دەشتایی بەشێوەی رەوەندی دەژیان زیاتر نزیکی چەمکی خودایی داتاشراون. رووبارێك، شاخ و زەوییەکی کشتوکاڵی جێنشینبوونی نییە کەحوکم بەسەر ژیانی کۆمەڵە رەوەندەکاندا بکات. سروشت یەك شێوەی نەگۆڕە. زەوی و ئاسمان وەك بۆشاییەکی فراوانە. لەدۆخێکی وەهادا هۆز وەك تاکە بوونەوەر وایە. لەبواری رەوشی پلەدارییش، دەزگای شێخایەتی پێشدەکەوێت. شێخ، زانا تەمەندارەکەی هۆزە. بەرلەپێکهاتنی دەزگای پێخەمبەرایەتییە. جۆرێك لەشامانی سامییەکانە, پێشەنگێکی پێخەمبەرایەتییە. چەندە دەستڕۆییەکەی گەشەدەکات رێزو بەهای پیرۆزی بەدەستدێنێ. هەروەکو مێشکی هۆز وایە. ئەو رێزو پیرۆزییەی بەدەستیهێناوە چەندەی دەکرێت بەبابەتگەرایی بەرەو بەئایینبوون دەچێ. لەقۆناخی تێپەڕبوون لەتەوتەمگەرایی هۆزەوە بۆ خودای داتاشراو چەمکی " شکۆداری " پێشکەوتنی بەخۆیەوە دەبینی. بەرامبەرەکەی "ئەل" ە. لەزمانی عەرەبی رۆژگاری ئەمرۆماندا " علا، اعلی " نزیك بەواتای بەرز، بەرزتردێ. کاتێ هۆزی عیبرانییەکان لەناوچەی کەنعانییەکان ـ ئیسرائیل و فەلەستین ـــ دەربازی ژیانی جێنشینی دەبن، کاریگەری کولتووری خۆجێیی کەنعانییەکانیان دەکرێتەسەر. ئەمجارە لەخوداوەند" یاهۆڤا " وە بۆ بیرۆکەی " ئەلۆهیم " دەربازدەبن کە " ئەل " رەگەکەی پێکدێنێ. بەپێی تێپەڕبوونی کات و قۆناخ لەئەلۆهیم بۆ چەمکی ئەڵلا دەگۆڕێ. گرێدراو بەگەشەکردن و بەهێزبوونی کۆمەڵگاو بەدەستهێنانی تایبەتمەندێتییە ناکۆکەکان چەمکی " ئەڵلا " ش لەسەردەمی حەزرەتی محەمەددا لەسادەیی " ئەل " و شکۆداری بۆ بارگاوییبوونێکی تێکەڵ دەگۆڕێ. نەوەدونۆ سیفەت (خاسییەت) بەدەستدێنێ. زەحمەتە مۆدێل و بیرۆکەیەکی سۆسیۆلۆژی بدۆزرێتەوە کەبە شێوەیەکی هێندە سەرنجڕاکێش تایبەتمەندێتییە گرنگ و پیرۆزەکانی دەزگای کۆمەڵگاو بابەتەکانی بەشێوەیەکی وەها گشتگیر نیشانبدات.

ئەوەشی بخەینەسەر کەنیشاندانی " ئەڵلا " وەکو وێنەیەکی بیری پێشکەوتنی کۆمەڵگا، بەشێوەیەکی قەبا هەڵسەنگێنرێ, گوایە نکوڵیمان لێکردووە هەڵەیە. بەپێچەوانەوە بەتایبەتی پێشکەوتنی ئەم چەمکە لەناو هۆزی عیبرانی، لەئەنجامی هەنگاونانی لەیاسای کۆمەڵایەتییەوە بۆ یاسای فیزیا، کیمیا و زیندەوەرزانی، تاوەکو زانستەکانی ئەمرۆمان هێزی واتای بەدەستهێناوە. تاوەکو قووڵایی شکۆداری کۆزمۆس و کوانتۆم هاتووە. تەنانەت بەچارەسەرکردن و پێکهێنانی خانەی بوهێلی و زیندوو گەیشتووە. هەربۆیە چارەسەرییەکی راست بۆ بابەتی " ئەڵلا " پێوانەیەکی خوداگەرایی راستەقینەیە. هەروەها بەشێوەیەکی وەها ئاشکرادانانی ئەم پێوانەیە، لەهەمانکاتدا نموونەیەکی زەق و سەرنجڕاکێشە سەبارەت بەچۆنییەتی و پێویستی شرۆڤەکردنی ئایین. لەرۆژگاری ئەمرۆماندا پیرۆزی راستەقینە بەشیتەڵکاری سۆسیۆلۆژی راست تێپەڕدەبێت. ئەگەرنا تەنیا هاواری وشك و ئەزبەرەکردنی " ئەڵلا " لەلایەن جەماوەری گەل کەهیچ واتایەك لەخۆوە ناگرێت،

نکولێکردنێکه له " ئەڵلا " کەزۆر لە " بتگەرایی " رابردوو مەترسیدارترە. ئەوەی پێویستە لەراستینەی کۆمەڵگاکەماندا نەفرەتی لێبکرێت و بەلاوە بنرێت ئەم " بتگەرایییە داتاشراوە "یە کەپشت بەئەزبەرەکردن دەبەستێ.

کۆمەڵناسی ئایین دوورە لەوەی راستینەی کۆمەڵگا نیشانبدات. بەشێوەیەکی تۆکمە دانانی پەیوەندی زانینناسی (ئەپستمۆلۆژی) لەگەڵ کۆمەڵگابوون، گرفتێکە پێویستی بەشیکردنەوە هەیە. رەوشی ئێستای سۆسیۆلۆژی سادەترین بابەتەکانیش ناچاری چارەسەری دەکات.

بەسووربوونەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە تاوەکو سروشتی کۆمەڵگای کۆمەڵکاری شیکار نەکرێت ناتوانین بەشێوەیەکی راست پێشکەوتنەکانی دواتر تاوتوێ بکەین. هەروەکو چۆن ئەوە راستە کەتاوەکو ئەتۆمی هایدرۆجین شیکار نەکرێت ئەوا شیتەڵکردنی هیچ توخمێك واقیعی نابێت، بۆ پێکهاتەی رەگی کۆمەڵگاش تاوەکو دەرك بەکۆمەڵەی کۆمەڵکاری نەکرێت ئەوا ناتوانین واتا بەهەمەڕەنگی دیاردەی کۆمەڵگا بدەین؛ هەربۆیە باسێکی ناتەواو و زانستێکی چەوتی کۆمەڵگا دێتەئاراوە. گوایە میتۆلۆژیا و تیۆلۆژیا چەمکێکی فەنتازی کۆمەڵگایان پێشکەشکردووە، سۆسیۆلۆژیەکی هاوشێوەی نموونەی بوخچەی پینەکراو, جگە لەماندووکردن و ئاڵۆزکردنی مێشك هیچ ئەنجامێکی دیکەی لێناکەوێتەوە. ئەمەش زیاتر رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە دەسەڵات بەرەو شێتایەتی بچێت. چونکە تاوەکو کۆمەڵکاری شینەکەیتەوە ناتوانی دەسەڵات شیکار بکەیت. ئەو زەمینەیەی پلەداری و دەسەڵاتی دەوڵەتی لەسەر بەزربۆوە کۆمەڵکارییە. پلەداری وەك چەمك بەواتای بەڕێوەبەرێتی پیرۆزییە؛ بەدەستهێنانی دەستڕۆییە لەلایەن زانای تەمەندار. لە قۆناخی لەدایکبوون رۆڵی ئەرێنییە. رێنیشاندانی گەنجان، راپێچکردن و بەڕێوەبردنی تیرەی ـ کۆمەڵکاری قۆناخێکی لەپێشی پێشکەوتنە. هەرچی دەسکەوتی زاناکانە لەم پەیڕەوەدا بەسانایی بەلاوەنانی تەنگەتاوییەکانی تەمەنداریيە. ئەو گەنجانەی لەدەوروبەری کۆبوونەتەوە، بەتوانستەکانیان دەرك بەوە دەکەن کەلەمیانەی سوودوەرگرتن لەئەزموونەکانیان دەتوانن سەرکەوتووتربن. دەشێ لەگەڵ شامان ببێت بەهاوپەیمانێکی نزیك کەیەکەمین شرۆڤەکاری ئایینە. پێبەپێ لەبواری ئاییندا بوونی بە وتەبێژی ئایین، بەواتای وەرچەرخانی شامان دێت بۆ راهیبێتی. کارامەیی کوڕە لاوەکان لەبواری نێچیروانی و کۆبوونەوەیان لەدەوروبەری سەرپەرشتیارێك دەیانکات بەجۆرێکی سەرەتایی دەستە و پێوەندی سەربازی. رێککەوتنی راهیب ــ سەرپەرشتیار ــ زانا گوزارشت لە پلەداری هەڵکشاوەکات. هێشتا نەگەیشتۆتە بەدەزگابوونی دەوڵەت. پەیوەندی لەنێوان کەسەکانە. چەندەی دەچێ هێزی دەوروبەری دایك ـماڵیکردن پەرتەوازە دەکرێت.

هێزی ئافرێنەری کۆمەڵگای کۆمەڵکاری دایك تێکۆشانێکی گەورە بەرامبەر بەم رێککەوتنە سێیانییە نوێیە بەڕێوەدەبات. تەواوی ئاسەوارە مێژووییەکان نیشاندەدەن کە ئەم قۆناخە بەشێوەیەکی بەهێزو کاریگەر لەئارادابووە. سەردەمی دایك ــ ماڵیکردن کە لەقۆناخی کۆمەڵگای نئۆلیتیك ـ 10000 ـ 4000 پێش زایین ـ گەیشتە لوتکە. لەئەنجامی رێککەوتنی راهیب ـ سەرپەرشتیار ـ زانا تێپەڕدەکرێت کە گوزارشت لە لەدایکبوونی باوکسالارێتی دەکات. دوالیزمی ئینانا ــ ئەنکی، ماردۆك ــ تیامات ی میتۆلۆژیای سۆمەری ئەم چاخەی بەرلە مێژوو سەمبۆلیزە دەکات. شرۆڤەیەکی ئاسایی میتۆلۆژی ئەم راستییە روونەدەکاتەوە. ئینانا رەمزی دایکە بەهێزەکەی بەر لەمێژووە؛ بەسووربوونەوە باس لە 104 " ما "کانی دەکات کە بەواتای ئامرازەکانی، بابەت و یاساکانی شارستانییەت دێت. باس لەوە دەکات کەخوداوەند ئەنکی (یەکەمین واتای باوکسالارێتی) ئەو بەهایانەی رفاندووە کە خۆی ئافراندوویەتی. بەجۆشترین بەشی داستانەکە لەئورگەوە چوونێتی بەرەو ئەریدۆ، لەشاری خۆیەوە چوونێتی بۆ شاری ئەنکی، ئەوتێکۆشانە شکۆداریەتی کە لەئەنجامی هەزارو یەك هەوڵ و کۆششەوە " ما " کان بەدەست دێنێتەوەو دەیگەڕێنێتەوە. کێشمەکێشی ماردۆك ــ تیامات ی داستانی بابلی زیاتر ئەو تێکۆشانە نیشاندەدات کەسەبارەت بەدەستڕۆییەوە (دەسەڵاتخوازی) ئەنجامدەدرێت. بەزمانی میتۆلۆژیا بێڕەحمی پەرینەوە لەدایکسالارێتی بۆ

باوکسالارێتی نیشاندەدات. وەك شێوەی دووەم و سێیەمی ئەم داستانانە لەشارستانییەتی میسر وەك ئیسیس ــ ئۆسیریس، گریکەکان زێوس ـ هەڕا و لەشارستانییەتی هیتیت و ئورارتووش دەشێ دوالیزمی هاوشێوەی ئەمانە ببینین.

ئەوەی لەمیتۆلۆژیاکان فێری بووین دەتوانین لەئایینەکان, بەتایبەتیش لەئایینە تاکخوداییەکانی بەدەستیبێنین. کۆمەك و بەشداری موسا لەنەریتی حەزرەتی ئیبراهیم مسۆگەر خستنی ژنە بۆ ژێر زەبت و رەبت. لای حەزرەتی ئیبراهیم هێشتا ژن بەتەواوەتی بچووك و سووك نەکراوە. دوالیزمی ئیبراهیم ــ سارا نزیك بەهێزی یەکسانە. هەرچی لەدوالیزمی موسا ــ مەریەمە، مەریەم کەرۆڵی خوشکی دەبینێ مەحکومی دۆڕاندنێکی پڕ لەئێشکراوە. دوا پاشماوەی هێزەکانیشی لەدەستدەدات. هەرچی لای حەزرەتی داود و سلێمانە ژن یەکلایەنە بابەتێکی ئارەزوومەندییە. هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی نامێنێ. ژن بابەتی کەیف و رابواردنی پادشا هەڵکشاوەکانە؛ ئامرازی درێژەپێدانی رەچەڵەکە. جارجار کەسایەتی وەکو ئەستەر و دەلیلە سەرهەڵبدەن ئەمانە لەبوون بەئامرازی خراپەکاری بەولاوە هیچ رۆڵێکی دیکە نابینن. لەدوالیزمی حەزرەتی عیسا ـ مەریەمدا تاکە وشەیەکیش لەزمانی مەریەمەوە نابیستین. هەروەکو بڵێی زمانی بڕاوە. مەسیحێتی هەنگاوێکی مەزنە لەگەیشتن بەژنانی رۆژگاری ئەمڕۆمان. هەرچی لەمەسەلەی حەزرەتی محەمەد ــ عایشەیە تراژیدیایەك لەئارادایە. عایشەی مندالْ بەرامبەر بەدەسەڵات و دەستڕۆیی دەرەبەگایەتی ئیسلامی هەڵکشاو, بەسکالایە. مێژوونووسان دەگێڕنەوە کە گووتوویەتی "ئەی خودایە لەجیاتی ئەوەی منت وەك ژن بهێنایەتە دونیا منت بکردبووایە بەتاشەبەردێك باشتربوو ". ئەمە نزایەکی خراپە لەئەنجامی ئەو کینە گوتوویەتی کەزانیویەتی سەرباری ئەوەی هاوسەری خۆشەویستی پێخەمبەر بووە, بەلام لەگەمەی دەسەڵاتدا هیچ ئەنجامێك بەدەستناهێنێ.

تاوەکو ئێستاش زۆرجار لەکۆمەڵگا ئەتنیکییەکاندا رووبەرووی ئەوە دەبینەوە کە لەبنەڕەتدا پلەداری هێزی لەکێشمەکێش و پێکدادانی باوکسالاری لەگەڵ دایکسالاریدا بینیوە. لەئەنجامی ئەم دۆڕاندنەی ژنان شکاندنەوەی گەورە لەفۆرمی ناو کۆمەڵگادا دەبینرێ. لەکاتێکدا جاران خۆی ***هەڵبژێرە*** ئیتر وەك موڵك دەکڕدرێ. ئیتر لەپاشماوەی ئەو ژنەی کە لەدەوروبەری پیاوەکەی رێکخراوە, بۆ ئەوەی دەستڕۆیی خۆی لەدەستنەدات بۆ ماوەیەکی درێژ بەرخودانی کرد، ژنێك ماوەتەوە کەئیرادەی خۆی لەدەستداوە، شێوەو ناسنامەیەکی ژن ماوەتەوە کە بەبژاری پیاو رازیکراوە. نموونەیەکی دیکەی سەبارەت بەوەی ئەم قۆناخە بەسانایی تێپەڕنەبووە، لەو مەراسیمەی هاوسەرێتی پیرۆزدا دەبینرێ کە پاڵێوراوە پیاوەکان لەگەڵ خوداوەندی دایك خێزان پێکەوەدەنێن و لەهەر ساڵوەگەڕێکی ئەم هاوسەرێتییە پیرۆزەدا دەکرێن بەقوربانی. ئەو رێورەسمانەی لەناو زۆربەی کۆمەڵگاکان بیرەوەریەکانیان دەبینین، سەمبۆلی ئەوەیە کە ژن لەپێناو لەدەستنەدانی دەستڕۆییەکەی ساڵانێکی درێژ بەرخودانی کردووە. رێورەسمەکانی قوربانیکردن وەك سەمبۆلێك ئەوە نیشاندەدات کە لەپێناو ئەوە رێکخراوە کاتێك پیاو دەستڕۆیی بەدەستدێنێ حوکمڕانی بەسەرژندا نەکات. پێکدادانی ماردۆك ـ تیامات ی ساڵانی 2000 ی پێش زایینی کۆمەڵگای سۆمەری ئەوە نیشاندەدات کە ئەم قۆناخە دژی ژن ئەنجامگیربووە. لەقۆناخی شارستانییەتی دوای 2000 ی پێش زایین لەتەواوی کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناوین نموونەی هاوشێوە دەبینرێ.

هەرچەندە لەسەرەتادا کۆمەڵگای پلەداری رۆڵێکی ئەرێنی لەپێشکەوتنەکاندا دەبینێ، بەلام پێبەپێ یان بەپەرتەوازەبوون یاخود بەدەوڵەتبوون ئەنجامگیردەبێ. هێزی خۆشی لە بەکۆمەڵگابوون وەردەگرێ. بەهۆی ئەوەی بۆماوەیەکی درێژ و رووبەڕوو ژیاوە ئەم شێوەیەی دەستڕۆیی بەتایبەتیش لەگروپە ئەتنیکییەکاندا گەیشتۆتە لوتکە. کۆمەڵگایەکی پلەداری ــ باوکسالارێتییە کە ملکەچکردنی ژنان، لاوان و ئەندامەکانی دیکەی ئەتنیك بەبنەما دەگرێت. گرنگترینیشیان شێوازی دابینکردنی ئەم دەستڕۆییەیە. دەستڕۆیی نەك بەیاسا بەڵکو لەرێگای ئەخلاقەوە بەرێوە دەبردرێت. ئەخلاق بەواتای ئەو هێزەی رێسا دێت کە پێویستە کۆمەڵگا گوێڕایەڵی بکات. ئەم هێزە لەرێگای فشارەوە پەیرەو ناکرێت، بەهۆی رۆڵە ژیانییەکەی

له بەردەوامکردنی هەبوونی کۆمەڵگا خۆبەخشانە پەیڕەو دەکرێت. جیاوازییەکەی لەگەڵ ئایینـدا ئەوەیـە لـەجیاتی پیرۆزی، سەرچاوەی خۆی لەپێویستی دونیایی وەردەگرێت. بێگومـان ئایینیـشس دونیـایی یـە. بـەڵام لایـەنی ئەفسووناوی بابەتـەکان و کۆنترین پێکهاتەی زیاتر دەیخاتە ناو رووخساری پیرۆزییەوە. زیاتر واتایی و بەرێورەسمـە. هەرچی ئەخلاقـە زیـاتر ئـەو رێسا پراکتیکیانەیە کە دونیایی و رۆژانەیە. لەگەڵ ئـەوەی لـەناو یەکتریـدان، لەکاتێکدا ئـەخلاق بـەردەوام بـەڕێوەبردنی کارەکـانی دونیا رێکدەخات، ئایین هەوڵدەدات وەڵامی تێگەیشتنەکانی باوەڕی و دونیای دیکە بداتەوە. لەکاتێکدا ئـایین تیـۆری کۆمـەڵگای سەرەتاییە، ئەخلاق دەبێتە کردارەکەی.

تاوەکو قۆناخی بەدەوڵەتبوون ئەم دوو دەزگایـە تێـری بـەڕێوەبردنی کۆمـەڵگا دەکـەن. دەتـوانرێ بـەقۆناخی بـەڕێوەبردنی کۆمـەڵگا لەمیانـەی دابونـەریت و بـاوەڕی بـەناو بکرێـت. ئـەوەی هێـشتا لـەناو کۆمـەڵگادا بـەهێزە کەسـێتی نییـە, بـەڵکو تایبەتمەنـدێتی کۆمەڵکارییـە. گرێـدان بەکۆمـەڵکاری هـەرە زێـدە بەخۆگونجانـدن لەگـەڵ پێکهاتـە ئـایینی و ئەخلاقییەکـەی فەراهەم دەبێت. گوێڕایەڵی نەکردن بەواتای گێژاو و ئاڵۆزی ناو کۆمەڵگادێت. ئەممەش پەرتەوازەبوون و لەناوچوونە. هەربۆیـە لـەم قۆناخـەدا ئـایین و ئـەخلاق بـاوەڕی و پـەیڕەوی زۆر بـەهێزن. هـەر کەسـێك گوێڕایـەڵی ئـەخلاق و ئـایین نـەکات، واتـە گەورەترین خراپی بەرامبەر ئەو کۆمەڵگایە دەکات. زەحمەتە کۆمەڵگا ئەمە پەسندبکات؛ بەقورسـترین سـزا وەڵامـی دەداتـەوە. یان فڕێیدەداتە دەرەوەی کۆمـەڵگا، یـاخود دەیخاتـە نـاو پەروەردەیـەکی تونـدەوە. ئـەوەی گرنگـە تێکنەچوونی تایبەتمەنـدێتی کۆمـەڵکاری(کۆمۆنـە)یـە. ئـەوەی تـاوەکو ئێـستاش لەئایینـەکان دەبینرێـت جێبەجێنـەکردنی هەنـدێ رێـسا و عیبـادەت بەگەورەترین گوناح لەقەڵەم دەدات, هێـزی کۆمۆنـە نیـشاندەدات. جـەخت لەسـەر تایبەتمەنـدێتی خـودایی پەیوەنـدی کۆمۆنـە دەکاتەوە.

سەرباری ئەوەی هەڵسەنگاندنێکی چەوتە سەبارەت بەئایین, بەڵام لەرۆژگاری ئەمرۆمان بەچڕی پـەیڕەو دەکرێت ئـەویش ئەوەیە کە ئایین مەسەلەیەکی تایبەت بەکەسێتی تاکە. ئایین تایبەت بەکەسێتی نییە، بەڵکو یەکەمین چەمك و ئاکارو شـێوەی بەڕێوەبەرێتی دیاردەی کۆمەڵگایە. پلەدارێتی کە بەواتای بەڕێوەبەرێتی پیرۆزیی دێت گوزارشت لەم راستییە دەکات.

پێکدادانی کۆمـەڵگای کۆمـەڵکاری لەگـەڵ پلـەداری هەمیـشەییە. لەگـەڵ سـەرلەنوێ گەڕانـەوەی بـەها مـاددی و مەعنەوییـە کەڵەکەبووەکان بۆ کۆمەڵگا بۆ زیاتر پاوانکردنی چەتاڵبوون لەرێسا ئایینی و ئەخلاقییەکان باڵا دەگرێت. لەکاتێکدا لـەدیاردەی ئایینی رەنگدەرەوەی بەهاکانی کۆمەڵگای باوکسالاری پێشکەوتنێك بەرەو چەمکی تاکخودایی داتاشراو لەئارادایە، دەسەڵاتخوازی دایکسالاری کۆمەڵگای سروشتی لەمیانەی چەمکی فرەخوداوەندی ژن بەرخودان دەکات. لە سیستەمی دایك ـ ماڵیکردن رەنـج و بەرهەم و رێسای پێشکەشکردنی پێویستی ژیانی هەرکەس بەبنـەما دەگیرێت. لەکاتێکـدا توانـستەکانی ئـەخلاقی باوکـسالارێتی رەوا دەکرێـت و رێگـای موڵکایـەتی دەکاتـەوە، توانـستی ئـەخلاقی کۆمـەڵگای کۆمۆنـە عەیبـدار دەکرێـت، بەچـاوی سەرچـاوەی خراپییـەکان تەماشـای دەکرێـت و هـانی پەرتـەوازەکردنی دەدرێـت. ریـشەی بابـەتی " جوامێـری " لـەم دیاردەیـەدا سەرچـاوە دەگرێت. بەرامبەر موڵکایەتی تایبەت هەوڵـدەدات موڵکایـەتی گـشتی بپـارێزێ. تـا دەچـێ گونجـان و هەمئاهـەنگی نـاو کۆمـەڵگا تێکدەچێت، گرژی زیاد دەبێت. چارەسەرکردنی ئەم ناکۆکییە یان لەگەڕانەوە بۆ بەهاکۆنەکان دەبینـێ، یـاخود لـەوەدا دەبینـێ کە لەدەرەوەو نـاوەوە هێـزی خـۆی زیـاد بکـات. بـەم شـێوەیە بناخـەی کۆمەڵایـەتی شـەڕ و توندوتیـژی پـشتئەستوور بەفشارو چەوسانەوە دادەنرێت.

گروپەکانی پلەداری کە لەدەوروبەری بەها ماددی و مەعنەوییەکان گـەورەبوون، بـۆ ئـەوەی پەرتـەوازە نـەبن بەشـێوەیەکی ئیرەیی و هەمیـشەیی بـۆ پیرۆزکردنـی دەسـتڕۆیی و مافـدارێتی موڵکایـەتی دەکەونـە نـاو هـەوڵێکی سیـستەماتیکەوە. زەحمەتـە کۆمەڵە بچووك و بەربڵاوەکان بتوانن بەرامبـەر ئـەم هێـزە خـۆڕابگرن. تـیرەو هـۆزە سـەرکوتکراوەکان تـەنیا لەمیانـەی کۆچـە

بەردەوامەکانیان دەتوانن ئازادانە هەبوونی خۆیان بپارێزن. کۆچبەرەکان تەنیا بۆ نێچیرگرتن و کۆکردنەوە سەری ڕێ ناگرن، زیاتر لەپێناو پاراستنی بەهاکانی کۆمەڵکاری بەرەو قووڵاییەکانی چۆلەوانی، دارستان و شاخەکان کاروانێکی گەورەی مێژوویی دەست پێدەکەن. پێویستییەکانی خۆپاراستن ناچاریان دەکات لەتیرەی سەرەتایی و هۆز بەرەو پێکهاتەی خێڵ بچن. خێڵ تەنیا گەورەبوونێکی جەستەیی (بایۆلۆژی) نییە، بەڵکو جۆرێك لەفۆرمی بەرخودانە بەرامبەر بەپلەداری. لەقۆناخی یەکەمدا دەستڕۆیی ژێرچەتری خێڵ چۆنایەتییەکی ئەرێنی هەیە، لەبواری ئەخلاقیشەوە بەردەوام لەمیانەی داستان و مۆسیقاکانەوە بەشان و باڵیدا هەڵدەدرێت. سەرۆك عەشیرەت سەمبۆلی هەبوون و ئازادی خێڵە. لەکەسایەتی ئەودا نوێنەرایەتی زهنییەت، کەرامەت و ئاسایشی خێڵ دەکرێت.

ئەو ئاستەی ئەم قۆناخە پڕ لەناکۆکییە پێیدەگات دەوڵەتە, کە دەستڕۆییەکی دەزگاییەو پشت بە توندوتیژی هەمیشەیی دەبەستێ. لەدایکبوونی دەوڵەت دووەمین قۆناخی گەورەیە لەمێژووی کۆمەڵگاکاندا. گۆڕانکاری ریشەیی بەسەر تەواوی پێکهاتەکانی بەرهەمهێنان، ژیانی کۆمەڵایەتی و دەسەڵاتدا دێنێ. لەبەرئەوەی پێکدادانی هۆزو خێڵە ڕێکنەخراوەکان بەردەوام توانست و موڵکایەتی پێشێل دەکەن و تێکیدەدەن، لەبەرامبەر ئەوە لەسەر بنەمای هێز چارەسەری لە بەدەزگابوونی دەستڕۆیی دەبینێ. راهیب لەشامانەوە، پادشا لەبیریارو فەرماندەش لەسەرپەرشتیار پەیدابووە. لەهەرسێ دیاردەشدا کەس کاتییە، دەزگا هەمیشەییە. قۆناخی نیشتەجێبوون گوندی تێپەڕکردووەو بەئاستی شار گەیشتووە. لەکۆمەڵگای گوند سەرەتا سیستەمی کۆمەڵکاری زاڵە. گوند شوێنی سەرەکی ژیانی کۆمەڵگای نیئۆلیتیکە. شوێنگەی پیرۆزی شۆڕشی کشتوکاڵە کە لەساڵانی 11000 پ. ز تاوەکو 3000 پ. ز بەردەوام بووە. بۆ ماوەیەکی درێژخایەنیش نوێنەرایەتی بەیەکەوەبوونی کۆمەڵگای کۆمەڵکاری و کۆمەڵگای پلەداری دەکات. هێشتا ئاغایەتی و بەگێتی لەئارادا نییە, دایکی ــ ماڵیکەر کۆتەڵ (ئابیدە)ی شکۆداری کەرامەتە. چونکە تەواوی بەهاکانی سەبارەت بەماڵ لەزهنی ئەو دەخولقێن. ئەو ئاژەڵانەی لەژینگەدا ماڵیکردوون لەگەڵ ئەو رووەك و سەوزاییەی کردبووی بەکولتوورێك، ژیانێکی پڕجوانی وەها پێشکەش دەکات کە هاوتاکەی نەبینراوە. هەزاران دۆزینەوەی ئەم قۆناخە بەرهەمی ژن ــ دایکە. دۆزەرەوەی قۆناخ دیارنییە، قۆناخی داهێنانەکانی ژنە. گروپەکانی پلەداری کە فێڵبازو بەهێزبوونە چاودەبڕنە دەوڵەمەندێتی ئەم داهێنان و بەرهەمانە، زەوتی دەکەن، بۆ ئەوەی شوێنگەکەشیان هەمیشەیی بکەن دەوڵەت دەئافرێنن. دەستیان لەگوندێتی سەر تەپۆلکە (بەرزایی) کانی بنارەکانی زاگرۆس ــ تۆڕۆس بەردا کە تائێستا ژیانی تێدا ماوە، لەو دەشتانەی رووبارەکانی دیجلە، فورات، نیل و بەنجاب و ئاویاندە دا لەلایەك شاریان ئاواکرد، لەگەڵ ئەویشدا رێگایان لەپێش سیستەمی دەوڵەت (پۆلیس)دەکردەوە.

پارچەبوونەکەی کۆمەڵگای بونیادی گوندو شار وەك فاکتەری دووەم و گرنگ کۆچبەری ـ جێنشینیشی هاتەسەر. لەکاتێکدا پارچەبوونی پلەداری ستوونییە، کۆچبەری ــ جێنشینی ئاسۆییە. ئیتر سیستەمە مێژووییەکانی کۆمەڵگا لەئەنجامی ئەم ناکۆکییانە شێوەدەگرن کە ئەم پارچەبوونانە رێگایان لەپێشکردۆتەوە.

شۆڕشی زهنی کە لەگوند دەستپێکرد, لەشار قووڵبۆوە, یەکەمجار لەکولتووری باوەڕی ئایینی رەنگدەداتەوە. سیستەمی خوداوەندەکان بەسووربوونەوە هەوڵدەدەن بەتەواوەتی خۆیان لەسیستەمی مرۆڤ و سروشت جیابکەنەوە. خوداوەندەکان بەسیفەتی لەجۆری تەمەندرێژی، لەئاسمان دەژین، هەندێ جار بۆ ژێرخاکیش رۆدەچن، مرۆڤ تێکەڵ بەخۆیان ناکەن، دڵیان بخوازێ دەتوانن مرۆڤ سزا بدەن، بارگاوی کران. لەمیتۆلۆژیای خوداوەندی سۆمەریەکاندا تا دێت ئەم تایبەتمەندێتییە هەمەڕەنگ دەبێ. پەنتائۆنێکی دەوڵەمەند پێکدێت کە لەخواوەندەکانی پارێزەری شارەکان تا خوداوەندی رووبار، چاندن، دەریا، شاخ، ئاسمان و ژێرزەوی لەخۆوە دەگرێت. ئەم سیستەمی بازاراوەکردنە نوێنەرایەتی ئەو هێزە چینایەتیە دەکات کە لەگەڵ هێزە سروشتییەکاندا لەناو یەك لەکۆمەڵگادا هەڵدەکشێ. ئەم فۆرمە زهنییە ئایینی و نیو میتۆلۆژییە هەبوونی ئەو

چینە باڵادەستانە پیرۆز دەکات و مانەوەی هەمیشەییان بەبنەما دەگرێت کە رووی زەوی لەنێوان خۆیان دابەش دەکەن، ئەمەش بۆ رەوابوونی سیستەمی ئاواکراو ژیانییە. لەکاتێکدا فۆرمە بنچینەییەکانی ئەخلاق و باوەڕی کۆمەڵگای کۆمەڵکاری دەڕووخێت، ئەوا نوێکان دەتوانن زهنییەتێکی بەهێزو هەمیشەییتر فەراهەم بکەن. ئەم جیاوازییە هەرەزێدە لەکاتی پەڕینەوە لەسیستەمی ئایینی خوداوەندە ژن بۆ سیستەمی ئایینی خوداوەندی پیاو نیشاندەدرێت. گرنگی جیاوازی ئینانا ــ ئەنکی، ماردۆك ــ تیامات لێرەدا شاراوەیە.

هیچ میتۆلۆژیایەك سەبارەت بەجیابوونەوەی چینایەتی و ئاواکردنی دەوڵەت هێندەی میتۆلۆژیای سۆمەری بەشێوەیەکی بێگەرد، رەسەن و زمانێکی شیعرئامێزانە بەهێزی باسکردن ناگات، رووبەڕووی گێڕانەوەیەکی سەیرو سەمەرەین. دەشێ " یەکەمین" ی تەواوی دەزگاو بیرۆکە ئایینی، ئەدەبی، سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان لەکۆمەڵگای سۆمەریدا ببینرێ. دەتوانرێ بگووترێ کە ئەم رەسەنێتییە لەسەرووی ئەو پێشکەوتنە مێژووییانەوە دێت کە هەرەزێدە شێوە بەپێکهاتەی دەزگاو بابەتە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا دەدات. هەربۆیە چارەسەرییەکانی کۆمەڵگای سۆمەری کارەکتەرێکی گەردوونی لەخۆوە دەگرێت.

مەزندە دەکرێ پێکهاتنی دەوڵەت و شار وەك بەردەوامی شۆڕشی گوند ــ کشتوکاڵی بنارەکانی زاگرۆس ــ تۆڕۆس پێشکەوتبێت. ئامرازو بابەتی کرداری و تیۆری ئەم شۆڕشە بەرفراوان و درێژخایەنەی مێژووی مرۆڤایەتی لەلایەن توێژی پلەداری کە راهیبەکان قورساییەکەی پێکدێنن بۆ میزۆپۆتامیای خواروو دەگوازرێتەوە. ئەگەری لەپێش ئەوەیە ئامرازەکانی چنین، ماڵ ئاواکردن، چاندن و نموونەکانی تۆو و دارمێوەکان و ئاژەڵەکانیان لەگەڵ خۆیان بردووە. هەلومەرجی ئەوەیان نەبووە ئەمانە لەناوچەیەکی بیابانی بێ ئاو بەدەست بێنن. ئەو بەڵگانەی لەبەردەستدان بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا نەخشەی رێگای ئەم کولتوورە نیشاندەدات کە لەگەڵ کۆمەڵگاکان گواستراونەتەوە. ئەو کۆچانەی لەدەوروبەری ساڵانی 6000 ــ 5000 ی پ.ز روویداوە لەساڵانی 4000 ی پ. ز وە ئەو یەکینانەی گوند پێکدێنێت کەدەتوانێ 5000 کەس لەخۆوە بگرێت. شاری بەناوبانگی مێژوویی ئورك کە خوداوەندەژن ئینانا دامەزرێنەرێتی، لەساڵانی 3200 ی پ. ز وەك دەوڵەت بەمرۆڤایەتی دەناسێنرێ. لەداستانی گلگامێشی شاری ئورگ (ورکاء) کە یەکەمین نموونەی نووسراوەی شۆڕشی شارە وەك سەمبۆلی خوداوەندە ژنی ــ دایك ماڤ خۆی پێدراوەو بەنەمری هێڵراوەتەوە. هەروەکو لەزۆر لەوشەکانی زمانی سۆمەری دەبینرێ لەبواری زمانناسییەوە وشەی گلگامێش ریشەکەی ئارییانییە. تەنانەت لەزمانی کوردی ئەمڕۆشماندا "گل واتە گر"، بەمانای گەورە دێت. " گامێش " واتە (جاموس). تاوەکو ئێستا لەکولتووری خۆجێییدا پیاوێك بەهێزبێ دەڵێن وەکو گایە یان دەڵێی گامێشە. لەدۆخێکی وەهادا وەکو گای مەزن گلگامێش گوزارشت لەبەرهێزترین پیاودەکات. پێناسەی داستانەکەش سەبارەت بە گلگامێش ئەم هەڵوێستەی ئێمە پشتڕاست دەکاتەوە. لەسەر راستەڕێی نەخشەی رێگای کولتوورەکان بەدوای بەها مێژووییەکاندا بچین" تابڵێی ئەزموونبەخش دەبێت.

ئەو چیرۆکەی لەداستانی گلگامێش نیشاندراوە، چیرۆکی پادشایەتی و لەدایکبوونی دەوڵەتە. لەبەرئەوەی یەکەمین داستانە، ئەو سەرچاوە سەرەکییەیە کە نموونەی لێوەردەگیرێ. دەتوانرێ بگووترێ کە لە ئیلیادای هۆمیرۆس و ئاییندەسیای فیرگیالیۆس تادەگاتە داستانی ئارسەری پادشاو کۆمیدیای ئیلاهی " دانتی" ن، بەرهەمە گەورەو مێژووییەکان بەردەوامییان بەم ئاسەوارە داوە. کێ دەزانێ یەکەمین شۆڕشی مەزنی کشتوکاڵی چەندین داستانی بەناوبانگی هەیەو نەنووسراون. لەچیرۆکە نووسراوەکانی سۆمەری، هیتیت و ئیۆن شوێنپەنجەی ئەم باسانە دەبینرێ. هەروەها تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆ هەست بەئامرازو نۆرمە مۆسیقییەکانیان دەکەین ــ بەشێکی زۆری ئەمانە کولتووری عەشیرەت نیشاندەدەن. لێکچوونی بەهای ئەو خێڵانەی تائێستا لەئارادان لەگەڵ شوێنپەنجەی سۆمەریەکان زۆر سەرنجڕاکێشە.

بۆ ئەوەی لەنزیکەوە سیستەمی نوێی کۆمەڵگاکەمان بناسرێ ئەم گەشتە مێژووییە کورتەمان ئەنجامدا. لەمێژووشدا کۆمەڵگای دەوڵەتیمان بینیوە. لەدەوروبەری باوەڕی پەرستگای مەزندا لەدایکبونی شارو دەزگای دەوڵەت لەناویەکدا دەبینین. لە نموونەی سۆمەریدا دەتوانین پێناسەیەکی راستتر لەوەی مارکسیزم سەبارەت بەئایین پێشکەش بکەین کە دەیگوت ئایین دەزگای سەرخان بووە دواتر وەك ژێرخان سیستەمی ئابووری نیشانداوە. خودی پەرستگا هەم گۆڕەپانی بەرهەمهێنانی بابەتە خوداییەکانە (زەقورەکان نهۆمی سەرەوەیان خوداییە، نهۆمی ژێر هی مرۆڤەکان و بەرهەمهێنانە)، هەم ناوەندی بەروبوومی ئابوورییە. نهۆمی ژێر پڕ لەئامرازەکانی بەرهەمهێنان و شتومەکە کەڵەکەکراوەکانە. نهۆمەکانی ناوین پڕ لەخەباتکارانە و دەگواسترێتەوە. نابێ پەرستگاکان وەك مزگەوت و کڵێساکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان ببینین. لەسەردەمی لەدایکبووندا, لەبنەڕەتدا وەك ناوەندەکانی بەرهەمی ماددی و زهنییەتی نوێ رۆڵ دەبینن. پێدراوەکانی لەبەر دەستدان زۆر بەئاشکرایی راستبوونی ئەم هەڵوێستە دەسەلمێنن. نابێ لەبیربکەین کەخودی راهیب دامەزرێنەری پەرستگایە. تەنانەت ئەم دیاردەیەش نیشاندەدات کە لەشۆڕشی پێکهاتەی ژێرخانی بەرهەمهێنان بەئەندازەی شارو دەوڵەت زهنییەتیش رۆڵی لەپێشینە دەبینێ. پەرستگا دەزگایەکە زهنییەت بەبنەما دەگرێت. لەزمانی هێلینیش زهنییەتی پەرستگا بەتیۆری بەناو دەکرێت. لەزمانی هێلینی تیۆری بەواتای " تێڕوانینی خودایی " دێت. ئەوەی سەرنجڕاکێشە زەقورەکانی پەرستگای سۆمەریەکانە کەوەك ناوەندی تیۆری ــ سیاسی و تەکنیکی ـ ئابوورییەو نموونەی سەرەتایی ئەو شارەشی لەهەناوی خۆی حەشارداوە کە دواتر گەشەدەکات.

زەقورەکان (زیگۆراتەکان) تۆوی شارو دەوڵەتە. لەوێدا بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگای پلەداری مێشکی راهیبەکان دەکرێت بەسەنتێز(کۆتێز)ێك و بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی بەرفراوانتر گەشە بکەن مۆدێلی تیۆری پێشدەخرێت و لەرێگای ئامرازە کردارییە ئامادەکان پراکتیزەدەکرێت. شار لەپەرستگا لەدایك دەبێ، شاریش شارستانییەتێکی لێدەکەوێتەوە، شارستانییەت دەوڵەتێك ئاوادەکات، دەوڵەتێك ئیمپراتۆریەتێك دەخوڵقێنێ و ئیمپراتۆریەتێکیش دونیا ئاوا دەکات. ئایا پەرچوویێکی لەمە گەورەتر بوونی هەیە؟ لەخۆڕا نییە کە ئەم خاکە بەوڵاتی پەرچوو (موعجیزە)ەکان بەناو دەکرێت. لەمێژوودا نووسراوە کە یەکەمین پادشاکانی سۆمەری لەبنەڕەتدا راهیب بوون. لەسیستەمی پێکهاتەو گریمانەکانماندا چاوەڕوانی جۆرێکی دیکە ناکرێت. چەندەی دەوڵەت بەدەزگادەبێت و بیرۆکراسی خۆی پێشدەخات توانستی پادشای ـ راهیب سنووردار دەبێ. سیاسەت، واتە گرفتی بەڕێوەبەرایەتی شارە گەورەبووەکە دەردەکەوێتە پێش. لەناوەڕۆکی پیرۆزی دەوڵەت بەرەو ناوەڕۆکێکی دونیایی (سکۆلاری) گۆڕانکارییەك دێتەئاراوە. لەکاتێکدا راهیب زیاتر بەکاروبارە تیۆرییەکان خەریك دەبێ، ئەندامە سیاسییەکە خەریکی بواری کردارییە. ئەم دۆخەی بەشێوەیەکی توندوتۆڵ بەناویەکداچووە، چەندەی دەچێ سیاسەتمدار زەقدەکاتەوە. شاری گەورەبوو، واتە سیاسەتمەداری گەورەبوو. هەنگاوێك دواتر بەتایبەتی کاتێ گرفتی ئاسایشی دەرەوەی بایەخدار دەبێ رۆڵی فەرماندەی سەربازی دەردەکەوێتە پێش. بەمجۆرە پادشایەتی لەلایەن سێ سەرچاوەوە خۆراکی پێدەدرێت. هەرسێکیشیان ئیلاهیبوون بەبنەما دەگرن. ئەوەی لەو رۆژە بەدواوە پێشکەوتووە زیادبوونی ئەم مۆدێلەو کەمێکیش هەمەڕەنگ بوونییەتی. خانەی بنەڕەتی دەوڵەت پەرستگایە. دواتر خانەو شانەو ئەندام و سیستەمی نوێ دێتەئاراوە. هەروەکو مرۆڤ.

ئەگەرکۆیبکەینەوە سەریەك، ئەوا تەواوی ئەم پێکهاتانە وەك سەرخان گوزارشت لەدەوڵەت دەکات. لەمیتۆلۆژیادا لەبواری دەزگاییدا دەوڵەت بەکورسیەکی زێڕین دەچوێندرێ. ئەو پادشایانەی لەسەر دادەنرێ کەوەك خوداوەندی نەمریان لێدەکرێ و بەشێوەیەك رەچەڵەکەکەیان ــ چینەکەیان ــ لەمرۆڤەکان جیادەکەنەوە, کەجارێکی دیکە کەس نەتوانێ لەم ژیانەیان دووربخاتەوە. لەبەر ئەوەی لەسەربنەمای خانەدانێتی (بنەماڵەگەرێتی) درێژە بە بەڕێوەبەرایەتی دەدەن رەچەڵەکی خۆیان بەنەمر رادەگەیەنن. بەمجۆرە پادشاکان وەك خوداوەندە نەمرەکان جێگای خۆیان لەگۆشەبەرزەکانی مێژوو دەگرن. خاڵی سەرنجڕاکێشتر ئەوەیە کە سەرەداوی هەموو قۆناخەکانی دواتر لەم پارچەبوونە کۆمەڵایەتییەدا دەدۆزینەوە. ئایینە

تاكخوداییەكان وەك وێستگەی سەر رێگای پێهەڵگرتنی رەسەنی سیاسەت، ئەدەبیات و هونـەر دەردەكەونـە سـەر شـانۆی مێـژوو. كاتێك بەقووڵی سەرچاوەی دەسەڵاتی دەوڵەت شیبكەینەوەو لێكۆڵینـەوەی لەسـەربكەین، ئـەوا باشـتر تێدەگـەین كە بۆچی بێ پچڕانە، ناچاری شێوە ژیانێكی چڕو بێبەزەییە.

لەسیستەمی كۆمەڵگای مێژووی نوێدا ركابەرایەتی بەرامبەر كۆمەڵگای كۆمەڵكاری وەك كۆمەڵگای باڵا شێوە بەخۆیـدەدات. قووڵیی و جیاوازیەكەی گەورە كـردووە. پرسـیاری ژیـانیی سـەبارەت بەبابەتەكـەمان ئەوەیـە ئایـا ئـەم شـێوەگرتنە ناچـارییە یاخودنـا؟ چـەندین تیـۆری كۆمەڵایـەتی لـەدایكبوونی كۆمـەڵگای چـینایەتی بەمـەرجێكی پێـشكەوتن دەبیـنن. لەمیانـەی تەماشاكردنی دینامیزمی پێشكەوتن دەتوانین وەڵامی نزیكتر شیبكەینەوە. لەمیانەی ئـەو ئاودێرییـەی لەدەوروبـەری پەرسـتگا پێشخراوە ئیتر بەرهەم زیاتر بەبەروبوومەكانی مـرۆڤ گرێـدەدرێت. ئـەو هەلومەرجە لەئارادایـە كە بەهـەزاران كـەس بتـوانن بەشێوەیەكی بەرهەمدار كاربكەن. گەورەیی ئاوەڕۆكان، بەرفراوانی زەوی و زار، ئامرازە برۆنزی و ئاسنەكان، بەلەمەكانی زێ و رووبارەكان دەرفەت بەئاستێكی بەرزی بەرهەمهێنان و بازرگانی دەدەن. یەكگرتنی تەواوی ئەم فاكتەرانە بـەواتای بـەجێبوونی شار دێت. بەڕێوەبەرایەتی راهیبەكان سەرەتا زۆر لەكۆمۆنیزمی سەرەتایی نزیكە. لێـرەدا ئـەو دەرئەنجامـە دەردەكـەوێت كە شـار دەوڵـەتی نـەكردووە بەناچـارییەك. لەبنەڕەتـدا دەوڵـەت لەئـەنجامی دەركـەوتنی فـشارەكانی جـۆری سیاسـی و سـەربازی سەرهەڵدەدات. هۆكاری ئەمەش ئەوەیە لەگەڵ تەنگەتاویـەكانی بەڕێوەبەرایـەتی شاری گـەورەبوو, كۆمەڵەی تیرەكانی شاخ و بیابان پاراستنی شار دەكەن بەكێشەیەكی گرنگ. ئایا ئاسایش و بەڕێوەبەرایـەتی بـۆ كۆمەڵگایـەك نـەبێت بەشـێوەی دەوڵـەتی بەدینایەت؟ لەزۆر لەشارەكان ـ بەتایبەتی نموونەی ئەسینا ــ دەبینـرێ كە لـەجیاتی دەوڵەت بەڕێوەبەرایـەتی دیموكراتییانـە بەشێوەیەكی سەركەوتووانە دەتوانێ پاراستنی گەوهەری ئەنجامبدات. لەقۆناخی سـەرەتایی كۆمـەڵگای سۆمەریدا ئـەم مۆدێلـە دەبینرێ, لەكاتێكدا ئەنجوومەنی پیاوەماقووڵ و ریشسپییەكانی هـۆز بەڕێوەبەرایـەتی پێكدێنن، بـەپێی پێویـست گروپـەكانی پاراستن لە لاوەكانی شار پێكدەهێنرێ. بـەگوێرەی پێداویـستی ئەركـەكان فەرماندەیـەك هەڵدەبـژێرن. لەكۆمـەڵگای ئەسـینادا بەشێوەیەكی بەرجەستەو سیستەماتیك ئەم پێشكەوتنە دەبینرێ.

لەدۆخێكی وەهادا وەك ناچارییەك بەجێكردنی لـەدایكبوونی دەوڵـەت لەبناخـەكانی مێـژوودا لەگەڵ دیاردەكان نـاگونجێ. هەڵسەنگاندنی دەوڵەت وەك دەستبەسـەرداگرتنی تواناكارییـەكانی بەرهـەمهێنانی زێـدەو بـەكارهێنانی وەك ئـامرازێكی فـشارو بەڕێوەبەرایـەتی پێناسـەیەكی راسـترە. كاتێـك ئەمـە ئەنجامـدەدات، بەڕێوەبەرایـەتی و ئاسایـشی گـشتی وەك ئـامرازێكی پەردەپۆشكردن و پرۆمۆسیۆن بەكاردێنێ. بەگوێرەی ئـەوەی بەڕێوەبەرایـەتی گەلـەری و ــ بەرژەوەنـدی هاوبەشـی كۆمـەڵگا ــ ئاسایـشی گـشتی بەئاسـانی لـەرێگای ئەنجوومـەنی شـارەوە بەدیـدێت، بـەكاربردنی ئـەم تواناكارییـە، لـەجیاتی ناچـارییەك، هەڵسەنگاندنی وەك دەستبەسـەرداگرتنی و دژە شۆڕشـی ــ بەشـێوەی دەستنیـشانكردنێكی گـرنگ رووبـەڕوومان دەبێتـەوە. كاروباری ئاسایش و بەرژەوەندی گشتی شار كە لەرێگای دیموكراتییەتەوە دەتوانرێ فەراهەم بكرێ. ئـەو هێـزەی ئەمـە دەكاتـە بیـانوو و خـۆی دەسـەپێنێ، هـەر لەسـەرەتای دەسـتپێكردنی مێـژووەوە وەك هێزێكـی موحافـەزەكارو زۆرداری پێناسـەبكرێت واقیعییە. تەنانەت لەرۆژگاری ئەمرۆشماندا سیاسەتمەدارو هێزی ئاسایشی زیاد لەپێویست، بـەهۆی تایبەتمەنـدێتی بێكارییـەوە لە بەدەستهێنانی تایبەتمەندێتی دەسپۆتیزم بەولاوە تێپەڕنابێت. ئیتر پێویستە ئەم هێزە وەكو بـارێكی زیـادەی سـەر بـەهاكان هەڵسەنگێنرێ. رووداوەكانی سەرەتای یارییەكەش لەناوەڕۆكدا جیاوازییەكی ئەوتۆی نەبوو.

بەڵام ئەوەی بەدرێژایی مێژوو گەورەبووە هێزی بەڕێوەبەرایەتی دیموكراتییانـە نییـە، بەڕێوەبەرایـەتی هێـزی دەسـپۆتیزم بووە. هەر هەنگاوێكی توانستی هێزی دەسپۆتیزمی دەوڵەتی پێشخستووە، ئەمە لەولاوە بمـێنێ كە بـۆ پێـشكەوتن ناچـاری بـێ، بـەڵكو نـاوەڕۆكی ئـەو گۆڕانكارییـە مێژووییەیـە كـە دواكـەوتووە، موحافـەزەكارو چەواشـەكارە. بـەواتا سـنووردارەكەی

هەڵسەنگاندنی خۆشاردنەوەی دەسەڵات و شەڕ لەناو دەوڵەت وەك حەسرەت و مێشك و ئیرادەی ریشەیی ئەم نەریتە تا دوا ڕادە هەڵوێستێکی گرنگ و واقیعییە. دیسان لەم چوارچێوەیەدا پێویستە هونەری سەربازی و سیاسەت لەدیاردەی ئاسایش و بەڕێوەبەرایەتی گشتی جیابکرێتەوە. هەرکەسێك هەستی زانستی و پراکتیکی هەبێت ناتوانێ ئەم جیاوازییە نەبینێ. پەیڕەونەکردنی ئەم جیاوازییە لەشیکردنەوەکانی سەبارەت بەدەوڵەت ئەنجامەکانی تادواڕادە نێگەتیڤە. پێویستە لێك جیاکردنەوەی بەڕێوەبەرایەتی دیموکراتی و بەڕێوەبەرایەتی دەسپۆتیك ـ ئارەزوومەندی بەرژەوەندی شەخسی ـ لەبوارەکانی تێوری و کرداری ببێتە بناخەی هەڵوێستی مێژووییمان.

لەسیستەمەکانی پلەداری و کۆمەڵگای دەوڵەتیدا کێشمەکێشی نێوان فاکتەری دیموکراسی و قڵفی دەسەڵات ـ شەڕ دیاردەی سیاسی سەرەکییە. تێکۆشانێکی بەردەوام لەنێوان فاکتەرەکانی دیموکراسی کەپشت بەشێوازی پەیدابوونی کۆمەڵگا (کۆمەڵگای کۆمۆنی) دەبەستن لەگەڵ ئەو گروپەی دەسەڵات ـ شەڕ لەئارادایە کەخۆی لەژێر دەمامکی پلەداری و دەوڵەت شاردۆتەوە. کەواتە لەم چوارچێوەیەدا تێکۆشانی چینایەتی تەسك داینەمۆی مێژوو نییە، لەمیانەی شێوازی پەیدابوونی گەل (دەمۆس) کەتێکۆشانی چینایەتیش لەخۆوە دەگرێت، تێکۆشانی نێوان دەمامکی دەسەڵات ـ شەڕو گەلە کەهێرش دەکاتە سەر ئەم شێوازەو هەوڵی خۆ تێرخۆراککردن دەدات. بەشێوەیەکی بنەڕەتی کۆمەڵگاکان پشت بەم دوو هێزە دەبەستن و دەبن بەژیانیی، بەدەستهێنانی زهنییەت، ئاواکردنی دەستڕۆیی، سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئامرازە ئابووریەکان لەمیانەی ئاستی شەڕی نێوان ئەم دوو هێزە دیاری دەکرێت. گرێدراو بەئاستی شەڕ بەدرێژایی مێژوو ئەم سێ ئاستە لەناو یەکتردا رووبەڕوومان دەبنەوە. یەکەمیان رەوشی سەرکەوتنی تەواوی قڵفی (دەمامکی) جەنگاوەری ـ دەسەڵاتە. ئەو سەرکەوتنە سەربازییە شکۆدارانەی وەك گەورەترین رووداوی مێژوویی ـ فەتحکاری ـ پێشکەش دەکرێت ئەوەی دەیسەپێنێ سیستەمی کۆیلایەتییە. هەرشت و کەسێك لەدەرەوەی گروپی جەنگاوەری دەسەڵات بێ پێویستە لەچوارچێوەی هێزی یاسا لەژێر فەرمانیان دابێت. جێگای ناڕەزایی و رکابەران نییەو نابێت. تەنانەت لەبواری فیکریش کەس ناتوانێ پێچەوانەی شێوەی زاڵی وێناکردنەکان بێت. چۆن بەسەرتدا سەپێنراوە، دەبێ وەها بیربکەیتەوە، کاربکەیت و بەم شێوەیە بیت !. لوتکەی سیستەمی باڵادەست بەبنەمادەگرێت کە بێ ئەلتەرناتیفە. بەتایبەتیش کردەوەکانی ئیمپراتۆرییەت، فاشیزم و هەموو جۆرەکانی تۆتالیتاریزم دەکەوێتە ناو چوارچێوەی ئەم نموونەوە. دووەمیان سیستەمی ژیانی ئازادە، کۆمەڵگای ئەو گروپانەیە کە لە گەل ـ تیرەی سەرەتایی و هۆزو خێڵەکان پێکدێت و لێکچوونی زمان و کولتورییان لەنێواندا هەیەو تەواو دژی ئۆلیگارشی دەسەڵات ـ جەنگاوەرییە کە لەژێرپەردەی دەوڵەت و پلەداریدا خۆیان حەشارداوە. گوزارە لەشێوازی بەرخودانی گەل دەکات. هەرجۆرە ئەتنیکێکی لەبیابان، شاخ و دارستانەکاندا بەرامبەر بە پەلامارەکان لەناو بەرخوداندا بوون، هەروەها ئەو گروپە ئایینی و فەلسەفییانەی پشتیان بەئۆلیگارشی نەبەستووە لەبنەڕەتدا نوێنەرایەتی ئەم شێوازەی ژیانی کۆمەڵگا دەکەن. ژیانی بەرخودانی گروپە ئەتنیکییەکانی لایەنی جەستەیی و ژیری سۆزدارییان لەپێشە لەگەڵ ژیانی بەرخودانی گروپە ئایینی و فەلسەفییەکانی ژیری ئەنالیتیکیان لەپێشە، هێزی سەرەکی تێکۆشانی یەکسانی و ئازادی کۆمەڵگان. لێشاوی ئازادیخوازی مێژوو ئەنجامی ئەم شێوازەی ژیانی بەرخودانە. دیاردەو بابەتە گرنگەکانی لەجۆری بیری خوڵقکارانە، کەرامەت، دادوەری، مرۆڤپەروەری، ئەخلاقگەری، جوانی و خۆشەویستی زیاتر گرێدراوی ئەم شێوازەی ژیانە.

سێیەمین جۆری سیستەمی کۆمەڵگا شێوازی ئەو سیستەمەیە کە بەرەوشی " ئاشتی، ئارامی" بەناو دەکرێت. لەم سیستەمەدا لەئاست و بوارە جیاوازەکاندا هاوسەنگییەك لەنێوان هەردوو هێز لەئارادایە. رەوشی شەڕو پێکدادان و گرژی بەردەوام، ژیانی کۆمەڵگا دەخاتە ناو مەترسییەوە. لەوانەیە لایەنەکان رەوشی شەڕو مەترسی بەردەوام بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆیان گونجاو نەبینن.

لەرێگای تەبایی و رێککەوتنی جیاوازەوە بەرەو رێککەوتنێکی نەخشەی " ئاشتی و ئارامی " دەچن. ئەگەر ئەو ئەنجامەش نەبێ کەهەردوو لایەن خوازیاری بوون ئەوا بەگوێرەی هەلومەرجەکان تەبایی و رێککەوتن دەبێتە ناچارییەك. تاوەکو شەرێکی نوێ رەوش بەمجۆرە بەرێوەدەبردرێت. ئەو رەوشەی بەئاشتی و ئارامی بەناو دەکرێت لەراستیدا گوزارە لەدۆخی شەرێکی نیوەچڵی نێوان هێزی دەسەلات ـ جەنگاوەری و هێزی بەرخودان و ژێر نەکەوتووی گەل دەکات.

بەناوکردنی رەوشی هاوسەنگی دوالیزمی شەڕ ـ ئاشتی بە شەڕێکی نیوەچڵ راستترە. کاتێ کێشەی شەڕو ئاشتی لەئارادا نەمێنێ, ئەگەر کۆتایی بەو هەلومەرجانە بێت کەجەمسەر دروست دەکەن, ئەوکاتە دۆخی سیستەمی چوارەم سەرهەڵدەدات. تەنیا لەو کۆمەلگایانەی یان هیچ بەم هەلومەرجانەی شەڕ تێنەپەڕیون، یاخود لەکۆمەلگاری ئاشتییەکی هەمیشەیی جێگای باسە کە لەمیانەی سیستەمی کۆمەلگای سروشتی کۆمەلگاری سیستەمی شەڕ ـ ئاشتی تێپەرکردووە. لەراستیدا لەکۆمەلگای بەمجۆرەدا جێگای چەمك و هزرەکانی شەڕو ئاشتی نییە. لەو سیستەمەی دیاردەکانی شەڕو ئاشتی بوونیان نەبوو، هزرو بیرۆکەکانیشیان جێگایان نابێت. لەو کاتەی سیستەمەکانی کۆمەلگای دەوڵەتی و پلەداری لەئارادابوون، مێژوو بەشێوەیەکی لاسەنگ لەناو هەرسێ ئاست و سیستەمدا دەژی. هیچ یەکێك لەم ئاستانە بەتەنیا، وەك سیستەمێکی مێژوویی سەربەخۆ کارا نابێت. هەڵبەتە لەدۆخێکی وەهادا مێژووش بوونی نابێت. دەبێ وەك دوو لوتکە بیر لەسیستەمی " بالادەستی رەها " و سیستەمی " یەکسانی و ئازادی رەها " بکەینەوە؛ پێویستە زیاتر وەك ئاستێکی ئایدیالیستی بیرۆکەکان دەرکی پێبکرێت. هەروەکو هاوسەنگی سروشتی ئەوا لەرەوشی هاوسەنگی کۆمەلایەتیشدا هیچ کاتێك دوو لوتکە بەتەواوەتی کارا نابێت. دەشێ موتڵەقەگەرایی تەنیا بەشێوەی بیرۆکە بۆجێگاو ماوەیەکی کورت لەناوەرۆکی سروشت جێگای باس بێت. لەرەوشێکی پێچەوانەدا سیستەمی گەردوون ناتوانێ بەردەوام بێت. کاتێك بیر لەوە بکەینەوە کەچەمکی هاوسەنگی و وێنەدانەوە نەبووایە، ئەوا دەبووایە لەمیانەی لێشاوێکی یەکلایەنە کۆتایی بەگەردوون بهاتبووایە. بەگوێرەی ئەوەی کۆتاییەکی بەمجۆرە بەدینەهاتووە، کەواتە موتڵەقگەرایی تەنیا لەشێوازی فیکردا بوونی هەیە، لەجیهانی دیاردەکاندا پەیرەو ناکرێت. بەردەوامبوونی لێشاوی دوالیزمی دیالەکتیکی نزیك بەرەوشی هاوسەنگی ئینجا لەدۆخی هەژاری یان دەوڵەمەندی بێت، زمان و لۆژیکی سیستەمی گەردوونییە کە کۆمەلگاشی تێدایە.

شێوەی پەسندکراو و ئالۆزی کۆمەلگاو کۆمەلە هەمەرەنگەکان رەوشی " ئاشتی و ئارامی" یە کەدۆخێکی نیو شەڕ ـ ئاشتی یە. تەواوی گەلان و هێزەکانی دەسەلات ـ شەڕ بۆ ئەوەی ئەم رەوشە بەلای خۆیاندا بشکێننەوەو پێگەی سیاسی، کۆمەلایەتی، ئابووری، یاسایی، هونەری و فیکری بۆخۆیان بەدەست بێنێن بەردەوام لەناو تێکۆشانێکی ئایدیۆلۆژی ـ کرداریدا دەبن. شەڕ هەستیارترین و توندترین دۆخی ئەم قۆناخەیە. لەبنەڕەتدا هێزی دەسەلات ـ شەڕ دەسەپێنێ. چونکە هۆکاری هەبوونی لەم رێگایەوە دەستبەسەرداگرتنی توانستەکانی گەلە. هەرچی گەل ـ چینەکانن، بۆ ئەوەی بژین بەناچاری لەرێگای شەڕی بەرخودان و لەپێناو پاراستنی هەبوونی خۆیان وەلامی ئەو داسەپاندنە تالانکاریانە دەدەنەوە. شەڕ بژاری گەلان نییە، ئەو ناچارییە یە کە بۆ پاراستنی هەبوون و کەرامەت ئاستی ژیانی ئازاد پێویستە.

کاتێك لەسیستەمە مێژووییەکان لەرەوشی دیموکراسی ورد دەبینەوە، ئەوا رامانێك لەم چوارچێوەیەدا بێت تا بلێی ئەزموونبەخش دەبێت. ئەو چەمکە مێژووییانەی تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان زالن لەبنەرەتدا لەمیانەی جیهانبینی (پارادیگما)ی گروپی دەسەلات ـ شەڕ رێکخراوە. لەپێناو تالانکاری و دەسکەوت (غەنیمەت) زۆر بەسانایی ناوی شەڕی پیرۆزییان لەپەلامارەکانی کۆمەلکوژی ناوە. چەمکی ئەو خوداوەندانە پێشخراوە کە فەرمانی شەڕ دەدەن. شەڕەکان وەك دیاردەی مەزن و بەرەونەق باسیانکراوە. هەلوێستێك تارۆژگاری ئەمرۆمان هاتووە ئەوەیە لەرێگای شەڕەوە هەمموو شتێکت بۆ رەوا دەبێت. بەکورتی ئەو مافەی بەشەڕ بەدەستهێنراوە، بووە بەدەسکەوت. بەجێکردنی شەڕ لەبناخەی چەمکی ماف و یاسا

شێوازی زاڵی هەبوونی دەوڵەتەکانە. لۆژیکی "مافت بەئەندازەی شەڕکردنەکەتە "بووە بە پێڕەوێکی گشتی. ئەو زهنییەتەی دەڵێ ئەوەی لەدوای ماف بگەڕێ دەبێ بزانێ چۆن شەڕبکات، گەوهەری " فەلسەفەی شەڕ" ە. لەتەواوی ڕێبازە ئایینی و فەلسەفی و هونەریەکاندا بەرزکردنەوەی ئەم زهنییەتە، بەو رادەیە دەگات کە مەیل و چالاکی گروپێکی تالانکار بەتایبەتمەندێتی " پیرۆزترین چالاکی" ناوزەد بکات. قارەمانێتی و پیرۆزی کراوە بەئەدرەسی ئەو چالاکییەی داگیرکردن. ئەو شەڕانەی بەمشێوەیە شکۆدارکراون و بوونەتە چەمکێکی زاڵ وەك ئامرازی چارەسەرکردنی تەواوی گیروگرفتەکانی کۆمەڵگا بیری لێکراوەتەوە. چەمکێکی ئەخلاق کۆمەڵگای بەستۆتەوە هەروەکو بڵێی لەدەرەوەی شەڕ ڕێگای دیکەی چارەسەرکردنی کێشەکان نییە، ئەگەر هەشبێت پەسندناکرێت. ئەنجام، پیرۆزترین ئامرازی چارەسەری توندوتیژییە. تاوەکو ئەم چەمکەی مێژوو پووچەڵنەکرێتەوە، ئەوا زەحمەتە دیاردەی کۆمەڵگا بەشێوەیەکی واقیعیانە هەڵسەنگێنرێ و بەبێ شەڕ بەدوای چارەسەرکردنیاندا بگەڕێیت. تەنانەت کاتێك ئاشتیخوازانەترین ئایدیۆلۆژیاش نەیتوانیوە خۆی لەشەڕ بپارێزێ هێزی ئەم زهنییەتە نیشاندەدات. بەڵگەیەکی دیکەی سەلمێنەری ئەم راستییەش ئەوەیە کە، ئایینە گەورەکان و بزووتنەوە هاوچەرخەکانی چینایەتی و گەلان کە بەردەوام ئاشتیخوازبوون نەیانتوانیوە خۆیان بپارێزن و بەشێوازی دەمامکی دەسەڵات ـ جەنگاوەری شەڕ پەیڕەو نەکەن.

بەکاریگەرترین ڕێگای خۆڕاگرتن و لەهەق دەرکەوتنی زهنییەتی دەسەڵات ــ شەڕ گەیشتنە بەشێوازی راوەستەی دیموکراسییانە. لەمیانەی ئەم گوزارەوە باس لەچەمکی " چاو بەچاو " ی وەڵامدانەوە ناکەین. هەرچەندە پێگەو پایەی دیموکراسی خاوەنی سیستەمێکی پاراستن بێت کە توندوتیژیش لەخۆوە بگرێت، لەبنەڕەتدا لەمیانەی شەڕکردن لەگەڵ زهنییەتی دەسەڵاتداردا کولتووری خۆبونیادنانی ئازادانە بەدەستدێنێ. باس لەهەڵوێستێك دەکەین کەشەڕەکانی پاراستن و بەرخودانی تێپەڕکردووە. ئەمەش قاڵبوونەوەو پراکتیزەکردنی چەمکێکی ژیانە کە لەبناخەدا لەناوەندی دەوڵەتدا چڕ نەبۆتەوە. چاوەڕوانیکردنی هەمووشتێك لەدەوڵەت، هەروەکو ئەوە وایە بەدوای دەمامکی دەسەڵاتی ــ شەڕەوە بێت. لەوانەیە پارووێکت بۆ فڕێبدرێت، بەڵام ئەمە بۆ راوکردنتە. ڕۆشنکردنەوەی خەڵك سەبارەت بەبابەتەکانی دەوڵەت یەکەمین هەنگاوی دیموکراسییە. هەنگاوەکانی دواتر ڕێکخستنی دیموکراتییانەی بەرفراوان و چالاکییە سڤیلەکان (مەدەنییەکان)ە. شەڕەکانی پاراستنی دیموکراتییانە تەنیا لەرەوشێکی وەهادا ببێتە ناچاری دەبێتە رۆژەڤ. بەبێ هاویشتنی هەنگاوە یەکەمینەکان، هەروەکو زۆرجار نموونەکەی لەمێژوو بینراوە شەڕکردن بەبوون بەئامرازی شەڕی تالان و زەوتکردن ئەنجامگیر دەبێ.

قۆناخی پێشکەوتنی هەبوونی دیموکراتییانە لەمێژوودا یەکێك لەئامانجە سەرەکییەکانی شیکردنەوەکانمانە. دەشێ تێکۆشانێکی راستی دیموکراسییانە لەمیانەی چەمکێکی راستی مێژوو بەدیبێت.

ئەو هەبوونە کۆمەڵایەتییەی تاوەکو نموونەی سۆمەر هەوڵی پێناسەکردنیمان دابوو ئاماژەمان بەوە کردبوو کە لەئەنجامی بەناویەکداچوونی دیاردەکانی دەوڵەت، شار، چینایەتی و پلەداری بەکارەکتەرێکی ناکۆك گەیشتووە. ئەمە لەئابووری تاوەکو زهنییەت و دامەزراوەکانی کۆمەڵگایەکی جیاوازە. حزبێك دەرکەوتووە کەبووە بە ئامرازێکی دەوڵەت و بەردەوام لەرێگای توندوتیژی و شەڕەوە سیستەم ئاوا دەکات و پێشیدەخات. دەستبەسەرداگرتنی دەوڵەمەندێتییە کەڵەکەبووەکانی ناوخۆو دەرەوەی کردووە بەهونەرێکی سەرەکی سیاسەت. هەروەها لەرێگای داهێنانی زهنییەت و ئەدەبیاتێك (ئەدەبیاتێکی میتۆلۆژی) کەشەڕ پیرۆز دەکات، باوەڕهێنانی تەواوی توێژە پەیوەندیدارەکانی کۆمەڵگایان بەبنەماگرتووە کە ئەمە سیستەمێکی ئیلاهییەو هەتا هەتایی بەمجۆرە دەبێت. ئەو سیستەمەی تاساڵانی 4000 ــ 2000 ی پێش زایین بەرەوشی سادەیی خۆی بەرێوە دەچوو، ئیتر دەبینین کەناڕەزایی و بەرخودانەکان سەریانهەڵدەدا. سەرەتا ئەنجوومەنی شارەکان کە لەڕیش سپییەکانی هۆز پێکدەهات بەسووربوونەوە هەڵوێستی دیموکراتییانەیان نیشاندەدا. بەرامبەر بەدەمامکی راهیب ــ

پادشا ـ سەربازی وەها بەسانایی دەستیان لەشێوازی دیموکراتییانە بەرنەداوە. بۆ ماوەیەکی درێژ سیستەمێکی تێکەڵەی نێو دەوڵەت ـ دیموکراسییان بەیەکەوە بەڕێوەبردووە. بەپێی کات لەدەرەوە, هەروەکو داستانی گلگامێش، ئەنکیدۆی نزیکترین یارمەتیدەرەکانی لەرێگای ژن قازانج دەکرێت. یەکەمین نموونەی سیخوڕێتی ژن، لەبەکارهێنانی ئەو مرۆڤانەدایە کە لەهۆز دابڕاون یان دابڕێنراون و لەناو ژیانی دەوڵەمەندو لەبارتری شار، لەناو بەڕێوەبەرایەتیدا یان وەك فەرمانبەر سەرباز یاخود وەك کۆیلەیەك بەکار دەهێنرێت. ئەم گۆڕانکارییە هاوسەنگی دەوڵەت ــ دیموکراسی پشتبەستوو بەهۆزەکان لەدژی ئەنجوومەنی شار دەشکێنێتەوە. لەگەڵ پێشکەوتنی ئەم قۆناخە بەیەکەوە پاکتاو دەبن. لەئاواکردنی زۆربەی دەوڵەتە نوێکاندا پێشکەوتنێکی بەمجۆرە بەیدێت.

تێکۆشانی ناوخۆ بەشکستی هێزەکانی دیموکراسی ئەنجامگیربووە. سەرباری ئەمەش هیچ کاتێك ناتوانرێ هاوسەنگی هۆز بەتەواوەتی لەناو دەوڵەتدا پاکتاو بکرێت؛ لەئاستی جیاوازدا هەبوونی خۆی دەپارێزێ. بەرامبەر بەمەش سیستەمی کۆمەڵگای دەوڵەتی (دەوڵەتگەرا) لەدەرەوە دەخرێتە ژێرفشارێکی گەورەوە. جموجۆڵی رەوەندەکان بەرامبەر نیشتەجێبووەکان جێگای باسە. ئەو جولانەوانەی لەئەدەبیاتی گریك ـ رۆمادا بەفراوانی وەك جموجۆڵی بەربەرەکان باسی لێوە دەکرێت، کاتێ لەناو یەکپارچەیی دیالەکتیکی توێژینەوەی لەسەر بکرێت بایەخدارە. لەناو شاردا رەنجی کۆیلە, لەدەرەوەش بازرگانی لاسەنگ و فشار بەردەوام دەوڵەمەندێکی کۆمەڵگای جێنشین زیاد دەبێت. ئەمەش هەروەکو پۆلێنی ئیمپریالیزم ــ وڵاتە دواکەوتووەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمانە. ئەوەی بەشێوەیەکی دڕندانە هێرش دەکات رەوەندەکان نین, بەڵکو خەڵکی شارن (شارستانن). بەداخەوە لەبەرئەوەی شار لەسیستەمی تێگەیشتن و بیرۆکەکانی ئێمەدا زاڵە, ئەو لێهاتوویيە نیشاندەدات خۆی وەك " مەدەنی، شارستانی " ئەوانەی دیکەش وەك" بەربەر، هۆڤ " پێشکەش بکات؛ بەمجۆرە رەوابوونی خۆی بەدەستدێنێ. دەشێ جولانەوەی رەوەندەکان بەرامبەر بەشار لەبزووتنەوەکانی رزگاری نیشتمانی گەلانی رۆژگاری ئەمڕۆمان بچوێنین. لەبەر ئەوەی فۆرمی کۆمەڵگای رەوەندی قۆناخە جیاوازەکانی خێل و نەژادە، لەناوەڕۆکدا دەتوانرێ ئەو بزووتنەوانەی ئافراندوويانە وەك راوەستەو بەرخودانی دیموکراتییانەو شێوازی ئافراندن هەڵسەنگێنرێت. هەڵبەتە پێویستە بەتایبەت لێکۆڵینەوە لەسەر ئەوە بکرێت کە کێ هێرشی کردۆتە سەر ئەویتر. دەوڵەتی شار ــ دواتر ئیمپراتۆریەت ــ کەخاوەن ئامرازەکانی چەوساندنەوەو توندوتیژی بەهێزە، لەبەرئەوەی بەردەوام گەورەبوون و پەلهاویشتن بەبنەما دەگرێت، بەشێوەیەکی بابەتی لەرەوشی پەلاماردان دایە. هەرچی پێگەی ئەتنیکە، دەتوانرێ کارەکتەری پاراستن و بەرخودانی پێ ببەخشرێ. بەواتایەکی دیکە بەرامبەر بەیەکەمین هەوڵەکانی کۆیلەکردن دەتوانرێ وەك قۆناخی یەکەمین بزووتنەوەی ئازادیخوازی هەڵسەنگێنرێ.

کۆمەڵگای سۆمەریش هەر لەسەردەمی ئاوابوونییەوە ـ دامەزرێنەرەکانیش لەهەمان رێگاوە هاتبوون ـ لەباکوورو رۆژهەڵات لەشاخ لەگەڵ هۆزە بەڕەچەڵەك ئاریانییەکان هەرچی لەباشوورو رۆژئاوایە لەگەڵ هۆزە ئامۆریتەکانی بیابان ــ دواتر عەرەبەکان رووبەڕووی یەکتربوونەوە. دروستکردنی شوراو قەڵا لەدەوروبەری شارەکاندا لەم سەردەمەدا دەست پێدەکات. شەپۆلی هێرش ــ دژە هێرشی نەپساوەیەو سەدان ساڵ بەردەوام بووە. لەئەنجامی ئەم دوالیزمە دیالەکتیکییە گەورەو یەکەمینەی مێژووو هێزی ئەتنیکە بەکاریگەرەکان و شارستانییەتە پێشکەوتووەکان سەریهەڵدا. ئەو دوالیزمە سەرنجڕاکێشەی تاکو ئێستا لەنموونەی بەرجەستەی ئێراقدا بەردەوامە کە تێیدا لەدایکبووە، دەبینین کە لە 10000 ی پ. ز لەیەکەمین جیابوونەوەی ئەتنیکی و زمانی شۆڕش و کۆمەڵگای کشتوکاڵی کولتووری رۆژهەڵاتی ناوین شێوەیان گرتووە. لەپێدراوەکاندا دەبینرێ کەبەرەو ساڵانی 4000 ی پ. ز ئەتنیك بەشێوەیەکی باش تویکڵی گرت و لەناو کولتوورو زمانی تایبەتی خۆیدا رەنگیداوەتەوە. دەتوانین مەزندەی ئەوە بکەین کە بەر لەشۆڕشی شار بزووتنەوە ئەتنیکییەکان لەپێناو سەرچاوەکانی بەرد، کانزاو زەوی گونجاوتر لەناو کێشمەکێش و ململانێدا بووبن. لەکاتێکدا گروپی کولتووری ئاریانی (ئاری) لەناوچەی زنجیرە

چیای زاگرۆس ـ تۆڕۆس خاوەن رۆڵ دەبێ، لەناوچەی عەرەبستانیش گروپی کولتووری سمیتیك (سامی) دەردەكەوێتە پێش. بەیەكگەیشتنی ئەم دوو كولتوورەی شاخ و بیابان سیستەمێكی تێكەڵە پێكدێت. دەشێ سۆمەرییەكان، عیبرانییەكان و هیكسۆسەكان وەك نموونەی ئەم كولتووره تێكەڵە نیشانبدرێ. هەرچی كوردو عەرەبەكانن وەك گەلی بنچینەیی كولتووری ئاریانی و سامی تا رۆژگاری ئەمرۆمان درێژەیان بەهەبوونی خۆیانداوە. چەندین گروپی كولتووری دیكەی دواتر هاتوون لەناو ئەم دوو گروپە سەرەكییەدا دووچاری توانەوە هاتوون. ئەو هێزانەی ئەمرۆش لە ئێراق لەناو پەیوەندی و ناكۆكی كورد ــ عەرەبدا دەژین و نوێنەرایەتی دەكەن، لەوانەیە هەروەكو ئاواكردنی یەكەم دەوڵەتی سۆمەرییەكان هەوڵبدەن دەوڵەتێكی دوو كولتووری ئاوابكەن.

سۆمەرییەكان زۆر باش گروپە سامییەكانی باشوورو رۆژئاوا و ئاریانییەكانی باكوورو رۆژهەڵات دەناسن. لە میتۆلۆژیاكانیاندا بەچڕی هەبوونی ئەم دوو گروپە دەبینن. بەشێوەیەكی ناراستەوخۆ توانای ناسینی كولتوورەكانیانمان بەدەستدێ. ئەو قۆناخەی تاسەردەمی داگیركردنی بابل لەسالانی 330 ی پ. ز لەلایەن ئەسكەندەری مەزنەوە، بەشێوەیەكی بنەڕەتی لەمیانەی بڵاوبوونەوەی شارستانییەتی شاری سۆمەرییەكان لەناو ئەم دوو گروپە كولتووریە تێپەڕدەبێت. بەواتایەكی دیكە مێژوو لەئەنجامی پێشكەوتنی دیالەكتیكیانەی نێوان جێنشین و رەوەندەكانی هەردوو گروپی كولتووری شێوە دەگرێت. داهێنانەكان شەپۆل بەشەپۆل لەزەریای ئەتڵەسییەوە تاوەكو زەریای گەورە، لەچۆلەوانی بیابانی گەورەوە تاوەكو بنارەكانی سیبریا بڵاودەبێتەوە. چەندە شارستانییەتی شار بەرەو دەرەوە بنێردرێت، بەو ئەندازەیەش كۆمەڵگای كۆچەری (رەوەندی) بەرەو ناوەوەدێت. هەربۆیە ئەو هەڵوێستە مێژووییانەی تەنیا پشت بەو نیشتەجێیانەی شار دەبەستێ كە رەوەندەكان بەركەنار دەكەن، كەموكورتی مەزن لەخۆوە دەگرێت. لەقۆناخی شارسانییەتی جێنشیندا چەندە دەوڵەت گەشە بكات، راوەستەی دیموكراتییانەش گرێدراو بەمەوە پێشدەكەوێت.

هەروەكو لەبەشەكانی داهاتوودا بەرفراوانتر تاوتوێی دەكەین، بەشێوەیەكی راست تێگەیشتنی پەیوەندی نێوان دیاردەكانی دیموكراسی و دەوڵەت بایەخێكی مەزنی هەیە. دیموكراسی شێوازی بەڕێوەبەرایەتی ئەو گەلەیە كەنەبووە بەدەوڵەت و دژی بەدەوڵەتبوون رادەوستێ. پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەت هەیە، بەڵام لەم پەیوەندییەدا ناتوێتەوەو نكوڵی لەخۆی ناكات. سنوورەكانی نێوان دەوڵەت و دیموكراسی لەسەرووی هەستیارترین گرفتە سیاسییەكانەوە دێت. پێناسەكردنی ئەو خاڵەی ناوین كە نەدیموكراسی دەوڵەت بەركەنار بكات نەدەوڵەت دیموكراسی بەلاوەبنێت بناخەی " ئاشتی و ئارامی" یە. یەكێكیان بەتەواوی نكوڵی لەئەوەی دیكە بكات بەواتای شەڕدێت. هەربۆیە چەندین چەمكی هاوچەرخ كەدیموكراسی وەك بەردەوامی دەوڵەت و دەمامكەكەی دەبینن تادواڕادە بەدوای هەڵسەنگاندن و دەستنیشانكردنێكی چەوتەوە دەڕۆن.

لەدۆخێكی وەهادا ئەو وەڵامەی بدرێتەوە پرسی دیموكراسی لەكوێیە، دەتوانرێ بگووترێ بەرلەهەموو شتێك لەو راوەستەو بەرخودانەی ئەتنیك دایە كە بۆ ئەوەی تایبەتمەندێتییە كۆمەڵكاریەكان و ئازادی خۆی بەرامبەر دەوڵەت و شارستانییەتی شار بپارێزی نیشانیدەدات. دەستنیشاننەكردنی ئەم راستییە لەلایەن سۆسیۆلۆژەكان، پەیوەندی خۆی بەرەوشی هەزاران جار جۆشدانیان لەناو ئەم كولتوورەی شاردا هەیە. زیاترلەوەی مەزەندە دەكرێ زاناكان راهیبی هاوچەرخی سەردەمی بۆرژوازین. هەروەكو گرێدان بە پەرتووكی پیرۆز وابەستەی بەهاكانی شارن.

بەو مەرجەی شێوازی هەبوونی ئەتنیك تێكشكابێ، دەتوانین وەك نیودیموكراسییەتێك پێناسەی بكەین. هەروەها پێویستە سیفەتی سەرەتاییشی بخەینە سەر. ئەتنیك دیموكراسی سەرەتاییە. لەناوەوە گرێدان بەنرخ و بەهاكانی كۆمەڵكاری، لەدەرەوەش بەرخودان بەرامبەر دەوڵەتی ستەمكار گروپەكانی گەل لەناوەخۆیاندا ناچاری پەیوەندی ئازادو یەكسان دەكات. ئەم كارەكتەرەی بەرخودان نەبێت، بەرخودان هیچ واتایەكی نامێنێ. كاتێك لەرۆژهەڵاتی ناوین دیموكراسی پێناسە دەكرێت

هەڵەیـەکی گـەورە ئـەنجام دەدرێـت وا دیاردەکرێـت کـە ئـەتنیك کۆسـپی بـەردەم دیموکراسـییە. دیموکراسـی شارسـتانییەتی ڕۆژئاوای پشتئەستوور بەتاك بەتەنیا ناتوانێ پێناسەی دیموکراسی دیاربکات. تـەنیا گرێـدانی دیموکراسـی بـەتاك، بەئەنـدازەی گرێدانی بەدەوڵەت هەڵەی گەورە لەخۆوە دەگرێت. هەبوونی کۆمەڵەو تـاکی ئـازاد لـەناو کۆمـەڵگادا پێویـستییەکی دیموکراسـی زۆرینەیە. چەمکی تاك و کۆمەڵی چۆنیەك نە بۆ دیموکراسی پێویستییەکە، نەگەرەنتیشە. پاراستنی جیاوازیـەکان و گەیـشتنی بەتوخمی نوێ، جیاکاری دیموکراسی و تایبەتمەندێتی بنچینەییەتی.

هەڵـسەنگاندنی کۆمەڵـە ئەتنیکییـەکان وەك جیاکارییـەکی دیموکراسـی، لەمیانـەی پراکتیزەکردنێکـی ڕاسـتەقینە دەبێـت. ئەگەر بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت بەگوێرەی پێوانەکانی خۆی ڕاوکردنی دەنگەکان وەك پێشبڕکێی دیموکراتییانـە دیاربکات، ئـەو سیـستەمەی دەردەکەوێتـەروو دیماگۆژییەتـە. بینـینی دەوڵەمەنـدێتی ئـەتنیکی وەك شـانس و تواناکـاری دیموکراسـی گـرنگ و بایەخدارە. لەوانەیە لەتاکی ئازاد زیاتر خزمەت بە دیموکراسی بکات.

ئاوێتـەکردنی ڕاوەسـتەی کولتـووری بـەرخودانی هـەزاران سـاڵەی گـەلان لەگـەڵ پێوانـە هاوچـەرخەکانی دیمـوکراتی کـاری ڕۆژانـەیی سیاسـەتمەدارە دیموکراسیخوازەکانە. وەك کۆسـپێك تەماشـاکردنی توانـستی دیموکراسـییانەی کۆمـەڵگای ڕۆژهـەڵاتی ناوین هەڵەیە.

لەبەرئـەوەی لـەئاواکردنی دەوڵـەت هێـزی دەسـەڵات ــ شـەڕ ڕۆڵـی سەرکێـشی دەبـینێ, سـەرەتا خۆیـان دەکـەن بەپادشـای ــ خوداوەندو ئیمپراتۆر. چەندەی چڕ دەبێتەوە فاکتەری گەل (دەمۆس) قورسایی خۆی لەدەستدەدات. لەمێـژوودا " سـەرجۆن " ی بەریـشە سـامی کۆمـەڵگای سـۆمەری وەك یەکـەمین ئیمپراتـۆر باسـی لێوەدەکرێـت. هـەروەها ئامـاژە بـەوەش دەکرێـت کـە بەئارەزوویکی گەورەوە تاوەکو ناوەوەی ناوچە شاخاوییەکان حوکمی کردووە. هەر بە وێنـەی سـەمبۆلێکی وابەسـتەیی لـە نێـو بێدەنگییـەکی مـەرگ ئاسـادا. ئـەو قۆناخـەی لەسـاڵانی 1350 ی پ. ز دەسـتیپێکردووە ئـەو ڕێگایـە خۆشـدەکات کەتـەواوی ئیمپراتۆرەکـان پـەیڕەوی دەکـەن. هەرئیمپراتۆریـەتێکی نـوێ سـنووری پێـشوو فـراوانتر دەکـات. ئەگـەر گلگـامێش سـەمبۆلی دەسـتپێکردنی پادشـایەتی بێـت، ئـەوا "سـەرجۆن " یـش بـاوکی ئیمپراتۆرەکانـە. لـەدۆخێکی وەهـادا هەڵـسەنگاندنی هـەر ڕاوەسـتەیەکی دژ بـەو قۆناخـەی کـە بەرامبـەر سیـستەمی کۆمـەڵکاری گـەورە دەبـوو و بینـینی وەك توانـستی دیموکراتییانـە لـەجێگای خۆیدایـە. تەنانـەت خـۆڕاگرتنی گروپـە ئەتنیکیـەکان بەرامبـەر هـەموو ئاسـتەمی و زەحمەتییـەکان، بەرگـەگرتن و بەرپەرچدانەوەی هەموو جۆرە پەلامارو نەخۆشی و برسێتییەك و, لـەناو قـووڵایی دارسـتان و شـاخ و بیابانـەکان درێـژەدانیان بەژیان و هەبوونی خۆیان، توانستێکی مەزنی دیموکراتییە. ئەم بەرخودانانە نەبووایە کێ دەیتـوانی دەوڵەمەنـدێتی کولتـووری و هەمەڕەنگی لەسەرپێیان بهێڵێتەوە؟.

ئەگەر کۆتەڵی هەزاران ساڵەی ئـەو بەرخودانـە نەبووایـە چۆن دەمـانتوانی هونـەری گـەلان بئـافرێنین؟ چۆن دەمـانتوانی بەهەزاران ئامرازی بەرهەمهێنان و دەزگا کۆمەڵایەتییەکان بخولقێنین، کەرامەت و ئەشقی ئازادی و هاوکاری نێوان مرۆڤـەکان فەراهەم بکەین؟.

کاتێـك لەخانـەدانێتی ئەکەدیـەکان بـەرەو خانەدانـە بەریـشە بـابلی و ئاشـووریەکان دەچـین، هێـزی ئیمپراتۆریـەت زیـاتر دەبێت. ئەوەی دێت هەروەکو بڵێی دەخوازێ ریکۆرد بشکێنێ چەترو ئاستی ملکەچکردنی بەرزترکردۆتەوە. بەشانازییەوە باس لەو شوراو قەڵایانە دەکەن کە لەکەللەی سەری مـرۆڤ ئاوایدەکـەن. تـەواوی ئەوکاتـەی گروپـەکانی گـەلان بەرامبـەر بەپـەلامارە سنوورنەناسەکان لەقووڵایی دارستان، شاخ و بیابانەکاندا بەسەریانبرد گەر لەمێژووی دیموکراسی نەنووسرێ ئەی بـەناوی کێـی بنووسین، یان هیچ باسی نەکەین و بەنەبووی دابنێین؟ ئایا بەمجۆرە دەشێ مێژوو واتادار بێت؟ ئەگـەر واتایـەکیش ببەخـشێ، ئایا لەواتای داگیرکاری و ستەمکاری بەولاوە واتایـەکی دیکـەی دەبێـت؟ ئەگـەر هەوڵبـدەین تێبگـەین کەبـەرخودانێکی بـچووکی

خێڵێك تا چ ڕادەیەك بۆتە بابەتی داستانەكان، ئەوا زیاتر دەرك بەبەهای دیموكراتییانەی ئەتنیك و ڕەوەندەكان دەكەین. بەگوێرەی گوایە ئەو تاكە ئازادەی كەسەرمایەداری ناوەڕۆكەكەی پووچكردووە ئەگەر مرۆڤی ئەتنیكەكان بەشێوەیەكی ڕاست هەڵسەنگێنرێ، دەبینرێ كە دوو ئەوەندە زیاتر هێزی دیموكراتییانە پێكدێنێت. توانستی ڕاستەقینەی دیموكراسی لەكۆمەڵگاكانی ڕۆژهەڵاتدایە. دەبێ باش بزانرێ كۆمەڵگای ڕۆژئاوا كەتاوەكو دوایی كولتووری دەسەڵات ـ شەڕی هەرسكردووەو توانستی دیموكراسییانەی زۆر سنوردارە. ئەو دیموكراسییەی لەئاراشدایە بەهەزارو یەك كۆتوبەند گرێدراوە، دیموكراسییەتێكە دەمامكی دەوڵەتەو قورسایی چینی بۆرژوای بەسەردا زاڵە. بەهۆی ئەو تیۆری و شێوازانەی ژیان كە بۆ بچووككردنەوەی كۆمەڵگاكانی خۆمان دروستكرابوون، ئەو توانستە مەزنەی مرۆڤەكانی خۆمانی نەبینی كەلەبواری دیموكراسییەوە هەیەتی.

هۆریەكان كە گەلی ڕەسەنی بەریشە ئارین و گەلی خۆمانن، بەتایبەت لەمیانەی هەڵسەنگاندنی سۆمەریەكان وەك كورتیەكان (كور = شاخ، "تی" پاشگری گرێدانە) و گەلی شاخی، هەڵسەنگێنراوە. لەسەردەمی لەدایكبوونی دەوڵەتی سۆمەریەكانەوە لەناو بەرخودانـدا بوون. گۆتییەكان، كاسییەكان و نایریەكان ئەو ناوە جیاوازانەن كەلێیان نراوە. دەوڵەتۆكەكانی ئۆرارتوو و میدیا ڕەسەنترین بەرخودانەكانی مێژوو بەرامبەر ئیمپراتۆرەكانی ئاشوور نیشاندەدەن. لەدوای شەڕێكی 300 ساڵەی بەرخودان تێكشكانی بێڕەحمترین ئیمپراتۆریەتی مێژوو، گەلی ئاشووریشی لەناودا، شوێنپەنجەی جەژنی لەناو تەواوی گەلان بەجێهێشتووە. ئەم بەرخودانە لەسەر كولتووری دیموكراسی نەنووسرێ ئەی لەكوێ بنووسرێ؟ لەراستییدا ئەو میدیایەی لەچیرۆكی "ئیسەوس "ی ئەسینایی باسی دەكرێت بیرەوەری ئەم بەرخودانەیە. تەنانەت دیموكراسییەتی ئەسینا كەزۆر لە مێژوودا پەسنی دەدرێت و بەشان و باڵیدا هەڵدەدرێت. لەخۆڕا نییە باسی میدیای بێبەخت دەكات. لەكاتێكدا ئەسینایییەكان لەناو دیموكراسیدا دەژیان، نزیكبوونەوە لەمیدیاییەكانیان بەگەرەنتی سەرەكی دیموكراسی دەبینی. لەمێژووی هیردۆدۆت ئەو بابەتەی هەرەزێدە باسی دەكرێت میدییەكانن.

پێویستە بەئاشكرا ئاماژە بەوە بكەین كە كاتێك میدییەكان نەریتی مەزنی بەرخودانی گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوینیان بۆ ئەسینا گواستەوە لەوانەیە گەورەترین بەشداری و كۆمەكی بە مێژووی دیموكراسی كردبێت, كە تائێستاش هەستی پێنەكراوە. لەخۆڕا نییە ئەسكەندەری مەزن خزمایەتی لەگەڵ گەلانی میدیادا دەكات. زۆر باش ئاگاداری شوێنگەكەیەتی لەمێژووی هێلین و وەك نموونەیەك سوودی لێ دەبینێ. ئەسكەندەر ئیمپراتۆرێكە, وەكو باگوردان (ڕۆڵا) شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی شێلاوە. بەڵام ئەو كولتوورە كاریگەری تێدەكات و دەزانێ بەشانازیكردن پێیەوە بژی. ئەو سەنتێزە كولتوورییەی ڕۆژهەڵات ــ ڕۆژئاوا كە ئاوێتەیكردن، كۆمەكی بەمەسیحییەت كرد، ئایینی مەسیحیش گەورەترین كۆمەك پێشكەش بەشارستانییەتی ڕۆژئاوا كرد. كەواتە ڕێڕەوەكانی ئیمپراتۆریەت تەنیا خزمەت بەهێزی دەسەڵات ـ شەڕ ناكات. كولتووری بەرخودانی گەلانیش لەم ڕێڕەوە دزەدەكات و مێژووی دیموكراسی گەلان دەنووسێ.

لەوانەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما بەهێزترین و بەهێزكەری هەرەگەورەی كولتووری دەسەڵات ــ شەڕ (جەنگاوەری) بێت. دڕندەترین ئیمپراتۆرەكانی بەرهەمهێناوە. سامناكترین شێوەكانی كوشتنی (لەخاچدان، فڕێدانە پێش شێر) مرۆڤایەتی سیستەماتیك كردووە. بەڵام دیسان ئەوەی بەرامبەر ئەم هێزەش گەورەترین بزووتنەوەی مرۆڤایەتی و هەژارانی دەستپێكرد ئایا كولتووری دیموكراتییانەی ڕۆژهەڵات نەبوو؟ ئایا خودی حەزرەتی عیسا نابێتە ئەڵقەی سفرو دەستپێكەری لەدایكبوونی نەریتی پێخەمبەرایەتی؟ ئەگەر ئایینی مەسیحی پشتبەستوو بەباوەڕی عیسا نەبووایە چۆن كولتوورو دیموكراسییەتی ڕۆژئاوا سەریهەڵدەدا؟ لە ڕەوشێكی وەهادا هەڵسەنگاندنی نەریتی پێخەمبەرایەتی لەبواری دیموكراسییەوە ناتوانرێ پشتگوێ بخرێت.

لەكاتێكدا كۆمەڵگای ڕەوەندی بەرامبەر هێزی دەسەڵات ــ شەڕ لەدەرەوە وەك هێزی پاراستن و هێرش ڕۆڵ دەبینن، پێخەمبەرایەتی ئەو هێزەی دەتوانین بەنەریتی ڕاهیبێتی بەناوی بكەین، لەناوەوە وەك ڕەوتێك خزمەتی لێگەڕینی

بەرخودانی هەزاران دەکات. ئەم بزووتنەوەیە لایەنی چینایەتی هەیە. ئەو نەریتەی سەرچاوەی خۆی لەکولتووری رۆژهەلاتی ناوین وەردەگرێت، هەروەکو یەکەمینەکانی دیکە, شیمانە دەکرێت لەکۆمەلگای سۆمەرەوە دەرکەوتبێت. لەکولتووری سۆمەریدا شوێنپەنجەی یەکەمین پێخەمبەر (ئادەم) و بەهەشتەکەی دەبینرێ. شیمانە دەکرێ نەگونجان و گوێرایەڵینەکردنی تەواوی ئادەم و حەوا بۆ سیستەمی کۆیلایەتی، هۆکاری دەرکردنیان بێت لەبەهەشت (شێوازی ژیانی کۆمەلگای بالای دەوڵەت). رەنگە چیرۆکێکی نیو میتۆلۆژی بێ سەبارەت بەئازادی تاك. بەگوێرەی ئەوەی ناکۆکییەکانیان لەگەڵ سیستەم ئاشکرایە، ئەوا دەرکردنیان شانبەشان رێگا لەپێش بەرخودانێکی زنجیرە ئاسا دەکاتەوە. پێگەکەیان نزیك بەجووتیارە ئازادو خاوەن پیشەکانە.

دەشێ هەڵسەنگاندنی چینی ناوینی بەکۆیلەنەبووی شار وەکو بناخەی چینایەتی ئەو دابونەریتە رۆشنکەرەوە بێت. دووەمین پێخەمبەری گەورە "نوح" بەدروستکردنی کەشتییەکەی دەسەلمێنێ کەخاوەن پیشەیە. دروستکردنی کەشتییەك کە بەو شێوەیە لەناو لافاو فریایان بکەوێت، هێزی پیشەکارییەکەی نیشاندەدات. گووتەی خوداوەند ئەنکی " لافاو دێت، کەشتییەکەت بەگوێرەی دەستپێکردنی ژیانێکی نوێ دروست بکە" و ئەنجامدانی بەبێ ئاگاداری خوداوەندەکانی دیکە، زیاتر کارەکتەرە چینایەتییەکەی روووندەکاتەوە. شتێکی ئاساییە کە ئەو توێژە جیاوازانەی پەیوەندییەکی گرنگیان لەگەڵ توێژی بەرێوەبەرایەتیدا هەیە، ئەو پیشەکارانەی وەکو کەشتییەوان بن کە گرنگییەکی ژیانیان هەیە. مەزندە دەکرێ چیرۆکی لافاو هاوشێوەی مەسەلەی ئادەم دوای بزووتنەوەی یاخبوون بەرامبەر بەخوداوەندەکان گوزارشت لەکۆچکردن بۆ ناوچەی دیکە بکات. باس لەوە دەکرێت کە کەشتی نوح لەشاخی "جودی" گیرساوەتەوە. وشەی جودی بەزمانی کوردی واتە "جێگای دیت". ئەمەش کۆچێکمان دێنێتە یاد کە بەئامانجی نیشتەجێبوون لەخوارووی میزۆپۆتامیا بۆ سەرووی میزۆپۆتامیا ئەنجامدراوە.

سیستەمی شاری سۆمەری لەسالانی 2000 ی پ. ز لەکەنارەکانی سەرەوەی دیجلە ــ فورات بەشێوەیەکی بەرفراوان ئاواکراون. یەکێك لەناوەندە گرنگەکان "ئورفا"یە. ئورفا وەك شارە گرنگەکانی سۆمەر ناولێنانێکی لەجۆری "ئور" و ئورگە. بەواتای جێنشینی تەپۆلکەکانیش دێت. ئورفاو ناوچەکانی دەوروبەری (وەك حەڕان) وەك ناوەندی نەریتی پێخەمبەرایەتی وایە. وەها دەرکی پێدەکرێت ئەوانەی لەخوارووی میزۆپۆتامیا نارەحەت دەبن، یاخی دەبن، بەدوای داد و ئازادی دەگەڕێن، لەناوەندی ئورفاو دەوروبەری نیشتەجێ دەبن. لەمێژوودا چەندین ناوەندی کولتووری بەمجۆرە هەیە. بابل، ئەسکەندەریەو ئەنتالیا ئەو ناوەندانەن کە دواتر دەرکەوتوون. لەسەردەمی سەرمایەداری ناوەند لەندەن و پاریسە لەرۆژگاری ئەمرۆشماندا نیویۆرکە. شیمانە دەکرێت ئورفا ناوەندی رۆشنگەریەکی بەمجۆرە بێت, کەلەسالانی 2000 ی پ. ز دەستپێکردووە. یەکەمین نموونەی پەرستگای تەپەی دیبەگلی کە لەسالانی 11000 ی پ. ز ئاواکراوە (دەستنیشانکراوە) لە شوێنێکی نزیك بەشاری ئورفایە. ئەو نەریتەی ئێستاش لەم ناوچەیەدا زاڵە بەگوێرەی ئاراستە مێژووییەکەیەتی. دیسان لەسالانی 300 ی پێش زایین بۆ کولتووری هێلین و سابییەکان، لەسالانی 100 ی زایینی رۆڵی ناوەندی ئایینی مەسیحی بینیوە. بۆتە لانکەی چەندین پێخەمبەر, لەسەرووی هەمووشیانەوە حەزرەتی ئەیوب و ئیدریس کە تائێستا کاریگەری باوەڕییەکەیان ماوە. بۆیە سەبارەت بە ئورفا گوزارەی شاری پێخەمبەران راستە.

چیرۆکی پێهەلگرتنی حەزرەتی ئیبراهیم رۆشنکەرەوەترە, کەشیمانە دەکرێت لەسالانی 1700 ی پ. ز روویداوە. شکاندنی بتەکانی پەنتائۆنی نەمروود ــ پادشا خوداوەندە کانی بابل ــ ئاشوور ــ ئەوە نیشاندەدات کە شۆڕشی زهنی ئەنجامداوە. رووبەڕووبونەوەی سزایەکی قورسی وەك ئاگرتێبەردان، شوێنگەی یاخیبوون وەك نەریتێکی مێژوویی نیشاندەدات. بەهۆی ئەم بزووتنەوەیە ناچاری کۆچکردن دەبێ بەرەو ولاتی کەنعان (ئیسرائیل ـ لوبنانی رۆژگاری ئەمرۆمان). لەولاتی کەنعاندا لەناو ژیانێکی قورس و سەختدا کۆمەك و بەشداریەکی گرنگ بە نەریتی پێخەمبەرایەتی دەکات. لەهەنگاونان بۆ دانانی بناخەی ئایینی تاکخودایی داتاشراو و واتایی بوێرانەیەو دەرکی پێدەکات. بەر لەحەزرەتی ئیبراهیم حەزرەتی ئەیوبیش کارەکتەرێکی

مێژوویی گرنگی نەریتی بەرخودانە. بۆیەکەمین جار بەرامبەر بەنەمرود ئەو نارەزاییە مێژووییە نیشاندەدات کە بەواتای " مرۆڤەکان ئازار دەدەیت" دێت. ئەمجۆرە هەڵسوکەوتەی بەرامبەر پادشا ــ خوداوەندەکان نیشاندەدرێ یەکەمینەو پێویستی بەبوێرییەکی مەزن هەیە. وەڵامەکەی داڕزینە لەناو زیندان. جەستەی کرمی دەبێت. سەرباری ئەمەش وەك نموونەی هۆگری و سەبر خۆڕاگری دەکات. ئەم کردارەی ڕێگا لەپێش بەپێخەمبەربوونی دەکاتەوە.

کاتێك شوێنگەی شۆڕشی تاکخودایی لەشارستانییەتی ڕۆژگاری ئەمرۆماندا بێنینەوە بەرچاو ئەوا باشتر دەرك بەشرۆڤەکردنی نەریتی ئیبراهیمی دەکرێت. تایبەتمەندێتییەکی دیکەی ئەو توانستەیەتی کەتوانیویەتی ببێتە گوزارشتێکی تێکەڵاوی کولتووری ئاری و سامی. ژیانی حەزرەتی ئیبراهیم لەناو کەشی هەردوو کولتووردا ئەو دەرفەتەمان پێدەدات ئەم تایبەتمەندێتییە تێکەڵاوەی وەك سەنتێزێك شرۆڤە بکەین. هەروەکو سەنتێزی ڕۆژئاوا ـ ڕۆژهەڵات، سەنتێزێکە ڕێگا لەپێش خولقکاری دەکاتەوە. سێیەمین تایبەتمەندێتی گرنگی باوەڕی ئیبراهیمی ئەوەیە کە بەرامبەر سیستەمی پادشا ــ خوداوەندەکانی سۆمەری (نەمروود) و میسری (فیرعەون) وەك نوێنەر(پەیامنێر)ی خودا گوزارشت لەیەکەمین دەستڕۆیی مرۆڤ دەکات. لەقۆناخێکی مێژوویی کە بەشێوەیەکی چڕو قورس کۆیلەداری لەئارادا بوو و یەکەمین لێگەڕینەکانی ئازادی دەستپێکردبوو، بژاری حەزرەتی ئیبراهیم پێهەلگرتن و بژارێکی مەزنە. وەڵامدانەوەی لێگەڕینی ڕیشەیی مرۆڤایەتی ڕێگا لەپێش گرنگترین بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی مێژوو دەکاتەوە. هەرچەندە کۆمەڵە ئەتنیکییەکان لەدەرەوە بەرخودانێکی بەهێزیان بەرامبەر بەهەردوو سیستەمی کۆیلەداری نیشاندابێت، بەڵام لەناوەوە بەرخودانێکی خاوەن کارەکتەری کۆمەڵایەتی تایبەتمەندێتی گرنگ و چارەنووسسازە.

سەرهەڵدان بەرامبەر بەباوەڕی پادشا ـ خوداوەند و حوکمکردن بەوەی مرۆڤ نابێت بەخوداوەند شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی گەورەیە. سیستەمی کۆیلەداری لەبەهێزترین کۆڵەکە ئایدیۆلۆژیەکانیدا گورزی بەر دەکەێت.

لەوەی پادشا ـ خوداوەندەکان مرۆڤن، بە واتای دروستکردنی گەورەترین کەلێن و درز دێت لە پێکهاتەی میتۆلۆژی سۆمەر و میسر. ئەمەش شێوەگرتنی ڕێبازی کۆمەڵایەتی ئایینی تاکخودایییە کە بە "تەوحید" بەناو دەکرێت. بەسووربوونەوە دەستپێکردنی یەکەمین ئەڵقەی زنجیرەکە لە ئادەمەوە شتێکی ڕێکەوت نییە. دەسەلمێنێ کە نەریتەکە ڕیشەییە و بەشێوەی زنجیرەیە. پێخەمبەرە گەورەکانیش دەبنە وێستگە مێژووییەکەی. هەروەکو پێخەمبەرەکانی مارکسیزم و لیبرالیزم. ئەو کارەکتەرەی شوێنپەنجەیەکی دیکەی لە نەریتەکەدا کردەوە حەزرەتی موسا بوو. حەزرەتی موسا کە بنەچەی تاوەکو حەزرەتی ئیبراهیم دەستنیشان کراوە کە لە ساڵانی 1300 پ. ز ژیاوە، لە میسر ڕێبەرایەتی یاخیبوونێکی هاوشێوە دەکات و پێهەلگرتنی خۆی ئەنجام دەدات. سەرباری ئەوەی کولتووری میسر دەناسێ، بەڵام لە میانەی بەکارهێنانی هۆزی عیبرانی کە وەك کۆیلە وابەستەی فیرعەون بوو، بە بوێری هەنگاونانی بۆ یاخیبوون نیشاندەدات کە لەسەر بنەمای کۆمەڵایەتی و ئازادی کەسایەتییەکی پێشەنگ بووە. پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ نەریتی هۆزی عیبرانی هەیە. ئایینی هۆزەکە لە ئایینی میسر جیاوازترە. هەرچەندە باسی ئەوە بکرێ کە حەزرەتی موسا کاریگەری باوەڕی تاکخودایی فیرعەون ئەخناتونی لەسەرە، بەڵام نەریتی ئایینی ئیبراهیمی بە بنەما گرتووە. کاروانی بیابانی سینای بەناوبانگ، کاریگەری شاخی گڕکانی و هەڵوێستی بەرامبەر بتپەرستی و گوتەی "دە فەرمان" لە پەرتووکی پیرۆز باسکراوە. لە کەسایەتی هۆزی عیبرانی حەزرەتی موسا تێکۆشانی لە پێناو ئایینی نوێ دەکات. ئەم شەڕە ئایدیۆلۆژییە هۆزی عیبرانی لە پەرتەوازەبوون ڕزگار دەکات و بەو خاکە پیرۆزانەی دەگەیەنێت کە بەڵێنیان پێدراوە. ئەم وشکە باوەڕییە ئایدیۆلۆژییە یەکێك لەهەنگاوە گەورەکانی مێژووی عیبرانییەکانە. کولتووری ئایینی عیبرانی کە تارۆژگاری ئەمرۆمان هەنگاوی هاوشێوەی هاوێشتووە، نموونەی کارتێکردنە سەر زۆرینەی نیشانداوە.

نـاتوانرێ بزووتنـەوەی پێخەمبەرایـەتی بەتـەنیا بکرێتـە مـوڵکی عیبرانییـەکان. لـەرێگای حـەزرەتی عیـسای نزیـك بـە ئارامییەکان و حەزرەتی محەمەدی بەرەگەز عەرەب لەئاستی گەردوونیدا رۆڵ دەبینێ.

بـەکورتی بزووتنـەوەی پێخەمبەرایـەتی کـە بەرامبـەر بـەهێزی دەسـەڵات ــ شـەڕ لـەناوەوە وەك نـەریتێکی کۆمەڵایـەتی پێشدەکەوێت. بەگشتی لەمێـژووی مرۆڤایەتیـدا, بەتایبـەتیش بەرامبـەر بەسیـستەمی کۆمـەڵگای مێـژوویی رۆژهـەڵاتی نـاوین زیـاتر نزیـك بەڕاوەسـتەیەکی دیموکراتییانەیـە. کاتێـك رەهەنـدی هەژاریـشی بخەینـە سـەر ئـەوا نوێنەرایـەتی یەکـەمین بزووتنـەوەی "سۆسـیال دیمـوکراتی" مێژوو دەکـەن. لەراستیـشدا لەمیانـەی ریـشەی چینایەتییان ــ چینی نـاوین, پیـشەکار, بازرگان, جوتیاری ئازادو هۆز لایەنی لێکچووی لەگەڵ بزووتنـەوە سۆسـیال ــ دیموکراتـەکانی ئـەمڕۆ دابنـێین. دەتـوانرێ ئـەم لێکچوونانە زیاتر بەرەو پێش ببردرێت. هەروەکو چۆن سەرباری ئەوەی سۆسیال دیموکراتـەکان سیـستەم کـەمێك نـەرم دەکـەن بـەڵام لـەبوون بـەهێزی یـەدەگی سیـستەم رزگـاری نـەبووە، ئـەوا سۆسـیال دیمـوکراتێتی پێخەمبـەرەکانیش زوو یـان درەنـگ لەخۆگونجاندن لەگەڵ سیستەمی ئاواکراو و بونیادنانی هاوشێوەکانیان رزگاری نەبووە. ئەو سیستەمەی بەرامبەر بەکۆیلایـەتی وشکی چاخی کۆن رێگایـان لەپێشکردەوە دەرەبەگایـەتی چاخی ناوینـە. بێگومـان رێگایـەك کـە گرتوویانەتەبـەر لێگـەڕێنێکی زانـابوون نییـە بـۆ سیـستەمی دەرەبەگایـەتی. ئاشـتی و دادوەری بـۆ تـەواوی مرۆڤایـەتی دەخـوازن. بـەڵام هێـزی گـەورەی وەرچەرخێنەری سیستەمی زاڵ دەوڵەتی خودایی، پێخەمبەرەکانیش وەك خۆیانی لێدەکات.

گوتە تیۆلۆژییەکان لەباسی سۆسیۆلۆژی بێبەشـن. سـەرباری ئـەوەی کۆکردنـەوەی بەرهەمەکانیـشی لەبەردەستدایە، بـەڵام تائێستا راستینەی کۆمەڵایەتی دەزگای پێخەمبەرایەتی روونـنەکردۆتەوە کە هـەرە زێدەکاریگـەری لەسـەر مێـژووی مرۆڤایـەتی کـردووە. تـاوەکو بـە گوزارشـتی زهنییـەت و زمـانی سـەردەمیەوە دەکـات، تـاوەکو بـەگوێرەی ئـەم قۆناخـە وەرنـەگێڕدرێ و نەگونجێدرێ ئەوا لەباسێکی ئەزبـەرەکراوی بێـزاری و کـوێرکردنی هـزر تێپـەڕناکات. لەراسـتیدا پێناسـەکردنی ئـەو دەزگایـەی بەرامبەر بەکۆیلایەتی کلاسیکی سۆمەری و میسری لایـەنی ئـازادی و دادوەری کۆمەڵایـەتی و تـاك بەبنـەما دەگرێت گـرنگ و بایەخـدارە. پێکهاتـەی زهـنی ئـەو سـەردەمەی گـەلان لـەژێر رووخـساری ئایینیـدا تێکۆشـانی گـەورەی کۆمەڵایــەتی خـۆی نیشاندەدات. پێخەمبەرایەتی یەکەمین دەزگای گەورەی رێبەرایەتی کۆمەڵایەتییە. بەسەنتێزکردنی ئـەو چـەمکی و رامانانـەی بەکاری دێنن (ئەو قالبە هزریانەی لـەم قۆناخـەدا هـەبوون) و گەیانـدنی بەئاسـت و قۆنـاخێکی بـاڵاتر بـەواتای بەدەسـتهێنانی پێخەمبەرایـەتی دێـت. بـەو رادەیـەی لـەمیتۆلۆژیای کۆیلـەداری و ئـاییني فـەرمی رزگـاربن رۆڵێکـی ئـازادیخوازی کۆمەڵایـەتی دەبینن. بێگومان هەروەکو لەهەموو قۆناخەکان روویدا, هەروەکو چۆن دەشێ دابڕانی رادیکاڵەیان لەسیـستەم هـەبێت ئەگـەری رێککەوتن لەگەڵ دەوڵەتیشدا هەیە.

ئەوەی لەمێژووی کۆمەڵناسی ئایین چاوەڕوانی دەکرێت هەر پێخەمبەرێك (گرنگەکان) لەناو رەوشی کولتووری ئەو قۆناخە شـیبکاتەوە, بەتایبـەتیش لـەبوارەکانی زهنییـەت، دەسـەڵات، کۆمەڵایـەتی و ئـابووری, لەسـەر ئـەم بنەمایـە باسـکردنی مێـژوو یەکپارچـەییەکی مـەزن بەدەسـتدێنێ. بەمـەش لەچیرۆکی پاڵـەوانێتی سـەڵتەنەت و قارەمـانێتی رزگـاری دەبێـت و مێـژوویێکی واقیعـی وەهـا دەنووسـرێ کـە رەهەنـدی ئـەتنیکی، کۆمەڵایـەتی و ئازادیخوازانـەی هـەبێت. بـەمجۆرە گفتوگۆکـانی عەلمانییـەتی رۆژگاری ئەمڕۆشمان واتادار دەبێ. پێویستە باش دەرك بەوە بکرێ کـە بەسـەدان هـەزار کـادیرو بودجـەکانیان خزمـەت بەچـی دەکات.

لەئیمپراتۆریەتی رۆمادا قۆناخێکی هاوشێوە رۆڵ دەبینێ. هەر لەسەردەمی لەدایکوونییەوە (50 ی پ. ز) لەناوەوە رێبـازە ئایینییـە بەخەسـڵەت کۆمەڵایەتییـەکان، لـەدەرەوەش بزووتنـەوەی رەوەنـدە بەخەسـڵەت ئەتنیکییـەکان، گـەورەترین هێـزی دەسەڵات ــ جەنگاوەری مێژوو راپێچ دەکات, کـە تـا ئەوکاتـە قالبۆتـەوە. مەسـیحییەت لەسـەردەمی لـەدایکبوون و گەشـەکردن

بەلانی کەم هێندەی ئیمپراتۆریەتی رۆما کارەکتەرێکی گەردوونی هەڵدەگرێت و بزووتنەوەی پارتێکە کە لەهۆزو خێزان و یەکینەکانی رەچەڵەك پێکهاتووە. یەکەمین پارتی گەردوونی هەزارانە کە ناوەرۆکێکی کۆمەڵایەتی هەیە. هەروەکو چۆن رۆما وەك گەورەترین هێزی دەسەڵاتی ــ جەنگاوەر(شەڕ)ی قۆناخ حزبی خۆی سەفەربەرکردووە، مەسیحییەتیش لەسەر ئەو شوێنپێیە رێکخستنی هەزارانی سەفەربەرکردووە. لەسەردەمی سەرمایەداریشدا چڕبوونەوەیەکی چینایەتی هاوشێوە روودەدات. پێکهاتەی هەرە ستەمکارو چەوسێنەری دەوڵەت و پێکهاتەی توندی زەحمەتکێشان بەردەوامی دوالیزمی دیالەکتیکییە.

هەردوو رێبازیش لەبەرخودانیان بەرامبەر بە رۆما خاوەن مێژوویێکی درێژخایەنن کە لەمیانەی توندوتیژییەوە سەرکوتکراوە. بینینی مێژوو وەك چیرۆکی ئیمپراتۆرەکانی رۆما دەبێ وەك چەواشەکاری مێژوونووسە فەرمییەکان هەڵسەنگێنرێت. هەروەکو چۆن هێزی جەنگاوەری ــ دەسەڵات, کە وەکو تۆپەبەفرین و تۆپەئاگرین کەڵەکەبووە, گەوهەری مێژووی ستەمکاری و چەوسانەوەیە, ئەوا ئەتنیکی رەوەندو رەوتە کۆمەڵایەتی و ئاینییەکانیش بەو ئەندازەیە گەوهەری کۆمەڵکارییە. مێژووی گەلان وەك راستینەی کۆمەڵایەتی و ئەتنیکی بەگوێرەی قورسایی پێویست نەنووسراوەتەوە. لەکارەکتەری چینی باڵادەستدا نووسینی مێژوو هەرە زێدە رۆڵی شێواندنی دیاردەی کۆمەڵایەتی و پشتگوێخستنی فاکتەرە راستەقینەکانی هەیە. نەنووسینی مێژووی راستەقینەو شێواندنی نائاسایی بەکاریگەرترین رێگای تەسلیمگرتنی زهنییەتی مرۆڤە. ئەو کۆمەڵگایانەی لەهۆشیاری مێژوویی دابڕاون ناچاردەبن لەناو هەلومەرجێکدا بژین کە لەقۆناخی قڕکردن نێگەتیفترەو واتاو ناسنامەی خۆیان لەدەستدەدەن. ئەو کۆمەڵگایانەی فێری ئەم هەلومەرجانە کراون، ساناییە کەهەموو جۆرە بارێکیان پێ هەڵبگریت. هەربۆیە نەریتی تاکخودایی لەم لایەنەوە گرنگە. ئەمانە وەك بیری راستینەی کۆمەڵایەتین. بەرامبەر بەدرێژخایەنی سەڵتەنەت، هەمیشەیی پێخەمبەرایەتی وەك ئەلتەرناتیفێکە. مەسیحێتی لەمیانەی دەزگای گەورە " قەشە "یێتی گەیشتۆتە ئەو نەریتەی هاوشانی ئیمپراتۆریەتی رۆمایە, پێشکەوتنێکی هاوشێوە بۆ رێبەرایەتی ئەتنیکیش لەجێگای خۆیدایە. لاساییکردنەوەی ئیمپراتۆر، لەناو هەردوو رێبازیشدا رێککەوتن لەگەڵ سیستەم، رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە هەندێ جار بەتەواوەتی بتوێنەوە، هەندێ جاری دیکەش بۆ ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتییە باڵایانە وەرچەرخێن کە توانای ژیانیان هەیە.

ئەگەر بخوازرێ هێلکارییەکی مێژوویی گشتی ئەتنیك بکێشرێ، ئەوا دەستپێکردنی لەسەرهەڵدان و بەدەزگابوونی کولتووری کشتوکاڵ دەشێ واتاداربێت. تەواوی پێدراوە شوێنەوارناسی و زمانناسییەکان دیاردەکەن کە بۆیەکەمین جار ئەتنیك لەم مێژووەدا لەبناری ناوەوەی کەوانەی زاگرۆس ــ تۆرۆس شێوەی گرتووە. شۆڕشی کشتوکاڵی هەلومەرجی هەبوونی بزووتنەوەی ئەتنیکییە. لەرەوشێکی پێچەوانەدا لەدۆخی کۆمەڵگای تیرەی سەرەتایی رزگاری نابێت. هەرچی کۆمەڵگای تیرەی بەراییە هیچ کاتێك لەگروپی بنەماڵەیەکی بەرفراوان بەولاوە تێپەڕ ناکات. تەکنۆلۆژیای بەرهەمهێنان ئەم سنوورە دیاری دەکات. هەربۆیە لەمیانەی سیستەمە سنووردارەکانی دەنگ بەگروپە مەزنەکانی زمان ناگەن. مێژووی ئەو گروپە زمانانەی دەیانناسین لەساڵانی 20000 ی پ. ز دەستپێدەکات. دیسان لەهەمان جوگرافیادا هۆکاری هاوشێوە رۆڵ دەبینن. جێگیربوونی زمان رێگا لەپێش گەشەکردنی بەرهەم دەکاتەوە، ئەمەش بەکۆمەڵگابوون بۆ قۆناخی باڵاتر دەگوازێتەوە. ئاسەوارناسەکانی وەکو " گۆردۆن چیڵدوڤانیلۆر" هاوفیکرن کەگروپی زمانی ئاریانی لەکەوانەی ئاماژەپێکراودا شێوەی گرتووە. زمانی گروپی ئاریانی بەرهەمی ئەو گروپانەی کۆمۆنەی سەرەتاییە کەشۆڕشی کشتوکاڵییان ئەنجامداوە. لەتەواوی ئەو قەومانەی هاوبەشێتی لەم گروپەی زمانەدا دەکەن کۆنترین وشەکانی سەبارەت بەکشتوکاڵ دەبینرێ. ئەوە بابەتێکی پەسندکراوە کە لەیەکەمین قۆناخیدا پێکهاتەی ئەتنیکی لەجیاتی پەلهاوێشتنی جەستەیی، لەمیانەی شێوە پەلهاوێشتنی کولتووری لەهەر چوارلاوە بڵاوبۆتەوە.

راستینەیەکی دیکەی پەسندکراو ئەوەیە کە لەسالآنی 11000 ی پ. ز لەرێگای " گەرووی برینگ" لەرێگای هیندە سوورەکان لەئاسیاوە بۆکیشوەری ئەمریکا بلاوبۆتەوە.

تاوەکو ئاواکردنی شارستانییەتی سۆمەری (نزیکەی سالآنی 3500 ی پ. ز) لەناوەندی سەرەکی پێدەشتەکانی کەناری دیجلە ـ فورات کە لەناوچە شاخاوییەکان جیادەبێتەوە کولتووری ئەتنیك پێشکەوتنێکی گەورەی بەخۆوە بینیوە. پاشماوەی کۆنترین شوێنگەکانی نیشتەجێبوون و چەندین فاکتەری کولتووری گەلان کە لەرۆژگاری ئەمرۆشماندا لەئارادان گەواهی ئەم قۆناخە دەدەن, بەتایبەتیش قۆناخی نێوان 6000 ــ 4000 ی پ. ز لەبواری گەیشتن بە ئەتنیکێکی خاوەن ناسنامە بایەخدارە. ئەم قۆناخەی لەگەڵ سەردەمی بەردینی مس ئاوێتە بووە, هەروەکو بڵێی تەواوی ئەم داهێنان و دۆزینەوە سەرەکییانە داهێنراون کە رێگایان لەپێش دەستپێکردنی مێژوو (شارستانیەت) کردۆتەوە. دەزگا سەرەکییەکانی هونەر، ئایین و پلەداری پێکهێنراوە. هۆریەکان وەك کۆنترین گروپی ئاریانەکان (ئور: گرد، تەپۆلکە، خەڵکی شوێنە بەرزەکان) لەناوەندی سەرهەڵدانی ئەم کەلتوورەدا وەکو کۆنترین باپیرەی کوردانی رۆژگاری ئەمرۆمان دەستنیشانکراون. هەروەکو دەزانرێ وەك گروپی هەمان گەل لەسالآنی 6000 ی پ. ز لەناوچەکە خاوەن ژیانێکی چالاکبوونە. لەقۆناخی ئاواکردندا لەگەڵ سۆمەریەکان هەم خزمن هەم دراوسێ. گۆتی، کاسی، لوڕی، نائیری و ئورارتوو و ماد ئەو ناوانەن کە ریشەکەیان سۆمەر ــ ئاشوورە و لەو گروپانە نراون کە هاوبەشێتیان لەهەمان کولتووردا کردووە.

لێشاوی کولتووری ئاریانی لەسالآنی 9000 ی پ. ز بۆ ئەنادۆل، 6000 ی پ. ز باکووری ئەفریقیا، قەفقاسیاو ئێران، 5000 ـ 4000 ی پ. ز لەچین باشووری سیبریاو ناوەوەی ئەوروپا بلاوبۆتەوە. ئەم مێژووانە نیشانیدەدەن کە کولتووری کشتوکاڵ لەسەرتاسەری جیهاندا بلاوبۆتەوە. کۆچبەرە ئاریانییەکانی بەشێوەیەکی رێژەیی لەمیانەی لێشاوێکی جەستەییش بلاوبوونەوە، لەسالآنی 3000 ـ 2000 ی پ. ز بەرەو نیمچە دوورگەی کیشوەرەکان، هیندستان، ئینگلتەرا، یۆنان، ئیتالیا و نیمچە دوورگەی ئیبەریك و تا باکووری ئەوروپا دزەو تەشەنەیان کردووە. گرێدراو بەگۆڕانکاری و پێشکەوتنەکان شیمانە دەکرێت لەسالآنی 2000 ی پ. ز بەشێوەی جوڵەیەکی بەرامبەر بەرەو ئەو ناوچانە چوونە کەشارستانییەتی سۆمەری دەوڵەمەندی کردوون ـ هیندستان، ئێران، ئەنادۆل و میسر ـ تەڤلی قۆناخەکانی شارستانییەت بوونە. تادوا رادە قۆناخێکی بەجموجۆڵ لەئارادایە. هێزی سەرنجراکێشی سۆمەر هەروەکو کاریگەری ئەمرۆی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، چەندە کۆمەڵەی گوندە کۆچبەرەکان هەبوون بەرەو خۆیان رادەکێشێ. جوڵانەوەی کۆچبەری 2000 ی پ. ز بەرفراوانترین بزووتنەوەی پەلهاوێشتنە لەمێژووی ئەتنیکدا. لەئەنجامی ئەم پەلهاوێشتنانە بناخەی شارستانییەتەکانی هیندستان، ئێران، ئەنادۆڵ و هەلاس و چین دادەنرێت.

بەشێوەیەك لەشێوەکان دوای میزۆپۆتامیا دووەمین هەڵمەتێتی لەبواری ئاواکردنی شار(بەشاربوون). سەرباری ئەمەش لەو ساڵانەدا شارەکانی شارستانییەت لەناو دەریای کۆچبەریدا وەك دوورگەی بچووك وایە. ئەوانەی لەبنەڕەتدا لەناو چالاکی دان کۆچەرەکانن. سێیەمین هەڵمەتی گەورەی کۆچبەری لەسالآنی 1000 ی پ. ز دەستپێدەکات. ئەو کۆچانەی لەئەوروپاوە بەرەو قەفقاسیا، لەئاسیای ناوین بەرەو ناوچەکانی شارستانییەتی باشوور ئەنجامدراوە، جێگای سیستەمەکانی خان و بەگەکان و شارستانییەتی سەرەتا دەگرنەوە. لەیۆنان دۆرەگان، فرێگییەکان لەئەنادۆڵ، مادەکانی گرێدراوی زاگرۆس ــ تۆرۆس و ئەترۆسکەکانی ئیتالیا ئەو گروپە ئەتنیکییە گەورانەن کە لەم هەڵمەتەدا ناسراون. ئەم گروپانە رۆڵێکی مەزن لەو پێشکەوتنەی شارستانییەت دەبینن کە لەسالآنی 1000 ی پ. ز لەنێوان ئیمپراتۆریەتی رۆما بەدیدێت. شارستانییەتەکانی ماد، گریك، فریك، ئورارتوو و ئەتروسك لەلایەن گرنگترین گروپە ئەتنیکییەکانی هەڵمەتەکە ئاواکراون.

بزووتنـەوەی ئـەتنیك لـەبواری رێكخستن قۆنـاخ و ئاسـتی پلـەداری دەربـاز ناكـات. لـەم سـنوورەدا لـەناوەوە یـاخود دەرەوە هەڵنەوەشێتەوە رووبەڕووی كێشەی بەدەوڵەتبوون دەبێتەوە. بەدەوڵەتبوونەكانی هاوشێوەی مۆدێلی سۆمەری، بۆ ئەم گروپانە پەیڕەو دەكرێت كە بەشێوەیەكی سەركەوتووانە ئەم قۆناخە تێپەڕبكەن. زیاتر لاسایی ئەو مۆدیلانەی شارستانییەت دەكەنەوە كـە لەگەڵیانـدا لـەناو پەیوەندیـدان. پێكهاتـەی پلـەداری توانـستی پێكهاتەیـەكی دیكـەی نییـە. لەرەوشـێكی وەهـادا جیـاوازی چینایەتی سەرهەڵدەدات. چینەكانی ژێر بەشێكیان بەرەوشی جارانیـان لەناوچـە لادێییـەكان، ئەوانـەی چوونەتە شـاریش یـان دەبن بەكۆیلەو سەرباز، یاخود دەچنە ریزی چینە جێگیرەكان و هەوڵی تەواوكردنی كۆمەڵگای چینایەتی دەدەن. بۆ كۆمـەڵگای چینایەتی ئەتنیك بەردەوام بەواتای خوێنی تازە دێت. گوندێتی بۆ سەرمایەداری چییە، ئەتنیكیش بۆ شارستانییەتە كۆنـەكان هـەمان رۆڵ دەبینـێ. ئەگـەر لێكچوونێكی گشتی لەگـەڵ رۆژگـاری ئەمرۆمانـدا بكـەین، ئـەوا بـەرخودانی نیـشتمانی بەرامبـەر ئیمپریالیزم و ئەو دەوڵەتەی لەئاكامیدا ئـاواكرا، بەرامبەرەكـەی لەشارسـتانییەتی كۆنـدا بـەرخودانی ئـەتنیكی و ئـەو دەوڵەتـە ئەتنیكییانەن كە پشت بەپێكهاتەی ئەتنیكی دەبەستن و لەشێوەی میرنشینی ئەتنیكییدان.

رێكخستنی پێخەمبەرایەتی ـ ئایینی كە وەكو جۆرێكی تێكۆشانی چینایەتی چاخی سەرەتایی شرۆڤەی دەكـەین سەرچاوەی خۆی لەسەردەمی پێگەیشتنی شارستانییەتەكان وەردەگرێت, ریشەكەیان شارییە و مۆركی چینی ناوینیـان پێوەیـە. توانیویانـە بوێرانـە ئـەوە نیـشانبدەن كەسیـستەمی كۆیلـەداری سـەرەتایی دژ بـە ئاقڵمەنـدین. رەخنـەگری سـەرەتاو یەكـەمین یـاخیبووە كۆمەڵایەتییەكانن. هەروەكو بڵێی كەوتوونەتە ژێركاریگەری شوێنپەنجەی نەریتی شامان و شێخایەتی پێشوو كەجێگای خۆیـان لەدەزگای پادشایەتیدا نەگرتووە. لەبەر چەمكیان سەبارەت بە ئـایینی تـاكخودایی داتاشـراوو دژایـەتیكردنی بتـەكان، دەتـوانرێ ئەم دۆخە وەك جێگیربـوونی زهنییـەت بنـرخێنێ. بانگەشـەی هـەرە گـەورەیان دەڵـێ: " مرۆڤـی ــ پادشـا نابێتـە خوداوەنـد". خەڵك بڕوای بەبانگەشەی پادشای ـ خوداوەند نەكردووە، ئەمـەش تێكۆشـان و نـاكۆكی نێـوان چینی بەڕێوەبـەرو خـەڵكی شـار نیشاندەدات. دوای ئەوەی خەڵكی شار ئاگاداری جیاوازی نێوان یاساییبوون و رۆحگـەرایی دەبـن, یـان دەركـی پێدەكـەن بڕوایـان بەپادشا ـ خوداوەندەكان دەهەژێ. جێگیربوون و جیاوازی زهنییەت لەناو شار خێراتردەبێ. رەوشی شار دەرفەت بە لێگەڕین و رامـان و تێگەیـشتنی نـوێ دەدات. زیـادبوونی زانیارییـەكان و داهێنـانی بیرۆكـەكان دوای قۆناخێـك ئایـدیۆلۆژیای فـەرمی (ئـەو میتۆلۆژیایانـەی باوەڕییـان پێـدەهێنرێ) تێپـەڕدەكات. بەلێگـەڕینی ئایـدیۆلۆژیای نـوێ سـەردەمی ئایـدیالیزمی پێخەمبـەران دەستپێدەكات.

بـەگوێرەی مەزەنـدەكان ئـەو قۆناخـەی سـاڵانی 3000 ی پ. ز دەسـتیپێكرد تـاوەكو سـەردەمی حـەزرەتی ئیـبراهیم زیـاتر لەشارە گەورەكانی سۆمەرییەكان سەریهەڵداوە. دوای ئەوەی نـەیتوانی جـێگیربێ پـەنایان بـۆ شـوێنە دوورو ناوچـە شـاخاوی و ئازادەكـان بـردووە. لـەو بڕوایـەدام كـە لەسـەردەمی ئادەمـەوە تـاوەكو قۆنـاخی ئیـدریس و ئـەیوب بـەقۆناخی پێخەمبـەرەكانی بەرلەئورفا بەناو بكەین راسترە. هەروەها دەتوانین بانگەشەی ئەوەبكەین كە لەساڵانی 2000 ـ 1000 ی پ. ز ئورفا رۆڵێكی ناوەندی بینیـوە. شیمانەی لـەپێش ئەوەیـە لـەم قۆناخـەدا نـەریتی پێخەمبـەرێتی بـاش جێگیربـووە. ژێرخـانی بـەدەزگابوونی بەهێزبووە. ناوچەكە چەندین پێخەمبەر لەسەرووی هەمووشیانەوە حەزرەتی ئیبراهیم دەنێرێتـە دەوروبـەر. گـەلێك چیرۆك ئەم شیمانەیە پشتڕاستدەكەنەوە. وەك گریمانی دووەم دەتوانین بانگەشـەی ئـەوە بكـەین كـە لەسـاڵانی 1000 ی پ. ز بـەدواوە تـاوەكو هەڵوەشـاندنەوەی رۆمـا, قـودس وەك دووەمـین ناوەنـدی پێخەمبەرایـەتی دەردەكەوێتـە پـێش. لەپـەرتووكی پـیرۆزدا لیـستەیەكی درێـژی پێخەمبـەرەكانی ئـەم قۆناخـە باسـدەكرێت. باسـێكی بـەهێزو دەوڵەمەنـد لەسـەر پێخەمبـەران هەیـە, لەسەرووی هەمووشیانەوە ساوڵ، سلێمان و داود. مـرۆڤ دەتـوانێ ئـەم باسـە سەرنجڕاكێشانەی پـەرتووكی پیرۆز وەك داواكاری پادشـایەتی و پێـوانی ئـەخلاقی هەڵـسەنگێنێ. بەشـێوەیەكی بـەهێز بەكۆمـەڵگابوون دەستنیـشاندەكرێت. لـەناوەرۆكی خۆیـدا

بانگەوازی بۆ هۆزی عیبرانی دەکات کە پێویستە دوور لە بتەکان بوەستێ و گرێدراوی خوای خۆی بێت؛ ئەم بانگەوازییە باسێکی ئایینییە هۆزی عیبرانی لە پەرتەوازەبوون رزگاردەکات و دەبێتە هۆکاری ئاوابوونی پادشایەتی. هەروەکو چۆن میتۆلۆژیای سۆمەری چیرۆکی پادشا ــ خوداوەندەکانە، ئەوا پەرتووکی پیرۆزیش چیرۆکێکی ئایینییە باس لەوە دەکات کەچۆن لەهۆزگەرایی بەرەو ئاواکردنی پادشایەتی هەنگاو دەهاوێژرێ. زهنییەت و ئەدەبیاتی زاڵی ئەو سەردەمە زمانێکی پیرۆزی پەرتووك دەسەپێنێ. جێگای بایەخە کە لەژێر چڕبوونەوەی شێوەی بابەتەکەدا ناوەڕۆکەکەی ببینرێ. ئامانجی دوایی حەزرەتی عیساش ئەوە بوو ببێتە پادشای قودس کە بە "کچی سەهیۆن" ی بەناو دەکرد. هەر لەم پێناوەشدا گیانی خۆی بەختکرد.

سێیەمین و دواترین قۆناخی پێخەمبەرایەتی لەسەرەتاییەوە تا 632 ی زایینی لەدایکبوونی حەزرەتی عیسا تاوەکو کۆچی دوایی حەزرەتی محەمەد بەردەوام دەبێت. دوای ئەو سەردەمە هۆزی عیبرانی لەرێگای سەفارییەکان دەکەوێتە قۆناخی کاتبەکان، ئایینی مەسیحیش لەرێگای حەواری و قەشەگەورەکان و پاپاکانەوە لەناو گەلانی دیکە بڵاودەبێتەوە.

ئەدەبیاتی پێخەمبەرایەتی (لەسەروودا ئینجیل) بۆ زمانی لاتینی و گریکی وەرگێڕدرا، ئەمەش کاریگەریەکی بنچینەیی کردە سەر زهنییەتی شارستانییەتی رۆژئاواو رێگای لەپێش گۆڕانکاریەکی ریشەیی کردەوە. تێکۆشانی لەدژی نیو خودا بانگەشەی خوداوەندیبوون لە ئیمپراتۆرەکانی هێلین ـ رۆما دەسەنێتەوە. لەساڵی 312 ی زایینی قوستەنتینی گەورە ئایینی مەسیحی پەسندکرد, دواتر وەك ئایینی فەرمی راگەیاند. ئەمەش هەنگاوی کۆتایی قۆناخێکی مێژوویی بوو. بەمشێوەیە هەرچەندە بانگەشەی "مرۆڤ نابێت بەخوداوەند " ی پێخەمبەران گەلێك خاسییەتی خۆی لەدەستدابێت, بەڵام دیسان سەردەکەوێت. هەربۆیە لایەنی (لقی) پێخەمبەرایەتی بەناوی موسڵمانێتی و بەپێشەنگایەتی حەزرەتی محەمەددا هەر لەسەرەتاوە خۆی وەك سێبەری خوداو پەیامنێرەکەی بۆ سەر زەوی رادەگەیەنێ. باوەڕی سێیانەی (سێکوچکەی) حەزرەتی عیسا " باوك ـ کوڕ ـ رۆحی پیرۆز" رەتدەکاتەوەو بەحوکمی ئایەتەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە مرۆڤ تەنیا دەتوانێ ببێتە بەندەی خودا. بەڵام چەمکی بەندەی خودا لێرەدا کاریگەری پادشا ـ خوداوەند نیشاندەدات. "ئەڵلا" لەشوێنی پادشا ــ خوداوەندەکان جێگیر دەکرێت. ئەم نموونەیە بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێشانە گوزارشت لەشەڕی درێژخایەنی بواری زهنییە. هەروەها دەسەلمێنێ کەشەڕی مرۆڤ بەرامبەر پادشا ــ خوداوەندەکان هەزاران ساڵی خایاندووەو دیاردەکات کەرزگاربوون لەکۆیلەدارییەکی دژوار سانایی نییە.

لەکۆتاییەکانی ئیمپراتۆریەتی رۆمادا سەردەمی پادشا خوداوەندەکان کۆتایی پێدەێت، لەگەڵ قۆناخی حەزرەتی محەمەدیش بەتەواوی کۆتایی پێدێت. بانگەشەی سەرەکی پێخەمبەران ئەوە بوو کە مرۆڤەکان ناتوانن خۆیان وەك خوداوەند رابگەیەنن. کاتێ ئەم خاڵە بەتەنیا وەك بەرنامەی پارتێك بەدیهات، ئیتر واتای بەردەوامبوونی هەبوونی پێخەمبەرایەتی نەما. ئەوانەی دوای ئەمە شوێنپەنجەو سێبەرو چیرۆکن.

بەرهەمی سەرەکی ئایینی تاکخودایی رۆژهەڵاتی ناوین دەوڵەتی دەرەبەگایەتی چەرخی ناوینە. بەگوێرەی کۆیلایەتی چاخی کلاسیك کۆیلایەتییەکەی نەرمترەو کۆیلایەتی رەنجبەرانە، واتا پێشکەوتووە. هەنگاوێکی پێشکەوتوو لەبواری کۆیلایەتی لەئارادایە. لەکۆیلایەتی چینەکانی تریشدا پێشکەوتن هەیە. سوڵتان (هێزی دەسەڵات و شەڕ) وەك سێبەری خودا لەقەڵەم دەدرێت. وەك بەردەوامی باوەڕی پادشا ـ خوداوەند تەماشای دەکرێت.

دەبێ هەردوو رێکخستنیش لەمێژووی مرۆڤایەتیدا لەبواری تایبەتمەندێتی کۆمەڵکاری و هەڵوێستی دیموکراتی بچووك نەبینرێن و وەك ئەو هەنگاوانە هەڵسەنگێنرێن کە بەرەو ئازادی و دادوەری نراون.

نەریتی بەرخودانی هەزاران ساڵ لەبەرامبەر کۆیلەداری کلاسیك و سەرەتایی خاوەن دەسکەوتی مەزنی بوارەکانی هزری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابوورییە. هەرچەندە مێژووی نووسراو بەشێوەیەکی تایبەت ئەم دەسکەوتانە جودا نەکاتەوەو دەستنیشانیان نەکات، بەڵام گومان لەهەبوونیان ناکرێت. کولتووری مرۆڤایەتی زیاتر بەجۆگەلەی خوێنی ئەم دوو بەرخودانە ئاودراون. ئەمانە بوونەتە بابەتی سەرجەم هونەرە سەرەکییەکان. بەهەموو شان و شەوکەتێکیان پەیکەری پەرستگاکان تا ڕۆژی ئەمرۆمان هاتوون. ئەگەر تۆزێك لەئەخلاقیش مابێتەوە ئەوا لەسایەی ئەم نەریتەیە. داستانە نەمرو و چیرۆکەکانی حەواری و وەلیەکان هەڵوێستە گەورەکانی مرۆڤایەتی نیشاندەدەن. دیسان لەسەر ڕێگای ئەم نەریتەیە کەمرۆڤ بەدەیان ساڵ دەکەوێتە خەڵوەت و گۆشەگیری، لەزیندانەکان دەڕزێ، لەخاچدەدرێ، بەپارچەیەك نان و زەیتون و چەند دەنکە ترێ و خورمایەك خۆی پەروەردە دەکات، هەست بەئێش و ئازاری خەڵك دەکات، نرخ و بەهای هەرە زێدە بەزانین دەبەخشێ. ئەم نەریتەیە کەبەها بەژیانی کۆمەڵگاری دەبەخشێت و تاکرەوێتی ڕەتدەکاتەوە، سیستەمی مانیستەر(دێر) بەچاوی قوتابخانە سەیری زانیاری بەدەستهێنراو و پیشەکاری دەکات و بەهایان پێدەدات. دیسان ئەم جۆگەلە ڕەسەنانەی بەرخودانە کەمرۆڤایەتی ناچاری بیرکردنەوە لەئاشتی کرد، کەرامەتی مرۆڤی پاراست، یارمەتیدانی کرد بەبنەماو سەرنجی خستە سەر برایەتی و دەرگای خۆی بەرووی مرۆڤایەتیدا کردەوە کەهێزی دەسەڵات ـ شەڕ لەکوشتن و مردن بەولاوە شانسێکی دیکەی نەدەدایە مرۆڤایەتی. کۆمەڵگای چینایەتییان لەگەڵ خۆیان نەهێناوە؛ بەڵام بۆ ئەوەی لەناو سیستەمی کۆمەڵگای باڵادەست نەتوێنەوە نەیانتوانیوە بەتەواوەتی خۆیان لێ ڕزگاربکەن. ئەوانیش هەندێ لەجاران هێندەی ئەربابەکانی پێشوویان بوونەتە دەوڵەتگەراو پلەدار, بەڵام دیسان ئەگەر هەندێ نرخ و بەهای مرۆڤایەتی تا ڕۆژگاری ئەمرۆمان ماوە، ڕۆڵی ئەم ڕێکخستنانەی تێدا هەیەو پێویستە مرۆڤ مافی خۆیان بداتێ. ئەگەر کۆمەك و ڕۆڵی ئەم دوو نەریتە لەرۆژگاری ئەمرۆماندا نەبینرێ ناتوانرێ هەڵوێستی دیموکراتی، ئازادی, یەکسانی و لێگەڕینەکانی ژینگەی سروشتی و مافی مرۆڤ و ناسنامەی کولتووری شرۆڤە بکرێت. بەلانی کەم هێندەی تاکێتی (کەسێتی)تاکی هاوچەرخ لەپێناو دیموکراسیدا خزمەتی لەبواری گەلەریشدا گرنگە، ئەگەر زەمینەی بواری گەلەریش وەکو میراسی ئەم دوو ڕێکخستنە پەسند بکرێت، ئەوکاتە بەشێوەیەکی ڕاستترو چارەنووسسازتر دەرك بەکاریگەری ئەرێنی ئەم نەریتە دەکرێت.

چوارچێوەی ئەو باسەی کە هەڵوێستی دیموکراتی و کۆمەڵگاریمان تێدا نیشاندا دەرفەت بەوە دەدات بەشێوەیەکی باشتر دەرك بەکۆمەڵگای ئیمپراتۆریەتی ڕۆما بکەین. ڕۆماش وەکو ئەوانەی پێش خۆی لەدوای چەند سەدەیەك لەئاکامی هەوڵەکانی ڕێکخستن کۆمەڵگای کۆمەڵگاری ناوخۆو، هاتنی گروپە ئەتنیکییەکانی باکوورو لەئەنجامی "هێرش ــ پاراستن"ی ئەو کۆمەڵانەی نزیك بەکۆمەڵگای سروشتی بوون، ڕووخا. ئیمپراتۆریەتی ڕۆما پارچەبوو، لەکۆتایی سەدەی چوارەمیشدا پارچەیەکی هەڵوەشایەوە. بەهۆی پەیوەندی ناڕاستەوخۆی نێوان ئەتنیك و کۆمەڵگاری ئایینی سەرکەوتن هاوبەشە. بەشێوەیەکی تێکەڵیش بێت سەرکەوتن هی سیستەمی کۆمەڵگاری و گەلانە. بێگومان زهنییەت و باوەڕی دەوڵەتگەرایی هەڵنەوەشاوەتەوە. هەرچەندە تۆپەبەفرینەکە پارچە پارچەش ببێت بەڵام بەبێ ئەوەی بتوێتەوە لەگەڵێك گۆڕەپان سەرلەنوێ بەردەوامی بەهەبوونی خۆی دەدات. جارێکی دیکە دەبینین کەهێزی دەسەڵات ـ شەڕ ناتوانێ ماوەیەکی درێژ بەپارچەکراوی بمێنێتەوە. وەکو ئەڵقەکانی زنجیرە، ئەڵقەکانی خۆی زیاتر دەکات و بەمجۆرە بەردەوام دەبێت. لەرۆژهەڵات بێزەنت، فرانك و شارلمان و ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای پیرۆز لەخاکی پاکیزەی ئەوروپا بەفۆرمی نوێ درێژە بەهەبوونی خۆیان دەدەن.

لەراستیدا ئەوانەی ڕۆمایان هەڵوەشاندەوە هۆزی جەرمەن بوون, کەلەبواری کولتووری بەرپشە ئاریانی بوون. هۆزەکانی لەئاسیای ناوین هاتبوون بەدەیان ساڵ ئەم سیستەمەیان هەژاند. بەبێ هێزی ئەتنیك ناتوانرێ ڕۆما بێهێز بکرێ و ئامێرە

گەورەکەی شەڕ بێکاریگەر بکرێت. هەروەکو چۆن گووتەی ئیمپراتۆریەتی رۆما بەشێوەیەکی خەمناك لەئەنجامی هێرشی بەربەرەکان رووخا, نابێتە زمانی کۆمەڵناسە دیموکراتەکان لەهەمانکاتدا نابێتە زمانی راستیش. کاتێك زنجیرەی ئیمپراتۆرەکان بێنینە بەرچاوان باشتر دەرك بەهێزی مەترسیداری شەڕ ـ دەسەلات دەکەین. هیچ ناڕەزاییەك ناتوانێ رێگری ئەوەمان لێبکات کەرووخاندنی ئەم هێزە لەلایەن بەربەرەکان وەك یەکێك لەهەنگاوەکانی ئازادی تێبگەین.

لەراستینەی هەڵوەشاندنەوەی رۆمادا جارێکی دیکە روونبۆوە کەمێژوو لەمیانەی شەڕی نێوان ئەو کەسانەی شەڕ ــ دەسەلات کە خۆیان وەکو سەرچاوەی مۆرالی سیاسەت، کۆمەلایەتی و ئابووری نیشاندەدەن لەگەل ئەو کەسانەیە کە جەخت لەسەر هەلوێستی دیموکراتیانەو ژیانی ئازادیخوازی و کۆمەلکاری دەکەن و بەرخودان دەکەن. ئەگەر لەبیرنەکرێ کەبەردەوام رەوشی شەڕ لەژێر سیستەمی ئاشتی و ئارامی شاراوەیە ئەوا باشتر دەرك بەراستینەی کۆمەلگا دەکرێت.

مێژوویێکی بەمشێوەیە کۆلەکەی هەنگاونانی ئەوروپا بۆ چاخی ناوین (سەدەی پێنجەم تا پانزدەهەم) پێکدێنێت کە هەولی ئاماژە پێکردنماندا. بەلێ ئەم مێژووە پالپشتی چاخی ناوینی ئەوروپایە. پێویستە لەوە تێبگەین کە بەبێ ئەم مێژووە ئەوروپا نەك ناتوانێ شارستانییەت بئافرێنێ, توانای فێربوونی سفریشی نییە. دوای ئەوەی بۆ ماوەیەکی درێژ لەسەردەمی دەرەبەگایەتیدا کرکەوت بەهەموو هێزی خۆی هەولیدا زانست و زهنییەتێکی نوێ بەدەستبخات. بەبێ ئەم مێژووە کەس ناتوانێ بیر لەمانە بکاتەوە یان خەیالیان بکات. دواتر ئەوروپا بەراستی روو لەزانست و مێژوو دەکات، ئەو هێزەی پێویستییەتی وەریدەگرێ. لەمیانەی ئەم دوو هێزە گەورەیەوە پێڕەوی زانین و مێژووی راست هەنگاوێکی مەزنی شارستانییەت دەخولقێنێ.

کۆمەك و رەنجی ئایینی مەسیحی بۆچاخی ناوین کەم و سنووردارە. لەرێگای دادگاکانی ئەنگیزاسیۆن خواستوویەتی زایینی نوێ ئاستەنگ بکات. لەکاتێکدا هەولدەدات رێگا لەجۆگەلە ئەرێنییەکانی وەك هێرێتیکەکان مەزهەب، سیحربازەکان، (پاشماوەی ژنی ئازاد)، سیپاچیەکان (پێشەنگەکانی زانست) بگرێت کە لە کۆنەوە هاتوون و بەئاگر بیانسووتێنێ، بەهۆی مەیلی نزیك بەژیانی سروشتی کە پشت بەئەتنیکی نوێ دەبەستێ و مەزهەبی پروتستانتیەوە ئیرادەی خۆی تێکدەشکێ و شارستانییەتی نوێ زهنییەتی دەکرێتەوەو ئیرادەی بەهێزدەبێت. لەرێگای پرۆتستانتییەوە موحافەزەکاری وشکی ئایین تێپەڕدەکرێت و رێگا لەپێش ئەو بەنەتەوەییبوونە دەبێتەوە کەپشت بەئەتنیك (نەژاد) دەبەستێ.

هیچ بەلگەو بیانوویێك لەئارادا نییە نیشانبدەن کە ئەم پێشکەوتنە مەزنە ئامانجی نەخشە بۆکێشراوی پێشخستنی سەرمایەدارییە. لەبنەڕەتدا گەلێك بەلگە لەدەستدان کەپێویستی پێشکەوتنی شارستانی دیموکراتیك نیشاندەدەن.

سەرباری ئەوەی لەمێژووی شارستانییەتدا سیستەمی دەرەبەگایەتی چاخی ناوین دۆگماتیزمی کۆیلەداری سەردەمی سەرەتایی سنووردارکرد، بەلام لەهەمانکاتدا گۆڕی و درێژەی پێدا. لەجیاتی پادشا ــ خوداوەند سێبەری خودا جێی گرتەوە، ئەم فۆرمەش شێوەی گۆڕانکاری دۆگماتیزمی فەرمانڕەواییە. ناوەڕۆك دەپارێزرێ. هێزەکانی شەڕ ــ دەسەلات لەگۆڕەپانە بەرفراوانەکانی ئەوروپاو ئاسیا بلاوبوونەتەوەو هێزی خۆیان زیادکردووە. لەجیاتی ئیمپراتۆریای رۆماو پارسی ماندووبوو، سیستەمی خوێنە تازەکانی عەرەب ـ ئیسلام، جەرمەن ـ کاسۆلیك، سلاڤ ــ ئۆرتۆدۆکس ئاواکران. بەدرەنگ وەختەوە هەمان سیستەم لەلایەن تورك ـ ئیسلام، مەغۆل ــ ئیسلام درێژەیان پێدراوە. لەم شێوە نوێیەی ئیمپراتۆریاندا گرنگ ئەوەیە کە توخمە کۆمەلایەتییە نوێکان وەك خوێنی تازە دەگرنە ناو بونیادو هەبوونی خۆیان. هەرچەندە لاسایی رێچکەی پارس ــ رۆمایان کردۆتەوەو بوونەتە خاوەن هێز، بەلام ئەو پێکهاتە بەهێزترەی زهنییەت ـ باوەڕی کەئایینی مەسیحی و موسلمانێتی لەگەل خۆی هێنا، ئەو بەنزین و وزەیەی بەخشی کە هێزی دەسەلات ــ شەڕ پێویستی پێیەتی. لەلایەکی دیکەش هێزە پلەدارەکانی عەرەب، جەرمەن، تورك و مەغۆل کەفێری درێژخایەنترین ژیانی کۆچەری ببوون لە مێژوودا، لەرەوشێکی وەهادا

بوون پێویستییان بەچەندە سەربازی باوەڕمەند هەبوو, لەگروپی ئەو قەومانەیان کۆکردەوە کە پاڵپشتییان بوون. ژیانی دەوڵەمەندو ئاسوودەتری شار خاوەن تایبەتمەندێتییەکی سەرنجڕاکێشی وەهابوو کە قەومە نوێیەکان بەشێوەیەکی بەرفراوان لەگۆڕەپانەکان بڵاو ببنەوە.

لە راستیدا بنگەی ژێرەوەی جەماوەری ئەتنیکی و توێژە هەژارەکانی تەریقەت و مانستەر(دێر)ەکانی مەسیحی و ئیسلام بەدوای دونیاو ژیانێکی جیاواز دەگەڕان. نەفرەتیان لەبەکاربردن و ستەمکاری دەوڵەت و پلەداری دەکرد. هەربۆیە چوبوونە ریزی رێکخستنی مەزنەوە. شرۆڤەی هەرەڕاست بۆ چاوەڕوانییەکەیان ئەوەیە؛ ناوەندی تەریقەت و دێر (مانستەر) وەك سەنتێزی ژیانی کۆمەڵکاری ـ سروشتی و دیموکراسییەکی گەردوونی مرۆڤپەروەر بوو. لەهەردوو ئاییینیشدا کەسایەتی وەکو مەولانا خالید زۆرن کە بەدڵ و زهنی سەردەم دەناسرێن و دەیانگووت "تۆ لە 72 میللەتی جیاوازیش بیت، پێشتر چ گوناحێکت هەبێت دیسان وەرە"، ئەم هەڵوێستەی بەپوختی ئاماژەمان پێکرد تا بڵێی دیموکراسییەتێکی گەردوونی لەناواخنی خۆیدا هەڵگرتووە. ئاماژە بەرێبازی دیموکراسی و گەردوونی چەرخی ناوین دەکات.

ئەگەر مرۆڤ بەمجۆرە هەڵوەستە بەرامبەر بەرێبازی سۆفیگەرایی و دێرەکانی ئەو قۆناخە بکات ئەوا رێگا لەپێش تێگەیشتن دەکرێتەوە. لەبەر ئەوەی چینی باڵای ئەتنیك و ئایین دەبنە هێزی دەوڵەتی دەرەبەگایەتی، بەشە هەژارەکانی ژێرەوەش لە دەوروبەری دێر ـ لەئیسلامیەتیشدا بەشێوەیەکی بەرفراوان لەناو تەکیەکانی تەریقەت بڵاو ببوونەوە ــ وەکو هێزێك لەدەوروبەری سیستەمی کۆمەڵکاری دەژیان. لەبواری چینایەتیدا ئەمە بەواتای پارچەبوونێکی قووڵ دێت. بەواتایەکی دیکە ئەمە وەك پارچەبوون و تێکۆشانی نێوان هێزی دەسەڵات ــ شەڕی تایبەت بەچاخی ناوین ــ شانبەشانی هێزە بەکرێگیراوەکانی ــ و گەلی کۆمەڵکار ــ دیموکراتە. ناکۆکی باتینی(الباطنیة) ــ سوننی جیهانی موسڵمانێتی و کاسۆلیك ــ هێرێتیکی جیهانی مەسیحی ئەم راستییە نیشاندەدەن. هەمان دابڕان و پارچەبوون لەناو قەومەکانیشدا دەبینین. نموونەی وەك سەلجووقی ـ عوسمانی ـ تورکمان؛ خەلیفەی عەرەب ـ خەواریج ... هتد لەئارادایە.

ئەم ناکۆکییە چینایەتییە گوزارشت لەشەڕی نێوان هەمان قەوم دەکات. هەندێ لەرێکخستنەکانی هەژاران لەئاستێکی بەرزدا توانییان ببن بەسیاسی. هەروەکو چۆن قەرەمەتی، حەشاشیەکان، فاتمی و عەلەوی گوزارشت لەنارەزایی چینایەتی بەشی هەژارانی جەماوەر دەکات؛ لەهەمانکاتدا نموونەی سەرەتایی دیموکراسی چاخی ناوینن. بەڵام چەمکی دەسەڵاتداری زاڵ بەسەر سیستەمی کۆمەڵگا رێگا نادات ئەم رێکخستنە لەبواری دیموکراسیدا هەنگاوی زیاتر بەرەو پێشەوە بهاوێژێت. لە ئاکامی ستەمکاری دەرەوەو ناوەوە، بەهۆی دوورکەوتنەوە لە راستینەی خۆیان خێرا پاکتاوبوون و کاریگەرییان نەما. لەئەوروپاو ئاسیای ناوین کولتووری دەزگاکانی هاوشێوەی دێرەکان کارگەریەکی هەمیشەییان هەبووەو توانییان بۆماوەیەکی درێژ بەردەوام بن. لەبەرهەمهێنانی زانست و ئامرازەکانی، دێرەکان رۆڵێکی گرنگییان بینی. هێزی گەوهەری ژیان و زانست بوون. دەرکەوتنی قوتابخانەو زانستگاکان لەنزیکەوە پەیوەندی بەخەباتی تەکیەو دێرەکان هەیە.

کۆمەڵەکانی شەڕ ـ دەسەڵات پێکدادانی مەزنیان رەچاو کردو لەئاکامدا توانییان ببنە هێزی باڵادەستی سیستەم. لێرەدا رۆڵی هێزی نەریتی دەوڵەت و دەزگاو زهنییەتەکەی دیاریکەرە. بۆ ئەوەی رێگا بەو رێکخستنە نیو ــ دیموکراتیانە نەدات کە لەبواری دەزگای بەڕێوەبردن ئەماتۆرن (بێ ئەزموون) بەگوێرەی خۆی بەتوانستە. لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە کە لەباڵادەستی ئەم هێزانە بەولاتر ئەم بەشەی مێژوو لەمیانەی ململانێوە تێپەڕدەبێت.

لەمیانەی پروپاگەندەیەکی بەرفراوان " سێبەری خودا، سوڵتانێتی گەورە " دەچەسپێنن، ئەمەش شێوەیەکی نوێی دەوڵەتی تەڵەکەباز و ستەمکار و تاڵانکارە کە هەر لەسەرەتاوە تاکو دوایی بەهەزاران ماکیاژ چنراوە. ئاییینی مەسیحی و موسڵمانێتی هێزی شەڕ ــ دەسەڵات کە وەك تۆپی بەفرین و ئاگرین وەسفمان کردبوو لە پارس ــ رۆما وەردەگرن و لەچاخی ناوینی

دەرەبەگایەتی دەمامکی ئایینی لەبەردەکەن و خۆیان دەکەن بەهەمیشەیی. بەم شێوەیە بە پێچەوانەی بانگەشەکانیان ستەمکاری و تالانکاری ئیمپراتۆریەتی پارس و رۆما تێپەڕ دەکەن. بەرامبەر ئەمەش رێکخستنی تەریقەت و مەزهەب و مانستەرەکان، ئەتنیکی هەژار کە لەژێرو لەدواوە بەجێ ماوە، تەنانەت پلەداری خیانەتیشیان لێ بکات، لەمەزەندەکان زیاتر دیموکراتن و نوێنەرایەتی راستی گەل و رۆحی کۆمەڵگای کۆمەڵکاری دەکەن. بۆ ئەوەی باش دەرك بەرۆژگاری ئەمڕۆمان بکەین بەئەندازەی سەردەمی کۆن، نابێ بەچاویلکەی ئەسپی بالادەستی و دڵێکی تەنەکە ئاسا تەماشای چاخی ناوین بکەین، بەڵکو پێویستە لەچوارچێوەی ئەم پێناسانە هەستی پێبکەین و دەرکی پێبکەین. ئەمە بۆ چەمك و رۆحی ئازادی بایەخدارە. ئەوانەی لەرۆح و تێگەیشتندا بەشێوەیەکی راست لەناو مێژوو نەژین ناتوانن بانگەشەی ئازادی و یەکسانی بکەن و ببنە دیموکرات.

شارستانییەتی چاخی ناوینی ئەوروپا لەدوای سەدەی سێزدەهەم تاوەکو پازدەهەمی زایینی چەندی بەهای شارستانییەتی رۆژهەلاتی ناوین هەبووە وەریاندەگرێ ــ رۆڵی مانەستەرەکان لەوەدا گرنگە ــ و بەخوڵقکاری خۆنوێکردنەوە, بەخێرایی زەمینەی رێنیسانس ئامادە دەکەن. پێویستە مرۆڤ لەنزیکەوە دەرك بەوە بکات بۆچی دەربەگایەتی بەشێوەی کلاسیك درێژخایەن نابێت. کۆمەڵگای چینایەتی لەمیانەی کۆیلەداری چاخی سەرەتایی لەتەمەنی 4000 ی پ. ز تاوەکو 500 ی زایینی لەماوەی هەرە درێژخایەنی خۆیدا ژیاو تەواوی توانستی خۆی خەرجکرد. ئەوەی لەدەستی هاتبوو ئەنجامیدابوو. لەم قۆناخەدا بەشداری جیابوونەوەی چینایەتی دەرەبەگایەتی کەمە، ئەمەش بۆ سنوورداری توانستەکانی دەگەڕێتەوە. لەدۆخێکی وەهادا نییە بەکەڵکی سیستەمی کۆمەڵگا بێت. هەڵبەتە ئامانجی رێکخستنی ئایینی و ئەتنیکی ئەوە بوو ئەم سیستەمە تێپەربکەن. پلەدارییەکان داخوازی بوون بەئیمپراتۆریەتییان هەبوو, بەلام ئەمە ئامانجی سەرەکی نەبوو. بەشێوەیەك شۆڕشی قەومی ئەتنیکی و شۆڕشی ئایینی کۆمەلایەتییان بەکارهێنابوو و خۆیان گەیاندبوو بەهێزە نوێکەی شەڕ ــ دەسەلات. بەر لەشۆڕشی فەرەنسا دروشمەکانی "ئاشتی، برایەتی و یەکسانی" لەسەر ئالای بەرخۆدانی گەلە هەژارەکان نووسرابوو. لەژێر سایەی حوکمداری هەزاران ساڵەی سەڵتەنەتی ئیلاهیدا ئەمانەش روویدەدا. بەمجۆرە ئۆتۆپیای "مەحشەر ــ بەهەشت" ئەبەدی دەکرا، جارێکی دی پلەدارییە کە لەمیانەی تەڵەکەبازی و ستەمکارییەوە لەبواری نەریتی درێژخایەنی هونەری تالانکاری کارامەببوو، چی بخواستبوایە لەرێگای تەفرەدان و سەرکوتکردن ئەنجامیدەدا.

لەئەوروپای رۆژئاوادا ئەم قۆناخە درێژخایەن نەبوو، لەم بوارەدا هێزی راستەقینەی رۆشنگەری مانستەرەکان ــ لە ئیسلامییەتدا ئەم هێزە لەژێرکاریگەری سەڵتەنەتدا مایەوە ـ و رۆحی کۆمەڵگای سروشتی تازەی ئەتنیك بەتایبەتیش لەلایەن "جەرمەن "ەکان رۆڵێکی گرنگ دەبینن. وەك هەموو قۆناخەکانی دیکە ئەم دوو هێزە بەردەوامییان بەئازادی ئیرادەو تێگەیشتن دەدا. بە جۆشوخرۆشێکی مەزن و حەسرەتەوە ئالای ئازادی و زانستییان لەگۆڕەپانە بە بەرهەمەکانی ئەوروپادا دەشەکاندەوە. نەپادشاو شازادەکانی چاخی ناوین کە کۆپی ئیمپراتۆریای رۆما بوون، نە ئەنگیزاسیۆنی کلێسا فەرمییەکانی کەببوونە رۆحی پادشاکان, نەیاندەتوانی رێگای لێبگرن و ببنە کۆسپ. بۆئەوەی شارستانییەتی ئەوروپای رۆژگاری ئەمڕۆمان بناسین پێویست و بایەخدارە کە بەرێزو بەرپرسیارێتی هەڵوەستە بەرامبەر ئەم سەردەمە خوڵقکارە بکەین کەمرۆڤی خاوەن رۆحی ئازادو هزری مەزن جێگای خۆیان تێدا دەگرت. ئەو بەهایانەی ئافرێنراون بەلانی کەم هێندەی بەهاکانی شۆڕشی نئۆلیتیك (گوند) جووتیاری و شۆڕشی شارستانی ــ شار واتادارن. ئەو زانین و رۆحەی لە رۆژهەلات بەرەو سیسبوون و کوژانەوە دەچێ، لەرۆژئاوادا بەردەوامە. ئەو ئازادی و زانینەی بەدەستی ئەوروپاییەکان گەورە دەکرێت، ئەو رۆح و هۆشیارییەی کۆمەڵگای سروشتییە کەبەهەزاران ساڵان پێشەنگایەتییمان کردو لەخۆمانەوە گرت. ئەمە لێمان نامۆ نییە بەڵکو راستییەکمانە.

بزووتنەوەی ڕێنیسانس کە لەسەدەی پازدەهەمەوە دەستیپێکرد، لەراستیدا دایك و باوکی ڕۆژهەلاتییەو دوا نەوەی بنەماڵەیەکی هەزاران ساڵەیە. ڕاست نییە کەوەك منداڵێکی ئادەم و حەوای ئەوروپا ببینرێ. لەوانەشە منداڵی نەفیکراوی ڕۆژهەلات بێ. ئاشکرایە کەرێنیسانس بەردەوامی ڕووداوەکانی سەدەی سێزدەهەمین و چواردەهەمینە. لەسەر زەمینەی پادشا کۆپیکراوەکانی ڕۆماو کۆشکی گەورە قەشەکان گەورەنەبووە، بەڵکو لەمانستەر(دێر)ی ناوچە لادێییەکان و زانستگاکانی شارگەورەبوون. لەم گەورەبوونەدا نەهێزی سیاسی ـ سەربازی نەهێزی ئابووری ـ بازرگانی دەرەبەگەکان، هیچ یەکێکیان ڕۆڵی دیاریکەریان نەبوو. مانستەری ناوچە لادێییەکان و زانستگاکانی شارەکان بەرەنجی خۆیان لەسەرپێیان دەمان و گەلیش بەخێوی دەکردن، پشتگیریان لێدەکردن و جێگای چاوەڕوانی و ئومێدیان بوون. ئەوان لەپێناو گەورەکردنی ئازادی و هۆشیاری شوێنگەی سەربەخۆی تێکۆشان بوون. بەبایەخەوە ئاماژە بەو خاڵە دەکەم کە ئەو ڕێگا سەرەکییەی بەرەو ڕێنیسانس دەڕۆیشت بەکۆشکی قەشەو پادشاکاندا تێپەڕ نەدەبوو، بەڵکو بەقوتابخانە هەرەوەزیەکانی گەلدا تێپەڕدەبوو. ڕێچکەی دەرەبەگایەتی و بۆرژوازی لەدایك نەبوو ئەم کاروانەیان نە نەخشاندووە.

ئەگەر بخوازین شوێن و کاتەکەی لەلێشاوی ڕووباری شارستانییەتدا دەستنیشان بکەین، ئەوەی بەسوودو ئەزموونبەخشە سەرچاوەی سۆمەرە. ڕاست ئەوەیە بۆ سەرچاوەی کانیەکە بگەڕێینەوە. شارەکانی 3500 ــ 2500 ساڵی پ. ز لەئورو ئورگ ئاواکران شەپۆل بەشەپۆل لە نیپورو بابل وەك ناوەند, لەنەینەواوە بەرەو باکووری دیجلە ــ فورات بڵاودەبنەوە. ئەو سەردەمەی لەم ناوەندانە پێکدێن وەهایە؛ نیپور 2500 ــ 2000 ی پ. ز، بابل 2000 ــ 1300 ی پ. ز (چاخی کۆن و ناوین) ئاشوور 1300 ــ 600 ی پ. ز، دوایین سەردەمی بابلیش 600 ــ 300 ی پ. ز لەدەرەوەی میزۆپۆتامیاش ئەو شارستانییەتانەی ڕاستەوخۆ کەوتوونەتە ژێرکاریگەری سۆمەریەکان هیتیتەکانی ئەنادۆڵ 1700 ــ 1300 ی پ. ز، میدیا 900 ـ 550 ی پ. ز، لە پارس 550 ــ 300 ی پ. ز دەتوانین شارستانییەتی ڕۆماو گریکی کۆن لەسەر دووەمین شۆڕشی زهنیەت هەڵسەنگێنین. شارستانییەتی سەردەمی تێپەڕبوونن لە هزری میتۆلۆژییەوە بۆ هێزی فەلسەفی. دوای ئەوەی نوێنەری هەرە گەورەی ڕۆژهەلات لە ڕۆژئاوا ــ تروادە ــ دەڕووخێ ئەم پێشکەوتنە بەدیدێت. هەلاس و ئەتروسکییەکان نەیانتوانی خۆیان بە پێشکەوتنێکی تایبەت بگەیەنن. ڕەوشی کۆچەری باوییان تێپەڕنەکردووە. شارستانییەتی ئیتاڵیاو گریك کە لەساڵانی 1000 ی پ. ز دەستیانپێکرد، لەمیانەی پێشکەوتنی هزری فەلسەفی لەساڵانی 500 ی پ. ز توانیویانە هەنگاو بۆ شارستانییەتێکی تایبەت بهاوێژن. ڕاستتر ئەوەیە بۆ ماوەیەکی درێژ لەسەر نەریتی شارستانییەتی میسرو سۆمەر خۆیان تێرخۆراك دەکەن لەگەڵ ئەو هێزانە دەبنە یەك کە لەباکوور دێن و لە ئەنجامی کاریگەری تایبەتی جوگرافیاش دەتوانن بەقۆناخێکی تایبەت بگەن. پێشکەوتنی نیمچە دوورگەکانی ئیتاڵیاو گریك بەردەوامی پێشکەوتنەکانی شارستانییەتی هیتیتی ئەنادۆڵە. کاتێك کۆمەکی میسرو فینیقییەکانی ڕۆژهەلاتی دەریای سپی بخەینە سەر ئەم پێشکەوتنانە ئەوا باشتر دەرك بەفاکتەرەکانی جیاکاری دەکرێت. ئەڵقەی گریك ڕۆمای دەوروبەری ساڵانی 1000 ی پ.ز تاوەکو 500 ی زایینی زیاتر فراوان دەبێت و لەکەنارەکانی ئەوروپاو زەریای ئەتلەسی دەوەستێ. هەلومەرجی جوگرافی و جیاوازی کات زەمینەو دەرفەت بۆ سێیەمین شەپۆل (ڤێرسیۆن) مەزن ئامادە دەکات. کاتێك ڕووباری شارستانییەت دەگاتە کەنارەکانی ئەوروپا دەگاتە قۆناخی بەپیت و بەرهەمدار. ئەوەی لەساڵی 1500ی زایینی دەستپێدەکات سێیەمین شۆڕشی شارستانییەتی مەزنە. کاتێك ڕێنسانس بەزنجیرەی شارستانییەتی جیهان گرێبدەین ئەوا ڕاستینەیەکی ئەو لێشاوەیە.

پێناسەی هەرەڕاست بۆ ڕێنیسانس ئەوەیە کە وەکو شۆڕشێکی زهنی بەناو بکرێت. شۆڕش لەچەند بوارێکدا ریشەیی یە. یەکەمیان، سەرلەنوێ لەدایکبوونەوەی ئەو تاکەیە کە هزری ئایینی بەناوی خودایی لەناویبردبوو تیۆلۆژیای ئایینی مەسیحی ساڵی 1250ی زایینی لەمیانەی سەنتێزی ئەرستۆ لەسەردەمی سکۆلاستیك (سەردەمی دۆگمای ئایینی) دەگاتە لوتکە، مرۆڤ

دەتوانێ وەکو دۆخی هەرە پێشکەوتووی میتافیزیقیش هەڵیسەنگێنێ. هەروەکو بلێی مرۆڤ لەبیرکراوە. هێندە لەژیاندا سڕاوەتەوەو بوونی نییە ناتوانێ ببێتە یارییەکی (گەمەیەکی) خوداش. لەژێرناوی ئایین کۆمەڵگابوون لەدوا سنوورەکانی خۆیەتی. ئەم شێوە پراکتیکەی هیچ لەگەڵ ژیانی بەرجەستە ناگونجێ ئاستەمە سروشتیبوونی مرۆڤ بۆ ماوەیەکی درێژ بەرگەی بگرێت. هەوڵەکانی هەرەتیزم (مەزهەبە لادەرەکان) جادووگەری (ژنی کۆمەڵگای سروشتی کە نەبۆتە مەسیحی) سیمیاگەرەکان (ئەوانەی زێڕ لە توخمەکانی سروشت دروستدەکەن) لێگەڕینەکانی زانست ــ لەدژی دۆگماتیزمی ئایینی مەسیحی نوێنەرایەتی بەرخودانێکی هزری تایبەت دەکەن. ئەنگیزاسیۆن دەخوازێت کۆسپ بخاتە بەردەم پێشکەوتنەکان بۆ ئەوەی تاکی ئازاد دەرنەکەوێت. نموونەی هەرە سەرنجڕاکێش کە خۆی لەدۆگماتیزمی مەسیحی دابڕاندووەو لەبیری ئازاد گیرساوەتەوە جیۆناردۆ برنۆیە. برنۆ کە خولیاو تامەزرۆی سروشت بووە جیاوازی ناخاتە نێوان خوداوەندو سروشت. هەروەکو بەهۆشیاری سروشتی (گەردوونی) زیندوو مەست بێت، هێندە شەیدای وێنە و ئەرکەکانی (فۆنکسیۆنی) سروشت بوو، پێشەنگی ڕێنیسانس کە جۆشوخرۆش دایگرتبوو لەساڵی 1600 لەرۆما سوتێنرا. بەشێوەیەك کەشایستەی یادگاری سپارتاکۆس و سانت پاوڵ بێت.

کەی مرۆڤ بەچاوێکی دابڕاو لە دۆگماتیزم تەماشای سروشتی کرد ڕێبازی زانستی پێشکەوت. مێشکی مرۆڤ کە بەڕێبازی میتافیزقیا چنراوە لەراستینەی سروشت دوورکەوتۆتەوە. دوای ئەوەی هزری مرۆڤ ڕێبازی خۆی گۆڕی و توانی بگاتە ڕێبازی زانستی سەرلەنوێ بۆ سروشت دەگەڕێتەوە. رۆجەر، فرانکیس باکۆن و گالیلۆگالیلی کەمرۆڤ دەتوانێ بە پێخەمبەرەکانی ڕێبازی زانستیش بەناویان بکات بەچاودێری، تاقیکردنەوەو پێوان دەرگای پێشکەوتنی زانستی ئاوالآ دەکەن. هزری زانستی کە هەر لەپێشکەوتندا بوو لەنزیکەوە پەیوەندی بەم پێڕەوەوە هەیە. بەرامبەر بەسروشت هەڵوێستی فەلسەفی گوزارشت لەئومێد دەکات، لەمیانەی پێڕەویش ئەم ئومێدانە دەبن بەراستی، پێشبینی و گریمانە فەلسەفییەکان شوێنگەو راستی زانستی روونەکەنەوە، چاودێری و تاقیکردنەوەو پێوانیش زانست دەسەلمێنن. بەبێ پێوان و تاقیکردنەوە ناشێ لەمیانەی ئەگەرە فەلسەفییەکان سوود لەسروشت ببینرێ. ئەو دیاردەیەی بەتاقیکردنەوەو پێواندا تێپەڕ نەبێت نازانرێ کە ئەنجامێکی چۆنی لێدەکەوێتەوە. هەرچەندە لەجیهانی ئیسلامدا لەم بوارەدا هەندێ هەنگاو هاوێشترابن لەبەر ئەوەی پشتیان بەڕێبازێکی سیستەماتیك نەبەست، رەنجێکی کەمیان لەزانینی زانستدا هەیە. شارستانییەتی رۆژئاوا کە کۆڵەکە سەرەکییەکەی زانینی زانستە، کاتێ گرفتە ریشەییەکانی پێڕەوی زانستی چارەسەرکرد بەخێرایی کەوتە سەر راستەڕێی پێشکەوتن. دوای ئەوەی کێشەی پێڕەوی زانستی چارەسەرکرا ڕێگا لەپێش شۆڕشی زانستی کرایەوە. لێگەڕینەکانی پێڕەوی زانستی کە لەمیانەی ڕێنیسانس دەستیپێکرد لەپێشکەوتنی ڕەوتی نوێی فەلسەفیشدا خاوەن رۆڵ بوو. پەیوەندی و هەڵوێستی فەلسەفەو زانست بەرامبەر یەکتر، بەو ئەندازەیەی بەکەڵکی پێشکەوتنی قۆناخێکی زانستی هات، هەروەها ڕێگای لەپێش فەلسەفەیەك کردەوە کە پەیوەندییان بەزانستەوە هەبوو.

ئەم شێوازەی هەستکردن و هزر کە دەتوانین وەك دابڕان لەخوداوەندو بناخەی ڕێنیسانس هەڵیسەنگێنین گەورەترین گۆڕانکاری پارادیگمایە. ئەو شۆڕشە هزرییەی ئەنجامدراوە ئاسایی نییە. زەحمەتترین جۆرەکانی شۆڕشە. بەدەسکەوت و سەرکەوتنی هەرە گەورەی شارستانییەتی رۆژئاوا، خۆی لەدۆگماتزمی ئایینی رزگاردەکات و بەهێزی خودی خۆی هەست دەکات، بیردەکاتەوەو واتا بەژیان دەبەخشێ. سروشتی دەوڵەمەندو زیندوو کە بەهەموو شتێکی جێگای جۆشوخرۆشە لەناواخنی خۆیدا بەڵێنی ئومێدی مەزن دەدات. دوای هەزاران ساڵ مرۆڤ بەدەسکەوتێکی گەورەی زانین بۆ سروشت دەگەڕێتەوە، ئەمەش سەرچاوەی هەموو پێشکەوتنەکانە.

دووەمـین گۆڕانکـاری مـەزن ئـەو ریفۆرمانـەن کـە لەئایینـدا ئەنجامـدراون. بەرامبەربـە دۆگماتیزمی ئـایینی مەسـیحی کـە پێـچەوانەی چـەمکی کۆمـەڵگای سروشـتی بـوو، نـاڕەزاییش بەشـێوەیەکی ئاسـایی دژوار بـوو. نـەریتی کۆمـەڵگای سروشـتی جەرمەنەکان لە بەرئەوەی تازە ئاشنای ئایین ببوون بووە هۆکار کە ریفـۆرمی ئـایینی لەمیانـەی ئـەم کولتـوورە ئەنجامبـدرێت. لەراستیدا پرۆتستانتی شرۆڤەی ئایینی مەسیحی تایبەت بەگەلی جەرمەنە. دۆگمـاتیزم نـەرمتر دەکات. کۆسـپەکانی پـێش کـار بـەلاوە دەنـێ، دەرگاکـان بـەرووی زانـست دەکاتـەوە، نوێنەرایـەتی ریفـۆرم و ریفزیـۆن دەکـات. هـەروەکو ناڕازیبوونێکـە دژی سەڵتەنەتی ئایین. گورزێکی بەکاریگەرو مەزنە کە لەموحافەزەکاری زێدەڕۆیی ئـایین دراوە کـە بەشـێوەیەکی نائاسـایی سیاسـی بـووە، کۆسـپی بـەردەم پێشکەوتنە کردارییەکانـەو جێگـا بـەئازادی و جیاکاری گـەلان نـادات. ڕەنگەدانـەوەی شۆڕشـی هزرییـە لـەبواری تیۆلۆژیـدا. لەگـەڵ هەڵوەشـانەوەی قاڵبـە دۆگماتیکـەکان هـزری فەلـسەفی بـەخێرایی دەکەوێتـە قۆنـاخی پێـشکەوتن. هـەروەکو چـۆن لەئـەنادۆڵی ڕۆژئـاوا لەسـاڵانی 600 ی پ. ز هـزری میتۆلـۆژی تێپـەڕکراو ڕێگـا لـەپێش فەلـسەفەی مێـژوویی کرایـەوە، لـە ناوچـەی ئـەورووپای ڕۆژئـاواش دوای ئـەوەی دۆگمـاتیزمی ئـایینی بـەلاوەنرا سـەردەمی فەلـسەفەی پێـشکەوتوو دەستپێدەکات. بواری هەرە پێشکەوتووی شۆڕشی زهنی فەلسەفە هەروەکو بڵێی لەمیانەی سپینۆزاو دیکارت پێخەمبـەری خـۆی دۆزیوەتەوە، دەگەشێتەوە.

سێیەمین پێشکەوتن کە لەرێگای رێنێسانسەوە دەسـتپێکرد شـێوەی ئـەو ژیانـە بـوو کـە مـرۆڤ ناوەندەکەیـەتی. چـەمکی " پێویستە مرۆڤ بەهەموو شتێکییەوە هی خوداوەندبێت " فۆرمێکی جیاوازی تایبەت بە کۆیلـەداری بـوو. هـزری میتۆلـۆژی کـە لەباوەڕی پادشای خوداوەند دزەیکردۆتـە نـاو ئـایینی تـاکخودایی بەشـێوەیەك تـاکی لـەژیان دابڕانـدووە هـەروەکو بڵێـی لـەناوی بردووە. ئەم کۆیلەیە بەهەموو شتێکیەوە ئامرازێکی خاوەنەکەیەتی. تاوەکو ئەم رادەیە ونبونی تاك لەناو ناسنامەی ئـەرباب و خوداوەندەکەی بەو واتایەش دێت کەژیانێکی تایبەت بەخۆی نییە. خوداوەنـد هـی ئـەو نییـە، بـەڵکو ئـەو مـوڵکی خوداوەنـدە. ئەگەر روونتری بکەینەوە واتە گرێدانی ئەوپەڕگەری مرۆڤایەتییە بەپلـەداری ئـایینی کـەبووە بەدەوڵـەت. لەهـەموو ئایینێکـدا کۆیلایـەتی شـاراوەی بـەمجۆرە بـەگوێرەی چـینی باڵادەسـت بـوونی هەیـە. زیندووکردنـەوەی رێزگـرتنی مرۆڤایـەتی لەلایـەن رێنیسانس بەگوێرەی ئەو پێناسەیەش گونجاوە کەواتادارکردنی ژیانی تاك لەلایەن کۆمەڵگاوە شێوازی هـەبوون و لـەدایکبوونی خۆیەتی. کەی هەبوونی بەکۆمـەڵگابوون لایـەنی تـاك لـەنێو ببـات کۆیلایـەتی دەسـتپێدەکات. ئـەوەی لەسۆسـیالیزمی سـۆڤیتدا پەیڕەوکراوە لەگەڵ ئەو سۆسیالیزمەی لەدەوڵەتی راهیبی سۆمەردا بەڕێوەبراوە لەناوەڕۆکدا هەمان شتە. لەژێر هەرچی ناوێك بێت کاتێك تاك توێنرایـەوە بەکۆیلایـەتی بـەناو دەکرێت. لـەتیرەی سـەرەتایی و چاخە سـەرەتاییەکانی فرەخـودایی و ئـایینی تەوتەمیـشدا بیرۆکـەکان رەنگـی خۆیـان لەکارەکتـەری کۆمـەڵگا وەردەگـرت و هێزیـان بـەتاك دەبەخـشی. لەبەرئـەوەی چـەمکی ئایینی چاخی ناوین تاکی لەناوبرد لەبواری کۆمەڵگابوونیشدا گوزارشت لە لادانێکی جددی دەکات.

لەبەرئەوەی مرۆڤپەروەری و کەسێتی تاك و ریفـۆرم مرۆڤیـان راکێشاوەتە نـاو ناوەنـدی ژیـان، بەرامبـەر بەلاڕێـدا چـوونی کۆمـەڵگا بوونەتـە رکابـەرێکی گـەورە. رێنیـسانس بـەم لایەنـەی خـۆی لەمێـژوودا یـەکێك لەقۆناخـە ریـشەییەکانی زهنییەتـە. خوڵقکـاری مـرۆڤ هـەنگاوێکی هـەرەگرنگ و پێویـستی سروشـتی خۆیـەتی. ئـەوە ڕێگـاو زەمینـەیەکـە کۆمـەڵگای ژینگـەپارێزی دەیتوانی پشتی پێ ببەستێ. بەڵام دوای ئەوەی زهنییەتی سەرمایەداری باڵادەستی خـۆی بـەرەو پێـشەوەبرد، مرۆڤـی لـەتاکێتی تـاك (کەسـێتی تـاك) بـەرەو تـاکڕەوێتی بـرد، سـەرباری ئـەوەی تـەواوی دەسـکەوتەکان لەدەسـتدران، لەمێـژوودا رێگـا لـەپێش گـەورەترین بەلاڕێداچوونی ژینگەپارێزی کرایـەوە. زهنییـەتی رێنیـسانس سەرچاوەی کارەساتەکانی ژینگـە نییـە، لەمیانـەی سەرمایەداری بەلاڕێداچووە. لەگەڵ ئەوەی ناوەڕۆکەکەی پووچەڵکراوەتەوە لەهەبوونی کۆمەڵایەتیش دابڕێنراوە. دۆگماتیزمی ئـایینی و میتۆلـۆژی بـەناوی خـودا کۆمـەڵگای ئـاواکردووەو راسـتی چەواشـە کـردووە. سـەرمایەداریش بـەگوێرەی داخـوازی

تاکڕەوێتی کۆمەڵگابوونی لەناو بردووە، لەمیانەی تاکڕەوێتییەوە بەکۆمەڵگابوونێکی شێوێنراوی پەیڕەوکردووە. کاتێك یەکێك لەکێشە سەرەکییەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بەلاڕێدابردنی ژینگە هەڵسەنگێنین ئەوکاتە بەوردی و بەقووڵی زیاتر دەچینە ناو بابەتەکەوە.

قۆناخی ڕێنیسانس کەخاوەنی توانستێکی 300 ساڵییە (1400 ــ 1700) شێوازی هەزری شارستانییەتی ڕۆژئاوای بەرهەمهێناوە. زهنی مرۆڤ کە لەکۆمەڵگاو سروشت دابڕێنراوە سەرلەنوێ بەڕێگایەکی قووڵی فەلسەفی و زانستی گرێدەدات و تادوایی دەرگا بۆشارستانییەتی نوێ ئاوالایە. گرێدراو بەم پێشکەوتنە گرفتێکی پێڕەو هەیە کە پێویستە هەڵوەستەی لەسەر بکرێت. بەتایبەتیش لەچەمکی مێژوویی مارکسیزمدا بەشرۆڤەیەکی ماتریالیستی قەبا ئەم هەڵە گەورەیە ئەنجامدراوەو فۆرمی کۆمەڵگا بەهێڵێکی ڕاست پێناسەکراون. پێشکەوتنی سەرمایەداری وەك ئاواکردنی سیستەمێکی ناچاری هەڵدەسەنگێنێ، لەسەرناوی دژە ــ سەرمایەداری گەورەترین خزمەت بەسەرمایەداری دەکات کە تەنانەت گەورەترین ئایدیۆلۆگەکانی بۆرژوازیش نەیانتوانیوە ئەنجامی بدەن. لەوانەیە ئەمە وەك ناکۆکی ببینرێ, بەلام کاتێك تەماشای ڕابردوو دەکەین، باش دەرك بەوە دەکەین کە هیچ ئایدیۆلۆگێکی سەرمایەداری هێندەی ماتریالیستە وشکەکانی مارکسیزم خزمەتییان بەسەرمایەداری نەکردووە.

سەرباری ئەوەی لەمێژوودا وەك گرنگترین شۆڕشی هزری هەڵدەسەنگێنرێ، پرسی گرنگ ئەوەیە کە پەیوەندی بەکام سیستەمی سیاسییەوە هەیە. چەمکی مێژوویی کلاسیك ڕێنسانس وەك ئامادەکاری سیستەمی زهنی کۆمەڵگای سەرمایەداری شرۆڤە دەکات، چەمکی مێژوویی مارکسیزمیش دەرکەوتنی ئەم سیستەمە وەك فەرمانێکی خودایی لەقەڵەمدەدات. تەواوی ئەم بۆچوونانە بەتایبەت ئەنجامی ژیانێکی گرێدراوە بەسەرمایەدارییە.

کەڵەکەبوونی سەرمایە کەم تا زێدە لەهەموو چاخەکانی مێژوودا دەبینرێ. لەسۆمەرییەکان بەملاوە, بەتایبەتیش لەئەنجامی پێشکەوتنی بازرگانی بەردەوام کەڵەکەبوونی سامان و سەرمایە دەبینین. لەبواری ئابووریدا دەوڵەمەندەکان ژمارەیان زۆربووە. لەم بوارەوە جولەکەکان لەمێژوودا بەناوبانگن. سەرباری ئەمەش نەیانتوانیوە ببن بەسیستەمی بالادەست. هەم کۆمەڵەی بالای دەوڵەت هەم کۆمەڵەی هەرەوەزی ژێر کەڵەکەکردنی توانستەکانیان مەترسیدار بینیوەو بەگومانەوە تەماشایان کردووە. بەردەوام ئەو ئەگەرەیان ڕەچاوکردووە کە لەوانەیە مامانێتی خراپەکاری مەزن بکات. چونکە ترساون ئاکاری کۆمەڵگا تێکبدات و پەردەی شەرم بچڕێنێ. هەرچەندە هێزی شەڕ ـ دەسەلات درێژە بەحوکمڕانی سەر کۆمەڵگا بدات ناوێرێ پەردەی ئەخلاقی کۆمەڵگا ڕامالێ. پاراستنی ئەو دیاردە کۆمەلایەتییەی بەدەزگابوونی پلەداری پشتی پێدەبەستێ مەرجە. گەر بەجەستەییش لەناوی ببات، ئەمە بەڕێگایەکی ئاکاری ئەنجامدەدات. ئەگەر کۆمەڵگایەك لەنەریتە ئەخلاقییە ڕیشەییەکانی خۆی دابڕێنرێ ئەو کۆمەڵگایە ڕووتکراوەتەوە، بێ پاراستنەو دەرگاکانی بۆ هەموو جۆرە مەترسییەك کراوەیە. ئەگەر سەرمایەی سەرمایەداری بووە بەسیستەم ئەمە مەسەلەیەکە لەنزیکەوە گرێدراوی ئەخلاق و ئەنالیزەکردنی کۆمەڵگایە. لە دەرەوەی ئیرادەی خۆی ئەمە بەمجۆرەیە. بەبێ چارەسەرکردنی کۆمەڵگابوون سەرمایە نابێت بەسیستەم، کاتێك بەرەو سیستەم بوونیش دەچێت زۆر تێکدەرو خراپەکار دەبێت.

مارکس و ئەنگلس لەمانیفێستۆی کۆمۆنیزمدا بەشێوازێکی سەرنجڕاکێش ئاماژە بەو قۆناخە دەکەن. توزێکیش پەشۆکاون. کاتێك ڕۆڵی شۆڕشگێڕێتی بەسەرمایەداری دەبەخشن، بەسووربوونەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە بەرلەهەنگاوێکی تێکدەرو بێ ڕەحمانە پێویستە تێپەڕو بەرکەناربکرێت. سەرمایەداری سیستەمێکی کۆمەڵگا نییە. سیستەمی شێرپەنجەی کۆمەڵگایە. بەشێوەیەکی گشتی لێتوێژینەوەی شارستانییەتی کۆمەڵگای چینایەتی, بەتایبەتیش شارستانییەتی سەرمایەداری، وەك نەخۆشییەکی کۆمەلایەتی هەڵوێستێکی جێی بایەخ و گرنگیە. شێرپەنجە نەخۆشییەك نییە لەزگماکییەوە بۆی هاتبێت.

دوای ئەوەی جەستە ماندوو دەبێ و توانستی بەرگری لەدەستدەدات، نەخۆشی شێرپەنجە سەرهەڵدەدات. ئەوەی لەراستینەی کۆمەڵگاشدا روودەدات لەو نموونەیە دەچێت. ئەو کۆمەڵگایەی لەناو سیستەمەکانی شارستانییەتدا ماندبووەو سەرمایە دزەی کردۆتە ناو تەواوی خانەکانی، تووشی نەخۆشی شێرپەنجە دێت. بەگوێرەی جۆرەکەی دەتوانێ کاریگەری دژواری کەم تا زۆری هەبێت. ئەگەر تەنیا شەڕی سەدەی بیستەم شیبکەینەوە لەگەڵێك لایەنەوە راستی ئاشکرادەبێ. مرۆڤ دەتوانێ پێشبڕکێ و رکابەرایەتی زێدە، قازانجی زۆر، بێکاری، هەژاری، برسێتی، نەژادپەرستی. میللیگەرایی، فاشیزم، تۆتالیتاریزم، هونەری دیماگۆژی و تێکدانی سروشت، پیسکردنی ژینگە، فینانسی زیاد، کەسانی لەدەوڵەت دەوڵەمەندتر، بۆمبای ئەتۆمی، چەکی کیمیاوی و بایۆلۆژی، تاکڕەوێتی زێدەڕۆ، دەتوانرێ تەواوی ئەمانە وەك جۆرەکانی شێرپەنجەی سیستەمی سەرمایەداری ببینێ.

ئەم کورتە پێناسەی سەرمایەداریمان بۆئەوە ئەنجامدا کە بەشێوەیەکی راست دەرك بە پەیوەندییەکەی لەگەڵ رێنیسانسدا بکرێ. پێناسەی رێنیسانس ـ کە بەشێوەیەکی گشتی پەسند دەکرێ بەمجۆرەیە؛ بەپووختی سروشت و کۆمەڵگاو تاك لەهەموو جۆرە دۆگمایێك بەدوور دەگرێ، بەحەسرەتەوە تێگەیشتنیان بەبنەما دەگرێت. بۆ پیرۆزی سروشت و تاك دەگەڕێتەوە. ئەم تاکەش تاکی سەرمایەدار نییە؛ داوەریەکی هاوبەشە کە ئەم تاکە بە تێگەیشتنی سروشت و هونەرو فەلسەفە بارگاوییە، خۆی لەشەڕ بەدوور دەگرێ، بەدوای کۆمەڵگایەکی ئازاد، یەکسان و سروشتیدا دەگەڕێ. ئۆتۆپیای رێنیسانس سەرمایەداری نییە، بەڵکو هەرەوەزی کۆمەڵکارییە. هیچ لێکۆڵینەوەیەك لەئارادا نییە بسەلمێنێ و باوەڕیمان پێبێنێ کە سیستەمی نوێی کۆمەڵگا سەرمایەدارییە. ژیانێکی کۆمەڵکاری لەمانستەرەکاندا هەیە. لەشارە نوێکاندا ئاوادەبن، رۆحییەتی زاڵیش لایەنگری دیموکراسییە. ئەو زانایانەی خەریکی فەلسەفەی ئەدەبیات و هونەرن، سەرجەمیان رەنجدەرن و بەئاستەم گوزەرانی خۆیان بەڕێوەدەبەن. ئەوانەی سەرمایە کۆبکەنەوەو کەڵەکەی بکەن زۆر کەمن، بەتایبەتیش بەشێکیان بەهۆی زێدەبەهاوە دووچاری نەفرەتی کۆمەڵگادەبن. ئەرستۆقراتی دەرەبەگایەتی و چینەکانی گەل کە وەك نەتەوەیەکی نوێ سەرهەڵدەدەن، تاوەکو سەردەمی شۆڕشی پیشەسازی بەشێوەیەکی تێکەڵ سیستەمی کۆمەڵایەتی پێکدێنن.

تەنانەت ئەم هەڵسەنگاندنە کورتەش زۆر بەڕاشکاوانە ئەوە روونەدکاتەوە کە تاوەکو سەدەی نۆزدەهەمیش سیستەمی کۆمەڵگای سەرمایەداری لەگۆڕەپاندا نابینرێ. هەربۆیە هەڵسەنگاندنی رێنیسانس وەك قۆناخی پێشەکی سەرمایەداری و بینینی وەك قۆناخی زهنی تایبەت بەسەرمایەداری هەڵەیەکی مەترسیدارە. لەراستیدا نێوەندێکی گێژاویە، دەشێ سەرەکەی بەرەو هەموو جۆرە بوویەرێك بچێت. سیستەمی دەرەبەگایەتی هەڵوەشاوەتەوەو پەرتەوازەبووە، بەلام کۆمەڵگای نوێ سەریهەڵنەداوە، قۆناخێکی ناوین و راگوزارەیە، ژانەکانی بەر لەزایین جێگای باسە. لەم قۆناخەدا دەشێ هەم دەرەبەگایەتییەکی بەهێز دەربکەوێ، هەم سیستەمێکی تاکڕەوی سەرمایەداری، هەروەها پێشکەوتنەکان دەتوانن بەرەو کۆمەڵگایەکی ئازاد و یەکسان و دیموکراتیش ئاراستەبگرن. گرێدراو بەتواناکاری و توانستی سیاسی و هۆشیاری جەنگاوەرانی سیستەم بەشێوەیەکی تیۆری ئەگەری دەرکەوتنی چەندین سیستەم لەئارادایە. هەروەکو دەزانرێ تاکۆتایی شۆڕشی فەرەنسا لایەنگرانی کۆمەڵگای یەکسان و ئازادیخوازو کۆمەڵگای سەرمایەداری شانبەشانی یەکتری تێکۆشان. شۆڕشی ئینگلتەرای 1640 بەقورسایی خاوەن تایبەتمەندێتی دیموکراتییە. لەم شۆڕشەدا تێگەیشتنی هاوبەشی کۆمەڵکاری و شەخسی بەهێز دەبینین سەبارەت بەئازادی و یەکسانی. لەشۆڕشێکی بۆرژوازی زیاتر شۆڕشێکی گەلە. لەسەدەی شانزدەهەم کۆمۆنگەراکانی شار لەئیسپانیا کارەکتەرێکی دیموکراتیانەیان هەیە. شۆڕشی ئەمریکاش ئازادیخوازو دیموکراتییە. شۆڕشی فەرەنسای ساڵی 1897 هەمەڕەنگەو تەنانەت کۆمۆنیستەکانیش جێگایان تێداگرتووە. بە کورتی لەقۆناخی رێنیسانس و نێوەندی قەیراندا بەلانی کەم هێندەی سیستەمی تاکڕەوێتی سەرمایەداری شانسی کۆمەڵگای دیموکرات، ئازادو یەکسانیش هەیە. شانبەشانی شۆڕشی پیشەسازی سەرمایەداری دەتوانێ لەمیانەی شەڕی کۆمەڵایەتیدا سەربکەوێ. سەرمایەداری لەرێگای شۆڕشی پیشەسازییەوە

لەسەدەی نۆزدەهەمدا لەهەموو گۆڕەپانێکدا باڵادەستی خۆی جاڕدەدات. لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا دەبینین کە سیستەمی سەرمایەداری بەشێوەیەکی وشك و قەبا بۆیەکەمین جار پەلهاوێشتنی خۆی بۆ سەرتاپای جیهان تەواو دەکات. بەسەرنەکەوتنی شۆڕشەکانی ساڵی 1848 و 1871 تێکۆشان لەپێناو کۆمەڵگای دیموکرات و ئازادی و یەکسانیەکی زیاتر ئەو شانسەیان لەدەستدا کەببن بەسیستەمی کۆمەڵگای زاڵ.

بۆ ئەوەی پێناسەی ئەم قۆناخە تەواو بکەین پێویستە بابەتی دەوڵەتی نەتەوەیی و نەتەوە لەگەڵ ئەم سیستەم تازەئاوابووەی کۆمەڵگا لەناو یەکتردا هەڵبسەنگێنین.

پێویستە مرۆڤ باش بزانێ کەڕاستی نەتەوەیی کۆمەڵگاکان راستەوخۆ بەرهەمێکی سەرمایەداری نییە. سەبارەت بەم بابەتە بانگەشەیەکی لەشێوەی: " سەرمایەداری نەتەوە دەخولقێنێ " هەڵەیەکی جددییە. بەشی مارکسیزمیش لەم هەڵەو چەوتیەدا هەیە. لە کۆمەڵگاکاندا قۆناخەکانی پێکهاتنی تیرەی سەرەتایی (قلان)، هۆز، خێل، نەتەوایەتی و نەتەوە دیالەکتیکێکی و تایبەت بەخۆی هەیە. وەك بەرهەمێکی کۆمەڵگای چینایەتی سەرهەڵئادەن. سەرمایەداری نەبێت، نەتەوە هەر دەبێت. لەشێوەگرتنی نەتەوەکاندا، زمان ـ کولتوور، مێژوو و هێزی سیاسی رۆڵێکی دیاریکراو دەبینن. لەکۆمەڵگا دیموکرات، ئازادو یەکسانەکاندا نەتەوە دەتوانێ بەشێوەیەکی تەندروستانەتر پەرەبسەنێ. لەدوای سەدەی دوازدەهەمیندا دەبینین کە لەئەوروپا نەتەوەکان رەنگ و شێوە دەگرن.

لەکۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا بەسەرکەوتنی بۆرژوازی دیاردەبێ کە کامە سیستەم لەناو نەتەوەکاندا زاڵ دەبێت. سەرکەوتنی سەرمایەداری لەناو نەتەوەدا لەهەمانکاتدا لەجیاتی ئایین میللیگەرایی وەك ئایدیۆلۆژیای باڵادەست بەجێدەکات. هەم لەناوەوە بازاڕ بەرەو پێشەوە دەبات، هەم بەڕووی دەرەوەدا دەیکاتەوە، ئەمانە هەردووکیشیان لەنزیکەوە پەیوەندییان بەنەتەوە پەرستییەکی بەهێزەوە هەیە. ئەم تایبەتمەندێتییە بەهێزەی میللیگەرایی دەرگا لەپێش دەوڵەتی نەتەوەیی دەکاتەوە. دوای ئەوەی دەوڵەتی نەتەوەیی لەمیانەی عەلمانییەت پەردەی ئایینی بەلاوە دەنێت گەشە دەکات. لەناوەڕۆکدا چەمکی وەك " دەوڵەتی نەتەوەیی" لەریشەدا هەڵەیە. ئەگەر مرۆڤ باسی نەتەوەییبوونی کۆمەڵگاو یەکپارچەیی نەتەوەیی بکات هەندێ راستی نیشاندەدات، بەڵام نەتەوەییبوونی دەوڵەت حوکمێکی ئایدیۆلۆژییە؛ واقیعی کۆمەڵگانییە. چونکە تەواوی کۆمەڵگا ناتوانێ ببێتە خاوەنی دەوڵەت. بەردەوام دەوڵەت لەژێر فەرمان و خزمەتی کەمینەیەکی نەتەوەدایە. ئەوەی دەوڵەت ئەنجامیدەدات ـ لەبابەتی ئایینیش هەمان شتی ئەنجامدابوو ـ راستینەی نەتەوەی بۆ راستینەی ئایدیۆلۆژی وەردەچەرخێنێ، بەمجۆرە کۆڵەکەکانی رەوابوون بۆ خۆی بەدەستدێنێ. سەرجەم میللیگەراییەکانی سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم پەیوەندییان بەو بانگەشانەی رەوابوون هەیە. نەتەوەپەرستی بەرامبەر دەرەوە لەوروژاندن و هاندانی هێرشبەری، لەناوەوەش لەشاردنەوەی ناکۆکییە چینایەتییەکاندا رۆڵێکی مەزن دەبینێ. دەبێ مرۆڤ وەك چەکی ئایدیۆلۆژی دەوڵەتی سەرمایەداری دەرك بەمیللیگەرایی بکات. گەر بەم شێوەیە دەرکی پێبکرێت ئەوا سەبارەت بەتێگەیشتنی قۆناخەکانی پەلهاوێشتن و بڵاوبوونەوەی گرنگ و بایەخدارە. میللیگەرایی لەهەمانکاتدا ناوەندێتی ناو دەوڵەت بەهێز دەکات. بەرامبەر بەپێکهاتەی فیدراڵ و دیموکراتیك میللیگەرایی دەوڵەت بەرەو ناوەندێتی دەوڵەت (یونیتار)ی دەچێت. لێرەشەوە بەرەو چەمکی دەوڵەتی فاشیست و تۆتالیتار دەچێ، ئەو نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەی دەبێتە هیستریا شانبەشانی سیستەمی سەرمایەداری پێشوو، کە ڕوو لەشێوەی دەوڵەتی فاشیست و تۆتالیتارە بەیەکەوە بەڕێوەدەچن. ئەنجام؛ خۆکوژی (انتحار)ی سەرمایەدارییە. لەم چوارچێوەیەدا دەتوانین شەڕی یەکەم و دووەمینی جیهان وەك چالاکی خۆکوژی سیستەم هەڵسەنگێنین. چونکە میللیگەرایی بەشێوەیەکی زێدەڕۆیی بەکارهێنرابوو. سەرمایەداری کە بەخۆی قەیرانی شارستانییەتە بەشێوەیەکی گشتی و قووڵ دەکەوێتە ناو قەیرانێکی فراوان، واتە دەکەوێتە قۆناخی گێژاو(فوضى)وە.

کاتێك لەمیانەی ڕێنومایییەکی تیۆری یەکپارچەو بەرفراوان سەیری کۆمەڵگای سیستەمی سەرمایەداری بکەین، دەبینرێ کە وەك بێ ئەمپاترین گروپی بەکار بردن دزەی کردۆتە نێو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی. بەمجۆرە دەتوانین بەکاربردن هەڵسەنگێنین؛ دەرفەت ببینێ هەموو شتێك بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆی دەقۆزێتەوە. هەڵپەرستی وەك هونەرێك دەبینێ و پەرەی پێدەدات. ئامانجی یەکەمی بەهای ماددییە. بەڵام بەو ئەندازەیەی خزمەت بەپێشکەوتنی ماددی بکات ڕوو لەفیکر، باوەڕی و هونەر دەکات کەئێمە وەکو بەهای مەعنەوی هەڵدەسەنگێنین. فەلسەفە بنچینەییەکەی ئەوەیە کەچاوەڕوانی قازانج لەهەموو دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەکات. بەهاکانی کۆمەڵگای کۆمەڵکاری بێت یاخود دەوڵەتی پلەداری بێت، لەبواری بەکاربردن و بەکارهێنان جیاوازییان لەنێواندا ناکات. بەهۆی ئەم تایبەتمەندێتیەیەوە لەو کرم و ڤایرۆسەی شێرپەنجەی دەچوێنین کە کەوتۆتە ناو جەستەی مرۆڤ. هەربۆیە پەندی " کرمی دار لەخۆیەتی " مان بەبیر دێنێتەوە. با دیسان بەزمانی نموونەهێنان و لێکچواندن ئاماژەی پێ بکەین، تاوەکو گورگ نەکەوێتە ناو تەواوی مێگەل، ڤایرۆس تەواوی جەستە نەگرێتەوە، تاوەکو کرم تەواوی دارنەخوات و نەیخات، لەوانەیە کۆنترۆل بکرێن و دیاردە پەیوەندیدارەکان بتوانن درێژە بە خۆیان بدەن. کاتێك سەرمایەداری دەبێتە سیستەمی باڵادەست شیمانە دەکرێت بەگەڵێك لایەنی دیکەدا بکەوێت ــ ئەمە لەسروشتەکەیدا هەیە ــ هەربۆیە سەرمایەداری لەقۆناخی هەرە مەترسیداردایە. ئەوەیە کە بەتۆتالیتاریزم و فاشیزم بەناو دەکرێت. لە دۆخێکی وەهادا کۆمەڵگا بەردەوام لەناو کەش و هەلومەرجی شەڕدایە. شەڕ نەك تەنیا وەکو یەکەمین و دووەمین شەڕی جیهان، لەئاستێکی جیهانگیری و فەرمیدا بەشێوەیەکی سەربازی پێکدێن. هەرە مەترسیداریش ئەوەیە کە لەناو سەرجەم دەزگاو دامەزراوەکانی کۆمەڵگادا شەڕ ڕوودەدات، ئەو لۆژیکە دەستپێدەکات کەپێی دەگوترێ: "مرۆڤ گورگی مرۆڤە". تەنانەت شەڕ لەنێوان ژن و مێردو منداڵان و تەواوی سروشتدا بڵاو دەبێتەوە. بۆمبای ناوکی گوزارشتێکی ڕەمزی ئەم ڕاستییەیە. لەناو تەواوی کۆمەڵگادا وردە وردەو بەشێوەیەکی بەردەوام بۆردوومانێکی ئەتۆمی ئەنجامدەدرێت.

کاتێك تەماشای قۆناخی جیهانگیری و دەوڵەتی نەتەوەیی دەکەین دەبینین کە ڕەوش بەرچاوترە. دوای ئەوەی دیاردەی نەتەوەیی بەرەو زێدەڕۆیی دەبات و دەستبەسەر دەوڵەتدا دەگرێت ئەو تاکەی سەرەتا هێزی بەدەستهێنابوو هەروەکو بڵێی دەکەوێتە قۆناخی بەمێروولەبوون. ئەو مرۆڤپەروەری و تاکێتییەی لەمیانەی ڕێنیسانس مەزن ببوون ئیتر دەکەونە ناو قۆناخێکی سەراوژێربوون. هەروەکو بووبن بەئامانجی هێرشەکان پەلاماریان دەدەن. ئەم ڕاستییە بەشێوەیەکی جودا جیاوازی نێوان بەهاکانی ڕێنیسانس و سەرمایەداری نیشاندەدات. کاتێك سەرمایەداری گەورە دەبێ تاك بچووك دەبێ. مرۆڤپەروەری دەبێتە چەمکێکی ناوەڕۆك پووچ و بەناوی جیهانگیری و لەئاکامی پێشبڕکێی چاوچنۆکی چەند کۆمپانیایەك, دەبێتە چەمکێك کە جێی خەجاڵەتییە. جگە لەدەوڵەتی نەتەوەیی دەبێ تەواوی دەزگاکانی دیکە بتوێنرێنەوەو داگیربکرێن. بەمجۆرە پرەنسیپی " هیچ بەهایەك لەدەوڵەتی نەتەوەیی مەزنتر نییە " دەشەکێتەوە، لەئاکامیشدا دەوڵەت قەڵغانێکی پیرۆزی وەها دەپۆشێ کە لەهیچ قۆناخ و چاخێکدا نەیتوانیوە ئەنجامی بدات. هەموو شتێك بۆ دەوڵەتی میللییە!. ڕاستتر ئەوەیە کە بەفێڵبازییەوە لەژێر دەمامکی دەوڵەتی نەتەوەیی هەموو شتێك بۆ سەرمایەدارییە. دەوڵەت، بەتایبەتیش دەوڵەتی نەتەوەیی لەپێناو بەدەستهێنانی قازانج و زێدە ـ بەها بەشێوەی کورتەڕێ خاوەنی سیحرێکی وەهایە کە میللیگەرایی وەك ئایدیۆلۆژیای دەوڵەتی نەتەوەیی دەکرێت بەڕێبازی باوەڕی و بڕوامەندییەك کە هیچ باوەڕی و تێگەیشتنێکی ئایینی و میتۆلۆژی پێینەگەیشتووە. هەروەکو دڵ و چاوەکانی سەرجەم پەیوەستدارەکان کوێر بکات, جگە لەکارەکتەرە زلکراوەکانی دەوڵەتی نەتەوەیی هیچ بەهایەکی دیکەی لەلا واتادارنییە. پیرۆزی تەنیا لەو بەها نەتەوەییانەدا شاراوەیە کە گەورەکراوەو بەشانوباڵیدا هەڵدەدرێت. بەرامبەر ئەمە هەروەکو بڵێی دەخوازن مرۆڤ بکەنە ئەندامی تەریقەتەکانی چاخی ناوین هەوڵدەدەن بەتەریقەتی دەوڵەتی ببەستنەوە.

مەسەلەی هاوولاتیبوون راستییەکە دەبێ باش شرۆڤە بکرێت. لەراستیدا لەجێی پەیوەندی "کۆیلە ــ رەنجبەر"ی چاخی سەرەتایی و ناوین پەیوەندی "تاك ــ دەوڵەت" بەجێ دەکرێ. بەشێوەیەك بۆرژوازی (دەوڵەت) بۆ پەیوەندی کۆیلایەتی دەگەڕێتەوە, لەژێرناوی هاوولاتیبوونی دەوڵەت بەشێوەیەکی دیکە کۆیلەی هاوچەرخ بۆ سیستەم ئامادە دەکرێت. ئەمەش بەو مانایە دێت کەتاك گەیشتۆتە ئاستێك بەکەڵکی بۆرژوازی بێت. بۆ گەلێك بابەت لەسەرووی هەمووشیانەوە سەربازی و باج بەرپرسیارێتی دەبێت. بەمجۆرە ئەو هێزە ئامادە دەبێت کەدەوڵەت و چینی باڵادەست پێویستییان پێیەتی. بۆ بۆرژوازی منداڵبوونیان کردووە بەکارێکی بێخەرجی. هەرچەندە بەتیۆری باسی مافی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و کولتووری بکرێت لەناوەڕۆکدا ئەم مافانە بەقورسایی هی چینی دەسەڵاتدارە.

کاتێك سەرمایەداری دەستبخاتە ناو هونەرو زانست ئەنجامی مەترسیدارتر لەگەڵ خۆیدا دێنێ. بەگشتی زانست و هونەریان کردۆتە ئامرازی دەسەڵاتی دەوڵەت. لەگەڵ سەرمایەداری کاری زانستی و دەسەلات لەمیانەی هێزی شۆڕشی زانستی بەئاستێك گەیشتووە کەهاوتاکەی نەبینراوە. دوای ئەوەی سەرمایەداری هێزی هونەرو زانست دەخاتە ژێرڕکێفی خۆی هێزی چەوسانەوەو هەژموونگەری بەئاستێکی مەترسیدار دەگات. چۆنی دەخوازێ بەمجۆرە تاك بەڕێوەدەبات و دەتوانن سوودی لێ ببینن. نەك تەنیا زهنییەتی تاك بەڵکو چەمك و تیۆرییە بنچینەییەکانیشی بەگوێرەی جیهانی تایبەتی خۆی دەگۆڕێ، هەروەها تاك دەکاتە خاوەن روانگەی ئەسپ و دڵێکی تەنەکەئاسا. بەم تێڕوانین و دڵانە مرۆڤ دەبێتە بەرژەوەندیپەرست، ئۆگۆیست، بێخەم، ستەمکار، بێهەست، وشك و رۆبۆت. جیهانی ئاسوودەو پرشنگداری رێنیسانس جێگای خۆی بۆ جیهانێکی کپ, مردوو و بێڕوح بەجێدێڵێ کە پیرۆزییەکەی نەماوە، جۆشوخرۆش و حەسرەتە قووڵەکەی لەدەستداوەو خاوەن رووخسارێکی ترش، ماندوو و بێزاربووە. بەشە رەنجدەرو زەحمەتکێشەکەی کۆمەڵگا کەبەهێزی بازوویان کاردەکەن وەکو ئەو مریشکانەیان لێکراوە کە تەنیا هێلکە دەکەن. ژیان تاکە واتایەکی ماوە ئەویش هێلکە کردنە. لەمیانەی خۆراکەوە فێردەکرێن و رادەهێنرێن. ئەو مرۆڤەی تەنیا بیر لەئابووری دەکاتەوە, هەموو شتێکی گرێدراوی زگ تێرکردنەو لەم پێناوەشدا بیردەکاتەوە. لەوەش مەترسیدارتر ئەوەیە کە یەکەمین جارە لەمێژوودا سیستەم بووە بەخاوەنی ئەو توانستەی مرۆڤ بەبێکاری و وێڵی دەهێڵێتەوە. بۆ هێزی کاری هەرزان سوپای بێکاران گەورە دەکات و بەئامادەیی لەدەستی خۆیدا دەهێڵێتەوە. پەیوەندی بۆرژوا و کارکەر دەگاتە ئاستێکی وەها کە ئەو کارکەرەی سەرەتا یاخی بوو وەك بەرخۆڵەی لێدێت و لەرەنجبەرەکانی چاخی ناوین زیاتر پێویستی بەخاوەنەکەی دەبێت. ئیتر کارکەر ئەو کەسە نییە کە شۆڕش لەژێر ناوی ئەنجامدەدرێت، بەهۆی زیادبوونی بێکاری و کەمی کرێ وەك کۆیلە بەدوای خاوەن کارەکەیەتی, لەم رەوشەدا کارکەر سەربەخۆ نرخ و بەهانییە، بەڵکو پاشکۆیەکی خاوەن کارو دامەزراوەکەیە. ئەوان چی بن ئەویش هەمان شتە.

بەشەکانی دیکەی کۆمەڵگا کە لەرەوشێکی مەترسیداردا دەژین، دۆخی منداڵ و ژن و بەساڵاچووان لەرەوشێکی بێڕەحمتر دان. ژن لەئاوابوونی پلەداری بەولاوە بەهۆی چاوچنۆکی و بێ خەمی پیاو کە لەژێر هێزە وشك و قەباکەیدا دەناڵێنێ، لەمیانەی سیستەمی سەرمایەداری بەچینێك زنجیری دیکە دەبەسترێتەوە. ئەو هەبوونەی هەرە زێدە پیاو درۆی لەبارەیەوە هەڵدەبەستێ ژنە. دەگێڕنەوە فرۆید کە هەرە زێدە سەبارەت بەمەسەلەی زایەند لێکۆڵینەوەی کردووە لەسەرە مەرگدا گووتوویەتی " ژن چی یە؟" ئەمە رەوشێکی ئاسایی نییە، بەڵکو دۆخێکی سامناکەو ئایدیۆلۆژیای پیاوسالاری خوڵقاندوویەتی. پیاوی باڵادەست کە ناخوازێ ژن بناسێ بۆ ئەوەی ئەم راستینەیەی خۆی پەردەپۆش بکات، پەنادەباتە بەر یەکێك لە چەکە گرنگەکان کە ئەدەبیاتی ئەشق (دڵداری)یە. بۆ پیاوی باڵادەست ئەشق واتە پەردەپۆشکردنی تەڵەکەبازی، سووکایەتی پێکردنی دەمامکدراو و نەزانی و درێژەپێدانی رەمەکە کوێرەکانی ناخی ژنیش بەو ئاستە دەگەیەنێ کە بەسانایی بەم رەوشە تەفرەبدرێ و بخەڵەتێنرێ. بێگومان ئەمە بەو بێچارەییەی ژن پەیوەندیدارە کە لەژێر سەرکوتکردنندا دووچاری هاتووە. ژن تا

ئەو رادەیە لەهەلومەرجی ماددی و مەعنەوی ژیان دابڕێنراوە کە زۆر داماوانە گوتە ریسواکارەکانی پیاوو هێرشەکانی وەك مافێکی سروشتی پەسند دەکات.

من خۆم وەك کەسێك واقم وڕما و تێنەگەیشتم چۆن ژن دەتوانێ هەرسی بکات و لەژێر سایەی ئەم " ستاتۆ " یەدا بژی کەتێیدایە. بەڵام دەبێ دان بەوەدابنێم کە هەستم بەوەکردووە: کاتێ بۆ سەربڕین ئاژەڵ دەبەنە لای قەساب، ئاژەڵەکان هەست دەکەن کەسەریان دەبڕدرێ بۆیە دەلەرزن، رەوشی ژن بەرامبەر بە پیاو بەردەوام ئەم لەرزەم دێنێتەوە یاد. تاوکو ژن لەبەرامبەری نەلەرزێ پیاو ئاسوودە نابێ. ئەمە یەکێك لەهۆیەکانی بالادەستییە. قەساب جارێك ئاژەڵ سەردەبڕێ، پیاو بەدرێژایی تەمەن ژن سەردەبڕێ. ئەمە ئەو راستییەیە کەپێویستە ئاشکرابکرێت. شاردنەوەی ئەم راستینەیە لەرێگای گۆرانیەکانی ئەشق (دڵداری) هەڵوێستێکی ریسواو سووکانەیە. لەژێرناوی شارستانییەت بیرۆکەو هەبوونی هەرە بێ نرخ و بەها سەبارەت بەئەشق (دڵداری)یە. هیچ کاتێك پیاو نەیتوانیوە، نەیخواستووە بەشێوەیەکی سروشتی و ئاسایی لەژن نزیك بێتەوە. من خۆم پیاوێکی خاوەن هەڵوێستی راست ببینم وەك قارەمانی لەقەڵەمدەدەم. سەرچاوەی لاوازییەکی هاکەزایی و جیاوازی بیۆلۆژی رەگەزی نییە، سەرچاوەی کێشەکە ئەوەیە کە کۆمەڵگای پلەداری دەوڵەتگەرا لەمەسەلەی جیابوونەوەی چینەکان ژنی لەچینی هەرەژێردا بەجێکردووە. بەهۆی ئەم تایبەتمەندێتیانەی ستاتۆکەی، ژن یەکێك لەکێشە قووڵەکانی کۆمەڵگایە. هەرچەندە بەشێوەیەکی سنووردارو درەنگوەختیش بێت لەبەرئەوەی سەرمایەداری کەوتۆتە ناو قۆناخی قەیرانەوە، سۆسیۆلۆژیا بەکێشەکە پەیوەندیدار دەبێت.

لەکاتێکدا هەموو شتێك ئاشکرا دەبێ، ئەوا دەشێ مەسەلەی ژنیش لەهەموو لایەنێکەوە خۆی نیشانبدات. پێویستە بەشێوەیەکی بەرفراوان دەرك بەو ستەمکاری و چەوسانەوەیە بکرێ کە سەرمایەداری سەبارەت بەمەسەلەی ژن زیادیکرد. گوایە ژن کاڵایەکی هەرەبەنرخە. هیچ سیستەمێك تا ئەم رادەیە هەوڵینەداوە ژن بکات بەکاڵا. لەچاخی ناوین و سەرەتاییدا کەنیزەکی و کۆیلایەتی ژن وەك بەشێکی کۆیلایەتی گشتی ئەو قۆناخەیەو بۆ سیستەم هێندە گرنگ نییە. لەو سەردەمەدا تەنیا کۆیلایەتییەکی تایبەت بۆ ژن جێگای باس نییە. حەرامسەرا لەئارادایەو پیاویش جێگای تێدا دەگرێت، پیاوی خەسێنراویشی تێدایە. ئەو کوڕانەشی تێدایە کەپێیانەوە پەیوەندیدارن. جیاوازی هەرەگەورە سەبارەت بەچەمکی زایەندی (سێکس) سەرمایەداری ئەنجامیدەدات. تاکە ئەندام و ئۆرگانێکی ژن نامێنێ کەسەرمایەداری نەیکات بەکاڵا. بەگووتەی ئەوان ئەمەش لەژێر ناوی ئەدەبیات، رۆمان و هونەر ئەنجامدەدەن. رۆڵی ئەم هونەرەش لەراکێشانی باری سیستەمدا ئەوەیە کە بارێکی زێدە بخاتە ئەستۆی ژن. هەروەکو چۆن هەموو کارێك مووچەو بەرامبەرەکەی هەیە، بەڵام کاری هەرە زەحمەت کەمنداڵبوون و بەخێوکردنی و هەمووجۆرە کارو خەباتەکانی ناوماڵە بێ بەرامبەرن. کۆیلایەتی زایەندی ژن بۆ پیاویش بەبێ بەرامبەرە. تەنانەت بەئەندازەی کرێی ژن لە سۆزانیخانە گشتییەکان لەهەندێ خانەی تایبەت (خێزان ــ ماڵ) ژن هێندە بەهایەشی نییە.

ئەو مەسەلانەی وەك ناموسی هاوسەرێتی و شەرەف بەناودەکرێن و هەمووی وەك پەژارەی"ئیمپراتۆری بچووکە" دەبێ ژن بینۆشێ. چۆن ئیمپراتۆری مەزن موڵکی دەوڵەت وەك شەرەفی خۆی دەبینێ، شتێکی بەسەربێت بەهۆکاری شەڕی دادەنێ، ئیمپراتۆری بچووکیش ژن وەك موڵکی خۆی دەبینێ، شتێکی بەسەربێت دەیکات بەمەسەلەی ناموس و تەنانەت بەهۆکاری شەڕی دادەنێت. شتی هەرە سەرنجراکێش ئەوەیە رۆحی ژن پوکێنراوەتەوە، تەنیا شێوەی ژنایەتی ماوەتەوەو کردوویانە بە" چۆلەکە رازاوەکەی ناو قەفەس". سیستەمی ماکیاژو ئاوازی دەنگ رەوشێکە کە بەشێوەیەکی سەخت پشت بە نکوڵیکردنی ناسنامەی خودی ژن دەبەستێت و زۆر لەژنی سروشتی دوورەو کەسایەتییەکەی دەکوژێت. بەشێوەیەکی تایبەت لە رێگای ژنێتی ژن لەکەسایەتی دادەماڵرێ. ئەمە داهێنانێکی پیاوەو بەسەر ژندا دەسەپێنرێ. سەرباری ئەوەی رەوشەکە بەمڕەنگەیە،

هەروەکو بڵێی راوەستەی ژن بەشێوەیەکی سروشتی بەمجۆرەیەو لەتاوانباکردنیدا دوودڵ نابێ. ژن وەك ئامرازی رەکلام و تەشهیرکردن بەکاردەهێنرێ و خودی سیستەم لەبەرامبەر ئەم رەوشە بەرپرسیارە. ئەمەش وەك ناوەڕۆك و سروشتی ژن دەبینرێ. لەمیانەی سەرمایەدارییەوە شەرەفی ژن کەوتۆتە نزمترین ئاستەوە. ئەوەی لەگەڵ ناسنامەی ژن کەوتۆتە نزمترین ئاست لەهەمانکاتدا بەهاکانی کۆمەڵگای کۆمەڵکارییە. لۆژیکی سیستەم هەم پێویستی بەمەهەیە, هەم بەتواناو کارامایە.

رەگەزی ژن کە لەرێگای سێکسی (porno)وە لەهەموو جۆرە پیرۆزییەك دابڕێنراوە، سەرمایەداری خستوویەتییە ئاستی پریماتە سەرەتاییەکان. لەتەواوی مێژووی شارستانییەت ژن لەناو کۆمەڵگا لەناوبردرا. بەئەندازەی رۆڵی پێشکەوتنی چینایەتی و پلەداری هێندەش رۆڵی کۆمەڵگای پیاوسالاری لەمەدا هەیە, کە پیاو گەورەی کردووە. دیسان چەندە ژن کاریگەری خۆی لەناو کۆمەڵگادا ونکردووە بەو ئەندازەیەش لەبەهاکانی کۆمەڵکاری (کۆمۆن) دوورکەوتۆتەوە، سروشتی ژن هێشتا نزیکی بەهاکانی کۆمەڵگای کۆمەڵکارییە. چونکە ژیری (هزری) لەبەرامبەر رووداوەکانی سروشت هۆشیارەو بەشێوەیەکی دروست دەجوڵێتەوە. ژیری سۆزداری لای ژن لەپێشە. ژیری ئەنالیتیك لەبەرئەوەی زیاتر لایەنی هۆنینەوەو گریمانی لەپێشە پەیوەندی لەگەڵ ژیان کەم و سنووردارە. پێشکەوتنی ژیری ئەنالیتیك لەلای پیاو پەیوەندی بە کارەکتەری تەڵەکەبازی و ستەمکارانەیەوە لەناوکۆمەڵگادا هەیە.

قورسایی سیستەم لەسەر جیهانی منداڵان رەوشی گشتی نیشاندەدات. ئەو منداڵانەی لەجیهانی خەیاڵدا دەژین، لەریشەوە پێچەوانەی لێکدانەوەکانی سیستەمن. منداڵان و سەرمایەداری لەگەڵ یەکدی ناگونجێن. بەساڵاچووان وەك منداڵی بەتەمەنن. ریش سپی و زاناکانی پێشتر ریزیان لێدەگیرا, بەڵام بۆ سەرمایەداری بەرهەمهێنان وەك بارێکی گران و هەبوونێکی بێ سوودە. لەوانەیە منداڵان گەورە بکرێن و بەکەڵك بێن. بەڵام لەبەرئەوەی بەساڵاچووان نزیکی مەرگن هیچ بەهایەکیان نییە. لەکەسایەتی بەساڵاچوو و تەمەندارەکاندا کۆمەڵگا لەشکۆمەندی و پیرۆزی دادەبڕێنرێ. کاتێك یەختیار لەخانەی بەساڵاچووان دادەنرێ بەئەندازەی زۆرداری سیستەم لەهەموو لایەنێکەوە بێواتابوون و رووە قێزەوەنەکەی ئاشکرا دەبێت. تەنانەت خودی کێشەی بەساڵاچووان زۆر بەسانایی دەتوانێ بسەلمێنێ کەئەم سیستەمە بۆ کۆمەڵگا پێویست ناکات. لەم بوارە بەپێی پێویست نیشانەی پرسیار بوونی هەیە.

لەگەڵ ئەوەی مرۆڤی مەترۆپۆڵەکانی سەرمایەداری لەهەموو شتێك تێربووە، مرۆڤی دەوروبەر لەهەموو لایەنێکەوە لەناو نەداری و برسیبووندا دەژی. تایبەتمەندی سیستەم لەبواری قازانجی زۆر لە دیالەکتیکی نێوان مرۆڤی قەڵەو و لاوازدا بەرچاوە, کەتەنیا ئێسکەکانیان دیارە. هەروەکو ئەوە وایە کە ناکۆکییەکانی ناو پێکهاتەی کۆمەڵگا ئیتر هێندە توانستی پێشکەوتنیان نەماوە، یان خۆدووبارەکردنەوەیەکی زیاد یان هەڵوەشانەوەی هەندێك دەزگای سیستەم هەمیشەیی قەیران نیشاندەدەن و سەداسەد کەوتنە ناو رەوشی گێژاو دەسەلمێنن. هەروەکو لەهەموو رووداوە یەك بەدوای یەکە زنجیرەئاساکانی سروشتدا دەبینرێ کاتی ئەوە هاتووە ئەڵقەی زنجیرە بپچڕێ. یاساییبوونی کۆن لەپەلوپۆ دەکەوێ. لەبەرئەوەی دەزگاکان رۆڵیان نامێنێ بێواتان. ئیتر وەها لەقەڵەمدەدرێ کەکاتی ئاواکردنی یاسای نوێی واتا و پێکهاتە پێویستەکانی هاتووە.

کێشەی ژینگەپارێزی کۆمەڵگا لەگەڵ شارستانییەت دەستپێدەکات. کۆمەڵگای سروشتی لەلایەنێکی خۆیەوە کۆمەڵگای ژینگەناسییە. ئەو هێزەی لەناوەوە کۆمەڵگای دابڕیوە پەیوەندییە واتادارەکەی لەگەڵ سروشتیش دەبڕێ. بڕین لەناوەوە نەبێت، گرفتێکی نائاسایی ژینگە دەرناکەوێت. ئەوەی نائاساییە ئەو واتادارییەی لەتەواوی قۆناخە سروشتییەکان لەئارادابووە لە کۆمەڵگای شارستانییەتدا لەدەستدەدرێت. هەروەکو ئەوە وایە منداڵ لەمەمکی دایکی دابڕێنرابێت. وردە وردە گەورەیی ژیری سۆزداری لەدەستدەدرێ (ونەکرێ). ژیری ئەنالیتیك کەبەردەوام لەزمانی سروشت و ویژدان دووردەکەوێتەوە، بەو جیهانەی خۆی کە دەیهونێنێتەوە تا دێت ناکۆکییەکانی خۆی لەگەڵ دەوروبەر گەورە دەکات. ناوکە پەتی ژیان لەگەڵ سروشت

باریك دەبێ. خوداوەندو هێزی داتاشراو جێگایان دەگرنەوە. سروشتی خولقكار جێگای خۆی بۆ خوداوەندی ئافرێنەر بەجێدێڵێ. ئەو سروشتەی پێویستە وەك میهرەبانی دایك ببینرێ و بناسرێ مۆری زۆرداری لێدەدرێت. ئیتر هێرشكردنە سەر سروشتی زۆردارو لاڵ (بێ زمان) دەبێ بەقارەمانێتی مرۆڤ. هەمووجۆرە فڕكردنێكی لاسەنگانەی رووەك و ئاژەڵ، پیسكردنی خاك، ئاوو هەوا هەروەكو بڵێی بنچینەییترین مافی مرۆڤە دەبێ بەراهاتن و فێربوونێك. ئیتر سروشتی ژینگە مردووە، وەك گۆڕەپانێكی بەسەرچووی ژیان كوێر دەكرێت. ئەو سروشتەی هیواو ئومێدی بێسنوری سروشتی زیندووە، ئیتر كوێرە، بێرێزە، لەكەڵەكەبوونی ماددەی قەبا بەولاوە شتێكی دیكە نییە.

ئەم چەمكەی سروشت لەمیانەی رێنیسانس هەڵوەشایەوە، بەڵام لەناو كۆمەڵگای سیستەمی سەرمایەداری تاوەكو دوایی بۆ بەكاربردن و چەوساندنەوە كراوەیە. سیستەمی سەرمایەداری دەخوازێ فەتحكردنی مرۆڤ لەرێگای فەتحكاری سروشتەوە تەواو بكات. بەهەموو شێوەیەك بەكاربردنی سروشت وەك مافێك دەبینێ. ئەمەش وەك لێهاتوویی و كارامەیی لەقەڵەم دەدات. دەرئەنجامی شۆڕشی پیشەسازی و ئەنجامەكەی فرێدانی سیگۆرتەی سروشتە كە هەلومەرجێكی دەستلێبەرنەدراوی ژیانی مرۆڤە. باش دەرك بەوە كراوە بێ ئەقڵ و نەزان سروشت نییە, بەڵكو خودی سیستەمە. ئیتر درەنگكەوتوون. ژینگە بەردەوام بانگەوازی فریاكەوتن و هاواردەكات. هاواردەكات دەقیڕێنێ، دەبێژێ: " ئیتر ناتوانم بەرگەی ئەم سیستەمەی كۆمەڵگا بگرم ". كاتێك مرۆڤ لەم لایەنەوە تەماشا دەكات دەبینێ كە هەروەكو بڵێی سیستەم كەوتبێتە ناو گێژاووە، تاوەكو گفتوگۆ لەبارەی ژینگەپارێزییەوە نەكات، واتاو ئاواكردنی كۆمەڵگای ژینگەناسی شرۆڤە نەكات، شانسی ئەوەی نییە لەگێژاو رزگاری ببێت.

كاتێك سیستەمەكانی كۆمەڵگا پێناسە دەكرێن یەكێك لەو چەمكانەی پێویستە مرۆڤ تێینەكەوێ لەڕادەبەدەر گشتگیركردنی پێناسەكانە. بۆ نموونە، كاتێك سەرمایەداری پێناسە دەكرێت، نابێ وەكو هەموو شتێكی كۆمەڵگا یان وەكو خودی كۆمەڵگا ببینرێ. ئەنجامی بەم شێوەیە تا دواڕادە هەڵەیە. چونكە سیستەمی دەسەڵاتدار ناتوانێ نوێنەرایەتی تەواوی كۆمەڵگا بكات. ئەمە دژی دوالیزمی دیالەكتیكییە. بەبێ پێشخستنی دژو ركابەرەكەی خۆی پێشكەوتنی یەكلایەنە هەڵوێستێكی ئایدیالیستانەیەو لەبواری جیهانی دیاردەكاندا نابەجێیەو بە پێچەوانەی مەزەندەكان لەدەرەوەی سیستەمی دەسەڵاتدار گۆڕەپانە بەرفراوانەكانی كۆمەڵگا سەرهەڵدەدەن. لێرەدا پاشماوەی سیستەمی كۆن، ركابەرانی سیستەمی دەسەڵاتدارو ئەلتەرناتیفی ئایندە بەناویەكدادەچن. كۆمەڵگا لەناو بزێوی و جموجۆڵێكی زیندوو دایە. زیاتر بەرەو پێشەوەبردنی یاساو مافداری بەردەوامی بەرەوابوون و وەرچەرخان دەدات. شەماتیككردنی سیستەم تێگەیشتن سانایتر دەكات. ئەگەر شەماتیزم (كرۆكیكردن) لەشوێنی هەموو راستییەكان دابنرێ مەترسی بوون بەهۆكاری هەڵوێستی دۆگماتیزم لەئارادایە. هەربۆیە پێویستە شەماتیكبوون لەگەڵ پێكهاتە تێكەڵەكەی راستی هاوواتا نەكرێت.

هەڵسەنگاندنی سەبارەت بەسەرمایەداریشیان شەماتیزەكردووە. هەربۆیە چەندین خاڵ و مەسەلەهەن لەیەكپارچەیی بابەتەكە دووردەمێنن. دەشێ هەندێ لایەن بەشێوەیەكی زێدەڕۆیی گەورەكرابن.

بەهۆی ئەم فاكتەرە بوو كەزیاتر هەڵوێستەمان دەرهەق بەپێناسەكرد. گرنگیدان و سەرنجدانە زلنەكردن و بچووك نەكردنەوەی قۆناخی پێشكەوتنی سیستەم بۆ هەڵسەنگاندنە بابەتییەكان بایەخدارە. نە لەمیانەی قەدەرگەرییەوە گەشەكردنی مۆدێل راستە، نە لەمیانەی كەهانەتەوە دەتوانرێ داهاتوو وەك ئەنجامێكی حاشاهەڵنەگر پێشبینی بكرێت. نێوانی یاساكانی كۆمەڵگا كورتخایەنە. بەشێوەیەكی چڕو بەرفراوان دەشێ واتا پێشبخرێ و گرێدراوپێیەوە پێكهاتەكان ئاوابكرێن. دیسان بەبێ پەنابردنە بەر قەدەرگەرایی و پێشبینییەكان، بەدەستەوەگرتنی سیستەمەكان لەناوخودی دینامیزمی خۆیاندا, بەدەستەوەگرتنی واتاكەی لەرێگای شێوە بەرجەستەكەی لایەنی ئەرێنی زانیاری زانستییە. بەڵام فەلسەفە لەرێگای میتۆلۆژیشەوە دەتوانێ كۆمەك بەدەوڵەمەندێتی واتا بكات و رۆڵی تێدا ببینێ. ئاشكرایە كە ناتوانین دیاردەیەكی وەك كۆمەڵگا

وەکو یاسا سادەکانی فیزیا پێناسە بکەین. چونکە تەواوی پەرەسەندنی سروشتی لەناواخنی خۆیدا گرتووە. لەفیزیای کوانتۆمیشدا ئەم راستینە سەلمێنراوە کە ناتوانین لەزۆر نادیاری رابکەین. چونکە خۆشمان لەنزیکەوە پارچەیەکی ئەم دیاردەیەن. لەنێوەندی رێنیسانسدا تەنیا ئەو بەهایانە وەرنەگیران کە لەقۆناخی راگوزاری بۆ سەرمایەداری گواستراوەتەوە. یەکێك لەئەگەرەکانیش ئەوە بوو کە لەمیانەی کەرەستە دەوڵەمەندەکانی بۆ پێکهاتەی کۆمەڵگای کۆمەلکاری دۆزینەوەی هێزی واتاداری پێویست بوو.

ئۆتۆپیاگەراکانی سەرەتایی وەك کامپانێلا، تۆماس مۆر، فرانکیس باکۆن و ئەوانەی دواتر فۆریەر، رۆبەرت ئۆوین، ئۆپرۆ ئوتۆن, بیر لەچەندین سیستەمی کۆمەڵگای کۆمەڵکاری دەکەنەوە. تەنانەت جێبەجێ هەوڵی رێکخستنی دەدەن. هەروەها لەسەردەمی رۆشنگەریشدا چەند فەیلەسوفێك دەردەکەون و سەبارەت بەتایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای نوێ قاڵدەبنەوە. شۆڕشەکانی سەرەتا بەردەوام روویان لەلایەنی چەپڕەوی بوو، بەردەوام لایەنێکیان ناتەواو بوو. سیستەمی سەرمایەداری بەو رەوشەی کەتێیدا سەقامگیربووە وەك وێناو گریمانەی هیچ بیرمەندێك پێکنەهاتووە ئەو ئۆتۆپیا کۆمەڵایەتییانەی بیرمەندە جددیەکان بەدوای کەوتوون و لەپێناویدا تێکۆشاون خاوەن کارەکتەرێکی کۆمەڵکارین. رۆڵێکی دیاریکەر بە ئەخلاق دەدرێ. سەرباری ئەمەش فاکتەری بابەتی لەجۆری هێزی باوەڕی دەوڵەت، قورسایی ئەرستۆکراسی پێشوو کە لەئارادایە، پێشکەوتوویی بۆرژوازی نوێ بەرامبەر بە رکابەرەکانی و هەندێ فاکتەری دیکە لەسەرکەوتنی سەرمایەداری بەکاریگەربوون. بەکارهێنان و بەکاربردنی کۆمەڵناسە نوێیەکان کە بەشێوەیەکی فراوان شوێنپەنجەی کۆمەڵناسەکانی کۆمەڵگای بالادەستی کۆنیان هەلگرتبوو رەوشێکی دەرکپێکراوە. ئەگەر هێزی هزری ئەو بەرنامەیەی نەبێت کەبتوانێ هێزی دەسەڵات ـــ دەوڵەت تێپەڕبکات هەرشەرێکی لەگەڵ دەسەڵاتدا ئەنجامبدرێت دەبێتە یاری چاوشارکێ و لەمەزیاتریش هیچ واتایەکی دیکەی نابێت. راکردن بەدوای دەسکەوت و تالانکاری کە ریشەیەکی مێژوویی هەیە، ئەو سامانە گەورانەی لەمیانەی دۆزینەوە جوگرافییەکان بەدەستهاتن، لەمیانەی داهێنانە زانستییەکانەوە بۆ شۆڕشی پیشەسازی تێپەڕبوون, لەشۆڕشی سیاسییەوە هەڵکشان بەرەو دەسەلات، لەرێگای دەوڵەتگەرایی مارکانیلیزم جێگیربوون لەناوەندی هێزی دەوڵەتی نەتەوەیی، ئەم فاکتەر بنچینەییانەو سەرمایەو قازانجی لەناوەڕۆکی سیستەمدا کۆبوونەتەوە بەکەڵك بالادەستی سیستەم دێن. ئەو سەرمایەیەی لەسەدەی نۆزدەهەمدا لەئاکامی شۆڕشی پیشەسازی بەسیستەم بوو چاوەڕوانی ئۆتۆپیاگەراکانی پووچەڵکردەوە. هەربۆیە بەرامبەر ئەمە پێویستی بە پێهەلگرتنێکی تیۆری و تێکۆشانێکی سیاسی بەهێز هەبوو. لەم قۆناخەدا پێخەمبەرایەتی کارل مارکس و فریدریك ئەنگلس دەردەکەوێتە پێش.

بەرامبەر بەسیستەمی سەرمایەداری کەلەسەدەی نۆزدەهەمدا سەداسەد لەسیستەمی شارستانییەتەکان سەرکەوتنی بەدەستهێنا. دەتوانرێ بگووترێ کە هزری رکابەر بەشێوەیەکی سیستەماتیك خۆی رێکخست و کەوتە ناو چالاکی سیاسییەوە. رێنیسانس، رۆشنگەری و شۆڕشی پیشەسازی سەرچاوەی هەردوو بزووتنەوە پێکدێنێ. تێڕوانین و دیدگای ئایینی بالابوونی خۆی لەدەستداوە، بۆچوونی دونیای عەلمانی دەرکەوتۆتە پێش. شۆڕشی زانستی و رێبازە هاوچەرخەکانی هونەر ئەو لێهاتوویی و کارامەییەیان هەیە کە رێنمایی پێشکەشی ئەم پێشکەوتن و گۆڕانکاریانە بکەن.

ئەوەی لەناو هزرەکانی رکابەرێتی سیستەمدا پێشکەوت مارکسیزم بوو. کارل مارکس و فریدریك ئەنگلس هزری ئۆپۆزسیۆنەکان(رکابەرەکان)ی خۆیان بەسۆسیالیزمی خەیاڵی بەناوکرد، ئەوەشیان دەستنیشانکرد کە بالادەست نەبوونی شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری رۆڵێکی ریشەیی لەمەدا بینیوە. سیستەمی هزریان گرێدراوی ماددیگەرایی (دەتەرمینیزم)ێکی وشکی ئابوری بوو، بەمجۆرە لەهەموو کەسێکی جیاکردنەوە. سیستەمی دیالەکتیکی هزری " هیگل " یان بەبنەماگرت، بەلام بانگەشەی ئەوەیانکرد کە لەسەراوژێربوون رزگاریان کردووەو لەسەرپێیەکانی خۆیان داناوەتەوە. سیاسەتی

ئابووری ئینگلیزو سۆسیالیزمی خەیاڵی فەرەنسی وەك سەرچاوەی دیکەی خۆیان دیاری دەکەن. لێرەدا ئەو بەشەی دەکەوێتە سەر ئەڵمانیا ئیلهامی فەلسەفییە. بەڵگەنەویستە کە بەگوێرەی سەردەمی خۆیان کۆتێزێکی بەهێزیان پێکهێناوە. لەسەردەمێکدا کۆمەڵگایەکی خاوەن سیستەم لەبەرامبەریاندا بەرەو سەرکەوتن دەچێ، ئەوانیش ئۆپۆزسیۆنێکی خاوەن سیستەم لەدژیان رێکدەخەن. لەراستیدا ئەمە هەوڵدانێکی گەورەی هەستی بەرپرسیارێتی و پێشبینیکردنە. یەکەمین بەرهەمی ئەم هەوڵ و کۆششانەیان مانیفێستۆی کۆمۆنیزمە. بەجۆرێك ئامادەکراوە هەروەکو بەرنامەی پارتێك بێت. لەماوەیەکی کورتدا وەك بەرنامەی کۆمۆنیستی رادەگەیەنرێ. کارل مارکس و فریدریك ئەنگلس بۆئەوەی خۆیان لەسۆسیالیستەکانی دیکە جودا بکەنەوە، خۆیان وەك "سۆسیالیستی زانستی" بەناو دەکەن.

ئاشکرایە کە بەگوێرەی سەردەمی خۆیان ئەوەی بەشێوەیەکی هەرە باش سەرمایەداری شیکردەوە ئەوان بوون. دەشێ بەرهەمی سەرەکی مارکس "سەرمایە" وەك پێناسەیەکی مەزنی سەرمایەداری ببینرێ. فریدریك ئەنگلس لەمیانەی بەرهەمی "بناخەی دەوڵەت و موڵکایەتی تایبەت و خێزان" دا بەشێوەیەکی بەرفراوان شرۆڤەی مێژووی کۆمەڵگای کردووەو هەوڵیداوە سیستەمی هزری تەواو بکات.

ئەنجامی ئەو سۆسیالیزمەی مارکسیزم بناخەکەیەتی لەدەوروبەری سالانی 1850 تا رۆژگاری ئەمرۆ سەرباری ئاشکراکردنی تەواوی کەموکورتی و هەڵەکانی ئەنالیزی سیستەم لایەنە راستەکانیشی ئاشکراکردووەو روونیکردۆتەوە. بۆ ئەوەی شیکردنەوەی سیستەمی مێژوویی باش بناسین لەوانەیە سرنگ کردنیان لەگەڵ نموونە مێژووییە هاوشێوەکانیان سوودمەند بێت. یەکەمین مانیفێستۆی لەسەرچاوە نووسراوەکان ناسیومانە " دە فەرمانەکە " یە. پێهەڵگرتنی حەزرەتی موسا لەسەردەمی کۆیلەداری سەرەتایی میسر فۆرمیلە دەکات. بەو ئەندازەیەی ئیلهام لەمەزهەبی تاکخودایی فیرعەون ئاخناتۆن (خودای خۆر) وەردەگرێت. هێندەش دەکەوێتە ژێرکاریگەری ئایینی " یەهوا " ی پێشووی جولەکەکان. لەرێگای دە فەرمانەکە دەخوازێ کۆمەڵگا (هۆزی عیبرانی) بخاتە ناو سیستەمێکەوە. ئەو مانیفێستۆیەی مەزنندە دەکرێ سالی 1300 ی پ. ز راگەیەندراوە کاریگەرییەکەی تا رۆژگاری ئەمرۆمان هاتووە. بەشی یەکەمی پەرتووکی پیرۆز (عەهدی قدیم) شاکارێکی فراوانکراوی دە فەرمانەکەیە. عەهدی قەدیم لەناوەخۆیدا بۆچەندین بەش جیادەبێتەوە، لەمیانەی مانیفێستۆی پێخەمبەرەکانی سەردەمە هەستیارەکان بەشێوەیەکی یەکپارچەیی تاوەکو حەزرەتی عیسا درێژدەبێتەوە.

دەتوانین " ئینجیل " یش وەك دووەمین مانیفێستۆی مەزن پەسندبکەین. ئینجیل جاڕنامەیەکی نەریتی حەزرەتی عیسایە کە لەژێر ناوی هەژارە بندەستەکان و بێکارەکان لەدژی کۆیلەداری رۆما پێشخراوە. لەوانەیە یەکەمین هەنگاو بێت کەبەناوی چینی ژێردەست دەهاوێشترێت. بەگشتی بەناوی مەسیحێتی رێگای لەپێش ئەنجامی گرنگ و بایەخدار کردەوەو, هەر وەکو رابردوو, ئەمرۆش بەکاریگەرە. بەئەندازەی نەریتی پێخەمبەرایەتی خاوەن نەریتی عەزیزو عەزیزەکانە. هەروەکو ئەولیاکانی ئیسلام هێشتا گەلێك وانەو ئەزموون هەیە کە مرۆڤ لێیان فێرببێت.

سێیەمین مانیفێستۆی گەورەو دیرۆکی "قورئان"ە. حەزرەتی محەمەد شانبەشانی بۆچوون و تێڕوانینەکانی خۆی سەبارەت بەهۆزە عەرەبیەکان شرۆڤەکانی خۆی دەرهەق بەتەورات و ئینجیل دەگەیەنێتە یەکتر و دەیکاتە جاڕنامەی مەرجەکانی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی چاخی ناوین. ئەوروپا بەگوێرەی ئینجیل خۆی رێکخست، رۆژهەڵاتی ناوینیش بەگوێرەی قورئان. هەرچەندە ئەمانە بەشێوەیەکی ئایینی هۆنراونەتەوە، راست ئەوەیە کە ئەم نموونانە وەك مانیفستۆی چارەسەری کۆمەڵگا ببینرێ.

**ئەو پرسەی مرۆڤ سەبارەت بە پەرتووکی " سەرمایە" بیکات ئەمەیە، سەرمایەداری رووخاند یاخود بەهێزتری کرد؟**

دەتوانین هەمان پرسیار دەرهەق بەمانیفێستۆی سیستەمەکانی دیکەش پێشبخەین. بۆ ئەوەی مەسەلەکە روونبکەینەوە پێویستە کۆڵەکەکانی دیالەکتیکی تێز ــ دژە تێز ــ کۆتێز بەشێوەیەك رۆشنبکەینەوە کە دەرکی پێبکرێت. هەروەکو لەسەرەتاش ئاماژەم پێکردبوو, تایبەتمەندێتی دوالیزمی لەگەردووندا پارچەبوونی یەکە بۆ دووان. هەروەکو بلێی لە پەیوەندی مادده ـ وزەدا یەکێتی (یەکانەیی) سەلمێنراوە. ***هاوکێشەی A*** - E=mc2 بەگوێرەی پێویست رێنیشاندەرە. وزە وەك ئەو بەشە دیاریدەکرێت کە مادده دەبزوێنێ و دەیگۆڕێ. دەشێ وەك ئەو ناوەڕۆکە پێناسەبکرێ کە بەسەربەستی ماوەتەوە. " فۆتۆن" کە وردەماددەی بزێوی تیشکە لەگەوهەری خۆیدا ئەو وزەیەیە کە لەمادده دابڕاوە. گۆڕینی تەواوی ماددەو بوونیان بە فۆتۆن بەواتای بوون بەتیشك دێت. ئاکتیفی رادیۆ گوزارشت لەم قۆناخە دەکات, بەلاّم دیسان دوالیزمی مادده ـ وزە راستییەکە. لەناوەڕۆکدا هەمان ڕەنگی ڕێگا لەدوالیزم ناگرێت. ئەمەیە کە وەکو نهێنی ماوەتەوە (یەکانەیی) بۆچی و چۆن بەرەو دوالیزم دەچێ ؟ مەیلی "دوالیزم" چییە و چۆن پێکدێت ؟ شیمانەیەکی هەرە لەپێشە گۆڕانکارییەکی نێو ئەتۆم رەنگ و شێوە بەهەموو جولەو هەمەڕەنگییەك دەبەخشێ. بەگوێرەی دوا لێکۆڵینەوەکان بەشێوەیەك کە بەبیری مرۆڤیشدا نایەت روونبۆتەوە کەپێکهاتن و وەرچەرخانی زۆر خێرا و دەمکورتی تەنە بچووکەکان قۆناخی بەئەتۆمبوون دیاری دەکات، ئەتۆمەکانیش گەردەکان پێکدێنن، گەردەکانیش ئاوێتەکان پێکدێنێ، بەمجۆرە دەرك بەوە دەکرێت کە توخم و ئاوێتەی نوێ هاتۆتە ئاراوە. شیمانە دەکرێت زەمینەی بارگاوی (مانیەتیکی) جیاوازیش رۆڵ لەمەدا ببینن.

گونجاندنی ئەم قۆناخەی سروشت بەگوێرەی کۆمەلگاش ناچارییە. هەرچەندە یاساو مافداری کۆمەلگا جیاوازیش بێ لەناو هەمان سیستەمدا دەجولێتەوە. بەشێوەی هێلی گشتی دەزانین کە وەرچەرخانەکانی سیستەمی کۆمەلگاش لە ــ یەك ــ واتە لەقلان (تیرەی سەرەتایی) دەستییپێکردووە. هەروەکو دەزانین قلان کۆمەلگای پلەداری لێکەوتەوە، کۆمەلگای دەولەتیش لەکۆمەلگای پلەداری پێکهات و تاگەیشتە سەرمایەداری بەشێوەی هەمەڕەنگ تێپەڕبووە.

پێویستە مرۆڤ بەشێوەیەکی راست دەرك بەچەمکی دژەکان بکات، دوولایەنی دژ یەکتری لەناونابەن، بەلکو یەکێکیان ئەویتر بارگاوی دەکات (لەخۆوە دەگرێت), بۆ ئاستێکی جیاواز هەلدەکشێ و بۆ پێکهاتێکی جیاواز وەردەچەرخێ. ئەگەربەمجۆرە شرۆڤەی بکەین، توانستمان بۆ تێگەیشتنی راستییەکان زیاتر دەبێت. خالێکی دیکەی گرنگ سەبارەت بەم بابەتە ئەوەیە کە ئەو وەرچەرخانەی روودەدات لەسەرهێلێکی راست و رێك و پێك بەرێوە ناچێت. وەرچەرخانی دژەکان بەشێوەی A×B=AB نییە. دەشێ ئەم هاوکێشەیەی لۆژیکی کلاسیك بەشێوەیەکی کاتی و بۆماوەیەکی کورت رۆڵ ببینێ. وەرچەرخان لەجیهانی دیاردەکاندا زیاتر بەشێوەی زگزاکی، حەلەزونی و بەسەرەیە، هەندێ جار خێرایە، هەندێ جار هێدی، لەجیاتی بێ دەستپێك و ئەبەدی زیاتر تایبەتمەندێتی سات و بەردەوامی لەخۆوە دەگرێت. مرۆڤ دەتوانێ پەسندی بکات کە وەرچەرخان لەنێوەندی گێژاودا لەشێوەی راستەهێل ئاساوە تادەگاتە بازنەیی، تایبەتمەندێتی گۆڕاو لەخۆوە دەگرێت.

لەرەوشێکی وەهادا کاتێك دژبەرێك بەرامبەر بەسەرمایەداری دەردەکەوێت، بانگەشەی ئەوەبکرێت لەبواری رێباز سەرمایەداری لەناو دەبات و بەکۆمەلگا نەخشە بۆ کێشراوەکە واتە بەسۆسیالیزم دەگات، دەشێ تەنیا ئەگەرێکی داتاشراوبێت. خودی راستی زۆر جیاوازە، بوویەرەکانیشی بەشێوەیەکی جودا روودەدەن. سیستەمی سەرەکی دەتوانێ رکابەرەکەی بتوێنێتەوە، بیکات بە کۆلۆنی، دەشێ لەرێگای پەرەسەندنەوە بیگۆڕێ، لەمیانەی شکانێکی توندیش دەشێ ببێتە ئامرازی سیستەمێکی نوێ.

سەبارەت بەو بوویەرانەی لەسەر رێبازی مارکسیزم روویانـدا دەتوانین بلێین لەبواری تیۆری و پراکتیکی لەناو سەرمایەداریدا تواونەتەوە. لەسێ لایەنەوە توانەوە روویداوە: سۆسیال ــ دیموکرات، سۆسیالزمی بونیادنراو و رزگاری نیشتمانی. ناتوانرێ بگووترێ لەمیانەی ئەم سێ رێگایە یاخود دیاردەیە سەرمایەداری هیچ نەگۆڕاوە. گۆڕانکاری گرنگ بەدیهاتووە. تابلێی گۆڕانکاری لیبرالیانە هاتۆتە ئاراوە. بەلاّم لەسایەی ئەم رێگایانە سیستەم توانیویەتی هەبوون و تەمەنی

خۆی درێژبکاتەوە. روونکردنەوەی ئەمە لەمیانەی دژە شۆڕشەکان پەسند ناکرێ و تێر ناکات. مەسەلەکە قوولترە. گرێدراوی چۆنییەتی و خاسییەتەکانی ئەو سۆسیالیزمەیە کە پەسندکراوە.

جیاوازی سەرمایەداری ـ کارکەر سەرچاوەی ریشەیی هەڵەو کەموکورتییەکانە. جیاوازی نێوان سەرمایەداری ــ کارکەر لەگەوهەری خۆیدا هێندە لەجیاوازی کۆیلە ـ ئەربابی خانەی رۆما جوداتر نییە. مرۆڤ دەتوانێ لەپەیوەندی نێوان رەنجبەر ــ ئاغاشی بچووێنێ. کاتێك لەناوخێزانێکی باوکسالاری شێوەی رێکخستنی پیاو و کۆڵەکەکانی لەگەڵ رێکخستن و کۆڵەکەکانی ژنی وابەستە بێننە بەرامبەر یەکتر، ئەوا لەسەرەتاوە لایەنی سەرکەوتووی ململانێ و پێکدادانەکە دیارە. بەدەر لە دۆخە شازەکان، لەئەنجامی شەڕێك کەلایەنی سەرکەوتووی دیارە، بێگومان لەئاکامی ئەم شەڕەدا بەرامبەر بەژنی پەرێشان و داماو پیاو بەهێزتر دەبێت. ژن زیاتر بووە بەموڵکی پیاو، دیسان ناکۆکی لەئارادایە، بەڵام بەو ئەندازەیەی دووچاری گۆڕان هاتووە هەندێکی دیکە لەناو سیستەمی پیاوسالاریدا تواوەتەوە. دەتوانین ئەم نموونەیە بۆ کۆمەڵگاش بەکاربێنین. لەڕێی گونجاندنی تیۆری و پراکتیکەوە چاوەڕوانیکردنی رزگاری لەو ژنە کە لەهەلومەرجەکانی شارستانییەتی چینایەتی و تەنانەت بەرلەوە لەکۆمەڵگای پلەداریدا بەهەزارو یەك کۆت و بەندەوە لەژێر باڵادەستی پیاودا بووە، لەخەیاڵگەراییش بەولاوە جگە لەلێدان و گرێدانی زیاتر هیچ واتایەکی دیکە نابەخشێ. لەو سەردەمەی کە ژن ژنێتی پەسندکردووە مەحکومی ژێرکەوتن بووە. بەرخۆڵەی ژێر دەستی قەساب چەندەی کۆشش بکات تا چ رادەیەك رزگاری دەبێت ؟ شانسی ژیانی بەرخۆڵە وابەستەی ویژدان و بەرژەوەندی قەسابە. دەتوانێ بۆ بەرهەمی شیرو خوریەکەشی بەخێوی بکات دەتوانێ سەریشی ببڕێ.

پێچەوانەی مەزندەکان چینی کارکەر بەرامبەر بەسەرمایەداری لەناو جۆرە ناکۆکییەکی لەناوبەر (تناحری) ــ دا نییە. ئەگەر تەماشای سەرمایەداری رۆژگاری ئەمڕۆمان بکەین دەبینین کە کارکەرێکی ئیش و مووچەیەکی باشی هەبێت بەیەکێك لەئەندامانی چینی سەرووی کۆمەڵگا لەقەڵەمدەدرێت. ئەوانەی گورزی کاریگەری سیستەمیان بەردەکەوێت سوپای گەورەی بێکاران، گەلە چەوساوەکان، گروپە ئایینی و ئەتنیکییەکان، زۆرینەی ژنانن ؛ دیسان رەوشی ناکۆکی منداڵان و لاوان، تەمەندارو بەساڵاچووان و ناکۆکییە ناوخۆییەکانی سیستەمی ژینگەی ئابووری، ناکۆکی نێوان تۆڕی جێیێ و پێگەگرتنی بەرژەوەندییەکانی ناو کۆمەڵگای سەرمایەداری، گوند ـ شارە گەورە ــ بچووکەکان، دەسەڵات ــ زانست، ئەخلاق ــ سیستەم، سەرباز ـ سیاسەت و.. هتد و بەسەدان ناکۆکی دیکە ناوەندی سیستەم دیاری دەکەن. تاوەکو تەواوی ئەم دیاردانە بەبنەما نەگیرێت ئەوا لەمیانەی چەمکێکی قووڵی کۆمەڵگا دەتوانرێ هەست بەوەبکرێ کە تیۆرییەکی شۆڕشی ــ گۆڕانکاری پشت بەکارکەرێك ببەستێ کەخاوەن جیاکاری بێت و بەسانایی لەلایەن سیستەمەوە بەڕێوەببرێت هێندە شانسی نابێت.

هەڵوێستی مارکسیزم هێشتا بەدەست کەموکوڕی ریشەیی دەناڵێنێ. نەیتوانیوە تەواوی شارستانییەت ئەنالیز (شرۆڤە)بکات. ئەنگلس خۆی تاقیکردۆتەوە, بەڵام سنوودارماوە. بە پێی ئەمان لەمێژوودا ناکۆکی نێوان کۆمەڵگای چینایەتی و کۆمەڵگای کۆمەڵکاری سروشتی تێپەڕکراوەو بەشێوەیەکی دواکەوتوو لەقەڵەمدەدرێت. پێناسە مێژووییە بەرفراوانەکەمان ئەوەی نیشاندا کە تێکۆشانێکی بەرفراوان و بەردەوام لەنێوان هەڵوێستی دیموکراتییانەی کۆمەڵکاری و هەڵوێستی دەوڵەتگەراییدا هەیە. لەناوچوون و دواکەوتوویی بەها کۆمەڵکاری و دیموکراتییەکان لەولاوە بمێنێت, بەڵکو لەپێکهاتنی هەموو سیستەمەکاندا رۆڵی دینامیکی دەبینن. دەتوانن سیستەمی سەرمایەداریش لەگەڵ ئەمانە لەقەڵەمبدەن. لەسەرهەڵدان و گەشەکردن و قەیرانی هەڵوەشانەوەی سیستەمی سەرمایەداری ناکۆکی هەرە کارا سەبارەت بە بەها دیموکراتی و کۆمەڵکاریەکانە. سیستەم دەتوانێ کارکەر، جووتیارو گەلێك چینی دیکە لەخۆوە بگرێت و بەڕێوەیان ببات. تەنانەت دەتوانێ بیکات بەهاوپەیمانێکی باشی خۆی. لەمیانەی گەرمکردن و هاندانی تاکڕەوێتی دەتوانێ بەڕێوەبەرایەتی خۆی بشارێتەوەو درێژەی پێبدات. بەڵام کۆمەڵگا لەکۆمەڵگابوونی خۆی دەرناکەوێت. چونکە کۆمەڵگا بەشێوەیەکی ریشەیی دیموکرات و کۆمەڵکارییە. هەربۆیە سەرمایەداری

بەرامبەر بەكۆمەڵگا تاكڕەوێتی دەخرۆشێنێ و هاری دەكات. ئارەزووە شاراوەكان دەخاتە سەرهەڵدان. بەشێوەیەكی بەرەواژی و پێچەوانە كۆمەڵگا بەرەو كۆمەڵگای پریمات (بەمەیموونكردنی كۆمەڵگا) دەگەڕێنێتەوە. چەندەی كۆمەڵگا بەرخودان بكات و لەكۆتاییشدا بەتەواوەتی پەرتەوازە ببێ شانسی دەركەوتنی كۆمەڵگایەكی نوێ دەڕەخسێنێ. پرۆژەكانی وەرچەرخانی كۆمەڵگا ئەگەر لەسەرەتاوە ئەم لایەنە بنچینەییەی ناكۆكییەكان رەچاو بكەن, دەتوانن شانسی سەركەوتن بەدەستبێنن.

گرێدراو بەم بابەتە ئەگەر ئەم تۆڕە ئەخلاقییە بەبنەما دانەنرێت كەسەرمایەداری هەڵیوەشاندەوە هیچ ناكۆكییەك بەشێوەی تەكنیكی شانسی چارەسەری نابێت. ئەگەر ئاكاری كۆمەڵایەتیبوونی نەبێت، ناشێ و ناگونجێ تەنیا لەمیانەی رێبازی یاسا، سیاسەت، هونەرو ئابووری كۆمەڵگایەك بەڕێوەببرێت و وەرچەرخێنرێ. ئەخلاق شێوەیەكی هەبوونە؛ پێویستە وەك شێوەی پەیدابوونی خۆیی كۆمەڵگا لە ئەخلاق تێبگەین و دەركی پێبكەین. باسی ئەخلاقی سنوورداری نەریتی ناكەم. باسی ئەو دڵ و ویژدانەی كۆمەڵگا دەكەم كە لەرێگایەوە خۆی بەڕێوەدەبات. ئەو كۆمەڵگایەی ویژدانی خۆی لەدەستداوە كۆتایی پێهاتووە. جێگای سەرنجە ئەو سیستەمەی هەرە زێدە لە قووڵاییدا ئەخلاقی شێواندووەو چەواشەی كردووە سەرمایەدارییە. لەبەرئەوەی سیستەمی دواییە شێواندنی ویژدانی كۆمەڵگا دەركی پێدەكرێت. گوزارشتی بەرجەستەی كۆتاییهاتنی توانستی سیستەمی فشارو چەوسانەوە، بەواتای تێكدانی سیستەماتیكی ئەخلاق دێت. هەربۆیە تێكۆشانێكی ناچاری ئاكاری ــ ئەتیك، ئەخلاقی بەزانین ــ بەرامبەر بەسەرمایەداری پێویستە. تێكۆشانێك كەبەپێی ئاكار بەڕێوەنەبردرێت، هەرلەسەرەتاوە ژێركەوتووە.

لەماركسیزمدا كەسایەتی بەتەواوی لەناو بەهاكانی سیستەمی سەرمایەداریدا دەژی. شارستانیبوون (شاریبوون) زیاتر لەپێشە. شێوازی ژیانێكی پووختەی بالادەستی ناوشار بەهەزارویەك بەندەوە تاك بەسیستەمەوە دەبەستێتەوە. دەبێ مرۆڤ باش بزانێ كەخودی ماركسیش لەمیانەی هەزارویەك بەندەوە لەناو سیستەم بوو. لەئایینی ئیسلامی و مەسیحیشدا تەنانەت ئەو كەسانەی لەسیستەم دادەبڕان و بەدەیان ساڵ لەمانستەرو تەكیەكان و ژوورەكان دەكەوتنە خەڵوەتەوە كاریگەرییەكی سنوورداریان هەبوو, زۆرینەی تێكۆشەرە ماركسیستەكان ئاگاداری ئەم شێوە ئەخلاقە نین. لەو بڕوایەدان كە لەگەڵ ئەم یان ئەو جۆرەی سەرمایەداری بژین و لەرێگای تیۆری ـ كرداری بەئەنجام بگەن.

سەبارەت بە تێزی شۆڕشی سیاسی و قۆناخەكانی دواتری بەشێوەیەكی زۆر مەترسیدار كارەكتەرێكی دەوڵەتگەراو پلەداری لەماركسیزمدا هەیە. هەروەك بڵێی چەمكەكانی شەڕ، دیكتاتۆریەتی پرۆلیتاریاو دەوڵەتگەرایی پیرۆزكراوە. هەروەكو دەزانرێ دەوڵەت، دەسەلات، شەڕو سوپا بەرهەمی شارستانییەتی كۆمەڵگای چینایەتییە، بەشێوەیەكی رەها ئامرازی ژیانی بالادەست و چەوسێنەرانە و دەستیان لێبەرنادرێت. ئەگەر ئەم ئامرازانە پێشكەشی پرۆلیتاریا بكرێت، كەواتە هەر لەسەرەتاوە بڕیاردراوە كە خۆی وەك ئەوان لێبكات. لەقۆناخی سۆسیالیزمی بونیادنراودا ئەم ئامرازانە بەربەرفراوانی بەكارهێنراو سەركەوتن بەدەستهێنرا. بەڵام دوای حەفتا ساڵ دەرك بەوەكرا كە شێوەی هەرە تاڵانكاری سەرمایەداری ئاواكراوە ـ بەبەراورد لەگەڵ ئەو وەك بڵێی سەرمایەداری ئەورووپای رۆژئاوا بەحەوت ئاو شۆردراوەتەوە . شێوەیەكی تۆتالیتارو دژە دیموكراسی سەرمایەداری ئاواكراوە، چەمكی دەوڵەت لەژێر ئەمەدا شاراوەیە. ئەو دەوڵەتەی ئەنگلس دەیگووت " پێویستە وردە وردە بچووك ببێتەوە" لەقۆناخی سۆسیالیزمی بونیادنراودا گەیشتە قۆناخی هەرە بەهێزی خۆی. لێرەدا گەڕان بەدوای نیازخراپی یاخود هەڵوێستێكی دژ بەشۆڕش بێواتایە. ئەو ئامرازانەی بەكاریدێنێ ــ تەنانەت دەوڵەتی بەتەواوی زەوتیش كردبێ ــ بەرەو سۆسیالیزمی نابات, بەڵكو بەرەو سەرمایەداری دەچێت. سۆسیالیزم پێویستی بەئامرازی سۆسیالیستیانەیە. ئەویش، دیموكراسی، بزووتنەوەی ژینگەپارێزی، بزاڤی ژن، ماڤی مرۆڤ و میكانیزمی تایبەتی خۆپاراستنی كۆمەڵگایە.

دەتوانین لێرەدا بابەتی وەك پارتی، سەندیکا، ئاشتی، بزووتنەوەکانی پێشووی رزگاری نیشتمانی، سیاسەت و گەلێك شتی دیکە کە وەك فاکتەرەکانی سیستەمی فەرمی لەراستی کۆمەڵگا تێپەڕنەکراون, وەك نموونەی سەرنەکەوتن نیشانبدەین. کاتێك لەچوارچێوەیەکی گشتی فەلسەفی و ستراتیژیدا بەتێڕوانینێکی دیموکراتی و ژینگەپارێزی سەیری ئەم ئامرازانە نەکرێت لەئەنجامدا چەندین ئامرازی تێکۆشان بەکاربهێنرێت لەکۆتاییدا بەسیستەم دەبەسترێنەوە.

رەخنەیەکی دیکەی ئاراستەی مارکسیزم بکرێت لەبارەی هەلومەرجی سیاسییە. لەسەردەمی مارکسدا سەرمایەداری لەقۆناخی پێگەیشتندا بوو. هەربۆیە مارکس و ئەنگلس سەرمایەداری وەك ناچارییەك دەبینن. سەرمایەداری وەك بلدۆزەرێك هەڵدەسەنگێنن کە رێگای سۆسیالیزم خۆشدەکات و دەکاتەوە. ئەگەر بەشێوەیەکی فراوانتر ئاماژەی پێبکەین، لەپێشکەوتنی شارستانییەکاندا کۆمەڵگای چینایەتی وەك ناچاریەك دەبینن، بۆ دامەزراندنی سیستەمیش شرۆڤەیان کردووەو بڕوایان بەپێویستی هەبوونی ئەم قۆناخە هێناوە. پێشتریش ئاماژەمان پێکردبوو پێویستە ئەمە وەك هەڵەیەکی بنچینەیی هەڵسەنگێنرێ. چینەکان و دەوڵەت وەك ئامرازی باڵادەستی بەڕێوەبەرایەتی جگە لەئاسایشی پێویست و بەڕێوەبەرایەتی گشتی تەواوی هەبوون، دەزگاو دامەزراوەکانی، نەك تەنیا بێ کەڵکەو پێویست ناکات بەڵکو لەرەوشێکی موحافەزەکاریدایە. دەشێ خزمەت و ئاسایشی کۆمەڵگا بەبێ دەوڵەتیش فەراهەم بکرێت. بەر لەهەموو شتێك سەرمایەداری دەوڵەت، باڵادەستی زێدە لەدەرەوەو ناوەوە، بیروکراسی گەورەکراو و چەندین دەزگای دیکەی دەوڵەتی کۆمەڵایەتی لەبەردەم دیموکراسی و ژینگە کۆسپن. لەبواری ئەخلاقیشەوە ـ جگە لەپاراستنی ناچاری و دیموکراسی ـ پێویستە دەزگای وەك شەڕ ــ سوپا رەتبکرێنەوەو پەسند نەکرێن. خودی مارکس کاتێك دەڵێ : " تیۆری شەڕی چینایەتیمان لەمێژوونوسانی فەرەنسی وەرگرتووە" لەراستیدا وەك پێدراوێکی سروشتی چۆنێتی و سیفەتی ئامرازە بەکارهێنراوەکان تاوتوێ دەکات. شێوازی شەڕی چینە باڵادەستەکان بەشێوەیەکی دەزگایی وەك خۆی پەسندی دەکات. لەچەمکی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاشدا ئەمە بەم شێوەیەیە. وەرگرتنی رەفتارو کردەوە دیکتاتۆریەکانی مێژوو وەك خۆی بەهەڵە نابینێ.

لەسەردەمی لینین و ستالیندا بەردەوام دیکتاتۆریەت دەبێتە دۆخی دەوڵەت. بەرلەوەی دیموکراسی پراکتیزە بکرێ نکوڵی لێدەکرێت. بەڵام کاتێك لینین دەیگووت سۆسیالیزم بەدیموکراسیدا تێپەڕدەبێ زیاتر نزیکی راستی دەبۆوە. لە قۆناخەکانی دواتردا شێوازی سیاسەتی چینی باڵادەست زیاتر لەناوەند جێگیردەبێ, دەوڵەت و پارتی دەبنە هەمان شت. لەدەرەوەو ناوەوە پارتی بەتەواوی دەبێتە دەزگایەکی دژە دیموکراسی. سیاسەتەکانی شەڕو ئاشتی ناو سیستەم تەنیا دەبن بەو جۆگەلە ئاوانەی کە ئاشی سەرمایەداری هەڵدەسوڕێنن. بەڵام ئەم هەڵەو خەتابارییە ریشەییانەی دەتوانین زیاتر بیانژمێرین،حەفتا ساڵیشی بەسەر تێپەڕبووبێت لەئەنجامی سروشتی خۆی زیاتر، لەئافراندنی سەرمایەداری و بەهێزکرنی بەولاتر ناتوانن رێگا لەپێش گۆڕانکاری ریشەدار بکەنەوە.

بەڵام سەرباری ئەمەش لەتێکۆشانێکی ئازادی و یەکسانیدا مارکسیزم ئەزموونێکی مەزن و مێژووییە. قورسایی چینایەتی و ئابووری گەیاندۆتە کۆمەڵناسی. بۆرژوازی ناچارکردووە سەبارەت بەبابەتەکانی رزگاری نیشتمانی, مافی مرۆڤ و دەوڵەتی سۆسیال نەرمتر بێت. بەهۆی هەڵوێستی تەسکی بەشێوەیەکی تەکتیکی نزیکی دیموکراسی دەبێتەوە، ناتوانێ ئازادی ژن و ژینگەپارێزی لەسەرمایەداری جودابکاتەوە، هەروەها لەبەرئەوەی تیۆرییە بنچینەییەکانی لەبارەی ژیان لەناو قاڵبەکانی بۆرژوازی دەمێنێتەوەو تێپەڕی ناکات، تەڤلی سیستەم دەبێ و پارچەیەکی پێکدێنێ. بزووتنەوەکانی رزگاری نیشتمانی و سۆسیال دیموکراتەکان کە لەئاکامی کاریگەری سۆسیالیزمی بونیادنراوو ئیلهام وەرگرتن لەمارکسیزم سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، وەك شێوە هەرە لاوازەکانی سۆسیالیزم هیچ کاتێ لەسەرمایەداری دانەبڕان. توێژەکانی ناویان زیاتر لایەنگری سەرمایەدارین. لەجیاتی فەراهەمکردنی ژیانێکی نوێ بۆ جەماوەرەکەیان، زیاتر لەم پێناوەدا تێدەکۆشن کە سوود لەو ژیانە ببینن کە

لەئارادایە. خۆشگوزەرانی و هاوبەشێتی کێشەیەکە پەیوەندی بەیاساو مافداری(مافپەروەری) سیستەمەوە هەیە. لەراستیدا مرۆڤ وەك مەزهەبە گەورەکانی سەرمایەداری تەماشای سۆسیالیزمی بونیادنراو، سۆسیال ــ دیموکرات، رزگاری نیشتمانی، لیبرالیزم و موحافەزەکاری بکات لەو بڕوایەدام گونجاوو بەجێتربێت. مەزهەبەکانی نێو ئایینی ئیسلام، مەسیحی و یەهودی چەندە لەسەرچاوەکانیان جیاوازترن، ئەوا مەزهەبەکانی لەسەرمایەداریش دەرکەوتوون بەو ئەندازەیە لەسەرچاوەکەیان جیاوازن. لەراستیدا جیاوازی نێوان مەزهەب و سەرچاوەکەی هاوشێوەی جیاوازی نێوان هەمان خێزان (بنەماڵە)یە. لەسەرمایەداریدا رێبازەکانی لەشێوەی ئەنارشیزم و ئایینی لەرەوتی مارژینالی بەولاوە گوزارشت لەشتێکی دیکە ناکەن.

لەدوای دووەمین شەڕی جیهانی کەشی سەرکەوتنی دژە ــ فاشیستەکان هێندە درێژەی نەکێشا. بزووتنەوەی لاوان و رێنمایی شۆڕشگێری سالانی 1968 لەبواری تیۆری و چەمك رێگای لەپێش گۆڕانکاری گرنگ و بایەخدارکردەوە. بەشێوەیەکی گشتی نەفرەتکردن لەسیستەم پەرەیسەند. دەرك بەوەکرابوو کەسۆسیالیزمی بونیادنراو، سۆسیال ــ دیموکراتی و رزگاری نیشتمانی ناتوانن وەلامی ئومێدو چاوەڕوانییەکان بدەنەوە. ئەوجیهانەی بەلێنی لەبارەیەوە درابوو لەوەی پێشتر باشترنەبوو. دەتوانرێ بگووترێ دوای ئەوەی چەندین رێبازی رۆشنبیری کە لەماوەی نێوان شۆڕشی 1848 و 1970 تەڤلی مارکسیزم ببوون هێزی خۆیان لەدەستدا، ئاشنای چەندین رێبازی نوێی دیکە دەبین, لەسەرووی هەمووشیانەوە چەپڕەوی نوێ، بزاڤی ژنان و ژینگەپارێزی. دوای ئەوەی باوەڕی بەسەرمایەداری و تەنانەت بە ئەندازەی ئەویش بەسۆسیالیزمی بونیادنراو شکا، لەئەنجامی دووەمین شۆڕشی مەزنی زانستی سالانی 1950کان و پێشکەوتنەکانی بواری کولتووری فێمینیزم (ژنناسی)، ئەکۆلۆژی (ژینگەناسی)، ئەتنۆلۆژی(نەژادناسی) هەنگاوی گەورەیان بەرەو پێشەوە هاوێشت.

هەروەکو مەزنده دەکرێ هەلوەشاندنەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو لەسالی 1989 بەگوێرەی بەرژەوەندی سەرمایەداری نەبوو. ئەمە بەو واتایە دەهات کەیەکێك لەئەلقە سەرەکییەکانی سیستەم دەپچڕێ و دەکەوێ. ئەو سیستەمەی لەمیانەی شەڕی سارد جەماوەری خۆی لەسەر پێیان رادەگرت، لەرێگای دەولەتی سۆسیالیزمی بونیادنراوو رزگاری نیشتمانی گەلانی خەریك دەکردو لەپەلەکوتکێیدا دەهێشتنەوە ئیتر رووخابوو.

بەرامبەر بەکۆمەلگای دەولەتگەرایی لەتەواوی جیهان ساردبوونەوەیەك بەدیهات، بڕوایەکی وەها دروستبوو کە ئەم کۆمەلگایانە ناتوانن چارەسەری فەراهەم بکەن. میللیگەرایی و دەولەتی نەتەوەیی بەشێوەیەکی بەرچاو توانستی خلەفاندن و کات بەسەربردنیان لەدەستدا. تەنانەت لەولاتە پێشکەوتووەکانی سەرمایەداریشدا جگە لەماوەیەکی کورت، دەولەتەکانی لەبواری کۆمەلایەتیشدا خۆشگوزەرانبوون کاریگەری خۆیان لەدەستدا. لەهەموو بوارێکەوە سیستەم کەوتە ناو قۆناخێکی نوێوە. کاتێك مرۆڤ چاوێك بەمێژووی سەرمایەداریدا بخشێنێ دەبینێ کە رێنیسانس یەکێك لەو سیستەمانەی کۆمەلگا بوو کە بەشێوەیەکی کارامەیی توانیبووی لەنێو رەوشی گێژاو دەربکەوێت. بەشێوەیەکی لێهاتووانە سوودی لەشۆڕشی سیاسی وەرگرت. لەمیانەی شۆڕشی پیشەسازی بەلوتکەی پێگەیشتن (کاملبوون) گەیشت. بوو بەیەکەمین سیستەم کە پەلهاوێشتن و بلاوبوونەوەی خۆی لەتەواوی جیهان تەواو بکات. لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا رووبەڕووی قەیرانی قوول بۆوە، هەولی ئەوە درا لەرێگای شەڕی جیهانی چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە، لەراستیدا قەیرانی سەرمایەداری تەواوی سەدەی بیستەمی گرتەوە. شەڕی یەکەم و دووەمینی جیهانی، ماوەی نێوانیان، بەر لەشەڕو دوای شەڕیش نیشاندەدەن کەسیستەم تەنیا لەرێگای شەڕ دەتوانێ خۆی لەسەرپێیان بهێلێتەوە. دوای ئەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو و شێوەکانی پەرەیان بەرکابەرایەتی(جەمسەرگەری) دا، لەشەڕی گەرم هەنگاو بۆشەڕی ساردنرا. هەلوەشانەوەی 1989 ئەو تواناکاریەی لەدەستدەرخست و سیستەم لەناو بۆشاییەکدا مایەوە. لایەنێکی نەبینی کەهێرشی بکاتە سەر. دەبووایە دوژمنی نوێ بئافرێنێ. لەدواییدا ئەمەی لەرۆژهەلاتی ناویندا دۆزیەوە کەخاوەن ریشەیەکی ئیسلامییە.

ئیتر لەچەمکناسی (وشەناسی) نوێدا بابەتی لەجۆری جیهانگیری و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەئارادان. جیهانگیری بەواتای پەلهاوێشتن و بڵاوبوونەوەی سیتسەمەکان دێت و هیچ لایەنێکی نوێی نییە. لەتیرەی سەرەتاییەوە تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان تەواوی سیستەمەکان جیهانگیرین. هەر سیستەمێك بەسەربکەوێت کەم تا زۆر شانسی بڵاوبوونەوەی هەیە.

ئیمپراتۆری چەمکێکی کۆنە. دوای ئەوەی دەوڵەتشارەکان زیادبوون، دەوڵەتیش بووە هی هەموو شارەکان، هەلومەرجی دەرکەوتنی ئیمپراتۆریەت دەڕەخسێ. چەندە شارەکان زێدەدەبوون، ئەوا بەرفراوانبوونی ئیمپراتۆریەتیش خۆی دەسەپاند. شێوازو گۆڕەپانی بەرچاوی ئیمپراتۆریەت سەرهەڵدەدەن. نەریتی ئیمپراتۆری " سەرجۆن " کە بەداگیرکردنی شارەکانی سۆمەر لەلایەن ئەکەدیەکانەوە دەستپێکرد تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە. ئیمپراتۆریەتی کۆیلەداری بەرفراوانترین و بەهێزین ئیمپراتۆریەت بوو کە تا ئەوکاتە جیهان بەخۆیەوە دیبوو. ئیمپراتۆریای دەرەبەگایەتی بێزەنتی و عوسمانی کە لەشوێنی ئەو دامەزران درێژەیان بەهەمان نەریت دا. لەچین و هیندستانیش ئیمپراتۆریای هاوشێوە دامەزران. هەروەها لەقۆناخی ئاواکردنی سەرمایەداریشدا پورتوگالیەکان، دواتر ئیسپانیەکان، دواتریش ئیمپراتۆریەتی ئینگلتەرا کە رۆژی لێ ئاوا نابێت، تاوەکو کۆتایی شەڕی دووەمی جیهانی درێژەیان بەم نەریتەدا. هەروەها رەوشی دوالیزمی ئیمپراتۆریای ئەمریکاو سۆڤییەتی دوای شەڕ کە لەناو گرژیدابوون، لەساڵی 1989 بەلایەنی ئەمریکادا شکایەوە. ئیتر هیچ کۆسپێك لەپێش ئیمپراتۆریەتی رۆمای سەرمایەداری نەمابوو.

ئیمپراتۆریەتەکان خاوەن کارەکتەرێکن: لەشێوەیەکی ناوەندیبوون و یەکپارچەیی (یونیتار) زیاتر بەشێوەی ئەیالەتەکان (ویلایەتەکان) دابەشدەکرێن. لەبەرئەوەی گەلێك نەریتی دەوڵەتی پێشوو پەسند دەکەن بەردەوام شێوەیەکی فیدراسیۆنی سست و خاو لەپێشە. لەدەرەوە چەندە هێزو لایەنی زیاتر بخەنە ژێررکێف و دەسەڵاتی خۆیانەوە ئەوا ئەیالەت و دەوڵەتە پاشکۆکانی ناوەوەش ژمارەیان زیاتر دەبێ. کاتێك پەلهاوێشتن و بڵاوبوونەوەو بەرفراوانبوون لەئاستی جیهانگیریدا بێت نەریتەکان زیاد دەبن و دووبارەدەبنەوە.

ئیمپراتۆریەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش لەسەردەمی خۆیدا لەناوەوەو دەرەوەش رووبەڕووی هەمان کۆسپ دەبێتەوە. پێویستە باش بزانرێ کە ئەمریکا لەخاڵی سفرەوە ئیمپراتۆریەت ئاوا ناکات؛ بەڵکو درێژە بەنەریتی هەزاران ساڵە دەدات. ناچارە بەردەوامیشی پێبدات. سیستەمی دەوڵەتەکانی جیهان بەبێ ئیمپراتۆریەت نابن. هەبوونی دەوڵەتی لەیەك جوداو سەربەخۆ ئەگەرو گریمانەیەکە. لەراستیدا بوونی نییە. بەڵکو ئەوەی لەئارادایە پێویستی دەوڵەتەکانە بەیەکتری. لەناو سیستەمدا لەدەوڵەتی هەرە بەهێز تا لاوازترینیان، گشتییان پێویستییان بەیەکترەو هەندێکیشیان دەبن بەئیمپراتۆریەت. ئەوەی خاوەن سیستەمێکی هەرە بەهێزە، وەك ئیمپراتۆری مەزن دەبێت بەخاوەن قسە. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەم نەریتەی ئیمپراتۆریەتی لەسۆڤییەت و بریتانیا وەرگرت. لەجوگرافیایەکی بەرفراواندا بەسەدان زمان، کولتوورو هەبوونی سیاسی و ئابووری لەخۆوە دەگرێت، بەشێوەیەکی قووڵ و بەرفراوان بڵاودەبێتەوە. سەرمایەی زۆرو قازانجی سیستەم بەردەوام ئەم قۆناخە تاودەدات، جێگیرکردنی هاوسەنگی قازانج گرێدراوی پەلهاوێشتنە. کاتێك بەرژەوەندی چەند هێزێك تێکبچێت پەیوەندییەکانیان خراپدەبێت. بەهۆی هەبوونی رێسای " بەهێزترین " جەمسەرێکی دیکە ئاوا نابێت. ئەمە دژی لۆژیکی سیستەمە.

لەدوای ساڵی 1990 جیهانگیری و ئیمپراتۆریەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەم چوارچێوەیەدا بەدوای هاوسەنگیدا دەگەڕێن. ئەو گێژاو (کائیوس)ەی سیستەم کە سەرمایەداری تێیدا دەژی نیشاندەدات کە قەیران بەشێوەی جاران تێپەڕ ناکرێت. هەربۆیە جیهانگیری سەردەم بەناو قەیراندا تێپەڕ دەبێت. ئەو فاکتەرانەی قەیران زیاد دەکەن سەرباری ئەوەی کە لەرابردوو ماونەتەوە، بەڵام وەك دەبینرێ قەیران بەهێزتر دەکەن. سەرەڕای تەواوی لێکدانەوەو تەگبیرەکان، بەهۆی یاسای

کەمبوونەوەی قازانج، پیسبوونی ژینگە، زیادبوونی خەرجی بەهۆی باج وەرگرتن، ئەو خەرجیانەی بەهۆی کردەوەکانی دەوڵەتی کۆمەڵایەتی زیاد دەبێت، هەروەها بەهۆی ئۆپۆزسیۆنی دیموکراتیك ڕێژەی کەڵەکەکردنی سەرمایە کەمدەبێتەوە. جیاوازی نێوان چەمکەکانی ناوەوەو دەرەوە زۆر کەمدەبێتەوە. جیهانگیری ناچاردەبێ وەك تاکە دەوڵەتێك ڕۆڵ ببینێ. لەقۆناخی بەمجۆرەدا سیستەم و هاوپەیمانەکانی سەرلەنوێ پەیوەندییەکانیان ڕێکدەخەنەوە. ئەو دەوڵەتە نەتەوەییانەی لەقۆناخەکانی دەرکەوتن و پێگەیشتنی سەرمایەداری سەریانهەڵداو هەندێ تایبەتمەندێتی سەربەخۆخوازییان هەبوو ئیتر دەبن بەکۆسپ. لەبەرئەوەی دەبێتە هێزی هەرە گەورەو هەروەها بەهۆی کارەکتەری ئابووری جیهانگیری میللیگەرایی کۆن و دەوڵەتی نەتەوەیی هەرس ناکات.

بەتایبەتی ئەو دەوڵەتە کۆمارییانەی لەسەر ڕێبازی نەریتی شۆڕشی فەڕەنسان زیاتر تەنگەتاو دەبن. بەرخودان دەکەن و دەبنە نموونەی موحافەزەکاری. ئەم ڕاستییە سەرچاوەی ناکۆکی نێوان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو یەکێتی ئەوروپایە. دیموکراسی و کۆمارگەرایی ئەوروپا سەبارەت بەبابەتی سەربەخۆخوازی جاران چاوچنۆکە. دیسان ڕەوشی کۆلۆنیالی بەبیردێتەوە. لەبیرناکات کەسەرمایەداری کەعبەیەتی. هەربۆیە گرژی نێوان یەکێتی ئەوروپاو ئەمریکا ڕشتە. سەرباری ئەوەی پاسیفیك، چین و ژاپۆن وەك سێیەمین گۆڕەپانی سەرهەڵدانی سەرمایەداری نوێ دەبینرێ و خاوەن توانستیش بێت دەتوانێ بەشێوەیەکی ڕێژەیی سەربەخۆیی خۆی بپارێزێ. وڵاتەکانی ئەم گروپە لەلاساییکردنەوەی سیستەم کارامەن، ئینجا بەشێوەیەکی تاکانە بێت یاخود تێکەڵ. وڵاتانی وەك ڕوسیاو بەرازیلیش بەسەربەخۆییەکی ڕێژەیی ڕازی دەبن. لۆژیکی هێزی تایبەت بەسیستەم ئەمە دەسەپێنێ. ئەو وڵاتانەی وەك تورکیا لەناوەڕاست ماونەتەوە زیاتر تەنگەتاو دەبن.

گروپی ئەو دەوڵەتانەی بەبەرەڵاو سەرسەری بەناو دەکرێن و ناکەونە ژێر زەبت و ڕەبتەوە لەرێگای هێزی سەربازی، ئابووری و کولتووریەوە دەیهێننەوە سەرڕێ. ڕۆژهەڵاتی ناوین کەبەرامبەر سیستەم دوور لەتوانەوەیە ــ نەریتی بەهێزی شارستانی، ئیسلامییەت، گرفتە قورسەکانی ئابووری ـ هەڵوێستەکەی بەتەواوی گوزارشت لەرەوشێکی وێڵ و یاخی دەکات. ئیتر "کۆمۆنیزم" ی سەردەمی شەڕی سارد جێگای خۆی بۆ" دەستڕۆیی سەوز" ی ئیسلامییەت بەجێ هێشتووە. پێکهاتە دەستڕۆ موحافەزەکارەکانی لەژێر پەردەی ئیسلامییەتدا ناچارن پارچەببن. لۆبی یەهودی (هۆزی عیبرانی) کە لەناو هێزەکانی دونیا بەکاریگەرە ناچارە خەونی هەزاران ساڵ و لێکدانەوەکانی سەبارەت بە ئیسرائیل جێبەجێ بکات. ئەو لۆژیکەی سیستەم کە لەئارادایە چیتر ناتوانێ ڕۆژهەڵاتی ناوین بەوشێوەیەی ئێستا پەسندبکات و بارەکەی هەڵگرێت. لەئەنجامی هێرشی 11 ی ئەیلولی 2001 بۆ سەر جووت تاوەرەکە کە پەلامارێکی ئاڵۆزو پیلانگێڕی بوو نەك تەنیا قۆناخێکی نوێی بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوین دەستپێکرد، بەڵکو سیستەمی ڕووبەڕووی ئەو دینامیکەکردەوە کە چارەنووسەکەی بگۆڕێ. لە بێشکەی دەرکەوتنی شارستانییەت کۆن و نوێ ڕووبەڕووی یەکتردەبنەوە. لەڕاستیدا ئەم ڕووبەڕوو بوونەوەیە پڕە لەو ڕووداوە کتوپڕو سەیرانەی کەشێوە نوێکەی شارستانییەت دیاربکەن.

### ب ـ پرۆژەیەك بۆ کۆمەڵگای دیموکراتی و ژینگەیی

لەساڵی 1989دا سۆسیالیزمی بونیادنراو بەهۆی بونیادەکەی هەڵوەشایەوەو لەئەنجامی ئەمەدا سیستەمی کۆمەڵگای جیهانی بۆ پرۆسەی گۆڕانکاری کەوتە نێوەندی گێژاوەوە. جیاوازی کارەکتەری لەنێوان قەیرانی سیستەمی سەرمایەداری و ئەو قەیرانەدا هەیە کە بەنێوەندی کائیوس(گێژاو)ی بەناودەکەین. گۆڕانکاری ڕیشەیی کۆمەڵگاکان لەئەنجامی قەیرانی ئاسایی بەدینایەت، بەڵکو لەئاکامی ئەو قەیرانانەوە پێکدێت کەخاوەن کارەکتەری گێژاون. لەقەیرانە ئاساییەکاندا سیستەم ئەو شانس و دەرفەتەی هەیە کە لەسەر هەمان بنەما سەرلەنوێ خۆی ئاوابکاتەوەو ڕێستۆرانس ئەنجام بدات درێژە بەهەبوونی خۆی

بدات. لەقۆناخی قەیرانی یەکەم و دووەمدا دوای شەڕ سیستەمی سەرمایەداری توانی خۆی بونیادبنێتەوەو بەشێوەیەکی بەهێز بەردەوام بێ. یەکێك لەو هۆکارە بابەتیانەی سەرمایەداری توانی سۆسیالزمی بونیادنراو لەناوخۆیدا بتوێنێتەوە پەیوەندی بەکارەکتەری قەیرانەوە هەیە. هەرچەندە هەڵوێستی مارکسیزم ــ لینینزم کە نەیانتوانیبوو خۆیان تەواو لەبەهاکانی چینی سەردەست رزگاربکەن هۆکارێکی گرنگیش بێت، بەلام قەیرانی ئەو سیستەمەی سۆسیالزمی بونیادنراو پشتی پێدەبەست خاوەن ئەو تایبەتمەندێتی و خاسیەتانەبوون کە لەمیانەی هەوڵە خودییەکانەوە تێپەڕبکرێت. ئەو فاکتەرانەی بوونە هۆکاری هەڵوەشانەوە ئەم تایبەتمەندێتییانەیان نەبووایە، ئەوا خراپترین شێوەی تەسلیمییەت (خۆبەدەستەوەدان) روویندەدا. تەنانەت چاوەڕوانی رزگاربوونیان لەسیستەمی بالادەست دەکرد. ولاتە لەپێشەکانی سەرمایەداری بوونە کۆسپ و رێگر لەپێش دارزینێکی خراپتر.

خودی ئەم راستییە کە کاریگەری سەرنجراکێشانەی سۆسیالیزمی بونیادنراو هەم لەتێپەڕکردنی قەیرانی سیستەم و هەم لەئەنجامگیرکردنیدا بەکائیوس رووندەکاتەوە ئەزموونبەخشە. ئەگەر سەرمایەداری لەئەنجامی شۆڕشی 1848 بۆچەند مەزهەبێك پارچە نەبووایە ئەوا دەشیا زووتر بکەوێتە ناو گێژاوەوە (کائیوسەوە). بەتایبەتی لەمیانەی سێ مەزهەبەوە سەدەی بیستەمی بەڕێکرد. ئەوانیش سۆسیالیزمی بونیادنراو، سۆسیال دیموکرات و رزگاری نیشتمانییە. بەلانی کەم ئەم سێ مەزهەبە بوونە هۆکار کە سەدەیەك درەنگ وەختتر بکەونە ناو گێژاوەوە. سەرمایەداری گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتبووایەو بەردەوامبووایە ئەوا لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەم دەکەوتە ناو نێوەندی گێژاوەوە کە خاوەن کارەکتەری وەرچەرخانە. شەڕی گەورەو مەترسیدار ـ ئەتۆمیشی لەناودا ـ لەسەر مرۆڤایەتی بەڕێوەچوو. جانەوەری لەجۆری داگیرکەری، میللیگەرایی، فاشیزم و تۆتالیتاریزم خولقێنران، بەرامبەر ئەمەش رۆڵی چارەسەرییان بەسۆسیالیزمی بونیادنراو، رزگاری نیشتمانی و سۆسیال ــ دیموکراتەکان بەخشی. دەبێ تەواوی ئەمانە وەك مانۆڕی مێژوویی و سیاسی و سەربازی دەرکیان پێبکرێت کە تەنێ سیستەممان درێژ کردەوە.

لەجیهانی دیاردەکاندا نێوەندی گێژاو گوزارشت لەو ئالۆزیە دەکات کە بۆ گۆڕانکاری وەك شێوەو جۆر و پێکهاتەی پێویستە. ئیتر لایەنە ناکۆکەکانی دیاردەیەك ناتوانن درێژە بەپەیوەندی و هەمئاهەنگی نێوانیان بدەن. شێوە ناتوانێ ناوەڕۆك بپارێزێ؛ تێرناکات، سنووردارو تێکدەرە. لەدۆخێکی وەهادا هەڵوەرین روودەدات، کائیوس سەرهەڵدەدات. ناوەڕۆك خۆی لەروالەت رزگارکردووە. بەلام هێشتا دەنگ و شێوەی نوێی وەرنەگرتووە. شێوەوبچمی پارچە بووی پێشووتر بۆ شێوەی نوێ تەنیا وەك ئامرازێك بەکاردەهێنرێ. لەراستیدا هەروەکو بلێی بنەماو پرەنسیپێکی گەردوونی لەم نێوەندەدا کارایە. پارچەکانی بونیادی گەردوون لەمیانەی ئەو گێژاوەی پێیگەیشتوون بەگۆڕانکاری خێراوە بەرەو رێکخستنی شێوەگرتووی نوێ دەچن. ئەگەر رێکخستنی شێوەگرتنی نوێ لەرەوشێکی گونجاودا بێ و بتوانێ پارچەکان لەخۆوە بگرێت بۆ پێکهاتەیەکی هەمیشەیی دەگۆڕێت. لەدەوروبەری پێکهاتەیەکی جێگیرو هەمیشەییشدا سیستەمێکی نوێ لەدایك دەبێ.

دەشێ لەمیانەی دیاردەی ئاسایی جیهانی ماددیدا رەوشەکەی شرۆڤەبکەین. گەردەکانی $H_2O$ شێوەیەکە بە "ئاو" بەناودەکرێت. یەکێك لەتوخمەکانی ئاو هایدرۆجین ($H_2$)ە کاتێك لەگەڵ گەردیلەکی ئۆکسجین دەبێتە یەك گەردی ئاو پێکدێت. لەمیانەی پەیوەندی کردار ـ پەرچە کرداری نێوان سیستەمی گەردیلەکانی هەردوو گەردەکانی ئاو دۆخی ئەو شلەیە فەراهەم دەکات کە تادوایی بەلێشاوە. هەرچی دۆخی پارچەبوونە بەواتای دەستپێکردنی گێژاودێت. کاتێك تەواوی گەردیلەکانی هایدرۆجین و ئۆکسجین سەربەست بمێنن و بۆنموونە توخمەکانی لەجۆری کاربۆن و کلۆر بکەونە ئەو نێوانە دوای کارلێکێکی کورت چەندین ئاوێتەی نوێ دروست دەبێت. ئەمەش بەواتای پێکهاتەی نوێدێت. لەجیاتی ئاو چەندین شلەو گازی ژهراوی پێکدێت $co$و$co_2$، ترش، تفت).

ئەم رێسایەی دروستکردن و بونیادنان گەردوونییە و بۆ کۆمەڵگاکانیش لەجێگای خۆیدایە. پەرتەوازەبوونی پێکهاتەی کۆن بۆ پێکهاتەی نوێ ناچارییە. بەڵام پەرتەوازەبوون و ئاڵۆزی بەتەنیا سەربەخۆ لەجێگای پێکهاتە دانانرێت. ئەو جۆرێکی هەویرە، شتێکی وەك شلەمەنییە. پێویستە بشێلدرێ و شێوەی پێبدرێت. بانموونەیەك لەناو کۆمەڵگاش بێنینەوە: سیستەم و زهنییەتی دەرەبەگایەتی لەکۆتاییەکانی سەدەی پانزدەهەمدا پەرتەوازە بوو. چینە نوێیە جیاوازەکان، بەربەر، شێوەگرتنەکانی دەرەبەگایەتی بەرلەمەسیحییەت کەوتبوونە ناوسیستەم، دوای ئەوەی دەرەبەگایەتی پەرتەوازەبوو چەندین شێوەی بیروکراتی سەرمایەداری و دیموکراتی دەرکەوتن.

لەساڵی 1990 شانبەشانی سەرمایەداری رکابەرەکانیش پەرتەوازەبوون. لەم بوارەدا بەڵگەی پێویست لەبەردەستدان. قاڵبوونەوەی سەرمایەی جیهانگیری لەگۆڕەپانی فینانس یەکێك لەهێما یەکەمەکانی بوو. سیستەمی فینانس، پارە پارە دێنێ. واتە وەك قومارە. هەربۆیە تەنیا دەتوانێ پەرتەوازە بکات. سەرمایەی فینانس هەروەکو لاجکردنی پەمۆ پێکهاتە جێگیرەکان دەپچڕێنێ. دامەزراوە نەتەوەییەکان لەدەوڵەت تاوەکو ئایدیۆلۆژیا، لەئابووری تاوەکو هونەر ناتوانن بەئیرادەی خۆیان لەسەرپێیان بوەستن. بەڵام چەندە جیهانگیری هێز، ئیمپراتۆریای ئەمریکا بێ واتایی هاوسەنگی و بونیادنان کۆنەکانی سەرتاسەری جیهان و بێ رۆڵ بوونیان لەلای خۆی نیشانبدات، لەچەندین ناوچەی جیهان و دەوڵەتی نەتەوە رێگا لەپێش قەیران و کودەتاو پێکدادانی ئەتنیکی و ئایینی خوێناوی دەکاتەوە. ئەم راستینەیەش کە پەیوەندی بەسیستەمەوە هەیە خاوەن تایبەتمەندێتی و سیفەتی ئاژاوەیە.

سیستەم هەرچەند دەکات ناتوانێ لەگرژیەکانی ناوخۆ رزگاری بێت. وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا ـ یەکێتی ئەوروپا، ئەمریکا ـ ژاپۆن ـ چین، یەکێتی ئەوروپا ـ ژاپۆن ـ چین بەردەوام لەناو لاسەنگی و گرژیدا دەژین. دابەشکردنی بەشێوەی هەژارترین ـ دەوڵەمەندترین وڵات کە بەناکۆکی باکوور ـ باشوور بەناو دەکرێت بە قووڵبوونەوە بەردەوامە. ئەوەی لەهەردوو دیاردەکە لەئارادایە، بەردەوامی خاسییەت و چۆنێتی گێژاوە. دابڕانی گەلان لەدەوڵەت چەندەی دەچێ قووڵدەبێتەوە. هەرچەندە دەرك بەوە بکرێ دیاردەی دەوڵەتەکە هەزاران ساڵە وەك پادشای خوداوەند، سێبەری خودا و خودی خودا ـ لای هیگل دەوڵەتی بۆرژوا ـ سەپێنراوە لەناوەرۆکدا هێزی شەڕ ـ دەسەڵات دەشارێتەوەو سەرچاوەی چەوسانەوەو فشارو توندوتیژییە رۆژبەدوای رۆژ گۆشەگیریەکەی زیاد دەبێت. هەروەکو گوتەی "دایکە، پادشا رووتە" ئیتر گەلانیش وەك منداڵەکە دەوڵەت بەرووتی دەبینن، ئەمەش سەرەتای گێژاوێکی گرنگە.

یەکێك لەبابەتە گرنگەکان زیادبوونی بێکارییە. تاوەکو سیستەم بەردەوام بێ بێکاریش هەردەمێنێ. خودی سیستەم بێکاری زیاد دەکات. لەسیستەمی هیچ کۆمەڵگایەکدا تا ئەورادەیە دانیشتوان بێکار نەماون. هەربۆیە یەکێك لەو دیاردانەی گێژاو پشت راست دەکاتەوە بێکارییە. لەکامە هەرێمدا بێکارییەکی مەزن لەئارادابێت واتە ئاژاوەیەکی گەورە لەئارادایە. سەرباری ئەوەی بێکاری گەلێك لایەنی نهێنی هەیە، بەڵام لەناوەرۆکدا کۆمەڵگا لەرەوشی کۆمەڵگابوون دەردەخات. بەگووتەیەکی دیکە کۆمەڵگا ئیفلاس دەکات.

لەلایەکی دیکەوە لەرێگای تەکنیکی پێشکەوتوو لەپێویستییەکان زیاتر بەرهەم پێشکەش (عرض) دەکرێت و بەکار ناهێنرێت. گرفتەبوون نییە، بەڵکو پێچەوانەیە. لەلایەك ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان رووبەڕووی نەدارییەکی دژوارە، لەلایەکی تریشەوە بەرهەمێکی لەداواکاریەکان زیاتر لەسەریەکتر کەڵەکە بووە. کاراکتەری گێژاو لەمە سەرنج راکێشتر پەیدا نابێت. دیسان ئەو شارانە لەئارادان کە وەك شێرپەنجە گەورەدەبن. یەکێك لەنموونە هەرە بەرچاوەکانی شێرپەنجەی کۆمەڵگا کە لەبواری کۆمەڵناسی پەیوەندی بە شارەوە نییە گەورەبوونی شارە. شارەکانی هەم لەمیانەی بەگوندبوون هەم گەورەبوونی بێسنوور واتای شارێتی (شارستانی) لەدەست دەدەن. بەشێوەیەکی چڕو بەرفراوانتر گێژاو لەشارەکان لەئارادایە. تەواوی

کۆمەڵگا دەبێتە کاڵا. هیچ نرخێك (بەهایەك) نەماوە نەبێتە بابەتی هەراجکردن. مێژوو، پیرۆزی، کولتوور و سروشت و هەموو شتێك دەبێتە کاڵا. ئەم راستییەش شێرپەنجەی کۆمەڵایەتییەو بەرەو گێژاو دەچێت.

لەئاکامی تەواوی کاراکتەرەکانی گێژاوەوە پیسبوونی ژینگە دێتە ئاراوە. ئەمەش ئەو راستییە ئاشکرا دەکات کە گێژاو ژینگەشی گەمارۆداوە. کونبوونی چینی ئۆزۆن، پیسبوونی ئاووهەوا، لەناوچوونی جۆرەکانی ئاژەڵ سەمبۆلی ئەم راستییەن. لەراستیدا پەیوەندی نێوان کۆمەڵگاو سروشت کەدیاردەیەکی ژینگەناسییە بەرەو هەڵدێر دەچێت. ئەگەر ساتێك زووتر ئەم درزە پڕنەکرێتەوە ئەوا ئەنجام بەدیناسۆربوونی کۆمەڵگایە. دەبێ تەقینەوەی ژمارەی دانیشتوانیش وەك ئەنجامێکی پێکهاتە ناکۆکەکەی گشتی کۆمەڵگا ببینرێ. سیاسەتی سەرمایەداری سەبارەت بەدانیشتوان پشت بەو پرەنسیپە دەبەستێ کە دەڵێ " چەندە مرۆڤ بێ نرخ بێ, بەو ئەندازەیە زیاد دەبێت ". تاوەکو سەرمایەداری هەبێت کێشەی ژمارەی دانیشتوان قورستر دەبێت و بەردەوام دەکات. تەقینەوەی ژمارەی دانیشتوان لەسەرووی ئەو تایبەتمەندێتییانەوە دێت کە گێژاو (کائیوس) گەورە دەکەن. کۆمەڵگاکانی لایەنی دیکەی جەمسەری رکابەری سیستەمیش لەناو هەمان رەوشی ئاڵۆزو پەرتەوازەیی دان. لەسەرووی هەموویانەوە, خێزان لەمێژووی خۆیدا لەناو قۆناخی هەرە دژواری پەرتەوازەبووندا دەژی. نزیکەی نیوەی ئەو هاوسەرێتی(زواج)ەی لەئارادایە شکست دێنن و پەیوەندی زایەندی بێ کۆنترۆڵ و دوور لەئاکاریش زیاد دەبن. ئەوە پەسند دەکرێ کە هاوسەرێتی (زواج)ی پیرۆز کۆتایی پێهاتووە. وەك دەرئەنجامێکی ئەم پەرتەوازەبوونە منداڵان، بەساڵاچووان و پەیوەندی دایك ــ باوك دەکرێن بەقوربانی و لەبواری کۆمەڵایەتییەوە دەکەونە رەوشێکی خراپ و بێواتا. بەکاربردن و ستەمکاری هەرە کۆنی سەر ژنانیش چەندەی ئاشکرا دەبێت کێشەی ژنانیش دەبێتە قەیرانێکی تەواو. چەندەی ژن خۆی بناسێ ئەوا لەمیانەی ئەو نەفرەتەی لەسووکایەتی پێکردن و خستنی خۆی دەیکات لەوانەیە بیکات بەکاریگەرترین یەکە لە پەیوەندی گێژاودا. داڕووخانی ژن هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگا لەگەڵ خۆیدا دێنێ، داڕووخانی کۆمەڵگاش رێگا لەپێش هەڵوەشانەوەی سیستەم دەکاتەوە.

کەمبوونەوە یان نەبوونی ئەخلاقی کۆمەڵگا نیشانەیەکی بێ ئەخلاقی گشتییە. لەناوبردنی دامەزراوەی ئەخلاق رێگا لەپێش تاکڕەوێتی و تێکدانی بەهاکانی کۆمەڵگا دەکاتەوە. لای سەرمایەداری بەئەخلاقبوون و گێلی (نەفامی)یەك شتە. کۆمەڵگایەك ریشەی ئەخلاقی خۆی لەدەستدابێت، واتە ویژدانی ونکردبێت گوزارشت لەگێژاو دەکات. ناتوانرێ بەشێوەیەکی تر پێناسە بکرێت. ئەو کێشەو گرفتە کۆمەڵایەتییانەی دەوڵەت هەوڵدەدات لەمیانەی سیاسەتی کۆمەڵایەتی رێگیریان لێبکات بەهۆی کەمی سەرچاوەکان و شێوەی گشتی ئاوابوونی سەرمایەداری چارەسەری نادۆزێتەوەو کێشەکان گەورەتردەبن. "سوودمەندی گشتی" کەتاکە چالاکی واتاداری دەوڵەتە بەتەواوی ناوەڕۆکەکەی لەدەست دەدرێت. ئاسایشی گشتی کۆمەڵگاش لەناو هەمان هەڕەشەدایە. لەبەرئەوەی سەرمایەداری تەواوی مرۆڤایەتی کردۆتە گورگی یەکتر کێشەی ئاسایش لەئارادایە. ئیتر ئاسایشی کۆمەڵگا (کۆمەڵایەتی) تەنیا لەلایەن گروپە رێگرەکان و ئەو تاوانانە پێشێل ناکرێت کە یاسا دیاری کردووە؛ لەسەرووی هەموویانەوە ئەو برسێتی و بێکارییەی سیستەم رێگای لەپێش کردۆتەوە، هۆکارە سەرەکییەکانی ئاسایش لەگەڵ خۆیدا دێنێ. بەهۆی خەرجی زۆرو زیادبوونی ژمارەی دانیشوان چارەسەری بۆ کێشەکانی پەروەردەو تەندروستی نادۆزرێتەوە. چەندین نەخۆشی دێوەزمە ئاسای وەکو شێرپەنجە, ئایدزو دڵەڕاوکێ گەورەدەبن. بۆ یەکەمین جارە لەمێژوودا کۆمەڵگا لەفاکتەرە سەرەکییەکانی ژیان وەك ژینگە، خانوو, تەندروستی، پەروەردە، کارو ئاسایش دابڕاوەو ناتوانێ چارەسەری بدۆزێتەوە. هەست دەکات کە دەکەوێتە ناو فشاری گێژاووە. ئەمە قۆناخێکە کە بێچارەیی مرۆڤ واقوڕمای دەهێڵێ.

ئەو میکانیزمانەی پێویستە لەقۆناخێکی بەمجۆرەی سیستەمە کۆمەڵایەتییە مێژووییەکاندا رۆڵی پاراستن ببینن هونەر، زانست و تەکنۆلۆژیایە. بەڵام لەبەرئەوەی هونەر، زانست ـ تەکنۆلۆژیا لەژێردەستی دەسەڵاتدان ناتوانن رۆڵی خوازراو ببینن.

چەندە کۆڵەکەو هاوکاری کۆمۆن پەرتەوازەبێت پاراستنی نەریتی لاواز دەبێت و جێگای خۆی بۆ توندوتیژی تاك و چەتەکان بەجێدێڵێ. بەرامبەر بەتۆقاندنی تیرۆر ـ دەسەڵات تیرۆری هۆزو خێڵەکان زیندوو دەبێتەوە. چەندە هێزی دەسەڵات ــ شەڕی ناواخنی دەوڵەت بەرووتی دیاربێت بەو ئەندازەیەش بەرگری رەوای کۆمەڵگا پێشدەکەوێت. تاوەکو پێوانە گشتییەکانی یەکسانی دەوڵەتی یاسا جێبەجێ نەکرێت، گەمارۆی سەرمافی مرۆڤ و هەڵوێستەکانی دژە ــ دیموکراسی بەردەوام بێت، ئاواکردنی هێزی پاراستنی گەلان ناچارییەو ئەمەش رەوش بەرەو توندوتیژی دوولایەنە دەبات. لەجیاتی ئەوەی لەقەیران رزگاری بکات رەوشی توندوتیژی دژوارتر دەکات. کاتێك میللیگەرایی دەوڵەت زیندوو دەکرێتەوە نەتەوەپەرستی ئەتنیکیش گەشە دەکات، ئەمەش یەکێك لەجۆگەلەکانی توندوتیژییە.

چالاکییە دەزگاییەکانی وەك هونەرو وەرزش کە لەنەرمکردن و تێگەیشتنی ناکۆکی و پەیوەندیەکاندا کاران، لەرەوشێکی پێچەوانەشدا وەك ئامرازە بێهۆشکەرو سڕکەرەکان رۆڵ دەبینن و دەبنە هۆکاری دەرکەوتنی دۆخێکی ساختەو دروستکراو. هەمان رۆڵ دەخەنە سەرشانی ئایین و مەزهەب و تەریقەتەکانیش، بۆ ئەوەی کۆمەڵگا ئاشنای راستی نەبێت، جگە لە قیامەت گروپی موحافەزەکار ئاوا دەکەن و کۆسپ دەخەنە سەر رێگای رێگەچارە راستەقینەکان. وەرزش، هونەرو ئایین لە ناوەڕۆکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی دوورخراونەتەوە، وەها لەمرۆڤ دەکەن لەمیانەی چاویلکەی ئەسپ و دڵێکی تەنەکە ئاسا بەشێوەیەکی بێخەم تەماشای کێشەکان بکات. لەرێگای خولقاندنی تیۆریەکی خەیاڵی و ساختە، بێچارەیی وەك چارەنووسێك بەسەر کۆمەڵگادا دەسەپێنرێ. ئەم بەرخودانەی بەرامبەر قەیران، ئەنجامێکی پێچەوانەی لێدەکەوێتەوەو گێژاو قووڵتردەکاتەوە.

لەقۆناخی بەمجۆرەدا بۆ رۆشنگەری و سەرلەنوێ ئاواکردن پێویستە زانست و تەکنۆلۆژیا دەرفەتی چارەسەری بڕەخسێنێ و رێنیشاندەربێت، بەڵام لەبەرئەوەی زیاتر لەژێردەستی دەسەڵاتدایە، ئومێدێکی چارەسەری نیشانناداات. لەرەوشێکی وەهادایە کە فیل بەتاڵە مووێك پێناسە دەکرێت و مشك بەفیل دەپلیشێندرێتەوە. دەرفەت و توانستەگەورەکانی چارەسەری کە تەنیا بۆ شەڕی بێواتاو چەك و تەقەمەنی و ئامانجەکانی قازانجکردن بەکاردێنن کە وەڵامی پێویستییە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا ناداتەوە، بەمشێوەیە رێگا لەپێش دۆخێکی نەرێنی(نێگەتیف) دەکەنەوە کەخزمەت بەگەورەبوونی گێژاو دەکات.

دەشێ پێناسەی خۆمان سەبارەت بە گێژاو زیاتر بەرەو پێش ببەین کە سیستەم رێگای لەپێش کردۆتەوەو تەواوی کۆمەڵگای تێوەگلاندووە. ئەم پێناسەیەش تێری وەڵامدانەوەی ئامانجەکانمان دەکات، تاوەکو رەوشی گێژاو رۆشننەکەینەوەو تێینەگەین، هەروەکو ئەوە بیربکەینەوەو جموجۆڵ بکەین کە لەناو ژیانێکی ئاسایی داین، ناتوانین خۆمان لەهەڵەی گەورە رزگاربکەین. هەربۆیە لەشوێنی چارەسەری دەکەوینە ناو بێچارەییەوە. لەهەموو قۆناخێك زیاتر لەم سەردەمەدا پێویستی بەهەوڵ و کۆششە روناکبیرییەکان هەیە. بەتایبەتی لەجیاتی ئەوەی لەمیانەی پێکهاتە کۆنەکانی دوور لەزانست ــ ئایین، زانکۆ ـ دەرك بەرووداوەکان بکرێ و رێگا لەپێش تێگەیشتنی هەڵە بکاتەوە، نرخ و بەهای ئەو هەوڵ و کۆششە رۆشنگەرییانە زیاد دەبێت کە مرۆڤ رۆشندەکەنەوە.

ئایین و زانستی گرێدراوی دەسەڵات لەنیشاندان و چەواشەکردنی هەلومەرج و پێشکەشکردنی تیۆرییە ساختەکان، تا دواڕادە کارامەو شارەزا دەبێت، لەم سەردەمانەدا بەشێوەیەکی ئاشکرا رۆڵی چەواشەکاری ئایین، هونەرو وەرزش دەبینین. هەربۆیە تابڵێی پێویستی بەو زانست و پێکهاتە زانستییانە زیاد دەبێت کەخەڵەتێنەر نییەو پرۆژەو تیۆری راستەقینە پێشکەشی کۆمەڵگا دەکات. بەرلەهەموو شتێك پێویستە تێکۆشان لەبواری رۆشنبیری (گۆڕەپانی هزری) سەرکەوتوو بێت. قۆناخێك لەئارادایە کە شۆڕشی هزری گرنگ و بایەخدارە.

پێویستە شەڕی هزری شانبەشانی بەها مەعنەویەکان بەرێوەببردرێت. تاوەکو مۆڕاڵ و ئەخلاق شانبەشانی هزر بەدەست نەهێنرێت، ئەنجام بەدەستهێنان کاتیی و بەگومان دەبێت. ئەگەر راستینەی بێئەخلاقی سیستەم رەچاو بکرێت، دەبێ

هەڵسوكەوتە پێویست و تێرەكانی ئەخلاقی و ئاكاری كۆمەڵگا لەتاك و دەزگاكاندا نوێنەرایەتی بكرێت. بەبێ ئەخلاق و ئاكار دەشێ رووبەڕوو بوونەوەی گێژاو بەفوتدانی تاك و كۆمەڵگا ئەنجامگیر ببێت. پێویستە ئەخلاق نەریتی كۆمەڵگا رەچاو بكات و بەهەمئاهەنگی ئاكاری نوێ بەكۆمەڵگاوە بلكێنێ. ئیتر بەرامبەر ئەو سیاسەت و دەزگاو ئامرازانەی كەلەقۆناخی گێژاودا لەلایەن سیستەمی باڵادەست كراوەتە ئامرازی دیماگۆژییەت، بۆ سەرلەنوێ ئاواكردنەوەی كۆمەڵگا پێویستە گرنگی و بایەخێكی تایبەت بە سیاسەت و ئامرازەكانی بدرێت. دەزگا سیاسییەكانی وەك پارتی، هەڵبژاردن، ئەنجوومەنەكان، بەڕێوەبەرایەتییە هەرێمییەكان كە لەئاواكردنی كۆمەڵگای دیموكراتی و ژینگەپارێزیدا خاوەن رۆڵن، پێویستە لەبواری ناوەڕۆك و رواڵەتدا ئامرازەكانی چارەسەری كێشەكە بدۆزنەوە. پێویستە پەیوەندی چالاكی و رێكخستنی سیاسی لەگەڵ كۆمەڵگای كۆمەڵكاری و دیموكراتی و ژینگەپارێزیدا تۆكمەو بەگوێرەی پێویستی بێت. بەرامبەر قۆناخی گێژاو پێویستی بەبەرجەستەكردنی ئەم هەڵوێستە گشتییانە هەیە. رزگاربوونی سیستەم و گەل لەگێژاو دەشێ لەرەوشی مەرحەلیدا بێت. لەوانەیە دەستێوەردانی بچووك ئەنجامی گەورە لەگەڵ خۆیدا بێنێ. دەشێ قۆناخەكانی دەركەوتن لەگێژاو كورتخایەن یان درێژخایەن بێت ــ 10 ساڵ تاوەكو 50 ساڵ ــ.

لەم چوارچێوەیەدا ئەگەر هەوڵی لێتوێژینەوەی ئەگەری چارەسەری لایەنەكان بدەین دەبینین كە دەركەوتن لەقەیران و گێژاو لەئەنجامی تێكۆشانی نێوان ئەو لقانەی هێزەكانی ئەمریكا پێشەنگایەتی دەكات لەگەڵ لقەجیاوازەكانی گەلان دیاردەبێت. قەیران بەشێوەیەكی سەربەخۆ هەڵوەشانەوەی سیستەم و ئاواكردنی نوێتر لەگەڵ خۆی ناهێنێ. هەروەكو دەزانرێ هەڵوەشانەوە یان پەرتەوازەبوون چەمكی رێژەیین. هەڵسەنگاندنەكانی لەجۆری "سەرمایەداری لەگۆڕدەنرێ"، " پڵنگی لەكاغەز دروستكراوە"، "جارێكی دیكە ناتوانێ لەقەیران دەربكەوێ"، تایبەت بەسۆسیالیزمی بونیادنراوە و لەپروپاگەندە بەولاوە هیچ واتایەكی دیكەی نییە. هەروەها هەڵوێستەكانی لەجۆری " بەناچاری بەرەو شێوەی پێشكەوتووتر دەچێ " خاوەن گەوهەرێكی ئیماندارییە و بەدیهاتنی زۆر سنووردارە. دەشێ دواكەوتنیش بەسانایی رووبدات. هێشتا جێگای گفتوگۆیە كەخودی سەرمایەداری تا چ رادەیەك پێشكەوتووە. هێزەكانی سیستەمی دەسەڵاتدار بەگوێرەی هێزەكانی گەل تێگەیشتووترن، لەبواری سوپاو دەسەڵات پڕ چەكترن و بەئەزموونن. سامانی گەورەیان لەبەر دەستدایە. بۆیە لەبواری ئاواكردنی سیستەمی نوێ و سەركوتكردنی سیستەمە ركابەرەكان، ئەگەر ئەمیش نەبوو كڕین و سازشكردن لەگەڵیاندا خاوەن دەرفەت و تواناكاری بەرفراوانە.

خاڵێكی دیكەی گرنگ كە پێویستە روونبكرێتەوە ئەوەیە كە رەخنەكردنی سەرمایەداری بەواتای رەشكردنی تەواوەتی نایەت. وەك تاك تەواوی سەرمایەدارەكان وەك دەمی شانە وەكو یەكترنین. دەشێ سیستەمی سەرمایەداری بەشێوەی جیاواز پێهەڵگرتن ئەنجامبدات. یەكەمیان، دەتوانێ رەستۆراسیۆن ئەنجامبدات، هەروەكو دەزانرێ لەدوای هەردوو شەڕی یەكەم و دووەمی جیهانی سەركەوتنی لەمەدا بەدەستهێنا. لەدوای شەڕی چەندین وڵاتیشدا رەستۆراسیۆن ئەنجامدراوە. دووەمیان، لەمیانەی نوێكردنەوەی ئەو مەزهەبانەی پێشتر تاقیكردبوونەوە هەنگاو بهاوێژێ. دەتوانرێ ریزبەندی سۆسیال ــ دیموكراتی بەڕێوە ببردرێت كە زۆرجار تاقیكراوەتەوە. سیستەم خاوەنی بژارێكی بەرفراوانی گۆڕانكارییە. لەپێشخستنی مۆدێل بەئەزموونە. سێیەمیان، كاتێك دەبینێ بەشێوەیەكی خراپ دەدۆڕێنێ ئەوا لەگەڵ هێزی بەرامبەر بەرەو رێككەوتن دەچێ. چوارەمیان، لەجیاتی لەدەستدانی هەموو شتێك گۆڕانكاری مەزن گونجاوتر دەبینێ. بەدرێژایی مێژوو سیستەمە باڵادەستەكان لەقۆناخە قورسەكانی قەیراندا گۆڕانكاری گەورەی لەو شێوەیەیان ئەنجامداوە. لەمێژووی سەرمایەداریشدا گۆڕانكاری هاوشێوە زۆرجار ئەنجامدراون. چەمكی كۆن كەدەڵێ " سیستەم وشكە, بكەوێتە قەیرانەوە بەسەلامەتی (ساغ) لێی دەرناكەوێ " واقیعی نییە. هەرچەندە ئەم چەمكانە وەك چەپڕەوێتی دیاربن, بەڵام لەناوەڕۆكدا راستڕەون. چونكە چاوەڕوانی لە خۆوە

هەڵوەشانەوەی لێدەکەن و هەروەکو بڵێی دەخوازێ دەستبەسەر میراسەکەیدا بگرێ، رەوشێکی چاوەڕوانی پووچ و بێواتا دروستدەکەن. تەنانەت پێگەیشتووترین میوەش تاوەکو لێی نەکەیتەوە ناخورێت. لەهەمووی خراپتر، کاتێك دەبینین وەك چاوەڕوانیان دەکرد سیستەم هەڵنەوەشایەوە، ئەمجارە دەکەونە گومان لەهزرو باوەڕی خۆیان. ئەگەرنا ئەوەی ئەنجامدراوە پێناسەیەکی چەوتی سیستەمە. بەشێوەیەکی راست پێشبینینەکردنی گۆڕانکاری و وەرچەرخانی سیستەمەکانە.

هەوڵی ئەمریکا بۆ ئیدارەکردنی سیستەم لەقەیراندا ئاشکرایە. بۆ ئەوەی دووچاری برینی قورس نەبێت هەست بەبەرپرسیارێتییەکانی خۆی دەکات. هەڵسەنگاندنی زێدەڕۆیی لەجۆری " بلاوکردنەوەی ئیمپراتۆریەت " سەبارەت بەم مەسەلەیە ناتەواوە. بێگومان سیستەم زۆربەی نیشانەکانی رووخانی رۆمای پێوە دیارە. هەروەکو رۆما پەنای بردۆتە بەر چەندین نوێبوونەوەو رەستۆراسیۆن. ئاشکرایە بۆ تاکجەمسەری سیستەم پێویستی بەهەوڵی زیاتری هێزی ئیمپراتۆریەت هەیە. لەدوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤییەت لەساڵی 1990دا، هەروەکو بڵێی پەلهاوێشتن بەشێوەیەکی خۆخۆیی بوو. بەڵام پێویستە ئەوە پەسندبکات کە ئەم پەلهاوێشتنە بۆ بەهێز بوونەکەی ناگەڕێتەوە، بەڵکو هۆکارەکەی ئەوەیە سیستەم بۆشایی پەسند ناکات. پێویستە بەگرنگییەوە ئاماژە بەوە بکرێ کە ئیمپراتۆریەت داهێنانێکی ئەمریکا نییە، بەدرێژایی تەمەنی سیستەمەکان هەبووە، هەرە دواییش لەسیستەمی سەرمایەداریدا ئەمریکای دۆزیوەتەوە. ئینگلیزەکان رادەستیان کردووە. نەك ئەمریکا بیدۆزێتەوە، بەڵکو ئەو ئەمریکای دۆزیوەتەوە. لەوانەیە ئەمریکا ئەو هێزە بێت کە بەشێوەیەکی هەرە سانایی لەجیهاندا بووە بەهێزی ئیمپراتۆریەت. پەلهاوێشتنی ئیمپراتۆیەت کە بە ناچارییەو کەمێکێکیش بە نابەدڵی، لەجیاتی دەرکەوتن لەقەیران بەپێچەوانەوە رۆڵ لەچەقین و نقوومبوونی دەبینێ. ئەو گۆڕەپانانەی تێیدا بلاوبۆتەوە ناوچەیەکن قەیرانەکانیان قووڵە. تەنانەت ئەو قەیرانە زیادانەی ئێراق و ئەفغانستان لەگەڵ خۆیاندا دێنن لەبەرچاوانە. بەکورتی، ئەمریکای ساڵانی 2000 وەك هێزی هەرە نزیك بەئیمپراتۆریەت ناتوانێ لەبەدیهێنانی شێوەگرتنی نوێ رابکات. ئەمە لەگەڵ راستینەی شەڕ ـ دەسەڵات ناگونجێ. ناتوانێ لەمیانەی هێزە سەربازی، ئابووری، زانیاری تەسکی بەردەستی پاشەکشێ بکات. یەکەمین ئەرکی بەڕێوەبردنی سیستەمە لەناو قەیراندا. ئەمەش بەم واتایە دێت لەگەڵ یەکێتی ئەورووپا، چین، ژاپۆن و روسیاو دەوڵەتە هاوشێوەکان لەناو پەیوەندییەکی نزیکدا, بەبێ پێکدادان, گرژیەکان بەڕێوە ببات. وەك شەڕەکانی یەکەم و دووەمی جیهانی ناکەوێتە ناو پێکدادانێکی ناوخۆیی خودی سیستەم. دیسان شەڕێکی ناراستەوخۆی هاوشێوەی ڤێتنام لەگەڵ ئەم هێزانە هەڵناگیرسێنێ. بەپێچەوانەوە هەوڵدەدات لەهاوبەشێتیکردنی باری سیستەم رۆڵی خۆی ببینێ. لەگرفتەکانی فینانس و بازرگانیدا چارەسەرکردنی قەیرانەکان لەرێگای رێککەوتن و هاوکاریەوە چارەسەر دەکرێت. هەربۆیە لەم پێناوەدا رێکخستنە جیهانییەکانی لەجۆری IMF سەندووقی دراوی نێودەوڵەتی، بانکی جیهانی و رێکخراوی بازرگانی جیهانی بەکاردێنن. هەوڵدەدات ئەمریکای لاتین و ئەفریقیا لەو هەڵوێستانە بەدووربگرێ کە سیستەم تەنگەتاو دەکەن و قەیران قووڵدەکەنەوە، گرنگی تایبەت بەوە دەدات و لەخاڵە لاوازەکاندا رێگا بەدابڕانی رادیکالانە نادات. لەولاتەکانی هاوشێوەی کوبا، فەنزویلا، هاییتی، لیبیریا هەوڵدەدات ئەو هێزانە کۆنترۆڵ بکات کەدژی سیستەمن یاخود دەخوازن سەرهەڵبدەن، ئەگەر هەلومەرجی پێویستیش برەخسێ ئەم رژێمانە برووخێنێ.

ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوینی بەرفراوان کە شوێنگەیەکی ژیۆپۆلۆتیکی گرنگ و هەستیاری بۆ ئەمریکا هەیە، لەولاتە عەرەبییەکان پرۆژەیەکی نوێ پێشدەخرێت، کە دەتوانرێ بەدووەمین پرۆژەی مارشالی ئیمپریالیزم بەناو بکرێت. ئەو هەنگاوەی بەپرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوینی گەورە بەناو دەکرێت، بۆ ئەوەی لەناو قەیران گورزی قورس بەر سیستەم نەکەوێ وەك ناچاریەك دەبینرێ. سەرچاوە سەرەکییەکانی وزە، دیاردە ئایینی و سۆسیۆکولتوورییەکان تاوەکو ناوچەکە بەسیستەمەوە نەلکێندرێ، ناهێڵن ئەمریکا ئاسوودە بێ. ئەو هێزانەی لە پێگەو پایەی ئیمپراتۆریەتدان ناتوانن بەرامبەر ئەم ڕەوشە بێدەنگ

بمێـنن. لـەم دوو سـەد ساڵەی دواییـدا هەوڵـدرا ناوچـەکە لەمیانـەی داگیرکـاری سـەرمایەداری و نیـوە داگیرکـاری (کۆلـۆنی) بەڕێوەببردرێت. لەرێگای پشتبەستن بەپێکهاتەی دەوڵەتە دەسپۆتەکان هەناسە لەبەرگەلان برێندرا، لەمیانەی سەرمایەداری پێوەلکاندنێکی واتاداریش بەدینەهات. ناکۆکی ستراتیژی عەرەب ـ ئیسرائیل زیاتر قووڵبۆوە. ئیسلامی رادیکاڵ هێرشی کردە سەر ئەمریکا (خولقێنەرەکەی خۆی). ئەو دەوڵەتە نەتەوەییانەی لەئاکامی ئەو سنوورانەوە ئاوابوون کە بە"راستە" کێشران، قوفڵبـوونێکی لەشـێوەی کۆنەپەرسـتی و سـتاتۆگەرایی خولقانـد. میللیگـەرایی، ئاییـنگـەرایی و دەوڵەتگـەرایی بەشـێوەیەك کـە لەجیهان نموونەی نەبینراوە وەك قەڵغانێك هەناسەی لەبەر کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناوین بڕیوە. هەربۆیـە پێویستە بیر لـە پرۆژەیـەکی نـوێ بکرێتـەوە. ئـەوەی گرنگـە ئەمـە چۆن و لـەرێگای کامـە هێـز پراکتیزەدەکرێت. کامـە سیستەمی سیاسـی و ئابووری بەبنەما دەگرێت. گەلانی ناوچەکە چۆن پێشوازی لێدەکەن و وەڵامی دەدەنەوە؟.

ئەمەیە مەسەلەی سەرەکی و ناکۆکی ریشەیی نێوان ناتۆو نەتەوە یـەکگرتووەکانی ئـەو سیستەمەیە کەئـەمریکا سەرکێشی دەکات. ئەو ئامانجەی شوێنی فاشیزم و کۆمۆنیستی سەردەمێکی گرتۆتـەوە ئیسلامی قـەبا، فاشیزمی ئیسلامییەتە. هێزەکانی سیستەم و پاشکۆکانیان بەرامبەر ئەو شەپۆڵەی "جیهانگیری" نیگـەرانن کـە بەڕێبەرایـەتی ئـەمریکا هەڵدەکشێ. بەتایبـەتیش رۆژ بەدوای رۆژ کاردانەوەی کۆمـارو دیموکراسییەکانی ئـەوروپا لەزیادبووندایـە. بەهەسـتیاری هەڵدەسوورێ تـاوەکو دەوڵـەتی نەتـەوەیی و چـەترە باڵاکـەی کـە یـەکێتی ئەوروپایـە سـەرکوت نـەکات. لـەژێر قـەڵغانی یـەکێتی ئـەوروپادا مافـەکانی مـرۆڤ و بۆرژوازی دیموکراتیك هەوڵی تاقیکردنەوەی ئەلتەرناتیفێك دەدەن. هاوسەنگکردنی ئـەمریکا سیاسـەتێکی ریشەییە کەرەچاو دەکرێ. روسیا، چین، ژاپۆن و بـەرازیل لـەناو هـەوڵ و کۆشـشی هاوشـێوەدان. بەشـێوەیەکی گـشتی بەرامبـەر ئیمپراتۆریـەتی ئـەمریکا دەوڵـەتی نەتـەوەیی دەزگایەکـە بـەرادەی هـەرە زۆر تەنگـەتاو دەبێـت. لەراسـتیدا ئـەم دەوڵەتـە نـاوین و بـچووکانەی لەمێژبوو دەبووایە ببنە دەوڵەتێکی ئەیالەت ئاسا، هەوڵەکانیان لەوە دەچێ بەبێڵ رێگا لەلێشاوی ئاو بگریت. دەشێ چاوەڕوانی ئەوەیان لێبکرێت کەدان بەرەوشی وابەستەیی هەمەلایەنەی خۆیاندا بنێن و دەست لەشانازی میللیگـەرایی جـاران بەربـدەن و گوێڕایەڵی رێساکانی جیهانگیری نوێ بکەن. بـژاری دیکـەیان لەپێشدا نییـە. هـەروەکو بڵێـی هەلومـەرجی دەرەکـی و نـاوخۆیی ئەوە نەماوە وەك تاقیکردنەوەیەکی دیکەی سۆڤییەت بەرەنگاری ببنەوەو درێژە بە سەربەخۆییە سنووردارەکەیان بـدەن. ئـیتر خولیـا کۆنـەکانی شـۆڕش بەرامبـەر بەسیـستەم نوێنەرایـەتی پاشـڤەڕۆیی دەکـات نـەك پێـشکەوتنخوازی. بـەوە دەچـێ بیروکراسییەتی موحافـەزەکاری رزگـاری نیـشتمانی پێـشکەوتووخواز زێـدە پـارە نـەکات و جێگـای خـەڵاتکردن نـەبێ. ئـیتر نەسیستەم، نە ئەمریکا، نەگەلانی ژێر لەرەوشێکی وەهادا نین ئەمەیان پێ قوت بچێ. ئیتر سەردەمی دەسپۆتیزمی نەتەوەیی و تۆتالیتاریزم کۆتایی پێهاتووە, کە پشتیان بەهاوسەنگی نێوان ئەمریکاو یەکێتی سۆڤییەت دەبەست.

لەگـەڵ ئـەوەی سیـستەم توانـستی پێشخستنی زیـاتری زانـست ــ تـەکنۆلۆژیای هەیـە، بـەڵام هەلومەرجـە کۆمەڵایەتییـەکان کۆسپی رشت و جددی دروستدەکەن. زیاتربوونی نمایش(عرض) لـە داواکـاری(طلب)ەکـان لـەبواری نوێبوونـەوەی راسـتەقینە زانست ـ تەکنۆلۆژیا لەپەلوپۆ دەخات. بەڵام لەچارەسەرکردنی گیروگرفتی جەماوەری بەرفراوان زانست ــ تـەکنۆلۆژیا دەتـوانێ رۆڵێکی گرنگ ببینێ. ئەمەش تەنیا لەرێگای کۆمەڵگایەکی دیموکراتی و ژینگەپارێزی بەدیدێت.

کاتێك تەماشای 25 ـ 50 ساڵی داهاتووی ئەو سیستەمە بکەین کەئەمریکا رێبەرایەتی دەکات، لەهەڵکشان زیاتر چاوەڕوانی دەکرێت بکەوێتە قۆناخی دواکەوتنەوە. تەواوی نیشانەکان دیاری دەکـەن کەفاکتـەرەکانی دواکـەوتن، لەفاکتـەرەکانی لەسـەرپێ مانەوەو بەردەوامبوون، زیاترن. تەنانەت کاتێك سیستەم بخوازێ درێژە بەهەبوونی ئێستای خۆیشی بدات، نەك بەگـەورەبوون، بـەڵکو لـەرێگای بـچووکبوونەوە دەتـوانێ ئـەنجامی بـدات. هەربۆیـە درێـژە بەبـچووککردنەوەی ئـامێری سـەربازی خـۆی دەدات

کەبەرامبەر یەکێتی سۆڤییەت و بزووتنەوەکانی رزگاری نیشتمانی بەقەد دێوێك گەورەی کردبوو. ئیتر هەنگاو بۆ سەردەمی سوپای تەکنۆلۆژی و قەبارە بچووك دەهاوێشترێ.

هەرچەندە ناوەندەکانی تیرۆرو ماددە بێهۆشکەرەکان و چەکە بایۆلۆژی و کیمیاوی و ئەتۆمییەکانی دەوڵەتە بەرەڵاکان وەك ئامانج باس بکرێ، لەبنەڕەتدا گۆڕانکارییەکانی رۆژهەڵاتی ناوین مەترسی شکاندنەوەی سیستەمی تێدا لەپێشە. هەروەکو مەزەندە دەکرێ گۆڕانکارییەکان و پێشکەوتنەکان لەوەزیاتر کەخاوەن تایبەتمەندێتی و خاسییەتی ئیسلامی رادیکاڵ بێت، ئەگەری بەهێز ئەوەیە زیاتر نزیك بەو سیستەمە دیموکراتی و کۆمەڵکاریانە بێت کەئیمپریالیزم و دەسپۆتیزم بەلاوە دەنێن. ئەگەر رۆژهەڵاتی ناوین لەمیانەی رژێمە دەسپۆت، میللیگەرایی، ئایینی و دەوڵەتگەراییەکان کۆنترۆڵ نەکرێت، دەشێ پێشەنگایەتی نموونەکانی چارەسەرکردنی قەیران بکات. ئەو جموجۆڵە کۆمەڵایەتییانەی پێشتر بەئەفغانستان و ئێراق دەستپێکرد، پێشتر بە فەلەستین ـ ئیسرائیل دواتریش بەفووڵایی لە کوردستاندا بەفووڵایی بەردەوام دەبێت, یان نموونە چارەسەرئامێزەکەی دەدۆزنەوە، یاخود لەزیاتر قووڵبوونەوەی گێژاو(کائیوس)دا رۆڵ دەبینن. هەر بۆیە هێزی سەربازی سیستەم سەرەتا ناتۆ، هێزی هاوپەیمانان لەئێراق و نەتەوە یەکگرتووەکان بە شێوەیەکی گشتگیر لەم زەمینە ژیۆپۆلۆتیکەدا بەدوای چارەسەریدا دەگەڕێن.

سروشتی ناکۆکییەکانی ناوچەکە لەسەربازی زیاتر, پێویستی بەرێگەچارەی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەیە. ئەگەر بەدەستێوەردانی سەربازی کەم و هاوکاری ئابووری و پشتگیری دیموکراتی زیاتر رۆژهەڵاتی ناوین لەناو گێژاوی ئێستا رزگار بکرێت، ئەوا کەم تازۆر مۆدێلی جیهانی 50 ساڵی ئاییندەش دیاردەبێت. ناوەڕۆکی ئەم مۆدێلە، دەوڵەت و سوپای بچووککراوە، سیستەمی دیموکراتی و ئابووری گەورەبووە. وەك عەمباری خەرجی دێوئاسا دەوڵەت بچووکنەکرێتەوە، شیمانە ناکرێت سیستەم لەقەیران رزگاری بێت. بەلاوەنانی دەوڵەتی نەتەوەیی پاشماوەی سەدەی نۆزدەهەم، پێشخستنی بەڕێوەبەرایەتی خۆجێیی گشتی، ئابووری کۆمپانیای فرەرەگەزی، بەرەو پێشەوەچوون بەرەو کۆمەڵگای زانیاری، هەروەکو بلێی بەرنامەی هاوبەشی ئەو سیستەمەیە کە ئەمریکا رێبەرایەتی دەکات. شیمانەی بەرۆژەڤبوونی یەکێتییەکی دەسپۆتی فراوان وەك یەکێتی ئەورووپاش لەئارادایە. وەك پێشبینییەکی تیۆری چاوەڕواندەکرێ وەك یەکێتی جیهانگیری یەکێتی هەرێمیش پێشبکەوێت و لەسەرتاسەری جیهانیش شەڕ بەرپا نەبێت. لەوانەیە دەوڵەت، کۆمپانیا، نەتەوەو ئایدیۆلۆژیەکانی لەسەدەی نۆزدەهەم ماونەتەوە شوێنی خۆیان بۆ دەزگا سیاسییە نیودەوڵەت نیودیموکراسییەکان و یەکینە ئابوورییە سنوورنەناسەکان، گروپی کولتووری هەرێمی و ئەو زهنییەتە فەلسەفی و کۆمەڵایەتی و هەڵسوکەوتانە بەجێبێڵن کەئەخلاق دەدەنەپێش.

ئەوجیهانەی سیستەمی سەرمایەداری تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم بەئیرادەیەکی یەکلایەنە بەڕێوەیبرد، سەدەی بیستەم بەشەڕی گەورەدا تێپەڕبوو. یەکێك لەئەنجامە هەرەگرنگەکانی ئەم شەڕانەش ئەوەبوو کەناتوانرێ جیهان بەبێ گەلان بەڕێوەببردرێ. سەرباری ئەوەی گەلان سیستەمی تایبەتی خۆیان ئاوا نەکردبێت بەو شوێنگەو پێگەیە گەیشتوون بەرامبەر سیاسەت و دەسەڵاتی دەوڵەت دەتوانن ئیرادەی دیموکراتییان بسەپێنن. شیمانەیەکی بەهێزە کەچارەگ یان نیو سەدەی داهاتوو لەسەر راستەڕێی سیستەمی دیموکراسییانەی گەلان هەڵسوڕێ. هەروەها ئەگەرێکی دیکەش زیندووبوونەوەی ئەم کولتوورانەیە کە وەك گەنجینەی هەرە بەهادارن و لەدەستدرابوون و بۆژیانێکی تایبەت وەرچەرخێن. دابڕینی گەلان لەراستینە کولتوورییەکانیان لەفڕکردنی جەستەیی و ئابووری ماڵوێرانکەرتربووە.

گەر ئەم بابەتە کۆبکەینەوە، لەئاییندەی نزیکدا شیمانەی سەردەمێك دەکرێت کە قۆناخی ئیرادەی یەکلایەنەی سیستەمی سەرمایەداری بەسەرچووە، گەلان میللیگەرایی بارگاوی بەشەڕو شۆڤێنیزم بەلاوەدەنێن و ئاشتی و دیموکراسی دەسەپێنن، سەردەمێك دەبێت کەلەگەڵ راستینەی کولتووری و خۆجێیی ئاوێتەدەبێت. ئەمەش لەناو ئەو ئەگەرانەدایە کەبەتەنیا

بەڕێوەی نابات, بەڵکو لەمیانەی رێککەوتنێکی بەپرەنسیپانە لەگەڵ پێکهاتـە بـچووککراوەکانی ناوەنـدی دەوڵـەت بەشـێوەیەکی هاوبەش بەڕێوەیان دەبات. لەجیاتی پێکهاتەی باڵادەستی چین، رەگـەز، ئـەتنیکی و کولتـووری شارسـتانییەتەکەمان دەشـێ وەك قۆنـاخێکی مێـژوویی بـۆ شارسـتانییەتێکی جیهـانگیری دیمـوکراتی هاوچـەرخ وەرچـەرخێ کـەدان بەبـەها کولتـووری و دیموکراتییەکانی گەلاندا دەنێ، بۆ ئازادی رەگەز کراوەیە، فشاری نەتەوەیی سەر ئەتنیکـەکانی بـەلاوەناوە، هاوکـاری کولتـووری بەبنەما دەگرێت.

### *1.* سیستەمی دیموکراسی وەك دەرەتانی رزگاربوون لەقەیران

ئەو هێزەکۆمەڵایەتییانەی جێگای خۆیـان لـەناو سیـستەمی کۆمـەڵگای جیهـان گرتـووەو لـەدەرەوەی دەوڵەتـدان و دەتـوانین بـەزاراوەی گـەل بـەناویان بکـەین, دەشـێ دەرکـەوتنیان لەگێـژاوی ئێستاشدا بەشـێوەی کـاتی (مرحلی) بێـت. تاکـە شـێوەیەکی رزگاربوون لەئارادا نییە، بەڵکو بـەگوێرەی توانـای جموجـۆڵی ئـەو هێزانـەی جێگـای خۆیـان لـەناو پـرۆژەو پراکتیکـدا گرتـووە ئەگەری رێگەچارەی هەمەجۆر هەیەو چاوەڕوانی دەکرێت.

کاتێك گەلانی جیهان پێناسە دەکەین پێویستە زیاتر روونیبکەینەوە. چەندین توێژی جیاواز هـەن کـە لـەدەرەوەی دەوڵـەت مـاون یـان بـەهۆی بەرژەوەندییـەکانیان بـەدەرنراون. چـڕی و بـەرفراوانییان لەدەوڵـەتێك بـۆ دەوڵـەتێکی دیکـە، قۆناخێـك بـۆ قۆناخێکی دیکە دەگۆڕێت. پێویستە گەل وەك زاراوەیەکی دینامیکی دەرکی پێبکرێت کـە بـەخێرایی دەگۆڕێـت. ئـەو توێژانـەی وەك گروپی بەرژەوەندیپەرستی ماددی و مەعنەوی (ئابووری و زانین) لەدەوروبـەری دەوڵـەت کۆبوونەتـەوە, دەشـێ لەمیانـەی گوزارشتی کۆمەڵگای باڵا، ئۆلیگارشی یان بەگوێرەی گووتەی رای گشتی بەتوێژی دەوڵەت ناوببرێن. بەرامبەر ئەمـەش دەتـوانین تەواوی گروپەکانی ـ چینە چەوساوەکان، ئەتنیکی ژێرفشار، گروپی کولتـووری، ئـایینی، رەگـەزی ــ لەلایەکـەی تـری دوالیزمـی دیالەکتیکیدان بە " گەل" بەناو بکرێن. چەندە رەوشی گۆڕانکارییەکانی ناوەوە بگۆڕێت، ئـەوا گروپـەکانی لـەناو چوارچـێوەی پێگەی گەلدان کەم و زۆر دەبن. دەشـێ نـاوەڕۆکی ئـەو فـشارو بەکاربردنەشـی بگـۆڕێت کەدووچاری دێـن. لەوانەیـە بەشـێوەی جیاوازی قڕکردن، دەستدرێژی، سـەرکوتکردنی چینایەتی، نەتـەوەیی، ئـەتنیکی، کولتـووری، نـەژادی، ئـاییـنی، هـزری، رەگـەزی بگۆڕێت و خۆی نیشانبدات. بەکاربردنیش لایەنی هاوشێوەی فشاری هەیە. دەشـێ چـەندین شـێوازی کۆلـۆنی لـەجۆری مـاددی، مەعنەوی، تواندنەوەو وەك خـۆلێکردن (ئاسیملاسیـۆن)، نکـولێکردن، تـالان و تەڵەکـەبازی و چـەندین شـێوازی دیکـەی یاسـایی یاخـود نایاسایی، لەمیانەی توندوتیژی یاخود تەفرەدانەوە پەیڕەو بکرێت.

بەدرێـژایی مێـژوو ئـەم توێژانـە لەسیـستەمێکەوە بـۆ سیـستەمێکی دیکـە دەگـۆڕێن و بـەرەو گروپـە ئاڵۆزەکـانی رۆژگـاری ئەمڕۆمان هاتوون و چەندین پەرەسەندنیان بەخۆیانەوە بینیوە.

قەیرانی سیستەم کە بە بزووتنەوەی لاوانی جیهانی ساڵی 1968 دەستیپێکرد، بەهەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤییەت لەسـاڵی 1989 خێرابـوو، لەمیانـەی هێرشـی 11 ی ئـەیلول بـۆ سـەر جـووت تاوەرەکـە قووڵبـۆوە، دەبینـرێ کـە گـەلان کاریگـەری توندوتیژیان کراوەتە سەر. لەئاکامی داگیرکردنی ئێراق لە 20 ی ئاداری 2003 دەتوانین بڵێین شـلەقاندنی جیهـان بەئاسـتێك و رەهەندێکی مێژوویی گەیشتووە. هەڵکشانە کورتخایەنەکان لەمیانەی گۆڕینی خاسییەت و گۆڕەپان بەردەوام دەبێ. ئـەو شـلە گرکانەی ناکۆکییەکانی نـاو سیـستەم بەسـەر گـەلانی دادەبـارێنێ سووتێنەرە. ململانێکـردن لەگـەڵ بێکاری، برسـێتی و گرفتـە قورسـەکانی تەندروسـتی و ژینگـە و پـەروەردە رۆژەڤـی هـەموو توێـژە کۆمەڵایەتییـەکانی داگرتـووە. هەوڵمانـدا توانـستی چارەسـەری هێـزە دەسـەڵاتدارەکانی سیـستەم پێناسـەبکەین. هەوڵمانـدا روونیبکەینـەوە کـە لـە ناوەڕۆکـدا ئـەو تواناکارییـەی لەدەست داوە ـ بەگوێرەی سەدەی نۆزدەهـەم ــ کـە بـە تـەنها ببێتـە چارەسـەری، ئـەوەی وەك چارەسـەریش دەیـسەپێنن تـەنیا

دۆخـی گێـژاو قـووڵتر دەکەنـەوە، دوورن لەبەرهـەمهێنانی چارەسـەری واتـادار کـەتواناکاری ژیـانی تێـدا بێـت. واتـە ئاماژەمـان بـەوەکرد کەسەرچـاوەکانی قـەیران بـۆ سەرچـاوەی چارەسـەری نـاگۆڕێن، تـەنیا لەحاڵـەتی گۆڕانکاریانـدا دەشێ وەك لایـەنێکی رێککەوتنی بەپرەنسیپانە رۆڵ ببینن.

هەروەکو چۆن لەمێژوودا هاتووە بەمجۆرە گەلان چارەسەری خۆیان پێشدەخەن. هـەر گروپگـەلێك مێـژووی تایبـەتی خـۆی هەیە، ئینجا ئەمە نەریتی پێبگووترێت یاخود کولتوور. لەسەردەمی کۆمەڵگای تیرە سەرەتاییەکانەوە، کۆمەڵـەی ئـەو گەلانـەی پێکهـاتوون بەدرێـژایی مێـژوو بەرامبـەر جـوگرافی ــ کولتـوور (هەلومـەرجی شـوێن) و پێکهاتـە سیاسـییەکان لەمیانـەی پەرچەکرداری هەبوونیان هەولی شێوەگرتن دەدەن. ئەم راوەستەیەی لەبەشی پێشتردا هەوڵمدا بەشێوەیەکی کـورت باسیبکەم خـاوەن چـۆنییەتی و خاسـییەتی کۆمـەڵکاری و دیموکراتییـە. ناشـێ سـەیری ئـەو تاکـە بکـەین کەسـەرمایەداری ناوەڕۆکەکـەی پووچـکردووەو کردوویـەتی بـەپریمات و راوەسـتەی دیمـوکراتی و کۆمـەڵکاری لەبیربکـەین. تەنانـەت ئەگـەر بەسـەرەتاییترین شـێوەش بێـت ئاسـتی کۆمـەڵکاری کۆمـەڵگا نـەبێت تـاك نـاتوانێ بـۆ تاکـە رۆژێکـیش بەتـەنیا بـژی. هەرچـەندە هـەموو جـۆرە پاکتاوکارییەکانی هـزر کەپـشت بـەنکوڵیکردنی کۆمـەڵگا دەبەسـتن بایـەخی ئـەم راسـتینەش ونبکـات، ئەمـە دیـاردەی سـەرەکی کۆمەڵگایە، هیچ تاکڕەوێتییـەك پەیوەنـدی لەگـەڵ ئـەو کۆمەڵگایـە نـەبێت کەپێیـەوە گرێـدراوە شانـسی ژیـانی نابێـت. تـاوەکو بەتەواوی رەهەندەکانییەوە راستینەی گەلان پێناسە نەکرێت، ئەوا لێکدانەوەکانی دەرکەوتن لەگێژاوی هەنووکەی سەرناگرێت. بەگرنگییەوە ئاماژەی پێدەکەم: لەسەدەی بیستەمدا پێکهاتەی سیستەمی سەرمایەداری ـ بەتایبەتی پێکهاتەی دەوڵەت ـ پـشتی بەئافراندنی سێ مەزهەب نەبەستبووایە ـ سۆسیالیزمی بونیادنراو، رزگاری نیشتمانی، سۆسیال دیموکرات ـ دەشیا رووبـەڕووی قەیرانی ئەمڕۆ نەبووایەوە. تایبەتمەنـدێتی سـەرەکی هەرسـێ سیـستەمیش، لەمیانـەی ئومێدبەخـشی بەجـەماوەر دەسـەڵاتیان گرتەدەست. تەواو 150 ساڵ دەبێ ـ لەشۆڕشی ساڵانی 1848 ـ دەیانگووت سەرەتا دەوڵەت دەخەینە ژێررکێفی خۆمـان دواتـر هەرکەس مافی خۆی وەردەگرێ، هەروەکو بڵێی چینەکانی دەوڵەت پڕە لەو توانـستانەی ژیـان کـە کۆتـایی پێنایـەت ــ بەهەشـت دێنێتەوە بیری مرۆڤ ـ دەکرێت بەبەرنامەی هیواو ئومێد. پارتەکان دادەمەزرێن، شەڕ بەرێوەدەبردرێ. دواتر کـە سـەردەکەوێ ئەو توانستانەی لەلای کۆمەڵگا وەك تواناکاریەکانی دەوڵەت دەناسرێ، بەسـەر لایـەنگرانی خۆیـدا بڵاودەکاتـەوە. کاتێـك نـۆرەی جەماوەرە بەرفراوانەکـەی کۆمـەڵگا دێـت شـتێك نـەماوە. هـەمان تـاس و حـەمامی جارانـە. ئەگـەر سـەرکەوتن بەدەسـتنەهێنێ درێژە بەشەڕ دەدات.

تەنانـەت ئـەم مەزهەبـە هاوچـەرخانەش نەیانـدەتوانی هـەنگاوێك بهاوێـژن تـاوەکو بـەناوی گـەل پیرۆزیـان نەکردبووایـە. بەدرێـژایی سـەدەی بیـستەم گـەل لەمەیدانـەکان بـوو. بـەڵام لەبەرئـەوەی تیـۆرو چـەمکی سیـستەمی باڵادەست دەربـاز نـەکرا، سەرباری قارەمانێتی و فیداکارییەکانیان لەمیانەی ئێش و دڵخۆشییەوە لەچوونەریزی سیـستەمەوە رزگاریـان نـەبووە. کاتێـك بۆهەرە قووڵایی مێژووش شۆڕبووینەوە بینیمان کە رەوشی هاوشێوە روویداوە.

لەم چوارچێوەیەدا ئەگەر لەواتایەکدا مێژوو وانەوەرگرتن بێ لـەرووداوەکانی رابـردوو، ئـەوا پێویـستە لەرەوشـی قـەیران ــ گێژاوی لەئارادایە، چارەسەرییەکی هەمیشەیی، ریشەیی و بەپرەنسیپ لەبەرژەوەندی گەلان بەرهەمبێنین. هیچ ئەرکێك لەمـە واتادارتر نییە، هیچ هەوڵێك لەمە پیرۆزتر نابێت. لەو بڕوایەدام کە خـاڵی سـەرەکی دۆڕان سەرچاوەی خـۆی لەبنەمانـەگرتنی راوەستەی دیموکراتی و کۆمەڵکاری گەلان وەردەگرێت.

چەندە شرۆڤەی کۆمەڵگا بکرێت، ستراتیژی و تەکتیك دەستنیشان بکرێت و رێکخستن ئاوا بکرێت، تەنانـەت سـەرکەوتنیش بەدەستبهێنرێ، ئەوا ئەو ئەنجام و خاڵەی پێیبگەن خراپترین پێگەیشتن و ئاوێتەبوونـە لەگـەڵ سیـستەمدا. کاتێك شۆڕشگێرە بلیمەتەکەی سەدەی بیستەم لینین دەیگووت: " جگە لەدیموکراسی رێگایەکی دیکە نییـە بـەرەو سۆسـیالیزم بـچێت " راسـتییە

سەرەکییەکەی درکاند، بەڵام تەنانەت ئەو بەخۆشی کاتێك هەر لەسەرەتاوە تووشی نەخۆشی دەسەڵات هات، لەو بڕوایەدا بوو لەمیانەی کورتەڕێ ــ بەبێ هیچ ئەزموونێکی دیموکراسی ــ دەتوانن بەرەو سۆسیالیزم بچن. هەرچۆنێك بێت بیری لەوەنەدەکردەوە کە ئەو دەوسەڵاتەی پشتی پێدەبەستێ 70 ساڵ دواتریش بێت بەرەو تاڵانکارترین سەرمایەداری دەبات. توانستە زەبەلاحەکانی سۆڤییەت ـ فیداکاری و شەهادەتی ملیۆنان مرۆڤ لەم پێناوەدا، قوربانیکردنی بەهەزاران رۆشنبیری کارامە ـ لەپێناو نەخۆشییەکی دەسەڵات، جگە لە ئاوکێشان بۆ ئاشی ئەو سیستەمەی گوایە دەیانخواست بیڕووخێنن هیچ واتایەکی دیکەی نەبوو. ئەو پەندو وانەیەی لەم ئەزموونە گەورەیەی سەدەی بیستەم ــ شۆڕشی ئۆکتۆبەر ــ هەڵدەهێنجرێ، ئەوەیە کە بەرامبەر بەسەرمایەداری تەنیا لەمیانەی چارەسەری هەمیشەیی، ریشەیی و بەپرەنسیپانە دەتوانرێ راوەستەی دیموکراتی گەلان بۆ سیستەمی دیموکراتی بەرفراوان وەرچەرخێنرێ. تاوەکو دیموکراسی و دیموکراتیزەبوون لەنەخۆشی بەدەوڵەتبوون رزگار نەکرێ بەسیستەمی دیموکراسی ناگات.

بۆ ئەوەی لەنزیکەوە ئاشنای شێوازی چارەسەری بین دیسان پێویستە تەماشای مێژوو بکەین. با لەهەرە کۆنەکەیان دەستپێبکەین. ئەوەی دوا ئیمپراتۆریەتی کۆیلەداری رۆمانی شرۆڤەکرد، ئەو گەلانەبوون کە دەوڵەتیان نەدەناسی و لەدەرەوە بەبەربەر ناودەبران. لەناوەوەش سیستەمی کۆمەڵکاری مانستەر(دێر) رۆمای کون کردبوو. ئەم هێزانە ئامێرە سامناکەکەی کۆیلەدارییان هەڵوەشاندەوە. ئەمانە تادوارادە هێزی کۆمەڵکاری و دیموکراتی بوون. بەڵام سەرپەرشتەکەیان لەمیانەی پاشماوەکانی دەسەڵات تەفرەیانی دا. لەجیاتی ئەوروپایەکی دیموکراتی کەتوانای پەرەسەرندنی هەبێ، بەرەو ئەوروپایەکیان برد کەلەسەربنەمای دەوڵەت و دەوڵەتۆکەی دەسپۆتیزمی دەرەبەگایەتی بوو. جموجۆڵی هاوشێوە لەتەواوی ئەو گۆڕەپانانە سەریهەڵدا کەکۆیلەداری تێدا بەلاوەنرا. لەکاتێکدا لەرێگای رێنیسانس لەدەرەبەگایەتی چاخی ناوین رزگاریان دەبوو، لەهەموو لایەکەوە شارەکانی نیمچە دوورگەی دیموکراسی هەڵدەکشان، دیموکراسی شارەکان پێشدەکەوت. ئیتر ئەوروپای دیموکراتی لەرۆژەڤی جیهاندا بوو. شۆڕشی گەورەی فەڕەنسا (1789) پێشتریش شۆڕشی ئینگلیز (1640) ئەمریکا (1776). لەئیسپانیاو چەندین دەڵەتی دیکەی ئەوروپا لەسەدەی شانزدەهەمەوە لەکۆمۆنەکان دەنگی بەگوڕی دیموکراسی بوون. بەڵام ئامرازی توندوتیژی و هاری کە بەدرێژایی مێژوو تەڵەکەبازی پەیرەوکردووە، واتە هێزی دەسەڵات ـ شەڕ ئینجا نوێیەکان بن یان کۆنەکان لەخزمەتی سیستەمی سەرکوتکردن هەڵدەسوڕان. هەندێکی بۆلایەنی خۆی کێشا، هەندێکیشی سەرکوتکرد. هێزە بێگەردەکانی دیموکراسی لەناو گێژاوی مێژوویی خۆی قوت دا. دوای ئەوەی هێزی دەسەڵات ـ شەڕ لەمیانەی شەڕەکانی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم خۆی تێرخۆراك کردو وەکو تەنە نەخۆشی شێرپەنجە گەورەبوو، رژێمە فاشیست و تۆتالیتارییەکانی دەرەوەی مرۆڤایەتی کرد بەبەڵایەکی مەزن، بوو بەگەورەترین گێژاو(کائیوس)ی مێژوو و رۆژگاری ئەمرۆمان و لەناوچوو.

نەریتە دیموکراتییەکان گەردوونیین. ئەوانیش وەك ئەڵقەکانی زنجیرەن. بەکۆنترین کاتەکانی زەمەنی رابردوو و شوێنەکانی تەنیایی و پەناگەمان دەبەستێتەوە. بەتەنیانین. مێژوو و گۆڕەپانەکان لە هەموو سیستەمێك زیاتر لەگەڵ ئەو دیموکراسییەدان کە لەهەرکەسێك زیاتر پێویستە هی ئێمە بێت. ئەرکی لەپێشینەی ئێمەش، رێگرتنە لەزیانەکانی قۆناخی زانین و هۆشیار بوونەوە، بەراستی هەڵبژاردنی ئامرازی سیاسی راست و گەڕانەوەیە بۆ ئەخلاقی کۆمەڵگا. تەواوی ئەم باسانە سەبارەت بەزانینە. ئامرازی سیاسی بابەتێکە هەرە زێدە پێویستە تاوتوێی بکەین. بەکورتی **بەو دیموکراسییەی ناودەبەین کە نەبۆتە دەوڵەت**. واتە ناکەوینە نێو هەڵەو غەفڵەتی دیموکراسی دەوڵەت یان دیموکراسی دیکتاتۆرییەت کە تەنانەت لینینی بلیمەتیش تێیکەوتبوو. ئەم هەڵوێستە بەواتای بێ سیستەمی و بێ دەستڕۆییەکەی ئەنارشیزم نایێت. دەستڕۆیی ئەو سیستەمەی گەلە کەواتادارە، لەدڵەوە پەسندکراوەو رۆشنکراوەتەوە. ئەو دیموکراسییەی گەلانە کەساڵانە فەرمانبەرانی بەڕێوەبەرایەتی هەڵدەبژێرێ، وەك چۆن هەڵیاندەبژێرێ بەهەمان شێوەش بەلایانەوە دەنێ.

تـاوەکو دیموکراسی ئەسـینای بـەناوبانگ بـەبیر خۆمـان نەهێنینـەوە تێپـەڕنابین. ئەسـپارتای خـاوەن رژێمـی پادشـایەتی و ئەسـینای خـاوەن رژێمـی دیمـوکراتی، بـۆ باڵادەسـتبوون لەنیمـچە دوورگـەی گریـك لـەناو پێکـدادان دابـوون. لەلایـەکی دیکـەوە دەیانخواست ئیمپراتۆریای داگیرکاری پارس ـ رۆمای ئەم قۆناخە بوەستێنن. شاری بچووکی ئەسینا لەرێگای چەکی دیموکراسی خۆی توانی بەسەر ئەم دوو دوژمنە بەناوبانگەی سەربکەوێ. بەبێ ئەوەی پەنابباتـە بـەر سـوپاو دەوڵـەتی رێکخـراو و جـێگیر، لەمیانـەی هێـزە خۆبەخـشەکانی جـەماوەرو ئـەو فەرماندانـە سـەرکەوتنی بەدەسـتهێنا کـە سـاڵانە هەڵدەبـژێردران. ئـەو دیموکراسییەتەی پەیڕەویش کراوە، دیموکراسی چینی کۆیلەدار بووە نـەك هـی گـەل. دیـسان لەساڵانی 500 ی پ.ز سـەردەمی ئەسینا مۆرکی خۆی لەیەکێك لەقۆناخە واتادارەکانی مێژوو دا. گەلان لەرێگای دیموکراسییەتەکەیانەوە گورزیان لەگەورەترین دوژمن و تەواوی سیستەمەکانی ستەمکاری وەشاندووە. لەمیانـەی دیموکراسـییەتەوە خۆشـترین قۆناخـەکانی خۆشـگوزەرانییان ئافراندووە. ئەگەر ئەمریکییەکان خاوەن دیموکراسی نەبوونایە نەیاندەتوانی ئـەو وڵاتـە (بریتانیـا) بێننـە سـەرڕێ کـە خـۆری تێدا ئاوانـدەبوو. ئەگـەر ئینگلیزەکان خـاوەن دیموکراسـی گـەل نەبوونایـە، ئـەوا نەیانـدەتوانی بنەماڵـەی پادشـای هـار نۆرمـان بـڕووخێنن، ئـەو دیموکراسـییەی ئینگلتـەراش ئـاوا نـەدەکرا کـە لـەرۆژگاری ئـەمرۆشمان نموونەیـە. ئەگـەر دیموکراسـییەتی Demos ی فەڕەنسا نەبووایە ئەوا ئەو شۆڕشە مەزن و رژێمە کۆمارییە ناودارانەی جیهان ئاوانـەدەکران. کەواتـە دیموکراسـی بەرهەمدارترین رژێمە. رژێمی سیاسی چەندە دیموکراسی بێت، ئەوا ئاشتی کۆمەڵایەتی بەشی تەواوکـەری هـەمان راسـتینەیە. زۆر باش دەزانرێ. کاتێك دیموکراسی ناوەڕۆکی خۆی ونبکات، لەدەستی دیماگۆگەکان ببێتە ئـامرازی نێـچیرگرتن سـەرەتا رژێـم دەڕووخـێ، دواتـر خۆشـگوزەرانی کۆتـایی پێـدێت. موحافـەزەکاری و فاشـیزم، شـەڕو داڕووخـان لـەدوای خۆیـان دێـنن. ئەگـەر کۆمەڵناسی تۆزێك هەڵوێستێکی دروست و دڵسۆزانەی نیشان دابووایە، ئەوا دەبینرا کەمێـژوو و کۆمـەڵگا بەشـێوەیەکی زۆرینـە لەمیانەی راوەستەی دیموکراسییەوە ئافرێنراوە.

با سەرنـج بۆ خاڵێکی دیکەی گرنگ رابکێشین کە سەبارەت بەبابەتەکەمان پێویستی بەروونکردنەوە هەیە. ئەویش دەرهەق بەوەیە کە دیموکراسیگەرایی چینایەتی واتادارو بەگوێرەی پێویـست نییـە. بـەگوێرەی چـەمکی باڵادەسـتی کۆمەڵناسـی سـەرەتا کۆیلە، دواتر رەنجبەر، هەرە دواییش بوون بەکارکەرو پرۆلیتاریا ئـەنجامی ناچاری و پێویـستی لێـشاوی مێـژوون کـە نـاتوانرێ رێگری لێبکرێـت. تـاوەکو ئـەم دیاردانـە لەژیاندانـەبن نـاتوانین بەسۆسـیالیزم، ئـازادی و یەکسانی بگـەین. لـەدۆخێکی وەهـادا: دروشمـی بـژی کۆیلـە، بـژی رەنجبـەری گونـدی، بـژی کارکـەر بـەواتای شۆڕشـگێڕی چینایەتی و دیموکراسـی چینایەتی دێـت، دواتریش بەواتای دیکتاتۆریەت دێت. ئیتر باش دەرك بەوەکراوە کە ئەم فۆرمیلەیە لەسەرەتاوە تاکۆتایی تیۆری خزمـەتکردنی کۆیلایەتییە. لەدیموکراسی گەلاندا جێگای کۆیلە، رەنجبـەرو کارکـەران نییـە. دیموکراسـی راسـتەقینەی گـەل کۆیلـە، رەنجبـەرو کارکەری سیستەمەکانی کۆیلەداری، دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری پەسـند ناکـات، رەتیاندەکاتـەوە. پیرۆزکردنـی گـروپ و گەلـە چەوساوەکان نەخۆشییەکی کۆنە. دیموکراسی ئەم نەخۆشیە هەڵناگرێ. نـاوی خـۆی لەسـەرە، لەشـوێنێکدا دیموکراسـی هـەبێت ژێردەستی و چەوسانەوە نابێت. بەڕێوەبردنێکی هاوشێوەی ڕانەمەڕیش نابێت. لەدیموکراسیدا بەڕێوەبردن بوونی نییە، بەڵکو خۆبەڕێوەبردن لەئارادایە. ژێردەستی بوونی نییە، بەڵکو زاڵبوون بەسـەرخود لەئارادایـە. دەشـێ سیـستەمە زۆردارەکان، کۆیلـە دروسـتبکەن و رەنجبـەری و کارکـەریش بکـەن بـەدەزگا. بـەڵام کاتێـك دیموکراسـی پێـشبکەوێت کۆیلـە، رەنجبـەرو کارکـەریش نامێنێ. دیسانیش کار دەکات، بەڵام وەك خاوەن کاری خۆی، وەك ئەندامی کاری هەرەوەزی کاردەکات. هەرەوەزی و دیموکراسـی وەك گۆشـت و نینـۆك بەیەکـەوە گرێـدراون. پێناسـەو کۆڵەکـە مێژووییـەکانی ئـەو دیموکراسـییەی کردوومانەتـە ئامـانج بەمجۆرەیە. هەرچی دیموکراسییەتی چینایەتییە پێویستی بەدەسەڵاتێك هەیە. هـەر دەسـەڵاتێك پێویـستی بەدەوڵەتێکـە، هـەر دەوڵەتێکیش پێویستی بەنکوڵیکردنی دیموکراسییە. دیموکراسییەتی چینایەتی لەناوەڕۆکدا دیموکراسی نییە, بـەڵکو دەسـەڵاتی

دەوڵەتە. ئەزموونی سۆڤییەت، چین و کوبا بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەمە دەسەلمێنن. پێویستە " چەندە دەوڵەت بەهێزبێت دیموکراسی لاوازدەبێت, چەندە دیموکراسی بەهێزبێت دەوڵەت لاوازدەبێت" وەك رێسایەکی زێرین بنووسرێ.

پەیوەندی دیموکراسی لەگەڵ ئازادی و یەکسانی تادوارادە دەرکی پێدەکرێت. ئەمانە ئەلتەرناتیڤی یەکترنین. چەندە دیموکراسی گەشە بکات، ئازادیش پێشدەکەوێت, چەندە ئازادییەکان گەشە بکەن یەکسانی دێتەئاراوە. دیموکراسی ئەو مێرگە راستەقینەیە کە ئازادی و یەکسانی تێدا گەشە دەکات. ئەو دیموکراسییەی پشت بەئازادی و یەکسانی نەبەستێ، تەنیا دەشێ دیموکراسی چینایەتی بێت. لەدۆخێکی وەهادا دەشێ تەنیا چینێك، دەستەیەك، یاخود گروپێکی بژاردە ئازادو یەکسان بن. تەنیا بەڕێوەبراوی و کۆیلایەتی بۆ ئەوانیتر دەمێنێتەوە. لەبەرئەوەی لەدیموکراسی گەلاندا بەرێوەبەرایەتی خۆیی و خۆبەڕێوەبردن بنچینەییە, یەکسانی و ئازادیش گشتی دەبێت. کەواتە بەرفراوانترین یەکسانی و ئازادی لەدیموکراسی گەل و ئەو دیموکراسییانە بەدیدێت کە نەبوونەتە دەوڵەت و دەسەڵات. دیموکراسی نکوڵیکردنی دەوڵەت نییە, بەڵام پەردەی رازانەوەی دەوڵەتیش نییە. داخوازیکردنی دیموکراسی لەرێگای رووخاندنی دەوڵەت بەهەڵەداچوونە. راستتر ئەوەیە کە بەشێوەیەکی یەکپارچەیی و بەپرەنسیپانە دیموکراسی و دەوڵەت بەیەکەوە بەرێوە ببردرێن.

لەقۆناخی دیموکراسییە بێسنوورەکاندا ناژین. لەم رۆژگارەماندا کە هێزی دەوڵەت باڵادەستە، دیموکراسییەتێکی شایستەی ژیان بێ پێویستی بە رێککەوتنێکی بەپرەنسیپانە هەیە لەگەڵ هێزی دەوڵەتدا. هەرچەندە درەنگکەوتبێت و ناتەواویش بێ شارستانییەتی ئەوروپا لەمیانەی ئەو وانەیەی کە بەشێوەیەکی باش هەرسیکردووە, هەوڵدەدات دیموکراسی و دەوڵەت لەناو یەکتردا بەرێوەببات. لەدوای شەرە گەورەکاندا هێزی چارەسەری دیموکراتییانەو کارەکتەری جەنگاوەری بینی. قورسایی خستنەسەر دەسەڵاتگەرایی لەوانەیە بەرژەوەندی کەمینەیەکی لێبکەوێتەوەو بەهێزببێت. بەڵام لەئاکامدا کارەساتی گەورە بۆ وڵات، نەتەوەو گەلەکانی دێنێت. ئەوروپاییەکان بەرلەوەی ببنە خاوەن دەوڵەتی نەتەوەیی هێندە ئارەزووی دیموکراسییان نەبوو. بەڵام ئەزموونی فاشیزم نیشانیدا تاوەکو قورسایی نەدرێتە سەر دیموکراسی تەنانەت ناتوانرێ دەوڵەتی نەتەوەییش بپارێزرێ. چەمکی سەرەتا دەوڵەتی نەتەوەیی زامن بکەین دواتر نۆرەی دیموکراسی دێت هۆکاری تەواوی کارەساتەکانی فاشیزم و تۆتالیتاریزمە. وڵاتانی ئەوروپا کەلەرێگای یەکێتی ئەوروپاوە سەرەتا باسی دیموکراسی و مافی مرۆڤیان کرد ئەوکاتە رێگای هەمیشەیی خۆشگوزەرانی و ئاشتی دەستنیشانکرا. مۆدێلی یەکێتی ئەوروپا بەم شێوەیەیە. ئەمە ئەو هێزە سیحراوییە راستەقینەیە کەجیهان بەرەو ئەوروپا پەلکێش دەکات. بەو ئەندازەیەی ئەوروپا ئەم هێزە سیحراوییە لەجیهان بڵاوبکاتەوە لەتاوانەکانی رابردووی رزگاری دەبێت. ئەوکاتە هەروەکو لەتەواوی شارستانییەتەکاندا روویداوە ناوەرۆکە ئەرێنییەکان دەبێتە بەهای هاوبەشی تەواوی گەلان.

بەڵام دیسان نابێ لەبیربکەین کە ئەوەی لەریشەی شارستانییەتی ئەوروپا شاراوەیە چینێکی بۆرژوازی بەئەزموونە کەبەردەوام بەدوای بەرژەوەندییەکانی رادەکات و لێکدانەوە ساردو سڕەکانی قازانج ئەنجامدەدات. وەك ئەرستۆکراتە هاوچەرخەکان زووبەزوو دەست لەو ژیانە لۆکسەی خۆیان بەرنادەن کە لەلوتکەی دیموکراسییەتەکاندا جێگیر بن. بەڵام دیموکراسیش بەبێ ئەوەی خوێن برژێن و سەربپەرێنێ دەزانێ چۆن تەختەکانیان بێنێتە خوارەوە، واتە دەزانێ چۆن وردە وردە دەوڵەتەکەیان بپوکێنێتەوە. بەتەنیا ناتوانێ ئەمە ئەنجامبدات. تەنیا کاتێك دیموکراسی لەجیهان پێشبکەوێت لەبواری ئەرێنی ئەوروپا بەجیهانی دەبێت، جیهانیش کاتێك دیموکراتیزەبێت دەبێت بەئەوروپا. وەها دیاردەبێ لەقۆناخی دەرکەوتن لەم گێژاو هەنووکەییەدا مێژوو ئەم ئەزموونە بەخۆیەوە دەبینێ. تاوەکو دیموکراتیزەبوونێکی نوێ لەجیهان بەدینەیەت ئاستەمە لەمیانەی کۆمپانیاکانی ئەمریکاو یاساو مافپەروەری و دیموکراسی ئەوروپا لەڤەیران و گێژاو رزگاریان بێت.

پێویسته بەبایەخەوە هەڵوەسته بەرامبەر ناوەرۆکی کۆمەڵایەتی چەمکی دیموکراسی بکەین. لەناوخنی چەمکەکەدا جیاوازی وەکو چین، رەگەز، ئەتنیك، ئایین، رۆشنبیری و پیشەییدا ناکرێت. دیسان دەشێ تەڤلیبوونی تاك و گروپ لەئارادابێت. هەروەکو چۆن بۆ دیموکراتیبوون هاووڵاتیبوونی تاك بەبنەما ناگیرێت، ئەوا رێگا لەجێگرتنی گروپە جەماوەریەکانیش ناگیرێت. هێزی تاك و گروپ بەواتای توانستبوون نایەت. هەروەکو چۆن تاکەکان رکابەری یەکترن، بانگەشەی بەهێزبوونی گروپەکانیش هیچ واتایەك نابەخشێ. ئەو پرەنسیپەی رەچاو دەکرێت ئەوەیە کە خزمەتی گشتی و دەستپێشخەری تاك بەگژ یەکتردا نەچنەوە. بەدەستهێنانی خاڵی ئۆپتیماڵی ـ هەرە بەپیت ـ نێوان تاکێتی تاك و گشتیبوونە. لەگەوهەردا خولقاندنی ئەو تاکەیە کەهاوسەنگە، خاوەن دەستپێشخەری و خولقکارە، هێزی خۆی لەتایبەتمەندێتییە کۆمەڵکاریەکان و خۆراکی خۆی لەتاکێتی تاك (کەسێتی تاك) وەردەگرێ. ئەگەر تەنیا قورسایی بدرێتە سەر کۆمەڵکاری لەوانەیە دیموکراسی بەرەو تۆتالیتاریزم بچێ. بەپێچەوانەی ئەمەش هەموو شتێك بۆ تاك رەوا ببینرێ، ئەمەش لەلایەك رێگا لەپێش ئەنارشیزم دەکاتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە دژ بەکۆمەڵگا تاکرەوێتی زۆر بەهێزبکات، لەئاکامدا هەردوو مەیلیش رێگا لەپێش ئەوەدەکەنەوە دیکتاتۆریەت لەسەر کۆمەڵگا زاڵ بێت، گەندەڵی بێتە ئاراوە. دیموکراسی پێویستی بەو کەسایەتییانەیە کە بەشێوەیەکی هۆشیارانەو بەدڵ ئاشقی خزمەتی کۆمەڵگاو ئاسوودەیی تاك بێت. لەپارتەکان زیاتر تاوەکو ئەو کەسایەتییە دیموکراسییانە لەئارادانەبن کە کۆمەڵگا بەزیندوویی و دینامیکی دەهێڵنەوە، بەردەوام گەل لەبواری دیموکراسی پەروەردە دەکەن، هانی هۆشیاربوونیان دەدەن، ئەوا تەنیا لەمیانەی دەزگاو بنەماکان دیموکراسی بەڕێوە نابردرێت. دیموکراسی وەك دیاردەیەکی دینامیکی بەردەوام پێویستی بەئاودانە (پەروەردەیە). ئەگەر دیموکراسی لەلایەن نەوە ئاشقەکانییەوە بەخێو نەکرێت، وشك دەبێ، گەندەڵ دەبێ و بەرلەهەموو شتێك دەبێتە ئامرازی گۆڕانکارییە دژە دیموکراسییەکان.

بەڵگەنەویستە کەدیموکراسی بەکاریگەرترین ئامرازی چارەسەرکردنی کێشەکانی ــ ئاشتی ــ کۆمەڵگایە. جگە لەبەرگری رەوا هێزی خۆی لەتوانای رازیکردن و بڕوا پێهێنان وەردەگرێت، نەك شەڕ. لەمیانەی بەراوردکردنی زیانەکانی شەڕو بەهاو دەسکەوتەکانی ئیقناعکردن، بەردەوام دەتوانێ ئەو رێگەچارانەیان پێشکەش بکات کە لەبەرژەوەندی گەلان دایە. گفتوگۆ بوێرو واقیعییەکانی گیروگرفتەکان رۆشندەکاتەوە. هەرچی کێشە رۆشنکراوەکانیشە، لەمیانەی تەڤلیبوونێکی بەرفراوانی لایەنەکان، لەرێگای رێککەوتنی ریشەیی چارەسەردەکرێت. هیچ سیستەمێك بەئەندازەی دیموکراسی پڕ لەگفتوگۆ نییە، لەئاشکراکردنی راستییەکانیش تائەم رادەیە سەرکەوتوو نییە. مێرگی راستەقینەی پێشکەوتنی زانست و هونەرەجوانەکان دیموکراسییە. دیموکراسی ئەسیناش باشترین زەمینەی بۆ فەلسەفە رەخساند. ئەگەر دیموکراسییەتی ئەسینا نەبێت ناشێ بیر لە ئەرستۆ، ئەفلاتون و سوقرات بکرێتەوە. ئەگەر دیموکراسییەتی شارەکانی سەردەمی رێنیسانس نەبووایە، ئەوا شۆڕشە زانستی و هونەرییەکان روویاننەدەدا.

گەلان لەباشترین دیموکراسیدا دەتوانن دەوڵەمەندێتی نەریتی کولتووریان بژێیننەوە. کولتوور تەنیا بەوە ناوەستێ کەرابردووی گەلێك بێت، بەڵکو شێوەی گەوهەری هەبوونەکەشیەتی. گەلێك لە کولتوورەکەی دابماڵی، تەنیا لە شێوەکەی خۆی دانابڕێنی، بەڵکو ئەو رۆحەشی لەناو دەبەرێت کەرێگای لەپێشکردۆتەوە. هەربۆیە دیموکراسی گونجاوترین سیستەمی سیاسییە، بۆ ئەوەی گەلێك لەسەربنەمای کولتوورەکەی بەئازادی بژێنێ. بەشێوەیەکی بنچینەیی ئەو کێشە نەتەوەیی، ئەتنیکی و ئایینیانەی سەرچاوەی خۆیان لەفشاری نەتەوەیی وەردەگرن، لەمیانەی ژیانێکی ئازادانەی هەلومەرجی دیموکراتیانەدا شانسی گەیشتن بەواتادارترین چارەسەریشیان هەیە. لەو وڵات و گۆڕەپانانەی دیموکراسییەتی راستەقینە پەیڕەو دەکرێت، پێویستی بەهیچ جۆرێکی فشار نابینرێت و دەرفەت بەوەش نادرێت کە وەك ئامرازی بەرژەوەندی بەکار بهێنرێت. لەجیاتی میللیگەرایی سەرکوتکەرو سەرکوتکراو یەکپارچەیی دیموکراسی بەبناخە دەگیرێت.

نـاتوانێ رۆڵ و کۆمـەکی دیموکراسـی بـۆ ئـابووری بـچووکبکرێتەوە. ئەگـەر سیـستەمی دیموکراسـی لـەناو کۆمـەڵگادا دەستبەکاربێت، ئەوا بەها ئابوورییەکان نەبۆ بەرێوەبەرایەتی پاوانخوازی و تالانکاریەکەی، نەبۆ بێبەرهەمی تاکەکان، بۆ هیچ یەکێکیان بەجێ ناهێڵدرێت. دیموکراسی توورەیی و حەماسەتی قازانجی زیادەو تەمبەڵێتی و نـەبوونی هەستی بەرپرسیارێتی تاك و دەزگاکان، هیچ یەکێکیان پەسند ناکات. لەم گۆرەپانەشدا باشترین شێوەی هاوسەنگی ئۆپتیماڵ (بەبەرهەم) ئاوادەکرێت. هەرەدرەنگیش بێت، ئابووری گشتی و تایبەت بەخاڵی هاوسەنگی ئۆپتیماڵ دەگات. لەمیانـەی چـەندین لێکۆڵینـەوە پەیوەنـدی دیموکراسـی لەگـەڵ بەرهەمـداری ئـابووری و گەشـەکردنەکەی، سـەلمێنراوە. بەئەنـدازەی بەرهـەمی بـەپێت دابەشـکردنێکی عادیلانـە، هێنـدەی سـەرمایەی وەبـەرهێنانی گونجـاو لێکۆڵینـەوەی پێویـست لەباشـترین دیموکراسـیدا زەمینەکـەی پێکـدێ. جێبەجێکردن و وەڵامدانەوەی داواکاریە راستەقینەکانی گەل لەلایەن بەرهەمهێنانەوە، فاکتەرێکی بنچینەیی هاوسەنگی نێوان نمـایش و داواکـاری (عـرض و طلـب)ە. بـەمجۆرە بـازاڕی کۆمـەڵگا شانـسی ئـاواکردنی دەبێـت. پێـشبڕکێ جێگـای رۆحـی لەناوبەرانەی کێبڕکێ دەگرێتەوە. لاسەنگی نێوان داواکاری و نمایش، یارییـەکانی نـرخ و کەمبوونـەوەی نرخـی دراو....هتـد کە یارییەکانی فینانسن و هۆکارە بنچینەییەکانی قەیرانن، لەنزمترین ئاستدا دەهێڵدرێتەوە، لەپێناو دەرکەوتن و چارەسـەرکردنی هێزەکانی خۆی دەخاتە گەڕ. بێکاری سیستەماتیك بەچارەسەری ریشەیی دەگات.

لەتێکۆشانی کۆمەڵگای دیموکراتیدا پێویستە بەشێوەیەکی تایبـەت هەڵوەسـتە بەرامبـەر توێـژی لاوان بکرێـت. کاتێـك لاوان بـەرەو بەکۆمەڵایـەتیبوون دەچـن رووبـەڕووی تەڵەزگـەی گـەورە دەبنـەوە. لەکاتێکدا لەلایـەك لـەژێر هەلومـەرجی کۆمـەڵگای نـەریتی باوکـسالاری، لەلایـەکی دیکـەوە لـەژێر مەرجـەکانی ئایـدیۆلۆژی سیـستەمی فـەرمی پەلـەکوتکێ دەکـەن، لـەرێگای دینامیکەکەیەوە پێکهاتەیەکی کراوەی بۆ نوێبونەوە هەیە. بەرامبەر بەرووداوەکان تـادواڕادە بـێ ئەزموونـە. لـەژێر کاریگـەری کۆمەڵگای بەسالاچـوودا لـەوە دوورە رۆڵـی خـۆی بدۆزێتـەوە. بەرامبـەر بەهـەزارو یـەك تەڵەکـەبازی تەفرەدەرانـەی کۆمـەڵگای سەرمایەداری ناتوانێ هەناسەش بدات. تەواوی ئەم راستییانە پەروەردەیەکی کۆمەڵایەتی دەکات بەناچاری کەتایبـەت بـەلاوان بێ، لەتەڵەزگـەکانیان دووربخاتـەوەو بـەگوێرەی ناوەڕۆکەکـەی بێـت. پـەروەردەی لاوان کارێکـە پێویـستی بـەئارامی و هـەوڵێکی مەزن هەیە، بەرامبەر ئەمەش لاو خاوەن ئاکتیفبوون و تەوژمێکە لەمیانەی هێـزە دینامیکییەکـەی دەتـوانێ داسـتان بنووسـێ. کاتێك بەشێوەی پێویست لەئامانج و پێڕەو بکات هیچ کارێـك نییـە تێیـدا سـەرنەکەوێت. کـاتێ ئامـانج و ژیـانی بـەپێڕەو وەك دیسپلینێکی سەرەکی ژیان ببینێ و سەفەربەر بێـت، ئـارامی و پێـداگری کـەم نەکاتـەوە، ئـەوا واتـادارترین بەشداری و کۆمـەك پێشکەش بەدۆزە مێژووییەکان دەکات. هەڵمەتێك کەلـەژێر رێبەرایـەتی ئـەمجۆرە کادیرانـە هـەنگاوی بـۆ بنرێـت، لەتێکۆشـانی گشتی کۆمەڵگای دیموکراتیدا فاکتەری گەرەنتیکردنە. بزاڤێکی کۆمەڵگا کە لەدینامیزمی لاوان بێبەش بێت شـانس و دەرفـەتی سەرکەوتنی سنووردارە. ئەزموونی تەمەنداران و دینـامیزمی لاوان دیاردەیەکـە لەهـەموو قۆناخـەکانی مێـژوو هەسـتپێکراوە. ئەوانـەی توانیویانـە بەشـێوەیەکی تەندروسـتانە پەیوەنـدی نێـوان هـەردووکیان دروسـتبکەن بـەردەوام شانـسی سـەرکەوتنی کاروانەکانیان بەرزبووە. خەیاڵە بەرزەکانی لاوانی رۆژگاری ئەمرۆمان تەنیا ئەوکاتە واتادار دەبێ کەسەبارەت بەوە بێت چۆن لـەم قەیرانـە کۆمەڵایەتییـە رزگارمـان دەبێـت. لاوێـك کـە لەخـەیاڵ بێبـەری بێـت، تـەنیا لەمیانـەی گەڕانـەوە بـۆ خەیاڵـە راستەقینەکان دەشێ لەگەندەڵبوون و لەدەستدانی ژیان رزگاری بێت. دەرککردن بەرەوشی گێژاو (کائیوس ـ کائیوس) کە دوا قـەیرانی سیـستەمە، بـۆلاوان مـەرجی ئەنجامـدانی پێهەڵگرتنـە. شانبەشـانی ئەمـەش پەسـندکردن و هەرسـکردنی بـەهاکانی کۆمەڵگای دیموکراتی، ژینگەپارێزی و ئازادیخوازی رەگـەزی، دەرفـەتی سـەرکەوتنی مێـژوویی پێـشکەش دەکات، لەلایـەك خـۆی بونیاد دەنێتەوە، لەلایـەکی دیکـەش لەئاواکردنـەوەی ئـەو کۆمەڵگایـەی تامـەزرۆیبوون رۆڵێکی گـرنگ دەبـینێ. هـەموو شـتێك لەمیانەی بەشداریکردنێکی راست و تۆکمەی لاوان بۆ هەڵمەتەکە دەستنیشاندەکرێت.

بەئەندازەی پێناسەکانی خودی دیموکراسی شێوەکانی ڕێکخستن و چالاکییەکانیش گرنگە. لەکاتێکدا پێناسەی ناوەڕۆك ڕێگا لەپێش ڕۆشنکردنەوەی ئامانجەکان دەکاتەوە، شێوەی ڕێکخستن و چالاکییەکان پێویستیان بەپێناسەیەکی ڕاستی ئامرازەکان هەیەو بەبێ ئەو نابێت. تاوەکو هەمئاهەنگی نێوان ئامانج و ئامراز بەشێوەیەکی ڕاست هاوسەنگی پێشوازیکردنی یەکتر شرۆڤە نەکەن زەحمەتە ڕێگاکانی دیموکراسی بگرنەبەر. ئەو دیموکراسییانەی تەنیا پشت بەئامراز یان ئامانج دەبەستن، کەمئەندامی بەیەك قاچمان دێنێەوە یاد. بەیەك قاچ، دەتوانرێ بەکامە هێزو تاکوێ بەرێوەبروات؟.

دەشێ لەسەرەوە شێوەی کۆنگرەیەك، لەناو بنکەشدا شێوەی هەرەوەزییە خۆجێییەکان، کۆپەراتیفەکان، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، مافەکانی مرۆڤ و ڕێکخستنەکانی شارەوانی وەك شێوە سەرەکییەکانی ڕێکخستنی دیموکراتی دەستنیشان بکرێت. پێویستی بەژمارەیەکی زۆری ئەو ڕێکخراوانە هەیە کەبەرفراوانن و وابەستەی مەسەلەکانی خۆیانن. دیموکراسییەکان پێویستییان بەرێکخستەترین کۆمەڵگا هەیە. ڕێکخراوەکان بۆ دەربڕینی داواکارییەکانی کۆمەڵگا ژیانیین. ئەو کۆمەڵگایەی خۆی ڕێکنەخستبێت دیموکراتیزە نابێت. ئاواکردنی تەواوی ڕێکخراوە تایبەتەکانی بوارەکانی کولتووری، سیاسی، ئابووری بنچینەییە. وەك ڕێکخستنە سیاسییە سەرەکییەکان (پارتەکان) بۆ دیموکراسی ژیانییە. ڕێکخستنەکانی کۆمەڵگای مەدەنی شێوەی سەرەکی ڕێکخراوبوونی گۆڕەپانی کۆمەڵایەتییە. لەبواری مافپەروەریشیدا، مافەکانی مرۆڤ، کۆمەڵەی پارێزگاران و وەقفەکان جێگای بایەخن. هەرچی ڕێکخستنی سەرەکی بواری ئابووریشە، دەشێ بەشێوەی هەرەوەزییەکان و گروپەکانی کار بن، یاخود بەئامانجی گشتی بەگوێرەی خاسییەت و چۆنایەتی بازرگانی، دارایی و پیشەسازی بێت. تەندروستی و پەروەردە ئەو دەزگا گشتیانەن کە هەرە زێدە پێویستە گەل شرۆڤەی بکات. ئاواکردنی دامەزراوەکانی وەرزش و هونەر لەپێناو پەروەردەکردنی گەل گۆڕەپانی دەستلێبەرنەدراون. هەروەها لەئاستی گوندیشدا ئاواکردنی دەستەی تەمەنداران و موختارێتی لەجیاتی ئەوەی ببنە ئامرازی دەوڵەت، ڕێکخستنیان وەك ئامرازی دیموکراسی جێگای بایەخە. هەر گوندێك پێویستی بەخانەی کولتووری گەل هەیە. پێویستە لەشاریش کۆمۆنەکان بەشێوەیەکی جودا وەك ژێرترین ڕێکخستنەکان واتاداربکرێن. هەروەها ئەنجوومەنەکانی شاریش دەزگایەکی دەستلێبەرنەدراون. یەکێتی شارەوانییەکانی نێوان شارەکان لەئاستی هەرێمیدا واتادارە. پێویستە تەواوی ئەم دەزگاو ڕێکخراوانە لەبەرزترین ئۆرگانەکانی بڕیاردانـدا نوێنەرایەتییان بکرێت کە کۆنگرەی گشتی گەلە. کۆنگرە گشتییەکانی گەل مۆدێلێکی ڕێکخستنە، کەتایبەتە بۆ چارەسەری کێشەی تەواوی گەلان و ژیانییە. کۆنگرەی گەل نەبێت، ناتوانرێ باس لەدیموکراسی گەل بکرێت.

نابێ کۆنگرەکانی گەل وەك ئەلتەرناتیفی دەوڵەت یاخود وەك دامەزراوێکی دەوڵەت ببینرێ. هەروەکو چۆن دەوڵەتی گەل نییە, لەهەمانکاتدا ئامانجی جێگرتنەوەی ئەو دەوڵەتە نییە کە لەئارادایە. هەروەکو زۆرجار باسکرا، دەوڵەت ڕێکخستنی کۆن و سەرەکی کۆمەڵگای باڵایە. بەشێوازی دیموکراسی پێکنەهاتووە. نەریتییەو لەمیانەی دامەزراندن و خستنەسەرکار بەرێوەدەبردرێت. دەشێ کۆمەڵگای باڵا دیموکراسییەك لەناوخۆیدا بەرێوەببات. دەشێ ئەمە بە" دیموکراسی چینی باڵا "ش بەناو بکرێت. ئەمەش ئەرکی پەردەپۆشکردنی دەوڵەت دەبینێ. ئەو دیموکراسییەتەی زیاتر لەمۆدێلی کۆماری ڕۆژئاوا دەبینرێ دەوڵەت بەبنەما دەگرێ. دەڵێن سەرەتا دەوڵەت دواتر دیموکراسی بەدیدێت؛ دەوڵەت نەبێ بیر لەدیموکراسی ناکەنەوە. هەرچی لە دیموکراسی گەلە دەوڵەت و دەسەڵات وەك ئامانج بەبنەما ناگیرێت. ئەو دیموکراسییەتەی بە دەوڵەتبوونی کردبێتە ئامانج بەدەستی خۆی کۆتایی بەهەبوونی خۆی دێنێ. لەسەردەمی دەوڵەتە مۆدێرنەکانی ئەوروپادا، قۆناخەکانی دامەزراندنی ئەمریکاو یەکێتی سۆڤییەت دیموکراسییە کورتخایەنەکان بوونیان هەبوو. بەڵام لەبەرئەوەی یەکسەر بۆ دەوڵەتبوون تێپەڕبوون دیموکراسییەکانی سەردەمی دامەزراندن بەرلەوەی ببن بەسیستەم لێك هەڵوەشانەوەو بێبەها کران. ئەمەیە ئەو ڕەوشەی بەزۆری لەمێژوودا ڕوویداوە. بەردەوام کۆمەڵگای باڵا لەدیموکراسی ترساوە.

لەبەرئەوەی قەیرانی رۆژگاری ئەمرۆمان ئاستەمە بە پێچەوانەی ئیرادەی گەلەوە بەلاوە بنرێ، ئەوا تەڤلیبوونی (بەشداریکردنی) گەل دەکات بەناچاریەك. هەرچی تەڤلیبوونە بەواتای دیموکراسییەتی گەل دێت. ئەمەش لەئاستی کۆنگرەدا نەبێت بەرێوەناچێ دەشێ دەوڵەتی سەرمایەداری سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم ناچارنەبووبن لەرێگای کۆنگرەی گەلەوە دەستڕۆیی و دەسەڵاتی گەل دەستنیشان بکەن. بەلام دەوڵەتە قەیراناویەکانی رۆژگاری ئەمرۆمان ئەگەر گەل رووبەرووی خۆیان بکەنەوەو دەستپێشخەری نەدەنە گەل, تەنانەت هەنگاوێکیش بۆ چارەسەری ناچنە پێشەوە. هەلومەرجە سەختەکانی قەیران تەڤلیبوونێکی بەرفراوان، هەمیشەیی و دەزگایی گەل دەکەن بەناچاریەك. هەربۆیە تەڤلیبوونەکانی گەل لەسەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم کە واتایەکی کەمی پێدەدرا، لەهەلومەرجەکانی ئەمرۆماندا تەنیا لەرێی کۆنگرەکانەوە دەشێ واتاداربێ. کۆنگرەکان لەمیانەی ئەم چۆنایەتی و خاسییەتانەی نە پارتێکە نە نیو ـ دەوڵەتێکیش, هەردووکیشیان نییە؛ ئەو دامەزراوە کارایانەی گەلن کە بەگوێرەی هەلومەرجە مێژووییەکان هاتوونەتەئاراوە. دوای مەزهەبەکانی سەرمایەداری (سۆسیالیزمی بونیادنراو، رزگاری نیشتمانی، سۆسیال ـ دیموکرات) گەلان زیاتر لەدەوڵەت دوورکەوتنەوەو بەقۆناخەکانی کۆنگرە گەیشتن. هەروەکو چۆن دەوڵەت بەتەواوەتی رەتناکرێتەوە، وەك جارانیش پەسند ناکرێت. هەربۆیە دەشێ لەسەربنەمای هەندێ پرەنسیپی دیاریکراو هەردووکیان بەیەکەوە لەچارەسەرکردنی قەیرانە کۆمەڵایەتییەکاندا بەشداری بکەن. پێبەپێ بچووکبونەوەی دەوڵەتەکان و کەوتنەگەڕی مۆدێلی نوێی دەوڵەت, ئەوا پێویستی مودێلی کۆنگرەکان زیاتر دەکات.

دیسان لەو وڵاتانەی بەدەست کێشە نەتەوەییە قورسەکان دەناڵێنن دەشێ مۆدێلەکانی کۆنگرە رۆڵی ئامرازەکانی (چارەسەرکردن ـ پڕکردنەوەی درزەکان) ببینێ. بۆ جەماعەت و گروپەکانی دیکەش لەئاستی ژێرتردا پێویستی بەکۆنگرە هەیە. تایبەتمەندێتی پارتەکان لە بەیەکگەیاندنی ئەو تەڤلیبوونە خۆبەخشیانەی بەبیروباوەڕو بۆچوون ئەنجامدەدرێت، نیشاندەدەن کە ئەمانە نەبن ناتوانرێ دیموکراسییەتەکان بەرێوە ببردرێن. وەك ئەنجام نابێ مۆدێلی کۆنگرە وەك ئەلتەرناتیفی دەوڵەت ببینرێ، بەپێچەوانەوە لەقۆناخی ئەو کێشە قورسانەی کەدەوڵەت بەتەنیا لەژێر باری دەرناکەوێت، لەرکابەرایەتی زیاتر، پێویستە وەك مۆدێلێکی چارەسەری ببینرێن کە هاوتەریبی یەکترن.

بەئەندازەی زۆرینەی رێکخستنەکان دیموکراسییەتی ناو رێکخستنیش بەلانی کەم هێندەی پێوانە دیموکراتییە گشتییەکان دەستلێبەرنەدراوە. پێکهاتەو بەرێوەبەرایەتی دیموکراسییانەی رێکخستنەکان مەرجە. ئەو گەلانەی رێکخستنەکانیان دیموکراتییانە نەبێ، نابنە خاوەن دیموکراسیش. هەربۆیە ئەو دیموکراسییانەی رێکخستن کە لەمیانەی هەڵبژاردن ـ ساڵی جارێك ـ نوێدەبنەوەو بەردەوام لەژێر کۆنترۆلی گەلدایە تەندروستترین دیموکراسییەتە.

تاوەکو شێوازی چالاکی دیموکراسی دەرکی پێنەکرێت، زەحمەتە بزێویەکەی بخرێتەگەر. دیموکراسی بێچالاکی وەك مرۆڤی بێدەنگ وایە. چالاکی زمانی دیموکراسییە. هەرجموجۆڵێکی گەل و هەرجوولەو کردارێکی رێکخستن چالاکییە. تاوەکو بەگوێرەی هەلومەرجەکان ریزە چالاکییەکانی لەجۆری خۆپیشاندان، کۆبوونەوە، رێپێوان، هەڵبژاردن، نارەزایی، بایکۆت، مانگرتن، ئەگەر هەلومەرجەکانیش رێبدات تا دەگاتە بەرخودانی یاسایی و راپەرین، لەکات و شوێنی خۆی نیشاننەدرێت دیموکراسی بەرێوە ناچێت. بەتایبەتیش کاتێك داواکاریە سەرەکییەکانی گەل پشتگوێ بخرێت، چەندین دەزگاو رێساو ئامانجی دیموکراسییانە تێکبدرێت، ئەوا چالاکی ئامرازی پێویست و ناچاری چارەسەرین. ئەو گەل و رێکخستنەی نەتوانێ چالاکی ئەنجامبدات دیموکراتیزە نابێت. ئەو گەل و رێکخستنەی توانستی رێکخستنی چالاکی نیشاننەدات لەراستیدا مردووە. ئاشکرایە کەچالاکی لەرێگای رێکخستنەکانەوە ئەنجامدەدرێت، چالاکییەك بێ رێکخستن بێت ئاشکرایە کە پووچەڵ دەبێتەوەو سەرناکەوێت. گەلان چەندە بەرێکخستەبن هێندەش خاوەن چالاکی دەبن. پێویستە بەردەوام چالاکی وەك نارەزایی و بەرخودان نەبینرێت. زۆربەی چالاکییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بونیادنەرە, چەمکی چالاکی ئەرێنی مەرجە.

چ کاتێك راپەڕین و شەڕی گەلان دەکەوێتە رۆژەڤ؟ بەشێوەیەکی راست وەڵامدانەوەی هەلومەرج و شێوازی ئەم چالاکییە سەرەکیانە کە بەخراپی دژ بەگەلان بەکاردەهێنرێن، لەمیانەی تێپەڕکردنی سەرکەوتوانەی قۆناخە گرنگەکانی وەرچەرخان لە مێژووی گەلاندا فەراهەم دەبێت. تەنیا کاتێك شێوەکانی دیکەی چالاکی ئەنجامێکی لێ نەکەوتەوە و کێشەکان لەناو بێچارەییەکی ریشەییدا بوون ئەوا راپەڕین و شەڕەکان واتادار دەبن. بەتایبەتی کاتێك هێزەکانی شەڕ ــ دەسەڵات جگە لەتوندوتیژی دەرفەتی هیچ بژارێکی دیکەی رێگە چارەیان نەدا، لەجیاتی ئەوەی گەلان لەژێر سووکایەتی کۆیلایەتیدا بژین بۆ بەرژەوەندییە ژیانییەکانی خۆیان دەبێ هێزی بەرۆژەڤکردنی راپەڕین و شەڕ نیشانبدەن. کاتێك یاساکان بەشێوەیەکی یەکسان پەیڕەونەکران، پەیوەندی بەرۆڵی چارەسەری دیموکراتییانە نیشاننەدرێ، تەواوی چالاکییە ئاشتیخوازییەکان پووچەڵکرانەوە، ئەوا دەشێ بەشێوەیەکی جددی بەرۆژەڤکردنی راپەڕین و شەڕی گەل ببێت بەبژارێکی ناچاری. دەشێ ئەم دوو سنوورە وەڵامی پێویست بداتەوە؛ ئەگەر دەوڵەت بەشێوەیەکی واتادارو هەستیار دەرفەت بەچارەسەری دیموکراتی نەدات، فاکتەرێکی دیکەی فشاریش لەدەست گەلدا نەمێنێ، هەروەکو لەزۆربەی گەلاندا بینراوە، کەم تا زۆر راپەڕینی خوێناوی یان کەم تا زۆر بەردەوام شەڕی گەل دەکەوێتە رۆژەڤ.

ئامانجی هەر راپەڕین و شەڕێك جودابوونەوە نییە؛ بە پێچەوانەوە زیاتر رێگەکردنەوەیە لەپێش یەکێتییەکی دیموکراتییانە. ئیتر سەردەمی ئەو راپەرین و شەڕانەی گەل بەسەرچووە کەجاران ئامانجیان ئاواکردنی دەوڵەت بوو. راپەرینێك و شەڕێکی رزگاری نیشتمانی کە ئامانجی دەوڵەت بێ لەئەنجامدا دەبێتە زیادەیەك و دەخرێتە سەر دەوڵەتی سەرمایەداری. هەروەکو چۆن ئەمە هیچ چارەیەك بۆ کێشەی گەلان ناهێنێ، تەواو بە پێچەوانەوە قورستری دەکات. بەهەرحاڵ کێشەکانی گەلی عەرەبی خاوەن 22 دەوڵەت چارەسەرنەبووە، کەمنەبووە، بەڵکو قورستریش بووە. هەربۆیە دەشێ راپەڕین و شەڕی گەل لەم قۆناخەدا وەها پێناسە بکرێت کەئامانجی ئاواکردنی دەوڵەت نییە، بەڵکو ئامانجی خستنەگەڕی دیموکراسییە لەبواری ناوەرۆك و شێوەوە. دەشێ بەمجۆرە رۆڵە سەرەکییەکانیان دیاربکرێت. تەنیا کاتێك ناچاری و دەستلێبەرنەدراو بێت جودابوونەوە واتادار دەبێت. بژاری گەلان بەردەوام پێویستی بەلایەنگیریکردنی یەکێتی دیموکراتییانە هەیە. هەرچەندە مەیلی میللیگەرایی ئەوپەڕگەری هەردوولا جودابوونەوە بسەپێنن، بەڵام لەم هەلومەرجانەدا پێویستە بژاری گەلان کەمترین توندوتیژی و یەکێتی دیموکراتییانە بێت. چەندە بەبێ پێگەیشتنی هەلومەرجەکان پەنابردنە بەر راپەڕین و شەڕ مەترسیدارە، ئەوا کاتێ هیچ بژارێکی دیکەش نەمێنێ و پەیڕەو نەکرێ سووکایەتی و نارەسەنییە.

گرفتێکی دیکەی چالاکی بۆ دیموکراسی سەبارەت بەوەیە کە لەرەوشی بەرگری رەوادا چۆن هەڵسوکەوت دەکەن. تەنیا لەهەلومەرجەکانی داگیرکاریدا بەرگری رەوا واتاداردەبێت. کاتێك سیستەمێکی داگیرکاری و کۆلۆنیالی، یاخود جۆرەکانی دیکەی فشار لەسەر گەلێك پەیڕەوکرا کەواتە داگیرکاری لەئارادایە. هەروەکو چۆن هێزێکی بیانی بەتەنیا دەتوانێ داگیرکاری پەیڕەوبکات، هەندێ جاریش بەشێوەیەکی هاوبەش لەگەڵ بەکرێگیراوە خۆجێییەکان ئەنجامی دەدات، لەرەوشێکی وەهادا ئەرکی خۆپاراستن (بەرگری) دێتەئاراوە. ئامانج بەلاوەنانی داگیرکاری و ئاواکردنی دیموکراسییە. بەڵام کاتێك دیاردەی بیانی لەئارادابوو ئەوا بەناوکردنی بەرگری بە رەوا، نەتەوەیی بە دیموکراتی هەڵوێستێکی راسترە. لەم هەلومەرجانەدا دیسان زەمینەی راپەرین و شەڕ هاتۆتەئاراوە، بەڵام دیسان ناشێ شەڕی رزگاری نیشتمانی کلاسیك بەبنەما بگیرێت. تەنانەت رەهەندی نەتەوەییشی هەبێت، بەگوێرەی پێویستییەکانی تایبەتمەندێتی سەردەم، بەناوکردنی بە شەڕی بەرگری لەپێناو یەکێتییە دیموکراتییە بەرفراوانەکان گونجاوترە. دەشێ ئەمجۆرە راپەرین و شەڕانە بەیەکەوە یان بەتەنیا لەشارو ناوچە پێدەشتەکاندا پەیڕەو بکرێت. لەچەندین وڵاتانی ئاسیا، ئەفریقیاو ئەمریکا هەموو شێوەکان تاقیکراونەتەوە. لەجیاتی ئەوەی ئامانجی دەوڵەت بێت، دیموکراسی بکاتە ئامانجی خۆی، بەگوێرەی ئەو چارەسەرییانەی لەرۆژگاری ئەمرۆماندا پێشبینی

دەکرێت زیاتر گونجاو دەبێت. تەنانەت خاوەن چۆنایەتییەکی نەتەوەییش بێت، ئەوا رێککەوتنی گەلان و جوڵەی هاوبەشیان بەرامبەر بەرێککەوتنی هاوبەشی داگیرکاران و نۆکەرەکانیان، راسترین هەنگاوە لەپێناو یەکێتی دیموکراتییانەدا. لەدۆخێکی وەهادا پێویستە جۆرەکانی دیکەی چالاکی ئاشتیخوازانە تا دوایی پەیرەوبکرێت. پێویستە بەرگری رەوا زیاتر لەپێناو پشتگیریکردن و پێشخستن و بەرگری لەدیموکراتیزەکردنی گەل رێکبخرێت و بەرێوە ببرێت. لەکاتێکدا هێزەکانی فشارو شەڕ بە ئامانج دەگرێت، ئەوا پێویستە هەبوونی موخاتیبەکانی چارەسەری دیموکراتییانە لەبیرنەکات. رووبەڕووبوونەوەی تەواوی دەوڵەت و نەتەوەی پەیوەستدار ستراتیژیەتێکی راست نییە. وەك تەکتیکیش بەئامانجگرتنی هەموو دەزگا و تاکەکانی هەر هێزێکی بیانی و نەتەوەیەکی داگیرکار راست نییە. پێویستە ئامانجەکان بەرتەسك و ئەنجامگیربێت، تواناکاریەکانی چارەسەری دیموکراتییانەی گەل فراوانبکات و هەبوونەکەی بپارێزێ. تاوەکو بزووتنەوەی بەرگری رەوا و رێکخستنەکەی هێزەکانی بەرپرسیار لەداگیرکاری و بێچارەیی دەهێننە سەر ئەو بڕوایەی کە ئیتر ناتوانرێ شەڕی ناعادیلانە پەیرەوبکرێ، بەرەو رێگای چارەسەری دیموکراتییانەیان پەلکێش دەکەن، بەچڕبوونەوە بەڕێوەبردنی دەشێ ئامرازی سەرەکی رزگاربوون بێ لەو قەیرانەی لەئارادایە. جگە لەرەوشە نائاساییەکان، لەرەوشە ئاساییەکاندا نابێ کێشەی پاراستنی خۆیی گەل پشتگوێ بخرێت. لەهەلومەرجەکانی قەیراندا، لەدەرەوەی ئاسایشی خۆیی، ئاسایشی خۆی بایەخدارتر دەبێت. پێودانگە کلاسیکییەکانی ئاسایشی دەوڵەت لەزۆر لایەنەوە ناتوانێ وەڵامی پێداویستییەکانی ئاسایشی گەل بداتەوە. کاتێك دەسەڵاتی دەوڵەت دەکەوێتە ژێررکێفی هێزە دیکتاتۆری و ئۆلیگارشییەکان گەرەنتی مافە سنووردارەکانیش لەئارادا ناهێڵێ. هەروەکو بڵێی دەوڵەت دابەشدەکرێت. لایەکی گرێدراوی ناوەندەکانی دەوڵەتگەراییەو مافیا وچەتەی لێدەکەوێتەوە. تەواو تیرۆر لەسەر گەل پەیڕەو دەکەن. تەقینەوەی ژمارەی زۆری تاوانەکان روودەدات. لەگەڕان بەدوای ماف لەجیاتی رێگای مافپەروەری، دەسکەلا (کەس یان لایەنی سێیەم وەك ئامراز) بەکاردەهێنرێ، وەك بڵێی مافپەروەری دەکرێت بەکالا. هێزەکانی ئاسایشی دەوڵەت خۆشیان دەبن بەکێشەی ئاسایشی. بەرامبەر بەکێشەی ئاسایشی زۆر لەو وڵاتانەی لەرەوشی قەیراندان، پاراستنی خۆیی (گەوهەری) بووە بەپێویستییەکی دەستلێبەرنەدراو. پێویستە هێزەکانی پاراستنی گەل دامەزرێندرێ.

لەوەزیاتر کەهێزەکانی پاراستنی گەل وەك هێزێکی دژ بەدەوڵەت یان ئەلتەرناتیف بێت، ئەوا هەڵسەنگاندنی وەك هێزی سەرەکی سەقامگیرکردنی ئاسایشی گشتی کەدەوڵەت بەدینەهێناوە، تەنانەت بەرامبەری تێری نەکردووە و بۆتە هۆکاری، هەڵسەنگاندنێکی راسترە. یەکینەکانی پاراستنی گەل هێزی کلاسیکی گەریلا یاخود رزگاری نیشتمانی نییە. گەریلای رزگاری گەل یاخودی رزگاری نیشتمانی ئامانجیان دەسەڵات و دەوڵەتە. دەخوازن کێشەی دەسەڵات چارەسەر بکەن. یەکینەکانی پاراستنی گەل ـ لەدەرەوەی رەوشی ناچاری و بابەتی ـ ئامانجی دەسەڵات و دەوڵەتیان نابێت. دەشێ ئەرکە سەرەکییەکانیان بەمشێوەیە کورتبکرێتەوە، کاتێك مافە یاسایی و دەستوورییەکانی گەل پێشێل بکرێت، دادوەری ئەرکی خۆی جێبەجێنەکات هەوڵی پاراستنی دەدات، دەبێتە گەرەنتی هەوڵەکانی دیموکراتیزەبوون، لەبەرخودان بەرامبەر هێرشەکاندا پێشەنگایەتی دەکات، هەبوونی کولتووری و ژینگەیی دەپارێزێ.

دەشێ یەکینەکانی پاراستنی گەل بەشێوەی گروپی جیاواز لەشارو ناوچە شاخاوی و پێدەشتەکاندا رێکبخرێت. دەشێ بەهێزی پارمەتی و پاراستنی گەلیش بەناوبکرێت. دەشێ لەو ئەرکانەدا رۆڵ ببینێ کەهێزەکانی ئاسایشی خۆجێیی جێبەجێیان نەکردووە. لەبەرئەوەی هەلومەرجەکانی قەیران بەردەوام پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان شیتەڵ دەکاتەوە، زەمینەی ئالۆزی کە لەزیادبووندایە، پاراستنی گەوهەری سەبارەت بەهەبوونی گەلان و بەرێوەبەرایەتی خۆی دەکات بە بابەتێکی ژیانیی. لەکاتێکدا لەمیانەی رێگاکانی چارەسەری دیموکراتییانە لێگەڕینی رزگاربوون لەقەیراندا هەیە، لەناو یەکێتییەکی دانەبڕاوە لەگەڵ ئەم قۆناخە، ئەوا لەرەوشی بێباوەڕی زیادیشدا دەتوانرێ لەرێگای هێزەکانی پاراستن هەنگاو بهاوێژرێ.

## 2 ـ ئازادکردنی ڕەگەزگەرایی کۆمەڵایەتی

شانبەشانی ئەوەی نوێنەرایەتی گەوهەری دیموکراتیزەبوون دەکات، ژن و سیستەمی پەیوەندی و ناکۆکییەکانی دەوروبەری لەسەرووی ئەو دیاردانەوە دێن کەپێویستە بەشێوەیەکی سەربەخۆ تاوتوێ بکرێ. چەندە هاوسەنگییەکانی ڕاوەستەی دیموکراتی و کۆمەڵکاری بەدرەنگ وەختی و ناتەواو جێگای خۆی لەبواری کۆمەڵناسییەوە گرتبێت، ئەوا ڕەوشێکی لەوەخراپتر لەهەڵوێستی سەبارەت بەدیاردەی ژن دەبینین. هەروەك بڵێی ئەو ڕەوشەی ژن تێیدا دەژی پێویستییەکی ئاسایی و سروشتیبوونە، ئەم چەمکە لەتەواوی هەڵوێستە زانستییەکاندا، هەڵوەستەی سیاسی و ئەخلاقی وەك ئەگەرو گریمانەیەکی لەپێشینە پەسنددەکرێ. ئەوەی جێگای خەم و پەژارەیە خودی ژنیش هۆگری ئەوەبووە کە ئەم چەمك و تیۆریە بەئاسایی و سروشتی ببینێ پەسند بکات. پیرۆزی و سروشتیبوونی ئەو ستاتۆیەی بەهەزاران ساڵ بەسەر گەلاندا سەپێنرا، چەندین جار لەوەزیاتر هەروەکو بڵێی لەتەواوی زهنییەت و هەڵسوکەوتی ژنان هەڵکەندراوە. بەو ڕادەیەی گەلان کراونەتە ژن، ژنانیش وەکو گەلانیان لێکراوە. کاتێك هیتلەر دەڵێ " گەلان وەك ژنن" گوزارشت لەم ڕاستییە دەکات. کاتێك بەشێوەیەکی قووڵتر دیاردەی ژن هەڵسەنگێنرێ و تاوتوێ بکرێت دەبینرێ لەوە زیاتر کەوەك ڕەگەزێکی جەستەیی، بەڵکو وەك چین و ڕەچەڵەکێك مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت. بەڵام وەك چین، ڕەچەڵەك و نەتەوەیەك کە هەرەزێدە دەچەوسێنرێتەوە. دەبێ باش بزانین کەهیچ چینێك، ڕەچەڵەك و نەتەوەیەك بەئەندازەی ژنێتی نەخراونەتە ژێر کۆیلایەتییەکی سیستەماتیك.

هێشتا مێژووی کۆیلایەتی ژنانە نەنووسراوە. هەرچی مێژووی ئازادیخوازییە لەچاوەڕوانی نووسینەوەدایە. بەئەندازەی قووڵایی کۆیلایەتی ژنان، هێشتنەوەی لەناو تاریکیدا لەنزیکەوە گرێدراوی دەسەڵاتی پلەداری و دەوڵەتگەراییە. لەمیانەی ڕاهێنانی ژن لەبارەی کۆیلایەتییەوە ــ بەڕێوەبەرایەتییە جیاکاری و پیرۆزەکان ــ پلەداری ئاواکراوە، ڕێگای کۆیلایەتی توێژەکانی دیکەی کۆمەڵگا کراوەتەوە. بەکۆیلەکردنی پیاوان دوای کۆیلایەتی ژنان دەردەکەوێت. کۆیلایەتی ڕەگەزی لایەنی جیاوازی لەگەڵ کۆیلایەتی چینایەتی و نەتەوەیی هەیە. لەمیانەی فشارە وردو چڕو تەڵەکەبازییە پڕ لەهەستەکانەوە ڕەوابوونی مەیسەردەکرێت. هەروەك بڵێی جیاوازی جەستەیی بیانوویەکی کۆیلایەتییەو بەکاریدێنێ. تەواوی ئیش و کارەکانی ئەنجامیدەدات، بەئیشی ژنانەی بێبەها بەناو دەکرێت، بەهەند نابینرێ و سووکایەتی پێدەکرێ. بەشداریکردنی لەگۆڕەپانە گشتییەکاندا، لەلایەنی ئایینیەوە قەدەخە دەکرێ، لەبواری ئەخلاقیشەوە بەعەیبداری لەقەڵەمدەدرێ. پێبەپێ لەتەواوی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان دووردەخرێتەوە. کاتێك هێزی حوکمڕانی چالاکییە سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان دەکەوێتە ژێررکێفی پیاو لاوازی ژن زیاتر بەدەزگا دەبێت. وەك باوەڕییەك لەسەر ڕەگەزی لاواز (ژن) هاوفیکرن.

دوای ئەوەی تەواوی توانستی هێزە ماددی و مەعنەویەکان لەدەستی پیاو کۆدەبێتەوە، ئیتر ژن دەبێتە بوونەوەرێك کە گیرۆدەی خنکانێکی بێدەنگە و بەردەوام زیزدەبێت، چاوەڕوانی دەستی پیاوە، هەندێ جار دەپاڕێتەوە، هەندێ جاریش تەواوی کەرامەتی خۆی پێشێل دەکات و بەچارەنووسی خۆی ڕازییە. بەواتایەکی دیکەش دەتوانرێ بەمردووی زیندوو بەناو بکرێت. لەمیانەی چەند نموونەو لێکچواندنێکەوە دەتوانین دیاردەکە ڕوونتر بکەینەوە. نموونەی یەکەم، چۆلەکەی ناو قەفەسە. هەندێ جار وەك چۆلەکەی کەناری دەڕازێندرێتەوە، هەندێ جاریش وەك بولبول دەنگی خۆش دەکرێ و بەکاردەهێنرێ. هەرکەسەو لەلای خۆیەوە بەچۆلەکەیەکی دەچوێنێ. زیاتر بەچۆلەکە بەناو دەکرێت. نموونەیەکی دیکە، ڕەوشی ئەو پشیلەیە کە فرێدراوەتە بیرێکی قووڵی بێبن و بەردەوام میاوەمیاوێتی. پاشماوەی خواردنەکانی دەدرێتێ و بۆ خاوەنەکەی ماڵیدەکرێت. لەوانەیە ئەم نموونانە کەمێك قەبا ببینرێن، بەڵام بۆ تێگەیشتنی قووڵایی کۆیلایەتی ئاشکرایە کە پێویستی بەهەوڵدانێکی هەمەلایەنی زانستی و ئەدەبی هەیە. کۆمەڵگایەکی ڕەگەزگەرایی زەبەلاح پێکهێنراوە. قەبایی ڕاستەقینە لێرەدایە کاتێك پیاو

یەکلایەنـە دەسـتدرێژی دەکاتـە سـەر ژن بـۆ پیـاو قارەمانێتییـەو تـادواڕادە پیـاو زەوقـی لێـوەردەگرێ و شـانازی پێـدەکات، ژن ڕووبـەڕووی هـەموو جـۆرە سـزایەکی بێڕەحمانـەی لـەجۆری ڕەجمکـردن تـامردن، فرێدانـە سـۆزانیخانەکان و تـا دەگاتـە لاتەریککردنی لەکۆمەڵگا دەبێتەوە. دیسان یەکێك لە قەباترینیان ئەوەیە، کاتێك پیاو شانازی بە ئۆرگانی زایەندی و نێرینەیی خۆی دەکات، ئۆرگانی زایەندی و مێینەیی بۆ ژنـان وەك سەرچاوەی عـەیب و خەجاڵـەتی دەبینـرێ. تەنانـەت لەبـەکارهێنانی سادەترین جیاوازی جەستەیی دژ بـەژن دوودڵـی نـەکراوە. خـودی ژنـێتی کـراوە بەسەرچاوەی عـەیب و شـەرمەزاری. تەنانـەت ئەشق کە سۆزو هەستێکی پیرۆزە ئەوەی ژنی دووچاری دێت داسەپاندنێکی کوێرانەی پیاوە. کیژۆڵـەکان بەبـەردەوامی بـچووك دەبینـرێن.

ئـەو پرسـیارەی پێویـستە بپرسـین بۆچـی کۆیلایەتییـەکی هێنـدە قـووڵ؟ مـسۆگەر وەڵامەکـەی پەیوەنـدی بـەدیاردەی دەسەڵاتەوە هەیە. سروشـتی دەسـەڵات پێویـستی بەکۆیلایەتییـە. ئەگـەر سیـستەمی دەسـەڵات لەدەسـتی پیاودابێـت ئـەوا تـەنیا بەشێکی مرۆڤ نا بەڵکو دەبێ تەواوی ڕەگەزێکیش بەگوێرەی ئەم دەسەڵاتە شێوە بگرێت. هەروەکو چۆن خاوەنەکانی دەسـەڵات سنوورەکانی دەوڵەت وەك سنوورەکانی خانە (ماڵ)ی خۆیان دەبینن و هەموو کردەوەیەك لـەم سـنوورەدا وەك مافێك دەبیـنن، لەو خێزانەدا کە میکرۆ مۆدێلێکی دەوڵەتە پیاو وەك خاوەنی دەسەڵاتی پیاوسالاری خۆی بـەخاوەن مـافی هـەمووجۆرە ڕەفتـارو کردەوەیەك ـ پێویست ببینێ کوشتنیشی تێدا ـ دەبینێ ژنی ماڵەوە موڵکێکی هێندە قووڵ و کۆنە لەمیانەی هەسـت و سـۆزێکی موڵکایەتی سنوورنەناس پیاو ژن بەموڵکی خۆی دادەنێ. بەرامبەر بەپیاو ژن نـاتوانێ بانگەشـەی بـچووکترین مـافی موڵکایـەتی بکات ـ لەگەڵ ئەو پیاوەی کە پەیوەندی هاوسەرێتییان پێکهێناوە ـ بەڵام خاوەنـدارێتی پیـاو لەسـەر ژن و منـداڵان بێـسنوورە. دیسان پێویستە دەرهەق بەخێزان و ڕەفتارەکانی کۆیلایەتی سەر ژن بۆ سەرچاوەی موڵکایەتی بگەڕێینـەوە. ژنـی بەکۆیلـەکراو سەرچاوەی موڵکایەتی پێکدێنێ. ئەو کۆیلایەتی و موڵکایەتییەی لەسەر ژن بڵاوکراوەتەوە شەپۆل شەپۆل سەرجەم ئاسـتەکانی کۆمەڵگا دەگرێتـەوە. بەمـشێوەیە هـەموو جۆرە هـرزو سـۆزێکی موڵکایـەتی و کۆیلایـەتی لـە پێکهاتـەی ڕەفتـارو هـزری تـاك و کۆمەڵگا بەجێدەکات. کۆمەڵگا بەگوێرەی پێکهاتەی هەمووجۆرە پلەداری و دەوڵەتگەراییەکان دەگونجێنـدرێ. ئەمـەش بـەواتای بــەردەوامکردنی ئاســاییانەی هــەموو جــۆرە پێکهاتەیــەکی شارســتانییەت دێ کــە بەچــینایەتی دەناســرێت و ڕەوابــوونی بەدەسـتهێناوە. بـەمجۆرە ئـەوەی دەدۆڕێـنێ و زیـانی بەردەکـەوێ تـەنیا ژن نییـە، بـەدەر لـەهێزێکی سـنوورداری پلـەداری و دەوڵەتگەرایی, تەواوی کۆمەڵگایە.

قۆناخەکانی تایبەتی گێژاو هێندە بـۆ ژن گـرنگ نییـە, چونکە بـەردەوام لـەناو قەیرانـدا دەژی. ژن بـەواتای ناسنامەیەکی قــەیراناوی دێــت. لەقــەیرانی هەنووکــەی سیــستەمی ســەرمایەداریدا، تاکــە ئومێــدی ئەوەیــە کــەدیاردەی ژن تارادەیــەك ڕۆشنکراوەتەوە. هەرچەندە بەشێوەیەکی ناتەواویش بێت لەدواچارەگی سـەدەی ڕابـردوو فێمینیـزم (ژنناسـی) ڕاسـتینەی ژنـی زەقکردۆتەوە. لەبەر ئەوەی لەمیانەی ڕۆشنکردنەوەیەکی بەهێز لەقۆناخی گێژاودا شانسی گۆڕینی هەر دیاردەیەك زیاد بـووە، دەشێ ئەو هەنگاوانەی لەبواری ئازادی بهاوێژرێن ڕێگا لـەپێش پێهـەڵگرتنی چۆنایەتی بکاتـەوە. دەشـێ ئـازادی ژن لەقـەیرانی هەنووکەدا دەسکەوتی گەورە بەدەستبێنێ و لێی ڕزگار ببێ.

دەبێ ئازادی ژن بەگوێرەی پێناسەی دیاردەکە گشتگیربێ. لەوانەیە ئازادی و یەکسانی گشتی کۆمەڵگا ڕاستەوخۆ بۆ ژنـانیش بەواتای ئازادی و یەکسانی نەیـە. هـەوڵی سـەربەخۆو ڕێکخـستن مەرجـە. دیـسان دەشـێ بزووتنـەوەی گـشتی دیموکراتیزەبـوون دەرفەت و تواناکاری بۆ ژنان بخوڵقێنێ. بەڵام لەخۆیەوە دیموکراسـی نـاهێنێ. بەتایبـەتی پێویـستە ژنـان ئامـانج و ڕێکخـستن و هــەوڵی دیموکراتییانــەی خۆیــان نیــشانبدەن. بەرلەهەمووشــتێك پێویــستی بەپێناســەیەکی ئــازادی هەیــە ڕووبــەڕووی ئــەو کۆیلایەتییە ببێتەوە کە ژن تێیدا دەژی. هێزی سیستەمی سەرمایەداری لـەبواری نیـشاندان و دانـانی سـەراب لـەجێگای ڕاسـتی

هێندە پێشکەوتووە، تەنانەت کردەوەیەکی کە هەرەزێدە سووکایەتی بەژن دەکات و بچووکی دەکاتەوە (بۆ نموونە پۆرنۆگرافی ـ سێکسی کراوە) هاوشێوەی ئازادی دەبینرێ.

سەرباری ئەوەی هەوڵەکانی فێمینیزم چەندین فاکتەری گرنگ لەخۆوە بگرێت, بەڵام هێشتا لە تێپەڕکردنی ئاسۆی دیموکراسییەتی سەنتەری ئەوروپا دوورە. نەك تەنیا شێوە ژیانی سەرمایەداری تێپەڕنەکردووە، بەڵکو ناتوانرێ بگووترێ کەدەرکیشی پێکردووە. رەوش بانگەوازی بۆ چەمکی شۆڕشی سۆسیالیزمی لینینی دەکات. سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵ و کۆششە مەزنەو بەدەستهێنانی چەندین پێگەی گرنگ، لەئاکامدا لینینیزم لەوە رزگاری نەبوو کە لەلایەنی چەپەوە بەهادارترین کۆمەك بەسەرمایەداری نەکات. لەوانەیە فێمینیزمیش دووچاری هەمان ئەنجام ببێت. نەبوونی بناخەیەکی بەهێزی رێکخستنی، پێشنەخستنی فەلسەفەکەی بەشێوەیەکی تەواو، ئاستەمییەکانی سەبارەت بەمیلیتانێتی ژنان بانگەشەکەی لاواز دەکات. لەوانەیە بەئاستی بەرەی ژنانی تایبەت بەسۆسیالیزمی بونیادنراویش نەگات. بەڵام سەبارەت بەسەرنجڕاکێشان بۆ سەر بابەتەکە، هەڵسەنگاندنی وەك هەنگاوێکی رشت و بەرچاو لەجێی خۆیەتی.

بێگومان وەك تەواوی جۆرەکانی بوونەوەر ژنیش خاوەن سروشتێکە. رۆژ لەدوای رۆژ زانستی بیۆلۆژی لەمیانەی بەڵگەکانەوە زیاتر دەسەلمێنێ کە ژن لەودیو کۆمەڵایەتی بوونەوە وەك رەگەزێکی بیۆلۆژی ئەندامێکی سەرەکی و ناوەندییە. بەکورتی لەگەڵ ئەوەی جەستەی ژن پیاویش لەخۆوەدەگرێت، جەستەی پیاو ژن لەخۆوە ناگرێت. بە پێچەوانەی پەرتووکە پیرۆزەکان دەرك بەوە دەکرێ کە ژن لەپیاو دروستنەکراوە، بەڵکو پیاو لەژن بەرهەمهاتووە. کرۆمۆسۆمەکانی ژن لەهی پیاو زیاترە. تەنانەت خوێنبەربوونی مانگانە کە وەك لایەنی نێگەتیڤی ژنان نیشاندەدرێت، پێویستە وەك نیشانەی پەیوەندی ناسکی ژن لەگەڵ سروشت بیری لێبکرێتەوە. پێویستە خوێنبەربوونی منداڵدان وەك لێشاوێکی بەردەوامی ژیانێکی سروشتی ببینرێ. پێویستە وەك ئیرادەی کۆتایی نەهاتن و بەردەوامبوونی رەگی سەرەکی ژیان ببینرێ. ئەو مەسەلانەی بەنەخۆشی ژنان بەناو دەکرێ لەراستیدا دیاردەکانی ژیانن. سەرچاوەی خۆی لەوە دەگرێت کە ژن نوێنەرایەتی سەرچاوەی ژیان دەکات. کێشە ئاڵۆزەکانی ژیان لەناو سك و منداڵدانی ژن دەستپێدەکات. ئەو منداڵەی لەدایك دەبێت و ناوکە پەتکەکەی وەك دوا ئەڵقەی پەیوەندی ژیانە. بەرامبەر بەم راستیانە پیاو وەك پاشکۆ یاخود بەردەوامی ژن دەبینرێ. بابەتێکی دیکەی ئەم دیاردەیە دەسەلمێنێ و پشتڕاستی دەکاتەوە هەست و سۆزی زێدەڕۆ و بێ واتای ئیرەیی پیاوە. لەکاتێکدا سروشتی ژن بەشێوەیەکی باوەڕمەندتر بەرامبەر خۆی دەوەستێ، پیاو ناتوانێ خۆی لەسەر پێیان بگرێ و ئارامی نییە، وەك بڵێی بەلایەکەو لەدەوروبەری ژن دەسوورێتەوە. تەواوی ئەم تێڕوانینانە دەسەلمێنن کە جەستەی ژن بەلاوازی بارگاوی نەکراوە, بەڵکو ناوەندێکە. هەربۆیە بەر لەهەموو شتێك پێویستە ژن بەپەلە و راستەوخۆ پێناسەی ناتەواو و نەخۆش رەتبکاتەوە کە کولتووری باوکسالاری دەیسەپێنێ. پێویستە وەها بکات کە پیاو هەست بەراستی پێچەوانەی بانگەشەکەی بکات. کاتێك دەڵێین پێویستە ژن لەبواری جەستەییەوە بڕوای بەخۆی هەبێت مەبەستمان ئەم راستینەیەیە.

ئاکامی سروشتی ئەو پێکهاتە جەستەییە بەهێزبوونی ژیری سۆزدارییە لای ژنان. ژیری سۆزداری ئەو ژیرییەیە کە لەژیان دانەبڕاوە. ئەو ژیرییەیە کە بەشێوەیەکی بەهێز خوێن شیرینی و خوێن ساردی لەخۆوە دەگرێت. تەنانەت کاتێك ژیری ئەنالیتیك لای ژن پێشدەکەوێت بەهۆی بەهێزی ژیری سۆزداری توانستی ئەوەی زیاترە کە هاوسەنگ بێ و گرێدراوی ژیان بێت و دوور لەرۆڵی تێکدەرانە دەوەستێ. پیاو هێندەی ژن لەواتای ژیان تێناگات. ژن کە خودی ژیانە ـ بەزمانی کوردی گروپی ئاریانی Jin واتە ژین Jîn، لەهەمانکاتدا بەواتای Jin ژنیش دێت ـ توانستی بینینی ژیانە لەمیانەی راستینەی خۆی و دوور لەڕیاکاری. ئەم توانستەی بەهێزە. لەژیانی کەسێتی خۆشماندا ئەم راستییە باش دەزانین. پیاو بەرپرسیاری بێ بەزەییانەی سیفەتەکاتی لەجۆری فێڵبازی، ناڕەسەنی، خراپەکاری و سۆزانی و ... هتدە کە دراونەتە پاڵ ژنان. هەر ژنێك, کە لەدۆخی

سروشتی خۆیدا مابێتەوە, پێویستی بەتەڵەکەبازی و سۆزانێتی نابینێ. لەبواری جەستەیی و بیۆلۆژیشەوە بۆ ئەمە لەبارنییە. خوڵقێنەری راستەقینەی تەڵەکەبازی و سۆزانێتی پیاوە. هەروەکو دەزانین یەکەمین سۆزانیخانەی لەساڵانی 2500 ی پ. ز لەسەردەمی سۆمەریەکان لەشاری نیپوری پیرۆز بەناوی موساقفەتدیم کردەوە دەسەڵاتی پیاو بوو. سەرباری ئەمەش بەشێوەیەکی بێ شەرمانە هەروەکو بڵێی سۆزانێتی داهێنانێکی ژنە بەردەوام بەزیندوویی دەیهێڵێتەوە. بەرهەمی خۆی، واتە ئەو تاوانبارییەی ئافراندوویەتی دەیکاتە موڵکی ژن و لەمیانەی پێشخستنی چەمکێکی ساختەو دروستکراوی نامووس، لێدان و نەفرەت و قڕکردن لەسەر ژن کەمناکاتەوە. ئەو ئەنجامەی دەتوانین لەو پێناسە زیادەدا بەدەستی بێنین، بەر لەهەموو شتێك رووبەڕووبوونەوەیەکی تۆکمەیە بەرامبەر هێرشی ئایدیۆلۆژی پیاو. پێویستە بەرامبەر ئایدیۆلۆژیای پیاوسالاری، لەمیانەی ئایدیۆلۆژیای رزگاری ژندا فێمینیزم و سەرچاوەکەی (سەمایەداری) تێپەڕبکرێت و لەرێگای خۆپرچەککردن (لەبواری هزری، رێکخستنی) تێکۆشان بەڕێوەببرێت. پێویستە بەرامبەر زهنییەتی دەسەڵاتی باوکسالاری پیاو زهنییەتی رێکخستنی و سروشتی ژن تۆکمە بکرێت و بەرلەهەموو شتێك لەبواری ئایدیۆلۆژیدا سەرکەوتن بەدەستبهێنرێ. نابێ لەبیربکرێ کەنەریتی باوی ملکەچکردن (تەسلیمییەت)ی ژن جەستەیی نییە، بەڵکو کۆمەڵایەتییە. لەو کۆیلایەتییەوە دێت کە لەناواخندا بەجێکراوە. لە دۆخێکی وەهادا بەرلەهەموو شتێك پێویستە لەبواری ئایدیۆلۆژی هزرو سۆزی تەسلیمکاری لەناو ببرێت.

کاتێك ئازادی ژن روو لەگۆڕەپانی سیاسەت دەکات دەبێ باش بزانێ کە رووبەڕووی دژوارترین لایەنی شەڕ دەبێتەوە. لەگۆڕەپانی سیاسەتدا سەرکەوتن بەدەست نەهێنێ، هیچ سەرکەوتن و دەسکەوتێك هەمیشەیی نابێت. سەرکەوتن لەبواری سیاسیدا بەواتای بزووتنەوەی دەوڵەتگەرایی ژنان نایێت. بەپێچەوانەوە تێکۆشان بەرامبەر پێکهاتە دەوڵەتگەراو پلەدارییەکان، بەواتای ئافراندنی ئەو قەوارانە دێت کە ناوەندەکەی دەوڵەت نییە، ئامانجی گەیشتنە بەکۆمەڵگای دیموکراسی، ژینگەیی و ئازادی رەگەزی. هەرە زێدە پلەداری و دەوڵەتگەرایی لەگەڵ سروشتی ژندا ناگونجێ و ناکۆکە. هەربۆیە لەپێناو گەیشتن بەقەوارەی سیاسی دیموکراتی و دژە پلەداری و دەوڵەتگەرایی پێویستە بزووتنەوەی ئازادی ژن رۆڵی پێشەنگایەتی ببینێ. رووخاندنی کۆیلایەتی لەبواری سیاسیدا لەناوەڕۆکدا لەمیانەی سەرکەوتنی تێکۆشانی ئەم گۆڕەپانە فەراهەم دەبێت. تێکۆشانی ئەم گۆڕەپانە پێویستی بەرێکخستنێکی بەرفراوانی ئازادی ژن و تێکۆشانەکەی هەیە. هەمووجۆرە رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، مافی مرۆڤ و بەڕێوەبەرایەتییە خۆجێییەکان ئەو گۆڕەپانانەن کەتێکۆشانی دیموکراتییانەی تێدا رێکدەخرێت و پێشدەخرێت. هەروەك سۆسیالیزم ئەو رێگایەی بەرەو ئازادی و یەکسانی ژنان دەچێت، بە بەرفراوانترین و سەرکەوتووترین تێکۆشانی دیموکراتییانە تێپەڕدەبێت. بزووتنەوەی ژنان دیموکراسی بەدەست نەهێنێ ناتوانێ یەکسانی و ئازادیش بەدەست بێنێ.

گرنگترین کێشەی ئازادی لەبواری کۆمەڵایەتی کێشەی هاوسەرێتی و راستینەی خێزانە. ئەمانە وەك بیرێکی قووڵ و بێبنن. ئەو دەزگایانەی بۆ ژن وەکو رزگاربوون دیارە، لەمیانەی زهنییەتی ئێستای کۆمەڵگا لەجێگۆڕکێ لەقەفەسێکەوە بۆ قەفەسێکی دیکە بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە. بەتایبەتیش ناچار دەبێ زیندوویی لاوێتیش لەژێر رەحمی زهنییەتی قەسابگەرایی بەجێ بێڵێت. پێویستە خێزان (عائلة) وەك رەنگدانەوەی کۆمەڵگای باڵا (کۆمەڵگای دەسەڵات) لەناو گەل و دەزگا سیخوڕیەکەی ببینرێ. پیاو نوێنەری دەسەڵاتە لەناو خێزان و گوزارشتە چڕکراوەکەیەتی. کاتێك ژن شوودەکات لەراستیدا دەبێتە کۆیلە. زەحمەتە دەزگایەکی دیکەمان بەخەیاڵدا بێت هێندەی هاوسەرێتی کۆیلایەتی بەرهەمبێنێت. لەواتای راستەقینەدا گشتگیرترین کۆیلایەتی لەمیانەی ئەم دەزگایە ئاوادەکرێ و لەرێگای خێزانیشەوە ریشەدادەکوتێ و بەردەوام دەبێت. بەشێوەیەکی گشتی باس لەبەیەکەوەبوون و ژیانی هاوبەش ناکەین. ئەمە بابەتێکە بەگوێرەی چەمکی ئازادی و یەکسانی هەرکەسێك واتادار دەبێ. بەڵکو باس لەو خێزان و هاوسەرێتییە کلاسیکییە دەکەین کە جێگیربووە. بەواتای ئەوە

دێت کە موڵکایەتییەکی مسۆگەر دژ بەژن پێشدەکەوێت، لەبوارەکانی هزری، کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسی دووردەخرێتەوەو جارێکی دیکە بەسانایی نایێتە هۆش خۆیەوە. تاوەکو بەلێپرسینەوەیەکی رادیکاڵانە تێپەڕ نەکرێت، بنەماکانی ژیانێکی هاوبەش فەراهەم نەکرێت کە ئامانجی دیموکراتی و ئازادی و یەکسانی رەگەزی بێت، ئەوا ئەو پەیوەندی و هاوسەرێتیانەی سەرچاوەی خۆی لەتەنگەتاوی تاك و ئارەزوومەندی و چەمکی باوی خێزان دەگرێت وەك مەترسیدارترین چەواشەکاریەکانی پێش ژیانی ئازاد رۆڵ دەبینین. پێویستی بەمجۆرە بەیەکەوەبوونانە نییە، بەڵکو پێویستە بە شیتەڵکردنی زهنییەت گۆڕەپانی دیموکراتی و سیاسی، ئازادی رەگەزی بەدی بهێنرێ و ئیرادەی ژیانی هاوبەش جێگیربکرێ.

بابەتی ئەشق کە لەجیهانی ئەمڕۆماندا وەك بنێشت لەهەموو زارێکدایە لەهیچ قۆناخێکی مێژوودا بەمرادەیە ژێرپێ نەخراوە. لەئەشقی کوێرانەی لەناکاوو ساتەوەختیەوە تادەگاتە هەڵوێستە ئاشکراکانی تاوانباری، تەنانەت مەترسیدارترین و وشکترین و کوێرانەترین شێوازی پەیوەندیش بەئەشق لەقەڵەم دەدرێت. ناتوانرێ بیر لەپەیوەندییەك بکرێتەوە کە لەمە روون و ئاشکراترچەمکی ژیانی سیستەمی سەرمایەداری نیشانبدات. تەنانەت ئەشقی ئەم ڕۆژگارەشمان ئاشکراترین دانپیانانە بەوەی سەپاندنی زهنیەتی سیستەمی باڵادەست بەسەر مرۆڤ و کۆمەڵگادا لەپیرۆزترین بواریشدا چی لێدەکەوێتەوە. زیندووکردنەوەی ئەشق یەکێکە لەزەحمەتترین ئەرکە شۆڕشگێڕییەکان. پێویستی بەرەنجێکی گەورە، رۆشنگەری زهنییەت و خۆشەویستی مرۆڤ هەیە. یەکێك لەسەرەکیترین مەرجەکانی ئەشق ئەوەیە بەئاراستەی بلیمەتی سەردەم و لەچوارچێوەی سنوورەکانیدا بەڕێوەبچێ. دووەمیان بەرامبەر هاربوونی سیستەم راوەستەیەکی مەزن و شکۆدار دەسەپێنێ. سێیەمیان، پێویستە ئەمە وەکو راوەستەیەکی ئەخلاقی پەسند بکات کە بەبێ رزگاری و ئازادی ناتوانن تەماشای یەکتریش بکەن. چوارەمیان، پێویستە ئارەزووی زایەندی بکاتە دیلی ئەم سێ خاڵەی سەرەوە. واتە پێویستە ئەوە بزانرێ کە تاوەکو ئارەزووی زایەندی بە بلیمەتی، ئەخلاقی ئازادی و راستینەی تێکۆشانی سیاسی و سەربازی نەبەسترێتەوە، هەر هەنگاوێکی بهاوێژرێ بەواتای نکۆڵیکردنی ئەشق دێت. ئەوانەی هێندەی چۆلەکەیەك دەرفەتی ئاواکردنی هێلانەیان نییە، کاتێك باس لەئەشق و پەیوەندی و هاوسەرێتی دەکەن، واتە بەهای رەسەنێتی تێکۆشانی ئازادی نازانن و تەسلیم بەکۆیلایەتی سیستەمی کۆمەڵایەتی دەبن.

ئەگەر باس لەراستینەی ئەشقی ئەم ڕۆژگارەمان بکرێت بەهەرحاڵ ئەمە پێویستی بەکەسایەتییەکە کە لەیلاو مەجنون و هاوڕێکانیان دەرباز دەکات، چەندین سۆڤ تێپەڕدەکات، پێویستی بەپاکی و وردکاری زاناکانە، لەگێژاو (کائیوس)ی ئێستا رێگا لەپێش ئازادی کۆمەڵایەتی بکاتەوە، ئازایەتی و فیداکاری و سەرکەوتنی بەدەستهێنابێ و خۆی سەلماندبێت.

کێشەکانی یەکسانی کۆمەڵایەتی و ئابووری ژنانیش، بەرلەهەمووشتێك لەمیانەی شیکاری دەسەڵاتی سیاسی، دەتوانێ لەدیموکراتیزەبووندا وەڵامی سەرکەوتوانە بدۆزێتەوە. ئاشکرایە تاوەکو سیاسەتێکی دیموکراتییانە پەیڕەو نەکرێت، پێشکەوتن لەبواری ئازادی بەدەستنەهێنرێ، ئەوا یەکسانییەکی وشکی یاسایی واتایەکی ئەوتۆی نابێت.

هەڵوێستی هەرەراست بەرامبەر بەژن ئەوەیە کە وەك شۆڕشێکی کولتووری تاوتوێ بکرێت. لەناو کولتووری هەنووکەدا چەندە نیاز پاك بیت و هەوڵیش بدرێت بەهۆی کێشەی خودی دیاردەکە و پێکهاتەی پەیوەندییەکانیەوە چارەسەرییەکی واتادارو ئازادیخوازانە بەدینایەت. رادیکاڵترین و ئازادیخوازترین ناسنامە لەمیانەی نزیکبوونەوە لەژن یاخود دەرککردنی تەواو بە سیستەمی پەیوەندی نێوان ژن ـ پیاو فەراهەم دەبێت. دەبێ باش بزانرێ کە لەمیانەی تێکەڵکردنی سەرپۆشی (حیجاب) لەگەڵ نەریت، پۆڕنۆ (سێکسی کراوە) لەگەڵ هاوچەرخێتی، تۆزقاڵێك رێ نابڕدرێت. بەئەندازەی قووڵایی کۆیلایەتی ئەم بوارە، ئەوا قووڵکردنەوەی تێگەیشتن لە ئازادی و کردنی بەئیرادەیەك پێویستییەکە. ئەوانەی لەبواری ئازادی ژن و خۆئازادکردندا مەودایان نەبڕیوە دەبێ باش بزانن کە لەهیچ گۆڕەپانێکی ئازادی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا ناتوانن ببنە هێزی

چارەسەری و گۆڕانکاری. دەبێ ئەمە وەك سەرەكیترین پێوانەكانی ئازادی بەبنەما بگیردرێت هەر هەوڵ و كۆششێكی ئازادی دووالیزمی پیاوی باڵادەست ـ ژنی كۆیلەی تێپەڕ نەكردبێت، ناتوانێ ناسنامەیەكی راستەقینەی ئازادی بەدەستبێنێ. تاوەكو پەیوەندی موڵكایەتی ـ دەسەڵاتی سەر ژن كۆتایی پێنەیەت پەیوەندی ئازادانەی نێوان ژن ـ پیاو پێشناكەوێت.

بینینی ئەم سەدەیەشمان وەك رۆژگاری هەڵكشانی كۆمەڵایەتی ئیرادەی ژنی ئازاد هەڵوێستێكی واقیعییە. بەڵكو بۆ ژنان پێویستی بیركردنەوەی ئاواكردنی ئەو دامەزراوە هەمیشەییانە بێت كە لەوانەیە سەدەیەك بخایەنێ. دەشێ پێویستی بەپارتی ئازادی ژنان هەبێت. پێویستە جێگیركردنی ئازادی و پرەنسیپە سەرەكییە ئایدیۆلۆژی و سیاسییەكانی و پراكتیزەكردنی و چاودێریكردنی هەم بەهانە, هەم ئەركە سەرەكییەكانی ئەم پارتیانە بێت.

بەتایبەتی لەشارەكاندا لەجیاتی خانەی حەوانەوە كە تائێستا بیری لێكراوەتەوە، پێویستە گۆڕەپانی ئازادی ژنان ئاوا بكرێت. بەگونجاوترین شێوە دەشێ پاركی كولتووری ژنی ئازاد بێ. كاتێك خێزانەكان ناتوانن كچانیان بنێرنە بەرخوێندن، هەروەها بەهۆی بونیادە ناسراوەكانی خوێندگاكانی سیستەمیش، دەشێ پاركە كولتوورییەكانی ژنی ئازاد بۆ ئەو ژنان و كچانەی پێویستیان پێی هەیە، وەك ئەو گۆڕەپانانەی پەروەردە، بەرهەمهێنان و خزمەت لەخۆوەدەگرێت رۆڵی پەرستگا هاوچەرخەكانی ژنانیش ببینن.

دەڵێن ژیان بەبێ ژن نابێ. بەڵام ژیان لەگەڵ ژنی هەنووكەیشدا مەحاڵە. بەهەرحاڵ پەیوەندییەكی ژن ـ پیاو كە تاقوڕگ نقوومی ناو كۆیلایەتی بووە، پەیوەندییەكە مرۆڤ دەخاتە ناو زەڵكاوەوە. لەدۆخێكی وەهادا ئەوەی لەئەشقی راستەقینە چاوەڕواندەكرێ هێزی مەزن لەدەوروبەری ژنی ئازاد بخوڵقێنی و لەدوا گێژاوی سیستەمی سەرمایەداری رزگارمان بكات. پێویستە ئەمەش رەسەنترین و پیرۆزترین كارەكانی ئەو قارەمانە راستەقینانە بێ كەخولیای ئەشقن و سەریان لەپێناودا دادەنێن.

### 3 ـ گەڕانەوە بۆ كۆمەڵگای ژینگەپارێزی

ئەگەر لەسەرەتاكانی شارستانییەت لەریشەكانی قەیرانی ژینگە بگەڕێین كە شانبەشانی قەیرانی سیستەمی كۆمەڵگا پێبەپێ قووڵبۆتەوە، واقیعیترین رێگایە. دەبێ بزانرێ كەچەندە لەئەنجامی زۆرداری ناو كۆمەڵگا نامۆبوون بەرامبەر بەمرۆڤ پێشبكەوێت، ئەوا نامۆبوون بەرامبەر بەسروشتیشی لەگەڵ خۆیدا هێنا، هەردووكیشیان بەناویەكداچوونە. لەناوەڕۆكدا كۆمەڵگا دیاردەیەكی ژینگەییە, ئەوەی لەگووتەی ژینگەیی مەبەستمانە سروشتی جەستەیی و بیۆلۆژییە كە پێكهاتنی كۆمەڵگا پشتی پێدەبەستێ. رۆژبەرۆژ زیاتر پەیوەندی نێوان پێكهاتەی جەستەیی و بیۆلۆژی هەسارەی دونیا رۆشندەبێتەوە. ئەمە یەكێك لەو گوڕەپانانەیە كە زانست تێیدا سەركەوتووە. ئەوەی لەبواری زانستیدا شیكراوەتەوە كەژیان لەئاوەوە دەستیپێكردووە، لەوێشەوە بۆ وشكایی تەشەنەیكردووە، لەجۆرەكانی رووەك و ئاژەڵە سەرەتاییەكاندا هەمەڕەنگییەك پێكهاتووە كەناتوانرێ سنووری بۆدابنرێ. گرێدراوی ئەم پێشكەوتنانە ئەو دەوروبەرە جەستەیی و بیۆلۆژییە دەخرێتەڕوو كەمرۆڤ بەرگەی گرتووە. یەكێك لەئەگەرو گریمانەكانی گرێدان لەوبارەیەوە ئەوەیە كەجۆری مرۆڤ بەشێوەیەكی گشتی دوا ئەڵقەی زنجیرەی دونیای زیندەوەرانە بەتایبەتیش جیهانی گیانلەبەران.

بەراییترین ئەنجامی لەوە بەدەستدەهێنرێ ئەوەیە كەجۆری مرۆڤ ناتوانێ بەشێوەیەكی هەڕەمەكی بژی و تاوەكو گرێدراو بە پێویستی ئەڵقەكانی زنجیرەی پەرەسەندن بمێنێتەوە، دەتوانێ درێژە بەهەبوونی خۆی بدات. لەرەوشێكدا ئەو مافانەی پەرەسەندن بشێوێنێ كە پشتی پێدەبەستێ، یەكپارچەیی بیۆلۆژی لەئارادا نامێنێ، هەربۆیە جۆر رووبەڕووی مەترسی لەناوچوونی هەبوونەكەی دەبێتەوەو ناتوانێ لەم هەڕەشەیە رزگاری ببێت. بەشێوەیەكی كارامە لەلایەن زانستەوە

دەستنیشانکراوە لەوە زیاترکەمەزندە دەکرێ یەکپارچەیی پەرەسەندنی سروشت پشت بە وابەستەیی دوو لایەنەی جۆرەکان دەبەستێ. کاتێك گرێدانی بەرامبەر بەیەکتری لەدەست بدرێت، دابڕانی مەزن لەئەلْقەکانی پەرەسەندن روودەدات، لەئاکامی ئەمەشدا کێشەی بەردەوامی ژمارەیەکی زۆری جۆرەکانی سەرهەلْدەدات.

بەرامبەر ئەم راستینە زانستییە کاتێك تەگبیر بەرامبەر ئەو کێشەیە نەگیرێت کە شارستانییەت خولْقاندوویەتی ئەوا بەو واتایە دێت کە لەمێژە لەدەرگای دۆزەخی داوە. ئەو راستینەیەی زۆرداری و نەزانی ــ راستتر درۆکردنی ناچاری ــ یە کە شارستانییەتی کردۆتە سەرچاوەی کێشەکان. کاتێك پلەداری و دەولْەت دادەمەزرێن تەنیا لەمیانەی فشارو زۆردارییەوە ناتوانن درێژە بەهەبوونی خۆیان بدەن. بۆئەوەی راستینەی رووداوو مەسەلەکان بشارێتەوە تەلْەکەبازی و ریاکاری دەبێتە پێویستییەکی دەستلێبەرنەدراو. حاکمییەتی دەسەلاْت پێویستی بەحوکمڕانی زهنی هەیە. هەرچی زهنییەتە چەندە بتوانێ ساختەکاری و تەلْەکەبازی بکات بەراستی دەسەلاْت دەخاتە ژێرگەرەنتییەوە. بەردەوام زهنییەت لایەنی هێزی قەبای دەسەلاْت وەك لایەنی هێزی ناسك زیندوو و بالاْدەست دەکات. ئەم شێوازەی پێکهاتنی زهنییەت بناخەی نامۆبوون بەرامبەر بەسروشت پێکدێنێت. تاوەکو نکولْی لەپەیوەندی کۆمەلْکاری بکات کە کۆمەلْگای ئافراند و هێزەکانی پلەداری و دەسەلاْت بەبنەما بگرێت کەوەك چەواشەکاری لەجێگای ئەو سەریانهەلْدا، ئەوا رەوشی زهنییەت کراوەدەبێت بۆ لەبیرکردنی پەیوەندی نێوان ژیان و سروشت و بێواتابوونیان. هەرهەلْکشانێك لەم زەمینەیەدا کە شارستانییەت پشتی پێبەستووە، ئەوا زیاتر لە سروشت دادەبڕێ و وەك تێکدانی ژینگە رەنگدەداتەوە. ئیتر چاوی هێزەکانی شارستانییەت ناچارییە سروشتییەکان نابینێ. هەرچۆنێك بێت چینی ژێر کە تێر خۆراکیان دەکات هەموو شتێکیان بەئامادەیی پێشکەش دەکات.

ئوتۆپیاکانی بەهەشت و خوداییبوونی پەرتووکە پیرۆزەکان لەسەر راستینەی میتۆلۆژیای سۆمەریەکان چنراوە کە یەکەمین هێزی شارستانییەتن. وەك قالبە سەرەکییەکانی زهنییەت لەزهنییەتی مرۆڤی سەردەمی مندالْێتیدا هەلْکەندراوە. خوداو بەهەشت هەبوونی داتاشراوی (واتایی) سروشتن. راستتر ئەوەیە لەجیاتی سروشتی راستەقینە خەیالْی ئەو دونیا ساختەیەیە کە هێزە هەلْکشاوەکانی دەسەلاْت وێنایان کردووە. ناوەڕۆکەکەشی ئەوەیە: "ئێمە کەبووین بەئیلاهی لەبەهەشت دەژین". دووەمین شەپۆل " سولْتانەکانی سێبەری خودا لەرەوشێکی وەك بەهەشت دەژین". سێیەمین شەپۆلْ" مرۆڤی چەوسێنەر وەك ئەو وایە کە لەبەهەشتدا دەژی". ئەو چەمکانەی وەك قالْبەزهنییە زالْەکانی سەرکۆمەلْگاو بەشێوەی راستییە شکۆمەندییە ئیلاهیەکانن پێشکەشدەکرێت. ئیتر دایکە سروشت لەبیردەکەن. لەوەش زیاتر دەڕۆن و لەمیانەی هەلْبەستنی شیمانەو ئەگەری چەمکەکانی سروشتی هۆڤ، کوێر، ئەو سروشتەی پێویستە ملکەچ بکات، پەیوەندییەکانی لەگەلْ سروشت بەرەو نامۆییەکی مەزن دەبن.

لەمیانەی ئەو توانستانەی کەبەرهەمی تەلْەکەبازی و زۆردارییە، سەپاندنی ژیانێکی دژە سروشت بناخەی کێشەکانی ژینگەیە. چەندە لەناو ژیاندا نکۆلْی لەرۆلْی سروشت بکات، لەجیاتی ئەوەش خولْقێنەرەکانی شێوە ساختەکانی ئایین جێگیربکات، ئەوا سروشت بەهێزێکی کوێر بەناو دەکرێت. بەتایبەتیش کاریگەری ئەم زهنییەتە تارۆژگاری ئەمڕۆمان هۆکاری سەرەکی پێشنەکەوتنی هزری زانستیشە. تەنیا لەمیانەی پێناسەیەکی راست و بابەتی هێزەکانی سروشت زهنییەتی زانستی گەشەدەکات. سیستەمێکی باوەڕی کەهەموو شتێك حەوالْەی خودا دەکات, هەرگیز واتا بەبەرگێکی دلْڕفێنی وەك سروشت نادات. کاتێك بەسووربوونەوە بیرۆکەی خودای داتاشراو وەك خولْقێنەری تەواوی سروشتی جەستەیی و بیۆلۆژی بسەپێنن، لەزانستیبوون دادەمالْرێ.

زۆرباش بۆمان روونبۆتەوە کە ئەم خودا داتاشراوە داهێنانێکی خەیالْی زهنییەتی یەکەمین چینی هەلْکشاوی چەوسێنەرە کە هەولْدەدات رەوابوون بۆخۆی بەدەستبێنێ. هەرچەشەو سامناکییەکەی ئەوەیە کەتەنیا بەوە ناوەستێ بەندە کۆیلەکان

بەخۆیەوە گرێبدات, بەڵکو لەراستیشیان دادەبڕێ. پەیوەندی راستی زهنی مرۆڤ لەگەڵ سروشت دەبڕێ و نامۆی دەکات. دایکە سروشتی جاران جێگای خۆی بۆ سروشتی زۆردار بەجێدێڵێ. بەتایبەتیش ئەمە لەلایەن ستەمکارە راستەقینەکانەوە ئەنجام دەدرێت. کاتێك لەوێستگە مێژووییەکانی ئەم زهنییەتە وردبینەوە بەدەست خۆمان نییە نەترسین. تێکبەردانی مرۆڤ و ئاژەڵە درندەکان لەئیمپراتۆریەتی رۆما بەرهەمێکی ئەم راستینەیەیە. رەفتارو کردەوەکانی هێزی ستەمکاری دەسەڵات پەیوەندی بەو ئاراستەیە هەیە کە پێبەپێ پەیوەندی لەگەڵ جیهانی تەواوی رووەك و گیانلەبەرەکان لەدەستبدات و بەرەو تاریکایی بچێت. لەراستیدا بەمجۆرە تێکبەردانی مرۆڤ و ئاژەڵ لەناوەڕۆکدا رەمزی نامۆبوونە بەسروشت. لەدەرەبەگایەتی چاخی ناوینیشدا شوێن خانەیەکە پێویستە ساتێك زووتر دەستی لێبەربدرێت. تەنانەت شوێنێکی قێزەوەنە کە مرۆڤ بەخۆیەوە دەبەستێتەوەو پەڵکێشی گوناهباری دەکات. بەرامبەر گەورەیی و شکۆمەندی خوداوەند دەشێ سروشت چیبێ. ساتێك زووتر وازهێنان لەسروشت و بەجێهێشتنی دونیا بووە بەئامانجێکی باوەڕمەندەکان. بەڵام لەلای چینی باڵا ژیانی بەهەشتیانە بەهەزارو یەك جۆری کەیف وسەفا و خۆشییەوە بەردەوامە. کاتێك باس لەشێواندن و چەواشەکاری مەزن دەکەین مەبەستمان ئەم لادانەیە. ئەم چەواشەکاریە هەزاران ساڵییەی زهنییەت لەژێر راستینەی پاشڤەڕۆیی رۆژهەڵاتی ناویندا شاراوەیە.

لەناوەڕۆکی خۆیدا رێنیسانس سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی ئەو پەیوەندییەیە کە لەگەڵ سروشت دابڕابوو. لەسەربنەمای زیندوویی سروشت و بەرهەمداری و پیرۆزیەکەی رێنیسانس شۆڕشی هزری پێشخست. ئەو بڕوایەی بەبنەماگرت کە دەڵێ، هەرچی هەبێت لەسروشتدا بوونی هەیە. لەرێگای هونەرەوە بەشێوەیەکی باشتر جوانییەکانی سروشتی نیشاندا.

لەرێگای هەڵویستی زانستییەوە لەدەرگای سروشتیدا. مرۆڤی بەبنەماگرت و ناسینی گشت راستییەکانی بەئەرکی هونەرو زانست لەقەڵەمدا. ئەم گۆڕانکارییەی هزر سەردەمی نوێی ئافراند. بەپێچەوانەی شیمانەکان کۆمەڵگای سەرمایەداری ئەنجامی سروشتی ئەم قۆناخە نییەو رۆڵێکی چەواشەکاری و پاشڤەڕۆیانەی بینی. شانبەشانی خراپ بەکارهێنانی سروشت پێڕەوە پێشخراوەکانی چەوساندنەوەی مرۆڤیشی پەیڕەوکرد. زاڵبوون لەسەر مرۆڤ، لەگەڵ زاڵبوون بەسەر سروشت بوون بەیەك. بەبێ ئەوەی بیر لە پیرۆزی و زیندوویی و هاوسەنگی سروشت بکاتەوە بەکاربردن (استثمار)ی وەك رۆڵێکی شۆڕشگێڕانە لەقەڵەمدا. ئەو پیرۆزییەی بەدەرکرد کە بەشێوەیەکی شێوێنراویش بێت لە زهنییەتەکاتی پێشووتر خاوەن پێگەبوو. بەبێ هیچ ترس و ئەندێشەیەکەوە تەسەڕوفکردنی لەسەر سروشت بە مافێکی خۆی زانی.

لەئەنجامدا هەردوو قەیرانی ژینگەیی و کۆمەڵایەتی بوون بەیەك. هەروەکو چۆن ناوەڕۆکی سیستەم قەیرانی کۆمەڵایەتی بۆ نێوەندی گێژاو گواستەوە، کارەساتەکانی ژینگەش دووچاری دەهات مەترسی و هاواری فریاگوزاری لێبەرزدەبێتەوە. شارەکانی وەك شێرپەنجە گەورەدەبن، پیسبوونی هەوا، کونبوونی چینی ئۆزۆن، کەمبوونەوەی خێرای جۆرەکانی رووەك و ئاژەڵ، بنبڕکردنی دارستانەکان، پیسبوونی ئاوەڕۆکان، زیادبوونی نائاسایی ژمارەی دانیشتوان، کۆبوونەوەی تەپۆڵکەی زبڵ لەهەموو لایەك و نەمانی ئاوی پاك، ئیتر لەدەرئەنجامی قەیران سروشتیشی بەرەو یاخیبوون برد. بەبێ ئەوەی لێکدانەوە بکرێت کە هەسارەکەمان تا چ رادەیەك بەرگەی شار، مرۆڤ، کارگە، ئامرازی گەیاندن، مادده دەستکردەکان، هەوای پیس و ئاو دەگرێت ئاراستەیەکی کوێرانەی بەدەستهێنانی قازانجی زۆر لەئارادایە. ئەم گۆڕانکارییە نێگەتیڤانە قەدەرێك نییە. ئەنجامی بەکارهێنانی لاسەنگانەی زانست و تەکنۆلۆژیایە لەلایەن دەسەڵاتەوە. هەڵەیە ئەگەر زانست و تەکنۆلۆژیا بەرامبەر بەقۆناخ بەرپرسیار ببینرێ. زانست و تەکنۆلۆژیا تەنیا سەربەخۆ ناتوانێ رۆڵ ببینێ. بەگوێرەی هێزەکانی سیستەمی کۆمەڵگا رۆڵ دەبینن. هەروەکو چۆن سروشتییان سەراوبن کردووە دەتوانن باشتریشی بکەن. کێشەکە تەواو کۆمەڵایەتییە. ناکۆکییەکی گەورە لەنێوان ئاستی زانست و تەکنۆلۆژیاو پێوانەکانی ژیانی بەشی زۆرینەی مرۆڤەکاندا لەئارادایە. بەهۆی بەرژەوەندی

تویژێکی کەمینە ئەم ڕەوشە سەرهەڵدەدات کە بەسەر زانست و تەکنۆلۆژیادا زاڵن. ئەو ڕۆڵەی زانست و تەکنۆلۆژیا لەکۆمەڵگای دیموکراتی و ئازادیخوازیدا بیبینێ ژینگە پارێزییە.

خودی ژینگە پارێزیش زانستێکە. زانستێکە لەپەیوەندی نێوان کۆمەڵگاو ژینگە دەکۆڵێتەوە. سەرباری ئەوەی نوێیە، بەڵام بەشێوەیەکی بەناویەکداچوو لەگەڵ زانستەکانی دیکە، لەبەلاوەنانی ناکۆکی نێوان کۆمەڵگاو ژینگە ڕۆڵی پێشەنگایەتی دەبینێ. ئەو هۆشیارییە سنووردارەی لەبارەی ژینگەوە گەشەیکردووە، لەرێگای ژینگەناسییەوە پێهەلگرتنێکی شۆڕش ئاسا ئەنجامدەدات. لەکۆمەڵگای کۆمۆنەی سەرەتاییدا پەیوەندی نێوان کۆمەڵگاو سروشت وەك ناوکەپەتکی نێوان منداڵ و دایکەکەی بوو. وەك هەبوونێکی زیندوو تەماشای سروشت دەکات. ڕووبەڕوونەبوونەوەی خۆی و سزاکانی دەکرێتە ڕێسای سەرەکی ئایین. ئایینی سروشت ئایینی کۆمەڵگای کۆمۆنەی سەرەتاییە. لەپێکهاتنی کۆمەڵگادا ڕەوشێکی نائاسایی سروشت و ناکۆکی بوونی نییە. خودی فەلسەفەش مرۆڤ وەك ئەو سروشتە پێناسە دەکات کە هەستی بەجیاوازی خۆی کردووە. مرۆڤ لەناوەڕۆکی خۆیدا پێشکەوتووترین پارچەی سروشتە.

بەمجۆرە ڕەوشی نائاسایی و دژە ــ سروشتی ئەو سیستەمەی کۆمەڵگا ئاشکرا دەبێت کە ئەو پارچەیەی (مرۆڤ) لەگەڵ سروشت ناکۆك کردووە. بەهەرحاڵ ئەو مرۆڤەی بەجۆشوخرۆشی جەژن ـ جەژن ڕەنگدانەوەی جۆشی بەیەکەوەبوونە لەگەڵ سروشت ــ لەگەڵ سروشتدا دەژی، کاتێ دەیکات بە بەڵایەکی سەر سروشتیش دەسەلمێنێ ئەم سیستەمەی کۆمەڵگا چۆن بەڵایەکە.

ئاوێتەبوون لەگەڵ ژینگەی سروشتی تەنیا گەوهەرێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی نییە. لەبواری فەلسەفیشەوە سروشت حەسرەت و تامەزرۆییەکە ناتوانرێ دەرکی پێنەکرێت. لەڕاستیدا ئەمە دوولایەنەیە. لەکاتێکدا سروشت دەبێ بەمرۆڤ و گەورەیی حەسرەت و هێزی داهێنانی خۆی دەخولقێنێ، مرۆڤیش دەرك بەسروشت ــ جێگای تێفکرینە کە سۆمەریەکان گەڕانەوە بۆ ئازادی (ئەمارگی) وەك گەڕانەوە بۆ دایك (سروشت) تێدەگەن ـ دەکات و هەست بەبوون و جیاوازی خۆی دەکات. پەیوەندی ئاشق ــ مەعشوق لەنێوان هەردووکیاندا هەیە. ڕووداوو بەسەرهاتێکی گەورەی ئەشقە. بەهەرحاڵ تێکدان و لێکدابڕاندنیان بەگوێرەی گوزارشتی ئایین گەورەترین گوناهە. چونکە ناتوانرێ هێزی لەوەگەورەتری تایبەت بەواتاداری بخولقێندرێ. پەیوەست بەم بابەتەوە جارێکی دیکە هەڵسەنگاندنەکەمان سەبارەت بەخوێنبەربوونی مانگانەی ژنان بەشێوەیەکی زەق دەردەکەوێت کەنیشانەیەکی لێکەوتنەوەو جودابوونەوەیە لەسروشت. سروشتیبوونی ژنان بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە لەسروشت نزیکە. پەنهانی و نهێنی سەرنجڕاکێشیەکەشی بۆ ئەم ڕاستینەیە دەگەڕێتەوە.

هەرجۆرە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی کە لەگەڵ سروشتدا نەبێت بەیەك، ناتوانرێ باس لە ئەخلاقیبوون و واقیعیبوونەکەی بکرێت. هەربۆیە ئەم سیستەمە کە ناکۆکی هەرەزێدە لەگەڵ سروشت دروست دەکات، لەبواری ئەخلاقی و واقیعیەوە بەلاوە دەنرێت. هەروەکو لەم پێناسە کورتەدا دەرکی پێدەکرێت پەیوەندی نێوان ئەو گێژاوەی سیستەمی سەرمایەداری تێیدا دەژی لەگەڵ کارەساتەکانی ژینگە پەیوەندییەکی دیالەکتیکییە. تەنیا لە ڕێگای ڕزگاربوون لەسیستەم دەشێ ناکۆکییە ڕیشەییەکانی لەگەڵ سروشت بەلاوەبنێ. بەهۆی تایبەتمەندێتی و کارەکتەری ناکۆکییەکان ناتوانرێ تەنیا لەرێگای بزووتنەوەی ژینگەپارێزی چارەسەری بەدیبێت. لەلایەکی دیکەشەوە کۆمەڵگایەکی ژینگەپارێز پێویستی بەوەرچەرخانێکی ئەخلاقیش هەیە. تەنیا لەمیانەی هەڵوێستێکی ژینگە پارێزییەوە دەشێ دژە ــ ئاکاری سەرمایەداری بەلاوە بنرێت. پەیوەندی ئەخلاق ــ ویژدان پێویستی بەدەروونێکی خوێنگەرم و ئارام هەیە. ئەمەش کاتێك لەمیانەی خۆتەیارکردن بەژینگەپارێزی واتادار بەهادار دەبێ. ژینگەپارێزی دۆستایەتیکردنی سروشت و بڕواکردنە بەئاینی سروشتی. لەم لایەنەوە لەمیانەی هۆشمەندی تازە زیندوودا گوزارە لەیەکبوون لەگەڵ کۆمەڵگای ئۆرگانی سروشتیدا دەکات.

گرفتـە کرداریـەکانی ژیـانی ژینگـە پـارێزیش هەنووکەییـە. قوولکردنـەوەی ئـەو رێکخـستنانەی لـەپێناو وەسـتاندنی کارەساتەکانی ژینگەی سروشتی ئاواکراون، کردنی بەپارچەیەکی جیانەکراوەی کۆمەلگای دیموکراتیك، هـەروەها هاوکـاریکردنی بزووتنـەوەی ئـازادیخوازی ژنـان و فێمینیـزم، ئەرکـەکانی چـالاکییە. چـڕکردنەوەی هۆشـیاری و رێکخـستن سـەبارەت بەژینگـە، یەکێکە لەکارە سەرەکییەکانی دیموکراتیزەبوون. هەروەکو کامپانیـای سـەردەمێك کەتایبـەت بەچـین و نەتـەوە بـەڕێوەدەبردرا، پێویـستە کامپانیـای تایبـەت سـەبارەت بەهۆشـیاری دیموکراتیانـەو ژینگـەپارێزی رێکبخـەین. پێویـستە لەمافـەکانی ئاژەڵـەوە تادەگاتـە پاراسـتنی دارسـتانەکان و سـەرلەنوێ بـە دارسـتانکردنەوەی سروشـت وەك چـالاکییەکی راسـت ببێتـە پارچـەیەکی دەستلێبەرنەدراوی چالاکییەکانی کۆمەلگا. ئەوەی هەسـتیاری بـایۆلۆژی (ژیـانزانی) نـەبێت، هەسـتیاری کۆمەڵایـەتی ناتـەواوە. هەسـتیاری واتـادارو راسـت پابەنـدی بینـینی پەیوەنـدی نێـوان هەردووکیانـە. بۆئـەوەی سروشـتی دامـاڵراوو رووتکـراوە بەدارسـتانێکی مـەزن و بـەرگی سـەوزی جۆرەکـانی رووەك بگـات قۆنـاخی داهاتوومـان تێکۆشـانی گـەورە بەخۆیـەوە دەبـینێ و تەنانـەت پێویستیـشە. بەهـەرحاڵ پێویـستە شـانس و دەرفـەتی بەدارسـتانبوونی پێبـدرێت. دەشـێ دروشمـی " وڵاتپـارێزی بەچاندنی نەمام و رواندنی دارستان تێپەڕدەبێت " ببێتە یەکێك لەدروشمە بەهادارەکان. باشتر دەرك بەوەدەکرێ کەئەوانەی ئاژەڵیـان خۆشـناوێ و نایپـارێزن، مرۆڤیـشیان خۆشـناوێ و نایپـارێزن. کاتێـك دەرك بـەوەبکرێ کـەرووەك و گیانلەبـەر ئەمانەتێکەو لەئەستۆی مرۆڤدایە، ئەوا هێندەی دیکە بەهای مرۆڤ زیاد دەکات.

هـەروەکو لـەدیاردەی سۆسـیالیزمی بونیـادنراودا بینـرا هۆشمەندییـەکی کۆمەڵایـەتی (کۆمـەلگا) کـە لەهۆشـیاری ژینگـەیی بێبەش بێت ئەوا لەهەلوەشانەوەو گەندەلبوون رزگاری نابێت. هۆشیاری ژینگەیی هۆشمەندییەکی سەرەکی ئایدیۆلۆژییە. وەکو ئەو پردەیە کەدەکەوێتە نێوان سنوورەکانی فەلسەفەو ئـەخلاق. لـەناو رەوشـی قـەیرانی هاوچـەرخدا تـەنیا کاتێك سیاسـەتی رزگاری (فریادڕەس) ژینگەیی بێـت دەشـێ بـەرەو سیستەماتیکێکی کۆمـەلگا ئاراسـتە بگرێت. هـەروەکو لەپرسـی ئـازادی ژنـدا بینـرا، ئەوا دیسان چەمکی دەسەڵاتی باوکسالاری ـ دەوڵەتگەرایی سەرچاوەی ئەم ژیانە پڕ لەهەڵـەو کەموکورتیانـە پێکدێنێ و هۆکـاری درەنگکـەوتنی چارەسـەرییە. کاتێـك فێمینیـزم و ژینگـەپارێزی پێـشبخرێت تـەواوی هاوسـەنگییەکانی سیـستەمی دەوڵەتگەرایی ـ باوکسالاری تێکدەچێت. تـەنیا کاتێـك تێکۆشـانی راسـتەقینەی دیموکراسـی و سۆسـیالیزم ئـازادی ژن و رزگـاری ژینگە بەئامانج بگرێت گشتگیردەبێت. تەنیا تێکۆشانی سیستەمێکی کۆمەڵایـەتی نـوێی بـەمجۆرە کەگشتگیر بووبێت دەتـوانێ ببێتە واتادارترین شێوەی رزگاربوون لەگێژاو(کائیوس)ە هەنووکەییەکە.

لەگـەڵ هەلوەشـانەوەی سۆسـیالیزمی بونیـادنراو لەسـاڵی 1989 بـەهۆی فاکتـەری نـاوەخۆوە جیهـانگیری سیـستەمی سـەرمایەداری کەوتـە نـاو قۆنـاخی سـێیەمین قـەیران ــ گێـژاوی گـەورەوە. بەسەرکێـشی ئـەمریکا سیـستەم هەوڵـدەدات درێـژە بەدەسەڵاتی " ئیمپراتۆریەتی گێژاو (کائیوس) " بدات. ئیمپراتۆریەتی گێـژاوی ئـەمریکا لـەناو رەوشـێکی هاوشـێوەی قۆنـاخی هەلوەشانەوەی ئیمپراتۆریـەتی رۆمـادا دەژی. بێگومـان دەبـێ بەرامبـەر بـەم رەوشـەش تـەواوی تایبەتمەندێتییـە جیاوازەکـانی سیستەمی سـەرمایەداری بزانـرێ. وڵاتـانی یـەکێتی ئـەوروپا کـەدەخوازن خۆیـان لەهـەژموونی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا بەدوور بگرن، لەمیانەی داخوازیەکانی دیموکراسی و مافی مرۆڤ ـ بەسنورداری ـ هەوڵی بەرخودان و پاراستنی سیستەمی بـاوی کۆمـاری و دیموکراسـی و دەوڵـەتی نەتـەوەیی خۆیـان دەدەن. شـوێنگەی کۆسـپ و رێگـری دەوڵـەتی ــ نەتـەوەیی بەرامبـەر بەجیهانگیری سەرمایەداری یەکێتی ئەوروپا ناچاری ئەوە دەکات وەك یەکینەیەکی سیاسی لاوازی سەرووی نەتـەوە بمێنێتـەوە. ئەوە وەك ئەگـەرو شیمانەیەکی نزیـك نـابینرێ کەبەرێبەرایـەتی چـین و ژاپـۆن لـە پاسـیفیك سـێیەمین ناوەنـدی جیهانگیری جێگیر بێت. وڵاتانی وەك روسیاو بەرازیل ... هتدیش بەشدارییان دەکەن و زیـاتر پاراسـتنی دەوڵەتـە نەتەوەییـەکان بەبنـەما دەگرن. هەروەها چەندین وڵات، دەوڵەت و گروپ ـ دەوڵەتەکانی دیکەی جیهان لەکاتێکدا زەحمەتی گەورە دەبیـنن لەدرێـژەدان

بەمۆدێلی دەوڵەتی ساڵانی 1945 کە پشتیيان بەهاوسەنگی نێوان ئەمریکا ـ سۆڤییەت دەبەست، ئەوا زیاتر رووبەڕووی ئەوە دەبنەوە کە لەچوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی گێژاوی ئەمریکا بچووك و بەرتەسك ببنەوە، بەشێوەیەکی رێژەیی یان تەواوەتی پارچە ببن و سەرلەنوێ ئاوا بکرێنەوە. رۆژهەڵاتی ناوین، بەڵقان و قەفقاسیا و چەندین ناوچەی دیکە بەشێوەیەکی چڕو بەرفراوان لەناو ئەم قۆناخەدا دەژین.

ئیمپراتۆریای کائیوس(گێژاو) کە دەتوانین بەسێیەمین شەڕی جیهانگیریش بەناوی بکەین تەنیا لەمیانەی پێڕەوی سیاسی و سەربازی بەڕێوە نابردرێت. بەشێوەیەکی چڕو دیاریکراوتر لەرێگای کۆمپانیا ئابوورییە جیهانگیری و دامەزراوەکانی میدیا (راگەیاندن) بەڕێوەدەبردرێت. کۆمپانیا ئابووری و ئامرازە جیهانییەکانی میدیا کۆمەڵگاکان لەناو برسێتییەکی راگەیاندنی و زهنی دەهێڵنەوەو لەئاراستەکردن و بەکارهێنانیاندا زەحمەتی نابینن. باڵادەستی زانستی ــ تەکنۆلۆژی خۆشیان دەخەنەگەڕ, یان ئەوەتا لەناو گێژاودا هەوڵی زیاتر بەهێزکردنی سیستمی کۆمەڵگای سەرمایەداری دەدەن، ئەگەر ئەمەش نەبێت بەزیانێکی کەم لەمیانەی سەرلەنوێ ئاواکردنەوە هەوڵی رزگاربوون لەوگێژاوە دەدەن. لەسەردەمی گێژاودا ئاراستەکردن و پاراستنی سیستەم یان بەردەوامکردنی لەرێگای گۆڕانکاری رێژەییەوە، ناشێ لەمیانەی هەڵوێست و پێڕەوەکانی قۆناخی کۆن ئەنجام بدرێت. ئەو ستراتیژە نوێ و هەڵوێستە تەکتیکی و کردەوەکانی ئەمریکا پەنای بردۆتەبەر، هەڵسەنگاندنی لەمیانەی تایبەتمەندێتییەکانی قۆناخی گێژاو واقیعیتر دەبێت.

بەرامبەر بەمەش پێویستە گەلان ئەو شێوازەی هەڵوێستی دیموکراتی و کۆمەڵکاریانەی بەدرێژایی مێژوو نیشانیانداوە، لەمیانەی ئەو تیۆری و تەکتیکانەوە خۆی نوێبکاتەوە کەدەتوانێ گێژاو تێپەڕبکات. بزووتنەوەکانی" چەپڕەوی نوێ، ژینگەپارێزی، فێمینستی " و کۆبوونەوەکانی پۆرتۆئالاگرای قۆناخە نزیکەکان کە لەئەنجامی چەمکی "چەپڕەوێتی" سۆسیالیزمی بونیادنراوی قۆناخی جاران هاتوونەتە ئاراوە لەو توانستە دوورن دەرك بەگێژاو بکەن و تێپەڕی بکەن. بەبێ نکوڵیکردن لەم بزووتنەوانە، لەمیانەی رێنمایی گشتییەوە لەپێناو " کۆمەڵگایەکی دیموکراتی و ژینگەپارێزی و ئازادی رەگەزی" جیهانگیری پێویستییەکی گفتوگۆی چڕو زۆری سەبارەت بەتەکتیکی خۆجێیی تایبەت و شێوازەکانی چارەسەری هەیە. کاتێك ئەمە ئەنجامدەدەین ئەوا "ماڵئاوایی" لەو هەڵوێست و تەکتیك و تیۆرییانەی چارەسەری و دەسەڵات دەکەین کە لەمیانەی " رووخاندنی دەوڵەت، یان دەستبەسەرداگرتنی دەوڵەت" بەدیدێن, لەسەرووی تەواوی مەرجەکانەوە دێن. هەروەکو لەمەسەلەی سۆسیالیزمی بونیادنراودا بینرا, تاوەکو دەست لەو پێڕەوانە بەرنەدرێت کە زهنییەتی دەوڵەت ناوەندەکەیەتی، ئەوا لەوە رزگاریان نابێت کەبەخراپترین شێوە خزمەتی سیستەمی سەرمایەداری نەکەن. دیسان لەسەربنەمای ئەو چەمکە کۆنانەی بەشێوەی وڵات، نەتەوە، چین و ئایینن، "داتاشراون" و لایەنی ئایدیۆلۆژییان لە پێشە، لەمیانەی دروشم و پڕوپاگەندەی لەشێوەی رزگاری ئایین، وڵات، نەتەوە، سۆسیالیزم و دەوڵەت جەماوەر بخرێتە ناو سەرهەڵدان و راپەڕین، شەڕ رێکبخرێت، وەڵامی داواکاری راستەقینەی یەکسانی و ئازادی گەلان ناداتەوە. تەنانەت ئەگەر وەڵامیش بداتەوە لەئەنجامدا لەتوانەوە لەناو سیستەمی سەرمایەداری و بەهێزکردنی بەولاوە هیچ رۆڵێکی دیکە نابینێ.

لەسەردەمی نوێی سەرمایەداری جیهانگیریدا هەموو شتێك بەوەدا تێپەڕدەبێت کە گەلان و تەواوی ئەو گروپانەی بونیادەکەی پێکدێنن، لەسەربنەمای ناسنامەو کولتووری خۆیان، ئیرادەیان دەردەکەوێت، لێکۆڵینەوە لەسەر چارەسەرییە خۆجێیی و سەروو(ئولترا) نەتەوەییەکان دەکرێت رێکبخرێت و بەرەو ئەنجامدانی چالاکی پراکتیزەدەکرێت. وەك ئۆرگانە سەرەکییەکانی بەڕێوەبەرایەتی خۆجێیی لەبزووتنەوەی دیموکراتییانەی شارەوانی و هەرەوەزو کۆمۆنەی گوندو گەڕەکەکان، لەشوراکان تادەگاتە رێکخستنە بەرفراوانەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، لەمافەکانی مرۆڤ تادەگاتە مافەکانی منداڵان و ئاژەڵان، لەرێکخستنەکانی ئازادی ژن تاوەکو دەگاتە رێکخستنەکانی ژینگەپارێزی و پیشەنگایەتی لاوان، پێشخستنی ئەم رێکخستنانەی

کۆمەڵگای دیموکراتیک دەستلێبەرنەدراوو ژیانییە کە لەدۆخی تۆڕێکی کۆمەڵایەتی بەرفراواندایە. وەك کارگێڕیی پێڕەوو تیۆری و ئایدیۆلۆژی ئەمجۆرە کۆمەڵگا دیموکراتییە دامەزراندنی ئەو پارتە سیاسیانە ژیانییە کە سیاسەتی دیموکراتییانە بەبنەمادەگرێت. پارت و هاوپەیمانێتی دیموکراتییانە پێشنەخرێت پێکهێنانی کۆمەڵگای دیموکراتییانە بێهودەیە. وەك بەرزترین گوزارەی ناوەندەکانی سیاسەت و کۆمەڵگای دیموکراتیك گەیشتن بە "کۆنگرەی گەل" بۆ سەرجەم گروپگەلەکان ئەرکێکی سەرەکی دەستلێبەرنەدراوە. کاتێك هەوڵی بەلاوەنانی گێژاوە هەنووکەییەکە دەدرێت ئەوا " کۆنگرەی گەل" لەسەرووی ئەو ئۆرگانە دیموکراتیانە دێت کە ئەلتەرناتیفی دەوڵەت نییە، بەڵام ملکەچکرن بۆ دەوڵەتیش رەتدەکاتەوە، کاتێك پێویستیش بێت بۆ رێککەوتنێکی بەپرەنسیب و بەبنەما ئامادەیە. لەبنەڕەتدا دەتوانرێ کۆنگرەکانی گەل لەپێناو جێبەجێکردنی ئەرکی دەزگا، رێساو چاودێریکردنی پێداویستیی سیاسی، بەرگری، یاسایی، کۆمەڵایەتی، ئەخلاقی، ئابووری، زانستی و هونەریەکان ئەرکداربکرێت.

دەشێ دروشمە سەرەکییەکانی گەلان بەشێوەی کۆنگرە دیموکراتییەکان ریزبەند بکرێت کەدەوڵەت نییە، نەتەوەو وڵاتی ئازاد لەخۆوە دەگرێت، بەبەرفراوانترین شێوە دیموکراسییەت پەیڕەو دەکرێت، ئازادی باوەڕی ئایینی مسۆگەر دەکات.

بەرەچاوکردنی ئەو تواناکارییە زانستی، سەربازی و ئابوریە زەبەلاحەی لەدەست سەرمایەداری جیهانگیریدا هەیە، کاتێك رێگا بەچالاکییە یاساییەکان نەدرا، یاساکان بەشێوەیەکی یەکسان پەیڕەو نەکراو رژێمی ستەمکاری پەیڕەوکرا، ئەوا راپەڕینی رێکخراوو شەڕی گەریلایی پشتبەستوو بەخۆپاراستن دەشێ وەك پێڕەوەکانی بەرپەرچدانەوە هەڵسەنگێنرێت.

کاتێك لەسەربنەمای رەتکردنەوەی ئەخلاقی کۆمەڵگای سەرمایەداری, کۆمەڵگای دیموکراتی و ئازادی رەگەزی و ژینگەپارێزی ئاوا دەکرێت ئەوا جوڵانەوە بەشێوەی تیۆری ــ ئەخلاق و کرداری ــ ئاکاری پرەنسیپ و هەڵوێستێکی دەستلێبەرنەدراوە.

کاتێك کۆمەڵگای گێژاو (کائیوس) بەلاوە دەنێین زانست و هونەر ئەو بنەما هزریە سەرەکییانەن کە هەرەزێدە پشتی پێدەبەستین. ئەو پەروەردە فەرمیانەی لەزانکۆکانەوە تاوەکو قوتابخانە سەرەتاییەکان دەسەپێنرێن، کاتێ لەبواری ناوەڕۆك و شێوەدا ئاواکردنی ئەو مرۆڤە بەبنەما دەگرێت کە لەتاك، کۆمەڵگاو ژینگە نامۆیەو پاشکۆی دەوڵەت و پلەدارییە، ئەوا پێویستە تەڵەزگەو خەڵەتاندنەکانی ئەم پەروەردەو فێرکردنە دەربازبکرێ، لەچوارچێوەی شۆڕشی زهنیدا چەمکێکی نوێی هونەرو زانست بەرجەستە بکرێ کە مرۆڤ و کۆمەڵگا بەراستینە مێژووییەکانی ئاشنابکات، سات ئازاد بکات. پێویستە بەگوێرەی پێداویستییەکان ئەکادیمیا نوێکانی کۆمەڵناسی و خوێندنگاکانی بکرێتەوە.

بەرامبەر بەئیمپراتۆریای گێژاوی جیهانگیری سەرمایەداری لەسەر ئەم بنەمایە ئاراستەی شارستانییەتی دیموکراسی جیهانگیری گەلان، بگیردرێت، بەئەندازەی رێزگرتن بەرامبەر نەریتی بەرخودانی رابردوو، دەشێ بەرەو جیهانێکی ئازاد و دیموکرات و یەکسانترمان ببات.

## بەشی سێیەم

طێذاوی شارستانییەتی رۆذهەلآتی ناوین و ئەطەرەكانی ضارەسەری

**دەروازە:**

**ئەوە راستینەیەكە كەشەڕی سێیەمی جیهانی بەشێوازێكی تایبەت بەخۆی لەرۆژهەڵاتی ناوین لەئارادایە. بەڵام ئەم شەڕە بەبەراورد لەگەڵ رەهەندەكانی شەڕی سەربازی ـــ سیاسی كلاسیك تایبەتمەندێتییەكی جیاوازتری هەیە. لەگەڵ ئەوەی پێناسەی شەڕی شارستانییەتەكان راست و بەجێیە، بەڵام هێشتا گەوهەرەكەی بەشێوەیەكی راست شرۆڤە نەكراوە. رەهەندە مێژوویی و كۆمەڵایەتییەكانی هێندە روونەكراوەتەوە. لایەنەكان و شێوازەكانی شەڕو ئامانجەكان یەكلانەبوونەتەوە. سەرباری ئەوەی باس لەگەلێك پلان و پرۆژە دەكەن، بەڵام شەڕێكی بێپلان جێگای باسە، تەنانەت لەخۆیەوە بەرێوەدەچێت. هەروەكو بڵێی رووبەرووی شەرێكین كەئامانجی خولقاندنی گێژاو(كائیوس)یە.**

**كۆمەڵگاو دەوڵەتەكانی رۆژهەڵاتی ناوین شوێنی كەڵەكەبوونی كێشەكانە. ئەو كێشە هەمەجۆرانەی لەسەردەمەكانی مێژووی دێرینەوە كەڵەكەبوون و سەركوتكراون، هەناسەی لەبەر كۆمەڵگا بڕیوە. ئەو رژێمانەی لەلایەن سیستەمی سەرمایەداری گوایە بەئامانجی دۆزینەوەی چارەسەری سەپێنراوە، خۆیان بوونەتە سەرچاوەی كێشەكان. نەخۆیان دەتوانن ببنەهێزی چارەسەری، نەرێگاو دەرفەتیش بەو هێزە ناوخۆو دەرەكییانە دەدەن كەهێزی چارەسەرین. تەنیا بەناوكردنی كێشەكە وەكو قەیرانی ئیسلامگەرایی كەموكورییەكی گەورەیە. هەندێ زهنییەت هەن كەئایینە تاكخوداییەكان تێپەڕ دەكات و رشەكەیان بۆ سەردەمی نیئۆلیتیك (چاخی بەردینی نوێ) درێژدەبێتەوە. چەندین شانەو سیستەمی كۆمەڵگا پێكهاتووە كەناتوانرێ لەمیانەی دیاردەی نەتەوە پێناسە بكرێن. نەك هەرتەنیا خێڵێك، تەنانەت هەر بنەماڵەو خێزانێك بەئەندازەی كێشەی دەوڵەتێك ئاڵۆزی و گێچەڵی لەخۆوە گرتووە. هەڵدێرو كەلێنی نێوان ژن و پیاو، بەئەندازەی هەڵدێرو كەلێنی نێوان دەوڵەت و كۆمەڵگا لەنێو نامۆییدا دەژیت. هەروەكو بڵێی گێژاوێكی هاوشێوەی گێژاوی لێكتێنەگەیشتنی كوێر و كەڕولاڵەكانی**

ژێر منارەی (تاوەر) بابل لە ئارادایە کە لە ئەفسانەداندا باسی دەکرێ. دەڵێی دیسان ئەفسانە لەهەمان شوێندا زیندوو بۆتەوە. هێزی نزیکەی حەفتا نەتەوە لەنێو هەوڵ و کۆششدایە، بەڵام رۆژ بەدوای رۆژ گێژاو و ئاڵۆزی زیاتر دەبێ. شەڕی یەهودی ــ عەرەب کە پاشماوەی سەردەمی فیرعەونەکانە هیچی لەخێراییەکەی خۆی ونەکردووە. ئەو شاڵاوە پاکتاوکاریانەی لەسەردەمی پادشاکانی سۆمەدا دەکرایە سەرگۆتییەکان (کوردەکان)، بەهەمان خێرایی جاران بەردەوامە.

لەرەوشێکی وەهادا پێویستە لەوەڵامی روونتری ئەم پرسیارە بگەڕێین؛ چۆن کێشەکان لەرۆژهەڵاتی ناوین بەم حاڵەتە گەیشتوون؟

کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین خانەی بنچینەیی هەموو کۆمەڵگاکانە. هێزی خۆی لەم کارەکتەرو ناوەڕۆکەی وەردەگرێت. تیۆری خانەی بنچینەیی بۆ کۆمەڵگاکانیش راست و بەجێیە. سیستەمی سەرمایەداری توانستی ئەوەی نیشانداوە کە لەنێو کولتووری کیشوەری ئەمریکاوە تادەگاتە کولتووری ئوستورالیا ــ باسیفیك، لەوێشەوە تادەگاتە کولتووری هیندستان، چین و ژاپۆن، لەئەفریقیاوە تادەگاتە کولتووری روسیا و سیبیریای باشوور لەناو تەواوی کولتوورەکاندا بڵاوبێتەوەو پەلبهاوێژێ. واتە لەشەڕی کولتوورو شارستانییەتەکاندا سەرکەوتنی بەدەستهێناوە. بەڵام لەرۆژهەڵاتی ناویندا سەرباری ئەو هەنگاوانەی لەساڵانی..18 وە دە ستیپێکردووە، تائێستا نەیتوانیوە سیستەمەکەی فەتح بکات. لەوانەیە رەوشێك لەئارادابێت کەزۆر لەشەڕە جیهانییەکان بەکێشمەکێشترە. هەندێ لایەن و تایبەتمەندێتی وەها لەخۆوەدەگرێت کەشەڕە لاسەنگەکان تێپەڕدەکات. ئاشکرایە کە سەرەکیترین هۆکاری تەنگەتاویەکان سەرچاوەی خۆی لەکارەکتەرو پێکهاتەی کۆمەڵگا وەردەگرێت. ئەو پادشایەتی و دەرەبەگایەتییەی شۆڕشی فەڕەنسا هەڵیوەشاندەوە، هەروەها ئەو دەرەبەگایەتی و سیستەمەی قەیسەر کەشۆڕشی روسیا هەڵیوەشاندەوە، هەردووکیان لێکدەچوون و خەریکی سەرخانێك بوون کەبۆخانەکان قووڵنەببۆوە. بێگومان شیکردنەوەی ئەم بونیادانەو هەڵوەشاندنەوەیان، دیسان زەحمەتی زۆری لەخۆوەگرتووە. تەنانەت ئەم شۆڕشانەش کە لەپێکهاتەی سەرخان دەستیانپێکرد، نەیانتوانی خۆیان لەوە رزگاربکەن و خۆیان لەئاوێتەبوونی سیستەمی سەرمایەداری بەدووربگرن. لەمیانەی سەپاندنی ئەم مۆدێلانە بەسەرکۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین و پێکهاتە سەرخانییەکەی، نەك هەرنەتوانرا کێشەکان چارەسەربکرێت، بەڵکو بەزیاتر قووڵکردنەوەی کێشەکان ئەنجامگیربوو. ئەوەی دەمێنێتەوە پێویستی باش دەرککردنە بەسروشتی شەڕی شارستانییەتەکان. راستتر ئەوەیە بپرسین، چییە ئەوەی وایکردووە شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین تائەم رادەیە بەرخودان بکات و بێچارە بمێنێ؟ بۆچی ئەنجام لەتەواوی ئەو دەستێوەردانانە بەدەستدێ کە بۆ شارستانییەتە ناسراوەکانی جیهان دەکرێت، بەڵام هەمان چارەسەری بۆ شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین سەرکەوتوو نابێ؟

وەڵامی ئەم پرسیارە لەو راستینەیەدا شاراوەیە کە دایکی شارستانییەتەکانە. هەروەکو چۆن نابێ دایك لەمنداڵ بچێ، بەڵکو دەبێ منداڵ لەدایك بچێ، بەهەمان شێوەش شارستانییەتەکانی دیکە ناتوانن شارستانییەتی دایك لەخۆیان بچوێنن. بەڵکو خۆیان ناچارن بەلایەنی کەم لەهەندێ لایەنەوە بەشارستانییەتی دایك بچن. ئەگەردیسان بگەڕێینەوە سەر نموونەی خانەی ریشەیی، دەشێ پێکهاتەی بوهێلی (جینات) تەواوی ئەو خانانەدا بدۆزینەوە کە لەخانەی سەرەکی (بنچینەیی) کەوتوونەتەوە. بەڵام ناشێ هەموو بوهێلەکانی (جینەکان) خانەی دایك لەو خانانە بدۆزینەوە کەلێی بەرهەمهاتوون. بێگومان بەشێوەیەکی زێدەڕۆیی بەراوردکردن و پێوانی دیاردەی کۆمەڵگا لەگەڵ دیاردەی بایۆلۆژی (زیندەوەرزانی) رێگا لەپێش هەڵەی گەورە دەکاتەوە، بەڵام دیسانیش بۆ تێگەیشتنێکی راست سەبارەت بەهێڵکاریەکان ئاسانکاری زۆرگرنگ دەڕەخسێنێ. ئاشکرایە کەپێویست دەکات شارستانییەتی سیستەمی سەرمایەداری بەشێوەیەکی قووڵ و تایبەت هەڵوەستە بەرامبەر شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین بکات.

کاتێك دەست بەشیکردنەوەی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین دەکەین، بەر لەهەموو شتێك پێویستە تەماشای پێکهاتەو بونیادی زهنییەتەکەی بکرێت. لەدایکبوون و بەرِیشەییبوونی پێکهاتەی زهنییەتی هەرسێ ئایینە تاکخوداییەکە یەکێکە لەراستییەکانی ناوچەکە. لەم بوارەدا چەندین بابەتی سەرەکی هەیە کەپێویستە کۆمەڵناسی ئایین شی بکاتەوە. هەروەها پێویستە ئەم هەوڵە بە بوارەکانی ئەدەبیات و هەڵوێستە هونەرەکانی دیکە بەرجەستەبکرێت. بەبێ ئەوەی بەهاکانی کۆمەڵگای ئۆلیتیك جیابکرێتەوە کە تائێستا لەناوچەکە بەکاریگەرە، دیاریکردنی هێڵکاری نەخشەی زهنییەت، کەموکورتییەکی مەزن لەخۆوەدەگرێت. لەلایەکی دیکەشەوە ئەمە راستینەیەکە پێکهاتەی خێزان و هۆز و ئایینزایەك کە نزمترین یەکینەی دیاردەکانی ئایین و قەومە ئاوێتەبووەکانن لەگەڵ دەسەڵات تائێستاش بەشێوەیەکی بەربلاو لەئارادان. بۆیە ئەو پێکهاتانەی زهنییەت کەسەرمایەداری رێگای لەپێشکردەوە، هەروەکو بڵێی لەواتایەکی شکست خواردوودا جێیان گرتووە وایە. بەدەستەوەگرتنی ریشەی قاڵبەکانی زهنییەت لەسەرەتای مێژووەوە، تەنانەت گەرِانەوە بۆ پێشتر و بەدەستگرتنی لەسەردەمی فرەخودایی و جیهانی میتۆلۆژیەوە، بەتایبەتیش تاوتوێکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ میتۆلۆژیا (ئەفسانە)ی سۆمەریدا، رۆڵێکی بەرچاوی لەدەرککردن بە ئەڵقە یەك بەنێو یەکداچووەکانی زهنییەتدا دەبێت. ئێستا لەرۆژهەڵاتی ناوەراست ئاڵۆزی و تێکچرِان و خراپبوون و داتاشراوی لەنێوان قسەو کردار، چەمك و دیاردە، خەیاڵ و راستی، ئایین و ژیان، زانست و ئایدیۆلۆژیا، فەلسەفەو ئایین، ئەخلاق و یاساکان لەئارادایە. هەروەك کەڵەکەبوونی کێشە و قێزەوەنییەکانی هەموو ئەو چینە زهنییەتانەی مرۆڤایەتی ناسیبوونی قورسی کردبێ لە جێی خۆی راوەستاوە. پێکهاتەکانی زمانیش، چ پێکهاتەکۆنەکان بن یاخود نوێکان، لەوە درەنگ نەماون کەرەوشی زهنییان لەنێو موحافەزەکاریەکی مەزندا نیشانبدەن. نەزانییەکی بەربلاوو تێروانینێکی بەرتەسك سەبارەت بەچەمکەکانی مەملەکەت، وڵات، نەتەوەو دەوڵەت لەئارادایە, کە لەسەدەکانی دوایی دۆزرانەوەو سنوورەکانیان دیاریکرا. هاوسەرێتییەکی ناتەواوو سەقەت لەنێوان فاکتەرەکانی زهنییەتی هاوچەرخ و فاکتەرەکانی زهنییەتی چەرخەکانی ناوین و کلاسیك لەئارادایە. تاوەکو پێکهاتەی زهنییەتی رۆژهەڵاتی ناوین بۆردومان نەکرێت، ئەوا ئەو بۆردومانە فسیۆلۆژی، سیاسی، کۆمەڵایەتی، مافپەروەری و ئابووریەی دەکرێت، هەروەکو ئێستا دەیبینین لەکردەوەی ئەشکەنجەدان و ژینۆساید و تیرۆری فەرمی و نافەرمی بەوڵاوە رێگا لەپێش ئەنجامێکی دیکە ناکاتەوە کە لەگەوهەری خۆیدا لایەنی زهنییان دەردەکەوێتەپێش.

پێکهاتەکانی دەسەڵات لەرۆژهەڵاتی ناوین جیاوازییەکی مەزنی لەگەڵ پێکهاتەی دەسەڵاتی گۆرەپانەکانی دیکەی جیهاندا هەیە. ئاڵۆزی دیاردەکانی شەرِو دەسەڵات لەئاڵۆزی تۆری زهنییەت کەمترنییە. سەرباری ئەوەی لەکۆنترین دەزگاکانی ناوچەن، بەڵام دابرِان و بێچەوانەبوونێکی سەیر لەنێوان ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و نێوان شەرِو دەسەڵات بەجێکراوە. پەیوەندییە دوولایەنەکان لەقەباترینیان تادەگاتە وردەکارترینیان رێگا بۆ هەمووجۆرە دیماگۆژییەت و فشارێك کراوەیە. عەقلانییەت لەنزمترین ئاستدا بایەخی پێدەدرێت. کۆمەڵناسیش وەکو دیاردەیەك کە شینەکراوەتەوە هەروەکو بڵێی بەند و داوە پەیوەستەکانی دەسەڵات و شەرِ، ئایین، ئابووری، چینایەتی و سیاسی لەناوخۆیدا شاردۆتەوە. لەبیرۆکەیەکی داتاشراوی خودایی تادەگاتە قەباترین گورزی قامچی تاوەکو شیکردنەوەیەکی راست بۆ دەسەڵات و شەرِ نەکرێت، زۆر زەحمەتە رووخساری راستینەی رۆژهەڵاتی ناوین بکەوێتەروو.

دەزگاکانی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بەتایبەتیش دیاردەی خێزان بەلانی کەم هێندەی دەسەڵات ئاڵۆزی لەخۆوەگرتووە. پیاوو ژنانی رۆژهەڵاتی ناوین هێندە ئاڵۆزی و پەرتەوازەیی لەخۆوەدەگرن پێویستیان بەشیکردنەوەی تایبەت هەیە. شیکردنەوەیەکی لەچوارچێوەی قالبە گشتییەکانی سۆسیۆلۆژی سەبارەت بەخێزان، ژن و پیاوی دەسەڵاتدار ئەنجامبدرێت، کەموکورتی بەرچاو لەخۆوەدەگریت. وشکترین و تاریکترین لایەنەکانی راستینەی سیاسی، ئایدیۆلۆژی و ئەخلاقی لەپیاوو

ژنـدا ڕەنگدەداتـەوە. ناکۆکییـەکانی ناودەزگای خێـزان لەناکۆکییـەکانی ناودەزگـای دەوڵـەت کەمترنییـە. خێـزان واتاکـەی لـەوە زیـاترە کەدەزگایـەکی کۆمەڵایـەتی بێت، هـەروەکو بڵێـی " کـونی ڕەش" ی کۆمەڵگاکانـە. کاتێـك ژن بخەینـە ژێـر زەرەبینـەوە، لەوانـەیە بتوانین ئێش و ئازارو درامای تەواوی مرۆڤایەتی بخوێنینەوە.

هەم بەکۆمەڵگابوونی مێـژوویی، هـەم بەکۆمـەڵگابوونی جـوگرافی، پێویـستە لەمیانـەی پەیوەندییـەکی چـڕی دیالـەکتیکی نێوانیـان هەڵوەسـتە بەرامبـەر ناوچـەکە بکـەن. تـاوەکو هـەر قۆنـاخ و پارچـەیەکی کاتـەکانی مێـژوو و شـوێنەکانی جوگرافیـا شینەکرێنەوە، ناشێ لەرۆژگاری ئەمڕۆمان و تـەواوی سیـستەمەکانی شارسـتانییەت تێبگـەین. مێـژووی نەنووسـراو لەمێـژووی نووسراو گرنگ و بەبایەخترە. دیسان زیاتر لەو شوێنانەی بەردەوام ناویـان دەهێنێـرێ، چیرۆکی ئـەو شـوێنانە گرنگـە کـەباس نەکراون.

ڕوون و ئاشکرایە تاوەکو دواکەوتوویی ئابووری لەناو تەواوی ئەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانـەدا تـاوتوێ نـەکرێت نـاتوانرێ ئەم دواکەوتووییە لەمیانەی پڕەنسیپە وشکەکانی تیۆری ئابووری شیبکرێتەوەو چارەسەربکرێت.

شـیکردنەوەی گـشت لەسـەر بنـەمای جیاکردنـەوە و پارچەپارچـەکردن نەخۆشـییەکی گـشتی کۆمەڵناسـییە، هەرەزێـدە ئەنجامەهەڵەکانی لەو خەباتـەدا بـەدی دەکرێت کەسـەبارەت بەشارسـتانییەتی ڕۆژهـەڵاتی نـاوین ئەنجامـدەدرێت. ئـابووریش لەسەرووی ئـەم خەباتـەوە دێـت. تـاوەکو لـەنێو بەیەکداچوونی شـەڕ ــ دەسـەڵات، زهنییـەت ــ بەکۆمەڵگابوونـدا نـەبێت ئـەوا شیکردنەوەکانی ئابووری تەنیا نەزانی و بێئاگایی قووڵتر دەکاتەوە. ئاشکرایە کەقالبی شیکردنەوەکانی شارشتانییەتی ڕۆژئاواو لێکۆڵینەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین هەڵەی تیۆری و پراتیکی بەرچاو لـەخۆوەدەگرێت. ئـەو گێـژاوەی ئێـستا ڕۆژانـە لەئارادایـە تاڕادەیەکیش بەرهەمی ئەم هەڵوێستانەیە.

ئەو ئالۆزی و گێژاوەی لەڕۆژهەڵاتی ناوین لەئارادایەو ئەمڕۆ بابەتێکە بەردەوام تاوتوێدەکرێ, ئـیتر کـەس نـاتوانێ نکوڵی لێبکات. تراژیدیا ئەوەیە, نە ئەوانەی بانگەشەی خاوەنداریتی ڕەسەنی ناوچەکە دەکەن, نە ئەوانـەی تـازە بـەدوای بانگەشـەی خاوەنداریتی کەوتوون, هیچ یەکێکیان نزیکی شیکردنەوەیەکی بەواتاو بایەخـدار نەکـەوتوون, چـونکە دەترسـن. هەڵوێـستێکی واقیعیانە سەبارەت بەناوچەکە تەنیا بەواتای کردنەوەی قووتووی پاندۆرا نایێت؛ بەڵکو بەواتای سـەرلەنوێ گێرسـانەوەی " کەشـتی نـوح " دێـت لەسـەر چیایەکی نـوێ. تـەنیا ئەوکاتـە لـەبواری ژیـانی نەوەیـەکی نـوێ (بـەمرۆڤبوون و ژینگـەپارێزی) چـەکەرە دەکـات. ئەوژیانـەی لەئارادایـە لەتـەوقی سـەر تادەگاتـە سـەرەپەنجەکانی پـێ لـەنێو ڕەوشـێکی تایبـەتی درۆو سـتەمکاریدایە. هـەروەکو چـۆن پـڕە لەپاشـخانەکانی هەڵوێـستی بـەکاربردن و دەسـتڕۆیی هـەزاران سـاڵە, دەمیلـە کۆمەڵایەتییەکانیشی پڕە لە سۆزانێتی هەمەجۆری پێنج هەزارساڵە کە ڕیشەکەی بـۆ دەوڵـەتی ڕاهیبی سۆمەر دەگەڕێتـەوە, ئەگەر بەتەواوەتی بەمردووش بەناونەکرێت, زۆر لەدووری ژیانەو لەناو پەلەقاژەدایە.

ئایا **ئیمپراتۆرەکانی ئەمریکا** وەکو ئەسکەندەرە هاوچەرخەکان لەمیانـەی دوا پرۆژەکانیـان سـەبارەت بەڕۆژهـەڵاتی نـاوین دەتوانن ڕێگا لەبەردەم پێشکەوتن و گۆڕانکارییـەك بکەنـەوە کـە هێلینیزمـان بێنێتـەوەیاد؟ وەك چـۆن ئەسـکەندەر لـەڕێگای ڕێککەوتن لەگەڵ ئەرستۆکراتە کوردەکانی پێکهاتەی تایبەتی ئیمپراتۆریەتی پارس جوڵانەوەی هێلینیزمـی بـەهێزکرد، ئـەمڕۆ ئەمریکا هاوشێوەی ئەسـکەندەر دەتـوانێ ئەمـە لەگـەڵ بەڕێوەبـەرێتی ئەیالەتـەکانی ئێـراق و ئەرسـتۆکراتە کوردەکـان ئـەنجام بـدات؟ گـرنگتریش ئەوەیـە، ئایـا دەشـێ ڕۆڵـی بوونـە لانکـەی شارسـتانییەت دووبـارە ببێتـەوە کـە هـۆزە کـوردە ئارییـەکان بـە دەستپێکردنی سەردەمی بەرەبەیانی مێژوو ڕێیان بۆ خۆشکرد؟ واتە ئایا دەتوانن لەهەنگاونانی ڕۆژهەڵاتی ناوین بۆ سـەردەمی شارستانییەتی دیموکراتیانە ڕۆڵێکی هاوشێوەی ئەمە ببینن؟. لە مێژووودا ڕۆڵی هۆزە کوردەکان بەرامبەر ئەو شارستانییەتانەی لەدەوروبەریان ئاواکراوە زیاتر لەدەرەوە بەشێوازی کارلێکردن و کاردانەوە بووە. لەجوگرافیای خۆیاندا ژمارەیەکی سنووردراوی

پێشکەوتنی شارستانییانەیان بەخۆیانەوە دیوە. بەرامبەر بەو دەستدرێژی و داگیرکارییەی لەدەرەوە دەهات زیاتر لەسەربنەمای ئەتنیك (خێل و تیرە و هۆزەکان) لەپێناو پاراستنی هەبوونی خۆیان بەرخودانیان کردووەو ئەو ڕێکەوتنانەیان ئەنجامداوە کەدەرفەتی خۆپاراستن و لەسەرپێ مانەوەی پێداون. لەرۆژگاری ئەمڕۆشماندا ئەم گەوهەرەی خۆیان دەپارێزن.

لەلایەکی دیکەوە بەرامبەر بەسەرمایەداری جیهانگیری کەهەڵمەتێکی نوێی دەستپێکردووە، وابەسانایی ناتوانرێ بەهەمان ڕەوتی کۆن پارێزگاری لەهەبوون بکرێت و ڕێککەوتن پێشبخرێت. ئەگەر بنەماڵە ئەرستۆکراتە خەڕەکی و بەکرێگیراوەکانیش بخوازن بەردەوامی بەم سیاسەتە بدەن، وەك گەلێك کەچوارچێوەی ئەتنیکی تێپەڕکردووەو گەیشتۆتە ئاستی گەلێکی دیموکراتیك (گەلی سەرکەوتن)، ئیتر لەسایەی ڕەوتی کۆن نەخۆیان تێردەبن، نەئەم یان ئەو هێز دەتوانێ کۆنترۆڵیان بکات. لەجیاتی ئەوەی وەك گەل ئاوانەکردنی دەوڵەتێکی کلاسیك وەکو زیان و ژێرکەوتن هەڵسەنگێنرێ، ئەوا هەڵسەنگاندنی ئاوانەکردنی دەوڵەت وەك شانسێك سەبارەت بەئازادیخوازەکانی کۆمەڵگا ڕاسترە. چەند بەهای ئازادی کۆمەڵگا و ئازادیخوازانی کۆمەڵگا هەیە کەناوەندەکەی دەوڵەت بێت و توانیبێتی گەلانی خۆی ڕازیبکات؟ تەواوی گەلانی ئەمریکای لاتین، ئەفریقیا و ئاسیا بوونە خاوەن دەوڵەت, بەڵام ئایا توانیان پرس و کێشەکانیان چارەسەر بکەن؟ بەپێچەوانەوە ئەی لەجاران قورسترنەبوون؟.

ئەوەی گرنگە ناسنامەی دیموکراتی و کۆمەڵکاری گەلان کە شێوازی سەرەکی بەرخورد و هەڵوەستەی گەلانە لەمێژوودا، لەگەڵ زانستی هاوچەرخ و تواناکارییە تەکنۆلۆژییەکان بکرێت بەیەك و بەدەزگا بکرێت. لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا ئەوەی بەئەندازەی نان و ئاوو هەوا بۆگەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوین پێویستە دیموکراسییە. لەدەرەوەی دیموکراسی هیچ بژارێکی دیکە ـ بژارەکانی دیکە هەمووی تاقیکراوەتەوە ـ ئەو توانستەی نییە بەختەوەری بۆ گەلان بێنێ. گەلی کورد کە لەسەرووی ئەم گەلانەوە دێت، ئەگەر ڕۆڵی ستراتیژی جوگرافیاکەیان و سەردەمی مێژوویی و تایبەتمەندێتییە کۆمەڵایەتییەکانی خۆی لەرۆژهەڵاتی ناوین لەپێناو شارستانییەتی دیموکراتییانە سەفەربەر بکات و سەربکەوێت، سەرباری خۆی ئەوا باشترین چاکە لەگەڵ مرۆڤایەتی و دراوسێکانی دەکات.

### A ـ بەشێوەیەکی ڕاست دەرککردن بەرۆژهەڵاتی ناوین، کێشە چییە و چۆن پێشکەوت؟

1 ـ بەرلەشیکردنەوەی دەزگاکان، سەرەتا بەگوێری پێویست ڕۆشنکردنەوەی شیتەڵکاری بیرۆکەکان گرنگە. ئەگەر ئەم بیرۆکانە بەشێوەیەکی ڕاست پێناسە نەکەین کە بەدرێژایی مێژوو و لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا بۆتە پارچەیەکی ژیانی کۆمەڵگاکان، ئەوا ئەو شێمانەو ئەگەرانەی دادەنرێت بەهایەکی ڕۆشنکارانەی ئەوتۆیان نابێت. بۆنموونە تاوەکو ئەنالیزەکردنێکی کۆمەڵناسی بۆ بیرۆکەی خودا (ئەڵلا) ئەنجامنەدرێ، دەتوانین کامە قۆناخی مێژوویی و کۆمەڵگا پێناسەبکەین؟. ئەوروپاییەکان کاتێك لەدەربەگایەتی چەرخی ناوین ڕزگاریان بوو، لەخۆڕانەبوو لەئاستی زهنییەتدا هەرەزۆر گفتوگۆیان سەبارەت بەزانستی خوداناسی (ئیلاهیات) و بیرۆکەی (ألە) کردووە. هێندە the,oy یان تاوتوێکردووە، واتە هێندە گفتوگۆیان لەسەر " ئەڵلا " کردووە تا لەرێگایەوە بەسەرەداوی زانست و فەلسەفە گەیشتوون. بەشێوەیەکی بەربلاو باوەڕهێنان بە theo و پیرۆزی لەئارادابووە. توانیویانە بڵێن ئەگەر هێندە باوەڕیمان پێی هەیەو بەپیرۆزی دەبینین مافی خۆمانە و هەڵوێستی ڕاستیش ئەوەیە ماناکەی بزانین. بوێری ئەوەیان نیشانداوە ئەو بیروبۆچوونانە گفتوگۆ بکەن کەدۆگماتیزم دەهەژێنێ و نوێکاری ئەنجامبدەن. لەسەردەمی دەرکەوتن لەچاخی ناوین خوداناسی (تیۆلۆژی) بنەمای گفتوگۆ هزرییەکان پێکدێنێ. ئەوهزرانەی بەناوی زانست و فەلسەفەش هاتوونەتە ئاراوە بەشێوەیەکی بەربلاو پەیوەندی بەئیلاهیات (خواناسی)یەوە هەیە. ئەوەی گرنگە لەم گفتوگۆیانەدا هەندێ ئەنجامی پێویستی بۆ فەلسەفەی عەقلانی و زانست

بەدەستهێناوە. هەرچی خوداناساکانی (تیۆلۆگەکانی) ئیسلامن لەجیاتی بەئەنجام گەیشتن، دۆگمایان پیرۆزکردو هزریان سڕکردو دووچاری بەستەڵەکیان کرد. هەر لەسەرەتاکانی سەدەی دوانزدەهەمدا " ئیمام غەزالی" فەلسەفەی مەحکومکردو ڕێگای لەپێش تەسککردنەوەی دەرگای ئیجتیهاد کردەوە، بەمەش وایکرد لەنێو تاریکایی چاخەکانی ناوین ونببێت. تەنانەت ئەمڕۆش کەس ناوێرێ گفتوگۆیەکی بەمشێوەیە بکات. ڕاستر بڵێین ئەم توانستە نیشانەدراوە.

قووڵایی هزری لەنێو کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین بۆچاخی میتۆلۆژیا (ئەفسانە) درێژدەبێتەوە. بەرهەمەکانی ئەدیب و ڕاهیبەکانی سۆمەر کەکارامەترین داهێنەرەکانی مێتۆلۆژیان، لەلایەن هەرسێ ئایینی تاکخوداییەوە وەکو نموونەی گەشەپێدراو بەکارهێنراوە. ئێمە حەزرەتی ئیبراهیم وەك دامەزرێنەری ئایینی تاکخودایی (تەوحیدی) دەناسین. تەنانەت خودی حەزرەتی ئیبراهیم لەناو پادشایەتی خانەدانی بابلی گەورەبووە. تائێستاکەش یادەوەرییەکەی بەزیندوویی لەئورفا ماوەتەوە، باوکی حەزرەتی ئیبراهیم وەکو فەرمانبەرێك لای نەمرووود لەپەنتائۆن ـ کۆی پەیکەرەکانی خودا ــ پاسەوانێتی کردووە، هەروەکو دەزانرێ لەئەنجامی کاریگەری ــ کاردانەوەدا وەرچەرخانی زهنی بەخۆیەوە دیوە. لەرەوشێکی وەهادا تاوەکو دەرك بە"پەنتائۆن" ی نەمرووود نەکەین و نەیناسین, چۆن دەتوانین لەئایینی حەزرتی ئیبراهیم تێبگەین؟ گووتەی لێهاتووترین پرۆفیسۆری خوداناسی سەبارەت بەم بابەتە, حەزرەتی ئیبراهیم بتەور بتەکانی شکاندووە, نەمرووود تووڕەبووە, پرسیاری کردووە, کێ شکاندوویەتی, ئەویش گووتویەتی بتەگەورەکە شکاندی, نەمرووود گووتویەتی چۆن ئەم بتەبێگیانە دەتوانێ بیانشکێنێ؟ ئەویش گووتویەتی ئەی خودانییە. چیرۆکەکە بەمشێوەیە بەردەوام دەبێت. ئەم گووتانە لەگێڕانەوەی چیرۆکێك بەولاوە هیچ بەهایەکی دیکەی نییە. تاوەکو شیکردنەوەیەکی کۆمەڵناسی (سۆسیۆلۆژی) میتۆلۆژیای سۆمەر نەکرێت کەکۆڵەکەکانی پانتائۆنی نەمرووودە, ئەوا ناشێ شۆڕشی ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم پێناسە بکەین, تاوەکو ئەمەش پێناسە نەکەین ناتوانین لەشۆڕشی ئایینی حەزرەتی موسا, حەزرەتی عیسا و حەزرەتی محەمەد تێبگەین. سەرباری ئەوەی هێندە زانکۆو پەیمانگای ئیلاهیات و فوتابخانەکانی ئیمام ـ خەتیب و دەزگاکانی ئایین و تەریقەت لەرۆژهەڵاتی ناویندا هەن, هیچ یەکێکیان ئیلاهیاتگەرایییەکی کۆمەڵناسی بەڕێوەنابات. ئەگەر ئەنجامی بدات سحر بەتاڵدەبێتەوە، کڵاوەکە دەکەوێ و کەچەڵ ئاشکرادەبێت. ئەوکاتە دەبینرێ کە دوودیاردە بنەماکانی هزری تاکخودایی پێکدێنن. ئەوانیش یەکێتی هێزەکانی سروشت و پادشاو سەرپەرشتیاری پلەدارین کە لەناو کۆمەڵگادا بەرزدەبنەوە. واتە چەمکی کۆمەڵگای باڵادەست, گرێدراوی ئەمەش چەمکی سروشتی زاڵ, وەکو شکۆمەندترین گوزارشت هەنگاو بەهەنگاو پێشدەخرێت تادەگەیەنرێتە ئەو خودایە (ئەڵڵا)یەی 99 تایبەتمەندێتی هەیە. هەروەکو چۆن گفتوگۆیەکی بەمشێوەیە ئەنجامنەدراوە، لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بەناوی حزبوڵڵا (پارتی خودا) بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ خودا پۆلەتیزەکراوە، تەنانەت سەرباری ئەوەی تێکەڵ بەسەربازیش کراوە، تاوەکو ئێستاش ئەوخەڵەتاندنە بەردەوامە کەوەکو هەبوونێك لەئاسمان لێیدەگەڕێن.

دەزگای پێغەمبەرایەتیش بەشێوازێکی دۆگماتیك لەئیلاهیاتدا تاوتوێ دەکرێت. بەشێوەیەکی داتاشراو باس دەکرێت, هەروەکو بڵێی هیچ پەیوەندییەکی بەپێشکەوتنەکانی کۆمەڵگاوە نییە. وەکو دیارە لەلایەك نەریتی شامان ــ شێخ، لەلایەکی دیکەش دەزگای وەزیرێتی کەگرێدراو بەدەسەڵاتی پادشا بەرزدەبێتەوە، کاریگەرییان لەسەر ئەم پێکهاتەیە هەیە. پێغەمبەرایەتی وەك چارەسەرییەك بۆ ئەو گرفت و کێشانە دەردەکەوێت, کە لەئەنجامی گەشەکردنی دەوڵەت و دەسەڵات لەنێوانیاندا سەرهەڵدەدات. پێشکەوتنێکە پەیوەندی بەسیاسەتەوە هەیە. ڕیشەیەکی جەماوەری و چالاکی هەیە. لەپێشکەوتنەکانی نێوان بلیمەتی و ڕێبەری سیاسیشدا خاوەن ڕۆڵە. هەرچەندە جێگای پیرۆزیش بێت، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیە تاوەکو شوێنگەی لەناو ڕاستینەی کۆمەڵگا دیاربکرێت.

ئەگەر ئەوە ئەنجامبدرێت ئەوکاتە دەتوانرێ بەراستی دەرك بەکەسایەتی مێژوویی هەندێ کەس بکرێ. بەمشێوەیە خودی مێژووش ڕۆشندەکرێتەوە. باسکردنی دۆگماتیکیانە هەردوو لایەنیش لەناو تاریکیدا دەهێڵێتەوە. چەندین چەمکی تیۆلۆژی هاوشێوەی ئەمە کە بەواتای پیرۆزییە بەهەمان شێوە خزمەتی تاریکی دەکات. بیرۆکەکانی بەهەشت و دۆزەخ لەم بوارەدا زەق و بەرچاوترە. ریشەکەیان بۆ سەردەمی میتۆلوژیای سۆمەریەکان دەگەڕێتەوە. پەیوەندییەکەی لەگەڵ هەڵکشانی کۆمەڵگای چینایەتیدا ئاشکرایە. سیستەمی چینە خەباتکارەکان (کارکەرەکان) لەزۆربەی بارودۆخەکاندا لەشێوەی دۆزەخ بوو، جەهەننەم وەکو وشە شوێنەکەی هینۆیمە کە لەلوبنانی ئەمڕۆیە؛ شوێنێکی پیسە، خراپە، وەکو دۆڵی لاشەی مردوو وایە. هەرچی شوێنی ئەوانەیە کەزێدە ـ بەرهەمەکان زەوتدەکەن هەنگاو بەهەنگاو وەکو بەهەشتی لێدێت. لەجیاتی زیادکردنی ئەم نموونانە، گرنگ ئەوەیە لەمیانەی شرۆڤەکانی کۆمەڵناسییەوە ڕۆشنبکرێتەوە.

تاوەکو ئێستا لەهزری ڕۆژهەڵاتی ناویندا جیابوونەوەی نێوان میتۆلۆژیا و ئاین گفتوگۆی لەسەرنەکراوە. تەنانەت خودی میتۆلۆژیاش شرۆڤە ناکرێت. دەڵێن چیرۆکەو لەکەنارێکی بەجێدێڵن. ئەمشێوازەی هزر بەهەزاران ساڵ، تەنانەت ئێستاش بیرەوەری کۆمەڵگاکان داگیردەکات. بەهەزاران ساڵ بوو بەفۆرمی سەرەکی هزر. وەکو باسکردنێکی شیعرئامێزانەی گوزارە سەمبۆلییەکانی ژیانی ماددی کۆمەڵگاکان، کاریگەری لەسەر تەواوی ئایین و شێوەکانی ئەدەبیات کرد کەدوای خۆی هاتنەئاراوە. هیچ ئایین و ئەدەبیاتێك لەئارادا نییە بیرۆکەکانی خۆی لەمیتۆلۆژیا وەرنەگرتبێت. ئەگەر میتۆلۆژییەکان وەکو دروستکراوی ئەفسانە فڕێبدرێنە لایەکەوە، ئەوا بەواتای خۆ بێبەشکردن دێت لەدەوڵەمەندترین سەرچاوەی کولتووری. تاوەکو بەهایەکی واتادار بەو میتۆلۆژیایانە نەدرێ کەهزری سەردەمی منداڵێتی مرۆڤایەتییە، ناتوانرێ شیکردنەوەی راست سەبارەت بەئایین و ئەدەبیات ـ هونەر ئەنجامبدرێت. لەجیاتی نکوڵیکردن لەمیتۆلۆژیا پێویستیمان بەزیندووکردنەوەی هەیە.

هەرئەمەش سەربەخۆ بابەتێکی گفتوگۆیە. داخوا میتۆلوژیا لەکامە قۆناخ و لەژێر کامە فۆرمدا بۆتە سەرچاوەی ئایین. هەروەکو دەگووترێ کاتێك میتۆلۆژیا دەبێت بەرێسای مسۆگەری باوەڕی ئەوکاتە دەبێ بەئایین. لەم چوارچێوەیەدا بەئایینبوون وەکو راستییەکی بێگومان و مسۆگەر پەیوەندە بەپەسندکردنی میتۆلۆژیاوە. بەئایینبوون بەهایەکی دوولایەنەی هەیە. لەلۆژیکدا ڕێگا لەپێش چەمکی " هزری مسۆگەر " دەکاتەوە. بەمجۆرە بیری یاسایی پێشدەکەوێت پێبەپێ یاسای خودایی لەگەڵ یاسای سروشت دەبن بەیەك. لەلایەکی دیکەشەوە بەر لە لەدایکبوونی ڕێگا لەهزری جوڵەی دیالەکتیکی کۆمەڵگاو سروشت دەگیرێت. بەمجۆرە ڕێگا لەپێش بیرکردنەوەی ئایدیالیستیانە دەکرێتەوە. هێندەی بڵێی هزر لەدیاردەکان دادەبڕێ و سەربەخۆ دووچاری گەشەکردنێکی بێ کۆنترۆڵ دەبێت. هزری ئایدیالیستی کە لەناوخۆیدا کەوتۆتە نێو ماجەراییەك، هێندەی دیکە زهنییەتی کۆمەڵگا لەجیهانی راستییەکان دووردەخاتەوە. ئیتر پێشکەوتنی هزری ئایینی لەبوارە سەرەکییەکانی، مافپەروەری، سیاسەت، ئابووری، ئەخلاق و هونەرو بوارەکانی دیکە وەکو دۆگمای وشك و برینگ شێوە دەگرێت، وەکو یاسای لێدێت. لەراستیدا ئاسانکاریەکی مەزنی بەڕێوەبەرایەتی بۆ دەوڵەتی چینایەتی هەڵکشاو دابینـدەکات. لەگەڵ ئەوەی بەهای یاسا بەهەر ڕێسایەکی ئایینی دەدات، لەهەمانکاتدا مەسەلەی یاساییبوون و ڕەوابوون چارەسەردەکرێت. هێندە شکۆدارکردنی ئایین لەچاخەکانی یەکەم و ناوین بۆ ئەو ئاسانکاریە دەگەڕێتەوە کە بۆ بەڕێوەبەرایەتی دابینیکردووە.

ئایین ئایدیۆلۆژیای بەڕێوەبەرایەتییە کە بەتایبەت کاری لەسەرکراوە. چینی دەسەڵاتدار بەردەوام هەست بەگەوهەری داتاشراوی ئایین دەکات. هەرچی چینەکانی ژێرەوەی کۆمەڵگایە وەها باوەڕیان پێهێنراوە کەراستییە. هێندە لێکدانەوە لەسەر ئایین دەکرێ و مەراسیمی تایبەتی بۆ پێشدەخرێ، بەخۆشەویستی نوێنەرایەتی دەکرێ، هەرهەمووی لەنزیکەوە وابەستەی هێزی بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتە. هەربۆئەوەی ڕووی ناوەوەی نەناسرێ گفتوگۆی لەبارەوە قەدەخەکراوە، گفتوگۆی لەبارەوە بکرێت دوو ئەنجامی لێدەکەوێتەوە: هەڵکشانی پادشایەتی و بەیاساییبوونی سروشتی، هەردووکیان زۆر گرنگن. ئەوکاتە

رووندەبێتـەوە کەپادشا ــ خوداوەنـد و سـوڵتان ــ سێبەری خوداوەنـد چۆن سـەریانهەڵداوە. لەرەوشـێکی وەهاشـدا لەچـەمکی خوداوەندێکی توفێنەری کۆمەڵگا و سزادەر رزگاری دەبێت. هەروەها هەرچی بەشی پەیوەندیدار بەسروشتیشە بەدوای دەرگای زانسیتبووندا دەگەڕێت. ئەو پرەنسیپە زانستیانەی حوکمی جیهان دەکەن تاوەکو دەگاتە فیزیای کوانتۆم و کۆزمۆس هەمووی دەرکی پێدەکرێت. هەڵکشان و باڵابوونی ئەوروپا بۆئـەوە دەگەڕێتـەوە لـەکاتی دەرکـەوتن لەچاخی نـاوین بەشێوەیەکی چڕو بـەردەوام شـیکردنەوەی سـەبارەت بـەم تیۆلۆژییـە(ئیلاهیـات) ئەنجامـداوە. بێگومـان نـاتوانرێ پێـشکەوتنی هـزری تـەنیا بەگفتوگۆکردنی تیۆلۆژیا ببەسترێتەوە. بەڵام ئەگەر ئـەم گفتوگۆیـەش نـەبێت نـاتوانرێ لـەدەرگای هـزری هاوچـەرخ بـدرێت. هـەروەکو دەزانـین ئەگـەر گفتوگۆکـانی سـەدەکانی 12, 13 و 14 ی سـەبارەت بەمەزهەبـەکانی دۆمینیکـان و فرانسـسکان نەبووایە وابەسانایی رێنیسانس پێشنەدەکەوت. تەواو لەسەدەکانی 12, 13, 14 دا چینی زانایانی رۆژهـەڵاتی نـاوین خۆیـان بەڕووی گفتوگۆدا داخست. خەڵکیان بەلادان لەئایین تاوانبارکردو دۆگماتیزمێکی وشکیان بەسـەر کۆمـەڵگادا سـەپاند ــ ئـەم مەیلەی نەریتی دەسەڵات تاڕادەیەکی زۆر بـەخێویکرد, لەئەنجامـدا رێگای لـەپێش ئـەوەکردەوە بـۆ یەکـەمین جار لەمێـژوودا رۆژهــەڵاتی نــاوین پێــشەنگایەتی بداتــە دەســت رۆژئــاوا. ســەدەی پانزدەهــەم ســەدەی مــەزنترین جودابوونەوەیــە. ئەوجودابوونەوەیەی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا کە پێبەپێ قووڵتربۆوە, جیاوازی هەڵوێست بەرامبـەر بـەتیۆلۆژیا بنەماکـەی پێکدێنێ. لەراستیدا لەسەدەکانی 9, 10, 11, 12 هزری فەلسەفی پێشکەوتنێکی مـەزنی بەخۆیـەوە دیـوە. رۆژئـاوا تـەنیا لەمیانەی ئەنجامـدانی وەرگێـڕان پێـشکەوتنەکان لەناوخۆیـدا بڵاودەکاتـەوە. بـاڵابوونی هـزری بەتـەواوی لەدەست رۆژهـەڵاتی ناویندایە. مەزهەبی " موعتەزیلە" لەمیانەی بەبنەماگرتنی عەقلانییەت شەڕی بەرامبەر دۆگماتیزم دەستپێکردووە. ئـیبن روشـد گـەورەترین فەیلەسـوفی سـەدەی دوانزدەهەمـە. پێـشەنگەکانی فەلـسەفەی تەسـەوف وەکـو مەنـسووری حـەلاج و سـەهرەوەردی تـامردن پارێزگاریـان لەفەلـسەفەی خۆیـان کـردووە. ئـەو فـشارانەی زیـادی کـردووە لەکۆتاییـەکانی سـەدەی دوانزدەهەم ئەو رەنگەی رۆژهەڵاتی ناوین دیاری دەکات کە تاڕۆژگاری ئەمرۆمان بەردەوامە.

نـاتوانرێ رۆڵـی دۆگمـاتیزمی ئـایینی لـە بـەلاوازی مانـەوەی ئـەدەبیات بـچووك بکرێتـەوە. لەکاتێکدا ئـەدەبیات دەیتـوانی گرێدراو بەسەرچاوەی میتۆلۆژیا پێشکەوتنی مـەزن بەدەسـتبێنێ, بـەڵام هـەمان قەدەخەنامـەکان ئـەم بوارەشـی وشککردووە. گوناه و قەدەخەنامەکان مرۆڤایەتی لەدەوڵەمەندترین سەرچاوەکان بێبەشکردووە. هەرچـی ئەوروپایـە لـەو ساڵانە هـەنگاوی دەرخـستنی یەکـەمین کلاسیکەکانی خـۆی هاویـشت. ئـەدەبیات هێنراوەتـە ئـەو ئاسـتەی هـۆنراوە تـەنیا لەسـەر سوڵتانەکان رێکبخرێت, لەمیانەی پیاهەڵدانەوە باس لەچیرۆکی ژیانیان بکرێت. لایـەنی هـەرە بەئێـشی ئـەم مەسـەلەیە ئەوەیـە کەئـەمڕۆ رۆژئاواییەکان دەستیان هاوێـشتۆتە بەئـەدەبیاتکردنی راسـتینەی میتۆلـۆژی و ئـایینی رۆژهـەڵاتی نـاوین. ئەمـەش کێـشەیەکی جددییە, داخوا ئەدەبیات چۆن ئەنجامدەرێت. ئەو وەرچەرخان و شۆڕشە هزرییەی ئەوروپا لەرێگای ئەنجامـدانی رێنیـسانس و ریفـۆرم و رۆشـنگەری ئەنجامیـدا, لـەناو کۆمـەڵگای رۆژهـەڵاتی نـاوین تائێـستا نەخراوەتـە رۆژەڤیـشەوە. گواسـتنەوەی پارچـە پارچـە بـەواتای رێنیـسانس و ریفـۆرم و رۆشـنگەری نایێـت. تەنانـەت دەتـوانین بـاس لەنائاراسـتەیەکی پێـچەوانەش بکـەین. لەراستیدا ئیسلامی رادیکال نەك نوێبوونەوە, بەڵکو گوزارشت لەزیندووکردنەوەی موحافـەزەکاری دەکات. بیرۆکـەی ئیـسلامی سیاسی لەبەکارهێنانی ئایینی باو لەلایەن دەسەڵات بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە. لەمیانەی بازدان بەسـەر قۆناخـەکانی زهنییەت کەرۆژئاوا بەخۆیەوەبینی, ئەگەری ئەوە لەئارادا نییە رۆژهەڵاتی ناوین بکەوێتە سەرراستـەڕێی پێشکەوتنی هـزری. تەنیا لەرێگای ئامێزکردنی ئایین یاخود زانستگەرایی وشك و هەڵوێستی فەلسەفی پۆزەتیفستی(الفلسفة الوضعية) نـاتوانرێ وەرچەرخانی هزری ئەنجامبدرێ. هەڵوێستی مەزهەبگەرایی "سۆسیالیزمی بونیادنراو" کەپشت بەقۆناخەکانی هزری رۆژئاوا نابەستێ, کاریگەریەکی دیاریکراوی هەیەو بنەمای دواکەوتوویی روسیا و چینی ئێستا پێکدێنێت.

بۆتێپەڕکردنی ئەو دامودەزگایانەی کۆمەڵگا کەبوونەتە گرێکوێرە، سەرلەنوێ بونیادنانەوە یان شۆڕشی هزری مەرجە. شۆڕشی هزری تەنیا هەرسکردن و گواستنەوەی هزری رۆژئاوا نییە. لەم بوارەشدا کاتێك پێشکەوتنە سنووردارەکان گەوهەریکی پارچە پارچەیی هەبێت, لەپینەکردن بەولاوە رۆڵێکی دیکە نابینێ. ئەزبەرەکردنی هزری رۆژئاوا هیچ خولقکاریەکی نابێت. هەروەکو چۆن بێبەرهەمی دەکات, هەر شۆڕشێکی هزری شیمانەکراویش ئاستەنگ دەکات. سەرباری ئەوەی رۆشنبیرگەلێگی زۆری ئەزبەرەکردن هەیە, بەڵام زانایەکی راستەقینەی کۆمەڵناسی نییە. ئەوانەی لەگۆڕێدان دەکرێ بە مەلا هاوچەرخەکان بەناویان بکەین کە فەقێ وشك باوەڕەکانی زانکۆ تێپەڕناکەن. راستینەی سۆفیگەراییەك لەئارادایە کەزۆر لەسۆفیەکانی چەرخی دێرین پاشکەوتووترن. ناشێ فەیلەسوفێکی زانستی خۆبەخشانە (طوعي) لەنێو مەلا رۆشنبیرەکاندا بدۆزرێتەوە, باوەڕی بەپێویستییەکی وەهانییە. کەرەستە ئایدیۆلۆژییەکانی رۆژئاوا زۆرخراپتر گواستراوەتەوە. ئەگەر میللیگەرایی بێت یاخود لیبرالیزم و سۆسیالیزم, فۆرمە ئایدیۆلۆژییە هاوچەرخەکان, لەبینینی رۆڵێکی خراپ لەسەر هزری رۆشنبیرانی رۆژهەڵاتی ناوین بەولاوە تێپەڕی نەکردووە. ناتوانرێ راستینەی رۆژهەڵاتی ناوین لەمیانەی ئەمجۆرە قالبە ئامادانە روونبکرێتەوە, لەو کردەوەو پراکتیکانەی لەئارادایە دیارە کەدووچاری تێکچوونی رەنگ هاتووە.

شانبەشانی بەکارهێنانی فۆرمەکانی رۆژئاوا شۆڕشی هزری ناچارە لەمیانەی راستییەکان گەوهەری خۆی پڕبکاتەوە، تاوەکو ئەو زەمینەی واتایە کە تەواوی بونیادە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکان پشتی پێدەبەستێ لەمیانەی بۆردوومانێکی هزری تێپەڕنەکرێت، ئەوا ناتوانرێ هێزی ئەو واتایە ئاوا بکرێت کە بونیادە نوێیەکان پشتی پێببەستێت. ئەو پێکهاتانەی واتایان نییە، جێگاو بەهای کۆمەڵایەتی نابێت. تاوەکو راستینەی کۆمەڵگا لەهزردا چارەسەرنەکرێت، دیاردە نەتەوەیی، ئەتنیکی و ئایینییەکان رۆشننەکرێتەوە، ئەوا زۆر زەحمەتە دەزگا سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان رۆشنبکرێنەوە. ئەو پێشکەوتنانەی سەبارەت بەلێشاوەکانی لەجۆری ئایین، نەتەوەگەرایی و نەژادگەرایی لەهزری رۆژئاوا هاتنەئاراوە پێویستی بەهەوڵ و کۆششی مەزن هەبووە. تەنیا لەمیانەی لایەنی پۆزەتیفی ئەمجۆرە هەوڵ و کۆششە مەزنانە توانراوە جیهانبینی (پارادیگما)ی ژیانی نوێ و باڵا بەجێبکرێ.

رۆشنبیرو سیاسەتمەدارانی رۆژهەڵاتی ناوین لەنێو هەڵوێستێکی وەهادان هەروەکو بڵێی لەکەسایەتی خۆیاندا وەها نیشاندەدەن پێویستی بەتێکۆشانێك نییە کەهاوتای ئەم کۆششانە بێت, وادەزانێ لەرێگای ئەزبەرەکردن و گواستنەوەی تەکنۆلۆژیا پێیدەگات. ئاکامیش, بێجورئەتی سەبارەت بەئەنجامدانی شۆڕشی هزری خۆی, وابەستەیی هزری و بێچارەییە بەرامبەر بەسەرمایەداری جیهانگیری. تاوەکو رۆژهەڵاتی ناوین رێنیسانس و ریفۆرم و رۆشنگەری خۆی ئەنجامنەدات ئەوا ئەو گێژاو(کائیۆس)ەی لەئارادایە لەبەرژەوەندی گەلان تێپەڕناکرێت. ناتوانێ لەرێگای بەکارهێنانی ماکیاژی شێوەکانی ئەم دووسەد ساڵەی دوایی رۆژئاوا لەدەستڕۆیی هەزاران ساڵ رزگاری ببێت.

2 ـ بەدەزگابوونەکانی دەسەڵات و دەوڵەت ئەو دیاردە کۆمەڵایەتییانەن کەشیکردنەوەیان سەختە. کاریگەری کردنە سەر کولتووری رۆژهەڵاتی ناوین, دەشێ لەرێگای شیکردنەوەی زمانی کولتووری سیاسی بەدیبێت. لەگەڵ هەڵکشانی دەسەڵات و دەوڵەت, ئەو تۆڕەی لەپەیوەندییەکانی نێوان جیاوازی چینایەتی, ئایینگەرایی, خانەدان, بنەماڵەو خێڵ چنرا, هەروەکو بڵێی سیستەمی کۆمەڵگا دەباتە دەرەوەی کات و شوێن. گووتە میتۆلۆژی و ئایینییەکان لەگەڵ گووتە ئەتنیکی و چینایەتییەکان راستینەی سەرچاوەی دیاردەکان بەهەمەڕەنگی ئاڵۆزدەکات.

ئەو ناوچەیەی بۆتە ناوەندی قۆناخی نئۆلیتیکی کۆمەڵگای کۆمۆنەی سەرەتایی, بەشێوەیەکی قووڵ کولتووری ئەم قۆناخە لەناو بیرەوەریەکەیدا دەژی. لەبواری ماددیش تاوەکو ئێستا هەبوونی پێکهاتەکانی نئۆلیتیك بەربڵاوە. گوندێتی (جووتیاری) تاوەکو دوێنێ لەبوون بەناوەندی نئۆلیتیك بەولاوە, گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتبوو. سیستەمەکانی

کۆمەڵگای کۆیلەداری و دەرەبەگایەتی بەهای کولتووری بنچینەیی ناوچەکەن. ئەو کولتوورەی رۆژئاوا کەخرایە سەر کۆی ئەم کولتوورانە، لەبۆیاخکردن بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە. هەربۆیە ئەگەر تەماشای رەنگی بۆیەکان بکرێ و بەگوێرەی ئەوە شیکردنەوەو چارەسەری بۆ کۆمەڵگا پێشبخرێت، خەڵەتێنەرەو بەلارێماندا دەبات.

ناوەکەی دیکەی دەسەڵات باوکسالاری، هیچ خانەو ئاستێکی کۆمەڵگا نەماوە دزەی بۆ نەکردبێ. لەوانەیە هەزاران ساڵ بەر لەدەزگای دەوڵەت دابونەریتی باوکسالاری کۆمەڵگای بەڕێوەبردبێ. هێزی باوکسالاری لەوانەیە لەهیچ شوێنێك بەئەندازەی رۆژهەلاتی ناوین هێزەکەی ئابلۆقەدەرو خنکێنەرنەبێت. ئێستاش وەك ئەو بەهایانەی لەئارادان کاریگەری هێزی باوکسالاری لەسەر کەسایەتی ژن و پیاو، کولتووری ئەتنیکی، خێزان و چەمکی نامووس زۆر دیارو بەرچاوە. پێویستبوو شارەکان کولتووری بەرامبەر پێشبخەن، بەڵام بەهۆی ناوچە لادێییەکان بەقووڵی شوێنپەنجەی باوکسالارییان پێوەیە. لەنێو ئۆقیانوسی ناوچە لادێییەکاندا شارەکان وەکو دوورگەیەك دەمێننەوە.

دەوڵەت لەسەربنەمای کولتووری باوکسالاری هەزاران ساڵە هەڵدەکشێ. لەپێکهاتنیدا لەفاکتەرەکانی چینایەتی زیاتر ئەوگروپە باوکسالارییانە رۆڵ دەبینن کەزۆر بەهێزبوونە. لەناو ئەم گروپەدا ئەوەی لەبەرچاوترە شێوەی یەختیاری بلیمەتە. وەك یەختیارو خاوەن ئەزموونی تیرە لەوانەیە ئەم بلیمەتە کۆنترین دەستڕۆبێت. شیمانە دەکرێ دوای شۆڕشی کشتوکاڵ کەدایك رۆڵی تێدابینی، ئەو زانا یەختیارە بەئەزموونەی هەنگاو بەهەنگاو پێشکەوت وەك شامان ـ شێخ ـ پێخەمبەر، پێبەپێ شوێنگە کۆمەڵایەتییەکەی زیادیکردووە. جیاوازی چینایەتی لەناو کۆمەڵگا پێشکەوتووە، کاتێك لەدەزگای باوکسالاری گۆڕانکارییەك بەرەو دەوڵەت هاتۆتەئاراوە، یەختیارە بلیمەتەکە لەگەڵ هاوپەیمانەکانی بۆ خانەدانی گۆڕاوە، بەپشتبەستن بەخانەدانیش دەگات بەپادشایەتی.

شیمانە دەکرێ لەشامانەوە بۆ راهیب، مەفرەزەی سەربازیش لەجەنگاوەرە لاوەکان پێکهێنراوە، تابەرەو ئاستێکی بڵندتر بەرزبوونەتەوە. کاتێك راهیب هۆنینەوەی ئایدیۆلۆژی شوێنگەی نوێ پێشدەخات، مەفرەزەی سەربازیش هەنگاو بەهەنگاو بەرەو بەسوپابوون دەچێ. ئەم مۆدێلەی بەدەوڵەتبوون ئێستاش لەناوچەکەدا واقیعییە. هیچ سەرەداوێك لەئارادا نییە بسەلمێنێ کەپێشتر سوپایەکی ئامادەی لەکۆیلە دروستکراو هەبووبێت. تەنیا ئەوکاتەی دەزگای دەوڵەت بەهێز دەبێت دواتر بەکۆیلەکردن پێشدەکەوێت. لەنموونەکانی میسر و سۆمەردا سەرەتا بۆ ماوەیەکی درێژ هێزی بەکاریگەری راهیب و هۆزەکان دەبینین. بەکۆیلەکردن وەها بەسانایی روویندەداوە، لەنێو خەبات و تێکۆشانێکی زۆرتوندو دژواردا بەڕێوەبراوە. قۆناخی راهێنانی کۆمەڵگا بۆ کۆیلایەتی، قۆناخێکە بەشێوەیەکی درێژخایەن لەناو کولتووری رۆژهەلاتی ناوین پەیڕەوکراوەو پێویستی بەشیکردنەوەیەکی باش هەیە. میتۆلۆژیا کەئایدیۆلۆژیای راهیبی سۆمەرو میسرە، بایەخە مەزنەکەی بۆ ئەو رۆڵەی دەگەڕێتەوە کە لەدەوڵەتبووندا بینیویەتی. هەروەکو چۆن سەرمایەداری ئەو تێکۆشانەی لەپێناو ئایدیۆلۆژیای وەکو میللیگەرایی و لیبرالیزم بەڕێوەی برد فۆرمی دەوڵەتی سەرمایەداری هێنایە کایەوە، هێزی چیرۆکە میتۆلۆژییەکانیش فۆرمی کۆیلایەتی چاخی یەکەمینی خوڵقاندووە. ئەگەر کاریگەری هێزی چیرۆکە میتۆلۆژییەکان لەسەر کۆمەڵگا نەبووایە بۆ رەواکردن، بەهەرحاڵ خانەدانە سەیرەکانی پادشای ــ خوداوەند دروست نەدەبوون. دروستیش بونایە، هێندە ریشەیی و هەمیشەیی نەدەبوون.

چیرۆکەکانی نەمروودو فیرعەون لەکولتووری رۆژهەلاتی ناوین تەواو گوزارە لەپادشا خوداوەندەکان دەکات. پادشای ــ خوداوەند داهێنانێکی رۆژهەلاتی ناوینە. لەکەسێك بەولاوە کولتوورێکە تەنانەت دەزگایەکە. سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵگە شوێنگەیان بەرامبەر پادشای ـ خوداوەند نموونەی ئەو مێروولانەیە کە گەنم دەگوازنەوە. جیاوازی نێوان پادشای ـ خوداوەندو ئەو کۆمەڵگایەی بووە بە ئەوانەیتر هێندە ئەوپەڕگەری و پێچەوانەکراوە، لەکۆتاییدا دوو بنەمای دەستنیشانکردووە، پادشای ــ

خوداوەند نەمرەکانن، مرۆڤەکانیش ئەوانەن کەدەمرن. فێڵبازی میتۆلۆژی یاخود بڵێین لێهاتوویيەکەی، گرنگی بەوەداوە کە ئەو چینەی بەدەوڵەتبووە وەکو مرۆڤ لەقەڵەمی نەدات. شیمانە دەکەم پێویستی ژیانی بەردەوامی حاکمەکانی دەوڵەت وەکو دەزگایەك، رۆڵێکی دیاریکراوی بینیوە لەدەرکەوتنی تایبەتمەندێتی "نەمرەکان". پەیوەندی نێوان چەمکی "نەمری" بیری خوداوەندو بەردەوامی دەزگای دەوڵەت زۆر ئاشکرایە. بەر لەدەوڵەتبوون بیر لەمردنی خوداوەندەکان دەکرایەوە. لەخوداوەندەکانی قۆناخی نئۆلیتیك و ئەو گوزارشتانەی نوێنەرایەتی دەکەن، هەموو ساڵێك رۆژی تایبەت بەمردن و لەدایکبوونی خوداوەند هەیە. لەرێگای گووتەو عیبادەتە بەربڵاوەکان مەراسیمەکانی پیرۆزبایی و پرسەدانان رێکدەخرا. ئەوکاتەی کەگووترا دەزگای دەوڵەت هەمیشەییەو کەسەکانیش کاتین، لەئەنجامدا هەمیشەییبوونی دەوڵەت سەرکەوت، ئەوکاتە خوداوەندەکانیش بەنەمر دانران. لێرەدا رۆڵی دیاریکردنی جیاکاری خانەدانەکان و بنەچەی پادشا ــ خوداوەندەکان گرنگ و بایەخدارە. نەمری و بینینی لەدەرەوەی مرۆڤەکان جیاوازی و مەزنایەتییەکی نائاسایی بەدیدێنێت. کاتێك خاوەنەکانی دەوڵەت بەمشێوەیە چین (طبقة)یان کرد بە خوداوەندو کردیان بەبنەچەیەکی نەمر، ئەوەی کەوتەسەر مرۆڤەکان ــ تەواوی مرۆڤەکانی کۆمەڵگا ـ بەندایەتی بوو بۆ ئەم خوداوەندە.

ئەم بەندایەتییە لەوجۆرە وابەستەییەی کۆیلایەتی جیاوازترە کەدواتر لەگریك و رۆمادا بینرا. وەکو جیاوازی نێوان وابەستەبوون بەخوداوەندو وابەستەبوون بەخاوەنەکەی. لەپەیوەستبوونی خودایی یەکبوونێکی بەهێزی نێوان باوەڕ و عیبادەت لەئارادایە. لەنەریتی راهیبیشدا پەیوەستبوون بەدەوڵەت واتە بەپادشای خوداوەند، بەزانابوونێکی وەها کاری لەسەرکراوە، سوپای کۆیلە ــ بەندەکان کراوە بەمێروولە، بۆبارهەڵگرتن هێندە بچووککراوەتەوە، کراوە بەخزمەتکار. لەمیتۆلۆژیای سۆمەریەکاندا وەها نیشاندەدرێت کە مرۆڤ لەپیسایی خوداوەندەکان دروستکراوە، یانیش وەکو هەنگاوێکی پێشکەوتوتر دەڵێن لەخۆڵ (قوڕ) خوڵقێنراوە. خوڵقاندنی مرۆڤ بەشێوازی سووکایەتیپێکردنی لەلایەن خوداوەندەکان باریك و روونتر بووەو تارۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە. ژن تائەو ڕادەیە لەبیرکراوە کە لەخوداوەند دروست ناکرێت. ئەو بەشەی بەودراوە، دروستکردنێتی لەئێسکی پەراسووی پیاوەوە. ئەم باسانە سەبارەت بەوە گرنگە چونکە سیستەمی مەزنی یەکەمین ئایدیۆلۆژیای لەدایکبوونی چینی دەوڵەت نیشاندەدات. پارچەکردنی مرۆڤایەتی هێندە کاری لەسەرکراوە، زۆربەی زۆری کۆمەڵگا بەدرێژایی نەوەکان هەرتەنیا خوداوەندیبوونی چینی دەوڵەتی پەسندنەکردووە، بەڵکو عیبادەت دەکات و ئەنجامدانی قورسترین کار وەکو فەرمانی خودایی دەبینێ، قووڵایی ئایدیۆلۆژی بەو ئەندازەیە پێشدەکەوێت. تایبەتمەندێتییەکی دەزگاگەرایی کە لەراستیدا بنەماکەی زۆرداری و درۆیە، دەکرێت بەشتێکی هەرە شکۆمەندی میتافیزیك و داتاشراو کەدەپەرسترێ و لەپێناویدا هەموو هەوڵ و کۆششێك دەدرێت.

ئەو تایبەتمەندێتییە سەرەکییانەی شارستانییەت کە لەرۆژهەڵاتی ناوین سەرچاوەی گرتووە، شەپۆڵ بەشەپۆڵ لەتەواوی جیهان بڵاودەبێتەوە. بەتایبەتیش تایبەتمەندێتییەکانی نئۆلیتیك سەرکوتدەکات کەکولتوورێکی بەهادارو دەوڵەمەندی ناوچەکەیە، میتۆلۆژیایەك دەخوڵقێنرێ کەدەبێتە زەمین بۆ دواکەوتووترین هزرو باوەڕی و ئەویش بەهەمان رێچکە سەرەتا لەنێو کۆمەڵگاکانی ناوچەکە دواتریش لەنێو بەشی هەرەزۆری کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان بڵاودەبێتەوە. ئەمەش کاریگەرییەکەی هێندە بەهێزە تەنانەت دوا نوێنەرە گەورەکەی فەلسەفەی ئایدیالیزم (هیگل) وەها لێدەکات بڵێ "دەوڵەت شێوەی بەرجەرستەبووی خودایە". تائێستاش گووتەکانی جاویدانی، شکۆمەندی و پیرۆزی کەسەبارەت بەدەوڵەت دەکرێت سەرچاوەی خۆی لەم سیستەمە کۆنەی بەندایەتی وەردەگرێت.

کاتێك لەئایدیۆلۆژیای دەوڵەت کە سەرچاوەکەی میتۆلۆژیایە، بەرەو چەمکی دەوڵەت هەنگاو دەهاوێشترێ کەسەرچاوەکەی ئایدیۆلۆژیای ئایینی تاکخودایيە گۆڕانکارییەکی بایەخدار جێگای باسە. ناکۆکی سەرەکی سەمبۆلی ئایینی مەسیحی لەگەڵ

ئیمپراتۆریەتی رۆما، ئەوەیە کەدەڵێ " ئیمپراتۆر نابێ بەخوداوەند"و حەزرەتی عیسای فریادڕەسیش وەك کوڕی خودا پەسنددەکات. لەگەوهەری خۆیدا ئەم گووتە بۆ هەموو ئایینە تاکخوداییەکان لەجێگای خۆیدایە. هۆکاری هەبوونی بێخەمبەرایەتی قەبوڵنەکردن و رەتکردنەوەی پادشا خوداوەندەکان و پەسەندکردنی پێخەمبەرەکان وەك نێردراوی خودا دابڕانێکی ریشەیی لەئایدیۆلۆژیای پادشا ـ خوداوەند دێتەئاراوە. کاتێك ئەو تێڕوانینە خوداییە بۆجیهان بێنینە بەرچاوان کە لەچاخەکانی یەکەمین و ناوین بەسەر زهنییەتی کۆمەڵگادا زاڵبوو، دەبینین کەشۆڕشێکی زهنی کۆمەڵایەتی ئەنجامدەدرێت بەشێوەیەکی بەرجەستە ئەم دیاردە بەواتای راکردنە لەکولتووری فیرعەون و نەمروود، هەربۆیە راکردنە لەدەوڵەتەکەیان. بەواتایەکی دیکە کۆچبەرییە. لەسەرووی هەموویانەوە حەزرەتی ئیبراهیم، موسا، عیسا و حەزرەتی محەمەد، لەپراکتیکی بێخەمبەرەکاندا هەمان مەیل و چالاکی دەبینین. ئەو چالاکییانەی بەئەندازەی لایەنە کۆمەڵایەتییەکەی لایەنە سیاسییەکەشیان روون و ئاشکرایە، دەبێ وەکو شۆڕشی جددی سەردەمی خۆیان ببینرێن. دروشمی سەرەکییان بەشێوەی مرۆڤەکان نابن بەخوداوەند، تەنیا دەتوانن ببنە نێردراوی خودا. ئەگەر بەشێوەیەکی بەرجەستە و روونتر ئاماژەی پێبکەین، نەرمکردنەوەی پادشای ــ خوداوەند، بەلانی کەم رێککەوتن لەگەڵ بەشێکی کۆمەڵگای بەسەردا دەسەپێنێ. دەخوازرێ سنوورێك بۆئەو پادشا ـ خوداوەندانە دابنرێ کە دەستڕۆن و چی بخوازن ئەنجامی دەدەن.

دەسپۆتێك کەپێداگری لەسەر پادشا ـ خوداوەندێتی خۆی بکات، نەك تەنیا رێککەوتن ئەنجام نادات, بەڵکو ناخوازێ دەنگی بەندەکانیشی ببیستێ. چیرۆکی حەزرەتی ئەیوب لەم بوارەدا زۆر سەیرەو پەندێکی مەزنە. ئەوانەی شرۆڤەی قووڵ سەبارەت بەبابەتی حەزرەتی ئەیوب دەکەن کە لەپەرتووکی پیرۆزدا هاتووە، یاخود ئەگەر بمانەوێ شرۆڤەی بکەین، ئەوا پێویستە ئەنجامدانی ئەم دەستنیشانکردنە وەکو گوزارشتی گەوهەری مەسەلەکە دەرکی پێبکرێت؛ هەروەکو دەزانرێ حەزرەتی ئەیوب هەموو شتێکی خۆی لەدەستداوە، لەنێو ئازارێکی مەزندایە، کرم کەوتۆتە نێو برینەکانی و لەلایەك لە" زیندان" کەوتووەو هێدی هێدی گۆشتەکەی دەخورێت. پادشای ـ خوداوەند (واتە نەمروودی شای ئورفا) هیچ واتا بەوەنادات کەبەندەکانیش ئێش و ئازاریان پێدەگات. لای پادشا ـ خوداوەندەکان بەندە بێدەنگە، هەست بەئێش و ئازار ناکات، ئەرکی تەنیا خزمەتکردنی پادشایە. تەنانەت هەستکردن بەئێش و ئازاریش تاوانە. لەرەوشێکی وەهادا گەورەترین چالاکی حەزرەتی ئەیوب ئەوەیە کەوەها لەپادشای ـ خوداوەند (واتەدەوڵەت) بکات و بزانێ کەبەندەش هەست بەئێش و ئازار دەکات. واتە بۆیەکەمین جار پاشا ـ خوداوەند تێدەگات کەبەندە هەست بەئێش دەکات. مەسەلەی ئەم"دەرکپێکردنە" شۆڕشێکە. لەراستیدا لەکەسێتی حەزرەتی ئەیوبدا ئەوە دەکرێت بەسەمبۆل کەگەل لەنێو هەژاری و ئێش و ئازاردا دەژی.

کاتێك گۆڕی پادشا ـ خوداوەندەکانی سۆمەرو میسر هەڵدەدرێتەوە دەبینرێ کەپاشماوەی هەزاران مردووی لەدەورووبەرە، زۆربەشیان ژنن. وەکو دیاردەبێ کاتێك پادشا مردووە، داروودەستەکانی بەزیندوویی لەگەڵیدا خراونەتە گۆڕەوە. بەگوێری چەمکی پادشایەتی ئەوکاتە، داروودەستەکانی گیانێکی لەهی پادشا جیاوازتریان نییە. چۆن دەستوپێ لەگەڵ پادشا مردوون، ئەوا داروودەستەکانیش هاوشێوەی دەستوپێ بەمردوو دادەنرێن. بەشێوەکی گشتی لەرژێمە شمولی و تۆتالیتاریەکانی هاوشێوەیان پادشای هەرەسەروو لەگەڵ هاوڵاتییەکانیان وەکو گۆشت و نینۆك ـ راستتر وەکو مووەکانی لەش ـ لەجەستەدا وەك یەك لەقەڵەمدەدرێت. ژیانێکی جیاوازیان بۆ پەسندناکرێت. هەرچەندە ئەم رێسایە نەرمیش بووبێت، ئەوەی تەواوی دەوڵەتەکان لەهاوڵاتییەکانیان چاوەڕواندەکەن "ئێسای زێڕین"ە. چەمکی خودا ـ پادشایەتی ـ بەندە بەبێ ئەوەی لەگەوهەردا بگۆڕێ تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە. بەڵام لەشارستانییەتی رۆژئاوادا گۆڕانکارییەکی سنووورداری بەسەرداهاتووە.

شۆڕشی حەزرەتی ئەیوب گوزارشت لەقۆناخی ئەوسەرهەڵدانە لاوازەی خەڵك دەکات کە بۆیەکەمین جار مرۆڤەکان ئێش و ناڕەزایی خۆیان دەدرکێنن. پیرۆزییەکەشی لێرەوە سەرچاوە دەگرێت، بۆیە نابێ بچووك بکرێتەوە. لەوانەیە یەکەم شۆڕش

بێت لەمێژوودا کەمرۆڤ بەرامبەر بەدەوڵەت ناڕەزایی خۆی دەربڕێ. هەرچەندە نەزانین کە تا چ رادەیەك دەوڵەت نەرمبووە، کولتووری پێخەمبەرایەتی کە هەرەس ئاسا مەزن دەبێ، لەساڵانی 1000 ی پ.ز لەکەسایەتی حەزرەتی داودو سلێمان یەکەم دەوڵەتی خۆیان دادەمەزرێنن. دامەزراندنی دەوڵەت لای داودی پێخەمبەر زۆرسەیرە. شتێکی چەندە غەریبە، کاتێك داود دەوڵەتی دامەزراند رۆڵی هاوشێوەی رۆڵی فەلەستینییەکانی رۆژگاری ئەمڕۆبوو. بەرامبەر میرنشینە خۆجێییەکان شەڕدەکات و میرنشینی خۆی دادەمەزرێنێ. لەقۆناخێکدا کەزۆر لەرۆژگاری ئەمڕۆمان دەچێ، ئیتر خوداو پادشا لێك جیابوونەتەوە. هەبوونی لەیەکترجیاوازن. هەرچەندە پادشا بەسێبەری خودا بەناوبکرێت، لەراستیدا خودا داتاشراوی ئەو پادشایەتییە نوێیەیە کە هەڵدەکشێ، گوزارشتە زاراوەییەکەیەتی.

پێویستە زۆر بەباشی دەرك بە" ظل الله" سێبەری خودای ئایینە تاکخوداییەکان بکرێ. ئەو گۆڕانکارییە گرنگە کە لەهێزی دەوڵەت روویداوە، بەڵام دەبێ ئەوە ببینرێ کە گەوهەرەکە نەگۆڕاوە. ئەو پادشایەتییەی کە بۆ ئاسمان بەرزکراوەتەوە، لەوانەیە فەرمانی مەترسیدار ببارێنێ. وەك کارەکتەرێکی نادیار، کەبەتەواوەتی لەبەرچاوی بەندەکان ونبووە، دەتوانێ بەشێوەیەکی فێڵبازانە داخوازییەکانی خۆی بەدیبێنێت. سوڵتانەکان کەسێبەری خودان، دەڵێن "تەنیا بەرامبەرخودا بەرپرسیارین" و بەمجۆرەش بەرپرسیارێتییەکەی کەمتر دەبێتەوە. مەسەلەیەك کەپێویستە ئاگاداری بین زیادبوونی ئەو پەیوەندییەیە کەلەنێوان هەڵکشانی خوداوەند بۆئاسمان و بەدەزگابوونی داتاشراوی دەوڵەتدا هەیە. چەندە دەوڵەت دەبێتە دەزگایەکی داتاشراو ــ بەجودا و سەربەخۆ لەخەڵك ــ چەمکی خوداوەند کەرەنگدانەوە ئایدیۆلۆژیەکەیەتی زیاتر بەرەو داتاشراوی (مجرد) دەچێت.

ئەو چەمکەی لەگەڵ حەزرەتی ئیبراهیم و موسا بوو بەشتێکی باو، لای حەزرەتی محەمەدیش لەقورئان ئەگەری تیۆری هەرەزاڵە. بەشداری هەرە مەزنی حەزرەتی محەمەد بۆ "بیرۆکە"ی خوداوەند، پڕچەککردنێتی بە" 99 "تایبەتمەندێتی وەکو تاقانەیی، نەبینراوی، هەمووشوێنێك دەبێنی، کەس پێی ناگات، هەم بەخشندە، هەم سزادەرە، هەرگیز هاوبەشی (شريك) پەسند ناکات. ئەوەی لێرەشدا رووبەڕوومان دەبێتەوە، قووڵایی داتاشراوبوونی دەزگای دەوڵەتە. چەندە بەدەزگابوون پێشدەکەوێت، بەرامبەر ئەمەش هێندە داتاشراوی خوداییبوون لەئارادایە. هەرچەندە پێخەمبەرەکانی بەرلەحەزرەتی محەمەدو حەزرەتی عیسا زیاتر لەنێو هەلومەرجی کۆمەڵگای کۆیلەداری رکابەرایەتییان بەڕێوەبردووە بەشێوەیەکی سنووردار سیستەمی سیاسی خۆیان ئاواکردبێت ــ بەشێوەی بەڕێوەبەرایەتی تیرەو دەوڵەتۆکەی کورتخایەن ــ لەراستیدا هەردوو پێخەمبەری دوایی زەمینەیان بۆدەرکەتنی دەوڵەتی دەرەبەگایەتی ئامادەکردووە. راستتر هەرچەندە تێکۆشانە مەزنەکانیان تەواو بەگوێرەی ئامانجەکانیان گونجاویش نەبێت، وەکو تەبایی و رێککەوتنێکی فراوانتر لەبناخەی دەزگای دەوڵەتی دەرەبەگایەتی بەجێکراوە. ئایینە تاکخوداییەکان، لەگەڵ راستینەی چینی ناوینی بەرفراوان گونجاوە. لەکاتێکدا ئایینەکانی پادشا خوداوەندەکان هاوکاتی قۆناخی لەدایکبوونی دەوڵەتی باوکسالاری و کۆیلەدارییین، بەڵام لەهەلومەرجی نیئۆلیتیك کە لەشێوەی تیرەیە، هەروەها لەهەلومەرجی هەبوونی چینەکانی ژێرەوە، خوداوەندی تاکەکەس و فرەخودایی لەئارادایە.

کاتێك ئەوە لەمێشکی خۆمان دەرنەخەین کەخوداییبوون گوزارشتی داتاشراوی کۆمەڵکاری ئیرادەو ناسنامەی ئەو کۆمەڵگایەیە کەپێشکەوتووە، ئەوکاتە زۆر باشتر دەتوانین دەرك بەو پەیوەندییە بکەین کە لەنێوان ئیلاهیات و کۆمەڵگاو سیاسەت لەئارادایە. لەکاتێکدا دەوڵەتی رۆژهەڵاتی ناوینی چاخەکانی ناوین چینی ناوینیش لەخۆوەگرت، بەڵام دیسان گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ لەکارەکتەری دەسپۆتیزمدا نابینرێت. ئەدرەسی تازەی پادشا سوڵتانە، ئەویش نوێنەری دەسەڵاتە، تاکەکەس نوێنەری دەسەڵاتە. جگە لەخودا ئیرادەیەك نییە سوڵتان ببەستێتەوە. چینی ئیماندار (زانا) کەفەرمانی خودا شرۆڤە دەکات جۆرێکی بەندەکانی بەردەرگایە. ئەوان لەئیرادەی سوڵتان بەولاوە نوێنەرایەتی هیچ شتێکی دیکە ناکەن.

کۆمەڵگای(چینی) سەرەوەی دەوڵەت بەشێوەیەکی زاڵ خۆی وەکو چەمك و ئەخلاق بەسەرکۆمەڵگادا سەپاندووە. دەوڵەت کەبەشێوەیەکی بەهێز لەشار درێژە بەهەبوونی خۆی دەدات، ئیتر لەناوچە لادێییەکانیش بڵاودەبێتەوە, هەم لەئیسلامییەت، هەم لەمەسیحییەت،دەوڵەتی چاخەکانی ناوین لەبەهێزترین قۆناخەکانی خۆیدا دەژی. لەئیمپراتۆریەتی ساسانی و بێزەنتی کەدواترین شێوەی خراپبوونی کۆیلەداری چاخەکانی یەکەمینە، لەسەدەکانی شەشەم وحەوتەمی زایینیدا قۆناخی پەڕینەوە بەرەو دەرەبەگایەتی لەئارادایە. لەوانەیە دەوڵەتی ئیسلام لەسەرووی ئەو دەوڵەتانەوە بێت کەبەشێوەیەکی توندو رادیکاڵ بەرەو دەرەبەگایەتی (فیودالیزم) هەنگاوی هاوێشتبێ. دەتوانرێ وەکو قۆناخێکی نوێی کولتووری رۆژهەلاتی ناوینیش هەڵسەنگێنرێ. دەوڵەتی عەرەبی ــ ئیسلامی کە لەسەردەمی ئەمەوی، عەباسی و سەلجوقییەکان بەشێوەیەکی بەهێز نوێنەرایەتی دەکرا، بەهۆی هێرشی مەغۆلەکان لەرۆژهەلات، کرستیانەکان (دیانەکان) لەرۆژئاوا، تارادەیەکی مەزن هێزی خۆی لەدەستدا. لەگەڵ پەرتەوازەبوونی خانەدانی ئەیوبییەکان لەسالانی 1250 کەوتۆتە نێو قونـاخی راوەستانەوە. بینینی عوسمانییەکان وەکو دەوڵەتێکی نیو ـ بێزەنتی، نیو ــ ئیسلامی واقیعیترە. تایبەتمەندێتییە فیوداڵییەکانی هەردوو دەوڵەت لەعوسمانییەکاندا کراوەبەیەك. هەردوو دەوڵەت کە وشکترین و توندترین شێوەی دەسرۆییان پەیڕەودەکرد، لەگەڵ ئەوەی هەوڵێکی زۆریاندا بۆئەوەی داڕووخانی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی بوەستێنن، بەلام عوسمانییەکان کەهێزێکی نوێبوون لەرێگای سازشکاری و رێککەوتنی بەرفراوان، تەمەنی خۆیان زۆر درێژکرد و بوون بەدواترین دەوڵەتی رۆژهەلاتی ناوین.

دەوڵەتی دەرەبەگایەتی کە لەچین، هیندستان و ئەوروپا بەهەمان قۆناخ تێپەڕیوە، لەدیموکراسی نامۆیە. دروشمی ئەو قۆناخەی گەلان گەورەترین بەختەوەری لەم جیهانەدا، ژیانێکی دوور لەدەوڵەتە. سەرباری هەموو هەوڵەکانی ئایین بۆ سازشکاری, بەلام نامۆیی نێوان دەوڵەت ـ کۆمەڵگا هەر بەردەوام بووە. ئەتنیك و مەزهەبە لادەرەکان ــ بەرامبەر سیستەم ــ لەمیانەی زۆری و زەحمەتییەکی زۆرەوە توانیویانە لەشاخ، چۆلایی، مانستەر (دێر) و تەکیەکان درێژە بەهەبوونی خۆیان بدەن, کەوەکو دواترین پەناگەی هەلۆوستەی دیموکراتی و کۆمەڵکارییان دەبینی. یاخیبوون بەرامبەر بەدەوڵەت زیاتر تایبەت بەم کۆمەڵگایانە بووە، بەرخودانڤانی وەکو شێوازێکی ژیان جێگیربووە.

کاتێك لەناو شارستانییەتی رۆژهەلاتی ناویندا هەوڵدەدەین دەوڵەت پێناسەبکەین، ئامانجمان روونکردنەوەی ئەمڕۆیە. سەرباری ئەوەی دامەزراندنی دەوڵەت لەشارستانییەتی رۆژئاوا بەریشە گرێدراوی رۆژهەلاتی ناوینە, بەلام لەگەڵ تێپەڕبوونی قۆناخە جیاوازەکان خۆی جوداکردۆتەوە. ئەم جیابوونەوەیەی بەدەوڵەتی قۆناخەکانی ئەسیناو ئاسپارتە دەستیپێکرد، لەرێگای هێلینیزمەوە بۆ رۆما گواستراوەتەوە. بانگەشەی پادشای ــ خوداوەند بەشێوەیەکی زۆر لاواز بەردەوامبووە. لەگەڵ پەسەندکردنی ئایینی مەسیحی لەلایەن قوستەنتینەوە جیابوونەوەکە تەواوبووە. بانگەشەی دەوڵەتی خوداوەند کەهەزاران ساڵ بەردەوامبوو، بەردەوامی چیرۆکێکی کۆنی بەناوبانگی رۆژهەلاتی ناوینە. بەگوێرەی فۆرمەکەی رۆژهەلاتی ناوین، دونیاییترە. پیرۆزی دەوڵەت قووڵتر نەکراوەتەوە. کاتێك ئیمپراتۆرییەتی رۆما لەئەنجامی گورزە تووندەکانی هێزی قەومە رکابەرەکانی دەوڵەت رووخا، ئەوا ئەوڕێزەی کەهەیبوو ئەویشی لەدەستدا. هۆزە جەرمەنەکان (ئەڵمانەکان) کەکەمتر دەوڵەتیان ناسیبوو، رۆڵێکی گرنگیان بینیوە لەئاشکراکردنی رووی دونیایی دەوڵەت. هەرچەندە چاخی ناوین خواستوویانە لەژێر ناوی ئیمپراتۆریەتی رۆما ـ جەرمەنی پیرۆز درێژە بەو دەوڵەتە بدەن کە لەئیمپراتۆریەتی رۆما بۆیان مایەوە، بەلام دەوڵەتشارو میرنشینەکان تاڕادەیەکی باش لەدەمامکی خودایی پاککرابوونەوە. چەندە دەرککردن بەگەوهەری دەوڵەت هەنگاوی بۆنراوە ئەو پێکهاتە سیاسییانەی گەل و نەتەوەکان کەوتۆتەگەڕ کەگەوهەری نەتەوەیی و دیموکراتی لەخۆوەدەگرن. شۆڕشەکانی ئینگلیز، ئەمریکا و فەڕەنسا لەزاڵکردنی گەوهەری عەلمانی دەوڵەتدا زیاتر بەرەوپێشچوون. ئیتر سنووردارکردن لەرێگای دەستوورەوە دەوڵەتی دەسترۆی لەمێژوودا ژێرخاك کرد. لەرۆژهەلاتی ناوینیش هەروەکو چۆن چەندین گۆڕانکاری لەنەرێتی

دەوڵەت هاتۆتەئاراوە، بەڵام زیاتر کەوتۆتە نێو قۆناخی موحافەزەکاری و دواکەوتنەوە. ئەوەی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی ئەنجامیانداوە، بەرامبەر دەوڵەتە هەڵکشاوەکانی رۆژئاوا دواپاراستنی خۆیان کردووە, تاوەکو بۆماوەیەکی دیکەش درێژە بەهەبوونی خۆیان بدەن. کاتێك دەوڵەتی رۆژهەڵاتی ناوین پەرتەوازە دەبێ، هێشتا داگیرکاری دەوڵەتی رۆژئاوا لەجێگیربوون دوورە. سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم بۆ رۆژهەڵاتی ناوین بەواتای قۆناخی قەیران دێت. پێکهاتە سیاسییەکانی ئەم سەدانە کەوەکو نیو داگیرکاری و داگیرکاری نوێ هەڵدەسەنگێرێت، هەندێ لایەنی جیاوازی لەگەڵ شوێنەکانی دیکەی جیهان هەیە. پێناسەیەکی کورتی مێژوویی ئەم جیاوازیانە ئاشکرا دەکات. بەتایبەتیش تادواڕادە بەرخودانی پەیوەندی نێوان کۆمەڵگاو دەوڵەت بەرامبەر بەگۆڕانکاری، دەرفەتی ئەوە نادات بۆماوەیەکی کورت لەقەیران رزگاری ببێت. نە ئەو هەلومەرجانە لەئارادایە کە بەخێرایی فۆرمەکانی دەوڵەتی سەرمایەداری هەرس بکات، نە بەخێراییش پەرتەوازەبوونی دابونەریتی خۆی جێگای باسە. نەریتی کۆمەڵگاش دینامیکی خولقکارانەی وەها لەخۆوە ناگرێت کە بتوانێ وەڵامی هەردوو جۆر پێشکەوتن بداتەوە. هەروەکو بڵێی هێزی نەریت هەر لەقۆناخی نئۆلیتیکەوە لەبنکەی کۆمەڵگادا چەقیوە و زوو نایێتەوە سەرەخۆ. هەوڵەکانی چینی سەرووش کە بەکرێگیراوێتی تێپەڕ نەکردووە زۆر لەوە دوورە کەبتوانرێ بکرێتە مولکی کۆمەڵگا و چارەسەری بکات. بۆئەوەی بکەونە سەر رێچەکەی پێشکەوتنی شێوازی رۆژئاوا، ناتوانرێ بەجۆری ئەمریکا یاخود لەجۆری ژاپۆنی پاسیفیك ئەنجام بدرێت.

لێرەدا تەنیا قالبە ئیسلامییەکان کۆسپ نیین. تەواوی بەهاکانی شارستانییەت بەرخودان دەکات. لەبەهاکانی کۆمەڵگای نئۆلیتیك تابەهاکانی کۆیلەداری سۆمەر و میسر، لەبەها ئیسلامییەکان تادەگاتە بەها ئەتنیکییە زۆر دەوڵەمەندەکان، تەقلیهەقی و ئاڵۆزیەك زاڵ و بەردەوامە. شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین بۆ ئەنجامدانی وەرچەرخان وەها بەسانایی موتوربەی بیانی پەسندناکات؛ تاڕادەیەکیش وەك ئەو پیرەدارەیە کە توانای پەسەندکردنی موتوربەی نییە؛ بۆ هەنگاوێکی نوێ یان ئەوەتا بەتەواوەتی دارەکۆنەکە دەخەیت، یاخود جۆرێکی موتوربە دەدۆزیتەوە. هەردووکیشیان نابێت. لەساڵانی 1900 رێکخراوەکانی تورکیای گەنج و تورکیای کەمالیست خواستیان یەکەم تاقیکردنەوەی موتوربە ئەنجامبدەن. هەروەکو چۆن ئەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو سەرینەگرت, ئەوا رەوشی موتوربەی رۆژئاواش, کە لەکەتیرەی میللیگەرایی نقومکراوە, سەرباری ئەوەی هەشتا ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە, بەڵام دوورە لەوەی سەریگرتبێت. کاتێك رژێمەکانی شای ئێران و ئەفغانستان خواستیان شێوەیەکی هاوچەرخ قایم بکەن, بەخێرایی لەرووخان رزگاریان نەبوو. هەرچی میللیگەرایی عەرەبە لەپەلەقاژەی مەرگ دایە. ئەو رەوشەی لەئێراق تێیدایە نیشاندەدات و دەسەلێنێ کەهەڵگرتنەوەی لاشەکەشی چەندە سەختە. میللیگەرایی ئیسرائیلی زایۆنیزمیش لەرەوشێکی هاوشێوە دایە، کێشەی فەلەستین ـ ئیسرائیلی کردووە بەهۆڤێتییەك. هەرچی سەرلەنوێ لەئامێزگرتنەوەی ئیسلام و رادیکالیزمە، وەك ئەنجامێکی بێ ئومێدی بەرامبەر گەورەترین هەڵمەتی جیهانگیری سەرمایەداری لە مەیلی خۆکوژی و پەلەقاژەی مەرگ زیاتر هیچ واتایەکی دیکەی نییە. دەرخستنی هێزێکی جیاواز یاخود پێشخستنی چارەسەری جێگای باس نییە.

تەنانەت پووختەیەکی مێژوویی بیرۆکە سەرەکییەکان نیشاندەدات کەدیاردەی دەوڵەت لەژێر کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناویندا شاراوەیە و بنەماکانی پێکدێنێ. شارستانییەتی رۆژئاوا تێکۆشانێکی مەزنیکرد تاوەکو لوغزی ئەو دەوڵەتە چارەسەر بکات کە ریشەکەی لەدەوڵەتی رۆژهەڵاتی ناویندایە. لەلایەکەوە رێنیسانس دەمامکە ئایدیۆلۆژیەکەی سەر دەوڵەتی هەڵدایەوە. لەلایەکی دیکەشەوە لەمیانەی شۆڕشی زهنییەوە لەمپەرە میتۆلۆژی و ئاینییەکانی پارچەپارچە کرد. وەهای کرد راستی بەرووني دەربکەوێت. ریفۆرمیش ئایدیۆلۆژیای دەوڵەتی ـ خودا و دەستلێنەدراو (حصانة)ی بیرۆکراسی و یەکێتییەکەی پارچەکرد, کەلەلایەن کلێساوە دەپارێزران. کاریگەری ترسی لەسەر کۆمەڵگا بەلاوەنا. رێگای لەپێش ئەوە کردەوە هەرکەس

بتوانێ شێوازی باوەڕی خۆی پێناسە بكات. لەرۆژهەلاتی ناوینیش بەپێچەوانەوە چەمكی موعتەزیلە و هاوشێوەكانی بەلاوەنران. رووخانی حاكمییەتی ئایینی ئازادی هزرو باوەڕی خێراكرد. قۆناخی رۆشنگەری رەهەندی پێشكەوتنەكانی فراوانتركردو بۆ ناو جەماوەری گواستەوە. لەكاتێكدا بەشێوەیەكی بابەتی هەرسێ مەیل لەمپەرەكانی دەستلێنەدراو (حصانة)ەكانی چواردەوری دەولەتی پارچەكرد، رێگای لەپێش هێزی دیموكراسی كومەلگا كردەوە. شۆڕشەكانی ئینگلیز، ئەمریكا و فەرەنسا دەولەتی كلاسیكیان پارچەكرد، لەبواری ئایدیۆلۆژی و بیروكراسی رێگای لەپێش نوێبوونەوە كردەوە. لەرێگای دەستوورو مافەكانی مرۆڤ سنوورەكانی تەسككردەوەو ئینسیاتیفی هێزە كۆمەلایەتییەكانی خێراكرد. بەمجۆرە پێشكەوتنە مەزنەكانی شارستانییەتی سەدەكانی نۆزدەهەم و بیستەم هاتەئاراوە.

هەرچی لەرۆژهەلاتی ناوینە لەم سەردەمەدا گۆڕانكاریەكان بەپێچەوانە بەڕێوەچوون. ئەو هێزانەی هەر لەسەرەتاوە پێویست بوونی دەولەتیان بۆ بەرژەوەندی و ئاسایشی گشتی كۆمەلگا بەخراپی بەكارهێناو وەك دەمامكی دەسەلاتێكی ــ شەڕكەری زەوتكار خۆیان رێكخست، لەرێگای هەولێكی مەترسیدارەوە بەتەواوەتی خۆیان زالكرد. دەولەت كە بەتەواوی بوو بەدەسپۆت, وەكو گەنە بەپشتی كۆمەلگاوە نووسا. قۆناخەكانی دوای سەدەی پازدەهەم چیرۆكی تراژیدیای ئەم سەردەمەیە. لەكاتێكدا رۆژئاوا لەمەگناكارتا بەرەو دەستووری هاوچەرخ هەلدەكشا، سەرجەم دەسترۆیی رۆژهەلات و رۆژهەلاتی ناوین جۆرە جیاوازەكانی دەسپۆتیزمیان پێشدەخست. ئەو پەندە گەلەرییەی دەلێ " یاری لای عوسمانییەكان زۆرە " لەم قۆناخەوە ماوەتەوە. گووتەی " گەورەترین بەختەوەری لەم جیهانەدا، ژیانێكی دوور لەدەولەتە" ئەم راستییە نیشاندەدات. كۆمەلگای رۆژهەلاتی ناوین وەك نێچیرێك بەتووندی بەدەستی دەولەت گرێدراوە. تەنانەت بچووكترین هێما (ئیشارەت)ی پەردەركردن ئاوەڕووت كردنی لەگەلْ خۆیدا دێنێ. لەجیاتی سنووردانان بۆ دەولەت. ئەو سنووردراكردنەی بۆ یاساو دەستوور دادەنرێت بەدیناسۆربوونی دەولەت پێشدەخات. دەولەتی رۆژهەلاتی ناوین لەناوخۆ بەرامبەر كۆمەلگا لەدەرەوەش بەرامبەر رۆژئاوا خۆی داخست و موحافەزەكارتربوو، كاتێك لەمیانەی پەردەی میللیگەرایی سەدەی بیستەم خۆی داپۆشی، رێگای لەپێش زیاتر سەختبوونی كێشەكان كردەوە. لەكاتێكدا كەمایەتییەكی بچووك لەمیانەی یارمەتی دەولەت، لەرێگای میللیگەراییەوە هەندێ ریفۆرمی سنوورداری ئەنجامداو هاوچەرخ بوو، بەلام دواكەوتوویی و دەمارگیری ناو كۆمەلگا زهنییەتێكی گەوج و سیس و نەخۆش و دەرەوەی سەردەمی خولقاند. لەكاتێكدا خەرەكیبوون و نەریتی باو هەموو پیرۆزی خۆی لەدەستدەدا، هاوچەرخبوونیش تەنیا لەچواردەوری دەولەت چینێكی سیخوڕی بابەتی پێكهێنا. دەولەتی رۆژهەلاتی ناوین بەتەواوەتی هەلئەوەشایەوە. هەروەكو لەتایبەتمەندێتی و كەسایەتییەكەی چاوەڕواندەكرا وەلامی دەزگای سیخوڕی دایەوە. لەبەرئەوەی رۆژئاوا ئەمەی بەگوێرەی بەژرەوەندییە كورتخایەنەكانی خۆیبینی نەیخواست بیرووخێنێ. ئەگەر لێیان بگەڕابووانایە ئەوا هەردوو پادشایەتی عوسمانی و ئێرانی خۆیان دەرووخاند. بەلام لەرێگای هاوسەنگی تایبەت بەدرێژایی دووسەد سالْ لەسەرپێیان هێشترانەوە. ئەو "سەرمایەداری كۆمپرادۆری" یەی سیستەمی سەرمایەداری بالادەستی رۆژئاوا لەهەرچوار لای جیهان پێشیخست بۆ بناخەی ئابووری ئەم بەسیخوڕبوونە گونجاوو نموونەیی بوو. نەك هەر تەنیا هیچ كێشە و گرفتێكی كۆمەلگا چارەسەرنەكرا، بەلكو نەخوازرا ببینرێ. هەروەكو بلێی نموونەیەكی هاوچەرخی دەولەتی پادشای ــ خوداوەند لەئارادایە. ئەوهێزە تەكنۆلۆژییە سەربازییەی لەرۆژئاوا بەدەستهێنرا بۆ دەولەتی رۆژهەلاتی ناوین وەك فریادرەسی گیان بوو. لەرێگایەوە زۆر بەسانایی دەیتوانی لەبەرامبەر كۆمەلگا خۆی لەسەر پێیان رابگرێت. كاتێك ئەربابەكانیشی پالپشتی بن، ئەوا درێژكردنی تەمەنی دەمامكی دەسەلاتی ــ جەنگاوەری هێندە سەخت نەبوو. چەندە لەمیانەی مەزهەبەكانی وەك سۆسیالیزمی بونیادنراو و سۆسیال دیموكرات و رزگاری نیشتمانی ــ كە ئامرازی یەدەگی سیستەمی سەرمایەداری بوون ــ خۆی ماكیاژ كرد، ئەوا زیاتر تۆكمە و قایم بوو.

ئەو قۆناخەی گوایە وەکو ریفۆرم لەقەڵەمدەدرێت، بەرامبەر بەو ئاڵۆزی (قەیران) گشتییەی سیستەمی سەرمایەداری ــ ئیمپیریالیستی جیهانگیری کە لەساڵانی 1990 لەگەڵ هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو خێرابوو، دانەدانە هەڵوەشایەوە. ئەو ئیمپراتۆریەتە قەیراناوییەی ئەمریکا رێبەرایەتی دەکات ناتوانێ لەگەڵ ئەم پێکهاتانە بەرێوەبچێت. چونکە لەگەڵ لۆژیکی سیستەمەکە ناگونجێ و پێچەوانەیە. لەکاتێکدا سیستەم قازانج و ئارامی بەبنەما دەگرێت، لەرەوشی نوێدا دەوڵەتی رۆژهەڵاتی ناوین کەوتە قۆناخێك هەروەکو بڵێی تی ئێن تی دەخاتە ژێر هەردوو بوارەوە. کەدەڵێین دەوڵەتی رۆژهەڵاتی ناوین واتە بێ متمانەیی و خەرجی لەخۆڕا. دابڕانی لەئاپۆڕای جەماوەری، بێ متمانەیی و خەرجکاری گەیاندۆتە ئاستێك کە بەرگەگرتنی ئاستەمە. بەرامبەر بەداواکاری ئەو گەلەی لەسەرەوە لەگەڵ کەڵەکەبوونی کێشەکانی سەرمایەداری جیهانگیری و، لە ژێرەوە لەگەڵ کەڵەکەبوونی گرفتەکان لەسەردەمی نئۆلیتیکەوە لە زۆرانبازیدایە، زۆر ئاستەمە دەسپۆتیزم بەمشێوە بۆیەکراوییەی بتوانێ وەڵام بداتەوە.

3 ـ کێشەیەکی دیکەی بەلانی کەم هێندەی کێشەی دەوڵەت قورسبووە ئەو هەڵسوکەوت و زهنییەتەی کۆمەڵگایە کە لەدەوروبەری خێزان و ژن شێوەی گرتووە. لەسەرووەدا دەوڵەت, لەخوارەوەش خێزان, وەکو دووالیزمی بەهەشت و دۆزەخ یەکێتییەکی دیالەکتیکی پێکدێنن. لەکاتێکدا دەوڵەت میکرۆمۆدێلی خۆی لەخێزان وەردەگرێت و پێکدێنێت, داواکاریەکانی خێزانیش کە لەگەورەبوون دایە ماکرۆمۆدێلی خۆی وەکو دەوڵەت وێنادەکات. هەرخێزانێك چارەسەری نموونەیی خۆی لەبەدەوڵەتبووندا دەدۆزێتەوە. رەنگدانەوەی دەسپۆتیزمی دەوڵەت لەخێزاندا "سەرۆکی خێزان" پیاوە, کەوەك" دەسپۆتێکی بچووکە" چەندە دەستڕۆییە گەورەکەی دەوڵەت هەوڵبدات لەمیانەی هەڵوێستە بەکاریگەرو دەستڕۆ ئارەزوومەندانەکەی خۆی خەڵك رێکبخات, سەرۆکە بچووکەکەش بەوە خەریك دەبێت هەمان سیستەمی رەهاگەرایی بەسەر چەند ژنێك و منداڵەکاندا پەیرەوبکات.

تاوەکو لەشارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناویندا خێزان وەکو میکرۆمۆدێلی (نموونەی بچووکی) دەوڵەت شینەکرێتەوە, ئەوا ئەنجامدانی شیکردنەوەیەکی تۆکمە بۆ کۆمەڵگا زۆر بەناتەواوی دەهێڵێتەوە. ئەگەر ئەمڕۆ لەکۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناوین کێشەی ژن بەلانی کەم هێندەی کێشەی دەوڵەت قورس بووبێت, ئەوا دیسان مێژووی کۆیلایەتی ژن لەژێرئەمەدا شاراوەیە. کەئەویش بەئەندازەی مێژووی دەوڵەت ئاڵۆزو درێژخایەنە. تاوەکو بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا سێکوچکەی بەرمۆدای ژن ـ خێزان ـ پیاو لەنەخشە نیشاننەدرێت, ئەوا نقوومکردنی هەرکەشتییەکی چارەسەری کۆمەڵگا کە بەتەنیشتی تێپەڕدەبێت زۆرسانایە. سێکوچکەی بەرمۆدا لەئۆقیانووسی کۆمەڵگادا لەرۆژهەڵاتی ناوین خێزانە. کە لەهەمانکاتدا میکرۆمۆدێلی دەوڵەتە. لەکاتێکدا دەسەڵات و دەوڵەت هەڵدەکشێن, مسۆگەر تاوەکو شوێنکەوتەی خۆیان لەدەزگای خێزاندا نیشاننەدەن ناتوانن ئەوەی دەیانەوێ ئەنجامی بدەن. دەسەڵات و دەوڵەتێك کە لەناوخێزاندا رەنگنەداتەوە، ناتوانن شانسی ژیانی خۆیان بەهێزبکەن و بەردەوامی پێبدەن. ئەم دووالیزمە دیالەکتیکیە بەشێوەیەکی تایبەت و هەستیار لەشارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناویندا دەستی بۆدەبردرێت و هیچ کاتێك پشتگوێ ناخرێت.

ژن وەکو چین، بنەچەو رەگەز خراوەتە نێو کۆنترین زنجیرەی دیلێتییەوە، تاوەکو تاوتوێ نەکرێت و بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت نەخرێتە ژێر شیتەڵکردنێکی سۆسیۆلۆژی، ئەوا کەموکورتی مەزن دەبێت لەدەرککردن بەخێزان و پیاو, بەواتایەکی دیکە دەوڵەت و کۆمەڵگا. بەکورتی پێویستە مێژووی کۆیلایەتی ژن بنووسرێتەوە. لەبەرئەوەی لەبەشەکەی پێشووتر هەوڵمدا ئاماژە بەپێناسەی ژن بکەم لێرە دووبارەی ناکەمەوە. بەڵام دیسان لەکاتی هەنگاونان بەرەو بەکۆمەڵگابوون لەبواری بایۆلۆژیدا نیشاندانی ژنان وەك رەگەزێکی ناتەواوو بەکەموکورتی تەواو هەڵوێستێکی ئایدیۆلۆژییە ــ تێڕوانینێکی

زهنیـەتی پیاوسالارییە ــ هەربۆیـە نـابێ پـشتگوێ بخرێـت. بەپێـچەوانەوە هـیچ کاتێـك نـابێ ئـەوە لـەبیربکرێ کـە لـەبواری زانستی سەلمێزاوە ژن وەکو هەبوونێکی کۆمەڵایەتی و بایۆلۆژی تۆکمەترە.

ناوەندی کولتووری دایك ــ ماڵیکردن رۆژهەڵاتی ناوینە. ئەو بەڵگانەی لەدەستدان نیـشاندەدەن کەئـەم کولتـووره لەسـاڵانی 15000 ی پ.ز لەنێو پێشکەوتندا بووە. هەبوونی ئـاژەڵ و دانەوێڵـە لـەبناری نـاوەوەی زنجیرە چیاکانی زاگـرۆس ــ تـۆڕۆس تواناکاریە سەرەکییەکان بۆ ماڵیکردن دەرەخسێنێ. لەباری پێکهاتەی خاك و کەش و هەوا بـۆ رووەك و بـەخێوکردنی ئـاژەڵی بچووکی وەکو مەڕو بزن رۆڵێکی سەرەکی لەمەدا دەبینێ.

پێویستیەکانی ژن لەمنداڵبوون و بەخێوکردن تەنیا لەهەلومەرجی شوێنی جێگیردا بەئاسـانی بەدیـدێت. کاتێـك کەشـێکی گونجاو, هەبوونی ئاژەڵ و رووەك لەگەڵ ئەم پێویستییە دەبـن بەیـەك, هەلومەرجـە بنـچینەییەکانی مـاڵیکردنی دێتـەئاراوە. هونەری کۆکردنەوە, هەبوونی چەندین جۆری رووەك و میوە دەتوانێ پێویستییەکانی خواردن دابین بکات. ماڵیکردنی مـەڕو بزنـــی شـــاخ, دابینکردنـــی پێداویـــستییەکان لـــەرێگای خـــوری, شـــیرو گۆشـــت دەوڵەمەنـــدتردەکات. لـــەرێگای ئـــەزموون و تاقیکردنـەوەکان بینـراوە کەپێگەیانـدنی دانەوێڵـەو دارەبەپیتـەکان لەوشـوێنەی وەکو کێڵگەیـە رێگـا لـەپێش چـەندین جـار زیادبوونی بەرهەم دەکاتەوە. لـەجیاتی ئـەوەی یەکسەر ئـاژەڵ بکوژن, بـەخێوکردنی زۆر گونجاوتربووە بۆئـەوەی لەسـەرماو نەبوونیدا برسی نەمێنێ و سوود لەبەرهەمەکانی شیرو خورییەکەی ببینێ. ژن ــ دایـك لەگـەڵ ئـەو منداڵانـەی لەدەوروبـەری خۆی گەورەی دەکات. بۆ پێشخستنی سیستەمی ماڵیکردن لەهەردوو بواریشدا خاوەنی ئەزموونی بەهێزە. لەوانەیە دەرکـەوتن لەئەشکەوت و پێگەیاندنی بەرهەمی گونجاوو ئاواکردنی مـاڵ لەوشـوێنانەی ئـاژەڵی لێ بـەخێودەکرێت کـارێکی سـادەو سـانایی دیاربێ, بەڵام هەروەکو چوونە سەرمانگ رۆڵێکـی مـەزن لەمێـژوودا دەبینـێ. دروسـتکردنی گونـد لەکوخـە بـچووکەکان هێنـدە زەحمـەت نابێـت. ئـەو مێـژووەی بـۆ سـاڵانی 11000 ی پ.ز درێـژ دەبێتـەوە ئـەمڕۆ لـەزۆر شـوێنەکانی کوردسـتان وەکـو, دیاربەکر, ئەرگانی, چیای ئۆنو: باتمان, چەمێ خەلان: ئورفا, نەڤالاچۆلێ و گۆبەکلی تەپە, برادۆست, ماغ ــ پاشماوەکـانی ئـەم کولتووره دەبینرێ. لەهیچ شوێنێکی جیهان شـوێنگەی کولتـووری نیـشتەجێبوون نـابینرێ, کـە لـەوە کۆنتربێـت. سـەرەکیترین بەڵگەکانی بڵاوبوونەوەی کولتووری دایك ــ ماڵیکردن لەم ناوچانە نیشاندەدات ئـەو پەیکەرانـەن کەهـەموویان لەوێنـەی ژنـن. هەروەها دەتوانرێ مۆرکی ژنان لەپێکهاتەی زمانی ناوچەکان وەك نموونە نیشانبدات. لەرۆژگاری ئەمڕۆشماندا کاتێك هـەمان کولتوور بواری کارامەیی ژنانە ئەوا ئەم راستینەیە پشتڕاست دەکاتەوە.

سەرچاوە سۆمەریەکان ئەوە نیشاندەدەن لەکاتی دامەزراندنی دەوڵەتشاردا بۆیەکەمین جار ئەم کولتـووره بەکاریگـەربووەو بەشـێوەیەکی بـەهێز درێـژەی بەهـەبوونی خۆیـداوە. ئـەو پـەردە میتۆلۆژییـە چـنراوەی لەدەوروبـەری ژنەخوداوەنـد ئینانـا ــ خوداوەندە ژنی ئورگ ــ ئەزموونبەخشە. بەتایبـەتی بـەرخودانی لەبەرامبـەر هەڵکشانی باڵادەستی پیـاو گەوهـەرێکی وەهـای هەیـە کەتۆکمـەترین بزووتنـەوەکانی فێمێنـزمیش پێینەگەیـشتوون. بەرامبەربەخوداوەنـد ئـەنکی بەشـێوەیەکی بـەهێز پارێزگاری لەوەدەکات کەژن خاوەنی کامە شارستانییەتە. بـەزمانێکی شیعرئامێزانە بـاس لـەوەدەکات کـەخۆی خـاوەنی 104 "مـا"کانـە, ئـەنکی بـەفێڵبازی لێیـدزیوە, بۆیـە پێویـستە بیداتـەوە. ئـەم باسـە میتۆلۆژییـە کـەبۆ3000 ی پ.ز دەگەڕێتـەوە, لەراستیدا بەشێوەیەکی بەرچاو رۆڵی ژنـان لـەدوای شارسـتانییەتی سـۆمەری نیـشاندەدات, هـەروەها ئینانا لەرِیشەوە بەکۆنـە ژنەخوداوەندی شاخ "نینهورساك" گرێدەدرێت. لـەبواری ئـەتیمۆلۆژی (زمانناسـی) نـین= ژنەخوداوەنـد, کـور= شـاخ, سـاك = ناوچە, ئەمەش بەواتای ژنە خوداوەندی ناوچەی شاخاوی دێت. بـەگوێرەی ئـەوەی کـە لـەخوارووی میزۆپۆتامیـا بـاس لەشـاخ بکـەیت زنجیرەی زاگـرۆس و بەردەوامییەکـەی بەئەفلاّدادێت, ئـەوا ئەوەروونـدەکاتـەوە کـەکولتووری ژنەخوداوەنـد لەناوچـە شاخاویەکانەوە بۆ خوارەوە گواستراوەتەوە.

لەماوەی نێوان 4000 ــ 2000 ی پ.ز لەناوەنـدی شارسـتانییەتی جیهـان واتـە لای سـۆمەریەکان هێـشتا کولتـووری ژن ــ دایـك بەکاریگـەرە شانبەشـانی پیـاو خـاوەن قورسـاییە. لەتـەواوی بەڵگـە میتۆلۆژیـەکانی پەیوەسـت بـەم قۆنـاخە بەقورسـایی رەنگیداوەتـەوە. پەرسـتگاکانی ژنەخوداوەنـدە بـەربلاون. هێـشتا لەدەوروبـەری ژن کولتـووری عەیبـداری پێـشنەکەوتووە. بەتایبـەتیش کـرداری زایەنـدی وەکـو چالاکییەکی خـودایی باسـدەکرێت. عەیبـداری لـەولاوە بمێنێـت, چیرۆکی ئـەدەبی وەها جێگای باسە تەنانەت لەرۆمانەئەرۆتیکە بژاردەکانیش نابینرێ. هەرچالاکی و هەڵسوکەوتێکی پەیوەندی بەزایەندەوە هەبێت, وەکو بەهادارکردن و جوانی ژیان واتای پێدەدرێت. هێشتا هیچ عەیبداریەك سەبارەت بـەژن لەئارادانییـە کـەدواتر لەمیانـەی شێوازی ژیانی دژەشۆڕشگێری پێشدەخرێت. جەسـتەی ژن بـەردەوام بابـەتی پیاهەڵدانـە. هەرچـەندە مەراسیمی هاوسـەرێتی پیرۆز چەواشەکرابێت ـ بووبێتە چالاکی پیسکردن ـ بەڵام پاشماوەی ئەم قۆناخەیە. داستانی "مـەمی ئـالان", "مـەم وزیـن" و "دەروێـشی عەبـدی" کـە تائێـستا لەکوردسـتاندا باسـدەکرێن چـەندین لایـەنی پەیوەسـت بەپـەیام و بابەتەکـەی شـوێنگەی بـەهێزی ژن نیـشاندەدات. ئامـاژە بـەوەدەکرێ کەیەکـەمین نموونـە رەسـەنەکەی ئـەم داسـتانانە بۆسـالانی 4000 ی پ.ز دەگەڕێتەوە.

لەهۆنینەوەی میتۆلۆژیای "ئینانا" هەم پیاوی ـ شوانکار, هەم پیاوی ـ جووتیار وەکو یارمەتیـدەر نیـشاندەدرێن. دومـوزی شوانکارو ئەنکۆمدی جووتیار بۆنیشاندانی رێزو گرێدانیان بەرامبەر ئینانا لەپێشبڕکێدان. بۆبـوون بەیارمەتیـدەری سـەرەکی هیچ کارێك نامێنێ نەیکەن. هێشتا ئینانا لەرەوشی پێشەنگێکی بەرچاودایە. وەك جووتیارو شوانکار پیاو زۆر لەوەدوورە ببێ بەبالادەست. لەداستانی بـابلی "ئەنومائـەلیش" کەداسـتانێکی دیکـەی بـەناوبانگی سـۆمەریەکانە, دەبیـنین رەوشـی پێـچەوانە بۆتەوە. دووالیزمی خوداوەند ماردۆك کەنوێنەرایەتی پیـاوی خـاوەن هێـزی نائاسـایی دەکات لەگـەڵ تیامـات کەنوێنەرایـەتی ئەودایکـە دەکـات کـەهێزی لەبـەربڕاوە, دووالیزمێکـی ئەزموونبەخـشە. سـەبارەت بەژنەخوداوەنـدو ژن ــ دایـك هەڵمـەتێکی رەشـکردن و کولتـووری عەیبـدارکردن بەڕێوەدەچـێت. بۆئـەوەی ژن وەك بێڕەوشـت, بێـسوود, زیابنـەخش و مەترسـیدار نیشانبدەن هێنـدەی بکـرێ قالبـە میتۆلۆژیـەکان تەنگـەتاودەکرێن. دەبیـنین لەسـالانی 2000 ی پ.ز بـەدواوە ئـەم کولتـوورە بلاودەبێتـەوە. لەسیـستەمی کۆمـەڵگا گۆڕانکاریـەکی مـەزن دژی ژن هاتۆتـەئاراوە. کۆمـەڵگای باوکسالاری لـەو هێزەدایـە بالادەستی خۆی بکاتـە داسـتان. لەکاتێکـدا هەرشـتێکی پەیوەنـدی بـەپیاوەوە هەیـە بەشکۆمەندی و قارەمـانی نیـشاندەدرێن, هەرشتێکی پەیوەندی بەژنەوە هەبێت بچووك دەکرێنەوە, وەك عەیبداری و بێنرخ نیشاندەدرێت.

شکاندنەوەیەکی رەگـەزی وەهـا دێتـەئاراوە کـە لەمێـژوودا رێگـا لـەپێش گـەورەترین گۆڕانکـاری ژیـانی کۆمـەڵگا دەکاتـەوە. دەتوانین ئـەم یەکـەمین گۆڕانکارییـەی لەرۆژهـەلاتی نـاوین پەیوەسـت بـەژن دێتـەئاراوە بـە"یەکـەمین شـکاندنەوەی رەگـەزی مـەزن" ی بەناوبکـەین کەشۆڕشـی چەواشـەیە. دەڵـێین شۆڕشـی چەواشـە (دژەشـۆڕش) هەربۆیـە کاریگـەری ئـەرێنی لەسەرگۆڕانکاری کۆمەڵگا نییە. بەپێچەوانەوە بالادەستی وشك و توندی کۆمەڵگای باوکسالاری هێناو لەمیانـەی لاتـەریککردنی ژنان رێگای لەپێش جیاوازییەکی مەزنی ژیان کردەوە. لەجیاتی کۆمەڵگایەکی دوودەنگی, رێگای لەپێش کۆمەڵگای یەکدەنگی پیاو کردەوە. لەوانەیە ئەم شکاندنەوەی شارستانییەتی رۆژهـەلاتی نـاوین یەکـەم هـەنگاوی سـەراوژێربوون بووبێت. لەگـەڵ تێپەڕبوونی قۆناخە جیاوازەکـان ئەنجامـەکانی تـاریکتر بـووە. هـەنگاو بۆنێـو کولتـووری کۆمـەڵگای پیاوسـالاری بەزێـدەڕۆیی و یەکلایەنـە نـراوە. لەکاتێکـدا ژێـری سـۆزداری و زینـدووی ژن ونبـوو کـە لەقوناخێکـدا سەیروسـەمەرە (عجائـب)ی خوڵقانـدو تادواڕادە مرۆ ڤپەروەرانەبوو؛ لە ژێری وشك ــ ئـەنالیتیك ــ کولتـوورێکی سـتەمکار لـەدایکبوو کەتەسلیمی دۆگماتیزم بـووە, لەسروشت دابـڕاوە, شـەڕ بەگـەورەترین مەردایـەتی لەقەڵەمـدەدات, چـێژ لەرشـتنی خـوێنی مـرۆڤ وەردەگرێـت, هـەمووجۆرە

هەڵسوكەوتێكی ئارەزوومەندانە لەگەڵ ژن و پیاوی بەكۆیلەكراو بەماف دادەنێ. ئەم ژێرییە یاخود ئەمجۆرە هزركردنە پێكهاتەیەكی پێچەوانەی ژێری ژنی هەیە كەیەكسانیخوازەو وابەستەی سروشتی زیندووو بەرهەمی مرۆڤدۆستانەیە.

لەدوای هەڵكشانی پێكهاتەی پیاوسالاری دەبینرێ كەخوڵقكاری كۆمەڵگا دووچاری بەستەڵەكیی و بنبەستبوونێكی جددی هاتووە. لەكاتێكدا لەقۆناخی نێوان 6000 ـ 4000 ی پ.ز (قۆناخی دایك) بەهەزاران داهێنان ئەنجامدران, لەدوای سالانی 2000 ی پ.ز دەبینرێ كەژمارەیەكی زۆر سنووورداری داهێنان هەن كەجددی و بایەخدار ببینرێن. لەتەنیشت ئەمەش پێكهاتەیەك هاتەئاراوە كەكولتووری دەسەلات ـ جەنگاوەری تێدابلاوبۆوە, فەتحكاری بەشكۆدارترین پیشە لەقەڵەمدرا ـ پیشەی پادشاكان ـ و ئامانجی سەرەكی دەوڵەتەكان بوو بەفەتح. بەپووختی بەلاوەنانی ژن و بەهاو نرخدانێكی مەزن بەدەسەلاتەكانی پێكهاتەی پیاوی فەتحكار ـ جەنگاوەر لەناویەكدا بەڕێوەچووە. لەكاتێكدا دەزگای دەوڵەت بەتەواوی وەكو دۆزینەوەیەكی پیاو واتاداربووە, شەڕەكانی بەئامانجی تالان و دەسكەوت ئەنجامدراون, بووە بەشێوازێكی بەرهەمهێنان. لەجیاتی چالاكی كۆمەلایەتی ژنان كەپشت بەبەرهەمهێنان دەبەستێ, هەنگاو بۆ ئەو چالاكییە كۆمەلایەتیانەی پیاونراوە كەپشت بەشەڕو دەسكەوت (غەنیمەت) دەبەستێ. پەیوەندییەكی نزیك لەنێوان دیلێتی ژن و كولتووری كۆمەڵگای جەنگاوەری هەیە. شەڕ بەرهەم ناهێنێ, قۆرخ دەكات, تالان دەكات. هەرچەندە رۆڵی توندوتیژی لەهەندێ هەلومەرجی تایبەتدا ـ كردنەوەی رێگای ئازادی, بەرەنگاربوونەوەی داگیركاری و دەستدرێژێ و چەوسانەوە ـ لەپێشكەوتنی كۆمەڵگادا رۆڵی دیاریكراوی هەبێت, بەلام بەزۆری رووخێنەرو نەرێنییە. كولتووری توندوتیژی كە لەناواخنی كۆمەڵگا جێگیربووە, لەرێگای شەڕەكانەوە تێرخۆراك دەكرێت. لەنێو دەوڵەتاندا شمشێری شەڕ, لەناو خێزانیشدا دەستی پیاو پەیكەری بالادەستین. هەم كۆمەڵگای ژێر هەم ئەوەی ژوور لەنێو بەرداشی شمشێر و دەست دان. بەردەوام بەشانوبالی كولتووری زاڵبووندا هەڵدەدرێت. گەورەترین كەسایەتییەكان ئەو شانازیكردن و پیاهەڵدانەی لەئەنجامی خوێنڕشتنێكی بەناهەق بەرامبەریان نیشاندەدرێت، بەگەورەترین و بەهێزترین مەردایەتی و رەوشت بەرزی لەقەڵەم دەدەن. بەتایبەتیش پادشاكانی ئاشوورو بابل دروستكردنی كۆشك و قەلاو شورا لەكەللەسەری مرۆڤ و نموونەكانی دیكە بەگەورەترین شان و شەوكەت و شەرەف لەقەڵەمدەدەن. كولتووری توندوتیژی ناوكۆمەڵگاو تیرۆری دەوڵەت كەئەمرۆش بەربلاو سەرچاوەی خۆی لەم كولتووره وەردەگرێت.

لەمێژووی ئایینە تاكخوداییەكاندا لەدەوروبەری ژن كولتووری "دووەمین شكاندنەوەی مەزنی رەگەزی" دێتەئاراوە. كولتووری شكاندنەوە لەقۆناخی میتۆلۆژی، ئەمجارە وەك فەرمانی خودا دەبێتە یاسا. شێوەی پەیوەندی حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵ ساراو هاجەر نیشاندەدات كەئایینی نوێ بالابوونی پیاو ئەرێ دەكات. باوكسالارێتی بەتەواوی جێگربووە. دەزگای كەنیزەك (جاریە)ی پێكهاتووە. هاوسەرێتی لەگەڵ چەندین ژن، واتە ـ فرەژنی ئەرێ دەكرێ. پەیوەندی توندی حەزرەتی موسا لەگەڵ خوشكەكەی مەریەم، نیشاندەدات كەبەشی ژن لەمیراس وەرگرتن هەڵگیراوە، نەماوە. كۆمەڵگای حەزرەتی موسا تەواو كۆمەڵگایەكی پیاوانە.

هیچ ئەركێك بەژنان ناسپێردرێ. هۆی كێشمەكێش لەگەڵ مەریەم بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە. گووتەی " نابێ ژنی دەست بەهەوێر خۆی تێكەڵی كاری پیاوان بكات"، لەو رۆژگارەوە بۆمان ماوەتەوە.

لەپادشایەتی عیبرانییەكاندا كەپێش سالانی 1000 ی پ.ز و دواتریش هەڵكشا، دەبینین كەلەگەڵ هاتنی داودو سلێمان هەنگاونراوەتە نێو كولتووری حەرەمسەرای فراوان. ژنان دەكرێن بەدیاری. هەنگاو بۆ قۆناخێكی نوێ نراوە كەدەنگی ژن كپكراوەو بۆڕی هەناسەدانی بڕدراوە. تەسەروفكردن لەسەر ژن هاوشێوەی تەسەروفكردن ـ خەرجكردنی هەر موڵكێكی دیكەیەو هیچ جیاوازییەكی نییە. ئەم رەوشەی لەدەوڵەتی ئایینی تازە لەئارادایە، كاریگەری و رەنگدانەوەی لەسەر خێزانیش دەبێت، ناشێ لەژێر بالادەستی جووتەی كولتووری باوكسالاری و كولتووری دەوڵەتی ئایینی باس لەرۆڵی ژن بكرێت. باشترین

ژن ئەوەیە کە بەباشترین شێوە گوێڕایەڵی پیاوەکەی و باوکسالارێتی بکات. ئایینیش کراوەتە ئامرازی رەشکردنی ژن و چەواشەکردنی راستینەکەی. بەرلەهەمووشتێك "حەوا" یەکەمین ژنی گوناهبارە کە "ئادەم"ی تەفرەداو بووە هۆکاری دەرکردنی لەبەهەشت. لیلیت کەکڕنۆشی بۆخوداوەندی ئادەم ـ شێوەی باوکسالارێتی ـ نەبرد، شەیتان بەبنەمادەگرێت شێوەی ئەو مرۆڤەی کڕنۆشی بۆ ئادەم نەبردو بەندایەتی پەسندنەکرد ـ هاوڕێی شەیتانە. رەشکردنی میتۆلۆژی وەك نموونە دەبینرێ و بۆڕەشکردنی ئایینی وەردەچەرخێنرێ. بانگەشەی سۆمەریەکان سەبارەت بەوەی گوایە ژن لەپەراسووی پیاو دروستکراوە لەپەرتووکی پیرۆزیشدا بەجێکراوە. ئەو پێخەمبەرانەی ژمارەیان بەهەزاران گەیشتووە تاکە ژنێکیشی تێدانییە. زایەندی ژن بەگوناهێکی گەورە لەقەڵەمدەدرێ، بەردەوام دووچاری رەشکردن و ناوزڕاندن دێت، بەسووك و نزم دەبینرێ و دەکرێت بەپرەنسیپێکی نەریتی. ئەو ژنەی لەکۆمەڵگاکانی میسرو سۆمەر خاوەن شوێنگەیەکی شکۆداربوو ئیتر بابەتی عەیبداری و گوناهباری و تەفرەدانە.

کاتێك دەگەینە سەردەمی حەزرەتی عیسا، شێوەی مەریەم کەرووبەڕوومان دەبێتەوە سەرباری ئەوەی دایکی کوڕی خوداوەندە, بەڵام بەخۆی هیچ پەیوەندییەکی بەخوداییبوونەوە نەماوە، کەوتن بەردەوامە. ژنێکی بێ دەنگی چاوبەفرمێسك جێی ناونیشانی دایکە خوداوەندی گرتۆتەوە. دووگیانبوونی لەئەنجامی فووتێکردنی خوداوەند ـ پیاوی باڵادەستی سەرژن ـ بیرۆکەیەکی پڕلەناکۆکییە. سێکوچکەی باوك ـ کوڕ ـ رۆحی پیرۆزی ئایینی مەسیحی لەبنەڕەتدا گوزارە لەسەنتێزێکی ئایینی فرەخودایی و تاکخودایی دەکات. لەم قۆناخەدا باوەڕی بتپەرستی و رۆحگەرایی کەپەیوەندییەکی چڕی لەگەڵ ئایینی مەسیحی هەبوو لەگەڵ باوەڕی وشکی تاکخودایی عیبرانییەکان ململانێییەکی بەرفراوانیان لەنێوانداهەبوو، لەئەنجامدا ئەم سێ مەیلە رێککەوتن، بوون بەخوداوەندی سێیانە، واتە ژمارەیان ئێجگار کەمبۆوە. لەسەردەمی حەزرەتی محەمەدیش سێکوچکەیەکی بەمشێوەیە بوونی هەبوو. بەجۆری ئایینێك شێوەی گرتووە. ئەوەی سەیرە، لەکاتێکدا بەلانی کەم پێویستە "مەریەم" یش خوداوەند بێت، وەك ئامرازێکی رۆحی پیرۆز دەبینرێ. ئەم دیاردەیە نیشاندەدات کەخوداوەند خاوەن مێشکێکی پیاوانەیە، بووە بەپیاو. لای سۆمەری و میسرییەکان خوداوەندە ژن و پیاوەکان تارادەیەك ژمارەیان وەك یەکە، یەکسانن. تەنانەت لەسەردەمی بابلیشدا هێشتا دەنگی دایکەخوداوەند بەهێزە.

ئەوەی لەرێگای حەزرەتی عیسا و مەریەم بەدیهاتووەو دەکەوێتە سەر ئەستۆی ژن، بوون بەدایکێکی هێمن و چاو بەفرمێسکە. ئەو هیچ کاتێك بۆنی خوداوەندێتی ناکات. زۆر بەباشی کوڕەکانی(کوڕی خوداوەند) بەخێو دەکات کە لەماڵن بەهادارن. لەبوون بەژنی ماڵ بەولاوە هیچ رۆڵێکی دیکەی کۆمەڵایەتی نییە. گۆڕەپانی گشتی بەتەواوی بەرووی ژناندا دادەخرێت. پراکتیکی عەزیزەکان (ژنی پاکیزە)ی ئایینی مەسیحی دۆخی گۆشەگێری ژنە لەپێناو رزگاربوون لەتاوانە گەورەکانی. ئەگەر شێوەیەکی سنووردارییش بێت دەتوانرێ بگووترێ رێگای لەپێش گۆڕانکارییەکی ئەرێنی کردەوە. بەلانی کەم عەزیزە گوزارەی رزگاربوونە لەعەیبداری و چەمکی زایەندی. هۆکارە ماددی و مەعنەوییەکانی بەهێزە بۆ پەسندنەکردنی ژیانی دۆزەخ ئاسای ماڵەوە. گومان لەوەدا نییە کەپراکتیکێکی مێژووییە. بەواتایەکی دیکە دەتوانرێ بەیەکەمین پارتی ژنە هەژارەکان بەناوبکرێت. بەشێوەیەکی زۆر دامالراوو سەراوەش بێت کولتووری ژنانی مانستەر (دێر) گوزارشت لەزیندووکردنەوەی کولتووری پەرستگای ژن دەکات. شوێنگەی پراکتیکی عەزیزە (راهیبەژنەکان) لەمێژووی ئەوروپادا گرنگە. تارادەیەکی مەزن شیمانە دەکرێت هاوسەرێتی (خێزانی)یەك ژنی لەپراکتیکی عەزیزەکان ئیلهامی لێوەرگیرابێت. دەتوانین بڵێین سەرباری ئەوەی ژن لەژێر هەلومەرجێکی سەختدایە و (پاراستنی پەردەی کچێنی) پاکیزەیی وەك بینینی زایەندکەیەتی بە سەرچاوەی هەڕەشە و مەترسی, دیسان رۆڵی هەبووە لەبەرزبوونەوەی ژندا. هەرچی لایەنی خراپەیەتی,

شێوەی هاوسەرێتی کاسۆلیکی شارستانییەتی ئەوروپایە ــ کەنابێ تەلاقی بدات ــ وەك پەرچەکردارێکەو ژن وەك کاڵایەکی زایەندی دەبینێ. بێگومان ئەمەش لەسایەی سەرمایەداری هەڵکشاوە.

سەرباری ئەوەی ئەو ستاتۆ نوێیەی ژن لەسایەی ئیسلامییەت و حەزرەتی محەمەد بەدەستیهێناوە بەگوێرەی فاکتەری کولتووری باوکسالاری هۆزەکانی بیابان هەندێ لایەنی ئەرێنی لەخۆوەبگرێت, بەڵام لەناوەرۆکدا کولتووری عیبرانی بەبنەماگرتووە. ئەو ستاتۆیەی لەلایەن حەزرەتی داودو سلێمان سەبارەت بەژن شێوەی گرتووە چۆنە, لای حەزرەتی محەمەدیش هەمان شتە. دیسان فرەژنی ئامانجی سیاسی و ژیانی پڕ لەکەنیزەك (جاریە) بەرەوا لەقەڵەمدەدرێت. هەرچەندە بە هاوسەرێتی لەگەڵ چوارژن سنووردارکرابێت، بەڵام لەناوەرۆکدا هەمان شتە. چەمکی " ژن کێڵگەتانە، چۆن دەخوازن وەها بەکاریبێنن" ژنی بەمولككراو وەك پێدراو تاوتوێ دەکات. چەمکی حەزرەتی محەمەد سەبارەت بەئەشقیش سەرسوڕهێنەرە. لەپەنجا ساڵیدا ئەڤینداریەکەی لەگەڵ عائیشەی نۆساڵی، ئاستی بەرزی پەیوەندداربوونی حەزرەتی محەمەد بەرامبەر ژن نیشاندەدات. بەردەوام پەسندانی خەدیجەی ژنی یەکەمی ئەو گرنگییەیە کەبەژنی دەدات. بەگشتی بەرامبەرژن هەستیارە. بەڵام هێشتنەوەی حەرەم و کەنیزەکی وەك دەزگایەك دواتر لەناو چینی دەوڵەتدا زۆر خراپ بەکاردەهێنرێت.

لەدوای مردنی حەزرەتی محەمەد کاتێك حەزرەتی عائیشە خۆی خستە نێو شەڕی دەسەڵاتی نێوان خەلیفەکان دۆڕاندی. لەمیانەی ئێش و ئازارێکی مەزن دەرك بەبەهای ژنێتی دەکات, هەربۆیە دەڵێ " ئەی خودایە، لەجیاتی ئەوەی من وەکو ژن بهێنیە دونیا، خۆزگە بتکردبام بەتاتەبەرد"، هەر لەپەیوەندی نێوان موسا ــ مەریەم دیاریکراوە کەجێگای ژن لەدەسەڵاتدا نییە. لەرۆژهەڵاتی ناوینی دەرەبەگایەتی چاخەکانی ناویندا گۆڕانکاریەکی ئەرێنی سەبارەت بەشوێنگەی ژن رووی نەداوە. دیسان قاڵبە مێژووییەکان بەڕێوەدەچن. لەپەیوەندی ئەڤینداری کە لەنێوان لەیلاو مەجنون کراوە بەسەمبوڵ ئەنجامێکی ئەرێنی دەرناکەوێت. لەدەرەبەگایەتیدا جێگای ئەشق نییە. لەناو ئەو خێزانەی لەژێر پێشبڕکێتی باوکسالارێتی و دەوڵەت دایە, ژن لەنێو قۆناخێکدا دەژی کە لەبەرزترین ئاستی نەبوونی کەسایەتی دایە. دیلی رەهای ئارەزووی خاوەن دەسەڵاتەکانە. بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتەکانیان بەتەواوی رۆڵی ئامراز دەبینێت. بەشێوەیەکی گشتی بەداتاشراوی لەکۆمەڵگا جیاکراوەتەوە. لەو کۆمەڵانەی هێشتا لەنێو هەلومەرجی رەوەندیدا دەژین، ئەو ئاسەوارانەی لەسیستەمی کۆمۆنەی سەرەتاییدا ماوەتەوە رێزگرتنی ژن لەخۆوە دەگرێت، بەڵام قووڵترین کۆیلایەتی ژن لەناو ژنانی شارەکاندا لەئارادایە.

پێبەپێ پێناسەکردنی شوێنگەی ژن لەژێر سیستەمی موڵکایەتی و باڵادەستی ئاستەم دەبێت. وەك پێدراوێکی پەیڕەوی هەزاران ساڵە لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا ژن لەنێو رەوشی وێرانەو رووخاویدا دەژیت. تەنانەت کاریگەی لەخشتەبردنی سیستەمی سەرمایەداری دوورە لەوەی بەتەواوی رەنگیدابێتەوە. توخمی سەرەکی ناوەندی پاشڤەڕۆیی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوینە. پیاوی رۆژهەڵاتی ناوین کە لەهەموو بوارێکدا دۆڕاوە، کاریگەری و تۆڵەی ئەم دۆڕاندنانە لەژن دەسێنێتەوە. لەدەرەوە چەندە دووچاری سووکایەتی ببێت، باجەکەی لەژن دەسێنێت، ئینجا ئەمە بەئەنقەست بێت یاخود لەخۆیەوە پێشبکەوێت. ئەو پیاوەی لەئەنجامی نەتوانینی پاراستنی کۆمەڵگاو نەدۆزینەوەی رێگای ئازادبوون پڕدەبێت، لەناو خێزاندا وەکو هێرشی بەسەر منداڵ و ژندا دەکات، توندوتیژی خۆی بەسەریاندا دەڕێژێ. لەراستیدا دیاردەی " تاوانەکانی نامووس" بەپێچەوانەوە چالاکی دەرخستنی رق و کینەی پیاوە بەسەر ژندا، ئەو پیاوەی کە لەهەمووبوارەکانی کۆمەڵگادا نامووسی خۆی ژێرپێخستووە. بەشێوەیەکی سەمبۆلیانە، بەڵام لەمیانەی نمایشیکی زۆر هەرزان و لەناوبەر وابیر دەکاتەوە کەدۆزی نامووسی چارەسەرکردووە. جۆرێکی تیمارکردنی دەروونی پەیڕەو دەکات. مێژووو دۆزێکی کۆمەڵایەتی لەدەستدراو لەژێر ئەم کێشەیەدا شاراوەیە. یەکێك لەکێشە هەرە سەرەکییەکان ئەوەیە کەئەم پیاوە رووبەرووی ئەم کێشە کۆمەڵایەتی و مێژووییە بکەیتەوە تێیبگەیەنی و پێی پەسندبکەی کەتاوەکو بیری لێنەکاتەوەو لەبارەیەوە هزر پێشنەخات، هەرگیز لەپیسبوونی (خراپبوونی)

نامووس رزگاری نابێت. دەبێ ئەوە فێربین و پەیڕەو بکەین کەنامووسی راستەقینە لەپاکیزەیی ئۆرگانی زایەندی ژندا نییە، بەڵکو لەبەدەستهێنانی پاکیزەیی مێژوویی و کۆمەڵایەتیدا تێپەڕدەبێت.

لەو باوەڕەدام لەمیانەی ئەم پووختە مێژووییەی ئاماژەمان پێیکرد باشتر روونبۆوە کەئەو کێشانەی لەناو خێزانی رۆژهەڵاتی ناوینی ئەمڕۆ لەئارادایە بەئەندازەی کێشەکانی دەوڵەت گرنگ و بایەخدارن. فشاری دوولایەنە گرفتەکە دژوارتر دەکات. کاریگەریەکانی کۆمەڵگای دەوڵەت و باوکسالارێتی کە لەمێژووەوە هاتوون لەگەڵ کاریگەریەکانی قاڵبە هاوچەرخەکانی شارستانییەتی رۆژئاوا, لەجیاتی خولڤاندنی سەنتێز، گرێکوێرە دروستدەکەن. ئەو بنبەستبوونەی لەدەوڵەت هاتۆتەئاراوە، لەخێزاندا دەبێت بەگرێ. پەیوەندیەکانی فرەژنی و زۆری منداڵ لەبواری ئابووریدا رێگانادات خێزان لەنێو رەوشێکی بەردەوامبووندا بێت. لەگەڵ گەورەبوونی منداڵەکان، گەنجان ناتوانن ئیش بدۆزنەوە، ئەمەش خێزان لەپەلوپۆ دەخات. خێزان کەبەگوێرەی پێوانەکانی ئابووری و دەوڵەت ئامادەکراوە، لەهەردوو لایەنەوە, ئیتر لەمیانەی شێوازی کۆنی پەیوەندیەکان بەرێوەناچێت و لەنێو چەقبەستندایە. نەخێزانێکی شێوازی رۆژئاوا، نەخێزانی شێوازی رۆژهەڵات، هیچ یەکێکیان لەئاراد نییە. داڕووخانی خێزان لەنێو ئەم هەلومەرجانەدا دێتەئاراوە. بەبەراورد لەگەڵ ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەی خێراتر هەڵوەشانەوە، تائێستا لەسەر پێمانەوەی خێزان و پاراستنی هێزەکەی، بۆئەوە دەگەڕێتەوە کەتاکە پەناگەی کۆمەڵگایە. مسۆگەرنابێ خێزان بچووکبکرێتەوە. ئەو رەخنانەی پێشمانخست بەو واتایە نایێت کەلەریشەوە رەتبکرێتەوە. بەڵکو پێویستی سەرلەنوێ تێگەیشتن و ئاواکردنەوە دیاری دەکات.

لەژن زیاتر، بەرۆژە ڤکردنی کێشەی پیاو بەشێوەیەکی قورس زۆر گرنگ و بایەخدارە. باڵادەستی پیاو، شیکردنەوەی زاراوەی دەسەڵات، لەکۆیلایەتی ژن کەم بایەختر نییە. لەوانەیە قورستریش بێت. ئەوەی بەلای وەرچەرخاندا نایێت و رێگای لەپێش ناکاتەوە لەژن زیاتر پیاوە. کاتێك دەست لەشێوەی پیاوی باڵادەست بەربدات، هەروەکو ئەو حوکمدارەی دەوڵەتی خۆی لەدەستداوە هەست بەوەدەکات کەفەوتاوە. دەبێ ئاماژە بەوەش بکرێ کەئەمشێوە پووچەی باڵادەستی لەئازادی بێبەشیکردووەو کردوویەتی بەموحافەزەکارێکی تەواو. گووتنی سەرەتا دەوڵەت کێشەیە، دواترخێزان، هەڵوێستێکی راست نییە. ئەم دوو دیاردەیە لەنێو پەیوەندییەکی دیالەکتیکیدان، پێویستە بەیەکەوە تاوتوێ و شیبکرێنەوە. ئەو ئەنجامانەی سۆسیالیزمی بونیادنراو بەگووتەی "سەرەتا دەوڵەت چارەسەربکەین دواتر نۆرەی کۆمەڵگادێت" رێگای لەپێشکردەوە لەبەرچاوانە. هیچ کێشەیەکی جددی کۆمەڵگا وەهاچارەسەرنابێت کەیەکێکیان بخەیتە پێشەوەوگرنگی پێبدەیت. لەنێو یەکپارچەیی تەماشاکردنی کێشەکان، واتادان بەهەر کێشەیەك لەمیانەی پەیوەندییەکەی لەگەڵ کێشەی دیکە، کاتێك بەرەو چارەسەریش دەچێت نیشاندانی هەمان نزیکبوون و هەڵوێست، رێچکەیەکی راسترە. چۆن بەبێ چارەسەرکردن و شیکردنەوەی زهنییەت ناتوانێ دەوڵەت شیبکەیتەوە، بەبێ شیکردنەوەی دەوڵەت ناتوانی خێزان شیبکەیتەوە، ژن شینەکەیتەوە ناتوانی پیاو شیبکەیتەوەو پرلەکەموکورتی دەبێت، لەهەمانکاتدا بەبێ ئەنجامدانی پێچەوانەکەی گەران بەدوای چارەسەری بەو ئەندازەیە بەناتەواوی دەمێنێتەوە.

4 ـ هەندێ دیاردەی دیکەی سەرەکی لەناو کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناویندا هەن کەپێویستیان بەپێناسەکردن هەیە. دیاردەکانی لەشێوەی ئەتنیك، نەتەوە، وڵات، توندوتیژی، چین، موڵکایەتی و ئابووری و ... هتد دوورن لەوەی لەئاستی چەمکدا پێناسەکرابن. بەچەمك بوون وەك ئاستێ کە پێناسەی دیاردەکان پێی دەگات، بە دامالینی لە ئایدیۆلۆژیا شۆڤێنیستەکان پێك نەهێنراوە. لەکولتووری رۆژهەڵاتی ناویندا بەشێوەیەکی زانستیانە بەهای راستەقینەی ئەم دیاردانە نەخراوەتەڕوو. یان لەمیانەی چاویلکەی ئایدیۆلۆژیای ئاینی یاخود چاویلکەی میلیگەرایی شۆڤێنیزم تەماشایانکراوە, بەگوێرەی خۆیان ئەنجامی پڕ لەباری بێچارەیی بەدەستدێنن. پرسیاری لەوجۆرە ناکرێت ئایا بەهاو جێگا و قورسایی ئەتنیك،

نەتــەوە، وڵات، توندوتیــژی و موڵکایــەتی ــ ئـابووری لەراسـتی بەکۆمەڵگابوونـدا چـییە، پەیوەندییـەکانی نێوانیـان گوزارشـت لەچیدەکات. راستینە دەکرێتە قوربانی ڕێنمایی ئایدیۆلۆژی. سیاسـەتیش بەڕێنماییـەکی لـەوەخراپتر بەشـێوەیەکی هێرشـبەرو تاکڕەوانـە هەڵسوکەوت دەکـات. دەرفـەت و شـانس بەهەڵوێـستی ئاقڵمەندانـە، دادوەرو دیموکراتییانـە نـادات. کەوتوونەتـە نێـو هەستێکی وەها هەروەکو بڵێی ڕۆشنکردنەوەی دیاردەکان لەمیانەی هەڵوێستی زانستی دوور لەهەڵوێستی ئایدیۆلۆژی ــ سیاسـی تەواوی گەمەکانیان تێکدەدات. لەرۆژهەڵاتی ناویـنـدا ئاشکرانەکردنی راستییەکان و لـەتاریکی هێشتنەوەیان ئـەرکێکی گرنگـی پـەروەردەو سیاسـەتە. تاسـەرکەوتن بەدەسـتنەیەت هونـەری دەسـەڵات ئـەنجامنادرێت. بـەتاڵکردنی سـیحر بەشـەفافبووندا تێپەڕدەبێت.

لەهەڵوێستەکانمان چەندەی بڵێی قورساییمان خستەسەر ئەتنیك ـ تیرەی بەرایی، تیرە، خێل و قـەوم. ئەگـەر بەشـێوەیەکی ناڕاستەوخۆش بێت هەوڵماندا لەدایکبوون، گەشەکردن و وەرچەرخانەکەی نیشانبدەین. ئەگـەر وەکـو جـارانیش نـەبێت, بـەڵام ئەمە راستینەیەکە هێشتا لەرۆژهەڵاتی ناویندا قورسایی خۆی پاراستووە. لەناوچە لادێیەکاندا بەهێزترە. لەشارەکاندا جێگـای خـۆی بـۆگروپی لەشـێوەی تەریقـەت و هاوتاکـانی بەجێهێـشتووە. لەبەرئـەوەی هـاوڵاتێتی و دیموکراسـی تـەواو لـەئارادا نییـە، هەرکەسە و سەر بەئەتنیك و گروپێکە. دەوڵەتەکانیش بەئەندازەی خێزانەکان چاودێری هەبوونەکانی دیکەی ئەتنیك دەکەن. بـەبێ لەبەرچاوگرتنی هێـزی عەشـیرەتەکان، ئاسـتەمە سیاسـەت سـەرکەوتووبێت. لەبەرئـەوەی لـەنێو جیـاوازی چینایەتی و نەتەوەبوونـدا بەتـەواوی نەتواوەتـەوە، پـشێوی و پاشـاگەردانی کۆمـەڵگای زیـاترکردووە. بـەڵام وەك ئەنـدامێکی بـەرخودانی مێـژوویی لەبـەر ئـەوەی گـرنگن کـە هـەڵگری کولتـووری رەچـەڵەکن. حاشـالێکردن یـاخود رەتکردنەوەیـەکی وشـك واقیعـی و سوودبەخش نییە. گرنگە بایەخدان بە پەیوەندییەکانی ئـەتنیك و پێویـستی راسـت شـیکردنەوەی لەگـەڵ کەوتنـە نێـو مـەیلی سیاسەتگەرایی تەسك و میکرۆمیللیگەرایی کەئەتنیك بەبنەمادەگرێت، جیابکرێتەوە. ئەوەی یەکەمیان چەندە بەرەو ئەنجامی راست دەچێت، لەوانەیە ئەوەی دووەم بەو ئەندازەیە بەرەو ئەنجامی چەوتمان ببات.

نەتەوەو نەتەوەگەرایی، ئەوچەمکانەن کەلەکۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناویندا لەجیاتی بوون بەهێزی چارەسـەری لایـەنی بـوون بەکێشەیان قورسـترە. لـەقۆناخی مارکـانتیلیزم (سـەرمایەداری بازرگـانی) کەسـەردەمی لـەدایکبوونی سـەرمایەدارییە، بـەهۆی پێویستی بازاڕی نەتەوەیی و لەمیانەی سـنوورە کۆنـەکانی زمـان، سـەرەتا وشـەی نەتـەوە دواتـریش نەتەوەگـەرایی دروسـتکراو خواسـتیان شـیبکەنەوە. چـەمکی نەتـەوە، گوزارشـت لـەو واتایـەی ئوممـەت ــ کۆمەڵەیـەکی گرێـدراوی یـەك ئـایین ــ دەکـات کەبـەگوێرەی سـنوورەکانی زمـان دیـاریکراوە. لەگەوهـەری خۆیـدا لەچـەمکێکی کۆمەڵناسـی (سۆسـیۆلۆژی) زیـاتر چـەمکێکی سیاسییە. بەئامانجی سیاسی لێی نزیکدەبنەوە. لەژێر سنووری قایمتر داواکاری بەدەوڵەتبوون جێبەجێدەکەن. گرنگی نەتەوە بۆ دەوڵەت، لەبنەما ئەتنیکییەکەی زیاتر، بـەهۆی بنـەما سیاسییەکەیەتی. تەنانـەت لەلێکـەڕینی نەتـەوەی پاکـژ (نقـي)، بیـانووە سیاسییەکان رۆڵی دیاریکراو دەبینن. هەڵبەتە لەم سیاسەتەشدا کێشەی بـازاڕ رۆڵـی دیـاریکراو دەبینـێ و بنەماکەی پێکدێنێ. بـازاڕو سیاسـەت منداڵـدانی نەتەوەیـە. لـەبواری کۆمەڵناسـی بەهاکـەی بەئەنـدازەی ئـەتنیك بەهێزنییـە. ئـەتنیك یـەکێك لەبەهێزترین دیاردە کۆمەڵناسییەکانە. وەك قەوم، ئەتنیك وەکو نەتەوەیە. جیاوازی قەوم لەگەڵ نەتەوە بۆئـەوە دەگەڕێتـەوە کەهێشتا بەهای سیاسەت و بازاڕ پێشنەکەوتووە. لەرۆژهەڵاتی ناوین لەنەتەوە زیاتر، لەدەوروبەری نەتەوەگـەرایی کۆدەبنـەوە. نەتەوەگـەرایی یـاخود میللیگـەرایی جێگـای ئـەو پەیوەندییـە ئایینـە دەگرێتـەوە کـەلاوازبووە. جۆرێـك لـەئایینی دونیاییـە. سـەرەکیترین ئـامرازی رەواییدانـە بەدەوڵـەت. بـەبێ پـشتبەستن بـەئایین و میللیگـەرایی بـەڕێوەبردنی دەوڵـەت ئاسـتەمە. لەبنەڕەتدا ئایین بوهێلی (جین)ی دەوڵەتە. میللیگەراییش شێوە هاوچەرخەکەیەتی.

سەبارەت بەرۆژگاری ئەمڕۆمان نەتەوە و نەتەوەگەرایی بەهای چارەسەری کۆمەڵگای پێ نییە. بەپێچەوانەوە لەژێر پەردەی نەتەوەو میللیگەرایی کێشەکان دەشارنەوەو چارەسەری ئاستەم دەکەن. پێناسەکردن و هەڵسەنگاندنی ئەم دیاردەو بیرۆکەیە کەرابردووەکەی نەبووە بەسەدەیەك لەناو ڕاستینەی خۆیدا زۆرگرنگە. ئەوهەڵوێستە ئایدیۆلۆژی و سیاسییەی تەنیا پشت بەنەتەوەو نەتەوەگەرایی ببەستێ لەوانەیە بەرەو چەندین هەڵەمان ببات. ئەو نەتەوەگەراییانەی گەیشتنە ئاستی شۆڤێنیزم، ئەو رۆڵەی لەشەڕەکانی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەمدا بینییان لەبەرچاوانە. لەتەواوی میللیگەرایی رۆژهەڵاتی ناویندا، بەتایبەتیش لەمیللیگەرایی عەرەب ــ ئیسرائیل لەبەرچاوانە کەبەکارهێنانی میللیگەرایی لەسیاسەتدا چ جۆرە چەقبەستن و چالاکی خوێناوی و ئێش و ئازاری مەزنی لەگەڵ خوێداهێناوە. بەهەموو جۆرێك بەکارنەهێنانی میللیگەرایی لەکردەوە ئایدیۆلۆژی و سیاسییەکاندا گرنگە، هەرچی دیاردەو راستی نەتەوەیە بەو ئەندازەیەی رۆڵی لەچارەسەری کێشەکانی کۆمەڵگادا هەبێت بەبنەماگرتنی بایەخدارە. لەرەوشێکی پێچەوانەدا هەروەکو لەئەورووپادا روویدا، ئەوا بەهۆی ئەو خۆ پێوانەکردنە ئایدیۆلۆژیەی هەیە خۆی لەخۆیدا بنەماکانی لەرۆژهەڵاتی ناوین بەهێزە، لەقووڵترکردنەوەی ئاڵۆزی و ئاژاوە، هیچ ئەنجامێکی دیکەی نابێت.

لەگەڵ ئەوەی بیرۆکەی نیشتمان (وڵات) وەك جێگای نیشتەجێبوون بۆ سەردەمانێکی دێرین دەگەڕێتەوە، بەڵام وەك ئەو جوگرافیایەی دەوڵەتی ــ نەتەوەیی بەبنەمای دەگرێت نوێیە. لەسنووری ئەتنیکی زیاتر، سنووری سیاسی بەبنچینە وەردەگرێت. ئەوەی لەرۆژهەڵاتی ناویندا دەستنیشانکراوە جیاوازیەکەی لەگەڵ ئەوەی ئەورووپا، سنوورەکانی نەتەوە سنوورەکانی زمان نییە، بەڵکو ئەو سنوورانە دیاری دەکات کەدەوڵەت پشتی پێدەبەستێ و بەبنەمای دەگرێ. لەرەوشێکی وەهادا نیشتمان دەبێتە دیاردەیەکی سیاسی. بەواتای هاوچەرخ هەردەوڵەتێك مانای نیشتمان (وڵات)ێك دەبەخشێت. ناتوانین لەمیانەی هەڵوێستێکی ئایدیۆلۆژی و سیاسی پێناسەیەکی راست بۆ نیشتمان (وڵات) بکەین. هەروەها تەنیا سنوورەکانی زمانیش بۆ پێکهێنانی وڵات بەشناکات، هەڵسەنگاندنی وەك چەمکێکی کولتووری نەختێکی تر نزیکی راستییە. ئەو شوێنە جوگرافیانەی نەتەوەگەرایی سیاسی تێپەڕکردووە، واتە زۆر لەوە پێشتر گەلان بەدرێژایی مێژوویان تێیدا نیشتەجێبوونە بەنیشتمان (وڵات) ناودەبرێت. هەروەکو چۆن دەبێ تاکەگەلێك خاوەن وڵاتێك بێت، بەهەمان شێوە ئەو گەلانەی بەناویەکدا چوونە دەشێ وڵاتێکی هاوبەشیان هەبێت.

کاتێك رۆژهەڵاتی ناوین بەیەکپارچەیی تاوتوێ دەکەین، ئەوا پارچەکردنی بەشێوازی ئەورووپا زەحمەتی مەزن دێنێتەئاراوە. یەکپارچەیی و تایبەتبوون تابڵێی جێگیربووە. پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و ئابووریەکان دیاریانکردووە کەکامە شوێن کامە مەملەکەتی پێدەڵێن. دابەشکردنی سیاسی زۆرەملێ، بەئەندازەی ئەو بەهایانەی لەمێژوودا خولقێنراون بەهێز نییە. ئەو سنوورە سیاسییانەی لەکۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانیدا کێشران، رێگای لەپێش شێواندنی چەمکی وڵات کردەوە، راستتر بڵێین رێگای لەپێش سەرهەڵدانی کێشەی راستەقینەی وڵات کردەوە. راستینەی یەکپارچەیی سیاسی رۆژهەڵاتی ناوین، نەخشەی سیاسی ئەمرۆ بەواقیعی نابینێ. دینامیزمی سیاسییانەی پێویستی بەیەکپارچەیی گۆڕەپانی جوگرافی جیاواز هەیە. رەوشی لەئارادایە پێویستی بەکێشمەکێش و پێکدادانی نێودەوڵەتییەو میللیگەرایی هاندەدات. نموونەی ئەمەش فەلەستین ــ ئیسرائیل و کوردستانی ئێراق (باشووری کوردستان)ە. نەریتی ئیمپراتۆریەتی رۆژهەڵاتی ناوین زیاتر نزیکی فیدرالیزمە. لەیەکەمین ئیمپراتۆریەتەکان تاوەکو دەگاتە دوا ئیمپراتۆریەتی عوسمانی پێکهاتەی ئابووری، سیاسی و ئیداری ناوچەکە فیدرالیزمە. ئەو فیدراسیۆنەی لەسەربنەمای ناوچە ئۆتۆنۆمییە فراوانەکانە، لەفیدراسیۆنی وڵاتە یەگگرتووەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان دەچێت. گرفت و کێشەی سەرەکی رۆژهەڵاتی ناوین سەبارەت بەمەسەلەی وڵات لەوەوە سەرچاوە دەگرێت

کەناگەڕێتەوە نێو ڕەوشی نەریتە فیدراڵییە باوەکەی و تووشی پارچەبوونێکی ناواقیعیانەی چەندین دەوڵەتی ـ نەتەوەیی بووە. تاوەکو ئەم پێگەیە تێپەڕنەکرێت زۆر ئاستەمە بەچەمکی واقیعیانەتری وڵات و هاووڵاتیبوون بگەین.

دیاردەی چین کەمتر لەوەی شیمانە دەکرێت لەسیستەمەکانی کۆمەڵگادا واتای سۆسیۆلۆژی لەخۆوە دەگرێت. ئەو پەیوەندییانەی بەقووڵایی کاریگەرییان لەسەرکۆمەڵگا هەیە، ئەوانەن کەگەوهەری ئایدیۆلۆژی، سیاسی و ئەتنیکی و کۆمەڵەی دیکەیان هەیە. جموجۆڵی هۆشمەندانەی چین سنووردارە. لەکۆمەڵگاکانی دەسەڵات و دەوڵەتگەرایی جیابوونەوەی چینایەتی ناچارییە. تاوەکو دیاردەی چین پێکنەیەت، دەسەڵات و دەوڵەت گەشەناکەن, بەڵام هیچ پێکهاتەو بونیادێکی دەوڵەت و دەسەڵات لەلایەن ئەو چینە کۆمەڵایەتییەوە لەناو نابردرێت کەلەژێرەوە بۆخۆی کردووە بەپاڵپشت. جیابوونەوەی چینایەتی و بەدەوڵەتبوون یەکتری دەکەن بەهەبونی ناچاری. لەوانەیە تێکۆشانێکی دژوار لەنێوانیاندا هەبێت. لەئەنجامدا سازشکردنیان بێگومانە. چینی باڵادەستی دەوڵەت و چینی ژێردەست دووالیزمێکی دیالەکتیکی لەخۆوە دەگرن. دەوڵەت ئەو ستاتۆو راوەستەیەیە کەلەنێوان ئەم دووالیزمەدا هەیە. ئەگەر یەکێکیان نەبێت ئەویتر ناتوانێ لەسەرپێیان بوەستێ. ئەگەرچین نەبێ دەوڵەتیش نابێ. سووربوون لەسەرچینایەتی سووربوونە لەسەردەوڵەت. پەسندانی چینی چەوساوە لەئەنجامدا بۆ پەسندانی ئەو دەوڵەتە دەگۆڕێت کەبەشێوەیەك لەشێوەکان پەسندی کردووە. وەك چەمك گووتەی دەوڵەتی چینی کارکەر(کرێکار) هەڵەیە. گووتنی دەوڵەتی چینی کارکەر، واتە خۆم بۆرژوازی دەخوڵقێنم. ئەزموونی سۆڤێت، بەڵگەی سەلمێنەرو بەرچاوی ئەمەن. راسترین شێوەی تێکوشانی چینایەتی ژیانەکردنی چینایەتییە لەبواری ئایدیۆلۆژی و پراکتیکیدا. ناوی ئەمەش ژیانێکە لەشێوەی تاکی ئازاد، گروپی ئەتنیکی یاخود وەکو هەر جەماعەتێکی دیکەیە. ئەوەی لەدەوڵەت دەمێنێتەوە دەزگایەکە (ئاسایشی گشتی و سوودی رای گشتی) پێدەڵێن، کۆردیناسیۆن (کارگێری)یەکە کەبەئیرادەی هاوبەشی کۆمەڵگا دەستنیشاندەکرێت.

لەشارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناویندا جیابوونەوەی چینایەتی پووخت لەسەردەمی لەدایکبوونی شارستانییەتی سۆمەرو میسردا بەرەسەنترین باری خۆی لەئارادابووە. لەمیتۆلۆژیادا وەك خوڵقێنراوە بەشێوەی ئیلاهی و لەقوڕ دروستکراوەکان واتاداردەبێت. ئەمە جیابوونەوەیەکی ریشەییە. لەئاییننە تاکخوداییەکانیشدا ئەم جیابوونەوەیە بەشێوەی ئەهلی پێخەمبەر(ئەهلی بەیت) و ئوممەت گۆڕاوە. حەزرەتی موسا لەنێو تیرە عیبرانییەکان دەسەڵاتی "کاهینێتی" دەداتە ئەو تیرەیەی کەلەخۆی نزیکە، بەمجۆرە جیابوونەوەیەکی چینایەتی تایبەت بەخۆی دەستپێکردووە. حەزرەتی عیسا خاوەن پێگەیەکی وەهایە لەبەرامبەر چینی کاهین سەرهەڵدانی هەژاران دەستپێدەکات. ئایینی مەسیحیش دواتر لەسەر بنەمای شوێنپەنجەی ئیمپراتۆریەتی رۆما جیابوونەوەی چینایەتی بەخۆوەدیوە. لەکاتێکدا بەرزترین ئاستی کڵێسا دەوڵەتی ئایینی دادەمەزرێنێ، لەژێرەوە لەنێو گەلدا توانیویەتی جیابوونەوەیەکی چینایەتی تایبەت بەخۆی لەژێرپەردەی ئایین پێشبخات. کاتێك بەبێ هەبوونی قووڵایی ئایدیۆلۆژی، زیاتریش لەمیانەی پاشماوەکانی دەوڵەتی بێزەنتی و ساسانی لەرێگای خەلیفەکان دەوڵەتی ئیسلامی ئاواکرا. وەك گروپێکی بەرفراوانی باوەڕهێنەکان ئوممەتیشی کردووە بەکۆڵەکە سەرەکییەکانی ئەم دەوڵەتە. ئوممەت گوزارە لەو بەشەی کۆمەڵگای دەوڵەتی ئیسلامی دەکات کەبەباشی باوەڕیهێناوەو فێرە گوێڕایەڵیکردن کراوە. پەردەی ئوممەت جیاوازی چینایەتی راستەقینە دادەپۆشێ، رێککەوتن و سازشکاریان لەنێودا ئەنجامدەدات.

ناسنامەی سۆسیال دیموکراتی ئایینە تاکخوداییەکان لێرەدا بەرامبەرمان دەردەکەوێت: ئەویش سازشکاری(تەبایی) نێوان چینەکانە. لەراستیدا حەزرەتی عیسا شۆڕشگێڕێکی رادیکاڵی چینایەتییە. لەئایینی مەسیحیدا, بەتایبەتی لەقۆناخی بەدەوڵەتبووندا، ئاریوسگەرایی نوێنەرایەتی بەرخودانی سەرسوڕهێنەری چینایەتی دەکات. هەمان مەیل، لەکاتێکدا مەزهەبی سوننی لەئایینی ئیسلامدا بەدەوڵەت دەبێ (دەبێتە خاوەن دەوڵەت) ئەوا لەدیاردەو مەزهەبگەرایی عەلەویدا نوێنەرایەتی

گرووپە هەزارو چەوساوەکانی گەل دەکات. لەرۆژهەڵاتی ناویندا چینەکان لەمیانەی پێکهاتە رووت و ئاشکراکانیان دەرناکەونەروو. بەردەوام لەمیانەی پۆشتنی پەردەو دەمامکی ئەتنیکی، ئایینی و مەزهەبی دێنە بەرامبەرمان. پێویستە جیاوازی چینایەتی لەناو دەمامك و پەردە ئەتنیکی و ئایدیۆلۆژییە فوولەکان بدۆزینەوە. تێکۆشانەکانیشیان هەمان تایبەتمەندێتی نیشاندەدات. لەهەر تێکوشانێکی ئەتنیکی، ئایینی، مەزهەبی و هزری و گرووپی دیکە، بەردەوام گەوهەرێکی چینایەتی هەیە. کاتێك هەڵوەستەو نزیکبوونەوە بۆ شیکردنەوەی دیاردەی کۆمەڵگا دەکرێت، پێویستە بەردەوام ئەم راستییە لەبەرچاوان بگێردرێت. لەرۆژهەڵاتی ناوینی رۆژگاری ئەمڕۆماندا کاتێك چینەکان لەسەردەوڵەت ململانێ دەکەن ـــ بۆنموونە لەئێراق ـ لەو پەیوەندی و ناکۆکییە دەبینرێ کەلەنێوان عەرەبەکانی هەردوو مەزهەبی شیعەو سوننی و ئەتنیکی کورد و کەمایەتییەکانی دیکە لەئارادایە. جیاوازی چینایەتی وەك لەفووڵایی پێکهاتەی ئەتنیکی، ئایینی و ئایدیۆلۆژی گەل و دەوڵەت دەژێندرێ. هەربۆیە بەشێوازی رۆژئاوا پارتەکانی چینی ئاشکرا واتایەکی ئەوتۆی نییە. نابێ بەهیچ شێوەیەك جیاوازی چینایەتی پشتگوێ بخرێت، بەڵام بەشێوەیەکی واقیعی رەچاوکردنی رەوشی بەرجەستەی تایبەت بەخۆی و بەبێ ئەوەی بکەوێتە نێوچەمکی رەهای چینایەتی ـ وەکو چینی کارکەر، جووتیار ـ، ئەوا پێشخستنی شیکردنەوەو پراکتیك ئەنجامگیرترە. لەرەوشێکی پێچەوانەدا هەروەکو لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا لەئارادایە، ئەوا دیاردەی جیاوازی چینایەتی لەفووڵکردنەوەی بێچارەیی رۆڵی ئامراز دەبینێ.

پارتە کۆمۆنیستە کلاسیکەکان، سۆسیال دیموکراتەکان و پارتەکانی رزگاری نیشتمانی بەهۆی هەڵوێستیان بەرامبەر بەچینی هاوچەرخ، لەژێرکەوتن رزگاریان نابێ. هۆی سەرنەکەوتی پارتە کۆمۆنیست، سۆسیال دیموکرات و میللیگەرا رادیکالەکانی ئێران، ئێراق، تورکیا، میسرو سوریا، بەپێچەوانەوە سەرباری هەوڵە گرنگەکانیان لەتێکوشانی دەسەڵاتدا ژێرکەوتنیان بەرامبەر لێشاوەکانی ـ شیعە، ئیخوانی موسلمین، حەماس، حزبوڵڵاو هاوشێوەکانیان ـــ کەبەشێوەیەکی کارامە پەردەو دەمامکی ئایینی بەکاردێنن، رۆڵێکی دیارو بەرچاوی ئەم هەڵوێستە قەباو وشکەیان هەیە.

لەگەڵ ئەوەی دیاردەو چەمکی موڵکایەتی لەقۆناخی جیابوونەوەی چینایەتی گەشەکردنی کۆمەڵگادا بەرچاوتر دەبێت، ئەوا ئینتیمای کۆمەڵایەتی و هەستی ناسنامە لەقوڵاییەکانیدا پێکدێت. جیاکردنەوەی دووجۆر موڵکایەتی سوودبەخش دەبێت. موڵکایەتی بەکۆمەڵ (هاوبەش) دەتوانرێ بە ئیرادەی تەسەروفکردن لەسەر هەر شتێ پێناسە بکرێ کە مەرجی هاوبەشێتی ژیانی کۆمەڵگایەکی رێکخستوو بە پێویستی بینیوە. هەرتاکێکی ئەم کۆمەڵەیە سەبارەت بەو موڵکە خاوەنی هەمان ماف و تەسەڕوفە ـ واتە خاوەنی ئیرادەی بەکارهێنانە ـ لەراستیدا بەهۆی ئەم گەوهەرەی ناتوانرێ بەتەواوی بەموڵکایەتیش ناوببرێت. کۆلەکتیفیزم (کۆمەڵکاری) بەواتای نکوڵیکردنی موڵکایەتی تایبەتە. هەرچی موڵکایەتی تایبەتە زێدەڕۆیی تەسەڕوفکردن و بەکارهێنانە لایەن، تاك و تاکە مۆڵبووەکانەوە دژ بە بەرژەوەندی موڵکایەتی گشتی ـــ بە کۆمەڵ. شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین، بەهۆی ئەو تایبەتمەندێتییەی کە لەهەمووان کۆنترە لەبواری تێپەڕبوون بەجیابوونەی چینایەتی نوێنەرایەتی ئەوکۆمەڵگایە دەکات کە لەکۆنەوە موڵکایەتی ناسیوە. دەوڵەتبوون لەگەڵ پێکهاتنی خۆیدا موڵکایەتییەکی پێشخستووە کەتایبەتمەندێتی کۆمەڵکاری و تایبەت بەتێکەڵی لەخۆوەدەگرێت. واتە مۆدێلێکی وەهاییە کەسەرەتا خاوەنی موڵکە تایبەتەکان دواتر دەوڵەتیان خستبێتە دەستەوە، لەگەڵ بەدەوڵەتبووندا سیستەمێکی بەناویەکداچووی موڵکایەتی تایبەت ـ بەکۆمەڵ پێکهاتووە. چینی سەروو چەندە بەدەوڵەتبوونی ئەنجامدابێت (بەدەوڵەتبوو بێت) بەو ئەندازەیە بۆتە خاوەنی موڵك. کەدەڵێ دەوڵەت، بەواتای راگەیاندن و لەقەڵەمدانی هەموو سنوورەکانی دەوڵەتە وەك موڵکی خۆی. خودی دەوڵەت گەورەترین هاوبەشی (شریك) موڵکە. یەکینەی موڵکایەتی تایبەتە. لەژێرەوەو توێژەکانی ناوینیش مۆڵەت بەهەبوونی موڵکایەتییەکی تایبەتی سنووردارەدەدات. ئەویش لەوە رزگاری نابێت کەزووزوو دەستی

بەسەردانەگرن. هەربۆیە موڵکایەتی تایبەت هێندە گەشەناکات. ئەو موڵکایەتییە تایبەتەی لەدەرەوەی دەوڵەتە هێندە جێگای ئاسایش و ئارامی نییە. ئەم رەوشەش ئەوە روونەدەکاتەوە کەبۆچی هاوشێوەی رۆژئاوا موڵکایەتی تایبەت گەشەی نەکردووە. شێوازی پێکهاتنی دەوڵەت فاکتەرێکی سەرەکی دیارکردنی چۆنییەتی موڵکایەتییە.

هەر لەسەرەتاوە سنووردارکردنی دەوڵەتی رۆژئاوا لەلایەن چینی بۆرژوا ئەرستۆکراتەکان کەپێگەی موڵکایەتی تایبەتیان بەهێزبوو، دەرفەتی بۆ ئەوە رەخساندووە کەدەزگای موڵکایەتی تایبەت بەشێوەیەکی بەهێز پێکبێت. لەئەزموونی شارستانییەتی رۆژئاوادا سەلمێنرا کەموڵکایەتی تایبەت زۆرلەموڵکایەتی دەوڵەت خوڵقاکارترە.

هەرچی موڵکایەتی بەکۆمەڵە لەقووڵاییەکانی کۆمەڵگادا زیاتر لەناوخێزان، تیرە، مەزهەب و کۆمەڵەو گروپەکانی هاوشێوەی ئەمانە بەردەوامبووە. تێکەڵنەکردنی ئەم چەمکەی موڵکایەتی گشتی لەگەڵ چەمکی موڵکایەتی تایبەت ــ بەکۆمەڵی دەوڵەت گرنگی و بایەخێکی مەزن لەخۆوەدەگرێت. موڵکایەتی دەوڵەت پاشڤەڕۆترین، مشەخۆرترین جۆری موڵکایەتییەو تابڵێی لە خوڵقکاری دوورە. پێویستە یەکێك لەهۆکارە سەرەکییەکانی دواکەوتوویی ئابووری رۆژهەڵاتی ناوین لەو زێدەڕۆییە ببینین کە لەموڵکایەتی دەوڵەتدا هەیە. سیستەمی دەوڵەت و موڵکایەتی دەوڵەت کەبەشێوەی تەنێکی نەخۆشی کۆمەڵگا گەورەدەبێت, هەناسەی لەبەر کۆمەڵگا بڕیوە. لەبنەڕەتدا بەزۆری واتای دەوڵەت و موڵکایەتی هەمان شتە، هاوواتایە. بەناویەکداچوونی موڵك ـ مەلیك ـ موڵکداری ئەم دیاردەو چەمکە نیشاندەدات. ئەگەر گشتگیرییەکی بەکۆمەڵ ئەنجام بدەین دەبینین، خودا = خاوەنی هەموو شتێکە، دەوڵەتی پادشای ـ خوداوەند = پادشای ـ خوداوەند, خاوەنی هەمووشتێکە، پادشای ــ خوداوەند = دەزگای دەوڵەت، دەزگای دەوڵەت = خاوەنی هەموو شتێکە. ئەگەر ئەم پەیوەندییەی نێوان دەوڵەت و موڵکایەتی لەئاستێکی ئۆپتیماڵدا شینەکرێتەوە، ئەوا گەشەکردنی کۆمەڵگا زۆر ئاستەم دەبێت. ئەوەی پەیوەندی تەندروستی نێوان تاك و کۆمەڵگا لەڕیشە دێنێ دەوڵەت ـ وەك کۆی هەموو ئەوانەی دەستی بەسەردا گرتووە ـ و موڵکایەتییە.

چەمکی ئابووری (ئۆکۆنۆمی) گەردوونییە. دەتوانرێ وەك رێکخستنی ئاڵوگۆڕی ماددە لەڕووداوی زیندەچالاکی جیهانی تەواوی زیندەوەرەکاندا پێناسەیەکی گشتی پێ بدرێت. بەدەستهێنانی ماددەی زیندووکەرەوە لەماددەی بێگیان و بەکاربردنی و دیسان دووبارە گەڕاندنەوەی بۆماددەی بێگیان گەوهەری چالاکی ئابوورییە. ئاشکرایە کەکۆمەڵگاش لەبەردەوامکردنی هەبوون و پێکهاتەی خۆی لەم چالاکییە بێبەش نامێنێ. بەڵام راستییەکی دیکەی پەیوەستدار ئەوەیە، زیندوویی نەبێت ــ وەك زهنییەت و رۆح ـ ئابووری نابێت. هەربۆیە فورسایی خستنەسەر تاکە فاکتەرێك و ئەنجامدانی شیکردنەوە بەرەو ئەنجامی هەڵەدەچێت. شیکردنەوەی زهنییەت و ئابووری لەناویەکدا راستترین شێوازو رێچکەیە. بەتەنیا ئەنالیزەکردن (شرۆڤەکردن)ی ئابووری یاخود زهنییەت (هزر) بەرەو هەمان هەڵەدەچێت کەفیل بەتاڵەمووێکی پێناسە بکرێت. ئاشکرایە زهنییەت چەندە خوڵقکارو بەبەرهەم بێت، کاریگەری ئابووریش بەو ئەندازەیە بەرهەمدار دەبێ. لەنموونەی مێژوویی بنارەکانی ناوەوەی چیاکانی ئامانۆس ـ تۆڕۆس ــ زاگرۆس ئاشکرایە کەزهنییەتی مرۆڤ لەساڵانی 6000—4000 ی پ.ز کەشۆڕشی ئابووری هاتەئاراوە لەیەکێك لەبەرهەمدارترین قۆناخەکانی خۆیدابوو. بەپیتی و بەهەمداری ئابووری کەنارەکانی ئیجە شارستانییەتی گریت، گریك و رۆمای خوڵقاندووە. ئەم وابەستەی شۆڕشە هزری، فەلسەفی و زانستییەکانە. زهنییەتی رێنیسانس ئابووری ئەوروپای مەزنی خوڵقاندووە. کاریگەریەکان دوولایەنەیەو یەکتری تێردەکەن.

ئەو چاخە ئابوورییانەی گەشەکردنی زهنییەتی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین رێگای لەپێشکردەوە دیارن. بەرامبەر ئەمە دابڕانی زهنییەت لەجیهانی دیاردەکان و کەوتنە ناو میتافیزیك و دابڕان لەفیزیك و نقوومبوونە ناو جیهانی خەیاڵ و وێناکان، سەرەکیترین فاکتەری خستنی بەرهەمە لەبواری ئابووریدا. میتافیزیقیای رۆژهەڵاتی ناوین چەندە خەریکی ئەوبیرۆکە داتاشراوانە بووبێت کە لەجیهانی دیاردەکاندا دابڕاون، بەو ئەندازەیە رێگای لەپێش دواکەوتوویی ئابووری

کردۆتەوە. قاڵبوونەوە لەئیلاهیات، بەتایبەتیش مەیلی دوژمنایەتی بەرامبەر فەلسەفە کە وای لێدەکات بەرەو پێناسەیەکی راستی جیهان نەچێت، بۆتە هۆکاری پێشنەخستنی هزری فەلسەفی و زانستی و رێگای لەپێش ئەوەکردۆتەوە لەبواری ئابووریشدا بکەوێتە نێو بێچارەییەکی قووڵ و گەشەنەکات، تەنانەت لەناو شێوازو رێچکەکانی چاخی نیئۆلیتیکی هەزاران ساڵ پێش ئێستا بچەقێت. تاوەکو پێشکەوتنێکی هزری لەجۆری رێنیسانس، ریفۆرم و رۆشنگەری لەرۆژهەڵاتی ناوین نەیەتەئاراوە، پێشکەوتنێکی هەمیشەیی ئابووری لەبواری دەزگابوونەوە بەدی نایەت. راستینەی سەرنەخستنی گەشەپێدان جا چ بەدەستی دەوڵەت بێت یاخود لەرێگای تاکەکان، بنەمای بێکاری و نەداری جەماوەر پێکدێنێت. ناوچەکە لەبواری سەرچاوەوە زۆر دەوڵەمەندە، تاوەکو شۆڕشێکی زهنی ریشەیی بەخۆیەوە نەبێنی، ناتوانێ شۆڕشی ئابووری ئەنجامبدات. هەربۆیە ناتوانن لەدەرهەق کێشە مەزنەکانی بێکاری و هەژاری دەربکەون. تاوەکو شۆڕشی هزری و دیموکراسی نەخرێتە ناوەندی شۆڕشی ئابووری، ئەوا گەڕان بەدوای چارەسەری بێ ئەنجام دەبێت. ئەو پێشکەوتنانەی بێتەئاراوە لەبینینی رۆڵی تیمارکردنی برین زیاتر تێپەڕنابێ. بەبنچینەوەرگرتنی پەیوەندییە دیالەکتیکییەکانی نێوان ئابووری و هزری و دیموکراسی، بەم شێوەیەش هەنگاونان بەرەو چارەسەری هەمیشەیی راستترین رێچکەیە.

کاتێك هەندێ چەمك رۆشندەکرێنەوە، ئەوا رۆشنکردنەوەی دیاردەکانی تەریقەت و خانەدان جێگای بایەخن کەپەیوەندییان بەدەوڵەت و ئایینەوە هەیە. تاوەکو رۆڵی خانەدان و تەریقەتەکان لەشارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین روونەکرێتەوە، ئەوا بە ئەنجام گەیاندنی پێناسەیەکی تەواوکەر کەموکورتی لەخۆوەدەگرێت.

خانەدانێتی دیاردەیەکی سەرنجڕاکێش و بەرچاوە کەلەناو خێزان و دەوڵەت هەڵدەکشێ و لە ناوەڕۆکدا هەڵگری لایەنی ئایینی و میتۆلۆژی و ئەتنیکە. بەردەوام خانەدان رۆڵی گرنگی لەهەڵکشان و داڕووخانی خێزان و دەوڵەتەکاندا بینیوە. دەگمەنە بیر لەدەوڵەتێکی بێ خانەدان بکرێتەوە. لەرۆژگاری ئەمڕۆشماندا تاڕادەیەکی مەزن ئەم رێسایە بەکاریگەرە. وەك هۆکاریش دەتوانرێ هێزی پێکهاتەی خێزانی باوکسالاری نیشانبدرێت. باوکسالارێتی بوهێل (جین)ی دەوڵەتە. هەربۆیە دەشێ بەهێزترین خێزانی باوکسالاری بۆدەوڵەتی خانەدان بەرزببێتەوە. خودی خانەدان دەبێتە دەوڵەت. خانەدانێتی دەزگایەکی وەهایە دەتوانرێ بۆهەزاران ساڵ پێش ئێستا بگەڕێندرێتەوە. شوێنپەنجەیەکی قووڵی بەسەر دەوڵەت و کۆمەڵگاوە هەیە. هەروەکو بڵێی ئاوێتەیەکی چینی باڵادەست باوەڕی ئایینی و گروپی ئەتنیکییە. لایەنێکی دیکەی کە دەست دەدات بۆ ئەمە لەڕێی پشتاوپشتیەوە ئاوێتەیەکی بۆ ماوەیەکی درێژ بەکاریگەربوونێتی. دیسان لەرێگای ژنخوازی نێوان خانەدانەکان بۆ پەلهاوێشتن و بڵاوبوونەوە لەشوێنە جیاوازەکاندا گونجاوو لەبارە. ئەم گەوهەرو تایبەتمەندێتییانە ئەوە رۆشندەکەنەوە کەبۆچی یەکەمین جار دەوڵەت لەناو خانەدانەکاندا ئاواکراوە. لەبەرژەوەندی دەزگای خانەدانێتی هێندەی رۆڵی لەپێشکەوتنە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگادا، لەگەشەکردنی دەوڵەتیشدا بۆتە بەناوەندێکی بەهێز، ئەوا پێویست دەکات پشتگوێ نەخرێت. شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین لەواتایەکدا لەرێگای خانەدانەکان دەگوازرێتەوە. بەتایبەتیش خانەدانەکانی دەوڵەت ئەو نموونانەن کەشوێنپەنجەی خۆیان لەمێژوو بەجێهێشتووە. لەکاتێکدا لەشارستانییەتی رۆژئاوادا زیاتر ئەو خانەدانانە خاوەن فورساییبوون کەلەدەرەوەی دەوڵەتبوون، بەڵام لەرۆژهەڵاتدا رەوشی درەوشاوەیی ئەوخانەدانانە جێگای باسە کەپەیوەندییان بەدەوڵەتەوە هەیە. خانەدانێتی لەهەمانکاتدا قوتابخانەیەکە، مۆدێلی کۆمەڵگایە. گەشەسەندنە گرنگەکان دوای ئەوەی بەمۆدێل و قوتابخانەی خانەدان تێپەڕبوو، ئینجا بۆ کۆمەڵگا دەگوازرێتەوە. گروپە ئەتنیکییەکان تەنانەت نەتەوەکانیش جێبەجێ بەناوی خانەدانەکان دەناسرێن. بینینی رۆڵی دەستپێکردن رووداوێك نییە کەم بەرچاو بکەوێت. بەهێزترین ئەتنیك و نەتەوەکان، لەمیانەی هێزو ناوی ئەوخانەدانانە بەبیردەهێزێنەوە کەلەناویاندا دەرکەوتوون. ئەمەوییەکان،

عەباسییەکان، ئەیوبییەکان، سەلجۆقییەکان، عوسمانییەکان و بەرمەکییەکان, لەهەمانکاتدا بەواتای نەتەوەکانی عەرەب، تورك، کورد و فارس دێت.

نابێ هەڵوێستمان لەبەرامبەر راستینەی خانەدان نکوڵیکارانە یاخود بەشکۆمەندبینینی بێت کەتارۆژگاری ئەمڕۆمان لەنێو هەلومەرجی هـزری و ماددیـدا بەردەوامـە. واقیعـیترین هەڵوێـست ئەوەیـە وەك دیاردەیـەکی کۆمەڵایـەتی ببینـرێ و بـەرەو زەمینـەی کۆمەڵگایـەکی دیمـوکراتی ئاسایی رابکێشرێت. بەئەنـدازەی نەکەوتنـە نێوخۆشەویستی کوێرانـەی خانـەدان، دەبـێ بزانـرێ کـەواقیعێکی کۆمەڵایەتییـە، لەسـەرئەم بنەمایـەش پێشخـستنی هەڵوێـستی چارەسـەرکارانە گرنگـە. لەرەوشـێکی پێچەوانەدا رێگـا لـەپێش کێـشەی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی رشـتدەکاتەوە, لەوانەیـە قەیرانـەکان قووڵتربکات. ئەگـەر نموونـەی هەرەدوایی ئێراق نیشانبدەین کەنەخۆشی خانەدانێتی (بنەماڵە)ی سەددام رێگای لەپێش تراژیدیایەکی چەندە ترسناککردەوە، ئەوا باشتر دەرك بەگرنگی بابەتەکە دەکرێت.

تەریقەتگەراییش وەکو خانەدانێتییـە، زیـاتر لـەبواری ئـایینی ـ مەزهـەبی لەئارادایـە. پـشت بـەپراکتیزەکردنی پرەنـسیپە گشتییەکانی ئـایین دەبەسـتێ, بـەگوێرەی قۆناخـە بەرجەسـتەکانی شـوێن و رۆژگـار. لاوازی گـشتی رێکخـستنی ئـایین لـەرێگای رێکخـستنەکانی تەریقەتگـەرایی بـەلاوە دەنرێـت. ئایینـەکان زیـاتر لەمیانـەی تەریقـەت و مەزهەبـەکان دەبـن بـەهێزێکی رێکخستنی بەرجەستە. لەهەرشوێنێکدا ئایینی تێدابێت هەبوونی مەزهەب و تەریقەتەکانیش سروشتییە. تەریقـەت بوویـەری لـەئارادابوونی ئایینـە بەشـێوەیەکی چڕو رێکخراوتـر. لەرەوشـێکی وەهـادا کەسـایەتی سـەرۆك تەریقـەت و هەڵـسوڕێنەرەکانی رۆڵێکی گرنگ دەبینن. لەکوێ بۆشاییەك هـەبێت لـەوێ تەریقـەتێك لـەدایك دەبـێ. بەتایبـەتیش ئـەو توێـژە جەماوەرییانـەی دەوڵەت ناتوانێ تێریان بکات، بۆ رێکخستنەکانی لەشێوەی تەریقـەت رادەکـەن. لەوهەلومەرجانـەی خێـزان تەنگە، دەوڵـەتیش کەس پێیناگات، رێکخستنی کۆمەڵایەتی بەهێزیش لەئارادا نەبێ، ئەوا رێکخستنی تەریقـەتێك ئەگـەرێکی بـەهێزە. رێکخـستنی مەزهـەبی بـاری فراوانـی و بـاوبوونی تەریقەتـە. چـەندین تەریقـەت هـەن بۆئـەوەی خۆیـان لەدەوڵـەت بپـارێزن و سـنوورە تەسکەکانی خێزان تێپەڕبکەن پێویستی دەبینن کەبەشێوەی نیو ـ نهێنی بمێننەوە. لەکاتێکدا هەندێکیان وابەستەی دەوڵەتن، هەندێکیشیان بـەدژواری لەبەرامبـەری دەردەکـەون. هـەروەکو بڵێـی رۆژهـەڵاتی نـاوین کۆمـەڵگای تەریقەتەکانـە. لـەو قۆناخـە مێژووییانەی کە ئەتنیسیتە (ئەتنیك), بەتایبەتی لەشارەکاندا, ناتوانێ ببێتە وەڵام، خێزان (عائلة) تەنگ دەمێـنن, لەلایـەکی دیکـەش کەدەوڵـەت بەتـەنیا خۆی بەهـەموو شـتێك دەزانـێ, تەریقـەت دەکەوێتەگـەڕو رۆڵێکـی گـرنگ دەبینـێ. لەچاخەکانی ناویندا باتنییەکان, لەراستیدا ئەو تەریقەتانەی دەڵێن نهێنین پـارتی چینی هـەژارانن. تەریقـەتی بـاتینی "حەسـەن سـەباح" کەبەناوبانگترینیانـە ــ1100 تـاوەکو 1250 ـــ سـوڵتان و وەزیرکـانی مەزهـەب و خانـەدانی سـەلجوقی باڵادەسـتییان تەنگەتاوکردووە. خەواریجەکان, فاتیمییەکان و عەلەویەکانیش نوێنەرایەتی هـەمان نـەریت دەکـەن. تەریقـەت و جەماعەتـە هاوشێوەکانی بەجۆرێك لەجۆرەکان دەزگاکانی کۆمەڵگای مەدەنی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین.

لەبەرئـەوەی دیـاردەی تەریقـەت سەرچاوەی خـۆی لەبۆشاییەکی کۆمەڵایـەتی وەردەگرێـت پێویـستی بەهەڵـسەنگاندنێکی بابەتی هەیە. لەبەرئەوەی دەزگاو پێکهاتـەی نیوەکۆمەڵایـەتی و نیوەسیاسـیین, سـەبارەت بەدەسـەڵات و ئۆپۆزسیـۆن رۆڵیـان گرنگە. لەوقۆناخ و شوێنانەی پێشکەوتنی زانستی سنووردارەو چەمکی دیموکراسی گەشەی نەسەندووە, ئەمجۆرە رێکخستنانە ناچارییە. رێگای تێپـەڕکردنی ئەمانـە پەرەپێـدانی زانـستی کۆمەڵایـەتی و تێکۆشـانی دیموکراتییـە. لـەرۆژگاری ئەمڕۆمانـدا رێگای راستی پەیوەندیداربوون لەگەڵ ئەو تەریقەتانەی تـابڵێی گەندەڵبوونـەو وەکو کۆمپانیـا ئـامرازی چـەندین پەیوەنـدی بەرژەوەندیپەرسـتین, هێنـانی زانـست و دیموکراسـییە بۆگـەل. هەربۆیـە بـەلانی کـەم هێنـدەی بـاوەڕی تەریقەتگەراییـەکان, لـەپێناو گەیـشتن بەدیموکراسـی باوەڕهێنـان بەزانـست و نرخپێـدانی و نیـشاندانی راوەسـتەیەکی بەعەزیمـەت, بـەبڕیارو

هەمیشەیی پێویستە. بەبێ نكوڵیكردن لەوكۆمەڵانەی ریشەكەیان بۆسەدان ساڵ پێش ئێستا دەگەڕێتەوە, لەمیانەی دەرككردن بەوەی لەدیموكراسیدا جێگای ئەوانیش دەبێتەوە, نیشاندانی هەڵوێستێكی دیموكراتییانە رێگایەكی بەكاریگەرە بۆهەڵوەشاندنەوەی موحافەزەكاری.

سەبارەت بەهەندێ پارتی سیاسی و رێكخراوەكانی كۆمەڵگای مەدەنی كەبەواتا بەرفراوانەكەی دەشێ بەتەریقەتە هاوچەرخەكانیشیان ناوببەین. دەتوانین هەمان هەڵوێست پێشبخەین. لەو هەلومەرجانەی پەیوەندییەكانی خێزان, تیرەو باوەڕی لەگەڵ پەیوەندییە ئایدیۆلۆژیە فراوانەكان بەناویەكدا دەچن, ئەوا لەرۆژگاری ئەمرۆماندا لەروانگەیەكی فراوانەوە تەماشاكردنی دیاردەی كۆمەڵی مەدەنی جێگای بایەخە. یەكخستنی فاكتەرەكانی كۆمەڵگای مەدەنی كۆن و فاكتەرە هاوچەرخەكانی دەشێ ئەنجامی باشتری لێبكەوێتەوە. ئەودامودەزگایانەی كۆمەڵگای مەدەنی كەپشت بەرابردووو نەریتەكان نابەستن لەوانەیە دووچاری چەندین كێشەوگرفت ببن. هەربۆیە بەخێرایی هەڕەشەی وشكبوونی هەیە. هەر بزووتنەوەیەكی ئایدیۆلۆژی, سیاسی, كۆمەڵایەتی و هونەری پەیوەندی لەگەڵ نەریتەكان نەبەستبێ شانسی سەركەوتنی هەمیشەیی و بەردەوام نابێت؛ وەكو مۆدە لەوە رزگاری نابێت كەكاتیی و راگوزارەیی بێت. بەتایبەتیش لەرێگای ئەزموون وەرگرتن لەرەوشی چەپ كەدابونەریتی بچووككردەوە, پێوستە بزووتنەوەیەكی سیاسی ــ دیموكراتی و كۆمەڵگایەكی مەدەنی پێشبخرێت كەسەرلەنوێ پەیوەندی لەگەڵ دابونەریت ببەستێ, ئەمەش رۆڵێكی چارەنووسسازانە دەبینێ بۆ دەركەوتن و رزگاربوون لەقەیران و دەشێ سەركەوتووبێ.

5 ـ دیكتاتۆریەت و توندوتیژی لەشارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناویندا: سەرباری ئەوەی لەلایەن دەوڵەتەوە پەیڕەوكراوە, بەڵام بۆ شیكردنەوەی دەوڵەت سەبارەت بەشێوەگرتنی دەسەڵات و توندوتیژی پێویستی بەپێناسەیەكی قووڵترهەیە. بەشێوەیەكی گشتی ناوەڕۆكی دەوڵەت لەهەموو شوێنێك هەمان شتە. نوێنەرایەتی ئەونەریتە دەكات كە لەسەربنەمای زێدە ـ بەرهەم و زێدە ـ بەها دامەزراوە. كاتێك شێوەگرتنەكانی جێگای باس بێ, ئەوا دەبینین كەگۆڕانكاریەكی مەزنی نیشانداوە. لێرەدا هەلومەرجەكانی كات و شوێن رۆڵ دەبینن. لەهەلومەرج و قۆناخە جیاوازەكاندا چەندین شێوەی جیاوازی دەوڵەت لەدایك دەبێ. بەڵام لەدووڕیانی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوادا دیسان دوومەیلی گشتی بەرچاوان دەكەوێت. لەكاتێكدا لەرۆژئاوا زیاتر شێوەكانی دەوڵەتی كۆماری و دیموكراتی دەبینری, ئەوا شێوەی سەرەكی رۆژهەڵات دەسپۆتیزمە.

رژێمی كۆماری هەم لەسیستەمی كۆیلەداری دێرین, هەم لەهەندێ دەوڵەتشاری چاخەكانی ناوین, هەم لەئەوروپای هاوچەرخ دەبینری. بنچینەییترین جیاوازی نێوان كۆمارو دەسپۆتیزم لەبواری مافپەروەری (حقوق) دایە. هەرچەندە لەهەردوو شێوەشدا چینەكۆیلەدارە باڵادەستەكان رۆڵ ببینن, لەرژێمی كۆمارگەراییدا ئەو رێسایانە پەیڕەودەكرێت كەلەئەنجامی تێكۆشانێكی كۆمەڵایەتی بەردەوام دەستنیشانكراون. پێكهاتەیەكی كۆمەڵایەتی دینامیك هەبوونی هەیە, دەزانن مافەكانیان چیین. كاتێك پێویست بكات لەرێگای توندوتیژی پارێزگاری لەمافەكانیان دەكەن. كۆمار نوێنەرایەتی كۆمەڵگای دینامیك دەكات. هەرچی لەرژێمی دەسپۆتیزمدا پێچەوانەكەی راستە. كەسێك یەكلایەنە چالاكییە ئارەزوومەندانەكەی خۆی بەشێوەی رێسا بەسەركۆمەڵگادا دەسەپێنێ. لەراستیدا جیاوازییەكی ئەوتۆی لەگەڵ رژێمی مۆنارشی (پادشایەتیدا) نییە. جیاوازی ئەوەیە كەرژێمی پادشایەتی بەپشتبەستن بەخانەدان (بنەماڵە)یەكی دیاریكراو, لەرێگای هەندێ رێسای دیاریكراو لەناوخۆیاندا دەستنیشانیانكردووە كەكێ دەكەن بەپادشا, ئەمەش بەگوزارشتێكی نەریتی گەیشتووە. رێساكانی بەڕێوەبەرایەتی, رێساباوو خەرەكییەكانە. جاربەجار لەرەوشی قەیران و ئاڵۆزی باری ئاوارتەیی(نائاسایی)بوون دەردەكەوێت. لەحاڵەتێكی وەهادا یان خانەدانێكی نوێ دەسەڵات وەردەگرێت, یاخود پادشا كۆنەكە رێساكە دەگۆڕێت و درێژە بەدەسەڵاتی خۆی دەدات. هەرچی رێساكانی دەسپۆتیزمە لەخۆیەوە دەیگوازێتەوە. بەشێوەیەكی بەردەوام رێسای ئارەزوومەندانە دادەنێت

و دەیانگۆڕێت. رژێمی پادشایەتی رۆژهەڵاتی ناوین زیاتر لەدەسپۆتیزم نزیکە. لەراستیدا فەرماننامەکان لەناوەرۆکی خۆیاندا فەرموودەکانی دەسپۆتیزمن. هەرچەندە بەنرخ و شێوەی یاسا هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکرێت, وەك بەرهەمێکی تێکۆشانی کۆمەڵایەتی, پەیوەندی بەمافپەروەری (حقوق) وە نییە.

دیکتاتۆرێەت شێوەو بچمێکی جیاوازترە. هەلومەرجی پێشینەی ئیمپراتۆرەکانە, یاخود نموونەی سەرەتاییە. چینی سیاسی هەڵبژاردە (نوخبە) لەلایەن کەسێك یاخود چەندکەسێك پێکدەهێنرێت, کەلەمیانەی دەستڕۆیی نائاسایی پڕچەککراون. بەردەوام دەوروبەرێك هەیە کەدیکتاتۆر بەرامبەریان بەرپرسیارەو حیسابیان دەداتێ, سەرباری ئەوەی ئیمپراتۆریەت رژێمێکی هەمیشەییە, بەلاَم دیکتاتۆریەت کاتییە. لەرەوشە نائاساییەکاندا پەنای بۆ دەبردرێت. سەرباری ئەوەی شێوەگرتنی دەوڵەت لەرۆژهەلاتی ناویندا زۆرنزیکی دەسپۆتیزمە، لەهەمانکاتدا زۆرنزیکی ئیمپراتۆریەت و دیکتاتۆریەتە. دەتوانرێ بگوترێ کەدەسپۆتیزم و ئیمپراتۆریەت و دیکتاتۆرێتی لەکەسایەتی سەرۆك دەوڵەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوین بوونەتەیەك. ئەم راستینەیەش ئەوە نیشاندەدات کەئەو سەرۆکەی خۆی هاوتای دەوڵەت لەقەڵەمدەدات تاچ رادەیەك بەکاریگەرە. لەوانەیە نوێنەرایەتی بەرفراوانترین ئیرادەو کاریگەری لەکەسایەتی سەرۆکی دەوڵەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوین لەئارادابێت. ئەمە پەیوەندی بەناوەرۆکی دەوڵەتیشەوە هەیە. نەریتی باوکسالارێتی بەهێز، شێخایەتی، میرێتی و ئەربابی لەسەرۆك دەوڵەتدا دەبن بەیەك، بەشێوەی هێزێکی بالاَ سەرلەنوێ بەدیدێتەوە. هەربۆیە لەرۆژهەڵاتی ناویندا گەڕان بەدوای شێوەی دەوڵەتی کۆماری و دیموکراتی، بەشێوەی شازبوونیش بێت دۆزینەوەی زۆر ئاستەمە. هەروەکو بڵێی دەوڵەت لەرێگای ناوەرۆکەکەی دەجوڵێتەوە. شێوەکەی (بچمەکەی) دەکات بەیەك و دەخوازێ هێزەکەی خۆی بسەلمێنێ. هەروەها مۆرکی دەوڵەتی نەگۆڕ، واتە نەگۆڕینی شێوەی دەوڵەت و درێژەپێدانی بەلێهاتوویی سیاسی و مەردایەتی لەقەڵەمدەدات.

بەدرێژایی سەدان ساڵ هەڵکۆڵینی شوێنی چەمکی پادشای ـــ خودایی و دەوڵەت لەبیرەوەری کۆمەڵگادا، رۆڵێکی ئاکتیفی لەپێشنەکەوتنی رژێمی کۆمارگەراییدا بینیوە. دەستێوەردانی مرۆڤە ـــ کۆیلەکان لەکاروباری دەوڵەتی خودایی لەگەڵ نەریتەکان ناکۆکەو گونجاونییە. دەستێوەردان لەکاروباری خودا ـ دەوڵەت گەورەترین گوناهە. گووتەی" دەست لەکاروباری خودا وەرمەدەن، حیساب لەخودا ناخوازرێ، لەشەریکی خودا مەگەڕێن" کە بەبەرفراوانی لەپەرتووکە پیرۆزەکاندا باسی لێوەدەکرێت، لەراستیدا گوزارە و دەربڕینی ئایینی گوتەی" دەست لەکاروباری سەرۆك دەوڵەت وەرمەدەن، حیسابی لێمەخوازن، مەبنە هاوبەشی دەسەلاَتەکانی"یە. بانگەشەی ئەوە دەکرێت کەپەرتووکی پیرۆزلەگەوهەری خۆیدا لەپێناو دیاریکردنی حوکمدارێك بۆ تیرەی عیبرانی پێشخراوە. ئەمەش بۆچوونێکە لایەنی راستی خۆی هەیە. تەنانەت باسێکی وەهاش هەیە کەحەزرەتی موسا لەبنەچەی میرەکانی میسرەوە هاتووە. بەیانکردنی نەخشەی حوکمڕانی خۆی لەرێگای تەورات شتێکە دەرکی پێدەکرێت. هەروەها حەزرەتی عیساش کاتێك هەوڵیدەدا حوکمڕانی شاری قودس خۆی گووتەنی"کچی سەهیۆن" بخاتەدەست، ئاشکرابووو دەسگیرکرا. باسی روون و ئاشکراتر لەقورئاندا دەبینرێ. ئەوەی بەشێوەیەکی بەردەوام حەزرەتی محەمەد باسی کردووە" شەریك بۆخودا دروست مەکەن، دەستکاری ئیش و کاروباری خودامەکەن، خودا حیساب لەهەمومان دەخوازێ، حیساب ناداتەکەس" لەرێگای واتای سوننەت و ئایەتەکان، بەزانینەوەبێت یان نەزانینەوە وەك سوڵتان، پادشا، میرەکانی رۆژهەڵاتی ناوین دەروازەی لەپێش سەرۆکایەتی دەوڵەت کردەوە. لەم لایەنەوە قورئان جاڕنامەی دەوڵەتە. لەمیانەی پێشبینییەکی نائاسایی هەروەکو بڵێی سەدان ساڵی داهاتوو بەڕێوەدەبات نەخشەی بەڕێوەبەرایەتی دیاری دەکات و رایدەگەیەنێت. شیکردنەوەی قورئان لەسەربنەمای تیۆری سیاسی دەشێ ئەنجامی فێرکەرو ئەزموونبەخشی لێبکەوێتەوە. بێگومان پێگەو شوێنگەی ئوممەت لەوابەستەیی نێوان خوداو دەوڵەت زۆرروون و ئەزموونبەخشترە. تەواوی جاڕنامە ئایینییەکانی چەرخەکانی ناوین هی ئیسلامییەت و مەسیحییەت و ئایینەکانی چین و هیندستانی رۆژهەڵاتی دوور، وەکو

پێشینەروونکردنەوەو ڕاگەیاندنی ئەو دەوڵەتە نوێیەیە کەلەدایك دەبێ. ئەوەی بەناوی خودا مژدە دەدرێت، چیرۆکی لەدایکبوون و گەشەکردنی ئەو دەوڵەتەی چاخی ناوینە کەهەواڵەکەی ڕاگەیەنراوە.

لەرۆژهەلاتی ناوینی ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دوورخستنەوەی دەوڵەت لەکارەکتەرە دەستڕۆییەکەی، ئەرکێکی زۆرقورسە کەپێویستە سەربخرێت. هەندێك دەوڵەت بەناوی کۆمار لەئاراشدابن، ئاستەمە بگووترێ ئەمانە ناوەڕۆکی دەسپۆتیزمیان تێپەڕکردووە. کۆمارگەرایی پێویستی بەتەبابی و ڕێککەوتنی نێوان چینەکان هەیە. لەمێژوودا لەهیچ یەکێك لەولاتەکانی ڕۆژهەلاتی ناوین دەوڵەتێك یاخود کۆمارێکی دەستووری بوونی نەبووە کەلەرێگای تەبایی و ڕێککەوتنی بیروبۆچوونە جیاوازەکانی کۆمەڵگا دیاری کرابێت. بەبێ تەماشاکردنە شوێنگەی پێشکەوتووخوازی یان پاشڤەڕۆیی، لەبەرئەوەی ڕژێمێکن پشت بەئیرادەی تاکەکەسێك دەبەستن لەگەڵ کۆمارناگونجێن. لەسیستەمی کۆماردا لەجیاتی ئیرادەی تاکەکەسێك، تەبابی و ڕێککەوتن و گونجانی ئیرادەی چەندین کەسی خاوەن هێزی هاوسەنگ بنچینەییە. لاوازی چینە کۆمەڵایەتییەکان، نەتوانینی پێشخستنی ئیرادەی سیاسی، کۆیلایەتی باو بۆدەوڵەت و نەبوونی نەریتی کۆمارگەرایی ئەمانە هەموویان جێگای خۆیان لەمەدا گرتووەو ڕۆڵیان بینیوە. ناویان هەرچییەك بێت، لەتەواوی دەوڵەتانی ڕۆژهەلاتی ناویندا ئەگەر جیاوازی چەند نمرەیەکیش لەنێوانیاندا هەبێت، بەلام دیاریکردن و دەرککردن بەوەی ناوەڕۆکی دەسپۆتیزمی خۆی بەلاوە نەناوە، سەبارەت بەبەڕێوەبردنی تێکۆشانی سیاسەتی دیموکراتی و کۆمارگەرایی گرنگی و بایەخێکی مەزنی هەیە.

هەڵسەنگاندن و شرۆڤەکردنی کولتووری توندوتیژی لەشارستانییەتی ڕۆژهەلاتی ناویندا زۆرگرنگ و بایەخدارە. دەتوانرێ بگووترێ کەهیچ خانەو دەزگایەکی کۆمەڵگای ڕۆژهەلاتی ناوین نەماوە توندوتیژی تێنەکەوتبێت و دیاری نەکردبێت. بەشێوەیەکی گشتی تێڕوانینێکی وەها پێشدەخرێ کەتوندوتیژی ڕۆڵێکی دیاریکراوی بینیوە لەبونیادی سیاسی، کۆمەڵایەتی، تەنانەت بونیادی ئابووریشدا. هەروەها دەستنیشانکردنێکی وەهاش هەیە، گوایە دەسەلات و توندتیژی دووبرای جمکن(دووانە)ن. بەلام لەهیچ شوێنێك بەئەندازەی ئەو ڕۆڵەی لەسەرخان و ژێرخانی کۆمەڵگای ڕۆژهەلاتی ناوین بینیویەتی بەرچاوو زەق نییە. ئاستەمە ڕاستی دەزگایەك هەبێت، بەبێ کەوتنە ژێرکاریگەری توندوتیژی شێوەی گرتبێت.

کاتێك توندوتیژی پێناسەدەکەین پەنابردنە بەرتوێژینەوەی بیۆلۆژی تەنانەت توێژینەوەی سروشتیش بێواتا دەبینم. ڕیشەی کۆمەڵایەتی توندوتیژی ئاشکرایە. پەیوەندی لەگەڵ دەسەلاتی دەوڵەت و جیاوازی چینایەتی پشتبەستوو بەزێدە ــ بەرهەم و زێدە ــ بەها هەیە. دەتوانرێ ئەم تایبەتمەندییانە وەك ئەو تێڕوانینانە باسیکرێ کە لە لایەن زانستی ــ کۆمەڵایەتییەوە هاوفکری بەدەست هێناوە.

ئەوەی سەبارەت بەتوندوتیژی جێگای بایەخە ئەوەیە دەستنیشانکردن دەرهەق بەم بابەتە زۆر کەمە. لەو کۆمەڵگایانەی بەدەسەلات ئاشنابوونە سەرباری ئەوەی بەش و ڕۆڵی توندوتیژی بەرچاوە، بەلام وەها تاوتوێدەکرێ هەروەکو بڵێی دیاردەیەکی بێبایەخ و نەوازەیە. سەرباری ئەوەی شەڕ گوزارەی چڕبوونەوەی توندوتیژییە، بەلام ئاماژە بەوە ناکرێت کەهۆڤێتییەکە تەنانەت لەهیچ کۆمەڵەیەکی ئاژەڵدا نابینرێ. بەردەوام بیانوو بۆئەوە دەدۆزرێتەوە کەبۆچی پێویستییەکە. تاکەبیانووی شەڕ ئەوەیە کەلەپێناو ئازادی و پاراستنی هەبوون و خودی خۆت بێت کەئەمە شەڕێکی ناچارییە، جگەلەمە هەمووی لەپێناو دەستبەسەرداگرتنی بەها کەڵەکەبووەکانی کۆمەڵگا، تالانکردنی، بالادەستبوون، بەردەوام حوکمکردنی کۆمەڵگا لەرێگای بوون بەدەسەلاتی دەوڵەت و شێوەپێدانێتی بە گوێرەی بەرژەوەندییەکانی. سەرباری ئەوەی وەلام هێندە سادەیەو دەرکی پێدەکرێت، بەلام دیسان هەزارویەك بیانوو دەدۆزرێتەوەو لەرێگای هەڵوێستەکانی پەردەپۆشکردن و پێناسەوە هەوڵی شاردنەوەی هەڵە و ناتەواوییەکان دەدرێت. هیچ دیاردەیەك بەئەندازەی سەرچاوە ڕاستەکانی دەسەلات و توندوتیژی بەچەوتی نیشاننەدراوەو نەشاردراوەتەوە. ئەودیاردەیەی لەلایەن میتۆلۆژیا، ئایین، فەلسەفە، تەنانەت هەرەزێدە لەلایەن گوایە زانستی ــ کۆمەڵگا

شێوێندراوەو شاردراوەتەوە توندوتیژییە، کەچالاکییەکی دەرەوەی مرۆڤایەتییە، بەڵام بەدەسەڵاتەو هۆڤترین چالاکی مشەخۆرو چەوسێنەرەکانی کۆمەڵگایە.

ئەم پێناسەیەی بۆگشتی راستە، بۆراستینەی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوینیش راستترو بەجێترە. گووتەکانی لەشێوەی " کوتەك لەبەهەشتەوە ـ کە دورگەی باڵادەستەکانە ـ هاتووە" و" توندوتیژی لەهەنگوین شیرینترە" زۆر بەباشی سەرچاوەکەی ڕووندەکاتەوە. ڕۆڵی توندوتیژی یەکلاییکەرەوەیە لەهێشتنەوەی کۆمەڵگا لەنێو ڕەوشی چەواشەیی و بێهەناسەییدا. لەتەواوی سیستەمەکانی پلەداری و کۆمەڵگای دەوڵەتیدا لەمیانەی پشتبەستن بەتوندتیژی ستاتۆکان ئاواکراون و لەرێگای قەڵغانەکانەوە دەزگاکان پارێزراون. هەردەزگایەك لەلایەن توندوتیژیەوە نەپێچرابێتەوە شانسی ژیانی نییە.

ئاشکرایە لەرەوشێکی وەهادا کۆمەڵگای ئازاد یاخود سفیلبوون پێشناکەوێت. تەنانەت فیکرەکانیش دوای ئەوەی بەپارزنگی توندوتیژیدا تێپەڕدەبن پەسند دەکرێن. لەزەمینەیەکی وەهادا هزری داهێنەرانە ناخولقێت. کاروباری دونیا لەمیانەی ئەوگووتانەوە بەرێوەدەبردرێت کەبەشێوەی قالبی گیراوە پەسندکراوە. لەسەرووی هەموویانەوە دەوڵەت و خێزان، سەرۆکەکانیان زۆرباش دەزانن هێزەکانیان وابەستەی دەسترۆیی و توندوتیژییەکەیانە. کاتێك دەڵێن" باخەڵك بخەینە ناو سیستەمەوە" ئەو ئامرازەی مەبەستیانە توندوتیژییە. ئەو توندوتیژییەی کاریگەرییەکانی دزەی کردۆتە ناو هەموو کون و کەلەبەرەکانی کۆمەڵگاوە جێگایەکی ئەوتۆ بۆهیزی "واتا" و تێگەیشتن ناهێڵێتەوە. هەربۆیە دەزگاکانی کۆمەڵگا تەنیا لەبواری شێوەدا بوونیان دەبێت. ئاشکرایە بەهۆی جێگانەدان بە"واتا" ئەو کۆمەڵگایەی لەداهێنان دوورە، کۆمەڵگایەکە لەو دامو دەزگایانە پێکهاتووە کەلەرێگای نەقیزە ـ نقورچەی دەرەوە دەکەوێتە جوڵە و ناتوانرێ چاوەڕوانی گەشەکردنێکی ئازادانەی لێبکرێ.

نەریتی بەخێوکردنی کۆمەڵگا بەتوندوتیژی، لە یەکینەی هەرەژێریندا کەخێزانە لەئاستی هەناسەبڕیندایە. بەتایبەتیش لەسەر ژنان بەشێوەی شەرێکی شاراوەو نادیارە, تەنانەت یەك خانەی ژنان نەماوە بەهۆی توندوتیژی نەلەرزێ. ڕەوشی منداڵانیش هاوشێوەیە. رێگای بنچینەیی پەروەردە توندوتیژییە. ئاشکرایە ئەو منداڵەی بەتوندوتیژی پەروەردەکرابێ، کەگەورەبوو هەمان شتی لێچاوەڕوان دەکرێت. شانازی بەو باڵادەستییە دەکرێ کەتوندوتیژی بنەماکەی پێکدێنێ، خۆشی و چێژی لێ بەدیدەکرێ. لەکاتێکدا پێویستبوو هەستی بەهێزبوون پاڵپشت بەدەسەڵات و توندوتیژی وەکو مەترسیدارترین نەخۆشی کۆمەڵگا هەڵسەنگێنرێت، بەڵام وەکو خۆشترین و شکۆدارترین هەست و سۆز راگەیەنراوە. دیاردەیەك کەپێویستی بەنەفرەتلێکردنە، شکۆدارکراوەو وەك فەزیلەتێك پێشکەشکراوە.

لەرۆژگاری ئەمرۆشمان بەبێ دەرهاوێشتە (إستثناء) تەواوی دەزگاکانی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین ناتوانرێ بەبێ توندوتیژی بیریان لێ بکرێتەوە. لەتوندوتیژی دەوڵەت تاتوندوتیژی ناوخێزان، لەتوندوتیژی رێکخستنی شۆڕشگێری تادەگاتە توندوتیژی فاشیستی، ئایینی و میللیگەرایی وەکو ئامرازی چارەسەرکردنی هەمووجۆرە کێشە سەرەکییەکان کەوتۆتەگەڕ. دیالۆگ وەك مامانێتی کردنی قسە دەناسرێت. هێندە واتا بەهێزی قسەو گووتەنادرێت. ئەمە لەکاتێکدا کە بارێکی پێچەوانەی ئەمە باڵابوونی شارستانییەتی رۆژئاوای بەدیهێناوە. لەبەرئەوەی یەکەمجار ڕۆڵی قسە لەئارادابوو، تاوەکو دوایی دیالۆگی واتادار پەیرەوکرا, کاتێك چارەنەما ئەوکاتە توندوتیژی بووە شێوازو رێچکەیەك، هەربۆیە شانسی سەرکەوتنیان بەرزبۆوە. بەگوێرەی رۆژهەڵات رۆژئاوا توندوتیژی ناوخۆی شرۆڤەکردووەو ئەزموونی لێوەرگرتووە. سەبارەت بەم بابەتە یەکێتی ئەوروپا بەوریایی و رەخنەدانەوە هەڵوەستەی کرد. تەنانەت کاتێك وڵاتە یەکگرتووەکان توندوتیژی بەکاردێنێ تادوادادە شیتەڵکارە، بەشێوەیەکی هەرەمەکی بەکاری ناهێنێ. هەروەکو چۆن لەسەرکەوتنەکاندا قەرزاری هێزی شیتەڵکارییە،

لەهەمانكاتـدا باشـدەزانێ سـەرنەكەوتنەكانی لەشـیكردنەوەی هەڵـەوە سەرچـاوە دەگرێـت. زۆر چـاك پەنـدو وانـەی خـۆی وەرگرتووە.

پاككردنـەوەی رۆژهـەڵاتی نـاوین لەتوندوتیـژی كێشەیەكی بەرفراوانـەو تـادوارادە گرێـدراوی پەروەردەیـە. متمانـەكردن بەهێزی واتا، بۆئەوە بنچینەییە كەتوندوتیژی تەنیا لەهەلومەرجی ناچاری و بۆگەیشتن بەسـەركەوتن پـەیڕەو بكرێت. نـەك تـەنیا شـەڕ، توندوتیـژی شـۆڕش و دژە شۆڕشـیش، بەشـێوەیەكی راسـت هەڵـسەنگاندنی چوارچـێوەی توندوتیـژی لەهـەموو گۆڕەپانـەكان، كاتێـك بەرپەرچیش دەدرێتـەوە ئامـادەكردنی دژە توندوتیـژی راسـت و ئـەنجامگیر و پراكتیزەكردنـی پێویـستی بەوەستایی و كارامەییەكی مەزن هەیە. كۆمەڵگایەك كـە بەنـەریتی توندوتیـژی هـەزاران سـاڵ گۆشـكرابێت، كاتێـك سـەرلەنوێ دەژێندرێتەوە لەرۆڵی مامانێتی بەولاوە نابێ متمانە بەتوندوتیژی بكرێت، زیاترجێگـادان بـەواتاو دیـالۆگ و هێـزی رێكخـستن، پێوستە وەكو رێچكەیەكی چارەنووسسازی رزگاربوون لەئالۆزی ببینرێ و پراكتیزەبكرێت.

ب ـ رەوشی هەنووكەیی رۆژهەڵاتی ناوین و ئێشكەوتنە شیمانە بوكراوەكان:

بەشێوەیەكی دروست پێناسەكردنی پەیوەندی نێوان نەریتی كۆمەڵگاو رەوشی هەنووكەیی تـاكو ئێـستاش گرفتێكـی جـددی زانستی كۆمەڵایەتی ـ كۆمەڵناسییە. ئەگەر رووداوو قۆناخەكان بەنەریتەوە گرێنەدرێن، چۆن و تا چ رادەیەك دەتوانین دیاردە هەنووكەییەكان پێناسە بكەین؟ تاچ رادەیـەك نـەریت لەسەررەوشـی ئـەمڕۆ بەكاریگـەرە؟ خـودی كۆمـەڵگا لـەناو كامـە پێوانـدا دەتوانێ نەریت و هەنووكەییبوون كۆبكاتەوەو لەناویانـدا بـژی؟ تـاوەكو وەڵامـی ئـەم پرسـیارانە نەدرێتـەوە، ئـەوا ئەنجامـدانی هەڵسەنگاندنێكی واقیعـی سـەبارەت بەرەوشـی هەنووكـەیی و پێـشكەوتنە چاوەڕوانكراوەكان ئاسـتەمە. ئـەو هەڵـسەنگاندنانەی ئەنجامیـشبدرێن ناتـەواوو پڕلەكـەموكورتی دەبـن. وەك پێڕەوێـك، بـەردەوام هەوڵـدانمان بـۆ بەیـەكتری بەسـتنەوەی مێـژووو هەنووكە بۆ ئەم هۆیە دەگەڕێتـەوە. ئەگـەرجارێكیتر ئامـاژە بەقەناعـەتی خـۆم بكـەم، تاڕادەیـەكی مـەزن ئەگـەر بەشـێوەیەكی "جفرەكراو"یش بێت نەریت لەئەمڕۆدا شاراوەیە. ساتی "هەنووكە" و هەلومەرج كەمترلەوەی شیمانەی بۆدەكرێ پێدراوەكانی نەریت دووچاری گۆڕانكاری دەكات. بـەڵام لـەجیهانی دیاردەكانـدا بۆتێگەیـشتنی ئەمـە پێویـستی بەكردنـەوەی كـۆدی هەنـدێ جفـرەی داخـراو هەیـە. هۆكاری ئەنجامـدانی پێناسـە مێژووییـەكان بەشـێوەیەكی بـەردەوام، لـەپێناو كردنـەوەو لابردنـی ئـەم جفرەداخراوو پۆشراوەیەیە كەلەئارادایە.

لەرێگای نموونەیەكەوە دەتوانم زیاتر روونیبكەمەوە. بەهەرحاڵ گومان لەدروستی و دڵسوزی شۆڕشـگێڕێتی لینین ناكرێت و هەموو كەسێكیش دەیناسێ. گریمانی ئـەوە ناكـەم كاتێـك لینـین بەدەسـەڵاتی تیـۆری و كـرداری پەیوەندیـداربووە تـوانیبێتی جفرەكـەی هـەڵبێنێ و بیكاتـەوە. لەبەرئـەوەی نـەیتوانی بیكاتـەوە، لـەرێگای ئەوسیـستەمەی ئـاوایكرد، لەئاسـتێكی بـەرزدا ئامانجەكانی خۆی پاكتاوكردو پووچەڵی كردەوە. گرنگی شیتەڵنەكردن و نەكردنەوەی جفرەكان بەشێوەیەكی راست لێرەدایـە. لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا بێ شومار بیریار هەن, كەدەتوانن لەشۆڕشگێڕەكانی رۆژگاری ئەمڕۆمان زیاترو باشتر پێناسـە سـەبارەت بەدەسەڵات پێشكەش بكەن. راستە هیچ دەسەڵاتێكیان نەڕووخاندووە، بەڵام لەهەمانكاتدا خۆشیان پیس و قێـزەون نـەكردووە. ئایا دەتوانین ئەمانە بەبێبایەخ لەقەڵەمبدەین؟ ئەو یـەكێتی سـۆڤییەتەی لەوجەمـسەرانەی دەسـەڵات ـ پاشماوەكـانی روسـیای قەیسەری ـ دامەزرێنرا كەلینین بەكاریهێناوە، توانی حەفتا ساڵ خۆی لەسەرپێیان رابگرێت. ئـەویش دوای ئـەوەی خزمـەتێكی باشی مێژوویی پێشكەش بەسیستەمە بەرامبەرو ركابەرەكەی خۆیكرد، بەبێ بەرخودان هەڵوەشایەوە. بـەبێ ئـەوەی ئەوجیهانـە ئاگاداربكاتەوە كەلەگەڵیدا لەنێو یەكێتی پەیمان و ئامانجدایە خیانەتی لێكرد. بەڕای من لەجیاتی ئەوەی سیستەمی لینینـستی لەناو ئەو رەخنانەدا نقووم بكەین كەسەروبنیان دیارنییە، تەنیا ئەوە دەستنیشانبكرێت كەجفرە فرەكۆدەكانی "دەسـەڵات" ی نەكردۆتەوە، هەڵسەنگاندنێكی راسترە.

تاوەکو سەرجەم قۆناخ و رووداو و دیاردە شۆڕشگێڕییەکان کە ئەمڕۆ کاری لەسەر دەکەین و بە تایبەتی وەك قۆناخەکانی قەڵەمبازی چۆنایەتی پێناسە دەکرێن، جفرە چەند فاتەکانیان کە لە نەریتەوە سەرچاوەی خۆی دەگرێ نەکرێنەوە؛ ئەوا باوەڕی بەدەستهێنانی پەرەسەندن و گەشەکردنی راست بەگوێرەی ئامانج و ئومێدو چاوەڕوانییەکان، تابلێی خەڵەتێنەرە. هەموو خەم و بیرکردنەوەیەکم ئەوەیە بێ ئەو پێناسە مێژوویی و کۆمەڵایەتییانە کەپێشکەشم کردوون، گەر پڕ لەکەموکوڕی و هەڵەش بن، ئەوا ناتوانرێ رۆژگاری ئەمڕۆمان پێناسە بکرێت. ئەو ژیانە نەهامەتی و پڕلەسامەی رۆژهەڵاتی ناوین لەرابردوودا، بەتایبەتیش لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا تێیدا دەژین، نیشاندەدا کەئەم بابەتە چەندە گرنگ و بایەخدارە. هەمووان لەسەر ئەو راستییە هاوبیرین، کەسەرەڕای ئەوەی دواترین جۆرەکانی تەکنۆلۆژیا لەم ژیانەدا بەکاردەهێزێت، بەئەندازەی چارەسەر نەبوونی لەرێگای بەکارهێنانی هەمووجۆرە پێڕەوەکانی توندوتیژی، لەهەمانکاتدا لەمیانەی هەوڵە ئابووری، دارایی، سیاسی و پەروەردەییەکانیش لەم رەوشە رزگاری نەبوو کەلەهۆڤێتی خراپترە. بەڵام ئەوەش روون و ئاشکرایە کەمسۆگەر پێویستە هەندێ هەوڵی لەپێشینەی خێرا نیشانبدرێت. لەبەر ئەم هۆکارانە، هەرچەندە نەریت لەچوارچێوەی زاراوە سەرەکییەکاندا بەڕووی رەخنەدا کراوەبێت، هەوڵی شیتەڵ و چارەسەرکردنم گرنگ و بایەخدارە. باوەڕییەکی قووڵی وەهام هەیە، کەبەبێ ئەو (هەوڵی شیتەڵ و چارەسەرکردن) هەوڵ و کۆششەکان بێ واتایە و ئەنجامی سەرکەوتووانەی لێناکەوێتەوە.

تەواو سەبارەت بەم خاڵە، کاتێك رۆژهەڵاتی ناوین و تەواوی پایتەختەکانی دێنمە بەرچاوان، نەفرەتکردنی شاری بابل تەوراتم بەئەقڵدا دێت. دیسان نەفرەتی مەسیحییەکان لەرۆما، نەفرەت کردنی شاری ئەگادا (ئەکادا) لەلایەن گۆرانیبێژە سۆمەریەکانەوە دێننەوەیاد. ئایا بەغداد، قودس، مەککە، ئەنقەرە، ئەستەنبۆل، کابول، تەهران، قاهیرەو ئیسلامئاباد دەتوانن بانگەشەی ئەوە بکەن کەبابلی هاوچەرخ نین؟ کامە گەل سەرباری ئەو کولتوورە مەزنەی لەپشتییەوەیە، دەتوانێ لەنێو رەوشی بێچارەیی و ژێرپێیی و سووکایەتیدا بژی؟ چۆن دەتوانرێ لەمیانەی ئەوچەمك و پێڕەوانەی لەناو هیچ پەرتووکێکی شەڕو هونەری دەسەڵاتبووندا بوونیان نییە گەلان بخرێنە ناو ئەم رەوشەوە؟ دەشێ بۆ شێوازەکانی مرۆڤخۆرە هۆڤە ئەفریقییەکان واتایەك ببینرێتەوە، بەڵام ناتوانین هەمان واتا لای ئەژدەها دەسپۆتەکانی رۆژهەڵاتی ناوین ببینین کەگەلانیان دووچاری قڕکردنی جەستەیی و گەوهەری کردووە. ئاستەمە لەتەواوی جیهاندا بتوانرێ جوگرافیایەکی وەکو رۆژهەڵاتی ناوین بدۆزرێتەوە کەتێیدا کوشتن بەوشێوەیە کەوتوو، خائینانەو بێ پێوانە بێت ـ بەگوێرەی خۆیان کارامەییە ـ.

پێویستە باس لەکێشەیەکی دیکەی پێڕەو بکەم. راهیبە هاوچەرخەکانی رۆژئاوا ــ ئەوانەی لەبوارەکانی ئەدەبیات، فەلسەفە، زانست، لقەجیاوازەکانی هونەر کاردەکەن ــ یەکپارچەیی دیاردە، رووداوو قۆناخێك پارچەدەکەن، ئینجا لێیدەکۆڵنەوە. لەو باوەڕەدان تاوەکو لاشەی پارچە نەکەن ناشێ لێکۆڵینەوەو لێتوێژینەوەی لەبارەوە بکەن. ئەمەش بەردەوام ئەو پێڕەوانەی راهیبی سۆمەریم دێنێتەوەیاد کەلەرێگای جموجۆڵی ئەستێرەکانی ئاسمان چارەنووسی مرۆڤیان دیاردەکرد. هەرچەندە یەکێکیان زانستییە، ئەوەی دیکەشیان چەندە میتۆلۆژی (ئەفسانەیی) بێت، بەتێڕوانینی من ئەنجام هەمان شتە. تەنانەت لەو باوەڕەدام کەراهیبە هاوچەرخەکانمان سووك و نزمترن. مادام دەتوانی تاڵەمووێك بۆ چل پارچە بەشبکەیت، بۆچی واتایەکی راست بەوقڕکردنە جەستەیی و گەوهەرییەی سەدەی بیستەم نادەیت کەچەندین جار سەدەکانی دیکەی تێپەڕکردووە؟ بۆچی چارەسەرییەکی ئەنجامگیر، پێشکەش ناکەیت؟ هەر دیاردە، رووداوو قۆناخێك کەلەناو گشتگیری و یەکپارچەییەکەی خۆی تەماشای نەکرێت، بەشێوەیەکی راست پێناسە ناکرێت. راستینەی شیتەڵکردنی پارچە پەکجاروردو بێ سنوورەکان، تارادەیەکی مەزن راستییەکان لەبەرچاوان وندەکات، فێرکەرو ئەزموونبەخش نابێ، فێربوونی تەندروستانە ئاستەنگ دەکات. شێوازی پێکهاتنی مرۆڤایەتی، بەبێ گۆڕینی ناوەڕۆکەکەی لەرەشێکی بەردەوامیدایە.

سیستەمی سەرمایەداری رۆژئاوا لەرێگای پێڕەوی پارچەکردن و گۆڕینی لەرادەبەدەر، شێوازی پێکهاتنەکەی تێکداوە. لەبەر ئەم فاکتەرو هۆکارانەیە کەسیستەم بۆتە کۆمەڵگایەکی قەیراناوی. هونەر، فەلسەفە و زانست رەوشی زهنییەتی مرۆڤ دیاری دەکەن. زهنییەت یاخود رۆحگەرایی پارچە نابێت. پارچەکردن دەیکوژێ. لەرۆژئاوادا؛ بەم شێوازە کوشتنی مرۆڤ زاڵە. تەنانەت دەرخواردی تەواوی جیهانی دەدات و بڵاویدەکاتەوە. گرنگترین لایەنی زانینی مرۆڤ، نوێنەرایەتیکردنی ئەم یەکپارچەییەیە. پێخەمبەرایەتی ئەو زانا پێشەنگەیە کەپیرۆزکراوە. سەختی و زەحمەتییەکانی لەوهێزانەوە دێت کەهەڵوێستی یەکپارچەیی بەبنەمادەگرن. هەرنوێنەرو دەزگایەکی کۆمەڵگا زانست، فەلسەفەو هونەری هەرس نەکردبێت، راستی پێکهاتەکە دەشێوێنێ و تێیکدەدات. وەك ئەنجام هەمووجۆرێکی لادان سەرچاوەی خۆی لەپێنەدانی چەمکی یەکپارچەیی دێت. سامناکترین نەزانی، تەماشاکردنی دیاردەو رووداوو قۆناخەکانە لەمیانەی زهنییەتی یەکلایەنە ــ راستتر زهنییەتی پارچەکراو ــ. چونکە راستی دەکوژێ. ئەمەیە نەخۆشی سیستەم و سەردەم. بۆ نموونە: تێڕوانینێك کەهەرەزێدە بەگوێرەی ناوەڕۆکی زانستە، پێویستە بەشێوەیەکی هەرە ساختەکارانەی نەزانی ببینرێ. زانستگەراییەك لایەنی رۆحگەرایی نەبێ، ژێری سۆزداری ونکردبێت ــ زانستگەرایی لەهەمانکاتدا ژێریەکی ئانالیتیکی بێکۆنترۆڵە ــ بۆهەموو مەترسییەك کراوەیە. جۆرێك لەشێرپەنجەی گووتەو گێڕانەوەیە.

گرفت زۆرزانی نییە؛ بەڵکو چۆنییەتی ژیانێکە بەگوێرەی زانین. لەمیانەی یەکپارچەیی تەواوی رەهەندەکانی زانین ــ زانست، فەلسەفە، هونەر ـ درێژەدان بە دۆخی زهنییەتی کۆمەڵگا، گەوهەری هەبوونی کۆمەڵگایە. ئەوەیە ئەو راستینەیەی چاخەکەمان رووخاندوویەتی. هەربۆیە زانست بۆتە رووخێنەرێکی زەبەلاح. بۆنموونە داڕووخانی ئەتۆمی یان هێزی داڕووخاندنی ئەتۆمی گوزارەی سەمبۆلی (رەمزی) راستییەکە. دروستکردن و بەکارهێنانی بۆمبای ناووکی دژبەخودی مرۆڤە، چالاکییەکە لەوەی مرۆڤخۆرەکان هۆڤانەترە. خودی زانستی کۆمەڵایەتی (کۆمەڵناسی) کەپێویستبوو ئەرکی رێگرتن لەپارچەکردن و بەدەستهێنانی یەکپارچەیی بێت، خۆشی پارچەبووەو بووە بەسەرچاوەی سەرەکی مەترسییەکە. ئەنجام لەسەرتاپای جیهاندا، شەڕە هەرێمی و خۆجێیە بێ ژمارەکان، میللیگەرایی، فاشیزم و هەموو جۆرێکی توندوتیژییە. لەبەرئەم هۆیە لەبەرگرینامەکەمدا، ئایین، میتۆلۆژی، فەلسەفە، زانست و ئەدەبیات و زهنییەتی گونجاوو هەمئاهەنگم لەناویەکدا بەبنەماگرتووە. بەرگرینامەیەك کەدەرهەق بەناوەڕۆکی مرۆڤ و گەلان بێت، تەنیا لەسەرئەم بنەمایە پێشدەخرێت. هێزی بەرگرینامەیەك، وابەستەی هێزی بەرخودان و شیتەڵکارییە بەرامبەر ئەو تیۆرەی شارستانی کەخراوەتە ئەستۆی.

1ـ رەوشی کائیوس (گێژاو)ی ئێستای رۆژهەڵاتی ناوین کە ریشەکەی بۆ رابردوو دەگەڕێتەوە راستینەیەکە. لەنێوان ئەو دوو لایەنی و دووالیزمەی کە لەنێوان ریشەی هەزاران ساڵی شارستانییەت و شارستانییەتی ئەم دووسەد ساڵەی دواییدا هاتۆتەئاراوە لەجیاتی چارەسەری گرێکوێرەی بەرهەمهێناوە. لەکاتێکدا شارستانییەتی رۆژئاوا لەتەواوی ژیۆ ـ کولتوورەیەکاندا سیستەمی وەهای پێشخستووە کەدەرفەتی ژیانی تێداهەیە، بەڵام لەئاواکردنی سیستەمی خۆی بەگوێرەی رۆژهەڵاتی ناوین سەرکەوتوونەبووە. کێشەکان دوورن لەوەی کەهەرێمی بن. سەرباری ئەوەی رەخنەیەکی زۆری ئاراستە دەکرێ، گووتەی "پێکدادانی شارستانییەتەکان" ی هونتینگتۆن لەهەندێ لایەنەوە راستە. پێکدادانی شارستانییەت بوونی هەیە. بەڵام ئەمە پێکدادانی نێوان ئیسلام و شارستانییەتی رۆژئاوا نییە. بوویەرێکی قووڵ و گشتگیرترە. تەنانەت ئیسلامییەت لەنێو ببرێت و نەشمێنێت، دیسان بنەماکانی پێکدادان بەردەوام دەبێت. بەتایبەتی لەئێراقدا لەئەنجامی دەرکەوتنی هەموو خراپییەکان قوتووی پاندرا ـ چیرۆکێکی یۆنانییە، گوایە ژنێکی بەناو پاندرا، هەموو باشی و خراپییەکانی لەناو قوتوویەکدا کۆدەکاتەوە، سەری قوتووەکە هەڵدەگرێ و ئەوەی تێیدایە بڵاودەبێتەوە، کاتێك خوداوەندەکان هەست پێدەکەن دەخوازن رێگری بکەن، کەسەری قوتووەکەی پێ دادەخەنەوە، تەنیا ئومێدی تێداماوەتەوە، بۆیە بەردەوام دەڵێن ئومێد شاراوەیە ــ ئەوە دیار دەبێت

کەلەقوولاییدا شتێك خۆی مەڵاسداوە. شیتەڵکارێکی وریا ئەگەر تەماشایەکی ئەو زەلکاوەی ئێراق بکات ئەوا زەحمەتی لەوە نابینێت و تێدەگات کەلەژێرناوی چارەسەری، هەموو شێوە هاوچەرخ و مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان دەرکەوتوونەتە سەرشانۆ، هەمووشیان ئەنجامیان لێنەکەوتۆتەوە. لایەنەکانی شەڕ کە کاریکاتۆریزەکراون سەددام و بۆش نین، بەڵکو ئەو سیستەمە بێ ژمارانەن کەتێکەڵاوی یەکتری بوونە. سیستەمە یەك لەدوایەکەکانی لەسەردەمی نیئۆلیتیکەوە هاتوون، لەمیانەی هەمەڕەنگی ئەتنیکی، ئایینی، رەگەزییانەوە لەناو ئیمپراتۆریەتی قەیرانـدا کەئەمریکا ڕێبەرایەتی دەکات، هەوڵدەدەن جێگای خۆیان بکەنەوە یاخود پێهەڵگرتنێك ئەنجام بدەن.

ئاواکردنی هاوسەنگی لەشەڕە سەربازیەکاندا شتێکە دەرکی پێدەکرێت. بەڵام لەشەڕی شارستانییەتەکاندا دەستنیشانکردنی هاوسەنگی ئاستەمە. چونکە ناوەڕۆکی پێکدادانەکە ئاڵۆزە. بەکارهێنانی چەکە سەربازیەکان سنووردارە. فاکتەرە کاریگەرەکان لەپێکهاتە کۆمەڵایەتی، سیاسی و هزریەکانیدا شاراوەیە. دەشێ بۆ ئەنجامگیربوون چەندین سەدە بخایەنێ. لەوانەیە رێگەچارەکانی جیاوازبێ، لەسەر لەنوێ ئاواکردنەوە تادەگاتە گۆڕانکاری رادیکاڵ هەموویان لەخۆوە بگرێ. پێویستە فاکتەری کات (زەمان)ی ڕووبەڕووبوونەی هەردوو سیستەم رەچاو بکرێت. هەرچەندە رۆژهەڵاتی ناوین لەرێگای دواترین شارستانییەتەکەی کەئیسلامییەتە بەرخودان بکات, بەڵام ئەمە لەسەمبۆل بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە. ئیسلام مەزنترین بەرهەمەکانی خۆی لەسەدەکانی 8 ـ 12 ی زایین پێشکەشکردووە. ئەوەی قۆناخەکانی دواتر تەنیا توێکڵە. رابردوو لەبەهای ناوێك بەولاوە زیاتر کاریگەری نابێت. هێندە دووری سەردەمە، تەنانەت ناتوانرێ ریفۆرمیزەش بکرێت. بەرخودانی ئەم سێ ساڵەی دوایی شتێکی دروستکراوە. ئەم بەرخودانەی لەنێو زەمینەو هەلومەرجی شارستانییەتی رۆژئاوادا بەڕێوەدەچێت، لەسایەی خودی رۆژئاوایە. هیچ تایبەتمەندییەکی جیاکاری نییە. بەرپەرچدانەوەی بەناوی ئیسلامییەت، لەسەرەتاوە بەواتای پەسندکردنی دۆڕان دێت. ئەوداهێنانانەی شارستانییەتی رۆژئاوا بەتایبەتمەندێتی خۆی ئافراندوویەتی، لەشتێکی دروستکراو بەولاوە هیچیترنییە. بەشداربوون و کاریگەرییە سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووریەکان لەجیاتی رۆڵی چارەسەرکردن، بنبەستبوون زیاددەکەن. شوێنێك نییە پێهەڵگرتنێکی لەشێوازی ئیسرائیل ئەنجام بدات. بەشێوازی ئەفریقیاش نابێت. کولتووری ئەفریقیا دەتوانێ لەناوەخۆیدا ململانێ بکات، بەڵام دەشێ تەنیا بۆ پەسندو هەرسکردنی ئەورووپا هەوڵبدات. لایەنێکی واتاداری پێکدادان یاخود سەرکەوتنی زۆرسنووردارە. وڵاتەکانی وەکو چین، هیندستان و ژاپۆن لەرێگای گواستنەوەی سیستەم بۆ ناوچەی پاسیفیك بەشێوەیەکی کارامە لەوانەیە ئەنجام بەدەستبێنن. کولتوورەکەیان لەجیاتی بەرخودان، تەبایی واتادار دەکات و سەریدەخات. بەهۆی ئەوەی پێنج سەدساڵە بونیادی کولتووری ئەمریکای لاتین لەگەڵ سیستەمدا دەژی، بەزەحمەتیشەوە بێت دەتوانێ لەرێگای خوڵقکارکردنی ئەوژیانەی شایەنی درێژەپێدانە سەرکەوتن بەدەستبێنێ. کولتووری رۆژهەڵاتی ناوین لەهیچ یەکێکیان ناچێت. لەرژێمەکانیانەوە تادەگاتە تاکەکانیان، لەزهنییەتەکانیان تادەگاتە پێکهاتە (بونیاد)ی ئابوورییان، قەیرانێك، گێژاوێك(کائیوس) لەئارادایە, کەئیتر ناتوانرێ درێژەی پێبدرێ.

لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا زهنییەتی رۆژهەڵاتی ناوین تەواو لەنێو ئاڵۆزی و کێشمەکێشدا دەژی. زۆر لەشۆڕشی زهنی شێوازی رۆژئاواوە دوورە. هیچ پێویست نابینێ لەنێو هەلومەرجی تایبەتی خوێدا بەرێنیسانس، ریفۆرم و رۆشنگەریدا تێپەڕبێ. بەڵام دوودڵ نییە لەبەکارهێنانی دوا مۆدێلەکانی بەرهەمی کردارییان. هیچ شتێك سەبارەت بەریشەی مێژوویی و گەشەکردنی ئەو زهنییەتە نازانێ کەگوایە بەهی خۆی دادەنێ. شرۆڤەکردنی مێژوو، لەپیاهەڵدان و پەسندانێکی وشکی گروپەکان بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە. بۆ زهنییەتی جەماعەتەکان (گروپەکان) مێژوو بەواتای پیاهەڵدانی خۆیان و بەدوژمن لەقەڵەمدانی بەرامبەرەکەیانە. لایەنی دیکە، واتە لایەنی سێیەم بوونی نییە. تەنانەت ئەمەش بەبیری خۆیدا ناهێنێت کەچەندە بابەتییە و تاچ رادەیەکیش راڤەکردنێکی خودیی (ذاتـی)یە. هەروەکو چۆن سەنتێز(کۆتێز) لەنێوان

قاڵبەکانی زهنییەتدا نییە، فێربوونێکی وەهاشی نییە بیر لەدوولایەنی یان دوالیزمی تێز، دژەتێزبکاتەوە، خووێکی وەهای لاپێشنەکەوتووە. جیهانبینیەکی نزیکی چەمکی "رەش ـ سپی"یە. لەجیاتی رێنیسانس و سروشتی بەجۆش و زیندووی چاخی نیئۆلیتیک، بۆچوونێکی رەشبین و بێئومێدی سەبارەت بەسروشت هەیە. لەتێڕوانینی سەبارەت بەکۆمەڵگا بەئەندازەی بێبەشی لەئۆتۆپیا، فاکتەرە جوانەکانی نەریتی میتۆلۆژیاو ئایینیشی لەدەستداوە. بەو ئومێدو جۆشوخرۆشەوە، نزیکی ئەوانەی پێش و دوای خۆشی نابێتەوە. کاتێك ئەمانە نەبن داهێنان و خوڵقکاریش بوونی نییە. بەرهەمە زانستی، فەلسەفی و هونەریەکانی زهنییەت وشکبووە. بانگەشەیەکی ئەوتۆشی نەماوە. هیچ کاتێك رەوش و هەلومەرجی رۆحی کەلەشەیدایی (شێتایەتی) خراپترە کەم نەبۆتەوە. شانازیکردن بەرابردوو، ئومێد بە'ئایندە، لەمێژە ونبووەو نەماوە. دوورە لەوەی مانا بەژیان ببەخشێ، لەهیچ چالاکی و تواناکارییەکانی ژیان خاوەن بانگەشەنییە. داخوازی تێگەیشتن و دەرکپێکردنی کزبووە. ئەوەی بەهەموو هێزو توانای خۆیەوە پێداگری لەسەردەکات، تەواوکردن و بەسەربردنی رۆژە. تەنانەت لەگۆڕەپانی فراوان و سەرتاپاگیری کۆمەڵگاشدا، لەپێڕپێڕێتی هەرزان بەولاوە توانستی خۆی پێشنەخستووە. تەواوی کاری رێکخستنی و پارتایەتییەکەی، پشت بەخۆسەنتەربینین دەبەستێ. هەربۆیە زۆرساختەکارە و بە کۆمەڵکوژی بەهاکانە. خێزانگەراییەکی سەمبۆلی (رەمزی) وەها پەناگەیەتی. خێزانگەراییەك کەلەمێژە کۆتایی بەواتاکەی هاتووە لەوانەیە لەسەرووی گۆڕەپانەکانی ژیانی پاشڤەڕۆیانەوە بێت. خۆشەویستییەکی قووڵی مرۆڤ، مرۆڤدۆستی و مرۆڤپەروەری بوونی نییە. پێناسەی مرۆڤ بوونی نییە، تاوەکو خۆشیبوێت. تەنانەت لەگەورەترین نەتەوەگەراییەکەیدا (میللیگەراییەکەدا) بازرگانییەك جێگای باسە, کەلەرێگای بەرژەوەندیپەرستییەوە بەچڕی چنراوە. بەپووختی لەدوای جیهانی زهنییەتی مێژوویی رۆژهەڵاتی ناوین ماوەتەوە، لەبیرچوونەوەیەکی مەزن، خاوەندارێتیکردنی نەزان و کوێران، بەتەواوی بێبەشی لەداهێنان و سیحرێك ماوەتەوە کەناتوانین وەکو خەیاڵیش بەناوی بکەین. فیزو نەفەسبەرزیەکەشی بەدەستهێنانی زهنییەتی رۆژئاواو رۆژهەڵاتی دوور پەسندناکات. هێزەکەشی تێری ئەمە ناکات.

لەم پێناسانەی زهنییەتدا, کەدەتوانین زیاتر پێشیانبخەین, لەسەر کامەدیاردەو رووداو یاخود قۆناخ رەنگبداتەوە، ئەنجامێکی رۆشنکەرەوەو چارەسەرئامێزانە دەرناکەوێتەڕوو. بنبەستبوون لەزهنییەتدایە. کاتێك قاڵبەکانی زهنییەتی ئایین، میللیگەرایی و سۆسیالیزم لەگەڵ ئەم زهنییەتە بوون بەیەك، ناوەڕۆکی راستەقینەی خۆی وندەکات و بۆ بێچارەترین ئامرازدەگۆڕێن. ئەم رەوشەی لەزهنییەتدا هەیە، سەبارەت بەهیچ کێشەیەك ناتوانێ چارەسەری پێشبخات. وەك تایبەتمەندێتی سروشتەکەی کاتێك لەگەڵ زهنییەتەکانی دیکە توانستی پێکهێنانی سەنتێزی نییە، تەواوی نەخشەکانی چارەسەری بەر لەراگەیاندنیان واتای خۆی لەدەستدەدات. بەشێوەیەکی واتادار، نەکرداری وەرگرتن نەکرداری بەخشین ئەنجامنادات. زهنییەتێکی هاوشێوەی (پیاهەڵدانی شێتایەتی)یش لەئارادانییە کە سەردەمێك لەئەوروپا لەئارادابوو. هەرهیچ نەبێ ئەشقێکی کوێرانە لەزهنییەتی لەیلاو مەجنوندا هەبوو. تەنانەت لەڕۆژگاری ئەمرۆماندا ئەگەر کوێرانەش بێت هیچ پاشماوەو شوێنپەنجەیەکی خۆشەویستی لەئارادا نەماوە. ئەنجام پووچییە (نەهێلیزمە)، خۆکوژییە. دوا وێستگەی ونبوونی واتای هەبوونی مرۆڤە. کەلەوە تێپەڕی ئیتر هەرجۆرێکی شێتایەتییە. ئەو شێتایەتییانەی لەجوگرافیای ئەفغانستانەوە تا وڵاتی مەغریب لەئارادایە، لەکامە شوێنی دیکەی جیهان و لە چ زەمەنێکدا دەبینرێ؟. تەنیا روونکردنەوەی ئەم رەوشەی لەئارادایە, لەمیانەی زاراوەی تەسکی ئابووری، سیاسی و سەربازی، بەناتەواوی دەمێنێتەوە، نەخۆشی لەزهنییەت دایە. بەڵام پێویستە شەرێکی واتاداری بەهێز پەیڕەوبکرێت. پێویستی بەمەولاناگەرایی، مانیگەرایی و رووناکگەرایی هاوچەرخ هەیە، کەلەمێژووی رۆژهەڵاتی ناویندا بەچڕی نموونەیان بینراوە. تەنانەت لێرەشدا تەریقەتگەرایی ساختە هێندە نەخۆشی زهنییەتە، تاوەکو تێپەڕنەکرێت، ئەوا هیچ یەکێك لەبەها سەنگین و بەرێزەکانی مێژوو لەرەوشێکی وەهادا نییە هێزبەخشبێ.

هەرچی زهنییەتەکانی دیکەی چاخە، لەدۆخێکی وەها کەخۆیان لەنێو قەیراندان تاچ رادەیەك دەتوانن رۆڵی چارەسەری و ئیجابی ببینن؟. تەواو لەبەر ئەم هۆکارانە پێویستە واتاو گرنگی و بایەخی شەڕی زهنییەت بزانرێ, دەبێ هەوڵدان لەم پێناوەدا ببێتە ئەرکی سەرەکی و هەنووکەیی.

ئاشکرایە بۆ سەرخستنی رۆشنگەری زهنی بەئەندازەی دەرککردنێکی گشتی و گەوهەری مێژوو، ئەوا گەیشتن بەئاسۆی فەلسەفە و زانستی هاوچەرخ، مەرجی لەپێشینەن. تاوەکو فەلسەفە و زانستی رۆژئاوا هەرسنەکرێت، دەرفەتی ئەوەنییە لەگەڵ مێژوو ئاوێتەبێت و سەنتێز پێکبهێنرێ، ئەمە کاروبارێکی وەهانییە لەرێگای ئیسلامگەرایی، بوداگەرایی بەرێوەبچێت. لەبەرگرینامەکەمدا ئەگەر لەناوەرۆکی گەلاڵەنامەیەکیش دابێت، ململانێیەك لەگەڵ زهنییەتی رۆژئاوادا دەبینرێ، بەڵام بەشێوازێکی کوێرانە نییە. بەشێوەیەکی زۆر دروست و گەوهەری هەوڵی پێگەیشتنی دەدەم. ناشێ من لەرێگای زهنییەتی رۆژئاواوە ئاسوودەببم. لاوازیەکی مەزنی لایەنی مۆراڵ (مەعنەویات)یان هەیە. بەڵام لەهەمانکاتدا خاوەنی قووڵاییەکی نائاسایی زانیاری زانستیانەن. ئەولایەنەی ئیرەیی پێوەدەبەم، توانستی سەرخستنی ئەم هەوڵەیە. هەربۆیە رێزی لێدەگرم. شانبەشانی ئەمەش باوەڕی مسۆگەرم بەوەهەیە کەنەخۆشییەکی مەزن یاخود ناتەواوی لەم بوارەوە سەرچاوەی خۆی دەگرێت. لەوبڕوایەدام وەکو مەعنەویات و ئاکار لەبوون بەڕاهیبێکی هاوچەرخ بەولاتر، بەهایەکی دیکەیان نییە. لەو قەناعەتەدا نیم بتوانن ئەم لاوازیانە تێپەڕبکەن. تاڕادەی لووشدان هێندە بەبێ ئامانی هەڵوەستەکردن بەرامبەر بەکۆمەڵگاو سروشت، مرۆڤ دەترسێنێ. بەئەندازەی زانینەکەیان پێویستبوو بەهایەکی ئاکاریش بخوڵقێنن. بێبەشکردنی سیستەم لەئەخلاق چۆن جێگای لەناو ویژدان و زهنییەتە رۆشنبیرییەکەیان بۆتەوە؟ کێ و چی ئەوانی بێگاریگەرکرد؟ لەوانەیە لەمێژبێت دەسەڵات ئەوانی کڕیبێت. چینی زانست (زاناکان) لەکارکەران زیاتر وابەستەی خاوەن کارەکانیانن. ئەمەیە هۆکاری بێ ئومێدییەکەم. هەروەکو دەزانرێ لەسەردەمی رێنیسانسدا بەرخودانی بێهاوتا هەبوون. تاچ رادەیەك دەتوانین" گیۆردانۆ برۆنۆ" بکەینە مۆلکی هەنووکە؟ دیسان دەتوانین ببینە دەنگی سوقرات؟ هیچ کەسێك ناتوانێ بانگەشەی لەناوچوون و ونبوونی ئەم زهنییەتە گەورانە بکات. نابێ بەلاوەبنرێن، بەڵکو پێویستە زیندووبکرێنەوە. هەروەها پێویستە ئەوانەی وەکو مەولانا، مەنسووری حەللاج، مانی و سەهرەوەردیش زیندووبکرێنەوە. وەکوتر پێویستی بەهاوچەرخکردنەوەی گەوهەرو رۆحی پێغەمبەرایەتی هەیە. دەبێ وەها تێبگەین، بەواتایەك لەواتاکان, ئەوان نەمردوون و لەمیانەی نوێنەرایەتیکردنێکی راستەقینەیاندا بژین، ئەم ئەڵقانە دەتوانن ئێمە لەزهنییەتە هەنووکەیی و پێویستەکان نزیك بکەنەوە. دەتوانن بەهاکانی رەچەڵەکی ئەم چاخەمان جیابکەنەوە. بەڵام زیندوو کردنەوەی ئەوانەی زۆر بەخراپی دۆڕاندوویانە، کاریگەرییەکی خوڵقکارانەیان نابێت.

کاتێك پێویست دەکات گەلێك، گەلی کورد، لەکەسایەتی ئەویشدا بەرگری لەتەواوی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین بکەی. پەی بەوە دەبەم کە ئەمە گەورەترین هێزە یاخود هێزی وەرچەرخانە. زۆر باش دەرك بەوەدەکەم کەپەنابردنە بەر ئەم هێز یان ئەو هێزە سیاسییە، واتای درێژەپێدان و بەردەوامکردنی بێچارەیی جارانە. لەم چوارچێوەیەشدا دەبینم کەهەر هاوکارییەك لەوانەیە لاوازیەکە بەخێوبکات و هێزی پێنابەخشێ. ئەگەر هەر فریادڕەسێك پەنا نەباتە بەرفریشتە، ئەوا لەوانەیە زهن پێشبخات. ئەگەر بتوانێ لەدەرهەق تەنیایی دەربکەوێت و بەرگەی بگرێت، لەوانەیە بۆ ئەو زهنییەتەی ببات کەچاخ پێویستی پێیەتی. تەواوی سیستەمی جیهان لەزەمینەی رۆژهەڵاتی ناویندا فشاری بۆهێنام. گرنگ نییە ئایا بەزانین بوو یان لەخۆیەوەو بەنەزانین. بەڵام ئەگەر "ناتۆ" گەورەترین هێزی سەربازی سیستەم بێت، ئەمریکا، ئینگلتەراو ئیسرائیل لەگەڵ یۆنانی تەڵەکەباز تەنیا بۆ ئەوەی من بکەن بەگەورەترین مەترسی، بەئەنقەست منیان خستبێتە ناو تەنیاییەك کەهۆکاری جیاوازی هەیە، گەورەترین کاری پەیڕەوی بکەم شەڕی هزری و مۆراڵە(مەعنەویاتە). شەڕێك کەدەتوانێ ئەوانیش بێنێتەوە هۆش خۆیان، دەتوانێ ئەوشەڕە گەورەو راستەقینەیەش بەسەرکەوتن بگەیەنێ کەلەرۆژهەڵاتی ناویندا بەرپاکراوە.

لەڕۆژهەڵاتی ناویندا دەسەڵاتی دەوڵەت ڕێگای زهنییەتی داخستووە، هەروەها بەوکارەکتەرەی کەلەڤەبوونی کۆمەڵگادا دەستپێشخەری شڤیل ناناسێ، تەواو بووە بەکۆسپێك. پێناسە مێژووییەکەی ئەمرۆش ڕووناك دەکاتەوە. هەرچەندە هەوڵ بدات کارەکتەرە دەسپۆتەکەی لەڕێگای دەمامکە هاوچەرخەکانی میللیگەرایی، کۆمارگەرایی و سۆسیالیستی پەردەپۆش بکات، بەڵام دیسان نەگۆڕاوە. ڕاوەستەی ئەم دووسەد ساڵەی دوایی بۆ هێزی خۆی ناگەڕێتەوە. کێشمەکێشەکانی ناوخودی ڕۆژئاوا ڕۆڵێکی سەرەکی لەمەدادەبینێ. لەسەدەی بیستەمیشدا لەئەنجامی لێکدانەوەو هاوسەنگییەکانی بەهۆی هەبوونی سۆڤییەت و فاشیزم لەئارادابوون، توانیویەتی درێژەبەهەبوونی خۆی بدات. لەڕاستیدا لەگەڵ جەمسەرە سەرەکییەکانی دەسەڵاتی جیهان لەناو هاوسەنگییەکی زۆر ناسکدایە. گوزارەی دەوڵەتی چەتە یان سەرسەری بۆئەم پێگەو شوێنگەیەی دەگەڕێتەوە. لەدوای هەڵوەشاندنەوەی سۆڤییەت ناسکبوون (مەبەست هاوسەنگی ناسکە) جێگای خۆی بۆ دەسەڵاتی حکومەتە جەمسەرگەرەکان بەجێهێشت کەلەپارچە سەهۆڵەکانی ناو ئۆقیانۆس دەچن. بەهۆی ئەو پێگەیەیان مەترسیدارن. لەوانەیە لایەنی سەرکەوتوو و ژێرکەوتووی شەڕەکان چارەسەری لەهاوسەنگییەکی نوێدا بدۆزنەوە. دەسەڵاتی ڕۆژهەڵاتی ناوین، هەڵوێستی داخراوبوون بەرامبەر بەچارەسەری بەهونەرێکی سەرەکی دەسەڵات لەقەڵەمدەدات. لەوانەیە ئەمە بەناوی بەرژوەندی دەسپۆتیزم ئەنجامبدات. بەڵام بەناوی بەرژەوەندی نەتەوەی شکۆمەند، یەکێتی و یەکپارچەیی دەوڵەت و وڵات، شاردنەوەی بەختەوەری کۆمەڵگاو پەردەپۆشکردنێکی بەکاریگەر ئەنجام دەدرێ. گەل بێچارەیە، وڵات بووە بەوێرانە، نەتەوەو کۆمەڵگا زۆر لەئاسوودەیی و بەختەوەری دوورن، بەڵام بەخەیاڵیشیاندا نایەت. بەکاریگەرترین پێڕەوی سیاسەت دیماگۆژیەتە. بەناوی دیموکراسی وردترین پێڕەوەکانی ڕێکلام و خۆناودارکردن پێشخراوە. لەمیانەی درۆو فێڵبازییەوە داپۆشین و شاردنەوەی ئەو بابەتانەی دەوڵەت پێیەوە خەریك دەبێ، بەوەستایی و کارامەیی سیاسەت لەقەڵەمدەدرێت. هەروەکو تۆپیێ فڕێدانی گەل لەولاوە بۆلایەکەیتر وەکو پێڕەوێکی بەکاریگەر دیاریکراوە.

سەرەڕای ئەوەی سیاسەت هونەری چارەسەرکردنی کێشە ژیانییەکانی کۆمەڵگایە، بەڵام لەواقیعی ڕۆژهەڵاتی ناوینی ئێستاماندا بۆ ڕاستینەی سەرگرتن و داخستنێکی کارامە گۆڕاوە. تەنانەت بەهای سیاسەتی موحافەزەکاریشی نییە. لەهەلومەرجی خوێدا فاشیزم وەك چارەسەریەك دێت. لەڕۆژهەڵاتی ناویندا لەجیاتی فاشیزم، هێشتا شێوەکانی چاخی دێرین جێگای باسە. بێ شانسی لێرەدایە، کاتێك لەکەناری ڕووخانبوو، تەنانەت پێویستبوو بڕووخێ، حیساب و لێکدانەوەکانی هاوسەنگی لەخۆڕا دووسەد ساڵی دیکە تەمەنی درێژکرد. کاتێك لەمیانەی تەکنۆلۆژییە سەربازییە هاوچەرخەکانیش پڕچەککردنی هاتەسەر ئەمە بووبە "لێڤی ئاتهان" ـ لەتەوراتدا ناوی دڕندەیەکە لەناودەریا دەژی، بۆبنەبڕکردنی هەمووجۆرە خراپەکاریەکان مەرجە بکوژرێ و لەناوببرێت ـ0

تیۆکراتی لەبناخەی دەوڵەتدا هەیە. لەهیچ قۆناخێکدا دەستی لێبەرنەدراوە. دەوڵەتی تیۆکراتی لەجیاتی بچم پێویستە لەناوەڕۆکدا ببینرێ. بینینی ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆژی هەوێنی (خەمیرەی) ئەو دەزگایە گرنگەیە کەلەدەوروبەری پەرستگای ڕاهیبەکانی ڕۆژهەڵاتی ناویندا بەرزبۆوە. پەیوەندی باوەڕبوون لەزهنییەتدا نەبێ، زۆرئاستەمە لەڕێگای توندوتیژی ڕووتدا بۆماوەیەکی درێژخایەن هەزاران کەس لەخزمەتی پەرستگا بهێڵێتەوە. ناوەڕۆکی پیرۆزی و ئیلاهی دەوڵەت، لەم پێویستییەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەگەر پشت بەمیتۆلۆژی یاخود باوەڕی ئایینی ببەستێ، تاوەکو پشت بەزهنییەتی باڵادەست نەبەستێ و ڕەوابوون بەدەستنەهێنێ، تەلاری دەوڵەت قایم نابێت، تەمەندرێژنابێ، داخوازی دەسەڵات لای ئەو تیرە عیبرانیانەی ڕۆڵێکی گەورەیان لەپێکهێنانی ئایینی تاکخودایی بینی، بەرامبەر بەهەبوونی دوو دەوڵەتی شکۆمەندی میسرو سۆمەر، پێویستی ئاواکردنی دەوڵەتێکی جیاوازی پێشخست، ئەمەش خەم و پەژارەی سەرەکی کتێبی پیرۆزبوو. بەجۆرێك لەجۆرەکان بناخەی ئایدیۆلۆژی پادشایەتی عبرانییە. بەتایبەتیش بەشەکانی "سامۆئیل 1 "و "سامۆئیل 2 "هەروەکو بڵێی مانیفێستۆی

دامەزرانـدنی دەوڵـەتی یـەهودا (دەوڵـەتی خـودا)یـە. لەبناخـەی ئیمپراتۆریـەتی پـارس ــ مـاددا زەردەشـتی فاکتـەرێکی ئـایینی دیاریکەرە. لەدوای رۆما ئایینی مەسیحی بوهێل(جینات)ی هاوبەشی تەواوی دەوڵەتـەکانی ئەوروپایـە. دەوڵـەتی ئیـسلامی هـەر لەسەرەتای سەرهەڵدانییەوە خودی ئایینە. تەواوی دەوڵەتە ئیسلامییەکانی چاخی ناوین، بەشێوەیەك خۆیان بەدەوڵەتی ئایین لەقەڵەمـدەدەن هـەروەکو بڵێـی ئەگـەر ئـەوان نـەبن نابێـت. ئیـسلامی شـیعە کـەجێگای زەردەشـتایەتی گرتـەوە، تائێـستاش ئایدیۆلۆژیای فەرمی دەوڵەتە. لەتەواوی وڵاتە عەرەبییەکاندا، ئایینی دەوڵەت، بەشێوەیەکی فەرمی ئیسلامە. کۆمـاری تورکیا کـەخۆی وەك دەوڵـەتێکی عـەلمانی راگەیانـدووە, خـاوەنی بـەرفراوانترین کـادیری ئایینییـە, ئایدیۆلۆژیاکـەی ئیـسلامی سـوننی فەرمییە، ئیسلام ئایینی فەرمی دەوڵەتە. پاکستان و هیندستان بەفەرمی دەوڵەتی ئیسلامیین. ئیسرائیل دەوڵەتی ئایینییە.

بانگەشەی دەوڵەتی عەلمانی، تاوەکو بەشۆڕشێکی ریشەیی تێپەڕنـەبێت، بانگەشـەیەکی خەیاڵییـە. هـەروەها دەتـوانرێ بـاس لەدەوڵەتی ئایینی ئاشکرا یاخود دەمامك کراو بکرێت. چ کاتێك دەوڵەت گۆڕاو بـوو بەدەزگایـەکی شـەفاف کەئاسایشی گشتی و خزمەتگوزارییـەکانی گـەل بەبنـەمابگرێ، ئەوکاتـە دەتـوانێ لەپـەردەو دەمامکـە ئایینییـەکان رزگـاری بێـت و ببێتـە خـاوەن گەوهەرێکی راستەقینەی عەلمانییەت.

بەجۆرێك بەدەوڵەتکردنی کۆمەڵگا جێگای باسە کەلەهیچ رژێمێکی هاوچـەرخدا نـەبینراوە. بەرامبـەر بەکۆمـەڵگا دەوڵـەت چەندە مەزن بکرێت، بەو ئەندازەیـە خـۆی بـەهێز دادەنێت. متمانـەو هێـزی خـۆی لەدەوڵـەتی تۆتالیتـاردا دەبینـێ. بـەردەوام تایبەتمەندێتییـەکانی دەوڵـەتی دایـك، بـاوك، پـیرۆزی بـەکاردینێ و لـەخۆی دوورناخاتـەوە. خـواردنی مـاڵی دەوڵـەت کـراوە بەدەربڕینێکی کلاسیك. سەرەتا دەوڵەت لەمیللـەت دەدزێ. دواتـر هـەروەکو خێـر بەسـواڵکەر بکـات، وەك چـاکەخوازو نمەکـدار خۆی پێشکەش دەکات. لەبـژاردەترین دزیـش مەترسـیدارتردەبێ. لەمیانـەی پـشتبەسـتن بەدەوڵـەت هـیچ خراپەکارییـەك نییـە نەکرێت. کاتێك دەڵێین "لێڤی ئاتهان" ی راستەقینە دەوڵەتە, بیانوومان زۆرە. لایـەنی بەئێـشی ئـەم مەسـەلە ئەوەیـە کـە ئـەم دەوڵەتـە لەلایـەنی گـەل وەکـو دەزگـای بەدەسـتهێنانی کـارو خـواردن دەبینـرێ. ئـەو دەوڵەتـەی هەمووشـتێکی وشـککردووە، خزمەتێکی وەهای لێ چاوەڕوان دەکەن هەروەکو بڵێی دەتوانێ هەمووشتێك بخولقێنێ.

تاوەکو دەوڵـەتی رۆژهـەڵاتی نـاوین شـینەکرێتەوە، نـاتوانرێ لەدەرهـەق هـیچ یـەکێك لەکێـشە ئـابووری و کۆمەڵایەتییـەکان دەربکەوێ. ئەم دەوڵەتەی ئێستا کەنەدەتوانێ وەکو ئەو دەوڵەتەی رۆژئـاوابێ, کەلـەبواری دیموکراسیدا زۆر وریایـە، نـەدەتوانێ وەکـو ئـەو دەوڵەتـە فاشیـستانە بـێ, کـەبێ پـەردەن و ئاشـکران. ئـەم دەوڵەتـە سەرچاوەی هەمووکێشەکانە، بۆیـە سـەرلەنوێ ئاواکردنـەوەی مەرجـە. هـەروەکو زۆرجـار ئامـاژەی پێـدەکرێ کێـشەکە بەجیاوازییـەکانی لەشـێوەی یونیتـاری (مرکـزي), خـۆجێیی، فیـدراڵ "چارەسـەری نـین". دەوڵـەتێك پێویـستە کـە بەرامبـەر چارەسـەرکردنی هەسـتیار بـێ. بـەڵانی کـەم دەبـێ لەرەوشی کۆسپنانەوە لەبـەردەم ئـازادی تـاك و دیموکراتیزەبـوونی کۆمـەڵگا بـەلاوە بنرێـت. تـەنیا پێویـستی بەبچووککردنەوە نییە، بەڵکو دەبێ چالاکیش بکرێت. جگەلەو دەزگا ماقووڵانەی ئاسایشی گشتی و خزمەتگوزاری گەل بەبنـەمادەگرن, پێویـستە تەواوی دامودەزگا زیادەکانی دیکە دەستیان لێبەربدرێت. تاوەکو ریفۆرمی دەوڵەت لەسـەرئەم بنەمایانـە پێـشنەخرێت، بـەهۆی ئەو دەوڵەتە گران و تەمبەڵە، هەرکێشەیەکی دەستی بۆ ببرێت لەکەوتنەنێو بێچارەیی رزگاری نابێت.

لەهەر قۆناخێکدا رووبەڕووی کێشەی سووتێنەرو بەکاریگەرتری دەسەڵاتی دەوڵەتین. بەبێ کەوتنـەنێو نەخۆشـی دەوڵـەتی رابـردووی نزیـك بـە سۆسـیال دیمـوکرات، رزگاری نەتـەوەیی و سۆسـیالیزمی بونیـادنراو, هـەروەها بـەبێ ئـەوەی بکەوینـە نـاو خەڵەتاندنەکانی لەجۆری "دەوڵەت بڕوخێنین، یەکێکی نوێی لەجێگادا ئاوابکەین"، نەلەرێگای سازشکاری خۆی بداتـە دەسـت، ئەوا پێشخستنی رێککەوتنێکی دیموکراتی بەپرەنـسیپانە سـەبارەت بەدەوڵـەت یـاخود خوڵقانـدنی تواناکارییـەکانی چارەسـەری ئەرکی سەرەکییە. پێویستە ئەم ئەرکەجێگای خۆی لەسەرووی ئامانجی سەرجەم چالاکییە سیاسییەکان بگرێت.

لەرۆژهەڵاتی ناویندا شانەکانی کۆمەڵگا ئەوبوارو گۆڕەپانەن کەبەشێوەیەکی چڕو بەرفراوان لەقەیراندا دەژین. دەزگا کۆمەڵایەتییەکان، لەسەرووی هەمووشیانەوە خێزان، عەشیرەت، شار، گوندێتی، بێکاری، گروپی ئایینی، رۆشنبیران، تەندروستی و پەروەردەی گەل لەنێو پووچی و قەیراناویترین قۆناخیاندا دەژین. لاشەی کۆمەڵگا کەلەسەرەوە لەلایەن دەسەڵات و ئایدیۆلۆژیای زاڵ گەمارۆدراوە، لەژێرەوەش لەلایەن ئابوورییەکەوە تەنگەتاو دەکرێت کەتێرناکات، ئەم لاشەیە نەخۆشی قەڵەوی دێنێتەوە بیری مرۆڤ. هەڵبەتە ئەم قەڵەوییە ئەو قەڵەوییە راستەقینەی ئەمریکاو ئەوروپانییە. لەنەخۆشی قەڵەوی ئەو منداڵە ئەفریقییە دەچێت کەلەبرسان ورگی ئاوساوە. وەك شانەکانی کۆمەڵگا لەم دەزگایانەدا تاڕادەیەکی مەزن مرۆڤ چالاکبوونی خۆی لەدەستداوە. رۆڵێکی واتاداری دەزگاکان نەماوە. تەنیا بەسەربەخۆ دەتوانێ چایخانەکان باس بکات کە راستی چییە. راستینەی دامەزراوو دەزگاکان کەدەبوایە بۆتاك ئامرازێکی کۆمەڵایەتیبوون بێت، بووە بەتەڵەزگەیەك کە ڕاوی مرۆڤ دەکات. ئەو تەندروستی و کۆمەڵایەتییەی لەخۆیدا نییە، زیاتر بەرەو گەندەڵبوون و قەیرانەکانی دەبات. ئارابێسك ـ جۆرێکی هونەری تایبەت بەئەشق و ئەڤینداریە ـ رەنگدانەوەی هونەری نەخۆشی ئەم راستییەیە. ئەو شانە کۆمەڵایەتییەی لەدەرەوە هاتووە دەوڵەمەندو گەوهەری نییە، بەرامبەر پەلامارەکانیش هیچ میکانیزمێکی پاراستنی پێشنەخستووە. هەربۆیە زهنییەت و خۆ پڕچەککردنی مۆڕاڵ و مەعنەویاتی نییە. لەبەرئەوەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لەلایەن بونیادی سیاسییەوە دیاریکراوە، تارادەیەکی مەزن کاردانەوەکانی شۆڕشی کۆمەڵایەتی پووکاوەتەوەو بێنرخ بووە. جولانەوەیەکی کۆمەڵایەتی سەرچاوەی خۆی لەدەوڵەت و سیاسەتی دیماگۆژیانە وەرنەگرتبێت و لەخۆیەوە سەریهەڵدابێت زۆردەگمەنە. بەسیاسیبوونی چینی بژاردەی کۆمەڵگا، لەسەفەربەری (نفیر)ی دەوڵەت بەولاوە رۆڵێکی دیکەی ئاستەمە، چونکە وەها فێرکراوە. پرەنسیپ بەمجۆرە بەرێوەدەچێت؛ ئابووری تەنگەتاوی دەکات (برسی دەکات)، دەوڵەت دەیخاتە قسەوە. کۆمەڵگاش لەسەربنەمای بەرژەوەندییەکانی خۆی وەك کۆمەڵگای مەدەنی هەوڵەکانی لێگەڕین و چارەسەری زۆر سنووردارە.

ئەو تراژیدیا کۆمەڵایەتییەی بێڕەحمی و بێچارەیی سیاسی دیاری دەکات، هەرە زێدە دەشێ لەراستینەی ژندا ببینرێ. وەك دیلی دەستی نەریتی پلەداری و دەوڵەتی پێنج هەزارساڵە، لەرۆژگاری ئەمرۆماندا جگە لەژنێتی ژیانێکی سەخت بەبیری کەسدا نایەت. زەحمەتی تەنیا سەرچاوەی خۆی لەنەریتەوە ناگرێت. ئەو بەها ژنانییەی شارستانییەتی ئەوروپاش خولقاندوویەتی بەلانی کەم هێندەی نەریتە دۆگماکان تێکدەرانەیە. ئەو ژنەی لەنێوان کولتووری بەئاستی "پۆڕنۆ" ــ بینینی ژن وەکو ئامرازی وروژاندنی زایەندی ــ گەیشتووەو ئەو کولتوورەی ژنی خستۆتە نێو پەردەیەکی رەش، ژن کەوتۆتە نێو ترس و لەرەوشێکی هەرەپەشۆکاو دایە.

ژنانی رۆژهەڵاتی ناوین شێوەیەکی دروستکراون کە لەدەوڵەت کۆنترە. تەواوی داخوازییەکانی شانازیکردن بە"ژنبوون" پێچەوانە کراوەتەوە. هەرچییەکی هەبێ شانازی پێوە بکات و پێشکەشی بکات، لەژێرحوکمی یاسای ئەخلاقی دایە. ئەو پیاوەی نەریتی ئایینی خاوەندارێتی خۆی لێزەوتکردووە ژنیشی کردووە بەنرخترین موڵك، تاکە چالاکی و تواناکاری ژن گوێڕایەڵی و ملکەچکردنی رەهایە بۆ داواکارییەکانی پیاوەکەی. ئیمپراتۆر بۆ دەوڵەت چیبێ، بەگشتی پیاو بەتایبەتیش مێرد بۆژن هەمان شتە. رێککەوتن و بڕیاری هاوبەش لەگەڵ ژنان، لەفەرهەنگی پیاوێتیدا بەعەیبە ناودەبرێت. گرێدانێکی هەرەزێدە و پرەنسیپ نەناس وەکو شکۆدارترین شانازی لەئەخلاقدا جێگای خۆی دەگرێت. لەو پێگەیە دوورە کەئازادانە بتوانێ پاراستنی ئەوە بکات کەخاوەنی جەستەو رۆحی خۆیەتی. لەبواری شانەی کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسی هێندە لاواز و بەرکەنارکراوە، بەچوارچاوەوە لەو پیاوە دەگەرێت کەوەکو کۆیلە وابەستەی دەبێت. بەڵام ئەمە لەمردن خراپتری لێکراوە. لەبەرئەوەی هاوڕەگەزەکانیشی وەك خۆیەتی، هەروەکو بڵێی یەکێك نییە لێیان تێبگات، بۆژیانێکی مرۆڤانەی راستەقینە ئومێدبەخش بێت. ئەم راستینەیەی گەمارۆدانی کولتووری، بەردەوام ژنان ناچاری تەسلیمییەت دەکات. چەندە بەرخودانیش بکات، ئەگەر

بیرلەخۆکوشتن نەکاتەوە، ئەوا مسۆگەرە تێکدەشکێ. لەدوای ئەمە هەمووجۆرە تایبەتمەندێتییەکی زایەندی ژنێتی بەشێوازێکی سووک و داڕووخاوانە وەردەگیرێت. لەهەرگۆشەیەکەوە هێمایەکی ئەم هاوکێشەیە دەچەقێنێ. لەراستیدا ژنێتی پیشەیەکی هەرە ئاستەم و سەختە. لەکاتێکدا قۆناخی پاکیزەیی لەسەر مێزی گورگەبرسیەکان وەکو مەززە وایە، قۆناخی دایکایەتیش بەئێش و ئازاری نەبڕاوەی منداڵبوونە یەك لەدوای یەکەکان تێپەڕدەبێت. گەورەکردن و بەخێوکردنی منداڵ بۆ ئەشکەنجەیەکی راستەقینە دەگۆڕێ. هەروەها جیهانێك کەهیچ ئومێدێکی بۆ منداڵەکەی تێدانییە، بەردەوام خەیاڵەکانی تێکدەشکێنێ. ئێش و ئازار بەسەرئێش و ئازاردا کەڵەکەدەبێ. ستاتۆی کۆمەڵایەتی ژن لەرۆژهەڵاتی ناویندا لەسەرووی ستەمکارترین کردەوەکان دێت. شێوەی کۆیلایەتی گەلان، سەرەتا لەژندا بەدیدەهێنرێت.

ئەمە پێشبینییەکی راستە کەراستینەی ژن تارادەیەکی مەزن راستینەی کۆمەڵگا دیاردەکات. ئەوپەڕگەڕی پیاوێتی و ژنێتی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین دووالیزمێکی دیالەکتیکییە. لەئەنجامی ئەم شێوازەی پەیوەندی ئەو پەیوەندییە پێچەوانانەی بۆ پیاو گەڕاوەتەوە پیاوێتی باڵادەستی پووچە. ئەو باڵادەستییەی دەسەڵات لەسەرپیاو پەیرەوی دەکات، پیاویش لەسەرژن بەڕێوەی دەبات، ژنیش بەرامبەر منداڵان نیشانی دەدات. بەمشێوەیە لەلوتکە تاخوارەوە گواستنەوەی باڵادەستی تەواودەبێت. ئاستی کۆیلایەتی ژن لەسایەی ئەم میکانیزمە بەردەوام خراپترین هەلومەرج دەرەخسێنێ، واتە ئاستی کۆیلایەتی کۆمەڵگا بەرەوپێش دەبات. بەمجۆرە لەدایکبوون قامچی دەسەڵات زۆر بەسانایی دەتوانێ ئەو کۆمەڵگا ژنانییە بەڕێوە ببات کە لە دایك بووە. ژن سەرباری ئەوەی لەدەرەوەی ئیرادەی خۆی دووچاری گەورەترین ستەمکاری هاتووە، لەهەمانکاتدا دەکرێتە ئامرازی ستەمکارییەکی لەوەزیاتر بۆسەر کۆمەڵگا. بەئەندازەی ئەوپەیوەندییانەی لەدەرەوە رۆژهەڵاتی ناوین بۆ تەسلیمییەت تەنگەتاو دەکەن، لەناوەوەش لەرێگای ئەو پەیوەندییانەوە تەنگەتاو دەبێ کەبەسەر ژناندا دەسەپێنرێ. لەبەر ئەم هۆکارانەیە هەر بزووتنەوەیەك پشت بەچالاکی ئازادی ژن نەبەستێ لەسەرخستنی و گەیشتن بەکۆمەڵگایەکی ئازادو هەمیشەیی و گەوهەری شانسی زۆر سنووردار دەبێ. بەدینەهاتنی هیواو ئومێدەکان لەلایەن هەڵوێستەکانی دەسەڵاتی سۆسیالیزم و رزگاری نیشتمانی گرێدراوی ئەم راستینەیەیە. تێکۆشانی ئازادی ژنان، تاڕادەیەکی زۆر یەکسانی رەگەزی تێپەڕدەکات، گەوهەری دیموکراسی گشتی، مافەکانی مرۆڤ، ژینگە و یەکسانی کۆمەڵایەتی پێکدێنێت.

یەکەم هەنگاو کەپێویستە بۆئازادی ژن ئەنجامبدرێ، ئەوەیە ژنان بکرێن بەهێزی چالاکی خۆیی؛ دوورکەوتنەوەیە لەو هەڵوێستەی موڵکایەتی کەلەسەر ژن هەیە. مۆدێلی ئەشقی پڕ لەتایبەتمەندێتییەکانی هەستی موڵکایەتی، چەندین مەترسی لەناواخنی خۆیەوە دەگرێت. لەکۆمەڵگاکانی پلەداری(یارارشی) و نەریتی دەوڵەتدا، ئەشق گەورەترین خەڵەتێنەرو تەفرەدەرە؛ فاکتەری پەردەپۆشکردنی ئەو تاوانەیە کەئەنجامدراوە. رێزگرتن لەژن و یارمەتیدانی بۆ ئازادی، بەوەدا تێپەڕدەبێ کەپێش هەموو شتێك دان بەو راستینەیە بنرێت کەلەئارادایەو لەپێناو بەلاوەنانی و بەدەستێهنانی ئازادی بەشێوەیەکی راستگۆو دڵسۆزانە هەڵوەستەبکەی. پیاوێك کە پیاوێتی و پیاوسالاری خۆی — جا لە ژێر هەر ناوێك بێت — لە ژندا بژێنێت، هیچ بەهایەکی تەندروستی بۆ ئازادی نابێت. بەهێزکردنی ژن لەبواری جەستەیی، رۆحی و هزری لەوانەیە بەهادارترین هەوڵەکانی شۆڕشگێڕی بێت. لەکولتووری رۆژهەڵاتی ناویندا کەلەقۆناخێکدا سەنتەری کولتووری خوداوەندی دایکبوو، جارێکی دیکە لەگەڵ بەهاپێشکەوتووەکانی کۆمەڵگا گەڕاندنەوەی ژن بۆ ئەوهێزەی بتوانێ سەربەخۆ بڕیاربدات، بژاری خۆی دیاربکات، رۆڵ بینین لەمەدا پێویستی بەلەهەنگی راستەقینەی ئازادی هەیە.

جێگای دیاردەی ئابووری لەناو ستاتۆی کۆمەڵایەتی و دەسەڵات و زهنییەتی گشتیدا تەواوکردنی یەکپارچەیی کۆمەڵگایە. ئابووری لیبراڵ جێگای لەناو نەریت و هەنووکەییدا (رۆژانەییدا)نییە. گەورەترین پاوانخواز دەوڵەتە، ئەمەش دەرفەتی پێدەدات ئابووری و دەسەڵاتی سیاسی بەیەکەوە بەڕێوەببات. لەکاتێکدا لەشارستانییەتی رۆژئاوا بەشێوەیەکی رێژەیی ئابووری

دەسەڵات دیاردەکات، لەئابووری رۆژهەڵاتی ناوینیشدا ئەوەی رۆڵی راستەقینەی دیارکردن دەبینێ دەسەڵاتە. یاساکانی ئابووری کەتایبەت بەهی خۆی لەقەڵەمدەدرێت لەژێو ـ کولتووری ناوچەکەدا پەسندو پەیڕەوناکرێت. لەلایەك ئابووری خێزان کە بۆ ماڵە بچووکەکانی قۆناخی نیئۆلیتیك دەگەڕێتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە ئابووری دەوڵەت. ئەوەی ناوەڕاستیش دوکانداروبازرگانەکانی وابەستەی دەوڵەتن. شانسی چینی ناوین سنووردارە کەلەرێگای هێزە ئابوورییەکەیەوە کاریگەری لەسەر دەوڵەت و سیاسەتەکانی بکات. چونکە ئابووری سەرچاوەی دەستلێبەرنەدراوی بەڕێوەبەرە، دەوڵەت بەبێی ئەو بەڕێوەنابردرێت. تەنیا کاتێك لەسەر شێوازی دەوڵەتی رۆژئاوا سەرلەنوێ دەوڵەتی رۆژهەڵاتی ناوین ئاوابکرێتەوە، کاریگەرییەکەی لەسەر ئابووری کەمدەبێتەوە. ئەم راستینەی ئابووری بەدرێژایی مێژوو زاراوەی دەوڵەتی بازرگان روونەدەکاتەوە. بەرپابوونی چەندین شەڕ بەهۆی رێگاکانی بازرگانی، رووخانی دەوڵەت لەئەنجامی داخستنی رێگای بازرگانی، پەیوەندی بەکارەکتەرە ئابوورییەکەیەوە هەیە. لەکاتێکدا دەوڵەتی رۆژئاوا پێشکەوتنی راستەقینەی خۆی لەسایەی پشتبەستن بەکۆکردنەوەی سەرمایەو پیشەسازی بەدەستهێنا، دەوڵەتی رۆژهەڵات بازرگانی و دەستبەسەرداگرتن (تالان) پەیڕەودەکات، لەرێگای بازرگانی شەڕەوە بەدیدێنێ. لەجیاتی پشتبەستن بەتوانست و پیشەسازی، ئەو نرخ و بەهایانەی کۆیکردۆتەوە بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت خەرجیدەکات. تەنانەت هەرشتێکی موڵکی کۆمەڵگاو وڵاتەکەی بێت، تەواوی سەرچاوەکانی ژێرخان و سەرخان، مرۆڤ وەکو موڵکی خۆی دەبینێ و هەوڵەکانی سەوداکردنی کۆنترین فێڵبازی سیاسییە. زۆر بەشێوازی دابەشکردنی نێوان دزەکان دەچێ. لەژێررۆشنایی ئەم پێناسانە گەشەسەندنی ئابووری لەرۆژهەڵاتی ناویندا تەنیا لەگەڵ هەڵوەشانەوەی ئەو ستاتۆیە بەدیدێت کە لەناو کۆمەڵگاداهەیە. لەژێرسایەی پێکهاتەی دەوڵەتی ئێستادا زۆر زەحمەتە لەگەڵ ئابووری جیهانگیری ئاوێتە بێ. بونیادی ئابووری سیستەم کەتەواو لەناودۆخی قەیران "ئاژاوە"دایە ئیتر بەو رەوشەی تێیدایە زۆر ئاستەمە بتوانێ ئەم هەڵوەشانەوەیەی کۆمەڵگا بوەستێنێ کەبەخێرایی بەرێوەدەچێ. هەستکردن بەپێویستی پێڕەوکردنی وشکترین دەسپۆتیزم، سەرچاوەی خۆی لەچۆنییەتی رێگرتن لەم هەڵوەشانەوەیە وەردەگرێت.

دیسان سیستەمی رۆژئاواش لەبەرهەمان هۆکار بۆماوەیەکی درێژ پشتگیری لەدەسپۆتیزم کرد. بەتایبەتیش بۆئەوەی بەشێکی مەزن لەدەوڵەمەندێتی پەترۆڵ(نەوت) وەربگرێت و رێگری لەو بزووتنەوانە بکات کەسیستەم تەنگەتاو دەکەن. بەڵام لەرۆژگاری ئەمرۆماندا ئەم رێگایە لەسوودزیاتر زیان لەگەڵ خۆیدا دێنێ. لەکاتێکدا زێدە هەژارکردنی گەل، هێزی داواکاری بازاڕ دەخات، لەهەمانکاتدا هەبوونی خۆشی بێ واتا دەکات. ئەوەی لەدەوروبەری رژێمی ئێراقدا روودەدات زۆر باش ئەم میکانیزمە روونەدەکاتەوە. کاتێك کۆنترۆڵکردنی ئەو جەماوەرە زەحمەت دەبێ کەداواکاری بازاڕیان نزمبووە، پێکهاتەی دەوڵەتی دەسپۆتیك دەکەوێتە دۆخێك کەرێگرە لەپێش سیستەمی جیهانگیری تەنگاتاوکراو لەهەردوولا، ئەمەش زەمینەی ماددی پرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوینی گەورەیە کەبووە رۆژەڤ.

بەکورتی لەرۆژگاری ئەمرۆماندا ستاتۆی رۆژهەڵاتی ناوین لەرەوشێك دایە ئیتر ناتوانێ بەردەوام بێت. پێشتر سوودی لەو هاوسەنگییە سیاسییە بینی کەئەڵمانیای نازی و روسیای سۆڤییەت خوڵقاندیان، بۆسەدەیەکی دیکەش تەمەنی خۆیان درێژکرد. هەڵوەشاندنەوەی هەردوو سیستەمیش سیاسەتی هاوسەنگی نوێی زۆر سنووردارکردووە. دوولایەنەی لەجۆری ئەمریکا ــ یەکێتی ئەوروپا، ئەمریکا ـ چین، خاوەن ناوەڕۆکێکی وەهان دەرفەت بەگەمەی هاوسەنگییەکی نوێ نادەن. ئەو هاوکاری و دانوستاندنەی ئەم دواییەی تورکیا خواستی رێبەرایەتی بکات، لەبەرهەمان هۆ تواناکاری گەشەکردنی نییە. لەراستیدا ئەوجەمسەرانەی دەسەڵات کەبەهۆی ئەنجامنەدانی گۆڕانکاری لەلایەن سیستەم پەسندناکرێت، بەئەندازەی ئەوەی لەجیهانی ئەمرۆماندا دینامیکە، مەترسیدارترین ناوچەی دەرخستۆتەروو. ئەوجەمسەرانەی دەسەڵات کەدەرفەت بەئازادی تاك و دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگانادەن، بەسنوورێك گەیشتوون ئیتر لەلایەن سیستەمی جیهانگیری باڵادەست پەسندناکرێن.

ئەوجەمسەرو ئیمپراتۆریەتەی گێژاو کەئەمریکا ڕێبەرایەتی دەکات، هەروەکو بڵێی کەوتۆتە ناو شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانی، لەمیانەی داگیرکردنی ئەفغانستان و ئێراق بەجۆرێك لەجۆرەکان لەناو سێیەمین شەڕی جیهانیدا دەژی. کاتێك "ناتۆ" بۆ ناوچەکە ئاراستەدەکرێ، هێزە گرنگەکانی وەکو روسیا، چین و هیندستان بێکاریگەردەکرێن. لەرێگای پرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوینی گەورەوە هەوڵ دەدەن لەگێژاو رزگاریان بێت و چارەسەری ئەنجامبدەن. بەرامبەر ئەمەش گەلان دەتوانن بژاری خۆیان دیاربکەن، هەربۆیە بەرۆژە ڤکردنی چارەسەرییەکی دیموکراتی و ئازادو یەکسان جێگای باسە.

ئاشکرایە کەبەقۆناخێکی گێژاو تێپەڕ دەبن. لەشەڕەکانی یەکەم و دووەمی جیهانیشدا هەمان قۆناخ سەریانهەڵدابوو. لەیەکەمیاندا یەکێتی سۆڤیەت، لەدووەمیاندا ئەڵمانیای فاشیست لەکاتی دەرکەوتن لەقەیران رێگایان لەپێش پێکهاتنی جەمسەرە لاسەنگەکانی دەسەڵات کردەوە. تەواوی ئەو دەوڵەتانەی لەدەرئەنجامی پاشماوەکانی هەردوو ئیمپراتۆریەتە گەورەکە ـ عوسمانی و ئێرانی ـ سەریانهەڵدا لەرەوشێکی وەهادانەبوون نەسیستەمی یەکێتی سۆڤییەت، نەسیستەمی کلاسیکی رۆژئاوا هەرسبکەن. سوودیان لەهاوسەنگی هێزەکانی نێوان سیستەمەکان وەرگرت و تاوەکو سالانی 1990 کان هاتن. ئەو هاوسەنگییەی لەگەڵ هەڵوەشانەوەی سۆڤییەت تێکچوو بەشەکانی دەسەلاتی زیاتر بەرەلاکرد. لەرێگای سیستەمی نوێی جیهانگیری بالادەست بەمشێوەیە رووینەدا. لەمیانەی هاوپەیمانێتێکەوە هاتنی ئەمریکا بۆ ناوچەکە بۆ ئەم هۆیەدەگەرێتەوە. رەوشی پارچە پارچەیی قەیراناوی سیستەم لەناوچەکەدا تەواو وەکو گێژاوێکە, دەستنیشانکردنی ناوی شەڕی سێیەمی جیهانی لەژێر هەلومەرجی تایبەتی خۆیدا لەخۆڕا وەك قسەیەك ناگووترێت. لەراستیدا یەکلاکردنەوەی ئەو حیسابات و پێداچوونەوانە جێگای باسە کەلەدوای شەڕەکانی یەکەم و دووەمی جیهانی تەواو نەببوون. بەرۆژەڤکردنی رژێمی دەسپۆتیزمی نوێ، لەگەڵ لۆژیکی جیهانگیری ناگونجێ. سیستەم لەجیاتی جەمسەرەکانی دەولەت ناچارە بەرووی ئاپۆڕای ئەوجەماوەرە بکرێتەوە کەداخوازی دەکات. ئەمەش پێویستی بەدیموکراسی و هاوبەشێتیکردنی دەوڵەمەندێتییە.

ئایا لەقۆناخی ئیمپریالیزمدا دەشێ قۆناخێکی نوێ جێگای باس بێت؟ دروشمی ئیمپریالیزمی دیموکراتی ـ بەگوێرەی پێوانەکانی سیستەم ـ تاچ رادەیەك واقیعییە؟ ئایادەرفەتی بژاری دیکە هەیە؟ ئایا چ لەئیسلامی میانرەوی مۆدێلی تورکیا تێدەگەین؟ چەندە دەتوانرێ مۆدێلەکانی دیموکراسی رۆژئاوا بگونجێندرێ؟.

ئەگەر بەشێوەیەکی لاوازیش بێت ئەو جیهانگیرییە سۆسیال دیموکراتییەی لەشاری پۆرتۆ ئەلەگرای بەرازیل دەنگی دایەوە، بۆناوچەکە چ واتایەك دەبەخشێ؟ ئایادەشێ فیدراسیۆنی دیموکراسییانەی رۆژهەڵاتی ناوین وەك ئۆتۆپیایەکی واقیعی نەخشەی بۆ بکێشرێت؟ ئایادەشێ فیدراسیۆنی دیموکراسیانەی ئێراق ببێتە نموونەی سەرەتایی ئەمە؟ هەربۆیە لەم قۆناخەی مێژوودا گەلێك ئیش و کار دەکەوێتە ئەستۆی ئەخلاق و کۆمەڵناسی. کۆمەڵناسییەك کەلەژێر پاوانخوازی و هەژموونی دەسەلات ـ زانین دەرکەوتووە، جورئەتی ئاواکردنی زانستی خۆی کردووە، بۆ دەرکەوتن لە گێژاو و گەیشتن بەچارەسەری بایەخدار ژیانییە. بۆئاواکردنی کۆمەڵگایەکی ژینگەیی(ئیکۆلۆژی) و ئازادیخوازی رەگەزی و دیموکراتییانەتر، لەپێش هەمووشتێك پێویستی بەئاواکردنەوەی کۆمەڵناسییەکی نوێ هەیە. ئەوەی هەوڵی ئەنجامدانی دەدەین، چوارچێوەی ئەم کارە رەسەن و بەجۆشوخرۆشەیە.

2ـ بەراستی ئەگەر 11 ی ئەیلولی 2001 وەك خاڵی دەستپێکردنی قۆناخێك هەڵبسەنگێنرێ، ئەمە نەك بەشێوەی خاڵی دەستپێکردنی شەڕی سێیەمی جیهان، پێویستە وەك قۆناخێکی ستراتیژی ئەم شەڕە ـ بابڵێین شەڕی پۆست مۆدێرن ـ هەڵبسەنگێنرێ کەدوای شەڕی سارد دەستپێکرد, تاچ رادەیەك پیلانگێڕی رۆڵی لەمەدا بینی؟ ئاخۆ ئاژاوەیەکی سیستەمی جیهانگیری بوو؟ بەرامبەر بەم پێشکەوتنە بابەتیانە وەلامی تەواوی ئەو پرسانەی کراون وەکو وردەکاری دەمێنن. چەندین بیرمەند، دەوروبەرو هێزی سیاسی پێهەلگرتنی ئەمریکا لەگەڵ یاساکانی نێودەوڵەتی و ئەخلاق ناکۆك و بێواتادەبینن.

تەنانەت نارِەزایی و کاردانەوەی خۆیان نیشاندا. سەرباری هەموو کۆسپ و رێگرییەکان هێزی فەرماندەری سیستەم لەئاستی ستراتیژی هەڵمەتی خۆی ئەنجامدا.

ئەو شیکردنەوە مێژوویی و کۆمەڵایەتییانەی تائێستا ئەنجاممانداوە ئەمە واقیعی دەبینێ کە لەناو گێژاودا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەکو ئیمپراتۆرییەت جموجۆڵ دەکات. تەماشا کردنی بە بێ یاسایی و بێ ئەخلاقی نابێتە رێگر لەپێش واقیعیبوونی. لەسەرووی هەموویانەوە دەوڵەتە کۆماریەکانی دەوڵەتی نەتەوەیی یەکێتی ئەوروپا لەم قۆناخەدا چەندین دەوڵەتی نەتەوەیی لە ناو ترسی قوڵدان. لەوانەیە لەم ترسەیاندا مافداریش بن، بەڵام واقیعی نین. جیهانگیری و بەئیمپراتۆربوونی سیستەمەکان لەدەوڵەتی "سەرجۆنی ئەکەدی"یەوە تاکو ئێستا بەردەوامە. سەدان ئەڵقەی هاتەسەر، هەرەدوایی لەلایەن ئینگلتەرا و سۆڤییەت ئیمپراتۆریەتی جیهان بەبێ شەڕ پێشکەشکرا، ئایا شەرمە ئەگەر ئەمریکا وەریگرێ و بەتەنیا بۆخۆی پاوانی بکات و بەردەوامی پێبدات؟ دەتوانرێ گفتوگۆ لەسەر قووڵایی قەیرانی سێیەمین هەڵمەتی گەورەی سەرمایەداری بکەین؟ دەتوانرێ تایبەتمەندێتییەکانی گێژاو(کائیوس) ریزبکرێت. تەواوی ئەمانە ئەوە پشتراست دەکەنەوە کەقۆناخ پێویستی بەبەڕێوەبەرایەتییەکی شێوازی ئیمپراتۆریەت هەیە. لەهەرشوێنێك شارستانیبوونی لێبێت دەوڵەتەکان بۆشایی ناناسن، بەردەوام جەخت لەسەرئەوە دەکرێتەوە کەسیاسەت خۆشی لەبۆشایی نایێ. لەدۆخێکی وەهادا ئەمریکا شۆڕشی هەرەدوایی زانست و تەکنۆلۆژیاشی بۆخۆی کردووە بەپاڵپشت، لەم بوارو گۆڕەپانەدا رۆڵی پێشەنگایەتی خۆی لەسەرهەموو لایەك کردووە بەواقیع، هێزێکی دیۆئاسای سیاسی و سەربازی پێکهێناوە، وەك پێویستییەکی سیستەمیش درێژەپێدانی پەلهاوێشتن راستییەکی دەستلێبەرنەدراوە. ئەمەش بەگوێرەی سروشتی سیاسەت و دەوڵەتە. ئاماژەکردن بەمە، بەو واتایە نایەت کەراست و مافدارە.

کاتێك بڵێین قۆناخی دەوڵەتی ــ نەتەوەیی سەردەمی بەسەرچوو، بەواتای ئەرێکردنی ئیمپریالیزمی جیهانگیری نییە. راستینەی سیاسی، سەربازی و ئابووری جیهانگیری ئەم مۆدێلە بەرهەمدارو بەپیت نابینێ، وەك کۆت و بەندەکانی دەست و پێ هەڵێدەسەنگێنێ. تەواو پێچەوانەی گووتەی میللیگەرایی دەوڵەتی ـ نەتەویی ئەو دەوڵەتە نییە کەسەربەخۆیی تەواوی تێدا بەدەستهاتبێ. تەنانەت لەهیچ یەکێك لەجیهانی دیاردەکاندا زاراوەیەك نییە بەناوی سەربەخۆیی تەواو. جێگرتن لەنێو وابەستەبووندا پۆلینکردنێکی گەردوونییە. هیچ بابەت (تەواوکەر) و بکەر(نیهاد)ێك نییە کەلەگەڵ یەکتری لەنێو پەیوەندیدا نەبن. پەرستن و بەبتکردنی سەربەخۆیی دەوڵەتی ـ نەتەوەیی ئۆتۆپیایەکی بۆرژوازی بچووکە. نەسەربەخۆیی دەوڵەتەکان، نەسەربەخۆیی نەتەوەکان، دیاردەیەك نییە بەدیهاتبێت. هەریەکەیان لەژێر تایبەتمەندێتی جیاوازدا گرێدانی بەئەوەیدیکەوە هەیە. ئەو مەیلەی ئیمپراتۆریەت کەئەمریکا دەیسەپێنی، نەرمترین جۆری وابەستەییە. پێڕەوەکانی لەجۆری داگیرکاری وشك، پاکتاوی ئەتنیکی و تەڵەکەبازی ئایینی بەبنەما ناگرێت کەمۆدێلیان بەسەرچووە. لەجیاتی داگیرکاری نوێ زیاتر شێوەکانی وابەستەیی پۆست مۆدێرن تاقیدەکاتەوە. هەروەکو دەزانرێ زۆر لەدەوڵەتە ــ نەتەوەییەکان، وەك پێویستییەکی پێکهاتەی بەڕێوەبەرایەتییان، وابەستەبوون بەئەمریکا وەکو خەڵاتێك دەبینن. دەوڵەتی ــ نەتەوەیی لەنێو نابردرێت، بەڵام ئیتر وەکوجاران رێگا بەجموجۆڵە بەرەڵاییەکانی نادرێت. لەقۆناخی نوێی جیهانگیریدا سەرلەنوێ پێگەگرتنی دەوڵەتە ــ نەتەوەییەکان ناچارییە. لەیەکێتی ئەوروپاوە تاوەکو چین ئەم قۆناخە بەردەوام دەبێت. ئەمە لەپێناو شەڕێکی نوێدا نییە، بەڵکو بۆئەوەیە کەشەڕی لەئارادایە ئەنجامگیربێت یاخود بۆئەوەی سیستەم بکەوێتە سەرئاراستەی سوودبەخش و بەقازانج. پێویست بکات بەرێچکە ئابوورییەکان، ئەگەر پێویست بکات بەپێڕەوە سەربازییەکان بەڕێوەبەرایەتی قەیراناوی سیستەم، یان رەوشی ئێستای دەپارێزێ، بەرەودواوە گەڕانەوەی دەوەستێنێ، یان بەرەو پێکهاتەی نوێ و بەرهەمدارتری دەبات و بەم شێوەیە بەڕێوەیدەبات. هەوڵدەدات پلانە ئەلتەرناتیفەکانی خۆی لەمیانەی ئەوچارەسەریە بەهێزانە ریالیزە (واقیعی)بکات

کەلەدەرئەنجامی قەیران دەرکەوتوون، کاتێك لەم چوارچێوەیەدا هەڵوەستەمان بەرامبەر راستینەی رۆژهەڵاتی ناوین کرد، دەشێ چۆن پێشبینی ئەگەری گۆڕانکارییەکان بکەین؟.

دەبێ زۆرباش بزانرێ کەئەمریکا تێڕوانینی خۆی سەبارەت بەجیهانی دیاردەکان، بۆ ئەو شێوازە شرۆڤەکردنەی خۆی دەگەڕێنێتەوە کەسەبارەت بەراستینەی فەلسەفی، ئایینی و شۆڕشی زانستی دەیکات و پشتی پێدەبەستی. بەهەزاران دامەزراوەی هزری تینگ تانگ(سەنتەری لێکۆڵینەوە ستراتیژییەکان) دەخاتەگەڕ، بەردەوام پێدراوەکان کۆنترۆڵ دەکات، بەبێ ئەوەی تۆزقاڵێك بکەوێتە ناو دۆگماتیزم، لەکاتی خۆیدا راستکردنەوەکان ئەنجامدەدات، مۆدێل و پرۆژەو پلانەکانی خۆی پێشدەخات. دیسان بەبێ ئەوەی پێشکەوتنی مێژوویی پشتگوێ بخەن، کۆڵەکە مێژووییەکانی مۆدێلی خۆیان دەدۆزنەوەو هەوڵدەدەن واتای پێبدەن. تەواوی ئەمانەش دەرفەتی بۆ پرۆژەیەکی نەرمی فرەبژارو چەمکی پلان دەرەخسێنێ.

بەگووتەی ئێستا پرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوینی گەورە؛ ئیمپریالیزمی قۆناخی نزیکی شرۆڤەکردووە، هەوڵی چارەسەرکردنی کێشە هەنووکەییەکانی دەدات و هەلومەرجەکانی دوای 1990 بەبنەما دەگرێت. ئەو سیستەمە بەناتەواو هەڵەدەبینێ کەفەرەنسا و بریتانیا لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی ئاوایانکرد. لەبەرئەوەی لەدوای شەڕی دووەمی جیهانی بەناوی ئاسایش و ئارامی دەسپۆتیزمی بەهێزکردووە، لەمیانەی هەڵوێستێکی رەخنەدانەوە بەهەڵەی دەبینێ. هەژاربوونی لەرادەبەدەری گەلانی ناوچەکە بۆ سیستەم زیانبەخش و مەترسیداردەبینێ. هەربۆیە دەخوازرێ گەشەسەندنی ئابووری، ئازادییەکانی تاك، دیموکراتیزەکردن و ئاسایش هەمووی لەناویەکدا پێشبخرێت. لەرێگای ئەم مۆدێلەوە هەم کێشە درێژخایەنەکانی عەرەب ـ ئیسرائیل، کورد ـ عەرەب ـ، کورد ـ تورك و کورد ـ ئێران چارەسەردەبێت، هەم کێشەکانی ئەو کۆمەڵگایە چارەسەردەبێت کەدەسپۆتیزم خنکاندوونی، بەمجۆرەش دەخوازێ رێ لەتەقینەوەی نوێ بگرێ. بەجۆرێك لەجۆرەکان دەخوازرێ پلانێکی نوێی مارشاڵ لەناوچەکە بگونجێندرێ کەدوای شەڕی دووەمی جیهانی لەئەوروپاو ژاپۆن پەیڕەوکرا. ئەگەر ناوچەکە بۆ سیستەم زۆرگرنگ بێت ــ کەوەهایە ــ و بەقۆناخێکی وەکو گێژاو تێپەڕبێ، ئەوا بەپشتبەستن بەو ئامانجە پێشخستنی فیکری پرۆژەیەك پێویست و واقیعییە. تەنانەت درەنگیش کەوتووەو تەواوی ئەو هەنگاوانەی لەلایەن سیستەمەوەنراوە پێبەپێ لەچوارچێوەی پلانێکدا وەردەچەرخێ. هەوڵ و خەباتەکانی پرۆژە ـ پلان چڕدەبێتەوە.

بەڵام گەورەترین کۆسپی بەردەم پرۆژەکە بۆئەوە دەگەڕێتەوە، جیاوازی پێگەوشوێنگەی رۆژهەڵاتی ناوینە لەگەڵ ئەوروپاو ژاپۆنی دوای شەڕی دووەمی جیهانی. شۆڕشی پیشەسازی و رۆشنگەری لەرۆژهەڵاتی ناوین روویندداوە. دیموکراتیزەبوون نەخراوەتە رۆژەڤەوە. تاوەکو ئەو سیستەمە دەسپۆتە سیاسیانە نەڕووخێن کەلەفاشیزم زیاتر میللیگەرایین، مەزهەبگەرایین و شانەی ئەتنیکییان زیندووە، ئەوا نوێبوونەوە لەسەر شێوازی ئەوروپاو ژاپۆن ئاستەمە. ئەو رژێمانەی لەئارادان بەردەوام قەیران بەرهەمدێنن. بلۆکی دەوڵەتە خۆجێی (هەرێمی)یەکان زۆر فێڵبازن و سەبارەت بەپاراستنی هەبوونی خۆیان بەهەر بەهانەیەك بێت بوونەتە پسپۆرو شارەزا. ئەوانەی لەژێرناوی رکابەرێتی سیستەمیش دێنەمەیدان، تایەی یەدەگ (سپێر)ی هەمان دەسپۆتیزمن. زێڕەڤانی دەوڵەت ئامانجی سەرەکییە. پاشماوەکانی چەمکی دەوڵەتی ـ خودایی لەوە بەهێزترە کەشیمانە دەکرێت. ئەو دەوڵەتەی لەئارادایە ناوەوەی بۆشە. هیچ رۆڵێکی مێژوویی نییە. بەجۆرێك لەجۆرەکان، لەناو گروپەکان (جەماعەتەکان) هەرەبەهێزە. تاکەکان ئەو دەخولقێنن، ئەویش تاکەکان بەرهەمدینێ. ئەو ئۆپۆزسیۆنەی خۆی بەشۆڕشگێڕ لەقەڵەمدەدات، ئامانجی لەوە تێپەڕناکات کەچۆن ئەو دەوڵەتە بەباشی بەڕێوە ببات. لەلایەکی دیکەوە ناوچەکە لەبواری مێژووییەوە کارەکتەرێکی فیدراڵیانە نیشاندەدات. بەرگەی دەیان دەوڵەتی نەتەوەیی ناگرێت. تەنانەت ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی ئێستا لەئارادان بێچارەیی بەرهەمدێنن. گروپەکانی لەجۆری مەزهەبی، پێکهاتەی ئەتنیك، تەریقەت و جەماعەتەکانی دیکە دەوڵەت بەخۆیانەوە دەبەستنەوەو دەکەونە قۆناخی یەکدی تێرکردن. بنبەستبوون لەم پێکهاتە(بونیادە)دایە. ئەوەی بەردەوام

دەوڵەتەکانی ڕۆژئاوا پشتگیری لێدەکەن ئەم پێکهاتانەیە. ئەگەر پرۆژەکە بخوازێ ئەنجامە پێشبینیکراوەکان بەدەستبێنێ، بەرلەهەمووشتێك پێویستە ئەم ڕژێمانە لەچاو دەربخات.

بەواتای وشە ئەمریکا تەواو ڕووبەڕووی هەڵدێرێکە. لەدوای 11 ی ئەیلول هەنگاوێکی وەهای هاوێشت. لەوانەیە ئەو ئاکامەی لێیدەکەوێتەوە زۆر لەئەنجامەکانی کەوتنە ناو شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانی قورستربێت. ئەو دەرئەنجامانەی دوای یەکەمین شەڕی جیهانی هاتنەئاراوە زۆرقووڵ نەبووو نەگەیشتە ئەو ئاستەی کاریگەری لەچارەنووسی سیستەم بکات. گرنگی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای خستبووەروو. تەنانەت ئەگەر لەشەڕیشدا ژێرکەوتوو بووایە، ئەوا بۆ کیشوەری خۆی دەکشایەوەو بەسانایی بەردەوامی بەهەبوونی خۆی دەدات. توانی یەکێتی سۆڤییەت گەمارۆبدات کەدوای دووەمین شەڕی جیهانی لەبەرامبەری قووتبۆوە. سەرباری ئەوەی هەندێ شەڕی پێگەشی لەدەستا، هێزی خۆی پاراست و پەرەیپێدا. لەهەردوو دۆخیشدا خەریکی پێکهاتەی دەوڵەتی هاوچەرختربوو. لەهەمان کولتووری مەسیحی هاوبەشبوون. ئەو فاکتەرانە سنووورداربوون کەپێکدادانی شارستانییەتەکان قووڵدەکاتەوە. فاکتەرەکانی فەیران گەیشتبووانایە لوتکەش، لەوئاستەدا نەبوون هەڕەشە لەسیستەم بکەن. فاکتەری بەمجۆرە لەرۆژهەڵاتی ناویندا نابینین کەهەمان ئەو ئەنجامانە پێڕەوبکەن. سیستەمێکە لەساڵی 1250 وە کەوتۆتە ناو موحافەزەکاری و دەسپۆتە، یان ئەوەتا شەڕ لەبەرچاوان دەگرێت یاخود پاشەکشێ دەکات. شەڕەکانی لەجۆری ئەفغانستان و ئێراق بەس نییە و تێرناکات. تاوەکو بلۆکی دەسەڵات لەناوچەکە تێکنەشکێندرێ، هەرهەنگاوێکی بهاوێژرێ بەواتای ژێرکەوتنێکی گران دێت. تەکتیکی پشتبەستن بەدەوڵەتێکی دەسپۆت بۆچارەسەرکردنی ئەویدیکە، دوورە لەئەنجامگیری و بەرهەمداری. لەرەوشی وەهادا کولتووری ڕۆژهەڵاتی ناوین لەبەرهەمهێنان و خولقاندنی دەسپۆتیزم بەتوانستە. ئەگەر رووخاندنی هەمووشیان بەئامانج دابنێ، کێشەی کۆنترۆڵکردنی جەماوەری گەل دەردەکەوێت. لەراستیدا ئەو رووداوانەی لەگێژاوی ئێراق دێنەئاراوە پڕە لەو پەندو ئەزموونانەی کەرووداوو ئەگەرە شیمانە بۆکراوەکانمان نیشاندەدات. بۆماوەیەکی درێژ پشتگیری لەرژێم کرا، ئاکامیش کێشەی قورس و گرانتربوو. ئەم رژێمەی رووخاند، بەڵام ئەو زەمینە کولتووری و بلۆکانەی دەسەڵات کە لەئارادان هاوشێوەکانیان لەسەرپێ رادەگرن و تێرخۆراکی دەکەن. بەلاوەنانی ئەم زەمینە کولتوورییە لەرێگای تاکرەوێتی رۆژئاوا ئەگەرێکی زۆر سەخت و ئاستەمە. پارچەکردنی بلۆکەکانی دەسەڵاتیش بەواتای هەڵمەتێکی راستەقینەی شۆڕشگێری دێت. دیالەکتیکی بنبەستبوون بەمجۆرەیە.

هەربۆیە کەوتنەگەڕی نەتەوەیەکگرتووەکان و ناتۆ ناچارییەکە. بەڵام ئەم دەستێوەردان و چوونەژوورەوە وەکو ئەوەی سۆماڵ و ئەفغانستان نابێت. هەمیشەیی و فراوانییەکەی پێویستییەکی هەلومەرجەکانە. شیتەڵکردنی رۆژهەڵاتی ناوین تازەبەتازە گرنگی و بایەخەکەی دیاردەبێت. رووبەڕووی ئەو گرفت و تەنگەتاوییانەی هەڵۆشانەوە دەبینەوە کەچەندین جار لەوەی سیستەمی سۆڤییەت قورسترە. ئەو ئاکامەی لەئەنجامی شکاندنی قاڵبەکانی دەسەڵات و هزر دێنەئاراوە کەبەدرێژایی هەشت هەزارساڵە بەردەوام بەرەو موحافەزەکاری زیاتر دەچێ، بەئەنجامی هیچ یەکێك لەناوچەکانی جیهان ناچێت. ئەو تاك، تیرەو گروپە کۆمەڵایەتییانەی سەربەست دەمێنن، وەکو مینی سەرسەری لەم نێوەندەدا دەمێننەوە. لەمیانەی کامە شۆڕشی ئابووری و زهنی ئەم بلۆکە(جەمسەرە) بچووکانەی دەسپۆتیزم پارچەدەکرێت، لەجێگای ئەوە پێکهاتەی نوێی ئابووری و زهنی ئاوادەکرێت؟ چۆن و بەچی دەتوانرێ ئەم جیاوازیە ریشەییانەی نێوان تاکی پێناسەکراوی رۆژهەڵاتی ناوین و ئەو تاکەی ئەوروپا بەلاوەبنرێت کەپشت بەنەریتی ریشەیی رۆشنگەری و ریفۆرم و رێنیسانس دەبەستێت؟ سەرباری ئەوەی کولتووری ئەورووپای رۆژهەڵات هێندە لەپێکهاتەی کولتووری گشتی ئەوروپا دوورنەبوو، توانی لەماوەی چارەگە سەدەیەك لەسیستەمێکی هاوچەرخی وەك سۆسیالیزمی بونیادنراو بەرەو سیستەمی لیبراڵ هەنگاو بهاوێژێ و تازەبەتازە لەمەدا سەردەکەوێ.

چارەسەرییەکی ناو سیستەم جێگای باسە. لەناو سیستەمە شیتەڵکراوەکەی ڕۆژهەڵاتی ناویندا گەیشتن بەچارەسەری بانگەشەیەکە گفتوگۆیەکی زۆری لەسەردەکرێت. ئاشکرایە ئایندەیەکی پڕلەکێشە چاوەڕوانە.

هەرچی ژێرکەوتنی ئەو هاوپەیمانێتییەیە کەئەمریکا ڕێبەرایەتی دەکات، کێشەی ستراتیژی دەخوڵقێنێ. لەئاستی جیهانگیریدا بۆ ئەمریکا دەبێتە کودەتایەك، قۆناخی بۆدواوە گەڕانەوەی ئیمپراتوریەت خێرادەبێت. ئەو ئەمریکایەی لەرۆژهەڵاتی ناوین بدۆڕێنێ، لەتەواوی ئاسیا، ئەوروپاو ئەفریقیا دەکەوێتە نێو قۆناخی دۆڕاندن و ژێرکەوتنەوە. وەکوجاران ناتوانێ ئەمریکای باشوور، مەکسیك و کەنەدا لەژێرکۆنترۆڵی خۆی بگرێت، دەکەوێتە نێورەوشی روسیای دووەم. لەناو ئەو هاوسەنگییەی هێز کەلەئارادایە، پەسندکردنی ئەمریکا بۆ کەوتنەنێو رەوشێکی بەمجۆرە، لەگەڵ راستینەی دەسەڵات ناکۆکە. هەربۆیە هەڵوەستەیەکی ستراتیژی ناچارییە. چەندە خەرجییەکەی زۆربێت، لەئاستی جیهان رووبەڕووی ناڕەزایی ببێتەوە، ناچارە بمێنێتەوەو هەندێ ئەنجامی چارەنووسسازانە بەدەستبێنێ.

ئەو کێشانەی سیستەمی سەرمایەداری رۆژئاوا خۆی ناچاری چارەسەرکردنیان دەبینێ، ئەگەر بەشێوەی کێشە درێژخایەن، مامناوەندی و کورتخایەنەکان ریزبەندییان بکەین، ئەفغانستان و ئێراق لەڕیزی کورتخایەنەکاندان. بانگەشەی فیدراسیۆنی دیموکراتییانە دەکرێت. وەك وڵاتە مۆدێل نوێکانی ناوچەکە بیریان لێدەکرێتەوە. ئەو گەڵاڵەنامە دەستووریانەی ئامادەکراون، لەسەرکاغەز سیستەمی فیدراسیۆنی دیموکراتییانە بەبنەمادەگرێت. ئاشکرایە هەڵوێستێك جێگای باسە کەخاوەن بانگەشەیەو نوێبوون لەخۆودەدەگرێت, بەمەراقەوە چاوەڕوانی دەکرێت ئاخۆ پراکتیزەکردنی بەکامە ئاقاردا دەچێت. ئەو کولتوورانەی ژمارەیەکی زۆری ئەتنیك، گروپی ئایینی لەخۆودە دەگرن، ئاشنابوونیان بەفیدراسیۆنی دیموکراتییانە وەرچەرخانێکی مەزنی شارستانییەتە. ئەمەش بەجۆرێك لەجۆرەکان وەك شێوەی شۆڕشەکانی فەڕەنساو روسیای رۆژهەڵاتی ناوین کاریگەرییان دەبێت. سەرلەنوێ بونیادنانەوەی رژێمە دەسپۆتەکۆنەکان ئەگەرێکی زۆر لاوازە. لەهەلومەرجەکانی ئیمپراتۆریای گێژاو و قەیراندا فیدراسیۆنی دیموکراتییانە پێکهاتەیەکە زۆربەزەحمەتییەوە بەڕێوەدەبردرێت. ئەو هێزانەی پێشەنگایەتی بۆ بکەن لەکوێ دەدۆزرێتەوە؟ هێزە داواکارەکانی دەسەڵات کەبەلانی کەم هێندەی رژێمەکانی رابردوو ناوەرۆکی دەسپۆتیك لەخۆوە دەگرن، لەپێگەیشتنێکی هزری و سیاسی وەهادوورن کەکارەکتەرە ئەتنیکی و مەزهەبییەکان بەسەنتێزێکی ئەرێنی بگەیەنن. هێشتا تاکی ئازادو لیبرال لەناو گەشەکردنێکی زۆرسنووردار دایە. ئایدیالیستە سۆسیالیست و دیموکراتەکان هێندەکەمن تارادەی نەبوون چوون. هەرچی ئەوانەی رابردوون هێندە لاوازبوون کەنەیانتوانی باری خۆیان هەڵگرن. زیاتر باوەڕییان بەنەتەوە یەکگرتووەکان(UN)، ناتۆ و یەکێتی ئەوروپادێت. پێکهاتەیەك بەردەوام وابەستەی دەرەوەبێت، فیدرالیزمە دیموکراتییەکەی دەبێتە جێگای گفتوگۆ.

کێشە گرنگەکانی قۆناخی ناوین، کێشەی عەرەب ـ ئیسرائیل و پەیوەندییەکانی کورد ــ عەرەب، کورد ــ ئێران و کورد ــ تورکیایە. بێگومان لەچارەسەرکردنی ئەو کێشانەی لەسەر بنەمایەکی مێژوویی پەرەیانسەندووە هەوڵەنوێ و تایبەتییەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان، ناتۆ، هاوپەیمانان و ئەوروپا کاریگەرییەکی خێراکردنیان دەبێت. بەڵام هەردووکیشیان کێشەی قورس و دژوارن. بەو ئەندازەیەی بۆ قووڵاییەکانی شارستانییەت شۆڕبوونەتەوە، پەیوەندییەکانیشیان لەگەڵ هاوچەرخبوون پڕە لەناکۆکی و گرژی. چارەسەرکردنی کێشەی فەلەستین ــ ئیسرائیل تارادەیەکی مەزن گرێدراوی بەهێزبوونی ئاشتی و دیموکراتیزەبوونی ناوچەکەیە. بەپێچەوانەی شیمانەکان، گووتەی "سەرەتا کێشەی فەلەستین ــ ئیسرائیل چارەسەربکرێت" مەترسی درەنگخستنی پەنجا ساڵی دیکە لەخۆوە دەگرێت. کۆمەڵگای عەرەبی دیموکراتیزەنەبووو دەوڵەتەکانیان بناخەی ئەم کێشانە پێکدێنن. دیموکراتیزەکردنی هەردووکیان زەمینەی ئاشتی فەلەستین ـ ئیسرائیل ئامادەدەکات. لەدۆخێکی پێچەوانەدا

پێکدادانی فەلەستین ـ ئیسرائیل پێکهاتەو زهنییەتە موحافەزەکارەکانی کۆمەڵگای عەرەبی و دەوڵەتەکانیان بەهێزتردەکات. هەروەکوچۆن تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان بەهێزیکردووە.

هەرچی دۆزی کوردە، زۆرئاڵۆزو فرەلایەنە. کێشەی قووڵی لەگەڵ دەوڵەت و پێکهاتەی کۆمەڵگای تورکیا، ئێران و عەرەبیدا هەیە. ناهێڵن تەنانەت سوود لەمافە مەدەنییەکانیش ببینێت. مافە سیاسی و ئابوورییەکانیش بەهیچ شێوەیەك نەخراوەتە رۆژڤەوە. قڕکردنێکی کولتووری بەڕێوەدەچێت. ئەگەری ئەوە هەیە دواسەپاندنەکانی ئەمریکا هەندێ جموجوڵ لەگەڵ خۆیدا بێنێ. دەشێ هەندێ کرانەوەی سنووردار بێنێتەئاراوە. بەتایبەتیش فیدرالیزمی کوردستانی(ئێراق) بۆ وروژاندن و لەخشتەبردن کراوەیە. لەژێرکاریگەری un و ناتۆو هاوپەیمانان چاوڕوانی کلپەگرتنی ئاگری دیکەدەکرێت. ستاتۆی ئێستای کوردان لەگەڵ ناچارکردن و سەپاندنی یاخیبوون یەکسان و هاوواتایە. ئەگەر لەسەر بنەمای شێوازی چارەسەرییەکی دیموکراتی واتادارو شایستەی ژیان هەڵوێستێك نیشاننەدرێت, چاوەڕوانی جوگرافیایەکی خوێناوی وەهادەکرێت کەپێکدادانەکانی ئیسرائیل ـ فەلەستین تێپەڕ دەکات. ئەو شەڕو پێکدادانانەی لەجوگرافیا سەخت و سەرکەشەکانی جەماوەرێکی چل ملیۆنی کورد دەستپێبکات, کێشەکانی ناوچەکە قورس و سەختتردەکات. دەرگاکانی ناوچەکە بەڕووی هەموو جۆرە گۆڕانکارییەك دەکاتەوەو دەخاتە سەرپشت.

دەشێ چارەسەری درێژخایەنی کێشەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگا عەرەبییەکان, کۆمارە تورکەکان, پاکستان و ئێران لەرێگای پێشخستنی مافەکانی مرۆڤ, دیموکراتیزەبوون و پەرەسەندنی ئابووری بەدیبێت. ئەو موحافەزەکاری و بلۆکە بەهێزانەی بەرژەوەندیپەرستن کەلەپێکهاتەی کۆمەڵگاو دەوڵەتدا هەیە هێندەی بۆیان بلوێ بەرخودان دەکەن. بەڵام کاتێك ئەلتەرناتیفی چارەسەری وەهاپێشکەشبکرێت کەبەگەل بگات و چینی دەسەڵاتداریش لەفشارەکانی کەم نەکاتەوە, ئەگەری ئەوەهەیە بەشێوەیەکی سنووردار وەرچەرخان لەناو سیستەمدا رووبدات. لەهەرسێ ماوە ـ مەودای چارەسەریدا پێویستی بەهێزێکی ئابووری و سەربازی بێپایان هەیە. بۆ بەڕێوەچوون و پراکتیزەکردنی پرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوین بەردەوام هەڵمەتی ئابووری و سەربازی دەکاتە پێویستییەك. شانبەشانی ئەمەش پێگەیاندنی تاکی لیبرال و پێشخستنی ئازادی ژن کەزۆر ئاماژەی پێدەکرێت، گرنگی و بایەخێکی ژیانی و دەستلێبەرنەدراویان هەیە. تاوەکو ژن هوشیارنەبێتەوە، نەیەتەوە هۆش خۆی و بەبچووکترین ئازادی نەگات، ئەوا تەواوی هەوڵ و کۆششەکانی دیکە مەحکومی بێئەنجامی و پووچەڵبوونەوەن. بەبێ جیاوازی خستنە نێوان ژن ـ پیاو تاوەکو ئازادی تاك لەناو گشتی کۆمەڵگادا بەدینەیەت، لەسەرووی هەموویانەوە ژن ئازادی هیچ یەکێك لەتوێژەکانی کۆمەڵگا بەدینایەت.

**وەك ئەنجام بۆ دەرکەوتن لە گێژاوی رۆژهەڵاتی ناوین دەتوانرێ سێ سیناریۆ دابنرێ:**

**یەکەمیان:** ئەوانەی دەخوازن پارێزگاری لەسیستەمی (ستاتۆ)ی جاران بکەن. وڵاتانی ناوچەکە کەدوای هەردوو شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانی ئاواکران، لەبواری سیاسی و ئابووری دەخوازن داکۆکی لەسەر مۆدێلی دەوڵەتی ـ نەتەوەیی بکەن. بەهۆی تێکچوونی هاوسەنگی سۆڤییەت ـ ئەمریکاو رووتێکردنی ئەمریکا بۆ ناوچەکە بەشێوازی ئیمپراتۆریەت، مۆدێلی دەوڵەتی ـ نەتەوەیی زەحمەتە بەدۆخی جارانی بەردەوام بێت و بەڕێوەبچێت. وەرچەرخانی کولتووری، ئابووری و سیاسی ناچارییەو رزگاربوونی لێ نییە. پێکهاتە ئابووری و سیاسییەکانی هزری دەوڵەتگەرایی، میللیگەرایی و ئایینی, کەلەکۆنەوە ماونەتەوە, لەهەموو لایەنێکەوە (بوارێکەوە) کۆسپن لەپێش هەڵمەتی نوێی جیهانگیری. لەبەرئەوەی لەمێژە چاخی سەرمایەداری میللی (نەتەوەیی) تێپەڕیوەو تواناکارییەکانی سیاسەتی هاوسەنگی سەدەی بیستەم ئێجگار سنوورداربووە، چاوەڕوانی دەکرێت ئەوانیش تەقلی سیستەم ببن. ئەوەی دەخوازن ئەنجامی بدەن بەخۆگرانکردنەوە تەقلیبوون و لکاندنە بە سیستەمە. لەمیانەی ناوەکانی میللیگەرایی، موحافەزەکاری و کۆمەڵایەتی بۆئەوەی خۆش بێتە بەرگوێی جەماوەر هەوڵدەدەن

لەرێگای پەیرەوەکانی راگەیاندن (میدیا) شێوەیەکی گونجاوی بدەنێ. ئەم هەوڵە لاوازو نەزۆکانەی بەشێوەیەکی بەرفراوان لەرۆژگاری ئەمرۆماندا لەئارادایە ــ کەناتوانرێ بەگۆرانکاریش بەناوببرێت ــ ئەگەرلەبواری سیاسیش رەنگبداتەوە، تەواو رێچکەو پێرەوێکی دیماگۆژیانەی فریودانە. ئەوەی گروپە بەرژەوەندیپەرستە دەوڵەتگەرایی و ئایینی و مەزهەبگەراییەکان دەخوازن رزگاری بکەن، بەرژەوەندی ئابووری و سیاسییە. ئەو ناوەندە سەرمایەدارییە بەرچاوانەی دەخوازن بەگوێرەی پێوانەو نۆرمەکانی چاخی زانیاری سەرلەنوێ سیستەم ئاوابکەنەوەو لەم بوارەدا خاوەن بانگەشەن"ئەمریکا، یەکێتی ئەوروپا، ژاپۆن، تەنانەت چینیش" چاوەروانی ناکرێت لەگەڵ پێکهاتە سیاسی و ئابوورییە بەرژەوەندیپەرستەکان بەرێوەبچن. پێویستە لەوە تێبگەن کەسەرمایەداری کۆمپرادۆری کلاسیك تێپەرکراوەو سەردەمی بەسەرچووە. بەتایبەتی ئەو ستاتۆیەی تورکیا، میسر، پاکستان و ئێران دەخوازن لەسەر پێیانی رابگرن، خۆراگری و لەسەرپێ راوەستانیان بەرامبەر فشارە بەردەوامەکانی سیستەم بۆ سەرناوچەکە رۆژبەدوای رۆژ ئاستەم دەبێت. نەلەناوخۆیان، نەلەدەرەوە، وەکو جاران تواناکاری نەماوە لەرێگای رێککەوتنی نوێ بەردەوامی بەهەبوونی خۆیان بدەن. بەنازو خۆگرانکردنیشەوە بێت، لەژێررێبەرایەتی ئەمریکاو لەچوارچێوەی پرۆژەی مەزندا جگە لەسەرلەنوێ تەڤلیبوونی سیستەم بژاری دیکە ماقووڵ نییە.

سیناریۆی دووەم : سەرلەنوێ ئاواکردنەوەیە لەژێر قورسایی ئەمریکا. پراکتیزەکردنی پیلانێکی هاوشێوەی ئەو پرۆژەی ئینگلتەراو فەرەنسایە کەدوای یەکەمین شەری جیهانی پەیرەویان کرد. دەشێ بیر لەستاتۆیەکی نێوان دەوڵەتی ــ نەتەوەیی و داگیرکاری بکرێتەوە. سووربوونی ئەمریکا لەناوچەکە بەردەوام بێت و بەرفراوانتر بێت، ستاتۆی ناوچەکە وەکو ئامانج نیشانی ئەو ناتۆیە بدات کەزیاتر بەخۆیەوە گرێداوە، UN یش بخاتەناو ئەم مەسەلەیەوە، ئەو سیناریۆیەی زیاتر داخوازی ریالیزەکردن ــ پراکتینرەکردنی واقیعی ــ دەبێت سیناریۆی دووەمە. ئەگەر بخوازین نموونەی بۆ بێنینەوە، سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی ئەوروپاو ژاپۆنە لەدوای دووەمین شەری جیهانی لەچوارچێوەی پرۆژەی مارشاڵدا. دەتوانین دراوسێکانیان مەکسیك و کەنەداش لەسەرئەم نموونەیە زیادبکەین. بەڵام ئەوەش ئاشکرایە کەپێویستە پێکهاتەو بونیادی رۆژهەڵاتی ناوین زۆر لەنموونەکانی رابردوو جیاوازتر پێشبخرێت. ئیتر بەگوێرەی ئەوەی میسرو تەواوی دەوڵەتە عەرەبییەکان، ئێران، ئەفغانستان، پاکستان و تورکیاشی لەناودا تەواوی دەوڵەتەکانی تورك زمان، ناتوانن بەشێوازی کۆن بەردەوام بن، ئەوا ناچارن زۆرباش وانەکانی سەرلەنوێ بونیادنانەوە بخوێنن. لیبرالبوون لەئابووری، ئازادبوون ــ بەتایبەتی ژن ــ لەبواری کۆمەڵایەتی، لەسیاسەتیشدا دیموکراتیزەبوون ــ دیموکراسی بۆرژوا ــ لەچوارچێوەی سیستەم، لۆژیکی سەرەکی ئەم سەرلەنوێ بونیادنانەوەیە. ئەمریکا، ئەوروپاو ژاپۆن دەکاتە پاڵپشتی خۆی، هەروەها لەرێگای UN رەوابوون (مەشروعییەت) مسۆگەردەکات، پێویست بکات قامچییە نوێکەی ناتۆش نیشاندەدات، سووردەبێ لەسەر وەرچەرخانی ئەم وڵاتانە لەماوە کورتخایەن، ناوین و درێژخایەنەکاندا. ئەوەی بخوازێ رێگری بکات و کۆسپ دروستبکات، هەموو ئەو بژارە سەربازی، سیاسی، ئابووری (بانکی جیهان، IMF ـ سەندوقی دراوی نێودەوڵەتی)یانەی لەدەستیدایە بەکاریدێنێ و دەیهێنێتەوە سەررێ. لەم سیناریۆیەدا سەرباری ئەوەی سنوورە سیاسییەکان هێندە ناگۆرێن، هەروەکو لەئەفغانستان، ئێراق، تەنانەت لەجۆرجیاو بەڵقانیش بینرا، لەجیاتی پێکهاتەیەکی وشکی مەرکەزگەرایی ـ بیروکراتیك، پێکهاتەیەکی سیاسی وەها بژارو بونیاد دەکرێت کەنەرمە، بەرێوەبەرایەتییە خۆجێییەکانی بەهێزکردووە، دەتوانێ تاوەکو سیستەمی فیدراسیۆن بچێت و دیموکراتییانەترە. لەبواری ئابووریدا ئابووری دەوڵەتگەرایی هەڵدەوەشێنرێتەوە، لەجیاتی ئەوە قورسایی دەخرێتە سەر پێکهاتەیەکی ئابووری پشتبەستوو بەکۆمپانیا فرەرەگەزەکان و کۆمپانیا دەرەکییەکان و تایبەتبوون (خصخصة)ی ئابووری. لەکاتێکدا لە میانەی پشتبەستن بەئازادی ژن و تاکێتی تاك (کەسێتی تاك) پرۆژە سەبارەت بەخەباتی کولتوورو هونەر پێشدەخرێت، هێزی

راگەیانــدن (میــدیا)ش بەشــێوەیەك بونیاددەنرێتــەوە کەلەخزمــەتی ئــەم ســەرلەنوێ ئاواکردنــەوەدا بێــت. دەشــێ ئێــراق و ئەفغانستان نموونەی سەرەتایی ئەم سیناریۆیەبن.

بەڵام لاوازترین لایەنی ئەم سیناریۆیە ئەوەیە کــەزۆر بەزەحمەتــە لەمیانــەی ئــیرادەی یەکلایەنــەی سیــستەم بەڕێوەبــچێت. لەلایەك دەوڵەتە ـ نەتەوەییە ستاتۆگەراییەکان، لەلایەکەی دیکــەوە لەبەرامبــەر زیــادبوونی داواکــاری رکابــەر (ئۆپۆزسیــۆن)ی کۆمەڵایەتی، ناچاری هەندێ تەنازول دەبێ. ئەنجامنــەدانی پێوەلکانێــك لەمیانــەی ئــیرادەی یەکلایەنــەی سیــستەم، وادەکــات بــۆ پێکهاتەو بونیادی تێکەڵەتر کراوەبێت.

سیناریۆی سێیەم: وەك وەڵامێکی ئەم پێویستییە پێشدەخرێت. بەومەرجــەی هێــزی دەســتپێکەرو بەهــەژموون خــۆی بێــت، رێککەوتن لەسەر هەردوو لایەن دەسەپێنێ. ئەوشتەی لەرابردوودا بەملکەچکردن ناومــان دەبــرد، لەهەلومەرجــەکانی رۆژگــاری ئەمڕۆمان بۆ تەبایی و رێککەوتن دەگۆڕێ. هەروەکوچــۆن دیــسان دەرفــەت بەدەوڵەتــە ـــ نەتەوەییــە ســەرفرازەکان و ئابوورییــە بێپیت و بەخەرجییەکان نادات, هــەروەها دەرفــەت بــەو راپەڕینــە ســەرهەڵدانە بــەرفراوان و درێژخایەنانــەی رزگــاریش نــادات کەلەلایەن گەلەوە ئەنجامدەدرێن. ئەو بژارانەی دەیسەپێنێ یان رێککەوتنێکی خێرا یاخود پلیشانەوەیە. گوزارەی بەرجەستەی ئەم سیناریۆیە دەشێ جۆرێکی هاوشێوەی وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات بێــت یــان هاوشــێوەی ئــەو ســتاتۆیەی رۆژگــاری ئــەمڕۆی وڵاتــانی ئــەورووپای رۆژئــاوای کــۆن بێــت. واتــە وەکــو مەکــسیك و کەنــەدایان لێنایــەت، بــەڵام وەکــو تورکیــا، میــسرو پاکــستانیش نامێننەوە. تێپەڕبوون زیاتر بەرەو دیموکراسی بۆرژوازی پەرەپێــدراو دەبێــت. لەوانەیــە گــەل چاوەڕوانی کــارابوونی چالاکی و هێزەکــانی خــۆی و پێبــەپێ بێکاریگــەربوونی هێزەکــانی دەوڵــەتی ـــ نەتــەوەیی ســتاتۆگەرابن. لــەنێوان دیموکراســی گــەل و دیموکراسی دەوڵەتی بۆرژوا دەشێ ئەزموونێکی سەیر بێتەئاراوە. لەکاتی دەرکەوتن لەقەیران پێویستە هێــزە پەیوەندیــدارەکان رەوشــی هاوســەنگی ئــەمجۆرە بژارانــە رەچاوبکەن. فاکتــەری ســەرەکی کەپێویــستی بــەئاگاداربوون هەیــە ئەوەیــە چــۆن نــابێ بەرخودانێکی کوێرانە بەرامبەر تەواوی سەرلەنوێ بونیادنانەوەی سیستەم بکرێت، لەهەمانکاتــدا نــابێ بکەویتــە نێــو ســازش و رێککەوتنێکی بێ پرەنسیپانە. هەروەکو لەچەندین ئەزموونداا بینراوە کاتێك دەڵێن "بەتــەواوەتی ســەرکەوتووبم" بەتــەواوەتی ژێردەکەوێ.

شیمانە دەکرێت لەچارەگە سەدەی داهاتوودا ئەم سیناریۆیانە بەشێوەیەکی تێکەڵاو لەگەڵ یەکدی و لەمیانەی ئەو بژارانەی ئەگەری زیادبوونیان هەیە، هەوڵــدەدرێت لــەم گێــژاوەی رۆژهــەڵاتی نــاوین رزگــاری بــەدیبێت و چارەســەری پێشبخرێت. بــەڵام ئەوەی لەهەمووان گرنگترە، ئەوەیە کەسیناریۆی هێزەکانی بنکەی کۆمەڵایــەتی گــەل ـ زەحمەتکێــشان چــی دەبێــت کەلــەڕێگای کۆبوونەوەکانی پرۆتۆ ـ ئالاگرا خۆی راگەیاندو ئۆتۆپیاکەی چۆن پەرەی پێبدرێت. هیچ کاتێك مێژوو بــەئیرادەی یەکلایەنــەی هێزە زۆردارەکــان دیــاری نــەکراوە. دەستنیــشانکردنی هەمیــشەیی لەلایــەن هەڵوەســتەو راوەســتەی دیموکراتییانــەو کۆمــەڵکاری کۆمەڵگاکانەوە بووە.

3 ـــ دەتــوانین رۆژهــەڵاتی نــاوینی ئــەمڕۆ لەرەوشــی ئیمپراتۆریــەتی رۆمــای ســەدەی چــوارەم بــچوێنین. جگەلەرۆژهــەڵاتی رووبــاری دیجلە ناوچــەکە ئەیالــەتی (ویلایــەتی)یەکی ســەر بــەرۆما بــوو. لەکاتێکــدا ئــایینی مەســیحی بــەخێرایی بڵاودەبــۆوەو لــەناوەوە فــەتحی دەکــرد، لێــشاوی هۆزەبەربــەرەکانیش ـــ بزووتنــەوەکانی رزگــاری نەتــەوەیی ئــەمڕۆ ـــ لــەدەرەوە هــەنگاوی فــەتحکارییان دەســتپێکرد. ئــەو وەڵامــەی سیــستەمی ئیمپراتۆریــەت دایــەوە، بەشــێوەی تواندنــەوەی هــەردوو بزوتنەوەکــە بــوو لەبونیادی خۆیدا. ئەو بزووتنەوە ئەتنیکی و کۆمەڵایەتییانەی سەردەمێکی درێــژ لەســەدەکانی دوو و سێ لەمیانــەی پــەلاماری بێڕەحمانەوە هەوڵی سەرکوتکردنی دا، لــەڕێگای سیاســەتی قــەرەبوودان چینی ســەرەوەیانی تــەقلی (بەشــداری) سیــستەم کــرد. تامــەزرۆیی و بــەڵام ئــەم موتوربەکردنــە هێنــدە بەخێرنــەبوو, زیــاتر رێگــای لــەپێش پووکانــەوەو نیــشاندانی نیــشانەکانی

پەرتەوازەبوون کردەوە. خولیای ئیمپراتۆر جۆلیان بۆ بوون بەئەسکەندەری دووەم و زیندووکردنەوەی پاکانیزم ــ بیروباوەڕی ئایینی سروشتی پێش زایین ـ لەکەنارەکانی رووباری دیجلە شالاّوە ئەسکەندەرئاساکەی بەدۆڕاندن ئەنجامگیربوو. نابێ گومان لەوەبکرێت کەجۆرج دەبلیو بۆشی سەرۆکی ئەمریکا لەژێرهەمان باوەڕی مێژوویی هەنگاوی بۆ سێیەمین هەڵمەتی ئەسکەندەر هاوێشت. ئەگەرخاوەن پاکانیزمیش نەبێت ئەمە راستییەکی زانراوە کەدەخوازێ ئەڤانگەلیزم ــ موساگەرایی، مەسیحگەرایی، تەنانەت لەهەندێ لایەنەوە موسڵمانێتی ــ بلاّوبکاتەوە. ئەڤانگەلیزم جۆرێکی ئاینی رۆژگاری ئەمرۆمانەو لەبەرامبەر زانستگەرایی رۆڵی پاکانیزم دەبینێ. لێکچوونەکەی لەمەدایە دژی حاکمەکانی رابردووە. لەدوای جۆلیانا ئیمپراتۆریەتی رۆما بەخێرایی بۆدواوە گەڕایەوە. دوای ماوەیەکی کورتیش بۆ دووپارچە دابەشبوو. مردنی جۆلیانا دەوروبەری ساڵی 365 بوو، پارچەبوونی رۆماش ساڵی 395 ی زایینی بوو.

لێکچوون لەکۆمەڵەی دیکەشدا بەکاریگەرو سەرنجڕاکێشە. ئاینی مەسیحی ئەو قۆناخە لەراستیدا چەندین جار لەسۆسیالیزمی بونیادنراو زیاتر بزووتنەوەی هەژاران بوو. بەشێوەیەکی زۆر هەستیار سیستەمێکی کۆمەڵکاری بەڕێوەبرد.

مانستەرەکان دامەزراوی راستەقینەی کۆمۆنیستی بوون. بەدرێژایی سێ سەدساڵ بەرامبەر رۆما بەرخودانیان کرد. لەساڵی312 ی زایینی لەرێگای قوستنەنتینی مەزن لەناوخۆدا رێککەوتن و بوون بەپارچەیەکی. هەرچی بنکە نەدارەکەیە، لەسەرووی هەمووشیانەوە ئاریوسگەرایی درێژەی بەبەرخودان دا. بەربەرە رەوەندەکانی لەبزووتنەوەکانی رزگاری نیشتمانی رۆژانی ئەمرۆمان دەچوون، بەتایبەتیش ئەتنیکە بەریشە جەرمەن و هونەکان لەمیانەی ئەو بەرخوادن و هێرشانەی سەدان ساڵ بەردەوامبوو چینی سەروو (بالاّ) رۆمابوونیان بەخۆیانەوە بینی، لەئاکامی ئەمەشدا تەڤلیبوون خێرابوو. بەمجۆرە ئیمپراتۆریەتی رۆما گەورەدەبێ، کاتێك وادیاردەبێ کە لەگەڵ هاوپەیمانە نوێکەی بەهێزدەبێ، لەراستیدا ــ لەناوەڕۆکدا ــ بچووك دەبێتەوەو پەرتەوازەدەبێ. لەگەڵ بەرەو پێشەوەچوونی گۆڕانکارییەکان ئەم قۆناخە ئاشکرادەبوو. کاتێك رۆما ئەو بەهایانەی ونکرد کەکردبووی بەرۆما، هەروەها لەبەرئەوەی بۆ داواکارییەکانی گەلان نەبووە وەلاّم هەڵوەشاوەتەوە، بۆ دواوە گەڕاوەتەوە و دواتریش پارچەبووە.

ئیمپراتۆریەتی ئەمریکای رۆژگاری ئەمرۆشمان لەزۆر لایەنەوە لەرۆما دەچێت. ئەویش بەرەوشی ئیمپراتۆریەتی جیهان گەیشتووە. گەیشتۆتە لوتکە. سێیەمین هەڵمەتی مەزنی جیهانگیری، گەیشتنە بەئیمپراتۆریەتی جیهان. کاتێك رۆما لەلوتکەدابوو، کەوتە ناو قۆناخی پووکانەوە، پەرتەوازەبوون و پارچەبوون.

ئەمریکاش کەوەك ئیمپراتۆریەتی گێژاو بەردەوامی بەهەبوونی خۆی دەدات چەندین نیشانەی پەرتەوازەبوونی پێوە دیارە. بەشێوەیەکی زێدەڕۆ بلاّوکردنەوەی هێزەکەی، پەرتەوازەبوونیشی لەگەڵ خۆیدا دێنێ. پارچەبوونیش بەهەمان شێوە لەگەڵ یەکێتی ئەوروپا لەئارادایە. لێکچوونێکی دیکەی قووڵتری، تواندنەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراوە (مەسیحییەتی قۆناخ) لەناو سیستەمی سەرمایەداریدا. لێکچوونی نێوان سالاّنی 1990 ــ 312 زۆر سەرنجڕاکێشە. مەسیحییەتی هاوچەرخ کەسۆڤییەتی سۆسیالیزمی بونیادنراو سەرکێشی دەکرد، لەدوای بەرخودانێکی درێژخایەن لەگەڵ سیستەمی دایك سازشکاری کردو رێککەوت ـ لەگەڵ توێژی بیروکراتی سەروو ــ خیانەتی لەهەژارو نەدارانی کرد. لێکچوونێکی دیکەی سەرنجڕاکیش، سازشکاری و رێککەوتنی رژێمەکانی رزگاری نیشتمانییە لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی ئەمریکا. "جەرمەن، هون" کانی دوێنێ موختارەکانی رزگاری نیشتمانی ئەمرۆ، هەریەکەو بوونەتە والی ئەیالەتێکی ئەمریکی.

سەرجەم قۆناخەکانی توانەوەو پارچەبوونی لەگەڵ گەیشتنمان بۆ سالاّنی 2000 گەیشتۆتە لوتکە. هەڵمەتی دوای 11 ی ئەیلول، لەکامەلاوە سەیربکرێ دەبینرێ، نەك هەڵمەتی پەلهاوێشتنی سیستەم، بەڵکو هەڵمەتی رێگرتن و وەستاندنی پەرتەوازەبوون، پارچەبوون و دواکەوتنە. دەبێ زۆر بەباشی جیاوازی نێوان هەردووکیان ببینرێ. هەڵبەتە ئەم لێکچوونانە

بـەو واتایەنایـەت کەهـەمان جـۆرە گۆڕانکـاری و پێـشهات دووبارەدەبنـەوە. ئـەمریکا تـادوارادە براگماتیـستە ــ ڕۆژانـەیی و بەرژەوەنـدیخوازە ــ و لـەجیاتی ئـەوەی لەهەرەدواییـدا وەکـو ئیمپراتۆریەتـەکان سیـستەم بـەرەو رووخانـدن ببـات، لـەرێگای سیاسەتی قەرەبووە بەرفراوانەکان دەتـوانرێ بـۆ گـوزەرێکی نـەرم وەرچـەرخێنرێ. پێویـستە بەشـێوەیەکی رشـت ئـەم ئەگـەرە رەچـاوبکرێت. هەڵبەتـە گەورەبوونەکـەی تـاوەکو رۆژی ئـەمڕۆ لەنزیکـەوە گرێـدراوی هەڵوێـستی براگمـاتیکی و سازشـکاری (رێککەوتن)یەکانێتی. بەڕێوەبردنی هەردوو پێڕەوی رێککەوتن و فشار لەرێگای هێزە سەربازی، هەوالگری، ئـابووری، کولتـوری ـ راگەیاندن، هونەر، رێکلام و هێزی زانستی ـ تەکنۆلۆژی لەلایـەن سیـستەمی سـەرمایەداری ئـەنجامی سـەرکەوتووانەی لەگـەڵ خۆیدا هێناوە. بۆئـەوەی گـەلان و زەحمەتکێـشان دیـسان لەئـەنجامی دووەمـین رێککـەوتنی نێـوان مەسـیحییەتی و بەربـەرەکان لـەناو سیـستەمی بالادەسـتدا نەتوێنـەوە، بەرلەهـەموو شـتێك پێویـستە لـەرێگای هێـزی زهنییەتـەوە هەڵوێـستی کۆمـەڵکاری دیموکراتییانە بکەن بەیـەك، بـەبێ پشتگوێخستنی رێککـەوتنی بەپرەنـسیپانە، دەشـێ ئەمـە لـەرێگای نوێکردنـەوەی هەڵمـەتی شارستانییەتی دیموکراتییانەو سەپاندنی بەسەر سیستەمدا بەدیبێت.

چۆن مێژووی گەشەسەندنی هێزە زۆردارەکان وەك ئەڵقەکانی زنجیرەیەك لەنێو یەکپارچەیی دایە، بزووتنـەوەی هێزەکـانی ئازادیش لەناو گەشەکردنێکی دیالەکتیکی هاوشێوەدان. هەرچەندە شـێوەی هـەر ئەڵقەیـەك جیـاوازیش بێـت، هـەمان داخـوازی ئـازادی بەئەڵقـەکانی چـاخە یـەك لـەدوای یەکەکانـەوە دەگـات و تـاوەکو ئـەمڕۆ دێـت. لێـرەدا جـارێکی دیکـە دەردەکـەوێت کەرۆڵەکەی شێوە پاراستن و گواستنەوەیە. هەرچی ناوەڕۆکە، تایبەتمەندێتییـەکی وەهـای هەیـە کەدەوڵەمەنـدێتی و قـووڵایی بەدەسـتدێنێ. لـەخۆوەگرتنی دەوڵەمەندێتییـەکی کـەم یـاخود زۆری ئەڵقـەکان، گرێـدراوی شـێوازەکانی بـچمیان (شـێوەیان) بەدیدێت. بەزمانی کۆمەڵگا ئەم ئەڵقانە بەپێکهاتەو رێکخستنیش بەناو دەکرێن. بـەهۆی زۆرداری پێویـستی ئـازادی گـشتییە. پێویـستی و شـێوازی ئـازادی هەرگـەلێك، وابەسـتەی رەوشـی ئـەو زۆرداریییەیـە کەبەسـەریدا زاڵـە. ئەگـەر لـەبوارو ئاسـتی کۆمەڵگابێت یاخود تـاك، تـاوەکو زۆرداری زاڵ بێـت، پێویـستی ئـازادی و تێکۆشـانەکەی بـەردەوام دەبێـت. پێویـستی ئـازادی بـۆ گەشەکردن مەرجە. قڕکـردن تـەنیا لـەرێگای کۆمـەڵکوژی ئـازادی بەدیـدێت. لە حاڵەتێکدا لەنێوچوون ئەنجامگیرنـەبێ، ئـەوا هاوشێوەی ئەو رووەکانەی بەرد دەقڵەشێنن و لـە ناویـدا دەڕوێـن، ئـەوا کاتـێ پێویـست بکـات ئـازادی هـەموو دیـوارێکی فـشاری سەری کون دەکات و هیچ شتێك ناتوانێ ئیرادەی لێشاوەکەی بوەستێنێ و بەرێڕەوی خۆیدا دەڕوات.

هەڵسەنگاندنی کێشەی ئازادی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین لەگەڵ نەریتی مێـژوویی، سـەبارەت بەسـەرتاپاگیری و بـەزنجیربوون گرنگ و بایەخدارە. هەموو کاتێك تێکۆشانی ئازادی مێژوویێکی زەمەنی هەیە. گـرنگ دەستنیـشانکردنی ئـەم کاتـەی مێـژووە لەناو تایبەتمەندێتی خۆیدا.

رۆڵێکی دیکەی هێزە ستەمکارەکان تێیدا سەرکەوتن, نکولێکردنیانە لەکێشەی ئـازادی گـەلان و کۆمەڵگاکانـدا, بڕواپێهێنـانی گەلان و تاکەکانە کەکێشەیەکی بەمجۆرەیان نییە. ئەوەی یاسایی و پەسندکراوە تاکە مێـژووە گـەردوونی و رەهاکەیانـە کـەپڕە لەپیرۆزی, قارەمانێتی و شکۆداری و ئیلاهی. کارامەییەکی وەهایە مێژووی نائاسایی و دەوڵەمەندی کۆمـەڵگا، لەمیانـەی بـەهای رووکەشی داتاشراوو بێواتادا نکوڵی لێدەکەن, مێژوویێکی نەبوو، یاخود ئەو مێژووە خوێناویەی لەهۆڤێتی خـراپترەو لەلوتکـەی بەکاربردندایە، هەریەکەی وەکو کاروانی خودایی (ئیلاهی) پێشکەش دەکەن.

یەکێك لەهۆکارەکانی ونکردنی (ژێرکەوتنی) ئازادیخوازەکانی کۆمەڵگا ژێرکەوتنیانە لەبەرامبـەر ئـەمجۆرە چیرۆکانەی مێـژووی زۆردارەکـان. ئـەوەی بەرلەهـەموو شـتێك بـۆ سـەرکەوتنیان پێویـستە نیـشاندانی هێـزی ئـەو توانـستەیە کـەبتوانن لەناوخودی مێژووی خۆیاندا بـژین. پێویـستە مێـژووی ئـازادی خـۆی ــ تەنانـەت ئەگـەر ئەمـەش نـەبێ نـەریتی خـۆی ــ وەك هەڵوێستێکی ئەخلاقی نیشانبدات. ئەگـەر فـشاریش هـەبێت، هـەرگیز دۆخێکی لەشـێوەی داوانـەکردنی ئـازادی نابێتـە جێگـای

باس. ئەم هەڵسەنگاندنە واتاییانە ــ (مجرد) بۆئەوە ئەنجامدەدەین تاوەکو واتایەك بەو راستینەیەی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین بدەین کەبێ دەنگ و ئارام دیارە. مێژووی ئازادی کۆمەڵگا لەرۆژهەڵاتی ناویندا بوونی هەیە، تەنانەت زۆر قووڵ و چڕیشە. جیاکردنەوەی لەمێژوو و دەرخستنە بەرتیشکی خۆر ئەرکی لەپێشینەی تێکۆشەرانی ئازادییە. گیا لەسەر پنجی خۆی شین دەبێتەوە. تێکۆشانی ئازادی ئەمڕۆشمان تەنیا دەتوانێ لەسەر ریشەکانی ئازادی و نەریتەکانی بژیت. لەبەرئەوەی لەسەرەتای ئەم نووسینەدا لەچوارچێوەی گەڵاڵەنامەیەك ئاماژەمان پێکرد دووبارەی ناکەینەوە.

لەناو سنووری ئیمپراتۆریەتی رۆمای هاوچەرخدا لەژێر ئابلۆقەی هێزەکانی ئەیالەتە جیاوازەکاندا دەژین. هەروەکو زۆر نموونەی لەمێژوودا بینراوە والی ئەیالەتەکان ــ دەوڵەتەکانی ئەمڕۆمان لەناوچەکە ــ زۆردارن. والی ئەیالەتی یەهودییەکان پیلاتۆس عیسای لەخاچدا. لەراستیدا حەزرەتی عیسا سەمبۆڵە, رەمزە. مەسیحێتی گواستنەوەی بەلافاوبوونی هەزاران دیاردەو رووداوی بەم شێوەیەیە. هەروەها لەمێژوودا دەبینرێ کە والی ئەیالەتەکان زووبەزوو سەرهەڵدانیان کردووە. هەندێکجار دەشێ سەرکەوتن بەدەستبێنن، دوای ماوەیەك یان خۆیان دەبن بەئمپراتۆر، یان چاکدەبنەوە، یاخود لەناو یاخیبوونەکاندا دەخنکێن. ئەمە رووداوێکی ناوخودی سیستەمە. لەبواری کۆمەڵگاو ئازادیدا هیچ بەهایەکی نییە. ئەگەر هەبێت ناڕاستەوخۆیە. پێویستە ئەمجۆرە بەرخودانەی ئەیالەتەکان لەگەڵ بزووتنەوەکانی ئازادی کۆمەڵگا تێکەڵ نەکرێت. تاوەکو لەتێگەیشتن و دەرکپێکردن راستینەی ئیمپرتۆریەتی هاوچەرخ تێپەڕنەکەین، شەڕکردن لەبەرامبەری یان هیچ شانسی سەرکەوتنی نییە، یاخود لەئەنجامی رێکەوت دەبێ, ئەمەش بەهایەکی ئەوتۆی نییە. سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی ئەیالەتەکانی (دەوڵەتەکانی) ناوچەکە بەهۆی ئەو ئاژاوەیەیە کەلەئارادایە. بەردەوام باس لەواقیعی تایبەتی رەوشی گێژاو (کائیوس) دەکەین. چونکە قەیران ئەو ماوە کورتخایەنەیە کەشانسی ئازادی و داهێنان تێیدا زۆربەرزە. ئەوەی لەم ماوە کورتەدا پێویستە ـ سەبارەت بەبەرەی ئازادی ــ هێزی واتایە, زانینە, زانینی مێژووو چاخی خۆتە. لەدوای قۆناخەکانی هەژموونگەرایی کەبەگشتی 5000 ساڵ بوو، لەقۆناخە نزیکەکانیش 200 و دواتریش 60 ساڵ بوو، تەقینەوەی سیستەم لەماوەی راگوزارەی قەیراندا دیاردەیەکە. پێویستی بەهەڵسەنگاندنی وردهەیە. هەوڵماندا لەرێگای چەند سیناریۆیەکی سەرەکی وەڵامی رێبەری ئیمپراتۆریەتی هاوچەرخ "ئەمریکا" بۆ گێژاو (کائیوس) نیشانبدەین. ئەمەشم لەم پێناوەدا ئەنجامدا تاوەکو بەشێوەیەکی واقیعی سیناریۆی هێزەکانی ئازادیخوازی گەلان و کۆمەڵگا دەستنیشان بکرێن. وەڵامی هێزەکانی کۆمەڵگا نەبەشێوەی مەسیحییەکانی ناو رۆما، نەبەوشێوەیەی بەربەرەکان دەبێ, کەلەدەرەوە ئەنجامیاندا. دەتوانرێ پەندو ئەزموون لەم نموونانە وەربگیرێت، بەڵام لاسایی ناکرێتەوە. لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا وەڵامێکی هاوشێوازی سۆسیالیزمی بونیادنراوو رزگاری نیشتمانیان نابێت. چونکە ئەم وەڵامانە لەڕەوشێکدا کەسەرکەوتنیش بەدەستبێنن، بەهۆی هەڵە ریشەدارەکانیان بوون بەپارچەیەکی سیستەم یاخود هێندە لەدواوەی سیستەم نەماون. وەڵاممان بەوشێوازەیە کەخۆمان دەیزانین.

مەبەست لەشۆڕشی زهنی باوەڕی و هوشیاری کۆمەڵگای ئازادە. زانین تەنیا زانینی رووداوەکان نییە. بەڵکو زانینی ئەوەشە کەدەبێ چی و چۆن بکرێت. هەرچی باوەڕییە، بڕوابوون بەفیکرەکەیەو جێبەجێکردنی پێویستییەکانێتی. واتە گوزارشت لەئاستی بڕیاربوون و هێزی پێکهێنان دەکات. تاوەکو ئەو پێکهاتانەی زهنییەت بەباشی نەناسین کەبەسەر کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناویندا زاڵکراوە، تاوەکو ئەو لایەنانەی پێویستە تێپەڕبکرێن لەگەڵ ئەولایەنانە لێك جیانەکرێتەوە کەپێویستە وەك میراس ببینرێن، هەروەها تاوەکو ئەو قاڵبانەی زهنییەت نەناسرێن کەپێویستە تێکوشانیان لەبەرامبەردا بکرێ، ئەوا ناتوانرێ تێکۆشانێکی ئایدیۆلۆژی تۆکمە بەڕێوەببرێت. بوون بەخاوەن زهنییەت، بەوواتایەدێت کەلەمیانەی هەڵوێستەیەکی رەنج و ئەخلاقی مەزن ئەو باوەڕی و هۆشمەندییە کۆمەڵایەتییەمان بەدەستهێناوە، کەپێویستە خۆمانی پێ پڕچەك بکەین. ئەوەی جیهانی هزری خۆی مەزن نەکات، ناتوانێ بۆماوەیەکی درێژخایەن تێکۆشانی ئازادی بەڕێوەببات. ئەو شوێن و ساتەی

گەندەڵبوونی تێدا دەستپێدەکات، ئەو شوێن و ساتەیە کە زهن ڤاڵادەبێ (بۆش دەبێ) و کۆتایی پێدێت. ئەوەی تەواوی زاناو پێخەمبەرەکانی رۆژهەڵاتی ناوین ئەنجامیانداوە لەگەوهەری خۆیدا شەڕی زهنیە. تاوەکو پەیوەندی زهن بەئەخلاقەوە دروستنەکرێت، بێبەهایە. سەرباری تەواوی کۆسپ و کەموکوڕیەکان ئەخلاق لەسەر ئەو ئاراستەیەی هۆشمەندی رووناکی کردۆتەوە هێزی بەڕێوەچوونە. داکۆکیکردنە لەسەر ئەو بەها ویژدانییانەی کۆمەڵگا کەبەبێی ئەو نابێت. پچڕانی پەیوەندی نێوان هۆش (زانیاری) و ئەخلاق، واتای وێڵی و بەڕەڵایی دەگەیەنێ. پێویستە زهنمان بەئاستی زهنی لایەنی بەرامبەر بگات و بەپێی پێویست لێی وەربگرێ. هەمووکاتێك زهنییەتی هێزەکانی دەوڵەت بەشێوەیەکی بەهێز رێکخراوە. ناتوانرێ بچووك ببینرێ. تاوەکو ئەم هزرە گەمارۆنەدرێ، فەڵەمبازێکی سەرکەوتووانەو چارەسەری پێشناکەوێت. سیاسەت و چالاکییەکی دابڕاو لەهزرو ئەخلاق، هەموو کاتێك ئەگەری ئەوە هەیە وەك مینێك لەژێرماندا بتەقێتەوە. سیاسەت و چالاکییەکانمان پێویستە بەردەوام لەژێر رۆشنایی هزرمان و مسۆگەری هەڵوێستی ئەخلاقیمان رێڕەوبگرێت. لەرەوشێکی پێچەوانەدا، لەبوون بەئامرازی هەڵمەتی سیاسی زهنیەتی بەرامبەر رزگارمان نابێت. تاوەکو لەژێر سایەی ئەم سەرەداوە سەرەکییانە شەڕی هزری بەڕێوەنەبردێت، ئەوە دیار دەکەین کەدەستپێکردنی هەڵمەتە سیاسییەکان بەردەوام مەترسیدار دەبێت. خەڵوەتگەرە مێژووییە گەورەکان بۆئەوەی کەمێك وانەو ئەزموون بدەنە مرۆڤایەتی، بۆئەوەی ئەم مەترسیانە ئاستەنگ بکەن، کەوتنە نێو خەڵوەت و هەوڵیاندا هێزی زهنی پێویست بەدەستبێنن.

سەرباری ئەوەی ئەمریکا هێزێکی ئیمپراتۆرە لەخۆڕانییە لەرێگای سەدان دەزگای تینگ ـ تانگ ـ دامەزراوەکانی زهنییەت و فیکر ـ کاردەکات. لەئەزموونی مێژووییەوە زۆرباش دەزانرێ، سەبارەت بەو ناوچانەی پێیدا دەڕۆیت چەندە خاوەن زانیاری بیت، بەو ئەندازەیە بەگوێرەی خۆی بەشێوەیەکی راست کارەکەی ئەنجام دەدات. ئیسلام و تەریقەتەکان کەسەرلەنوێ لەناوچەکە زیندووبوونەتەوە، دیسان سەرچاوەی خۆی لەداخوازی هەندێ توێژی کۆمەڵایەتی دەگرێت کەبەگوێرەی خۆیان بەدوای زهنییەتێکی پێویستدا دەگەڕێن.

تاوەکو تەریقەتەکان شێنەکرێنەوە، بەشێوەیەکی گشتیش ئەوکاریگەرییەی ئیسلامگەرایی تازەزیندووبۆوە دەیکاتە سەر کۆمەڵگا لێکۆڵینەوەی لەسەرنەکرێت، ناتوانرێ تێکۆشانێکی زهنی راست بەڕێوەببرێت. هەمان شت بۆ میللیگەراییەکانیش لەجێگای خۆیدایە. میللیگەرایی کەبەجۆرێك ئەتنیکگەرایی هاوچەرخە، تاوەکو رۆڵی هزری میللیگەرایی لەسەر کۆمەڵگاو چۆنێتی رێکخستن و لەدایکبوونی دەرکی پێنەکرێت، ناتوانرێ تێکۆشانێکی پێگەیشتووی ئایدیۆلۆژی کرداری بەڕێوەببردێت. ئەو هێزە ئەتنیکییانەی تارۆژگاری ئەمرۆمان بەجۆری خێزانگەرایی و تیرەگەرایی درێژەیان بەهەبوونی خۆیان داوە، پێویستە باش دەرکیان پێبکرێت و وەڵامبدرێنەوە. دەرککردن بەتەواوی ئەم زهنیەتانەوە گەمارۆدانیان، بەخشینی بەهای راستەقینەی هزری بەوانەی کەبۆ مەبەستەکانیان پێویستیان پێیەتی، چەندین جار لەشەڕی کرداری سەختترە، بەڵام دەبێ وەکو ئەرکە پێویستەکانی پێشەنگایەتی بناسرێت. کاتێك لەرۆژهەڵاتی ناویندا شەڕی هزری بەڕێوەدەبەیت، دەبێ وەکو حەزرەتی موسا تیرەی عیبرانی بەڕێوەببەیت، وەکو داود لەگەڵ "گۆلیات"دا بجەنگی، وەکو حەزرەتی عیسا حەواریەکانت سەفەربەر بکەیت، وەك حەزرەتی محەممەدیش موئمینەکان بخەیتە ناو ئیشوکارەوە. هەروەها دەبێ بەجۆشوخرۆشی سوقرات گووتەی "خۆت بناسە"بزانی، بەجۆشی پریکلەس" بەها بەدیموکراسی بدە" تێبگەی و بەزانستی ئەرستۆ بزانی بڵێی" رێگابۆ ئەسکەندەر بکەرەوە". لەرۆژهەڵاتی ناوین بوون بەخاوەنی زهنیەت واتە، بەجۆشی رێنیسانس راکردن بەرەو سروشت، خۆشویستنی مرۆڤ، تێنوێتی زانست، کونکردنی دۆگما ئاینییەکان و تێپەڕبوون لەرێگای ریفۆرم، بەدەستهێنانی باوەڕی گەوهەری پێویست، لەرێگای رۆشنگەری واتای گواستنەوەی زانست، فەلسەفەو هونەرە بۆگەل، واتە سەفەربەرکردنی گروپە یەك لەدوای یەکەکانی رۆشنبیرانە لەپێناو ئازادی.

تـەنیا کاتێك لـە میانـەی ئـەو زهنییەتـە بێت کەپێناسـەمان کـرد ئـەو کاتـە لـەکاتی بەرێوەچـوون بیرکردنـەوە، لـەکاتی بیرکردنەوەش بەرێوەچوون لـە رۆژهـەڵاتی نـاوین واتـادار دەبـێ. لـەدۆخێکی وەهـادا زینـدوویی سروشـتی نیئۆلیتیـك و هێـزی ئەوهەڵوێسته بەجۆشـە سـەردەکەوێت کەهەمووشـتێك پیرۆزدەبینـێ. ئەوکاتـە یەکەبەیەکـەی پەرتووکـەکانی داناکـان و هـزرە میتۆلۆژییە پرلەئەزموونەکانی چاخەکانی شارستانییەت لەپێشماندا دەکرێتەوە. ئەومێژووە سامناك و پیرۆزەی بـەمرۆڤبوون و شارستانیبوون دەخوێندرێتەوە کەلەلایەك مرۆڤ دووچاری بەسـتەڵەکی دەکات لەلایـەکیش دەیخاتـە نێوجۆشـەوە، هـەروەها لەهەمانکاتـدا ژیـانی شـکۆدارو سـووکیش کـرد. مانـای راسـتی ئـەزموونی پێخەمبـەرە گـەورەکانی پەرتووکـە پیرۆزەکـان زیندوودەبێتـەوە. یەکبەیـەك زیندووبوونـەوەی کانییـە وشـکبووەکانی شارسـتانییەت، بەشـاربوونەوەی وێرانـەکان و زیندووبوونـەوەی تەپۆلکـەکان لادێییـەکی بێگـەرد دیاردەکـات. لەساکارترینیان تـاوەکو دەوڵەمەنـدترین، لەنـەمرود تـاوەکو قاروون، لەئەیوب تـاوەکو مـەزلۆم و فـەرهادو کـەمال، تـەواوی نـرخ و بـەها رەش و سـپییەکان دەرژێتـە مەیـدان. شـەڕی زهنـی درکاندنی تەواوی ئەم بەهایانەیە. بەنەمری هێشتنەوەیانە لەمێشك و دڵماندا. ئەوکاتە هیچ هێزو پێویستییەکی بێواتای ژیان، نابێتە بیانووی خەڵەتاندن و تەفرەدان. لەرێگای هۆشمەندی دەریا ئاسا قووڵ و ئـەو ئیرادەیـە لافاوئاسا بەجۆشـە هەرهـەمووی چارەسەرو تێپەڕدەکەین. ئەوکاتە بلیمەتانە لەسەر مەسەلە سیاسییەکان، سەربازییەکان دەوەستین و بەشێوەی داسـتان وەڵامـی دەدەینەوە.

لەکات و زەمینەی ئێستای رۆژهەڵاتی ناویندا ناتوانی لەمیانەی هەڵوێستی کلاسیکی راسـت و چـەپ، ئـایینی و میللیگـەرایی بەشوێنگەیەك بگـەیت، بەگووتـەی پێخەمبەرانـە لـەکوفر رزگارنابیـت. لەهەمانکاتـدا لـەرێگای چـەپی نـوێ، کۆمەڵـە مەدنییـە لەراستی دابڕاوو پێ لەهەواکان، هەروەها لەمیانەی ئەو بزووتنەوانەی ژنانیش بەهیچ ناگـەیت کەلەمێـژوو و رەنـج بـێ ئاگـان. لەگەڵ بۆرژوازی بـچووکە تەنگـەتاوو ئیفلاسـبووەکانی شـار لەمیانـەی ئـەمجۆرە کاروانـە بێبـاوەڕو بێهـزرە تـەنیا دەتـوانرێ بـۆ سەیران بچی. بەتایبەتیش لەگەڵ ئەو سەیروسەمەرانەی لەنێو بازرگانێتی شەرخنکاون و دووچاری نەخۆشی کورسی دەسەڵات هاتوون ناتوانرێ پاراستنی هیچ فیکرو باوەڕییەك بکرێت. بـەهیچ جۆرێـك نابێتـە وەڵام بـۆمرۆڤ و گـەلانی رۆژهـەڵاتی نـاوین کەهەمووجۆرە رۆژێکی بینیوەو لەهەزاران شوێن لێیدراوە.

کاتێك لەرێگای راستینەی کۆمـەڵگای رۆژهـەڵاتی نـاوین جموجـۆڵ دەسـتپێدەکات، پڕکردنـەوەی نـاوەڕۆکی ئـەو زهنییەتـەی توانرا بەمـشێوەیە پێناسـەبکرێت، بەرێوەچـوونێکی بـەمجۆرە بـەرەو مێـژووە بـن خاککراوەکـەمان دەبـات، بەدڵـە کـۆن بووەکـە دەگەیەنرێتەوە، بەراستینەی لێگەڕی رووناکی دەگەیتەوە. ئینجا ئەوکاتە دەکەونە ناو ئـەو تێکۆشـانە رەسـەنەی کـە شایـستەی مێژووی راستی و ئاشقانی ئازادی بێت. بەهیچ شێوەیەك ئاستەنگ ناکرێت، ئەگەرچەواشە بکرێ و دووچاری خیانەتیش بێـت، تەنانەت بکوژرێت، دیسان لەشوێنێکدا سەرهەڵدەدات و بەرەو ئامانجەکەی دەچێت. ئەوکاتە مێژوو دەبێتە هی ئێمە، دڵ لەگەڵ ئێمە لێدەدات. راستینەی کۆمەڵایەتیمان بۆئەو ئیلاهیبوونـەمان وەردەچـەرخێ کەدروسـتیکردووە. گـەلان دەبنـە خـاوەنی ئـەو ئازادیەی کەبەهەزاران ساڵە تامەزرۆی بوون و مافی خۆیانە.

بـژاری سیاسـی رۆژهـەڵاتی نـاوین کـاتی دەرکـەوتن لـە گێـژاو نـەك تـەنیا بۆناوچـەکە، بـەڵکو پێویـستە ئەوگەوهـەرە لـەخۆوەبگرێت کەلەئاسـتی گەردوونیـدا بۆکێـشەکانی ئـازادی ببێتـە وەڵام. چارەنووسـی هەڵمـەتی جیهـانگیری لەناوچـەکەدا نەخشەی بۆکێشراوە. ئەمەش بۆیە بەمشێوەیە چونکە سەرکەوتنی ئەو سیستەمەی کە ئـەمریکا رێبەرایـەتی دەکات ئایینـدەی تەواوی جیهان دیاریدەکات. تاوەکو ئەم جەمسەرانەی دەسەڵات نەگۆڕدرێن و وەرنەچەرخێنرێن کەلەسەدەی بیستەمدا لـەهێزە فێودالییەکان کۆکرانەوە، لەکاتێکدا ئەنجامدانی بەردەوامییەکەی شیمانەیەکی بەزەحمەتە، بەشێوەیەك لەشێوەکان ئـەو بنکـە بەرفراوانـەی کۆمـەڵگا دەکەوێتەگـەڕ کەبەشـێوازی بـاو لـەژێر سـتەمکاریدا دەژی. لەبەرئـەوەی هێـزە سـەرمایەدارییەکانی

جیهانگیری سەرلەنوێ ئاواکردنەوە دەخوازن، بۆیە بەمشێوەیە. بەڵام ئەوەش جێی گومانە کەئەو جەماوەرەی هوشیار بووبێتەوە بەو سیستەمانە سنووردار بکرێن. دیارنییە کەچی لەناو قووتووەکەی پاندۆرادا دەردەکەوێ. ئەوەی دەتوانێ دۆخی نادیاری بەلاوە بنێت، خودی ئەو هەوڵە داهێنەرو ئازادیخوازانەیە کەلەماوەی راگوزارەی گێژاو لەئارادایە. قۆناخێکی گۆڕانکاری وەهادێتەئاراوە کەناتوانرێ لەگەڵ هیچ قۆناخێکی مێژوو بەراوردبکرێ. هەروەکو ئاواکردنی شارەنوێکان سەرلەنوێ بونیادنانەوەی کۆمەڵگا لەرۆژەڤی مێژوودایە. ئەم راستینەیە لەژێر تەنگەتاویەکانی رۆژهەلاتی ناویندا شاراوەیە. سەرلەنوی ئاواکردنەوەی سیستەمی زاڵ و تێکۆشانی سەرلەنوێ بونیادنانەوەی هێزە ئازادیخوازەکانی کۆمەڵگاو گەلان لەناو زەمینەو هەلومەرجی ناکۆکی و پەیوەندییەکی مەزن بەڕێوەدەبردرێت. بەرلەوەی باسی ئەو جەمسەرانە بکەین کەسەرلەنوێ ئاوادەکرێنەوە سەرەتا پێویستە بەگوێرەی تایبەتمەندێتی ناوچەکە سەرلەنوێ پێناسەی سیاسی ئەنجام بدەین. وەك بەڕێوەبەرایەتی کرداری کۆمەڵگاکان دەشێ سیاسەت پێناسەی هەنووکەیی یاخود قۆناخ بەقۆناخ لەخۆوە بگرێ. ئەگەر سیاسەتی موحافەزەکاری جێگای باس بێت, ئەوا بەواتای لەجێی خۆژماردن (پەلەکوتکێ)ی کۆمەڵگایە, ئەگەر پێهەڵگرتن ئەنجامبدات بەسیاسەتی ئەنجامدانی فەڵەمباز پێناسەدەکرێت. دەشێ رەهەندی پێناسەیەکی سێیەمین بەناوەڕۆکەوە پەیوەندیدار بێت. ئەگەر جەمسەری دەوڵەت پەیوەندیدار بکات سیاسەتی دەوڵەتگەرییە, ئەگەر جەماوەری دەرەوەی دەوڵەت پەیوەندیداربکات دەشێ وەکو سیاسەتی دیموکراتییانەش پێناسە بکرێ. دەشێ پێناسەی سەبارەت بەرەهەندەکانی بواری ئابووری, سیاسەت، کولتوور، کۆمەڵایەتی و هونەر پێشبخرێت. ئەو گۆڕانکاریانەی لەئاستی سەرەوە پەیوەست بەکۆمەڵگاوە ئەنجامدەدرێن دەشێ سیاسەتی بالای پێ بگووترێت، ئەوانەی پەیوەست بەگۆڕەپانێکی تەسك و سنووردار ئەنجامدەدرێن بەسیاسەتی لاواز، یان سیاسەتی بنکەناوبېرێت. خالی هاوبەشی تەواوی ئەم پێناسانە؛ ئەوەیە کەهونەری وەرچەرخان و گۆڕانکاری و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا بەسیاسەت ناودەبرێت. چالاکی سیاسی کاری دروستکردنی کۆمەڵگایە. لەکاتێکدا هەوڵی فیکری خەباتی ئۆتۆپیا، پرۆژە، پلان و پرۆگرام ئەنجام دەدات، هەوڵی سیاسیش خەباتەکانی پەروەردە، رێکخستن و چالاکییە. بەئەندازەی تێکەڵنەکردنی کاری هزری لەگەڵ خەباتی سیاسی، ئەوا تێکەڵنەکردنێکی بەپێچەوانەش بایەخەکی گەورەی هەیە. ئەو گرنگی و تایبەتمەندێتییەی بونیادنەرو وەستاو کرێکارەکانی بواری کۆمەڵگا نیشانی دەدەن دەشێ بەهونەری سیاسەت بەناوبکرێت. کەواتە سیاسەتکردن لەبواری هزریدا پێویستی بەخۆئامادەکردن هەیە، لەبواری کرداریشدا بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاو گۆڕاندن و وەرچەرخاندنی پێویستی بەخۆ پڕچەککردنێکی بەهێزە، واتە پێویستی بەتوانستی پەروەردە، رێکخستن و چالاکی هەیە. لەخۆڕا نییە سیاسەت بەهونەری ئیلاهی بەناودەکرێت. کاتێك دەڵێین پادشای ـ خوداوەند، سوڵتانی سێبەری خودا، وەك شێوەگرتنی خودا دەڵێین "دەوڵەت" لەراستیدا جەخت لەسەر هونەری خودایی دەکرێتەوە. کاتێك ئایین یاخود میتۆلۆژیا شیدەکەینەوە، پێویستە بەشێوەیەکی لێهاتووانە کۆمەڵناسی بخوێندرێتەوە.

لەپێناو ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو هاوبەشە هەڵبژاردەکانی بونیادنانەوەی سیاسی ـ سەربازی بەشێوەیەکی بەرفراوان لەرۆژهەلاتی ناوین بەڕێوەدەچێت. بەڵام پێویستە پراکتیکی سەربازی لەسیاسەت جیانەکرێتەوە. لەزەمینەیەکی گەرمدا کەتێکۆشانی چەکداری تێدا بەڕێوەبچێت ناوی سیاسەت شەڕ و سەربازبوونە. ئەوەی لەهەلومەرجی بەمجۆرەدا رۆڵی دیاریکەر دەبینێ شەڕە. لەو زەمینەیەی کەچەکەکان بێدەنگ دەبن سیاسەت وەك خەباتێکی درێژکراوەی پەیوەست بەسوپا رووبەڕوومان دەبێتەوە. واتە پێچەوانەکەی فۆرمیلەی کلاوس فیتز لەجێگای خۆیدایە. ئەوەی شەڕ دیاردەکات سیاسەت نییە، بەڵکو ئەوەی سیاسەت دیاردەکات شەڕە. ئەم راستییە لەئێراقدا زۆر روون و ئاشکرایە. ئەوەی لەئێراقدا رێگای سیاسەتی (سیاسەتی نوێ)ی کردەوە شەڕی تەکنۆلۆژیای هاوچەرخی ئەمریکایە. هەروەکو دەزانرێ لەتەواوی مێژووی میزۆپۆتامیادا شەڕلەسەرووی رێگای سیاسەتەوە بووە. راستینەی مێژوویی شەڕی دوایی راستگۆیانە دیارەو لەبەرچاوانە. کاتێك شەڕ

لەئاستێکی نزمدا بێت یاخود بەتەواوی رابوەستێ، وەك بەردەوامی شەڕ کاری سیاسی خێرا دەبێت. کەواتە سیاسەت بەشە بێ چەکەکەی شەڕە. دەبێ بەو بەشەی کەبەبێ پەنابردنە بەرچەك چالاکی، رێکخستن و پەروەردە بەرێوەدەبات و پشت بەهزرەکەیان دەبەستێ. کەواتە لەم چوارچێوەیەدا ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی لەژێر پشتگیرییەکی بەرفراوانی سەربازی لەتەواوی رۆژهەڵاتی ناویندا لەسەرووی هەمووشیانەوە ئێراق و ئەفغانستان، لەسەربنەمای هزری" پرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوینی گەورە" سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی سیاسی بەرێوەدەبات، دەیگۆڕێت و بەردەوامی پێدەدات. لەبەشی رابردوودا ئەم خەباتەمان لەچوارچێوەی سێ سیناریۆ کورتکردەوە.

لەرەوشێکی وەهادا گرنگ و جێی بایەخە ئەو جۆرە تێکوشانە سیاسییە روونبکرێتەوە کەوەك ئەرك دەکەوێتە سەرشانی هێزە ئازادیخوازەکان تاوەکو لەبەرامبەر ستەمکاریدا، گەل و کۆمەڵگا بپارێزێ. هەرلەم پێناوەشدا لەسەرەتا پێناسەی پێویستی تایبەت بەزهنییەتمان ئەنجامدا. هەروەها پێناسەی سیاسەتیشمان کرد.

ئەگەرباسی خودی سیاسەتی بەرجەستە بکەین, یەکەم ئەرکی نەخشە بۆکێشراوی, لەمیانەی هەڵوەستەی دیموکراتییانەو کۆمەڵگای کۆمەڵکاری گەلان کەناوەندەکەی دەوڵەت نییە بەرێوەبردنی دیموکراتیزەکردن و پەرەپێدان و دەوڵەمەندکردنی گەوهەرەکەیەتی. نەبوون بەپاشکۆی دەوڵەت پێویستە وەك پرەنسیب وەربگیردرێت. ئازادی کۆمەڵگا لەگەڵ خەباتێکدا ناکۆکە کەناوەندەکەی دەوڵەت بێت. تێکۆشانێکی وابەستەی دەوڵەت تەنیا بەناوی هێزە ستەمکارەکان بەرێوەدەبردرێت. روون و ئاشکرایە ئەو هێزە کۆمەڵایەتییانەی ئازادی بەبنەمادەگرن نابێ پەیوەندییان لەگەڵ زۆردارەکان هەبێت، بەڵکو ئەرکی سەرەکی رکابەرایەتی کردنیانەو وەك سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتیش پشت بەناوەندەکانی دیموکراتیزەبوون دەبەستن. لەپێناسەکردنمان بۆ دیموکراسی, ئەو دیموکراسییەتەی وەکو پەردەیەکی بۆرژوازی دەوڵەتە، لەگەڵ دیموکراسی لێکیان جیادەکەینەوە. پێویستە لەدیموکراسییەکانی سەردەمی ئەسیناو تەنانەت دەوڵەتشاری سۆمەریەکان ئەمانە زۆر بەباشی لەیەکتر جیابکرێتەوە کەدیموکراسی راستەقینەو دیموکراسی دەوڵەت نابن بەبەردەوامی یەکتر، یەکێکان لەزیادبووندایەو ئەویدیکەشیان لەکەمبوون، یەکێکیان کۆتایی پێدێت و ئەوەیدیکەش سەرکەوتنی تەواو. ئەو دیموکراسییەی ئەمریکاو هاوبەشەکانی (هاوپەیمانانی) دەیسەپێنن، دیموکراسی دەوروبەرێکی سنووورداری بۆرژوا ـ فیودالە کەپشت بەئامێری سەربازی ـ دەسەڵات دەبەستێ. هەرچی هێزە ئازادیخوازەکانی کۆمەڵگان ئەگەر بۆ پاراستنی کۆمەڵگا پشت بەهێزێکی بچووکیش ببەستن، بەڵام زیاتر سیاسەتی دیموکراتییانە بەخەباتی بنچینەیی دادەنێن. هەرچی سیاسەتی دیموکراتییانەیە، تەواوی خەباتی پەروەردە, رێکخستن و چالاکی ـ سیاسەت، ماف, خۆپیشاندان بەئامانجی ئابووری, کۆبوونەوە, ناڕەزایی, راپەڕین و شەڕ ــ ئەگەر مەرجەکان بیکات بەناچاری ــ ئەو گروپ و تاکانە دەگرێتەوە کەلەژێردەستی ستەمکاریدان. ئەم خەبات و چالاکییانەش یان خەباتی بەرێوەبردنی رۆژانەن, یان خەباتی ریفۆرمی ئاسایی و گۆڕانکارین. ئەگەر گۆڕانکاری گەوهەری لەخۆوە بگرێت خەباتی شۆڕشە. چەندە هەوڵ و کۆششەکانی سیستەمی زاڵ بۆدەسەڵات و دیموکراسی چربێتەوە, خەباتی دیموکراسی هێزە ئازادیخوازەکانیش بەوئەندازەیە لەناویەکدا هەندێ جاریش بەرامبەریەکتر دەمێنن و بەرێوەدەچن.

دووبارەنەکردنەوەی ئەو هەڵانەی شۆڕشەکانی ئینگلتەرا, فەرەنساو روسیا لەمێژوودا ئەنجامیانداوە زۆرگرنگە. ئەویش ئەوەیە هەردوو لایەن گرنگی بەوە بدەن کەلەتێکۆشانی دیموکراتییانەدا نکوڵی لەیەکتری نەکەن و یەکتری لەنێوبردن یاخود تواندنەوەی یەکتر پەیڕەونەکەن و نەکەونە نێو هەڵەیەکی مەزنی مێژوویی ـ دەتوانێ لەدایکبوونی ناچاریشی پێبگووترێ ــ. لەنێوان هەردووجۆرە دیموکراسیدا دەشێ پەیوەندی و ناکۆکیش هەبێت. دیسان هەروەکو چۆن دەشێ بەشێوەیەك تێکەڵ بە یەکدی بن، لەهەمانکاتدا دەبێ لەبەرامبەر یەکتریشدا بن. خاڵی بنچینەیی ئەوەیە نەکەونە نێو هەڵوێستە مەترسیدارەکانی نکوڵیکردن و لەنێوبردنی یەکدی یاخود مەیلی یەکتر تواندنەوەو پاوانکردن. پێویستە زۆربەباشی رێساو هەلومەرج و

پرەنسیپ و بنەماکانی بەیەکەوەبوون و رکابەرایەتیکردن دەستنیشان بکرێت. تاکرەوێتیبوون لەدیموکراسیدا بەردەوام مەترسیدارە، چونکە نکوڵیکردن لە دیموکراسی لەگەڵ خۆیدا دێنێ. رێزگرتن و بایەخدان بەبژاری تایبەتییانەی دیموکراسی هەرگروپێك لەدەرەوە یان لەناوەوە، لایەنی باڵای کارامەیی دیموکراسییە. پێچەوانەکەی سیاسەتی پادشا فەیلەسوفەکەی ئەفلاتوونگەرایی و پادشای ــ خودایی میتۆلۆژیایە ــ واتە سیاسەتی فاشیزم، تۆتالیتاریزم، پلەداری و دەسپۆتیزم و، هەمووجۆرە دیکتاتۆریەتێکە. لەئەنجامدا هەموو سیستەمە ستەمکارەکان دژە دیموکراسین.

ئەگەرو شیمانەیەکی بەهێزە ئەو دیموکراسییەتەی لەرۆژهەڵاتی ناویندا گەشەدەکات ناوەرۆکێکی تێکەڵەیی هەبێت. لەناویەکتردا لەخۆوەگرتنی داواکاریەکانی گروپ و چینە رەنجدەرەکانی کۆمەڵگاو بۆرژوا ــ فیوداڵەکان جێگای باسە. ئەو قۆناخە بەسەرچوو کەدیموکراسی بۆرژوا بەتەنیابێت. لەرابردووش هیچ کاتێك بەشێوەیەکی ساف (بێگەرد) پەیرەونەکراوە. دیموکراسی هێزە گەلەریەکانی کۆمەڵگاش سەربەخۆ بەتەنیا پەیرەونەکراوە. هەڵبەتە ئەم پێناسانە بەو واتایە نایێت دیموکراسی گەلەری کۆمەڵگاو دیموکراسی بۆرژوا جیاجیا نابێت. هەرگروپ گەلێك بەچڕی لەنێو دیموکراسی خۆیدا دەژی، پێویستیشە لەناویدا بژی. چەندە دیموکراسییەتەکەی لەناواخنی خۆی بەجێ بکات، بەو ئەندازەیە بەشێوەیەکی پرەنسیپانەو خاوەن ئەزموون لەگەڵ گروپ و چینەکانی دیکەدا دیموکراسییەتێکی هاوبەش بەرێوەدەبات، دەیگۆرێ و وەریدەچەرخێنێ.

با لەژێرروۆشنایی ئەم شیکردنەوەو شیتەڵکردنانەدا لەنزیکەوە پەیوەندی نێوان دیموکراسی و دیاردەکانی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین ببینین. لەئەنجامدا بینیمان کەزاراوەی دیموکراتیزەکردنی دەوڵەت زاراوەیەکی راست نییە. راست ئەوەیە دەوڵەت بەرامبەر بە دیموکراسی هەستیاربێ. هەستیاربوون واتای پەسندکردنی زهنییەت، پێکهاتەو کردارەکانی دیموکراسییە. ئەگەر بڵێین ئەم رەوشە هێزو گەورەیی دەوڵەت سنووردارەدەکات راستە. هەڵبەتە هەبوونی دیموکراسی واتای سنووردارکردن و بچووککردنەوەی دەوڵەتە. لەو وڵاتانەی دیموکراسی بەشێوەیەکی کاریگەر بەرێوەدەبردرێت، دەتوانرێ سەرلەنوێ دەوڵەت بەشێوەی رێکخەری "ئاسایش و خزمەتگوزارییە گشتییە جەماوەریەکان و بەدەزگاکردنیان" پێناسە بکرێت. لەدیموکراسیدا جێگای دەوڵەتی ستەمکاری کلاسیك نابێت. تەنیا لەم چوارچێوە سەرەکییەدا دەوڵەت و دیموکراسی دەتوانن لەگەڵ یەکتری بن. لەهەلومەرجی ئەم سەردەمەماندا تواناکاری دەوڵەتێکی کلاسیکی تەواو یاخود بەرێوەبەرایەتییەکی دیموکراتییانەی تەواو لەئارادانییە. بەم واتایە دەڵێین چاخەکەمان سەردەمی لەدەوڵەتەوە پەڕینەوەیە بۆ دیموکراسی. لەچاخەکانی پەڕینەوەدا بەشێوەیەکی گشتی دەزگا سەرەکییەکانی رابردووو ئایندە بەیەکەوە لەئارادا دەبن. هەروەکو ئەو قۆناخەی دەرەبەگەیاتی و سەرمایەداری بەیەکەوە دەژیان.

لەکەسایەتی رۆژهەڵاتی ناویندا گەشەکردنی دیموکراسی هێندەی بڵێی سنووردارە. فیکرو کاردانەوەکانی هێشتا بەتەواوی نەهاتۆتەوە هۆش خۆی. لەگەڵ ئەوەی گروپەکان حەسرەتی قووڵیان هەیە، بەڵام دەوڵەتی بێ مەرهەمەت و زۆرداری هەزاران ساڵە لەرێگای سەرکوتکردنی زۆردژوارەوە ئەو تامەزرۆییەی خستۆتە خەوێکی قووڵەوە. هەرچەندە جاربەجار بەشێوەی راپەرین و یاخیبوون بتەقێتەوەودەربکەێت و، بەڵام کارەکتەری بێڕەحمی دەسپۆتیزمی دەوڵەت دیسان چەندبارە ئەم حەسرەتانە ژێرخاك دەکات. کاتێك راستینەی چاخەکەمان لەگەڵ ئەم پێکهاتەیەی دەوڵەت دەکەوێتە نێو ناکۆکییەکی ریشەییەوە، ئەوا حەسرەتەکانی دیموکراسی، ئازادی و یەکسانی دەژیێنێتەوەو دێنێتەوە هۆش خۆی. سەدەی بیستەم بە پڕلەهێماو نیشانەکانی ئەمجۆرە پێشکەوتن و گۆڕانکاریانە تێپەڕبوو. هەرچی سەدەی بیست و یەکەمە، شیمانەو ئەگەرێکی بەهێزی ئەوپێشکەوتنانە دیارە کەبەرەو بەدیهاتنی حەسرەتەکان بەرێوەیە. ئەوجوگرافیایەی لەدوای هەمووانەوەیە وڵاتانی عەرەبن. گرێدانی پێکهاتەی ئەتنیکی و ئایینی بەدەوڵەتەوەو بەستنەوەی کارەکتەری دەوڵەتگەرایی چینی سەرەوە

لەسەربنەمای بەرژەوەندی و گرێدانی بەپەیوەندی بەهێزەوە, هاتنەوە هۆش خۆیان کاردانەوەی ديموکراسی و کەوتنە جوڵەی ئاستەم دەکات. پێویستی بەدەستێوەردانی دەرەوەیە.

ئەگەر تاوەکو ئێستا گەشەکردنی ئیسرائیل لەناوجەرگەی عەرەبەکان میللیگەرایی عەرەب و ئایینگەرایی بەهێزکردبێت, ئیتر گەیشتۆتە ئەو دەروازەیەی کەرێگا لەپێش کاریگەرییەکی پێچەوانە بکاتەوە. لای تەواوی جیهان روونبۆتەوەو دەرك بەوەکراوە کەمیللیگەرایی و ئایینگەرایی ناتوانن کێشەی درێژخایەنی عەرەب ـ ئیسرائیل چارەسەربکەن. تەنیا بەلاوەنانی ڕێبەرایەتی میللیگەرایی و ئایینی و دەرکەوتنی گروپی ڕێبەرایەتی دیموکراتییانە دەتوانێ ببنەستبوونی ئێستابکاتەوە. هەروەکو لەنموونەی قوبرسدا بینرا, هەم هەلومەرجی ناوخۆ هەم دەرەوە تواناکاری پڕبەبایەخ بۆ مەیلی لایەنگری چارەسەری دەرەخسێنن, هەربۆیە پرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوینی گەورە بەپلانی بەرجەستەوە پەیڕەودەکرێت. بەتایبەتیش دیموکراتیزەکردنی عەرەبستانی سعودیاو میسر گرنگ دەبینرێ. دەوڵەتە بچووکەکانی دیکەی عەرەبیش بەو وانەو ئەزموونەی لەرەوشی ئێراق وەریانگرت ناچاربوون پەیوەندی بەرامبەر بەدیموکراسی نیشانبدەن. لەدەرەوە رای گشتی جیهان, لەناوەوەش حەسرەتەکانی هەڵوێستی دیموکراتییانەو کۆمەڵگای کۆمەڵکاری کەهەزاران ساڵە سەرکوت و چەواشەدەکرێ, خەریکە لەخەو هەڵدەستێتەوە. چاوەڕوانی ناکرێت دەوڵەتە دەسپۆتە عەرەبییەکان بۆماوەیەکی درێژ بەرامبەر ئەم دوو دیاردەیە (چەمکە) بەرخودان بکەن و جێگا بەدیموکراسی نەدەن. هەڵگرتنی ناوەکانی پادشایەتی یاخود کۆماری سەبارەت بەدیموکراسیەت گرنگییەکی نییە. هەردووکیشیان مەیلیان دەسپۆتیزمە. ئەوەی گرنگە بەرامبەر بەدیموکراسی هەستیاربن و بۆ سنووردارکردن و بچووککردنەوەی دەوڵەت کراوەبن.

ئەو دەوڵەتانەی کەگرێدراوی سیستەمە باوەکانی هاوسەنگی بوون لەدوای ساڵی 1990 مانەوەیان ئاستەمبوو. هەبوونی هەژموونی ئەمریکا لەناوچەکەدا زیاتر ناچاری ستاتۆی ئەیالەتییان دەکات. ئەگەرێکی بەهێزە بۆئەوەی وەکو دەوڵەت لەسەرپێیان بمێنن و بژین پێویستە بەرەو دیموکراسییەتێك بچن کەبەگوێرەی پێوانەکانی ئەمریکایە. رۆژبەدوای رۆژ ئاستەمتر دەبێت کەلەقۆناخی داهاتوودا بەپشتبەستن بەجەمسەرەکانی دەسەڵاتی ئەمریکا, پێشتریش ئینگلتەراو فەرەنسا, تەنانەت عوسمانییەکانیش درێژە بەدەسەڵات و ستاتۆی خۆیان بدەن. جێگای وەبیرهێنانەوەیە کەپرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوینی گەورە لەم زەحمەتییەوە سەرچاوە دەگرێت. هەرچەندە پێکهاتە دیموکراتییەکان لەناو سنووری وڵاتە جیاوازەکاندا جیاوازی نیشانبدەن, بەڵام لایەنی هاوشێوەشیان دەبێت. وەك پێشکەوتنی هاوبەش تادەچێ مافەکانی مرۆڤ, ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی, هەڵبژاردنەکان, فرەلایەنی, جیاوازی لەراگەیاندن, بەهێزبوونی پەرلەمانەکان, گەشەکردنی تاکێتی تاك رۆژهڤ داگیردەکەن. لەچالاکییەکانی دەستوورو یاساییشدا چاوەڕوانی پێشکەوتن دەکرێت. ئەو دیموکراسییەتەی گەشەدەسەنێ نەبەشێوەی دیموکراسی بۆرژوا ـ فیوداڵ دەبێ, نەبەشێوەی دیموکراسی گەل. لەبەرامبەر دەوڵەت سنووردارە, بەڵام هێندەی دەچێ کۆمەڵگا دەگرێتەوەو دەشێ بەشێوەی چالاکی ڤەبوون (کرانەوە) نیشانبدات.

دەبێ دیاردەی ئایین و ئەتنیك (ئەتنیسیتە) لەقۆناخی دیموکراتیزەبووندا گۆڕانکاری نیشانبدەن. ئیتر دەشێ ئایین و ئەتنیك بەشێوەی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و ڕێکخراوی سیاسی تۆزێك هاوچەرختر نوێنەرایەتییان بکرێت. بەواتای کلاسیك ئایین و عەشیرەتەکان دەتوانن جێگای خۆیان بۆ ناو پێکهاتە سیاسی و دیموکراتییەکان بگوازنەوە. نەدەوڵەت و دیموکراسی پشت ئەستوور بەئایین و ئەتنیك دەبێت نەئەو پێکهاتانە شانسی سەرکەوتنیان هەیە کەنکوڵی لەم دیاردانە دەکەن. بەتایبەتیش گرنگترین هۆکاری بەجێنەبوونی مەیلی چەپ و لیبراڵی شێوازی ئەوروپا لەناو جەماوەردا یاخود نەبوونیان بەخاوەن جەماوەر, بۆئەوە دەگەڕێتەوە کەبەشێوەیەکی راست ئەم دوودیاردەیان شینەکردۆتەوەو پەیوەندییان لەگەڵ نەبەستوون. لەکاتێکدا تۆڕی چنراوی کۆمەڵگا تارادەیەکی مەزن پشت بەم دوو دیاردەیە دەبەستێ. تاوەکو سەبارەت

بـەئایین و ئـەتنیك هەڵوێـستێکی ریـشەیی و پێکهاتـەکان پێـشنەخرێت ئەگـەرێکی لاوازە بتـوانرێ بەشـێوەیەکی گـشتی, بەتایبەتیش سیاسەتی  دیموکراتییانە, سەربخرێت. مەگەرتەنیا لەسەرەوە لەرێگای دیکتاتۆریەتێکی دژواری دژەشۆڕشگێڕی یان شۆڕشـگێڕی بـەدیبێت. بـەڵام  بـەردەوامبوونی تـابلێی جێـی گومـان دەبـێ. پێویـستە لـەم چوارچێوەیەدا هەڵوێـست بەرامبـەر تەریقـەت و مەزهەبـەکان نیـشانبدرێت. لەهـەردوو  دیاردەشـدا دەتـوانین جۆرێـك لەسیـستەمی مانـستەری چـاخەکانی نـاوین ببینین. وەکو شێوەی کۆمەڵگای مەدەنی چاخی ناوینە. ئەم دەزگاو  دامەزراوانەی ئـەمڕۆش درێـژە بەهـەبوونی خۆیـان دەدەن, گۆڕینیان بۆدیموکراسی پێویستی بەهەوڵی تایبەت هەیە. لەجیاتی نکوڵی و سەرکوتکردن, هەڵوێستی هەرەڕاست ئەوەیـە وەکـو دیاردەیەکی  سۆسیۆلۆژی ببینی و بەمەیلی ئازادیەوە گرێی بدەی. مافەکانی ژن و  ئازادییەکەی وەك گەشەسەندنێك کەبـەبێی ئەو نابێت, لەقۆناخی  دیموکراتییانەدا رۆڵێکی گرنگ دەبینێ. ئەم باباتە بەشێوەیەکی  جیاوازتر هەڵدەسەنگێنن.

لەگۆڕەپانی عەرەبیدا ئیسرائیل و سوریا وەك دوو فاکتـەری  سـتراتیژی سـەبارەت بـەدیموکراتیزەبوون گـرنگترن. ئیـسرائیل دیموکراسییەتێکی سـەقامگیرو جێگیری هەیـە. ئەمـەش بـۆ ئیـسرائیل  لاوازی نییـە, بـەڵکو فاکتـەرێکی گرنگـی بەهێزبوونـە. زەحمەتە هەمان شت بۆ سوریا بگووترێت. سوریا لەدەروازەی رێگایەکی جـددی دایـە. ئەگەرلـەرێگای ریفـۆرمی ڕشـت و جـددی هەنگاوی خێرا بەرەو دیموکراتیزەبوون نەهاوێژێت و کێشەکانی لەگەڵ ئیسرائیل چارەسەرنەکات, دەشێ بکەوێتـە نێـو رەوشـی ئێراقی دووەم. دیموکراتیزەبوون و ئاشـتی لەگـەڵ ئیـسرائیل, بـەبێ ئـەوەی رژێمـی سـوریا پەنابباتـە بـەر توندوتیـژی دەتـوانێ گـــۆڕان و وەرچــەرخان ئەنجامبـــدات. هـــەبوونی رۆشـــنبیری بـــەتوانا,  پێکهاتـــەی هەمـــەڕەنگی ئـــەتنیکی و مەزهـــەبی, لەدیموکراسییەتێکی  هاوبەشی چینەکانی نـاوین و هـەژارەکان دەتـوانێ قۆنـاخێکی بەرهەمـدارتری گەشەسـەندن ئەنجامبـدات. رۆڵی کوردەکانی(سوریا) نەك وەکو کوردەکانی (ئێراق), رەوشـیان زیـاتربۆ بـوون بەتوانـستی  وەرچـەرخانێکی دیموکراتییانـەی لیـبڕال لـەبارترە. هەڵوێـستی  هەسـتیارانەی دەوڵـەت ئەمـەدیاردەکات. لـەباکووری ئـەفریقیاش بەربـەرەکان دەتـوانن رۆڵێکـی هاوشێوەی ئەمەببینن.

ئێراقیش زیاتر بۆئەوە هەڵبژێردراوە ببێتە تاقیگەی (مختبر) دیموکراسییەتی عەرەبەکان و تەنانەت رۆژهەڵاتی نـاوینیش. کۆکردنەوەی تەواوی دیاردە ئـەتینکی, ئـایینی, مەزهـەبی, سیاسـی و  کۆمەڵایەتییـەکانی رۆژهـەڵاتی نـاوین لـەناواخنی خۆیـدا تایبەتمەنـدێتی  بـوون بەتاقیگـەی تۆکمـەترکردووە. لەئـەنجامی فووڵبونـەوەی هەوڵـەکانی  ئـەمریکاو هاوپەیمانـەکانی, دەستپێـشخەری دیموکراتیزەبـوونی گروپـە  ئـەتنیکی, مەزهـەبی و کۆمەڵایەتییـەکان لـەژێرەوە زیاددەکـات, لـەبواری دیموکراسییەوە ئەم وڵاتە دەکەنە خاوەن شوێنگەیەکی ستراتیژی. ئەگەربەشێوەیەکی راسـت دەوڵەمەنـدێتی مێـژوویی و نـەوت بـەکاربهێنرێت، دەشێ بۆدیموکراسـی ببـێ بەدەرفـەتێك. چەسـپاندنی فیـدرالیزمی دیموکراتییانـە لەلایـەن کوردانـەوە جگـە لەچەسپاندنی هەبون و مافی خۆیان لەتەواوی ناوچەکە رێگا لەپێش ئەنجامی گرنگ و بایەخداردەکاتەوە. فیدراسێونی ئێراقی دیموکراتیك دەشێ ببێتە نموونەی سەرەتایی فیدراسیۆنی رۆژهەڵاتی ناوینی دیموکراتیـك, کە لـەداهاتوودا خـۆی رادەگەیـەنێ. هەربۆیە گۆڕانکارییەکان زۆرگرنگ و بایەخدارن. چارەسەرییەکانی ئێراق دەشێ لەتەواوی رۆژهەڵاتی ناویندا بڵاوبێتەوە.

لەئێران هەنگاوبەهەنگاو دیموکراتیزەبوون دەبێ بەرۆژەڤی هەنووکـەیی. تادێت ئـیتر نـەریتی بـەهێزی دەوڵـەتی کلاسـیکی لەخۆگونجاندن لەگەڵ چاخ زەحمەتی دەبینێ. تامەزرۆیی و جۆشوخرۆشی دیموکراتی لای گەلانی ئێـران چـڕدەبێتەوە. لـەدوای ئێـراق، فیدراسـیۆنی دیموکراتییانـە لـەئێرانیش دەبـێ بـەرۆژەڤ. لەپارچـەبوون زیـاتر لـەباربوونی بۆفیـدرالیزم بـەهێزترە. لەنەریتی 2500 ساڵی نەریتی دەوڵەتیشدا ئـەو فاکتەرانـە زاڵـن کـەنزیکی فیـدرالیزمن. ئەگەرحەسـرەتە چـڕبووەکانی گـەل و فیـدرالیزمێکی هاوچـەرخ بـبن بەیـەك، دەشـێ ئێـران ببـێ بەبـەهێزترین فیدراسـیۆنی دیموکراتییانـەی ناوچـەکە. بـەجۆرێك لەجۆرەکانی وەکو روسیای دووەمی لێدێت. لـەجیاتی بـەرخودانێکی سـەددامیانە بەرامبـەر بەفشارە زیادبووەکانی ئـەمریکا،

هـەنگاونان بـەرەو فیـدرالیزمێکی دیموکراتییانـە دەشـێ بـۆ ئێـران ببـێ بەبـژارێکی هەمیـشەیی و ڕاسـت. بەسیاسـیبوونی ئەوپەڕگەرایی ئـایین نێگەتیڤانـە کاریگەری لەسـەر دیموکراتیزەبـوون دەکـات. چالاکی و کاریگەرییـەکانی ئایـدیۆلۆژی ئـایینی چـەندەی دەچـێ پێـچەوانە دەبێتـەوە. کولتـوری ئێـران زیـاتر نزیکـی دیمکراتیزەبوونـە. نەریتـەکانی بـەرخودانی مێـژوویی، چەندین کەسایەتی مێژوویی لـەجۆری زەردەشـت تـاوەکو مـەزدەك، لەبابەکەوە تاحەسـەن سـەباح، زیـاتر ژێرخـانی کولتـووری دیموکراسی پێکدێنن.

ئەزموونی ئۆپۆزسیۆنی فرەڕەنگی لـەقۆناخێکی نزیکدا خۆی لەنەخۆشـییەکانی پاکدەکاتـەوەو دەتـوانێ دیموکراسـییەتێکی بەپرەنیـسپانە پێـشبخات. تـەکنۆلۆژیای گەیانـدن دەتـوانێ قۆنـاخ خێرابکـات. ئەگەربەڕێوەبەرایـەتی میـانڕۆیی پێویـست نیشانبدات، دەشێ دیموکراسییەتێکی هاوشێوەی ئیسپانیا لەئێران بەرجەستە ببێت.

ڕۆڵـی ئـایین لەپاکـستان زۆرنێگـەتیف و خـراپترە. ئـەو ئایینگەرایـیـەی لەلایـەن دژە هینـدێتی و عەشـیرەتگەرایی بـەخێوی کردووە، هەروەك بلێی دەوڵەت و کۆمەڵگای بە دیلی گرتووە. بەڵام کشاندنەوەی دەستی یارمـەتی ئـەمریکا بـۆ ئـایین، هـەروەها ئەزموونی ئەفغانـستان تـۆڕی ئـایینی لاواز دەکـات و دەتـوانێ دیموکراسـییەتێکی عـەلمانی پێـشبخات. بـەجۆرێکی دیکـە نـاتوانێ لەدەرهەقی هیندستان، ئێـران و ئەفغانـستان دەربکـەوێ. مـۆدێلی پاکـستان مۆدێلێکـە بەپەلـە پێویـستی بەوەرچـەرخان هەیـە. ئەزموونی ئەفغانستان هاوشێوەی ئێراق دەتوانێ ببێتە نموونەیەکی سەرەتایی تەواوی ئاسیای ناوین. ئەو فاکتـەرەی هەرەزێـدە ئاسیای نـاوین ناچاری گۆڕانکاری دەکـات ئـەزموونی دیموکراتیزەبـوونی ئەفغانـستانە. دیموکراتیزەبـوونی کۆمـارە تورکییـەکان زیاتر نزیکی ڕوسیایە. بەڵام دەشـێ دەوروبەرەکـەی ڕێگـا لـەپێش گەشـەکردنی جیـاو تایبـەت بکاتـەوە. بـەهۆی ئـەو دەوڵـەت و هزرەی پێکهاتە سیاسییەکەی پارچەکراوە ئەگـەر ڕۆژهـەڵاتی نـاوین بەسـانایی نـەتوانێ هـەنگاو بـۆ گەشەسـەندنێکی لەشـێوەی ئەوروپا بهاوێژێ، ئەوا زەمینەی مێژوویی هاوبەشێتی مـاقووڵتردەبینێ. کۆنگرەی وڵاتـانی ئیـسلامی هێنـدە خـاوەن ڕۆڵ نییـە. دەشێ فیدراسیۆنی دیموکراسـییانەی ڕۆژهـەڵاتی نـاوین ئایـدیالیزە بکـرێ. کاتێـك ئـەمریکا و هاوپەیمانـەکانی دیمکراتیزەبـوون بەگوێرەی بەرژوەندی خۆیـان گونجـاو دەبیـنن، شانـسی پێشکەوتنی بـەمجۆرە زیاتردەکات. لەکاتێکـدا ئەوهێزانـەی بەرلەسـاڵی 1990 پشتگیری و یارمەتیاندەدرا هێزە دەسپۆتیك و دژە دیموکراسییەکان بوون، قۆناخی نوێ پێچەوانەکەی بـەرۆژەڤکردووە. کاتێك چاخ تاودانێك بەدیموکراسی دەدات، ئەوە ناوچەکە بەرگەی ئەوە ناگرێت بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لەلایەن پێکهاتـەکانی دەرەوەی سەردەم بەڕێوەببردرێت. دیاردەکانی دەوڵەتی نەتەوەیی کەبەدرێـژایی 50 ــ 60 ساڵی دوایـی پـشتیان بەهاوسـەنگی نێوان سۆڤییەت ــ ئـەمریکا دەبەسـت، ئیترمـۆدێلێکی بێـچارەو بێبەرهـەمن و جیهانگیریش نـاتوانێ هەرسیان بکـات و باریـان هەڵگرێت. ڕاستینەی دەوڵەتێك جێگای شیمانەکردنە کەبە ئەندازەی سیستەم بتوانێ گوێ لەگروپەکانی گەل بکرێ، بـەگوێرەی ئەمـەش بەرامبـەر بـە دیموکراسـی هەسـتیاربێت و بـچووك و سـنووردارکرابێت. تێپـەڕبوونی ڕۆژهـەڵاتی نـاوین بۆچـاخی شارستانییەتی دیموکراتییانە، بەهۆی ئەم فاکتەرانە دەشێ ڕۆڵی گرنگ لەوەرچەرخانی جیهاندا ببینێ.

ئەم پێشبینیانە وەك ڕەوشی بەرجەستەی قۆناخی نزیکی ڕۆژهەڵاتی ناوین, ئاشکرایە سـەبارەت بەسـیستەمی دیمـوکراتی و کۆمـەڵکاری گـەل شـێوە نموونەییەکـەی پێـشکەش ناکـات؛ وەکـو ئۆتۆپیـای سۆسیالیـستی قۆناخێـك نموونـەیی دەمێنـێ. بـەڵام نموونەیەکی واقیعیترە. گرنگ ئەوەیە، ئەوانەی لەناو دۆزی ئازادی و یەکسانی کۆمـەڵگادان هەڵوێـستی بەپرەنـسیپانەی خۆیـان نەکەنە قوربانی ئەو چارەسەرییانەی ـ لەڕاستیدا بێچارەییە ـ لەناوەندی دەوڵەتەوە دەردەکەوێت. پێویستە وەکو سۆسیالیزمی بونیادنراو، ڕزگاری نیشتمانی و سۆسیال دیموکراتەکان بەرامبەر بەهەندێك قـەرەبوو دەسـت لـەم هەڵوێستە بەپرەنـسیپانەیان هەڵنەگرن. سووربوون لەسەر دیموکراسی، ئارامترین ڕێگای ئازادی و یەکسانی و قووڵبوونـە. لیـنین گووتـەنی، ئەگـەرددرەنگیش بێت، تەنیا لەمیانەی ئەم هەڵوەستەیە، واتە لەڕێگای فراوانترین و پشوودرێژترین دیموکراتیزەبوونەوە بەدیدێت.

لەشارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناویندا دیاردەی ژن سەنتەری چارەسەرکردنی تەواوی کێشە کۆمەڵایەتییەکانە. بەبێ دووبارەکردنەوەی پووختە مێژووی گەشەکردنی دروشمی سەرەکی قۆناخی داهاتوومان، ئەمجارە پێویستە **"سێیەمین شکاندنەوەی مەزنی رەگەزی" دژی پیاوبێت. تاوەکو یەکسانی رەگەزی کۆمەڵگا بەدینەیەت، هیچ داواکاریەکی ئازادی و یەکسانی واتادارنابێ و دەستەبەرناکرێت. بەرفراوانترین و هەمیشەییترین فاکتەری دیموکراتیزەبوون دیسان ئازادی ژنە.** ئەو سیستەمەی سەرەتا ژنی کرد بەموڵك، لەڕۆژگاری ئەمرۆشماندا بەهەمووشتێکیەوە کردوویە بەکاڵا، لاوازترین لایەنی دیسان کێشەی ژنە. رۆڵی ئەودیاردەیەی لەقۆناخێکدا چینی کارکەری پێدەگووترا، بەباشترین شێوە رەچەڵەکی ژن ئەنجامیدەدات. بەرلەچینایەتی پێویستە شیتەڵکاری رەسەنێتی ژن بکرێت، تاوەکو باشتردەرك بەچینایەتی نەتەوایەتی بکرێت. ئازادییەکی راستەقینەی ژن بەلابردنی هەست و سۆزو ئیرادەی مێرد، باوك، برا، دۆست.. هتد بەدیدێت. باشترین ئەشق (ئەڤینداری) مەترسیدارترین موڵکایەتییە. تاوەکو تەواوی قاڵبە ئایینی و زانستی و هونەری و فیکرییەکانی جیهانی پیاوسالاری سەبارەت بەژن خوڵقاندوویەتی بەرەخنەیەکی چڕوپڕدا تێپەڕنەکرێت، ناسنامەی ژنی ئازاد دەرناکەوێتەڕوو. بەرلەهەموو شتێك پێویستە ژن ببێتە هی خودی خۆی، تاوەکو لەموڵکبوون رزگاری بێت. ئەوژنەی کەوتبێتە رەوشی موڵك و کرابێتە موڵك، دەبێتە رێگرلەپێش پیاوی مەردو رەوشتبەرزیش. هەستان و دانیشتن لەگەڵ ئەمجۆرە ژنە کۆسپە لەپێش پیاوی ئازادیش. ژنێکی خراوو داڕووخێنراوی بەمشێوەیە، ئەگەر بەپێچەوانە تاوتوێی بکەین, واتە پیاوی رووخێنراوە.

گرێدانی ئاستی ئازادی کۆمەڵگاکان بەئاستی ئازادی ژنەوە دەستنیشاکردنێکی راستە. کاتێك لەلایەنی ئیستاتیکاوە تەماشای بابەتەکە بکەین، دەبینین ئەوەی ئازادنەبێت ئیستاتیکای (جوان) نابێت. هەربۆیە ژیانێکی جوان نەبێت لەسنوورەکانی ناکامیدا بەدیدێت. وەك دیاردەیەکی هونەری تەماشاکردنی دیاردەی ژن زیاتر واقیعی و ژیانییە، نەك وەك موڵك ـ موڵکایەتی یاخود کارکەر ـ گوندی. بینینی ژن وەکو پارچەی هەرەبزۆك و هەستیاری سروشت، هەستکردن بەوەی پیرۆزییەکی دیاریکراو لەخۆیەوە دەگرێت، موخاتەبەنەکردنی بەزمانی پیاوسالاری، دەرککردن بە زمانی پڕلەنهێنی ژیان، سەبارەت بەژیانێکی جوان زۆرگرنگە. خراپترین کرداری کۆمەڵایەتی کەبەسەر ژندا دەسەپێنرێ پیاوسالارێتی و خۆپەرستی پیاوە. هیچ شتێك وەکو هەڵوێستی ئەو پیاوە ناقۆڵایە قەدەرگەرا نابێت کەبەسەر ژنی بێچارەدا داسەپێنراوە. بەگوێرەی من بەهێزترین و دیموکراتترین پیاو ئەوەیە کەوا پێگەیشتووە، هەستیارە، لەئازادی و یەکسانی تێدەکات، گرێدراوی ئەو پێوانانەیە کەپێناسەمان کردو دەزانێ پێداویستییەکانی بخولقێنێ. ئەو کۆمەڵگایەی بێڕادە ژن بچووکدەکاتەوە ئەوکۆمەڵگایەیە کەلەناو کۆیلایەتیدا قووڵبۆتەوە. ئەو کۆمەڵگایەی ژیانێکی هاکەزایی لەگەڵ ژن پەسندبکات هیچ لەواتای ژیان تێناگات. دیسان خراپترین و بێ هەستیارترین ژیان دوور لەجۆش و تێگەیشتن ئەو ژیانەیە کەلەگەڵ ژنێکی کۆیلەدا پێکەوەی بنێت.

کاتێك لەژێررۆشنایی تەواوی ئەم پێناسانەدا تەماشای کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین بکەین، باشتردەرك بەوەدەکەین کەبۆچی ژیانێکی پاشکەوتوو، بێواتا، زۆردار، ڤێزەون و بێ چەمك زاڵە. زۆر ئاشکرایە کۆمەڵگایەکی پیاوان کەبەرامبەر ژنان خاوەن هەڵوێستێکی سووك، لەجوانی بێبەش، بێنرخە و وەك ماڵ و موڵك تەنانەت وەك دەردێکی دەبینێ, کەپێویستە لەکۆڵەخۆی بکاتەوە، ئەم کۆمەڵگایە ئیفلاح نابێ (چاك نابێ)و لەئاشتی بێبەش دەبێ و بەڤێزەونی دەژی. کۆمەڵگاکانی پیاوی بەم چەشنە ناتوانن هەڵوێستێکی پیرۆزی ژیان، شکۆداری نیشتمان، رەوشتبەرزی و مەردایەتی راستەقینە و هەڵوێستێکی واتادار بەرامبەر بەسروشتی زیندوو بخولقێنن. کاتێك ناتوانن بیخولقێنن بەردەوامی"ژنی شەیتان" وەك بیانوو نیشاندەدەن. ئەو ژنەی بەشەیتان و ناتەواو بەناودەکرێ، لەراستیدا درۆیەکی پووچ و ساختەکارانەی کۆمەڵگای پیاوی دۆڕاوە. تاوەکو شەڕێکی بەهێز بەرامبەر بەئایدیۆلۆژیای پیاوسالاری و ئەخلاق و هێزی کۆمەڵایەتی و تاکەکان بەڕێوەنەبردرێت ژیانی ئازاد بەدەستناهێنرێ،

کۆمەڵگایەکی دیموکراتییانەی راستەقینە ناخوڵقێنرێ. هەربۆیە وەك یەکسانی سۆسیالیزمیش بەدینایەت. بژاری سیاسی گەلان تەنیا کۆمەڵگایەکی دیموکراتیك نییە، بەڵکو کۆمەڵگای دیموکراتی و ئازادی رەگەزە.

بەشێوەیەکی بەرجەستە تێکوشانی ئازادی ژن لەئاواکردنی پارتی تایبەت بەخۆیەوە تاوەکو بزاڤی گەلەری ژنان و تەواوی رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و پێکهاتەکانی سیاسەتی دیموکراتییانە، دەبێ هەموویان لەناویەکتریدا بەرێوەببات. چەندە بتوانێ لەدەست باڵادەستی پیاوو کۆمەڵگاکەی رزگاری ببێت و لەمیانەی دەستپێشخەرییەکی سەربەخۆ بجولێتەوەو بەهێزبێ، بەو ئەندازەیە ژن دەتوانێ ببێتە خاوەن کەسایەتی و ناسنامەیەکی ئازاد. هەرلەزووەوە، پێشوەخت سەرگرێدان کۆیلایەتییەکی هەرە زۆردارانەیە. رەسەنترین هەڵوێست و رەفتار ئەوەیە بە هیچ شێوەیەك سەری (مێشکی) گرێنەدرێت. لەعەباوە تادەگاتە لەچکەو بەکارهێنانی وەك ئامرازێکی زایەندی (سێکسی)، ئەو کردارانەی بەدەستی پیاو بەسەرژندا سەپێنراوە، ئەم سووکایەتییە بەئەندازەی خراپی هیچ چین و نەتەوەیەك نابێ. هەربۆیە هاوکاریکردنی جموجوڵ و هوشیاری ئازادی و تووڕەیی ژن شکۆدارترین بەهای هەڤاڵێتی و مرۆڤێتییە. رۆژهەڵاتی ناوین ئەو ناوچەیە کەبەهێزترین کولتووری خوداوەندی ژن و قووڵترین کۆلایەتی ژنی تێدا ژیاوە، ناوچەیەکی بەشارستانییەت ئاشنایە. **"سێیەمین شکاندنەوەی گەورەی رەگەزی"** ئەنجامدەدات و بەشێوەیەك جێگا بەکاروانێکی مەزنی ژنان دەدات کەشایستەی مێژووەکەی بێت. هەڵسانەوەی کەوتنە گەورەکانیش مەزن دەبێت. لەم چوارچێوەیەشدا ئەگەروەك باوەڕهێنەکانی ئایینێکی نوێی ژنەخوداوەند هەڵوەستەبکەین، بەو پیرۆزییەی دایك و ژنێتی ئەشق دەگەین کە شایستەیەتی.

هێندە واتاداری نابینم کەپێویستە ئابووری، چین و کۆمەڵایەتیبوونی کۆمەڵگای ئەلتەرناتیڤی رۆژهەڵاتی ناوین چۆن بێت. زیاتر ئەوانەی پێویستە شیبکرێنەوە ئەو بابەتانەن کە تاوتوێکران. نەك داننان بەکارکەرێتی و بێکاری و گوندێتی، بەڵکو نەناسین و دانپێنەنانیان شۆڕشگێڕێتی راستەقینەیە. بینینی ئەم چینانە وەك کۆیلەی ئاغاو سەرمایەدارەکان باشترنزیك بە راستیمان دەکاتەوە. ئەگەرلەلایەنی ئابووریش نەبێت بەو ئەندازەیەی کارکەرو گوندێتی بەهزرو سیاسەتی دیموکراتییانە تێپەڕبکەین هێندە ئازادی بەدیدێت. لەناچاریەوە خەڵك دەبێ بەکارکەرو گوندی. ئەگەر ئازادیش تێپەڕکردنی ناچاری بێت، ئەوکاتە دەبێ بوون بەکارکەرو گوندی تێپەڕبکەین. کاتێك تێکوشانی چینایەتی راستەقینە بەم هزرەو بەشێوازی دیموکراتییانە بەرێوەببرێت، ئەوکاتە وەك یەکسانی سۆسیالیزمیش بەواتای راستەقینەی خۆی دەگات. بێکاری بەرهەمی نەبوونی دیموکراسییەتە. ئەو کۆمەڵگایەی بزانێ ببێ بەدیموکرات بێکاران بەرهەم ناهێنێ. لەکوێ بێکارییەکی زۆرهەبێت، بەو واتایەدێت کەلەوێ بەو ئەندازەیە دیموکراسییەت بوونی نییە. دیاردەی بێکاری بەگشتی دەردو نەخۆشی شارستانییەتی چینایەتییە. ئەو مرۆڤ و کۆمەڵانەی بزانن چۆن بەرپەرچی بدەنەوە هیچ کاتێك بێکارنامێنن. تەنانەت هیچ ئیش و کارێك نەدۆزرێتەوە، بەگوێرەی ئەوەی شکۆدارترین کار، کاری دیموکراسییە, کەواتە شکۆدارترین ئیش لەئارادایە. ببە بەدیموکراتێکی باش و لەپێناو ئازادی بجەنگی، دەبینی کەبەدرێژایی تەمەنی خۆت یەك تاکەکاتژمێریش بێ ئیش نابیت. ئەو گەل و کۆمەڵانەی شەڕی دیموکراسی بەرێوەنابەن، هەمووکاتێك بەرەنجبەری و وێڵی و بێکاری دەمێننەوە.

لەدۆخێکی وەهادا چەندە کۆمەڵگایەك، تاکێك لەپێناو تێکوشانی ئازادی پەروەردەبکەین، رێکبخەین و بیخەینە ناو چالاکییەوە، بەو ئەندازەیە لەتێکوشانی بەرامبەر بەبێکاری، وێڵی، مەیخۆری و تەمبەڵی سەرکەوتن بەدەستدێنین.

تاوەکو گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین لەپێناو دیموکراسی هەڵنەستنە سەرپێیان، لەعەودالی سەردەم و تەمبەڵێتی و بێکاری رزگاریان نابێت. ئەو کۆمەڵگایانەی دەزانن ببن بەدیموکرات، دەبن بەخاوەنی وڵاتەکەیان، هەمووجۆرە سەرچاوەیەك، رەنجی خۆیان و کولتوورەکەیان، ئەوکاتەش تەنیا رەنجی بەپیت و بەبەرهەمی مرۆڤ دەمێنێ. کاتێك ئەم رەنجە لەگەڵ چاخی زانست ـ تەکنۆلۆژیا بووبەیەك، بەهەرحاڵ هیچ شوێنەوارێکی برسێتی و بێکاری نامێنێ. دووبارە جەختی لەسەردەکەمەوە، بێکاری و

تەمبەڵی بەرهەمێکی نەبوونی دیموکراسی و فێرکردنی کۆیلایەتییە. ئەگەر بخوازرێ لەبەین ببرێ، نەك بەپاڕانەوە لەدەوڵەت و سەرمایەداران ــ هەردووکیان سەرچاوەی سەرەکی بێکاری و هەمووجۆرە سووکایەتییەکن ــ، بەڵکو لەمیانەی سەپاندنی رێکخستن و چالاکی دیموکراتییانەوە ئەنجام بەدەستدێنێ. تێکۆشانی ئابووری راستەقینە گرێدراوی ئەمجۆرە چالاکییە دیموکراتییانەیە. رێگاکانی دیکە گەمەی رووزەردی سەندیکاگەرایی و سیخوڕێتی بەرێوەبەرەکانە (سەرکارەکان)ە، لەرێگای قەرەبووی هەرزانەوە بەدرێژایی تەمەن کۆیلایەتی و کرێکارو گوندی دەمێنێتەوە. ئەو وڵات و کۆمەڵگایانەی دەزانن چۆن ببن بەدیموکرات، لەمێژوو ــ ئەسینا ــ لەرۆژگاری ئەمرۆشماندا "سویسراو ئینگلتەرا" دەوڵەمەندترین و سەرکەوتووترین کۆمەڵگان.

مێژووی رۆژهەڵاتی ناوین دیرۆکی کوشتنی مێژووی ژینگەپارێزییە.

کاتێك شارستانییەتی کۆمەڵگای چینایەتی لەسروشت نامۆبوو، تێکدانی هەمیشەیی ژینگە رۆژبەرۆژ، مانگ بەمانگ، سەدە بەسەدەو هەزارە بەهەزارە بەردەوام بوو و تائەمڕۆ هات. تەواوی دارستان و خاکەکەی دەڵێی بووە بەچۆڵەوانی. ئەو دارستان و خاکەی کەبەرهەمدارترین شادەماری مرۆڤایەتی پێکدەهێنا. سەرەکیترین ناوچە و گۆڕەپان بوون کەلەرێگای ئاژەڵ و دانەوێڵەکەیەوە رێگای شارستانییەتی کردەوە. کاتێك مرۆڤ کۆیلایەتی بەسەرمرۆڤی دیکەدا سەپاند، تێکدان و تەورە بێرەحمەکەشی بەسەر ژینگەدا سەپاند. ئەو ناوچانەی کرد بەچۆڵەوانی کەخەیاڵەکانی بەهەشتی خوڵقاندبوو. کەدارستان نەما، خاك نامێنێ، کەخاکیش نەما رووەك و ئاژەڵ و مرۆڤ نامێنێ. بەبرسی و تێنوێتی مایەوە، لەنێوچوو. لەئەنجامدا دەوڵەمەندترین خاك، بوو بەهەژارترین و بێخێرترین خاکی دەستلێبەردراو. ئەو خاکەی لەسەردەمێك لەهەرچوار لای جیهان رووی تێدەکرا، بۆئەو چۆڵەوانییە گۆڕا کەلەوێوە بۆهەر چوار لای جیهان رادەکەن. لەرۆژهەڵاتی ناویندا مێژووی ژینگەپارێزیش وەکو مێژووی ژن نەنووسراوەتەوە. هەروەکو چۆن پێویستە لەپێناو ژنی ئازاد مێژووی ژن بزانرێ، بۆ کۆمەڵگایەکی ژینگەپارێزیش پێویستە مێژووی ژینگەپارێزی بزانرێ. کۆمەڵگایەکی دیموکراتی ئازادیخوازی رەگەزی پشت بەهوشیاری ژینگە و چالاکییەکەی نەبەستێ نابێتە بژاری راستەقینەی گەلان.

بزووتنەوەیەکی دیموکراسی و ئازادیخوازی رەگەزی پشت بەجولانەوەیەکی پەرەپێدانی دارستان و بەگژداچوونەوەی داخوران (بەبیابانبوون) و داماڵینی خاك و ئاوەدانکردنەوەی نەبەستێ، لەگەڵ جیهانی دیکەی ستەمکاری پیاو جیاوازی نابێت. بزاڤی ژینگەپارێزی یەکێك لەو فاکتەرانەی کۆمەڵگای نوێیە کە بە بێی ئەو نابێت. ژینگەپارێزی تەنیا ئابووری نییە. سەرلەنوێ گەڕانەوەی چەمکی سروشتی پیرۆزو زیندووە کەهزر لەدەستیدابوو. تاوەکو هوشیارییەك سەبارەت بەوسروشتە نەبێ کە بەجریوەجریو و ئاواز ئاخافتنمان لەگەڵدا دەکات، لەگەڵ ئێمە خوڵقاوەو ئێمەی خوڵقاندووە، ژیانێك کە لەخاکی رەشی بێگیان و ئەو سروشتەبێ کەپیرۆزی لەدەستداوە تاڕادەیەکی مەزن ژیانێکە بەهای خۆی لەدەستداوە. هوشیاری ژینگە تەنیا بۆ ئاوو هەوای پیس پێویست نییە، بەڵکو سەرتاپاگیری ژیانە لەگەڵ سروشتدا، لەسروشتە پارچەکراوەکە گەڕانەوەیە بۆ سروشتی یەکپارچەیی. ئەمەش واتای گەیشتنە بەکۆمەڵگایەکی دیموکرات و سۆسیالیست. بەناویەکداچوونێکی بەمرادەیە جێگای باسە. رێزگرتنە لەزنجیرەی ئەو قۆناخ و پەرەسەندنانەی مرۆڤی بەرهەمهێنا. ئەو کۆمەڵگا سروشتییەی کۆمەڵگای کۆمۆنەی سەرەتایی لەگەڵ خۆیدا بەدیهێنا، ئەمرۆ لەرێگای زانست و تەکنۆلۆژیاوە دەتوانین بەزانینەوە بیخوڵقێنین. بەرامبەر بەکێشە خۆیناویەکانی رۆژهەڵاتی ناوین لەوانەیە کێشەکانی ژینگە وەکو فەنتازیا بێتەبەرچاوان. بەڵام نابێ لەبیر بکرێ لەمیانەی خیانەتکردن لەژینگەوە بەوکێشە خوێناویی و برسێتی و بێکارییە گەیشتن. چۆن بەبێ پشتبەستن بەپزیشك ناتوانرێ باس لەتیمارکردن بکرێ، ئەوا ئەگەر پشت بەژینگەپارێزی نەبەستی ناتوانرێ باس لەکۆمەڵ و کۆمەڵگایەکی تەندروست بکرێ. لەدۆخێکی وەهاشدا ناتوانرێ کۆمەڵگایەکی دیموکرات و رەگەزی ئازاد ئاوابکرێ.

کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناوین بەهەموو گەلەکانییەوە گەیشتوونەتە سەری رێگا (دەروازە). مەیلی ئیمپراتۆریەتی هێزی بەهەژموون ئەمریکا، دوورە لەوەی چارەسەری بێنێتەئاراوە. دەرکەوتنی ڤێتنامی نوێ لەبەرامبەری هەڵوێستێکی واقیعی نییە. تورکیایەکی ساڵانی 1920یش جێگای باس نییە کە تازە دامەزرابێ. چونکە هێزی هاوسەنگی، سۆڤییەت نەماوە، گرنگتریش ئیمپریالیزمیش وەکوجاران نییە، هەربۆیە ئەمڕۆ رزگاری نیشتمانی تورکیا و شۆڕشی رزگاری نیشتمانی هاوشێوەی ڤێتنام لەئارادا نابێ. هەلومەرج و ئامانجەکانی هەرقۆناخێکی مێژوویی، تەنانەت شەڕە رێکخراوەکانیش جیاوازتر دەبێت. واتادارترین هەڵوێست بەرامبەر بەئەمریکا و هاوپەیمانەکانی، لەمیانەی پرۆگرامێکی ژینگەپارێزی و ئازادیخوازو دیموکراتەوە کەتوانای پراکتیزەکردنی هەبێ، تەواوی هێزە ئازادیخوازەکانی گەل و کۆمەڵگا لەناو پەیوەندییە بەرفراوانەکانی رێکخستن بکەیتەیەك و بیانخەیتە ناوجوڵەوە. لەوانەیە کەمخوێن بێت بەڵام شەڕی ئەنجامگیرو هوشیارانە بەمجۆرەدەبێت.

ئەگەرپێویست بکات لەمیانەی رێککەوتنی بەپرەنسیپانە، ئەگەرئەمە نەبوو، ئەوا بەپشتبەستن بەهێزەکانی پاراستنی خۆمان دەتوانین دیموکراتیزەبوون لەگوند، شارو شاخ و چۆلایی ئەنجامبدەین. ئەو گەلانەی خۆیان دیموکراتیزەنەکردبێت شانسی سەرکەوتنیان نابێت. کاتێك گەلان لەرێگای کۆنگرەکاندا کەنوێنەرایەتی ئیرادەی گشتیان دەکات، لەمیانەی هەمووجۆرە رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، کۆمەڵگاری و گروپەکانی خەباتی بەکۆمەڵ بکەونە جوڵەوە، ئەوا دەبینین هیچ دۆزێکی کۆمەڵگانییە نەتوانین تێیدا سەربکەوین. کاتێك هەستانەسەرپێی گەلان لەقۆناخی نوێی مێژوویی رۆژهەڵاتی ناوین بەمشێوەیە بێت، تەنیا بەپووچەڵکردنەوەی داسەپاندنە کۆنەکانی ئیمپریالیزم ناوەستن؛ ئەوا لەرێگای رێککەوتنی واتادارو بەپرەنسیپانە دەتوانن پێشەنگایەتی دیموکراتیزەبوونێکی ئاشتیانە بکەن. بەمجۆرە دەتوانن وەکو کۆڵەکەیەکی شارستانییەت بمێننەوەو شایستەی مێژووی شارستانییەتی خۆیان بن.

ئەگەر بگووترێت ئەی رۆڵی شۆڕشگێرەکان لەکوێ مایەوە؟ بەرلەهەموو شتێك پێویستە بزانن بەوراستینەیەی کۆمەڵناسی بگەن کەهەوڵماندا دیاری بکەین. وەرچەرخێنەری کۆمەڵگا یاخود شۆڕشگێڕێتییەکی بێ زانیاری کۆمەڵناسی هەندێجار بەبێ ئەوەی ئاگاداربێت تێکەڵی تاوان و خیانەتکاری دەبێت. تاکەرێگای رێگرتن لەم رەوشە، رزگارکردنی کۆمەڵناسییە ــ لەدەستی دەسەڵات ــ لەدەستی هێزەکان و سەرلەنوێ ئاوەدانکردنەوەیانە، ئاواکردنی فوتابخانەکانی کۆمەڵناسی تایبەت بەخۆمانە. بەبناخەدانانی زهنییەتی پشتئەستور بەکۆمەڵناسییە لەسیاسەتەکانماندا. بەڵکو لەهەمووان گرنگتریش، زاڵکردنی ئەخلاقی کۆمەڵایەتییە. لەسیاسەتی ئەخلاقیدا تاوەکو دوایی بەسەبرو باوەڕی و بانگەشە بەرێوەچوونە لەسەر ئەورێبازەی دەستنیشانکراوە. بیانوونەگرتنە لەپێناو هەڵگەڕانەوەو خیانەتکردن. ئەخلاق، ساتبەسات گونجاوبوونە لەگەڵ ئەوجیهانەی هزرمان کەبەزانست شێلراوە. ژیانی بەردەوامە لەگەڵ زانستدا. لەدۆخێکی وەهادا کاتێك ئەخلاق و زانست و سیاسەت دەستبدەنە دەستی یەکتر، دەبینین بەگشتی بۆمرۆڤایەتی بەتایبەتیش گەلانی ناوچەکە کەپارچەیەکی جیانەکراوەیەتی، هیچ دۆزێکی کۆمەڵایەتی نییە کە لەخزمەتیاندا بێت تێیدا سەرنەکەوین و لەهەقیان دەرنەکەوین. وەك ویژدانی مێژووو کۆمەڵگا، لەهەمووکاتێك زیاتر ئەخلاقەکەمان فەرمانی بەرێوەبردنی سیاسەتێکی هوشیارانەو گۆڕانکاری و وەرچەرخانی پێشبینیکراومان پێدەدات.

بەکورتی، لەقۆناخی راگوزاری بەرەو شارستانییەتی دیموکراتییانەدا گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین سێ بژاری سەرەکی دیاریکراویان هەیە. یەکەمیان، بەردەوامبوونی ستاتۆ (سیستەمی بونیادنراو)ی ئێستایە. ئەو رژێمەی سوودی لەسیستەمی هاوسەنگی سەدەی بیستەم وەرگرت و درێژەی بەهەبوونی خۆیدا، گەیشتۆتە کۆتاییەکەی. ئەو رەوشە قەیراناوییەی لەئارادایە کەلەئەنجامی هەڵوەشاندنەوەی سۆسیالیزمی بونیانراودا خێرابوو، هەم رێگای لەپێش تاکجەمسەری کردەوە، هەم لەژێرهەژموونی ئەمریکا و لەمیانەی ئیمپراتۆریەتی گێژاو (کائیوس) هەوڵی بەلاوەنانی دەدرێت. سێیەمین هەڵمەتی مەزنی

جیهانگیری لەگەڵ ئەم قۆناخە راستهاتووە. زێدەیی نمایش (عرض)ی کاڵا کەلەرێگای شۆڕشی زانستی و تەکنۆلۆژی هەرەس ئاساگەورەبوو، دووچاری کۆسپی جەماوەری هەژارو نەداردەبێتەوە. تاوەکو جیهانگیری ئەم ناکۆکییە چارەسەرنەکات، بەئامانجی خۆی ناگات. پێکهاتەی ستاتۆگەرایی دەوڵەتی نەتەوەیی وەکو سەرەکیترین کۆسپ دەبینرێ. تێپەڕکردنی ئەم پێکهاتانە لەسەربنەمای تاکێتی تاك، لیبرالیزەبوون و دیموکراتیزەکردن و سەرلەنوێ بونیادنانەوەیان دەردەکەوێتەڕوو. ئەم پێشکەوتنە کەهەم کاریگەری ئەرێنی هەم نەرێنی لەسەرجەماوەر هەیە، پێویستە لەخێراکردنی هوشیاری دیموکراتییانە وجموجۆڵدا وەکو فاکتەرێکی بابەتی ببینرێ. هەربۆیە هەم هێزی باڵادەستی سیستەم، هەم زیادبوونی هوشیاربوونەوەو جموجۆڵی گەلان لەژێرەوە، تادەچێ ستاتۆ دەخەنە رەوشێك کەتوانای بەردەوامی نییە. ئەوستاتۆیەی هەوڵدەدات بێچارەیی بکات بەشێوازێکی ژیان، کاتێك فشاری دەکەوێتەسەر ماکیاژ دەگۆڕێ و جارجار هەوڵدەدات لەرێگای ئاژاوەگێڕی تەمەنی خۆی درێژبکات، تادەچێ لاتەریك و گۆشەگیردەبێ. لەبەرئەوەی وەکو جاران یارمەتی لەو سیستەمە بەدەستناکەوێ کەپشت بەئەمریکاو روسیا دەبەستێ, بۆیە سیستەمی دردۆنگ بوو هەروەکو بڵێی لەجێگای خۆی پەلەکوتکێ دەکات و کات دەکوژێ.

شیمانەی ئەوەش ناکرێ لەرێگای بەکارهێنانی دیماگۆژیەتی راستڕەوو چەپڕەوە ساختەکانی جارانیش ئەنجام بەدەستبێنێ. کۆنترۆڵکردنی دەوڵەت وکۆمەڵگا نەلەرێگای فاشیزم، نەتۆتالیتاریزم وەکوجاران پاڵپشتی لێناکرێت. پێبەپێ هەڵوشانەوەی ستاتۆگەرایی دەوڵەتی ـ نەتەوەیی کەرۆژلەدوای رۆژ زیاتر پشتگیری گەل لەدەستدەدات، هەروەها یەکبوونی چینی سەروو لەگەڵ پێکهاتەی نوێی باڵادەستی و لێگەڕینی سیستەمی دیموکراتییانە لەلایەن چینی ژێرەوەی جەماوەری گەل، ئەم بژارە سەپێنراوە لاتەریك و لەکاردەخات. ئەو قۆناخەی کەبەشێوەیەکی چڕو رۆژانەیی لەرۆژهەڵاتی ناوین لەئارادایە ئەگەرئەو کێشانەی رۆژانە قورستردەبن بەرەو چارەسەری تەواویش نەبات، دەتوانێ لەرەوشی رێگری و بەربەستبوونی دەربخات. بەتایبەتیش تەواوی دەوڵەتە عەرەبییەکان لەسەرووی هەموویانەوە میسر، پاکستان، تورکیا و ئێران لەنێوان ستاتۆخوازی و گۆڕانکاری سەریان لێشێواوەو وەستاون. سەبارەت بەقۆناخی داهاتوو بریاری یەکلاکەرەوەی خۆیان نەداوە. بەڵام ئەگەرێکی بەهێزە لەسەرەوە لەرێژ کاریگەری پرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوینی گەورەی ئەمریکا، لەژێرەوەش لەمیانەی قوڵبوونەوەی پرۆژەی کۆمەڵگایەکی دیموکرات و ژینگەپارێزو ئازادی رەگەزی گەلان دەکەونە ناوقۆناخی گۆڕانکاری و وەرچەرخانەوە.

بژاری دووەم، بژاری سیستەمی دیموکراتی تێکەڵ و سنووردارە, کەلایەنی کرداری بەرچاوو لەپێشە. سەردەمی ئەو سیستەمە بەسەرچووە کە لەرابردوو لەمیانەی ئیرادەی یەکلایەنەی ئیمپریالیزم ئاوادەکرا. ئەگەر ئەمریکا وەك هێزی بەهەژموونی نوێ بەهەمان شێوە لەمیانەی ئیرادەی یەکلایەنەی خۆیەوە سیستەم ئاوابکات و درێژەی پێبدات، ئەمە شیمانەیەکی دوورو ئاستەمە. لەبەرامبەر رژێمەکانی دەوڵەتی نەتەوەیی کەکۆمەڵەی نەتەوە جیاوازەکان لەقۆناخێکی نزیکدا ئاوایانکردووە, هەروەکو چۆن توانستی چارەسەرکردنی کێشەکانیان لەدەستداوە، ئەواهەم لەناوەوە هەم لەدەرەوە بوونەتە سەرچاوەی کێشەکان. هەڵوێستی سەربەخۆیی رەها, کەلەسەردەمی هاوسەنگی نێوان سیستەمەکاندا لەئارادابوو، تادەچێ زەحمەت و ئاستەم دەبێ.

چاخ پەیوەستبوونی بەرامبەر یەکدی دەردەخاتەپێش. سێیەمین هەڵمەتی مەزنی جیانگیری ئەم قۆناخەی خێراکردووە. قۆناخی نێودەوڵەتی جێگای خۆی بۆ قۆناخی نێوکۆمپانیاکان بەجێهێشتووە. دەوڵەتی ـ نەتەوەیی بۆ دەوڵەتی ـ کۆمپانیا دەگۆڕێت. سەرمایەی نەتەوەیی جێگای خۆی بۆسەرمایەی نێوکۆمپانیاکان بەجێدێڵێ. لەلایەکی دیکەوە کولتوورە خۆجێیەکان بزێویی و زیندووبوونێکی مەزن نیشاندەدەن. خۆجێیەتی بەهایەکە لەبەرزبوونەوەدایە. لەژێر سایەی ئەم فاکتەرانەدا دەتوانرێ قۆناخ وەك سەردەمی دەرکەوتنەپێشی جیهانگیری و خۆجێیەتی پێناسە بکرێت. ئەو سیستەمە سیاسییەی لەگەڵ ئەم دیاردەیە گونجاوە، نەفاشیزم و دیموکراسی بۆرژوازیی شێوەی گەشەسەندووی کۆنی نەتەوە، نەسیستەمی تۆتالیتاری

رزگاری نیشمانی و سۆسیالیزمی بونیادنراوی نەتەوە پاشکەوتووەکان، هیچ یەکێکیان نابێت، دەشێ ئەو دیموکراسییەتە تێکەڵەبێت. هەردوو سیستەم بەیەکەوە لەناواخنیدا بژین. رێککەوتنی دیموکراتییانەی نێوان گروپە خاوەن پێوانە نەتەوەیی و خۆجێیەکان گونجاوترین رێچکەیە. بەڕێوبەرایەتییەکانی دەوڵەت و ناوخۆی تاکحزبی راستڕەوو چەپڕەوی کۆن جێگای خۆیان بۆ بەڕێوەبەرایەتییە دیموکراتی و فرەلایەنەکان بەجێدێڵن. بەم چەشنە هەرگروپێك توانستی نوێنەرایەتی بەمرەنگەی هەبێت لەنزیکەوە دەتوانێ لەگەڵ سیستەمی جیهانگیری بکەوێتە پەیوەندییەوە، تەوژمەکەی زیاتردەبێت، زێدەکالاکان هەڵدەلووشرێ. ئەم قۆناخەی لەسەرتاپای جیهان لەئارادایە بۆ وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوینیش تادەچێ وەکو پێویستییەك زیاتر پێشدەکەوێت. پێویستی و ناچاری بەزاندن و تێپەڕکردنی کۆنترین پێکهاتەو ستاتۆگەراییەکان، ئەم بژارە دەکاتە هەنووکەیی. پرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوینی گەورەی ئەمریکا سەرچاوەی خۆی لەم پێداویستییە گرنگەوە دەگرێت. هەرچی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوینە لەبەرئەوەی لەئاستی هوشیاری رێکخستەبووندا نین و ناتوانن دیموکراسییەتی خۆیان پێشبخەن، دۆخی پارچەپارچەیی ئیرادەکەیان، رەوشی تازە هوشیاربوونەوەو کەوتنە جوڵەیان یەك لایەنە پێکهێنانی بژارێکی دیموکراتییانەیان زەحمەتتر دەکات. وەك ئۆتۆپیایەك بۆئاییندەی بەجێدێڵن. سەرباری ئەمەش بۆ رێککەوتنێکی بەپرەنسیپانە بەشێوەیەکی تایبەت و لێهاتووانە پێشخستنی دیموکراسی ناوخۆیان دەکاتە پێویستییەکی ژیانیی کەناتوانرێ دوابخرێ. تایبەتمەندییەکانی ئازادی و خوڵقکاری قۆناخی قەیران گرنگی چاخی راگوزارە زیاددەکات و دەرفەتی ئەوەدەدات لەدیموکراسییەتی تێکەڵەدا گەلان ببنە پێشەنگ.

سێیەمین بژارمان وەك ئۆتۆپیایەکی زیاتر سەبارەت بەئاییندە، کومەڵگای دیموکرات و ئازادیخوازی رەگەزی و ژینگەپارێزی گەلانە کەوابەستەی دەوڵەت نییەو گرنگی سەرەکی بەئەخلاق دەدات. ***قورسبوونی لایەنی ئۆتۆپیایی بەوواتایە نایێت لەرۆژگاری ئەمرۆماندا لەئارادا نابێت.*** بەپێچەوانەوە لەمیانەی هەنگاوی ماقووڵانەوە بەڕێوەبردنی ئەم دۆزە رەسەنە هەمووکاتێك و لەهەر شوێنێکدا ئەرکێکی هەنووکەیی و رۆژانەییە. لەهەندێ قۆناخ و شوێندا لەئاستێکی نزم یان بەرز لەئارادا دەبێت, یاخود بەڕێوەدەبرێت. لەمیانەی گەشەپێدانی دیموکراسی ناوخۆی گەلان و کۆمەڵە ئازادە جیاوازەکان و بەدیهێنانی ئازادی رەگەزی کۆمەڵایەتی و جێبەجێکردنی پێداویستییەکانی کۆمەڵگای ژینگەپارێزی و فێربوونیان بۆ ژیان، رۆژلەدوای رۆژ ئێمە زیاتر لەم کۆمەڵگایەو دیموکراسییەکەی نزیك دەکاتەوە. ئەو کۆمەڵانەی گەلان کەبەبێ پشتبەستن بەدەوڵەت ناتوانن خۆیان بەڕێوەببەن، هەرگیز ناتوانن ئەو ئازادی و یەکسانییە بەدەستبێنن کەئاواتخوازی بوون. ئەو دیموکراسی و سۆسیالیزمەی لەدەوڵەت چاوەڕوان دەکرێ لەراستیدا نکوڵیکردنی دیموکراتی و سۆسیالیزمە. ئەم پەیڕەوەی سەدان جار لەمێژوو تاقیکراوەتەوە بەردەوام رێگای لەپێش بەهێزبوونی هێزە خەڵەتێنەرو ستەمکارەکان کردۆتەوە. لەو دیموکراسییانەی گرێدراوی دەوڵەت نین کۆمەڵەکانی گەل خۆیان پاراستنی خۆیان ئەنجامدەدەن. میلیسەکانی پاراستنی گەل لەهەر شوێنێکی پێویست بێت ـ لەگوند، شار، شاخ، چۆڵەوانی ـ لەسەرووی هەمووانەوە دەبێ بزانن دیموکراسی گەل و تەواوی بەهاکانی دیکە لەبەرامبەر پەلاماردەرو ستەمکاری و تالانکارییەکان بپارێزن.

لەبواری ئابووریشدا دەتوانرێ لەمیانەی کۆمۆنەو کۆمەڵکاری و گروپەکانی دیکەی خەبات ئابوورییەك پێشبخرێت, کەپشت بەکالاکردن نەبەستێ، لەگەڵ تەندروستی گەل گونجاوبێ و زیان بەژینگە نەگەیەنێ. بێکاری کەتایبەتمەندێتییەکی بونیادگەرایی سیستەمەکانی چەوسانەوەیە, لەکۆمەڵگای دیموکراتی و ژینگەپارێزی گەلدا نابێتە کێشە. ئەم کۆمەڵگایە کەلەجیاتی یاسا لەبنچینەدا ئەخلاق رۆڵی تێدادەبێنێ، لەمیانەی پەروەردەیەکی خوڵقکارانە ئەشقی ژیان بەکاریگەرە، لەناوخۆیدا شەڕناناسێ و پەیوەندی برایەتی و دۆستانە تێیدا زاڵە، راسترین رێگایە بۆ پەرینەوە بەرەو سۆسیالیزمی پڕلەیەکسانی. کۆمەڵگای کۆمۆنەو سیستەمەکانی ئەتنیکی کەلەیەکسانی نزیکن و بۆ ماوەیەکی درێژخایەن گەلانی رۆژهەڵاتی

ناوین لەناویدا ژیاون ئەگەر لەگەڵ توانکارییە زانستی و تەکنۆلۆژییەکانی رۆژگاری ئەمرۆماندا بکرێت بەیەك، ئەوا ژیانکردنی کۆمەڵگایەکی ژینگەپارێزی و ئازادیخوازی رەگەزی و دیموکراسی پێشکەوتوو وەك رەسەنترین نرخ و بەها واتاداردەبێت.

## بةشي ضوارةم

### دياردةو كيَشةى كورد لةقةيرانى رِؤذهةلاَتى ناويندا

### دیاردەی کێشەی کورد لەقەیرانی رۆژهەڵاتی ناویندا

**دەروازە :**

لەهەموو کاتێك زیاتر هەڵوێستێکی واقیعی سەبارەت بەدیاردەی کورد بایەخدار بووە. ئەو گێژاوەیەی ئێراق سەرچاوەی خۆی لەکێشەی کوردەوە وەردەگرێت. نازانرێ وەك بابەت و رۆژەڤی سەرەکی جیهان چۆن تێپەڕدەکرێت. هێزی چارەسەری شارستانییەتی رۆژئاوا تێرناکات و ناتەواو ماوە. جارێکی دیکە دەخوازرێ لەرێگای پرۆژە گەورەو تایبەتەکانی دوای شەڕە جیهانییەکان دەرەتانێك بدۆزنەوە. گرژییەکی مەزن لەناوچەکەماندا لەئارادایە. هیچ یەکێك لەرژێمە بونیادنراوەکان لەخۆیان دڵنیا نین. دیارنییە سبەینێ (داهاتوو) چی لەگەڵ خۆیدا دێنێ. لەلایەکی دیکەشەوە بەپێچەوانەی بانگەشەکان زیادبوونی ئەو دیاردەیە جێگای باسە کەبەتیرۆر ناوزەد دەکرێت. ئەوەش رووننەکراوەتەوە کەتیرۆری راستەقینە چییە. لەکەشی تەمومژاوی گێژاوەدا گۆڕانکارییە بێخێرەکان تەراتێن دەکەن. سەرباری هەموو شتێك ئومێد بەبەرەبەیانی ئازادی دەکرێت.

کەوتووینەتە قۆناخێك ئیتر ناتوانرێ وەکو جاران کورد بەڕێوەببردرێت. ئەگەر کوردان خۆشیان خوازیاربن ئیتر مەحاڵە بەردەوامکردنی تەمبەڵی ژیانە کۆن و نەفرەت لێکراوەکەیان لەگەڵ سەردەم بگونجێنن. ئەو کاریگەرییانەی بەشێوەیەکی رۆژانە لەناوەوەو دەرەوە دێن هەڵوەشانەوەی دیاردەی کورد خێراتردەکات. ناوەرۆك و خێرایی هێزە دەستێوەردەرە کردارییەکان ئاراستەو چۆنییەتی چارەسەری دەستنیشاندەکات. هەروەکو بڵێی لەسەرتاسەری رۆژهەڵاتی ناویندا کوردەکان ئەو رۆڵە شلەژێنە دەبینن کەئیسرائیل لەناو عەرەبەکاندا دەیبینێ. سەپاندن و چەسپاندنی دەوڵەتی فیدراڵی کورد لەئێراق مۆدێلی ناوەندیگەرایی دەوڵەتی ـــ نەتەوەیی ناوچەکە بەلاوە دەنێت. لەدەرەوەی ئیرادەی خۆیان، دەشێ مەیلێکی فیدراسیۆنبوون ئامادەبکەن کەلەگەڵ مێژووی رۆژهەڵاتی ناوین گونجاو بێت. ئەم قۆناخە لەسەربنەمای ململانێ و پێکدادانی دوو میللیگەرایی یاخود لەرێگای رێککەوتنی دیموکراتییانە بەرەو چارەسەری دەچێت، وەکو دوو پرسیاری گەرم جێگای خۆیان لەرۆژەڤدا گرتووە.

وڵاتـه یـەكگرتووەكانی ئـەمریكا كەلـەدوای 1990 وەك هێزێكـی تاكجەمـسەری ناوبـانگی دەركـرد، لەرۆژهـەڵاتی ناویـنـدا كەوتۆتـە نـاو ئـەزموون (تاقیكردنـەوە)ی هەرەگـەورەی خـۆی. بەشـێوەیەكی رۆژانـە لێپرسـینەوە سـەبارەت بـە بـەپرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوینی گەورە دەكرێت. شوێنگەی كوردان لەپرۆژەكـەدا گـرنگترین بابەتـە. دەشێ پێبـەپێ پەیوەنـدی كورد لەگـەڵ ئەمریكاو ئیسرائیل بكەوێتە رەوشێكی ستراتیژییەوە. دەبێ كاریگەرییەكانی ئـەم رەوشـە لەسـەر ناوچـەكە بـاش لێكبدرێتـەوە. ئەمە هێژای گفتوگۆكردنە ئایا قۆناخێكی پر لەخیانەت بۆ كوردان دەسـتپێدەكات یـاخود لەناوچـەكەدا دەبـن بەئەسـتێرەیەكی هەڵكشاو. بۆ یەكـەمین جارە پەیوەندییـەكانی كـوردان لـەناوخۆیان و لەگـەڵ قـەوم و دەوڵەتـە دراوسـێكان گەیـشتۆتە دۆخێك لەقووڵاییەوە پەیوەندی بەستراتیژییەتی ناوچەكەوە هەیە. پەیوەندییەكانی كورد ــ عـەرەب، كـورد ــ ئێـران و كـورد ــ تـورك كەوتۆتە قۆناخێك پێویستە زیاتر مێشكی خۆمانی پێوە ماندوو بكەین.

لەلایەكی دیكەوە ئایا پارت و بزووتنەوەكانی كوردان كەبەرامبـەر بەئافرانـدنی هـزرو چـالاكی و سـەرلەنوێ ئاواكردنـەوەی دیاردەی كورد بەرپرسیارن بۆ وەڵامدانەوەی قۆناخ توانستی پێویست لەخۆیان شك دەبەن ؛ دەشێ هەڵوێستەكانی میللیگـەرایی سەرەتایی، سۆسیالیزمی بونیادنراو و لیبراڵییەكان وەڵامی ئەمڕۆ بدەنەوە ؛ چۆن دەتوانرێ نوێبوونەوەی ئایـدیۆلۆژی و هێـزی زهنییـەت بەدەسـتبهێنرێ، ئەمانـەش پرسیاری گـرنگن. ئایـا رێبـەرەكانی باشـوور (كوردسـتانی ئێـراق) كاتێـك ئـەو هەنگاوانـە دەهاوێژن كەتەواوی كوردان، تەنانەت گەلانی ناوچەكەو دەوڵەتـەكانی پەیوەندیـدار دەكات دەتـوانن بـەگوێرەی بەرپرسـیارێتی پێویست رەفتاربكەن ؟ ئایـا دەتـوانن كارەكتـەرە (كەسـایەتییە) بـاوو بەرژەوەندیپەرسـتە تەسكەكەیان و بـەكاربردنی كەسـێتی خۆیـان تێپـەڕ بكـەن؟ بۆئـەوەی رێگـا لـەپێش كارەسـاتی دیكـە نەكەنـەوە پێویـستە كامـە تـەگبیر پێـشبخرێ، چـۆن و كـێ ئەنجامیـدەدات؟ بێگومـان ئـەم پرسـیارانەش گرنگـی و بایـەخی خۆیـان پاراسـتووە، سـەرلەنوێ كێـشەكان و رێگەچـارەی لەپارچەكانی كوردستان دەبێتە رۆژەڤ و پێویستی بەپێشخستنی ئـەم رێگەچارانە هەیـە كەشـیاوی پراكتیزەكـردنن. بـۆ ئـەوەی ئێش و ئازاری نابەجێ زیاد نەبێت، گرنگی تێكۆشانی جـەماوەری دیموكراتییانـە بایەخـداردەبێ. لەمیانـەی گفتـارێكی سیاسـی نوێ و بەبێ هەرەشـەكردنە سـەر سـنووورە سیاسییەكان، ئەگـەری رێگەچارە متمانـە بەخـشەكان رۆژبـەدوای رۆژ گرنگییەكـەی زیاتر دەبێت. لەهەر پارچەیەكی كوردستان بەشێوەیەك لێگەڕینەكانی چارەسەری لەرۆژەڤدایە ناتوانرێ دوابخرێت.

ئەو گۆڕانكارییانەی هێزی پێشەنگی ئەم سی ساڵەی دوایی "PKK" بەخۆیەوە بینی، تائێستاش گرنگـی خـۆی پاراسـتووە. ئەو كێشانەی بزووتنەوە چەپڕەوەكانی جیهان لەساڵانی 1968 و دوای 1990 دووچاری هاتن، رەنگدانـەوەی لەسـەر"PKK" ش هـەبوو. رێبـازی پـارت كەئاوێتـەبوونێكی سۆسـیالیزمی بونیـادنراو و رزگـاری نیـشتمانی بـوو، لـەئاكامی فـشارە قورسـەكانی دەرەوەو بەو ئەندازەیەش كەموكورتییەكانی ناوەوە، چەندەی هەوڵدرا نەیتوانی توانستی راستەقینەی خۆی بخاتەگـەڕ و خـۆی رێكبخات. لەئەنجامی پراكتیكێكی نیو گەریلایی ـ ـ نیو سەرهەڵدان رێگای لەپێش زیانی زۆر بێواتاكردەوە. بەپێی تێپەڕبوونی كـات پراكتیكـی گروپـە چـەتەو وێـڵ و یاخییـەكان ئـەو بەهایانـەیان لـەناودەبرد كەبـەرەنجێكی مـەزن ئـاواكرابوون، ئەمانـە بەكرداری پاكتاوكارییان دەسەپاند. سەرباری تێكڕای هـەوڵ و كۆشـشەكان لـەدوای 1995 "PKK" لـەناوەڕۆكی راسـتەقینەی خۆی دابڕابوو. ئەزموونەكانی كادەك و كۆنگرەی گـەل شانبەشانی گۆڕانكارییـە تـەكتیكی و سـتراتیژیی و تیۆرییـەكان بـەواتای سەرلەنوێ ئاواكردنەوە دەهات. پێكهاتەی كادیرانی كۆن نـەیانتوانی ئـەم بـارە هـەڵگرن. لەمیانـەی پارچـەبوونێكی كردارییـەوە چۆنییەتی بێكاری و ئـاوارەیی خۆیـان نیـشاندا. لەچوارچێوەی خاوەنـداریكردن لەمیراسـی ئـەرێنی "PKK" وەك هـەنگاوێك بەرامبەر پاكتاوكاری راستڕەوی و چەپڕەوی بیر لەسـەرلەنوێ ئاواكردنـەوەی "PKK" كرایەوە. لەكاتێكدا لەهـەموو بوارێكدا كوردسـتان هـەنگاو بـۆ قۆنـاخێكی نـوێ دەهاوێـژێ، پێویـستی بەئـەنالیزێكی گـشتی ئـەم گۆڕانكاریانـەو پێشخـستنی رەخنـە ــ رەخنەدان و سەرلەنوێ دەستنیشانكردنی ئەركەكان هەیە.

أ ـ هەندێ ڕێبازی جیاکاری لەکۆمەڵگای کوردستاندا

1.چوارچێوەیەکی کورت سەبارەت مێژوو و بابەتەکانی کوردو کوردستان: پێناسەکردنی کوردستان وەك وڵاتێك و کوردان و گروپە کەمایەتییەکان وەك کۆمەڵگا سانایی نییە. بابەتەکانی وڵات لەجوگرافیای ڕۆژهەڵاتی ناویندا پێناسەی جیاواز لەخۆوە دەگرن. ئەگەر لەچاخەکانی ناوین دەستپێبکەین دەبینین پێناسەکانی وڵات لەسەربنەمای ئایینی لەپێشە؛ بەشێوەی وڵاتی موسڵمانان، وڵاتی کافران پۆلێن کراوە, لەگەڵ ئەوەی جیاوازی قەوم و خێل بوونی هەیە، بەڵام جیاکارییەکی یەکلابۆوەی سنوور بوونی نییە. کاتێك پرسیار بکرێ سنووری گروپە ئەتنی و قەومەکان کوێیە، ئەو وەڵامانەی دەدرێتەوە مسۆگەر نییە. بەشێوەیەکی گشتی شوێنی جێنشینی کۆمەڵەکانی قەوم و خێل دیاردەکرێت. لەگەڵ پێکهاتەیەکی سیاسی دیاریکراودا ناگونجێن. پێکهاتە سیاسییەکان زیاتر لەسەر بنەمای شارن. جوگرافیاکەشی ناوچەی چالاکییەکانی شارە. دەشێ وەرزەکانی هاوین و زستان سنووری ناوچەکانی بڵاوبوونەوەی خێڵ بگۆڕن. هەرچی سنووری زەوییەکانی خانەدانە بەهێزەکانە دوورە لەوەی واتایەکی سیاسی پێبدرێت. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی سنوورەکانی عەرەب، تورك، کورد، فارس و قەومەکانی ئاستی ژێرتر لەمیانەی زمان و کولتوورەکەیان هێڵە پانەکەی دەستنیشاندەکرێت.

وشەی "کور" لەژێر وشەی کوردستاندا شاراوەیە و ریشەکەی بۆ سۆمەرییەکان دەگەڕێتەوە. بەزمانی سۆمەری کور واتە شاخ. پاشگری دی گوزارشت لەئینتیما دەکات. بەمجۆرە وشەی "کوردی" واتای شاخییەکان، گەلی شاخی دەبەخشێت. دەتوانین ئەمەش بۆ دواوە، بۆ ساڵانی 3000 ی پ.ز بگەڕێنینەوە. لەم دۆخەدا دەبینین هەندێ ناولێنانی دیکەش لەئارادا بووە. لەساڵانی 1000ی پێش زایین (لۆییەکانی) دراوسێکانی ڕۆژئاوایان کەخاوەن کیانێکی بەهێز بوون وشەی "گوندوانا"یان سەبارەت بەکوردستان بەکاردەهێنا کەبەواتای "مەملەکەتی گوندەکان" دێت. گوند : واتە لادێ تائێستاش لەزمانی کوردیدا بەکاردەهێنرێ. لەقۆناخی حوکمڕانی ئاشوورییەکانیشدا وشەی نایری بەکاردەهێنرێ کەبەواتای خەڵکی وڵاتی "نەهر" ڕووبارەکان دێت. تەنانەت هەروەکو دەزانرێ فیدراسیۆنی نایری لەنێوان دیجلە ــ زاب دامەزراوە. هەروەها دەبینین بەشێکی بەرفراوانی بەهۆی بوونی کانزاکان (مەعدەن) بەمەدائین : ماد : وڵاتی مەعدەنەکان بەناوکراوە. ئەم ناوانە لەقۆناخی ساڵانی نێوان 1300 ــ 500 ی پێش زاییندا کەسەردەمی حوکمڕانی ئاشوورییەکانە بەکارهێنراوە. لەڕێگای شیکارێکی هاوشێوە دەتوانرێ بگووترێ وشەی ئورارتوو ریشەکەی بۆ سۆمەرییەکان دەگەڕێتەوە. ئور بەواتای لوتکە (تەپگرد)ی بەرز دێت. ئورارتوو بەواتای مەملەکەتی زەوییە بەرزاییەکان دێت. لەبەرئەوەی سۆمەرییەکان لەمیزۆپۆتامیای خواروو ژیاون، بەرامبەر هەوارە بەرزەکانی سەرووی خۆیان، بەردەوام ئەو زاراوانەیان بەکارهێناوە کەگوزارشت لەبەرزایی دەکەن. شیمانەی هەرە لەپێشە کەوشەی "هۆری" یش لەهەمان سەرچاوەوە دێت. بەواتای گەلی خاوەن وڵاتی بەرزایی دێت. واتە دیسان بەواتای گەلی شاخی دێت. "کۆماگەنەس"ناولێنانێکە ریشەکەی بۆ هێلینیەکان دەگەڕێتەوە. لەنزیکەی ساڵانی 250 ی پێش زایین تاوەکو 100ی زایینی پادشایەتی گۆماگەنا لەئارادا بووەو ناوەندەکەشی لەشاری ئادیەمانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بووە. "کۆم" ئەو ناوەیە کەبە کۆمەڵە ڕەوەندەکان و شوێنی نیشتەجێبوونیان دەگووترا، ئەمڕۆش بەواتای زۆم (ڕەشماڵ) دێت. هەرچی " گەنە"یە بەواتای بنەچە، هۆزو خێڵ دێت.

لەچەرخەکانی ناوینیشدا لەسەردەمی حوکمڕانی سوڵتانە عەرەبەکان ــ بلد الأكراد ــ ناوچەی کوردەکان وەك ناوێك بەکارهاتووە. هەرچی سوڵتانە سەلجۆقییەکانن کەزمانی فارسییان بەکاردەهێنا، یەکەم خاوەن دەوڵەت بوون کەبەفەرمی وشەی کوردستانیان بەکارهێناو بەواتای وڵاتی کوردان دێت. دواتر دەبینین سوڵتانە عوسمانییەکان، بەتایبەتیش لەلایەن سوڵتان یاووز سەلیم لەمیانەی بەکارهێنانی دەستەواژەکانی حوکمەت و ئەیالەتەکانی کوردستان بەشێوەیەکی چڕ وشەی کوردستان بەکاردێنن. لەیاسانامەی 1848 و 1867 زەوی و زاردا بەشێوەیەکی فەرمی ئەیالەتەکانی کوردستان ئاواکراوە. لەقۆناخەکانی

مەشروتیەتدا نوێنەرایەتی کوردستان لەئەنجوومەن دادەنرێ. لەسالآنی 1920 کان چەندین رێنمایی، فەرمان و بۆچوونی راگەیاندووە کەوشەکانی کوردو کوردستانی تێدا بەکارهێنراوە. هەرچی نکوڵیکردنی فەرمییە, زیاتر دوای سەرکوتکردنەوەی یاخیبوونەکان شانبەشانی سیاسەتی تواندنەوە پێشخراوە. کوردو کوردستان کەبەواتای وڵاتی کوردان دێت، خاوەن تایبەتمەندێتی و جیاکارییەکی وەهایە کەکۆنترین گەل و وڵاتی مێژوومان دێنێتەوە یاد. بەڵام لەرۆژگاری ئەمرۆماندا لەواتای سیاسی زیاتر بەواتای کولتوورێکی ـ جوگرافی بەکاردەهێنرێت. لەگەڵ بڕیاری دەوڵەتی فیدراڵی کوردی لەباشوور (کوردستانی ئێراق)، ئیتر بەو واتایە دێت کەوشەی کوردستان بەواتا سیاسییەکەی دەردەکەوێتە بەروو. گرنگتریش ئەوەیە لەمیانەی ئەو گۆانکاری و پێشکەوتنە سیاسییانەی "PKK" رێگای لەپێشکردەوە ئەمە لەولاوە بمێنێت کوردستان وەك وشە، بەڵکو وەك بابەتێکی سیاسی ـ کۆمەڵایەتی لەگۆڕەپانی نێودەوڵەتی و ناوچەکە بەشێوەیەکی بەرفراوان بناسرێت.

بەشێوەیەکی ستراتیژی ناوچەیەکی 450 هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشە دەگرێتەوە کەکەوتۆتە نێوان فارس، ئازەری، عەرەب و تورکەکانی ئەنادۆڵ. شاخەبەرزو دارستان و رووبارە بەپیتەکانی جوگرافیای رۆژهەڵاتی ناوین پێکدێنێ. زەوییە سەوز داپۆشراوەکەی بۆ ئاژەڵداری لەبارە. خاکەکەی بۆ بەرهەمهێنانی هەمووجۆرە میوە، سەوزەو رووەکێك گونجاوە. ناوەندی سەرەکی گەورەترین شۆڕشی مێژوو، شۆڕشی کشتوکاڵی نیئۆلیتیکە (11000ی پ.ز تاوەکو 4000 ی پ.ز). سەرچاوەی شارستانییەتەکان و ناوچەی پەرینەوەیانە. لەکاتێکدا ئەم شوێنگە ستراتیژییە دەرفەت بەکوردان دەدات وەك قەوم خۆیان بپارێزن، رێگا لەپێش ئەوەدەکاتەوە لەگۆڕەپانی شارستانییەتدا بەدواکەوتوویی بمێنێتەوە ـ بەهۆی تێپەڕبوون و داگیرکارییە بەردەوامەکان.

پێناسەکردنی کۆمەڵگای کورد سانایيترە. شاخ و کشتوکاڵ و ئاژەڵداری هاوواتای گەلی کوردە. لەکاتێکدا شاریبوون (بوون بەخەڵکی شار) بابەتێکی دوورە، لەوانەیە گوندێتی (لادێتی)یەکەمین دیاردەی کۆمەڵایەتی بێت لەمێژوو کەباپیرەی کوردان ئەنجامیانداوە. کوردان چەندە گوندی و رەوەند بن بەو ئەندازەیە دوور بەشاری (شارستانی) بوونن. هەروەکو کۆماگەنە زۆر باش روونیکردۆتەوە، رەوەندی و نیوگوندێتی بەهەزاران ساڵ سیستەمی جوڵانەوەو نیشتەجێبوونی کوردان بووە. هەرچی شارەکانە زیاتر داگیرکەران ئاوایانکردووە یان پڕیان کردۆتەوە. هەڵبەتە ئەمە بەو مانایە نایەت کەکوردان شاریان ئاوا نەکردووەو نەبوونەتە خاوەنی شارستانی. هەروەکو دەزانرێ خاوەنی چەندین شارستانییەتی شار بوونە، لەسەرووی هەمووشیانەوە دەوڵەتەکانی ئورارتوو، ماد و میتانی. لەچاخەکانی ناوینیشدا بەشێوەیەکی بەربڵاو حکومەتی شارو ئەیالەتەکانیان ئاواکردووە. بەڵام لەبەرئەوەی دەوڵەت و حکومەتەکانی دایانمەزراندووە درێژخایەن نەبوون، شارەکان زیاتر بڕیارگەو کۆمەڵگاکانی نزیك بەداگیرکەرانی لەخۆوەگرتووە. لەکاتێکدا لەچاخە سەرەتاییەکاندا مۆرکی خۆی لەشارو شاکارە هونەرییەکانی سۆمەر، ئاشوور، ئارامی, پارس و هێلینییەکان داوە، ئەوا لەچاخەکانی ناوینیشدا شوێنپەنجەی خۆی لەسەر کولتوورو زمانی عەرەبی و فارسی بەجێهێشتووە. چەندین رۆشنبیر، فەرمانڕەواو کاربەدەستانی دەوڵەت لەناو ئەم زمان و کولتوورە دراوسێیانەدا خاوەن رۆڵ بوون. سەربارى ئەوەی زمانی کوردی ریشەیەکی کۆن و بناخەیەکی کولتووری هەیە، بەشێوەیەکی سنووردار بوونی بەزمانی نووسین و نەبوونی بەزمانی دەوڵەت، رێگر بووە لەبەجێهێشتنی بەڵگەو ئەنجامدانی پێشکەوتن. سەرباری ئەمەش کولتووری کوردان توانیویەتی لەرێگا ناراستەوخۆکانەوە، لەمیانەی هەبوونی خێڵایەتی خۆی و پاشماوە مێژووییەکان تارۆژگاری ئەمرۆمان بەردەوامی بەهەبوونی خۆی بدات.

ئەگەرێکی زۆر بەهێزە کەزمان و کولتووری کوردان وەك یەکەمین دەستپێکەری شۆڕشی نیئۆلیتیکی بنارەکانی زاگرۆس ـ تۆڕۆس ـ چەندین شوێنەوارناس لەوەدا هاو فیکرن ـ بەپێی تێپەڕبوونی کات بناخەی هەموو کولتوورو زمانەکانی هیندۆ ئەوروپی پێکهێناوە. مەزەندە دەکرێ لەسالآنی 9000 ی پێش زایین بەدواوە، لەشێوەیەکی جەستەیی زیاتر لەبواری

کولتوورییەوە بەرەو جوگرافیای هیند ـ ئەورووپا پەلیهاوێشتووەو بلاوبۆتەوە. دەتوانین پێکهاتنی خۆشی بۆ ساڵانی 15000 ــ 10000ی پێش زایین بگەڕێنینەوە ــ لەگەڵ دەرکەوتن لەقۆناخی سەهۆڵبەندی چوارەم (20000 ــ 15000ی پ.ز) شیمانەیەکی لەپێشە کەوەك زمان و کولتووریی خۆجێیی (نۆتۆکتون)ی ناوچەکە شێوەیان گرتووە. لەساڵانی 6000ی پێش زایین زۆر بەباشی خێڵە (ئەتنیکە) کوردەکان جیادەکرێنەوە. (لەساڵانی 3000 ـ 2000ی پ. ز) دەبینین بۆ یەکەمجار لەژێر ناوی هۆرییەکان دێنە سەر شانۆی مێژوو. سۆمەرییەکان بەهۆی دارستان و کانزاکان، هۆزە هۆرییەکانیش بەهۆی دەوڵەمەندی شارستانی بەهەزاران ساڵ بەرامبەر یەکدی لەناو تێکۆشانێکی هێرش ــ بەرگریکردندا بوون. ئەم دیالەکتیکە مێژووییە بەرامبەر بابلی، ئاشووری، هیتیت، ئیسکیتەکان، پارس و هێلینییەکان بەردەوام بووە. لەوانەیە کوردان لەسەرووی ئەو قەوم و هۆزانەوە بێن کەبەشێوەیەکی بەرامبەر لەناو رەوتە رەوەند و جێنشینەکاندا ژیاون. رۆڵی کولتووری میدی و هۆری یەکلاکەرەوەیە لەگواستنەوەی شارستانییەتی سۆمەر بۆ هیتیت، لوویی، ئیۆن و پارسەکان. جێگرتنی ئەم گەلانە لەگرووپی زمان و کولتووری هیندۆ ـ ئەورووپی لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم راستینەیەیە.

لەمێژووی "هێرۆدۆت"دا بەئاشکرایی دەبینرێ کەزمان و کولتووری کاریگەر لەسەر هێلینییەکان ریشەکەی بۆ میدییەکان دەگەڕێتەوە. تاوەکو ساڵانی 900 ـ 400 ی پ. ز هێلینییەکان لەژێر کاریگەری بەرفراوانی میدییەکاندا دەژین. لەم قۆناخەدا چەندین فاکتەری ماددی و مەعنەوی لەسەرچاوەکانی ئورارتوو ــ ماد ــ پارس وەرگرتووەو لەمیانەی سەنتێنری خۆیان دەوڵەمەندییان کردووە. مەزەندەدەکرێ باپیرەی کوردان هۆرییەکان لەقۆناخەکانی (2500 ــ 1500 پ.ز)، هەروەها میتانییەکانی بەرپشە هۆری (1500 ــ 1250 پ.ز)، نایریییەکان (1200 ــ 900 پ. ز)، ئورارتووییەکان (900 ــ 600 پ.ز)، میدییەکان (مادەکان) (700 ـ 550 پ.ز)، بەشێوەی پادشایەتی و فیدراسیۆنی خێڵە (عەشیرەت) کان ژیاون. کۆمەڵگای کورد لەم قۆناخەدا بەرەو پلەداری و دەوڵەت دەچێ. باوکسالارێتییەکی بەهێزیان پێشخستووە. لەبەرئەوەی لەسەردەمی کشتوکاڵی نیئۆلیتکدا ژن چالاکترە، قورسایی ژن لەکۆمەڵگای کوردەواریدا بەهێزە. شیمانەی لەپێش ئەوەیە، بۆماوەیەکی درێژ ئەم هێزەی خۆی بەکارهێناوەو بناخەکەشی شۆڕشی کشتوکاڵ بووە. فاکتەرە مێیینەکانی زمان، باوەڕی عەشتاری خوداوەندەژن بەڵگە سەلمێنەرەکانی ئەم راستییەن.

لەقۆناخی 700 ــ 550ی پێش زایین زەردەشتی وەك شۆڕشێکی هزری کوردان پێشکەوتنی بەخۆوە بینیوە. هزری زەردەشتایەتی کولتوورێکە پشت بەکشتوکاڵ دەبەستێ، لە ئاستی ئاژەڵدا پڕ لەخۆشەویستییە، بنەماکەی یەکسانی ژن ــ پیاوەو ئەخلاقی ئازاد وەك فەلسەفەیەك دەگرێتەدەست، لەرێگای پارسەکاندا بەرەو رۆژهەڵات، لەرێگای هێلینییەکانیشەوە بۆ شارستانییەتی رۆژئاوا کاریگەرییە بەهێزەکانی گوێزراوەتەوە. جێگای خۆی لەسەر هێڵی جیابوونەوەی رۆژهەڵات ــ رۆژئاوادا گرتووە، لەشێوەگرتنی شارستانییەتدا کاریگەرییەکەی لەسەر هەردووکیان بەلانی کەم هێندەی ئایینی مەسیحی و موسەوی رۆڵی سەرچاوەی بینیوە. لەبنەڕەتدا شارستانییەتی پارس شارستانییەتێك بوو مادەکان ئاوایانکردبوو، ئەو شارستانییەتەی پارس ــ ماد بوو کەبەیەکەوە لەگەڵ هۆزە پارسەکاندا درێژەیان پێدا. ئەم راستینەیە بەشێوەیەکی زۆر روون و ئاشکرا لەمێژووی هێرۆدۆتدا دەبینرێ. دووەمین گرووپی ئەتنیکی (خێڵەکی)یە کەلەسەرەتاوە تاکۆتایی بەشداری لەئیمپراتۆریەتدا دەکات. لەسەردەمی ساسانییەکانیشدا هەمان رەوش بەردەوام دەبێت. لەتەواوی شارستانییەتەکانی ئێراندا هەڵسەنگاندنی رۆڵی کوردان لەریزی دووەم هەڵوێستێکی واقیعییە.

باوو باپیری کوردان کەلەچاخە سەرەتاییەکاندا بەشێوەیەکی بەهێز لەناو باوکسالارێتیدا ژیاون، بەقووڵایی جیابوونەوەی چینایەتییان بەخۆیانەوە نەدیوە. بەرامبەر ئەوەی رەوشی پلەدارییان بەهێزبووە، بەڵام لاوازی جیابوونەوەی چینایەتی، سەرچاوەی خۆی لەتۆکمەیی رەوەندێتی هۆزە شاخاوییەکان وەردەگرێت, کۆمەڵەکانی خێڵ ــ تیرەکان کەلەنێو پەیوەندی

خزمایەتیدان لەناو خۆیاندا دەرفەت بەپێشکەوتنی کۆیلایەتی نادەن. هەروەکو دەزانرێ کۆیلایەتی، زیاتر بەرهەمی شارستانییەتی شارە، فۆلکلۆری کۆمەڵگای کوردەواری زیاتر فاکتەرەکانی لایەنی داستانی لەپێشە. لەبەرئەوەی داستانەکان باس لەقارەمانێتی دەکەن، مەزەندەی لەپێش ئەوەیە لەقۆناخی پلەداری مابێتەوە. دەتوانین سەرچاوەی ئاوازی داستانەکانی وەك مەم و زین، مەمی ئالان و دەروێشی عەبدی بۆسەردەمی مۆسیقای سۆمەرییەکان بگەڕێنینەوە. دیسان شیمانەدەکرێت داهێنانێکی هۆزە هۆرییەکانی سالانی $4000$ی پ.ز بێت کە لەرەوتی سۆمەرییان وەرگرتووە. سیستەمی مۆسیقاو یارییە کوردەوارییەکان کولتوورێکی بەهاداری هونەری و بەبەرەکەتی رۆژهەلاتی ناوینە. دەشێ بەڕادەی هەرەزێدە هەبوونی مێژوویی کوردان لەسیستەمەکانی مۆسیقاو یاریدا ببینرێ. دیسان دەتوانرێ هەمان تێبینی لەراوەستەی ژن، شێوازی جل پۆشینی و وردەکاری جوڵەکانیدا ببینرێت. بنەچەی رەسەنێتی کوردان سەرچاوەکەی بۆ چاخەکانی دێرین دەگەڕێتەوە. سروشتی سەختی شاخەکان، بەرخودان بەرامبەر داگیرکارییە هەمیشەیی و بێڕەحمەکان و رابردووی مێژووی درێژخایەن، رۆڵی سەرەکییان لەپێکهێنانی ئەم رەسەنایەتییەدا بینیوە.

دەرك بەوەدەکرێت کە لەتێپەڕبوون بۆ چاخی ناوین شوێنپەنجەی قۆناخی هێلینییەکان دیارە. پادشایەتییەکانی ئەبگار لەناوەندی شاری ئورفا $300$ پ.ز، کۆماگەنای ناوەندەکەی لەئادیامان و سامسۆن بوو لەگەڵ پادشایەتی پالیمێرا (تەدمور)ی سوریا تایبەتمەندێتی هاوشێوەیان لەخۆوە دەگرت، کاریگەرییەکی بەهێزی هێلینییەکانیان لەسەربوو. راستتر، نوێنەرایەتی نموونەی پڕشنگداری یەکەمین سەنتێزی رۆژهەلات ــ رۆژئاوا دەکەن لەمێژوودا. ئەم شارستانییەتانەی تاوەکو سەردەمی فەتحی رۆما بەردەوامبوو ــ هەرەدوایی رووخانی پالیمێرا لەسالی $269$ی زایینی بوو، نوێنەرایەتی قۆناخێکی گرنگی پێشکەوتنی ناوچەکە دەکەن. ئەو شوێنەوارە مێژووییانەی لەئورفا، نەمروودو پالیمێرا ماونەتەوە هی ئەم قۆناخەن. ئەو شارستانییەتانەن کە لەگەڵ کوردان لەنێو هاتووچۆییەکی فراواندان. لەم قۆناخەدا هەردوو زمانی ئارامی و هێلینی وەکو دوو رکابەری یەکتری ناویان دەرکرد بوو. بەرامبەر ئەم شارستانییەتانە کەزیاتر بەسەر رێگاکانی بازرگانی زالبوون، کوردان زیاتر لەرێگای کشتوکاڵ و رەوەندێتی دەوروبەرێك بۆخۆی پێکدێنێ. پاشماوەی ئەم سیستەمە کەتا رۆژگاری ئەمڕۆمان ماوەتەوە، ئێستاش درێژە بەهەبوونی خۆی دەدات. نامۆبوونی ناوەندەکانی شار و کوردایەتی رەوەندێتی و ناوەندەکانی گوند هەروەکو بلێی دوالیزمێکی دیالەکتیکی پێکدێنێ.

لەئیمپراتۆریەتی ساسانی کە لەسەرەتاکانی سێیەمین سەدەی زایینی دامەزرا فورسایی کوردان گۆڕانکاری بەسەردا نەهات. زەردەشتی پالپشتی سەرەکی ئایدیۆلۆژییە. مانی پێخەمبەر نوێبوونەوە ئەنجامدەدات کە لەسالانی $210$ ــ $276$ی زایینی ژیاوە. سەنتێزنێك لەسەرجەم ئایینەکانی قۆناخ پێکدێنێ، دەکرێتە تۆڕی هزری بنچینەیی ئیمپراتۆڕیەتەکانی رۆماو ساسانی و خوڵقاندنی ئاشتی و رێنیسانس بەئامانج دادەنێ. بەلام دووچاری تووڕەیی راهیب (مووغ)ە توندڕەوەکانی ئایینی زەردەشتی دێ و دەکوژرێ. سەرباری ئەمەش وەك رێبازێکی بەهێزی هزر شوێنپەنجەکانی تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆشمان ماوە. بلاوبوونەوەی ئایینی مەسیحیش رێکەوتی ئەم قۆناخەیە. بەتایبەتیش ئورفاو نوسەیبین (نیزیب) وەك بەهێزترین ناوەندی مەسیحێتی لەو قۆناخەدا کاریگەری لەسەر کوردانیش دەکات. مەسیحیەتییەکی رێژەیی بەخۆیەوە دەبینێ. هەبوونی زەردەشتیزم لەناو ساسانییەکان دەبێتە رێگر لەبەردەم پێشکەوتنی تەواوەتی مەسیحییەکان.

مەزەندەی ئەوە دەکرێت لەقۆناخی ساسانییەکان ($216$ ــ $652$ی زایینی) پێکهاتەی دەرەبەگایەتی لەناو کوردان دەرکەوتووە. مانیگەرایی جۆرێك لەئیسلامی پێشوەختە. خودی مانیش لەدایکبوونێکی پێشوەختی حەزرەتی محەمەدە. بەلام کاریگەری شەڕە وێرانکەرەکانی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی رۆماو ساسانی بەسالان بەردەوام بووە. پێچەوانەی قۆناخی هێلینی کۆمەلگا بەشێوەیەکی هێمنانە رووی پێشکەوتنی بەخۆوە نەدیوە. پێشبڕکێیەك لەنێوان مەسیحییەت و زەردەشتی

لـەئارادا بـووە. نەسـتوریگەرایی ئـەو رەوتـە رکابـەرە مەسـیحییەیە کـە لـەژێر کاریگـەری ساسـانییەکان دایـە. ئاشـووریەکان کەناسـنامەی مەسـیحییەتیان وەرگـرت و نـاوی سـوریانییان لـەخۆیان نـا لـەو قۆناخەشـدا زۆر بـزۆك بـوون. بەتایبـەتی ئـەو تێکۆشـانەیان کـردووە کەبـەهای ئەرشـیفێکی بایەخـداری هەیـە. لەپەلهاوێـشتن و بڵاوبوونـەوەی ئـایینی عیـسایی لەگریکـەکان (یۆنانـە کۆنـەکان) زیاترخـاوەن رۆڵ بـوون. چـەندین گـەورە قەشـەی مـەزنیان پێگەیانـدووە. مەزەنـدە دەکـرێ ئـەدەبیاتێکی بەرفراوانیان پێشخستبێت. لەئورفا، نوسەیبین و سێرت ئەکادیمیای پێشکەوتوویان ئـاواکردووە. لـەپێکهێنانی ناوەنـدی زانـستی گوندی شاپووری ساسانییەکانیشدا رۆڵیان دیاریکراوە. زمانی ئارامی وەکو زمانی هاوبەش بەردەوامی بەکاریگەری خۆی دەدات. لەکاتێکدا زمانی گریکی (یۆنانی) بۆ ناوچەی بێزەنتییەکان دەگوازرێتەوە، ئەوا زمانی ئارامی لەرۆژهەڵات بـووە بـەزمانی زاڵی بازرگانی و ئەدەبیات ـ ئایین.

شـیمانە دەکرێـت لـەم قۆناخـەدا (250 ــ 650ی زایـین) کوردەکـان نـەریتی دەرەبەگایـەتییان پێشخـستبێ و لـەم بـوارەدا بەوەرچـەرخانێکی کۆمەڵایـەتی تێپـەڕبووبن. پێـشکەوتنی فیـۆدالیزم، جیابوونـەوەکانی پێکهاتـەی ئـەتنیکییش نیـشاندەدات. چـەندەی دەچـێ پەیوەندییـە دەرەبەگایەتییـەکان لەکۆمــەڵگای کوردەواریـدا پێـشدەکەوێت. لـەم سـەردەمەی پێـشکەوتنی شارستانییەتی دەرەبەگایەتیدا شۆڕشـی ئیـسلام دەتەقێتـەوە. ئیـسلامییەت پێکهاتـەی ئایـدیۆلۆژی و شۆڕشـی هـزری کۆمـەڵگای دەرەبەگایەتییـە کـە لەسـەربنەمای بەشـاربوون پەیوەندییـەکانی کۆیلایـەتی وشـك و پەیوەندییـە ئەتنیکییـەکانی لەبـەردەم پێشکەوتن کۆسپبوون دووچاری وەرچـەرخان دەکات و سیـستەمێکی پێـشکەوتووتره. ئـەو پێـشکەوتنەی لەچـین و هینـدسـتان لەمیانەی پەرەسەندنی پلەبەپلە (تدریجی) بەدیدێت، لەئەوروپا لەرێگای شۆڕشـەوە ئەنجامـدەدرێت. ئیـسلامییەت دوا شۆڕشـی گەورەی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوینە. تاوەکو نزیکەی سەدەی دوانزدەهـەم لەپێشکەوتنی کۆمـەڵگای دەرەبەگایەتیـدا رۆڵـی پێکهاتەی ئایدیۆلۆژی و سیاسی بنەڕەتی دەبینێت.

ئـەو ئیـسلامییەتەی دوای رووخـانی ساسـانییەکان (650 زایـینی) لـەناو کـوردان پێـشکەوتنێکی خێـرای بەخۆیـەوە بـینی، ئەرستۆکراتییەتێکی دەرەبەگایەتی ئاواکردووە. هێزە دەوڵەتگەرایی و پلەدارییەکانی کوردان کـە لـەژێر عەرەبانـدنێکی بـەهێز وەرچەرخانیان بەخۆیانەوە بینی لـەم قۆناخـەدا بوونەتـە یـەکێك لەبـەهێزترین گروپـە سیاسـی و کۆمەڵایەتییـەکان. لـەرێگای خانـەدانی کـوردە ئەیوبییـەکان (1175 ــ 1250 ز) بـەهێزترین خانـەدانی سیاسـی رۆژهـەڵاتی ناوینیـان پێکهێنـاوە. لـەناو کوردانیـــشدا زۆر بەکاریگەربوونـــە. لەلایـــەکی دیکەشـــەوە ســـوڵتانە ســـەلجۆقییەکان کـــە لەســـاڵی 1055 ئیمپراتۆریـــەتیان لەعەباسـییەکان دەوروەرگـرت بەشـێوەیەکی تێکـەڵ لەگـەڵ کوردانـدا ژیـاون. هـەروەکو تائێـستا لەکـەرکوك لەئارادایـە ئـەم بەناویەکداچوونە لەپێکدادان زیاتر بەشێوەی هاوبەشێتی تێپەڕکراوە. دەوڵەتی دەرەبـەگی لەشـێوەی شـەدادی، بووەیهییـەکان و مەروانییەکان پێشکەوتنیان بەخۆیانەوە بینیوە کە بەتایبەت ریشەکەیان کورد بـووە. چـەندین میرنـشین و حکومـەتی دیکـەی کوردان ئاواکراون. نەوەکانی شەرەفخان درێژخایەنترین میرنشینیان ئاواکردووە کەناوەندەکەی بەتلیس بووە. تاوەکو سـەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی بەردەوام بووە. تایبەتمەندێتییەکانی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی رێگای لـەپێش وەرچـەرخانێکی گرنگـی هـزری کۆمـەڵگای کـوردەواری کـردەوە. جگـە لـە"زەردەشـتییەکان ــ ئێزیدییـەکان" پاشماوەی زەردەشـتی نـەماوەو سـڕاوەتەوە, شیمانەی ئەوە دەکرێت ئەم وەرچەرخانە لەپێشکەوتنی کوردە بەکرێگیراوەکان رۆڵی شۆڕشی چەواشە دەبینێ.

لەکاتێکدا زمانی عەرەبی لەشارەکان بەکاریگەر دەبوو، دواکەوتنێك لەزمان و کولتووری کوردی جێگای باس نییە، یەکـەمین کۆکەرەوەی داستانە نووسراوەکانی وەك ئەحمەدی خانی لەم قۆناخەدا دەرکەوتن. هەروەکو لەهـەموو کۆمەڵەیـەکی ئەتنیکیـدا دەبینرێ کولتووری بە موسڵمانێتی پەردەپۆشکراو لەناو کوردانیشدا تاڕادەیەك رەگـی داکوتـاوە. سـەرباری ئەمـەش لەباشـووری کوردستاندا بەردەوام پێکدادان لەگـەڵ هـۆزە عەرەبـە ــ بەتایبـەت لەگـەڵ شـەمەرەکان ــ پەلهاوێـژەکان لـەئارادابووە. داسـتانی

دەروێشی عەبدی داستانی ئەم شەڕانەیە. داستانێکە داکۆکی لەسەر ریشەی زەردەشتی دەکات و شوێنپەنجەی بەهێزی کولتووری کوردی لەخۆوە دەگرێت. شیمانە دەکرێ لەسەدەی هەژدەهەم روویدابێت. لەهەلومەرجی ئیسلامییەتدا زەردەشتی جۆرێك لەبەرخودانی کولتوورییە. بەرخودانێکی رەسەنە بەرامبەر بەبیانیکردن و نامۆکردنی کولتووری کوردەواری. دوای زەردەشتی عەلەویگەرایی کوردان کەلاوازەو پەردەیەکی ئیسلامی پشتیوانانی حەزرەتی ئیمام عەلییان لەخۆیان پێچاوە, بەهێزترین بەرخودانی کولتووری کوردانە؛ شیعەگەرایی ناو کوردانە. بەرامبەر ئەمەش ئەو ئیسلامییەتە سونیگەراییەی لەناو کوردەکانی باشوور بەتایبەتیش ئەوانەی نزیکی دەشت پێشکەوت بەشێوەی کارەکتەرێکی بەکرێگیراوی و کۆنەپەرستی بووە. ئەم نوێنەرە بەکاریگەرانەی زهنییەتی بازرگانە ـ دەرەبەگەکان کەنکولّی لەبنەچەی کولتووری خۆی دەکات، بەتایبەتیش لەشارەکانی ئورفا، ماردین، سێرت و دەوروبەرەکانی لەناو خیانەتێکی بێ هاووتادان. بەشێوەیەکی مەترسیدار بەکرێگیراوو بەرژەوەندیپەرستن. شکان وخراپبوون لەناو ئەو کوردانەی لەژێر کاریگەری ئێراندا بوون کەمتر بوو. لەمیانەی پێکهاتەی خۆجێیی خۆیان گەوهەری کولتووری نەتەوەیی دەپارێزن.

پەیوەندی نێوان دەوڵەت و هۆزە ئەتنیکییە کورد ـ تورکەکان کەپەیوەندییەکی گرنگی قۆناخ بوو لەوە زیاتر کە لەنێو پێکدادانەدا بێت، بەهۆی فاکتەری بێزەنتییەکان لەمیانەی هاوکاری و دۆستایەتی بەڕێوەچووە. مەسیحیبوونی ئەرمەنی و سوریانییەکانیش رۆڵێکی گرنگیان لەم هەڵوێستەدا بینیوە. شەڕی مەیدانی "مەلازگرت" ی 1071، لەگەوهەری خۆیدا شەڕێکە پشت بەرێککەوتنی کورد ــ تورك دەبەستێ. ئەگەر سولّتان ئەلپ ئەرسەلان کوردانی نەکردبووایە پاڵپشتی خۆی، مەحاڵ بوو ئەم سەرکەوتنە بەدەستبێنێ. خێڵە تورکمانەکانی لەم قۆناخەدا لەناو هۆزو کولتوورە بەهێزو جێگیرەکەی کوردان دەژیان بەتواندنەوەیەکی بەکاریگەردا تێپەڕبوون. ئەم قۆناخەی "پەیوەندی ــ رێککەوتن" تاوەکو کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم بەردەوام بوو، لەگەڵ قۆناخی دەستپێکردنی کۆماردا پێچەوانە کراوەتەوە.

کوردەکان کە بەشێوەیەکی سەرتاپاگیری لەژێر کاریگەری کولتووری دەرەبەگایەتی چاخی ناویندا بوون، بەو ئەندازەیەی جیابوونەوەی چینایەتی دەرەبەگایەتییان بەخۆوە دیوە لەبواری ژیانی ئازاد تووشی دواکەوتن هاتوون. کۆیلایەتی دەرەبەگایەتی بەردەوام لەسەر حیسابی ئازادی عەشیرەت پێشکەوتنی بەخۆیەوە دیوە. قۆناخێکی گرنگی نامۆبوونی هزری پێکهێناوە. سەرباری ئەوەی چەندین رۆشنبیری کوردی ــ ئیسلامی پێگەیشتوون، بەهۆی مەیلەکانی نۆکەرێتی بۆ دەوڵەت کاریگەرییەکی هەمیشەییان لەدوای خۆیان بەجێنەهێشتووە. ئیدریسی بەتلیسی لەسەرووی ئەمجۆرە سەیرو بەکرێگیراوانەی دەوڵەت دێت کەکاریان تەنیا پیاهەڵدانی سولّتانە. ئەمە زۆر سەیربوو کە لەهەڵبژاردنە خۆجێییەکانی ئەم دواییەی ساڵی 2004 لەبینگۆڵ گروپێکی سەر بەتەریقەتی نەقشبەندی دروشمیان دەداو دەیانگووت "ئیدریسی بەتلیسی لێرەیە یاووز سەلیم لەکوێیە؟". چاوەڕوانی رۆڵی یاووزی دووەم لەئەردۆغان دەکەن. تاوەکو خیانەتەکانی نەقشبەندییەکان لەکوردستان بەشێوەیەکی گشتی هەڵنەسەنگێنرێت، دەرفەتی ئەنجامدانی شۆڕشی رۆشنگەری لەئارادا نابێت. بەرامبەر بەئەمەش رۆشنبوونەوەی کوردە بەریشە عەلەوییەکان ئەرێنیتر بووە. لێکۆڵینەوەی کاریگەری سەرنجراکێشی دینامیزمە مێژووییەکان لەسەر رەوشی هەنووکەیی لەچوارچێوەی ئەم تەریقەت و مەزهەبانە دەشێ ئاکامی زۆر ئەزموونبەخشی لێبکەوێتەوە. رۆشنگەری کۆمار بە"کەمالیست" تاوانبار دەکەن و مەزندە دەکەن دەتوانن رووخساری فێزەونیان دەمامك بدەن و لەگەلی کوردی بشارنەوە. تاوەکو بەشێوەیەکی باش دواکەوتوویی و بەرژەوەندیپەرستی رووخساری ژێرپەردەی چەندین تەریقەتی بەریشە سونی دەستنیشان و ریسوا نەکەین، ناتوانرێ دیموکراسیخوازی و وڵاتپارێزییەکی بەپرەنیسیپی کوردان پێشبخرێت.

شارستانییەتی ئیسلام لەسەدەی سێنزدەهەم بەدواوە لەناوەوە بەهۆی داخستنی دەرگاکانی ئیجتیهاد، لەدەرەوەش لەژێر هێرش و پەلامارەکانی مەغۆل و کرستیانەکان (مەسیحییەکان) بەشێوەیەك کەوتە ناو قۆناخی راوەستان و دواکەوتن

کەجارێکی دیکە نەتوانێ بێتەوە هۆش خۆی. دوای ئەوەی بەناوی شارستانییەتی رۆژهەڵات تاوەکو سەدەی سێزدەم کۆمەکی پێشکەش بەیەکەم هەنگاوەکانی پێشکەوتنی شارستانییەت کرد، عوسمانییەکان زۆر بەزەحمەتی توانیان بەردەوامی بەو راوەستان (1200 ــ 1500ی ز) و دواکەوتنەی (1500 ــ 1918ی ز) بدەن. هەرچەندە قۆناخی عوسمانییەکان دواترین پاراستنی رۆژهەڵات بێ بەرامبەر شارستانییەتی هەڵکشاوی رۆژئاوا، بەڵام دواکەوتوویی سیستەمی ئابووری، سیاسی و ئایدیۆلۆژی کۆسپ بووە لەبەردەم سەرکەوتنی و نەیتوانیوە رێگری لەرووخانی بکات. لەگەڵ قۆناخی یاووزدا چینی دەسەڵاتداری کورد لەناو ئۆتۆنۆمییەکی فراوان و تایبەت بەخۆیان نزیکترین یارمەتیدەری عوسمانییەکان بوون. ئەم رەوشە کەتاوەکو سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم بەردەوام بوو, لەگەڵ یەکەم هەنگاوەکانی داگیرکەری رۆژئاوا لەسەدەی نۆزدەهەم بۆ ناوچەکە تێکچووە. سیاسەتی زێدەڕۆیی باج وەرگرتن و سەرباز کۆکردنەوەی بەڕێوەبەرایەتی ناوەندی لەپەلوپۆکەوتوو رۆڵێکی دیاریکراوی لەمەدا بینیوە.

لەگەڵ سەدەی نۆزدەهەمەوە مێژووی کوردو کۆمەڵگاکەی دەکەوێتە قۆناخێکی نوێ. لەکاتێکدا تێکچوونی پەیوەندییەکان لەگەڵ عوسمانییەکان رێگا لەپێش سەرهەڵدان و یاخیبوونەکان دەکاتەوە، ئەوا ئینگلیزو فەرەنسا کڵێساکانی ئەرمەن و ئاشورییەکان هانی جوداخوازی دەدەن و لەو بوارەدا کاریگەرییان دەخەنەسەر و رێگا لەپێش رەوشێکی ئاڵۆز دەکەنەوە. پەیوەندی نێوان ئەرمەنی و ئاشوورییەکان لەگەڵ کوردان تێکدەچێت. تێکچوونی پەیوەندی هەمووان هەم لەناوخۆیان هەم لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی عوسمانییەکان، رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە بکەونە ناو قۆناخی هەرە بەئێشی مێژووی خۆیان. ئەم قۆناخە لەکۆتاییەکانی شەڕی جیهانی یەکەم لەمیانەی پاکتاوکاری کولتووری و جەستەیی ئەرمەنی و سوریانییەکان ئەنجامگیردەبێت کەهەزاران ساڵ پشت و پەنای کوردان بوون. سەرباری ئەوەی پەیوەندی قەومگەرایی کوردان و تورکان زیانی بەرکەوت، بەڵام سەبارەت بەمەسەلەی ئەرمەنی و ئاشوورسیەکان رێگای لەپێش دابڕانێك نەکردۆتەوە. هەربۆیە بەشێوەیەکی هاوبەش لەساڵانی 1920 لەگەڵ تورکەکان جێگای خۆی لەشەڕی رزگاری نیشتمانی (تورکیا)دا گرتووە. ئەو رێککەوتنە ستراتیژی و پێکهاتەیەی لەگەڵ ئەڵپ ئەرسەلان و یاووز سەلیم ئەنجامدرابوو کەوتۆتە ناو سێیەمین شێوەی گەورەی خۆی. مێژوو گەواهی ئەوەیە هەروەکو سەرکەوتنی ئەڵپ ئەرسەلانی 1071, ئەگەر لەسەرکەوتنەکانی 1514 بەرامبەر سەفەوییەکان، 1516 و 1517 بەرامبەر مەمالیکەکانی میسر رۆڵی کوردان ئەرێنی نەبووایە، ئەوا فەتحکاری تیرە تورکەکان بۆ ئەنادۆڵ و بڵاوبوونەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەرۆژهەڵات و رۆژئاوا بەدینەدەهات.

لەساڵانی 1920 کاندا ئەم هێلکارییە مێژووییە بەردەوام بووە. سێیەمین هاوبەشێتی ستراتیژی بۆتە رێگر لەپێش پەلهاوێشتنی ئیمپریالیستی و دەرفەتی سەرکەوتنی بۆ شۆرشی کۆماری رەخساندووە. بەڵام هەڵسەنگاندنی چەوتی کۆمار لەلایەن چینی سەردەستی دەرەبەگایەتی بەکرێگیراوی باوی کوردان و خەڵەتاندنی لەلایەن نیازخراپەکانی ئیمپریالیزم و یاخیبوون، رێگای لەپێش ئەوەکردۆتەوە دامەزرێنەرانی کۆمار سیاسەت بگۆڕن. بەیەکەوە دەستبەردانی کورد ــ تورك لەپرۆژەی ئازادی، بۆتە هۆکاری کەوتنە ناو خراپترین قۆناخەکانی مێژوویان. ئەم تێکچوونە ستراتیژییەی پەیوەندی نێوان کورد ــ تورك، نکوڵیکردنی کوردان و بەدواکەوتوویی مانەوە، تواندنەوەی زۆرەملێ و دواتریش بەرکەنارکردنی تەواوەتی لەسیستەمی لەگەڵ خۆیداهێناوە. پەسەندکردنیان بەئەندازەی ئەرێکردنی تورکاندنی خۆیان ئەم سیاسەتانەی قووڵترکردۆتەوە، بەرامبەر ئەو رۆشنگەرییە مەزنەی لەساڵانی 1970 لەسەرتاسەری جیهان لەئارادا بوو ئەوا سیاسەتەکانی ناشرینکردن و نکوڵیکردنی دیاردەکانی کوردو کوردستان رێگای لەپێش بزووتنەوەیەکی نوێی رۆشنبیرانی کوردو دواتریش لەکەسایەتی "PKK"دا رێگای لەپێش قۆناخی بەرخودانی سیاسی و سەربازی کردەوە. پەیوەندییەکانی کورد ــ تورکیش کەوتۆتە ناو پێکدادان و ئازارێکی زۆر, بەڵام کەوتۆتە ناو قۆناخێکی شەرەفمەندانەوە.

2 ـ تێکۆشان لەسەر کوردستان، شەڕو تیرۆر

شوێنگەی ستراتیژی و ژیۆکولتووری کوردستان ڕێگای لەپێش ئەوە کردۆتەوە ببێتە وڵاتێك کە لەمێژوودا تێکۆشان، شەڕو تیرۆری هەرەزێدەی لەسەر پەیڕەوکراوە. شیمانە دەکرێت ئەو ناوچەیەی دوای چوارەمین قۆناخی سەهۆڵبەندی و پێش 20 هەزار ساڵ قۆناخی مەزۆلیتیکی بەخۆیەوە بینی و دواتر کولتووری نیئۆلیتیکی (کشتوکاڵ و ماڵیکردنی ئاژەڵ) تێدا پێشکەوت ـ نزیکەی 20 هەزار ساڵ پێش ئێستا ـ ناوچەی کوردستانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بووبێت. لەبابەتە جیاوازەکاندا هۆکارەکانمان روونکردەوە. لەبەرئەوەی ناوەندی پێشکەوتنی هەرەزێدەی مەزۆلیتیك و کولتووری نیئۆلیتیك بوو، لێشاوی کۆمەڵەی ئەو مرۆڤانەی لەگەڵ خۆی هێناوە کە لەقۆناخی کولتووری سەرەتایی (مرۆڤەکانی قۆناخی بەردینی کۆن) دابوون. لەبەر ئەوەی هەنگاونان لەکۆکردنەوە بۆ بەرهەمی کێڵگە ڕێگای لەپێش بەرهەمی زێدەتر کردەوە چاوەڕوانی چڕبوونەوەی ژمارەی دانیشتوان دەکرێت. بەڵگە مێژووییەکان نیشانیدەدەن کە لەم قۆناخەدا ژمارەی دانیشتوان زیادیکردووە. پێشکەوتنی ژیانی جێگیرو گوند، پەرەسەندنی کولتووری کێڵگە و ڕەزو باخی خێراترکردووە. ئەم دۆخەش وایکردووە خاکی بەپیت و ناوچەکانی پڕ لەرووەك و ئاژەڵ ناوەناوە ببنە فاکتەری شەڕو پێکدادان. شیمانەیەکی بەهێزە ئەو پێکدادانانەی بەئامانج ئابووری و ناوەڕۆك کۆمەڵایەتی بوون بەم شێوازە پەرەیسەندووە. هەروەها پاشماوەکانی لەبەردەستدان شوێنەواری هەندێ گوند نیشاندەدەن کەلەم قۆناخەدا بۆمان ماوەتەوە.

دیسان سەرهەڵدانی یەکەمین تێکۆشانی ئابووری و کۆمەڵایەتی مێژوو لەکوردستاندا بەهۆی هەندێ فاکتەری دەرکی پێدەکرێت چەندەی بڵێی جێگای تێفیکرینە. بەو ئەندازەیەی لەجموجۆڵی ژمارەی دانیشتوان دەرکی پێدەکرێت چڕبوونەوە لەئەنجامی هاتنی لێشاوی چەندین کۆمەڵەی باشوور لەعەرەبستانی ئەمڕۆو باکووری ئەفریقیا، لەرۆژهەڵات لەئێران و رۆژهەڵاتی دوورتر، لەباکوور قەفقاسیا و لەرۆژئاوا لەئەنادۆڵ بەدیدێت. هەروەکو لێشاوی مرۆڤەکان بۆ ئەوروپاو باکووری ئەمریکای ئەمڕۆ، یەکەمین لافاوەکانی مرۆڤ لەمێژوو کەبەئامانجی ئابووری و گەوهەری کۆمەڵایەتی ئەنجامدرا، بەدرێژایی 15هەزار ساڵ بەرەو ئەو کوردستانەی ئەمڕۆ بووە کە ئەوکات رۆڵی "وڵاتی رۆژ"ی بینیوە. شتێکی سروشتییە ماوەیەکی هێندە درێژ رۆڵی وڵاتی رۆژ ببینێ، دەبێتە هۆکاری کێشمەکێش و پێکدادانی گەورە. نۆهەزار ساڵ پێش ئێستا دوای ئەوەی بەشێوەیەکی بەرفراوان کولتووری نیئۆلیتیکی هەرسکرد، ئەمجارە ڕێگای لەپێش جموجۆڵێکی پێچەوانەی دانیشتوان کردۆتەوە. پێدراوەکانی لەبەردەستدان نیشاندەدەن کە نزیکەی حەوت هەزار ساڵ پێش ئێستا کولتووری نیئۆلیتیك هەم لەبواری جەستەیی (لەگەڵ مرۆڤەکانی) هەم کولتووری ــ تەنیا کاریگەری ــ لەئۆقیانۆسی ئەتڵەسییەوە لەرۆژهەڵات بەرەو کەنارەکانی پاسیفیك و چین، لەباکوور سیبریا، لەباشووریش تاباکووری ئەفریقیا بڵاوبۆتەوە. بەمجۆرە چڕبوونەوەی سەر ناوەندی نیئۆلیتیك کەم بۆتەوە.

مەزەندە دەکرێ نزیکەی 5 _ 7 هەزار ساڵ پێش ئێستا (5000 ــ 3000 پ.ز) گرووپی زمان و کولتووری ئاریان لەکوردستان شێوەی گرتووە، لەکۆمەڵگای قلان و تیرەوە بەرەو کۆمەڵگای خێڵایەتی هەنگاو هاوێشتراوە. کۆمەڵگای عەشیرەت ڕێکخستنێکی چڕو چالاکی کۆمەڵەیەکی گەورەتری مرۆڤەکانی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. لەکاتێکدا کۆمەڵگاکانی قلان و هۆز لە 20 ــ 25 کەس پێکدێت، کۆمەڵگای خێڵایەتی دەتوانێ بەسەدان کەس ئۆرگانیزە بکات. ئەم رەوشە ئەوە نیشاندەدات لەکاتێکدا گرفتە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان دژواربێت ئەوا دەشێ تێکۆشانەکانی نێوان کۆمەڵەی عەشیرەتەکانیش گەورە بێت. ئەو پێدراوە شوێنەوارناسییانەی لەو قۆناخەدا بۆمان ماوەتەوە نیشانیدەدەن کەزیاتر بەهۆی فاکتەرە ناوخۆییەکانەوە ململانێیە کۆمەڵایەتییەکان دژواربووە ـ هەندێ گوند بەتەواوی رووخاوە. زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان لەم خاکە بەپیتە و شوێنی ئاوەڕۆکان و چاوچنۆکی دراوسێیان، هۆکاری ئابووری پێکدادان و کێشمەکێشەکان پێکدێنێت. دەتوانین شیمانە بکەین

لەئاکامی ئەم تێکۆشانانە سنووری تایبەت بەخێڵ و هۆزی جیاواز پێکهات. بۆیە ئەگەرێکەو دەتوانین ریشەی ناوچەی عەشیرەتەکان بۆ سالانی 4000 ی پ.ز بگەڕێنینەوە. ئیتر دەتوانرێ ناوچەی کوێستانی و موڵکی هاوبەشی خێڵەکان جیابکرێتەوە. هەروەها شیمانە دەکرێت گروپی زمان و شێوە زمان و کولتووری تایبەت بەخێڵەکان پێشکەوتووە. یەکەمین مۆسیقاو بابەتی یارییەکان و باوەڕی پەرستن شێوەی گرتووە. چەندین پەیکەر هەیە لەخۆوەگرتنی شێوەی ژن قورسایی کولتووری دایك ـ کەویبوون نیشاندەدات. دەتوانین ئەم قۆناخە وەك تێکۆشانێکی بەناوەڕۆك کۆمەڵایەتی و بەئامانج ئابووری پێناسە بکەین.

قۆناخی 3000 ی پێش زایین ـــ 330ی گوزارە لە لەدایکبوون و تەواوبوونی شارستانییەتی سۆمەری خوارووی میزۆپۆتامیا دەکات. تێکۆشانەکان گەیشتۆتە ئاستی شەڕ. بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا نەریتی پیلانەدانانی پێشوەختی تالانکردن و زەوتکردنی بەها ئابوورییەکان لەرێگای هێزی سەربازی لەدایك بووە. هێزی جەنگاوەری دەسەڵات لەناوەڕۆکدا هێزی تالانە. تایبەتمەندێتییەکانی ئیلاهی، پیرۆزی و قارەمانی کەوەك دەمامکێك پۆشراوە زەوتکردن و تالانی لەپشتدا شاراوەیە.

کوردستان یەکێك لەسەرچاوە سەرەکییەکانی لەدایکبوونی ئەم شارستانییەتەیە. داستانی گلگامێش کەیەکەمین داستانی شارستانییەتی سۆمەری و تەواوی مرۆڤایەتییە باس لەگەشتێکی جەنگی تالانکردنی کوردستان دەکات. بابەتی سەرەکی داستان گەڕانی گلگامێشە کە لەیەکەمین پادشاکانو قارەمانی ئورگە بۆ کوردستان بەیارمەتی ئەو بەربەرەی ناوی ئەنکیدۆیەو لەرێگای ژنە سۆزانییەکانی رەمزی شارستانییەتی شار تەفرەدراوە. لەراستیدا ئەنکیدۆ نوێنەرایەتی یەکەمین نموونەی ئەو ناوچە شاخاویانە دەکات (کوردستان) کە لەشاخەوە بۆشار داکەوتوونەو نۆکەرێتی هێزە دەسەڵاتدارەکان دەکەن. سەرکێشی داگیرکردنی وڵاتەکەی خۆی دەکات. بەرامبەر ئەمەش لەسەر مێزی خوانی دەوڵەت ـ پادشا فێری ژیانی پڕ لەرابواردن وخواردن و خواردنەوە دەکرێت. گووتەی "کورد چی لەجەژن دەزانێ، هەردەزانێ دۆ بخواتەوە" سەرچاوەی خۆی لەم قۆناخانە وەردەگرێت. دەشێ گلگامێش خۆشی خەڵکی وڵاتی شاخاوی بێت. چونکە گلگامێش بەواتای "گامێشی مەزن"، "پیاوێکی بەقەدەرگا" دێت. رێکەوت نییە کەمێژووی کوردستان پڕ لەمجۆرە خیانەتکارانەیە. لەبەرئەوەی سۆمەرییەکان پێویستییەکی زۆریان بە کەرەستەکانی دارستان، تەلسمی بەرد و کانزاکان هەیە، بەردەوام بەرەو باکوور پەلدەهاوێژن و شالاو دێنن. ئەو شەڕەی ئەمڕۆش لەدەرئەنجامی قەیرانی ئێراق دەیبینین، لەراستیدا پووختەی مێژووی رابردووە.

بۆ یەکەمین جار بەشداریکردنی هێزەکانی شارستانییەت لەقۆناخی داگیرکاری و دەستبەسەرداگرتن و تالانکردنی کوردستان پێشکەوتنێکی چۆنایەتییە. هێزە بەدەوڵەتبووەکان پەلامارەکانی تالان و بەکۆیلەکردن لەسەر کۆمەڵگا ئەتنیکییەکانی وەکو خێڵ، هۆز و تیرە ئەنجامدەدەن. لەکاتێکدا لەقۆناخەکانی پێشووتر تێکۆشان بەئامانجی خۆپاراستن، بەدەستهێنانی ئاوەڕۆکان و زەوییە بەپیتەکان بوو، لەقۆناخی شارستانییەتدا بەر لەهەموو شتێك بەئامانجی تالان و کۆیلەکردنە. بەشێوەیەکی نەخشەکێشراو لەسەر کوشتن یان برینداركردنی مرۆڤ چڕبۆتەوە. بەهەرحاڵ پێویستە ئەو جموجۆڵانەی لەقۆناخی پێشوودا ماونەتەوە بەردەوام بێت کەلەچوارلاوە بەرەو ناوچەکە دەهاتن و کولتوورەکەیان بۆ دەرەوە دەگواستەوە. ئەو دۆزینەوە شوێنەوارناسییانەی لەسەردەمی هۆرییەکان ماوەتەوە رۆشنایی دەخاتە سەر راستینەی شەڕو تێکۆشانی کۆمەڵایەتی ئەم قۆناخە. سیستەمەکانی پاراستن و چیرۆکەکانی قارەمانێتی بەڵگەی سەلمێنەری هەبوونی شەڕو تێکۆشانەکانیانە. لەسالانی 2000کانی پێش زایین بەردەوام لەئێران، فەقفاسیا، ئەنادۆڵ و عەرەبستان لێشاوی گروپەکانی داگیرکاری پەلامار دێنن. شورای شارە سۆمەرییەکان و قەڵای هۆرییەکان بەئامانجی خۆپاراستنە لەم پەلامارانە. پەنابردنە بەر شاخە بەرزەکان بێگومان لەبەرئەوەیە کەشاخەکان وەك قەڵای سروشتی دەرفەتی خۆپاراستن دەدات. ئەمەیە راستینەی: شاخ =

بارەگای (مۆڵگەی) پاراستنی گیانی ئەتنیکی کوردان. باب و باپیرەی کوردان لوتکەی شاخەکانی کوردستانیان بۆ خۆیان کردووە بەشوێنگە کەسەرتاسەری وەکو قەڵایەو هەوڵیانداوە بەرامبەر خراپەکاری داگیرکاری و دەستبەسەرداگرتن و تاڵانکاری ئەو هێزانە خۆیان بپارێزن کەبەهەزاران ساڵ وەك لافاو لەهەمموو لایەکەوە پەلاماریان دەدان. هۆی پێشنەخستنی شارستانییەتی شار لەناوچە دەشتاییەکانەوە لەنزیکەوە وابەستەی ئەم راستینە مێژووییەی کوردانە.

لەقۆناخەکانی 2000 ــ 1000ی پێش زایین دەبینین ئەندامی نوێ تەڤلی شەڕەکانی داگیرکردنی کوردستان بوونە. پادشایەتی هیتیتەکان کە لەئەنادۆڵی ناوین ئاواکراوە لەگەڵ کۆمەڵە بەربەرەکانی قەفقاسیا کەبەئیسکیت ناودەبرێن بەشداری قۆناخی داگیرکاری شارستانییەتی هۆری (میتانی) و شارە دەوڵەمەندەکانی ئاشوورو بابلی باشوور دەبن. دیسان ئەوانەی کەوتوونەتە ناو رەوشی هەرە زەحمەتەوە گروپەکانی باپیرەی کوردانن. چونکە لەکاتێکدا جاران تەنیا لەباشوور لەلایەن سۆمەری ـ بابلی ـ ئاشووری هێرشیان دەکرایەسەر، ئیتر لەباکوور دەوڵەتی هیتیت و تیرە جەنگاوەرەکانی "ئیسکیت" یش تەڤلی دەبن. لەئێران هۆزە پارسەکان لەرۆژئاواش گروپی ئەتنیکی لوویی تەڤلی ئەم ئابلۆقەدانە دەبن. هەم لەبەرئەوەی ناوچەیەکی دەوڵەمەندی بەرهەمهێنانە، هەم بەهۆی هەڵکەوتەکەی کەشوێنی تێپەڕبوونی شارستانییەتە تازە ئاواکراوەکان پێکدێنێ، بۆ کوردو کوردستان دووالیزمێکی تەواوە. لەپێناو لەسەرپێ مانەوەو ژیان هەم بەرخودان هەم نۆکەری هەردووکیان پێشدەکەون. لەکاتێکدا پلەدارەکان رۆڵی بەکرێگیراوێتی دەبینن، توێژەکانی دیکەی ژێرەوە بەردەوام لەناو بەرخوداندا بوون.

لەبەڵگە نووسراوەکانی 1600 پ.ز میرنشینێکی کورد وەها بۆ پادشای دامەزرێنەری هیتیتەکان"ئانیتا" دەنووسێ: "ئەی ساویلکە، تۆمان پێگەیاند، لەوێ تۆمانکرد بەمیر، بۆ ئەوە نەبوو لەرێگای مێگەڵە جەنگاوەرەکانی کۆتکردۆتەوە بێیت لەسنوور ئێمە نارەحەت بکەیت، هەوڵبدە شایستەی بەڵێنەکانت بیت"، ئەو نووسینانە بەم واتایە دێت کە ئەو پادشایەتییەی هیتیتەکان بەقووڵی بەهۆرییەکان کاریگەربووە، وردەوردە گەورە بووەو لەلایانەوە پێگەیشتووە, دوایی بۆتە مەترسییەك لەسەرمیرەکانی هۆری ـ میتانییەکان. هەروەها پادشای بەناوبانگی هیتیتەکان "شوپلیولیوما" وەها بۆ "ماتیوازا"ی پادشای میتانییەکان دەنووسێ (نزیکەی ساڵانی 1300ی پ.ز): "کچەکەمت پێشکەش دەکەم، ئیتر بەکوڕم دادەنرێی. جارێکی دیکە یاخی مەبە. ناخۆشی دروست مەکە. هەوڵبدە لەوڵاتە باشەکەت بەئاسوودەیی بژیت. من پاڵپشتتم." لێرەدا دەبینین سەرباری شەڕەکانی نێوانیان چۆن لەرێگای هاوسەرێتی سیاسییەوە هەوڵدەدەن ئاشتی و خزمایەتی لەنێوان خۆیان دروستبکەن.

لەم قۆناخەدا کاتێك هێزە مەترسیدارەکەی ئاشوورییەکان سەریانهەڵدا، پێویستی بەرێککەوتنی نێوان هیتیت ــ میتانییەکان هەیە. ئەوەی سەیرترە ئەوەیە کەشاژنی بەناوبانگی میسرییەکان "نەفەرتیتی" لەلایەن میتانییەکانەوە پێشکەشیان کراوە. دەوروبەری ساڵانی 1500ی پێش زایین کەقۆناخێکی مێژوویی بەجموجۆڵە بەئەندازەی ئەم رێککەوتنە سیاسی و دیپلۆماسیانە چەندین شەڕیشی بەخۆوە دیوە. لەساڵی 1596ی پ.ز لەئەنجامی هاوبەشێتی و هاوکاری هیتیت و هۆرییەکان بابلی بەناوبانگ داگیرکراوە. شیمانە دەکرێت "شەڕو ئاشتی کادەش"ی بەناوبانگ لەساڵانی 1280 پ.ز روویدابێت. مەزەندە دەکرێ راکردنی حەزرەتی ئیبراهیم لەبەردەستی نەمروودی ئورفە لەساڵی1650 بێت، راکردنی موسا لەبەردەستی فیرعەونەکانی میسر لەسەرەتاکانی 1300ی پ.ز بووبێت. حامورابی بەناوبانگ لەساڵانی 1750ی پ.ز ژیاوە. لەم سەدانەی کەپڕ لەقۆناخی شەڕو ئاشتییە کوردستان رۆڵی شوێنێکی ناوەندی دەبینێت. وڵاتێکە شەڕی لەسەر کەم نەبۆتەوە.

لەقۆناخی نزیکەی ساڵانی 1000 ــ 330ی پێش زایین دوا قۆناخی ئەو شارستانییەتە گەورانەیە کەناوەندەکەیان میزۆپۆتامیایە. ئیتر ئیمپراتۆریەتی ئاشووری وەك هێزی دیاریکەری مێژوو لەسەرشانۆیە. لەپێشبڕکێی نێوان بابل ـ نەینەوادا پێشەنگایەتی کەوتۆتە دەست نەینەوا. بەبڵاوکردنەوەی ترس و سام بۆ دراوسێکانیان بەناوبانگبوونە. ناوونیشانی دیکەی ئیمپراتۆرە ئاشوورییەکان، بیرۆکەکانی دروستکردنی قەڵا، ئاواکردنی شوراو کۆکردنەوەی خەرمانی کەللەسەری مرۆڤ بوو.

بێڕەحمترین سەفەرەکانی شەڕیان بۆ ناوەوەی کوردستان و سوریاو میسر بووە. کاریگەرییەکانیان تاوەکو رۆژئاوای ئەنادۆڵ بڵاوبۆتەوە. لەم قۆناخەدا هیتیتەکان پەرتەوازە بوونە ـ لەساڵانی 1200 پ.ز لەلایەن فریگەکانی تراکیا ــ لەجیاتی ئەو لە باشووری شاخەکانی تۆڕۆس پادشایەتی شارە بچووکەکان ئاواکراوە. هەرچی لەکوردستان سەرەتا کۆنفیدراسیۆنی نایری لەهەرێمی "بۆتان" ی ئەمڕۆمان ئاواکرا ــ شیمانە دەکرێ 1200 ــ 900 ی پ.ز بووبێت ــ دوای پەرتەوازەبوونی ئەم کۆنفیدراسیۆنە دەوڵەتی ئورارتووی بەناوبانگ ئاواکراوە ــ 875 ــ 606 پ.ز ـــ ە ئاشوورییەکان پەلاماری زۆر دژوارو بێڕەحمانەیان بەرامبەر ئەو دەوڵەت و میرنشینانە ئەنجامداوە کەدوای هیتیتەکان ئاواکران. چەندین پاشماوە, لەسەرووشیانەوە رەوشی نائاسایی تاتەبەردەکان, رووداوەکانی شەڕ زیندوودەکاتەوە. هەڵگرتنی سەرە بڕاوەکانی مرۆڤ دەبێتە پێڕەوێك لێپرادێن و هۆگری دەبن. دیسان گرنگترین هۆکاری شاڵاوەکان دەستبەسەرداگرتنی کەرەستەو کانزاو رێگاکانی بازرگانییە.

ئورارتوویەکان توانیویانە بەرامبەر ئەم هێرشانە ببنە لەمپەرو بیوەستێنن. دەرك بەوەدەکرێ کە لەبەرگریکردندا بەناوبانگ بوونە.

مادەکان (میدییەکان) لەم قۆناخە لەرۆژهەڵات (لەکوردستانی ئێرانی ئەمڕۆدا) سوود لەنموونەی ئورارتوویەکانیش دەبینن، قەوارەی خۆیان بەهێزدەکەن، دەرك بەپێویستی کیانی سیاسی دەکەن، بەرپەرچی هێرشی ئاشوورییەکان بۆ رۆژهەڵات دەدەنەوەو هێز کۆدەکەنەوە. لەراستیدا 300 ساڵە بەناوبانگەکەی بەرخودان و ئامادەکاری لەمێژوودا گوزارە لەقۆناخی ئورارتوو و بەهێزبوونەکەی دەکات. سەرکەوتن بەسەر ئاشوور، هاوشێوەی ئەوەیە کەئەمڕۆ ئێراق بەسەر ئەمریکادا سەربکەوێت. هەربۆیە پێویستی بەئامادەکارییەکی هەمەلایەن و نوێکردنەوەی تەکتیك هەیە. لەکۆتاییدا فەرماندەی بەناوبانگی میدیا کیاکسارو هاوپەیمانەکەی لە بابل نەبوخزنەسر بەیەکەوە نەینەوا دەڕوخێنن و دەیسووتێنن و کۆتایی بەهەبوونەکەی دێنن. لەساڵی 612ی پێش زایین ـ ساڵانی 715 ـ 550 پ.ز ــ میدییەکان لەئاواکردنی قەوارەیەکی سیاسی سەردەکەون کەنزیك بەئیمپراتۆریەتەو ناوەندەکەی ئەکبەتان ــ هەمەدانی ئەمڕۆ ــ یە ناوەڕۆکی کورد بەهێزتر بووە. هێرشەکانی ئەسکیتەکان لەباکوور، تیرە پارسەکان لەرۆژهەڵات و باشوور رێینەداوە بەهێزببن. لەئەنجامی خیانەتی فەرماندەی بەناوبانگ هێرباکۆس و نۆکەرایەتیکردنی بۆ پارسەکان رێگا لەپێش ئەوەدەکرێتەوە هێزی دەسەڵات بکەوێتە دەست کیرۆس ی خوشکەزای پادشای ماد، هەربۆیە کەوتۆتە دەست پلەدارانی تیرەکانی پارس.

ئیمپراتۆریەتی پارس بەردەوامی ئیمپراتۆریای میدییەکانە. بەجۆرێك لەجۆرەکان دەبێتە دەوڵەتێکی هاوبەش. دیسان گۆڕەپانی شەڕو پێکدادان زیاتر کوردستانی ژێر رکێفی ئیسکیتەکانە. تەنانەت مردنی کیرۆسیش لەئەنجامی ئەو شەڕانە بوو کە لەم ناوچەیەدا بەرامبەر ئیسکیتەکان ئەنجامیاندەدا. جێگۆڕینەوەی ئیمپراتۆریەت بۆ شوێنێکی ئارامترو بەجێبوونی لەباشووری رۆژئاوای میدیا کاریگەری ئەو ڕەوتە بەربەرانەی دەکرێتەسەر کەلەباکوورەوە دێن. پەلامارە گەورەکەی داریوش بۆسەر ئیسکیتەکان ــ دارای مەزن: 520 ــ 485 پ.ز ــ بەئامانجی چارەسەرکردنێکی ریشەیی ئەم بەڵایەیە. سەرتاسەری ئەنادۆڵ نزیکەی دووسەد ساڵ ـ 530 ـ 330 پ.ز ـ بەدەستی ئیمپراتۆریەتی ماد ـ پارس شێوە دەگرێت. بەڕیزە یەکەبەیەکە کۆتایی بەهەبوونی سیاسی فریگیا، لیدیاو لیکیا دێت، تەواوی شارەکانی لەکەناری ئیجە ئاواکراون کۆنترۆڵ دەکرێن. دەتوانرێ بگووترێ لەم قۆناخەدا کوردستان ـ میدیا لەسەر رێگای شارستانیبوون بەژیانێکی ئارام و هێمن دەگات. بەهێزبوونی خێزانی باوکسالاری، پێکهاتەی خێڵەکی بەهێزی میدییەکان، وادەکات میدییەکان لەسوپای پارسەکان جیاوازتربن. لەگەڵ فەتحکردنی میسریش ـ 525 پ.ز ـ ناوەندی شارستانییەت بۆ ناوچەکانی مادو پارس جێگۆڕکێیان کردووە. بابلیش لەنێو ستاتۆیەکی نیو گرێدراو هێشتا پایتەختی کولتووری شارستانییەتە.

لای ئەرستۆکراتەکانی مەکدۆنیاو هێلین، فەتحکردنی تەواوی ئەنادۆڵ، بەم شێوەیە هەم بەلاوەنانی هەڕەشە گەورەکەی ماد ـ پارس، هەم دەستبەسەرداگرتنی ئەو دەوڵەمەندێتییەی هەرگیز نەیانبینیوە، بووە بەحەسرەتێك. شەوو ڕۆژ خەیاڵی ئەوە دادەنێن و گفتوگۆی سیاسی لەبارەوە دەکەن. باوەڕی هاوبەشیان سەرخستنی ئەم کارە بەئێشێکی خودایی دادەنێت. بیرمەندی مەزن ئەرستۆ (385 ـ 320 پ.ز) بەردەوام ئەم باوەڕی و زانیارییە لەسەر قوتابییەکەی خۆی ئەسکەندەری مەزن موتوربە دەکات کەکوڕی فیلیپی پادشای مەکدۆنییەکانە. شیمانەیەکی لەپێشە کەبۆچوونی بەئاژەڵ بینینی مرۆڤی ڕۆژهەلات و پلیشاندنەوەی وەکو مێروولە لەلایەن ئەرستۆوە لەسەر ئەسکەندەر تەلقین کراوە. دوای ئەوەی ئەسکەندەر لەناو ئەم هەلومەرجەو پەروەردەی چڕی مامۆستاکەی پێدەگات، دوای ئەوەی کەلەتەمەنێکی زۆر لاودایە باوکی دەکوژرێ سەرەتا یەکێتی هێلینییەکان، دواتریش تیرەکانی دەوروبەری مەکدۆنیا دەکاتەیەك، ئەو سەفەرەی ڕۆژهەلات دەستپێدەکات کەئاراستەی مێژوو دەگۆڕێ. وەك ئەسکەندەری مەزن وەلامی داریوشی گەورە دەداتەوە. هەروەکو دەزانرێ لەمیانەی ئەو شەڕانەی کە لەم قۆناخەدا "سەفەری برووسك"یان پێدەگووترا هەروەکو مێروولە مرۆڤیان لەژێرپێ دەپلیشاندەوەو تاروباری گانژی هیندستان ڕۆیشت. هیچ شوێنێك نەما زەوتی نەکات. بەناوبانگترین شەڕی ـ 331ی پ.ز ـ لە گاڤگەمالای نزیك ئەربەئیلۆ ـ هەولێری ئەمڕۆمان ـ بووە. ئیمپراتۆریەتی پارس لەناو شەڕێکی مەزن و دژواردا تێکدەشکێ. کاتێك دووبارە گەڕایەوە شاری بابلی پایتەختی کولتووری ئەوکاتە، لەئەنجامدانی ئەو کارانە بەردەوام دەبێ کەشایستەی ناوو دەنگەکەیەتی. وەك سەمبۆلێکی سەنتێزی ڕۆژهەلات ـ ڕۆژئاوا بەیەکجار دەهەزار پیاوی جەنگاوەری بەلکان و دەهەزار کچی ئەسلزادەی پارس و ماد دەکات بەهاوسەر. کچی سێیەمین داریوشیش بەرخۆی دەکەوێ. ئەمجارە لەکاتێکدا ئامادەکاری کاروانی کۆماری ڕۆمای تازە لەدایکبووی ڕۆژئاوا دەکرێ، لەئەنجامی تووشبوونی بەمیکرۆبی مێشوولەکانی زەلکاو لەتەمەنی لاویدا دەمرێ.

ئاسەواری ئەسکەندەر لەکوردستاندا زۆرە. بتلیس لەناوی فەرماندەیەکیان ماوەتەوە کە "بالیسی"ی ناوە. دەتوانرێ بگووترێ هاوشێوەی گەریلا شاخەکانی زاگرۆسی تێپەڕکرد. دەگووترێ لەبواری سەربازیدا ئەسکەندەر نیو ـ خودا بووە. لەئەنجامی ئەم شەڕانەوە کوردستان دەکەوێتە ناو مەقاشێکی دوو لایەنەوە.

دەبێتە ناوچەی ناوەندی پێکدادانە بەناوبانگەکەی ڕۆژهەلات ـ ڕۆژئاوا. دیسان زیاتر ناوەندی شەڕەکانی نێوان ئیمپراتۆریەتی پارت ـ 250 ـ 216 پ.ز ـ کە لەئێران لەجێگای ئیمپراتۆریای فارس ئاواکراوە لەگەڵ هێلینی دوای ئەسکەندەر ناوەندەکەی کوردستانە. پادشایەتی ئەرمەنییەکانیش کەوتۆتەگەڕ. مافەکانی فەتحکردن وەك بناخەیەکی سەرجەم گەلان ئەم دەست و ئەو دەست دەگۆڕێ. کەنارەکانی دیجلەو فورات پڕ لەقەلا دەکرێ. تەواوی شارەکان لەڕێگای دروستکردنی شورا و ئاواکردنی قەلا چەمکەکانی بەرگریکردن پێشدەخەن. دیسان سەرباری ئەوەش لەقۆناخی پادشایەتی هێلینیەکاندا پادشایەتی کۆماگەنە (ناوەندەکەی سامسات ـ ئادیەمان)، ئەبگار (ناوەندەکەی ئورفا) و پالیمێرا (ناوەندەکەی تەدمور) بایەخێکی تایبەتیان دەبێت. بەرهەمە هەلبژاردەکانی سەنتێزی ڕۆژهەلات ـ ڕۆژئاوا دەخولقێنن. لەبواری زهنییەت هەم لەوانەی پێشووتر، هەم ئەوانەی دواترجیاوازترە. دەتوانرێ وەك قۆناخێکی پڕشنگداری شارستانییەتیش هەڵسەنگێنرێ. کاریگەری بزۆکی ئێران ـ پارت ـ و هێلین لەناویەکدا بەڕێوەدەچێت. گۆڕینەوەی کولتوور بەئەندازەی دانوستاندنە بازرگانییەکان زیندووە.

دیسان یەکەمین وێستگەی حەواریەکان کە دوای لەخاچدانی حەزرەتی عیسا لەتیرۆری ڕۆما رادەکەن شارەکانی ئەنتاکیا، ئورفاو نوسەیبینە کەدەروازەی کوردستانن. دەتوانرێ بگووترێ قۆناخێك لەئارادایە کەتازە بەتازە تیرۆرتێیدا بالادەکات. ئیمپراتۆریەتی ڕۆما هەرەدرەنگ لەسالانی 50ی زایینی تەواوی ئەنادۆڵ، سوریا، ئیسرائیل و لوبنانی فەتحکردووە، کەنارەکانی رووباری فوراتیشی تێپەڕکردووە. دوای لەخاچدانی حەزرەتی عیسا ئەو گروپە مەسیحییانەی تازە دەرکەوتوون بەرەو

کونەکانی شاخ، ناوچە سەختەکان، ئەشکەوت و بیابان بڵاوبوونەوە. قۆناخێکی نیو ــ نهێنی لەئارادایە. بۆیەکەمین جارە تیرۆری سیاسی پەیڕەو دەکرێ، ئەویش لەسەر باوەڕمەندە مەسیحییەکان بەڕێوەدەبردرێ. هەربۆیە شاخەکانی کوردستان دەبێتە یەکەم پەناگەیان. ئیتر ئیمپراتۆریەتی رۆما کەتەواوی میرنشینەکانی هێلینی خستۆتە ژێردەست گەیشتۆتە سنوورەکانی ئیمپراتۆریەتی پارت. کاتێك لاشەی فەرماندەی بەناوبانگی رۆما کراسۆس دەکەوێتە دەست (ساڵانی 50ی زایینی) پارتەکان و ئەرمەنییەکان وەك جەژن پیرۆزی دەکەن. چەند رۆژێك سەری کراسۆس هەڵدەواسن و ریسوادەکرێت. گۆڕەپانی رووداوەکە شاری "کتەسیفۆن"ی کوردستانە.

لەسەدەی سێیەمی زایینی بەدواوە ئیتر شەڕەکانی نێوان ئیمپراتۆریەتەکانی رۆماو ساسانی دەستپێدەکات. دیسان دژوارترین شەڕەکانی مێژوو لەسەرخاکی کوردستان روودەدات، دیجلەو فورات دەبنە سنووری شەڕەکان. شارەکانی وەکو دیاربەکرو نوسەیبین چەندین جار داگیردەکرێن، ئەم دەست و ئەو دەست دەگۆڕێ. بەردەوام کوردستان پارچە دەکرێت. چاوەڕوانیکردنی پێشکەوتن لەو ناوچەیەی بەردەوام دەبێتە شوێنی رشاندنەوەی بەردەوامی تاڵانی و توندوتیژی شارستانییەت واقیعی نابێت. لەکاتێکدا بەشێوەی گروپ و کۆمەڵە ژیان لەشاخەکان بەردەوام دەبێت، ناوەندەکانی شار دەبێتە برپارگای داگیرکاری. جیاوازییەکی بەرچاوو ساف لەنێوان کۆمەڵگای ئەتنیکی و کۆمەڵگای سەربازی دێتەئاراوە. بازرگانەکانی ئەڵقەی نێوان داگیرکارو گروپە ئەتنیکییەکانن. لەسەدەکانی چوارەم و پێنجەمدا بەهۆی شەڕی بەردەوامی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەت قۆناخێکی تاریکی لەناوچە بەڕێوەدەچێت. بەڵام چالاکییەکانی پڕوپاگەندەیی گروپە مەسیحی و مانیگەراکان کەلەژێر ترسی تیرۆرو تۆقاندن دان تاکە چالاکی گرنگی کۆمەڵگایە. رووخانی پالیمێرا، ئەبگارو کۆماگەنە دەبێتە سەرەتای ئەم قۆناخە تاریکە. دواکاتەکانی کۆیلەداری کۆن لەئارادایە. مەسیحییەت موژدەهێنەری قۆناخی نوێیە. ئەو رۆشناییەی دوای تاریکی دێتەئاراوە، بەردەوام باوەڕی پادشای خودایی دەبەخشێ. ئایدیۆلۆژیای رزگاری پێشکەشکراوە. سوپای رزگاری کۆمەڵایەتی ئاواکراوە. هەردوو ئیمپراتۆریەتیش لەناوەخۆ خۆیان دەپووکێننەوە. هێرشە دژوارەکانی گروپە ئەتنیکییەکانی دەرەوە سەرەتا رۆما پارچەدەکات، دواتر رێگا لەپێش رووخانی بەشێکی دەکاتەوە. ئیتر ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی وەك دووەم ئیمپراتۆریەتی رۆما بەدوای میزۆپۆتامیاوەیە. کاتێك پێکدادانی نێوان مەزهەبەکانیشی هاتەسەر، هەروەکو سوننیگەرایی و عەلەویگەرایی ئەمرۆمان، پارچەبوون روودەدات. پێکدادانە ئایینی ــ مەزهەبییەکانیش تەقلی پێکدادانە سیاسییەکان بووە. لەکاتێکدا تێکۆشانی کۆمەڵایەتی لەژێرناوی پۆشاکی ئایینی بەڕێوەدەچوو، پێکدادانە ئەتنیکییەکان رووخساری قەومیان پێدرابوو. پاپا سوریانییەکان، بەتایبەتیش نەستوریەکان تەواو وەکو جەنگاوەری زانیارین. پێکدادانە ئایینی ــ مەزهەبییەکان هاوتەریبی پێکدادانە سیاسی ـ سەربازییەکانن. قۆناخ لەمیانەی چاوەڕوانییەکانی گەڕانەوەی مەهدی و مەسیح و پێخەمبەرەکانی ئاخیر زەمان تێپەڕدەبێت.

حەزرەتی محەمەد لەبۆنکردن و هەستکردن بەزەمەن بەتوانستە. چەندەی دەچێ ئەم باوەڕییە زیاددەبێت کەدەشێ خۆی پێخەمبەری چاوەڕوانکراو بێت. تۆزێ ماوە سەردەمی بەختەوەری سەرهەڵبدات. سەدەکانی شەشەم و حەوتەم قۆناخی لەدایکبوونی ئیسلامییەت و پەلهاوێشتنە مەزنەکەیەتی. هەق دێت، ناهەقی نامێنێ. رۆژهەڵدێ، تاریکی نامێنێ. فەتحکاری یەك بەدوای یەك ئەنجام دەدرێ، ئەمجارە لەباشوورەوە لەدەرگاکانی کوردستان دەدرێت. ئیتر لەجیاتی خانەدان و پادشایەتی، شەڕ لەپێناو ئایینی ئیسلام لەرۆژەڤدایە.

لەدوای سەرکەوتنی قادسیە 647 فەتحکاری ئیسلام لەکوردستان چڕبۆتەوە. شار بەشار بەئیسلامکردنی ناوچەکە دەستپێدەکات. لەکاتێکدا ئێرانییەکان لەرێگای مەزهەبی شیعەگەرایی هەوڵی پاراستنی جیاوازییەکانی خۆیان دەدەن، کوردەکانیش لەمیانەی داکۆکیکردن لەسەر زەردەشتی و عەلەویگەرایی کەپەردەیەکی لاوازی ئیسلامییەتی بەسەردا کێشراوە

هەوڵی درێژەدان بەهەبوونی قەوم و ئەتنیکی خۆیان دەدەن. کوردایەتی سوننی لەبنەڕەتدا ئەو کوردایەتیەیە کەژێرکەوتووە و خیانەتکارە. هەرچەندە ئیسلام وەك وشە بانگەوازی بۆ ئاشتی بکات، بەڵام ئایدیۆلۆژیایەکی بەهێزی شەڕی نەتەوەیی عەرەبە. هەروەکو جیهانگیری رۆژگاری ئەمرۆمان دەخوازێ لەسەر ئاستی دونیا جیهانگیربێت. جیهاد گەورەترین عیبادەتە. هەرشتێك لەرێگای جیهاد (شەڕ) فەتح بکرێت هی تۆیە. ئەگەر خوازیاربی دەتوانی ژێرکەوتووەکان بکەیت بەکۆیلە. وەك خۆی دەتوانی دەست بەسەر ژناندا بگری. هەروەکو شێوازی دەسەڵاتی ئەم ڕۆژگارەمان تەنیا بەفەتحکاری سەربازی ناوەستێ. لەپەلامارەکانی فەتحکاریدا دەستبەسەر تەواوی نرخ و بەهاکانی باوەڕی، کۆمەڵایەتی و ئابووریدا دەگیرێت و کۆنترۆڵ دەکرێ. لەهەمووان زیاتر باڵادەستی زهنی لەئارادایە. ئیسلام وەك ئایدیۆلۆژیای دەرەبەگایەتی بانگەشەی سەرلەنوێ شێوەپێدانی تەواوی کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناوین دەکات. چەمکی تاکە ئوممەتی باوەڕمەند بناخەی کۆمەڵایەتی ئیمپراتۆریەتی ئیسلام ئامادەدەکات کەهەنگاو بەهەنگاو بەرزدەبێتەوە. لەبنەڕەتدا ئایدیۆلۆژیای تاکخودایی کەبەوەستاییەکی مەزن خوڵقێنراوە وەك تاکەدەستڕۆیی کاربەدەست بناخەی ئایدیۆلۆژی سوڵتانێتییە.

ئیسلام کەبەشێوەیەکی کارامە بنکەی جەماوەری باوەڕمەندو لوتکەی سوڵتانی خوڵقاندووە، لەوانەیە لێهاتووترین تیۆری دەرەبەگایەتی ناوەندی جیهان بێت.

گروپە ئەتنیکییە عەرەبەکان کە لەسەردەمی سۆمەرییەکانەوە بەهیچ جۆرێك لەنیمچە دوورگەی عەرەبستان دەرنەکەوتبوون، لەرێگای ئیسلام یەکێك لەگەورەترین رابوونەکانی مێژوو ئەنجام دەدەن. بەرووخاندنی بێزەنتی و ساسانییەکان تینوێتی هەزاران ساڵەی خۆی بۆ دەسەڵات دەشکێنێ. شارستانییەتێکی دەرەبەگایەتی مەزن ئاوادەکات. ئەمەوییەکان (650 ــ 750ی زایینی) و عەباسییەکان (750 ــ 1258) لوتکەی ئیمپراتۆریەتی عەرەب پێکدێنن. پەلهاوێشتنەکانیان بۆ کوردستان بەهێزە، تاوەکو بنارەکانی زاگرۆس و تۆڕۆس بڵاودەبنەوە. کوشتاری گەورە روودەدات. کاروانێکی ئەسکەندەرئاسای حەجاج لەئارادایە. تاوەکو دەروازەکانی ئەستەمبوڵ، پیرنە، هینیکوش و قەفقاسیا هێزی پەلهاوێشتن نیشاندەدەن. لەگەڵ گەیشتن بەساڵی 1000کان موسڵمانێتی گەیشتۆتە لوتکەی خۆی. ئەوەی ساڵانی 1000ی پێش زایین تیرە یەهودییەکان ئەنجامیاندا. لەساڵی 1000ی زایینی هۆزەکانی عەرەب ئەنجامیاندەدا. یەك بەدوای یەك سەلجۆقی و عوسمانییەکانی تیرە تورك ـ ئۆغزەکان هاتن. دواترین سەفەرە گەورەکان سوڵتانە بەڕیشە تورکەکان لەژێر ناوی ئیسلام و سوننیگەرایی بەڕێوەیان دەبرد. پێکدادانە کلاسیکییەکانی سەردەمی عەباسی و سەلجۆقییەکانیش دیسان بەکوردستاندا تێپەڕدەبێ، هێزەکانی بێزەنت و سوڵتانەکان بەشێکی هەرەزۆری شەڕەکانیان بەشێوەی دەستبەسەرداگرتن و لەدەستدانی شارەکانی ناوچەی کوردستان بەسەردەبەن. بەئیسلامکردنی کوردستان تەواو دەبێ. لەئەنجامی شەڕی مەلازگرت ی 1071 سوڵتانی سەلجۆقی ئەلپ ئەرسەلان هێزە بێزەنتییەکان لەکوردستان بەدەردەنێ. هەرچەندە لەسەردەمی میرنشینە تورکەکان شەڕ لەنێوان سوڵتانە ئەیوبییەکان و میرنشینەکان هەبووبێت، بەڵام دیسان شارستانییەتی ئیسلام پێشکەوتن بەخۆیەوە دەبینێ. لەشوێنەکانی وەکو ئورفا، ماردین، دیاربەکر، سێرت، مەڵاتیا و ئەلازخ ئیسلام دەردەکەوێتەپێش. کولتووری ئیسلامییەت هەبوونی مەسیحییەکان، سوریانی و ئەرمەنی دەخاتە ریزی دووەم.

پەلامارەکانی کرستیان و مەغۆلەکانی سەدەکانی سێنزدەهەم و چواردەهەم لەناوچەکە رێگا لەپێش تێکشکانێکی بێوێنە دەکاتەوە. پاشەکشێکردن بۆ شاخەکان بەردەوام دەبێ. دووبارە ناوچەکە دەشلەژێ. ئەمجارە هێڵی شەڕو پارچەبوونی باو لەنێوان سەفەوییەکانی ئێران و عوسمانییەکاندا دەکێشرێ کەناوەندەکەیان لەقەفقاسیاو ئەنادۆڵە. بەجۆرێك لەجۆرەکان دەبێتە نوێکردنەوەی دووالیزمی بێزەنتی ـ ساسانی. لەئەنجامی سەرکەوتنی یاووز سەلیم لەشەڕی چاڵدێرانی ساڵی 1514 ــ بەهاوپەیمانێتی کوردە سوننیگەراکان ـ سنووری رۆژهەڵاتی کۆن لەگەڵ رۆژهەڵاتی دوور دەکێشرێ. بناخەی ئەو پارچەبوونەی

کوردستان دادەنرێت کە تائەمڕۆ بەردەوامە. هەرچەندە لەسەرتاسەری سنوور پەلامار بەرەو ناوەوە ئەنجامبدرێ، لەئەنجامی پەیمانی قەسری شیرین 1639 ئەو پارچەکردنەی کوردستان دێتەئاراوە کە تائەمڕۆ بەردەوامە، بەشێوەیەکی فەرمی هێڵی سنووری نێوان هێزەکانی ئەنادۆڵ و ئێران دەکێشرێ و دانیپێدادەنرێت. زۆربەی زۆری کوردان و میزۆپۆتامیا لەناو سنووری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەمێنێتەوە. تاوەکو سەرەتاکانی 1800ی زایینی لەئەنجامی ئەو هاوسەنگییەی لەنێوان میرنشینە کوردەکان و عوسمانییەکان ئاواکراوە تارادەیەك قۆناخێکی هێمنانە تێپەڕدەبێت. لەکاتێکدا شارستانییەتی ئیسلامی لەسەر ڕێبازی سوننیگەرایی پێشدەکەوت، کوردە زەردەشتی و عەلەوییەکانی بەرخودانیان (خۆڕاگریان) دەکرد لەدۆخێکی نیو یاخیدا ناچاربوون لەلوتکەی شاخەکان و حەشارگە شاراوەکاندا بژین. بەهۆی ترسی یاووز سەلیم لەسەفەوییەکان موراد پادشا (کەنازناوی کراوە بە بیرلێدەر) لەسەردەمی سەدرولئەعزەمی خۆیدا 40 هەزار عەلەوی بەزیندوویی دەخاتە بیرەکان و پیرسوڵتان عەوداڵ لەسێدارە دەدرێ، ئەمانەش نموونەی هەرە بێڕەحمی تیرۆرە کەشوێنپەنجەی خۆی بەجێدێڵێ. سەرهەڵدانی جەلالییەکان (خێڵێکی باکووری کوردستانن) لەئاکامی هەژاری و سەربازی زۆرەملێ و باج وەرگرتن، دواتریش سەرکوتکردنیان، نیشاندەدات کەچۆن چینی ئەرستۆکراتی ئیسلامی شەپۆلەکانی تیرۆریان بەرزکردۆتەوە. تیرۆری عوسمانییەکان بەلانی کەم هێندەی ئەم شەڕانە بێڕەحمە کەرەهەندی دەرەکی هەیە.

لەگەڵ ئەمەشدا بەشێوەیەکی فراوان چالاکییەکانی تیرۆری لەجۆری کوشتنی وەلی عەهدەکان و لەسێدارەدانی سەدرولئەعزەمەکان بەڕێوەدەچێ. زۆر ئاشکرایە لەسەردەمی عوسمانییەکاندا لەژێر سایەی ڕێبەرنامەی سوننیگەرایی؛ شرۆڤەی فەرمی ئیسلام بەشێوەیەکی سامناك و بەرفراوان تیرۆر پەیڕەوکراوە. بەرامبەر بە تیرە تورکمانەکانی شاخیش بەردەوام پەلامارەکانی تیرۆر ئەنجامدراوە.

لەسەرەتای ساڵانی 1800 دوە تاوەکو رووخانی ئیمپراتۆریەت، کوردستان زۆربەی زۆری ئەم قۆناخە بەسەرهەڵدان و سەرکوتکردنەوە بەسەردەبات. سەرتاسەری سەدەی نۆزدەهەم سەردەمی یاخیبوون و سەرکوتکردنە. بەهۆی زیادبوونی کاریگەری ئینگلیزو فەڕەنسا پەلامارەکانی سەرکوتکردن لەم سەدەیە بۆسەر سوریانی و ئەرمەنییەکان زیاد دەبێت کە پەیوەندی خۆیان لەگەڵ ئیمپراتۆریەت خراپکردووە. لەگەڵ تەواوبوونی ئەم سەدەیە، لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا ئەم گەلە کۆنانەی مێژوو دەکەونە رەوشێك تەنانەت کەمێك ماوە بسڕدرێنەوە. ئەو میللیگەراییەی سەرمایەداری دەیوروژێنێ وردەوردە بەرهەمە ژەهراوییەکانی دەبەخشێ. دووچارنەبوونی کوردان بەهەمان چارەنووسی ئەرمەنی و ئاشوورییەکان بۆ جیاوازی ئایین و بەرفراوانی بەرخودانیان دەگەڕێتەوە.

پێکدادانە ئایینی و مەزهەبییەکانی چاخی ناوین بەلانی کەم هێندەی شەڕو پێکدادانەکانی چاخی کۆن کاریگەرییەکی تێکدەرانەی هەبووە. ئاشکرایە کەبەهۆی ئەم شەڕو پێکدادانانە شارستانییەت لەکوردستاندا پێشناکەوێت و گەشەناکات. پێکهاتەی ئەو گروپە ئەتنیکییانەی بەئامانجی خۆپاراستن پەنایان بردۆتە بەر لوتکەی شاخەکان، لەگەڵ ئەو شارانەی بوونەتە بڕیارگای داگیرکاری و تاڵان لەرەوشێکی وەهادا نین پەیوەندییەکی دیالەکتیکی بەدەستبێنن. هەربەشێك لەناو دواکەوتوویی خۆی و رەوشی گۆشەگیریدا دەخنکێ. کاتێك ئیسلام کەمێك رووی ئاشتی بەخۆیەوە بینی، دەبینرێ کەهێزی هەزاران ساڵەی بەکاربردن و زۆرداری لەژێردا شاراوەیە. سوڵتان و بەندەکانی لەژێر دەمامکی هەمووجۆرە تایبەتمەندێتییەکی ئیلاهی لەرێگای ئایەت و فەرموودەکان رژێمێکی زۆرداری و چەوسانەوە بەڕێوەدەبەن. لەکاتێکدا رێگرەکانی شاخ قەباو ئاشکران، هەرچی ئەوانەی شارو دەسەڵاتدارەکانن جوببە لەبەرن، رووزەردی دەم و چاو داپۆشراون، هەمان بەکاربردن و زۆرداری لەئاکامی ئەرێکردنی خوداوەند پەیڕەودەکەن. جیاوازی لەناوەڕۆکدا نییە, بەڵکو لەشێوەدایە.

ئەو تێکۆشانەی بەناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی قۆناخی چاخی بەردینی نوێ دەستیپێکرد و لەمیانەی شەڕەکانی کۆیلایەتی چاخە دێرینەکان زیادیکردو بەشەڕو تیرۆرەکانی دەرەبەگایەتی چاخی ناوین چڕکرایەوە، بەڵێ ئەو تێکۆشانەی لەکوردستان بەرێوەچووە سەرباری هەلومەرجی شەڕو تیرۆر توانیویەتی هەبوونی گەلی کورد بپارێزێ, هەربۆیە چەندەی بڵێی بەهادارە. ئەگەر بەئەندازەی شارستانییەتە پێگەیشتووو بەهێزەکانیش نەبێت، بەلام بەرخودانی ئەتنیکی سەرەڕای هەموو کەموکورتییەکانی فاکتەری سەرەکی لەسەرپێ مانەوەی هەبوونی کوردانە لەم قۆناخە مێژووییە بێئامانەدا.

دوای پەرتەوازەبوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی زیاتر پارچەبوونی کوردستان و بوون بەزەمینەی توندوتیژی پێشکەوت. لەئاکامی ئەو نەخشەیەی فەڕەنساو ئینگلتەرای هێزی چەوسێنەرو ئیمپریالیستی نوێ بۆ رۆژهەلاتی ناوین کێشرا دەسەلاتی کۆماری تورکیا، شاهنشایی ئێران، پادشایی ئێراق و بەڕێوەبەرایەتی سوریا ــ فەڕەنسا لەسەر کوردستان بالادەستکرا. راستتر سەپێنرا و چەسپێنرا. چینی سەردەستی کوردان کەلەژێر سایەی رژێمە نوێکان بەرژەوەندییەکانیان کەوتە ژێرفشار، ئەو یاخیبوونانەی کەسەرچاوەی خۆی لەئارەزووی ئۆتۆنۆمی کۆن وەردەگرت و زۆربەشیان پشتییان بەوروژاندن و هاندانەکانی دەرەوە دەبەست رێگای لەپێش چڕبوونەوەی تیرۆرکردەوە. سەرهەلدانەکان لەپێشخستنی داواکارییە نەتەوەیی و دیموکراتییەکان دوورە. شەڕی داواکردنی بەشی چینی دەرەبەگی کوردبوو لەرژێمە نوێکاندا، چونکە لەجیاکارییەکانی (أمتیازات) سەردەمی پێشوو دەگەڕان. لەفەناتیزمی تاك, نەتەوە، تاك زمان و دەوڵەتی مەرکەزی رژێمە نوێکان کەکاریگەری ئایدیۆلۆژیای میللیگەرایی پشتئەستوور بەسەرمایەداری لەسەرە ئەوەی دەبێتە بەشی کوردان، نکولیکردنێکی لەجاران خراپتر، خستنە ژێرفشار، لەدۆخی یاخیبوونیشدا لەمیانەی کۆمەلکوژی و تواندنەوەی زۆرەملێ لەناو تاریکییەکانی چاخی ناوین دەهێلرێتەوە. بەتەواوی واتای وشە کەوتنە ناو فشارێکی بێکۆتایی جێگای باسە. دەتوانرێ بگووترێ کە لەئاستی جیهان دوای یەهودییەکان ئەو گەل و ئەتنیك و دیاردەیەی لەناوچە لەژێر بەرفراوانترین تیرۆری میللیگەرایی شۆڤێنی دەژیت کوردە. لەلایەن خودی چینی سەردەست و خیانەتکارەوە هێشتنەوەی کوردان لەناو دواکەوتوویی دەرەبەگایەتی، هەروەها ئەو رەوشەی لەئەنجامی واتانەدان بەبزووتنەوەی دیموکراتی نەتەوەیی هاوچەرخ، یەکێك لەرووە هەرە قێزەونەکانی سەدەی بیستەمە.

ئەو سیاسەتەی تورکیا لەسەر پارچەی کوردستانی ژێردەسەلاتی خۆی پەیڕەویکردووە بەشێوەیەکی فەرمی بە "شالاوی لافاو" بەناوکراوە. پلیشاندنەوەو تێپەڕبوون بەهەر شوێنێك بە"باشە" ئەرێکراوە. ئێشی ئیمپراتۆریەتی لەدەستدراویش رۆڵی لەمەدا هەبوو. هیچ نەبێ دەبووایە ئەم پارچانە دووچاری تواندنەوەیەکی موتلەق بێن کەلەژێر دەسەلاتیدا مابۆوە. قەدەخەکردنی زمانی زگماکی کوردان لەرژێمی $12$ی ئەیلول پراکتیزەکرا، ئەمەش نموونەکەی لەهیچ قۆناخ و رژێمێکی جیهاندا نەبینراوە. سەرباری تێکۆشانی کۆمەڵایەتی هەزاران ساڵ، جگە لەشەڕە بێئامانەکانی تالانکاری و داگیرکردن، چارۆگەیەکی رەش بەسەر تەواوی ئەو بەهایانەی کۆمەلگا پۆشرا کەکوردایەتییەکەیان نیشاندەدات. تەنیا لەمیانەی هەوڵ و کۆششێکی چڕو بەرفراوانی ئەدەبیات و کۆمەڵناسی سەبارەت بەژیانی کوردەکانی ژێر ستاتۆی کۆماری تورکیا دەشێ هەندێ راستی رۆشنبێتەوە.

شاهێتی پەهلەوییەکان کەوەك خانەدانێکی نوێی ئیمپراتۆریەت لەئێران بەرزبۆتەوە کردارو رەفتارەکانی لەهی کۆماری تورکیا جیاوازتر نییە. بزووتنەوەکانی کورد لەسەرهەلدانی سمکۆی شکاك تادەگاتە ئەزموونی کۆماری کوردستان لەمەهاباد بەهۆی فاکتەرە ئایدیۆلۆژی و چینایەتییە هاوشێوەکان بەسانایی پاکتاوکران. دواتر لەئاکامی رژێمێکی چڕی تیرۆر هەلۆێستەکانی میللیگەرایی شۆڤێنی زالکران کەتایبەت بەسەدەی بیستەمە. کردەوەکانی ئینگلتەراو فەڕەنسا لەسەر کوردستانی ئێراق و سوریا، بەپشتبەستن بەخانەدانە عەرەبە بەکرێگیراوەکان بەشێوەی بالادەستکردنی رژێمەکانی چەوسانەوەو سەرکوتکردن بوو.

ئەوەی لەسەدەی بیستەم بەسەر دیاردەی کورد پەیڕەوکرا سیاسەتی "خستنە قەفەس و کردن بەئاژەڵێکی ماڵی ــ کەوی" بوو کەلەدونیادا نموونەی نەبینراوە. هیچ نیشانەیەکی ئەوە لەئارادا نییە وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی کوردانیان بەمرۆڤ لەقەڵەمدابێت. تەنانەت ئەو سیاسەتەی لەئەفریقیا سەبارەت بەکۆلۆنییەکان پەیڕەوکراوە ئەویش بۆ کوردان زیاد بینراوە. تەنانەت سیاسەتە ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، یاسایی و سەربازیش، شێوەکانی فشاری کۆلۆنیکردن و نەتەوەیی و ئەتنیکی هاوچەرخیش زێدە بینراوەو، پەیرەونەکراوە. بەنەبوو لەقەڵەمدان (سەرۆك وەزیرانی نوێ رەجەب تەیب ئەردۆغان راستینەی دەوڵەتی قووڵی باش ئەزبەرە کردووەو دەڵێ "ئەگەر خۆت بەکورد لەقەڵەمنەدەی، ئەوا کێشەی کورد بوونی نییە") چەمکی "بەوڕادەیەی سەر بەنەتەوەو مەزهەبی دەسەڵات بیت، خۆت بەنەبوو لەقەڵەمبدەیت پەسند دەکرێی" لەبنەڕەتدا یەکێك لەشێوە مەترسیدارەکانی فاشیزمە. ئەوەی سەر یەهودییەکان ئاشکراو بەرچاوە. لێرە جۆری نکوڵیکردن شاراوەو تاریکە. ناوزەدکرنی ئەو تیرۆرەی لەسەر کوردان پەیڕەو دەکرێ بە"تیرۆری رەش" یان تیرۆری شاراوە لەجێگای خۆیەتی. سیاسەتێکی ناکۆك و مەترسیدار لەکوردستان و ناوچەکە پەیڕەودەکرێت کەلەکۆتاییەکانی سەدەی بیستەم و سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکەم بۆ کردارەکانی ئەمریکا کراوەتەوە. هەرگیز بەبێ ئەمریکاو یەکێتی ئەوروپا ناتوانرێ بیرلەفیدرالییەتی کوردانی پارچەیەك و تەسفیەکردنی "PKK" و کوردانی پارچەی هەرە گەورەی کوردستانی ژێردەسەڵاتی تورکیا بکرێتەوە. دەشێ گەمەیەکی زۆر خراپتر لەوەی فەلەستین ــ ئیسرائیل لەنێوان کوردستان و دراوسێکانی بنێنەوە. دەشێ تایبەتمەندێتی "سامناك"ی بۆ سیاسەتەکانی تێکۆشان، شەڕو تیرۆر زیادبکرێت. لەهیچ قۆناخێکی مێژووو شوێنێکدا، نموونەی سیاسەتی بەمجۆرە نەبینراوە کەگەیشتبێتە ئاستی سامناکی و لەسەر هیچ کۆمەڵەیەکی مرۆڤ پەیڕەونەکراوە، هەمووشتێکیش بەشێوەیەکی وردو تەڵەکەبازی و بەرنامەڕێژی بەگوێرەی ئەم سیاسەت و توندوتیژییە نەخشە بۆکێشراوە پێوانەنەکراوە.

یەکسەر دەمەوێ ئاماژە بەو مەسەلەیە بکەم کەوەکوجاران هەوڵبدەین ئەم سیاسەتانەی شەڕ تەنیا بەچەوسێنەری نەتەوەیی تورك، فارس، عەرەب و گووتەکانی نکوڵیکردن و فڕکردنەوە روونبکەینەوە تێرناکات و بەرەو ئەنجامی چەوتمان دەبات. دیاردەکە زیاتر پەیوەندی بەسیستەمی کۆمەڵایەتی و مێژوویی گشتگیرتر هەیە. بەهەمان شێوە گووتەی بەتەنیا دەوڵەتەکانی عەرەب، فارس و تورك بەرامبەر کردەوەو رووداوەکانی کوردستان بەرپرسیارن داتاشراوەو بچووککردنەوەی بوویەرەکەیە. دوورە لەروونکردنەوەی پێکهاتەی راستەقینەی دیاردەکە. هەروەکو مەزەندە دەکرێ هیچ سوودێکی نەتەوەو دەوڵەتی تورك، فارس و عەرەبی تێدا نییە. خودی دەوڵەتی نەتەوەییش خاسیەتێکە؛ پێناسەیەکی ئایدیۆلۆژییە، خودی راستی نییە. نەتەوەکان دەوڵەتیان نابێت. تەنانەت بەواتای تەسك چینەکانیش دەوڵەتیان نابێت. دەوڵەت بەلانی کەم نەریتێکی پێنج هەزار ساڵییە وەکو تۆپە بەفرینە ـ تۆپی ئاگرین خولاوەتەوە سوڕاوەتەوە تاڕۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە، بۆچەندین پارچە دابەش بووە، هەندێ ئەتنیك زۆر هەندێکی دیکە کەم بەکاریان هێناوە، ئەوانەی بەکاریشیان هێناوە تەواوی ئەتنیکەکە نەبوون بەڵکو هەندێ گروپی پلەدارو چینایەتی بوون.

لەوانەیە گروپە ئەتنیکییەکانی تورك، عەرەب و فارس بەئەندازەی کوردان فشارو چەوسانەوەیان لەلایەن دیاردەی نەتەوەو دەوڵەت بینیوە. ئەگەر بڵێین ئەوەی تورکمانەکان چەشتوویانە، بەدەویەکان تێیدا ژیاون و راستینەی خولامەکان لەهی کوردان کەمترە، خەڵەتاندنە. هەڵبەتە پرسیاری کامە کورد زۆرگرنگە. بەرپرسیاری گەورەی ئەم سیاسەتانەی شەڕ فیۆدالیزمی کوردە. ئەو گروپەیە کەبەگێتی، میرێتی، حاجییەتی و مەلایەتی وێناکردووە. ئەگەر سەرهەڵدانە ئاژاوەگێرییەکانی ئەمانە نەبووایە کەدواتر زۆر بەسووك و ریسوایی تەسلیم دەبوون، هیچ دەوڵەتگەرایی و نەتەوەگەراییەکی تورك، عەرەب و فارس ئەم کردەوانەی دانەدەهێنا کەلەئارادان. هەربۆیە ئەگەر کوردان بەدوای فاکتەری خراپەی ستراتیژی دەگەڕێن، پێویستە لەناو خیانەتکارەکانی خۆیان لێبگەڕێن. تەنانەت پێویستە بەردەوام و لەهەموو شوێنێك ئەم لێگەڕینە بکەن. بەهەر پێڕەوو

ئامانجێك بێت. چونكه ئەمانه لەپێناو بەرژەوەندییه ڤێزەونەكانیان، لەمیانەی ئەو گەمانەی تراژیدیای فەلەستین ـ ئیسرائیل تێپەڕدەكات گەلی كوردو دەسـەڵاتەكانی هێناوەتـه بەرامبەریـەكترو دواتـریش خۆیـان لـەناو مەسـەلەكە دەردەكەون، بەرامبـەر بەخیانەتەكەشیان ماڵ و موڵكی خۆیان دەپارێزن. تەنانەت لەمەترەپۆل و هەوارگە و شـوێنگەكانی رابـواردن نیـشتەجێدەبن و بەبێ وەستان بەدرێژایی هەزاران ساڵ درێژە بەم گەمە نەفرینلێكراوە دەدەن.

هەرچەندە كەوتبێتە ناو ڤلّفی داستانەوە هەوڵمدا مێـژووی ئـەم سیاسـەتە روونبكەمـەوە كەبـەلانی كـەم پێـنج هـەزار سـاڵ دەبێ ـ لەسەردەمی گلگامێش و ئەنكیدۆوە ـ. لەو بـاوەڕەدام كەلەسـەدا نـەوەدونۆی تـورك، عـەرەب و فارسـەكان وەك نەتـەوەو دەوڵـەت سـوودێكی راسـتەڤینەیان لەسیاسـەتی پـەیڕەوكراوی جەمـسەری دەسـەڵاتدا نییـە. سـوودیان لـەولاوە بمێنێـت، بـەهۆی دواكەوتوویی، دوژمنكاری، كۆكردنەوەی كینی نابەجێ، توندوتیژی دوولایەنە، لەخۆڕا خەرجكردنی سەرچاوەكان و لەئەنجامـدا رێكردنەوەیان لەپێش ژیانێك كەشایستەیان نییە، زیانێكی گەورە بەخۆیان دەگەیەنن. بۆئەوەی ئەم رەوشە نەزۆكییە ترسناكە و گەمە پڕ لەنهێنی و ئەفسووناوییە رۆشنبكرێتەوە ئـەو رێگەچارەیەی پـەنای ببردرێتـە بـەرخودی كۆمەڵناسـییە. بـەڵام بـاس لەكۆمەڵناسـییەكی راسـتەڤینە دەكـەم؛ سۆسـیۆلۆژییەك كەدەسـەڵات و پاڵپـشتەكانی رێگـای لەپێـشكردۆتەوە شـەڕو پێكهاتـە كۆمەڵایەتییەكانی، سەرجەمیان شیكردبێتەوە. ئەگەرنا باس لە"زانستی لاشە (تشریح)" ناكەم كەیەكپارچەیی جەسـتەو ژیـان نابینێ، رێزو خۆشەویستی لەلا نییە، تەنانەت ئەنجامەكانی لە"زانستی ڤەدەرگەرایی" راهیبە سۆمەرییەكانیش مەترسـیدارترە كەپشت بەجوڵەی ئەستێرەكان دەبەستنێ. گرنگترین كۆمەكی لەڕێگای ئەم بەرگرینامەیەوە پێشكەشم كـردووە، دەمـامكی ئـەم زانستەم هـەڵماڵیوەو كـەمێكیتر بـەرەو راسـتی نـزیكم كردۆتـەوە. ئایـا میللیگـەرایی زانـستە؟ ئایینگـەرایی زانـستە؟ سۆسـیالیزم زانـستە؟ لیبرالیـزم زانـستە؟ موحافەزگـەرایی زانـستە؟ بـەڵكو بتپەرسـتییەك بێـت كـەزۆر لـەو بتپەرسـتییەی چـاخی دێـرین دواكەوتووتربێ كەسەردەمی بەسەرچووە. چونكە زیانی ئەو بتپەرستیانە زۆر سنووردرابوو. ئەی سنوورو حیسابی ئەم زیانانە دیارە كەبتگـەرایی ئـەم بیرۆكانـە خوڵقاندوویانـە، كەراسـت و چـەپیان دیارنییـە؟ تەنانـەت باوەڕمەنـدەكانی گرێـدراوی كتـێبی ئایینێكی پیرۆزیش ـ هەوڵمدا شرۆڤەی كۆمەڵناسی هەندێ لایەنی ئەم پەرتووكانە بكەم ـ بەرامبەر گرێدانیان بەو بەهایانـەی كەمەزەندەی زانینی دەكەن، تا چ رادەیەك دەتوانێ گرێدراوی دەستنیشانەكانی بابەت و لاشـە بتئاسـاكان بـن، یـاخود سـوود لـێ ببینن؟ لەبەشەكانی داهاتوودا سەبارەت بەم بابەتانە رەخنەدانی خۆم پێشدەخەم و دەگەڕێمەوە سەر بابەتەكە.

بە جەختكردنەوە باس لەوە دەكەم ئەگەر بەشێوەیەكی راسـت دەسـەڵاتی سەركوردسـتان و ئـەو شـەڕەی پـشتی پێدەبەسـتێ شیتەڵ نەكرێت، ئەوا زیانێكی گەورە بەهەركەس و دەوڵەت و گروپی سیاسی و كۆمەڵایەتی دەگەیەنێ كـە بەكێـشەی كوردەوە خەریك دەبێ یان تێیكەوتووە. بەهەرحاڵ ئەمە دەبێتە واتادارترین پێڕەوی هەڵوێستەكانی سەرلەنوێ رەچاوكردنەوەی خـودی لایەنـەكانو، دەسـتبەردان لەهەڵـە و چـەوتییە گـەورەكان و لەسەرشـێتی و گەیـشتن بەچارەسـەرییە مرۆییانـە بـێ ژمارەكـان. هەرهەڵوێستێكی میللیگەرایی و ئایینگەرایی و چەپڕەوی پشت بەفەناتیزم ببەستێ ئینجا ئەمە چەوسێنەر بـێ یـان چەوساوە, یـان سـەركوتكەرو سـەركوتكراو, لەمیانـەی ئێـشە دژوارو زیانـە مەزنـەكانی شـەڕەكانی سـەدەی بیـستەم سـەلمێنراوە كـەرێگای چارەسەری نییە.

هەروەكو لەچوارچێوە گشتییە مێژووییەكەشمان دەركی پێدەكرێت، پەیڕەوەكانی تیرۆر، شـەڕ، پێكـدادان و تێكۆشـانی وەكـو كوردسـتان جەمـسەرێكی دەسـەڵاتی تایبـەت بـەخۆی پێكـدێنێ. ئـەم جەمـسەرانەی دەسـەڵات كەلەتـەواوی سیـستەمە دیـارو بەرچاوەكانی مێژوو هەبوونی خۆی چڕدەكاتەوەو بـەردەوامی پێدەدات، لەمیانـەی پـشتبەستن بەشـەڕو هێـزی سـەربازی هـیچ خانەیەكی كۆمەڵگا نامێنێ وەك هەویر نەیشێلێ و شێوەی پێنەدات.

لەراستیشدا وایە ئەوەی لەسەردەمی حەزرەتی نوحەوە بەدەسەڵاتبووە، بووە بەگوزارشتی دەزگایی جەمسەرەکانی دەسەڵات، نەریتەکانی توندوتیژی دەستنیشانی دەکات. لەزەمەنێکدا وەك چیرۆك بووە بەمیتۆلۆژی، لەسەردەمێکی دیکەدا بەئایینی شکۆدار ناوبراوە، ئەم ئامرازانەی توندوتیژی کە لە چاخەکەمان بەناوی نەتەوەکەمان و چینەکەمان وەك میللیگەرایی و سۆسیالیزمگەرایی بەدوای مەشروعییەت و کارابوون دەگەڕێ، هیچ خانەیەکی کۆمەڵگا نەماوە کەدەستیان بۆ نەبردبردبێ، هەوڵی دەستنیشانکردنیان نەدابێ. لەبنەڕەتدا کێشەی کورد لەئەنجامی شێوازی پێکهاتنی ئەم دیاردانەی پێیدا تێپەڕیوە سەرهەڵدەدات. خودی دیاردەی کورد بەهۆی شێوازی پێکهاتنی تەواو بووە بەحەشارگەی گرفتەکان. لایەنی هەرە بەترس و پڕ لەئێشی مەسەلەکە، تاڕادەیەکی مەزن لەدەستدانی توانستی ئەم دیاردەیە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان. بەهۆی ئەو گرفتانەی بەدەستییەوە دەناڵێنێ دیاردە هەناسەی لەبەربڕاوە. پێویستە باس لەو خانانەی کۆمەڵگای کورد بکرێ کەلەخانەکانی نەخۆشی شێرپەنجە دەچێ. پێشینان گوتوویانە"دار کرمی لەخۆی نەبێ تەمەنی هەزار ساڵە". بەمشێوەیە ناسنامەی کوردو کەسایەتییەکەی لەگەڵ جەماوەر لەناوەڕاستدا دەوەستێ. لەزمانی کوردییەوە تادەگاتە پارتییەکانی ئەگەر هەبێت، لەژنی کوردەوە تادەگاتە ئەو ڕێبەرانەی گوایە بەناوبانگن، لەلادێیی تاشارستانەکەی، لەڕووناکبیرەکەی تا مەلاکەی، لەئایینەوە تا دەگاتە میللیگەراییەکەی، لەوڵاتپارێزەکەی تا خیانەتکارەکە، لەدیپلۆمات تادەگاتە سیاسەتمەدارەکەی چەندین بێچارە، ساختەکار، فێڵباز، خیانەتکار، مەترسیدار، باش، جوان و دروست هەن کەتەنانەت ئەلفوبێیی کارەکانیشیان نازانن؟ پرسیارێکە خەملاندنی وەڵامەکەی قورسە. بەرپرسیارەکەی کییە؟ پارچەکانی دەسەڵات کەلەرۆژگاری ئەمڕۆمان و مێژوودا شێوەیان وەرگرتووە ئەقڵ بڕ ناکات چەندەو تا چ رادەیەك بەڕاستی خزمەتیان بەکێ کردووە، بۆیە لەئەنجامدا ئەوەی لەسەر پێیان دەگرێ ئامرازەکانی توندوتیژی رابردووو رۆژگاری ئەمڕۆمانە، هەمووجۆرە شەڕو تیرۆرێکیانە. ئەمانەیە کەدیاردەی کۆمەڵگای کوردی دیارکردووە، لەدۆخی ئێستادا بەبەرپرسیارو بێچارەیی هێشتۆتەوە.

بەپێچەوانەوە کاتێك لەمیانەی راپەڕین و پێڕەوەکانی لەشێوەی گەریلایی بەرخۆدان نیشانبدرێت، ئەوا راستینەی دەردەکەوێتەڕوو، مۆدێلێکی پێکدادانی فەلەستین ـ ئیسرائیلە کەهێشتا زۆر پێشنەکەوتووە، کاتێ پەرەبسەنێ ئەویش تێپەڕدەکات. لایەنەکانی ئەمە بەهەر چ بەرژەوەندییەك بەناو بکەن، ئایا دەتوانن لەرێگای مۆدێلی بەمجۆرە گرفتێکی کۆمەڵایەتی بەرەو باشترو جوانتر چارەسەر بکەن؟ ناشێ کوژاندنەوەی ئاگر بەئاگر واقیعی بێت. لەدۆخێکی وەهادا شتی هەرەراست ئەوەیە وەك حیزبە جەنگاوەرەکانی ـ دەسەڵات پێڕەوەکانی چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکانی دەستی لێبەربدرێت. پێویستە ئامرازی هێزەکانی بەرخودانیش لەناو ئەمانە دابنرێت. دەبێ لەشوێنێکی دیکەو جۆرە پێڕەوو رێچکەیەکی دیکە بگەڕێن.

پێویستە چاوەڕوانی پێڕەوی شیکردنەوەی شێواندنە گەورەکانی دیاردەی کورد لەئامێرەکانی شەڕ نەکرێت ـ بەتایبەتیش هێزەکانی دەسەڵات کەتوندوتیژی زاڵیان بەدەستەوەیە. بەهەرحاڵ ئەوەی پێویستە لەسەرەتاوە ئەنجام بدرێ، ئەگەر لایەنی بەرامبەر لەمیانەی توندوتیژی بانگەشەی سەپاندنی شتێك نەکات، شێوازی سیاسی ئاشتی و دیموکراتییانەی کێشەکان بەبناخەدابنێت و بەو هۆکارانەی ببەستێتەوە کەجێگای راستگۆیی و متمانە بێت، پێویستە هێزی حوکمڕانیش ئامێری سەربازی بەلاوە بنێت، لەسەرهەمان بنەما وەڵامبداتەوە. بەجێهێشتنی گفتوگۆ و رێگاکانی چارەسەری بۆ ئامرازەکانی دیالۆگی مەدەنی و دیموکراتی، بەو رادەیەی شتێکی مرۆییانەیە ئەوا لەبەرژەوەندی بەشی زۆری کۆمەڵگاو ئابووری دایە.

لەساڵی 1982 کتێبەکەی "رۆڵی توندوتیژی لەکوردستان"م کۆکردەوە. مەزەندەم کردبوو کەتوندوتیژیم شیکارکردووە. پراکتیکی دواتر نیشانیدا کەئەم باوەڕهێنان و متمانە بەخۆکردنەم پڕ لەکەموکورتی بووە. لەکاتێکدا ئەم دێرانە وەك دەروازەیەك دەستنیشان دەکەم و سەرلەنوێ بۆ رۆڵی توندوتیژی لەکوردستان دەگەڕێمەوە، لەراستیدا ئەمجارە متمانەکەم

واقیعییه. چونکه قووڵایی زانستی هەنووکەیی بەدەستهێناوه. هەوڵمدا لەمیانەی هەستکردن و دەرککردن بەوەی کەهەروەکو مەزنەندە دەکرێ ڕێگای چارەسەری بە"توندوتیژی پیرۆز" تێپەڕنابێت، بەپێچەوانەوه زۆر پێویست و ناچاری نەبێت لەدەرەوەی "بەرگری ڕەوا"ئەوا پێویستە هەمووجۆرە توندوتیژییەکانی پراکتیکی مرۆڤ نەفرەتی لێبکرێت، هەروەها هەوڵمدا بەرپرسیارێتی شیکارکاری کێشەی کوردو دیاردەکەی نیشانبدەم.

3 ـ سیاسەتەکانی تواندنەوەی زۆرەملێیانە لەسەر کولتووری کوردستان

یەکێك لەسیاسەتە کۆمەڵایەتییەکانی هەرەزێدە لەلایەن جەمسەرەکانی دەسەڵات و شەڕ هانای بۆ بردراوە تواندنەوەو وەك خۆلێکردنە. بەدەستەواژەییەکی گشتی ئامانجی سەرەکی سیاسەتەکانی لەخۆچوواندن (Asimilasiyon) کەبەواتای تواندنەوەی کولتووری دێت، بۆئەوەی تەواوی توانستەکانی هێزی بەرخودانیان لەدەستدەربهێنرێ، بەرلەهەموو شتێك گوزارشت لەقەدەخەکردنی زمانی زگماگی دەکات کەئامرازی سەرەکی بەکارهێنانی هزرەو لەجێگای ئەو بەشێوەیەکی بەرفراوان بەجێکردن و بەکارهێنانی هێزە دەسەڵاتدارەکانە. لەڕێگای زمانی فەرمییەوە زمان و کولتووری خۆجێیی بێ بەهادەکرێت و هێندە سنووردار دەکرێت ئیتر ناتوانێ لەهەڵسوڕاندا ڕۆڵ ببینێ. هەرچی زمان و کولتووری سەرکوتکراوو ژێرفشارە زیان بەوانە دەگەیەنێ کەبەکاریدێنن. لەژێر ئەم دووڵایەنەدا ڕۆژبەدوای ڕۆژ خۆڕاگرتنی زمانی خۆجێیی بەرامبەر زمانی فەرمی ئاستەم دەبێت. بەتایبەتیش کەنەبووبێتە زمانی نووسین و شێوە زمانێکی گشتی بۆخۆی دانەنابێت، ئەوا کۆتایی ئەم زمانەو زاراوەکانی نادیارو تاریك دەبێت. تواندنەوەو لەخۆچوواندن تەنیا لەبواری زمان بەڕێوەنابردرێت, بەڵکو لەتەواوی ئەو دەزگایانە پەیڕەو دەکرێت کەدەسەڵات شێوەی پێداوە. لەهەموو ئاستێکدا گونجاندنی گروپ بەگوێرەی ڕاستینەی دەزگای ئایینی و نەتەوەیی دەسەڵاتداران پەیڕەو دەکرێت. کاتێك بوارەکانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری تەنانەت ئەو ڕامانانەی بەفەرمی ناسراوە لەلایەنی یاساوە پارێزرا، ئەوا دەزگای کەمایەتییەکانی دیکە یاخود دۆڕاوەکان بەگوێرەی دەزگا باڵادەستەکان خۆیان دووچاری لێکچوواندنی زۆرەملێ یاخود خۆبەخشانە دەکەن و جێگای خۆیان لەناو فەرمیبووندا دەگرن. چەندە بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری و فشار بکەوێتەگەڕ، بەو ئەندازەیە توانەوە ڕۆڵ دەبینێ.

بەلانی کەم هێندەی شەڕو تیرۆر تواندنەوەی زۆرەملێ (ئاسیمیلاسیۆن) ڕۆڵێکی تێکدەرانەی لەسەر هەبوونی کولتوری کوردستان هەیە. دەتوانین هەمان پێڕەوی مێژوویی پەیڕەو بکەین و تاوەکو چاخە سەرەتاییەکان بگەڕێینەوە. ئەگەر بڵێین زمانی سۆمەری یەکەمین و گەورەترین زمان و کولتووری تواندنەوەیە ئەوا بەزێدەڕۆیی لەقەڵەم نادرێت. لەرێکخستنی وشەو ڕستەدا دەرك بەم ڕاستییە دەکەین. بەڕیزە بەر لەزمانی هۆری، میتانی، ئورارتوو، مادو فارسی، زمانی سۆمەری، دواتر زمانەکانی بابلی و ئاشووری کەبەڕیشە ئەکەدین، دواترینیشیان زمانی ئارامی گەورەترین زمانەکانی تواندنەوەبوون لەرۆژهەڵاتی ناوینی چاخە سەرەتاییەکاندا. دەتوانرێ ئەم ڕاستینەیە لەنووسینە هەڵکۆڵراوەکانی هیتیت، ئورارتوو، میتانی، مادو پارسەکاندا ببینرێ. هەروەکو زمانی ئینگلیزی ئەمڕۆ زمانی ئارامیش کەزمانی "نێوان ئەتنیکەکان"ی قۆناخ بوو ئامرازی ڕێککەوتنامە هاوبەشەکانە. بەتایبەتیش نموونەیەکی زۆر بەرچاو دەکەوێت ئەوەیە زمانی بیرۆکراتی دەوڵەت و ئەرستۆکراتی ئارامییە. زمانی خۆجێیی و ئارامی هەردووکیان بەکاردەهێنرێ. هەروەکو چۆن لەرۆژگاری ئەمڕۆشمان زمانی باڵای دەسەڵاتداران لەپەیوەندی دەوڵەتاندا بنچینەییە، لەو قۆناخانەشدا زمانی ئارامی ــ پێشتریش سۆمەری و ئەکەدی ــ زمانی بنچینەییە، هەرچی زمانی خۆجێییە ئامرازی دانوستاندنی ئەو دەوروبەرانەیە کەخوێندن و نووسینیان نییە. شیمانەی لەپێش ئەوەیە توێژی ئەرستۆکرات بەزمانی ئەو دەوڵەتە قسەیان کردبێت کەبەکرێگیراوێتی بۆدەکەن. هەروەکو بەڕێوەبەری دەوڵەتە پاشکۆکان کەبەئینگلیزی و فەڕەنسی دەدوێن.

لەکۆتەڵەکانی پارسەکاندا جێگای زمانی ئارامی ئاشکرایە. وەك زمانی هاوبەشی دیپلۆماسی و بازرگانی قۆناخ لەتەواوی ڕۆژهەڵاتی ناوین بەکارهێنراوە. لەتەواوی بەڵگەکاندا دەبینرێ کەلەبوارەکانی بیناسازی، بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت، ئەدەبیات و یاسادا بەشێوەیەکی بەرفراوان تواندنەوە ڕۆڵی بینیوە. مەزەندە دەکرێت کەحەزرەتی عیساش زمانی ئارامی زانیوە. زمانی سوریانیش کەشێوەی نەتەوەیی زمانی ئارامییە ئامرازێکی دیکەی بەربڵاوی تواندنەوەیە. لەبەرئەوەی زمانی عیبرانی سنوورێکی بەرتەسکی کاریگەری هەبوو، ئەوا زمانی هێلینی کەلەرەوشی پەلهاوێشتنی بەرامبەربوو پێبەپێ کاریگەری لەسەر ڕۆژهەڵاتی ناوین دەکات. هەروەکو ئینگلیزی و فەرەنسی ئەمڕۆمان هەردوو زمانی هێلینی و سوریانیش لەناو پێشبڕکێدا بوون. هەردووکیشیان لەکوردستان، بەتایبەتی لەشارەکانی مەیدانی شەڕن کاریگەری دەکەن. ئورفا نموونەیەکی بەرچاوی ئەم دۆخەیە. خاوەنی ڕەهەند و قووڵایی کولتوورێکە کەزمانەکانی ئارامی، ئەرمەنی، سوریانی، عەرەبی و کوردی و تەنانەت هەرە دواییش لەناو زمانی تورکی ژیاوە. بەڵام تواندنەوەو لێکچوواندنی ئەوپەڕگەری ڕێگا لەپێش تێکەڵەیەکیش دەکاتەوە. دەشێ لەرەوشی ئورفای ئەمڕۆشماندا دەرك بەم ڕاستییە بکرێت.

شوێنگەی زمانی سوریانی لەکولتووری کوردستاندا لەزمانی عەرەبی لەپێشترە کەدواتر دێتە گۆڕەپانەکەوە. دەتوانرێ بگووترێ وەك زمانی ڕۆشنگەری ڕۆڵی بینیوە. بەشێوەیەکی سەرەکی نیشتەجێبوونی سوریانییەکان لەشار ئەم ئەنجامە دەخوڵقێنێ. کوردان وەك گەلی کۆماگەنە زمانی قسەکردنی ڕەوەندو گوندییەکان، زاراوەکانی زمانی کوردی بەکاردێنن. سەرچاوەی نووسراویان سنووردارە. ئەمەش بەو واتایە نایەت کەنەیانتوانیوە. بەتایبەتی چەندین بەڵگەی نووسراوەی لەپایتەختی میتانییەکان واشوکانی دۆزراوەتەوە، ئەوە نیشانیدەدات کە لەساڵانی 1500ی پێش زایین زمانی کوردی ــ سەرەتایی وەك زمانی نووسین بەکارهاتووە.

لەساڵانی 300 ـ 250ی پ.ز لەکوردستان لەسەردەمی پادشایەتییەکانی هێلین، هەبوونی گەلی بەریشە هێلین بەتایبەتیش فورساییان لەشارەکان، ئەوە نیشاندەدات بۆ ماوەیەکی درێژ زمانی هێلینی بەکارهاتووە. بەجۆرێك لەجۆرەکان ڕۆڵی زمانی داگیرکەری دەبینێ. هەروەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان لەکاتێکدا شارەکانی کوردستان بەگوێرەی زمان و کولتووری بیانی دەژین، گەلی ناوچە شاخاوی و لادێییەکان لەناو زمان و کولتووری خۆجێیدا دەژین.

ئەو زمانەی لەگەڵ هاتنی ئیسلام دەردەکەوێتە پێش عەرەبییە. زمانی عەرەبی کەسەرەتا زمانی بەدەوییەکانە، لەگەڵ بەشاربوون و لەدایکبوونی ئیسلامییەت بوو بەزمانی زانست و بەنرخترین زمانی ڕۆژهەڵاتی ناوین. وەك زمانی فەرمی شەڕو دەسەڵات عەرەبی باڵابوونێکی مەزنی بەدەستهێنا. بەرامبەر زمانە لاوازەکانی ئەفریقیا لەتەواوی باکووری ئەفریقیا تاوەکو باشووری زنجیرە چیاکانی زاگرۆس ـ تۆرۆس بڵاوبۆوەو بووە زمانی باڵا. کولتوورو زانستیش ئیتر لەڕێگای زمانی عەرەبی ئەنجامدەدرێ و پەیڕەودەکرێت. جیاکاری هەیە، ئەوەی بەکاریبهێنێ دەتوانێ جێگای خۆی لەبیرۆکراسیدا بگرێ، دەتوانێ بچێتە ناوچینی زانست و بەزانستەوە خەریك بێ. هەربۆیە عەرەبی زمانی بەرزبونەوەو تۆکمەکردنی بەرژەوەندییەکانە. گرنگییەکەی تارۆژگاری ئەمڕۆ بۆ ئەم ڕاستییە بابەتیانە دەگەڕێتەوە. لەدوای عەرەبی ئیتر کاریگەرییەکانی زمانی فارسی سنووردارە. ئەویش لەبەرئەوەی بەتایبەتی لەدەسەڵاتی سەلجۆقییەکاندا لەئێران زمانی فەرمی بوو هەربۆیە بڵاوبۆوە. کاتێك سەلجۆقییەکان دەستیان بەسەر ئەنادۆڵدا گرت و لەناوەندی قۆنیا دەوڵەتێکیان دامەزراند دیسان زمانی فەرمییان فارسی بوو. مەولانا کتێبی مەسنەوی بەزمانی فارسی نووسیوە. زمانی تورکی هاوشێوەی زمانی کوردی لەو قۆناخەدا زیاتر زمانی قسەپێکردنی گەلی ناوچە لادێییەکانە.

زاڵبوونی زمانی عەرەبی لەکوردستان زۆر بەکاریگەرە. بەتایبەتیش کاتێك چینی "مەلا" کان بەکارهێنانی زمانی عەرەبی بۆ پەرستن دەکەن بەپێویستییەك، ڕۆڵێکی سەرەکی لەمەدا دەبینێ، هەروەها حەزکردن لەشێوازی ژیانی عەرەبەکان

لەشـارەکاندا زاڵ دەبـێ. لەجلوبەرگـەوە تادەگاتـە دیـاریکردنی رەچـەڵەك، هاوشـێوەبوونی عەرەبـەکان دەبێتـە مۆدێلێـك. لەباسکردنی چیرۆکەکانی بنەماڵێتیدا خۆگرێدان بەقولپێکی (رەگێکی) عەرەبەکان دەبێتە رێورەسمێك. لەبوارەکانی پـەروەردە، فێربوون، مۆدە، سیاسەت، دیپلۆماسی، هونەرو زانستیشدا بەسەر زمانێکی وەکو فارسیشدا کاریگەر دەبێت کـەخاوەن ئـەزموونی دەوڵەتە. بەنیوەیی دووچاری داگیرکاری زمانی عەرەبی دێت. تەواوی خەڵکی رۆژهەڵاتی ناوین ناوو نازناوی عـەرەبی لـەخۆیان دەنێن. ئەم باڵابوونە تاوەکو پێشکەوتنی دەوڵەتی نەتەوەیی و هۆشیاری نەتەوە بەفراوانی بەردەوام دەبێت.

بڵاوبوونەوەی سیستەمی سەرمایەداری و شێوەگرتنی "دەوڵـەتی نەتـەوەیی"، قۆنـاخی تواندنـەوەی سـەرزمان و کولتـووری کوردانی چڕترکردەوە. جگە لەفشاری هەردوو زمانی عەرەبی و فارسی، فشاری زمانی تورکیـشی هاتەسـەر کـەتازە بـەرزدەبۆوە. زمان و کولتووری کوردی کەلەچاخەکانی سەرەتاو ناویندا لەسایەی بونیادی ئەتنیکی هەبوونی خـۆی پاراست، لەژێرکاریگـەری سـێ زمـانی سەردەسـت کـەوەك زمـانی فـەرمانی تواناکاریـیـەکانی زانـست و تـەکنۆلۆژیایان بـەکاردەهێنا، چـەندەی بڵێـی سەرکوتکراوەو دواخراوە. زمانی کوردی کەلەچاخەکانی ناوین چەندین بەرهـەمی ئـەدەبی لـەجۆری ـ مـەم و زیـنی ئەحمـەدی خـانی ـ بەرهـەمهێنا، لـەئاکامی کاریگـەری فشاری سیاسـی رۆژلـەدوای رۆژ سـنوورەکانی تەسککرایەوە. وەك زمـان و کولتـوور, کوردایەتی بۆرەوشێکی گوماناوی گۆڕا. بوو بەبابەتێکی تاوانباری. پێبەپێ کوردبوون بەتاوان دانرا. رووبـەڕووی زێـدەڕۆییترین شـێوەی پراکتیکـی تـاوان ـ زینـدانی بـۆرژوازی بوویـەوە. دیـاردەی کـوردو گرفتـەکانی پێیـەوە گرێـدراون, خرایـەریزی مەترسیدارترین تاوانەکانـەوە. لەهەرسێ دەوڵـەتی نەتـەوەیی ـ تـورك، عـەرەب و فـارس ـ دا بەشێوەیەکی دژوار کامپانیـای دوورخستنەوەو تواندنەوەی تەواوی هەبوونەکەی پەیڕەوکرا کەسنووری زمـان و کولتـوور تێپـەڕدەکات و بـەزمان و کولتـووری باڵای دەبەستێتەوە. پەروەردەی زمانی زگماگی کوردیشی لەناودابێت، هـەموو جـۆرێکی قوتابخانـەی کـوردی قەدەخـەکرا. تـەنیا ئەوانەی تواناکارییان هەبوو دەیانتوانی لەخوێندنگاکانی نەتەوەی سەردەست فێرە مۆدێرنیزم ببن. لەهەموو بوارێکەوە کـوردو زمانەکەی خرایە دەرەوەی چوارچێوەی مۆدێرنیزمەوە. تەنانەت سادەترین پەخشی مۆسیقا، رۆژنامـەو پـەرتووکی کـوردی بـە "کوردایەتی" لەقەڵەمدراو خرایـەریزی تاوانـە سیاسـییەکانەوە. تەنانـەت خۆشـیان لـەبواری زمانـدا میللیگـەراییـەکیان پـەیڕەو دەکرد کە هیتلەری تێپەڕدەکرد و تەنانەت بەتیۆرییەکانی "شکۆدارترین نەتەوە" تێپەڕنەدەبوو."میللەتی نەجیب" ئـەدرەسـی عەرەبەکان بوو. تورکێتی بەڵگەی بەختەوەری بـوو! فارسـێتی (بەفارسـبوون) گـەورەترین رەسـەنێتی مێـژوویی بـوو. هەسـت و سۆزەکانی میللیگـەرایی کەسـەرمایەداری هۆشـیاری کـردەوە کـرا بەماددەیـەکی بێهۆشـکەر کەهـەموو رەوشـەکانی دواکـەوتوویی پەردەپۆشی کردبوو.

تەنیا لەگەڵ سێیەمین هەڵمەتی گەورەی جیهانگیری سەرمایەداری و بوونی خۆجێیەتی بەبەهایەکی هەڵکشاو، بێواتـابوونی قەدەخەنامەکانی زمان لەئەنجامی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا ـ رادیۆو تەلەفیزیۆن ـ، دەرفەتەکانی چالاکی دەرەوە، رۆڵـی بـینی و کۆمـەکی بـەوە کـرد کـە کورد و زمانەکـەی تۆزێـك شـوێن بدۆزێتـەوەو بێتـەوە هـۆش خـۆی. بێگومـان راسـتینەی بـەرخودانی هاوچەرخیش کاریگەرییـەکی دیـاریکراوی لـەپێکهاتنی بنـەماکانی ئـەم رەوشـەکرد. بـەرخودانی نەتـەوەیی دیموکراتیـك لەگـەڵ خۆیدا باوەڕی بۆ ناسنامەی کوردو زمان و کولتوورو خودی خۆشی گەڕاندەوە. بەرخودانی خۆپاراستن کەبەرامبەر توندوتیـژی و شـەڕ ـ دەسـەڵاتی خوڵقێنـەری تواندنـەوەی زۆرەملـێ پێـشخرا مامـانێتی بـۆ سـەرلەنوێ لەدایکبوونـەوەی زمـان و کولتـووری نەتەوەیی دەکرد.

4 ـ ئەتنیك، جیابوونەوەی چینایەتی و بەنەتەوەبوون لەکوردستاندا

لەشێوەی پەیدابوونی کۆمەڵگاکانـدا، گەیـشتن بەیەکپارچـەیی پێناسـەکردن سـەبارەت بەئاسـتەکانی ئـەتنیکی، چـینایەتی و نەتەوەییـدا بایەخـدارە. کۆمـەڵگاکان لەناوەڕۆکـدا یـەکن. جیـاوازی لەشـێوەگرتنـدا دەردەکـەوێت. تایبەتمەندێتییـە ئـەتنیکی،

چینایەتی و نەتەوەییەکان لەسەرووی ئەمانەوە دێن. بەلاوەنانی پێکهاتەکانی شێوازی ئەتنیك، تیرەی سەرەتایی و تیرە، بەدەرکەوتنی جیاوازییەکانی رەچەڵەك، کاتێك وەك گروپەکانی بەرژەوەندی دەرکی پێبکرێت ئەوا دەبێت بەدیاردە. ژیان بەسەربردن لەدۆخی تیرەگەرێتی کەشێوەیەکی پێشکەوتووتری تیرە سەرەتاییەکانە (قلانە)، گەورەترین بەشی زەمەنی ژیانی جۆری مرۆڤی پێکهێناوە. لەپراکتیکی گروپە گەڕۆکەکانی زۆر لەیەکتر جیاوازنین هۆشیاری بنەچە لاوازە. هێشتا ئەم ناکۆکییانە پێشنەکەوتوون کەرێگای لەپێش دەکاتەوە. شیمانە دەکرێت لەسەردەمە درێژخایەنەکانی چاخی بەردینی کۆنی بەرلەقۆناخی نیئۆلیتیك شێوازی ژیانی تیرە بەراییەکانی تێپەڕ نەکردبێت. بۆ ئەوەی تیرەکان بگەن بەدۆخی پێکهاتەی ئەتنیکی، پێویستە گۆڕەپانێکی تایبەتی پەیوەندی و بەرژەوەندی هاوبەشیان هەبێت، لەم ناوچەیەشدا خۆیان رێکبخەن و ئینتیمایەکی دیاریکراو بەدەستبێنن. چەندەی دەچێ زمان و بەرهەمی هاوبەش گروپەکان بەیەکترەوە گرێدەدات. فاکتەرەکانی لەجۆری نەداری و هێرشەکانی دەرەوە، رۆژبەدوای رۆژ زیاتر گرنگی یەکێتییەکان روونەدەکاتەوە. ئەمجۆرە پێشکەوتنانە پێویستییەکانی بەڕێوەبەرایەتی و پاراستن زیاتردەکات. پلەداری کۆمەڵگا حوکمڕانێتی ڕەگەزی و باوکسالارێتی دەئافرێنێ.

تەواوی ئەم پێشکەوتنانە ئەو شێوەیەی بنەچە یەکلادەکاتەوە کەئەتنیك (خێڵ)ی پێدەڵێین. خۆجێیی و زەمەنگەرایی، تەواوی ئەو توانستانەی کولتووری کۆمەڵایەتی پێدەڵێین لێکجیادەکاتەوەو ناچاری پاراستنی دوولایەنەو سەنتێزیان دەکات. دەرکەوتنەپێشی هەندێ رەچەڵەك رێگا لەپێش ئاواکردنی پلەداریش دەکاتەوە. ئیتر فیدراسیۆنی نەژاد یاخود خێڵەکان لەدایك دەبێ. قۆناخ خێرایی بەخۆیەوە دەبینێ و بەرەو کۆنفیدراسیۆن دەچێت، ئەگەر لەوێش هەلومەرج لەباربێت و هەڵوەشانەوە بەرەو دواوە نەبێ و بۆپێشەوە بچێ ئەوا بەدەوڵەتبوون و جیابوونەوەی چینایەتی پێشدەکەوێت. هەم رەچاوی ئەوە دەکرێ کە ئەم قۆناخانە بەشێوەی بەرهەمی نیئۆلیتیك ژیاون، هەم لەمیانەی ژیرییەکی دیاریکراوەوە دەتوانرێ مەزەندە بکرێ, سەردەمی پێکهاتن و گەشەکردنی خێڵەکان و سەردەمی زێڕینی قۆناخی نیئۆلیتیکە. یەکەمین شۆڕشی کشتوکاڵی، ماڵیکردنی ئاژەڵەکان و تێپەڕبوون بۆ سیستەمی گوند لەگەڵ سیستەمی خێڵایەتی لەناویەکدان. لەئاستە پێشکەوتووەکانی ئەم قۆناخەدا باوکسالارێتی پەرەدەسەنێ. پێدراوی بەرچاو لەبەردەستدان سەبارەت بەوەی لەسەرەتا سیستەمی ماڵی ـ دایك لەپێشە. لەکاتێکدا سەردەم بەدایکایەتی ـ ماڵیکردن دەستپێدەکات، لەگەڵ زیادبوونی پلەداری لەمیانەی باوکسالارێتی لەقۆناخی هەرە ئەبڵەقبوونی خۆیدا دەژی.

سەرباری ئەوەی دینامیزمی جیابوونەوەی چینایەتی گرێدراوی پلەدارییە، لەڕیشەدا لەمیانەی جیاکاری ئەو گروپە دەستپێدەکات کەدەستەی سەربازی کۆیدەکاتەوە. لەناو ئەم گروپەدا لەپەیوەندی خزمایەتی زیاتر هونەری کەسێتی بەکاریگەرە. یەکبوونی ئەوانەی لەبواری تواناکاری پاراستن و نێچیروانی بەهێزن لەژێر رێبەرایەتی بەهێزترینیاندا، لەقۆناخەکانی سەرەتادا جیاکارییەك دەخولقێنێ کەنەبینراوە. دیاردەی حوکمڕانێتی بەهێز دێنێتەئاراوە. کۆبوونەوە لەژێر حوکمی سەرپەرشتیاری بەهێز، رێگا لەپێش ئەو پەیوەندییانە دەکاتەوە کەپەیوەندییەکانی عەشیرەت تێپەڕدەکات. ئەم پەیوەندییە نوێیانە چین. ئەوانەی لەخێڵەکان رایانکردووە، لەگەڵ گروپە بچووکەکانی کە هێشتا نەبوونەتە خێڵ و گروپەکانی پیشە, دەشێ چین پێکبێنن. هەرچی خێڵە بەهۆی پەیوەندی خزمایەتییەوە بەرامبەر بە جیابوونەوەی چینایەتی بەرخودان دەکات. زەحمەتە عەشیرەت دووچاری جیابوونەوەی چینایەتی بکرێت؛ وەك پێویستییەکی سروشتەکەی ناخوازێ پەیوەندی چینایەتی بناسێ. بەرامبەر بە جیابوونەوەی چینایەتی بەردەوام بەرخۆدان لەناوەڕۆکی عەشیرەتەکاندا هەیە. وەك "بەربەرەکان"ی سیستەمی کۆیلەداری بەهۆی ئەم پێکهاتەیان بەردەوام هەڕەشە لەسیستەم دەکەن. بڵاوبوونەوەی جیاوازی چینایەتی و بەرهەمهێنانی ئابووری شانبەشانی یەکتر دەڕۆن. چەندەی رەنجی کۆیلە بەرهەمداربێت، ئەوا

جیابوونەوەی چینایەتی شێوازی کۆیلەداری چڕدەبێتەوە. لە ئاکامی بەدەوڵەتبووندا ئەم قۆناخە خێراتردەبێ. لەبنەڕەتدا دەوڵەت بەڕێوەبەرایەتی ڕێکخستەی سیستەمی کۆیلەدارییە. لەخۆڕایە ئەگەر لەفیکری ئیلاهی و بەرژەوەندی نەتەوەیی و ئاسایش لەناوەڕۆکەکەی بگەڕێی. لەم چوارچێوەیەدا پەیوەندی نێوان دەوڵەت و چینایەتی مسۆگەرە.

پارچەبوونی عەشیرەتی سەرەکی ڕێگا لەپێش شێوەگرتنی گروپەکانی زمان و کولتووری هاوبەش دەکاتەوە کە "قەوم"یان "نەژاد"ی پێدەڵێین. کاتێك دەڵێین قەوم یان نەژاد، مەبەستمان ئەو گروپە کۆمەڵایەتییانەیە کەکەم تازۆر پشت بەکولتوورو زمانی هاوبەش دەبەستن و پەیوەندییەکی سستیان لەنێواندا هەیە. لەم چوارچێوەیەدا گرێدانی پەیوەندی ئەتنیك "نەژاد" قەوم، راستە. یەکێك لەبیرۆکەکانی ریزبەندی کۆمەڵایەتی سەرەتای چاخی ناوین و قۆناخە پێشکەوتووەکانی چاخەکانی سەرەتایی پێکدێنێ. وەك یەکێتی گروپەکانی رەچەڵەك رۆڵێکی مەزن لەسەرهەڵدانی چاخی ناویندا دەبینن. دەستبەسەرداگرتنی جەرمەنەکان بەسەر رۆما، هۆزە عەرەبەکان بەسەر بێزەنت و ساسانییەکان، هەروەها هۆزە تورك و مەغۆلەکان بەسەر دونیای ئیسلام لەنزیکەوە گرێدراوی قەومگەراییانە. نیشتەجێبوون و جیابوونەوەی کولتووری لەقەومەکاندا زەقترە. چینی زاڵ ئەرستۆکراسی و گوندێتی رەنجبەرەکانە. سەرباری ئەوەی خەڵکی شار جێگای خۆی لەناو ئەم پۆلێنە گشتییەدا دەگرێت، نوێنەرایەتی تێکەڵەیی و سەربەخۆیی سنووردارەدەکات. سەرەڕای ئەوەی لەدەرەبەگایەتیدا چینی سەردەست و ژێردەست لەهەمان گروپی ئەتنیکیدان، بەڵام نامۆبوونی نێوانیان چەندەی بڵێی پێشکەوتووە. لەسیستەمی کۆیلەداریدا زۆردەگمەنە دووانەی کۆیلەدار ـ کۆیلە لەهەمان عەشیرەت بن.

دیاردەی نەتەوەو بەنەتەوەبوون، لەئەنجامی زیاتر چڕبوونەوەو بەردەوامبوونی پەیوەندی قەومگەرایی دێتەئاراوە. هەڵوەشانەوەی ئەو پێکهاتە ئابوورییەی بەپەرژینەکانی دەرەبەگایەتی جیاکراوەتەوەو سەرهەڵدانی بازاڕێکی هاوبەشی پێشکەوتووتر، یەکێك لەشێوەکانی پەیدابوونی بەنەتەوەبوونە. هەرچەندە بازاڕی هاوبەش سەرمایەداری بێنێتەوە بیری مرۆڤ، بەڵام دیاردەیەکی هاوواتای سەرمایەداری نییە. سیستەمەکانی پێشترو دواتری سەرمایەداری دەشێ بازاڕی هاوبەشیان هەبووبێ. بازاڕ پۆلێنێکی گشتی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتییە. بەردەوامبوونی لەسیستەمە سۆسیالیستییەکانیشدا سروشتی و سوودمەندە. زمان و کولتووری هاوبەشی بازارە پێشکەوتووەکان ڕێگا لەبەردەم پێشکەوتنی پەیوەندییەکانی نەتەوە دەکاتەوە. راستتر کولتوورو زمانی هاوبەش زیاتر گەشە دەکات و دەبێتە سەرەکیترین پەیوەندی نەتەوە. سیستەمی سەرمایەداریشی لەسەر پێشدەکەوێت. دەشێ ئەو سیستەمانەش بێنە ئاراوە کەسەرمایەداری نین، بەڵکو کۆمەڵکاری و دیموکراتی و سۆسیالیستین. ئەگەر لەناو نەتەوەدا زۆرداری چینی سەرمایەدار بەکاریگەربێت، ئەوا ناوزەدکردنی بەچینی بۆرژوا یاخود سەرمایەدار واتادار دەبێت. بەڵام لێرەدا هاوواتاکردنی سەرمایەداری و نەتەوە راست نییە. ئەگەر پەیوەندییەکانی چەوسانەوە لاوازبێت، پەیوەندییە دیموکراتی و کۆمەڵکارییەکان سەرکێش بێت، ئەوکاتە ئەمجۆرە نەتەوانە بەنەتەوەی دیموکرات و سۆسیالیست بەناو دەکرێن.

لەناو نەتەوەکاندا ئاڵۆزی پەیوەندییەکانی ئەتنیك، رەگەزو چین زیاددەکات. لەگەڵ ئەوەی چینە سەرەکییەکان بۆرژوازی و کارکەرن، چەندین توێژوچینی گوندی نوێدەبێتەوە. دەشێ چەندین قەوم، چین و جەستەی چەوساوە لەبونیادی نەتەوەدا ببینرێ. ئەوکاتە بابەتەکانی چینی و رەگەزی نەتەوەی سەردەست زیاتر دیاردەبێت. زمانی فەرمی، جیاکاری نەتەوەیی، ئەتنیکی ستەملێکراو و گروپی کولتووری پێکدێن. هەرچەندە دەوڵەتی ـ نەتەوە گوزارشت لەو دەوڵەتە بکات کەلەناو دیاردەی نەتەوە دەرکەوتووە، بەڵام زیاتر نیشانەی بابەتێکی میللیگەراییە. ئەگەر ئایدیۆلۆژیای دەوڵەت میللیگەرایی بێت، بەهۆی نەتەوەی باڵادەست بەدەوڵەتی ـ نەتەوەیی ناوزەد دەکرێت. دەشێ دەوڵەت فرە نەتەوەش بێت. بەهەرحاڵ دەبێ ئەمجۆرە دەوڵەتانە لەجیاتی دەوڵەتی ـ نەتەوە بەشتێکی دیکە بەناو بکرێن. بەناوکردنی هەردەوڵەتێك بەنەتەوەیەك، یان هەر

نەتەوەیەك بەدەوڵەتێك، یەكێك لەلایەنە هەرە ترسناكەكانی میللیگەراییە. هێندە تێكەڵەكردنی پۆلێنەكانی دەوڵەت و نەتەوە، بەناوكردنی دەوڵەت وەك رێكخستنێكی هاوبەشی تەكنیكی، زیاتر خزمەتی یەكسانی ـ ئازادی و دیموكراسیبوونی نەتەوەكان دەكات.

لەولای نەتەوەوە، تێگەیشتنی سەنتێزی گروپە نەتەوەییەكانی نزیك و خاوەن بەرژەوەندی هاوبەش راسترە. لەجیاتی نكوڵیكردن لەیەكتری فووڵبوونەوە لەسەر سەنتێزی دەوڵەمەندێتی نەتەوەكان رێگا لەپێش ئەنجامی بەرهەمدارو چارەسەرئامێزانە دەكاتەوە. نەنەهیلیزم (نكوڵیكردن)ی نەتەوە، نەفەناتیزمی نەتەوە؛ بەپێچەوانەوە سەنتێزگەرایی بەهای نەتەوەكان، دەشێ باشترین رێگای رزگاربوون بێ لەئالۆزی میللیگەرایی رۆژگاری ئەمڕۆمان.

گرێدراو بەبیرۆكەو چەمكە بنچینەییەكانمان باشتر دەتوانین لەكوردستان چاو بەراستینەی ئەتنیك، چین و نەتەوەدا بخشێنینەوە. دەستنیشانكردنی كوردستان وەك شوێنی سەرەكی لەدایكبوونی ئەتنیك دەشێ هەڵوێستێكی واقیعی بێت. لەبەرئەوەی یەكێك لە گەشەسەندووترین و كۆنترین ناوەندی شۆڕشی نیئۆلیتیك بووە، ئەوا روونكردنەوەی ئەو پێكهاتە ئەتنیكییانە سانادەكات كە تائێستا بەكاریگەرن. لەوانەیە بەرفراوانترین و كۆنترین مۆزایكی كۆمەڵە ئەتنیكییەكانی مێژوو كۆمەڵگای كورد بێت. بەپیتی شۆڕشی كشتوكاڵی رۆڵێكی سەرەكی لەوەدا دەبینێت كەئەم ناوچەیە هەزاران ساڵ ببێتە ناوەندی لێشاوی باكوور ـ باشوور، رۆژهەڵات ـ رۆژئاوا. لەكاتێكدا لەمیزۆپۆتامیای خوارووو میسر هەلومەرج بۆ شارستانییەتێكی خێراتری چینایەتی لەبارە، ئەوا میزۆپۆتامیای سەرووو دەوروبەری ژیان بەشێوەی كۆمەڵەی ئەتنیكی گونجاوتر دەكات. هەلومەرجی رەوەندێتی نیوەچڵ، مەرجەكانی خۆپاراستن، پەیوەندییەكانی شاخ و دەشت، هەلومەرجی وەرزی ئەم ناوچەیە بۆ گروپی ئەتنیكی دەكاتە شوێنێكی نموونەیی. هەروەكو دەزانرێ شۆڕشی نیئۆلیتیكیش ئەنجامێكی ئەم هەلومەرجانەیە. خێرایی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان هەرزوو رێگا لەپێش ئەو ململانێیانە دەكاتەوە كە لەسەر ناوچەكانی نیشتەجێبوون و بەرهەم ئەنجامدەدرێ. هەربۆیە رێكخستنی لەجۆری خێڵ (عەشیرەت) دەبێتە سەرەكیترین یەكینەی پاراستن و بەرهەمهێنان و نیشتەجێبوون. رێكخستنی شێوازی دەوڵەت بەهۆی هێرشی هەمەلایەنەوە هەرساتێك دەشێ بڕووخێ. هەلومەرجەكان بۆ دەوڵەتبوونێكی پێشوەخت لەبارو گونجاونییە. شانسی ژیانی عەشیرەت لەگوندە بچووكەكان و یەكینەكانی تیرە سنووردارە. سێ بژاریان لەپێشدایە، یان ئەوەتا تەڤلی عەشیرەتێكی بەهێزدەبن، یان كۆچ دەكەن، یاخود تاوەكو دوایی بەرخودان دەكەن. ئەوانەی دەخرێنە هەلومەرجی سەخت و تەنگەوە زۆربەیان بەرخودان دەكەن و لەگروپە سنووردارەكانن. هەرچی نیشتەجێبووانی دەشتن زۆربەیان ئەو توێژانەن كەبەسانایی دەكەونە ژێركاریگەری و كۆنترۆڵی دەوڵەتێك. كاتێك تێبینی عەشیرەتەكانی شاخ و دەشت بكرێت، ئەوا دەبینین ئەوانەی لەناوچە شاخاوییەكاندا دەمێنن بێگەردن و تێكەڵ نین، بەڵام ئەوانەی لەشار دەژین دووچاری تواندنەوەیەكی چڕو بەرفراوان دێن، لەبەر ئەم هۆكارەیە جیاوازییەكی جددی لەنێوان كوردایەتی شاخ و شار دروستدەبێ.

مەزەندە دەكرێ نموونەی سەرەتایی گروپی زمانی كوردی بۆ 12000 ساڵ پێش ئێستا بگەڕێتەوە. لەبەرئەوەی زمانی كشتوكاڵ و ئاژەڵدارییە، ئەوا لەپێكهێنانی بناخەی زمانی ئەوانەشدا بەكاریگەردەبێت كەهەمان شێوازی ژیانیان هەیە. رۆڵێكی سەرەكیشیان لەوەدا بینیوە كەهۆرییەكان جیاوازترو دیاربن. بەهێزی گروپی زمانی هیندۆ ـ ئەوروپی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە ئەو بناخەی پشتیان پێبەستووە هەزاران ساڵ شۆڕشی كشتوكاڵییان پێكهێناوە. ئەگەر سەرچاوەیەكی بەمجۆرەی زمان نەبووایە، ئەوا نەدەشیا وشە سەرەكییەكانی ئەم جوگرافیا فراوانە شیبكرێتەوە. پێویستە ئەو پەلهاوێشتنەی لەكوردستانەوە ئەنجامدراوە كولتووری ببینرێ، نەك جەستەیی. نزیكەی 6000ساڵ پێش ئێستا ئیتر پێكهاتنی عەشیرەت تەواو بەدەركەوتووە. لەعەشیرەتە كوردەكانی نیشتەجێی ناوچە شاخاوییەكاندا هەندێ وشەی بەكاری دێنن لەبەڵگەی هۆرییەكاندا دەبینرێ.

تەنانەت ئەو وشانەی لەجۆری مۆرد = مردن، ژن = ژیان، را = رۆژ، ستار = ئەستێرە کەزۆر کۆنن و لەگروپی زمانی هیندۆ ـ ئەوروپی بەکاردەهێنرێن ئەم راستییە نیشاندەدات. لێکچوونی نێوان سیستەمی خوداوەندو ئەفسانەکانیش سەرنجڕاکێشە.

پێگەی گوزارەی نێوان شارستانییەتەکانی سۆمەری ـ هیتیتی، فاکتەرێکی دیکەی بەهێزکردنی هەبوونی خێڵایەتی کوردە سەرەتاییەکانە. لەبەرئەوەی دەوڵەتبوونی پێشوەخت پاکتاوبوونیان سانایيتر دەکات، ئەوا ژیانێکی نیو رەوەندو شێوازێکی نیو گەریلایی بۆخۆیان وەك بژارێك پەسنددەکەن. چەندە دەوڵەت لەدەوروبەریان ئاوابکرێت، بەو ئەندازەیە بەهێزکردنی پێکهاتەی خێڵایەتییان بەپێویست دەبینن. لای کوردان خێڵ نیو گەریلایەکە. کاتێك لەناو رێکخستنی خێڵدا لەنزیکەوە تەماشای خێزان بکەین دەبینین کەمەبەستی سەرەکی ئازادی زەق دەبێتەوە. ژن زۆر کاراو ئازادە. ئەو ئەنجامەی دەرکەوتووە بۆ شێوازی بەرخودانی نیو گەریلایی خێڵ دەگەڕێتەوە. جارێکی دیکە دەبینین ئاستی ئازادی ژن ئاستی ئازادی کۆمەڵگا دیاریدەکات. مەردایەتی، هێزو کارایی باوی ژنی کورد سەرچاوەی خۆی لەنەریتێکی زۆرکۆنی مێژوویی وەردەگرێت. هەرچی لایەنی خراپی شێوازی ژیانی خێڵەکییە، دەرفەتی گۆڕان بۆ کۆمەڵگایەکی پێشکەوتووتر سنووردارە.

کۆمەڵگای چینایەتی شار دەئافرێنێ. لەگەڵ ئاواکردنی شار نووسین، هونەرو زانست خێراتر پێشدەکەوێت. ئاواکردنی دەوڵەت تادوارادە توانستی هزرو چالاکی زیاددەکات. لەمیانەی بەرهەمی ئابوورییەوە, ژمارەی زۆری دانیشتوان دەتوانێ لەگەڵ یەکتریدا بژی. نەك لەبەرئەوەی کوردان بێتواناکارین، بەپێچەوانەوە لەبەرئەوەی زۆر بەتواناکارین و بەتایبەتیش داکۆکیکردنیان لەسەر ئازادی وڵاتەکەیان، رێگای پێنەداون شارستانییەتی کۆیلەداری پێشبخەن. بەڵام پاراستنی هەبوونیشیان لەسایەی ئەم بەرخودانانەی ئازادی بووە. لەراستیدا ئەگەر ئازادی وەکو فۆرمی پێشکەوتن دیاریبکرێت ئەوا لەوانەیە کوردان پێشکەوتووترین گەل و گروپی ئەتنیکی بن لەمێژوودا. تاوەکو ساڵانی 330ی پ.ز لەو شارستانییەتانەدا کەناوەندەکەیان میزۆپۆتامیابوو ستاتۆی عەشیرەتی کوردان لەرەوشێکدایە ئەوتایبەتمەندییانە لەخۆوەدەگرێت کەهەرەزێدە لەناوچەکە حیسابی بۆبکرێت و پەیوەندی لەگەڵ ببەسترێت. باشترین سەرچاوەش بۆئەمە مێژووی هیرۆدیتە. هیرۆدیت کەجێبەجێ باسی مادەکان دەکات، هێما بۆ هەندێ مەیل دەکات کەکۆمەڵگای پێگەیشتووی گریك بەبەکرێگیراوی میدیاییەکان لەقەڵەم دەدات. وەك کوردانی ئەو قۆناخە مادەکان بۆ ئەم تایبەتمەندێتییانەیان قەرزباری ناسنامە ئازادەکەیانن.

ئایینی زەردەشتی ئایینێکە ناوەڕۆکی ئەخلاقی ئازادی زۆر بەهێزە. لەپەیوەندییەکانی ژن ــ پیاودا خاوەن سیستەمێکی نزیك بەئازادییە. بوار بەسیستەمێکی زانیاری هاوسەرێتی نموونەیی دەدات. بوون بەژنێکی باش بەیەکێك لەرەوشت بەرزی هەڵبژێردراوی ئاکاری باش لەقەڵەمدەدات. گرنگی تایبەت بەبەخێوکردنی منداڵان دەدات و راستگۆیی یەکەمین پرەنسیپی پەروەردەیە. راستگۆیی بایەخێکی تایبەتی هەیە. ئایینێکە هەرەزێدە سەرنجی ئاژەڵ و ژینگە دەدات. لەبەهێزبوونی خێزان (عائلە)دا لەناو کوردان ئەم کاریگەرییانەی زەردەشتی زەق و بەرچاوە. تاکو ئێستاش ئەمجۆرە نەریتانە لەناو ئێزیدی و عەلەوییەکاندا بەهێزە.

چەندەی دەکەونە ژێرکاریگەری شارستانییەت ئەخلاق و سیستەمی خێڵایەتییان تێکدەچێت. دوای داگیرکاری هێلینیزم سەنتێزی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوا لەسەر رێی شارستانیبوون قۆناخێکی نوێ دەئافرێنێ. نووسراوە هەڵکۆڵراوەکانی شوێنەواری نەمروود کەپەیکەری یادگاری پادشایەتی کۆماگەنەیە زۆر بەباشی ئەم راستییە نیشاندەدات. تاوەکو لەدایکبوونی ئیسلامییەت شاخ شوێنگەی تایبەتی خۆی لەژیانی کۆمەڵایەتی کوردانیدا دەپارێزێ. لەگەڵ ئەمەشدا مەزەندە دەکرێ کەسەرەتا لەئیمپراتۆریەتی پارس دواتریش پارت و ساسانییەکان چینێکی ئەرستۆکراتی کوردان شوێنی خۆیان کردۆتەوە. ئەو ئەرستۆکراتییەتەی لەئەتنیك جیابۆتەوە دوورە لەوەی سەربەخۆ بێت. لەوانەیە بەر لەپارسەکان ئەم توانستەیان هەبێت. بەڵام دوای ئەوەی بوون بەبەکرێگیراوی ئیمپراتۆریەت ئیتر زیاتر چاوەڕوانی پەیوەندی بەندەو کۆیلایەتییان لێدەکرێت. ئەو

پێدراوانەی لەبەر دەستدان زۆر بەباشی ئەم ناوەڕۆکەی چینی ئەرستۆکرات نیشاندەدات. ئەتنیکی کورد چەندە ئازاد بێت، ئەرستۆکراتەکەشی هێندە داخوراوو بەکرێگیراوە. لەسەر ئەم بنەمایە جیابوونەوەی چینایەتی و شێواندن و نکۆڵیکردن لەرەچەڵەك بەناویەکداچووە. چینێکی ئەرستۆکراتی وەك گریك، رۆماو پارس لەناو کۆمەڵگای کوردی دەرناکەوێتەپێش. زیاتر لەناو ئەرسۆکراتی سەردەست بەلاسایی کردنەوەیان شێوە دەگرن. دەشێ دەستەواژەی "لەپادشا پادشاتر" بۆ بەکرێگیراوێتی کورد بەکاربهێنرێ. ئەگەر ئەرستۆکارتییەتێکی هاوشێوەی رۆما تەنانەت چینێکی دەوڵەتی هاوشێوەی سۆمەرو میسر پەیدابووایە، بێگومان پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی کوردستان جیاوازتر دەبوو. شاری تایبەت بەخۆیان نییە. بەندەی شارە ئاواکراوەکانن. کاتێك تەماشای ئەو شارانە بکەین کەهێلێنییەکان ئاوایانکردووە ئەوا جیاوازییەکی گەورە دەبینین.

بەدرێژایی ئەم قۆناخانە جیابوونەوەیەکی قووڵی کۆمەڵایەتی لەگەڵ جیاوازی گوند ــ شار بەڕێوەدەچێت. لەکاتێکدا لەسەردەمی باڵادەستی پارسەکانەوە شارەکان رۆڵی ناوەندی بیانییەکان دەبینن، ئەوا زۆم و رەوەندێتی رۆڵی گواستنەوە دەبینن بۆ کولتووری خۆجێیی. بۆ ماوەیەکی درێژ ئەم راستینەیە بەردەوام دەبێ. شارەکان سەرەتا مۆرکی سۆمەرییەکان دواتریش یەك بەدوای یەك مۆرکی بابلی، ئاشووری، پارسی، هێلینی، رۆمایی، بێزەنتی، عوسمانی و دەوڵەتە نەتەوەییەکان لەخۆوە دەگرێت. بەرامبەر ئەمەش گوند و کوێستانەکان کوردایەتی لەخۆوەدەگرێت و نوێنەرایەتیشی دەکات. مانەوەی کوردان وەك کۆمەڵگای گوندو کوێستانەکان شتێکی ئارەزوومەندی نییە، بەڵکو داگیرکاری بێڕەحم و تاڵان و بەشاربوونی بیانی رۆڵێکی دیاریکراویان لەمەدا بینیوە. نامۆبوونی شار بەواتای کۆیلایەتی و بەکرێگیراوێتی دێت.

کاریگەری ئیسلامییەت لەسەرئەتنیکی کوردو ئەرستۆکراتەکەی هەمەلایەن بووە. ئەتنیکە بەکرێگیراوەکان و ئەرستۆکراتەکانی شار یەکەمین توێژبوون کەبەیعەتیان کرد. تەسلیمکارییان ریشەییە. رۆڵیان لەجیابوونەوەی چینایەتی چاخی ناوین بناخەی ئەو خیانەتانەیە کەتاڕۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوامە. خۆیان لەکوردایەتی پێدەشتەکانی شاخ و لادێ بەجیا لەقەڵەمدەدەن و لەناو گروپەکانی حوکمڕانیدا خۆیان رێکدەخەن. کاتێك بەشێوەیەکی بابەتیانەتر ئەم مەسەلەیە تاوتوێ بکەین ئەوا دەتوانین باشتر شیبکەینەوە. ئەم شوێنە هەزاران ساڵ پێشتر وەك ناوچەی شارستانییەت خۆی رێکخستووە. زۆر لەمێژە بەکرێگیراوەکان رێگایان کردۆتەوە. ئەوەی کەوتۆتە سەرشانی ئەوانەی دواتر درێژەپێدانی ئەم رێگایەیە. لەبەسۆمەریبوونەوە بگرە تابەهێلینیبوون، لەپارسبوونەوە تادەگاتە بەعەرەببوون، لەتواندنەوە لەناو هیچ گروپێکی رەچەڵەکی حوکمڕان دوانەکەوتوون. گروپێکی ئەتنیکی کەبەمجۆرە پلەداری خۆی لەدەستدابێت یان لەناو ئەم رەوشەدا بێت بێگومان زمان و کولتووری خۆی پێشناخات. هەرچەندە لەچاخی ناویندا هەندێ خانەدانی کوردان پێکهاتبێت، بەڵام نەگەیشتوونەتە ئەو ئاستەی کاریگەرییەکانی زمانی فارسی و عەرەبی بەلاوە بنێن و ببنە خانەدانێکی میللی. بەناوبانگترینیان کەمەروانی و ئەیوبییەکانن (990 ـ 1090، 1250 ـ 1775) لەسەردەمی دەسەڵاتداریێتیاندا جیاوازییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ خانەدانە عەرەبەکاندا نەبووە. هەوڵێکی ئەوتۆیان سەبارەت بەزمانی کوردی نیشاننەداوە. درێژەیان بەرێبازی کۆن داوە. ژیانی گەل لەناو شێوە جیاوازەکانی مەزهەب و تەریقەتە ئیسلامییەکان، تاڕادەیەك بۆ پاراستنی ناوەڕۆکی خۆی سوودمەندبووە. سەرباری هەموو خراپەکارییەکانی ناوەڕۆکی قەومی کوردان بەڵام دەرەبەگایەتی چاخی ناوین نەیتوانیوە بیسرێتەوە، بەپێچەوانەوە ئەگەر بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت لەپێشکەوتنە سیاسی، رۆشنبیری و ئەدەبیەکاندا هەبوونی خۆیان نیشانداوە. دەشێ شەرەفنامە (1596)، شاکاری مەم و زین (1690) وەك نموونەی پێشکەوتنی زمانی کوردی و تایبەتمەندێتییەکانی قەومگەرایی نیشانبدرێت. دەبینین کەیەکەمین جارە جیابوونەوە لەگروپەکانی خێڵایەتی روودەدات.

ئەوجیابوونەوەی بەکرمانج ناوی دەبەین گوزارشت لەو کۆمەڵە دەکات کەلەدەرەوەی عەشیرەتن. پەرتەوازەبوونی سیستەمی خێڵایەتی و دابڕان لێی بەردەوام ئەم کۆمەڵەیەی زیادکردووە. وەك گەل یەکەمین کەسانی شاریان ئاواکردووە

کرمانجەکانن. لەدوای سەدەی نۆزدەهەمەوە دەبینرێ کەئەم قۆناخە خێرابووە. دەتوانرێ بەقۆناخی بەکرێکارکردنی سەرمایەداریش بچووێنرێ. کرمانج تەواو لەگەڵ کوردایەتی گونجاوە. جیاوازی لەنێوان کرمانج و "کورد"ی عەشیرەتگەرادا هەیە. ناشێ بێ پلەداری بیر لەخێڵ بکرێتەوە، هەرچی کرمانجە لەگەڵ خێزانی خۆیەتی. جۆرێك لەکارکەرە کوردەکانن، چینی کارکەرە. کارکەر ناوێکی راستی ئەم گروپەیە.

کوردی خولام و رەنجبەر بەندەی ئاغایە. ئەو ئاغایەتییەی لەچاخی ناویندا پێشکەوت لەناو ئەرستۆکراتی کورد خاوەن جێگایەکی تایبەتە. توانیویەتی رەنجبەر لەناو عەشیرەتدا دروستبکات. بەتایبەتی لەقۆناخی عوسمانییەکاندا ئاغایەتی پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە. زیاتر لەو گوندانە پێشکەوتووە کەدەرفەتی توانای کشتوکاڵی تێدا هەیە. ئەگەر ئەتنیك لەگوندێکی کشتوکاڵی نیشتەجێ بووبێت، ئەوا پلەداری بەشێوەی ئاغایەتی گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. ئاغا بەتوندی خۆیەوە دەناسرێ. لەسەرۆك عەشیرەت جیاوازترە. مەیلی بەلای هێزی کوتکە. هەرچی سەرۆك عەشیرەتە لەمیانەی پەیوەندی خزمایەتییەوە بەڕێوەبەرایەتی دەکات. دەزگای شێخایەتیش زیاتر وەك نەریتێکی عەرەبەکان پەسندکراوە. دەزگایەکە کاریگەرییەکانی ئایین ئاوایکردووە. لەگەڵ ئەوەی بنەمایەکی ئابووریشی هەیە، زیاتر نوێنەرایەتی رۆشنبیری چاخی ناوین دەکات. لایەنی هاوشێوەی سەرمەشقی تەریقەتەکان لەخۆوەدەگرێت. دەتوانرێ سەرۆك عەشیرەت، ئاغای گوندو شێخایەتی تەریقەتی ــ ئایینی وەك چینی سەردەستی کوردانی چاخی ناوین بەناو بکرێت. پێشکەوتنێکی بەرچاو لەجیابوونەوەی چینایەتی سەریهەڵداوە.

ئەو چینە سەردەستەی لەرێکەوتنی عوسمانییەکان و شەرەفخانییەکان ــ ئەمیری بتلیس، ئیدریسی بەدلیسی رێبەری مەعنەوییانە ـ بەرژەوەندییان بەدەستهێنا، لەسەدەی نۆزدەهەمەوە کاتێك بەرژەوەندییەکانی خۆیان لەدەستدا هەنگاویان ناوەتە ناو قۆناخی یاخیبوونەوە. کاتێك داواکاری سەربازو قورسایی باج وەرگرتنی دەوڵەتی ناوەندی ستاتۆی کۆنی تێپەڕکردووە، ئەوا سەرتاپای سەدەی نۆزدەهەم لەمیانەی یاخیبوونەکان تەواوبووە. بەڵام نەگەیشتوونەتە ئاستی میللیگەرایی کورد. نەگەیشتوونەتە ئاستی بۆرژوازی رۆژئاوا, تەنانەت نەگەیشتوونەتە میللیگەرایی ئەرمەنی و سوریانییەکانیش کەلە تەنیشتیانەوە بوون. شکستەکەیان کاریگەرییەکی خراپی کردۆتە سەرگەل. تەنانەت بۆتە هۆکاری دابەزینی ئاستی ئازادی. قەومی کوردیان بەبزووتنەوەیەکی نەتەوەیی نەگەیاندووە. ناتوانرێ باس لەتێپەڕاندنی رۆڵی باو بکرێت. دەتوانین قۆناخی سەراوژێربوونی کوردان بەم یاخیبوونانەی سەدەی نۆزدەهەم دەست پێبکەین. بۆیەکەمین جار لەمێژوودا ستاتۆی کوردان دەسڕدرێتەوە، هیچ رۆڵێکی سیاسی تایبەتی نامێنێت. رووخانی سەڵتەنەتی عوسمانییەکان دوای شەڕی یەکەمی جیهانی بەکرێگیراوە کوردەکانیشی خستۆتە ناو رەوشێکی زەحمەتەوە. کاتێك تێدەگەن کەشەڕی رزگاری نیشتمانی لەپێناو رزگارکردنی خەلیفە نییە, بەڵکو لەپێناو کۆمارە، ئەوا هاوکارێتییەکەی سەرەتایان گۆڕیوەو کردوویانە بەیاخیبوون. ژێرکەوتنیان لەپێشکەوتنی ستاتۆیەکی بەکرێگیراوی و نکۆڵیکاریدا خاوەن رۆڵ بوو. کاتێك تاڕادەیەکی بەرچاو ناوەڕۆکی کوردایەتییان لەدەستدا، لەوە دوودڵ نەبوون کە وەك گروپێکی سیخوڕ لەناو دەوڵەتەکاندا بجووڵێنەوە. بۆئەوەی وەك کەمایەتی خۆیان بەدەوروبەر بناسێنن، بوون بەتوندترین میللیگەرایی نەتەوە سەردەستەکان. ئایینگەرایی و میللیگەراییەکەشیان بۆهەر گەل و نەتەوەیەك مەترسیدارە.

بەنەتەوەبوونی کوردان لەناو ئاراستەیەکی جیاوازو ناکۆك دایە. لەدەوری بازاڕێکی هاوبەشدا لەناو سنووری زمان و کولتووری خۆیدا توانای پێشکەوتنی نەدۆزیوەتەوە. یاخیبوون و سەرکوتکردنە دژوارەکان ئەم دەرفەتەیان نەداوە. تێکشکانی بەرخودانەکان و نەئافراندنی بزووتنەوەیەکی هاوچەرخی نەتەوەیی رێگای لەپێش بەنەتەوەبوونێکی زۆر دواکەوتوو کردۆتەوە. بۆ بزووتنەوەو پارتی نەتەوەیی هاوچەرخ وەرنەچەرخاون. کۆمەکێکی وەهاشیان بە رۆشنگەری کوردان

نـەکردووە کـە شـایەنی باسـکردن بێـت. سـەرباری ئـەوەی شانبەشـانی تورکـەکان کۆمـاری ئـاواکردووە، بـەڵام لێگـەڕێنیان بـۆ سیستەمی کۆن و نەناسینی کۆمار بۆتە هۆکاری ئەوەی ئەم دەرفەتەش بەفیڕۆ بچێ و یاخیبوونە نوێیـەکانیش بـەدژی کـوردان بشکێتەوە. دواتر پەسەندکردنی توانەوەو، بەشێوەیەکی بێ پرەنـسیپ و خیانەتکارانـە کەوتنـە سـەر ڕێـی سیاسـەتی نەتـەوەی سەردەست، ڕۆڵێکی دیاریکراویـان بینیـوە کەسـەدەی بیـستەمی سـەردەمی رزگـاری نیـشتمانی گـەلان بەشـێوەیەکی وەهـا خـراپ بـەدژی کـوردان بـشکێتەوە. بـەو ئەندازەیـەی میللیگـەرایی خۆیـان لەکـەدارکردووە، ئـەوا ئـەو میللـەت و میللیگەراییەشـیان لەکەدارکردووە کەهەوڵیانداوە لەناویاندا کاربکەن.

نە لەدەوروبەری بازاڕی نەتەوەیی نەبەشێوەی بزووتنەوە نیشتمانییەکانی بۆرژوازی ئەگەری پێشکەوتنی نەتـەوەییبوونی کـوردان نـابینرێ. ئـەوە جێگـای گفتوگۆیـە ئایـا لەهەڵمـەتی نـوێی ئـەمریکادا بـۆ ڕۆژهـەڵاتی نـاوین تـا چ رادەیـەك کۆمـەکی بـەکرێگیراوە کوردەکـان و نەتەوەگـەرایی بـۆرژوازی دەکـات. چـونکە لەهاوپـەیمانێکی بەپرەنـسیپ زیـاتر، تـادواڕادە گرێـدراوی بەرژەوەندییەکانی دەجوڵێتەوە.

ئەوەی ماوەتەوە ئەو پێشکەوتنانەیە کەدەشێ لەڕێگای پێکهاتەکانی شێوازی کرمانجی و چالاکییەکانی کۆمەڵگای دیمـوکراتی و کۆمەڵکاری بەدیبێت. دەشێ نەتەوەییبوونی کوردان لەدەوروبەری کۆمەڵگایـەکی مـەدەنی کۆمـەڵکاری و دیموکراتیـك یـەکێك لەتەندروستترین و هاوچـەرخترین پێڕەوەکـان بێـت. جیاوازییەکـەی لەگـەڵ بزووتنـەوە نەتەوەییـە کلاسـیکییەکانی ئامانجیـان دەوڵەتبووە ئەوەیە لەجیاتی پشتبەستن بەپێڕەوی شەڕە درێژخایەنەکانی رزگـاری نەتـەوەیی، قورسـایی خـستنەسەر چـالاکییە ئاکتیفەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و دیموکراتییانە دەشێ شێوەگرتنی نەتەوەیی فەراهەم بکات. بەتایبەتیش بەشداریکردنی ژنـان لەســەربنەمای ئــازادی گرنگییەکــەی زیاتردەبێــت. ئــەمجۆرە بەنەتەوەییبوونــە کەلەمیللیگــەرایی پاککراوەتــەوە، جێگــا بەرادیکالیزمی ئایینی نادات، پشت بـەئازادی کولتـووری و ئـازادیخوازی رەگـەزی کۆمـەڵگا دەبەسـتێ و تێکۆشـانی ژینگـەپارێزی بەبنــەمادەگرێت، ئەمــەش لەمیانــەی ئــەو پێڕەوانــەی دوورلــە جوداخــوازی و توندوتیژییــە تەندروســترین رێگــای بــوون بەنەتەوەیــەکی دیموکراتــە. لەمیانــەی ئــەم پێــڕەوە دەشــێ بەنەتــەوەبوونی کــوردان لەناوچـەیەکی وەکـو رۆژهــەڵاتی نــاوین کەهەرەزێــدە ململانێــی ئــەتنیکی، ئــایینی، مەزهــەبی و میللیگــەرایی تێــدا لەئارادایــە، ببێتــە نموونەیــەك کەبــەهای چارەسەرکاریەکەی بەرزبێت. بەتایبەتیش لەجیاتی رێچکەی میللیگەرایی کەلەنموونـەی ئیسرائیل ــ فەلەسـتین کەوتۆتـە نـاو بنبەسـتبوونێکی مەزنـەوە ئـەوا پێـڕەوی نـوێ بۆتـە ناچارییەك. ئێـستا تـەواو کـاتی دەرککردنـە بـەوەی کەکێـشەو گرفتـەکان بەرێچکەی توندوتیژی و جوداخوازی چارەسەر نابێت و ئەم پێڕەوانـە واقیعـی نـین. هـەروەها پێویـستە دەرك بـەوەش بکرێـت ئیتر تواناکاری و دەرفەتی ئەوە نەماوە لەڕێگای تیرۆری دەوڵەت راستینە نەتەوەییەکان لەناوببرێت. لەوەش گرنگتر دەبێ دەرك بەوەبکرێ کەنابێ ژیان لەگەڵ نەتەوەی جیاواز و کولتـووورە ئـەتنیکی و ئایینییـەکان وەك فاکتـەرێکی زیانبـەخش و نیگـەرانی ببینـرێ، بـەڵکو دەبـێ وەکـو رێگـای ژیـانێکی دەوڵەمەنـدو زینـدوو ببینـرێ. کاتێـك دەرك بەوەبکـەن کـەجیاوازی کولتـووری و نەتەوەیی پێویستی بەدەوڵەتی جیاواز نییە، بەڵکو دیموکراسییەتێکی تـەواوی پێویـستە، ئەوکاتـە زۆربـاش دەرك بـەوەدەکرێت کەهیچ کێشەیەکی نەتەوەیی نییە چارەسەر نەکرێت.

لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا بەنەتەوەبوونی کوردان هەردوو پێڕەو لـەناو یـەکتردا تاقیدەکاتـەوە. یەکـەمیان رێگـای میللیگـەرایی سـەرەتایی چینی دەرەبـەگ ــ بـۆرژوای سەردەسـتی کوردانـە کەسیـستەمی سـەرمایەداری رۆژئـاوا پـشتگیری دەکـات و ئێـستاکە پرۆگرامەکەی وەك دەوڵەتی فیدراڵی کورد بەرجەستەبووە؛ دووەمیان رێگای گەلی کـوردی زەحمـەتکێش و رەنجـدەرە کـەهێزی خۆیی بەبنەمادەگرێت و ئامـانجی بوونـە بەنەتەوەیـەکی دیمـوکرات و ئـازادیخواز. ئـەوەی یەکـەم پەیوەندییـە دەرەبەگایـەتی و ئـایینی و عەشـیرەتگەراییەکان بـەکاردێنێ کەکۆنەپەرسـتن و پـشت بەبەرژەوەندیپەرسـتی دەبەسـتن، هەرچـی هـی دووەمـە

پەیوەندییە دیموکرات و ئازادیخوازو یەکسانەکان بەبنەما دەگرێت و عەشیرەتگەرایی تەسکی تێپەڕکردووەو پشت بەمەیلە فیۆدالی و ئایینییەکان نابەستێ. ئەوەی یەکەم لەباشووری کوردستان (کوردستانی ئێراق) هەوڵی پێشەنگایەتی دەکرێ کەلەژێر هەلومەرجی داگیرکاری ئەمریکادایە، ئەوەی دووەمیان لەسەر بنەمای هێزی خۆیی هەوڵدەدات لەدیموکراتیزەکردنی تورکیادا کوردستان رۆڵی پێشەنگایەتی ببینێ نەك پاوان. لەقۆناخی داهاتوودا ئەم دوو رێگایە یاخود پێڕەوە رۆڵیان لەچارەسەرکردنی کێشە نەتەوەییە دیموکراتییە قورسەکانی سەرتاسەری رۆژهەڵاتی ناوین و بایەخەکانیان زیاتر دەرکیان پێدەکرێت. بەگوێرەی قورسبوونی ئەم پێڕەوانە دیاردەکرێ: ئایا کوردستان دەبێتە فەلەستین ـ ئیسرائیلێکی نوێ و بەرفراوانتر، یاخود دەبێتە وڵاتی رێگەچارەی ئاشتی و دیموکراتییانە. چەندە لەپێڕەوی ئەتنیکگەرایی تەسك و قەومگەرایی و ئایینی و میللیگەرایی دووربکەونەوەو گرنگی بەرێبازی سەربازی نەدەن، ئەوا چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتییە ئاڵۆزەکانی کوردستانیش لەسەر بنەمای دیموکراسی و ئازادی و یەکسانی بەرێگای نەتەوەییبوونی دیموکراتییانە دەبێت.

5. ئایدیۆلۆژیای فەرمی و شێوازی دەسەڵات لەکوردستاندا:

ئەگەر چیرۆکەکانی ئایدیۆلۆژیاو دەسەڵات بنووسرێ، ئەوا گرنگترین هەنگاوی تیۆری هاوچەرخی راستینەی کۆمەڵگا دەهاوێشترێ. پێویستە باش بزانرێ کەدیاردەکانی ئایدیۆلۆژیاو دەسەڵات لەسۆسیۆلۆژیادا شیتەڵنەکراوە. وەك بیرکردنەوەی هاوبەش و شێوازی زاڵبوون تاوەکو بەرێوەچوونی ئایدیۆلۆژیاو دەسەڵات و رۆڵیان لەسەر شێوەگرتنی فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە دەستنیشاننەکرێت ئەوا شیکردنەوە ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان لەشرۆڤەی دواییدا رێگا لەپێش مەترسیدارترین شێوەی نەزانی دەکاتەوە. تاوەکو جیاوازی نێوان پراکتیزەکردنی پێڕەوی زانستییانە لەسەر کۆمەڵگاو جیهانی دەرەوەی کۆمەڵگا نەبینرێ، ئەوا گرفتی زانین و جێبەجێکردن ئاڵۆزتر دەبێ. تەنانەت ناسینی خودی کۆمەڵگاش بەجۆرێك لەو راستینەیە لەقەڵەم دەدرێت. لەوانەیە پێناسەکردنی خود سەرەکیترین گەوهەری کۆمەڵگاکان بێت. زەحمەتە باس لەهەبوونی ئەو کۆمەڵگایە بکرێت کەخۆی پێناسە نەکردووە. دەشێ ئەمە بەکەلاشبوونی کۆمەڵگاش بەناوبىرێت. ناوێکی دیکەی خۆ پێناسەکردن ئایدیۆلۆژیای کۆمەڵگایە. دەشێ ئایدیۆلۆژیا وەك پلانێکی فیکری هاوبەش پێناسەبکرێت کەبووە بەئیرادە. ناوێکی دیکەی ئەمەش ئەخلاقی کۆمەڵگایە. ئەرکی سەرەکی ئاکاری کۆمەڵایەتی مسۆگەرکردنی هەبوونی کۆمەڵگایە. هەبوونی کۆمەڵگا تەنیا لەمیانەی خاوەنداریێتیکردن لەخۆ واتە لەئەنجامی بوون بەهێزی ئایدیۆلۆژی بەدیدێت. بەمجۆرە ئەڵقەکە تەواو دەبێت.

لەگەڵ ئەوەی دەسەڵات پەیوەندییەکی زۆر توندی لەگەڵ ئایدیۆلۆژیادا هەیە، وەك دیاردەیەکی جیاواز بەتایبەتیش لەناو کۆمەڵگاکانی باڵادەستیدا رۆڵی دیاریکراو دەبینن. هەرچی خودی دەسەڵاتە بەدەزگابوونی توندوتیژییە لەناو کۆمەڵگادا. ئامرازی شاردنەوەی توندوتیژییە. هەربۆیە سەربەخۆ پێناسەکردنی دەسەڵات ناکرێت. تەنیا ئەوکاتە دەتوانرێ دەمامكێك پێناسە بکرێ کەبزانێ چی پەردەپۆش کردووە. دەمامکەکان بەتەنیا پێناسەناکرێت. تەنیا کاتێك توندوتیژی بتەقێتەوە دەرکی پێدەکرێت. ئەو کاتە دەمامك دەکەوێ و روونەبێتەوە کەبەتەنیا هیچ شتێك نییە. ئەوکاتە ئاشکراتر دەبینرێ مەگەر تەواوکەرێکی توندوتیژی یاخود دێوێکی تەفرەدەرێتی. کۆمەڵگایەك توندوتیژی دەستنیشانی کردبێت ناشێ رەوشێکی ئاسایی هەبێت. دەشێ دۆخێکی تەقینەوەی هەبێت. هەروەکو سروشت ئەوا رەوشی تەقینەوەی بەردەوام لەکۆمەڵگاشدا دەگمەنە. تەنانەت هەروەکو دەزانرێ دەرفەتی گەورەی هاوبەشێتی ژیری ئەنالیتیك و سۆزداری توانای رێگرتنی تەقینەوە کۆمەڵایەتیەکانی ـ شەڕ، شۆڕش، شۆڕشی چەواشە، راپەڕین و پێکدادانی هەیە. کاتێك دۆخێکی بەگیروگرفتی بەخۆوە گرت مسۆگەر دەشێ چارەسەری بێتەقینەوە فەراهەم بکرێت. واتە واقیعی نییە ئەگەر بگووترێ جگە لەرێی سەربازی و توندوتیژی رێگە چارەیەکی دیکە نەبوو.

سەبارەت بەهەڵسەنگاندنی دەسەڵات و ئایدیۆلۆژیای فەرمی لەکوردستاندا پێویستی پێشخستنی ئەم کورتە پێناسانەم بینی. ئایدیۆلۆژیای فەرمی ئامرازی مەشروعییەت پێدان و پاراستنی ئەو ستاتۆیەیە کەدەسەڵاتی دەوڵەت لەناو کۆمەڵگادا بەجێی کردووە؛ ئافراندنی هزری و پراکتیزەکردنییەتی بۆئەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت یەکلایەنە خۆی بسەپێنێ و درێژەی پێبدات. ئەگەر نموونە بێنینەوە ئەوا لای سۆمەرییەکان میتۆلۆژی، فەلسەفەش لەسەردەمی گریکەکان، لەئەوروپای هاوچەرخیشدا زانست، لەجیهانی چاخی ناوینیشدا ئایین وەك ئامرازی ئایدیۆلۆژی ئەرك دەبینن. پراکتیزەکردنەکانیان (عیبادەت و رێوڕەسمەکانی) رۆڵێکی لاوەکییە. لەبەرئەوەی قاڵبی سەرەکی زهنییەتن رۆڵی دیاریکراویان هەیە. بانگەشەی سەرەکی ئایدیۆلۆژیا فەرمییەکان لەکوردستان بەوشێوەیە کەدیاردەیەك بەناوی کورد بوونی نییە، ئەگەر هەشبێت گرنگ نییە، گرنگیش بێت ئاشکراکردنی زۆر مەترسیدارە. لەم پێناوەشدا هەزارویەك بروبیانوو دەدۆزنەوە. هەندێکیان وەك سەهۆڵ، هەندێکیش وەك ئاوی کوڵاو بەسەریاندا دەرێژن. تاوەکو دەسەڵاتی بەرپۆەبراو هەرشتێکی پێیەوە گرێدراوە ئەرێکردن و پەسندکردنی خۆی نیشاندەدات ئەم ئەرکە بەسووربوونەوە درێژەی پێدەدرێت. بیانووی سەرەکی لەژێر ئەمەدا شاراوەیە، ئەوەیە کەلەمێژە کوردستان فەتحکراوەو لەگەڵ ئەمەشدا کوردەکان خۆیان بەدەستەوەداوە. لایەنی سەیری مەسەلەکە ئەوەیە کە کوردان هەست بەم بانگەشانە ناکەن. تورکێك، فارسێك یاخود عەرەبێکی خاوەن دەسەڵات زۆر بەچاکی دەتوانێ باسی ئەوە بکات لەکامە شەڕی بەناوبانگدا چۆن توانیان ئەو پارچەیەی کوردستان فەتح بکەن کەلەژێر دەسەڵاتیان دایە، تەنانەت لەباسکردنی چیرۆکەکانی قارەمانێتی ئەم فەتحکاریانە زەوق وەردەگرێ. هەرچی کوردە ـ ئەگەر ئەو جەرگەی هەبێ بانگەشەی هەبوونی خۆی بکات ـ وەکو گەمژە گوێ لەم چیرۆکانە دەگرێ. توانستێکی کەم نیشاندەدات تاوەکو لێپرسینەوە بکات کێ بوو ئەوەی فەتحکاری ئەنجامدا. ئەم شوێنگەیە ئەو شوێنەیە کە زهنییەتی کۆمەڵگا و پەیوەندی ئەخلاقی کۆتاییان پێهاتووە.

سەدان ساڵە ئایدیۆلۆژیا فەرمییەکان بەردەوامن و تارۆژگاری ئەمڕۆمان هاتوون. بەشێوەی ئەڵقەکانی زنجیرە هاتوون و پچڕان ناناسن. ئەگەر نموونەیان بێنینەوە، عەرەبەکان بەردەوام فەتحەکانی ئیسلام وەك بەڵگەی ئیلاهی و سەرەکی پێشکەش دەکەن. کەدەڵێ "فەتحمان کرد، کەواتە هی خۆمانە" ئایا لەفەتحکردن بەناوی خوا بەولاوە مافێکی گەورەتر دەبێت؟ ئەمەیە بانگەشەکە و تاوەکو ئێستاش بەشێوەیەکی بەهێز پێشکەشدەکرێت. فارسەکانیش کەمێکی دیکە بەرەو پێشەوەدەڕۆن و کوردەکان لەژێرەوەی خۆیان وەك خزم لەقەڵەمدەدەن و بەوە باوەڕەی کە لەمێژە بووە بەخاوەنی هەموو شتێکیان و ئەوانیش ئەم رەوشەیان ئەرێکردووە. ریزکردنی بیانووە درێژەکان بێواتا دەبینن. هەروەکو بڵێی دەڵێن: بەرامبەر گەورەیی ئایدۆلۆژیای دەوڵەت و دەسەڵاتەکەیان کوردایەتیش چ بانگەشەیەکە. تورکەکانیش هەمان سیناریۆی فەتحکاری زەقدەکەنەوە. بەبێ ئەوەی هیچ لێپرسینەوەك بکەن وەها پێشکەشی دەکەن کەوەك پارچەیەکی ئەنادۆڵ هەزار ساڵ پێش ئێستا فەتحیان کردووە. بەجۆرێك بەباوەڕی باس لەو بانگەشەیە دەکەن هەروەکو بڵێی فەتحکردن وەکو مافێکی موتڵەق بۆیان پەیدا بووە. لەبنەڕەتدا دەشێ فەتحی بەڵکان و ئەستانبوڵ واتاداربێ. بەڵام کاتێك دەڵێین هیچ کاتێك دیاریەکر (ئامەد) فەتحنەکراوە، بەڵکو لەسەردەمی سەلجۆقییەکانەوە لەمیانەی سیاسەتێکی هاوبەش جموجۆڵی تێداکراوە، بەڵێ کاتێك بەمجۆرە رێبازی مێژوو دەسەلمێنێ، ئەوا وەك هێرشێك بۆسەر فەتحکاری و ئایدیۆلۆژیەکەی هەڵدەسەنگێنرێ. تەنانەت زۆر بەچاکی ئەوەمان خستەڕوو ئەو کوردانەی نزیکەی پانزدەهەزار ساڵە لەسەر ئەم خاکە ژیاون و بوون بەخاوەن کولتوورو نیشتمان، هەزاران جار لەماف فەتحکاری زیاتر ماف بانگەشەکردنی و خاوەندارێتییان هەیە. ئەو وڵاتەی هاوین و زستان چاندنی تێدا ئەنجامدراوە تا کردوویەتی بەکێڵگە، گوندو شاری تێدا ئاواکردووە، بەهەزاران ساڵ ئازارەکەی چەشتووە، بەرخودانی کردووەو خۆی کردووە بەقوربانی و رۆناهی چاوی لەپێناویدا رژاندووە، واتە ئەو هەبوونە کۆمەڵایەتی و وڵاتەی هەمووشێوە رەنجێکی لەپێناو

تەرخانكردووە لەناكاو دەبێتە موڵكی عەرەب و تورك و عەجەم: مافی خۆیەتی بانگەشەی ئەوە بكات و بڵێ، بەڵكو تۆ بەناهەق جارێك داگیرتكردبێ بەڵام من بەسەدان نەوەم كردووە بە قوربانی و رۆژانە فەتحی دەكەم.

بانگەشەیەكی دیكەی ئایدیۆلۆژیا فەرمییەكان سەبارەت بەوەیە كەبابەتەكانی كوردو كوردستان بێواتاو مەترسیدارن، تەنانەت وەك بیانووی جوداخوازییەكی گرێدراوی تیرۆر نیشانیدەدەن. هەروەكو دەزانرێ بەشێوەیەكی مێژوویی سەلمێنراوە بەرلەوەی عەرەب و فارس و تورك پەیدا ببن كوردو كوردستان هەبوو. هەروەها ئاماژە بەوەشكرا كەبێ بایەخ نییە و بەڵكو لەسەرووی سەرچاوە سەرەكییەكانی شارستانییەتەوە دێ. هەرچی بانگەشەی بوونی بەسەرچاوەی جوداخوازی و تیرۆرە پێچەوانەكەی دەسەلمێنێ. نموونەی ئەو دزەی خاوەن باخ لەباخەكەی دەردەكات ئەم هەڵوێستە جواداخوازییە. بۆچی كوردان ئەو خاكە پارچە بكەن كەبەرەنجی هەزارانساڵەیان خوڵقاندوویانە. دیسان خۆیانن ئەوانەی بەردەوام لێیان دەدرێ و داگیردەكرێن، لەبنەڕەتدا ئامرازەكانی توندوتیژی لەدەست ئەوانەیە كەلەدەرەوە هاتوون. بۆچی توندوتیژی بەكاربێنن؟ بۆچی بەرگری رەوای ناچاری ببێتە توندوتیژی و جوداخوازی؟.

ئەو مەسەلانەی فۆرمیلەمان كرد ئایدیۆلۆژیا فەرمییەكان بەئاشكرا نایدركێنن، بەڵام لەناوەڕۆكدا بانگەشەكان ئەمانەن. ئیتر بەشێوەی پەندی پێشینان دووبارە كراوەتەوەو گووتراوە" دەستاودەست بكەو بسوڕێ، محەمەدی كورد هەر پاسەوانە"ە "كورد چی لەجەژن دەزانێ، تەنیا بەفڕەفڕ دۆدەخواتەوە". ئایدیۆلۆژیا فەرمییەكان ئەمە بەیەكێك لەئەركە سەرەكییەكان دەژمێرن و ئەم بانگەشانە وەك وانەی درێژی مێژوو، ئابووری، سیاسەت، ئەدەبیات، یاسا، هونەرەكانی دیكە، سەربازی، تەنانەت وەك زانستی ئایین و ئەخلاق لەقوتابخانە فەرمییەكان دەخوێندرێ. بەمجۆرە بڕوا دەكەن كەلەناو كۆمەڵگادا مەشروعییەتی خۆی بەدەستهێناوە. لێرەدا ئایدیۆلۆژیا هەوڵدەدات ئەركێك جێبەجێ بكات كە لەكۆمەڵكوژی مەترسیدارترە. سوود وەرگرتن لەبێهێزبوونی گەل و كۆمەڵگایەك یاخود لەتێكشكانی و نكوڵیكردنی، تەنیا پێشێلكردنی ماف نییە، لەناوەڕۆكدا نكوڵیكردنی سەرجەم راستییە ئایینی، فەلسەفی و زانستییەكانە. كێشەیەكی لەوە ترسناكتری كۆمەڵگا نابێت. ئەوەی نكوڵی بكات لەناویشی دەبات. ئەركی ئەم نووسینە نییە كەبەدرێژی گفتوگۆی ئەوە بكات لەم قۆناخانەدا دەوڵەتەكانی تورك، عەرەب و فارس چۆن بانگەشەیەكیان كردووە. لێرە تەنیا پێناسەیەكی ئەركی ئایدیۆلۆژیا دەكرێت. هەروەها گرفتی ئامرازە ئایدیۆلۆژییەكان لەئارادایە. پێشتر لەرێگای مەلا گەڕیدەكان، دەروێش و سەیدەكان، دواتر پەرتووك، لەرۆژگاری ئەمڕۆشماندا رۆژنامە و رادیۆو تەلەفزیۆن، لەقوتابخانە فەرمی و مزگەوتەكاندا هەروەكو بڵێی ئەم بانگەشە ئایدیۆلۆژییانە راستن و رۆژانە هەزارجار دووبارە دەكرێنەوەو هەوڵی مەشروعكردنیان دەدرێ، هەرچی پێشخستنی بیرۆكەیەكی پێچەوانەی ئەمانەیە، وەك بابەتی سزایەكی قورس یەكسەر لەلایەن هێزەكانی ئاسایش و ئۆرگانەكانی دادگا لێكۆڵینەوەی دەرهەق دەكرێت، دادگایی دەكرێ، دەخرێتە زیندان ودەبێتە بابەتی سزای گران. خۆگوزارشتكردن لەكەرامەتی سەرەكی گەل و كۆمەڵگایەك، كاتێك دووچاری ئەو هەموو رێگری و كۆسپانە بێت، ئیتر سەردەست بێ یاخود ژێردەست، ئایا دەنگی نەخێر لەم كۆمەڵگاو مرۆڤانە بەرزدەبێتەوە یاخود نا؟

ئاشكرایە كەئایدیۆلۆژیا فەرمییەكان گیروگرفتی جددییان خوڵقاندووە. بۆئەوە بەكاردەهێنرێ كەناوەڕۆكی توندوتیژی دەسەڵات رەواو باڵادەست و مافداربكات و ستاتۆیەك بخوڵقێنێ. ئەگەر سەردەست یان ژێردەست بێ، لەمیانەی پێكهێنانی چەمكی سەرەكی كۆمەڵگاو هەوڵدان بۆ زاڵكردنی تێڕوانینی یەكلایەنە، دەركردنی راستی و هەڵوێستی گونجاو ئاستەنگ دەكات. ئاشتییەكی كۆمەڵایەتی شیمانە بۆكراویش، ناوەڕۆكی راستینەی هاوكاری پووچەڵدەكاتەوە. بەپێچەوانەوە، هەركاتێك بانگەشەی بەرامبەر دەربكەوێت، دەبێتە هۆكارێكی جددی و بانگەوازی بۆ زەمینەو هەلومەرجی كێشمەكێش و توندوتیژی دەكات. لەمێژوودا ئەوەی ئاستی كۆمەڵایەتی ئاستەنگ دەكات و بیانوو بۆ شەڕ دەخوڵقێنێ، بەردەوام بانگەشە چەوت و

ناواقیعییەکانی ئایدیۆلۆژییانە. ئەمەش بەردەوام ڕێگا لەپێش ئایدیۆلۆژیای دژو لەگەڵ ئەویشدا پێکهاتەی دژ دەکاتەوە، کۆمەڵگا لەناو دۆخی گرژی و پێکدادان دەهێڵێتەوە.

ئاشتییەکی راستی گۆڕەپانی ئایدیۆلۆژیا بەئازادی هزردا تێپەڕدەبێت. ئەوروپاییەکان دوای شەڕە ئایدیۆلۆژییە گەورەو درێژخایەنەکان هەستیان بەگرنگی ئازادی هزرکردو کردیان بەیەکێك لەمافە سەرەکییەکان. ئازادی هزر لاوازی هەڵەکانی ناوەڕۆکی هەلۆێستە ئایدیۆلۆژییەکان دەردەخاتەرووو ڕێگا لەپێش نزیکبوونەوەیەکی واقیعی دەکاتەوە. بەرهەمی فیکریش بەمجۆرە بەدەست دێت. هەڵگرتنی ئابلۆقەی ئایدیۆلۆژی دەوروبەری دیاردەی کوردو کوردستان و سەربەستکردنی ئامرازەکانی تەلەفزیۆن، رادیۆ، سینەما، رۆژنامەو پەرتووك بۆ رادەربڕینی ئازادانە تەنیا پێویستییەکی دیموکراتیزەبوون و مافەکانی مرۆڤ نییە, لەبنەڕەتدا تواناکاری ئەوە دەخوڵقێنێ کۆمەڵگا دەرك بەراستی بکات و ئاشنای زانیاری زانستی بێت، هەربۆیە رۆڵی یارمەتیدەرو کۆمەك دەبینێ بۆ بوون بەکۆمەڵگای زانیاری. زانیاری وەرگرتنی راست ڕێگا لەپێش چارەسەری واقیعی کێشەکان دەکاتەوە، هەربۆیە ڕێگای ساغڵەمی چارەسەرییەکی ئاشتی و ئاقڵمەندانەیە. ئەوەی وایکردووە ئەوروپا لەجیهان ببێتە بەهایەکی سەرەکی، لەبەرئەوەی کۆمەڵگاکانیان شایستەی ئەم راستییە دەبینن.

ئەم ئایدیۆلۆژیا فەرمیانەی لەئارادان تاوەکو لەسەر دیاردەی کوردو کوردستان بەردەوام بێت، ئەوا لەمیانەی بەزیندوو هێشتنەوەی زەمینەیەك کە بۆهەمووجۆرە بەکاربردنێکی دەرەوە کراوەیە, دەبن بەهۆکاری هەڕەشەی راستەقینە. ڕووداوەکانی ئێراق زۆرباش گوزارە لەم راستییە دەکات. ئەوانەی قەمبورێتی ئایدیۆلۆژیای فەرمییان لەسەر پشتی خۆیان هەڵگرتووە، هیچ کاتێك لەسەر ڕێگای هاوچەرخ بوون لەکەموکورتییەکان رزگاریان نابێت. هەربۆیە بەپێچەوانەی بانگەشەکان، لەبەرئەوەی ئایدیۆلۆژیا فەرمییە پەیڕەوکراوەکان بەردەوام رەوشێك بەزیندوویی دەهێڵنەوە کەبەجوداخوازی و توندوتیژی هەڵئاوساوە، ئەوا سەرچاوەی راستەقینەی مەترسی سەر یەکپارچەیی دەوڵەت و وڵاتن. مێژوو ئاشنای چەندین کۆمەڵگا، دەوڵەت و وڵاتە کەلەبەرئەم هۆکارە کەوتوونەتە ناوشەڕ، پارچەبوونەو دووچاری زیانی گەورە هاتوون.

کاتێك بەشێوەیەکی بەرجەستە شێوەی ئەو ئایدیۆلۆژیا فەرمییانەمان رەچاوکرد کەلەسەر کوردستان بەکاریگەرن دەبینین کەلەخودی ئایینگەرایی و میللیگەرایی باڵادەست, لەهەر چوار پارچەی کوردستان ئیسلام وەك ئایدیۆلۆژیایەکی دەوڵەت دەستبەکارە. هەرچەندە گفتوگۆ سەبارەت بەعەلمانییەت بکرێ، پێویستە باش بزانرێ کە لەهەموویاندا ئیسلام رۆڵێکی سیاسی دەبینێ، پەیوەندی نێوان تاك و خوداوەند ــ لەگەوهەردا پەیوەندی تاك و دەوڵەت ــ تەفرەدانە. لەکاتێکدا هەندێ دەوڵەت وەکو ئێران بەئاشکرا ئەمە دەکەن، ئەوانەی دیکە بەدەمامککراوی ئەنجامی دەدەن. لەتورکیا دیانەت نزیکەی $100$ هەزار کادیری هەیە. لەوانەیە لەئێرانیش سوپایەکی ئایینی لەو شێوەیە هەبێت. قوتابخانەکانی ئیمام و خەتیبی هاوشێوەی دواناوەندییە فەرمییەکانە. لەرێگای خولەکانی قورئان خوێندن و کۆمەڵەو پەیمانگاکانی ئیلاهیات نزیکەی کادیرێکی یەك ملیۆنی دێتەئاراوە. لەمیانەی سوافکردنی پەروەردە بەعەلمانییەت (سکولاریزم) فەراهەم نابێت. تەنیا تێپەڕکردنی لەرێگای شیکاری سۆسیۆلۆژییانەی هزری ئایینی و ئەدەبیاتەوە دەشێ عەلمانییەتی راستەقینە پێشبکەوێت. لەم وڵاتانەدا ئایینگەرایی و زانستگەرایی خراپترین رکابەرێتی پێکدێنن. ئەم رکابەرێتییە بنبەستبوونی زهنییەت ئەنجامگیر دەکات. لەسەرووی ئەو کۆسپانەشەوە دێت کە ڕێگرن لەپێش هزرێکی خوڵقکار و پێشکەوتنی فەلسەفی کەتیۆرییەکی رەسەنی ئەدەبی دێنێتەئاراوە. لەبنەڕەتدا ئەم وڵاتانە بەباشی بیریان لەوە نەکردۆتەوە لەرێگای ئایدیۆلۆژیای ئیسلامەوە دەتوانن چی بکەن. لەلێکدانەوە رۆژانەییەکانی دەسەلات و کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگاو رەگەزی ژن وەك ئامرازێك بەکاردەهێنرێ. بەڵام هەست بەوە ناکەن چونکە تیۆری زانستییان پێشنەخستووە، دووچاری گەورەترین زیان هاتوون.

جگەلەمەش کاتێك تەریقەتگەرایی و پارتیبوون کەزهنییەتی ڕێکخراون ڕاستەوخۆ تێکەڵ بەسیاسەت دەبن، ئەوا ڕەوشێك دەخولقێنن کەدەرکەوتن لێی زەحمەتە. باوەڕمەند بێت یاخودنا بەتەنیا سەربەخۆ واتایەکی ئەوتۆ نابەخشێ. هەروەکو چۆن باوەڕمەندێکی باش دەتوانێ ڕۆڵێکی گرنگ لەناو کۆمەڵگادا ببینێ، یەکێکی عەلمانیش دەتوانێ هەمان ڕۆڵ ببینێ. بەڵام چارەسەری سۆسیۆلۆژییانەی ئایین بۆ ئەمە مەرجە، هەرگیز ناتوانرێ نەریتی ئایینی بچووکبکرێتەوە. نابێ بێڕێزی لەبەرامبەردا بکرێ. مسۆگەر پێویستە ئەم واتایە دەرکی پێبکرێت کەنوێنەرایەتی دەکات. ئەگەر بەمشێوەیە بێت وەك پێناسەیەکی گرنگی ناسنامەی کۆمەڵگا بەهادارە. ئەگەر وەها نەکرێت تەنیا بۆ ئەزبەرەکردنێکی وشکی ڕێوڕەسمەکانی عیبادەت و پاڕانەوە دابخرێت، ئەوا لەسڕکردنی هەست و هزرو بێکاریگەرکردنیان و داخستنیان بەرووی زانست بەولاوە ڕۆڵێکی دیکە نابینێ. بەتایبەتیش لەو قۆناخانەی بەڕێوەبەرایەتی ئارەزوومەندی ــ دەسپۆتیزم ــ دژوار دەبێت، خۆپێچان لەئایین لەبەر ئەم هۆکارەیە. لەڕێگایەوە هەوڵدەدرێ هۆشیاری و ئیرادەی کۆمەڵگا سڕبکرێت. بەئەندازەی ئێران لەئێراق، سوریاو تورکیاش لەسەر ئەم بنەمایە بەشێوەیەکی فراوان ئایین بەکاردەهێنرێت. خەسڵەتێکی سۆسیۆلۆژییانە لەهەڵوێستی مستەفا کەمال بەرامبەر بەئایین دەبینرێ. بژاری بەلای زهنییەتی زانستی ئاشکرایە. ناتوانێ نکوڵی لەوەبکرێت کەتێکۆشانێکی زهنی بەڕێوەبردووە. بەڵام ئەنجامنەدانی شرۆڤەیەکی قووڵی نەریتی ئایینی، تێپەڕنەکردنی لەمیانەی فەلسەفەوە، کۆنترۆڵکردنی لەلایەن دەزگای دیانەتەوە سەبارەت بەئەنجامی درێژخایەن هێندە سوودمەند نەبوون. عەلمانییەتێکی بەشێوازی ئەوروپا ئەنجامنەدراوە.

لەقۆناخی دوای مستەفا کەمالدا گەندەڵکردنی و بەکارهێنانی تیۆری ئایینی بۆ ئامانجە سیاسییەکان، دەسکەوتەکانی کۆمار لەم بوارەدا لەدەستدراوە. لەقۆناخی دەسەڵاتی هەردوو پارتی دیموکرات و عەدالەت AP و DP بەشێوەیەکی ئاشکراتر ئایین دووچاری بەسیاسیبوون هاتووە. لەکودەتاکانی 12ی مارت (حەفتاکان) و 12ی ئەیلول (هەشتاکان) لەژێرناوی سەنتێزی تورك ــ ئیسلام رووخساری ئایدیۆلۆژیایەکی فەرمی دراوەتێ. تورکیای دوای 1980 لەبنەڕەتدا بەجۆرێك کەوتۆتە سەررێگای بەئێرانیبوون. هەرەدواییش لەرێگای دەسەڵاتی پارتی دادو گەشەپێدان"AKP " ئایدیۆلۆژیای ئیسلامی بەفەرمی بووە بەدەسەڵات. پێچەوانەی مەزەندەکان گەیشتنە دەسەڵاتی ئیسلامی سیاسی بژارێك نەبووە، بەڵکو ئەنجامێکی سیاسەتی ئایین بووە کەماوەیەکی درێژە دەوڵەت بەڕێوەی دەبات. تەنانەت ئەم گۆڕانە لەرێگای ڕێبازی سوننی ــ نەقشبەندی ئەنجامدراوە کەشرۆڤەی مەزهەبێکی هەرە موحافەزەکاری ئیسلامییەتە. ناکۆکی لەگەڵ ئیسلامییەتی ئێران لەناوەڕۆکدا نییە, بەڵکو رواڵەتە. مەزهەبی شیعە کەلایەنی کۆمەڵایەتی لەپێشە لەگەڵ شرۆڤەی سوننی ـ نەقشبەندی لەناو کێشمەکێش دایە کەلایەنی موحافەزەگەرایی و دەوڵەتگەرایی لەپێشە. ئەمریکا ئەو بزووتنەوە ئیسلامییەی لەژێرناوی پشتێنەی سەوز بەرامبەر کۆمۆنیزم بەڕێوەیبرد، لەرۆژگاری ئەمڕۆشماندا دەخوازێ بەرامبەر گوایە ئیسلامی رادیکال وەك ئیسلامی میانڕەو درێژەی پێبدات. لەرێگای تورکیاوە خوازیارن تاقیبکەنەوە، بەتایبەتیش هەوڵدەدەن لەژێر ڕێبەرایەتی فەتحوڵڵا گولەن لەئاستی ناوچەکەو جیهان پرۆژەیەکی گەورەی ریفۆرمی ئیسلام بەڕێوەببەن و ئەنجامگیری بکەن. لەدوا شیکردنەوەدا ڕۆڵی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئایدیۆلۆژیای سیاسی نێگەتیڤە. چونکە ڕێگانادات کۆمەڵگاکان شەفاف بن. دوورە لەوەی شرۆڤەی ڕاستەقینەی نەریتی کۆمەڵگا بێت.

بەقورسایی شێوەی ئیسلامی سیاسی سەرکوردستان سوننی ـ تەریقەتی نەقشبەندییە. شێخ و سەرۆك تەریقەتەکانی کورد ڕۆڵێکی مەزنیان بینی لەوەی نەقشبەندێتی خاوەن مێژووی درێژخایەن لەرۆژهەڵاتی ناویندا پێشبکەوێت. دەخوازن ئەو بۆشاییە ئایدیۆلۆژییەی لەئارادایە لەرێگای نەقشبەندێتی پڕبکەنەوە. دوای قۆناخەکانی ڕاپەڕینی بەگەکان دەبینرێ کەرێبەرایەتی ئایدیۆلۆژی کەوتۆتە دەستی شێخەکانی نەقشبەندی. لەیاخیبوونەکانی 1878ی نەهری، 1914ی بەتلیس ــ

موتكی، 1925 شێخ سەعید، 1930کان شێخ ئەحمەدی بارزانی و بزووتنەوەکانی ساڵانی 1960ەکان بەڕێبەرایەتی بارزانی و تاڵەبانی پێشخران لەنەخشاندن و هاندانە ئایدیۆلۆژییەکانیاندا نەقشبەندێتی دیارو بەرچاوە. لەسەنتێزی تورك ـ ئیسلامی دوای هەشتاکانیشدا نەقشبەندێتی بەرچاوە. تورکۆت ئۆزال خۆی و پارتەکەی (پارتی نیشتمانی دایك ANAP ـ هەڵمەتێکی گرنگی نەقشبەندێتییان ئەنجامداوە. لەناو هەردووپارتی عەدالەت و دیموکراتی پێشووتریش تەریقەتەکان بەکاریگەرن. بەڵام چوونەتە ناو هەر پارتیبوون، کۆمەڵە، فوتابخانە، راگەیاندن و سەرمایەی هاوبەش کەدوای 12ی ئەیلول لەژێرسایەو پاراستنی دەوڵەت ئاواکران. مسۆگەرە کەبەرامبەر بەئایدیۆلۆژیای کۆماری کەمالیستی دژە شۆڕشێکی ئایدیۆلۆژی ئەنجامدراوە. بەڵام مۆدێلەکە ئاشکرا نییە. بەنهێنی و بێدەنگی بەڕێوەبردراوە. تاکو ئێستا ئەم دژە شۆڕشە بابەتێکە لەتاریکاییدا ماوەتەوە. لەگەڵ ئەوەی پەیوەندییان بەئەمریکاوە هەیە، بەڵام هێشتا رەهەندە فەرمییە ناوخۆکانیان روون نەبۆتەوە.

یەکێك لەو فاکتەرانەی رۆڵی کلیل دەبینێ مەلا فەتحوڵڵایە. باس لەوەدەکرێت کەمەلا فەتحوڵڵا سەعید نورسی سەردەمە ـ رێبەرێکی نەقشبەندی لەپێشی ساڵانی دامەزراندنی کۆمارو تاوەکو 1960کانە ـ. دەشێ بگووترێ رێبەری تەریقەتی ئەڤانگەلیستی جیهانی ئیسلامە کەلەگەڵ ئەمریکا لەناو رێککەوتن دایە. کاتێك مەلا ئەربەکان و ئەجەوید هەمئاهەنگی و خۆگونجاندنی پێویستییان لەگەڵ ئەمریکاو بیرۆکراسییەت بەدەستنەهێنا، دەبینرێ ئەمجارە لەژێر رێبەرایەتی رەجەب تەیب ئەردۆغان و پارتەکەی دادوگەشەپێدان وەك شەپۆلێکی نوێ بەرزدەکرێتەوە. دەتوانرێ بگووترێ نەقشبەندێتی سەرکەوتنێکی سیاسی بەدەستهێنا. رۆڵی سەرۆکە نەقشبەندییە کوردەکان لەوەدا گرنگە. هەروەکو بەئاشکرا لەهەڵبژاردنەکانی 2002 و 2004دا بینرا میراتگری شێخ سەعیدو سەعید نورسی, عەبدولمەلیك فورات، جونەید زاپسو، حوسێن چەلیك و زەکی ئەرگەزەنن. عەبدولمەلیك سەرۆکی پارتی ماف و ئازادیەکانە، زاپسو لەراوێژکارە سەرەکییەکانی تەیب ئەردۆغانە، حوسێن چەلیك وەزیری پەروەردەی میللییە، چەندین رێبەری دیکەی نەقشبەندی لەناو دەوڵەت و سیاسەتی فەرمی جێگای خۆیان گرتووە. رێبەری YNKتاڵەبانی و رێبەری PDK بارزانی نەوەی شێخی هەمان تەریقەتی نەقشبەندیین، یارمەتیدەری نەریتی نەقشبەندێتی تورکیان. هەر لەسەردەمی ئۆزالەوە تاوەکو ئێستا بەهاوبەشێتی لەگەڵ دەوڵەت چەندین کێومالێ سەربازییان دژی بزووتنەوەی دیموکراتی و رەنجدەرانی گەلی کورد ئەنجامداوە.

لەبەرئەوەی تەریقەتی نەقشبەندێتی کوردان بەنیو ـ نهێنی کاردەکات، ناتوانرێ رێکخستنەکانی دیکەی لەئەمریکا، یەکێتی ئەوروپاو رۆژهەڵاتی ناوین پەی پێببردرێ. بەڵام دەبێ بزانرێ بەلانی کەم هێندەی شیعەکان بەکاریگەرن. بەڵگەنەویستە کەپەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئەمریکا ستراتیژییەو رۆڵێکی گرنگی ئایدیۆلۆژی و سیاسی لەپرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوینی گەورەدا دەبینن. لەبنەڕەتدا ئیسلامی میانڕۆ، ئیسلامییەتی نەقشبەندییە. رۆژبەدوای رۆژ زیاتر دەرکی پێدەکرێت کەبەشێوەی پرۆگرامێکی هاوبەشی تاوەکو ئاسیای ناوین لەگەڵ ئەمریکا لەناو رێککەوتنێکدایە. ئیسلامی میانڕۆی نوژەنکراو وەك ئەلتەرناتیفێکی میللیگەرایی عەرەبی ـ بەعسی کۆن، میللیگەرایی کەمالیستی (پارتی گەلی کۆماریCHP) و، مەزهەبگەرایی وەهابی عەرەبستانی سعودی و، ئیخوان موسلمینی میسرو حزبوڵڵای ئێران، دەردەخرێتەپێش.

شێوەی گەورەو دووەمی ئایدیۆلۆژیای فەرمی میللیگەراییە. ئەم مەیلانەی ئایدیۆلۆژیای بەرچاوی سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم بوون، بۆئەوەی لەناوەوە چینی کارکەر لەدەرەوەش رەوتەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو لاواز بکەن وەك ئایدیۆلۆژیای دەوڵەت بەشێوەیەکی تایبەت بەکاریهێناوە. ئەمەش ئەنجامێکی سروشتی چەمکی دەوڵەتی نەتەوەییە. جۆرێك لەئایینی هاوچەرخە. دواشێوەیە کەئەتنیك (میللیگەرایی عەشیرەت) پێیگەیشتووە. لەسەدەی نۆزدەهەم لەئەوروپا و سەدەی بیستەم لە وڵاتانی دەرەوەی ئەوروپادا رۆڵی بەکاریگەرترین ئایدیۆلۆژیای فەرمی بینیوە. لەسڕکردنی ناکۆکییە کۆمەڵایەتییەکان و،

گواستنەوەی بۆرژوازی تازە لەدایکبوو بۆ دەوڵەت و کردنی بەخاوەنی بازاڕێکی هاوبەش و هێرشبردنە سەر خاکی نەتەوەو ئەتنییەکانی دیکە رۆڵێکی گرنگی بینیوە.

لەتورکیا کەلەساڵانی 1840 و لەرێگای تەنزیماتی نامیق کەمال نموونە سەرەتاییەکەی میللیگەرایی تورك دەستیپێکرد لەپێناو پەرتەوازە نەبوونی ئیمپراتۆریەت چڕکرابۆوە. لەپێرەویشدا رەواییگەر بوو. لەقۆناخی دوای ساڵانی 1876 بەرامبەر سەڵتەنەتی سوڵتان عەبدولحەمید رادیکالتر بوو و لەمیانەی میللیگەرایی جۆن تورك (تورکیای لاو) و کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی هەوڵیدا هەم مەشروعییەت بەدەستبێنێ، هەم بەتەواوی دەسەڵاتی سیاسی کۆنترۆڵ بکات و رێگا لەپەرتەوازەبوون بگرێت. سیاسەتی کرانەوەی ئەڵمانیا بەرەو رۆژهەڵاتی ناوین و ئاسیای ناوین بۆ میللیگەرایی تورك نەژادپەرستی لەگەڵ خۆی هێنا. ئەنجام پاکتاوکردنی ئەرمەنی، رۆم، ئاشووری و تارادەیەکیش کوردان بوو. میللیگەرایی سەردەمی کۆمار لەمیانەی چەمکێکی وشکی دەوڵەتی ــ نەتەوەیی وەك قەڵغان کۆمەڵگای پێچاپەوە. چەمکی تاك زمان، تاك نەتەوەو دەوڵەت فوولکرایەوەو هەروەکو بڵێی هەڵوێستی رەسەنێتی کرا بەئایینگەرایی ــ لەجیاتی شێوەی کۆنی خێڵ کەلەدواوە بەجێهێشترا، هەروەکو بڵێی باوەڕییەکی بەشێوەی مەزهەبی ئایینێکی نوێ ئافرێنرا. رژێمی خانەدانی سەدەکانی رابردوو، داگیرکارییەکانی رووبانداوەو گۆشەگیری بوونە هۆکاری سەرەکی ئەم رەوشە. سیستەمی کۆمار کەجێگای خانەدانێتی گرتبۆوە، کاریگەری میللیگەرایی شۆڕشی فەرەنسای بەهێزترکردو پتەوکردنی یەکێتی کرد بەئامانجی سەرەکی خۆی. سەرباری ئەوەی چەمکی نەتەوەیەکی بێ چین و بێ جیاکاری ئامانجێکی شکۆداربوو، بەڵام لەئامرازەکانی جێبەجێکردن بێبەش بوو. بەهۆی مانەوەی بەشێوەیەکی داتاشراوی (واتایی) مەترسی کەوتنە ناو وشکە باوەڕییەکی ئایدیۆلۆژی لەخۆوەدەگرت. میللیگەرایی رۆڵی پەردەپۆشکردنی لاوازی تەواوی دەسەڵاتەکانی گرتەئەستۆی خۆی. هەوڵدرا هەمووشتێك لەژێر دروشمی زێدەڕۆیی "تورکێتی مەزن" دەرخواردی کۆمەڵگا بدرێت.

سەرباری ئەوەی میللیگەرایی مستەفا کەمال لەبنەڕەتدا هێندە لەزانست دوور نییە، پەنا ناباتە بەر ماجەڕا، شێوەیەکە لایەنی وڵاتپارێزی هەیە، زوو ئەم ناوەڕۆکەی لەدەستدا و کرابە ئامرازی سەرەکی دەسەڵاتی سیاسی بۆ سڕکردنی کۆمەڵگا. لەدوای 1980کان هەوڵدرا لەمیانەی چەمکی ئیسلامی سوننی ـ نەقشبەندی وشکتربکرێ و بەشێوەی سەنتێزێکی نوێی تورك ـ ئیسلام پێشکەش بکرێت. ئەمەش رۆڵێکی سەرەکی لەماڵیکردنی میللیگەرایی زێدەڕۆیی ــ MHP ــ تورك کردو لەویش گرنگتر بووە رێگر تاوەکو بزووتنەوەی کورد زیاتر گەورەنەبێ. چینی سەردەستی کوردانی خاوەن نەریتی نەقشی ئەوانیش چوونە پاڵ سیستەم و خواستیان کۆسپ لەپێش تەڤلیبوون و بەشداریکردنی بزووتنەوەی بەرخودانی کوردان دروستبکەن. لەدەرەوەش هەمان هەڵوێستی نەقشی تاڵەبانی و بارزانی پشگیریان لەهەمان هەڵوێستکردو خواستیان بەرامبەر "PKK" بەرەیەك پێکبێنن. بەرامبەر ئەمەش لەئایدیۆلۆژیای کۆمار قەرەبوودان (تعویض)ێکی زۆردرا. ئەنجام بوو بەدەسەڵاتی AKP لەتورکیا، دەسەڵاتی YNK و PDK لەباشوور.

ئەگەر تەواو بەئایدیۆلۆژیای فەرمیش بەناو نەکرێت، هەندێ مەیلی ئایدیۆلۆژی دیکەی نزیك بەم تایبەتمەندێتییەی بەدەرخست. بۆرژوای لیبراڵ وەك مەیلێك (نزعـة) هێندە کاریگەری لەسەر دەوڵەت نەکرد. ئەزموونی سۆسیال دیموکراتەکانیش دووچاری هەمان چارەنووس هات. هەرچەندە ئایدیۆلۆژیا چەپەکان باس لەرکابەرایەتی دەسەڵات بکەن، لەو ئاسۆیە بێبەشن کەدەوڵەتگەرایی تێپەڕدەکات. تەواوی ئەم ئایدیۆژیایانە لەمیانەی خستنەڕووی چۆنییەتی رۆڵیان لەپەیوەندییەکانیان لەگەڵ دەسەڵاتدا کارەکتەری راستەقینەی خۆیان نیشاندا.

لەکاتێکدا ئایدیۆلۆژیاکان ــ پێکهاتەی زهنییەتی هاوبەشی کۆمەڵگاکان ــ دەسەڵات پەردەپۆش دەکەن، ئەوا پێویستە زۆرچاك ئەوە شیبکرێتەوە کەدەسەڵاتیش لەسەر بنەمای توندوتیژی ئاواکراوەو راستینەی کۆمەڵایەتی دادەپۆشێ. تاوەکو

سێکوچکەی ئایدیۆلۆژی ــ دەسەڵات ــ توندوتیژی شیتەڵ نەکرێت، ئەوا رۆشنکردنەوەی گیروگرفتێك یان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی زەحمەتە. تاوەکو لەرێگای میکانیزمەکانی دەسەڵات و ئایدیۆلۆژیا توندوتیژی و چەوسانەوەی کۆمەڵگا نەپێچرێ و بەرێوەنەبردرێت ئەوا بەسانایی ئەنجامنادرێ. بۆئەوەی دەرفەت بۆتوندوتیژی و چەوسانەوە برەخسێ، "هەر لەسەردەمی دەوڵەتی راهیبی سۆمەرەوە" بەگرنگییەوە پێشخستنی شێوەگرتنی ئایدیۆلۆژی و دەزگاکانی دەسەڵات ــ شێوەکانی دەوڵەت و رژێمەکانی ــ سەرەکیترین ئەرکی سیاسییە. دوولایەنەی ئایدیۆلۆژی سیاسەت بەرهەمدێنێ یان بەپێچەوانەوە گرێدراوی پەیوەندییە قووڵەکانی کۆمەڵگایە. هەروەکو لەرواڵەتدا مەزەندەدەکرێ وەها بەسانایی بەکاربردن و توندوتیژی لەسەر کۆمەڵگا پەیرەو ناکرێت. لەم کاتانەدا ئایدیۆلۆژیاو سیاسەت دەکەونەگەڕ. بێگومان بەشێوەیەکی خۆبەخشی و دیموکراتییانە لەناو کۆمەڵگا پەیرەو ناکرێت، بەپێچەوانەوە بەرێوەبردنی تەواوی پەیوەندییە ماددی و مەعنەوییەکانی وەڵامدانەوەی پەرچەکرداری دژوار ئەرکی راستەقینەی ئایدیۆلۆژیاو سیاسەتە.

لەشێوە فەرمییەکانی سیاسەت و ئایدیۆلۆژیاکانی کوردستان بەردەوام پێویستە ئەم ئەرکە رەچاوبکەین. لەرەوشێکی پێچەوانەدا ئەگەر شیکردنەوەی دیاردەی کوردو گەڕان بەدوای چارەسەرکردنی کێشەکەی مەحاڵیش نەبێت، بەڵام بۆ ئەو شێوانە دەگوازرێتەوە کەتاریکترەو بووە بەگلۆڵە. لەچوارچێوە مێژووییەکەماندا هەوڵدرابوو کە بەکورتی پێشکەوتنی توندوتیژی و دەسەڵات پێشکەش بکرێ. کاتێك لەمیانەی ئەم پێدراوانە دەسەڵاتی هەنووکەییمان شیتەڵکردەوە، ئەوا دەبینین کە تەواوی رژێمەکانی لەئارادان تەنیا بەپشتبەستن بەپەرستنی مافی فەتحکاری قەبا هەبوونی خۆیان پێناسەدەکەن و دەپارێزن. ناوەڕۆکی مەسەلەکە ئەوەیە سەردەمێك هەندێ لەباب و باپیرانیان لەرێگای توندوتیژی و شەڕەوە دەستییان بەسەر ئەو دیاردانەدا گرتووە کەکوردو کوردستانی پێدەڵێن. لەم سەردەمانەوە دەستاودەستی کردووە، تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووەو ئەو مافەیان پێگەیشتووە. هەندێکیان لەوانەیە وەك باوەڕییەك پەسەندی بکەن کەشەڕو توندوتیژی تاکە سەرچاوەی تەواوی مافەکانە، واتە مافی فەتحکردنی پیرۆزببینن و بەسەرچاوەی پێشکەشکردنی هەموو مافەکانی دابنێن. بەڵام لەبواری سۆسیۆلۆژیدا وەها شرۆڤە دەکرێ و دەسەلمێنێ کەتاکە سەرچاوەی توندوتیژی رووت شەڕو دەسەڵاتە.

دەشێ بۆچوونێکی واقیعی بێت. بەڵام تێری روونکردنەوەی ئەوەناکات کەتاکە سەرچاوەی مافەکانە. لەم بوارەدا ئەورووپا شەڕی زۆر سامناکی بەرێوەبرد. لەئاکامدا ئەو خاڵەی پێیگەیشتووە ئەوەیە کەدیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ سەرچاوەی سەرەکی مەشروعییەت و راسترین رێگایە. رۆژبەدوای رۆژ زیاتر لەمافەکانی فەتحکردن دووردەکەوێتەوە، گۆڕەپانی بەکارهێنانی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ فراوان دەکات، لەتەواوی بنەمای یاساکان و دەستووری خۆیدا ئەوە بەجێ دەکات کەفەراهەمکردنی مافەکانی تاك و جەماوەر لەسەر ئەم بنەمایە بەهادارترینیانە.

کاتێك تەواوی رۆژهەڵاتی ناوین بەلاوە بنێین و تەماشای دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتانە بکەین کەلەکوردستان ستاتۆیان بەدەستهێناوە، ئەوا دەبینین بانگەشەی ئەوە دەکەن کە لەسەردەمی سەرجۆنەوە خۆیان فەتحکاری موتڵەقی ئەم خاکانە بوونەو لەدەرەوەی ئیرادەشیان کەس ناتوانێ خوارتەماشای یەك چقڵە بەردیشی بکات. رەفتارو کردەوەکانی دەسەڵاتەکانی سەرکوردستان بەشێوەیەکی زۆر سەرنجراکێش نیشاندەدات کەپێناسەیەکی لەوە ئاشکراتر بۆ دەسەڵاتێك ناکرێت کەتوندوتیژی بناخەکەی پێکدێنێ. کورد بەزمانی خۆی ناتوانێ پەروەردە ببینێ و تەکنۆلۆژیا هاوچەرخەکانی گەیاندن بەکاربێنێ. بڕیاری سیاسی خۆی دیاری ناکات. دابەشکردنی ئابووری ئەنجامنادات. پەیوەندی سیاسی ناوخۆو دەرەکی پێش ناخات. ناتوانێ دەزگا نەتەوەیی و دیموکراتییەکان ئاوابکات. ئەم راستیانەش بەڵگەی سەلمێنەری ئەوەیە کەتوندوتیژی مافی فەتحکردن، ئەوانیش دەسەڵات، دەسەڵاتیش لەهەموو ئاستێکدا تەواوی دەزگاکانی رۆشنبیری، ئابووری، کۆمەڵایەتی و جەماوەری دیاری دەکات.

تەنانەت ئەگەر دادوەری ئەمە پەسندیش نەكات، ئەوا پێكهاتەی زهنییەت و دەزگاكانی دەسەڵات گومان لەوەناكەن ئەوەی رۆڵی یەكلاكەرەوە دەبینێ پەیوەندییەكانی هێزە.

كاتێك بەرجەستەتری بكەین، دەسەڵاتی دەوڵەتەكانی سەر كوردستان بەبێ ئەوەی هیچ ئیرادەیەكی بەرامبەر هەبێ، ئەوە لەولا بمێنێ كەلەوە دوودڵ نین چۆن بخوازن وەها شێوە بەم گەل و خاكە دەدەن، بەڵكو وەكو ئەركێكی خودایی و نەتەوەیی پەسندی دەكەن. تەنیا خۆیان بڕیار دەدەن چۆن چەوسانەوە بەڕێوەدەبەن، كێ هەندێ كەس فێری چی دەكات، چەند باج و سەرباز كۆدەكەنەوە، كێ دەكەن بەخاوەنی هێزوكار، چی لەكێ قەدەخە دەكەن و كێ بەتاوانبار نیشاندەدەن. تەنانەت هێز و چینەكانی دەسەڵاتی تورك، عەرەب و فارس لەبواری تیۆریش بەرامبەر بابەتەكانی كوردو كوردستان كراوە نین و رێزی لێناگرن. بەپێچەوانەوە نیشاندانی ئەم بابەتانە وەكو سەرچاوەی تاوانباری بەیەكێك لەكارە گرنگ و جددیەكانی دەوڵەت لەقەڵەمدەدرێت. كاتێك ئەمە بەشێوەیەكی نهێنی و تایبەت ئەنجامدەدەن، وەك پێوانەیەكی گرنگیدان بەئاسایشی نەتەوەیی نیشانیدەدەن. هیچ چەمكێكی ئاسایشی وەهایان بەهزردا نایەت كە لەرێگای ناسینی كوردان وەك كۆمەڵگایەك و بینینی بەخاوەن ماف بەدیدێت. ئەركی سەرەكی سوپا ئەوەیە كێشەی دیاردەكانی كوردو كوردستان بەهەموو وردەكاریەكەوە نكوڵی بكەن و ناوەرۆكە زیندووەكەیان بشێوێنن و راپەرینەكان سەركوتبكەن، لەم پێناوەشدا پیلان و وردەكارەكان دادەنێن. پراكتیزەكردنی ئەم پیلانانەو لەسەر ئەم بنەمایەش چاودێری كردنی دەزگاكانی دیكە لەئەركە راستەقینەكان دەژمێرێ. حكومەت و پەرلەمان و بیرۆكراسیش هەوڵدەدەن ئەو كارانەی یاسا، بڕیارنامەو رێبەرنامانە تەواو بكەن كەسوپا بۆپلەی دووەمی جێهێشتووە. زیاتر تەوقی دەكەن. كاتێك كێشەی كورد بەركەنار دەكەن ئینجا دێتەوە یادیان كەسیاسەتیش بوارێكی چارەسەرییە. لەبەرئەوەی لەسەرەتاوە تاكۆتایی پێڕەویان بەرامبەر كێشەی كورد توندوتیژییە ئەوا هەرگیز گومان لەوە ناكەن هەر لەبچووكییەوە سەری مار پان بكەنەوە. لەرەوشێكی پێچەوانەدا باش دەزانن تەگەرەیەكی جددی دەكەوێتەپێش دەسەڵاتەكەیان. لەبنەڕەتدا سیاسەتی باو لەلایان رەوشێكی پەرچەكرداری وەرگرتووە. وەك هاندەرانی یارییەكانی تۆپی پێ هەرلەخۆیانەوە پەرچەكردار نیشاندەدەن.

پارتە سیاسییەكان و دەزگا نیو سیاسییە هاوشێوەكانیان رۆڵی بواری پروپاگەندەكردنی ئەم میكانیزمە دەبینن لەناو گەلدا. پەسەندكردن و رێكخستنی داواكانی گەل وەك سیاسەت، لەوكارە زیادو نابەجێیانە لەقەڵەمدەدرێت كەجارجار دێتەوە یادییان، باشترین پارتی ئەوەیە بەچاكترین شێوە نوێنەرایەتی دەوڵەت بكات. تەنانەت پارتییەكانیش ئەمە بەفیكری خۆیاندا ناهێنن كەنابێت هی دەوڵەت بن بەڵكو دەزگایەكن ئیرادەی كۆمەڵگا لەخۆوە دەگرن. لەكاتێكدا بوون بەپارتی دەوڵەت بەشانازی لەقەڵەمدەدەن، بوون بەپارتی كۆمەڵگا وەك كۆت و بەندی دەبینن. پارتەكان هەست بەوە ناكەن لەمیانەی ئەم ناوەڕۆكەیان بوونەتە نووسینگەی پڕوپاگەندەی دەوڵەت. لەكاتێكدا ئەمە بەگرێدانی نەتەوەیی وڵات و نەتەوە لەقەڵەمدەدەن، هەرەس ئاسا گەورەبوونی گیروگرفتە ئابووری و كۆمەڵایەتییەكان هەروەكو بڵێی گرفتی ئاساین و ئەوان پەیوەندیدار ناكات، پشتگوێخستن و خۆلەنەزانیدان بەسیاسەت دادەنێن.

دامەزراوەكانی كۆمەڵگای مەدەنیش كەپێویستە دەسەڵاتی دەوڵەت سنووردارباكات بەردەوام دەوڵەت بەبنەمادەگرن. داواكارییەكانی تاك و كۆمەڵگا لەپلەی دووەم دەمێنێتەوەو بەمجۆرە بەردەوام دەبێت. لێرەدا دەبینین تاكو ئێستا تاچ رادەیەك چەمكی دەوڵەتی پیرۆز، دەوڵەتی ئیلاهی بەهێزە. لەم شێوازەی بەڕێوەبردنی دەسەڵاتدا ئابووریش بەشی خۆی وەردەگرێت. ئابووری بوارێكی تێكۆشان و كارە كەپێویستە تەواو بەگوێرەی بەرژەوەندییەكانی دەسەڵات رێكبخرێت. خۆی ئابووری دیاری دەكات. ئایا یاساكانی ئابووری بەرامبەر توندوتیژییەكەی خۆی بەهەند وەردەگیرێ لەكاتێكدا برسێتی و هەژاری بەرهەمێكی پێكهاتەی ئەم سیستەمەیە، بەناوی دەسەڵات سوودوەرگرتن لەمە بەسیاسەتی بنەڕەتی لەقەڵەمدەدەن. لەمیانەی هێڵێكی پان

ئەمە لەمێشکیاندا دەسەلمێنرێ کەبرسی و هەژارەکان چەندە گرێدراوی دەسەڵاتی دەوڵەت و پارتەکەی بن بەو ئەندازەیە نرخ و گرنگیان پێدەدرێت. هێندە بەبێڕەحمی ئابووری لەسەرکوردان پەیڕەودەکەن، تەنانەت وەها دەکەن بۆ جێبەجێکردنی پێداویستییە ناچاریەکانیش بەخۆگرێدان بەدەسەڵاتی دەوڵەتەوە تێپەڕدەبێت. لەدوا هەڵبژاردنەکانی شارەوانی تورکیادا، لەو شوێنانەی ئەگەری سەرکەوتنی کوردە دیموکرات و وڵاتپارێزەکان لەئارادبوو، هەروەکو بڵێی یەکبوونی تەواوی پارتەکانی دەوڵەت و ئاوێتەبوونیان لەگەڵ گشت بیرۆکراسییەکان تێرناکات، سەرباری ئەمەش بەتریلیۆنان پارەیان بۆ ئەم شوێنانە گواستەوە، دیسان ئەو جەماوەرەی لەناو تەنگەتاوی و نەداریدا دەژین، جارێکی دیکە بەرامبەر بەدەنگەکان هەڕاجێکی مێژوویی ئەنجامدراو کوردان کڕان و فرۆشران، گوایە بەم شێوەیە بەتەواوی سیستەم خرایە ژێرگەرەنتییەوە. بەمجۆرە جارێکی دیکە شارۆچکەکانی کوردان فەتحکرانەوە. بەبێ خۆدەرخستن ئەمە بەدەستی پارتەکەی ئەردۆغان ئەنجامدرا. مێژوو باس لەوەش دەکات کاتێك یاووز سەلیم بتلیس دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی چەندین کۆڵەپشتی پڕ لەزێڕی بۆ ناردوون. کاتێك لەبینگۆل دەڵێن "ئیدریسی بتلیسی لێرەیە، یاووز لەکوێیە؟ "دەخوازن مێژوو بێننەوە یادمان. هیچ شتێك لەرۆژهەڵات نەگۆڕاوە!. کردەوەو رەفتاری وڵاتەکانی دیکە قەباترە. هەر هیچ نەبێ لەتورکیا ئەگەر سنووردااریش بێ میکانیزمی بازاڕ بوونی هەیە. هەرسێ سڕکەری هونەر، وەرزش و سێکس پارچەیەکی جیانەکراوەی میکانیزمی گشتی ئەم دەسەڵاتەیە. ئەم سێ سڕکەرە ئەگەر شتێك لەتاکدا مابێتەوە ناوەڕۆکەکەی پووچەڵ دەکەنەوە، تاك وەك خڵتەیەك لێدەکەن بەکەڵك هیچ نەیەت و فڕێی دەدەنە کەنارێکەوە. ئەم پێڕەوانەی تەنانەت سەبارەت بەسەرجەم کێشە کۆمەڵایەتی و نەتەوەییەکان پەیڕەوکراوە، بەرچاوترین سیاسەتی سەدەی بیستەم بوو. لەئاکامدا فاشیزم رێگای لەپێش دونیایەکی پڕ لەشەڕو تۆقاندن کردەوە. متمانە پێکراوترین سیاسەت دونیایەکی بێ ئاسایشی و بێ متمانەیی خوڵقاند. هەرەدوایی سەرۆکی ئەمریکی بۆش کاتێك دەڵێ "سیاسەتەکانمان بەناوی ئارامی دەسپۆتیرمی بەرهەمهێنا، زەمینەو هەلومەرجی تیرۆری ئامادەکرد، دیموکراسی رێگای رزگارییە لەم رەوشە، بۆیە دیموکراسی بەبنەما دەگرین. " لەراستیدا دانی بەسیاسەتەکانی سەدەی بیستەم دادەنا. بەمجۆرە هەواڵی گۆڕانکارییەکی گرنگی سیاسەتی رادەگەیاند.

ئەمریکا پاڵپشتی سیاسەتەکانی قۆناخی نزیکی تورکیای دوای ساڵانی 1950کان بوو. بەرامبەر بەئامانجە ستراتیژییەکەیان (یەکێتی سۆڤیەت) پاڵپشتی میللیگەرایی کرد ـ بەتایبەت لامپی سەوزی بۆ رێکخستنی کۆنتراگەریلا هەڵگیرساند ــ و تیرۆری فاشیزمی بەسەر هەلومەرجی 1970کان سەپاند. لەجیاتی ئەو میللیگەراییەی ــ ئاکامەکەی پەرتەوازەبوونی ئیمپراتۆریەت بوو ـ ئیتحادو تەرەقی کەئەڵمانەکان قووڵیان دەکردەوەو هانیاندەدا، ئەمجارە کۆماری میللیگەرایی فاشیست گەیێنرایە لێواری تەقینەوە، کەئەمریکا پاڵپشتی لێدەکرد. کوردانی ناچاری سەرهەڵدان کرد. لەکاتێکدا لەئاکامی 12ی مارت و 12ئەیلول (کودەتاکانی 1970 و 1980) لەمیانەی سیاسەتە بێڕەحمەکان ئۆپۆزسیۆنی کۆمەڵایەتی سەرکوتدەکرا، جارێکی دیکە سەلمێنرا کەیەکلاکەرەوەی راستەقینە توندوتیژییە. لەدوای 1980کان سەرتاسەری کوردستان بوو بەگۆڕەپانی توندوتیژی. لەمیانەی هەمووجۆرە رێکخراوە سەربازی و نیو سەربازییەکانی هەموو چینەکان و لەرێگای بەکارهێنانی کلاسیکیانەی خیانەتکارانی کوردان خوازرا بزووتنەوەی دیموکراتی و وڵاتپارێزی سەرکوتبکرێت. لەئێران بەناوی شۆڕشی ئیسلامی، لەئێراق و سوریاش لەمیانەی میللیگەرایی بەعس هەمان رژێم پەیڕەوکران. رووداوو ژینۆسایدی وەکو هەڵەبجە روویاندا. بەهەزاران گوندی کوردستان چۆڵ و وێرانکران، بەدەیان هەزار تاوان ئەنجامدرا. تاکە گۆڕانکارییەکیش لەکارەکتەری ئەورژێمانە رووینەدا کەبەرێوەیان دەبرد.

ماف و دادگا لەسەرووی ئەو دەزگایانەوە دەهاتن کەپێچەوانەو ناکۆك لەگەڵ ناوەڕۆکی خۆیان رەفتاریان دەکرد. بەسەدان هەزار کەس تاوانبارکران، لێپرسینەوەو دادگاییکردن پەیڕەوکرا؛ بەجۆری سزادانی (گوللەباراندن)یەکلایەنەی بێدادگا شێوەی

هەرەناموی یاسا پەیڕەوکرا. لەراستیدا ماف بەبێ بەشداریکردن رۆڵی پراکتیزەکردنی فاشیزمی بینی. رۆڵی دەزگای هەرە ناعادیلانەی دەسەڵاتی بینی. کوردبوون، تەنانەت هەڵگرتنی ناسنامەی کوردی خاوەن کەرامەت بۆ تاوانبارکردن بەس و زیادیش بوو. کوردو کوردستانیبوون بەتەواوەتی بەنایاسایی لەقەڵەمدراو بەمجۆرەش راگەیەنرا.

لەمیانەی کۆمەڵگای مەدەنی، هونەر، وەرزش، برسێتی زایەندی و سێکس چاودێری سیاسەتی گشتی کراو سوودیان لێوەرگیرا. لەسەرکوتکردنی بەرخودانی کوردو کوردستان،ماڵی تایبەت و گشتی (سۆزانیخانەی تایبەت و گشتی) وەك خانە سەرەکییەکانی سیاسەت لەبەکارهێنان رزگاریان نەبوو.

بەمجۆرە بینینی رۆڵێکی نێگەتیڤانەی کردەوەو رەفتارەکانی دەسەڵات لەسەر کوردستان هۆکارەکەی بۆ ئەمجۆرە ترس و گومانەیان دەگەڕێتەوە کە بۆ بێکاریگەربوونی سیاسەتی توندوتیژی دەگەڕێتەوە. سیستەم لەسەر توندوتیژییەکی بێسنوور ئاواکراوە. بەبێ ئەوەی هیچ پێوانەیەکی سەردەم بناسێ پەیڕەو دەکرا. ئامانج بەرکەنارکردنی دیاردەکانی کوردو کوردستان بوو لەمێژوو و کۆمەڵگادا. بەرامبەر ئەمەش ئایدیۆلۆژیا فەرمییەکان بەشێوەیەکی زێدەڕۆیی لەجاڕدانی میللیگەرایی و ئایینگەرایی خۆیان دوودڵ نەوەستان.

ئامانجی سەرەکی هەنووکەیی دەسەڵاتی ئێستای تورکیا بەتەواوەتی بە"تیرۆریست" لەقەڵەمدانی بەرخودانی کوردان و سەپاندنێتی بەسەرتەواوی جیهاندا. لەسەر ئەم بنەمایە لەسەرووی هەموویانەوە بەها ئابوورییەکان، تەواوی بەها ستراتیژی و سەربازییەکان لەگەڵ تەواوی دەوڵەتە پەیوەندیدارەکان لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەمریکا، خرایە بازاڕەوە. بۆ ئەوەی "PKK" بەتیرۆریست راگەیەنرێ هیچ جۆرە قەرەبوویەك نەماوە نەیدابێتە یەکێتی ئەوروپا. سیاسەتێکی هاوشێوە بۆهەموو ئەو شوێنانە پەیڕەوکرا کەبیرۆی "PKK"ی لێیە. بەگوێرەی خۆیان شەڕی سەرتاسەری بەمجۆرەبوو. تەنانەت ئەوروپاو چەندین دەوڵەت کەپێویست بووە هەڕەشەشیان لێکراوە. سیاسەتی شەکرو قامچی هەردووکیان بەیەکەوە پەیڕەو کران. هەڕەشەی شەڕ بەسەر سوریادا سەپێنرا، عەبدوڵلا ئۆجەلان لەوێ دەرخرا. بەدواداچوونە مەزنەکە بەئاکامی گیرسانەوە لەئیمرالی گەیشتە قۆناخێکی دیکە.

سیاسەتەکانی ئەمریکا سەبارەت بەجیهان و رۆژهەڵاتی ناوین کەلەبەشەکانی پێشووتردا باسمانکرد، ئەو سیاسەتانەی دەسەڵات کەبەسەر کوردستاندا دەسەپێنرێ بەتەواوی دەزگاکانی سەرخان و ژێرخانییەوە هەرهەمووی هەژاند. دیاردەی کوردستانی فیدراڵ وایکرد سەرلەنوێ هەمووشتێك رەچاوبکەنەوە. ئێران، تورکیاو سوریا جارێکیتر دەستیان بەئەنجامدانی کۆبوونەوەی سێ قۆڵی کرد. لەفوولاییدا هەستیان بەوەکرد هەروەکو چۆن سەرەتا لێی راهاتوون ئیتر ستاتۆی دەسەڵاتیان بەمشێوەیە بەردەوام نابێت. لەکاتێکدا ئەم پێکهاتەو کردەوانەی دەسەڵات کاریگەری خۆی لەسەر تاك و کۆمەڵگای کورد بۆ دواتر بەجێدیڵێ، لەژێر گەمارۆییەکی چواربەچواری دەسەڵات تاکەکانی نەتەوە ـ دەوڵەتی سەردەست ناتوانن چارەسەرییەکی دیموکراتی و مرۆییانەی جددی پێشنیاز بکەن، چونکە لەم هێزو توانستە بێبەشن. دەوڵەت چی پێشکەش کردبێت تێردەیخۆنەوە، سەرخۆش دەبن. گروپەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و بەناو چەپەکان هەروەکو بڵێی لەمیانەی چەمکێکی باوکسالاری گوێدان بە"قسەی گەورەکان" ئەو پەرچەکردارەیان نیشانداوە کەلێیانی چاوەڕوانکردووە. ئەو وەڵامەی وەریانگرت قەیرانە بەرفراوانەکانی ئابووری، زیادبوونی قەرزی ناوخۆو دەرەوە، بێکاری بێسنوور، بنبەستبوونی سیاسەت، تورکیاو ئێران و ئێراق و سوریا یەك بوو کەبەبێ یارمەتی دەرەوە ناتوانێ لەسەرپێیان بوەستێ و لەهەموو کاتێك زیاتر نائارامە. وەك هەموو کات و زەمەنێك دیسان لێکدانەوەی چەوت لەبەغدادەوە دەرکەوت.

لەکاتێکدا کۆتایی بەم بابەتە دێنین یەکلابوونەوە سەبارەت بەمەسەلەیەك بایەخدارە. ئەویش بەراوردنەکردنی دەوڵەت و دەسەڵاتە. هەروەکو لەتەواوی شیتەڵکارییەکانمان دەردەکەوێ، دەوڵەت پووختەی کۆمەڵگایە کە لەسەردەمی کۆمەڵگای

پلەدارییەوە تائەمڕۆ هاتووە. دەوڵەت، گوزارشت لەبەرزترین دەزگای هەبوونی کۆمەڵگاو، پێشکەوتووترین دەزگای لۆژیکی ئەنالیتیك دەکات و ئەو پەیوەندییانەی تێدا قاڵدەبێتەوە کەپەیوەندی بەتەواوی کۆمەڵگاوە هەیە، بەرفراوانەو پشت بەنەریتەکان دەبەستێ. پێناسەکردنی دەوڵەت وەکو زۆرداری چینێکی سنووردار یاخود ئامرازی چەوساندنەوە کەموکورتی بەکاریگەرو چەوتی لەخۆوە دەگرێت. پێناسەکانی دەوڵەتی نەتەوەیی یاخود تاکەنەژادی پەتی دەشێ بەگوێرەی هەلومەرجە هەمەلایەنەکانی لەئارادایە بەهایەکی هەبێت. لەپێناسەکردنی ناوەڕۆکەکەی دوورە. هەرچی دەسەڵاتە گوزارشت لەوهێزانەی دەسەڵات دەکات کەقۆناخ بەقۆناخ دەگۆڕێن و لایەنی زۆرداری و بەکاربردنیان لەپێشەو لەناو ئەم نەریتەدا جێگیربووە. بێگومان دەوڵەت بەبێ دەسەڵات نابێ. بەڵام لەقەڵەمدانی تەواوی دەوڵەت وەك دەسەڵات، بۆچوونێکی رووکەشییەو رێگا لەپێش تێکەڵکردنی چەندین دیاردەو پەیوەندی دەکاتەوە.

جیاکردنەوەی نەریتی دەوڵەت لەکوردستان و دەسەڵاتی جێبەجێکردن رووداوێکی مەزنی تێگەیشتنە. دەبێ زۆرچاك جیاوازی نێوان دژایەتیکردنی دەوڵەت و دژایەتیکردنی دەسەڵات ببینرێ. ناوەڕۆکی ئەو مەسەلەیەی کە لەبەرگرینامەکەمدا بەبنەمامگرت و بەردەوام هەوڵی روونکردنەوەم دا سەبارەت بەم بابەتەیە. پێویستە دەوڵەت وەك ئامرازی ئاسایشی گشتی و ـ کە کۆمەڵگا لەسەری رێککەوتووە ـ سوودی خزمەتگوزاری گشتی ـ بابەتەکانی سوودمەندی هاوبەش کەدیسان کۆمەڵگا لەسەری رێککەوتووە ـ بەریفۆرمدا تێپەڕێت و لەسەردەمی شارستانییەتی دیموکراتییانەدا هەبوونی خۆی بپارێزی ـ بچووك بێ, بەڵام بەکاریگەرو چالاك بێ ـ بەرامبەر ئەمەش پەسند نەکردن و رەتکردنەوەی ئەم شێوەگرتنانەی دەسەڵاتی دەوڵەت مەرجە کەبەشێوەیەکی دەوری پێناسەی دەکرێ و لەمیانەی ئەم هەڵسەنگاندنەشمان دەرکەوت کەکوردستانیش لەخۆوە دەگرێت و یاساو تایبەتمەندێتییە سۆسیال دیموکراتەکان بەزمان بەهەبوو دادەنێت و، کردەوەکانی بکەری نادیار بەسیاسەت دادەنێت و لەناودزی و تاڵاندا خنکاوە. تاوەکو جیاوازی نێوان هەردوو پێناسە نەبینرێ زەحمەتە تێکۆشانێکی بەپرەنسیپانەی مافپەروەری و کۆمەڵایەتی و دیموکراتییانە بەڕێوەببردرێت. بینینی جیاوازی نێوان رەوتەکانی بزووتنەوەی کوردان ئەوانەی کەگرێدراوی مەسەلەی دەوڵەتێکی جیاوازن لەگەڵ ئەو رەوتانەی کە ئەم پێناسانە بەبنەما دەگرن کەسەبارەت بەدەوڵەت ئەنجاممانـدا، خوازیارن دەوڵەتێکی دیموکرات، کۆمەڵایەتی و یاسایی بخوڵقێنن، لەم پێناوەشدا بۆ کۆمەڵگاو سیاسەتێکی دیموکراتییانە خەبات دەکەن، بینینی ئەم جیاوازییە مەزنەو بوون بەخاوەن تیۆری و کردار بایەخێکی مەزنی هەیە.

6 ـ لە کوردستان هەست کردنی کوردان بەبوونی خۆیان و پوختەیەکی بەرخودان

لەکاتێکدا تەواوی بەش ئەم بابەتە پێناسە دەکات، باهەوڵبدەین لەمیانەی پوختەیەکی کورت و ئەنجامێك تەواوی بکەین. لەگەڵ هەستکردنی گەل بەجیاوازی خۆی لەگەڵ رژێمی پادشایی, شۆڕشە سیاسیەکانی ئەوروپا دەستی پێکردووە. ئەم هەستکردنە سەرەتا سەبارەت بەجیاوازی نێوان مێژووی خۆیان و مێژووی پادشایەتییە. تەواوی مێژووەکانی پێشوو یەکلایەنەیەو بەشێوەی چیرۆکی لەدایکبوون و چۆنیەتی بەردەوامبوونی پادشاو ئیمپراتۆرەکانە. ئەم چەمکەی مێژوو لە رۆژهەڵاتی ناوینـدا چڕو بەرفراوانترە. پادشاو ئیمپراتۆرەکان یان وەك خودا یاخود سێبەری خودا، گوزارشت لەو هێزە دەکەن کە بەشێوەیەکی موتڵەق هەموو شتێکی پەیوەست بە کۆمەڵگاوە دیاری دەکەن. جگە لەوان ناشێ بیر لە هەبوون و لاشەیەکی دیکە بکرێتەوە. بەندەکان تەنیا وەك پارچەیەکی جەستەی پادشاکان واتاو بەهایەکیان دەبێت. هەبوونی ناسنامەیەکی جیاواز، مافەکانی مرۆڤ وهزری دیموکراسی ئەو بابەتانەن کەنەفرەتیان لێکراوە. بەرامبەر بە پیرۆزی خۆیان گوزارشت لە راستینەی لەعنەت لێکراو دەکەن. لەساڵانی 1640 بەر لەشۆڕشی ئینگلتەراو لەسەرەتاکانی سەدەی هەژدەهەم لە ئینگلتەراو فەرەنسا لەلایەن هەندێ رۆشنبیرو مێژوونووسەوە ئەم چەمکە بووە جێگای گفتوگۆ کردن. لەئەنجامدا هەستیان بەوەکرد کە جگە لەپادشا ناسنامەیەکی گەل و نەتەوە هەروەها جیا لەمێژووی پادشایەتی مێژوویێکی گەلان و نەتەوەکان بوونی هەیە. دواتر

لەژێرناوی مافی نەتەوەکان دەستنیشانکردنی داواکارییەکانی چینەجیاوازەکان دەستیپێکرد. هەرچینێك خۆی لەگەڵ نەتەوە کرد بەهاووڵاتا. بەمجۆرە لەئەوروپا شەپۆڵە مەزنەکانی نەتەوە، دواتریش بزووتنەوە چینایەتییەکان یەك بەدوای یەکتر سەریانهەڵدا.

لەرۆژهەڵاتی ناوین و تورکیادا لەساڵانی 1840ی تەنزیمات لەمیانەی بزووتنەوەی عوسمانییەلاوەکان و جۆن تورك (تورکە لاوەکان) هۆشیاری سەرەتایی هەستکردن بەبوونی گەل و نەتەوەی جیاواز دەستیپێکرد. رۆشنبیرەکانی یەکەمین و دووەمین مەشروتییەت وردە وردە جیاوازییەکانی نێوان پادشایەتی و نەتەوەیان درکاند. لەمیانەی کۆمارەوە بەشێوەی گووتەیەکی زۆر رادیکاڵانە ئاماژە بەهەبوونی نەتەوەی تورك کرا. سەرباری ئەوەی مستەفا کەمال لایەنی باوکسالارێتی هەیە، سەبارەت بەپێشخستنی تیۆری و پراکتیکی نەتەوەیەکی جیا لەعوسمانییەکان، هەنگاوێکی گەورەی هاوێشت. بەشێوەیەکی زۆر بەهێز کەوتبووە ژێرکاریگەری چەمکی نەتەوەیی فەرەنسا. چاوەڕواندەکرا لەژێر هەلومەرجی داگیرکاریدا چەمکێکی رادیکاڵی میللیگەرایی پێشبکەوێت. لەدوای رزگاربوون بەهۆی هەلومەرجی میللیگەرایی زێدەڕۆ راستینەی کۆمەڵگای سەرکوتکرد. هەربۆیە بەها شۆڕشگێڕییەکەی بەسنووورداری مایەوە. میللیگەرایی دوای 1950کان بەفاشیزمەوە بارگاوی کرا. سەنتێزگەرایی تورك ـــ ئیسلامی دوای 1980 رێگای لەپێش تێکەڵەی نەتەوەو ئوممەت کردەوەو، تێکچوونی تایبەتمەندێتییە چینایەتییەکانی فەراهەمکرد. دەشێ وەك پێچەوانەی ئەم مەیلە گشتییە بیر لەئیسلامگەرایی نوێ بکرێتەوە. پێشکەوتنی هاوشێوە لەگۆڕەپانەکانی ئێران و عەرەبەکانیش هاتەئاراوە. بەرخودان و هەستکردن بەخۆیان دیاردەیەکن یەکتری تێرو بەخێو دەکەن. لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا هەستکردن بەجیاوازی کۆمەڵایەتی لەبوارەکانی ژینگەناسی و ژنناسی و کولتوورە خۆجێییەکان قووڵدەبێتەوەو بەردەوام دەبێ. دەرککردن بەجیاوازی لەنزیکەوە پەیوەندی بەئازادییەوە هەیە. تاوەکو جیاوازییەکان دەرکی پێنەکرێت، ئەوا کاریگەری سەرکەرو بەکۆیلەکردنی گشتگیرێتی بەلاوەنانرێت. ناسنامەکانی پشت بەجیاوازی و هەمەڕەنگی دەبەستێ رێگا لەپێش کۆمەڵگای ئازادو خوڵقکارتر دەکاتەوە.

لەکوردستاندا، هەستکردنی کوردان بەخۆیان وەك نەتەوەو گەل درەنگتر بووە. هەرچەندە یاخیبوونەکانی سەدەی نۆزدەهەم سۆزی کوردایەتییان هۆشیارکردبێتەوە، بەڵام ئەم هەست پێکردنە بابەتەکانی پادشایەتی و مەلەکێتی تێپەڕنەکردووە. کوردایەتییەکی جیاواز، کوردایەتییەکی پادشایەتییە. فیکر لەدابڕان لەچەمکی سوڵتانێتی چاخی ناوین ناکرێتەوە. هەربۆیە لەسەدەی نۆزدەهەمەوە تاوەکو ناوەڕاستی سەدەی بیستەم هۆشمەندی نەتەوەو گەلی کورد دوورە لەهۆشیاربوونەوەو هەستکردن و دەرکپێکردن.

لەدووەمین نیوەی سەدەی بیستەمدا لەمیانەی ئەو گفتوگۆیانەی لەنێوان رۆشنبیران ئەنجامدەدرا، ئیتر راستینەی گەلی کورد سەریهەڵدەداو ئاشکرا دەبوو. بەشێوەیەکی بنەڕەتی ئەم رەوتە لەناو نەریتی چەپی تورکیا دەستیپێکرد. ئەو کوردایەتییەی باشووری کوردستان کەلایەنی خێڵەکی و شێخایەتی لەپێشبوو ئەو هێزەی نەبوو کوردایەتی کلاسیك تێپەڕبکات. دەیانگووت لەجیاتی مەلیکی تورك و عەرەب و فارس پێویستە مەلیکێکی کورد جێگایان بگرێت، لەم چەمکە بەولاوە هیچ قووڵاییەکی دیکەی نەبوو. پارتە کۆمۆنیستەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراوو پارتە وردە بۆرژواو فیۆداڵییەکان دووربوون لەوەی بەراستینەیەکی جیاوازتری گەل و نەتەوە بگەن. بەئامانجی تەکتیکی و بەگووتنی هەندێك وشە وەستان. خەباتێکی ئەوتۆو جددی مێژوو و سیاسەتییان ئەنجامنەدا. نەریتی چەپگەرایی تورکیا بەتایبەتیش هەڵمەتەکەی 1970 کان کۆمەکێکی گرنگی رۆشنکردنەوەی هۆشیاری گەلی کوردی کرد. دروشمەکانی ئازادی و برایەتی گەلی کورد کەدەنیز گەزمیش و هەڤاڵەکانی لەژێر پەتی سێدارەدا ڤیڕاندییان واتایەکی مێژوویی هەیە.

پێهەڵگرتنەکانی چەندین شۆڕشگێر سەبارەت بەبرایەتی گەلان لەسەرووی هەمووشیانەوە ماهیرچایان و ئیبراهیم کایپاك قایەو هەڤالانی واتایەکی هاوشێوەیان هەیە. بەڵام دروشم بەرزکردنەوە بەتەنیا دووره لەوەی بەرخودان و چالاکی لەگەڵ خۆی بێنێ. بەتەنیا بەرخودان پێویستی بەقۆناخێکی نوێ هەیە.

جیاوازی گەلی کورد بەپێشکەوتنێکی دوو رەهەندی دەستپێکرد: دابڕان لەچەمکی شۆڤێنی نەتەوەی تورك و جیابوونەوە لەنەتەوەپەرستی سەرەتایی کوردان بەیەکەوە لەناویەکدا پێشکەوت. لەراستیدا شکاندنی هەژموونی ئایدیۆلۆژی ئەوانەی دەمامکی چەپ و شۆڕشگێڕێتیان پۆشیبوو، هەروەها رزگاربوون لەزەمینەی فشاری وشکی هێزە زۆرداره خۆجێییەکان کە بەکرێگیراوی دەسەڵاتی دەوڵەتبوون سانایی نەبوو. زۆرداری کرداری و ئایدیۆلۆژی هەم هێزی روناکبیری هەم رێکخستنی دەکرد بەناچارییەك. ئەمەش بەخێرایی بەرەو بەرخودانی دەبرد. هەلومەرج و زەمینەی سیاسی و یاسایی دەرفەتی بەتێکۆشانێکی زهنی تەندروستانە نەدەدا. پێویستی بەجووڵانەوەیەکی شێوازی حەزرەتی محەمەد لەمەککە، حەزرەتی عیسا لەقودس، گالیلۆ و جیۆردانۆ برنۆی سەردەمی رێنیسانس دەکرد.

وەك یەکێك کەیەکەم کەسبوو لەناو ئەم قۆناخەدا ژیاوە کاتێك هەوڵبدەم بیکەم بەچیرۆك ئەوا باشتر دەرك بەراستی دەکرێن. کاتێك لەقوتابخانەی سەرەتایی بووم هەستم بەوە کردبوو کەجیاوازبوونی کورد کێشە دروستدەکات و دەبێتە بەڵا. شانبەشانی ئەوەی لەقوتابخانەی سەرەتایی تاوەکو دواناوەندی لەو هێزەدا نەبووم تێکۆشانی هزری بکەم، بەردەوام ئەم دیاردەیە وەك کۆت و بەندەکانی پێ خۆی دەسەپاند. من چەندە رامدەکرد ئەو وەك سێبەر بەدوامەوە بوو. بەڵام لەمیانەی ئەو ئایدیۆلۆژیا فەرمییەی لەقوتابخانە بۆمان باسدەکرا، بەئەندازەی کونی دەرزیش سەرەداوێکی وەڵامدانەوەم نەدەدۆزیەوە. تەنانەت بەتەواوی تورکێتیش پەسند بکەی، ئەوا نەریتە کۆنەکانی کوردان، لەخێزانەوە تا هەرشوێنێکی بۆی دەچووم لەتەواوی ناوچە خۆجێیەکاندا کوردێتی دیاربوو و هاواری دەکرد و دەیگوت:"من هەم". کەسایەتی رووبەڕووی دووڕووتییەکی مەزن بوو. دابڕان لەنەریت هەروەکو راکردن لەبەشێکی گەورەی راستی و خەڵەتاندن، ساختەکاری دەهێنا ئاراوە و کەسایەتی دەسووا. دابڕان لەناسنامەی خۆت، هەروەکو ئەو پەڵە چرۆیەی لەداری خۆی بۆتەوە بەواتای کەوتنە ناو بۆشایی دەهات. سەبارەت بەکەسایەتی بەواتای لەدەستدان و ونکردنی پێکهاتەی مەعنەوی کۆمەڵگاش دەهات. رۆژبەدوای رۆژ لەناو ژیان دەرك بەوەدەکرا کەنکۆڵیکردن لەرابردوو و نەریت و کۆمەڵگا تەواو رێگا لەپێش کەسایەتییەکی نەخۆش دەکاتەوە.

بەرامبەر بەمەش زۆر لەولاوەی پەسەندکردنێکی سروشتیانە تورکێتی بەشێوازی "عیبادەتی ئایینی"ئەزبەرەکردن بەرێوەدەچوو کەزمانەکەیمان نەدەزانی.

بەرامبەر ئەمەش ئیسلامیبوونێك بەزمانی عەرەبی بێت کەنایزانی، لەگەڵ خوێندنێکی بەزمانی تورکی و رێوڕەسمی فەرمی هەمان ئەنجامی لێدەکەوتەوە. گووتنی "ئامین" بوو بۆ ئەو دوعایانەی لێیتێناگەی ! هەڵبەتە لەکاتێکدا بەسەدان ساڵ کەسایەتی کورد لەژێرناوی بەئیسلامبوون لەناو رواڵەتیبوون و نەزانی دەتلایەوە، ئەوا ئایینی بەرووخسار هاوچەرخ لەمیانەی بەتورککردنی زێدەڕۆ تێکچوونی کەسایەتی قووڵتردەکردەوە. لەوانەیە لەتەمەنی پێگەیشتوویدا بوون بەئیسلام و تورکبوون بەهەرچۆنێك بێت دەرکی پێبکرێت. دەشێ پێویستییەکانی کۆمەڵگا ئەمجۆره یەکبوونانە واتادار بکات. بەڵام بەشێوەی عیبادەتی رۆژانە مسۆگەر ناشێ ئیسلامگەرایی و تورکێتی ببێتە بابەتێکی ئاسایی و هاوچەرخی پەروەردە. خواستم واتا بەهەردووکیان بدەم. هەر لەقوتابخانەی سەرەتاییەوە داخوازی بوون بەباوەڕمەندێکی نوێ و تورکێتیم لادروست بوو. بەڵام تاوەکو کوێ؟ لەناو زەمینەی رۆشنبیری چەپگەرێتی 1970 کان کەگفتوگۆی چڕی تێدا ئەنجامدەدراو کێشەی کوردیشی تێدا باس دەکرا، بەبڕیاربوون لەمندا پێشدەکەوت. بارگاویکردنەکانی چەندین ساڵەی تورکێتی و ئایینگەرایی لەو رەوشەدا نەبوو بەرامبەر چەپگەرێتی خۆی رابگرێت. لەتەمەنی لاوێتیدا بەبێ جیاوازی خستنە نێوان کورد ــ تورك، بەڵام گووتەکانی

سەربەخۆیی و ئازادی و یەکسانی هەردوو گەل رەنگی راستەقینەی بژاری ژیانمی دەستنیشاندەکرد. لەگەڵ لەدەستدانی ئەو رێبەرانەی هەریەکەو قارەمانێك بوون، ئیتر لەم کاروانەدا بەدواداچوونی دۆزەکە بۆ من بووە مەسەلەیەکی ناموس کەناتوانرێ دەستیلێبەربدرێت. لەم قۆناخەدا سەرباری هەردوو داسەپاندنەکان خاوەنداریێتیکردنی تەواوم لەسەر کوردبوون هەنگاوێکی مێژوویی لەگەڵ خۆی هێنا.

لێکۆڵینەوەی دیاردەی کورد کەخەباتی نموونەیی ئەم قۆناخە بوو, لەمیانەی ماتریال و تواناکاری سنووردارەوە بەرێوەبردرا. شرۆڤە میللیگەراییە سەرەتاییەکان لایەنی سۆزدارییان لەپێش بوو، لەگەڵ شرۆڤە دۆگماییەکانی "مافی چارەی خۆنووسینی گەلانی سۆسیالیزمی بونیادنراو کەلەبەردەستدابوون دوور بوون لەوەی راستی بەدەستەوە بدەن. لەناوگفتوگۆکانی لە شێوەی "دیاردەی کورد, بوونی هەیە یاخود نا، کوردستان داگیرکراوە یاخود نا"، پەستێنرابوو. بۆ هەڵوێستە کۆمەڵگاگەراییە مێژووییەکان نەبەگوێرەی پێویست پێدراوو بەڵگە لەئارادابوون، هەروەها نەتوێژەرەوەو شرۆڤەکاری قووڵی کۆمەڵناسی جێگای باس بوو. لەناو زەمینەیەکی تاریکدا دەربارەی دەوروبەر حوکم دەدرا. لەلایەکی دیکەشەوە هەلومەرج و زەمینەی سیاسی بەردەوام دەوروژاو گرژی بەخۆیەوە دەبینی، ترسی باوی دەوڵەت سەبارەت بەکورد رێگای لەپێش هەڵوێستی زۆر بەپەلە دەکردەوە. لایەنەکان هەوڵیانەدەدا ساتێك زووتر شتێك یاخود خۆیان رزگاربکەن. بەڵام تەنانەت زانیارییەك و شرۆڤەیەکی سنووردار سەبارەت بەچاخ نیشانیدەدا کەئەم ستاتۆیەی لەئارادایە لایەنێکی وەهای نییە پەسندبکرێت. ستاتۆ (سیستەم) لەجیاتی ئەوەی بیر لەریفۆرم بکاتەوە، تەنانەت دەستنیشانکردنێکی ئاسایی سەبارەت بەدیاردەکە یەکسەر بەتاوانی لەقەڵەمدەداو دەیکرد بەبابەتێکی دادگاییکردن. ئومێدی تێکۆشانی ئاشکرا (LEGAL) بەئەندازەی نەبوون کەم بوو. لەلایەکی دیکە دیاردەکانی چەپێتی و کوردایەتی کە فێری ببووین، لەئاستێکدا بەرخودانی دەسەپاند کە"بەبێی ئەو نابێت". هەروەکو بڵێی بەرخودان نەکردن یەکسانی وازهێنانە لەمرۆڤایەتی. ناموس و شەرەفمەندێتی راستەقینە، لەژێر هەر هەلومەرجێکداو لەهەموو شتێك لەپێشتر خاوەنداریکردنی دۆزەکەو پاراستنی دەکردە پێویستی. لەدۆخێکی وەهادا وەك گرووپێکی سنوورداری لاوان توانیمان لەناوچەکاندا گرووپە سنووردارەکانی هەواداران پێکبێنین. هەرچەندە بەشێوەیەکی چڕو بەرفراوان وانەکانی شەڕی رزگاری نیشتمانی گەلان دەخوێندراو باوەڕی بەوە دەکرا کەلەمیانەی پێڕەوەکانی گەریلا دەتوانرێ داستانە خوازراوەکان بنووسرێ، بەڵام ئەمە لەئۆتۆپیایەك بەولاوە هیچ شانسێکی دیکەی نەبوو. سەربگرێت هەرچییەکمان دەستبکەوێت، سەرنەگرێت خودا کەریمە؛ بەمجۆرە بیر لەدواتر دەکرایەوە. دیسان لێرەشدا کۆچکردن لەمەککە، بڵاوبوونەوەی حەوارییەکان و چوونە خەڵوەتی جەنگاوەرانی زانست خۆی نیشاندەدا. تەقاندنی یەکەم گوللە لەوانە بوو نارەزاییە یەکەمینەکان بکاتە رۆژەڤ. هەرساتێك دەشیا گرووپی باوەڕمەندان یەکەمین شەهید یاخود گیراو بدەن. ئەو تراژیدیایەی لەچەندین دیاردەی کۆمەڵایەتیدا ژیاوە مێژوو قۆناخێکی هاوشێوەی دەخستە رۆژەڤی دیاردەی کوردیش. هەموو شتێك بەرەو تراژیدیا راپێچیدەکرد. مسۆگەر دۆزەکە پێویستی بەفیدائی خۆی هەبوو. بەگووتەیەکی دیکە سەبارەت بەلایەنی بەرامبەر خوداوەندەکانیان قوربانییان دەخواست.

هێشتا ئەدەبیاتی ئەم هەلومەرجە پێشنەخراوەو نەنووسراوە کەجیابوونی کوردان پێیدا تێپەڕی و پێشکەوت. بەڵام مسۆگەر پێویستە ئەنجامبدرێ و بنووسرێ. تەنانەت قۆناخێکە پێویستە هێزی رۆماننوسی ئەدەبیات بوارەکانی ئۆتۆپیا، تراژیدیا، دراما، چیرۆك و سینەماو لقەکانی دیکەی بەکاربێنێ. بۆ نموونە تۆوێك فرێدەدرێ، نازانرێ پووچە یاخودنا، دەژیت یان نا؟ تەنیا ئومێدێکە. هەروەکو بڵێی " ئومێد نانی هەژارە، یان دەبێ یان نا"، هاوشێوەی قەدەر مل بۆ قۆناخ درێژدەکرا.

نزیکەی ماوەی 30 ساڵ بەسەر هەستکردن بەجیاوازی کوردان و بەرخودان تێدەپەڕێ کەلەسەرەتای ساڵانی 1970کان دەستپێکرد. گرنگترین راستینەی دەرکەوتۆتەڕوو، تەنیا رۆشنگەری سەبارەت بەدیاردەی کوردو تواناکارییەکانی چارەسەری

نییـه. لەبنەڕەتـدا لەگـەڵ خۆیـدا رووخانـدنی ئـەو رەوشـە نائاسـاییەیە کەگـەلان و دەوڵـەتانی دراوسـێ بەدەسـتییەوە دیلـن. ئاشکرابوونی جۆرێکی پووچی فشاری نەتەوەییە. ئەوەی سەلماندووە کە ئەو رژێمەی هەرتوێژێکی پەیوەندیداری زنجیرکردووە، حاکیمی کردۆتە دیلی مەحکوم، مەحکومی کردۆتە دیلی حاکم، ئەوا شانسی ژیـانی نابێت. وانەیـەکی دیکـەش ئەوەیـە، تـاوەکو گەلێك خاوەنداریێتی لەکەرامەتی کۆمەڵگای خۆی نەکات هیچ شانس و دەرفەتێکی پێشکەوتن بۆ ئەو بـوونی نابێت. کەرامـەتی کۆمەڵگا خاوەنداریێتی کـردن و متمانـەکردن بەخۆیـە. هێـزی ناسـین و پێشخسـتنی خـودە. وانەیـەکی دیکـەش کـەدەرکیپێکراوە ئەوەیە ئەو کۆمەڵگایانەی ئەم هێزەیان نەبێت ئەوا لەناو بالادەستەکاندا هیچ واتاو بەهایەکیان نابێت. ئـەوەی خێـری بۆخـۆی نەبێ، خێری بەکەسی دیکەش ناگات. لەکاتێکدا کوردان هێندە بێچارەبن دەتـوانن کامـە بـەها پێشکەش بەدراوسێکانی بکـات؟ تەنانەت ئەگەر داگیرکراویش بێت بۆئەوەی واتای بەهایەك ببەخشێ، دەبێ رێگای بـوون بـەخاوەن بـەها کراوەبێـت. بەرلـەوەی بکەوینە رێ لەراستیدا رێگای کوردان داخراوبوو. لەم دارستانەدا پێشێلکاری زۆرخراپ لەئارادابوون.

لەوانەیە بگووترێ بۆ بەدەستهێنانی ئەم وانانە، هێندە ئـێش و زیانـە پێویسـتبوو؟ باشـترین وەڵامـی بدرێتـەوە ئـەم پرسـە، پرسـیارێکی بەرامبـەرێتی کەبەئەنـدازەی کۆمـەڵگاکان بـۆ تـاك و کەسـێتیەکانیش لـەجێگای خۆیـەتی. ئایـا دەشـێ کۆمـەڵگاو کەسێتییەکان بەبێ کەرامەتی بژین؟ ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە، ئایا لەمێژوو و لـەم سـەردەمە هاوچـەرخەشماندا ئەگـەر هـەر کەسێك خاوەن ئەو ناسنامەیەی نەبێت کەبەپێی ئەو نابێت و بەشێوەیەکی ئازادانە گوزارشتی لێنەکات، دەشێ ژیـان واتایـەك و بەهایەکی هەبێت؟ ئەوەی ئەم واتاو بەهایەی لەدەستدابێت، ئایا بەهایەکی دەبێت بەخەڵکانی دیکەی ببەخشێ؟.

کاتێـك چـینی بـژاردەی بەڕێوەبـەرێتی تـورك، عـەرەب و فـارس کـوردێکی بێـچارە وەکـو گونجـاوترین دۆخ بۆخۆیـان هەڵدەسەنگێنن, بەهەڵەدا چوونە. ئەگەر لەهەستیارترین قۆناخە مێژووییەکانی تورکیادا کۆمەکێکی کوردان بووبێت، بۆئـەوە دەگەڕێتەوە کەلەم قۆناخانەدا کوردانیش خاوەن بەهابوون. ئەگەر ئەم بەهایانەیان نەبووایە ئایا کوردان دەیانتوانی بەشداری شەڕی رزگاری بکەن؟ لەو قۆناخانەدا کەلێن لەنێوان کورد ــ تـورك نـەبوو و بەئومێـدی پێشکەوتنی هاوبـەش بەشـدارییان بـۆ ئاییندە دەکرد.

لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا شەڕێك روویدات، ئایا وەکو جاران کوردان شانبەشانی تورکەکان بەشداری دەکەن؟ کوردەکانی ئێـراق باشترین وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەنەوە. ئەگەر رژێمی سەددام بیتوانیبایە وەکو برا کوردان بۆ لای خۆی رابکێشێ، ئایا دەکەوتە ناو ئەم رەوشە تراژیدییەی ئێستا تێیدایە؟.

دەبێ باش دەرك بـەوەبکرێت کەپەیوەنـدی کـوردان لەگـەڵ تـورك، عـەرەب و فـارس بەدرێـژایی سـەدەی بیـستەم دووچـاری رەوشـێکی نائاسـایی هـاتووە. مێـژوو دەیگێڕێتـەوە کەسـوڵتانێکی دیکـەی وەك یـاووز سـوڵتان سـەلیم دژوار نـەبووە سـەبارەت بەچارەسەرکردنی گیروگرفتەکان لەرێگای توندوتیژییەوە. تەنانـەت ئەویش کاتێك سیاسـەتی خـۆی سـەبارەت بـەکوردان دادەنـا کاغەزی سپی و نەنووسراوی رەوانـەدەکرد. وەها دەگێڕنـەوە؛ دەیگـووت "داخوازیـەکانتان بنووسـن، بـەهای یاسایەکی هەیـە", چونکە ئیمزای یاووز سەلیم لەژێرەوەی ئەم کاغەزە سپیانەوەیە. باسکردنی ئەم چیرۆکە پێویـستە وانـەی لێـوەربگیرێ و دەبـێ چینی هەڵبژاردەی بەڕێوەبەرێتی دەرکی پێبکات کەبەشێوەیەك داکۆکی لەسەر بێ بەرپرسیارێتی دەکات. زەحمەتـە لـەرۆژگاری ئەمڕۆماندا باوەڕی پێبکرێت. بەردەوام چینی بژاردەی بەڕێوەبەرایـەتی وەك بەهایـەك یـادی مـستەفا کـەمال دەکاتـەوە. بـەڵام مستەفا کەمالیش هەڵوێستێکی بەرامبەر کێشەو گیروگرفتـەکان هەیـە. مـسۆگەر واتـای کۆمەڵایـەتی بەبنـەما دەگرێـت، ئەگـەر پێویستی بەسەرکوتکردنی رەها هـەبێ سـەرکوتیدەکات، ئەگـەر پێویـست بەهەڵوێـستێکی دیکـە بکـات، تـاوەکو بـەیانی بیر لـەم هەڵوێستە دەکاتەوەو پێویستییەکانی جێبەجێدەکات.

هیچ کەسێك گومان لەوەناکات کەرێبەرێکی بەمجۆرە بووە. بەڵام مەسەلەیەکی لەرەوشێکی وەهادا بەجێنەدەهێشت کە تائەم رادەیە وڵاتەکەی و دەوڵەتەکەی تەنگەتاوبکات، دووچاری قەرزی بکات، لەناو هەرەشەو مەترسی بەردەوامی بەجێنەدەهێشت. ئاشکرایە ناسنامەیەك بڵێ "ئازادی کارەکتەری منە" گوایە لەژێرناوی رزگارکردنی دەوڵەت ناچێ لەگەڵ تەریقەتگەراییەکان هاوبەشێتی بکات. چەندە نەتەوەپەرستێکی گەورەی تورك بێ، بەڵام هەوڵی تێگەیشتنی کوردانی دەدا. وەك پێویستییەکی کارەکتەری ئازادی رێگەچارەیەکی بۆدەدۆزیەوە. ئایا دەشێ گومان لەمە بکرێت؟ ئایا بەر لەیاخیبوونەکان چەندین جار باسی ئەم شیمانەیەی نەکردووە؟ تەنانەت کاتێك هێرشی دەکردە سەر یاخیبوونەکانیش کێشەی کوردایەتی و ئاستەنگکردنی ئازادییەکانی نەبوو، بەپێچەوانەوە، هەروەکو باش دەیزانی، ئەی گەمەکانی ئیمپریالیزم نەبوو کە لەئاکامدا کوردایەتی و ئازادییەکانیشی لەناو دەبرد؟. چەندە ئەم راستییانە دەشاردرانەوەو بۆ ئەوەی رێگا لەپێش بەرخودانێکی نوێی کوردان بکاتەوە بەسووربوونەوە ئاژاوەیان دەنایەوە؟.

لەبەرخودانەکەی 1970کان دۆگماتیزم زۆر بەکاریگەربوو. بەشێوەیەکی سروشتی هەرچالاکییەکی پێشیدەخست بەشی خۆی لەئەنجامی ئەمە وەردەگرت. بەپارتیبوون، بەرەی جەماوەری و سەربازبوون لەژێرکاریگەری نزیکی دۆگماتیزم شێوەیان گرت. سەرباری هەوڵە گەوهەری و راستگۆییەکان، دەربازبوون لەو هەڵوێستە دۆگماییانەی مۆرکی خۆی لەتەواوی زەمەنەکانی کۆمەڵگاداوە، لەبزووتنەوەیەك چاوەڕوان نەدەکرا کەبەگوێرەی قۆناخی خۆی زۆربێ ئەزموون بوو. چەندە هەوڵدەدرا سۆسیالیزم و رزگاری نیشتمانی و گەریلایەتی بەگوێرەی ئاستی تێگەیشتن پراکتیزەو پەیڕەوەبکرێت، ئەوا ئەو راستییەی رۆڵی دیاریکراوی دەبینی خۆیشی و چەندەی رەندەش دەکرا دیسان سنوورەکانی خۆی نیشاندەدا. ژیان بەگوێرەی تیۆری نا، بەڵکو زیاتر تیۆری ناچاربوو بەگوێرەی ژیان بگۆڕێ. پێشکەوتنی هاوشێوە بۆ سیستەمی فشاری نەتەوەییش لەجێگای خۆیدا بوو. سیستەمیش هەڵوێستی دۆگماییانەی خوێندۆتەوە، لەو بڕوایەدایە کەخۆی بەگوێرەی رەوشێکی شیمانەبۆکراو ئامادەکردووە.

قۆناخی داهاتوومان ماوەی نزیکەی سی ساڵ بەوانەو پەندەکانییەوە هەڵدەسەنگێنێ. تەنیا وانەکانی بەرخودان نییە، ئەو وەرچەرخانەی دونیاش بەخۆیەوە بینی لەچوارچێوەی هەمان هەڵسەنگاندن دایە. لەکوردستاندا خودی دیاردەی کوردیش پێشکەوتنی گرنگی بەخۆیەوە بینیوە، تاکو ئێستاش پێشکەوتن بەخۆیەوە دەبینێ. بەڵام لەبنەڕەتدا کێشەکە پارێزگاری لەرەوشی قەیراناوی دەکات. هەروەکو تەواوی رۆژهەڵاتی ناوین لەکوردستانیشدا دەشێ پێڕەوە سیاسی و سەربازییەکانیش پێشکەوتن بەخۆیانەوە ببینن. لەم بەسەرهاتەی مێژووددا ئەو وانە گەورەیەی بەدەستهێنراوە بۆ چارەسەری دیموکراتییانەی هەموو کێشەکان بەبنەماگرتنی ئاشتی و بەرۆژەڤبوونی دەستبەرداریکردنی دوولایەنەیە لەتوندوتیژی. ئەگەر دیسان بەهەمان سووربوونەوە متمانەی پێنەکرێت و رێزی لەبەرامبەر نیشاننەدرێت و بەداکۆکیکردنەوە لەسەر رێبازی سەربازی بەڕێوەبچێت، ئەوا بۆ ئەوەی راستینەی مێژوویی کۆمەڵگا لەقەیران رزگاری بێت بەرخودانی سەربازی ئاکتیف پێویست دەبێت و ئەمجارە خۆی دەکات بەرۆژەڤ. ئەو رێگایانەی لەساڵانی 1970 کان چەتاڵ کرابوون بەواتای سیاسی و سەربازی نەبوون. بەرخودان وەکو قەدەرێك بوو. لەم بەرگرینامەیەدا هەوڵمدا ئەوە بسەلمێنم کەناتوانرێ ساڵانی 2000کان هەمان شت بگووترێ. بۆئەوەی لەنزیکەوە تواناکاری و گرفتەکانی ئەگەری پێشکەوتنی چارەسەری هەردوو رێگای سیاسی و سەربازی ببینین ئەوا هەڵسەنگاندنی هەموو بوارەکانی پێشکەوتن و گۆڕانکارییەکانی ئەم سی ساڵە گەردەلول ئاسایەی دوایی سوودێکی مەزنی دەبێت.

## بةشي ثيَنجةم

## بزووتنةوةى ث.ث.ك, رةخنة ـ رةخنةدان و سةرلةنوىَ ئاواكردنةوة
## ضوارضيَوةى هةلَسةنطاندنيَك بؤ كورتة ميَذووي PKK

**يەکەمین هەڵمەتی بە PKK یی بوون**

له 31مین ساڵوەگەری دانانی بناخەکانی PKK، هەڵسەنگاندن و رەخنەو رەخنەدانێکی بەرفراوان و پێویستی سەرلەنوێ ئاواکردنەوە وەك گرفتێکی بەپەلەو ئەرکێکە دەبێ جێبەجێ بکرێت.

لەنیسانی 1973دا لەکەنارەکانی "بەنداوی چوبوك"ی ئەنقەرەی پایتەخت، وەك گروپێکی شەش کەسی، هەندێجار لەسەرپێیان، هەندێجاریش بەدانیشتن، گفتوگۆمان دەکرد کەراستتر ئەوەیە وەك گروپێکی کوردستانی بجولێینەوە، هۆکاری سەرەکیشمان بۆئەوە دەگێڕایەوە کەکوردستان کۆلۆنییەکی کلاسیکە، بۆیەکەمین جار وەك نهێنییەك ئەمەم بۆگروپەکە راگەیاندو دەستمانپێکرد. ئیتر شێوازی درکاندنی راستییەکان بۆتاکەتاکی مرۆڤەکان گۆڕا بۆ شێوازی ئاشکراکردنی بۆ کۆمەڵگاو رێکخستنیان، دەتوانرێ ئەمەش وەك یەکەمین هەنگاوی دەستپێکردن هەڵسەنگێنرێ. ئەم شێوازەش تایبەتمەندێتییەکی وەهای هەیە کەبەرەو رێکخستن دەچێ, سالانی 1974، 1975، 1976 سالانی پێشخستنی گروپ بوو لەژێر چەتری "کۆمەڵەی دیموکراتی خوێندنی بالای ئەنقەرە ـ ADYOD ". ئەو گەڕان و کۆبوونەوانەی لەئاداری 1977 لەئەنقەرەوە بۆ کوردستان ئەنجامدراو لەشارەکانی ئاگری، دۆغو بایەزید، قارس, دیگۆر، دێرسیم، بینگۆل، ئەلازخ، دیاربەکر، ئورفاو عەنتاب بەواتای گواستنەوەی گروپبوو بۆ ناو ولات(کوردستان). دوای گەڕانەوەم بۆئەنقەرەو شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" لەشاری عەنتاب ـ سێ رۆژ دوای کۆبوونەوە ـ کاریگەرییەکی هەژێنەرانەی هەبوو. وەلامی ئەمە هەنگاوەکانی بەرەو بەپارتیبوون بوو. لەکۆتاییەکانی هەمان ساڵدا لەعەنتاب گەلالە (تاسلاق)ی بەرنامەم ئامادەکرد. لەهاوینی 1978دا لەئاکامی هاوسەرێتییەکی بەبەلاو بەخیانەت بارگاویکراو بوو لەدیاربەکری ناوەندی کوردستان گیرساینەوە کە لەمێژوودا دووچاری خیانەتکاری گەورەبۆتەوە. له 27ی مانگی تشرینی دووەمدا لەگوندی "فیس" وەك گروپێکی ئەماتۆری 22 کەسی بەلێنی بەپارتیبوونمان دا. دەرك بەوەکرا کەلەژێر ناوونیشانی پارتیبوون ناتوانرێ لەم هەلومەرجەدا بۆ ماوەیەکی درێژ بمێنین، کاتێك پێویستی

بەکارهێنانی بژارەکانی شاخ و ڕۆژهەڵاتی ناوین هاتەئاراوە، هەروەکو دووەمین کۆچی حەزرەتی ئیبراهیم لە 1ی تەمموزی 1979 بەدواوە لەئورفا بەرەو سوریا لەوێشەوە بەرەو وڵاتی کەنعان بەئامانجی گەڕان بەدوای ئازادی هەنگاو هاوێشترا.

نزیکەی ئەو 10 ساڵەی تاوەکو 15ی ئابی 1984 پێویستە لەنزیکەوە بزانرێ لەناو کامە زەمینەی سیاسی و ئایدیۆلۆژی و چۆن تێپەڕبووە.

ساڵانی 1970 کان سەرەتای ئەو قۆناخەیە کەشکاندنەوەیەکی گرنگ لەمێژووی سیستەمی سەرمایەداری دەستپێکرد. سیستەم لەشەڕی دووەمی جیهانی دەرکەوتبووو خۆی کۆکردبۆوە، بەشێوەیەکی مسۆگەر ڕێبەرایەتی ئەمریکا یەکلادەبۆوە، ئەوروپا دووبارە هەڵسابۆوە سەرپێیان، ژاپۆنیش وەك دێوێکی ڕۆژهەڵاتی دوور سەریهەڵدابوو. لەکاتێکدا سیستەمی سۆسیالیزمی بونیادنراو بەرەو لوتکە هەڵدەکشا، بزووتنەوەکانی ڕزگاری نیشتمانی لەقورسترین قۆناخەکانی خۆیاندا دەژیان. تەواو لەم خاڵەدا بزاڤەکانی لاوانی 1968 شۆڕشێکی نوێی زهنیان دەستپێدەکرد.

سیستەمێکی مێژوویی ـ کۆمەڵایەتی بەمشێوەیە کەگەیشتبووە لوتکە لەوانەیە جێگای واقورمان بێت کە چۆن کەوتە قۆناخی قەیران ـ گێژاوەوە. بەڵام ئەگەر بێتەوەیادمان کەهەنگاوێکی دوای لوتکە سەرەتای کەوتنە، ئەوا بۆچوونی سەرەکی و پەسندکراو ئەوەیە قۆناخێکی راستەقینەی ئاژاوە(کائیوس) سەریهەڵداوەو بەشێوەیەکی خێرا کاریگەرییەکانی بڵاودەبێتەوە. کاتێك لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ئاوڕێك لەڕابردوو بدەینەوە دەبینین و دەرکی پێدەکەین کەسەربارى ئەوەی بزوووتنەوەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو، ڕزگاری نیشتمانی و سۆسیال ـ دیموکراتەکانی لەبازنەی تیشکۆی دەوڵەت چڕببوونەوە بەئامانجی خۆیان گەیشتن. بەڵام دووربوون لەو بەڵێن و ئومێدانەی بەجەماوەری گەلیان دابوو. دیسان ئەم دوالیزمە سەریهەڵدابوو ئایا ئایینی مەسیحی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای فەتحکرد یاخود بەپێچەوانەوە. دەشێ ڕێژەی راستی لەهەردووکیشیاندا هەبێت. کاتێك ئایینی مەسیحی کۆتێز (سەنتێز)ێکی لەگەڵ باوەڕی ئیمپراتۆریەت پێکهێنا، دەرەبەگایەتی چاخی ناوینی هێنابووە ئاراوە. ئەگەر یەکسانیخوازو ئاشتیخوازیش نەبێت، دەتوانرێ بگووترێ کەبەسیستەمێکی جیاوازی کۆمەڵگا گەیشتبوو. بەڵام ئەمەش راستییەکە تارادەیەکی مەزن ئازادی و یەکسانیخوازییەکەی ناواخنی خۆی لەدەستدابوو.

ڕێبازەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو، سۆسیال ـ دیموکرات و ڕزگاری نیشتمانی کە لەقۆناخی هۆڤێتی سەرمایەداری سەریانهەڵدا، لەئاکامدا پاشکۆو بەردەوامی سیستەمن. واتە لێیکەوتبوونەوە. بێگومان ئەگەر بڵێین بەتەواوەتی وەك ڕێبازو ڕەوتە یەدەگەکانی سیستەم ئامادەکران واقیعی نابێت. بەڵام ئەمڕۆ زۆر بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین کێشەی تێپەڕکردنی واقیع و شێوازی ژیانی سیستەمیان نەبوو، ئەگەر هەشبووبێت تەنیا لەبواری قسەکردن و تیۆرییدا ماوەتەوە. ڕیشەی ئایدیۆلۆژیا یەکسان و ئازادیخوازەکان لەدەرەوەی کۆمەڵگای پلەداری و چینایەتییە. لەئاکامی تامەزرۆیی بۆ ڕاوەستەی دیموکراتی و کۆمەڵکاری لەدایك دەبن. بەڵام لەڕێگای چەندین نموونەوە دەزانین کە لەمێژوودا یان لەڕێگای توندوتیژی یاخود بەرامبەر بەهەندێ سازش و قەرەبوو لەپێناو ونکردنی ناوەڕۆکەکەیان دووچاری گەندەڵی کراون.

کاتێك ئەوە بێنینە بەرچاوان کەئەمڕۆ وڵاتەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو هەڵوەشاونەتەوە، دەوڵەتەکانی دوای تێکۆشانی ڕزگاری نیشتمانی ئاواکران کەوتوونەتە ناو قەیران و حکومەتە سۆسیال دیموکراتەکان هیچ جیاوازیەکییان لەگەڵ موحافەزەکارەکاندا نەماوە، ئەوکاتە بەدڵنیاییەکی زیاترەوە دەتوانین بڵێین ئەم ڕێبازانە هەریەکەو مەزهەبێکی تایبەت بەسیستەم بووە. قەیرانی 1970 کان لەنزیکەوە پەیوەندی بەوەوە هەیە. ئەوە روونبۆوە کەئیتر سیستەم ناتوانێ سوود لەم مەزهەبە یەدەگانە وەربگرێت. بزووتنەوەی لاوانی 1968 لەناوەڕۆکی خۆیدا گوزارشت لەم راستینەیە دەکات. ئەو ئەنجامانەی لێنەکەوتۆتەوە کەچاوەڕوانی و ئومێد دەکران. سەربارى ئەوەی هەرسێ ڕەوتیش دەسەڵاتیان گرتەدەست بەڵام پەیمان و بەڵێنەکانی خۆیان جێبەجێ نەدەکرد. ببوونە هۆی لەدایکبوونی چینێکی نوێی سەرمایەداری و بیرۆکراسی. لەزۆرلایەنەوە

لەسەرمایەداری کلاسیك دواکەوتووتربوون. ئەو قەیران و نەبوونی ئازادی و یەکسانییەی کەرێگایان لەپێشکردبۆوە، وەهایکرد بەدوای ئەو سیستەمەدا بگەرێن کەپێشتر رەخنەیان دەکرد.

ئەم راستینەیە هەرەشەیەکی جددی بوو سەبارەت بەرەوابوونی دەوڵەتی سەرمایەداری. ئیتر لەو توانستە رشت و بەهەندانە بێبەش دەبوو کەکاریگەریان دەکردە سەر جەماوەر. هێزە ئۆپۆزسیۆنەکانی جەماوەر روویان لەو رێبازانە دەکرد کەپاشکۆو وابەستەی دەوڵەت نەبوون. لەگەڵ ئەوەی شۆرشگێریتی 1968 چەندین کەموکورتی لەخۆوە دەگرت، بەلام رێگای لەپێش ئەم راستینەیە کردبۆوە. لەچەپرەوێتی نوێوە تاوەکو دەگاتە فێمینیزم، بزووتنەوەکانی ژینگەپارێزی و رێبازەکانی کولتووری خۆجێیی بەرامبەر دەوڵەت وەك شێوازێکی نوێی ئۆپۆزسیۆن پێشکەوت. ئەمە سەرەکیترین فاکتەربوو کەسیستەمی خستە ناو گێژاوەوە. لەلایەکی دیکەشەوە لەئاکامی زیادبوونی کێشەکانی ژینگەو سیاسەتی قەرەبوودان، بەهۆی بەرزبوونەوەی کرێ و هەژاری جەماوەر، کەمی و ناتەواوی داواکارییەکان رێگای لەپێش دارایی و نمایشی زیادکردەوە. ناکۆکییەکانی ناوخۆی سیستەم لەتەوەری ئەمریکا ـ یەکێتی ئەوروپا ــ ژاپۆن زیادی کردبوو. لەدوای 1980کان وەك رێگەچارەی ئەم قەیران ــ ئاژاوەیە پێشبینی و چاوەروانی لەلیبرالیزمی نوێ (نیولیبرالیزم)کرا. هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤییەت لە 1990 سەرکەوتنی سیستەم نەبوو، بەڵکو فاکتەرێکی زیادکردنی قەیران بوو. لەژێر ئەم هەلومەرجانەدا" هەڵمەتی نوێی جیهانگیری" لیبرالیزمی نوێ کەوتەرۆژەڤەوە. لەژێرکاریگەری سەخت و قورسی بۆردوومانی میدیای یەکلایەدا هەوڵی ئافراندنی چەمك و تیۆری ساختەدرا. بۆئەوەی ئامانجی نوێ بۆ سیستەم دیاریبکەن خێرایی بەبونیادنانی تیۆری درا. لەجیاتی کۆمۆنیزم بۆچوونی "پێکدادانی شارستانییەتەکان" رەواجی پێدرا. بەتایبەتیش لەو جوگرافیانەی بەناو ئیسلامین, ناکۆکبوونی سیستەمی رژێمە ئاواکراوەکان لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیان دەردەکەوتەپێش.

لەکاتێکدا سەرەتای حەفتاکان پێشکەوتنی گەورەی بەمجۆرە لەجیهان روویاندەدا بزووتنەوەی چەپرەوێتی و کوردایەتی پەیوەستدار بەکێشەی نەتەوەیی کوردان لەتورکیا، مەیلی چەپرەوێتی کلاسیك و میللیگەرایی تێپەرنەکردبوو. بەدرەنگوەختی و زۆرلەدواوە بەدوای شوێنپێی جیهاندا دەرۆیشتن. لەکاتێکدا چەپی تورکیا لەمیانەی کەناڵەکانی کۆمۆنیزمی سۆڤییەت و چین و ئەلبانیاو ئەوروپا تێرخۆراك دەکرا، چەپی کوردیش کەبزووتنەوەیەکی کزی رۆشنبیران بوو، لەناومارکەیەکی تێکەڵاوی کاریگەرییەکانی میللیگەرای سەرەتایی کوردو چەپی تورك دەژیا. وەك کەسێتی لەم قۆناخەدا خۆم پەیوەندیم لەگەڵ هەردوو مەیل هەبوو. هەوڵمدا ببمە هەوادارو لایەنگر. لەگەڵ ئەوەی هەوادارییم بۆ بەرەی پارتی کۆمۆنیستی گەلی تورکیا (THKPC) لەپێشتربوو کە لەبزووتنەوەی لاوانی شۆرشگێر جیاببووەنەوە، بەلام لەبەرئەوەی پارتی کارکەرە پێشکەوتنخوازەکانی تورکیا بەشێوەیەکی گشتگیرتر نزیکی کێشەی کورد دەبووەوە, زیاتر سەرنجی منی رادەکێشا. لەسەرتەختەی لەسێدارەداندا جەختکردنەوەی "دەنیز گێزمیش"ی رێبەری رێکخستنی کۆمۆنیستی گەلی تورکیا لەسەربرایەتی ئازادانەی کورد ــ تورك پەیامێك بوو پێویستبوو بەردەوام وابەستەی بین. لەگەڵ ئەمەشدا لەساڵی 1970 لەئەستانبۆڵ ببوومە ئەندامی (DDKO). کاتێك گەردەلوولەکەی 12ی مارت هەڵیکرد لەناو هەلومەرجێکی ئاڵۆزی بەمشێوەیەی رێکخستندا ئەگەری ئەوە هەبوو هەرساتێك دەربکەومە دەرەوەی یاسا. هەربۆیە لەئەنجامی بەشداریکردنم لەچالاکییەکی بایکۆتکردن کەبەبۆنەی شەهیدبوونی "ماهیرچایان" ئەنجامدرا، دەستگیرکرام، دواتر بەهۆی نەبوونی شاهێدو بەڵگەی پێویست ئازادکرام، بەتایبەتی بینیم کەئەوشێوازە رێکخستنە ئومێدبەخش نییە، بەو بروایە گەیشتم راستتر ئەوەیە بەرەو رێکخستنێکی نوێ هەنگاو بهاوێژم.

لەبەهاری 1973 بەبریاربوونمان سەبارەت بەرێکخستنێکی سەربەخۆ، لەو تواناکارییەی لەبەردەستدابوو زیاتر، لەبواری واتادا زۆرگرنگ بوو. ئەوەی ئێمە نەمەیلێکی میللیگەرای (نەتەوەپەرستی) سەرەتایی کورد بوو، نەمەیلێکی چەپرەوێتی

میللیگەرایی تورك بوو کەبەسۆسیال شۆڤێنی ناومان دەبرد، بەڵکو راستتر ئەوەبوو لەمیانەی شرۆڤەیەکی تایبەت بەمێژووو رەوشی بەرجەستەیی ئەوکاتە وەك "شۆڕشگێڕانی کوردستان" هەنگاو بهاوێژین. ئەمە گۆڕانکارییەکی رێبازبوو، رۆژبەدوای رۆژیش گرنگییەکەی زیاتر روونبووەوە. لەبواری ئایدیۆلۆژیدا نەتوانەوە لەناو مەیلەکانی ستەمکاری نەتەوەی سەردەست و مەیلی کوردە (نۆکەرەکان) کەپاشکۆی دەسەڵاتی ـ نەتەوەی زاڵ بوون، هەروەها بەدەستەوەگرتنی دەستپێشخەری لەبواری سیاسی، ناسنامەیەکی ئازادی بۆ فەراهەم دەکردین. لەو بڕوایەدام ئەم بڕارە راستبوو. ئەو تایبەتمەندییانەی لەهەناوی خۆی دەگرت کەگەلی کوردی بەرەو ئازادی دەبرد، هەروەها بەگوێرەی ئاستی کۆمەك و رۆڵەکەیان گەلانی دیکەشی بەرەو هۆشیاریبوون بەگەلێکی ئازاد دەبرد. بەئامانجکردنی ناسنامەی گەل بەبێ کەوتنە ناو میللیگەرایی نەتەوەی سەردەست و ژێردەست. لەهەمانکاتدا لەشوێن و کاتی خۆیدا بەرامبەر چەواشەکاری و لادانەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو، رزگاری نیشتمانی و سۆسیال ـ دیموکراتەکان گەرەنتییەك بوو. بەئەندازەی پێشکەوتنێکی دروستی زهنییەت، تایبەتمەندێتی ئەو رێگایەشی لەخۆوەدەگرت کەبەئاقاری سیاسەتی دیموکراتییانەدا دەڕۆیشت. بەشێوەیەکی زێدەڕۆیی جەختکردنەوە لەسەر رزگاری نیشتمانی لەوانەیە رێگای لەپێش بەلارێداچوونێکدا بکردبایەوە. شرۆڤەی دۆگمایانەی پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسینی گەلان کاریگەری لەسەرئەوە هەبوو. هەرنەتەوەیەك و دەوڵەتی خۆی وەك تاقە شرۆڤەی راستی ئەم پرەنسیپە دەبینراو دەرکی پێدەکرا. ئەم رەوشە کەسەرچاوەی خۆی لەچەمکی دەسەڵاتی سۆسیالیزمی بونیادنراو وەردەگرت، کۆسپی دەخستەپێش خوڵقکاری رێبازەکە. بەڵام کاتێك لەساڵی 1978 وەك PKK خۆمان راگەیاند، رێگای لەپێش زیاتر پێشکەوتنی ئەم لادانە گرت. لەجیاتی ئەوەی بکەوینە رەوشی بزووتنەوەکانی رزگاری نیشتمانی ئەوروپا، ئەو پێگەیەو شوێنگەیە بەهێزبوو کەببێتە رێبازێکی پشتبەستوو بەئازادی گەل. ئەگەر بەزانینیشەوە نەبێت، پێشکەوتنەکان لەگەڵ ئەو وەرچەرخانانە کۆکبوو کەبزووتنەوەی چەپ لەسەرئاستی دونیادا بەخۆیەوە دەبینی. ئەو شانسەی هەبوو ببێتە رێبازێکی خاوەن ئایندە.

لەگەڵ ئەوەی هێشتا بەتەواوی قووڵ و یەکلانەبووە، بەڵام کراوەبوونی بواری ئایدیۆلۆژی رێبازەکە بۆ پێشکەوتن، نەیدەهێشت بکەوێتە ناو لادانی گەورەو هەمیشەیی. بەسووربوونەوە بەناوکردنی ئەو سۆسیالیزمەی نوێنەرایەتیمان دەکرد بە"سۆسیالیزمی زانستی" ئەو پەیوەندییەی روونەدەکردەوە کەبەرامبەر کۆمەڵناسی لەئارادابوو. هەوڵدرا بەرامبەر نەخۆشی بەتەواوی نەبینینی راستییەکان تەگبیر پێشبخرێت کەسەرچاوەی خۆی لەوشکبوونی ئایدیۆلۆژی وەردەگرت. دیسان ئەو گیروگرفتە قورسانەی خودی کۆمەڵناسی بەدەستییەوە دەیناڵاند، تازە بەتازە پەیوەندیداربوونی بەکێشەکانی ژن، ژینگەپارێزی و کولتوور، گرنگی رێبازەکە دەسەلمێنێ. بەبێ چۆکدادان بەرامبەر ئاڵۆزییەکانی زانستی کۆمەڵناسی، رێبازەکەمان داخوازییەکانی یەکسانی و ئازادی زیندوودەکردەوەو دەریدەخستە پێش. بەلانی کەم توانرا لەرێگای رێبازەکەمانەوە سنوورێك بۆئەو تێکدانانە دابنرێ کەقەیرانی سۆسیالیزمی بونیادنراوو کۆمەڵناسی دەیاننایەوە، لەبەرئەوەی رێبازە چەپڕەوەکانی دیکەی تورکیا ئەم توانستەیان نیشاننەداو لەمیانەی کارەکتەری دۆگمایانەیان لەنێوان لیبرالیزمێکی تاکڕەوی پووچ دەهاتن و دەچوون, لەمارژینالبوون رزگاریان نەبوو. چونکە کەوتنەنێو رەوشی مەزهەبی بچووك, هەر لەسەرەتاوە شانسی سیاسیبوونیان لەدەستدا. ئەوگروپە بچووکانەی بەچەپە کوردەکانیش بەناو دەکران بەشێوەیەکی دامالراوتر هەمان رەوشیان بەخۆیانەوە بینی.

شانسی بەسیاسیبوونی رێبازی PKK لەنزیکەوە گرێدراوی تایبەتمەندێتییە ئایدیۆلۆژیەکەیەتی. بەخێرایی گەیشتنی بەو گەلەی کەبنکە جەماوەرییەکەی پێکدەهێنا ئەم راستییە دەسەلمێنێ. ئەگەر دووچاری نەخۆشی چینایەتی تەسك یان نەتەوەگەرایەتی تەسك بهاتبووایە، هەروەکو لەنموونەکانی دیکەدا بینرا, ئەویش لەمارژینالبوون رزگاری نەدەبوو. هەروەکو

دەزانـرێ سیاسـیبوونێکی قـووڵ روویـداوە. پێویـستە ئەمـە بـە"گـرفتی کـادیربوون" گرێبـدەین. خـودی کـادیر بـەهۆی ئـەم شێوەگرتنەی کەهەیبوو رۆڵی کۆسپنانەوەی دەبینی. یەکێك لەو فاکتەرانـەی دواتـر سۆسـیالیزمی بونیـادنراو بـەرەو داڕووخـان دەبـات، ئـەو دەستنیـشانکردن و رێکخـستنانەیە کـەدواتر سـەبارەت بەکێـشەی کـادیر ئەنجامـدەدرێت و لـەئیفلیجبوون رزگـاری نابێـت. هێنـدەی رێبـازە سیاسـییەکەی مـۆدێلی رێکخـستنەکەی بـۆ پێـشکەوتن و گەشـەکردن گونجـاوو لـەباربوو. لـەبواری پاراستنیـشدا دەیتـوانی لەسـەربنەمای پاراسـتنی چەکداری قۆنـاخ خـۆی بپـارێزێ. بـەڵام نـەبوونی ئەوکادیرانـەی خـاوەن ئـەو داواکاریانەبن رێگای لەپێش ئەوەکردەوە بەردەوام رێبازەکە زیانی بەربکەوێت و هەڵەبکات. خـوازرا ئـەم گرفتانـە بـەلاوەبنرێ کـەدەتوانین بەقـەیرانی رێکخستنیـشی بـەناو بکـەین. بـەدیهاتنی هەنـدێ پێشکەوتنی سـنووردار لەبنەڕەتـدا سەرچاوەی خۆی لەگەلەریبوونی بزووتنەوەکە وەردەگرت. بۆ بەدەستهێنانی پێشکەوتنی گەورەتر رێبازەکە پێویستی بەپرۆفسیۆناڵبوون هەبوو.

گرنگترین بابەت کەپێویستە سەبارەت بەرێبازی سیاسی PKK روونبکرێتـەوە ئـەوەبوو ئایا دەوڵەتێکی جیاوازی لـەخۆوە دەگرت یاخود نا. سـەرباری ئـەوەی بـەردەوام دروشمـی "کوردسـتانێکی سـەربەخۆ" بەرزدەکرایـەوە، بـەڵام زەحمەتـە بگووترێ بەواتای دەوڵەتێکی سەربەخۆ دەهات. وەك یـەکێك کەهەرەزێـدە نزیـك بـەم بابەتـە دەژیـام، ئەگـەر بڵێین بەشـێوەیەکی قـووڵ چەمکی دەوڵەت بەتایبەتیش دەوڵەتی کوردستانمان تاوتوێ کردووەو گفتوگۆمان لەبارەیـەوە کـردووە راسـت نییـە. هەرچـەندە لـەبواری ئۆتۆپیـادا مـەیلێك بێـت، بـەڵام لـەبواری واقیعیـدا بـەرۆژەڤکردنی هێنـدە جێگـای سەرنجڕاکێـشان نـەبوو. لەوەزیاتر کەداخوازییەکی وەهامان هەبوو یـاخود نـا، لـەو بڕوایـەدام کەسـەبارەت بەبـەهاداری و بـوونی بەرێگەچارە یەکلانەبووینـەوە. ئەوە مسۆگەرنەبوو کەبوون بەخاوەن دەوڵەت بەواتای چارەسەری دێ. لـەبواری تیۆریـشدا کێشەیەکی بەمـشتومڕ بـوو. پرسـی سۆسیالیزمی دیموکراتییانە یاخود دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا بەردەوام مێشکی مرۆڤـی ئـاڵۆزدەکرد. هـەروەها ئـەو بۆچـوونەش بەکاریگەر بوو: لەسەر ئاستی دونیا لەمیانەی گەیشتن بەرەوشی دەوڵـەت کێـشەکانی گـەلان و زەحمەتکێـشان چارەسـەرنەبووە. هەروەکو چۆن تـەواوی ئەمانە قاڵبوونەوەی سـەبارەت بەدەوڵـەت دەکـرد بـەجێگای سەرنجڕاکێشان، بـەڵام ئـەو هەستەشـی لـەلا دروسـتدەکردین کەکێـشەی وەهـا دروسـتدەکات بەرگـەگرتنیان زەحمەتـە. هـەروەها بەئەنـدازەی سـەختی و زەحمەتییـەکانی ئاواکردنی دەوڵەتی کوردان لەهەلومەرجی تورکیاو رۆژهەڵاتی ناوین، ئەو کێشەو گرفتە نوێیانـەی لەگـەڵ خـۆی دەهێنـا ئـاراوە بابەتەکەی ناسکتر دەکرد. وەك ئەنجام, لەجیاتی دەوڵەت هەرچەندە بەتەواوی ستاتۆکەشـی یەکلانەکرابێتـەوە, زیـاتر چـەمکی کوردستان وەك بژاری نیشتمانی دایك هەڵبژێردرا. هەروەها لەگووتەی "کوردستانێکی سەربەخۆ، دیموکراتیـك و سۆسیالیـست" دا کەوەك دروشمی سەرەکی هەڵبژێردرا بوو، دەرکی پێدەکرێت کەبژارێکی ئاشکرای دەوڵەت لەئارادانییە. مەزەندەی ئەوەدەکرا وەك رێگـای نـاوین و واقیعـیترین چـەمکی شۆڕشـگێڕانە بەشـێوەی کوردسـتانی ئـازاد بەرجەسـتە دەبـوو. کاتێـك گووتـەی شۆڕشگێڕانی کوردستان وەك لایەنگرانی کوردستانی ئازاد وەربگێڕین دەشێ شرۆڤەیەکی راستتر بێت. دواتر گرنگی ئەم گرفتـە ئاشـکرا دەبـوو. بەتایبـەتیش راگەیانـدنی دەوڵـەتی "فیـدراڵی کوردسـتان" لەسـەرەتای 1990 کـان و "ناوچـە ئازادەکـان" ی لەئەنجامی بەرخودانی PKK وە سەریانهەڵدا، دەبووە هۆی ئەوەی زیاتر بیر لەدەسەڵاتی دەوڵەت بکەینەوە.

بەتەواوەتی شینەکردنەوەی کێشەی دەوڵـەت لەئایـدیۆلۆژیای سۆسیالیـستیدا تەمومـژی زیـاتردەکرد. بـەڵام ــ مـاف چارەی خۆنووسینی نەتەوەکان ـ بۆچوونی "هەر نەتـەوەو دەوڵـەتی خـۆی" رۆڵـی سـەرەکی لەقورسـکردنی کێشەکەدا دەبـینی. کاتێـك دەتگـووت دەوڵـەت توندوتیـژی و شـەڕ دەکەوتـە نـاو مەسـەلەکەوە. نـەك شـەڕێك لـەپێناو بـەرگری رەوا، بەشـێوەیەکی گـشتی رەواکردنی شـەڕ لـەپێناو ئامـانجی سیاسـی گرفتێکـی دیکـەی گرنگـی پەیوەسـت بەبابەتەکـەوە بـوو. وەك بۆچـوون و فیکرێکـی سـتراتیژی ئـەوە پەسـند دەکـرا: ئەگـەر شـەڕ, بەتایبـەتیش شـەڕی گـەلی درێژخایـەن نـەبێت نەتـەوەکان رزگاریـان نابێـت،

کەنەتەوەکان رزگاریان نەبێت، رزگاری چینایەتیش بەدینایەت. ئەم گرفتانەی شەڕو دەسەڵات کە لەمێژووی تێکۆشانی ئازادیدا ڕێگای لەپێش بەلارێداچوونی گەورە کردۆتەوە، زیاتر جێگای خۆی لەرۆژەڤی PKK دا دەگرت.

لـەم قۆناخـەدا هێرشـەکانی دەوڵـەت بۆسـەر ئێمـە بەگشتی پارچـەیەکی هێرشـەکانی بـوو بۆسـەر بزووتنـەوەکانی چـەپ و کوردایەتی. رەوشێکی وەها لەئارادا نەبوو پێویستی بەپێگەیەکی جیاکاری بێت. بیرلەوە نەدەکرایەوە ببێتە ناوەنـدێکی تایبـەت و درێژخایـەنی بـەرخودان. تـەواوی نیـشانەکان ئاماژەیـان بـەروودان و هـاتنی کودەتایـەکی سـەربازی دەکـرد. دوو هەڵوێـست لەئارادابوو ئەنجامبدرێ: یان ئەوەتا پـەنامان بـەرەو شـاخەکان بردبووایـە، یـاخود بـەرەو دەرەوەی وڵات، بـۆ رۆژهـەڵاتی نـاوین پاشەکشەمان بکردبووایـە. لەراسـتیدا پـەنا بـۆ هـەردوو هەڵوێـست بـردرا. لەکۆتاییـەکانی 1979 دا بـەبێ ئـەوەی بزووتنـەوە زیانێکی ئەوتۆی بەربکەوێت خاوەنی تەواوی ئەو تواناکاریانـە بـوو کـەبۆ هـەردوولا پاشەکشێ بکات. پاشەکشێیەکە وردەوردە ئەنجامدەدرا. جگە لەهەندێ دەسگیرکردنی بێ بەختانەی وەکو "مەزلوم دۆغان و محەمەد خەیری دورمـوش" زیـانێکی جـددی ئـەوتۆمان بەرنەکـەوتبوو. توانیمـان بـبین بەبزووتنـەوە، پـارتی راگەیـەنرا، بـەو پێگـەو شـوێنگانە گەیـشتبوو کـەبۆ ماوەیـەکی درێژخایەن بەردەوامی بەهەبوونی خۆی بدات و بـڵاو ببێتـەوە. هەربۆیـە تـوانرا بەرامبـەر بـە کودەتـای 12ی ئـەیلول خـاوەن پێشبینی بێت، بەرلەوەی کودەتای سەربازی روودات پێویستییەکان ئەنجامـدرابوون. کرانـەوە بـۆ دەرەوەی وڵات بـۆ ماوەیـەکی درێژخایـەن بـیری لێنەدەکرایـەوە. لەمیانـەی چـەند پـەروەردەو راهێنـانێکی سـەربازی کـادیران، شـەڕکردن لـەرێگای شـەڕی گـەریلایی درێژخایەنـەوە وەك " یاسـایەکی شـۆڕش" شـرۆڤە دەکـرا. باوەڕیمـان بـەوەدەکرد هەمووشـتێك وەك پـلان و نەخشەکانمان بەرێوەدەچێت.

هەروەکو پێشبینی دەکرا, لەدوای 1980 چەند گروپێك لەرۆژهەڵاتی ناوین پەروەردەکران و بەرەو وڵات گەڕانەوە. هەندێ خەبات لەپێناو ئاواکردنی بەرەیەك بـەرێوەبردرا ـ بـەرەی بـەرخودانی یـەکگرتوو بەرامبـەر فاشـیزم ـ. بـەڵام کاتێـك ئـیش و کارەکان بەگوێرەی پێویست بەرێوەنەچوون پێداویـستی ئەنجامـدانی هەنـدێ خـەباتی تیـۆری خـۆی سـەپاند. هەربۆیـە لەسـاڵی 1981 بـەدواوە سـەرەتا بابـەتی " پرسـی کەسـایەتی لەکوردسـتان، ژیـانی پـارتی و تایبەتمەندییـەکانی خـەباتگێڕ" دوای ئـەو "رۆڵی توندوتیژی لەکوردستاندا" و "سەبارەت بەرێکخستن" بەشـێوەی موحـازەرە پێـشکەشم کـرد، دوای تۆمـارکردنی لـەتایپ، کـران بـەکتێب. دوای ئـەوەی خەباتـەکانی یەکـەمین کۆنفرانـسی PKK (1981) و کـۆنگرەی دووەمـی PKK (1982) ئەنجامدران, هەوڵدرا بەشێوەیەکی بنەڕەتی و هەمیشەیی بەرەو وڵات هەنگاو بهاوێژرێ. شەڕی فەلەستین ـ ئیـسرائیلی 1982 ئەم قۆناخەی خێراترکرد.

لەبنەڕەتـدا رۆژهـەڵات و باشـووری کوردسـتان کـە لەئـەنجامی شۆڕشـی ئێـران هەلومـەرجی گونجـاو لـەبارتریان بـەخۆوە بینیبوو: بۆجێگیربوون و بەرێوەبردنی کاروخەبات لەباربوون. نەك بیر لەمەنەکرایەوە. هەڤاڵ "محەمەد قەرەسـونگور" لـەوێ بوو کەلەشەڕو پێکدادانەکانی سیڤەرەك خاوەن ئەزموون بوو. ئەو توانایەی هەبوو پێویستییەکان جێبەجێ بکات. بەڵام کاتێك لەمانگی ئایاری 1983 لەئەنجامی دڵسۆزی و بێ ئەزموونی خۆی بووە قوربانی و شەهیدبوو بێ شانسییەکی گەورەبوو. ئەوەی لـە"دووران کالکـان و عـەلی حەیـدەر قـەیتان" چاوەڕواندەکرا کەبـەئامانجی پڕکردنـەوەی بۆشـایی بـۆ ناوچـەکە رەوانـەکران ئاراستەکردن و جێگیرکردنی رێبازبوو. هەروەها خاوەنی رێنماییەکی گشتی وەهابوون کەلەبۆتانەوە تا دێرسیم هێڵێکی درێـژی بەرخودان پێشبخرێت کەپێـشتر بەرێبەرایـەتی هـەڤاڵان "کـەمال پـیرو مەعـسوم قۆرقمـاز" هـەوڵی بـۆ درابـوو، دەسـتگیرکردنی نابەجێ و بێبەختانەی "کەمال پیر" لەتەمموزی 1980 دا زیـانێکی گـەورەبوو. ئەوانـەی چاوەڕوانی هـەنگاوی راسـتەقینەیان لێدەکرا، "دووران کاڵکان و هەڤاڵانی بـۆ یەکـەمین جار رێگایـان لـەپێش ئەندێـشەیەکی وەهـا دەکـردەوە, هـەروەکو بڵێـی یـاری بەرێباز دەکەن. هێندەی بەبیرم دێتـەوە دەمگووت: "دووبارەکردنـەوەی بوویـەرەکانی رۆژهـەڵاتی نـاوین، هـەروەکو ئـەوە وایـە

گوێدرێژەکە بۆیاخ بکەیت و بیفرۆشیتەوە خاوەنەکەی". کاتێك پێهەلگرتنی چاوەڕوانکراو ئەنجامنـەدران، ئـاگر لەخۆبـەردانی "فەرهاد کورتای" و هەڤاڵانی لەزیندانی دیاربەکر، ئەو ئەندێشەو بەرپرسیارێییەی بەرامبەر شـەهیدبوونی"مـەزلۆم دۆغـان و کەمال پیرو هەڤاڵەکانی لامان دروست دەبوو، رەوشمـانی بـەرەو تووڕەبـوون و کـین دەبـرد. بـەم ئامانجـەش لـەکانوونی دووەمـی 1984 ی کۆبوونەوەی کادیرانی ناوەندی کەژمارەیەکی دیاریکراو تێیدا بەشداربوون بەناوهێنان هەنـدێ هـەڤاڵانمان بەتونـدی رەخنەکرد ـ بەتایبەتیش دووران و جەمیل ـ.

2 ـ دووەمین هەڵمەتی"PKK"یی بوون.

ئـەو قۆناخـەی پێیگەیـشتبووین خـاڵی دووریـان و جیابوونــەوە بـوو، ئـاخۆ دەبینــە بزووتنەوەیـەکی پەنابـەری، یـان بزووتنەوەیەکی هاوچەرخی رزگاری نیشتمانی یـاخود بزووتنەوەیـەکی ئـازادیخوازی گـەل. بێـدەنگی درێژخایـەن و بـەردەوامی بزووتنـەوەی ئـازادی بەرپرسـیارێتییەکەی قـورس بـوو. بەتایبـەتیش شـەهیدانی زینـدان و هەلومەرجـەکانی ئەشـکەنجەدان مسۆگەر پێویستی بەوەڵامدانەوە هەبوو. لەدۆخێکی پێچەوانەدا، نەدەشیا مۆرکی خیانەتمان لێنەدرێت. لەژێرئەم ئەندێـشانەدا بەشێوەیەکی ناتەواوو درەنگوەختـەوە پێشوازی لەهەڵمـەتی 15ی ئـابی 1984 کـرا. لـەقۆناخی سـەرۆك وەزیرانـی "ئـۆزال"دا دیسان هەڵوێستی دەوڵەت بەگوێرەی قورسایی پێویست نەبوو. بەهۆی ئەو زهنییەتەی گەریلای وەك "گروپێکی وێـڵ دەبـینی" هیچ ئومێدێکی بۆ هەڵوێـست و نزیکبوونـەوە سیاسییەکان نەدەهێـشتەوە. لەمیانـەی ئەومتمانـە بێـسنوورەی بەرامبـەر هێـزی سەربازی کلاسیك هـەیبوو، لەچاوەڕوانی ئـەوەدابوو لەماوەیـەکی کورتـدا سـەرکوتمان بکـات. لەمیانـەی پروپاگەندەیـەکی زۆرو بەهاتوهوتەوە شاڵاوی بۆهێنایـن. تاوەکو کۆتایی 1984 هیچ سـەرکەوتنێك لـەئارادا نـەبوو. پـێش شـەڕی گـەریلایی کراوەبـوو. بەڵام کاتێك ئەو فاکتەرە رێگرانەی ناوخۆ ئەو کۆسپانەشی هاتەسەر کە "پ. د. ك" سەرچاوەکەی بوو، چەندەی هەوڵـدرا ئـەو هەنگاوو هەڵمەتە بەهێزانە ئەنجامنەدران کەچاوەڕوان دەکران. کاردانـەوەی گـەل ئـەرێنی بـوو. ئـەوەی لـەئارادا بـوونی نـەبوو، کـادیرانی فەرمانـدەیی راسـتەقینەبوو کەبەڕێوەبەرایـەتی بزووتنـەوەو رێکخـستنەکەی بەڕێوەببـەن. ئـەم کێـشەیە لەسـەرەتا تاکۆتایی مۆرکی خۆی لەئەنجامە نەرێنییەکان (نێگەتیفەکان)دا.

ئەو رەخنانەی کەمال پیرو مەعسوم قۆرقمـاز سـەبارەت بەتێکۆشـانی چـەکداری پێشیانخستبوو واقیعـی بـوون. دوو هـەڤاڵی بـەهاداربوون کـەدەیانتوانی پێویـستییەکان جێبەجێبکـەن. شـەهیدبوونی کـەمال پـیر لـە 1982، مەعـسوم قۆرقمـاز لـە1986 زیـانێکی گـەورەبوو دەرهـەق بەچـۆنییەتی پێشخـستنی شـەڕ بـەگوێرەی رێـساکانی خـۆی. دواتـر ئـەو پاشەکـشێ رێژەییـەی ئەنجامـدراو بەسـتنی سـێیەمین کـۆنگرەی PKK لـە1986 بـوو بەخـەباتی پێشخـستنی قـەیران. ئەمـەش بـەهۆی نـەبوونی تواناکارییەکان نەبوو، بەڵکو چەمکی خەوتن لەسـەر ئـەو تواناکاریانـە بەکاریگـەردەبوو کەبەهـەزارو یـەك بـەڵا ئـافرێنرابوون. هەڵوێستە ئاژاوەگێڕییەکانی کەسیرە تادواڕادە دەمارەکانی گرژدەکردین. سەرباری گشت کەموکورتییەکانیش لەساڵی 1987 بـۆ پێهەلگرتنێکی جددی و بەرچاو دیسان لەمیانەی رێنماییەکی بەرفراوان و تواناکارییەکی دیارەوە ئامـادەکرابوون. بـەڵام کاتێـك بوویـەری چـەتەگەرێتی نـاوخۆ کـە لەهـەناوی بزووتنەوەکـەدا جێگیربـوو، پێبـەپێ دۆخێکـی زانـینی بـەخۆوەگرت و لەگـەڵ بێبەرپرسیارێتی کادیرانی ناوەندی بوو بەیەك، ئەو کارو خەباتانەی زۆر بەهاداربوون و بەفیدارکارییەکی نائاسایی خەڵکانێکی بێژمار ئامادەکرابوون خستە دۆخێکی بێکەڵك، بێبەرهەم و لەکارکەوتوو.

بەرامبـەر بـەم رەوشـەی روونکردنـەوەی زەحمەتـە، پێگـەو شـوێنگەی سـەرۆکایەتی گـشتی کـەرۆژ لـەدوای رۆژ بارەکـەی گرانتردەبوو پێویستی بەئەنجامـدانی شیکردنەوەی گشتگیرو قووڵکردنـەوەی پـەروەردە دەکـرد. سـەرباری تـەواوی زەحمـەتی و قورسـاییەکەیەوە بەشـێوەیەکی سـەرکەوتووانە بەرپرسـیارێتی جێبـەجێ دەکـرا. لـەپێناو کەرامـەتی شۆڕشـگێڕی هـەر بەرئەندامێکی کادیر مسۆگەر یارمەتی و هاوکاری پێویستی پێشکەشکراوە. لەجیاتی رێز لەم کۆششەبگرن و خۆشیان کۆمەك و

بەشدارییەکی بخەنەسەر، بەلاّم کەوتنیان بۆناو شەڕێکی دەسەڵاتی ناوخۆیی تەواوی هەوڵ و کۆششەکانیان ژەهراوی دەکرد. گروپی "شاهین بالیج، شەمدین ساقق، جەمالەکوێرو هۆگر" کە بە"چوارچەتە"کە ناویان دەبەین، بەشێوەیەکی فەرمی کوشتاری بەکۆمەڵی کادیرانیان دەستپێکرد. تاوەکو ئێستاش نازانرێ لەژێرناوی "لەناو شەڕدا شەهیدبوو" چەندین کادیرانی هێژایان گوللەباران کردووە. تاکو ئێستاش نهێنی مردنی تاریك و بەگومانی چەندین هەڤالانی هێژامان ئاشکرانەبووە. چەندین مرۆڤی ئاسایی، ژن و منداڵ کەنەدەبوو بکرێن بەئامانج، کوژران. دەستپێشخەری (مبادرة) ـ ناوەندی لەئارادا نەمابوو. تاکو ئێستاش دیارنییە تا چ رادەیەك زانیاری راستیان بۆمن رەوانە کردووە.

تەنیا ئەوکاتە توانیم هۆشیاربېمەوە کە لەکانوونی دووەمی 25ی مانگی 1990 لەبەرچاوم هاوڕێی منداڵیم "حەسەن بینداڵ"یان شەهیدکردو گووتیان"لەکاتی راهێنان (تدریب)بەهەڵە لێیدراوە". سەرباری باوەڕییە گەورەکانی ولاّتپارێزی و سۆسیالیستیم، بەلاّم ئەوتاوانە گەورانەی لەبونیادی بزووتنەوەکە بەشێوەیەکی هەرەدڕندانە ئەنجامدەدراو ناتوانرێ روونبکرێتەوە، رێگای لەپێش بێخەمی کردبۆوە. مەزەندەدەکرێ لەم نێوەندەدا لەژێرناوی قەلاّچۆکردنی سیخوڕێتی چەندین مرۆڤی بێتاوانیش لەنێوبردرابن. بەگوێرەی ئەوەی لەتەنیشت منەوە ئەنجامیاندا، لەوانەیە ئاستی تاوانەکانیان لەناوەوە (کوردستان) زۆر ترسناکتر بێ. کاتێك لەساڵی 1991 تاڵەبانی سەبارەت بەبابەتی "PKK" لەگەڵ تورکیا رێککەوت، لەگەڵ "پ. د. ك"بەیەکەوە شانبەشانی تورکیا بڕاری "یان تەسلیم بوون، یان لەناوبردن" یان لەپێشداناین و شالاّویان بۆ سەربزووتنەوەکەمان هێنا، سەرەڕای خەباتی مەزن و قارەمانێتی و پشتگیری گەل، چەندەی هەوڵدەدرا نەماندەتوانی لەقەیران دەربکەوین. کۆنگرەی چوارەمی 1990 و چەندین کۆنفرانسی ئەنجامدران لەنووسینی سەرئاو بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نەبوو. سەرباری تەواوی ئەم خراپەکاریانە شیکردنەوەی قووڵی بەلگەکراو، خەباتی کادیران کەساڵانە هەزاری تێپەڕدەکردو تەڤلیبوونی رەنوو ئاسای گەل نەوەستا.

بۆیەکەمین جاربوو پێشکەوتن و گۆڕانکاری جددی لەبەرەی دەوڵەت دەبینرا، لەگەڵ ئەوەی هەڵوێستی ئەرێنی تۆرکۆت ئۆزاڵ سەبارەت بەئاگربەست و گفتوگۆکردنی کێشەکەو گووتەی "ناسنامەی کورد دەناسین"ی سلێمان دیمیراڵ ئومێدبەخش بوون, بەلاّم جێگای متمانەنەبوون. ئەگەر لەبەهاری 1993 تۆرکۆت ئۆزال نەمردبووایە, یاخود وەك بانگەشەدەکرێ نەکوژرابووایە, لەناو بزووتنەوەش وەك کاردانەوە بەرامبەر زیانە بێواتاکانی گەریلا شەمدین ساقق 33 سەربازی بێ چەکی نەکوشتبووایە، لەوانەبوو ئاگربەست بەئاشتییەکی هەمیشەیی ئەنجامگیربێت. بەلاّم رەوشی ناوخۆی دەوڵەت، لەناو "PKK" شدا بەدەستەوەگرتنی دەستپێشخەری لەلایەن گروپی چەتەگەرێتی و خیانەتەکەی تاڵەبانی و بارزانی بوونە کۆسپ لەپێش سەرگرتنی ئەم شانسە، مەسەلەکان ئاڵۆزتربوون و سنووری خۆی تێپەڕکرد. لەساڵی 1994 تاوەکو 1998 داکۆکیکردن لەسەر خۆدووبارەکردنەوە تاڕادەیەکی مەزن هەردوو لایەنی لەپەلوپۆخست. بەو بڕوایەی کەقۆناخی 28ی شوبات دەنگێکی جیاوازەو لەساڵی 1998 دەوڵەت بەبێخەمی و بێوەلاّم نامێنێتەوە، هەنگاو بۆ ئاگربەستی یەکلایەنەنرا. لەئەنجامی داسەپاندن و فشارەکانی سەر سوریا ئەم ولاّتەم بەجێهێشت و ئەم قۆناخەش نەیتوانی رێگا لەپێش رێگەچارەیەك بکاتەوە. دەوڵەت وازی لەرەوشی شالاّوی بەرفراوان نەهێنا. بەگوێرەی خۆی دەرفەتی بۆرەخسابوو، لەوباوەڕە دابوو مسۆگەر مەسەلەکە بەرێگای سەربازی تەواو بکات و کۆتایی پێبێنێ. کاتێك ماجەڕا ناسراوەکەی ئەوروپا بەقۆناخی ئیمپرالی ئەنجامگیربوو، ئیتر هەنگاو بۆ قوناخێکی دیکە نرا. ئەم رەوشەش بەواتای دووەمین هەڵمەتی بە "PKK"یی بوون دێت.

ماوەی نێوان 15ی ئابی 1984 تاوەکو 15ی شوباتی 1999 کەدەتوانین بەقۆناخی "شەڕی چڕی ئاست نزم" بەناوی بکەین، دەشێ لەزۆر بوارو لایەنەوە هەڵسەنگاندنی هەمەلایەنەی لەبارەوە بکەین. هەروەکو چۆن دەتوانرێ هەڵسەنگاندن لەبواری مەسەلەکانی سەرۆکایەتی، پراکتیکی بەڕێوەبەرایەتی سیاسی و سەربازی بکرێت، لەهەمانکاتدا سەبارەت بەمەسەلەی

هونەری شەڕو دەسەڵاتیش دەتوانرێ ئەنجامبدرێت. هەروەها بەئەندازەی راستی و هەڵە سەرەکییەکان، دەتوانرێ هەڵسەنگاندن سەبارەت بەو کارو خەباتانە بکرێ کەمسۆگەر دەبووایە جێبەجێ بکرێن، بەڵام ئەنجامنەدران. هەروەها لەسەرئاستی جیهان دەتوانرێ هەڵسەنگاندن سەبارەت بەهەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤییەت، هەڵبژاردنی کلینتۆن بۆ سەرۆکایەتی ئەمریکا، قەیرانی ئێراق و هەڵمەتی نوێی جیهانگیری بەشێوەیەکی قووڵ شرۆڤەبکرێت. هەروەها گرێدراو بەوە دەتوانرا چۆنییەتی تێپەڕکردنی چەپی کۆن و خاسییەتەکانی چەپی نوێ و خودی ئۆتۆپیای شۆڕشگێڕیش، لەبواری تیۆرییەوە سەرلەنوێ هەڵسەنگێنرێتەوە. دەتوانرا کەموکورتی و هەڵەی شرۆڤەکان دەستنیشان بکرێت و تەواوبکرێت.

3. هەندێ هەڵسەنگاندن سەبارەت بە"PKK"

هەوڵمدا چوارچێوەیەکی کورتی گەلاڵەی مێژووی "PKK" دیاربکەم. بۆ ئەنجامدانی هەندێ شرۆڤەو هەڵسەنگاندن چەندەی بڵێی ئەزموونبەخشە. پێشتر گووتەیەکی وەهام بەکارهێنابوو: "ئەوەی شیدەکرێتەوە سات نییە مێژووە، کەس نییە کۆمەڵگایە". کاتێك ئەمە لەسەر "PKK" پەیڕەوبکەین زیاتر دەرکی پێدەکرێت. ئەوەی لە"PKK"دا شیدەکرێتەوە, هەم مێژووی کوردە هەم کۆمەڵگاکەیەتی. بەتەواوی لایەنە ئەرێنی و نەرێنییەکان(پۆزەتیف و نێگەتیف)ی بەمجۆرەیە. بەمەرجێك تەنیا بتوانین بەشێوەیەکی راست بیخوێنینەوەو وانەکانی لێوەربگرین.

هیچ کاتێك گومانم لەوەنەبوو کە"PKK"یی بوون لەدایکبوونی کوردی هاوچەرخە. بەڵام بەتەواوەتی ئەقڵم ئەوەی نەبڕیبوو کەئەو تاکانەی بەکورد ناودەبرێن لەلایەك هێندە ناکۆك، بێواتاو لاوازبێت، لەلایەکی دیکەشەوە هێندە راستگۆ، فیداکارو ئازابێت. چەندین شیکردنەوەم سەبارەت بەکەسایەتی ئەنجامدا. تائێستاش ناتوانم بڵێم بەتەواوەتی لەکەسایەتی کورد گەیشتووم و شیتەڵم کردووە. چونکە زۆرلەوە دوورخراوەتەوە کە هی خۆی بێت. هەرچەندە لەڕواڵەتدا وەك کورد دیاربێت، لەناوەڕۆکدا ببوو بەشتێکی دیکە. تەنانەت هەستی بەرەهەندو ئاستەکانی خیانەتیش نەدەکرد. نەیاساکانی سەبارەت بەمرۆڤ, نەئاژەڵ دەرهەق بەو پەیڕەو نەدەکرا. هەروەکو بڵێی جۆری سێیەمی زیندەوەرانە.

ئەو رۆڵە سەرەکییەی لەمەسەلەی"PKK"یی بووندا هەوڵی بینینم دا, پەیوەندی لەگەڵ بواری هزریدا ئاشکرابوو. بەڵام چ وەك تاك بێت یاخود کۆمەڵگاو ئەو کوردە بێت کەوەك سەرچاوە نکوڵی لێدەکرا, چەندەی هەوڵمدا بەگوێرەی تیۆرییە کۆمەڵایەتییەکانی لەئارادان شیتەڵ بکەین، بەڵام لەکەموکورتی و پڕ لەهەڵە رزگاری نەبوو. هەرلەپێهەڵگرتنی 1975 دا هەروەکو بڵێی لەمیانەی فەرموودەی زەردەشتییەوە سەبارەت بەئیمپریالیزم و داگیرکاری گەلاڵەی بۆچوونەکانم دانابوو. ئەم چوارچێوەیەی مەزەندە دەکەم تائێستاش پارێزراوە، هیچی لەگرنگی و بایەخەکەی خۆی لەدەستنەداوە. ئێستاکەش دەتوانرێ بەکاربهێنرێ. چوارچێوەیەکی باشی ئەو بۆچوونە شۆڕشگێڕیانەبوو کەمۆرکی خۆی لەقۆناخ داوە؛ کۆمەك و بەشدارییەکی باشی لەشەڕی هزری شۆڕشگێڕێتی کوردستاندا کرد. ئەو گەڕان و کۆبوونەوانەی لەچوارچێوەی ئەم گەلاڵەیە لەکوردستان ئەنجاممدا جێگای سەرنجراکێشان بوو. ئەو گووتەیەی لە کۆمەڵەی بیناسازانی ئەنقەرە لەئاداری 1976 پێشکەشم کرد ناوبانگی دەرخستبووم. دواتر لەئاگری، دۆغو بایەزید، قارس ــ دیگۆر، دێرسیم، بینگۆل، ئەلازخ، دیاربەکر، ئورفا، عەنتاب بەردەوام بوو، لەمانگی ئایار دیسان لەئەنقەرە کۆتاییم پێهێنا. ئەو کاروانەی لە 15ی ئایار تەواوبوو، لە 18ی ئایار وەڵامەکەم وەرگرت. کاتێك لە 18ی ئایار بەشەهیدکردنی هەڤاڵ "حەقی قەرار" لەلایەن عەلائەددین قەپانی ئەندامی گروپی "ستێرکاسۆر"ی گومانلێکراو وەڵامەمان درایەوە، بەو واتایە دەهات مەنجەڵێك ئاوی کوڵاو بەسەرماندا برێژن. ئەمە رووداوێك بوو ئاراستەی مێژووی گۆڕی. شیمانەی پەیوەندی ئەم گروپە گومانلێکراوە لەگەڵ "پ. د. ك" و پاشماوەی هەندێك گروپی تورك و تەنانەت هەندێ گروپی گرێدراوی دەوڵەت، بەشێوەیەکی خێرا شەڕی هزری بەرامبەر چەند ئامانجێکی جیاواز خستبووە رۆژەڤەوە. هەرزوو شەڕی هزری کەوتە ناو مەترسی بوون بەئامرازی شەڕی ماددی.

کاتی هەڵکەوتەی کوشتنی 37 هاوڵاتی بوو کە لە 1ی ئایار لەخۆپێشاندانی کرێکاران لەئەستەنبۆڵ لەئەنجامی پیلانگێڕی کوژران و لەهەمانکاتدا هەوڵی تیرۆرکردنی "بولند ئەجەوید" درا. ئەوکاتانە بوو کەتورکیا رووخساری قێزەونترین شەڕی ناوخۆیی پێوە دیاربوو. لەژێرئەم هەلومەرجانەدا بەخێرایی بەبڕیاری پارتیبوونی گروپ گەیشتین. وەك پێویستییەکی گرێدان بەبیرەوەری شەهید "حەقی قەرار" لەپاییزی هەمان ساڵدا لەشاری عەنتاب چوارچێوەی بەرنامەم ئامادەکرد. دووبارە گەڕامەوە ئەنقەرە، دواتریش لەگەڵ ئەو هاوسەرێتییە سەیرەی کەدەزانرێ لەسەرەتاکانی هاوینی 1978 دا لەدیاربەکر گیرسامەوە. ئەگەر ئەم مەسەلەیەی هاوسەرێتییە وەك شەڕێکی گەورەی هزری، سیاسی و هەست و سۆز هەڵسەنگێنرێ راستترە. لەبەرئەوەی کەسایەتی "کەسیرە" لایەنی عەلەوی، کوردو دەوڵەتی تێدا کۆببۆوە، سەبارەت بەو شەڕە هزرییەی تێیکەوتبووم تادواڕادە بزوێنەرو هاندەربوو. کاتێك هاتەریزی گروپەوە وەك ژن دەبووایە ڤەبوون ئەنجامبدات و سەرنجڕاکێش بێت. هەروەکو ئاوێکی مەنگ و قووڵ چەندە دەچێتە ناویەوە کاریگەری خنکێنەرانەی خۆی نیشاندەدات. دوو رێگا هەبوو دەتوانرا پەیڕەو بکرێت: یان دەبووایە بەتەواوەتی لێی دووربکەومەوە، یاخود مەترسییەکە لەوە دووربخرێتەوە کەبتخنکێنێ. دوورکەوتنەوە رێگایەکی هەرزان بوو، بەواتای دۆڕاندن دەهات. هەرچی داواکردنی هاوسەرێتی بوو لەلایەك لەپێناو بەختەوەری گروپ بوو، لەلایەکی دیکەشەوە ئەوەم بەراستبینی کەپێویستە لێکدانەوەو حیسابی راستەقینەی لەگەڵ من هەبێت. ئاشکرایە پەیوەندییەکی سیاسی، هزری و سۆزداری بوو. وەهابیرم دەکردەوە: سۆسیالیستێکی کوردبێت لەوە باشتر نابێ، ئەگەر وەك شیمانەیەکیش ئەرکداری دەوڵەت دەربکەوێت، ئەوا ژیری و توانست دیاری دەکات کامیان ئەوەیتر بەکاردێنێ. هەرچەندە سنووردارییش بێت لەم لایەنەوە بڕوام بەخۆم هەبوو. بەڵام غرورم ئەوەی پەسند نەدەکرد کەژنێکی بەڕواڵەت کورد بەم دۆخەی بەیەکێك لەئەندامانی دەوڵەت لەقەڵەمی بدەم. تەنانەت ئەگەر وەهاش بێت، دەتوانرا لەکەسایەتی ئەو ژنەدا تێکۆشان بەرامبەر بەدەوڵەت بکرێ. بەڵکو ئەم تێکۆشانە تەنیا لایەنەکانی بەرەو شەڕی قورس نەدەبرد، لەوانەیە بەرەو رێککەوتن و ئاشتیشی ببردبووایە. هەستی بەمجۆرەم هەبوو.

هەرچی بابەتی عەلەویگەرایییە، لەبەرئەوەی هێندە نەریتی سوننیگەرایییم بەجددی وەرنەدەگرت، وەك فاکتەرێکی دیکەی وروژاندن بینیم لەپەیوەندی بەستندا. وەها بیرمکردەوە: لەرێگای پەیوەندی دەتوانین هەردووکمان کۆمەك بە بەیەکەوەژیانی کوردە عەلەوی و سوننییەکان بکەین. لەبەرئەوەی بنەماڵەکەی لەیاخیبوونی دێرسیم لایەنگری کەمالیستەکانیان کردبوو، دواتریش جێگای خۆیان لەناو سۆسیال ـ دیموکراتێتی پارتی گەلی کۆماری (CHP)دا گرتبوو، لەلای من وەك دەرفەتێك بینرا. دەشیا سۆسیال ـ دیموکرات بۆ من ببێتە دەرگایەکی رێککەوتن و ئاشتی. بەڵام هەروەکو دواتر دەرکی پێدەکرێ، هەروەکو چۆن سۆسیال دیموکراتییەتی CHP بۆیاخێکی دەوڵەت بوو، چەپڕەوێتی و سۆسیال ـ دیموکراتێتی "کەسیرە"ش خاوەن هەمان کارەکتەربوو. لەئەنجامی شەڕە مەزنە دە ساڵییەکەی زهنییەت، رێککەوتن لەگەڵ کوردایەتی، عەلەویگەرایی و دەوڵەتگەرایی چەپڕەوی ئەم ژنە بەدینەهات. هەڵوێستی کوشتنم لەجێدا نەبینی کەرێکخستن هەیبوو. چەندە سەرسوڕهێنەرە هەروەکو لەمەسەلەی رفاندنە نامەردانەکەی دژی من ئەنجامدرا دیسان ئەویش بەیارمەتی دەزگای هەوالگری یۆنان رفێنرا. لەدوای ئەم رووداوە کەلەساڵی 1987 روویدا جارێکی دیکە بەدەرنەکەوتەوە.

هەندێ ساختەکار هەم لەناوەوەی رێکخستن هەم لەدەرەوە بەهۆی ئەم پەیوەندییەوە لەبڵاوکردنەوەی بووختانی گەورە، گومان و قسەو قسەلۆك دوودڵ نەبوون. لەراستیشدا ئەم شەڕەی زهنییەت لەوانەیە زەحمەتترین ساتەکانی ژیانم بووبێ کەپێویستی بەکۆششێکی نائاسایی و دەرەوەی توانای مرۆڤ هەبوو، شەڕی وڵاتپارێزی، ئازادی و ئەشق بوو کە لەوانەبوو بەرەو مرۆڤی کوردی ئازاد، بەتایبەتیش بەرەو شێوەگرتنی ژنی ئازادمان ببات.

ئەو پرسەی پێویستە پرسیار بکرێ: ئایا تا چ رادەیەك شەڕی زهنی راست و بەجێ دەبێت کاتێك لەمیانەی ئەنجامی بەمجۆرە سیاسەت و رووداوەکانی توندوتیژی بەیەکتربگەن. جێگای ئەمجۆرە پرسیارانە لەناو سروشتی سیاسەتی ستەمکاریدا نابێتەوە. ئاشکرایە نەخۆشییەکانی ئەمجۆرە سیاسەتە وردەوردە ئێمەشی دەگرتەوە.

دووەمین هەڵمەتی زهنی گەورە کەئەنجاممدا هەڵسەنگاندنێك بوو بەناوی "مانیفێستۆی شۆڕشی کوردستان". بەتایبەت ئەم هەڵسەنگاندنەم لەتەمموزی 1978 لەدیاربەکر بەدەستنووس نووسی. دەبێ ئاماژە بەوە بکەم کەئەم هەڵسەنگاندنەم لەناو هەلومەرجی شەڕی بەڵای "هاوسەرێتی" دا نووسی. دەگێڕنەوە، لەم قۆناخەدا "محەمەد خەیری دورموش و جەمیل بایق (هەڤاڵی دیکەش لەوانەیە کەمال پیر بێت)" جارێکیان هاتوونەتە ئەو ماڵەی تێیدا دەمامەوە. کاتێك رەوشی پەیوەندی نێوانمان دەبینن، دەکەونە ناو تووڕەییەکی مەزنەوە. دەڵێن " ئەم ژنە چۆن دەبێ وەها نزیکی رێبەرەکەمان ببێتەوە؟ وەرن بابیکوژین، مەسەلەکە بشارینەوەو نەهێڵین ئەم هەڤاڵەشمان پێی بزانێ". بەڵام هەڤاڵ کەمال پیر کەبەردەوام زانیویەتی گەورەیی خۆی بپارێزی، بەرامبەر ئەم رەوشە هەڵوێستێکی پێگەیشتووانە نیشاندەدات. گوتوویەتی "بەهەرحاڵ دیارە هەڤاڵ شتێك دەزانێ، بائێمە لێیبگەرێین". بەڵام کاتێك لەزیندانی دیاربەکر لەمانگرتن تامردن دایە، هەروەکو بڵێی وەسیەت دەکات دەڵێ" پێویستە سەبارەت بەم مەسەلەیە پارتی زۆر هەستیار بێت و لەبیر نەکات". مانیفێستۆ، مانیفێستۆی دامەزراندنی ئەو پارتەیە کەبیرمان لەراگەیاندنی دەکردەوە. ئەو رۆژنامەیەی بەناوی "سەرخۆبوون" بیر لەدەرخستنی دەکرایەوە، لەیەکەمین ژمارەیدا مانیفێستۆی تێدا بڵاودەکرێتەوە. کاتێك سەبارەت بەمانیفێستۆ بۆ دواوە بگەرێینەوەو تەماشابکەین دەتوانین وەك گوزارشتی گشتگیری کۆبوونەوەی 1973، فەرمانەکانی 1975 و ئاخافتنە نهێنییەکانی ساڵی 1977 هەڵسەنگێنرێ. ئاشکرایە کە لەمانیفێستۆی کۆمۆنیستی دەچێ. لەناوەڕۆکەکەیدا دیارە تایبەت بەگەلی کوردستان نییە، بەڵکو بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ موخاتەبەی تەواوی کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناوین دەکات. ناوەڕۆك و ئسلوبەکەی (شێوازەکەی) لەنەتەوەگەرێتی زیاتر، نزیکی ئازادی کۆمەڵایەتی (کۆمەڵگا)یە. هەروەکو چۆن نەتەوەگەراییەك پەسند نەدەکرا کەئازاد نەبێت، بیر لەئازادییەکیش نەدەکرایەوە کەدەنگی نەتەوەیی نەبێت. لەمیانەی ئەو خێراییەی لەمانیفێستۆ وەرگیرا هەنگاونان بەرەو پارتیبوون ژیانیی و دەستلێبەرنەدراو بوو. تەنیا کێشە تەکنیکی و وردەکارییەکانی دەرهەق بەناوو بەشداران، گرفتی هێندە جددی نەبوون.

بەهۆی تایبەتمەندێتییەکانی ئەو قۆناخەی تێیدا بووین ئاواکردنی پارت مەسەلەی ناموس بوو, ئەو تواناکاریانەمان نەبوو یەکسەر وەڵام بدەینەوە. بەڵام لەهەرهەنگاوێکدا دەبینرا بۆشاییەکی گەورەی رێزوشەرەف لە ئارادایە. هەروەك بڵێی هەمووشتێك دووچاری خیانەت هاتبوو. شاخ ـ دەشت، گوند ـ شار، مێژوو ـ هەنووکە، تاك ـ کۆمەڵگا، دەوڵەت ــ هاووڵاتی، ژن ـ پیاو، منداڵ ـ دایك و باوك، رێگا ـ رێبوار, بەکورتی هەموو دووالیزمێك بەشێوەیەکی کوێرو خیانەتکارانە تەماشای دەکرد. مسۆگەر دەبووایە شتێك ئەنجامبدرێ. دەکرێ پارتی واتا بەم دووڕیانانە ببەخشێ و بیانخاتە رێگای چارەسەرییەوە. ئەوەی دامەزرابوو بەواتای پارتێکی تەسك نەبوو, بەڵکو شێوازێکی نوێی ژیان بوو. وەرچەرخانی ناسنامە دەسەپێنرا. بەهیچ بیانووێکەوە نەدەتوانرا تائەو رادەیە ناکۆکبوون و نەگونجاوبوون لەگەڵ وڵات، مێژووو هاوچەرخبوون روونبکرێتەوە. راستی و لاوازییەکانمان هەرچییەك بێت، دەستێوەردانی ئەم رەوشە مەرج بوو. لەم دۆخەدا بەپارتیبوون وەك چالاکییەکی گیانبازی (خۆکوژی) بوو. بەڵام بەزانینەوە خۆکوژی تاك نییە، بەواتای کاردانەوە بەرامبەر ئەو ژیان و رەوشەی کۆمەڵگا تێیدایە، خۆکوژییەکە لەپێناو تاقیکردنەوەی شانسی ژیانی شەرفمەندانەیە ئەگەر بەقەد کونی دەرزیش دەرفەتی هەبێت؛ بەواتایەکی دیکە چالاکی رزگارکردنی ناموسە. بەپارتیبوونمان شێوەیەکی سەربەخۆو تایبەتی چالاکی ناموس بوو کەبەشێوەی جیاواز پراکتیزە دەکرا. من لەجیاتی ئەوەی خۆم فیدای ئەوچەمکە تەسکانەی ناموس بکەم کەلەمنداڵییەوە لێم رادەکرد، چالاکییەکی ناموس بژاری من بوو کەواتایەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی هەبوو. روونکردنەوەی بەرۆژهەڤکردنی ئەم چالاکییە

لەمیانـەی بەرژەوەنـدی چـینایەتی، نەتـەوەیی، ئـەتنیکی، ئـایین و بنەماڵەگـەرایی ئاسـتەمەو نابەجێیـە. فاکتـەری سـەرەکی ئـەوەبوو، کەچالاکی ئـەو مرۆڤانـەی نـاو کۆمـەڵگا (گـەل)بـوو کەبەهـەزارو یـەك زەحمەتییـەوە خۆیـان رۆشـنکردبوو، ئەمـەش روونکردنەوەی هەرە نزیك بەراستی بوو. لێکچواندنی بەئەنارشیتسە روسەکان (نارۆدنیکەکان)کە لەمێژوودا دەناسرێ زیـاتر دەرکی پێدەکرێت. کاتێك تەماشای کاریگەرییەکەی بکەین دەتـوانین بڵێین کـەرۆڵی شێوازی پـارتیبوونی بینیـوە. یـەکێك لـەو پێشکەوتنانەیە کەوەڵامی پێداویستییەکی گشتی و شەرەفمەندانەی داوەتەوە.

ئەوخەباتـە هزریانـەی لەسـەرەتاکانی 1980 ئەنجامەانـدا زیـاتر بـەلای چارەسـەرکردنی پەیوەنـدی نێـوان سیاسـەت و توندوتیژیدا بـوو. ئاخافتنـەکانی سـەبارەت بـەرۆڵی توندوتیـژی لەکوردسـتان، بـەرەی رزگـاری نیـشتمانی، پرسـی کەسـایەتی و رێکخستن زیـاتر تایبـەت بەچارەسـەرکردنی کێـشەوگرفتە بەرجەسـتەکان بـوو. کاریگـەری ئـەزموونی فەلەسـتین ــ ئیـسرائیلی رۆژهەڵاتی ناوین لەئارادابوو. خەبات و کۆششە فیکرییەکانی چەندین ساڵ بـەردەوام بـوو، تـەنیا تـوانی توێـژێکی سـنووورداری لاوان هۆشـیاربکاتەوە. هـەژانی گـشتی و قـووڵی کۆمـەڵگا گرێـدراوی ئـەو هـەنگاوە سیاسـی ـــ سـەربازییانەن کەکاریگـەری لەسەرهەموو کەسێك بکەن. لەمیانەی هاوێشتنی ئەم هەنگاوانەوە، پارتیبوونی راستەقینە دەیتوانی کامڵبوونی خۆی بسەلمێنێ. لەرەوشێکی پێچەوانەدا وەك ئەوەی لێدەهات کەبەنەخۆشییەکی منـداڵی بمرێـت. کاتێـك بـەرخودانی زینـدان لەگـەڵ خـەبات و کۆششەکانی رۆژهەڵاتی ناوین بوون بەیەك، ئەوا هەڵمەتی گەریلا ناچاری و دەستلێبەرنەدراو بوو. هیچ دژە شـالاوێکی ئـەرێنی لەئارادانـەبوو کۆسـپ بخاتـە پـێش ئەمـە. دەوڵـەت لـەناو دۆخێکـی نکـوڵێکردن و سـەرکوتکردنی سـەرتاپاگیری دابـوو. هـەردوو دیـاردەش لەپێگـەی یـەکتر نەناسـین و پەسـندنەکردندا بـوون. گـەڕان بـەدوای زەمینـەی رێککـەوتن لـەخۆڕابوو. هەڵوێـستە سەیرەکانی "کەسیرە"و"حوسێن یلدرم"ی پارێزەر کە لەم قۆناخەدا دەرکەوتبوو، دواتر ئێمەی بـەرەو ئـەو تێفکرینـە بـرد ئایـا دەشێ گرێـدراو بەدەوڵـەت بێـت. بـەڵام زەحمـەت بـوو سـەرەداوێك بدۆزرێتـەوە کەبـەم واتایـە بێـت. تەنانـەت نیـشاندانی ئـەم بوێرییە زەحمەت و قورستربوو. هەڵوێستەکانی دواتری "محەمەد شەنەر"و "سەلیم چروقایە"ش گومانی بەمجۆرەیان دەرهەق هەبوو. بەڵام ئەگەر هەڵوێستی خۆشیان بووبێت، ئەو هێزەی نەبوو سیخوڕییەکی هەرزانیش تێپـەڕ بکات. هەربۆیـە بـیر لـەوە نەدەکرایـەوە حیـسابێکی جـددییان بۆبکرێـت. هەڵـسەنگاندنی سـەبارەت بەهەڵمـەتی 15ی ئـابی 1984 ئەنجامـدرا دەرهـەق بەوەنـەبوو کەبۆچـی ئەنجامـدرا, بـەڵکو لـەبارەی نەخـشەو فراوانییەکـەی بـوو. بـەهیچ جۆرێـك هەڵوێـستێکی خوڵقکارانـەی سەربازی نیشاننەدرا. جگە لەگەریلا لەهەموو شتێك دەچوو. بەردەوام ئەم پرسیارە دووپاتکرایـەوە بۆچـی نـەتوانرا رێبـازێکی راستی گەریلایی پەیڕەوبکرێت. تەنانەت نزمترین ئاستەی پێویستییەکانی پارتیبوون لەناو گەریلادا نەبینراو رەنگی نەدایەوە. لەو بڕوایەدام دوو فاکتەر رۆڵی لەمەدابینی. یەکەمیان: هەر لەسەرەتاوە پێداگرییە گەورەکەی مـن لـەپێناو لەسـەرپێ راگـرتنی ئـەو کەسـایەتییە لاوازانـەی بـەباوەڕی و هۆشـیارییەکی بنـچینەییەوە تـەقلی شـەڕی هـزری و کۆشـشە کردارییـەکان نـەببوون. هەروەکو لەبزووتنەوە چەپەکانی تورکدا دەبینرا. بنکە دەیخواسـت لەمیانـەی قەڵـەمبازێکی بـاروت تەقانـدن ئـەنجامگیر بێـت. هەرچی ئێمەش بووین دەمانخواست خاوەن ژیانێکی شایستەو بەسەرکەوتنیان بگەیەنین. لەم ناوەدا هەنـدێك کەسـی خـۆجێیی (محلی)کە بەخێرایی ناویان دەرکرد، هەستیان بەبۆشایی ریزەکانی فەرمانـدەیی کـردو لەپڕکردنـەوەی درەنـگ نەکـەوتن. ئـەم مەیلـەی دواتـر وەك گروپـی "چوارچـەتە" یەکلادەبێتـەوە, نـەك تـەنیا پـارتیبوون, بـەڵکو بـچووکترین پێویـستییەکانی بەکۆمەڵگابوونیشیان نەدەناسی. لەوێل و چەتەکان خراپتر، ئـەم توخمانـە خراپـەکاری و تێکـدانی وەهایـان ئەنجامـدا تەنانـەت نـاقۆڵاترین سـیخوڕی ئـاژاوەگێڕیش بەئەنقەسـت نـاتوانن ئـەنجامی بـدەن. کاتێـك جۆرێـك لـەرێگری خـۆجێیی و کاریگەرییـە لاوازەکـانی پـارت رووبـەڕووی یەکتربوونـەوە. گۆڕانکارییـەك جێگـای بـاس بـوو کەسـەریهەڵدابوو, ئـەم رەوشـە تـاوەکو کۆتـایی قۆناخی پووچەڵکردنەوەی دووەمین هەڵمەتی پارتیبوون بەردەوام بوو.

لەکاتێکدا هێشتا لەقۆناخی زهنییەتدا لەلایەن "کەسیرە"و "شاهین دۆنماز"و هاوشێوەکانیان هەوڵی بێکاریگەرکردنی یەکەمین هەڵمەتی بەپارتیبوون دەدرا، دووەمین هەڵمەت لەلایەن چەتەگەرێتییەوە ڕۆحی دەکێشرا. هەر هەڵمەتێکی وەك تەگبیر بیری لێدەکرایەوە ڕووبەڕووی پێکهاتە کۆنکرێت بووەکەی چەتەکان دەبۆوەو دەتوایەوە. وەك ڕێبەرایەتی نەکەموکورتی ئێمە، نەپەلامارەکانی دەوڵەت و بەکرێگیراوەکان ڕێگایان لەپێش ئەوەنەکردەوە. کاتێك بڵێین پەینەبردن بەهێزی چەتەگەرێتی و نیشانەدانی هەڵوێستی بەکاریگەر هۆکاری سەرەکین، واقیعیترە. سەرکەوتن نەهی سەرۆکایەتی، نەهی دەوڵەت، هی چەتەگەرێتی بوو. هەڵبەتە ڕەوشی ئێستا کەجاشەکانی دەوڵەت و سەرۆك جاشەکان زۆربەیان لەتەسلیمکارەکانن بەشێوەیەکی باشتر ئەم دیاردەیە ڕووندەکاتەوە. بەڵام ئەم چەکەی دەوڵەت بەتەواوەتی پێیەوە نووسا هەروەکو کاریگەری بومەرانگ (چەکێکی تایبەت بە ئەبورژینەکانی تیرەکۆنەکانی ئوستralیایە، کاتێك ئامانج نەپێکی دژی خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە) خاوەن ئەو کاریگەریەش بوو کەبەدژی خۆیدا بچێتەوە. دواتر ئەمە دەبینرا. هەروەکو چۆن لەسەرەتای 1990 کان پشتگیریکردنی سەرۆك خێڵەکانی باشوور دواتر بەشێوەی دەوڵەتی فیدراڵ ڕووبەڕوویان بوویەوە، سەرۆك خێڵە بەکرێگیراوەکانی باکووریش لەسەربنەمای جاشایەتی و تەریقەتگەرایی ئیتر بەشێوەیەك لەپێکهاتەی سیاسی و سەربازی دەوڵەت بەجێبوون کەناتوانرێ ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵدا ئەنجام بدرێت.

لەبواری گەوهەرو ناوەڕۆکدا، لەم قۆناخەدا دەزگای سەرۆکایەتی بەزیادەوە ڕۆڵی خۆی بینی. بەئەندازەی گرفتەکانی ڕێبازی سەربازی، سیاسی و ئایدیۆلۆژی، ئەوا لەهەوڵەکانی پەروەردەی سەرەکی کادیران، پەیوەندییەکانی گەل، لۆجستیك و چەکدارکردن زیاترلەوەی چاوەڕوانی لێدەکرا ڕۆڵی خۆی بینیوە. لەوانەیە سەبارەت بەجێگیربوون مەسەلەی جێگۆڕکێ ڕەخنەبکرێت. بەڵام کاتێك ئەمەش لەگەڵ تواناکارییەکانی جولانەوە لەناو ئاسایشێکی درێژخایەندا بەراورد بکرێت، ڕەخنە هێزی خۆی لەدەستدەدات. سەرباری ئامادەکردنی ئەو هەموو تواناکاریانە، بەڵام ڕێبەرایەتی پراکتیکی ڕێباز (بزووتنەوە) نەلەبواری سیاسی نەسەربازی ڕۆڵی خۆی نەبینی، ئەمەش مەسەلەیەکە هەرە زێدە بەپێویستی تاوتوێکردن و هەڵوەستە هەیە. لەپێناو گەیشتن بەسەرکەوتن هەمووشتێکیان لەبەردەستدا بوو. لەچەك تاوەکو پارە، لەجێگرتن تاوەکو پەیوەندی دەرەوە، لەپەیوەندییەکانی گەل تاوەکو پەیوەندی دەوڵەتان، لەهەمووجۆرە پالێوراوێکی کادیرو جەنگاوەران، تاوەکو دەگاتە ژمارەیەکی زۆری کادیری پەروەردەکراو، تەواوی ئەم تواناکاریانە تەنیا بەدەستی بەڕێوەبەرایەتییەکی دروستی سەربازی، سیاسی و ڕێکخستنی شێوەی پێدابووایە، ئەوا ئاراستەی گۆڕانکاری و پێشکەوتنەکان زۆرجیاوازتر دەبوو. لەوانەیە دەسەڵاتی دەوڵەتێکی بەدەست نەدەهێنا. لەبنەڕەتدا ئەمە ئامانجێکە بەشێوەیەکی ئەوتۆ نەخشەی بۆنەکێشراوە. سەرباری ئەمەش بەسانایی دەتوانرا بەچارەسەرییەکی دیموکراتییانە بگەین. بەتایبەتیش بەبێ ئەوەی لایەنەکان هێندە زیانیان بەربکەوێت و دووچاری ئێش و ئازاربێن، دەتوانرا ئەم ئەنجامە بەدیبهێنرێ. چەتەگەرێتی ناودەوڵەت و ناو "PKK" هەروەها کۆمیتەی ناوەندی "PKK" بەرامبەر ئەنجامگیرنەبوونی بەرپرسیارە. چونکە خاوەن لەڕۆڵی خۆی دەرنەکەوت و بەرپرسیارێتی خۆی جێبەجێنەکرد، هەربۆیە ئەمانە فاکتەرە سەرەکییەکانی کۆسپنانەوە بوون. ئاشکرایە کە دەوڵەت و "PKK"ش هیچ یەکێکیان سەرنەکەوتن. زیانێکی زۆریان بەرکەوت. بەرامبەر ئەمەش بەدرێژایی مێژوو، چینی سەردەستی دەرەبەگایەتی کوردان کە لەبنەوەیەو بەکرێگیراو بووە بەباشی بەرژەوەندی خۆیان بەڕێوەبردووە.

ڕێبەرایەتی باوی خێڵایەتی باشووری کوردستان لەهەستیارترین ساتی شەڕی "PKK"بەرامبەر سوپای تورکیا، بەرامبەر هەندێك بەرژەوەندی تایبەت و گرنگ، بەبوێری هەنگاوی بۆ گەورەترین خیانەت هاوێشتووە. کاتێك لەگەڵ خیانەتەکانی ناوزیندان و زەمینەی شەڕ بەراورد بکرێ، دەبینرێ کەئەم خیانەتەی بەنهێنییەو نەخشەبۆکێشراوو تەڵەکەبازانەترە، زیاتر تورکیای هانداوە لەسیاسەتی چەتەکان بئاڵێ. وەك پێویستییەکی پێکهاتەکەیان لەکاتێکدا سیاسییەکان لەسەرەتاوە بۆ

ئەمەکراوەن، سوپاش بەهۆی ئەو زەحمەتییەی دووچاری هات، پەنابردنی بۆ ئەم سیاسەتە بووە سەرەتای ئەو ئەنجامانەی لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا لەئارادان ــ بەتایبەت لەباشووری کوردستان ــ. بێگومان بەڕێوەبەرایەتی تورکیا بەهیچ شێوەیەك چاوەڕوانی ئەم ئەنجامەی نەدەکرد، وەك پەیوەندییەکی تەکتیکی هەڵیدەسەنگاند؛ بەخۆی باوەڕبوو لەگەڵ پاکتاوکردنی "PKK" کۆتایی پێدێت. هەروەها لەرەهەندە راستەقینەکانی پلانی ئەمریکا سەبارەت بەئێراق بێئاگابوو. رێبەرایەتی بەکرێگیراوی کوردان لەئامانجەکانی خۆیان هۆشیارو بەپلانتربوون. بەشێوەیەکی وەستایانە ئەمەیان لەپەیوەندی خۆیان لەگەڵ "PKK" و کۆماری تورکیاش بەڕێوەدەبرد. ئەوەی بەشێوەیەکی رووکەشی و سادە هەڵسوکەوتی دەکرد، فەرماندەی مەیدانی "PKK" و کۆماری تورکیا بوون. هەڵسەنگاندنێکی فراوان و گشتگیری ئەم قۆناخە، چەندین راستی رووندەکاتەوەو ئاشکرای دەکات. بەتایبەتیش روونکردنەوەی پەیوەندی و ناکۆکی نێوان چەمکی کلاسیکی دەوڵەت و چەمکی چەتەگەرێتی دەوڵەتی کۆماری تورکیا بایەخێکی گەورەی هەیە. نەك تەنیا "PKK"، بەڵکو یەکێك لەو مەسەلە گرنگانەی پێویستە روونبکرێتەوە ئەوەیە، کامە سیاسەتمەدارو دەزگای ناو دەوڵەت خراپەکاری و تێکدانی مەزنی بەرامبەر هەبوونی دەوڵەت ئەنجامداوە. چۆن بەشێوەیەکی دابڕاو لەبنەما شۆڕشگێڕییەکانی کۆمار لەژێرناوی سەنتێزی تورك ـ ئیسلام بەرەو پێکهاتەیەکی دەوڵەت رۆیشت؛ ئایا رۆڵی شەڕی کوردستان، عەشیرەتگەری کوردان و سیستەمی جاشایەتی لەمەدا چییە؟ لەرێگای جاشایەتی و تەریقەتگەرایی دەوروبەرە ئایینییە دەرەبەگەکان رێگا لەپێش کامە گۆڕانکاری دژ بەکۆمار دەکاتەوە؟ ئایا بەرەو پێکهاتەیەکی فیدراڵی کوردان ناچێ؟.

بینینی کاریگەری و رۆڵی پێشکەوتنە نێودەوڵەتییەکان لەگەیشتن بەم رەوشەدا گرنگە. بەبێ هەبوونی ئەم پێشکەوتن و گۆڕانکاریانە ناتوانرێ تەنیا لەرێگای گۆڕانکارییەکانی بونیادی "PKK" و دەوڵەتی کۆماری تورکیا رەوش رۆشنبکرێتەوە. کاریگەری هەڵوەشانەوەی سۆڤییەت 1990 کان و جیهانگیری و سەرۆکایەتی کلینتۆن، هەم بەشێوەیەکی راستەوخۆ هەم ناراستەوخۆ کاریگەرییان لەسەر رۆژهەڵاتی ناوین، تورکیاو کوردستان بەرفراوان بووە. لەبەرئەوەی هەڵوەشانەوەی سۆڤییەت کاریگەری لەسەر ئاستی بڕیاری سوریاکرد، رێگای لەپێش دەرکەوتنی من کردەوە. پشتگیری دیپلۆماسی لاوازبووە, لەئەگەری پشتگیرییەکی گشتگیر بێبەش بووە. بەهۆی ئەو گۆڕانکارییە ناچارییەی جیهانگیری لەرۆژهەڵاتی ناویندا رێگای لەپێش دەکاتەوە، پێویستی باشتر بینینی پێش خۆمان دەسەپێنێ. لەدۆخێکی پێچەوانەدا لەچەندین وڵاتدا, لەسەرووی هەمووشیانەوە ئێراق, ناتوانرێ پێشتر گۆڕانکارییەکان پێشبینی بکرێ. لەرەوشێکی وەهادا دەکەونە ناو موحافەزەکاری چەمك و تیۆری کۆن و لەکاتی خۆیدا مەسەلەکان نابینرێ. جگە لەمەش دەبووایە هەست بەوەبکرێ کەلەگەڵ هاتنی "کلینتۆن" لەمیانەی تەکتیکی جیاوازەوە نزیکی ناوچەکە دەبێتەوە. ئەگەر بەقووڵایی دەرك بەسیاسەتەکانی ئەمریکا سەبارەت بەناوچەکە، تورکیاو کوردستان بکرابووایە، لەوانەیە نەکەوتباینایە ناو ئەو رەوشانەی کەدوای دەرکەوتنمان لەسوریا تێیکەوتین. رووکەشی و هەڵسەنگاندنە درەنگوەختەکان، رێگای لەپێش ئەوەکردەوە لەکاتی خۆیدا نەجوڵێینەوەو دەستپێشخەری لەدەست بدەین.

لەکاتی خۆیدا ئەنجامنەدانی گۆڕانکاری تیۆری ــ پارادیگماش کاریگەری خۆی لەکەوتنمان بۆناو ئەم رەوشە تکاکارییەی هەنووکەمان هەبوو. بەشێوەیەکی باش و بەگوێرەی پێویست رەوشی چەپ لەدواچارەگی سەدەی بیستەم و بزووتنەوە کەلتوورییەکان و فێمینیزم و کرانەوە ژینگەپارێزییەکان بەدواداچوونی بۆ نەکرا. هەروەها بەقووڵایی دەرك بەگرنگی تێکۆشانی مافەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگای مەدەنی نەکرا. پرۆگرام، رێکخستن، ستراتیژو تەکتیکەکانی "PKK" لەژێر کاریگەری قووڵی رێبازەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراوو رزگاری نیشتمانی دابوو. ئەو گۆڕانکاریانەی لەکۆنگرەکان ئەنجامدەدرا لەئاستی تەکتیکی بەولاتر تێپەڕی نەدەکرد. تیۆری و چەمکە سەرەکییەکانی سەبارەت بەجیهان گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتبوو. هەرچەندە شیتەڵکردنەکان قووڵدەکرایەوە, بەڵام نەبوونی پارادیگمای نوێ، دەرفەتی ئەنجامدانی گۆڕانکاری ریشەیی نەدەدا.

هێشتا بەشێوەی لاساییکردنەوەو قالبگەرایی نزیکی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان دەبوویەوە. زهنییەتی دۆگماییانە لەتێڕوانین سەبارەت بەکۆمەڵگاو سروشت بەکاریگەربوو. زهنییەتی چاخی ناوین تێپەڕکرابوو، بەڵام قالبگەرایی هزری سۆسیالیزمی بونیادنراو ڕێگای لەپێش تیۆرییەکی ئافرێنەر سەبارەت بەکۆمەڵگاو سروشت نەدەکردەوە. هەڵوێستی قالبگەرایی بینینی جیهانی دەوڵەمەندی دیاردەکان و، دەوڵەمەندێتی وەرچەرخان و گۆڕانکاری پەردەپۆش دەکرد. لەوەش گرنگتر قالبوونەوەی ئەوپەڕگەری سیاسی و سەربازی، کەسایەتی دەکرد بەتاکلایەنە. ڕەهەندو ئاستی پلەداری بەسەر پەیوەندییەکان دەسەپاند. نەخۆشی دەسەڵات هەروەکو نەخۆشییەکی بڵاوەبوو بەخێرایی تەشەنەی دەکرد. ئەوە خرابووە پلانی دووەم کەدیموکراسی وێستگەیەکی ناچاری یەکسانی و ئازادی کۆمەڵگایە کەلەپێناویدا شۆڕش ئەنجامدەدرێ. هەڵوێستی سیاسی ـ سەربازی بووە فاکتەری دیاریکەری تەواوی پەیوەندییەکان. ئەم ڕەفتارانەی لەزەمینەی سەربازیدا واتاداربوو، ڕەنگدانەوەی لەناوگەلدا نەخۆشییەکی سۆسیالیزمی بونیادنراو بوو.

تەنانەت گرنگیدان و پەیوەندیداربوون بەهەڵوێستی تیۆری نوێ و گۆڕانکاری چەمك لەئارادانەبوو. لەوانەیە ترس لەچەوتی بۆچوونەکان هەبووبێ. ڕاکردن لەئاکامەکانی هەبوو. تەنانەت وەك دەزانرێ هەڵوەشانەوەی سۆڤییەت سەرلەنوێ تاوتوێکردنی سۆسیالیزمی دەکرد بەناچارییەك. هەرچەندە پەیوەستبوون بەکێشەکانی ژینگەو ژنان زیاد بووبێت، بەڵام قووڵایی تیۆری پێویست سنووردار بوو. دەشیا هەڵوێستێکی واقیعیانەتر سەبارەت بەئەتنیك، مەیلەکانی چینایەتی تەسك و ئابووریخوازی بشکێنێ و بەرەو ڕێنمایی ڕاوەستەیەکی کۆمەڵگاری و دیموکراتییانە بچێت. هەرچەندە بەپێی کات دواتر هەڵوێستی هۆگرانەتر نیشاندرا، بەڵام ئەو قووڵاییەی نەبوو کەبەلاوەنانی بنبەستبوون فەراهەم بکات. لەراستیدا "PKK" بەپارادیگما (جیهانبینی)ی حەفتاکان بەرەو ساڵانی 2000 هاتبوو. هەرچەندە بەتەواوەتی پەرتەوازە نەببوو، بەڵام تاڕادەیەکی مەزن ئەرك و کاریگەری خۆی لەدەستدابوو.

لەهیچ گۆڕانکارییەکی دیاردەکاندا هەمووشتێك بەنەرێنی(نێگەتیڤی) هەڵناسەنگێنرێت. مێژووی "PKK" لەهەمانکاتدا مێژووی کوردو کوردستان، مێژووی گۆڕانکاری و وەرچەرخانی مەزنی بونیادە کۆمەڵایەتییەکەیەتی. دەتوانرێ بگووترێ دواچارەگی سەدەی بیستەم لەکوردستان مۆرکی "PKK"ی پێوەیە. ئەو وەرچەرخانە زهنی و سەراوبنبوونە کۆمەڵایەتی و سیاسییانەی لەگەڵ خۆی هێنا بووە بەموڵکی مێژوو.

سەرباری هەموو تێکدان و خراپەکارییە گەورەکان تاڕادەیەکی گرنگ و مەزن درێژە بەهەبوونی خۆی دەدات. لەناوەوەو دەرەوەی وڵات، لەتەواوی پارچەکانی کوردستان زەمینەی توانست، تواناکاری لۆجستیکی، کادیران و چەندین گروپ و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ئامادەن بۆ ئاواکردنی هەمووجۆرە ڕێکخستنێك. ئاستی سیاسی گەل تابڵێی بەرزبۆتەوە. جەماوەری "PKK" لەسەرتاسەری کوردستاندا لەدۆخی پێشەنگی دایە. هەروەها لەدەرەوەی وڵات و مەترۆپۆڵەکانی دراوسێکاندا بەملیۆنان جەماوەری لایەنگرو هەوادار هەن. هۆشیاربوونەوەو ڕێکخستنێکی گەورەی ژنان لەئارادایە. هەروەکو بڵێی جیهانێکی نوێ لەدەوروبەری ژن لەدایك دەبێت. فاکتەرە ڕاستەقینەو ڕەسەنەکانی هەڵوێستی تیۆری و چەمکی نوێ بەئازادی ژندا تێپەڕدەبێت. لاوان لەرەوشێکی هاوشێوەدان. لاوان کەهیچی لەپەیوەستبوون و گەرمایی خۆی لەدەستنەداوە، شوێنکەوتەیەکی بەبڕیاری نموونەیی کۆمەڵگای ئازادە. دروشمی"یان ژیانی ئازاد، یاخود هیچ "بووە بەو ئاڵایەی دەستی لاوان کەهەرگیز دەستی لێبەرنادەن. بەپارتیبوون گشتی بەفیڕۆنەچووە. لەمیانەی ئەزموونە مەزن و زەبەلاحەکەی، هەزاران کادیر، بەدەیان هەزار لایەنگرو جەماوەرە سەدان هەزارییەکەی لەژێرسایەی ئەو شێوەو ناوەڕۆکەی گونجاوی دەبینێ زۆر بەسانایی دەتوانێ سەرلەنوێ خۆی بونیادبنێتەوە. سەرباری چەمکەکانی چەتەگەرێتی و ئەو زیانە نابەجێیانەی شایستەی خۆی نەبوو، لەناوەندی کوردستان و تەواوی ناوچە ستراتیژییەکانی جێگیربوون بەهەزاران کەسەوە گەریلا درێژە بەهەبوونی خۆی دەدات.

لەکاتیکدا خۆی لەنەخۆشییە قورسەکانی رابردوو پاکدەکاتەوە، ئەوا لەرێگای ئەو ئەزموونە گەورەیەی بەدەستیهێناوەو لەژێرسایەی بەرنامەیەکی سیاسی واقیعیانە، لەهەموو کاتێك زیاتر بۆ سەرکەوتن ئامادەیە. سەرباری تەواوی گەمارۆکانی لەچواردەوری ئەنجامدراوە,"PKK" لەگشت گۆشەو لایەکانی جیهان پێگەو پەیوەندی دۆستانە دەپارێزێ و درێژە بەبەرەو پێشەوەچوونیان دەدات. بەهەزاران شەهیدی قارەمان چاوەڕوانی ئەو هەڤاڵانە دەکەن کەبەشێوەیەکی راست لەبواری هزری و کرداری نوێنەرایەتییان بکەن.

بەکورتی هیچ کاتێك لەو هەوڵ و کۆششانە پەشیمان نابینەوە کەبەناوی ئازادی دراوە. تەنیا زیانە نابەجێکان، پێداگرییە کوێرانەکان و جێبەجێنەکردنی ئەرکەکان لەکاتی خۆیدا جێگای ئێش و خەم و پەژارەیە. هەرچی ئێش و ئازارەکانن, بەردەوام بۆئەو کەسانەی نرخ و بەهاکەی دەزانن دەبێتە باشترین مامۆستا. ئەمجارە بەئارەقەی نێوچاوان وانەکانی چاکە و راستی و جوانی بەباشترین شێوە لەمامۆستا چاکەکەی فێر دەبوو.

ب ـ رەخنەو رەخنەدان بەناوی "PKK"

لەمێژوودا پێخەمبەرو داناکان گوتوویانە گەورەترین شەڕ ئەوەیە کە مرۆڤەکان بەرامبەر نەفسی خۆیان ئەنجامی دەدەن. دەگێڕنەوە کە"کالانۆس"ی بلیمەت بەرەزامەندی خۆی لەهیندستانەوە هاتۆتە سەردانی ئەسکەندەر، کاتێك بەر لەمەراسیمی ئاهەنگ خواستوویەتی خۆی بسوتێنێ، کەئەسکەندەر بینیویەتی پێداگری لەسەر جێبەجێکردنی چالاکییەکەی دەکات گوتوویەتی" ئەو بەسەر رکابەرانی لەمن گەورەتردا سەرکەوتووە". هەروەکو دەزانرێ ئەسکەندەر گەورەترین جەنگاوەری مێژوو بووە. تەنانەت ئەویش دەزانێ جەنگاوەرێتی زانست (دانایی) لەجەنگاوەرێتی خۆی واتادارترە. کاتێك حەزرەتی محەمەدیش شەڕی نێوان سوپاکان بە " شەڕی بچووك ــ الجهاد الصغری " بەناو دەکات، ئەوا بەناوکردنی شەڕی نەفسی مرۆڤ"واتە شەڕی هزری بە" شەڕی مەزن ـ الجهاد الاکبر"بەهەمان واتادێت. لەراستیدا رەخنەدانێکی بەبنەماو وەرچەرخێنەر بۆتاك بەواتای گەورەترین شەڕ دێت. رەخنەدان ئەو شەڕەیە کەمرۆڤ بەرامبەر لاوازی، کەموکورتی و هەڵەکانی خۆی ئەنجامی دەدات. لەمیانەی گوزارەی زانستیانەتر، شەڕی ژیری ئەنالیتیکە بۆ بەلاوەنانی هەڵەکانی و شوێنپەنجە ئارەزوومەندییەکانی ژیری سۆزداری و گرێدانێتی بەوپێگە راستەی کەژیری ئەنالیتیکی دەستنیشانی کردووە. بێگومان ئەمەیە ئەو رووداوەی بەگەشەسەندنی مێشك بەناوی دەکەین. لەبنەڕەتدا جیاوازی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ سەرچاوەی خۆی لەشێوازی پەرەسەندنی بلیمەتی ژیری ئەنالیتیك وەردەگرێت.

بێگومان ناتوانین ناسنامەی کورد زۆر جیاوازتر لەکۆمەڵەی گشت مرۆڤەکان هەڵبسەنگێنین. پێناسەی گشتی سەردەمەکان (چاخەکان) بۆ ناسنامەی هەموو گروپە کۆمەڵایەتییەکان هاوشێوەیە. کاتێك جیاوازی تایبەتبوون (رەسەنێتی) دەخرێتەڕوو، ئەوانەی دیکە تاڕادەیەکی مەزن لێکدەچن. رەسەنێتی و تایبەتبوونی ناسنامەی کورد لەمیانەی شێوەگرتنی کۆمەڵایەتی و مێژوویی دیاری دەکرێت. بەشێکی گەورەی بەرگرینامەمان بۆ پێناسەکردنی ئەم رەسەنێتی و تایبەتبوونە پێناسەکرد. شێوەگرتن لەژێر کاریگەری سەرکوتکردنێکی زێدەڕۆیی هێزەکانی ستەمکاری، تاڕادەیەکی مەزن ئازادی و تایبەتبوونیان ناکام کردووە. لەمارژینالبوون زیاتر، وەك جۆری کۆمەڵگایەکی ناکام و پەتاداری لێکراوە. لەمیانەی شیکارەکانی کەسایەتی هەوڵی دەستنیشانکردنی ئەم تایبەتمەندێتییە پەتادارانەمان دا. بۆ بەلاوەنانی ئەمە تەگبیری کرداری گەورەمان پێشخست. بەپێچەوانەی مەزندەکان, لەبنەڕەتدا "PKK" گوزارشت لەئاساییبوونەوە بەرەو مرۆڤی هاوچەرخ دەکات ــ کورد بگات بەدۆخی مرۆڤی هاوچەرخ ـ. دەشێ گفتوگۆ بکرێ تاچ رادەیەك سەرکەوتووە یان نا. بەڵام ناتوانرێ نکوڵی لەوەبکرێ کەیەکێك لەواتا کۆمەڵایەتییەکانی ئەم ناوەڕۆکەی هەیە.

ئەگەر لەکەسایەتی "PKK"دا وەرچەرخان زۆر بەئێش و ئازاربێت، هۆکارە سەرەکییەکەی ئەو زەمینە کۆمەڵایەتییەیە کەدەخوازێ پشتی پێببەستێ. ئەگەر بونیادنانەوەی رێکخستن تایبەتمەندێتی دیموکراتییانە لەخۆوە بگرێ، ئەوا چاوەڕواندەکرێ چەندین کاریگەری زەمینەی کۆمەڵایەتی (کۆمەڵگا) بۆناو رێکخستن دزەبکات، کاریگەری لەتاکە تازە بونیادنراوەکە بکات و بیخاتە رەوشی بەردەوامی و پاشکۆی خۆی. لەرەوشێکی وەهادا یان هیچ کاریگەرییەکی لەسەر تایبەتمەندێتییەکانی کۆمەڵگانابێت، بەبێ خەمی دەمێنێتەوە، ئەوکاتە لاتەریکی و گۆشەگیری رێکخستن بەرامبەر بەکۆمەڵگا دەبێتەناچاری؛ یاخود پێکهاتەی رێکخستن بەتەواوەتی دەبێتە رەنگدانەوەی پاشکۆکانی کۆمەڵگا، وەك ئەوی لێدێت؛ لەدۆخێکی وەهادا رێکخستن نەخۆش و دەردەداردەبێ یاخود هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئەو کۆمەڵگایە نامێنێ کەنیازی گۆڕینی لەئارادایە. ئەو پێگەیەی هاوسەنگەو ئارەزوو دەکرێ ئەوەیە؛ لەمیانەی کاریگەرییە شۆڕشگێڕی ــ گۆڕاوی رێکخستن کاریگەرییەکانی لەزەمینەی کۆمەڵگاوە هاتوون بکرێ بەکۆتێز و بەرەو پێکهاتەیەکی بالاتر ببرێت. لەم چوارچێوەیەدا گەشەکردنی دیالەکتیکییانەی نێوان رێکخستنی شۆڕشگێڕی و ئەو کۆمەڵگایە بەدیدێت کەداخوازی گۆڕینی لەئارادایە.

هزری رەخنەکردن پەیوەندی بەئەرك و چالاکبوونی دیالەکتیکی پێشکەوتن هەیە. شێوازی کاری دیالەکتیکی نابەجێ ئاشکرا دەکات و تێپەڕکردنیان بەئامانج دەکات. لەماجەرای گەشەکردندا لێشاوی گونجاو بەسروشتی مەحاڵبوون بەبناخە دەگرێت. هەرچی هزری رەخنەدانە گوزارشت لەو هزرە دەکات کەسەبارەت بەو قۆناخ، بوویەرو رەوشانەیە کەبەرەو ئامانج ناچێ، لەگەڵ ئەنجامدانی چۆنییەتی و خەسڵەتەکانی ناگونجێ و بکەری مەسەلەکە تێیدەکەوێ. واتە گوزارشت لەکۆتاییهێنان بەو هزر، خەیاڵ، هەڵوێست و کردارە سەرنەکەوتووانە دەکات کەلەگەڵ گەشەکردنی دیالەکتیکییانە ناگونجێ، هەروەها بەهزرو کرداری راستت دەبەستێتەوە.

ئاستەمە بگووترێ "PKK" فۆرمی هاوچەرخبوونی بەدەستهێناوەو بەتەواوی لەم بوارەدا سەرکەوتنی بەدەستهێناوە. بەپێچەوانەوە لەو هەڵسەنگاندنانەی ئەنجامیش دراوە دەبینرێ کەتەنیا بەنیشاندانی کەموکورتی و هەڵەی گرنگ نەوەستاوە، لەناوەوەو دەرەوەش دووچاری خیانەتی گەورە هاتووە. هەربۆیە بەردەوام هزری رەخنەو رەخنەدان بەشێوەیەکی گشتگیر بەکاردێنێ. ئەگەر رەخنە ــ رەخنەدان پەیرەوکرابێ، بەڵام لەپراکتیکدا ئەنجامی چاوەڕوانکراو دەرنەکەوتوون کەواتە لەراستیدا ئەو شەڕە ئەنجامنەدراوە کەداناکان بە"شەڕی نەفس" بەناویان کردووە. دیسان هەروەکو داناکان گوتوویانە بەناوی "رزگارکردنی رواڵەت ـ ظاهر" بەزانین بێت یان بەنەزانین، پەنای بردۆتە بەر رێگای خەڵەتاندنی خۆی و دەوروبەر. ئەمەش بکەرەکە دەخاتە رەوشێکی سەخت و ئاستەمترەوە. دەیخاتە رەوشی تاوانباری و دووڕوویی و تەڵەکەبازییەوە. لەدۆخێکی وەهادا لەجیاتی رەخنە ــ رەخنەدان پێویستە پەنا بۆسزای قورستر ببرێ. ئەم سزایانەش چەندین شێوەی لەجۆری دانپێدانان، تەشهیرو گۆشەگیری، دەستگیرکردن، ئەنجامدانی کاری پراکتیکی جیاواز دەگرێتەوە. تاوەکو بەئامانج دەگەی درێژە بەهەڵوێستەکانی راستکردنەوە دەدرێ. ئەگەررێکخستن ئەمە ئەنجام نەدات کەواتە لەگەڵ گەوهەری خۆی ناکۆکە؛ کەواتە بێڕێزی بەرامبەر بەئامانج و پراکتیکی خۆی کردووە. زیاتر بەرەو پێشەوە بچێت بەکەوتنە ناوخیانەت لەقەڵەم دەدرێت. هەرچی رەوشی خیانەتە، خراپترین و مەترسیدارترین دۆخە کەکەسێك بەرامبەر ئەو کۆمەڵگاو رێکخستنە تێیدەکەوێ کەئەندامێتی. ئەگەر سووربوون لەسەرخیانەت بەڕاکردن ئەنجامگیر نەبووبێت بەواتای شەڕێکی ئاشکرادێت، کەئەمەش لەبواری جەستەیی یان فیکری بەواتای مردن یان کوشتن دێت.

کاتێك بەمجۆرە راستینەی رەخنە ـ رەخنەدان پێناسەبکەین و لەسەر "PKK"ی پەیڕەو بکەین ئەوا دەشێ بەهەندێك ئەنجام بگەین کەگرنگی مێژوویی هەیە. پێشوەخت پێویستە ئەمەشی بخەینە سەر کەئەو کەس و رێکخستنانەی بوێری ئەنجامدانی رەخنە و رەخنەدانێکی بەپرەنسیپانە نیشاندەدەن، ئەوا بەواتای لاوازی نایێت، بەڵکو گوزارشت لەبەهێزی پێگەو

شوێنگه دەکات. تەنیا ئەو ڕێکخستن و کەسانەی لاوازن، باوەڕییان بەخۆیان نییە و لەرەخنە ــ رەخنەدان رادەکەن. بۆئەوانە رەخنەدان بەواتای رووخان دێت. هەرچی رەخنەدانە لەناوچوونە. بەپێچەوانەوە ئەوانەی بڕوایان بەخۆیانە رەخنە ــ رەخنەدان بەواتای سەرکەوتنی زیاتردێت لەئاراستەگرتن بەرەو ئامانج. بەواتای بەلاوەنانی کۆسپەکان و لەمیانەی هەنگاوی مسۆگەرو بەهێزەوە گەیشتنە بەئامانج. لەو رەخنە ـ رەخنەدانەی بەناوی "PKK"ئەنجامی دەدەم هێندە باسی ئەو بابەتانە ناکەم کەزۆرجار باسم کردووە، یان باسکراوەو لاوەکییە، کەپێویست نەبێ باسیان ناکەم. قورسایی دەخەمەسەر هەندێك بابەت کەبەتێڕوانینی من لەڕوونکردنەوەی هەندێ بابەتی سەرەکی رۆڵی یەکلاکەرەوەی دەبێت؛

1. سەرەتا پێویستە لەچەمك و بیرۆکەی پارتی دەستپێبکەین. پارتە هاوچەرخەکان زیاتر سەرچاوەی خۆیان لەکۆمەڵگای سەرمایەداری وەردەگرن کە لەسەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم گەشەیان کرد. پشت بەتوێژە چینایەتی و کۆمەڵایەتییەکانی دەبەستێ. لەسەرەتادا وەك چینی سەرەکی دووالیزمی بۆرژوا ـ کارکەر بەبنەما دەگرێ. لەمیانەی جەماوەریش باس لەپارتی "وردەبۆرژوا" دەکرێ کەوەك چینی ناوینە. بۆتەواوی ئەم پارتانە گەیشتن بەدەوڵەت ئامانجی سەرەکییە. لەمیانەی پێڕەوی شۆڕشگێڕانە بێت یاخود هەڵبژاردن، لەهەر پارتێکدا گەیشتن بەپێگەو پایەکانی دەوڵەت، بەواتای سەرکەوتن دێت. ئینجا ئەمە دەوڵەتێکی بونیادنراو بێت، یاخود بەئامانجی دامەزراندنی بێت، بۆهەمووشیان لەجێگای خۆیدایە. بەدەوڵەتبوون, بەواتای گەیشتن بەشکۆمەندی و بەدەستهێنانی بەرەکەت و زەوتکردنی داینەمۆی پێشکەوتن دەهات. هەروەها ئەم پێناسە بەبێ هیچ جیاوازی بۆ تەواوی چینەکان لەجێگای خۆیدایە.

دەشێ بگووترێ لەئامانجی دامەزراندنی "PKK"دا مەیلی بەدەوڵەتبوون بوونی هەبوو. ئەگەر بەشێوەیەکی ئاشکراش نەبێت، ئەمە گریمان و شیمانەیەکی سەرەکی بوو، تەواوی ئومێدی ئەوەبوو یان بەوەدەوڵەتە بگات کە لەئارادایە، یاخود بەگوێرەی خۆی دەوڵەتێکی نوێ ئاوا بکات. تەواوی رەهەندەکانی تێکۆشان و چالاکییە ئایدیۆلۆژی، سیاسی، سەربازی، ڕێکخستنی و پڕوپاگەندەییەکانی لەدوا شرۆڤەدا ئامانجی دەوڵەتەو لەپێناویدا پەیڕەودەکرێت. هەرچەندە لەبواری تیۆریدا باس لەئامانجی کۆمەڵگایەکی کۆمۆنیستی بێ چین و بێ چەوسانەوە بکات، وەك ئەگەرێکی پێشوەخت پەسندکراوە تاوەکو بەرلەگەیشتن بەم ئامانجە بۆماوەیەکی درێژخایەن ئەو دەوڵەتە نەبێت کە بە"دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا" بەناو دەکرێت, ئەوا گەیشتن پێی مەحاڵە. لەدۆخێکی وەهادا بەئەندازەی تەواوی پارتەکانی سەدەی بیستەم ئامانجی دەوڵەت لەسەرووی ئەو فاکتەرانەوە دێت کە"PKK"شی بەستۆتەوە. هێندەی تەواوی پارتەکانی دیکە ئەمە بابەتێکە ناتوانرێ نکوڵی لێبکرێت کە"PKK" پەیوەندی بەبابەتی دەوڵەت و ئاواکردنی هەبووە، ئیرادەی نوێنەرایەتیکردنی دەوڵەتی لەخۆوەگرتووە. دەتوانرێ گفتوگۆ لەسەرئەوە بکرێ تاچ رادەیەك لەپێناو گەیشتن بەم ئامانجە بەشێوەیەکی هۆشیارو کارامە تێکۆشانی کرد. دەتوانرێ ئەوە هەڵسەنگێنرێ پێیگەیشت یان پێی ناگات. هەروەها دەتوانرێ شرۆڤە لەم بارەیەشەوە بکرێ ئاخۆ لەدوالیزمی دەوڵەتی بۆرژوا ـ پرۆلیتاریادا لەکامەیان نزیکتر بووە. بەڵام ئەگەر بڵێین "PKK" هیچ نیازێکی چڕبوونەوەی سەبارەت بەمەسەلەی دەوڵەت نەبوو، واقیعی نابێت. دیسان لەو دەوڵەتبوونەی مەبەستی بووە مارکەو نیشانەکەی کورد یاخود نەتەوەیەکی دیکە بووبێت هیچ لەگەوهەری مەسەلەکە ناگۆڕێ. ئەوەی گرنگە بەدەوڵەتبوونی بەبنەماگرتووە یاخود نا. بەگوێرەی ئەوەی بەبنەماگرتنی شیمانەی هەرە لەپێشە، ئەوا شتێکی سروشتییە کەشێوازی کەسایەتی، ڕێکخستن و کاری بەدەوڵەتبوون مۆرکی خۆی لەتەواوی پراکتیك و ئامانجەکانی دیکەی دەدات. هەروەکو چۆن ناوەندی سەرەکی پەیوەندی تیۆری سیاسەت و دەوڵەت دەبێ، ئەوا بابەتی سەرەکی ستراتیژی و تەکتیکیش دەبێتە دەستبەسەرداگرتنی دەوڵەت، لەم پێناوەشدا پێگەگرتنی کورتخایەن یان درێژخایەنی چینایەتی، هەڵبژاردنی هاوپەیمانی و دۆست و شێوەکانی ڕێکخستن و چالاکییەکانی دیاری دەکات. تەواوی خەباتەکانی رۆژانە گرێدراو بەو بناخە تیۆری، ستراتیژی و تەکتیکیانە ئەنجامدەدرێت.

ئەنجامدانی تەواوی خەبات و تێکۆشانەکان بەرە ـ پارتی سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم لەسەرئەم ئاراستەیە ئەم گریمان و شیمانەیەمان پشتڕاست دەکاتەوە. سەرەکیترین پرسیار ئەوەیە، بەم شێوازەی پارتیبوون بەئامانجەکانی گەیشتووە یان نا. بەگوێرەی ئەوەی تەواوی پارتەکانی بەناوی چین و نەتەوەی جیاواز ئاواکران، بەدەوڵەتبوون گەیشتن و بەپێی پێویستیش دەسەڵاتیان بەدەستبوو، ناتوانرێ بگووترێ بەئامانجی خۆیان گەیشتوون. بۆئەوەی ئەم راستییە دەستنیشان بکرێت هێندە پێویستی بەنیشاندانی بەڵگەنییە. ئاشکرایە کەهەردوو سەدەی 19 و 20 ئەو سەدانەن کەهەرەزێدە شەڕ، بێدادی، ستەمکاری و رووخانی تێداڕوودا. بۆمبای ئەتۆمی لەسەرملی مرۆڤ دانراوەو سەپێنراوە. هەمووجۆرێکی سەرکوتکردن و کوشتار، توانەوەو وەك خۆلێکردن (ئاسیمیلاسیۆن) تاقیکراوەتەوە. لەئەنجامدا لەسەرەتاکانی 2000دا شارستانییەتێك بەردەوام بووە کەکۆمەڵگاکەی رەگەزگەراییە، پیسبوونی ژینگە ترسناکە، کەلێنی نێوان دەوڵەمەند ــ هەژار لەئارادایە، لەئازادی بێبەشەو یەکسان نییە. بەلانی کەم پارتەکانی پرۆلیتاریا کەبەئامانجی گەورە دامەزرێنران هێندەی پارتە بەناو بۆرژوازیەکان بەرامبەر ئەم ئەنجامە بەرپرسیارن. هەروەکو دەزانرێ ئەزموونەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو ئەنجامی زۆر دواکەوتووتری لەوەی ئەزموونی بۆرژوای کلاسیك هێنائاراوە. شتێکی سروشتییە کەپارتە کۆمۆنیستییەکان (پارتی پێشەنگ) بەرامبەر ئەمە بەرپرسیارن.

لەبارودۆخێکی وەهادا پارتیبوونێك کەخۆی وەك ئیرادەیەکی چڕبۆوەی تەوەرەی دەوڵەت ببینێ, لەگەڵ ئەوخەسڵەتانەی ئازادی و یەکسانی پێچەوانەیە کە لەسۆسیالیزمدا چڕدەبێتەوە، ئەویش بانگەشەی بۆ دەکات؛ لەگەڵیدا ناکۆکە. ئەو پارتیانەی بەدەوڵەتبوونیان کردۆتە ئامانج چاوەڕوانی ئەوەیان لێناکرێت بەبانگەشەکانی ئازادی و یەکسانی بگەن و پەیڕەوی بکەن. بەپێچەوانەوە کردەوەو پراکتیکەکان ئەوەیان سەلماندووە کەنێوانیان لەگەڵدا زیاتر دەکرێتەوە. ئامرازی شیکردنەوەی ئەم ناکۆکییە، دەستبەردانە لەو ئیرادەیەی ئامانجی دەوڵەتبوون لەخۆوە دەگرێت. واتە گەیشتن بەپێناسەی دەوڵەت = نەبوونی ئازادی، دەوڵەت = نەبوونی یەکسانی و بەشێوەیەکی ریشەیی دەستبەردانە لەو پارتەی خۆی بەمەسەلەی دەوڵەت (دەوڵەتبوون) کلیل کردووە. بینینی پارتیبوونێك بەناوی دەوڵەت یاخود پارتی ئاواکردن لەپێناو بوون بەخاوەنی دەوڵەت، بینینی وەك هەڵەیەکی بنچینەیی و لەمیانەی رەخنەدانێکی راستگۆیانە دەستبەردان لەمجۆرە پارتیبوونانە راستترین هەڵوێستە. هەم خەیاڵی بەدەوڵەتبوون هەم یەکسانی و ئازادی بەیەکەوە نابێت. پێویستە یەکێکیان ئەویتریان بەلاوە بنێت. بالێی وردبینەوە: باس لەرووخان و سەراوبنکردن ناکەم. چەمکی بەلاوەنان گرێدانی بەبیرۆکەی"کوژانەوەی (کزبوونی) دەوڵەت، هەیە کەلەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم "ئەنگلس" سەرنجی بۆ راکێشابوو. بۆ سۆسیالیزم دەوڵەت وەك تۆپە ئاگرینەکە پێویستە وردەوردە بکوژێتەوە. من ئەوەم بەتیۆری " تۆپی بەفرین و، تۆپی ئاگرین" بەناو کردبوو. ئەم تۆپە بەفرینەی بەهەزاران ساڵە گلۆر دەبێتەوەو هەرەس ئاسا گەورەبووە, نەك وەك سۆسیالیزم ئازادی و یەکسانی لەگەڵ خۆیدا ناهێنێ، بەڵکو کاتێك بیخەنە ژێرکێفی خۆیانەوە ئەوا پێشخستنی فشارو بێدادی جێگای باس دەبێت. لەبەرئەوەی دەوڵەت کۆنترین نەریتی کۆمەڵگای چینایەتی و پلەدارییە نابێ وەك ئامرازێکی بەدەستهێنانی ئازادی و یەکسانی هەڵبژێردرێ.

بژاری دەوڵەت لەپێناو گەیشتن بەئازادی و یەکسانی گەورەترین هەڵەیە. کاتێك بۆناو قووڵاییەکانی مێژوو شۆڕبببینەوە نموونە گەورەکانی ئەم هەڵانە دەبینین. تەنانەت ئایینی مەسیحی کە سێسەد ساڵ بەرامبەر بە ئیمپراتۆریەتی رۆما جەنگا, دوای ئەوەی بەدەوڵەتبوونی خۆی ئەنجامدا لەوە دوورکەوتەوە کەخەیاڵی ئازادی و یەکسانی هەژاران بێت. خۆی بووە بەئیمپراتۆریای کۆمەڵگایەکی چینایەتی. پێگەی دیموکراتی و کۆمەڵکاری هێزە گەورەکان دوای ئەوەی گەلەکانیان کردووە بەخاوەن دەوڵەت بەخێرایی لەپایەی ئازادی و یەکسانی دوورکەوتوونەتەوە. کۆمەڵە رەوەندە گەورەکانی وەك جەرمەن، عەرەب و تورك دوای ئەوەی چینی باڵایان بەدەوڵەت بوو وردەوردە بونیادە دیموکرات و کۆمەڵکاریەکەی جارانیان لەدەستدا.

مێژوو پڕە لەمجۆرو شێوازانەی لەدەستدانی ئازادی و یەکسانی. ئەو وەڵامەی دەیدەینەوە پرسیاری: ئەگەر دۆخێکەو راستینەکە وەهایە بۆچی بژاری دەوڵەت باڵادەبێ، پەیوەندی بەناوەڕۆکی دەسەڵاتەوە هەیە.

2.کەواتە پێویستە دەسەڵات شیبکەینەوە، دەسەڵات چییە؟ دەسەڵات دۆخی ئەو دەوڵەتەیە کە کەوتۆتە رەوشی کرداری و جێبەجێکردنەوە. دەوڵەتی قۆناخە, پڕکردنەوەی ناوەوەی دەوڵەتە بەچین و توێژەکان، چینەباڵاکانی ئەتنیك، ئایین، قەومی قۆناخ. زاڵبوونی توێژە رێکخراوەکانی گروپە نەتەوەیی، مەزهەبی، خانەدان و چینی نوێیە لەسەر دەزگاکانی. دەستنیشانکردنی پەیوەندی، رێکخستن و چالاکی ئەم توێژانە وەك هێزی ستەمکاری و چەوسانەوە بەواتای دەوڵەت دێت. هەروەکو ئایدیۆلۆژیا دەوڵەتگەراکان بانگەشەی بۆ دەکەن دەوڵەت نەخودی خوداوەند و نەسێبەرەکەیەتی، نەدایکی پیرۆز و نەباوکی پیرۆزە، نەپادشای ـ خوداوەند نەبەرجەستەترین شکۆمەندی ئەقڵ، هیچ یەکێکیان نییە. لەسەردەمی یەکەمین کۆمەڵگای چینایەتی و پلەداری مێژووەوە کردارو چالاکی دەستبەسەرداگرتنی ئەو زێدە ـ بەها و بەرهەمانەیە کەکۆمەڵگاکان بەهەزارویەك رەنج و ئارەقەی نێوچاوانیان کۆیان کردۆتەوە، ئەمەش لەمیانەی ستەمکاری و تەڵەکەبازییەوە لەلایەن هەندێ گروپەوە ئەنجامدەدرێ. ئەو دەزگاو رێسایانەیە کە ئەمجۆرە کردارانە ئەنجام دەدات. دەسەڵات وەك چالاکی ئەو گروپانەیە کەچۆن بخوازن بەمجۆرە دەزگاو رێساکان پڕدەکەنەوەو بەکاری دێنن.

لەبەرئەوەی لەبەشی کۆمەڵگاکاندا بەدرێژی باسی پێناسەی دەسەڵاتمان کرد، لێرەدا هەوڵدەدەین بەکورتی بیبڕینەوە: هۆکاری هێندە سەرنجڕاکێشیەکەی بۆئەوە قەرزارە کەشانسی خاوەنداریێتی زۆرترین توانستەکانی بەهاکانی کۆمەڵگایە. دەسەڵاتداریێتی گوزارشت لەخاوەنداریێتی دەوڵەمەندێتییە کەڵەکەبووەکان و پێرەوو هێزی ئەو رێساو دەزگایانە دەکات کەدەتوانێ زیادیان بکات. کاتێك بەگووتەی بریقەدار بانگەشەی ئەوە دەکرێت کەلەرێگای دەسەڵاتەوە ئازادی، یەکسانی و خۆشگوزەرانی دێنێ، ئەگەر بەزانینەوەبێت یان بەنەزانین بەو واتایەدێت کەخۆی، دەوروبەری و ئەو کۆمەڵگایە دەخەڵەتێنێ کەپشتی پێدەبەستێ. لەرێگای دەسەڵاتەوە، نەشۆڕش نەگۆڕانکاری، هیچ یەکێکیان ئەنجام نادرێت. لەمیانەی دەسەڵاتەوە بەهاکان زەوتدەکرێن، دابەشدەکرێن، هەروەها دەسەڵات جێگای ئافراندنی بەهانییە, بەڵکو جێگای بەکارهێنان و خەرجکردنێتی. ئەگەر بەشێوەی باج وەرگرتن بێت یان زۆرداری، لەکۆمەڵگای وەردەگرێت لەنێوان ئەندامەکانی خۆی بڵاویاندەکاتەوە. ئەنجامدانی پرۆژەو بەرهەمهێنانیش، واتە ئابووری دەوڵەتیش لەرێگایەکی دیکەی تاڵان و بەدەستهێنان و کۆکردنەوەی بەها بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە. لەوانەیە بگووترێ سیاسەتمەدارێکی گەورەی چینی زەحمەتکێشان، یەکێکی وەك لینین بۆچی ئەم راستییەی نەبینی؟ ئەمە پێویستی بەروونکردنەوەی گشتگیرو بەرفراوان هەیە. بەڵام زۆر بەکورتی ئاماژەی پێدەکەین: تەواوی مێژووی سەدوپەنجا ساڵەی سۆسیالیزم لەسەر بنەمای جیهانبینی (پارادیگمای) گەیشتن بەدەسەڵات ئاواکراوە. ئەوەی "لینین" لەکورتە رێگاوە ئەنجامیدا، پراکتیزەکردنی ئەم پارادیگمایەو هەوڵەکانی دۆزینەوەی رێگاو پێڕەوی راستی بوو. هەرچەندە گوتوویەتی "سۆسیالیزم بەپێشکەوتووترین دیموکراسیدا تێپەڕدەبێت" بەڵام خۆی و پارتەکەی لەرێگای کورترین رێچکەی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا هەنگاونان بەرەو سۆسیالیزمیان وەك سەرەکیترین هێڵی تەکتیکی دەستنیشانکردووە. لەهەلومەرجی بوونی ئیمپریالیزمدا، ئەمەیان وەك چەمکێکی بنچینەیی دەستنیشانکردووە کە پارتی ـ دەسەڵات لەئارادا نەبن ناتوانن لەسەر پێیان بوەستن. تەنانەت حەفتاساڵیشی بەسەردا تێپەڕبوو بێت، لەدواییدا مێژوو سەلماندی کەئەم بۆچوونە راست نییە.

ئەم راستینەیەش بەوواتایە نایەت کە لینینزم ـ مارکسیزم هەمووشتێکی هەڵەبووە. تەنیا ئەوە دەسەلمێنێ کەتێزی پارتی ـ دەسەڵات هەڵەیە، بەرەو سۆسیالیزممان نابات. بێگومان لەبەرئەوەی پێگەو پایەی مارکس و ئەنگلس تەنیا بەتیۆریزانی سنووردارە، ناتوانرێ بەتەواوەتی شوێنگەیان لەمەسەلەی دەسەڵات ـ دەوڵەت دیاربکرێت، چونکە ئەقڵمان پەی پێنابات. بەڵام

باسی ئەوەیان کردووە کەپێویستە بۆماوەیەکی کورت وەك ئامرازێکی حوکمڕانی دەوڵەت بەرامبەر بۆرژوازی بەکاربهێنرێ. ئەنارشیستەکانیش لەئارادان کەدەوڵەتگەڕانین. چەندین ئۆتۆپیاگەراش هەن. لەچەندین شوێن و قۆناخی جیاوازدا ئەو دیموکراسییانەش پراکتیزەکراون کەدەوڵەتگەرایی نەبوون. چەندین دەوڵەتی سۆسیالیستیان رەخنەکردووە، باسی ئەوەیانکردووە پێویستە بەخێرایی دەوڵەت بکوژێتەوە. روسیای سۆڤییەتی پڕە لەنموونە مێژووییەکانی ئەمە. وەك ئەنجام: بەکارهێنانی دەوڵەت و دەسەڵاتی دەوڵەت لەپێناو گەیشتن بەئامانجەکانی رزگاری و ئازادی و یەکسانی، نەك هەر پێت ناگەیەنێ، بەڵکو دوورت دەخاتەوە. بەراستی ئەگەر دەخوازن گرێدراوی ئەم ئامانجانە بن و بەسەرکەوتوویی پێی بگەن، پێویستە مۆدێلی سیاسی جیاوازتری ئامرازی بەرە ـ پارتی وەك ئامرازی سەرەکی تێکۆشان وێنابکەن، بەئاستی رامانێکی تیۆری و چەمکئامێزی بگەیەنن. ئەمەش گرنگی و بایەخێکی مێژوویی هەیە. تەنیا کاتێك بەشێوەیەکی راست وەڵامی ئەم پرسیارانە درایەوە دەشێ پارتە نوێکان واتایەکیان هەبێ.

ئەوەی پێویستە گرێدراو بەدەسەڵاتەوە پرسیاربکرێ: دەسەڵات هێزی خۆی لەکوێ وەردەگرێت؛ دەستبەسەرداگرتنی ئەو هەموو نیعمەتە و حوکمکردن بەسەر ئەم بەهایانەدا چۆن فەراهەم دەبێت؟ ئەم پرسیارە بەرەو ئەوەمان دەبات کەهێز سەرچاوەی دەسەڵاتە، هێزیش لەمیانەی شەڕەوە دەستنیشاندەکرێت. کەواتە پێویستە زۆربەباشی ببینرێ کەئەقڵی کۆمەڵگا سەرچاوەی دەوڵەت و دەسەڵات پێکناهێنێ، بەڵکو هێزو شەڕ لەژێریدا شاراوەیە. دەوڵەت و دەسەڵات وەك ئامرازی چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگا سەرهەڵنادەن. تاوەکو رای گشتی وەك سەرچاوەی چارەسەرکردنی کێشەو، دەوڵەت و دەسەڵاتیش وەك هێزی حوکمڕانی و بەکاربردن لەیەکتری جیاواز نەکەینەوە، ئەوا دەکەوینە ناو هەمووجۆرە ئاڵۆزییەك. لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا هیچ کردەوەو چالاکییەکی کۆمەڵایەتی لەئارادا نییە کە دەسەڵات دەستی تێوەرنەدابێت و پێینەگەیشتبێت. دەوڵەتیش دزەی بۆ ناوخێزان کردووە. ئەو ئاستەی سەرمایەداری جیهانگیری پێیگەیشتووە، دەوڵەتی خستۆتە نێورەوشی دەزگایەك، لەلایەکەوە هەرەزێدە بەکاریدێنێ، لەلایەکی دیکەشەوە بێواتای کردووە. کاتێك دەوڵەت کەوتۆتە بێواتاترین رەوش و پێگەوە، ئەو مانایە نابەخشێ کەلاوازبووە. بەپێچەوانەوە ددانەکانی لەنینۆك قایم کردووەو کاتێك پێویست بکات لەمیانەی بەکارهێنانی سیاسەتی قەرەبوودان هەوڵی درێژەدان بەکاریگەرییەکانی خۆی دەدات. ئەم رەوشەی دەسەڵاتی دەوڵەت بەتۆتالیتاریزم بەناودەکرێت. لەوانەیە شێوەی کۆنی سۆسیالیزمی بونیادنراو یاخود تۆتالیتاریزمی فاشیزم تێپەڕکرابێت. بەڵام دیسان دەوڵەت تۆتالیتارە. لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دەوڵەتێك نییە تۆتالیتار نەبێت. ئەم رەوشە گرێدراوی پێویستییەکانی سەرمایەداری و ئەو قەیرانەی تێیدایەو کەوتنەگەڕی ئەلتەرناتیفەکانە.

بەکورتی دیاردەی هێزو شەڕ کەدەوڵەت لەسەردەمی یەکەمین ئاواکردنیەوە پشتی پێبەستووە تاوەکو ئێستا بەردەوامە. شەڕ بناخەی دەسەڵاتە. دەسەڵاتداریێتی واتە: بەپشتبەستن بەکولتووری شەڕ بەواتای شێوەپێدانی هەموو ئاستەکانی کۆمەڵگاو هێشتنەوەیەتی لەناو ستاتۆیەکدا. هەروەکو لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا, دەوڵەت لەگەڵ بانگەشەکانی ئازادی و یەکسانی ناگونجێ کەبەواتای نکوڵیکردن لەخۆی دێت. بەکردەوەو رەفتارەکانی خزمەت بەو بانگەشانە ناکات. پێچەوانەکەی ئەنجامدەدات و دەخوازێ درێژە بەرۆڵی خۆی بدات. هەربۆیە ئەو پارتانەی ئەم ئامرازەیان کردۆتە ئامانجی خۆیان لەبانگەشەکردنی ئازادی و یەکسانیدا نیازپاکیش بن، کاتێك بەدەوڵەت گەیشتن دیسان پووچەڵ دەبێتەوە.

3. لەرەوشێکی وەهادا ئەگەر پارتە نوێکانی ئازادی و یەکسانی بخوازن جێگیرو بەپرەنسیپ بن، پێویستە ئەو سیاسەت و شێوانەی کۆمەڵگا لەبەرنامەی خۆیاندا بەجێبکەن کەتەوەرەکەی و ناوەندەکەی دەوڵەت نییە. ئەلتەرناتیفی دەوڵەت دیموکراسییە. پێشوازیکردنی دەوڵەت لەمیانەی ئەلتەرناتیفێکی بەبێ دیموکراسی، تەواوی رێگاکانی پووچەڵکردۆتەوە کەتائێستا تاقیکراوەتەوەو پەیرەوکراوە. هەروەکو مەزەندە دەکرێ دیموکراسی شێوەیەکی دەوڵەتی سەرمایەداری نییە.

هەروەها جگە لەدیموکراسی هیچ رژێمێکی دیکە سنوور بۆدەوڵەت دانانێ، لەناو یاسایدا ناهێڵێتەوە، تەسك و بچووکی ناکاتەوە. رووخاندنی دەوڵەتێك بەواتای بەلاوەنانی کولتووری دەوڵەت نایەت. هەرساتێك دەوڵەتێکی دیکەی لەجێگادا ئاوادەکرێت یان دەوڵەتێکی دیکە بۆشاییەکە پڕدەکاتەوە. تەنیا دیموکراسی گۆڕەپان لەگەڵ دەوڵەت دابەش دەکات و هاوبەشێتی دەکات، سنووری بۆ دادەنێ و گۆڕەپانی ئازادی کۆمەڵگا فراوان دەکات. ئەو بەهایانەی لێکەمدەکاتەوە کەزەوتی کردوون، هەندێکی دیکە لەیەکسانی نزیك دەکاتەوە. کاتێك دیموکراسی پێناسەبکەین، دەتوانین بڵێین: ئەو رەوشەیە کەلەدەرەوەی دەوڵەت کۆمەڵگا خۆی بەڕێوەدەبات. دیموکراسی، بەواتای ئەو بەڕێوەبەرایەتییە دێت کەنەبووە بەدەوڵەت؛ هێزی خۆبەڕێوەبردنی کۆمەڵگاکانە بەبێ دەوڵەت. بەپێچەوانەی مەزەندەکان لەوکاتەوە کەکۆمەڵگای مرۆڤایەتی پێکهاتووە تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان لەدەوڵەت زیاتر دیموکراسی بەخۆیەوە بینیوە. لەوانەیە رەوشی دیموکراسیەتێکی گشتی وڵاتێك یاخود نەتەوەیەك بەچڕی لەئارادا نەبووبێت. بەڵام شێوەی ئاوابوونی کۆمەڵگا پێگەیەکی دیموکراتی و کۆمەڵگاریانەیە. تاوەکو کۆمەڵگاری و کاردانەوەی دیموکراتییانە نەبێت تەنیا بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا لەرێگای دەوڵەتەوە مەحاڵە. دەوڵەت تەنیا لەبەرامبەر کۆمۆنەو دیموکراسی گەورەدەبێت و دەتوانێ حوکمڕانی بکات. ئەو زەمینەیەی لەناو دەوڵەت هەڵکشاو تێیدا ژیا کۆمۆنەی کۆمەڵگاو راوەستەی دیموکراتییانەیە کە پێویستی بەیەکەوە بوون و پەیوەندییەکی دیالەکتیکی لەنێوان هەردووکیاندا هەیە. هەربۆیە کاتێك کۆمەڵگاو شارستانییەت دێنەلای یەکتری، ئەوا ناکۆکی سەرەکی لەنێوان دەوڵەت و دیموکراسیدایە. کەمبوونەوەی یەکێکیان بەواتای زیادبوونی ئەوەیترە. دیموکراسی تەواو رەوشی بێ دەوڵەتبوونە. هەرچی باڵادەستبوونی تەواوی دەوڵەتە بێبەشی و نەبوونی دیموکراسییە. ئەو ئەنجامەی لێرە بەدەستیدێنین ئەوەیە: پەیوەندی نێوان دیموکراسی و دەوڵەت لەجیاتی یەکتر رووخاندن، بەشێوازی یەکتر تێپەڕکردنە.

تەنیا دەوڵەت دەتوانێ دەوڵەت بڕووخێنێ. دیموکراسی دەوڵەت نارووخێنێ؛ هەروەکو سۆسیالیزمی بونیادنراو تەنیا دەشێ رێگا لەپێش دەوڵەتێکی دیکەی نوێ بکاتەوە. بەمجۆرە ئەرکی سەرەکی دیموکراسی دەردەکەوێتە ڕوو. تەنیا کاتێك سنوور بۆ دەوڵەت دادەنێ، بچووکی دەکاتەوە، ئەو قۆڵانەی دەشکێنێ کەوەك ئەختەبووت کۆمەڵگای پێ پێچاوەتەوە، دەتوانێ تواناکارییەکانی ئازادی و یەکسانی زیادبکات. هەرچی بەرەو کۆتاییە, لەوانەیە بەتەواوەتی دەوڵەت پووچ و بێواتا بێت و بکوژێتەوە. لەگەڵ ئەوەی چەمکی ئەنگلس و لینینیش تاڕادەیەك بەمجۆرەبوو بەڵام ناتوانین بڵێین تیۆرییان پێشخستووە. بێگومان لەدەوڵەتە دیموکراسییەکانیشدا گۆڕانکاری گرنگ بەسەر شێوەکانی دەوڵەت دادێت. پێبەپێ جگە لەگۆڕەپانی گشتی کەوەك گۆڕەپانەکانی ئاسایشی گشتی و بەرژەوەندی هاوبەشی کۆمەڵگایە، ناچاردەبێ دەست لەتەواوی دەزگاو رێسا پووچ و بێواتاکان بەربدات. بەتایبەتیش هەرچەندە بەشێوەیەکی هێدی و درەنگیش بێت، ئەوەی لەوڵاتەکانی یەکێتی ئەوروپا پەی پێبراوەو پەیڕەو دەکرێت، ئەم شێوازەی دەوڵەت و دیموکراسییە. بەجۆرێك لەجۆرەکان سەبارەت بەمەسەلەی دەوڵەت و دیموکراسی بەناوی تەواوی مرۆڤایەتی رەخنەدان دەدات.

ئەو خاڵەی لەمیانەی ئەم هەڵسەنگاندنە کورتەدا خوازیاری نیشاندانی بووین ئەوەیە بەهۆی بوونمان بەپارتێکی دەوڵەتخواز هەر لەسەرەتاوە تێڕوانینمان سەبارەت بەجیهان هەر لەریشەوە هەڵەی لەخۆوە گرتووە. ئەگەر دەوڵەت ئاوابکات و پێیبگات، یاخود ئاوانەکات و پێینەگات، ئەم پارتیانە ناتوانن لەرێگای دەوڵەتەوە ئامانجەکانی دیموکراتی، ئازادی و یەکسانی بەدیبێنن. تاوەکو لەم رێگایە نەگەڕێنەوە، ناتوانن ببن بەپارتی یەکسانیخوازو ئازادیخوازی نوێ. بەکورتی رێگای بوون بەپارتێکی دیموکراتی و سۆسیالیست بەگەڕانەوەو وازهێنان لەتیۆری، بەرنامە، ستراتیژی و تەکتیکە دەوڵەتخوازەکان و نوژەنبووندا تێپەڕدەبێت. پێویستی بەتەکتیك ــ ستراتیژ، بەرنامەو تیۆرییەکی سۆسیالیست و دیموکراتییانە هەیە کەدەوڵەتخواز(دەوڵەتگەرا) نەبێت. ئەگەر لەسەر ئەم بنەمایە رەخنەدان پێشکەش بکرێ واتایەکی دەبێ. لەدۆخێکی

پێچەوانەدا لەژێرناوی نوێبوونەوە, دیسان کەوتنەوە ناو رەوشی جاران دەستلێبەرنەدراوە. رەوشی پارتەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو، سۆسیال ـ دیموکرات و رزگاری نیشتمانی بەشێوەیەکی زۆرئاشکرا ئەم بارودۆخەی پشتڕاست کردۆتەوە.

4. ئەگەر"PKK" لەم چوارچێوەیەدا رەخنەدانێکی گشتگیر بدات، لەپراکتیزەکردنی ئەمەدا هێزی خۆی نیشانبدات، ئەوا سەرلەنوێ ئاواکردنەوە واتادار دەبێ. جارێکی دیکە تەماشای رابردوو بکەین دەبینین چەمکی پارتی دەوڵەتخوازی کلاسیك لەژێرتەواوی هەڵەو کەکورتییەکاندا شاراوەیە. ئەگەر وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ یان فیدراڵی بیر لەکوردستان بکەینەوە، بەدەوڵەتبوون وەك ئاسۆی سەرەکی پەسندبکەین، تەواوی خەبات و تێکۆشانەکانیش بەگوێرەی ئەمە پێوانەو رێکبخەین، ئەوا چۆنییەتی و خەسڵەتەکانی تەواوی کادیر، رێکخستن، چالاکی و پڕوپاگەندەکان دیاردەبێت. کادیرانی"PKK" کەکۆنترین خاوەن نەریتەکانی دەوڵەت لەمێژوودا لەبەرامبەریانن، تاوەکو دەرك بەزانستی سیاسی نەکەن، ئەو پەیوەندییانەی دەسەڵات کە تێیدەکەون، هەروەکو چۆن چەندین جار وەك رەخنەیەك بەشێوەیەکی ئاشکرا ئاماژەم پێکردووە ئەو کردەوانە ئەنجامدەدات کە لەگووتەی "پادشایەتییان بەقەرەج بەخشیوە، سەرەتا باوکی خۆی لەسێدارە داوە" دەبینرێ. باشتر دەرك بەوە دەکەین کەدوای پەیڕەوێکی حەفتا ساڵی بۆچی سۆسیالیزمی سۆڤییەت بۆ سەرمایەدارییەکی هۆڤانە گەڕایەوە. چونکە بەپەروەردەی دیموکراسیدا تێپەڕنەبوو. بەشێوەیەکی خێراو بەپەلە رۆحی تۆتالیتاریزمی لە بۆهێڵەکان(جینات)ی کۆمەڵگای دەوڵەتگەرایی چاند. کاتێك فشار نەما هەروەکو بڵێی دواکەوتوویی قۆناخەکانی سەرەتا بووە دێوو دڕنج. ئەوەی شاراوە بووو دیموکراتیزەنەببوو پاشڤەڕۆیەتی روسیای قەیسەری بوو. بۆیاخی سەرمایەی دەوڵەتی تەنیا لەوەدا سەرکەوتوو بوو کەبەدرێژایی حەفتا ساڵ شاردیەوە. لەدۆخێکی وەهادا کاتێك "PKK" لەناو کۆمەڵگایەکدا کەناسنامەکەی لەکەناری کوشتارو لەناوچوندایە کادیر دەخاتە ناو پەیوەندییەکانی هێز، چەك و سیاسەت, دەبێ بزانرێ و مەزەندەبکرێ: لەهۆش خۆی دەچێ، دەبێتە پادشای قەرەجەکان ـ لەم بوارەداو بەو گوتەیەوە زۆر جار پراکتیکی "شەمدین ساقق"م رەخنەکرد ــ. کامە دەزگا پێکدێنین, یان هیچ پەی پێ نابەن، یاخود دەبوون بە "دەسپۆتێکی" بچووك. سەرەکیترین فاکتەری لەژێر ئەمەدا شاراوە بوو: ناتەواوی پەروەردەی سیاسی, گرنگترینیشیان نەناسین و دانەنان بەدیموکراسی بووە. تەنانەت لایان لەزانینی شێوازی دامەزراوو رێسایی و کاروباری دیموکراسیش نەدەکردەوە. بەهۆی کولتووری باوو نەریتی راکردن لەدیموکراتیزەبوون ببووە فێربوونێك و رێگای ژیانی هەرزان. شێوازی دیموکراسییانە پێویستی بەزانستیبوون، هۆشیاری کۆمەڵگا، زانستی سیاسی و ئەزموونی بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵگا هەیە. ئەم دانایی و رەوشت بەرزیەش بەسانایی بەدەست نایەت. پێویستی بەئەزموون و پەروەردەیەکی چڕ هەیە.

هەروەکو لەتەواوی پارتە هاوشێوەکانیدا دەبینرێ کاتێك مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی خۆی بەپلەداری دەگەیەنێ، بەسانایی پێناگەن، وەها دەکەن کە دەستلێنەدراو بن، ئەمە ئەنجامێکی بەبنەماگرتنی نەریتی دەوڵەتە. بەدەوڵەتبوون بەدەستڕۆییەوە دەستپێدەکات. ئەوکاتە بەشێوەیەکی توندو بەساردی نزیکی مرۆڤەکان دەبیتەوە. لەمێژوودا سەرپەرشتیاری مادەکان "دیاکۆس" کاتێك یەکەمین کۆنفیدراسیۆنی مادەکانی ئاواکرد، دەگێڕنەوەو دەڵێن، یەکێك لەیەکەمین کارەکانی ئەنجامیدا ئەوە بوو کە تەواوی پەیوەندییە مرۆییەکانی پێشووی بەرکەنارکردو پێشوازی لەهیچ کەسێك نەکردووە. شاری "ئەکبەتان" ی پایتەخت کەتازە ئاوایکردبوو بەدیوارێکی حەوت شورایی دادەخات. ئەمە رەوشێکی سەیرو سەرنجڕاکێشە. بۆئەوەی ببیت بەخاوەن دەوڵەت، بەردەوام خۆت پەردەپۆش دەکەیت، دەبیتە خاوەن دەمامك. پادشا عوسمانییەکان بەردەوام لەپشت پەردەوە دەیانڕوانی. بەکورتی پارتە سۆسیالیستەکانیش لەبەڕێوەبەرایەتی باڵا دەستیانپێکردو ناچاربوون بکەونە سەرهەمان رێگا. چونکە ئەمە پێدویستییەکانی بەدەوڵەتبوونە. وەك یەکێك لەسەرەتاوە جێگای خۆی لەناو ئەم پراکتیکەدا گرتووە پێویستە دان بەوە دابنێم کەئەو بابەتەی هەرەزێدە زەحمەتی بۆ دروستکردم ئەوەبوو. بەهیچ جۆرێك فێری

پرۆتۆکۆڵ و شێوازی دەوڵەت نەبووم. لەنێوان پێکهاتە دیموکراتی و پێکهاتە بەدەوڵەتبووەکەمدا دووچاری شلەژانێکی گەورە هاتم. هەروەکو بڵێی لەنێوان دوو بژاردا مامەوە. کاتێك "PKK" گەورەبوو باشتر دەرکم بەگەمەکانی دەسەڵات کردو لێی تێگەیشتم. دەبێ بەئاشکرا بڵێم، هیچ کاتێك رازی و خۆشنوود نەدەبووم. لەناوەڕۆکدا گەورەترین شەڕی رووبەڕووی بوومەوە، سەبارەت بەوەبوو کە دەبمە دەوڵەتخواز یان نا. ئەو دیاردەیەی بەرەو ساڵانی 1995 بەراستی ئارەزووی منی تێکدا، دەرککردنم بوو بەوەی کەچەندەی دەچێ لەئامانجەکەم دووردەکەومەوە. تەنانەت ئەگەر"دەوڵەت"یش بم هەستم بەوەکرد مرۆڤەکانی بەرامبەرم بچووك بوونەتەوە. هەروەکو بڵێی لەبەرامبەرمدا سەریان دەچەماندەوە. دەمزانی کەلەدڵەوە نییە. هەروەها ئەوەشم مەزندە دەکرد ئەگەر دەرفەتیان بۆبڕەخسێ مەترسیدارن. ئەمە ئەو گۆڕانکارییە بوو کەمنی زۆر تەنگەتاو دەکرد. هەرگیز بەو سیستەمەی پەیوەندی نەدەچوو کە لەفیکرو خەیاڵی مندا هەبوو. یەکەمین جار باوەڕیم بەوەهێنا کەلەمیانەی ئەم پێڕەوە ناتوانین سەرکەوین، لەحاڵەتێکدا سەرکەوتنیش بەدەستبێنین ئەو ئامانجە نییە کەبەهیوای بووین.

باشتر دەتوانم ئاماژە بەوەبکەم کەلەدوای ساڵی 1995 ئەمە ناوەڕۆکی بابەتە بەکێشەو گرفتەکانی "PKK" ی پێکدەهێنا. ئەوەی لەپەیوەندی و پێکهاتەی تەواوی کادیران و دەزگاکاندا سەریهەڵدا چەمکێکی ساختەی فەرمانبەرێتی بوو. ئیتر گرفت ئەوە نەبوو ببێت بەخاوەن ئۆتۆپیا، بەجۆشوخرۆش بێ، رۆژانە بەدوای لێگەرین دابێت و شتی نوێ بخوڵقێنێ، هەرکەس کەوتبووە ناو هەوەس و ئارەزووی ژیانێکی هەرزان لەسەر ئەو نرخ و بەهایانەی بەهەزارو یەك رەنج ئافرێنرابوون. یەکێك لەمەترسیدارترین نەخۆشییەکان ئەمەبوو. بەواتایەکی دیکە لەلایەك چەتەگەرێتی، لەلایەکەی دیکەشەوە فەرمانبەرێتی، بەواتای کۆتاییهاتنی "PKK" ی شۆڕشگێر دەهات. ئەو خەبات و تێکۆشانە مەزنەی ئەنجامم دابوو مرۆڤی گرگنی بەرهەمهێنابوو. لەراستیدا بۆ شیکارکردنی ئەم دیاردەیە هەوڵ و کۆششێکی گەورەم دا. شیکردنەوەکانی دوای 1990 نیشاندەدات کە ئەم هەوڵانە چەندە چڕو بەرفراوان بووە. بەشێوەیەکی چڕو بەرفراوان چەکی رەخنەکردنم بەکاردەهێنا. بەڵام کەهۆکاری نەخۆشییەکە بەراست دەستنیشان نەدەکرا، چاوەڕوانی واتاداری تیمارکردنەکە ناکرێ. شتێکی سروشتی بوو کەکادیرانی پارتێکی دەوڵەتخواز لەکۆمیتەی ناوەندییەوە تادەگاتە کادیرانی ژێر لەهەلومەرجی کوردستانی بەڕیشە گوندی و لادێییەکان ببن بەدڕندەترین چەتە، رۆشنبیرە نیوەچڵەکانیش ببن بەفەرمانبەرێکی دەستپۆت. ئەم گەندەڵبوونە لەسروشتی ئامانجەکەدا "مەبەستی بە دەوڵەتبوون"ی هەبوو.

کاتێك دەڵێم دووەمین هەڵمەتی"PKK"یی بوون پووچکرایەوەو بەفیڕۆچوو، باسی ئەم راستینەیە دەکەم. ژێرکەوتن یان ژێرنەکەوتنی هەڵمەتەکە لەبواری سەربازی ـ تەکنیکیدا جێگای باس نییە. ئەمانە مەسەلەی لاوەکین. لەلایەکەوە "PKK" ببووایە خاوەن دەوڵەتیش کۆتایی پێدەهات؛ واتە لەبواری گەوهەری شۆڕشگێڕییەوە کۆتایی پێدەهات. دەگەیشتە ئەوئاستەی بەرەو پێکهاتەیەکی وەك"ی. ن. ك" و "پ. د. ك" بچێ. لەماوەی نێوان 1995 ـــ 2000 ئاستەم بوو هێزی چارەسەرییەکی تەواوی ئەم کێشەیە نیشانبدەم. "PKK" و بەڕێوەبەرایەتی بەر لە ساڵی 1995 خاوەن ئۆتۆپیابوو, جۆش و بڕوای بەهێز بوو. کاتێك قۆناخ بەرەو کۆتاییەکان دەڕۆیشت هەستم دەکرد کەناتەواوییەکی جددی لەژێر ئیش و کارەکانماندا شاراوەیە، دەمبینی بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر کەوتووینەتە رەوشێکی خۆ دووبارەکردنەوە، بەڵام نەماندەزانی رێگەچارە لەکوێ شاراوەیە. ئەوەی ئەنجامماندا پاراستنی پێگەکان و پڕکردنەوەیان بوو. کەوتبووینە ئەو رەوشەی کەبەرزگارکردنی رواڵەت بەناو دەکرێ.

بەشێوەیەکی سەرەکی قۆناخی ئیمرالی رۆڵی لەوەدا بینی کە ئەم کێشەیە چارەسەربکەم. ئەمەش گرێدراوی توانستەکانی دابڕان لەپراکتیکێکی چڕو وردبوونەوە واقیعییەکانە لەبارەی ریالیتەی کۆمەڵگاو سروشتی زانستەکان. ئەگەر نەخۆشی دۆگماتیزمم قووڵ بووایە هەروەکو لەسەدا نەوەدونۆی کادیرەکانماندا بینرا، نەمدەتوانی ئەم هێزەی چارەسەری نیشانبدەم.

لەلای منەوە نەك تەنیا مارکسیزم, بەڵکو تەواوی ئۆتۆپیاکانی ئازادی و یەکسانی شیکراوەتەوە. هەروەها دیاردەی دەوڵەت و دیموکراسیش شیتەڵکراوە. جفرەی پەیوەندی نێوان دەسەڵات و شەڕیشم شیکارکردووە.

نەخۆشی دەوڵەتبوون و دەسەڵاتپەرستی، بەتایبەتیش لەزەمینە دواکەوتووەکانی کۆمەڵگادا، ئەو تاکانەی بەپەروەردەیەکی جددی زانستی و مرۆییانە تێپەڕنەبوونە جۆرێکی زۆر ترسناکی "دەسپۆتیزم "دەخوڵقێنێ. بۆئەوەی دەسەڵاتخوازی تێربکات بۆچارەسەرکردنی بچووکترین گیروگرفتیش چەك بەبنەما دەگرێت. بەتایبەتیش لەکەسە دواکەوتووەکاندا ئەمە زۆر ئاشکرا بوو. بەتایبەتیش لەماوەی چەتەگەرێتیدا جۆرو کەسایەتی زۆر دڕندە ئافرێنران. هەروەکو بڵێی مێشوولەیەو لەسەرچاویان نیشتووە: بەتەڵەکەبازترین و نامەردانەترین شێوە کوشتنی هێژاترین و بەهادارترین هەڤاڵ کەلێی ئاسوودە نەبوون، کردیان بەشێوازێکی فەرمانداریێتی و پێشەنگایەتی. ئەمە گەورەترین سام بوو. تەنانەت لەپێناو بچووکترین پێویستییەکانیان بۆئەوەی ئەوهەڤاڵانە بەرکەنار بکەن کەدەیانخواست لێیان رزگاربن، هەناردنیان بۆ چالاکییە لەنێوبەرەکان شێوازێك بوو بەچڕی پەیڕەویان دەکرد. هەڵبەتە زۆر دواترو درەنگوەخت دەرك بەو شێوازەی گەندەڵبوون دەکرا. بوون بەدەسەڵات و فەرماندێتی ببوو بەسەرنجڕاکێشترین بابەت. تەواو چاوڕەشی سەریهەڵدابوو. چونکە هەرشتێکی ئاواتەخوازو ئامانجیان بوو لەرێگای ئەم دەسەڵاتانەوە بۆی دەچوون. نەخۆشی ئەبەدی دەسەڵات بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر تەشەنەی کردبووو بڵاوببۆوە. گەمەکانی دەسەڵات ببووە ئەو یارییانەی حەزیان لێیبوو, لەمیانەی زەبرلەیەکتر وەشاندنەوە ئەنجامیاندەدا. مەترسیدارترین گەندەڵی ناو "PKK" لەم لایەنەوە بوو. رەنگدانەوەی ئەمە لەناو گەل بەشێوەیەکی خراپتر بوو. تەنانەت ئەو مرۆڤانەش لەناو دەبردران کەوەك زێڕبوون و گرێدراوی دۆزەکەبوون.

لەچالاکییەکانیشدا ئەو شتانە ئەنجامدران کەهەرگیز نەدەبووایە ئەنجامبدرێ. جیاوازی نێوان ژن و منداڵان لەبیرکرا. تەنانەت ئاژەڵیش لەناوبردرا. ئاشکرایە کەمرۆڤایەتی ئەمانە پەسندناکات. بەڵام نابێ لەبیر بکرێ، کەزۆرجار لەنموونەکانی مێژوودا بینراوە, لەشەڕەکاندا چەندین شارو گوند تەختکراون و بەتەواوەتی لەنەخشەدا سڕاونەتەوە. فەرمانبەرێتیش نەخۆشییەکی کەمترنەبوو. لەشەڕی مان و نەماندا پەنابردنە بەر پیشەی فەرمانبەرێتی، یەکێك لەخراپترین شێوەکانی فەرمانبەرێتی بوو. ئەوانەی دیکەش لەمیانەی پێرپێرێتی (ئەحباب چاوشی) و دەستنەبردن بۆ ئاوو سابوون، رازیبوون بەوەی کە هەیە، بەم کەموکورتییانەوە قۆناخیان پڕدەکردەوە. بەمجۆرە قۆناخێکی "PKK"یی بوون پڕدەکرایەوەو تەواودەکرا. ئاشکرایە کەچۆنییەتی و خەسڵەتی دەوڵەتخوازی پارتیبوون لەژێرتەواوی ئەم کەموکورتییانەدا شاراوەیە. خۆت وەك یەکسانیخوازو ئازادیخواز راگەیەنیت، دەوڵەتیش وەك ئامانجی بەدیهێنانی ئەم بانگەشەیە بەبنەمابگریت، ئەوا ئەو رەوشانەی دواتر تێیدەکەوێ، یەك بەدوای یەك بەمجۆرە دەبێت. تەنیا لەمیانەی دەستبەردان لەم خەسڵەتەی بنەمای پارت دەشێ ئەم رەوشەو ئەوجۆرە پارتە تێپەڕبکرێت.

5. دووەمین هەڵەی گرنگی "PKK" سەرچاوەی خۆی لەپێناسەکردنی نەتەوەو شەڕی رزگاری نیشتمانی وەردەگرێت. هەروەکو بڵێی بوون بەنەتەوە ئەنجامدانی لەرێگای شەڕی رزگاری نیشتمانییەوە وەك فەرمانێکی قورئان دەستنیشان کردبوو. چونکە تەواوی شاکارە کلاسیکییەکانی مارکسیزم و نموونەکانی شەڕی هاوچەرخ ئەم فەرمانەیان دەدا. تاوەکو بەنەتەوەبوون ئەنجامنەدرێت، یەکسانی و ئازادی بەدینایەت، تەنانەت ناتوانی ببیت بەمرۆڤێکی هاوچەرخیش. رێگای ئەمەش بەوەدا تێپەڕ دەبوو کەهەموو هێزت بخەیتە خزمەتی سێ قۆناخی شەڕی رزگاری نیشتمانی درێژخایەن (بەرگری، هاوسەنگی، هێرش) لەم پێناوەدا رێگای شاخەکان، گوندو شارەکان گیرابووەبەرو بەدەیان هەزارکەس لەزیندان، دەرەوەی وڵات و مەترەپۆڵەکان گیرسابوونەوە. کاتێك لەمیانەی دۆگماتیزمەوە هەڵوەستەت کردبووایە کەلەمرۆڤی رۆژهەڵاتی ناوین بۆتە تایبەتمەندێتییەکی گشتی، پێویستبوو شەڕێکی رزگاری نیشتمانی پەیڕەو بکرێت. جگە لەمە رێگایەکی دیکەی بوون بەنەتەوەیەکی سەربەرزو

شەرەفمەندانە نەبوو. ئیتر شەڕببوو بەبیرۆکەو چەمکێکی پیرۆز. شەڕکردن لەم پێناوەدا لەجیهادی ئیسلامییەکان گرنگتر بوو. ئاشکرایە کە لەم هەڵوێستەدا نەخۆشی دۆگماتیزم سەریهەڵدابوو. هەروەکو هەڵوێست بەرامبەر بە دیاردەکانی دیکە.

کاتێك شەڕ وەك دیاردەیەك شیتەڵ بکەینەوە، لەراستیدا دەبینین کە نەخۆشییە پێویستە شایستەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی نەبێ. جگە لەخۆپاراستنی ناچاری دەبووایە هیچ جۆرێکی شەڕ رەوا نەبینرا بووایە. چونکە ناوەڕۆکەکەی بریتییە لەستەمکاری و زەوتکردن. چەندەی دەخوازێ خۆی دەمامك و پەردەپۆش بکات، سروشتەکەی تەڵەکەبازی و ستەمکاری و تالان بوو. مەزنەدەکردنی ئەوەبوو کە لەرێگای فەتحکارییەوە خاوەنی هەمووشتێکی. لەژێرسایەی ئەم تایبەتمەندێتی و خەسڵەتانەدا هەڵەنییە کەشەڕ وەك گەورەترین کارەسات و خراپەکاری وەسف بکرێت. بەقووڵایی دەرك بەوەنەکرابوو تەنیا ئەوکاتە شەڕ واتادار دەبێ کەهیچ رێگایەکی دیکەی بەدەستهێنان و پاراستنی نامووس، ئازادی و هەبوون، لەئارادا نەما. ئەوەی تێیگەیشتبووین: شەڕی رزگاری نیشتمانی فەتحکردن و هەمووشتێك دەگرێتەوە. بەسانایی بەرگری رەوای تێپەڕدەکرد. لەوانەبوو بۆزاڵبوون بەسەریەکترو تۆڵەسەندنەوەی دوولایەنە بگۆڕێ، هیچ ئەندێشەیەك لەم بوارانەدا نەدەکرا. بێگومان ئەگەر هەڵوەستە لەسەر شەڕی بەرگری رەوا کرابووایە، تیۆری و ستراتیژی و تەکتیکەکانی لەتەواوی جۆرەکانی دیکەی شەڕ جیابکرایانەوە، ئەوا چەندین هەڵە و کەموکورتی و زیان روویاننەدەدا. گرێدانی تەواوی هیواو ئومێدەکان بەشەڕی رزگاری نیشتمانی کەدەبوایە تێیدا سەربکەوین، لەبواری راستینەی ماددی (بابەتی)یەوە گرفت و بەربەستی گەورەی لەخۆوەدەگرت.

کاتێك بابەتەکانی لەجۆری رەوشی جیهان، پێگەگرتنی هێزو رێکخستنی و لۆجستیك رەچاو بکرێ دەبینرێ کەشەڕێکی رزگاری نیشتمانی چاوڕەش و کوێرانە بەختی گرێدراوی رێککەوتەکان بوو. بەبێ ئەوەی تەواوی ئەم راستیانە رەچاوبکرێت، پراکتیکی شەڕێکی بەردەوامی ئاست نزم کەنزیکەی پانزدە ساڵ بەردەوام بوو، لەدوای ساڵی 1995 تەنیا لەمیانەی خۆدووبارەکردنەوە توانی درێژە بەهەبوونی خۆی بدات. ناتوانرێ بگووترێ ئەم شەڕە هیچ بەرهەم و ئاکامێکی لێنەکەوتەوە. بەڵام ئەمەش راستینەیەکە کاتێك وەك تاکەرێگا بینراو پراکتیزەکرا چەندین زیانی بێواتاو نابەجێی لەگەڵ خۆی هێناو رێگای لەپێش ئەوەکردەوە کەبەرهەمی کۆششەکانی دیکە لەئارادانەبێت. ستراتیژیەتێکی ئەوپەڕگەریش تەواو نموونەیەکی دۆگماتیزم بوو. بێگومان ئەگەر شەڕێکی واقیعی خۆپاراستن بەگوێرەی جوگرافیای کوردستان و پەیوەندییەکانی گەل لەمیانەی گونجاوترین تەکتیك و پێگەگرتن بەڕێوەبرابایە، مسۆگەر بەئامانجی دەوڵەتی نەگەیاندبایین ئەوا بەرەو چارەسەریەکی دیموکراتیانەی جێگیری دەبردین. چەمکی شەخسی و باوەڕیم ئەوەبوو کەکادیران و فەرماندە مەیدانییەکانمان توانای نیشاندانی ئەم توانست و تواناکاریەیان هەیە. بەردەوام لەچاوەڕوانی ئەوەدابووم, یارمەتی و هاوکاریەکی گەورەم پێشکەشکردن. ئەو فیداکاریانەم نواند کەبەدەگمەن نموونەکانی دەبینرێ. بەڵام هەمان نەخۆشی دەسەڵات بەشێوەیەکی ترسناکتر لەم گۆڕەپانەشدا سەریهەڵدابوو. تەنانەت چەتەگەرێتی تائەو ئاستەی گەندەڵی و تاوانکاری هەڵکشابوو کەبەئاسانی هێژاترین هەڤاڵان پاکتاوبکەن. هێندە گرنگ و دیاریکەرنەبوو, ئایا خیانەتی بەئەنقەست و زانینی ئاژاوەگێڕی و بەکرێگیراوانی تێدابوو یان نا. بەگشتی لەبەرئەوەی شەڕ هونەرێکی پیس و قێزەونە، بەتایبەتیش بەم شێوازە دۆگماییانە گرتنەدەست و تاوتوێکردنی شەڕی رزگاری نیشتمانی ئەم ئەنجامانەی لێدەکەوتەوە. هەڵژنینی هەموو جۆرە میللیگەراییەك و توندوتیژی کوێرانەو مەیلێکی جوداخوازی مەترسی قووڵبوونەوەی قەیران ـ گێژاوی کۆمەڵایەتی دەهێنائاراوە.

لەراستیدا ئەگەر پێناسەی نەتەوەمان نەگەیاندبوایە ئاستی تابۆ پەرستن، وەك دیاردەو شێوەیەکی سستی کۆمەڵگا هەڵسەنگێنرابووایە، ئەگەر بوون بەکۆمەڵەی نەتەوەیەکی یەکسان و ئازادمان بەبنەماگرتبووایە، ئەوا بەئەنجامێك دەگەیشتین کەبەرامبەر راستی وردەکارو هەستیارتربوو. ئایا نەتەوەیەکی یەکگرتوو، بۆ نەتەوەیەك کەدەخوازێ ببێتە خاوەن دەوڵەتێکی تەواو باشترین، جوانترین و راسترین بانگەشە نەبوو. دیسان ئەوە گرنگ نەبوو کەلەژێرچەتری هەمان دەوڵەت دایت یاخود نا،

بەڵكو دیموكراتییانەیە یاخود نا. هەموو پێڕەوو ڕێچكەیەكی شەڕ نەبوو كەبەرەو ئەمە دەڕۆیشت، بەڵكو شەڕێكی واتاداری بەرگریكردن، تێكۆشانەكانی كۆمەڵگای دیموكراتییانە و هەموو شێوەیەكی هاوكاری و ڕێكخستن كە لەخزمەتی ئەمەدا بێت. بەمجۆرەش بەبێ ئەوەی بكەویتە ناو میللیگەرایی نەتەوەی ستەمكارو ستەملێكراو، بەبێ ئەوەی دەرفەت بەجوداخوازی و توندوتیژی زێدەڕۆ بدرێت، دەتوانرا پێشخستنی ئازادی و یەكسانی فەراهەم بكرێت. بەڵام ئەو هەڵوێستە دۆگماییانەی سەرچاوەی خۆیان لە "مافی چارەی خۆنووسینی نەتەوەكان" دەگرت بینینی ئەلتەرناتیفە دەوڵەمەندەكانی چارەسەری بەربەست دەكرد. بەمجۆرە ڕێگای دیموكراتیزەكردنی توركیاش نەدەكرایەوە. میللیگەرایی ئۆلیگارشی بەشێوەیەكی مەترسیدار گەرم بوو، تادواڕادە دەستبەسەرداگرتنی ئابووری و سیاسەتی بەرژەوەندیپەرستی وەك سیاسەتێك لەقەڵەمدا كەدەگمەنەو نادۆزرێتەوە. ئەگەر ئەوە دانیپێدانرا بووایەو بسەلمێنرابووایە كەكوردانیش لەژێرچەتری هەمان دەوڵەتدا، لەوڵاتێكی هاوبەشدا وەك كۆمەڵەی گەلێكی ئازاد لەدەوڵەتگەلی گشتی توركیا بوونایە، چۆنییەتی ئەندامێكی دەستلێبەرنەدراوو ستراتیژی یەكێتی وڵات نیشاندرابووایە، بەگوێرەی ئەمەش سیاسەت پەیڕەو كرابووایە، تەنانەت چالاكییەكانیش لەخزمەتی ئەم ئامانجەدا بوونایە، ئەوا ئەنجامەكان بۆ هەردوولاش تابڵێی ئەنجامگیرو چارەنووسساز دەبوون. بیرنەكردنەوە لەمجۆرە ڕێچكە دەوڵەمەندو چارەنووس ئامێزانە لەنزیكەوە گرێدراوی چەمكی شەڕكردنە لەپێناو پارتیبوون ـ دەسەڵاتداریێتی ـ دەوڵەتخوازی ـ نەتەوەبوون كە لەسەرەوە جەختمان لەسەركردەوە.

لەگەڵ تێپەڕكردنی دۆگماتیزم ڕەهەندی واقیعیترم بۆ پێناسەكانی دەوڵەت، دەسەڵات، شەڕ، نەتەوەو دەوڵەتی نەتەوەیی زیادكرد، ئەمەش لەسەربنەمای سەرلەنوێ پارتیبوون و كۆمەڵگایەكی دیموكراتییانە ڕێگای چارەسەرییەكی كردەوە كە كاتێ پێویست بێ شەڕێكی گشتگیری بەرگری ڕەواش لەخۆوە دەگرێت. ئەم هەڵوێستە تەنیا وەرچەرخانێكی ستراتیژی و تەكتیكی نییە. بەڵكو تیۆری و بۆچوونێكی پارادیگمایی پشتبەستوو بەهزری زانستی و بۆچوونێكی سیاسی دەوڵەمەندو شێوازێكی پارتیبوونی لەپشتەوەیە. وەرچەرخانێك لەئارادایە نەخۆشی دەوڵەتگەرایی تێپەڕدەكات كەمۆركی خۆی لەپێشكەوتنی سەدو پەنجا ساڵەی سۆسیالیزم دابوو، چەمكی نەتەوەیی بۆرژوا بەلاوەدەنێ، شێوازی دیموكراتی و كۆمەڵكاری درێژایی مێژووی بەكۆمەڵگابوون بەبنەمادەگرێت، بانگەشەكانی ئازادی و یەكسانی بەم گۆڕانكارییە ڕیشەییانەوە دەبەستێتەوە. ئەو ڕەخنەو ڕەخنەدانەی لەسەر ئەم بنەمایە بەناوی "PKK" ئەنجامدەدرێت كێشەی سەرلەنوێ ئاواكردنەوە دەكاتە ڕۆژەڤ. بەپشتبەستن بەپووختەی ڕەوشی هەنووكەیی سەرلەنوێ پارتیبوون، بەرگری ڕەواو بەكۆنگرەبوون وەك ڕێكخستنی سەرەكی كۆمەڵگا وەك كێشەو ئەركی گرنگ چاوەڕوانی هەنگاونان و چارەسەرین.

ج ـ كێشەكانی سەرلەنوێ ئاواكردنەوە لە "PKK"دا.

لەسەرەتاكانی ساڵی 2000دا ئاماژەمان بەوەكردبوو كە"PKK" زیاتر لەئەنجامی كێشە ناوخۆییەكان بنبەستبووە، بەردەوامبوونی لەمیانەی ئەم پێكهاتەوە لەجیاتی چارەسەری بێچارەیی زیاتر بۆ كێشەو گرفتەكان دێنێ، هەربۆیە هەڵوێستی ڕاست ئەوەیە لەژێرناوێكی دیكە یان پێكهاتەیەكی تر درێژە بەمیراسی خۆی بدات. كاتێك لەبەرگرینامەدا ڕەوشی نوێمان هەڵسەنگاند، شرۆڤەمان سەبارەت چاخ و مێژوو ئەنجامدا، هەوڵماندا ناوەڕۆك و شێوەی شیمانەی سەرلەنوێ ئاواكردنەوە ڕۆشنبكەینەوە. لەسەربنەمای ئەم چەمكانە هەوڵدرا سەرەتا ئەزموونی كادەك KADEK, دواتریش كۆنگرەی گەل KONGRA GELپێشبخرێت. لەسەربنەمای ئەو زانیارییە سنووردارانەی لەزینداندا پێمگەیشت: گوایە ڕەخنەدانێكی ڕاستگۆیانەیان ئەنجامداوە، هەربۆیە بەگونجاومان بینی بەرەو پێكهاتەی نوێ بچن. لەم ماوەیەدا بۆئەوەی ئەو ئاگربەستەی لە 1998 یەكلایەنە هەوڵی بەرێوەبردنمان دەدا واتادارو هەمیشەیی بێت، لەقۆناخی ئیمرالی چەندی بڵێی هەستیارانە مامەڵەمان لەگەڵدا كرد. ئەگەربەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆش بێت وەك بەردەوامی لێكۆڵینەوەكان، لەمیانەی هەندێ دیالۆگ و

نامەناردنەوە سەبارەت بەجێبەجێکردنی ئەرك و بەرپرسیارێتییەکان هەندێ پێشنیازمان پێشکەشکرد. تاوەکو قۆناخی 11 ی ئەیلول هەوڵمدا سەبارەت بەرێگەچارە بەئومێدبم. بەڵام لەو بڕوایەدام کاربەدەستانی تورکیا هەڵمەتە نوێکەی "دژە تیرۆر"ی ئەمریکایان وەك دەرفەتێك بینی، ئەمەش رێگای لەپێش هەڵوێستێك کردەوە کەلەسەر بنەمای قڕکردن بوو. قۆناخی دیالۆگی ناراستەوخۆ داخرا.

لەم نێوەندەدا هەڵبژاردنەکانی 3 ی تشرینی دووەمی 2002 ی تورکیا کەوتە رۆژەڤ. بەرلەوەی ئاراستەی نوێی بزووتنەوە دیاربکرێ، چاوەڕوانیکردنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردنمان گونجاوبینی. بەئامانجی چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەرێگای دیالۆگەوە نامەیەکم بۆ سەرۆك وەزیرانی تازە رەوانەکرد، کەسەرۆکایەتی حکومەتی پارتی دادو گەشەپێدان (AKP)ی دەکرد و لەدوا هەڵبژاردندا بەتەنیا شانسی ئاواکردنی حکومەتی پێبڕا. بەگوێرەی ناوەڕۆکی وەڵامەکەی رێگای خۆمان دیاری دەکرد. بەلانی کەم وەڵامێکی یەکلابۆوەم دەدایەوە ئەو بنکەیەی ئومێدو چاوەڕوانی لێدەکردم. سەرباری ئەوەی چەندین جار ماوەکەی درێژکرایەوە، وەڵام نەبوو. لەدواییدا رامگەیاند کەئەو جاڕنامەیەی "رێککەوتنی دیموکراتی و ئاشتیانە"ی 1ی ئەیلولی 2003دا بڵاومکردۆتەوە لە کاتەکەی تەواو دەبێت. ئیتر "کادەك" رێگای خۆی دیاری دەکرد. وەك هەڵمەتی نوێ خۆیان 1 ی مانگی کانوونی 2003 یان دەستنیشانکردبوو. لەم ماوەیەدا پێشنیازم کرد لەجیاتی ئەوەی بزووتنەوە دووسەربێت، کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان و کادەك، لەژێر ناوی کۆنگرەی گەل یەك سەربێت راسترە، وەهام بەباش بینی کەرێکخراوی نوێ بەفەرمی لەژێرناوی کۆنگرەی گەل رابگەیەنرێ. پەسندکرا. لەکۆتاییەکانی 2003 دا بۆئەوەی لەژێرناوی ئەم پێکهاتەیە کاربکەن لەمیانەی کۆنگرەیەکی فەرمی ئەرێیان کرد. بەڵام لەجیاتی ئەو هەڵمەتەی چاوەڕوانی دەکرا، هەواڵی ئەوە بڵاوبۆوە کەپارچەبوون.

ئاشکرایە بەهیچ جۆرێك چاوەڕوانی گۆڕانکارییەکی بەمجۆرە نەبووم لەبەرئەوەی پێشتر ئەندامەکانی بنکەو کادیرانم دەناسی لەشرۆڤەکردنی رەوشیان زەحمەتیم نەبینی. لەسەردەمی بەفەرمی دامەزراندنی "PKK" وە، کادیرانی سەرکردایەتی لەئەنجامدانی نوێبوونەوەو بەدەستهێنانی پێشکەوتنی چاوەڕوانکراو دووربوون. تەنانەت لەزەحمەترین هەلومەرجیشدا لەپێناو گەشەکردنیان لەبواری تیۆری و کردارییەوە یارمەتییەکانی خۆمانمان کەم نەکردەوە. سەرباری ئەو پەروەردەیەی لەرۆژهەڵاتی ناوین بینیویانە، ئەو تواناکاری و هەلومەرجە نوێیانەی لەئارادان و ئەزموونەکانیان، لەکاتێکدا چاوەڕوانی پێهەلگرتنی نوێمان لێدەکردن، دیسان لەوە دوودڵ نەبوون کاروبارەکان بکەنە قوربانی نیازە نادیارەکانی خۆیان. هەم درەنگخستن، هەم تێپەڕکردنی سنووری شێوازەکانی خۆمان لەهەڵمەتەکانی هاوشێوەی 15 ی ئابی 1984 بەردەوام ناڕەحەتی و نیگەرانی منی زیادکرد. لەساڵی 1981 بەدواوە لەرێگای چەندین کۆنفرانس، کۆنگرەو کۆبوونەوەکانی پەروەردە، بەگووتەی پەروەردکارانە داوام لێکردوون بەگوێرەی پێویستییەکانی رێباز خۆیان بۆ پراکتیك ئاراستەبکەن. رەخنەی زۆرتوندم لێگرتن. بەڵام ئەوان زیاتر ئەو رێگایەیان هەڵبژارد کەوا من بەرەو شێوازی خۆیان ناچار بکەن. بەسووربوونەوە درێژەیان بەوهەڵوێستانەدا کەلەبەشەکانی پێشتر لەمیانەی هەڵسەنگاندنەکانمەوە خستمەڕوو. هەروەکو بەکورتی ئاماژەم پێکرد ئەم هەڵوێستە چۆن بەپاکتاوکردنی "PKK" ئەنجامگیر بوو.

لەو شێوازە پارچەبوونەی تێیکەوتوونە دیارە لەرەخنەدانەکانی سەرەتاکانی 2000 راستگۆ نەبوون. بەشێوەیەکی زۆردوور لەبەرپرسیارێتی کەهەرگیز لەگەڵ مێژوو، کۆمەڵگا، هەڤاڵێتی، شەهیدان، ئەخلاق و پێشکەوتنە سیاسییە ژیانییەکان ناگونجێ و لەپاکتاوکاری ڤێزەونتریان وەك هەڵمەتێکی نوێ بەسەر رۆژەڤی گەل و جەنگاوەرانیاندا سەپاند. بەو ڕادەیەی لەمیدیاکاندا رەنگیداوەتەوە. لەکۆتاییەکانی 2003 و سەرەتاکانی 2004 ـــ لەبەر هەرهۆکارێك بێ پارێزەرەکانم روونکردنەوەی چاوەڕوانکراویان ئەنجامنەدا. ئەم جموجۆڵە ڤێزەونە بەبێ ئاگاداری من چەندەی توانیویەتی قووڵبۆتەوەو بڵاوبۆتەوە. دەبێ

ئاماژە بەوەش بکەم لەم نێوەندەدا بۆماوەیەکی درێژ پەیوەندییەکانم لەگەڵ دەرەوە بڕابوو. ئەوەی رووبەڕووی ببومەوە، گۆشەگیری بوو لەناو گۆشەگیرییەکی گشتگیردا. ئەو ئەنجامەی لەهەندێ زانیاری زۆر سنووردارەوە پێیگەیشتم, ئەوەبوو کەهەندێ حیساب و لێکدانەوە بەشێوەیەکی قووڵ سەبارەت بەمن دەکرێت. بناخەی ئەم لێکدانەوانە ئەوەیە: هێزی کۆنترۆڵکردنی گۆڕانکاری و پێشکەوتنەکانی نییە، هەروەها زەحمەتە بەزیندوویی لەزیندان دەربکەوێت؛ هەربۆیە منیان بەبێ رۆڵ و لەکارکەوتوو لەقەڵەمدا, دەشێ بەنیاز پاکی بێت !!. لەژێرناوی تەگبیر وەرگرتن، ئەوەی چەتەگەرێتی لەناو گەریلا ئەنجامیدا، ئەمجارە هەوڵیانداوە هەمان شت لەسەر زەمینەی سیاسی، سەربازی، ئایدیۆلۆژی و جەماوەری پەیڕەو بکەن و کۆتایی پێبێنن.

لەرەوشێکی وەهادا نیم نیازو پێگەی راستی ئەو هەڤاڵانە بزانم کەجێگای خۆیان لەناو ئەم قۆناخەدا گرتووە. ئەمەش بەگرنگ نابینم. ئەوەی بۆمن ئاشکرایە ئەم هەڤاڵانە خۆیان لەسەرووی رێبازی مێژوویی، کۆمەڵایەتی، ئایدیۆلۆژی، سیاسی، رێکخستنی و کرداری دەبینن. بەگەوهەری تەڤلی پێکهاتە کۆن و نوێکان نەبوون، هێزی ئیرادەو رووناکبیری پێویستییان نیشانەندا. بەئەشقەوە بەشدارییان لەدۆزی پیرۆزی دیموکراتییانەی ئازادی و یەکسانی گەل نەکرد. یان دەستیان لەخۆیان بەرداوەو دۆڕاندنێکی بابەتییان پەسندکردووە، یاخود لەمیانەی هەڵوێستێکی تادواڕادە خود سەنترالیزم هەوڵیانداوە پێشکەوتنەکان وەك مەسەلەیەکی شەخسی بمێنێتەوەو بەمجۆرە بیکەن بەقۆچی قوربانی. خواستوویانە سوود لەتواناکارییەکانی بزووتنەوە ببینن و کەسایەتی خۆیان بژێنن. لەهەمووشیان گرنگتر ئەوەیە کەدەرکیان بەبەهای ئەو هەوڵ و کۆششانەم نەکردووە کەلەناو سنوورەکانی تورکیا، رۆژهەڵاتی ناوین، هەرە دواییش لەقۆناخی ئیمرالی خستمەڕوو، بەگوێرەی ئەمەش نەبوونە خاوەن هەڵوێستێك. ئەنجامدانی هەڤاڵێتییەکی راستەقینەیان لەدەست نەهات. دەرکیان بەوەنەکرد کەپارتیبوون بەواتای بەشدارییبوونێکی فیداکارانە دێت لەکاردا. ئاشنای جیهانی راستەقینەی سیاسەت، رێکخستن و هزرنەبوون. رێزیان لەبەهای ژن و ئازادی ژن نەگرت.

هەرەدوایی هەستیاری نائاسایی منیان بەلاوازی لەقەڵەمدا، ئایا لایەنێکی دیکەی روونکردنەوە هەیە کەبەم شێوازە خۆیان نیشانداوە؟ ئەو هەڵوێستەی هەرەدوایی نیشانیانداوە، مەسەلەکانی پارت تێپەڕدەکات، کاتێك بۆ هەوڵەکانی دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگاش درێژبۆوە، ئایا دەشێ یاخی نەبی؟ هەروەکو چۆن توانستی جەماوەریمان لەهەموو شوێنێك هەیە، سەرباری ئەوەی لەتورکیا لەسەدادە(10٪) کەمتر نییە، لەئەنجامی ئەو هەڵوێستانەی دەیسەپێنێ بەردەوام لەئاستی سەدا پێنج دەمێنێتەوە، ئەمەش لەچەندایەتی زیاتر کێشەیەکی چۆنایەتییە. ئەمەش دەسەلمێنێ کەهیچ نەیانخواستووە لەدیموکراتیزەبوون تێبگەن. هەروەکو چۆن نەیانخواستووە لەشەڕو پارتیبوون تێبگەن، تەنانەت ناخوازن دەرك بەمەش بکەن کەلەئەنجامی ساختەکاری و خۆسەپاندن ئەو گەلەی بەهەزارو یەك رەنجەوە کۆکرابۆوە خرایە ناورەوشی وازهێنان و دوورکەوتنەوە. ئەو هەڵوێستەی لەدوا هەڵبژاردنەکانی شارەوانی نیشانیاندا تەنانەت ناقۆڵاترین ئاژاوەگێڕ نەیدەتوانی سەرکەوتنی تێدا بەدەستبێنێ. دیارە کەبوون بە"دەسپۆت"ی بچووك تاڕادەیەکی مەزن لەکەسایەتییان بەجێکراوە. دواتر تێگەیشتم تەنانەت شەش ساڵە پێویستی یاسایی پاراستنی من بەرکەنارکراوە، هەندێ نامەردو بێ شەرەف لەو کۆمەك و بەشدارییەی من نارەحەتن کەدەخوازم پێشکەشی هەوڵەکانی دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگای بکەم.

هەروەکو دەزانرێ یەك دوو بەرگ رەخنەم دەرهەق بە"عوسمان ئۆجەلان" هەبوو و هەوڵی دادگاییکردنیم دا. تەنانەت کاتێك دایکم کۆچی دواییکرد بۆ تاکە جارێکیش بەتەلەفۆن هەواڵیم نەپرسی، بەهۆی چەمکی "زیان بەتێکۆشانی گەل دەگەیەنێ" پشتگوێم خست. واتە زۆرباش دەزانرێ سەبارەت بەمەسەلەی بنەماڵەگەرێتی لەناوکورداندا هیچ کەسێك نییە وەکو من هەستیاربێت. بەڵام وەرە تەماشابکە، منیشی لەناودا، بەم دواییانە تەواو دەست بەهەڵمەتێکی رەشکردن و ناوزڕاندن

کراوە. هەڵبەتە ئەمە رەفتارێکی ئاسایی نییە، هەڵوێستێکە واتایەکی زۆر دەبەخشێ. هەندێ هەڵوێستی قەبا کەتەنانەت دەوڵەتیش بەناهەقی دەبینێ و لەئەنجامدانی بەدووردەکەوێتەوە، کاتێك هەندێ سووك و ساختەکار ئەنجامیدەدەن ناتوانرێ دەرکی پێبکرێت. هەندێ هەڵوێست بەرامبەر ئەو ئەندامە نەخۆشانەی بنەماڵەمان نیشانەدرێ کەماونەتەوە، بەواتای تیرۆرو تۆقاندن دێت. تێنەگەیشتم بەم هەڵوێستە دەخوازن چی رزگاربکەن. بۆ نموونە ئەگەر مەسەلەی بەهێزبوون بێت، پەیوەندییەکەی لەگەڵ ئێمە دیارە. هەروەکو دەزانرێ نەك رێبەرایەتی، بەڵکو نەبوون بەرێبەرایەتیم شایستەیان نەبینی. کەواتە دەخوازن تۆڵەی چی بکەنەوە؟ چییە ئەوەی لەمرۆڤێکیان خواستبێ و بەدەستیان نەکەوتبێت؟.

دەشێ گێل، نەفام، ساختەکار، پیلانگێڕ، خیانەتکارو ئاژاوەچی لەناو بزووتنەوەیەك دەربکەون. هەروەکوچۆن کەسانی مەرد، دانا، بەشەرەف، دڵسۆزو بەرۆح گرێدراوی بزووتنەوە سەرهەڵدەدەن. بەڵام هیچ لەم شێوەیە تێنەگەیشتم کە بەم دواییە دەرکەوتن. بەچەتەگەرێتی سیاسی دەچوێنم. ئەگەر بەخۆشیانەوە سنووردار بووایە قەی نەدەکرد. سبەینێ بۆ بابەتە سەربازی، سیاسی، ئایدیۆلۆژییەکان درێژبێتەوە، مەترسیدارترین ئەنجامی لێدەکەوێتەوە. لەهەمانکاتدا هێندە گێل و نەفامن تێناگەن کە لەئەبوجەهل نەزانترن. مرۆڤ چۆن بەمجۆرە نزیکی بەهایەك دەبێتەوە کەتائەم رادەیە شەرەف و کەرامەت و هەموو شتێکیانی بەخێو کردووە؟. ناخوازم لەمیانەی بەناوکردنی ئەم مەسەلانە درێژی بکەمەوە. ئەم رەوشەی بەو دواییە دەرکەوتووە بابەتەکانی حزب، لادان، راکردن و هاوشێوەکانی تێپەڕدەکات. پێویستە هەڵوەستە لەسەر رەوشی دیکە بکەین. لەقەبارەی خۆی زیاتر عوسمان دەکەنە رۆژەڤ، بەم شێوەیە هەندێ راستی پەردەپۆش دەکرێت. بەگوێرەی من عوسمان رۆڵی ئەو کەرە دەبینێ کەبۆ گۆڕەپانێکی بەمین چێنراو هاژۆراوە. ئەوەی ئەنجامیداوە: لەخۆکردن بەخراپترین ئامرازی بەکارهێنان بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە. بەڵام ئەوەی ناتوانم بیهێنمە سەر زمان: جەمیل و دووران بەردەوام رێگای راکردن بەمرۆڤە پووچ و بێ کەڵکەکان دەدەن، چەندین ئەندامی دروست و راستگۆش خۆیان کوشت یان رایان کرد، یاخود گووتیان گوێڕایەڵی فەرمانەکانیان نەکردو سزادران، باشەچۆن ئەمە ڕووندەکرێتەوە؟. پارچەکردن، رەڤاندن و کوشتن تاکەی؟ ناخوازم باسی ناوی هەندێ کەس و کردارەکانیان بکەم، کەئەوان رۆڵیان پێدان. ئایا نازانن چی بارگرانییەکیان لێکەوتەوە؟

نیازپاکی و بەگوێرەی خۆشیان فیداکاری ئەم سێ هەڤاڵە ناکەمە گفتوگۆوە. بەڵام بەویژان تێناگەن کەئەوەی لەژێرناوی گەل و هەزاران بەها ئەنجامیانداوە چی لێدەکەوێتەوە؟ ئایا پێوانەکانی سیاسەت و رێکخستن بەرگەی ئەم رەوشە دەگرێ؟ ئەگەر بەقەد تۆزقاڵێك بەرپرسیارێتی کێشەی شەڕو تێکۆشانیان هەبێت رێگا بەمەدەدەن؟ لێرەدا بەدوای ئاستی رۆحی بەرپرسیارێتی ناگەڕێم. ئەوشتەی لەسیاسەت بەئەقڵ بەناو دەکرێت ئەم رەوشانەی ئاشکرا نەکردووە. ئەو رووداوەی بەرێبەرایەتی بەناودەکرێت، ئەوەنییە کەهاوار بکات و بڵێ ئەم رەوشە روویداوە، بەڵکو لەمیانەی پێشبنیکردنێکی ئاوارتەوە رێگای سەرهەڵدانی نادات. ئایا دەشێ ئەمە ئەنجامی بەڵێنەکان بێ؟. ئەوەی بەردەوام سەبارەت بەبابەتە سیاسی، رێکخستنی و کردارییەکان رەخنەدان بدات، دەشێ رێگا بەم رەوشانە بدات؟. لێرەدا بەدوای ئەوەدا ناگەڕێم کامەیان، لەکامە بواردا مافدارن، یان بەرپرسیارن. ئەگەر مرۆڤێك ئاژاوەچی، ساختەکار و پووچ نەبێ، چۆن بەهەڵوێستی خۆی دەبێتە ئامرازی ئەم رەوشە، یان دەرفەت بەسەرهەڵدانی دەدات. جارێکی دیکە دەخوازم بەبیری تەواوی هەڤالان، دۆستان و دوژمنان بێنمەوە کەبزووتنەوەکەمان، گەلەکەمان و تەواوی بەهاکانی لەژێرناویانەوە تێدەکۆشین هەرگیز شایستەی ئەم رەوشە نین، بەناوی ئەوانیشەوە دەڵێم هەرگیز دەرفەت بەمەنادەم.

بەرامبەر ئەم گۆڕانکاریانە ئەوەی لەمن چاوەڕواندەکرێ، وەك پێویستییەکی ئەو هەلومەرجەی تێیدا دەژیم، تەنیا دەتوانم سنووری رێبازەکانی خۆم دیاری بکەم. لەسەرووی ئەم رێبازانەوە ناچاردەبم بەرامبەر ئەو هەڤاڵانەی نزیکەی بیست ساڵە رێبازی جەماوەری و شەڕو شێوازی پارتیبوونی خۆیان بەڕێوەدەبەن، رێبازی پارتی، رێکخستن، چالاکی و جەماوەری خۆم

دیاری بکەم. ناتوانرێ چاوەڕوانی بکرێ یەکێکی وەك مـن تەسلیمیان بێ و خۆیـان بداتـە دەسـتەوە. تەنانـەت ئـەوەی دەوڵـەت نـەیوێراوە باسـی بکـات، ئەمانـە چۆن دەوێـرن؟ بـەلانی کـەم پێویـستە ئەمانـە هێنـدەی دەوڵـەت بـزانن جـددی بـن. تەنانـەت دوژمنایەتی منیش بکـەن، دەبێ ئـەم جددیەتـە نیـشانبدەن کـەبۆ دوژمنایـەتی پێویـستە. بەتایبـەتیش ئەگـەر وەکـو بانگەشـە دەگەن دەخوازن هەڤاڵێتی و هاوڕێییەتی بکەن، پێویستە نزمترین هێزی خۆگونجانـدن لەگـەڵ پێداویـستییەکانی ئـەم راسـتییە نیـشانبدەن. بەدڵـەوە ئامـادەم وەك مـەیلێك (گروپێـك) لـەناو راسـتینەی کۆنگرەکەمانـدا پەسـندیان بکـەم. ئەگـەر تـۆزێکیش دڵخوازی لەوانـەدا هـەبێت، بـەلانی کـەم لەسـەربنەمای شایـستەبوون بەئەرکـەکانی کۆنگرە، مـسۆگەر پێویـستە بتـوانن خـاوەن هەندێ هەنگاوبن. بەشێکی زۆری گەلە هۆشیارەکەمان، تادواهەناسەم شتێك لەمن چاوەڕوان دەکـەن. ئەگـەر لەجێبـەجێکردنی ئەمەدا نابنە یارمەتیدەر، ئەوا دەخوازم نەبنەڕێگر.

وەك ئـەنجام، ئەوانـەی خۆیـان وەك لایـەنێك دەبیـنن، بـەڕێزەوە پێـشوازی لـەو مافـەیان دەکـەم کـەوەکو مـەیلێك خۆیـان رێکبخـەن. دەتـوانن لـەبوارەکانی ئایـدیۆلۆژی، سیاسـی، سـەربازی، کۆمەڵایـەتی و ژیـان گـوزارە لـەخۆیان بکـەن و ببنـەخاوەن پراکتیـك. تەنانـەت دەتـوانن ببنـە پـارت. بـەڵام بچووکترین پێویـستی ئەمـە گوێڕایـەڵیکردنی دیـسپلینی کۆنگرەیـە. پێویـستە نەکەونە ناو ئەو هەڵوێستانەی ئیرادەی کۆنگرە تێپەڕدەکات، پـەیڕەوکردنی ئـەو دیـسپلینەی بـۆ ئەمـە پێویـستە، خاوەنـدارێتی ئەرکەکانیان بکەن. هەڵبەتە منیش وەك پێویستییەکی بەرپرسیارێتیم، مافی بەردەوامکردن و درێژەدان بەرێبازی خـۆم هەیـە. جێبەجێکردنی ئەوماف و ئەرکانەی ئازادی هـزرو ئـیرادەم پێـی بەخـشیوم مـەرجی سـەرەکی و لەپێـشینەی بـوون بـەمرۆڤێکی سەربەرزو شەرەفمەندە. بەکارهێنانی ئەم مافە لەسەر ئەو کۆڵەکە هزریانەی ماوەیەکی درێـژە پـێم گەیانـدووە, لەسـەربنەمای سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی "PKK" وەك ئـەرکێکی سـەرەکی دەزانم. کـاتێ ئـەم مەیلانـە باشـتر خۆیـان بناسـن، لەوانەیـە کـاتێ هەلومەرجـەکانی یەکگرتنـەوە دەرەخسێ، ئـەوا سـەرلەنوێ ئاواکردنـەوە بـۆ هەڵـسەنگاندن گونجـاوترین رێگایـە. لەرەوشـێکدا هەزاران شەهادەت بەگووتنەوەی ناوی من رێگای کاروانی گرتۆتەبەر، بـەملیۆنانی هەڵساندۆتە سـەرپێیان و بەهـەزاران هـەڤاڵ بەئومێدەوە چاوەڕوانیم لێدەکەن، لەو باوەڕەدام راستترین هەڵوێستی پێویستە پەیڕەوی بکەم ئەمەیانە.

تکام لەهەڤاڵان ئەوەیە بەرامبـەر گیروگرفتـەکان نەکەونـە نـاو هەڵوێـستێکی سـۆزداری نابـەجێوە، بەپێچەوانەوە هـەروەکو لەسـەرەتا ئامـاژەم پێکـرد نـابێ تـەنیا زانـابن، بـەڵکو پێویـستە بـزانن وەك کەسـایەتییەکی رێکخـستنی و سـەربازی و سیاسـی راستەقینە شایستەی گەل و مرۆڤایەتی بن. هیـچ شـتێك درەنـگ نەکـەوتووە. بەمـەرجێ تـەنیا بتـوانین بەشـێوەیەکی شایـستە لەخاوەندارێتیکردنی ئەرکە مێژوویيە هەنووکەییەکاندا سەربکەوین. سەرکەوتن و یەکێتییەك وەك خاوەنی هەڵوێستی مەزنی پشتبەستوو بەراستییە گەورەکان، بەردەوام لـەو دەسکەوتانە بـەهادارترە کەسەرچاوەی خـۆی لەراوەسـتەی ناتـەواوی هـەزاران کەسی هەڵوێـست بـچووك وەردەگرێـت و بەرێکـەوت بەدیـدەهێنرێ. چەتە کۆنەکانیـشی لـەناودا، پێویـستە بـزانن بـەهۆی ئـەو رەوشەی تێیکەوتوون، لەخۆیان زیاتر، من چـەندە خـەمگین بووم. سـەرباری ئـەوەی تاڕادەیـەکی بـەرز راسـتینەی کۆمـەڵگامان تایبەتمەندێتییە نەفرەتلێکراوەکانی دەسەپێنێ، بەڵام دیسان متمانەو باوەڕکردن بەمرۆڤ مەرجە. جێگای باسە ئەو هەڤاڵانـەی ماوەیەکی درێژە بەرگەی هەلومەرجی هەرە سەخت و قورسیان گرتووە، ئەگەرخۆیان بناسن و رێزیـان بـۆ خۆیـان هـەبێ، ئـەوا ناشێ شێوازی سیاسی، رێکخـستنی و چالاکییەکانی ئەمـە جێگیرنەکـەن. هیـوادارم لـەماوەی درێـژدا ببنـە خـاوەن سـەرکەوتنی گەورە، جارێکی دیکە دووپاتی دەکەمەوە لەسەر رێگای راست هاوکاری و یارمەتییەکانمان بەردەوام دەبێت.

1. لەبەشـەکانی پێـشوودا هەوڵمانـدا ئـەو هەڵوێـستە تیـۆری، کۆمەڵایـەتی و مێژوویيـە پێـشکەش بکـەین کەسـەرلەنوێ ئاواکردنەوەی "PKK" وەك کۆڵەکە پشتی پێدەبەستێ. بـەگوێرەی هەلومەرجـەکانی جیهـان، ناوچـەکەو وڵاتەکـەمان هەنـدێ تایبەتمەنـدێتی سـەرمایەداریمان هەڵـسەنگاند کەسیـستەمی باڵادەسـتی کۆمـەڵگای ئـەم سـەردەمەمانە. لەمیانـەی ئـەم

هەڵسەنگاندنەوە خواستمان بەکورتی ئەوە نیشانبدەین کەبەشێوەیەکی تێکچڕژاو لەگەڵ پەرەسەندنی کۆمەڵگای دیموکراتی و ڕێنمایی مێژوویی ئاراستەیەکی چۆنیان دیارکردووە. بەبڕیارەوە جەختمان لەسەرئەوە کردەوە کەپێویستە پرۆسەی مێژوویی پرۆژەکانی ئازادی و یەکسانی بەشێوەی ئەڵقەکانی زنجیرەیەك ببینرێن. هەروەها دیسان هەوڵماندا روونبکەینەوە چۆن بانگەشەکانی یەکسانی و ئازادی چەواشەکراون، ناوەڕۆکەکەیان پووچکراوەو لەلایەن هێزە ستەمکارو بەکاربەرەکان پارچەی جیاوازی خراوەتە سەر. لەژێرسایەی هەمان پارادیگمادا خواستمان راستینەی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین و رەوشی ئەمڕۆمانی نیشانبدەین. بەشێوەیەکی تیۆری باسی ئەوەمانکرد چۆن دیاردەو کێشەی کورد لەناو تەواوی ئەم چوارچێوانە جێگیردەکرێ و بە چ شێوەیەك دەتوانرێ لەچارەسەری نزیکبینەوە. پرۆسەی ئاواکردن و گەشەکردنی "PKK" مان شرۆڤەکرد، روونمانکردەوە کەچۆن بەهۆی فاکتەرە ناوخۆییەکان بنبەستبوو، دەستنیشانمان کرد کە لەمیانەی رەخنەو رەخنەدانەوە پێویستی بەسەرلەنوێ ئاواکردنەوە هەیە. هەروەها هەندێ لایەنی نوێی رێبازە سیاسی و تیۆرییە هەنووکەییەکانمان لەئاست و رەهەندەکانی بزووتنەوە ژینگەپارێزی، کولتووری و فێمینیستەکان هەڵسەنگاند. بەجەختکردنەوە ئاماژەمان پێکرد کاتێك سەرلەنوێ ئاواکردنەوە تەواوی ئەم پێشکەوتنانە لەخۆوە بگرێ واتاداردەبێ.

لەرەوشێکی وەهادا بەپشتبەستن بەتەواوی شیمانەو گریمانەکانی ئەم بابەتانە، کاتێك سەرلەنوێ ئاواکردنەوە بۆ "PKK" دەبێتە رۆژەڤ، یەکەم کاری ئەنجامبدرێ دەست نیشانکردنی رەوشی واقیعی جیهان، ناوچەکەو نیشتمانە. بەبێ دووبارەکردنەوەی ئەو شرۆڤانەی لەبەشە پەیوەندیدارەکان ئەنجامامان دا، با لەمیانەی کورتە باسێکەوە پەیوەندی نێوان بابەتەکان دابنێین. سەرمایەداری جیهانی کەئەمریکا سەرکێشی دەکات نەوەکو سەدەی نۆزدەهەم دەرفەتی هەنگاونانی بۆ کۆلۆنی نوێ هەیە، نەوەکو سەدەی بیستەم هەلومەرجی ئەوە ماوە لەرێگای شەڕ جیهان دابەشبکەنەوە. هەلومەرجە نوێکانی جیهانگیری بەهی کۆن ناچێ. ئەگەر لێکچوونێکیش هەبێت، جیاوازی تایبەت بەخۆی هەیە. شۆڕشی زانستی ــ تەکنۆلۆژی دەرفەتێکی جیاوازتری قازانج بەسیستەمی سەرمایەداری دەبەخشێ. ئەویش توانستی قازانجی کۆمپانیاکانی سەرووی نەتەوەکانە (ئولترانەتەوە) کە لەگەڵ جیهانگیری سەریهەڵدا. ئەوانەی دیاردەی کۆمەڵایەتی بەگوێرەی خۆیان ئامادە دەکەن و لەژێر چوارچێوەی یاسایی گونجاودا بوونەتە هێزی حوکمڕانی نوێ کۆمپانیا فرە رەگەزەکانن. لەمیانەی ئەم شێوازەی کۆمپانیاکان دەتوانن بەرزترین ئاستی قازانج بەدەست بێنن. شێوەکانی دەوڵەتی نەتەوەیی دەگۆڕدرێ کەرۆڵی بەربەست دەبینێ، ئەو پێکهاتە سیاسییانە دەئافرێنرێن کەرێگری ناکەن، بەمجۆرە لەزەمینەی قەیران ــ گێژاویشدا سیستەم هەوڵی بەدەستهێنانی زیاترین قازانج دەدات.

ئەم راستینەیە لەو پەیوەستداربوونە چڕەدا شاراوەیە کە لەسەرەتاکانی 2000وە سیستەم بەرێبەرایەتی ئەمریکا بەرامبەر بەرۆژهەڵاتی ناوین نیشانیدەدات. ناوچەکەمان بەو پێکهاتە سیاسی، سەربازی، ئابووری و هزرییەی ئێستای سەرەکیترین کۆسپی پێش سیستەمە. کێشەکانی ئیسرائیل ــ فەلەستین، نەوت، کێشەی کورد، ئیسلامی رادیکاڵ، پێکهاتەی سیاسی دەسپۆت، ئەو ئابوورییەی بێکاری و هەژاری لێدەکەوێتەوە، بابەتی ژنانی لەئازادی بێبەرین و گلۆڵەبوونی کێشەکان ناوچەکەی کردۆتە خاڵی لاواز. واتە کردوویەتی بەسگی سیستەم. سیستەمی حوکمڕان بەرامبەر بەم رەوشە ئۆقرەی نامێنێ و ئارامی لەبەردەبڕێ. ئەو راستینە سیاسییەی هێزە سیاسییەکانی رۆژهەڵاتی ناوین ناخوازن لێی تێ بگەن ئەمەیە. ئەمانە وەها مەزندە دەکەن و لەو بڕوایەدان کە لەمیانەی لۆژیکی سیاسەتی کلاسیك و تیۆری دەوڵەتی نەتەوەیی دەتوانن درێژە بەهەبوونی خۆیان بدەن. ئەمریکا وەك هێزی ئیمپریالی سیستەم ناچارە پێویستییەکانی بەرپرسیارێتی خۆی جێبەجێ بکات. ئەم رکابەرێتییەی هێزەکانی دیکە بەئامانجی رزگارکردنی رواڵەتی خۆیان لەگەڵیدا نیشانیدەدەن تەفرەدان و خەڵەتاندنە. ئەمانە زیاتر خۆپیشاندانن لەپێناو بەدەستهێنانی کاریگەری زیاتر. لەقۆناخێکی داهاتووی نزیکدا تەواوی هێزو دەزگا گرنگ و

لەپێشەکانی سیستەم، هاوپەیمانێتی خۆیان بەهێزدەکەن و زیاتر روو لەناوچەکە دەکەن. وردەوردە کارگێڕی بزاڤەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، ناتۆ، یەکێتی ئەوروپاو گروپی هەشت وڵاتە پیشەسازییەکە(G8) لەناوچەکە جێگیردەکرێن. لەهەندێ کات و شوێندا هێرشی سەربازی بەرامبەر وڵاتی وەکو ئێراق و ئەفغانستان رێکدەخرێ، هەڕەشە لەهەندێکی دیکە دەکرێ، هەندێکی دیکەشیان چەکی ئابوورییان لەبەرامبەر بەکاردەهێنرێ و ناچاردەکرێن لەگەڵ سیستەم بین بەیەك. بەرامبەر ئەو وڵات و پێکهاتە سیاسییانەی بەرخودانیان لەبەرامبەر نیشاندەدرێ ئابلۆقە فراوانتردەکەن و لەمیانەی ئیفلاس پێکردنیان هەوڵی ئەنجام وەرگرتن دەدەن. چەندین پرۆژەی سەرلەنوێ ئاواکردنەوە بەسەر ئابوورییە بێ بەرهەمەکاندا دەسەپێنرێ، هەوڵی ریفۆرمیزەکردن و لیبرالیزەکردنی دەدرێت. بەگوێرەی مەزنەدەکان ناوچەکە بەچارەگە سەدەیەك لەگەڵ سیستەم دەگونجێ. دابڕانێکی سەرتاپاگیری چاوەڕوان ناکرێ؛ چونکە بنەمای ئابووری، سەربازی، زانستی و تەکنیکی ئەمە بوونی نییە. بۆماوەیەکی درێژیش ناتوانێ وەکو دەوڵەتی یاخی بمێنێتەوە. لەسەرەوە سیستەمی حاکم، لەژێرەوە کۆمەڵەکانی گەل بۆماوەیەکی درێژ ئەم پێکهاتە سیاسی و ئابوورییە بێبەرهەمانە پەسندناکەن و هەڵناگرن. لەسەرووی هەموانەوە ژنان و تاکەکان ناچارن لەبواری ئازادیدا تەکانیدەن.

لەکاتێکدا سیستەم لەناو پێکهاتەی دەزگاو لۆژیکی خۆیدا بەم شێوەیە رەفتاردەکات، خودی کۆمەڵگای راستەقینەو هێزەکانی گەل چۆن هەڵسوکەوت دەکەن؟ مەسەلەی گرنگتر ئەم پرسیارەیە. گەلانی ناوچەکە ناچارنین و لەرەوشێکی وەهاشدا نین سیستەم وەك خۆی پەسندبکەن. ئیتر وەکو جاران هێزی یەدەگی دەوڵەتی نەتەوەیی نییە، لەسەر ئاراستەی ئامانجە دیموکراتی، یەکسانی و ئازادییەکانی خۆیدا گەڕان بەدوای چارەسەری کەوتۆتە رۆژەڤەوە. بەرامبەر هەوڵە سنووردارەکانی سیستەم لەپێناو دیموکراسیدا، هەوڵەکانی گەلانیش لەپێناو دیموکراتیزەبووندا کەبزووتنەوە کولتووری، فێمینستی و ژینگەپارێزییەکانی لەهەناوی خۆیدا هەڵگرتووەو لەدەوڵەتخوازی دوورن، بەلانی کەم هێندەی جیهانگیری سیستەم واتایەکی سەرووی نەتەوەکان (لەنەتەوە باڵاتر) لەخۆوە دەگرێت. لەبەرئەوەی لەبەشەکانی پێشوودا هەڵسەنگاندنمان سەبارەت جیهان و ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوین ئەنجامدا، دووبارەی ناکەینەوە، ئەم کورتەباسە تێردەبینم.

رۆڵی کلیلی راستەقینەی چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەپەیوەندییەکانی "کورد ــ تورك"ی تورکیادا شاراوەیە. توانستی کوردەکانی ئێران، ئێراق و سوریا سنووردارە کەبەتەنیا سەربەخۆ بەچارەسەرییەکی هەمیشەیی بگەن. زیاتر وەك هێزی یەدەگی چارەسەری دەستەمۆ دەکرێن. ئەو قۆناخانەی کێشەی کورد لەئێراق بەخۆیەوە بینی ئەم راستییە دەسەلمێنێ. دیاردەی ئەمڕۆی دەوڵەتی فیدراڵی کورد لەبەرامبەر هەوڵەکانی کۆماری تورکیا بۆ بە "تیرۆریست" لەقەڵەمدانی "PKK" لەلایەن ئەمریکاو هاوبەشەکانی وەك پێکهاتەیەك هاتۆتەئاراوە. ئەگەر کۆماری تورکیا دەرفەتی پێنەدابایە، ئەوا ئاشکرا دەبوو کە ئەمجۆرە چارەسەرییە ناشێ. ئەنجامەکەشی ئەو گێژاوەیە کەئێراق تێیکەوتووە. دیارنییەو نازانرێ کۆتاییەکەی بەچی ئەنجامگیردەبێ. گرێدراوی ئەمەش پێکهاتەی کوردستانی فیدراڵ کەخەسڵەتی فیۆداڵ ــ بۆرژوا لەخۆوە دەگرێت دیارنییە بۆماوەی درێژخایەن بەکامە ئاراستەدا دەڕوات، بەتایبەتیش دوای ئێراق کاریگەرییەکانی لەسەر ئێران، تورکیاو سوریا نازانرێ. نیگەرانی و مەترسی ئەوە لەخۆوەدەگرێت شێوازی فەلەستین ـ ئیسرائیل لەسەرتاپای ناوچەکەدا هەم قووڵ، هەم بەرفراوان بێت. میللیگەرایی کورد کەوەك جۆرێکی ئایدیۆلۆژیای ناو سیستەمی سەرمایەداری پێشدەکەوێت، بەردەوام ئەو توانستە لەخۆوەدەگرێت هەم میللیگەرایی عەرەب، فارس و تورك بەشێوەیەکی زێدەڕۆتر رق ئەستوور بکات، گرێدراوی ئەمەش کێشەکانی بەرەو بنبەستبوون و قوفڵبوونی تەواو ببات. بەرامبەر ئەمەش دەشێ شێوازێکی چارەسەری ببێتە رۆژەڤ کەسنوورە سیاسییەکان وەك پێدراو پەسنددەکات، بەڵام دان بەستاتۆی یاسایی کوردان دادەنێ و لەناوەڕۆکەوە گرێدراوی دیموکراتیزەبوون و ئازادییەو کولتووری تایبەت و رەسەنیان بەبنەمادەگرێت، مۆدێلێکی نوێی چارەسەری دوور لەمیللیگەراییە. لەبەرئەوەی ئەم

شێوازە هەم زیاتر توانستەکانی ئاشتی، هەم لەچوارچێوەی پەکپارچەیی گەل و دەوڵەتی ئەم وڵاتانە بەدیدێت، زیاتر لەگەڵ راستینە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان کۆك و گونجاوترە. بەشێوەیەکی گشتگیرو فراوان خستنەڕووی تەواوی کۆڵەکەو ئەنجامەکانی هەردوو شێوازی چارەسەری، ئەوا رۆڵ و کۆمەکێکی باشی لەبینینی ئەگەرو پێشهاتەکانی قۆناخی داهاتوو دەبێت.

2. تورکەکان لەمێژوودا، پەیوەندییان لەگەڵ کوردەکان: سەرلەنوێ گەرمکردن و بەرۆژەڤکردنی پرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوین لەلایەن ئەمریکاوە، کۆماری تورکیا ناچاردەکات بەشێوەیەکی واقیعیتر نزیکی دیاردەی کوردو پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکەکان ببێتەوە. هەربۆیە رەهەندی مێژوویی پەیوەندی "کورد ـــ تورك"یش بایەخداردەبێ. زۆرچاك دەرك بەوەکراوە کەسیاسەتەکانی نکوڵیکردنی سەر بەقۆناخی نزیك زەنگی مەترسی لێداوە. بۆئەوەی مەسەلەی کورد ـــ تورکیش وەك تراژیدیای فەلەستینی لێنەیەت، پێویستە لەمە بەدواوە لەچوارچێوەی رێنماییەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی هەڵوێستێکی دیموکراتییانەی خولقکار نیشانبدرێت. سەرباری ئەوەی لەم قۆناخانەی دوایی باسی هەندێ گووتەی دیموکراتییانە دەکرێ، بەڵام لەبەرئەوەی پراکتیکی نکوڵیکردن لەناوەوە (بەڤسەنا) لەراستڕەوەکانەوە تادەگاتە چەپڕەوەکان تەواوی سیستەمی کۆمەڵگاو دەوڵەتی بەستۆتەوە، رێگای لەپێش هەلومەرج و زەمینەیەك کردۆتەوە کەئەندێشە (دڵەڕاوکێ)ی گەورە لەخۆوە دەگرێت و پێکدادانی مەزنی لێدەکەوێتەوە. بەپاڵپشتی ئەو ئەزموونەی پێیدا تێپەڕین، بۆئەوەی بەشێوەیەکی گەرەنتیکراو ئەندێشەکان لەئارادا نەمێنێ و، رێگا لەپێش کەش و زەمینەیەك بکرێتەوە ئومێدو چاوەڕوانی چارەسەرییەکی راستەقینەی لێبکرێت: ئەوا پێشکەشکردنی هزرو پێشنیاز لەلایەن ئێمەوە گرنگی و بایەخێکی مەزنی دەبێت.

مێژوو خاوەن بەڵگەی گرنگ و بایەخدارە کەکۆمەڵەی قەومەکانی باشووری سیبریا کەتورکە بەراییەکانیش جێگای خۆیان تێدادەگرن، لەسەردەمەکانی 9000 ـ 7000 ی پ. ز لەلایەك بۆ باشوور بەرەو چین، کۆریا، ژاپۆن و مەغۆلستان و ئاسیای ناوینی ئەمڕۆو رۆژئاوا شۆڕبوونەتەوە؛ هەرچی بەشێکی دیکەیە لەرێگای گەرووی "بیرینگ" ی نێوان کیشوەرەکانی ئاسیاو ئەمریکا لەکیشوەری ئەمریکا بڵاوبۆتەوە. تایبەتمەندێتییە ئەتمۆلۆژی و نەژادییەکان بەشێوەیەکی بەهێز جەخت لەسەر ئەم دەستنیشانکردنانە دەکاتەوە. لەهەمانکاتدا ئەم سەردەمە بەو قۆناخە پێناسە دەکرێ کەشۆڕشی نیئۆلیتیك (شۆڕشی گوندو کشتوکاڵ)لەبنارەکانی زنجیرە چیای زاگرۆس ـــ تۆڕۆس ئەنجامدراو تاوەکو کەنارەکانی زەریای گەورە، کەنارەکانی چین بڵاوبۆوە. مەزەندە دەکرێ بەرهەمداری و بەپیتی شۆڕشی نیئۆلیتیك ئەم قەومانەی خستۆتە جموجۆڵەوە. بۆماوەیەکی درێژ بەردەوام زیادبوونی ژمارەیان لەرێگای ئەم سیستەمە نوێیەوە، دیاردەی کۆچی بەردەوامیش واتادار دەکات. لەم ناوچەیەدا یەکەمین شارستانییەتی زانراوە سالانی 2000ی پ. ز لەچین سەرهەڵدەدات. لەئاواکردنی شارستانییەت لەلایەن ئەم قەومانەوە رووباری زەرد هەمان ئەو رۆڵە دەبینێ کەرووبارەکانی نیل، دیجلە ـ فورات و پەنجاب بینیویانە. شیمانە دەکرێ چەندە شارستانییەت لەدەوروبەری رووباری زەرد پەرەیسەندووە، دووچاری پەلامارە بەردەوامەکانی قەومەکانی دەوروبەرهاتووە.

هەروەکو دەزانرێ لەیەکەمین سەرچاوە نووسراوەکانی چین هاتووە لەسالانی 200ی پ. ز لەلایەن قەومەکانی دەوروبەر شارستانییەکەیان دووچاری هێرش و پەلامار هاتووە. بۆچوونێکی گشتی پەسندکراو ئەوەیە کەئویگورەکان تورکە سەرەتاییەکانن. لەمێژووی فەرمی تورکەکانیشدا کاتناسییەك (کرۆمۆنۆلۆژی) جێگای باسە کەلەساڵی 209ی پ. ز بەمەتاخان دەستپێدەکات. لەچەندین بەڵگەی مێژووییدا دەشێ ئەوە ببینرێ کەتورکە بەراییەکان هەم بۆ باشوور چین، ئەفغانستان و هیندستان هەم بەرەو رۆژئاوا بۆ کازاخستانی رۆژگاری ئەمڕۆمان، لەوێشەوە بەرەو ئەوروپا بزووتنەوەیەکی گەورەی کۆچبەری ئەنجامداوە. ئەوشوێنانەی هەرەزێدە تێیدا چڕبوونەتەوە کرگستان، کازاخستان، ئۆزبەگستان، تورکمانستان و ناوچەی ئویگوری چینی رۆژگاری ئەمڕۆمانە. لەسەدەی چوارەمی زاییندا لێشاوێکی گەورەی هونەکان بەرەو ئەوروپا دەستپێدەکات. ئەو

لێشاوانەی لەچوون بەرەو چین سەرکەوتنیان بەدەستنەهێنا ئاراستەی خۆیان دەگۆڕن. بەرامبەر بەو کرانەوەیەی باکووری قەزوین و دەریای رەش، بەرەو باشووری قەزوین و دەریاچەی ئارال، بەرەو ئەفغانستان بڵاوبوونەوە لەزیادبووندایە. زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و بەستەڵەکی لەکەش و ئاوو هەوا کۆچ خێراتر دەکات. لەسەدەی شەشەمی زایینی چەندەی دەچێ سنوورەکانی ئێران تەنگەتاوو قەرەباڵغ دەبێ. قەرەباڵغبوونی سنوورەکانی ئەم ناوچەیە تاوەکو سەردەم (ئیمپراتۆریەت)ی پارسەکان درێژدەبێتەوە. چیرۆکەکانی ئەفراسیاب و توران هی ئەم قۆناخەن.

لەکۆتاییەکانی سەدەی حەوتەمی زایینیدا بڵاوبووونەوەی ئیسلام و گەیشتنی بەسنوورەکانی ئاسیای ناوین قۆناخێکی نوێ لەمێژووی تورکەکان دەکاتەوە. لەبەرئەوەی دەوڵەتەکانی گوك تورك کەپێشتر دامەزران و دەوڵەتی ئۆیگاری دواتر تایبەتمەندێتی کۆنفیدراسیۆنیان هەبوو، شیمانەو مەزەندە دەکرێ بەئەزموونی دەوڵەتێکی ناوەندی بەهێز تێپەڕنەبووبن. تاوەکو ئەو قۆناخە دەوڵەتی ناوەندی دیاردەیەکە بۆماوەیەکی درێژ لەئاسیای ناویندا نەبووە. ئەو کۆنفیدراسیۆنانەی لەژێرکاریگەری چین و هیندستان تاقیکراونەتەوە بەردەوام تەمەنی یەك دوو نەوە بووە. هەرە دوایی ئیمپراتۆریەتی جیهانی مەغۆلییش ئەم دیاردەیەی تێپەڕنەکردووە.

هۆکاری پەسندکردنی ئیسلام لەلایەن تورکەکانەوە لەهۆکارە ئایینییەکان زیاتر، ئامانجی سیاسی بوو. بەرلەوەی ئیسلام پەسندبکەن، تواناکاری کۆچی باوو نەریتییەکانیان بۆ هەڵناکەوێت. ئەو ئیسلامبوونەی لەسەدەی نۆیەم خێرابوو، لەمیانەی یەکەمین پێکهاتەی سیاسییەوە خێراتربوو. دوای میرنشینی قەرەخان یەکەمین میرنیشینی سەلجۆقییەکانی مەروە یەکەمین ئەزموونی دەوڵەتی ئەرستۆکراتەکانی هۆزی تورکە.

دوای سەرکەوتنی 1040 لە"داندانکان" لەنەریتی دەوڵەتی ئێران رێگای لەپێش بنەماڵە(خانەدان)ی سەلجۆقی کردەوە. لەساڵی 1055 خەلیفەی موسڵمانان لەبەغداد سەلجۆق بەگ وەك سوڵتان رادەگەیەنێ، بەمجۆرە سنوورەکانی خانەدانی خۆی لەدەریای سپییەوە تاوەکو ئەفغانستان فراوانکردووە. بۆ یەکەمین جار لەم قۆناخەدا لەسەربنەمای دەرەبەگایەتی بەشێوەیەکی بەرفراوان جیابوونەوەی چینایەتی لەناو هۆزەکانی قەومی تورك سەریهەڵداوە. لەکاتێکدا توێژی ئەرستۆکراتی بۆتە خاوەن دەوڵەت بەشێوەی چەندین میرنشین لەرۆژهەڵاتی ناوین بڵاودەبوونەوە، هەرچی تورکمانەکانن کەتوێژی هەژاریان پێکدەهێنا، بەشێوەیەکی سەربەخۆو لەئاستێکی نزمدا وەك تیرەی رەوەند درێژەیان بەژیانداوە. ئەو ژمارە زۆرەی تورکەکان کەلەماوەی نێوان هەردوو سەدەی 10 ــ 15 لەرۆژهەڵاتی ناوین چڕببوونەوە، لەلایەك بە"شاربوون" و جیابوونەوەی چینایەتی، لەلایەکەی دیکەشەوە دەوڵەتبوون لەناویەکتردا پێشکەوتنیان بەخۆیانەوە بینیوە. نزیکەی سەدەیەك دوای سەڵتەنەتە گەورەکەی سەلجۆقییەکان ئەتابەگ و میرنشینەکان لەجێگایاندا ئاواکراوە. ئەوانەی ئەنادۆڵ یەکیانگرتووەو دەوڵەتی سەلجۆقی ئەنادۆڵیان دامەزراندووە کەناوەندەکەی قۆنیابوو. بەمجۆرە یەکەمین دەوڵەتی ئیسلامی لەئەنادۆڵ دامەزرا.

دوای قۆناخێکی دووسەد ساڵی (1076 ــ 1308) و بەرزبوونەوەی میرنشینی عوسمانی لەسەر میراسی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی، بەگەورەترین ئیمپراتۆریەتی ناوەندی دەرەبەگایەتی خانەدانی عوسمانی تورکەکان ئەنجامگیربوو. لەسەردەمی گەشەکردن و هەڵکشانی سەرمایەداریدا ئەم ئیمپراتۆریەتە کەوتبووە رەوشێك کەبەرامبەر بەرۆژئاوا، رۆژهەڵات بپارێزێ. سەدەکانی 19 و 20 ئەو سەردەمەبوو کەنەتەوەگەرایی بۆرژوای تورك گەشەیکرد؛ لەساڵی 1840 (دامەزراندنی پەرلەمان) تەنزیمانی ئەنجامدا، 1876 مەشروتییەتی یەکەم، 1908 مەشروتییەتی دووەم، لەدوای پاشماوەکانی یەکەمین شەڕی جیهانی لەمیانەی شەڕی رزگاری 1920 کان دەوڵەتی ئاواکرد، بەمجۆرە قۆناخی دەوڵەتی نەتەوەیی تورك دەستیپێکرد، قۆناخی کۆماربووە بەسەردەمی پەرەسەندنێکی مێژوویی کەتورکەکان وەك نەتەوەیەکی هەمیشەیی لەئەنادۆڵ شێوەیان گرت و لەسیستەمی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتییەوە بۆ سیستەمی کۆمەڵگای سەرمایەداری وەرچەرخان ئەنجامدرا. لەبەسەرهاتی نزیکەی

هەزار ساڵی تورکەکان لەرۆژهەڵاتی ناوین و، چڕبوونەوەیان و بەدەوڵەتبوونیان لەئەنادۆڵ، دیسان شانبەشانی بەدەوڵەتبوون لەتیرەو هۆزەوە وەرچەرخانیان بۆ نەتەوەی تورکیا، لەراستیدا ئەو پەیوەندییانەی لەگەڵ کوردانیان بەستووە رۆڵێکی ستراتیژی لەمەدا بینیوە.

پەیوەندی مێژوویی کورد ــ تورک دەتوانرێ تاوەکو چیرۆکی ئەفسانەیی زەردەشت ــ توران درێژبکرێتەوە. کۆچ و بڵاوبوونەوەی ئیمپراتۆریەتی ماد ــ پارس بەرەو ناوچەکانی تورکەبەراییەکان ئاستێکی ئەفسانەیی بەپەیوەندییەکان بەخشیوە. لەکاتێکدا لەسەردەمی پارت و ساسانییەکاندا تیرە تورکەکان لەئەیالەتی خوراسانی باکووری رۆژهەڵاتی ئێران چڕدەبوونەوە، لەگەڵ ئەو تیرە کوردانە کەوتبوونە پەیوەندییەوە کەبەهۆی جیاوازەوە بۆ ئەو ناوچانە ئاراستەیان گرتبوو. پەیوەندی بنەڕەتیش لەقۆناخی باڵادەستی سوڵتانە گەورەکانی سەلجۆق بووە. لەئازەربایجان، ئەرمەنستان، میزۆپۆتامیاو ئێراقی ئەمڕۆمان لەماوەی سەدەکانی نێوان 10 ـ 15 تیرەکانی کوردو تورک لەژێرسایەی پەیوەندی و ناکۆکی ئاڵۆزدا لەناو یەکتردا ژیاون. دوای سەلجۆقییەکان، دەوڵەتی ئاق قۆینلارو قەرەقۆینلار، ئارتوك ئۆغڵاری و ئاتا بەگەکانی موسڵ، چەندین میرنشینی تورکان لەگەڵ میرنشینەکانی کوردان بەیەکەوە بەردەوام بوون. هاوبەشی لەئایینی ئیسلام و، دەوڵەتە مەسیحییەکانی ئەرمەنی و بێزەنتی کە لەبەرامبەریان بوون، دواتریش شاڵاوەکانی کرستیانەکان (مەسیحییەکان) رۆڵێکی ستراتیژی لەمەدا بینیوە.

دەستەواژەی "کوردستان" یش لە 1155 دا وەك یەکینەی بەڕێوەبردن لەلایەن دواترین سوڵتانی گەورەی سەلجۆقییەکان "سنجار" بەکارهێنراوە. مێژوو لەسەرئەوە هاوفیکرە کەکوردەکان دووەمین هێزبوون لەپاڵ تورکەکان کە لەشەڕی "مەلازگرت"ی 1071 سەرکەوتنیان بەدەستهێناو بەیەکجارەکی رێگای ئەنادۆڵ لەپێش سوڵتان ئاڵپ ئەرسەلان کرایەوە. هەروەکو دەزانرێ لە 15ی ئایاری 1071 ئاڵپ ئەرسەلان گەیشتە سیلڤان کەئەو کاتە پایتەختی دەوڵەتی مەروانی کوردان بوو، 10000 هێزی ئامادەهەبوو, هێندەش هێزی خێڵەکانی کۆکردەوە. ئەمە بەو واتایە دێت: ئەگەر پشتگیری و یارمەتی پێکهاتە سیاسییەکانی کوردان نەبووایە، ئەوا قەوارەی تورکەکان لەئەنادۆڵ ئاوانەدەبوو، جێگیرنەدەبوو. تەنانەت ئەگەر ئاواشبکرابووایە لەمەترسی جددی رزگاری نەدەبوو. پێویستە ئەم خاڵە زۆرباش بزانرێ: کۆمەڵگایەك لەبناخەدا لەسەرکامە هاوسەنگی ئاواکرابێت، بۆماوەیەکی درێژ لەسەر ئەم هاوسەنگییە بەردەوامی بەهەبوون و پێکهاتەی خۆی دەدات. لەدۆخێکدا لەم فاکتەرەی هاوسەنگی بێبەش بێت، تاوەکو هاوسەنگییەکی نوێ دەدۆزێتەوە هەبوونەکەی دەکەوێتە ژێرمەترسییەکی جددیەوە.

لەم مێژووە بەدواوە ئەگەر لەدوو بوارو بەگوێرەی دوو رەهەند بیر لەپەیوەندی نێوان کورد ــ تورک بکەینەوە واقیعیترە. یەکەمیان رەهەندی سیاسی و دەوڵەتە. ئەمەش گوزارشت لەپەیوەندی و ناکۆکییەکانی نێوان میرنشینەکانی کوردان و تورکان دەکات. یەکەمین قۆناخی ئەم پەیوەندی و ناکۆکییانە لە 1050 دەستپێدەکات تاوەکو رووخانی سەلجۆقییەکانی ئەنادۆڵ بەردەوام دەکات.

دووەمیان، رەهەندی گۆڕەپانی کۆمەڵایەتی و کولتوورییە. ئەو قۆناخەیە کەتیرەو هۆزەکان بەناویەکدا چوونەو هاوشێوەبوونێکی سروشتی بەڕێوەدەچێت. هاوشێوەبوون و توانەوەیەکی سروشتی لەناو گەلەریبوون و کولتووری کوردیدا جێگای باسە. لەبواری ئاشتیخوازی و کولتوورییەوە قۆناخێکە دەوڵەمەندی دەئافرێنێ. تائێستاش بەردەوامە. لەگەڵ ئاواکردنی کۆمار بەهۆی زێدەڕۆیی فشاری سیاسی میللیگەرایی تورك قۆناخێکی زۆرەملێی توانەوە لەناو نەتەوەی تورك دەستپێکردووە. بەهۆی ئەو رەفتارو پێڕەوانەی لەبوارەکانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، سەربازی، پەروەردەیی و هونەری لەم قۆناخە لەسەرکوردان پەیڕەوکراوە رووبەڕووی توانەوەی کۆمەڵایەتی (کۆمەڵگا)بوونەتەوە.

دووەمین قۆناخ ئەو قۆناخەیە کەئیمپراتۆریەتی عوسمانی رووی لەرۆژهەلات کردو لەسەردەمی "یاووز سولتان سەلیم"دا وەك پەیوەندییەکی ستراتیژی سیاسی دەستپێکرد، ئەمەش دوای سەدەی شانزدەهەم بوو. سولتان یاووز بۆئەوەی بتوانێ لەهەق ئیمپراتۆریەتی سەفەوی ئێران و، دەولەتی مەمالیکی میسر بێت مسۆگەرپێویستی بەیارمەتی تیرەو هۆزە کوردەکان هەیە کەخاوەن پێگەو شوێنگەیەکی ستراتیژین. لەمێژوودا نووسراوە بۆئەوەی ئەم رێککەوتنە مسۆگەربکات، چەندین کۆلەپشتی پڕ لەزێڕو شەش کاغەزی سپی ئیمزاکراوی وەك بەلگەهەناردووە. بەجیا رێککەوتن لەگەلٚ یەکەیەکەی بیست و سێ میرنشینەکانی کورد دەبەستێ. بژاری یاووز ئەوەیە هەموویان لەژێرسایەی میرێکی تەواوی میرنشینەکاندا کۆببنەوە. بەلام کاتێك ناکۆکییەکانی نێوانیان رێگا بەمەنادات، ئەوا بەخۆی میرێکی میران دادەمەزرێنێ و ئامەد (دیاربەکر) دەکاتە ناوەندەکەی. لەسایەی ئەم پەیوەندییە بەبەشداربوونی تەواوی میرەکانی کوردان سەرەتا لەسالٚی 1514 لەوان (چالدیران) سەفەوییەکان تێکدەشکێنن، لەسالٚی 1516 لەباکووری حەلەب شەڕی "مەرج ئەلدابق" و لە 1517 لەمیسر لەشەڕی "رێدانییە" بەسەر مەمالیکەکاندا سەردەکەوێ و گەورەترین ئیمپراتۆریەتی رۆژهەلاتی ناوین ئاوادەکات. ئەگەرئەم پەیوەندییە ستراتیژییە نەبێ، نەك تەنیا ناتوانێ دەولەتەکانی میسرو ئێران تێکبشکێنێ، ناشێ و ئاستەمە بتوانێ لەلەئەنادۆلی ناوینەوە هەنگاوێك بەرەوپێش بچێ. بەپێچەوانەوە، ئەگەر هەردوو دەولەتی میسرو سوریا لەجیاتی رکابەرایەتیکردنی میرنشینەکانی کوردان لەگەلیاندا رێککەوتبووانایە، لەوانەیە ئەم پەیوەندییە ببوایە هۆکاری کۆتاییهاتنی دەولەتی عوسمانی. پەیوەندییەکی بەم چەشنەی تیموری سولتانی تورکمانەکان لەگەلٚ کوردان لەسالٚی 1402 لەئەنجامی شەڕی ئەنقەرە دەولەتی عوسمانی رووخاندبوو.

پەیوەندی کوردەکان لەگەلٚ سولتانە عوسمانییەکان تاوەکو سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم لەمیانەی جیاکارییەوە بەردەوام بووە. میرنیشینە کوردەکان وەك چەندین حکومەت, میرنشینی و بەگی بەیرەقدار لەسیستەمێکی جیاکاریدا ژیاون کەلەباوك بۆ کوڕ ماوەتەوە. لەکاتێکدا لەکاروبارەکانی ناوخۆدا خودموختاربوون (ئۆتۆنۆم بوون) هیچ قەدەخەنامەو سنووردانانێك بۆ بوارەکانی کولتوور، زمان و هونەر تەنانەت بۆ بواری هزریش نەبوو. لەم قۆناخەدا زمان و کولتووری کوردی چەندین بەرهەمی لێکەوتۆتەوە. نموونەیەکیان داستانی مەم و زینە. بالابوونی کوردان لەبواری کۆمەلایەتی و کولتووری بەردەوامە. تەنیا کاتێك سولتان بخوازێ یان بەئیرادەی خۆیان دیاری دەنێرن و بەشداری پەلامارەکان دەکەن. ئەوانەی پەیوەندییان لەگەلٚ سولتانەکان باشە، میرنشینە کوردە سوننی مەزهەبەکانن. ئەم میرە کوردانەی ئەمرۆش پەیوەندییان لەگەلٚ دەولەت باشە، زیاتر جێگای خۆیان لەناو سیستەمی تەریقەتی نەقشبەندیدا گرتووە. بەرامبەر ئەمەش رووی کوردە عەلەوییەکان بەرەو دەولەتی سەفەوی شیعە مەزهەبی ئێرانە. بەهۆی ئەم فاکتەرەو زیاتریش وابەستەبوونیان بەئازادی بەردەوام کردوونی بەئامانجی تیرەکان. لەراستیدا لەسەردەمی یاووزدا کاتێك مورادی بیرهەلکەن (چالهەلکەن) چل هەزار عەلەوی فرێدەداتە بیرەکانەوە نیازی ئەوەیە لەرەگ و ریشەوە مەترسییەکی ستراتیژی بەرکەناربکات.

لەگەلٚ دەستپێکردنی سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا قۆناخێکی نوێ لەپەیوەندی کورد ـ تورك دەستپێدەکات. زیادبوونی پێویستییەکانی باج و سەربازی عوسمانییەکان کەبەرامبەر رۆژئاوا تەنگەتاوبووە رێگا لەپێش ئەوەدەکاتەوە کە فشارێکی زێدە بکەنەسەر کوردان. ئەنجام دەستپێکردنی قۆناخێکی خوێناوی یاخیبوونە. ئەم یاخیبوونانە بەپێشەنگایەتی ئەو میرنشینە کوردانە دەستپێدەکات کەخاوەنی ئۆتۆنۆمییەکی بەرفراوان بوون. ئەو قۆناخەی لەسالٚی 1806 دا بەیاخیبوونی میرنشینی بابان دەستپێکرد، لەسالٚی 1878 ئەمجارە بەرێبەرایەتی شێخەکان بەردەوام دەبێت. لەسالٚی 1925 بەرێبەرایەتی شێخ سەعید، 1938 بەرێبەرایەتی سەیدرەزا لەمیانەی دوا بەرخودانەوە ئەم قۆناخە بەشکست کۆتایی دێت. کوردەکان هەموویان بەیەکەوە بەشداری لەیاخیبوونەکان ناکەن. سەنگەر بەسەنگەر دەستپێدەکەن، بەهیچ جۆرێك بەئاستێکی نەتەوەیی

ناگەیەنن. پێکهاتەی دەرەبەگایەتی لەپێش ئەمە بەربەستە. دیسان ئەگەر یارمەتی ئینگلیزەکان بۆ دەوڵەتەکان نەبووایە لەوانەیە یاخیبوونەکانی بەدرخان بەگ (1843) و شێخ مەحموودی بەرزنجی (1923) بەسەرکەوتن بگەیشتبووانایە. رێبەرایەتی تاڵەبانی و بارزانی رۆژگاری ئەمڕۆمان دوا نوێنەری ئەم رێبازەن و ریشەکەیان بۆ شێخایەتی و سەرۆك عەشیرەتی دەگەڕێتەوە. تێپەڕبوونیان بەوەرچەرخانێکی بۆرژوازییانەو یارمەتی ستراتیژی وڵاتە رۆژئاواییەکان، ئەوانی خزاندۆتە ناو دوا شانسێکی پڕ لەمەترسی.

لەم قۆناخە سیاسییە درێژخایەنەدا لۆژیك (منطق)ی پەیوەندی کورد ـ تورك زیاتر لەگەڵ شێوەی رێککەوتنی ستراتیژی دەگونجێ. پێویستی دوولایەنەی هەردوولا بەیەکتر ئەم رێککەوتنە ستراتیژییە دێننە ئاراوە. ئەگەر دەست لەو پەیوەندییانەیان بەربدەن، ئەوا زیان و دۆڕاندنی ستراتیژی هەردوولایەنیش دەستلێبەرنەدراوە. کاتێك عوسمانییەکان لەئەستانبۆڵ و ئەنادۆڵ دەپەستێنرێنەوە، میرنشینەکانی کوردیش تاڕادەیەکی مەزن دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمییان لەدەستدەدەن، وەك هێزێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بوونیان نامێنێ. رێککەوتنی ستراتیژی پشت بەبناخەیەکی تۆکمەی مێژوویی و کۆمەڵایەتی دەبەستێ.

لەپەیوەندییە کۆمەڵایەتی و کولتووریەکاندا نەك هەر قەدەخەکاری نییە، زەمینەیەکی سەربەستی بەمجۆرە هەیە تەنانەت لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا خەیاڵ ناکرێت. بێگومان تواندنەوەی زۆرەملێیانەی ئەتنیکەکان ئەنجامێکی سیاسەتەکانی دەسەڵاتی ـ بایۆلۆژی سەرمایەدارییە. لەو رژێمە دەرەبەگایەتییانەی کەپەسندیان ناکەین، وەك خۆلێکردن و تواندنەوەی کولتووری وەك ئەخلاقێك بیری لێناکرێتەوە. کردەوەیەکی بەم چەشنە لەچەمکی مرۆڤایەتیدا جێگای نییە. لەتەواوی ئۆرگانیزاسیۆنە سیاسییەکانی چاخی ناوین بەم چەشنەیە. تواندنەوەی کولتوورو زمانی گەلان و قڕکردنیان کردەوەیەکی نائەخلاقی سیستەمی سەرمایەدارییە. بێبەشی سەرمایەداری لەئاکار، رێگا لەپێش ئەمە دەکاتەوە. بەرلەوەی تورکەکان بەسیستەمی سەرمایەداری بگەن، هیچ دەستیان بۆ ژیانی کولتووری، ئایینی و زمانی گەلان نەبردووە، ئەمەش گرێدانی خۆی بەراستینەی ئاماژەبۆکراو هەیە. هەر چ کاتێك کەوتنە ناو ئایدیۆلۆژیای میللیگەرایی سەرمایەداری ئەوکاتە سیاسەتی فێڵبازی و زۆرەملێیی توانەوە دەستپێکرد. هەڵبەتە لەمێژوودا توانەوەی سروشتی بەردەوام لەمیانەی سەنتێزی دوولایەنەی کولتوورەکان رێگای لەپێش دەوڵەمەندێتی کردۆتەوە. لەم بوارەوە، واتە لەلایەنی رێزگرتن لەئایین، زمان و هەبوونی کولتووری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەرامبەر کردەوەکانی دەوڵەتە میللیگەراییەکانی عەرەب، فارس و تورك گوزارشت لەرژێمێکی پێشکەوتووترو خاوەن رەهەندی ئازادی و مرۆیی دەکات. بەراورد بەچاخی ناوین لەهەموولایەکەوە بەچاوێکی باڵاترو ئازادیخوازترەوە تەماشای سەرمایەداری بکرێ چەواشەکاری و هەڵەیەکی گەورەیە. لەم لایەنەوە سەرمایەداری گوزارشت لەبەربەرێتی هاوچەرخ دەکات. دەشێ سەردەمی سەرمایەداری و بۆرژوابوونی تورکیا بەشێوەی چەند قۆناخێکی جیاوازەوە لێکۆڵینەوەی لەسەربکرێت. لەوانەیە دەرەبەگایەتی ناوەندی عوسمانییەکان لەمێژوودا نوێنەرایەتی گەورەترین شارستانییەتی بەر لەسەرمایەداری بکات. خاوەن تایبەتمەندێتی ئەو رژێمەیە کەهەرەزێدە بەرامبەر سەرمایەداری بەرخودانی کردووە. چەند سەد ساڵێك پێشکەوتنی سەرمایەداری لەرۆژهەڵاتی ناوینی درەنگخستووە. لەئەنجامی ئەمەشدا رۆژهەڵاتی ناوین بەتەواوی کۆلۆنی نەکراوە، ناسنامەی ئیسلامی پارێزراوەو، گرفتەکانی هاوچەرخبوونیش رۆژبەدوای رۆژ قورسبووە، تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان بەهەموو قورسایی خۆی دواخراوەو بەرەو بێچارەیی هەڵکشاوە.

رۆم، ئەرمەنی و سوریانییەکان بەهۆی ناسنامەی مەسیحییانەوە بەشێوەیەکی سانایيتر سەرمایەدارییان پەسندکرد، کاتێك بۆرژوابوونەکەیان رێگای لەپێش میللیگەراییەکی پێشوەخت کردەوە، بەهۆی لاسەنگی نائاسایی هێز بەقۆناخی لەناوچوون و پاکتاوکردندا تێپەڕبوون. مەیلی قازانج و کەڵەکەکردنی سەرمایەداری بەرپرسیاری سەرەکی ئەم قۆناخەیە. کەمینەی سەرمایەداری پێشوەخت، بەپێکدادان و پاکتاوکاری پێشوەخت ئەنجامگیربووە.

بەپـشتبەستن بەدەوڵەتگـەرایی "پـارتی ئیتیحـادو تـەرەقی" هـەنگاوی سـەرمایەداریبوونی سـەرەکی دەسـتپێکرد. سـەرەتا هەوڵیـدا لەمیانـەی ناسـنامەی پـان ــ ئیـسلامیزم تـەواوی موسـڵمانەکان بـەرەو وەرچـەرخانێکی بـەمجۆرە ببـات، بـەهۆی ئـەو پێشکەوتنەی بەلایەنی میللیگەراییـەوە لـەناو تـەواوی قەومـە موسـڵمانەکان هاتبووەئـاراوە سـەرکەوتنی بەدەسـتنەهێنا، ڕێگـای لەپێش ئەوەکردەوە بەشێوەیەکی خێراتر ئیمپراتۆریەت بەرەو پارچەبوون بچێ.

کۆمـاری تورکیـا کـە لەسـەر پاشماوەکـانی ئیمپراتۆریـەت ئـاواکرا، دەتـوانین سـەرمایەداری سـەردەمی کۆمـار بەسـێ قۆنـاخ هەڵسەنگێنن: قۆناخی یەکەم، سەرخانی سەرمایەداری و زەمینەکەی بەبناخەگیرا. مستەفا کـەمال ئیلهامی لەشۆڕشـی فەڕەنـسا وەرگرت، ئاواکردنی کۆمارو بەدەزگابوونی لەهەموو بوارەکانـدا، لەبنەڕەتـدا پـشت بەزهنییـەتی ڕۆژئـاوا دەبەسـتێ. هەرچـەندە درەنگیش کەوتبێت، خواستوویەتی قۆناخەکانی ڕێنیسانس، ریفۆرم و ڕۆشـنگەری لـەناو قـاوخێکی تەسـکی میللـی و لەمیانـەی پێڕەوی شۆڕشگێڕیەوە ئەنجامبـدات. لەگـەڵ ئـەوەی ئەنجامـدانی ئـەم پێـشکەوتنە چـەند سـەدەییەی ئـەورووپا لـەناو قـاوخێکی میللـی و لەماوەیـەکی هێنـدەخێرادا ڕێگـای لـەپێش پەرەسـەندنی گـرنگ کردۆتـەوە، لەهەمانکاتـدا بۆرژوایـەکی شۆڕشـگێڕی خولقاندووە. زیاتر لەمیانەی ئەو بیرۆکراسییە سەرمایەداریانەوە قۆناخی یەکەمی ئەنجامداوە کەلـەناو دەوڵـەت چـڕببوونەوە. ئەو بیروکراسی و سەرمایەدارییەی کۆمەڵکاری دەوڵەت کـەتاوەکو 1950 کـان گەشـەی کـرد، لـەم بـەروارەدا دوای ئـەوەی لـەناو هاوسـەنگی ڕۆژئـاوا ــ ڕۆژهـەڵات ڕۆژئـاوای هەڵبـژارد، قۆنـاخێکی کـرد بەناچـاری کەقورسـایی بـەلای سـەرمایەداری تایبـەت شکایەوەو دەرکەوتەپێش.

سـەردەمی پـارتی دیمـوکراتی (DP) ئـەو قۆناخەیـە کەسـەرمایەداری تایبـەت خێرابـوو. لەمیانـەی کودەتاکـەی 1960 خواستیان سنوورێك بۆ ئەو سەرمایەدارییە تایبەتە هەژموونگەراییە دابنـێن کەبەپاڵپـشتی شارە گـەورەکانی وەك ئەسـتانبۆڵ، ئەزمیرو ئەدەنا گەشەیانکرد. لەبنەڕەتدا کودەتا بەرهەمی ناکۆکی نێوان سـەرمایەداری دەوڵـەت و سـەرمایەداریبوونی تایبەتـدا بوو. ئەگەر لەمیانەی ئێش و پێکدادانیشەوە بێت گواستنەوە لەقۆناخی سەرمایەداری دەوڵەتی دەستڕۆ بۆ قۆنـاخی ئۆلیگارشـی سـەرمایەداری تایبـەت خێرابـوو. لەکاتێکـدا لەسـەردەمی "پـارتی دیمـوکراتی"دا زیـاتر نوێنـەرانی سـەرمایەداری بازرگـانی و کشتوکاڵی بەشداری ئۆلیگارشیان دەکرد، لەسەردەمی پارتی داد (1960 ـ 1980) توێژی پیشەسازی قورسایی خـۆی خـستۆتە سـەر. لـەقۆناخی 1980 ــ 2000 لەمیانـەی حکومەتـەکانی قورسـایی پـارتی نیـشتمانی دایـك (ANAP) چـەندەی بلێـی سەرمایەی دارایی بەهێزبووە. هەرچی دەوڵەتە بەشی قورس و گەورە هی سوپا بووە. توێـژە مەدەنییـەکان قورسـایی جارانیـان لەدەستداوە. چینی سەردەستی کوردان کەلەیەکەمین قۆناخی کۆمـار سـەرکوتکران لـەماوەی نێـوان سـاڵانی 1950 ــ 2000 دا لـەڕێگای توێـژی جیاوازیـشەوە بێـت جێگـای خـۆی لـەناو ئۆلیگارشـیدا گرتـووەو هـەوڵی پاراسـتنی داوە. جیاکـاری بـۆ ئەوانـە دەستنیشانکراوە کەهەرەزێدە وابەستەیی خۆیان بەئایدیۆلۆژیای دەوڵەت نیشانداوەو سەلماندووە.

لەکاتێکدا میللیگـەرایی مـۆرکی خـۆی لەئایـدیۆلۆژیای هـەردوو قۆنـاخ دەدات، لـەدوای 1950 کـان سـەنتێزگەرایی تـورك ــ ئیسلام، کۆمەڵە شۆڤێنی و فاشیستەکان و موسڵمانێتی شێوازی تەریقەتگەرایی پێبەپێ قورسایی لـەناو دەوڵەتـدا پەیـداکردووە. لەکاتێکدا نەتەوەپەرستی سەردەمی مستەفا کەمال و عیسمەت ئینۆنۆ زیاتر لەڕێگای کولتووری ڕۆژئاوا بـەخێودەکران، لـەدوای 1950 کـان بـەهۆی سیاسـەتی دژە ــ کۆمۆنیـستی ئـەمریکا میللیگـەرایی لەمیانـەی ئایدیۆلۆژییـە فاشیـستی و ئاینییـە دواکەوتووەکانەوە تێرخۆراك کراوە. تەنیا لەمیانەی بوون بەماشەو ئامرازی نکوڵیکردن و توانەوەیەکی چڕو بەرفراوان چینی سەردەستی کورد توانیویەتی درێژە بەهەبوونی خۆی بدات.

ئـەو توێژانـەی گـەل کەلـەم قۆناخانـەدا لـەدەرەوەی سـەرمایەداری دەوڵـەت و تایبـەت مانـەوە ڕەوشـیان قەدەرگـەرایی بـاوی تێپەڕنەکرد. هەڵمەتێکی دیموکراتییانـە پێشنەخراوە. پێهـەڵگرتنی چـەپڕەوە کلاسیکەکان بەرلـەوەی لـەناو گـەل ڕەنگبداتـەوە

سەرکوتکراوە. دوای یاخیبوونەکانی کوردان داماڵین و سووانی کولتووری گەلی کورد خێرابوو، تەنانەت کرابوو بەشتێکی دیکە. هەرەزێدە بزووتنەوەی "PKK" گوزارشتی لەپەرچەکرداری ئەم قۆناخانە کرد. تەنیا بینینی "PKK" وەك بزووتنەوەیەکی کوردان دەبێتە هەڵسەنگاندنێکی ناتەواو. بەڵکو وەك کاردانەوە بەرامبەر تەواوی هێزە ئایدیۆلۆژی و سیاسی و دەوڵەتگەراکانی تورکیاو پارچەکانی دیکەی کوردستان سەریهەڵداوە.

دەشێ سێیەمین قۆناخی سەرمایەداری تورکیا وەك ئەو قۆناخە هەڵبسەنگێنرێ کەلەژێرسایەی کۆمەڵی سەرەکی "سەرمایەداری ئەنادۆڵ"، سەرمایەی ناوینی(KOBI) گەشەکردنی بەخۆیەوە بینی، دەشێ ئەمە بە"شۆڕشی سەرمایەداری ئەنادۆڵ"یش بەناوبکرێ. ئەمە سێیەمین نەوەی سەرمایەداری تورکە. لەکاتێکدا نەوەی یەکەم سەرمایەداری کۆمەڵکاری بیرۆکراسی تورکە، دووەمین نەوە سەرمایەداری تایبەتی شارەگەورەکانە، هەرەدواییش لەرێگای نەوەی سەرمایەداری تورکەکانی ئەنادۆڵ سیستەم تەواو پێدەگات. پارتی دادو گەشەپێدان (AKP) خۆیکردووە بەسەرپەرشتیاری سەرەکی سەرمایەداری ئەنادۆڵ. هەرچەندە لەسەردەمی دەسەڵاتەکانی (DP,AP,RP,ANAP)یشدا سەرمایەداری ئەنادۆڵ گەشەکردنی بەخۆیەوە بینیبێ، لەمیانەی پارتی (AKP) کەوەك بزووتنەوەیەکی سیاسی سەربەخۆ دیارە، هەوڵدەدات وەك خاوەنی راستەقینەی ناوەندی سیاسی بەردەوامی بەهەبوونی خۆی بدات. بەتایبەتیش گرنگی بەراکێشان و جێگرتنی توێژی بۆرژوازی کوردانیش دەدات.

لەسەردەمی کۆماری تورکیادا پەیوەندی کورد ـ تورك دەکەوێتە مەترسیدارترین قۆناخ, لەجیاتی ئایدیۆلۆژیای ئیسلامی باو میللیگەرایی لەزەمینەی زهنییەتی پەیوەندییەکاندا جێگیر دەبێ. لەدەرەوە دوو سەرچاوە میللیگەرایی تورك بەخێو دەکات: یەکەمین ئەو زانیاریانەی مێژوو و کۆمەڵگایە کەلەرێگای رۆشنبیرانی ئەو تورکە کازاخانەوە دەستیانکەوتووە کەبەهۆی ستەم و فشارەکانی روسیای قەیسەری روویان لەئەوروپا کردبوو. بۆ یەکەمین جار هەوڵ دەدەن بەشێوەیەکی کۆکراوە نیشانبدەن کەلەدەرەوەی بنەماڵەی عوسمانی مێژوویێکی تورکان هەیە. دووەمیان، ئیمپراتۆریەتی ئەڵمان کە لەکۆلۆنی (داگیرکردن) درەنگکەوتووە، بۆ ئەوەی لەلای رۆژهەلات بتوانێ لەئاسیای ناوین بلاوبێتەوە، هەوڵدەدات ئەو کۆمەڵە تورکانەی بیرلەبەکارهێنانیان دەکاتەوە بەردەوام خواستوویەتی بەلای هزری پان ــ ئیسلامیزم و پان ــ تورکیزمدا رایانبکێشێ. لەو بڕوایەدایە کەلەمیانەی ئەم هەردوو شێوە ئایدیۆلۆژییەوە پشتگیری لەیاخیبووە ئیسلامی و تورکەکانی دژ بەروسیای قەیسەری بکات دەرفەتی پەلهاوێشتنی بۆ دەرەخسێ. ئەجەندای بەناوبانگی سیاسەتی رۆژهەلاتی ئەڵمانەکان پێویستی بەمجۆرە هەوڵ و یارمەتییانە هەیە. ئەڵمانیا کەلەساڵانی 1880 بەدواوە جێگای فەرەنساو بریتانیا دەگرێتەوە، بەردەوام کاریگەرییەکانی خۆی لەسەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی زیاددەکات، بەدۆڕاوی لەشەڕی یەکەمی جیهانی دەردەکەوێت، لەگەڵ خۆیدا ئیمپراتۆریەتی عوسمانیش بەرەو رووخان دەبات.

میللیگەرایی گروپی ئیتیحادو تەرەقییەکان خاوەن کارەکتەرێکی نەژادپەرستییە کەسەرچاوەکەی بۆ ئەڵمانەکان و تورکەکانی دەرەوە دەگەڕێتەوە. لەبەرئەوەی ئیلهامی لەمیللیگەرای ئەڵمانی وەرگرتووە دەبێتە خاوەنی ئەم پێکهاتەیە. مێژوونووسەکانی ئەڵمان لەم قۆناخەدا بەدوای نەژادی بێگەرد (ساف)دا دەگەڕێن. میللیگەرایی ئیتیحادیەکان، لەسەر هێڵێکی گونجاو بەداخوازییەکانی پەلهاوێشتنی ئەڵمانەکان، دەخوازێ تەواوی جیهانی تورکەکان لەژێرهەمان ئالای میللیگەرایی نەژادپەرستی کۆبکاتەوە. لەبەرئەوەی ئەم هەڵوێستە لەراستینەی مێژوویی و کۆمەڵایەتی دوورەو لێیدابراوە، بەگران بەسەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا دەشکێتەوە. بەرامبەر ئەمەش هەڵوێستی ئەو بزووتنەوەیەی کەمستەفا کەمال رێبەرایەتی دەکات و کۆماری تورکیای دامەزراند، هەڵوێستەکەی سەبارەت میللیگەرایی جیاوازە. شارستانییەتەکانی کولتووری ئەنادۆڵ بۆخۆی بەبنەما دەگرێت، ئەم میللیگەراییەی لەسۆمەریەکانەوە تا دەگاتە هیتیتەکان، پشت بەتەواوی ئەو شارستانییەتانە دەبەستێ

کەهاتوونەتە ئەنادۆڵ و پێیدا تێپەڕبوونە، دەشێ بەمیللیگەرایی کولتووری یاخود بەوڵاتپارێزی ئەنادۆڵ بەناو بکرێت. مستەفا کەمال هەست بەجیاوازییەکانی ئەم چەمکانەی میللیگەرایی دەکات. بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەم پێشنیازانە ڕەتدەکاتەوە کەبەسووربوونەوە دەڵێن "با کۆمارە تازە ئاواکراوەکەمان بەکۆماری تورك بەناوبکەین"، لەجیاتی ئەو ناوی "تورکیا"ی گونجاوتر بینیوە ـ واتە نەك لەسەربنەمای نەتەوە، بەڵکو نیشتمان ــ ە لەناو چەمکێکی وەهادایە: هەر نەژادو ڕەچەڵەکێك دەتوانێ بەدڵخوازی لەناو ئەم وڵاتپارێزییەدا جێگابگرێ. ناشێ ئەم وڵاتپارێزییە یان نەتەوەگەراییە بەنەژادپەرستی بەناوبکرێ.

بەڵام هەندێ ڕۆشنبیرانی پاشکۆی ئیتیحادو تەرەقی پەرە بەگووتەی نەژادپەرستی دەدەن و بەردەوام دووبارەی دەکەنەوە. بەتایبەتیش لەمیللیگەرایی "نیهاد تاتسز" بەشێوەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش واقیعی گەڕانەوە لە"جولەکایەتی" و گۆڕانی ڕەچەڵەکەکانی دیکە دەخاتەڕوو. هەم لەسەردەمی عوسمانییەکان و هەم کۆمار گەڕانەوەو گۆڕان وەك مەترسیدارترین گروپەکانی تێکدانی دەوڵەت و تورکێتی پێناسەدەکرێن. ئەم چەمکە لەساڵی 1948 وەك پارتی میللەت، 1960 بەدواوە وەك پارتی بزووتنەوەی نەتەوەیی تارۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە، هەرچی میللیگەرایی ئەنادۆڵە لەناو گروپی کۆماری گەل سەرەتا لەرەوشێکی وشکدابوو، لەساڵانی 1960 کان بەدواوە لەمیانەی گوتەی سۆسیال ـ دیموکراتی بەبێ لەدەستدانی ناوەڕۆکەکەی و ئەنجامدانی گۆڕانکاری و وەرچەرخان تارۆژگاری ئەمرۆمان هاتووە. ئایدیۆلۆژیای میللیگەرایی لەتەواوی پارتە ڕاستڕەو, چەپڕەوو ئیسلامییەکان لەدۆزە جیاوازییەکاندا بەکاردەهێنرێ. لەتورکیا چەندە سەرمایەداری پێشکەوێت میللیگەرایی لەدەوڵەتەوە بۆ کۆمەڵگا گەشەدەکات، قووڵدەبێتەوەو بەردەوامکردنیشی دیاردەیەکی سەرەکی هزرییە.

لەم لایەنەوە میللیگەرایی تورك لەمیانەی تایبەتمەندێتییەکی باوکسالاری شێوەی گرتووە. بوونی بەوڵاتێکی دواکەوتووی سەرمایەداری رۆڵی لەمەدا دیاریکراوە. بەڵام ئایدیۆلۆژیای ئیسلامیش بەتەواوەتی دەستی لێبەرنەدراوە. لەقۆناخی کۆماردا لەئاستی وەزارەتی ئایینی بەرێکخستەیە، بەتایبەتی باوەڕی ئیسلامی سونی بەناوی ئیسلامییەت کۆنترۆڵ دەکات تاڕادەیەکی مەزنیش بەم شێوەیە لەژێرناوی عەلمانییەت هەوڵی کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگا دەدات. لێرەدا عەلمانی دیاردەیەکی سۆسیۆلۆژی نییە، وەك پارچەیەکی ئایدیۆلۆژیای فەرمی دەوڵەتی رۆڵ دەبینێ. بەواتایەك بەشێوەیەکی کۆنترۆڵکراو هەمئاهەنگی ئایین لەگەڵ هاوچەرخبوون فەراهەم دەکات. شێوە ئایدیۆلۆژیاکانی دیکەی قۆناخی کۆمار لەمیانەی مەیلە لیبرال، سۆسیالیست و دەوڵەتگەرا گەشەکردووەکانی ـ تەواوی پارتە ڕاستڕەوو چەپڕەوەکانی قۆناخی کۆمار تاوەکو ئەمڕۆ هەموویان دەوڵەتگەراین ـ لەرێگای ئەو تەریقەتە ئیسلامییانە نوێنەرایەتیان دەکرێت کەخاوەن کارەکتەرێکی سۆسیۆلۆژین و داخراون و بەشێوەیەکی نیو ـ نهێنی خەبات دەکەن. بۆئەوەی زەمینەی ئایدیۆلۆژی کۆمار بەکۆڵەکەی زانستی ببەستێتەوە, بەتایبەت مستەفا کەمال هەوڵێکی زۆری داوە، بەڵام سەرکەوتنێکی سنوورداری بەدەستهێناوە. چەندین گووتەی چەپڕەو ــ ڕاستڕەوی سەرمایەداری کەزانستیبوونەکەی جێگای گومانە لەگەڵ نەریتی دەرەبەگایەتی ئیسلامی بەناویەکداچووە، بەمجۆرە زەمینەیەکی شێلویان خوڵقاندووە.

دامەزراندنی سیاسی و سەربازی کۆمار لەناوەوەو دەرەوە پشت بەهاوسەنگییەکی سەیر دەبەستێ. ڕێبەرایەتی مستەفا کەمال کەپشتگیری لەزەمینەی گەرمی یەکەمین شۆڕشی دژی سەرمایەداری، شۆڕشی 1917ی بەلشەفیکەکانی بەدەستهێنا، کاتێك گوێی لەهەڕەشەی پارچەکردن و سڕینەوەی پلانی ئینگلتەراو دەوڵەتانی هاوپەیمانی بیست گەلی کوردو تورکی لەژێر ستراتیژی "میساقی میللی"دا کردە یەك. هەم لەئاستی خۆجێیی هەم نەتەوەیی بزووتنەوەی رزگاری نیشتمانی ڕێکخست، لەژێرسایەی ئەم هاوسەنگییەدا سەرکەوتنێکی سیاسی و سەربازی بەدەستهێنا. ڕێبەرایەتی مستەفا کەمال کۆتایی بەسەڵتەنەت و خیلافەت دێنێ، مۆدێلی کۆماری فەرەنسا وەك ڕێبەرنامەیەك بەبنەمادەگرێ. لەراستیدا شۆڕشێکی جددی سیاسی

ئەنجامـدەدات. رووخانـدنی پێکهاتـەی ئـەو دەوڵەتـەی ریشەکەی بـۆ هـەزاران سـاڵ دەگەڕێتـەوەو لەسـەر بنـەمای بنەماڵـەیی و ئایینگـەرایی ئـاواکراوەو راگەیانـدنی کۆمـار پراکتیکێکـی شۆڕشـگێڕی جددییـە. لەهەلومەرجـەکانی ئـەو دەوڵەتـە داگیرکـراوو دواکەوتووەدا رووداوێك بوو تائەو قۆناخە نموونەکەی نەبینرابوو.

ئاراسـتەی کۆمـار لـەماوەی نێـوان 1920 ــ 1945 لەسـەربنەمای شـەڕی هاوسـەنگی نێـوان سیـستەمی سـەرمایەداری و سۆسیالیستی پێشکەوتن بەخۆیـەوە دەبـینێ. کاتێـك لـەدوای 1945 هاوسـەنگی بەرێبەرایـەتی ئـەمریکا بـەلای سـەرمایەداریدا دەشکێتەوە، کۆماری تورکیا هەڵوێست بەلایەنی ئەم گەشەکردنە نیشاندەدات، سەرەتا لەلایەنی سەربازی لەناتۆ دەبێتە ئەنـدام، دواتر لەبوارەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی هەوڵدەدات ببێتـە پارچـەیەکی سیـستەم. لـەرێگای پـارتی دیموکراتـەوە ئـەم قۆناخە خێرادەبێت؛ ئەو گۆڕانکارییە سیاسییانەی لەکۆمارگەرایی دەستڕۆوە بەرەو کۆماری ئۆلیگارشی ئەنجامدەدرێت لـەبواری ئابووریدا لەگەڵ سەرمایەداری پیشەسازی و دارایی یەکدەگرێتەوە. لەدوای 1980 لەگەڵ ئەو هەڵمەتـە جیهانگیرییـەی لیبرالی نـوێ کەلەسەرتاسـەری جیهـان هاتـەئاراوە، لەمیانـەی گرێـدان بـەدەرەوەو دوورکەوتنـەوە لـەمۆدێلی دەوڵـەتی ــ نەتـەوەیی بەقۆناخێکی نوێ دەگات. سیستەمی سەرمایەداری جیهان کەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا رێبەرایەتی دەکات, تەواو دەکەوێتە ناو قۆناخی گێژاو (کائیوس)ی دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤییەت. هەروەکو بڵێی لکاندن بەسیستەم لەبوارەکانی سەربازی، ئابووری، سیاسی، راگەیاندنی و کولتووری تەواوبووە. تورکیا کەسەرەتا وەك باڵێکی ناتۆ دژی سۆڤییەت رۆڵـی بـینی، لـەپرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوینی گەورەش وەك وڵاتێکی بەرە کەسەرلەنوێ رووبەڕووی ریشە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکانی خۆی دەبێتـەوە ــ بەگوێرەی تیـۆری پێکـدادانی شارسـتانییەتەکان ــ، نـاکۆکی و پەیوەندییـەکانی نوێدەکاتـەوە، هەوڵدەدات بەپێکهاتەیـەکی نـوێ لەرەوشی قەیران ـ گێژاو دەرکەوێت.

گرێدراو بەپێشکەوتنەکانی سەردەمی کۆمار دەتوانرێ پەیوەندی کورد ـ تورك بۆ سێ قۆناخ جیابکرێتەوە. یەکەمین قۆناخ لەشەڕی رزگاری نیشتمانی دەستپێدەکات تاوەکو ساڵی 1940 بەردەوام دەبێ. کاتێك سەردەمی رزگاری نیـشتمانی دەسـتپێکرد لاشـەی سـەرەکی کۆمـەڵگای کـورد لـەناو چـەمکی کلاسـیکی ئوممـەت درێـژە بەگرێـدان بـەکولتووری دەوڵـەت دەدات. بەرامبـەر بەداگیرکاری ئینگلیزو فەڕەنسا لەباشـوور لەمیانـەی پەرچـەکردارێکی هاوبەشـدا رووبـەڕووی دەبنـەوە. بەرخودانـەکانی ئورفا، عەنتاب و مەڕەش نموونەی بەرخودانی هاوبەشی کورد ــ تورکە. نـەریتی مێـژوویی درێـژەی پێـدەدرێت. هاوبەشـێتی ئـایین و قەوم لەئارادایە. لەسەرەتای شەڕی رزگارییەوە تاوەکو کۆتاییەکەی بەئاشکرا باسی ئایدیۆلۆژیای میللیگەرایی نەکراوە. گرێدراو بەچەمکی ئوممەت برایەتی موسڵمانێتی رۆڵێکی دیاریکراوتر دەبینێ. ئەنجوومـەنی گـەورەی گـەلی تورکیـا کـە لەسـاڵی 1920 دامـەزراوە وەك ئەنجوومـەنی هاوبەشـی هـەردوو گـەل هەڵدەسـەنگێنرێ. پەرلەمانتـەرە کوردەکـان بەفـەرمی وەك "نوێنـەرانی کوردسـتان" رادەگەیەنـدرێن، لـەنێوان هـەردوو گەلـدا جێگـا بـەناکۆکی قـەومی نادرێت. تەنانـەت هەوڵـدەدرێ لـەناو هـەمان هەڵوێستی برایانەدا یاخیبوونی کوردان لەکۆچگری چارەسـەربکرێت کەلـەم قۆناخـەدا تەقیـەوە. لەدامەزرانـدن و راگەیانـدنی کۆماردا رۆڵی ستراتیژی کوردان بەلانی کەم هێندەی سەرکەوتنە ستراتیژییەکانی مەلازگرت 1071، چاڵدێران 1514 و مـەرج دابقی 1516 دیاریکەرە. هەڵوێستی ستراتیژی و تـەکتیکی مـستەفا کـەمال رۆڵێکـی دیـاریکراوی لەمـەدا هەیـە. مـستەفا کـەمال بەشـێوەیەکی زۆر ئاشـکرا لەمیانـەی هەڵـسەنگاندنی "جیـاوازی کـورد ــ تـورك، بەتایبـەتیش دژایـەتی، دەبێتـە کۆتـایی هەردووکیان" پێویستییەکانی جولانەوەی هاوبەشانەی هەردوو گەل دەستنیشاندەکات. جگە لەهەندێ گرژی سـنووردار کـوردان وەڵامێکی ئەرێنییان داوەتەوە ئەم بانگەوازییە. هەم بەشێوەی گەل، هەم وەك توێژی ئەرستۆکراتی سەروو. فاکتەری هەمەجۆر لـەخراپکردنی رەوشـی 1925 دا رۆڵ دەبیـنن. یەکـەمیان دەرککردنـە بـەوەی کۆمـار لەسـەر بنـەمای میللیگـەرایی تـورك پێشدەکەوێ، ئوممەتگەرایی و خەلیفایـەتی و سـەڵتەنەت جارێکی دیکە ناگەڕێنـەوە. دووەمیـان؛ چـینی بـەکرێگیراو جیاکاری

جارانیان لەدەستدا، رۆژ بەدوای رۆژ ئاشکرابوو کەوەك کورد لەدەوڵەتی ــ نەتەوەیی تورکدا جێگایان پێنادرێت. سێیەمیان؛ کاریگەری ئاژاوەگێڕی بەهۆی کێشەی "کەرکوك ـ موسڵ" ی ئینگلیزەکان و بانگەشەکانی بنەماڵەی عوسمانی بۆ گەڕاندنەوەی خەلیفەو سەڵتەنەت. رۆڵی جەمعیەتی تەعالی کورد لەیاخیبوونەکاندا هەیە کەبەشێك لەرۆشنبیرانی کورد ئاوایانکردبوو. میللیگەرای سەرەتایی کوردان کەلەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم سەریهەڵدا چەندین کۆمەڵەو رۆژنامەی دامەزراندو بەدوای ئەنجامدانی هەندێ ریفۆرمی کوردادا گەڕان.

بەشێوەیەکی بابەتی دەشێ ئەم یاخیبوونانە وەك بەردەوامی یاخیبوونە ناوخۆییەکانی ــ ئازناڤورو یۆزگات ــ دەرکیان پێبکرێت کە لەنێوان چەمکی ئوممەتی عوسمانییەکان و میللیگەرایی تورك روویاندا. رەنگدانەوەی شێوەی پێکدادانی نێوان کۆمارگەرایی و عوسمانیگەراییە لەناو کوردانداا. تاوەکو نزیکەی ساڵی 1940 بەردەوام بووە. دەتوانین یاخیبوونەکانی ئەم سەردەمەش بۆ سێ قۆناخ جیابکەینەوە ـ یەکەمیان یاخیبوونی ساڵی 1925 کە لەناوچەکانی گەنج ـ هانی بەرێبەرایەتی شێخ سەعید تەقییەوە. بەشێوەی پێکدادانی جێبەجێ تاوەکو 1928 بەردەوام بووە. لەژێرکاریگەری قووڵی چەمکی ئوممەتی عوسمانییەکانی قۆناخی نزیکدایە. کاریگەری تەریقەتی نەقشبەندی سوننی بەرچاوە. هەروەها رۆڵی لەدەستدانی ئەو جیاکاریانەش هەیە کەلەسەردەمی عوسمانییەکان پێیان بەخشرابوو. زیاتر لەوەی ئامانجیان کوردستان بێ، داخوازی گەڕاندنەوەی خەلیفەو سەڵتەنەتی عوسمانی بەهێزترە. مەیلی دەوڵەتی ئایینی زۆرئاشکرایە. جەمعیەتی ئازادی کە لەساڵی (1924) بەرێبەرایەتی خالد جبرانی لەلایەنی رۆشنبیرانی کورد ئاواکرا، بەهۆی دەستگیرکردنی رێبەرەکەیان ئەوەی خواستییان لەجێگای دابنێن رۆڵی خۆی نەبینی. کاریگەری ئینگلیزەکان ناراستەوخۆیە. هەروەك بڵێی "ئەگەر دەست لەموسڵ ـ کەرکوك بەرنەدەن، ئێمەش پشتگیری لەیاخیبوونی کوردان دەکەین "وەك قۆزێك و کارتێك بەرامبەر کەمالیستەکانیان بەکارهێناوە. ئەمەش رۆڵێکی سەرەکی بینیوە لەخراپبوونی پەیوەندی نێوان کورد ــ تورك. لەساڵی 1924 مستەفا کەمال لەکۆنفرانسە رۆژنامەگەریەکەی شاری ئیزمیت کێشەی ئازادی کوردان پەسند دەکات، ئاماژە بەهەبوونی لێگەڕینێك دەکات لەپێناو چارەسەری.

یاخیبوون تەواوی هەڵوێستە شیمانەبۆکراوو ئەگەرەکانی چارەسەری لەئارادا هەڵدەگرێ. مەیلی تواندنەوەو پاکتاوکاری تەواو دەردەکەوێتە پێش. مستەفا کەمال وەك هەڕەشەیەکی جددی دەرك بەو یاخیبوونانە دەکات؛ خەلیفە، ئینگلتەراو هێزە ئوممەتگەراکان لەرێگای هەوڵی هاوبەشەوە دەخوازن کۆمار لەبەین بەرن. ئەمەیە هۆکاری سەرەکی دژواری سەرکوتکردنەکەیان. لەکێشەی کورد زیاتر، وەك هەوڵەکانی رووخاندنی کۆمارو گەڕاندنەوەی سەڵتەنەتی بەکرێگیراوان و ئیمپریالیزم تەماشای دەکات. تەواوی یاخیبوونەکانی دوای ئەمەش لەژێر کاریگەری ئەم تێگەیشتنە هەڵدەسەنگێنرێ؛ تەنانەت وەك ترسێك تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان کاریگەرییەکەی بەردەوامە. ئەمە سەرەکیترین خاڵی شکانەوەیە لەهەڵوێستی خراپی کۆمار بەرامبەر بە کوردان. ئەمەش لەکاتێکدایە کەلەسەردەمی قۆناخی دامەزراندنی کۆماردا کوردان رۆڵی ئەندامی دامەزرێنەریان بینی. کاتێك شکانەوەیەکی ریشەیی بەمجۆرە کاریگەرییەکەی رێگا لەپێش فشارێکی نائاسایی دەکاتەوە، لەنزیکەوە گرێدراوی ئەو هەڕەشەیەیە کەئاماژەمان پێیکرد. ئەم هەستەی هەڕەشەکردن کرا بەرێبازێکی سیاسی کەساتێك زووتر هەناسە لەبەر کوردان ببڕێ، نەك هەر نەهێڵێ بەدوای مافەکانی خۆیدا بگەڕێ، بەڵکو بەشێوەیەك سەرکوتکردن و کپکردن بەبنەما دەگرێ کەناتوانن ناوی خۆشیان بێنن. کاریگەرییەکانی ئینگلیز رۆڵێکی زۆرخراپی لەئاژاوەنانەوە بۆ هەردوولا بینیوە. دەوڵەتە گەورەکانی دیکەی رۆژئاوا کەرێگایان لەپێش هەمان کاریگەری کردەوە، لەپاکتاوکردنی هەردوو گەلی ئەرمەنی و ئاشووری خاوەن رۆڵی دیاریکراون. ئەگەر دەستیان لەمەسەلەکە وەرنەدابووایە ئەم کارەساتانە بەسەر ئەم گەلانەدا نەدەهات.

یاخیبوونی قۆناخی دووەم یاخیبوونەکەی "ئاگری"یە کەبەڕێبەرایەتی ئیحسان نوری پاشا لەساڵی 1928 تاوەکو 1932 بەردەوام بوو. لەگەڵ ئەوەی پشت بەهەمان فاکتەر دەبەستێ، خاوەن رەنگێکی میللیگەرایی زیاترە. کاریگەری جەمعیەتی خۆییبوون لەمەدا هەیە کە وەك رێکخستنێکی هاوبەشی رۆشنبیرانی کوردو ئەرمەنی ئاواکرا. لەخۆجێییبوون رزگاری نەبووە. لەقۆناخی سێیەمدا یاخیبوونی دێرسیم لەئارادایە. لەبنەڕەتدا تاوەکو ئەوڕۆژە دێرسم ناوچەیەکەیە ئازادانە ماوەتەوە. دەسەڵات و دەستڕۆیی ناوەندی کۆمار: وەك لەناوچوونی خۆی دەبینێ. بەردەوام یاخیبوونی گەورەو بچووك لەناوچەکەدا هەیە. دوا یاخیبوونی ساڵانی 1937 ـ 1938 دەگاتە لوتکە. کاریگەری پاشماوەکانی تارۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە. ناوچەکە خاوەن نەریتی کوردەواری و عەلەویگەراییە. لەگەڵ یاخیبوونەکەی شێخ سەعید یەکیان نەگرتووە کەنەقشبەندی و سوننی بوو. ئەو رەوشەش پارچەبوونێکی سەرەکی ناو کوردانە. بەهۆی مەسەلەی ئەسکەندەرۆنە لەساڵی 1936 وە فەرەنسییەکانیش وەك کاریگەری ئینگلیزەکانی ساڵی 1925 کاریگەری خۆیان نیشاندەدەن. ئەم کاریگەریەش رۆڵی لەسەرکوتکردنی تراژیدیانەی یاخیبوونی دێرسیمدا هەیە.

مستەفاکەمال و عیسمەت ئینۆنۆ لەزانستی ئەوەدان کەسەبارەت بەیاخیبوونەکان مەسەلە تەنیا بەسەرکوتکردن چارەسەرناکرێ. بەتایبەتیش عیسمەت ئینۆنۆ لەیاداشتەکانیدا نووسیویەتی کە لەمەسەلەی سێدارەدان زێدەڕۆیی کراوە. دەرکیان بەوەکردووە، برینێکی گەورەیان لەکۆمارکردۆتەوە. هەربۆیە بەکارهێنانی پاشماوەی قوربانییەکانیان وەك چارەسەرییەك هەڵبژاردووە. هەڵبەتە لەم قۆناخەدا بیر لەوە ناکرێتەوە دەوڵەتی ـ نەتەوەیی کەلەم قۆناخەدا لەسەرتاسەری دونیا زاڵبوون دەرفەت بەچارەسەرییەکی دیکەبدات. کاتێك ئێشی لەدەستدانی ناوچە جیاوازەکانی سەردەمی ئیمپراتۆریەتی دێتەسەر، قووتدانی کوردو کوردستان وەك تاکەبژار (بۆیان) دەمێنێتەوە. ئەم هەڵوێستەش یەکێك لەو فاکتەرانەیە کەکۆتایی بەئیمپراتۆریەت هێنا. ئینگلتەرا کەچارەسەری لیبرالیانەی پێشدەخست، توانیویەتی لەسەر ئاستی جیهان تارۆژگاری ئەمڕۆمان درێژە بەکاریگەرییەکانی خۆی بدات. پێویستە یاخیبوونەکان و سەرکوتکردنیان وەك دوو کردەوەو هەڵەی مێژوویی گەورە هەڵسەنگێنرێ کەبەهۆی پێکهاتە ئایدیۆلۆژی و چینایەتییەکەیان یەکتری بەخێودەکەن و لەڕێ دەردەخەن. بێگومان لێرەدا کاریگەری پێکهاتەی سیستەمی سەرمایەداری سەرەکییە کەمیللیگەرایی، فاشیزم و داگیرکاری بەرهەمدێنێ.

دووەمین قۆناخی پەیوەندییەکانی تورك ــ کورد، قۆناخی بێدەنگییە گەورەکەی نێوان ساڵانی 1940 ــ 1970یە. لەهەلومەرجە دژوارەکانی دووەمین شەڕی جیهانیدا چاوەڕوانیکردنی جموجۆڵێك ئاستەمە. لەقۆناخی دەسەڵاتی پارتی دیموکرات (DP) گۆڕانکارییەکی جیاواز دێتەئاراوە. لەکاتێکدا دەسەڵاتی (DP) سەرلەنوێ پایەداران لەدەوڵەت بەجێدەکات، پیاوە لەپێشینەکانی کوردانی لەبیرنەکردووە. لەپێناو رێکخستنی ئەو کاردانەوەو ناڕەزاییە بەرفراوانەی بەرامبەر پارتی گەلی کۆماری (CHP) هەیە، تواناکارییەکی گەورە پێشکەش بەرێبەرە ئایینی و خێڵەکییەکانی دەرەبەگەکوردەکان دەکات. پارتی دیموکراتی لەئاواکردن و پێشخستنی ئۆلیگارشی ئەم توانستەی کردووە بەهێزێکی گرنگ، چینی سەردەستی کوردان کەلەکوردایەتی داماڵراون، خۆشحاڵن بەوەی جێگای خۆیان لەناو دەوڵەتدا گرتووە. رزگاربوون لەبەڵای کوردایەتی ــ بەگوێرەی ئەوان بەڵایە ـ و بەتورکبوون چەندەی بلێی لەگەڵ کارەکتەرە مێژووییەکەیان دەگونجێ. ئەوان هیچ جارێك ئەو رۆڵەیان نەبینیوە کەهەڵگری زمان و کولتووری کوردانن. لەسەردەمی سۆمەرییەکانەوە پەسندکردن و ژیان لەگەڵ زمان و کولتووری هێزە دەسەڵاتدارەکان هەروەکو بلێی لەبۆهێلەکانیان (جینەکانیان)دا جێگیربووە. تەنانەت رۆڵیان لەیاخیبوونەکان وەك کارتێکی فشار خۆیان بۆ بەدەستهێنانی بەشی زیاتر وەك قۆزێك بەکاردێنن. لەم قۆناخەدا جگە لەچەند رۆشنبیرێکی لاواز هیچ کاریگەرییەکی بۆ کوردان نییە. تەنیا کاریگەری ناراستەوخۆی یاخیبوونی کوردەکانی باشوور (کوردستانی ئێراق) جێگای باسە. هەروەها کاریگەری هەندێ رادیۆی کوردیش هەیە کەلەدەرەوە پەخشی خۆیان دەکەن. ئەگەر ئەمانەش نەبێ، زۆر

زەحمەتە کوردان هەست بەبوونی خۆیان بکەن. لەلایەکەی دیکەشەوە دەوڵەت سیاسەتێکی چڕو بەرفراوانی تواندنەوەو وەك خۆلێکردن بەڕێوەدەبات، لەمیانەی دروشمی "هاووڵاتی بەزمانی تورکی قسەبکە" دەگاتە ئاستی هەڕەشەکردن. ناشێ، ناتوانرێ یەك دانە رۆژنامە، گۆڤارو پەرتووکی کوردی چاپبکرێ یاخود بڵاوبکرێتەوە. بەمجۆرە بەکارهێنانی کێشەکە، سەرچاوەکەی بۆئەوە دەگەڕێتەوە کەوەك ئەگەرێکی چارەسەرییان دەبینی. ئاشکراکردن و روونکردنەوەی تەواوی ناوەڕۆکی ئەم سیاسەتانە، رۆڵێکی گرنگی رۆشنکاری دەبینێ. لەساڵانی 1970 بەپێچەوانە دەشکێتەوە.

قۆناخی سێیەم ئەوەیە کەلەدوای ساڵی 1968 بەبزووتنەوەی لاوان دەستیپێکردو تاکو ئێستاکەش بەردەوامە. بزووتنەوەی لاوانی 1968 زیاتر لەرێگای چەپی تورکیاوە کاریگەری لەسەر لاوانی کوردکردووە. لەم قۆناخەدا کەشرۆڤە مارکسییەکان سەبارەت بەکێشە نەتەوەییەکان بەفراوانی گفتوگۆی لەسەردەکرا، رۆشنبیران و لاوانی کورد بەرەو ساڵانی 1970 سەرەتا بزووتنەوەی"کۆمەڵەی کولتووری شۆڕشگێری رۆژهەڵات ـ DDKO "یان دامەزراند، دواتر بۆچەند فراکسیۆنێك پارچەبوون، خواستوویانە بەکاریگەربن. لەئەنجامی شەڕە ئایدیۆلۆژییە دژوارەکانی 1970 ـــ 1980 PKK بەشێوەیەکی بەهێز دەرکەوتەڕوو و لەمیانەی قەڵەمبازی 15ی ئابی 1984 ـــ لەسەرتاسەری کوردستان ـــ مۆرکی خۆی لەقۆناخ دا. بۆیەکەمین جار لەمێژوودا رێنمایی و چوارچێوەی سیاسی و ئایدیۆلۆژی کوردە زەحمەتکێشەکانی بەبنەماگرت، ئەو بزووتنەوە ئازادیخوازییەی کوردان کەداخوازی گەشەپێدانی هەبوو، تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان بەبێ لەدەستدانی کاریگەرییەکانی بەردەوامە.

ریفۆرم و وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی لەتورکیا

ئەو کورتەباسەی سەبارەت بەپەیوەندییەکانی کورد ـ تورك لەقۆناخی کۆمار ئاماژەمان پێکرد، هۆکارەکانی بنبەستبوون و داخراوبوونی دەوڵەت و کۆمەڵگامان بۆ دەخاتەڕوو. دەوڵەت لەگۆشەنیگای ئاسایشەوە تەماشای هەموو گرفتەکان دەکات. لەژێرناوی "تورکەکان و دەوڵەت" هەڵسەنگاندنێکی وردتربکەین سەبارەت بەچۆنییەتی گەیشتن بەم رەوشە رۆشنکەرەوەتر دەبێ. لەو سەردەمەی لەئاسیای ناوین جیابوونەتەوە تورکەکان تەواو پەی بەوە دەبەن کەتەنیا لەمیانەی جەنگاوەرییەوە دەتوانن خۆیان بپارێزن. تەنانەت لەناوەخۆشیاندا بەردەوام لەناو رەوشی پێکدادانی تیرەکاندا دەژین. لەهەر هەنگاوێکی بەرەو رۆژهەڵاتی ناوین هاوێشتوویانە، تاوەکو رووبەڕووی دۆستێك یان دوژمنێك نەبوونەتەوە، تا نەکەوتوونەتە شەڕەوە، چوون بەرەوپێش یان گەڕانەوە بۆدواوە نەبووە. یاساکانی شەڕکردن ئاراستەی پێشکەوتنەکان دیاردەکات. ئەگەری ئەوە ناکرێ هەبوونێك بەبێ شەڕبتوانێ درێژەو بەردەوامی بەخۆی بدات. چونکە لەسەردەمی سۆمەرییەکانەوە رۆژهەڵاتی ناوین لەسەرووی ئەو ناوچانەوە هاتووە کەشەڕ و دەسەڵات حوکمڕانی تێداکردووە. کاتێك تازە تیرەو هۆزەکانی تورك هاتنەناوچەکە ئەم یاسایە بەشێوەیەکی دژوارتر پەیڕەوکراوە. ئەو شەڕەی لەگەڵ هاتنی سەلجۆقییەکانەوە دەستیپێکردووە لەسەربنەمای پەلهاوێشتنەو زۆر لەکۆچی ئەو هۆزانە جیاوازترە کەگروپی کۆمەڵایەتی سنووردابوون. لەسەردەمی سەلجۆقییەکانەوە، هەروەکو بڵێی تیرە تورکەکان دەبنە دەوڵەت و پێشدەکەون. ئەم کاروانەی لەیەکەمین چڕبوونەوەی سیاسی و سەربازی کەلەشاری "مەروە" ئەنجامدرا تادەگاتە قەڵای "زیگەتوار"ی هەنگاریا کەدوورترین پەلهاوێشتنی رۆژئاوایە بەردەوام بەمجۆرەیە. پاشداکشانەوەش هەرلەناو شەڕدا ئەنجامدراوە. لەدووەمین گەمارۆی ڤیەننا تاوەکو دووەمین شەڕی کەنداو لەتەواوی پاشداکشانەوەکاندا یاساکانی شەڕ کارایەو پەیڕەو دەکرێ. تورکەکان ئەمە تەنیا بۆخۆیان پەیڕەو ناکەن، لەبنەڕەتدا تەواوی ئەو کۆمەڵانەی لەژێرحوکمڕانیان دان لەمیانەی دەسترۆیی و دەسەڵاتی سەربازییەوە بەڕێوەدەبەن. هێزی سیاسی گەشەی نەکردووە. لەبواری سەربازییەوە سوڵتان خاوەن پێگەی ئیمپراتۆرە. لەرێگای ئەو فەرمانانەی رۆژنە دەریانخستووە دەوڵەت و کۆمەڵگایان بەڕێوەبردووە. لەقۆناخی کۆماریشدا پێشەنگایەتی سەربازی مەرجە. هەروەکو چۆن کۆمار لەرێگای

شەڕەوە ئاواکرا، تەواوی بەدەزگابوونە سیاسی و سەربازییەکانی دواتر لەژێرچاودێری نزیکی سەربازاندا پێکهاتوون. لەهەر وڵات، قەوم و نەتەوەیەکی دیکە زیاتر ئەم راستینەیە لەپەیوەندی تورک ـ دەوڵەتدا زاڵەو رۆڵی خۆی دەبینێ. تورکەکان وەك قەوم و نەتەوە هەروەکو بڵێی دەوڵەتگەرایی لەبۆهێڵەکانیاندا سووڕدەخوات. دەوڵەتگەرایی تەنیا هەمووشتێکی چینەکانی دەوڵەت نییە. دیاردەیەکە بۆ هەموو توێژەکانی گەلیش بەبێی ئەو نابێت. چۆن بەبێ خودا نابێت، بەبێ دەوڵەتیش نابێت. دەوڵەت چەندە بەهێزو دژاوربێت، بەو ئەندازەیە هەست بەئارامی خۆیان دەکەن. لاوازی یاخود داڕووخانی دەوڵەت لەلایان بەواتای لەناوچوون و مەرگ دێت. هەڵوێستێکی زێدەڕۆییانەیە. بەڵام هۆکارە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان ئەمە دەکاتە ناچارییەك. لەبەرئەوەی دەسەڵاتەکان لەبونیادی خۆیاندا ئاوانەکراون و بەردەوام لەدەستی هەندێکی دیکەدا زەوتکراون، لەدەستچوونیشی بەدەستی هەندێکی دیکە دەبێ. هەربۆیە دەشێ هەرمەترسییەکی لەناوچوون و مردنی لەدواوەبێت. کاتێك وەك راستینەیەکی دیالەکتیکی مێژوویی بۆ تورکەکان دەستنیشاندەکەین بەهۆی ئەم فاکتەرانەوە دەرکی پێدەکرێت.

کۆمار هەم لەسەر ئەم کولتوورە ئاواکراوە، هەم لەبەرئەوەی بەخۆی لەئەنجامی شەڕ لەبەرامبەر "حەوت دەوڵەت" پێکهاتووە، بۆخۆی و بۆکۆمەڵگاش بەردەوام قورسایی یەکەم دەداتە ئاسایش. لەکۆمەڵگاکانی رۆژئاوا رەوش گۆڕانکاری جیاوازتر لەخۆوەدەگرێت. چەندین کۆمەڵە نەك لەرێگای شەڕەوە، بەڵکو لەمیانەی هەڵوێست وەرگرتن بەرامبەر جەمسەری شەڕ ـ دەسەڵات هەبوونی خۆیان بەرەو پێشەوە بردووە. بەردەوام هەوڵیانداوە جەمسەری شەڕ ـ دەسەڵاتدار سنووردار بکەن، ئەم کولتوورە بەساناییتر بەرەو کۆمەڵگای مەدەنی و دیموکراسی دەچێ. قورسایی یەکەم دەداتە مافەکانی مرۆڤ. بەڵام دیسان نەریتی شەڕ ـ دەسەڵات لەپەیوەندییەکانی کۆمەڵگادا رۆڵی دیاریکەر دەبینێ. جیاوازی لەچڕی و چەمکی فەلسەفی دایە. لەلای تورکەکان دەوڵەت هەم چڕبۆتەوە، هەم لەمیانەی شرۆڤە فەلسەفی و ئایینییە پیرۆزەکان دەژی. هەربۆیە هەررەفتار، رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، مافەکانی مرۆڤ، تەنانەت یاسای گەردوونی و رێساکانی سیاسەت کەبەواتای سنووردارکردنی دەوڵەت بێت، وەك هەڕەشەیەکی سەردەوڵەت دەرکی پێدەکرێت. تائێستاش لەناوەرۆکدا بڕوای بەدیموکراسی نییە؛ لەوە دەترسن دەوڵەت لاوازبکات و بیپووکێنێتەوە. تەنانەت گەمەی دیموکراسییەتی "دووپارت"ی ئۆلیگارشی کەلەساڵانی 1945وە هەوڵی بەڕێوەبردنی دەدرێت، تەواو لەژێرسایەی پاشکۆیەتی بەڕێوەدەبردرێت. وەك تەڵەزگەیەکی پێش دەوڵەت تەماشای دیموکراسی دەکرێت. هەربۆیە هیچ کاتێك کۆنترۆڵی ئاوارتە کەم ناکرێتەوە.

ئەو روانگانەی لەتیشکۆی دەوڵەتەوە تەماشای دەکرێت لەهەموو دەزگاکانەوە هەستی پێدەکرێت. وەها لەقەڵەمدەدرێ کەتەواوی رێگاکانی هەڵکشان و پێشکەوتن بەدەوڵەتدا, بەتایبەتیش بەسەربازی سوپادا, تێپەڕدەکرێت. جێگرتن لەدەزگاکانی دەوڵەت هەم رێگەی کەرامەتە، هەم ئارامترین رێگەی قازانجی ژیانە. ئاشکرایە کۆمەڵگایەکی هێندە وابەستەی دەوڵەت بێت خوڵقکاری و بڕوابوون بەخۆی لەلا پێشناکەوێت. ئەو کۆمەڵگایەی بەناوی دەوڵەت خۆی لەبیرکردووەو سەرفرازی خۆی نازانێ، شتێکی سروشتییە کەناتوانێ رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، مافپەروەری و هێزی ئابووری و دەزگا خوڵقکارەکانی سیاسەت ئاوابکات یان گەشەی پێبدات. ئەم هەڵوێستەی تورکەکان سەبارەت بەدەوڵەت لەقۆناخەکانی قەیران خراپترین ئەنجامەکانی دەردەکەوێت. کاتێك دەوڵەت دەکەوێتە قەیران، هێزێکی دیکەی چارەسەریش ناکەوێتەگەڕ، ئەوا وەك کارەسات هەڵدەسەنگێنرێ؛ بەساتی مان و نەمان لەقەڵەمدەدرێ. لەراستیدا چاوەڕوانەکردنی هەموو شتێك لەدەوڵەت، لەسنوورێکدا هێشتنەوەی دەوڵەت کەنەبێتە بار، پێودانگی سەرەکین بۆ هاوچەرخبوونی دەوڵەت و کۆمەڵگا. چەمکی دەوڵەتی ئەوروپا لەم چوارچێوەیە رێکخراو توانی بە ئاستی بەرهەمترین ستاتۆبگات.

گرفتی دەوڵەت و پارتە سیاسییەکان کەپێویستە وەك بابەتێکی جیاوازو سەربەخۆ تاوتوێ بکرێ زۆر مەترسیدارترە. بەبێ شازبوونێك تەواوی پارتەکانی تیشکۆو تەوەرەی دەوڵەت بەبنەمادەگرن، ئینجا ئەمە بەزانین بێت یان بەشێوەیەکی بابەتی.

هەروەکو کۆمەڵگا، پارتەکانیش کاتێك گرنگی سەرەکی و لەپێشینە دەدەنە دەوڵەت هەرلەسەرەتاوە رۆڵ و ئەرکی خۆیان لەدەستدەدەن. پارتەکان لەبنەڕەتدا لەسەرووی ئەو دەزگایانەوە دێن کەداواکارییەکانی کۆمەڵگا لەگەڵ دەوڵەت هاوسەنگ دەکەن و، لەکاتێکدا پێویستە بەردەوام ئەرکیان بەبنەماگرتن و هۆشیارکردنەوەو رێکخستنی کۆمەڵگابێت، یان بەردەوام چاوەڕوانی شۆڕش لەدەوڵەت دەکات، یان بەدوای یارمەتییەکەیدا دەگەڕێ، زیاتریش دەوڵەت وەك دەرگای بەرژەوەندیپەرستی دەبینێ. ئەم هەڵوێستانە هەر لەسەرەتاوە پارتەکان دەکات بەدژە دیموکراتی، کە لەبنەڕەتیشدا دەزگایەکی سەرەکی دەستلێبەرنەدراوی دیموکراسین. تەنانەت وایلێدێت پارتەکان دەکرێن بەدووەمین سێبەری دەوڵەت. هەروەکو بڵێی دەوڵەتێك تێرای نەدەکرد، هەرپارتێك دەبێتە مۆدێلێکی دەوڵەت. هەرکەس لەلای خۆیەوە، رۆڵی پیاوی دەوڵەت دەبینێ، خۆی لەجێی پیاوی دەوڵەت دادەنێ. هەربۆیە بەخێوکردنی خۆی و دەوروبەرەکەی لەرێگای دەوڵەتەوە بەبنەمادەگرێت، بەمەڕەنگە لەراستیدا دەوڵەت قورستریش دەکات و زیانەکەشی زیاتر دەکات. لەهیچ وڵاتێکدا بەئەندازەی تورکیا نەریتی "پارتەکانی دەوڵەت" بوونی نییە. ئەگەر هەشبێت هێندە بەرفراوان و لەناوەوە نییە. ئەگەردەوڵەت لەسەنتەری تەواوی بەهاکان بەجێبکرێت، ئەوا توانستەکانی بەرهەمهێنانی سیاسەت، پێشخستنی سیاسەتی ئابووری، پێشخستن و بەهێزکردنی دیموکراسی و، بەلانی کەم هێندەی دەوڵەت پێشکەشکردنی ئامرازەکانی چارەسەری بۆکۆمەڵگا دادەسووێ. هەربۆیە بۆ دەوڵەت و کۆمەڵگاش بێ رۆڵ و بێکاریگەر دەبن. لەبەرئەوەی گەل پەی بەم رەوشانە بردووە، ئەم پارتانەی دەخوازن دەوڵەت رزگاربکەن لەهەڵبژاردنەکاندا لەرێگای سندووقەوە ژێرگڵیان دەکەن، بەمجۆرە پووچێتی و بێواتابوونیان دەسەلمێنێ.

پارتەکان لەجیاتی ئەوەی چارەسەری قەیران بکەن، بوونەتە ئامرازی قووڵکردنەوەی قەیرانەکان. بەتایبەتی دوای دووەمین شەڕی جیهانی پێشنەکەوتنی پارتەکان لەسەربنەمای پێوانە هاوچەرخەکان ئەم رەوشەی پاشکۆیەتی پارتەکان فاکتەری سەرەکی بووە. لەناو کۆمەڵگاشدا رێگای لەپێش ئەوەکردۆتەوە کەکولتووری دیموکراسی لەناو کۆمەڵگادا پێشنەکەوێت، هەموو شتێك لەدەوڵەت چاوەڕوان بکرێ. جگە لەهەندێ قۆناخی سنووردار لەم رۆژگارەماندا پارتەکان لەبەرئەوەی بەردەوام دەوڵەتگەرابوون، بوونەتە هۆکاری سەرەکی قەیرانی سیاسی و ئابووری ئەمڕۆمان. پارتی گەلی کۆماری (CHP) کەدامەزرێنەری کۆمارە (کۆماری تورکیا) ئەمڕۆ فاکتەرێکی سەرەکی سنووورداری و تەسکبوونی سیاسی و پێشنەخستنی ئۆپۆزسیۆنە. ئەم رەوشەش سەرچاوەی خۆی لەوەدەگرێت کەپێشتر پارێزەری خۆ بەخشانەی دەوڵەت بوون بەرامبەر بەبزووتنەوە شۆڕشگێڕییە چەپڕەوەکان بەتایبەتیش"PKK". لەجیاتی ئەوەی لەپێناو چارەسەرکردنی کێشەکان سیاسەت پێشبخەن، بوون بەلقێکی پروپاگەندەو ئاژیتاسیۆنی دەوڵەتییان هەڵبژارد، هەم خۆیان هەم دەوڵەتیشیان بەبێچارەیی هێشتەوە، رێگایان لەپێش ئەوەکردەوە کێشەکان هێندەی شاخێك گەورەببن.

ئەم شێوازەی پێکهاتن و کاری دەوڵەت لەلای تورکەکان هەرەزێدە لەدیاردەو کێشەی کورددا دەبینرێ. سەبارەت بەتێگەیشتنی دەوڵەت بۆ دیاردەو کێشەی کورد لەسەرووی ئەو نیشانانەوە دێت کەهەم شاراوە هەم ئاشکرایە. لەخستنەڕووی جیاوازی دەوڵەتەوە تاوەکو دەگاتە گرفتنانەوە، کوردان وەك کێشەیەکی ئاسایش دەبینێ. یان کوردان بەهیچ و نەبوو لەقەڵەمدەدەن، یاخود وەك هەڕەشەیەك دەبینرێن کەلەکاتی داواکردنی بچووکترین مافدا پێویستە سەرکوتبکرێن.

بنبەستبوونی ئایدیۆلۆژیای میللیگەرایی لەژێرئەم هەڵوێستەی دەوڵەتدا شاراوەیە. ئەگەر وەك نەخۆشییەك تووشی میللیگەرایی نەهاتبووانایە، بەمجۆرەش تەماشای دیاردەی کورد نەدەکرا. هەروەکو لەمێژووشدا بینرا، مەیلی بەیەکەوەبوونی نزیك بەهێزترە. هەڵوێستی کوردان سەبارەت بەدەوڵەت هێندەی تورکەکانیش نەبێت، بەرامبەر هەڕەشەکانی دەرەوە، دەوڵەت وەك ئامرازێکی هاوبەش دەبینن. لەقۆناخی عوسمانییەکان و ساڵانی ئاواکردنی کۆماردا ئەم رەوشەمان بینی. بەکاریگەری یاخیبوونەکانیش, چەمکی یەك مێژوو، یەك زمان، یەك نەتەوەو یەك دەوڵەتی پشتبەستوو بەمیللیگەرایی رێگای لەپێش

ئەوەکردۆتـەوە توانـەوەی زۆرەملێیانـە ببێتـە بەشـی کـوردان؛ ئەمـەش وایکـردووە لـەدەرەوەی کێـشە ئـابووری، کۆمەڵایـەتی و سیاسییەکانی سیستەم بمێنێتەوە. ئیتر لەهەموو لایەکەوە کوردان وەك هەڕەشەیەك دەبینرێن. باشترین کورد کـوردی مـردووە. چارەسەرییەك کەسەداسەد بەلایەنی تورکەکاندا شکابێتەوە، دیسان لـەم چـەمکەی هەڕەشـە رزگارنـابن. بچووکترین جموجۆڵی کـوردان و داواکـاری سیاسـی و کۆمەڵایـەتی بـە "جوداخـوازی" بـەناودەکرێ. زانـستیبوون، هاوچـەرخبوون، تەنانـەت چـاخی نـاوینیش لـەم هەڵوێـستەدا بـەدیناکرێت. ئـەم میللیگەراییـە بـچووکترین جیـاوازی یـان بەهەڕەشـە یـان بـەهۆکاری قووتـدان لەقەڵەمدەدات و لەمـە بـەملاوە هـیچ شـتێکی دیکـە نییـە. هەربۆیـە جگـە لەتێکۆشـان بـەئامرازە سـەربازی، سیاسـی، ئـابووری، کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکان بیر لەچارەیەکی دیکە ناکرێتەوە.

لـەقۆناخی بزووتنـەوەی ئـازادیخوازی کـوردان بەڕێبەرایـەتی "PKK" ئـەم سیاسـەتە هـەم لەلایـەن دەوڵـەت هـەم لەلایـەن سیاسـەتی راسـتڕەوو چـەپڕەوی نـاو کۆمـەڵگادا وەك ئامـانجێکی پـیرۆز دیـاریکرا. هەمووشـتێك بـەناوی یـەکێتی نەتـەوەیی و یەکپارچەیی وڵات دەگووترێت، تەنانەت دیموکراتییانـەترین پێهەڵگرتنـەکانی لایـەنی بەرامبـەر بـۆ بەدەستهێنانی مافەکانیان وەك جوداخوازی بەناوکرا. سیاسەتی "تیرۆریست" یش لەسـەر ئەمـە زیادکرا. لـەدوا چارەگی سـەدەی بیـستەمدا لەسیاسـەتی دەرەوە هەموو شتێك، تەواوی تواناکارییەکانی دەوڵەت لەپێناو ئەو ئامانجە خەرجکرا کە "PKK"بەتیرۆریست رابگەیەنـدرێ. ئەنجام، ئەو قەیران و گێژاوە بوو کەلەسالی 1990 بـەدواوە تێیکـەوت. پـەلاماری سەرتاسـەری راگەیـەنرا. یاسـاو مافپـەروەری پێشێلکران و لەگەڵ خاك تەختکران. ئابووری نقوومی نـاو زەڵکـاوی قـەرز کـرا. سیاسـەت تـەنیا کـرا بـەئامرازی سیاسـەتەکانی ئاسایش. جاشی و تەریقەتەکانیش خرانەگەڕو سەرلەنوێ عەشیرەتگەرێتی و تەریقەتگەرایی لەناو کوردانـدا بەهێزکران. گرووپە میللیگەرا سەرەتاییەکانی باشوور پشتگیریان لێکرا، تـاوەکو ئاسـتی دەوڵـەتی فیـدرالی کـورد رۆیـشتن. شـێخە نەقـشبەندییەکانی کـوردان جێگـای خۆیـان بۆنـاو دەوڵـەت گواسـتەوە. سـەرەکیترین دەزگاکـانی کۆمـار درابـووە دەسـت رکابـەرانی کۆمـار. تەنانـەت نـاتوانرێ ئەمـە بـە"سـەرکەوتنی پـیرۆس" (ئـەو سـەرکەوتنەیە کەلایـەنی سـەرکەوتووش هێنـدەی لایـەنی ژێرکـەوتوو زیـانی بەرکـەوتووە)یش بـەناوبکرێ؛ دەشـێ بەئیفلاسـبوونی سیاسـەتی میللیگـەرایی کوێرانـە بـەناوبکرێت. دیـسان لەمیانـەی پـرۆژە نوێکەی ئەمریکا سەبارەت بەڕۆژهەڵاتی ناوین بۆخاڵی سەرەتا گەڕانەوە: یان لەگەڵ کوردان بەڕێوەدەچی، یـان دەوەسـتێندرێی! ناشێ لەهەلومەرجە نوێکانی جیهانی هاوچەرخدا بەجۆرێکی دیکە رێگا بگریتەبەر.

بەبێ بیانوو دۆزینـەوە، لـەم خاڵـەوە"ریفـۆرمی کۆمـار" ئەنجامنـەدرێ، پێـشکەوتن لـەولاوە بمێنێ, تەنانـەت نـاتوانرێ ئـەو پێکهاتەیـەی هەنووکـەش بپـارێزرێ. ئـەزموونی ئـەم یـەك دوو سـاڵەی دوایـی ئـەم راستینەیەی نیـشانداوە. بەگووتـە دەوڵـەت چەندین ریفۆرم ئەنجامدەدات. بەڵام لەبەرئەوەی دەست بـۆ بابـەتی سـەرەکی ریفـۆرم "ریفـۆرمی دایـك" نـابردرێ، هـەموویان لەبێبەهابوون رزگاریان نابێت. چونکە ئەو گرفتە سەرەکییەی ئەوانی بنبەستکردووە لەجێگای خۆی ماوەتەوە. لەراستیدا ئـەو کۆمەڵگایەی لەکـەناری وەرچـەرخانێکی مەزندایـە, بـەهۆی کێـشەی کوردەوە لـەو تەنگەتاوییـە رزگـاری نابێـت کەتێیکـەوتووە، بـەردەوام ناچـاری دەکـات پـشت بەراسـتڕەوی ببەسـتێ و خـۆی بـەگوێرەی ئـەو بگـونجێنێ، خـۆی لەوەرچـەرخانێکی مێـژوویی بێبەشدەکات. دیسان هۆی ئـەم کێشەیە ئـەو پارتانەیـە کەلەتیـشکۆی دەوڵەتـدا دەجووڵێنـەوە، بـەردەوام پاکتـاودەبن، لـەجیاتی ئەوەی ببنە ئامرازی دیموکراتی، دەبنە کۆسـپە راسـتەقینەکانی پـێش دیموکراتیزەبـوون. ئـیتر بنبەسـتبوونی کۆمـارو کۆمـەڵگا بەئاستێك گەیشتووە کە لەزهنییەتی تاك و منداڵانیشدا رەنگدەداتەوە. دەرك بەوە ناکرێت کەپێویستە موحافەزەکاری راستڕەو نەبێتە قەدەری شۆڕشگێڕێتی کۆمار. ئێش و زیانی ئـەو سیاسـەتە لەئارادایـە کەسـەردەمێك مـستەفا کـەمال بەپێویـستی بـینی. بەڵام ئەمڕۆ کراوەتە تابۆیەکی نەگۆڕ. ئەنجامەکانی بێ سیاسەتی و نەبوونی رێبەرایەتی رق و کینی کۆمـەڵگای بـە بـەرزترین ئاست گەیاندووە. ئاشکرایە ئەگەر دیموکراتیزەبوونێکی راستەقینە بخوازرێ، ئەگەر ریفۆرمی دەوڵەت و وەرچەرخانی کۆمـەڵگا

وەك قۆناخێكی مێژوویی واتادار بێت، پێویستە دەرك بەوەبكرێت كەئەمە بەئازادی كوردان تێپەڕ دەبێت كەئەندامی راستەقینەی كۆمارن.

دیسان بەشێوەیەكی گونجاو لەگەڵ قۆناخە ستراتیژییەكانی رابردوو مێژوو پێویستی ئەنجامدانی پێهەڵگرتنێك نیشاندەدات لەسەربنەمای یەكێتی ئازادانەی كورد ـ تورك بێت. گونجاوترین مۆدێلی بەلاوەنانی رەوشی قەیران ـ گێژاوی رۆژهەڵاتی ناوین بەیەكێتی ئازادانەی كورد ـ توركدا تێپەڕدەبێت. ئەگەری بەهێز ئەوەیە ئەو چارەسەرییانەی هاوپەیمانێتی جیهانگیری بەرێبەرایەتی ئەمریكا لەگەڵ خۆی دێنێ خۆی ببێتە سەرچاوەی هەندێ كێشەی نوێ. تاوەكو رەوشی عەرەبەكان چارەسەر نەبێ ئەوا زیاتر نزیكی قووڵكردنەوەی بێچارەییە. لەقووڵكردنەوەی ناكۆكییە ستاتۆگەرا ئابووری و سیاسییەكانی ئەمڕۆمان زیاتر هیچ ئەنجامێكی دیكەی نابێت. لەماوەیەكی نزیكدا چاوەڕوانی بەلاوەنانی ئەو سیاسەتانە ناكرێ كەلەگەڵ ئیسرائیل بووە بەگرێكوێرە. خودی ئێران كێشەی لەگەڵ سیستەمی باڵادەستی جیهاندا هەیە. گەورەبوونی قەیرانەكان لەگەڵ ئێران شیمانەیەكی مەزن و لەپێشە.

ئەوەی دەمێنێتەوە توركیایە. تاوەكو توركیا لەسەربنەمایەكی ئەرێنی لەمەسەلەی كورد رزگاری نەبێ كەپێیەوە دەناڵێنێ، ئەوا توركیا بەردەوام رووبەڕووی قەیران دەبێتەوە. ئەنجام قووڵبوونەوەی سیاسەتی ئەمریكایە سەبارەت بەكوردان، ئەمەش لەئافراندنی ئیسرائیل ـ فەلەستینی نوێ درەنگ ناكەوێت. تەواوی مێژوو، مێژووی نزیك و قۆناخی هەنووكەمان ئاماژە بەوە دەكەن كەنزیكترین بژاری وەرچەرخانی دیموكراتییانەی ناوچەكە، پێویستی بەئاواكردنی سیستەمێكی نوێی پەیوەندی كورد ـ تورك هەیە كەبتوانێت چارەسەرییەكی دیموكراتییانە بۆ كێشەی كورد بەرهەم بێنێت. كاتێك ئەم بژارەی چارەسەری لەمیانەی چەمكێكی زانستی سۆسیۆلۆژی لێكۆڵینەوەی سەبارەت بكرێ، ئەمە لەولاوە بمێنێت كەنابێتە هەڕەشە بۆسەر یەكێتی نەتەوەیی و دەوڵەتی توركیا، بەڵكو كۆمەكێكی هەمیشەیی پێشكەش دەكات. هەربۆیە پێویستە "وەرچەرخانی كۆمەڵگا" وەك ئامانجێكی سەرەكی پەسندبكرێت؛ لەمیانەی روانگەی توركیایەكی دوور خراوە لەمیللیگەرایی شۆفێنی و وەك دەوڵەمەندێتی تەماشای جیاوازییەكان دەكات؛ هەروەها خاوەن چەمكی سیاسەت و كۆمەڵگایەكی دیموكراتییانەیە؛ كۆمەڵگای ژینگەپارێزی، ئازادی رەگەزی كۆمەڵگاو "ریفۆرمی كۆمەڵگا" لەخۆوە دەگرێت، كەدەوڵەتی لەئەستووربوونی بێواتا رزگاركردووەو بە" گۆڕەپانی ئاسایش و رای گشتی " سنووردراركراوە. ئەگەری بەهێز ئەوەیە لەگەڵ ئەم وەرچەرخانە زهنییەی لەم سێ گۆڕەپانە سەرەكییە ئەنجامدەدرێ، ریفۆرمی سیاسی و وەرچەرخانی كۆمەڵگا راستترین و ئەخلاقیترین رێگەچارەیە كەدەركەوتنی رۆژهەڵاتی ناوین لەم ئاژاوەیەدا بەرهەمدێنێ.

وەك ئەنجام؛ لەقۆناخی ریفۆرم و وەرچەرخانی كۆماری توركیاو كۆمەڵگاكەی كە پشتبەستوو بەكێشەی كورد ئەنجامدەدرێ؛ لەمیانەی سێ رێگەو مەیلی جیاوازەوە هەوڵدەدرێ تێكۆشانی پەیوەندی و ناكۆكی نێوان لایەنەكان هەمیشەیی بێت. لەئاكامی تێكۆشانی مێشك, ئەخلاق و سیاسەتی "پەروەردە، رێكخستن و چالاكی" نێوان لایەنەكان دیاری دەكرێت كامە رێگەو مەیل سەركێش و هەمیشەیی دەبێت.

أ)یەكەمین رێگاو مەیل؛ ئەو پارادیگماو پراكتیكەی میللیگەراییە كە تاقۆناخی نزیك پەیرەوكراو تائێستاش درێژە بەكاریگەرییە بەهێزەكانی دەدات، لەناوەخۆی داخراوەو، جوداخوازی و توندوتیژی بەرهەمدێنێ. لەلایەن توركەكانەوە لەمیانەی میللیگەراییەكی نەژادپەرستەوە وەك مەیلێكی دەوڵەتگەرایی وشك، بەبێ ئەوەی لەبواری كۆمەڵگا جیاوازی لەنێوان راستڕەو ـ چەپڕەو ببینێ، لەرێگای دۆگماتیزمێكی موحافەزەكارییەوە هەوڵی بەردەوامی دەدات. دەوڵەت و نەتەوە، تەنانەت كۆمەڵگاش بەردەوام لەمیانەی تێگەیشتنێكی نەخۆشی دەروونی ـ خاوەن هەڵوێستێكی شیزۆفرینیایی وەهایە كەوا مەزندە دەكات دوا قەڵاكانی توركیاتیش لەكەناری رووخانن و ئایین و باوەڕی لەدەستچووە. رۆژانە بیست و چوار كاتژمێر

"پروپاگەنـدەکردنی تورکایـەتی بـۆ تورکـەکان" وەك ئـەرکێکی سـەرەکی دەستنیـشانکردووە. پێویـستییەکانی موسـڵمانێتیش پشتگوێ ناخات؛ وا دەزانێ لەمیانەی ئەم زهنییەتەوە بەسەر دەبردرێت. کاتێك نۆرەشی بێ بۆ لەئامێزگرتنی "ئەتاتورکچێتی" یش درەنگ ناکەوێ. بەڵام ئەو دیاردەیەی بەئەتاتورکچێتی بەناو دەکرێت لەسەرووی گرنگترین پرۆژەکانی گۆڕانکاری سـەدەی بیستەم دێت. بەبێ ئەوەی هیچ بایەخێك بەو ناوەڕۆکەی بدەن، ئەتاتورکـچێتییەکی وشـکە بـاوەڕی و لەسـەر بنـەمای پەرسـتن زیاتر سوودی لێدەبینن و دەکەوێتە خزمەتیان. سـەرباری ئـەوەی لـەزۆربواری وەك هاوچـەرخێتی، ژن، زانـست و کۆمارگـەرایی لەگەڵیـدا ناکۆکە، ئـەم بەکاربردنـە وەك بـەهێزترین پێـڕەو درێـژەی پێـدەدرێت. ئەتاتورکـچێتی بـەزمان نـەك نـاوەڕۆك، هـەم لەدەزگا فەرمییەکانی دەوڵەت هەمە لەگۆڕەپانی کۆمەڵایەتی (کۆمەڵگا)دا هەڵوێستێکی بەربڵاوە.

بەتایبەتی ئەم مەیلەی لەنەریتی هەردوو پارتی "CHP"و"DP " دا بەرەو موحافەزەکاری چوو, کە لەگۆڕەپانی سیاسـیدا رۆڵیان دەبینی، لەساڵانی 1990 بەدواوە لەگەڵ هەڵکشانی بزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردان، گۆڕان و بـوون بەپاشکۆی سیاسـی کردەوەکانی کۆنترگـەریلا. هەوڵیانـدا چـەندین پـەلاماری دەرەوەی یاسـایی پـەردەپۆش بکـەن. لـەبیریانکرد کەبـەناوی کۆمـەڵگا سیاسەت بەڕێوەدەبەن، گوایە رزگارکردنی دەوڵەتیان وەك ئەرکی سەرەکی خۆیان دەستنیـشانکرد. ئـەنجام قـەیرانێکی قـووڵتری دەوڵەت و کۆمەڵگای لێکەوتەوە. خۆشیان، لەسەرووی هەمووشیانەوە "CHP,DYP,MHP" لەگەڵ ئەم قەیرانانەوە لەبواری مێژووییەوە کۆتاییان پێهات. ناوەنـدەکانی سـەرمایە کەبەشـێوەیەکی باشـتر ئـەم رەوشـەیان شـرۆڤەکرد، لـەرێگای "AKP" وە قۆنـاخێکی نوێیـان دەسـتپێکرد. لەئەنجامـدا لەلایـەن ئەمریکاشـەوە لـەبواری سـتراتیژییەوە دەسـتی لێبـەردراو رووبـەڕووی چارەنووسی خۆیان کرانەوە. لەدوای ساڵانی 1950 ئەمریکا بەردەوام پشتگیری لەو مەیلەکرد کەبەشێوەی فاشیستی هەڵدەکشا؛ وەك "MHP,AP" و چەندین دامەزراوی دژە کۆمۆنیستی سەریانهەڵدابوو. بەڵام کاتێك لەهەڵمەتی نوێی جیهـانگیری ساڵانی 1980 کاندا بینی کەدەوڵەتگەڕان و موحافەزەکارن، سەرەتا تاڕادەیەك, دواتریش بەتـەواوەتی یارمەتییـەکانی لێبڕین، سـەرەتا "ANAP" لە2000 کانیشدا پشتگیری لە"AKP" کردو بەمجۆرە هەڵوێـستی خـۆی نـوێکردەوە. تـەنیا توێـژە دەسـەڵاتخوازو دەوڵەتگەراکان لەدواوەمانەوە کەجەمسەری موحافەزەکارانی کۆماربوون. ئەمانە دژی ریفۆرمەکانی نـاو دەوڵـەت و کۆمـەڵگان و دەشـێ وەك "موحافـەزەکارانی کۆمـار"یـش بـەناوبکرێن. لـەم قۆناخانـەی دوایـی بـەگوێرەی مـۆدە بەهاوپـەیمانێتی"سـێوی سوور"یش ناودەبرێت. کۆماری شۆڕشگێڕیان بۆجەمسەرێکی موحافەزەکاری سەرمایەداری دەوڵەت گۆڕی کەدژی گەلەو خـاوەن تێڕوانینێکی نەتەوەپەرستی شۆڤێنییە. بـەمجۆرە لـەقۆناخی کۆمـاری دەسـتڕۆیی سـەردەمی ئەتاتورکـەوە، بـەرەو پێکهاتەیـەکی دەسەڵاتی دووجەمسەری گۆڕاو، دواتریش کۆتاییەکانی کۆماری ئۆلیگارشی دەستپێکرد.

رەنگدانەوەی ئەم مەیلە لەسەر سیاسەتەکانی سەبارەت بەکوردان بەردەوام بەشێوەی نکوڵیکردن، لەبیربـردنـەوە، بەتـەواوی لەدەرەوە هێشتنەوەی سیستەم بـووە، کاتێـك سـەرهەڵبڕن بـەردەوام سـەرکوتکراون. فاکتـەرێکی دیکـەی گرنگـی ئـەم سیاسـەتە ئەوەیە کە: توێژێکی بەکرێگیراو کەخیانەتیان لەکوردایەتی خۆیانکردووە وەك ئامرازێکی کۆنتڕۆڵ لەسـەر گـەلیان دەهێڵنـەوە. بەرامبەر بەبزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردان کە"PKK"خواستی پەرەی پێبدات، تەواوی راستڕەوو چەپڕەوانی ئەم سیـستەمە یەکپارچـە کەوتنەجوڵـەوە. سـەبارەت بەسیاسـەتەکانی دەرەوەو نـاوەوە یەکـدەنگیان وەك "سیاسـەتی پـیرۆز" دەستنیـشانکرد. لەمیانـەی رۆحـی سـەفەربەری سـەربازییەوە یاسـا، ئـابووری، سیاسـەت، هونـەرو وەرزشـیان بـەکارهێنا. تـەواوی کۆمـەڵگا بۆجەمـسەرێکی میلیگـەرای شۆڤێنی و هێرشـبەر گـۆڕا. مـەیل و رێگـا و قۆناخێـك لەپەیوەنـدی کـورد ــ تـورك ئـافرێنرا کـە هاوتاکەی نەبینراوە. لەراستیدا ئەمە هـیچ پەیوەندییـەکی بـەو ئەتاتورکـچێتییەوە نییـە کەبـەردەوام لەسـەر زمانیانـەو باسـی دەکەن. سیاسەتی مستەفا کـەمال سـەبارەت بـەکوردان پایـەو پێگـە دژە ــ ئیمپریالیـستییەکەی دیاری دەکات. هـیچ بەڵگەیـەك بوونی نییە کەجگە لەدژایەتی ئیمپریالیزم دوژمنایەتیکردنی کوردایەتی ئازاد بسەلمێنێ. لەوانەیـە ئـەو رۆڵـەی کوردانی زیـاتر

لەراستی خۆی گەورە کردبێت، کەئامرازێکی دەستی ئیمپریالیزمن بۆ رووخاندنی کۆمارو گێڕانەوەی سەڵتەنەت و خەلیفە. بەڵام کەس ناتوانێ حاشا لەوەبکات کەئەمە ناوەڕۆکی سیاسەتەکەی نەبووبێ.

تەواوی سیاسەتەکانی ئەوانەی خۆیان بەموحافەزەکار، نەتەوەپەرستی شۆڤێنی و کۆمارگەرایی دادەنێن پێچەوانەی ئەم هەڵوێستەی مستەفا کەمال, لەهەموو بوارێکەوە تورکیایان بەئەمریکاو وڵاتەکانی یەکێتی ئەوروپا بەستەوە، تاوەکو بەرامبەر بەتێکۆشانی ئازادیخوازی کوردان پشتگیری بەدەستبێنن. بتوانێ داخوازی سەرکوتکردن جێبەجێ بکات. لەسەربنەمای دوژمنایەتیکردنی"PKK" تادوایی لەبوارەکانی ئابووری، سیاسی، دیپلۆماسی و سەربازی پاشکۆیەتی و وابەستەیی پەرەیسەند. هەرەدواییش لەپێکهاتنی دەوڵەتی فیدراڵی کوردستان کەکوردە ـــ دەرەبەگە نەتەوەپەرستە سەرەتاییەکان بەیەکەوە لەگەڵ ئەمریکاو ئیسرائیل ئاوایانکرد, رۆڵی مامانێتیان بەکاربەدەستانی تورکیا ئەنجامدا. لەناو دەوڵەتیش دەرفەتێکی فراوانی خۆرێکخستنیان بەتوێژێکی تەریقەتگەراییدا. ئاشکرایە تەواوی ئەم گۆڕانکاریانە دژە ـ کەمالیستین.

ب) دووەمین مەیل و رێگا، لەیەکەمیان جیابۆتەوەو دەرکەوتووە. دەشێ بەرێگای "بۆرژوازی لیبراڵی" یش بەناوبکرێ. لەهەڵمەتی جیهانگیری سەرمایەداری دوای 1980 کاندا کرانەوەی راستەقینەی خۆی ئەنجامداوە. "ANAP" یەکەمین ئەزموونی ئەم شێوەیەیە کەتورکۆت ئۆزال سەرکێشی دەکرد. ئەم رێگاو مەیلە نوێیە کەبەرامبەر ستاتۆگەراییە ـــ کەبەداخراوی و سەرمایەداری دەوڵەتی میلیگەرایی زێدەڕۆ دەناسرێ ـــ ئەم مەیلە بەرامبەر دەرەوە کراوەیە، لیبراڵەو بەلێبووردەیی تەماشای جیاوازییەکان دەکات. خۆلکاندن بەمەیلی جیهانگیری سەرووی نەتەوەکانی وەك ئامانج دیارکردووە, "AP, DP"تێپەڕەکات، بەڵام وەك شێوەی هاوچەرخ و نوێیان جموجۆڵ بەبنەمادەگرێت, دژی ئۆلیگارشی نییە, دوورە لەوەی بەتەواوەتی بەرامبەر دیموکراسی کراوەبێت. بەڵام لەکۆمارگەرا موحافەزەکارو ستاتۆگەرەکان زیاتر نزیکی چارەسەرییە. بۆ هەڵوێستی هاوچەرخانە بەرامبەر گرفت و کێشەکان کراوەیە. هەرچەندە لەبنەڕەتدا مەیلی توێژی سەرمایەداری پیشەسازی تورکە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانستی کۆکردنەوەی توێژەکانی دیکەشی هەیە. TUSIAD لەگووتەبێژە سەرەکییەکانی ئەم مەیلە دەژمێردرێ. پارتی دادو گەشەپێدان لەو رێگایە دایە ببێتە دووەمین نموونەی ئەم مەیلە. لەلایەن ئەمریکا، یەکێتی ئەورووپاو ژاپۆن پشتگیری لێدەکرێت. بەڵام هەرچەندە لەسەر رێبازی تایبەتی خۆشیان ئەنجامبدرێت، لەپرۆژەکانی وەرچەرخانی کۆمەڵگادا دوورە لەوەی دەستپێکێکی جددی لەریفۆرمی دەوڵەت دەست پێبکات. لەناوەندە گرنگەکانی دەوڵەت دەترسێ، ئامێرەکانی بیروکراتی تێپەڕناکات. هەرچەندە شیمانە دەکرێت پارتی دادو گەشەپێدان هێندەی ئۆزال بەکاریگەربێت، بەڵام مسۆگەر نییە. توانست و بوێری تۆرکۆت ئۆزال هێندە لەرەجەب تەیب ئەردۆعان نابینرێ. ئەگەری تەسلیمبوونی ئەردۆغان بەبیرۆکراتەکان کەم نییە. بەتایبەتیش شیمانەیەکی لەپێش و بەهێزە کە لەهەڵوێست بەرامبەر کێشەی کورد دەمامکەکەی ئاشکرابێ و بکەوێ. ناشێ بۆماوەیەکی درێژ بەقاچاخی زۆرانبازی بکات و لێیڕابکات.

سیاسەتی کوردان لەلایەن ئەم مەیلە بەشێوەیەکی سنووردار بۆ چارەسەری کراوەیە. بەتایبەتی لەمێژووی کۆماردا تورکۆت ئۆزال لەمیانەی مەیلی لیبراڵییەوە نیازی هاوێشتنی هەندێ هەنگاوی هەبوو. ئەمەش لەناوی برد. ئەو گێژاوەیەی کەدوای مردنی ئۆزاڵ تورکیا تێیکەوت گرێدراوی ئەم ناکۆکییەیە. ئەو قۆناخەی بۆماوەیەکی درێژ بەپێکدادانی یەکەمین و دووەمین کۆمار بەناوکرا، لەگەڵ قۆناخی ئیمرالی عەبدوڵلا ئۆج ئالان بەئاستێکی جیاوازتر گەیشت. قەیران قووڵتر بۆوە. سیاسەتی حکومەتی MHP,ANAP,DSP کە بولند ئەجەوید رێبەرایەتی دەکردو هەڵوێستی نکوڵیکردنی کلاسیکی بەبنەمادەگرت تەواوی کۆمەڵگای دژی خۆی هەڵساندە سەرپێیان. کاتێ قۆناخی ئاگربەستی یەکلایەنە نەقۆزرایەوە, دەرکەوت کەلەتێگەیشتنی قۆناخ دوورن. ئەمەش رێگای لەپێش ئەوەکردەوە کەلەسندووقی هەڵبژاردنەکاندا ژێرخاك بکرێن و زەبرێکی گەورەیان بەرکەوێت.

هیچ سەرەداوێك دەرهەق بەسیاسەتی AKP بەرامبەر كوردان لەئارادا نییە كەجێگای حكومەتی پێشووی گرتەوە. هەرچەندە بخوازێ لەگەڵ ئەمریكا لەناو هەمئاهەنگی دابێت، بەڵام ئەو هێزە نییە بەتەنیا سەربەخۆ لەم بارەیەوە سیاسەت دیاری بكات و بەڕێوەی ببات. هەموو ئومێدی خۆی بەوە بەستۆتەوە كە ئەمریكا پەلاماری "PKK" كۆنگرەی گەل بدات. هەروەها لەمیانەی چەندین كوردی بەكرێگیراو كەبرای تەریقەتگەراییین (نەقشبەندی) لەدەوڵەتی فیدراڵی باشووری كوردستان قورسایی بۆخۆیان دروستبكەن، هەم ئەوانەی باكووریش بەقورسایی جێگای خۆیان لەناو كۆماری توركیا بگرن، لەژێرچەتری ئەمریكا بەرەو چارەسەرییەك بڕۆن. ڕۆژبەدوای ڕۆژ زیاتر ئاشكرا دەبێ كەلەمیانەی لۆژیكێكی نیو نهێنی و تەقیەگەرایی دەخوازن هەندێ گۆڕانكاری ئەنجامبدەن. بەهۆی هەستیاری نائاسایی كێشەی كوردەوە، چاوەڕوانی دەكرێ بەهۆی پەلامارێكی نهێنی دەزگا موحافەزەكارەكانی دەوڵەتی توركیا و هێزە شۆڕشگێرەكانی گەلی كورد لەژێر پەردەی ئایینی، كۆمەڵایەتی و ئابووری بجوڵێنەوە. ئەم ڕێككەوتنە بابەتییە لەدوای هەڵبژاردنە خۆجێییەكان تارادەیەك ئاشكرابوو (بارزانی و تاڵەبانی بەشێوەیەكی ئاشكرا بانگەوازییان بۆ پشتگیریكردنی AKPكرد). بەهەنگاوێكی داخراوو داپۆشراوی بەمجۆرە كێشەی كورد چارەسەر ناكرێت. شیمانەیەكی بەهێزیش ئەوەیە هەرساتێك ڕێگا لەپێش تەقینەوەی بەهێز بكاتەوە.

ئەو مەیلەی لەلایەن ئەمریكاو یەكێتی ئەوروپاوە پشتگیرییەكی بەهێزی ماددی و دیپلۆماسی لێدەكرێت، مەترسیدارترین لایەنی ئەوەیە: لەڕێگای مۆدێلی كوردستانی فیدراڵی باشوور، میللیگەرایی سەرەتایی كوردان بوروژێنن و بەسەر سوریا، ئێران و توركیاشیدا بسەپێنن. هەروەكو بەتیرۆریست لەقەڵەمدانی"PKK"، كۆنگرەی گەلیش بەتیرۆریست دابنێن و بەمجۆرە دڵی توركیا ڕازی بكەن. لەم لایەنەوە باوەڕی و متمانە دەدەن. لەڕاستیدا ئەم هەڵوێستە دووهێندەی دیكە مەترسییەكە گەورەتر دەكات. لەلایەك میللیگەرای سەرەتایی بەشێوەیەكی بەرچاو بەهێزدەبێت؛ لەلایەكی دیكەشەوە سوود لەڕەوشی ناكۆكییەكانی ناو"PKK" كۆنگرەی گەل دەبینێ و كرانەوەی مەزن ئەنجامدەدات. ئەنجام پێشكەوتنی شێوازی جەمسەرگەری فەلەستین ــ ئیسرائیلی ڕۆژهەڵاتی ناوینە لەهەناوی توركیا، ئێران، سوریا و ئێراق. توانستەكانی بەهێزبوونی مەیلی میللیگەرایی هەردوولایەن ئەمجۆرە گۆڕانكاریانە وەك ئەگەرێك بەزیندوویی دەهێڵێتەوە.

ج) سێیەمین ڕێگاو مەیل ئەوەیە كە: لەتیشكۆی كۆمەڵگاوە سەرچاوە دەگرێ، لەژێرسایەی دیموكراسی هاوبەشی گەلان پشت بەلێگەڕینەكانی یەكسانی و ئازادی دەبەستێ. چەمكی گەلی توركیا وەك ناسنامەی باڵا چەمكی نەتەوەیی نەژادپەرست و شۆڤێنی دەشكێنێ و دەشێ ببێتە وچانی هاوبەشی سەرجەم كولتوورەكان. لەجیاتی چەمكی نەتەوەیی پشتبەستوو بەڕەچەڵەك، چەمكی نەتەوەیی پشتبەستوو بەوڵات لەچەندین وڵاتانی جیهان پەیڕەودەكرێت. ئەمریكا، سویسراو ئینگلتەرا لەسەرووی هەموویانەوە، زۆربەی زۆری نەتەوەكان (گەلان)یان سەرباری ئەوەی فرە كولتوورو فرە زمانن، دەتوانن لەژێرچەتری یەك دەوڵەت ببن بەیەك. ئەوە گرفت نییە كەئەو زمانەی بەشێوەیەكی فراوان و زیاتر بەكاردەهێنرێ ببێتە زمانی فەرمی. بەڵام سنووردارنەكردنی ماف بەكارهێنان و پەروەردەكردنی زمانی گەلان پەیڕەوێكی هاوچەرخ و بەربڵاوە، لەتەواوی جیهان پەیڕەودەكرێت.

ئەوەی لەبناخەی ڕیفۆرمیزەكردنی دەوڵەتدا شاراوەیە: دەوڵەت لەدیاردەیەكی ئایدیۆلۆژی دەربكەوێت، ببێتە ئامرازێكی تەكنیكی خزمەتكردن. چەمكی فەتحكاری و فریادڕەسی مێژوویی كۆسپە لەپێش خوڵقكاری و بڕوا بەخۆبوونی كۆمەڵگا. هەروەكو چۆن هەموو شتێك لەخوداوەند چاوەڕواندەكرێ، ڕێگا لەپێش ئەوەدەكاتەوە ئەمە لەدەوڵەت چاوەڕوان بكرێ. هەربۆیە جگە لەئاسایشی گشتی دەرەوەو خزمەتگشتییەكانی بۆ توێژە جیاوازەكانی كۆمەڵگا بەناچاری دەبینرێ، كاتێك لەتەواوی گۆڕەپانەكان پاشەكشێ بكات، ئەمە بۆریفۆرمێكی ڕیشەیی مەرجە.

لەراستیدا گەورەیی قەبارەی دەوڵەت لەتورکیا زۆر لەدواوەی کۆمەڵگایەو رۆڵی موحافەزەکارییەکی گەورە دەبینێ. هەموو کەسێك، بۆهەر کارێك چاوەڕوانی چارەسەری لەدەوڵەت دەکات. تەنیا لەمیانەی ریفۆرمێکی ریشەییەوە دەتوانرێ ئەم بیروکراسییەت و موحافەزەکارییەی کۆمەڵگا تێپەڕبکرێت. جیاوازی نەکردن لەنێوان هاووڵاتیان و، لەسەربنەمای گەرەنتی رێککەوتنە نێو دەوڵەتییەکان بەشێوەیەکی ئازادانە گوزارشت لەهەبوونی کولتووری خۆیان بکەن، ژیانیشیان بەتوێژێکی ئەتنیکییەوە گرێدراو نەبێت و، هەروەها پەیرەونەکردنی جیاوازی ئایینی و مەزهەبی ئەو مەسەلانەی دەوڵەتن کەپێویستییان بەریفۆرم هەیە. گەرەنتیکردنی ریفۆرمیش لەمیانەی دەستوورەوە مەرجێکی سەرەکییە. ئەنجامدانی گۆڕانکاری پێویست و دانانی یاسای نوێ پێویستە خزمەت بەهەمان ئامانج بکات.

ئەگەر لەبناخەی وەرچەرخانی کۆمەڵگادا هەڵوێستە رەگەزییە کۆمەڵایەتییەکان یەکسان و ئازادبێت، تێردەکات. تەدبیری بەتوانا بەرامبەر ئەو چەمك و پراکتیکانە پێویستە کەژن وەك موڵك دەبینێ. دەبێ لەپێناو ئازادی ژنان ماڵە کولتوورییەکان ـ وەك ماڵی پەنابردن نەبێ ـ وەك پرۆژەیەك گەشەی پێبدرێت.

پێویستە دەست لەگفتوگۆ ساختەکانی لەجۆری حیجاب بەربدرێت. هەروەها کۆمەڵگای ژینگەپارێزی بابەتێکە رۆژبەدوای رۆژ قورسایی خۆی زیاتر نیشاندەدات. کۆمەڵگای ئازاد تەنیا لەمیانەی ژینگەپارێزییەوە مسۆگەردەبێت. پێویستە لەژێررۆشنایی دوا پێدراوەکانی زانست کۆمەڵگای گونجاو بەژینگەپارێزی بەئاستێکی دەستووری بگەیەندرێت. لەکۆمەڵگایەکی ئازاددا جێگای دیاردەی لەجۆری بێکاری، بێ پرۆژەیی، بنبەستبوونی بودجە نابێتەوە. پێویستە قورسایی بدرێتە سەر ئابوورییەك کەخۆراکی تەندروستانەی کۆمەڵگا بەبنەما بگرێت و پشت بەخۆراکی سروشتی ببەستێ. پێویستە هەنگاونان لەئابوورییەك کەقازانج بەبنەما دەگرێ بۆ ئابوورییەك کەدەرفەتی بەخێوکردنێکی تەندروستانەو ژیانێکی هاوچەرخانە بدات و پێبەپێ کاڵابوون کەمبکاتەوەو بەهای بەکارهێنانی هەبێت، بەبناخەبگیردرێ.

ئەم رێگاو مەیلەی ریفۆرمی دەوڵەت و وەرچەرخانی کۆمەڵگا کەبەمجۆرە هێڵە گشتییەکەیمان دیاریکرد لەنزیکەوە پەیوەندی بەچارەسەرکردنی کێشەی کوردەوە هەیە. رەنگدانەوەی ئەم مەیلە لەسەر کێشەی کورد، پەسندکردنی ئاشتی و چارەسەری دیموکراتییانەیە. بۆئاشتی پێش هەموو شتێك پێویستی بەئاگربەستێکی دوولایەنی هەیە. بۆچارەسەری دیموکراتییانە دەشێ باس لەئەگەری دوو گۆڕانکاری بکەین: یەکەمین شێوازی چارەسەری، ئەو گۆڕانکارییانەی کەلەگەڵ دیموکراتیزەبوونی تورکیا بەدیدێت. لەم پێناوەشدا ئەو ریفۆرمەی دەوڵەت پێویستە کەبەکورتی ئاماژەمان پێیکرد. پێویستە کوردان دەست لەوەبەردەن کەکۆسپی نهێنی و ئاشکرا لەپێش دیموکراتیزەبوونی خۆیان دابنێن، دەبێ یاساکانیش لەرەوشی کۆسپنانەوە دەربخرێن. تائێستاش رێنەدان و ئەنجامنەدانی کۆبوونەوە بەزمانی کوردی، هێزی کۆسپنانەوەی یاساکان دیاریدەکات. بەشێوەیەکی کرداری کۆسپی جددیتر هەن. بەتایبەتیش ئیتر پێویستە چەمکی دروستکردنی کادیرانی دەوڵەت لەسەربنەمای نکوڵیکردنی نەریتی و بەکرێگیراوی بەریشە کورد، عەرەب، ئاشووری، ئەرمەنی، رۆمی و قەفقاسی دەستی لێبەربدرێت. لەکاتێکدا ئەم "یەنی چەری" (بەشێکی سوپای عوسمانییە: لەو سەربازانە پێکهاتووە کەبەڕەچەڵەك قەوم و نەتەوەی جیاوازترن و کراونەتە تورك) هاوچەرخە جۆرێکی کادیرانی "هەڵگەڕاوەو گۆڕاون" کەلەمیانەی چەمکی لەپادشا پادشاتر میللیگەرا نەژادپەرستەکان دەوروژێنن، لەژێرەوەش خەڵات بەمیللیگەرایی کەمینە دەبەخشێ. ئەمەش وڵاتپارێزی راستەقینەو یەکێتی ئازادو دیموکراتییانەی گەلان تێکدەدات. هەروەکو لەهەڵوەشانەوەی عوسمانییەکاندا بینرا ئەم کەسایەتییانە رۆڵیان لەگەندەڵبوونی کۆماریشدا بچووك ناکرێتەوە. چارەسەرییەکی دیموکراتییانە لەرێگای ئەم کادیرانەوە بەڕێوەناچێت. دیموکراتیزەبوون لەگەڵ کادیرەکانی خاوەن ناسنامەی تەریقەتگەراییش ناگونجێ. تەریقەتگەراکان دیموکراسی

بەکاردێنن. بەڵام بەشداری سەرفرازییەکەی نابن. بۆئەوەی گەلی کوردو تورك لەپلاتفۆرمێکی ئازاددا بگەنە یەکتری پێویستی بەهەندێ ڕێکخستنەوەی نوێ هەیە. دەبێ کەمایەتییەکان بپارێزرێن.

دووەمین ڕێگای چارەسەری دیموکراتییانە، پێویستە کوردان بەتایبەتی دیموکراسی خۆیان ئاوابکەن. ئەگەر یەکەمین ڕێگا بەبنبەستکراوی بمێنێتەوە، بەشێوەیەکی سروشتی ئەو ڕێگایەی دەگیردرێتەبەر گەشەپێدانی ڕێساو دەزگاکانی دیموکراتیزەبوونە لەلایەن خۆیانەوە. دوا هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان و شارەوانییەکان جارێکی دیکە نیشانیدا، سەرباری ئەوەی کوردان پاڵێوراوی خۆیان هەڵبژارد، یاسا دژە دیموکراتییەکان و ئەوکۆسپانەی کە دەوڵەت لەڕێگای ماددی و فشارەوە نایەوە، کەدەوڵەت ڕێز لەئەنجامەکانی ئەم هەڵبژاردنانە ناگرێ و هێزی پراکتیزەبوونی بەدەستنەهێناوە. لەماوەی داهاتوودا چەندە ئەم کۆسپ و سنووردارکردنانە بەردەوام بن، ئەزموونی دیموکراسی گەوهەری کوردان خێراتر دەبێت. ئەو قۆناخەی بەکۆنگرەی گەلەوە دەستپێکردووە چەندەی دەچێ دەبێتە گۆشت و ئێسك. بەشێوەیەکی ڕێکخستە پێکهێنانی کۆنگرەی گەل وەك ئامرازی باڵای کارگێڕی و بەڕێوەبەرایەتییە خۆجێییەکانی خۆی، ناوەڕۆکی دیموکراتیزەبوونی کوردان پێکدێنێ. ئەم بزووتنەوە دیموکراتییە لەپەرلەمانی فیدرالی کورد ناچێ، فیدرالیزم چەمکی دەوڵەتی فیدرال ـ بۆرژوا بەبنەما دەگرێت. لەبواری پرەنسیپەوە کۆنگرەی گەل (کۆماگەل) دژی دەوڵەتخوازییە. دیموکراتیزەبوون و بەدەوڵەتبوون لەگەڵ یەکتر لەناو دژایەتییەکی دیالەکتیکی دان. ڕێساو دەزگا دیموکراسییەکان لەژێردەستپێشخەری کۆنگرەی گەل دان، لەجیاتی فیدرالیزم، کوردستانێکی دیموکراتیك پێکدێنن. کوردستانی دیموکراتیك دژی یەکێتی وڵاتەکانی تورکیا، ئێران، ئێراق و سوریا نییە. تەنیا داخوازی یەکێتییەکیان لێدەکات کە لەسەر بنەمای ڕێککەوتنی دیموکراتییانە بێت. هەربۆیە کوردستانێکی دیموکراتیك بەواتای تورکیایەکی دیموکراتیك، سوریا، ئێران و ئێراقێکی دیموکراتیك دێت. تەنیا لەمیانەی ئەم مۆدێلەوە دەتوانین بەربەست بۆ ئەو ململانێیانە دروستبکەین کەلەسەربنەمای میللیگەراییە. دەتوانین ڕێگری لەئافراندنی فەلەستین ـ ئیسرائیلی نوێ بکەین. هەردوو ڕێگای دەرەوەی ئەمە سەرکوتکردن و نکوڵیکردنە، بەرامبەرەکەشی سەرهەڵدان و شەڕە. لەم بارەیەوە مێژوو وانەو ئەزموونی پێویستی پێشکەشکردووین.

لەگەڵ ئەوەی دەنگی داخوازییەکانی دیموکراتیزەبوون و چارەسەری دیموکراتییانە لەتورکیا بەرزبۆتەوە، بەڵام هێشتا لەرۆژەڤی سیاسی بەجێنەبووە. کەچی دەبینرێ لەتەواوی وڵاتەکانی ئەوروپا، تەنانەت چەندین وڵاتانی ئاسیا، ئەفریقیاو ئەمریکا بەشێوەیەکی بەرفراوان مۆدێلی دیموکراسییان سەبارەت بەکێشەکانی کولتوورو گەلان پەیڕەوکردووە. ئاراستەی جیهان بەردەوام بەم لایەنەوەیە. دواترین نموونە چارەسەری قوبرسە. ئەو کێشەی چەندین ساڵە بووە بە"کانگرێن" لەمیانەی دیموکراسییەتێکی هاوبەشی دوولایەنە بەرەو چارەسەری دەچێت. دەشێ بۆچارەسەری دیموکراتییانەی کێشەی کوردیش ئەزموونبەخش بێت. هەروەها دەشێ مۆدێلەکانی باسك، ئێرلەندا، سکۆتلەندا، سویسراو بەلژیکا ڕۆڵ ببینن و کۆمەك بەچارەسەری بکەن.

پێویستە کاربەدەستانی تورك باش بزانن کەبەشێوازی کۆن ناتوانن کوردان بەڕێوەببەن. ئەگەر ئێراقی دووەم نەخوازن، پێویستە بەجددی هەڵوەستە لەسەر ئاشتی و چارەسەری دیموکراتییانە بکەن. دەبێ باش بزانرێ کەئەم چارەسەرییە پێچەوانەی پراکتیزەکردنێکی واقیعی هەڵوێستی ئازادی مستەفا کەمال نییە. بانگەشەکردنی ئەوەی کەئەتاتورك دوژمنی هاووڵاتێتی ئازادی کوردو، ئۆرگانە هاوبەشەکان یان تایبەتەکانی بووەو، کەمالیزم بەواتای دوژمنایەتی کوردان دێت؛ ئەمە بەواتای کەوتنە ناو تەڵەزگەکانی میللیگەرایی دێت. کوردستانێکی دیموکرات و ئازاد گەرەنتییەکی ڕاستەقینە، برایانەو هەمیشەیی یەکپارچەیی دەوڵەت و وڵاتی تورکیایە. هەروەکو ڕابردوو، لەرۆژگاری ئەمڕۆشماندا کۆڵەکەیەکی ستراتیژییە. کوردو کوردستانێکی نکوڵیلێکراو بەردەوام بەواتای مەترسی، کێشە و سەرهەڵدان و دەستێوەردانی دەرەوە دێت. ئەمەش

بەواتای خەرجکردن و بەفیڕۆدانی تەواوی تواناکارییە ماددی و مەعنەوییەکانی کۆماری تورکیاو کۆمەڵگاو کەوتنە ناو قەیران دێت. ئەمەش بەواتای لەدەستدانی هێزو قورساییەکەی دێت لەرۆژهەڵاتی ناوین و ئەوروپاو جیهان. لەدۆخێکی وەهادا پێهەڵگرتنێك لەسەربنەمای دیموکراتیزەبوونی هاوبەشی کورد ـ تورك لەرەوشی گێژاوی رۆژهەڵاتی ناوین ئەنجامبدرێت بەلانی کەم هێندەی پێهەڵگرتنە مێژووییە هاوشێوەکانی واتادارە. بۆنەبینین و پراکتیزەنەکردنی ئەمە، یان دەبێ دوژمنی گەل بیت یان خیانەتکاری نیشتمان. تەواوی پێشکەوتن و گۆڕانکارییەکانی جیهان، ناوچەکە، تورکیاو کوردستان ئاشتی و چارەسەری دیموکراتییانە دەسەپێنن.

قۆناخی سەرمایەداری نوێ کە لە 2000کان خێرابوو، پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ یەکێتی ئەوروپاو ئەمریکا گەیاندە بەرزترین ئاست و داخوازی تێپەڕکردنی قۆناخی لەلابەهێزە. هاوشێوەی قۆناخی پارتی دیموکراتی DP پەنابردنە بەر هەڵمەتێکی دیموکراسی خۆنمایشکردن بەناچاری دەبینێ. هەم بۆ یەکێتی ئەوروپا، هەم بەرامبەر سوپا پێویستی بەو قەڵغانە هەیە. ئەو توانست و گەوهەرەی نییە رێبازێکی جێگیری دیموکراتییانە بەدیبێت. پێشکەشکردنی ئایدیۆلۆژیای ئیسلامی وەك "دیموکراتە موحافەزەکارەکان" دوورە لەوەی بەتەواوەتی لەکاریگەری تەقیەگەرایی پاك بووبێتەوە. هێزی لەو شکاندنەوانە وەرگرتووە کەقۆناخە دژوارەکانی تێکۆشانی ناوەوەو دەرەوە رێگایان لەپێشکردەوە، بەمجۆرە لەناو دەوڵەت بووە بەخاوەن قورساییەکی مەزن. لەقۆناخی داهاتوودا قورسایی کۆمەڵایەتی و سیاسی یەکلادەکرێتەوەو شوێنی راستەقینەی خۆی دەدۆزێتەوە.

لەبەرامبەر دواهەڵمەتی سەرمایەداری تورکیا پێویستە تەواوی گەلانی تورکیا, بەتایبەتیش گەلی کورد, بەشێوەیەکی زۆر وریاو وردەکارانە بیربکاتەوەو بجووڵێتەوە. وەك لایەنێك کەلەهەردوو قۆناخی رابردوو زیانی بەرکەوت، هەم دەشێ ئەم قۆناخەی سێیەم ببێتە قۆناخێك, هەرنەبێت نیو بەنیو دەسکەوتی لێ بەدەستبهێنرێ، هەم بەرامبەر بەو بێکاری و هەژارییەی هەرەس ئاسا گەورە دەبێ تاکەچارەی رزگارییە کەپەنای دەبردرێتەبەر.

رۆژەڤی سەرەکی گەلی تورکیا: سەرخستنی ئەو هەوڵەیە کەراوەستەی دیموکراتییانەی خۆی بۆ بزووتنەوەیەکی رێکخستەو خاوەن چالاکی وەرچەرخێنێ. لەبەرئەوەی رێبازەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو (پارتی کۆمۆنیستی تورکیا TKP وهتد...) و میللیگەرا چەپڕەوەکان لەهەرسێ قۆناخیشدا لەبزووتنەوەی دەوڵەتگەراو وابەستەیی دەوڵەت رزگاریان نەبوو، بەشێوەیەکی بابەتی لەبەهێزکردنی قۆناخی سەرمایەداری بەولاوە هیچ رۆڵێکی دیکەیان نەبینی. بەڵام ئەمەش راستییەکە میراسێکی بەهێزی ئازادیخوازی و یەکسانیخوازی لەئارادایە. کێشە ئاواکردنی بزووتنەوەیەکی جەماوەری ئازادی و یەکسانی بەپەرەنسیپە لەسەر ئەم میراسە. بزووتنەوەی دیموکراتی گەلی کورد کە هەڵستاوەتە سەرپێیان، لەرەوشێکی وەهادایە گەورەترین کۆمەك بەو بزووتنەوەیە بکات. لەبنەڕەتدا ئەوەی پێویستە تەواوی گروپە چەپڕەوەکانی تورکیا، لەبزووتنەوەی دەوڵەتخوازی وابەستەی دەوڵەت دەربکەون و بەدیموکراسیبوونێکی سەقامگیر بگەن و لەسەرئەم بنەمایە یەکێتییەك ئاوابکەن.

سەرباری ئەوەی وەك ئاراستە "یەکێتی هێزە دیموکراتییەکان" راستبوو کەهەرەدوایی لەلایەنی شەش گروپ (EMAP,SDP,ÖDP,DEHAP,SHP) ئاواکرابوون، بەڵام لەبەرئەوەی لەبواری ناوەڕۆك و ئەرکدا لەخراپییەکانی میراسی کۆن رزگاریان نەببوو، دابڕانی ریشەییان لەئایدیۆلۆژیای دەوڵەتخوازی و بیروکراسییەت ئەنجامنەدابوو، سەرکەوتنیان بەدەستنەهێنا. ئەوەی پێویستە لەسەربنەمای ئەم ئاراستەیە ئەنجامدانی کاروانێکی بەرفراوانی بنکەی جەماوەرییە لەمیانەی بزووتنەوە ژینگەپارێزی، فێمینستی، مافەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگای مەدەنی کە لەسەربنەمای جەماوەر ـ بەتایبەتی بێکاران و هەژاران لەسەرووی هەموویانەوە ـ وەك چەترێك خۆی رێکخستووە. لەمیانەی دینامیکی بزووتنەوەی دیموکراتی کوردان، ئەم

کاروانــە بەرامبــەر بەدەســەڵاتی ئۆلیگارشــیيانەی بەســەرمایەداری ئــەنادۆڵ تــەواوکرد، دەشــێ وەڵامێکــی راســتەقینە بداتــەوە, تامەزرۆیی ئازادی و یەکسانیخوازی گەلانمان و سەرکەوتنیان بەدەستبێنێ.

ب. ئەرکەکانی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی "PKK" و سەردەمی کۆنگرەی گەل

ئــەو هەڵســەنگاندنانەی بــەناوی "PKK" پێــشکەشمان کــرد، هــەروەها هەڵوێــستەکانی ســەبارەت بەرەخنــە ــ رەخنــەدان و کێشەکانی سەرلەنوێ ئاواکردنــەوە نیــشاندرا، دەرهــەق بەبابــەتی ئەرکــەکان رۆشــن و  وریامــان دەکاتــەوە. هەرچــی شــرۆڤەکانی سەبارەت بەچارەسەری دیموکراتییانەیە، دەرفەتی زیاتر تێگەیشتنی بابەتی کۆنگرەی گەلمان نیشاندەدات.

1 ـ کاتێك بەناوی "PKK" بەرەو سەرلەنوێ ئاواکردنەوە دەڕۆین، پێویستە زۆرباش رەچاو بکەین و دەرك بەهۆکارەکانی بێ رۆڵ مانەوەی پێکهاتەی کۆن بکەین. لەسێ خاڵی سەرەکی رەخنەی پێکهاتەی کۆنمـان کـرد. یەکـەمیان: چـەمکی پـارتی وەك بــەردەوامی چــەمکی دەوڵــەت تــاوتوێکردووەو بەرێــچکەی پێگەیــشتنی دانــاوە. بــوون بــەپارتێکی دەوڵــەتخواز، ناکۆکییــەکی دیالەکتیکی لەگەڵ ناوەڕۆك و شێوەی پێشکەوتنی دیموکراتییانەو ئازادی و یەکسانیدا هەیـە. "PKK" بەتـەواوی مانـای وشـە خــۆی لــەم چــەمکە رزگــار نــەکردبوو. دووەمــین بابــەتی رەخنــەکردن تێــڕوانینی بــوو ســەبارەت بەدەســەڵات. ئــەو بابەتــەبوو کەپارتێك بەگوێرەی گەیشتن بەدەسەڵات شێوەی گرتبێت بــەردەوام دیموکراتیزەبــوونی کۆمــەڵگا دوادەخــات و لــەکاری دەخــات. ئەو کادیرانەی بەگوێرەی ئەمە پێگەیشتوون لەجیاتی ئەوەی پشت بەگەل ببەستن، یان قورسایی دەدەنە سەر بوون بـەخاوەنی دەســتڕۆیی، یــان پــشت بەدەســتڕۆیی دەبەســتن. ئــەوەی بــەردەوام ســەرنجیان رادەکێــشێ ئــەو ژیانــە تایبەتەیــە کەپــشت بەبەرژەوەندیپەرستی دەسەڵات دەبەستێ. جەختم لەسەرئەوە کردەوە کە سێ رێبازی گرنگی شۆڕشگێڕی ئەم هەڵوێستە بـوون بەمەزهەبەکانی سەرمایەداری. رێبازەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو، سۆسیال ـ دیموکرات و رزگاری نیشتمانی کاتێك لـەجیاتی دیموکراسی پێشوەخت دەسـەڵاتیان بەبنـەماگرت, سـەرەتا رێگای لـەپێش گەنـدەڵبوونیان کـردەوە، دواتـریش هەریەکـەو بوونـە کۆڵەکەیـەکی یـەدەگی سیـستەمی سـەرمایەداری. سێیەمین رەخنـەدان سـەبارەت بەبابـەتی شـەڕ ئەنجامـدرابوو. بـەبێ ئـەوەی سروشتی شەڕ بناسرێ، هەرچی جۆرێـك بێـت، وەك ئـامرازێکی پـیرۆز تەماشـای دەکـرا. کەچـی جگـە لەخۆپاراسـتنی ناچـاری و ژیانیی هەرشەڕێك تاوانێك بوو. لەمێژوودا شەڕ لەژێر تەواوی دەسەڵاتە چەوسێنەرەکاندا شاراوەیە. رێساو دەزگاکانی کۆمـەڵگا بــەگوێرەی شــەڕ رێکخرابــوون. ســەرکەوتن لەشــەڕ بەبناخــەی گــشت مافــەکان دادەنــرا. ئاشـکرایە کەنەدەشـیا ئـەم چـەمکە هەڵوێستێکی سۆسیالیستی و دیموکراتییانە بێت. پارتی سۆسیالیستی واتە: نابێ دەوڵەتخوازبێ، نابێ ئامانجی دەسەڵات بێ, نابێ بــەگوێرەی شــەڕ رێکبخرێــت و بخــەملێنرێ، هــەروەها شــەڕیش بەبناخــەی هــەموو مافــەکان دانــەنێ. بەبایەخــەوە ئاماژەمـان بەوەکرد کەسەرلەنوێ پێناسەکردنی خود ئەنجامنـەدرێ، هـەنگاونان بـەرەو سـەرلەنوێ بونیادنانـەوە، لەوانەیـە کـەموکورتی و هەڵەی گرنگ لەخۆوەبگرێ.

لەرەوشێکی وەهادا پێناسەکردنمان بۆ پارتی پێویستە وەڵامەکانی رەخنەدان بەبنەما بگرێت. پێویستی بەپێناسەیەك هەیـە کە لەتیشکۆی دەوڵەت و دەوڵەتخواز نەبێ، دەسەڵات و شەڕ لەناوەندی وەرچەرخانی نوێی کۆمەڵگا دانەنێت. بەگوێرەی ئـەوەی شـەڕو دەســەڵات بناخــەی ســەرمایەداری پێکـدێنێ کـەدوا سیـستەمی کۆمـەڵگای چینایەتییە، پارتێـك کـەئامانجی تێپـەڕکردنی سـەرمایەدارییە، پێویـستە شـەڕو دەسـەڵاتیش، هـەردووکیان لەبناخـەی کۆمـەڵگا بـەلاوەبنێ. ئەمـەش تـەنیا لەمیانـەی گـۆڕینی ڕاوەستەی دیموکراتییانەو هـەبوونی کۆمـەڵکاری کۆمـەڵگا بـۆ کۆمەڵگایـەکی دیمـوکرات، ئـازادو یەکـسان بەدیـدێت. کاتێـك ئـەم فاکتەرانە رەچاوبکرێ، پێناسـەی پارتیمـان لەمیانـەی بەرنامەیـەك ئەنجامـدەدرێ کەوەرچـەرخان بـەرەو کۆمەڵگایـەکی ئـازادو یەکـسان بەبنـەمادەگرێ، تـەواوی ئـەو توێـژە کۆمەڵایەتییانـەی بەرژەوەنـدییان لـەو بەرنامەیەدایـە لـەدەوری سـتراتیژییەکی هاوبەشدا کۆدەکاتەوە. ئەمەش دەبێت رێکخستنێکی ئەرکانی بزووتنـەوەی کۆمـەڵگا کەپـشت بەرێکخـستنێکی فـراوان و شـێوەی

چالاکییەکانی دەبەستێ، لەسەرووی هەمووشیانەوە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ـ ژینگەپارێزی، فێمینستی، کولتووری ـ تەکتیکێکیش بەبنەمادەگرێ کەبەرگری ڕەوای پشتگوێ نەخستووە.

ئەو ناوەی لەتیۆری ئەو تێڕوانینە سەرەکییەی دەنێین کەپێناسەکەمانی سەبارەت بەپارتی ئاراستەکردووە، بەمەرجێك گرێدراوی بێت دەشێ "سۆسیالیزمی زانستی"جاران بێ. یاخود دەشێ" سۆسیالیزمی دیموکراتییانە"ش بێ کەگوزارشتی هاوبەشی سێیانەی فەلسەفەی گشتگیرترین کۆمەڵناسی، ئەخلاق وەك هۆشیاری ئازادی کۆمەڵگا، لەگەڵ سیاسەت کەبەواتای ئیرادەی وەرچەرخان دێت. گرنگ ناو نییە، پێناسەکردنی ناوەڕۆکە. پارتی بەبێ تیۆری نابێ، هەروەکو چۆن بیر لەجەستەیەکی بێ زهنییەت ناکرێتەوە، ئەوا بیر لەپارتێکی بەبێ تیۆریش ناکرێتەوە. بەو ئەندازەیەی تیۆری بەرزترین ئاستی گشتگیری پێشکەوتنی زانستی لەخۆوە دەگرێت، لەرەوشێکی وەهادایە کەوەك هونەرێك دەرك بەئەخلاق و سیاسەت دەکات کەئیرادەی وەرچەرخانی کۆمەڵگایە. زهنییەتی پارتی بەردەوام کۆمەڵناسی و ئەخلاق و سیاسەت بەیەکەوە بەکاردێنێ، تاوەکو وەرچەرخانی کۆمەڵگا دەبێتە دیاردەیەك کەلەخۆیەوە بەڕێوەبچێت، تاوەکو لەژێرسایەی سیستەمی سەرمایەداری بژی پێویستە.

زهنییەت هێزی واتایی پارتییە. ئاشکرایە کەپێویستە زهنییەتی پارتی زۆر باش دەرکی بەزانستی کۆمەڵایەتی (کۆمەڵناسی) کردبێت. کۆمەڵناسی کەتەواوی پێشکەوتنە زانستییەکان دەگرێتەوە، دوا تەواوکەری زانستەکانە، هێزی ڕۆشنکەرەوەی ئەو کۆمەڵگایەیە کەدەخوازرێ وەرچەرخێنرێ. دیاردەی کۆمەڵگا کەرابردوو لەمیانەی ڕێبازەکانی میتۆلۆژی، ئایینی و فەلسەفی هەوڵی ڕۆشنکردنەوەی دەدرا، لەکاروانی درێژخایەنی خۆیدا ئەگەر بەشێوەیەکی سنووردارىش بێت لەروونکردنەوەیەکی کۆمەڵایەتی ـ زانستی نزیك بۆتەوە. دەرککردنی زانستییانەی کۆمەڵگا هێزێکی مەزن دەبەخشێ. لەم بوارەدا ئەگەر بەشێوەیەکی سنووردارىش بێت تێگەیشتنی سۆسیۆلۆژی، بەهێزترین لایەنی وەرچەرخانی کۆمەڵگایە. بەڵام ئەمە تێرناکات. پێویستە ئەم مەسەلەیە باش بزانرێ کەتەواوی خەباتە میتۆلۆژی، ئایینی، فەلسەفی و زانستییەکان درێژایی مێژوو لەدوا شرۆڤەدا سەرچاوەکەی کۆمەڵگایەو لەپێناو ڕۆشنکردنەوەی ڕاستینەی کۆمەڵگاو کێشەکان و ڕێگەچارەکانی و جێبەجێکردنی پێویستییەکان بە ئاواکراون و ئەنجامدراون. هەبوونێکی لەکۆمەڵگا جیاوازتریان نییە. تاوەکو دەرك بەکۆمەڵگا نەکرێت، ناشێ بەپێی پێویست دەرك بەتاك، کەرەستەو سروشتیش بکرێ. شەڕو دەسەڵات، دەوڵەت و نەزانی و ستەمکاری لەسەرچاوەی ئەو کارەساتانەی مرۆڤایەتی شاراوەیە کەبەسەر کۆمەڵگادا هاتووە. تەنیا کاتێك لەکۆمەڵگا تێبگەین دەتوانین ئەم دەزگایانەی نەزانی و ستەمکاری بەرکەنار بکەین. لەکاتێکدا دەوڵەت و دەسەڵات و شەڕ بەرهەمی لادانی ژێری ئەنالیتیکن، تێپەڕکردنیشیان تەنیا لەمیانەی دەستدانە دەستی یەکدی ژێری ئەنالیتیك و ژێری سۆزداری بەدیدێ. ئەوانەی بەمەسەلەکانی دەوڵەت، دەسەڵات و شەڕ، هەروەها ئاشتی پەیوەستداردەبن، مسۆگەر پێویستە قورسایی بخەنە سەر تۆکمەیی و پڕی چەمکی کۆمەڵگا.

ئەخلاقیش دەبێتە پارچەیەکی جیانەکراوەی زهنییەتی پارتی. لەراستیدا ئەخلاق شێوەی باوو نەریتی ئازادی کۆمەڵگایە. لەدواشرۆڤەدا زانینە. ئەو کۆمەڵگایەی ئەخلاقی نەمابێت واتە ئازادیشی کۆتایی پێهاتووە. کۆمەڵگای بێئەخلاق، کۆمەڵگایەکە لەناوچووە. لەدۆخێکی وەهادا لەهەوڵەکانی گۆڕین و وەرچەرخانی کۆمەڵگا، بەبنەماگرتنی ئەخلاق و نەکەوتنە ناو بێئەخلاقی، پرەنسیپێکی ژیانی و دەستلێبەرنەدراوە. ئەو ڕێبازە کۆمەڵایەتییانەی جێگا بەئەخلاق نادەن چاوەڕوانی هەمیشەییبوونیان لێناکرێت. ئەوانەی لەوەرچەرخانی کۆمەڵگادا بەبڕیارن پێویستە هەرگیز پەیوەندی خۆیان لەگەڵ ئەخلاقی ئازادی نەپچڕێنن.

پەیوەندی زهنییەت لەگەڵ ئیرادەی سیاسی پەیوەستی چالاکییەکانە, تەنیا کاتێك تێگەیشتن و بەئەخلاقبوون لەگەڵ چالاکییەکاندا بووبەیەك بەهای دەبێت، بەهێزی چارەسەری دەگات. بێ سیاسەتی پڕیەتی لەخەڵەتاندنەکانی زانستی و ئەخلاقیبوون. مسۆگەر تەسلیمبوون بەناوی هێزە باڵادەست و زۆردارەکان خۆفرۆشتنە. زانینی دەسەڵات، بەواتای بوونە بەپارچەیەکی ئەخلاقی رەسمی. بێگاریگەری و تەنانەت پێچەوانەبوونەوەی هەڵوێستی چەندین زانا لەگەڵ ئامانجەکانی کەدژ بەکۆمەڵگا رۆڵیان بینی، هۆیەکەی بۆ پشتگوێخستنی ئەم پەیوەندییە دەگەڕێتەوە. ئەوەی لەو سەردەمەماندا بەربڵاوە تەنیا خەریکبوون بەئەخلاق، یان زانست یاخود سیاسەت، هەڵوێستێکی مەترسیدارەو دەرگای بەرووی هەمووکارەساتێکدا کراوەیە. لەوانەیە ئەوەی هەرەزێدە پێویستە، تۆکمەکردنی هەڵوێستێکە ئەم دابڕانەی رۆژگاری ئەمڕۆمان بەلاوەبنێ، ئاشکراترین گوزارشتی ئەمەش گەیشتنە بەزهنییەتێکی تۆکمەو لێهاتووی پارتی.

لەم لایەنەوە ئەو پێناسەیەی دەرهەق بەزهنییەتی پارتی ئەنجامماندا بایەخێکی گەورەی هەیە. تاوەکو ئەم شێوازەی زهنییەت بەبنەمانەگیرێت و پراکتیزەنەکرێت ئەوا لەو بنبەستبوونەی سۆسیالیزمی بونیادنراو، سۆسیال ـ دیموکرات و رزگاریخوازە نیشتمانییەکان تێیکەوتن و، بوون بەهێزی یەدەگی سیستەم رزگاریان نابێت. هەربۆیە کاتێك بەرەو سەرلەنوێ ئاواکردنەوە دەچین، گرنگی لەپێشینە بەفاکتەری زهنییەتی پێناسەکەمان دەدەین سەبارەت بەپارت. لەم لایەنەوە پارت لەمیانەی پێکهاتە زهنییەکەیەوە چەندە بەهێزبێت، ئەوا بەو ئەندازەیە دەتوانێ لەمیانەی ستراتیژی و تەکتیکی لێهاتووانەوە بەرنامەکەی بەهێزو نزیك بەڕاستی بێت، لەرەوشێکی پێچەوانەدا لە لەدەستدانی ئەوهەنگاوانە رزگاری نابێت کەوەك دەسکەوت قازانجی کردبوو. تەنانەت لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشەکانیش، ناتوانین رووخانی ئەو پێکهاتانە بەربەستبکەین کەئاواکراون. لەم لایەنەوە سۆسیالیزمی سۆڤییەت ئەزموونبەخشە. مەسەلە تەنیا یەکێتی نێوان تیۆری و پراکتیك نییە. ئەو پرسیارە گرنگە ئایا تیۆرییەکی خاوەن چ ناوەڕۆکێك، بەپشبەستن بەکامەتیۆری و زهنییەتی پارتی، پارتی بەڕێوەدەبەین. تیۆری و زهنییەتێکی پارتی کەناوەڕۆکەکەی بەگوێرەی ئامانج پێناسەنەکرابێت، لەئەنجامدا دەبێتە فاکتەری ئەو هەڵەو کەموکوڕییە پراکتیکییانەی رێگای لەپێشکردۆتەوە. هەربۆیە پێویستە یەکێتی تیۆری ـ پراکتیك بەپتەوی بناخەکەی دابنرێت.

کاتێك تیۆری تۆکمە لەبەرنامەدا رەنگبداتەوە واتادار دەبێ. بۆ پارتێك بەرنامە گوزراشت لەپێوانە سەرەکییەکانی وەرچەرخانی کۆمەڵگا دەکات. کۆمەڵەیەك بەرنامە ئامادەنەکات، یان ئامادەبکات بەڵام هەرسی نەکات ئاستەمە بەپارت بەناو بکرێ. واتای وشەی پارتیش، بەشی بچووك، پارچە دەبەخشێ. بەسەرهاتێکی مێژوویی درێژخایەنی هەیە. دەشێ یەکەمین گروپی بەئەزموونی رێنیشاندەری کۆمەڵگا بەپارت بەناوبکرێ. یەکەمین گروپی حوکمداری پلەداری پارتە. کاتێك بەرەو ئاواکردنی دەوڵەت هەنگاونرا، گروپی بەڕێوەبەرایەتی لەهەمانکاتدا وەك گروپی ئایدیۆلۆژی و رێکخەری پراکتیکی پارتی حوکمڕانی ئاوادەکات. کۆمەڵگای ژێر هەم لەبواری هزر، هەم لەبواری بەرهەمهێنان بەخۆیانەوە دەبەستنەوەو بێ پارتیان دەهێڵنەوە. لەراستیدا باوەڕی تەوتەمگەرایی قلان و تیرەو هۆزەکانی بەواتای پارتی خۆشیان دێت. بەواتایەکی سەرەتایی نەریتی کۆمەڵەکان پارتییە. هەروەکو لەمێژوو دەزانرێ هۆزی حەزرەتی ئیبراهیم هەم بەرامبەر نەمروودەکانی بابل و ئاشوور، هەم فیرعەونەکانی میسر نوێنەرایەتی یەکەمین پارتی ئازادیخوازی تیرەو هۆزە هەژارەکان دەکات. ئەم پارتییە هەم گەلەرییە هەم یاخییە. دەشێ بەپارتی گەلی یاخیبووش بەناوبکرێت. هەرچی حەزرەتی عیسایە بۆیەکەمین جار هۆزی عیبرانی پارچە دەکات، بزووتنەوەی پارتی چینی هەژاران دەستپێدەکات یاخود پارتی پێشووتری هەژاران (ئەسەنییەکان) بەرەو قۆناخێکی پێشکەوتووتر دەبات. بەدرێژایی سێ سەد ساڵ ئایینی مەسیحی وەك پارتی هەژاران لەدژی ئیمپراتۆریەتی رۆما جەنگا. حەزرەتی محەمەدیش بەگروپێکی بچووکی هەژاران بەرامبەر ئەشرافەکانی مەککە یاخیبوونی دەستپێکرد.

هەروەها دەتوانرێ بزووتنەوەکانی خەواریجەکان، قەرمەتییەکان، عەلەوییەکان وەك پارتی چین و توێژەکانی ناو ئیسلامییەت هەڵسەنگێنرێ.

مەزهەبەکانی چاخی ناوین هەریەکەو پارتییەکە. گرێدراو بەرەوشی چینایەتی و هزرییان نوێنەرایەتی توێژێکی کۆمەڵگا دەکەن. سیستەمی پارتی سەرمایەداری دەزانرێ. بەدرێژایی مێژوو باوەڕی و رێکخستنی ئەم بزوتنەوە نەریتیانە هەریەکەو بەهای بەرنامەو رێکخراوێکی هەیە، بەرنامە ئەو عەقیدە کۆمەڵایەتییەیەکە بەساقی لەسەری پێکهاتوون، پێیەوە گرێدراو دەمێنن و بەهای پراکتیزەکردنی هەیە. واتە ئەو بەهایانەی هزرو باوەڕین کەکراون بەپرەنسیپ. ئەوانەی دەزانن هەرەزێدە گرێدراوی پرەنسیپەکانیان بن، ئەوانەن کەبەشێوەیەکی سەرکەوتوو ئەمانە لەژیانیاندا بەرجەستە دەکەن. بێ پرەنسیپی و بێ ئامانجی، بەواتای رۆیشتن لەگەڵ هەر بایەکی هەڵکردوو دێت، واتای کەوتنە ناو لاوازی و حەزە تایبەتەکانە. لەرەوشێکی وەهادا تیۆرییەك لەئەنجامی هەوڵ و کۆششێکی مەزن بەدەستهاتبێت، بەئەخلاق و زهنییەتی سیاسییەوە پاڵپشتی کرابێ، کاتێك بەشێوەیەکی بەرجەستە پرەنسیپەکانی وەرچەرخانی کۆمەڵگا بەبەرنامەوە گرێدەدرێ، وەها لەقەڵەمدەدرێ کەگرنگترین هەنگاوی بەپارتیبوونیان هاوێشتووە. ئەوانەی ئەم دوو هەنگاوە ناهاوێژن یان پارتیبوونەکەیان ناکامە، یاخود لەهەواداری بەولاوە تێپەڕناکەن. پارتیبوون کارێکی زۆر رشت و جددییە. لەوانەیە پێویستی بەقاڵبوونەوەی دەیان ساڵیی، پەروەردەکردنی هەناسەو بەدەستهێنانی سەرفرازی و توانست هەیە. بۆ نموونە لەمێژووی ئایین و مەزهەبەکاندا نموونەی ئەو عەزیزو عەزیزانە دەبینرێن کەچڵ ساڵ لەئەشکەوتدا خۆیان پەروەردەکردووە. لەهەرسێ ئایینی گەورەو بوداگەراییدا بەچڕی نموونەی مێژوویی بەمجۆرە دەبینرێ. پێویستە لەمیانەی ئەم روانگە مێژووییەوە تەماشای زهنییەت و پرۆگرامی پارتی بکرێ.

لەمێژووی "PKK"شدا کۆتەڵەکانی وابەستەیی مەزنی هزری و بەپرەنسیپی هەن. چەندین نموونەی لەجۆری حەقی قەرار، مەزلۆم دۆغان، کەمال پیر، محەمەد خەیری، فەرهاد کورتای، مەعسوم قۆرقماز، تایلان ئۆزگور، بارزان ئۆزتورك، زیلان، بێریتان، بەرماڵ و لیستەیەکی درێژی ناوی ئەو هەڤاڵانە هەیە کە لەبوون بەکادیرە گەورەکانی پارت سەرکەوتنیان بەدەستهێنا. ئەمانە هەموویان هێندەی پەرتووکێك واتا بەخشن کەپێویستی بەخوێندنەوەیان هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا دەشێ چەندین نموونەی خیانەتکار، هەڵگەڕاوە، گەندەڵ، خاوو خلیچ، پەرێشان، کورتبین کە رۆژ بەسەردەبەن. هەروەها ژمارەیەکی زۆری ئەو نموونانەش دەبینرێ کەوەك حەمباڵ کاردەکەن و لەبەهای زهنی و بەرنامەیی بێبەشن.

بەرنامە ئەو بۆچوون و پرەنسیپانە نییە کەنەگۆڕێ یاخود نوێ نەکرێتەوە. لەبەرئەوی گۆڕانکاری پرۆسەیەکی بەردەوامییە، لەکاتی قۆناخە گرنگەکاندا ئەنجامدانی گۆڕانکاری لەبەرنامەدا هەڵوێستێکی راسترە. ئەوەی پێویستە نەگۆڕدرێ، بەزیندوویی هێشتنەوەی هێزی سەرلەنوێ پارتیبوونە کەبەردەوام هەوڵی دۆزینەوەی چارەسەری پێویستییە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا لەخۆوەدەگرێ. تادواهەناسە ناسینو بەرجەستەکردنی ئەم بڕوایەو سەرخستنیەتی لەرێگای هەوڵی نائاساییەوە.

لەکاتێکدا لەناو "PKK"دا بەرەو ئەنجامدانی گۆڕانکاری بەرنامە هەنگاو دەهاوێژرێ گرنگە ئەم چوارچێوەیەمان بەبیربێتەوەو رەچاوی بکەین. هەروەکو هەندێ مەزەندە دەکەن سەرلەنوێ ئاواکردنەوە نەبەواتای پاکتاوکاری دێت، نەبەواتای دابەزین بۆ ئاستی کۆمەڵەیەکی سادە دێت.

ئەو زهنییەتەی لەسەرلەنوێ ئاواکردنەوەی "PKK"دا حوکم دەکات، سەبارەت بەهێزە سەرەکییەکانی دونیا لەچەند بەشێکی بەرگرینامەکەماندا هەوڵی روونکردنەوەی تیۆری خۆماندا ــ تیۆری بەواتای بۆچوونی خودایی دێت، دەشێ وەك دیدگای جیهان و چەمکی تێڕوانینەکەشی پێناسە بکرێ ــ. بەچڕی باسی تایبەتمەندێتی ئەو تیۆرییەمان کرد کەلەبوارەکانی گەردوون، سروشت، فیزیا، کیمیا، زیندەوەرزانی و مرۆڤ و کۆمەڵگا بەشێوەیەکی سیستەماتیك ئاماژەمان پێکرد. لەمیانەی

بــیردۆزەی کۆزمۆســەوە تــاوەکو دەگاتــە کوانتــۆم، لەیەکــەمین پێکهاتــەی گــەردوون تادەگاتــە هــزری مــرۆڤ، بــەلانی کــەم هەڵوێــستەکانمان لەئاســتی پێناســەکردندا روونکراوەتــەوە. لــەجیاتی دووبارەکردنــەوە، لــەو بابەتانــەی پێویــستی هــەوڵی ئاماژەپێکردنی دەدەین. واتە بەردەوام بەتیۆری دەجوڵێینەوە. ئەوانەی تیۆری نەبن بەسانایی ناتوانن رێبەرایەتی بزووتنەوەی پارتی بکەن. تا چ رادەیەك بەهێزبوونی تیۆری بەدەستبهێنرێ، بەو ئەندازەیــەش شیکاری پراکتیکی پێشدەکەوێت، ئاواکردن سەرکەوتوودەبێت.

پێویستی بەهەڵوەستەکردن و تاوتوێکردنی بەرنامە هەیە، بادرێژەی پێبدەین. لەم سەردەمەماندا بەرنامەی پارتی لەچوار بەش پێکدێ کەلێی راهاتووین, کەئەمانەن: مافەکانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری و کەسێتی تاك لـەخۆوەدەگرێت. لەبەشی سیاسیدا لێکۆڵینەوە لەسەر کێشەکانی دەوڵــەت و رژێـم دەکرێت، ئــەو دابەشکردنە سیاسییانەی دەخـوازرێ لـەجێگای دابنـرێ لەئاســتی پرەنــسیپ دیاریــدەکرێت. هێنــدەی تــاوەکو ئێــستا لەشــیکردنەوەکانماندا دەرکــی پێــدەکرێت، پــارتیبوونی نوێمــان هەوڵدەدات ئــەو هەڵوێستە سیاسییانە شیکاربکات کەتایبــەت بەکوردســتان و تورکیــان. هەڵوێــستێکی سۆســیۆلۆژیانە ســەبارەت بەدەوڵــەت و سیاســەت پێــشخراوە. ســەرنجی بــۆ تایبەتمەندێتییــە ئۆلیگارشــی و دژە ــ دیموکراتییــەکانی دەوڵــەت راکێــشاوە. لەبەرئەوەی دیموکراسی لەئاستی پەیڤدا ماوە، هیچ هەنگاوێك سەبارەت بەناوەرۆکەکەی نەهاوێشتراوە. لەکێشەی کورددا ئــەم مەسەلەیە سەلمێنراوە. گۆڕەپــانی سیاســی لــەدیموکراتیزەبوون دوورە. بەتایبــەتیش تــەواوی پارتــەکان لــەگۆڕەپانی سیاســی وەك لقی پڕوپاگەندەو ئاژیتاسیۆنی دەوڵەت کاردەکەن. ســەرباری ئــەوەی حەســرەتی کۆمــەڵگا بــۆ دیموکراســیبوون بــەهێزە، بــەهۆی کاریگەری قورسی نەریتی دەوڵەتگەرایی، ناتوانێ بەرەو کۆمەڵگای مــەدەنی، مافــەکانی مــرۆڤ ئــازادی ژن و ژینگــەپارێزی خــۆی دیموکراتیزەبکات. سەرەڕای هەوڵەکانی خۆنوێکردنەوەی سوپا، تائێستاکەش کاریگەرییەکــەی لەســەر سیــستەمی سیاسی هێنــدە بەهێزە کەرۆڵی بەرچاو دەبینێ.

لەرەوشــێکی وەهادا مەرجە لەبەشی سیاســی بەرنامەکەمانــدا ریفۆرمێــك رێکبخــات کەلەقــسە بــەولاوە دەوڵــەت ناچــاربکات بەراستی بەرامبەر دیموکراسی راستەقینە هەستیار بێت. لەبەرنامەی "پ.ك. ك"ی کۆنــدا دەوڵــەت بەتــەواوی بەرکــەنارکرابوو. واتە بەتەواوەتی لەناوبردنی بەئامانج کرابوو، ئەوەی لەجیاتی ئەویش بیری لێکرابۆوە، هەرچەندە بەتەواوەتی دیاریش نەبوو، بــەڵام پێکهاتەیــەکی هاوشــێوەی دەوڵــەتی کوردی بــوو. لەبەرئــەوە نــەبوو کــەپراکتیزەکردنی زەحمەتــە، لەبەرئــەوەی لــەبواری پرەنسیپییەوە دەوڵەتخوازیمان لەگەڵ تێڕوانینمان بۆجیهان کۆکنەبوو، هەڵوێستێکی قەبای لــەجۆری"دەوڵــەتی تــورك نــەمێنێ، لەجێگای ئەو دەوڵەتی کورد دامەزرێندرێ "راست نابینین. خــاڵی دووەم، بۆچــوونی، بــاهیچ دەوڵــەتێك نــەبێ " واقیعــی نییــەو زیاتــر بانگەوازی بۆ نەهێلیزم و ئەنارشــیزمی کــۆن دەکــات. هــەروەها دەوڵــەتی تــورکی، کــوردی نابێــت. وەك نــەریتێکی قورســی مێژوویی بەردەوام گرنگی بەبەرژەوەندی کەمینەیەك دەدات. خزمەتی گشتیــشی چــەندەی بڵێــی ســنووردارو رواڵەتییــە. بــەڵام لەبەرئەوەی ئاسایش و خزمەتی گشتی بابەتێکن لەرۆژگاری ئەمرۆمان نــاتوانرێ پــشتگوێبخرێ، ســەرلەنوێ لــەتورکیاو تــەواوی کوردستان چەمکی سەبارەت بەدەوڵەت شــرۆڤە دەکەینــەوە. لەبەرئــەوەی هــەر لەئێــستاوە بەتــەواوەتی کۆتاییهێنــان بەدەوڵــەت واقیعی نییە، ئەمە بەم واتایە نایەت بەمشێوەیە بەردەوام بێت کەهەیە. هەرچەندە بەواتا کلاسیکییەکەی پێکهاتــەی دەوڵــەت، بەتایبەتیش کردەوەی دەسەڵاتە دەسپۆتەکانی لەئارادان هاوواتای دەوڵەت بکرێت، ئەمە پەسندناکرێ. راســت ئەوەیــە کەلەســەر دەزگایەکی سیاسی رێکبکەوین کــەوەڵامی پێداویــستی ئاســایش و خزمــەتی گشتی بداتــەوە، ســنووردارو بــچووککرابێتەوە، بــەواتا کۆنەکەی بەدەوڵەت لەقەڵەم نەدرێ، ئەمەش وەك دەسەڵاتی گشتی جەماوەر پێناسەدەکرێ.

ئەگەر ئەم دەزگایە بەکۆمار بەناو بکرێ دەشێ لەگەڵ پێناسەکە گونجاو بێت. ئەمەش بەواتای بەڕێوەبەرایەتی گەل دێــت و پێناســەیەکە لەگــەڵ دیموکراســی دەگــونجێ. بــەڵام لەبەرئــەوەی دەســەڵاتی گــشتی جــەماوەر لــەجیاتی هەڵبــژاردن دامەزرانــدن

بەبنـەما دەگـرێ هاوواتـاکردنی لەگـەڵ دیموکراسـی بۆچـوونێکی راسـت نییـە, راسـتر ئەوەیـە وەك دەوڵـەتێك پێناسـەبکرێ کەبەرامبەر دیموکراسی هەستیارەو پەسندی دەکات. کۆماری تورکیـا کەبـەمجۆرە پێناسـەبکرێ، پێویـستە سـەبارەت بـەکوردان گوزاشت لەهاووڵاتی ئازادو یاساییبوون بکات، یان گوزارشتی لێدەکات. یاساییبوونی کـوردان واتـە؛ یـان بەشـێوەیەکی گـشتی یـان تایبەت، پەسندکردنی ناسنامەکەیانە لەبواری یاساوە ـ دەستووریشی لەناودا ــ. وەك کولتـوورو گـەل داننـانی کـوردان بـەکۆمار گرێدراوی ئەوەیە کۆمار کورد وەك پێکهاتەیـەکی کولتـووری و خـاوەن مـافی سیاسـی ببـینێ و بناسـێ. دەبـێ دان بەیـەکتری نـان دوولایەنەبێ و لەژێرگەرەنتی یاسایی دابێت.

سەبارەت بەکۆماری تورکیا، بەگشتی بۆ تەواوی تورکیا، بەتایبەتیش بەهۆی ئـەو رەوش و شـوێنگەیەی هەیانـە بـۆ کـوردان، پێویـستی بەهەڵوێـستێکی ریفـۆرم و رێنیـسانس هەیـە. هەرچـەندە هەنـدێ سـەرلەنوێ رێکخـستنەوەی یاسـاو دەسـتوور ئەنجامبدرێت، ئاستەمە ئەمانە بەریفۆرم بەناوبکرێ. بەتایبـەتی تـاوەکو هەڵوێـستێکی بەقەناعـەت سـەبارەت بەکێشەی کـورد نیـشانندەرێ و نکـوڵیکردن بـەردەوام بێـت رێککـەوتنی دەسـتووری زەحمەتـە. لەکاتێکـدا "PKK" سـەرلەنوێ ئاوادەکرێتـەوە، لەبەرئـەوەی لەبنەڕەتـدا خـۆی بەرامبـەر بەکوردسـتان بەرپرسـیاردەبینێ، لـەم چـوار گۆڕەپانـەی خـاوەن دەوڵـەت رێککـەوتنی دیموکراسـیی و دەسـەڵاتی دەوڵـەت وەك بابـەتێکی گـرنگ دەبـینێ. ئەگـەر دەوڵەتـەکان (دەوڵـەتی فیـدراڵی کوردیش) بخوازن لەکوردستان درێژە بەهەبوونی خۆیان بدەن، پێوانـەکانی ئەمـە خزمـەتی گورەپانـەکانی گشتی و ئاسایـشە کـەدژی گـەل نییـە. نوێنەرانی گەلی کورد ئەرکیان دەستنیشانکردنی ئەو پێوانانەو رێککەوتنە لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەت. کـردەوەو رەفتـارێکی یەکلایەنەو سنوورنەناسی دەوڵـەت، بەشـێوەیەکی سروشـتی پـشت بەرەزامەنـدی گـەل نەبەسـتێ، پەسـندناکرێ. ئەگـەر بەفـشار بـسەپێنرێ، مـافی بـەرخودانی گـەل دێتـەئاراوە. هەربۆیـە پێویـستی بەرێککـەوتنێکی نێـوان ئەرکـدارانی گـەل و دەوڵـەت هەیـە کەوەك دەسەڵاتی گشتی جەماوەر رۆڵ دەبینێ.

دەشـێ ئـەم مـاددە گرنگـەی پرۆگـرام وەك " بەرێوەبەرایـەتی دیمـوکراتی گەوهـەری گـەل لەکوردسـتان + دەسـەڵاتی گـشتی جەماوەر ـ دەوڵەت ــ " کورتبکرێتـەوە. کوردسـتانێك سـتاتۆکەی بـەمجۆرە دیـارکرابێ، واتـە پێگەیـەکی نزیـك بـەدیموکراتی و ئازادی و یەکسانییە. دیموکراسییەتێکی بەبێ دەوڵەت، لەم قۆناخە مێژووییەی ئێستادا بەواتای خۆتەفرەدان و ماجەراپەرسـتی دێ. پێویستی بەپێکهاتەی دەوڵەتێك هەیە کەسنوورەکانی دیارکرابێ و بچوککرابێتەوەو لەبارەیـەوە بەرێککـەوتنێك گەیـشتبن. بەسـووربوونەوە جـەخت لەسـەرئەوە دەکەینـەوە کەبـەواتای کلاسـیکی ئـەم دەسـەڵاتە (دەسـتڕۆییە) بەدەوڵـەت بـەناوناکرێ، پێویـستە بەدەزگایـەکی گـشتی کۆمـەڵگا بـەناو بکـرێ کەبـەناوەڕۆك و رواڵـەت گرێـدراوی دیموکراسـییە. لەلایـەکی دیکەشـەوە لەکوردستان دیموکراسی بەواتای هەڵبژاردنی کاربەدەستە خۆجێیی و گشتییەکان دێت لەماوەی رێکخراوو دیـاریکراو کـەبتوانێ وەڵامی پێداویستییە هاوبەشەکانی کۆمـەڵگا بداتـەوە، لەسـەرووی هەمووشـیانەوە بـوارە ئـابووری، کۆمەڵایـەتی و سیاسـییەکان. دیموکراسی دەوڵەت پەیوەستدارناکات. کاروباری خودی گەلە. دەوڵـەت تـەنیا دەتـوانێ رێـز لـەئیرادەی دیموکراسـی گـەل بگـرێ. ئەگـەر خزمـەتێکی پێویـست جێگـای بـاس بێـت، جێبـەجێی دەکـات. بـەکورتی لـەقۆناخی داهاتوومانـدا دەشـێ فۆرمیلـەی "دیموکراسی + وەك دەسەڵاتی گشتی جەماوەر دەوڵەتی تورکیا، ئێران، ئێراق و سوریا "کە لەکوردسـتاندا زۆر بەباشـی ناسـراوە وەك ماددەیـەك (خاڵێـك)ی سـەرەکی بەرنامـە ببینـرێ. کاتێـك دەڵـێین ماددەیـەکی پرۆگـرام، نـاڵێین ماددەیـەکی سـەربەخۆو بەتەنیا بێت. پێویستە بۆ 3 ـ 5 ماددە جیابکرێتەوە.

دیموکراتیزەکردنی کوردستان، لەولاوەی کێشەیەکی یاسایی، پرۆژەیەکی گشتگیری کۆمەڵایەتییـە. بەرامبـەر ئـەو توێژانـەی نکـوڵی لەناسـنامەی گـەل و دیـاریکردنی چارەنووسـیان دەکـات، هـەروەها پێکهێنـان و بـەدەزگاکردن و بـەڕێوەبردنی ئـیرادەی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی توێژەکانی دیکەی کۆمـەڵگا لـەخۆوەدەگرێت. پرۆسـەیەکی بەردەوامـە. هەڵبژاردنـەکان یـەکێکن

لەو ئامرازانەی کەبۆدیاریکردنی ئەم ئیرادەیە پەنای دەبردرێتەبەر. لەبنەڕەتدا پێویستی بەرێکخستنی و چالاکی ئاکتیفی گەل هەیە. قۆناخ و پرۆسەیەکی دیموکراتییە لەکۆمۆنە خۆجێیەکانی گوندو شارەکان، ئەنجوومەنەکانی گەل، دەستپێدەکات تادەگاتە شارەوانی و کۆنگرە گشتییەکانی گەل درێژدەبێتەوە. گوزارشت لەژیانێکی سیاسی چالاك دەکات. بەگوێرەی هەلومەرجەکان هەروەکو چۆن دەتوانێ لەگەڵ گەلانی دراوسێ وەك دیموکراسییەتێکی هاوبەش رێکبخرێن، ئەگەر دەرفەتی ئەمە نەدرێ دەتوانێ سیستەمی دیموکراتی تایبەت بەخۆی ئاوابکات.

دیموکراتیزەکردنی سیاسەتیش ئەرکێکی گرنگی دەرهەق بەگۆڕەپانی سیاسەتە. سیاسەتی دیموکراتییانە پێویستی بەپارتی دیموکراتیك هەیە. تاوەکو ئەو پارت و رێکخراوانە لەئارادا نەبن کەلە تیشکۆی دەوڵەت ناخولێنەوەو داواکارییەکانی کۆمەڵگا بەبنەمادەگرن، چاوەڕوانی دیموکراتیزەکردنی ژیانی سیاسی ناکرێت. پێکهاتەی پارتەکانی تورکیا جگە لەلقی پروپاگەندەکردنی دەوڵەت، کاتێك لەدەوڵەتیش جێگیربوون لەئامرازێکی بلاوکردنەوەی بەرژەوەندیپەرستی بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەیان نییە. تێپەڕبوون بۆ ئەو پارتانەی سەبارەت بەکێشە کۆمەڵایەتییەکان چڕبوونەتەوە، ستاتۆیەکی بەگوێرەی ئەمەش پارچەیەکی گرنگی ریفۆرمی سیاسییە. ئاواکردنی پارت بەناوی کوردستان تاوەکو ئێستا بابەتێکی قەدەخەکراوە. جگە لەپارتەکانی دەوڵەت دەرفەت و شانس بەئەوانەی دیکە نادرێت. ئاشکرایە کەپێویستی بەگۆڕینی ئەم ستاتۆیە هەیە. پارت و هاوپەیمانێتی بەناوی کوردستان پەیوەندی بەناوەڕۆکی دیموکراتیزەبوونەوە هەیە. تەنیا پەنا بۆ جوداخوازی و ئامرازی توندوتیژی نەبەن.

هەوڵەکانی سیاسەتی دیموکراتییانە، تێگەیشتنی کۆمەڵگاو وەرچەرخان لەکوردستان گرنگی و بایەخێکی گەورەی هەیە. بەتایبەتیش کارەکتەری دەسپۆتیزمی دیاردەی سیاسی، تێگەیشتن و پراکتیزەکردنی پێوانەکانی دیموکراسی دەکاتە پێویستییەکی ژیانیی. نەك تەنیا سیاسەتەکانی ناوەندی راستڕەوی، زۆربەی سیاسەتەکانی چەپڕەویش لەتیشکۆی دەوڵەت دەسووڕێنەوە، خاوەن کارەکتەری دەسپۆتیزم و بەرژەوەندیپەرستین. ئەم تایبەتمەندییە سەرەکیانە زۆرباش ئەم راستینە رۆشندەکەنەوە کەبۆچی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین نەفرەت لەسیاسەت دەکەن. دوای ئەوەی سیاسەت رۆڵی تەفرەدان و سەرکوتکردنی بۆ برایەوە، مانەوەی کۆمەڵگا لەدەرەوەی سیاسەت، راستتر ئەوەیە بەناچاری دەکرێتە بکەری سیاسەتی ستەمکاری. باشترین پێڕەوی بەلاوەنانی ئەم نامۆبوونەی سیاسەت، هونەری بەڕێوەبردنی سیاسەتی دیموکراتییانەیە کەئامانجی کۆمەڵگای دیموکراتییەو لەتەوەرەکەیدا دەخولێتەوە. تاوەکو لەبواری تیۆری و کرداری سیاسەتی دیموکراتییانە بەبنەمانەگیرێت، ئەو هەوڵ و کۆششانەی لەناو تەواوی گروپە کۆمەڵایەتییەکاندا بەڕێوەدەبردرێت لەخەڵەتاندن و تەفرەدان رزگاری نابێت. لێرەدا نیازپاکی هێندە واتای نابێت. پێویستە زۆربەباشی جیاوازی نێوان وابەستەیی گەلی پلاتۆنیك (خۆشەویستی بێبەرامبەر یان تاکلایەنە) و هونەری سیاسەتی دیموکراتییانە ببینین.

لەبنەڕەتدا بەرگرینامەکەم, وەك یەکەمین ئەرکی لەپێشینە, کردنەوەی رێگای سیاسەتی دیموکراتییانەیە. تەنیا کاتێك پێوانە گەردوونییەکانی دیموکراتی پراکتیزەبکرێ دەتوانرێ ئەو کولتوورەی ملکەچی و ملکەچی پێکردن بەلاوەبنرێ کە لەتاك و دەزگاکاندا بەکاریگەرە. لەدواقۆناخەکاندا لەسەر میراسی "PKK" شدا کردەوەی دژە دیموکراسی زەبەلاح بینراوە. لەدوا هەڵبژاردنەکاندا نەگەیشتنی "DEHAP" بەسەرکەوتن سەرچاوەکەی بۆئەوە دەگەڕێتەوە کەتیۆری و کرداری دیموکراتی وەك شێوازی چارەسەری پێشنەخراوەو پەیرەو نەکرا. لەپارچەکانی دیکەی کوردستاندا سیاسەتی دەسپۆتیزم زیاتر باڵادەستە. لەقۆناخی داهاتوودا ئەوەی بەر لەهەمووشتێك بۆکوردستانێکی ئازاد پێویستە، ئاواکردنی قەوارەی سیاسییە کەبەگوێرەی تایبەتمەندێتی مێژوویی ـ کۆمەڵایەتی بەرجەستەی هەر پارچەیەك بێت و سیاسەت و کۆمەڵگای دیموکراتیك ناوەندەکەی پێکبێنێ. لەسەر ئەم بنەمایە گۆڕین و وەرچەرخانی پارت و کۆمەڵەو رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ئەرکێکی

ئێستایە. هیچ خەباتێك لەوە بەهادارتر نییە کەبەهەمموو هێزی هەمانە باوەڕبکەین و بەزانینەوە پەیڕەوی بکەین و ڕێگا لەپێش سەردەمی سیاسەتی دیموکراتییانە بکەینەوە.

هەربۆیە ئەرکی سەرەکی ئەوەیە لەهەر پارچەیەکی کوردستان و لەشارو مەترۆپۆلە گەورەکانی دراوسێدا کەبەچڕی کوردانی تێدا دەژی، لەناوچە لادێییەکان و دەرەوەی وڵات، لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەوروپا، لەشێوازی ڕێکخستن و خەبات و چالاکیدا پەیڕەوێکی دیموکراتییانە جێبەجێ بکەین. لەمیانەی نەرمایی نیشانداان بۆ لەخۆوەگرتنی ئەو دۆستە خۆبەخت و کەمایەتییانەی لەناو کوردستاندا دەژین، پێویستە گەلەکەمان ڕێکخستنی جەماوەری و چالاکی بخاتە پێش هەمووشتێکەوە. پێویستە بەتایبەت دیموکراسیی خۆی ڕێکبخات و پراکتیزەی بکات. بەئەندازەی جوڵانەوە بەگوێرەی یاسا دیموکراتییەکانی لەئارادایە، ئەو لەو هەلومەرجانەی یاسای دیموکراتییانە بوونیان نییە، پێویستە بەگوێرەی ڕێسا دیموکراتییەکان و پەیڕەوەی ناوخۆو ڕێبەرنامەی خۆی ژیان و تێکۆشان ڕێکبخات. پێویستە بەگوێرەی ئاستی سەرکەوتن و چارەسەری بەڕێوەبەرایەتی تەواوی دەزگا ـ لەهەرەوەزییەکانەوە تادەگاتە کۆنگرەی گەل ـ دیموکراتییەکان سەرلەنوێ لەمیانەی کۆنگرەی ناوچەکان ساڵێ جارێك هەڵبژێردرێنەوە. پێویستە لەڕێگای پێڕەوی گونجاوەوە سیستەمی هەڵبژاردن و پاڵێوراوی خۆی ئامادەبکات. دەبێ بەڕێوەبەرێك دووجار زیاتر هەڵنەبژێردرێ، تەنیا لەسەر بنەمای پرۆژەی نوێ دەتوانێ دوای دوو قۆناخ ببێتەوە پاڵێوراو.

لەسەرووی هەمووانەدا گەلەکەمان کە لەئەوروپا دەژی، لەتەواوی پارچەو مەترۆپۆلەکان، ئەو پێڕەوانە بەکاربێنێ کەدیموکراسییەتی خۆی گونجاوی دەبینێ، سەرکەوتووترین پاڵێوراو بۆ تەواوی دەزگاکان هەڵبژێرێ، بەشێوەیەکی ڕێکوپێك راپۆرت بخوازێ و لەسەر ئەو بنەمایەش چاودێری بکات. ئەگەر دەوڵەتەکان بەرامبەر دیموکراسی خۆیان بەڕێزبن دەتوانێ لەگەڵیاندا ڕێکبکەوێ، لەرەوشێکی پێچەوانەشدا پێویستە لەمیانەی پێڕەوی گونجاو تادوایی درێژە بەبەرخودانی دیموکراتییانەی خۆی بدات. دیموکراسی خود (گەوهەری) کەگونجاوترین ڕێگای ئازادی و یەکسانی گەلەکەمانە، تێگەیشتن و پراکتیزەکردنی تاگەیشتن بەسەرکەوتن مەرجە.

لەگۆڕەپانی سیاسیشدا پێویستی بەمەیدانی ئازاد هەیە. تاوەکو میدیا (راگەیاندن)ی ئازاد نەبێ، هەستیاری دەوڵەت سەبارەت بەدیموکراسی و دیموکراتیزەبوونی گۆڕەپانی سیاسی بەدینایەت. نەك وەك مافی تاك، بەڵکو وەك مافی گشتی لەکوردستاندا پێویستی بەرێکخستنێکی میدیایی هەیە. نابێ جوداخوازی زمان بکرێ.

هەروەکو دەزانرێ دەزگا فیوداڵییەکان کۆسپن لەپێش دیموکراسی. پێویستە ئاغایەتی، شێخایەتی، عەشیرەتگەرایی و تەریقەتگەرایی پاشماوەکانی چاخی ناوین لەمیانەی پێڕەوی گونجاوەوە ناچاری گۆڕانکاری و وەرچەرخانی دیموکراتییانە بکرێن. ئەم دەزگایانە کەمشەخۆرن و هزر سڕدەکەن و لەپێش ئەخلاقی ئازاددا بەربەستن، بەئەندازەی دەزگا کلاسیکەکانی دەوڵەت کۆسپن لەپێش دیموکراتیزەبوون. دەتوانرێ تەواوی ئەم مەسەلانە بەشێوەی ماددەی گونجاو وەك پرەنسیپەکانی بەرنامە لەگۆڕەپانی سیاسی بەجێبکرێ. لەم چوارچێوەیەدا پێشخستنی هەڵوێستی تیۆری و ڕێکخستنی ماددەی گونجاو سەبارەت بەگۆڕەپانی سیاسی، دەرهەق بەراستینەی سیستەمی باڵادەست و راستینەی گەل واقیعییە و شانسی پراکتیزەکردن و پەیڕەوکردنی هەیە.

کێشەکانی خێزان، ژن، تەندروستی، پەروەردە، ئەخلاقی، ئایین و چالاکییە هونەرییەکان و ئەرکەکانی چارەسەرکردنیان گەوهەری ڕێکخستنی بواری کۆمەڵایەتی بەرنامە پێکدێنێ. بەشی کۆمەڵایەتی کەلەگەڵ بوارەکانی سیاسی و ئابووری لەناو یەکێتییەکی لێکجودانەبۆوە دان بۆئەوەی ئاسانکاری دروستبکات دەشێ وەك بەشێکی جودا ڕێکبخرێت. لەگەڵ ئەوەی پێویستە وەك گۆڕەپانێکی بنەڕەتی ببینرێ، بەهۆی ئەو ستەمکاری و بەکارهێنانە ئابوورییەی لەبواری سیاسی بەکاردەهێنرێ، گۆڕەپانی کۆمەڵایەتی لەژێر فشارێکی مەزندا دەژی. تەنانەت بۆ جەستەیەکی نەخۆش گۆڕاوە. پێبەپێ بەهێزکردن و

پاراستنی گۆڕەپانی کۆمەڵایەتی پێویستە بەیەکێك لەئەرکەکانی بەرنامە لەقەڵەمبدرێ. پێویستە لەئابووری و سیاسەتەوە قورسایی بۆ گۆڕەپانی کۆمەڵایەتی بگوازرێتەوە.

دەستبەردان لەو پێڕەوەی بەشێوەیەکی چڕ لەلایەن سیستەمی دەوڵەتەوە بۆ کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگا بەکاردەهێنرێ؛ توانادارییە ئابورییەکان لەدەست کۆمەڵگا دەردێنێ، دووبارە بەرامبەر بەخۆوەگرێدانی کۆمەڵگا کەم کەمە پێشکەشی دەکاتەوە: خاڵێکی سەرەکی ئاستی ئازادی کۆمەڵگایە. پێویستە دەست لەوە بەربدرێ کەبەبرسیکردن و لەرێگای ئابووری دیکەوە کۆمەڵگا پەروەردە بکرێ. ئەو رێچکەیەی بەشێوەیەکی بەرفراوان پەیڕەوکراوە، تەواو گەلەکەمانی خستۆتە ناو رەوشی سواڵکەرێتییەوە. بەرلەهەموو شتێك پێویستە ئەم تەڵەزگەیە لەگۆڕەپانی کۆمەڵایەتی هەڵبگیرێتەوەو کۆتایی پێبهێنرێ. دەبێ لەجیاتی دەوڵەت مافی کۆمەڵگا لەسەر توانستە ئابوورییەکانی کۆمەڵگا هەبێت و پەسندبکرێ.

لەناو دەزگای خێزاندا ژن، پیاو و منداڵان رەگەزی هەرە بنبەستبووی سیستەمن. هەروەکو بڵێی سیستەم خێزانی کردۆتە جروفە، کردوویەتی بەدەزگایەك کەتەواوی ناکۆکییەکانی دەخنکێنێ، دەخواتەوە. لەکاتێکدا هێشتا پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکانی ژن و مێردو منداڵێتی و هاوسەرێتی جارانیان تێپەڕنەکردبوو، لەلایەن پەیوەندییە بێ ویژدانەکانی سەرمایەداریش ئابلۆقەدران و کەوتنە ناو ژیانێك کە وەکو بەندیخانە وایە. سەرباری ئەوەی لەکوردستاندا خێزان بەپیرۆز لەقەڵەمدەدرێ، بەتایبەتی بێبەشی لەئاستی ئازادی، نەبوونی توانستی ئابووری، بێ پەروەردەیی و گرفتەکانی تەندروستی خستوویەتییە ژێر فشارێکی مەزنەوە. رەوشی ژنان و منداڵان کارەساتێکی تەواوە. ئەو رەوشەی بەتاوانی نامووس پاککردنەوە (غسل ألعار) دەناسرێ لەراستیدا گوزارشتی رەمزی ئەو بارەیە کەبەگشتی ژیان تێیکەوتووە. ئەو نامووسەی کۆمەڵگا کەنەماوە، بەسەری ژندا دەتەقێندرێتەوە. ئەو پیاوێتییەی ئیفلاسی کردووە رق و کینی خۆی لەژن دەردەخات. لەهەلومەرجی هەنووکەدا, تەنیا لەمیانەی دیموکراتیزەبوونێکی گشتی کۆمەڵگادا دەشێ قەیرانی خێزان بکەوێتە سەر رێگای چارەسەری. پەروەردەو پەخشی بەزمانی دایك دەشێ تارادەیەك شێوان و تێکچوونی ناسنامە بەلاوەبنێ. دەشێ یارمەتی تایبەتی ئابووری بەشێوەیەکی کاتی خێزانە هەژارەکان رزگار بکات.

جگە لەتوێژێکی بەکرێگیراوی دەوڵەت لەکوردستان مرۆڤایەتییەکی دیکە هەیە کەنەکەس دەتوانێ باسیان بکات، نەشتێکیان لەسەر بنووسرێ. تاوەکو کێشەی ناسنامە، ئازادی و یەکسانی ئەوانی دیکە چارەسەرنەکرێت، ناتوانرێ بگووترێ لەپیسترین شەڕ پاککراوەتەوە. شەڕێکی تراژیدی یەکلایەنەیە کەلەسەر منداڵان، پیاو، ژن، خێزان و کۆمەڵگای کوردەواریدا پەیڕەوکراوە. پێویستە بەشێوەیەکی تایبەت لەپرۆگرامدا هەڵوێستە سەبارەت بەم بابەتە بکرێ و وەك ئامانج دەستنیشان بکرێ.

پێویستە پەروەردە بەزمانی فەرمی و زمانی زگماکی (دایك) ئازادبکرێ. ئەگەر دەوڵەت یارمەتیش نەدات، پێویستە کۆسپ نەخاتە پێش ئاواکردنی ئەو دەزگایانەی گەل بەتواناکاری خۆی بۆ زمان و کولتووری خۆی ئاوایدەکات. پێویستە وەك ئەرکێکی گشتی تەندروستی لەلایەن دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی جێبەجێ بکرێ. پێویستە ئازادی ئەوەهەبێ کۆمەڵگا لەمیانەی بزووتنەوەکانی هونەری ئازاد تێرخۆراك بکرێت. تاوەکو نەبێ بەکۆمەڵگایەکی خاوەن ئەخلاق لەهیچ کارێکدا سەرکەوتن بەدەستنایێ. بەدەستهێنانی ئەخلاقێکی ئازاد گرێدراوی هۆشیاربوونەوەی کۆمەڵگایە. هەربۆیە پێویستە کۆسپ لەبەردەم هۆشیاربوونەوەیەکی بەرفراوانی کۆمەڵگا دانەنرێ. کۆمەڵگای ئازاد، کۆمەڵگایەکی بەئەخلاقە. پێویستە ئەم هاوواتابوونە لەناو تەواوی خەباتەکانی ریزە جیاوازەکانی کۆمەڵگا رەنگبداتەوە. دەبێ شوێنی ئایین لەژیانی کۆمەڵگادا تاوتوێ بکرێت و وەك کۆت و بەندێکی بەستنەوە نەمێنێ، هەروەها لەبەرئەوەی کۆنترین نەریت و ویژدانی گەل پێکدێنێ دەبێ بەریفۆرمی پێویست تێپەڕبێت و لەگەڵ زانستی هاوچەرخ و فەلسەفە بگونجێندرێ. گەیشتن بەزمانێکی هاوبەشی ئایین، فەلسەفە، زانست و تەنانەت میتۆلۆژیا لەسەرووی فاکتەرەکانی رزگاربوونی لەو قەیرانە دێت کەتاك لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا تێوەی گلاوە.

لەکاتێکدا ئایین زیاتر لەئەخلاقی نوێی ئازادیدا رۆڵ دەبینێ، زانست بەگوێرەی روانگەی خۆی سەرلەنوێ پەیوەندی کۆمەڵگا شرۆڤەدەکات و پێشکەشکردنی بەکۆمەڵگا دەبێ وەك ئەرکێك ببینێ. پێویستە باش دەرك بەوە بکەین کە پێخەمبەرەکانیش لەناوەرۆکدا ئەم رۆڵەیان جێبەجێکردووە. لەهیچ قۆناخێکدا ئایین وەك رۆژگاری ئەمڕۆمان گەندەڵ نەبووەو لەکارنەکەوتووە. دووبارە کارابوونی دەبێ ئامانجی سەرەکی ریفۆرمی ئاییني بێت.

پێویستە سەرەکیترین دەستنیشانکردنی بەرنامە سەبارەت بەگۆڕەپانی کۆمەڵایەتی سەرلەنوێ گەڕاندنەوەی ئەوفورساییە بێت کەلەدەستی دابوو. پێویستە دەوڵەت و ئەو کەمایەتییە سنووردارەی ئابووری زەوتکردووە، دەست لەو هەڵوێستە تاڵانکارو مژۆگدارییە بەربدەن کەلەسەر ئەو کۆمەڵگایە بەڕێوەی دەبەن. بەهەوڵ و ئێش و ئازاری هەزاران ساڵە بەم رۆژە گەیشتوون، سەرلەنوێ گەڕاندنەوەی رێزو پایەی شایستەیان وەك سیاسەتێکی سەرەکی کۆمەڵایەتی پەسندبکات. پاراستنی کۆمەڵگا هەم بەرامبەر کەمایەتی دەوڵەت، هەم بەرامبەر تاکی تاڵانکارو تەڵەکەبازو هێرشەکانی پێویستە وەك سەرەکیترین ئەرکی بەرنامە سەبارەت بەگۆڕەپانی کۆمەڵایەتی دەرکی پێبکرێت. ئاستی ئازادی ژن ئاستی ئازادی کۆمەڵگا دیاری دەکات، ئەویش ئاستی گشتی دیموکراتی و دەوڵەتی هەستیاری کۆمەڵایەتی دیاری دەکات.

بەهۆی شوێنگە ناوەندییەکەی ئازادی ژن, بابەتێکە پێویستە وەك ماددەیەکی جیاواز لەپرۆگرامدا رێکبخرێت. ئەو شیکردنەوانەی سەبارەت بەکێشەی ژن ئەنجامماندا، ئەوەدەخاتەڕوو کەبواری ژن خاڵی سەرەکی وەرچەرخانی کۆمەڵایەتییە. ئەگەر یەکێك لەو خاڵانەی سۆسیالیزمی بونیادنراو تێیدا ژێرکەوت دەسەڵات و شەڕ بێت، دووەمیان کێشەی ژنە. ژن و دەسەڵات دوو دیاردەن تابلێی لەگەڵ یەکتریدا ناکۆکن. ژن یەکەمین رەگەز، چین و نەتەوەی چەوسێنراوەیە. تاوەکو مەسەلەکانی ئازادی و یەکسانی لەناو پەرەسەندنە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان تاوتوێ نەکرێ و تیۆرییەکەی دانەنرێ، ئەوا پەرەسەندنێکی کرداری تەندروستانەی نابێ.

تاوەکو ئێستاش کاریگەری سەردەمەکانی نیئۆلیتیك لەسەر ژنانی ناو کۆمەڵگای کوردەواری بەردەوامە. لەگەڵ ئەمەشدا خەمی هەموو قۆناخەکانی شارستانییەتی کێشاوە. خاوەن بونیادێکی خۆڕاگرە. ئاشکرایە کەدووچاری خیانەتی سەردەمیش بووە. کاتێك ئەم تایبەتمەندێتییانە لەگەڵ هەوڵ و کۆششە گەردوونییەکانی فێمینیزمەکان ببێتەیەك، ئەوا دەشێ پارتییەکی جیاوازی ژنان لەتێکۆشانی یەکسانی، ئازادی و دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگادا رۆڵێکی مەزن ببینێ. پارتی ئازادیخوازی ژنانی کوردستان (PAJK) بەگوێرەی ئەم رۆڵە دامەزراوە. هەرچەندە بەسانایی لەچەمکی پیاوێتی زاڵ رزگاری نابێت، بەڵام سووربوون لەسەر ئازادی بایەخێکی ژیانی و دەستلێبەرنەدراوی هەیە. باشترین رێچکەی ئازادکردنی جیهانی ژنان بەیەکەوە بەکارهێنانی ژیری سۆزداری و ئەنالیتیکییە. پێویستە سەبارەت بەژن سەرلەنوێ میتۆلۆژیا، فەلسەفە، ئایین و زانست رەچاوبکرێتەوە، لەمیانەی ژیری ئازادو تایبەتی ژنان شرۆڤەبکرێ و پراکتیزەبکرێ. هەڵوەستەکردنی تیۆری و کرداری لەرێگای ژیری ژنانەوە، دەشێ بەرەو ژیانێکی جوانترو واتادارتر و جیهانێکی یەکسان، ئازادو ئاشتیانەمان ببات.

لەکوردستاندا سووربوون لەسەر پاژك (PAJK) و گەشەپێدانی دەشێ بۆ سەربەرزی ژنە خواوەندەکان، بێگەردی فریشتەکان و جوانی ئافرۆدیت بیانگوازێتەوە. سەنتێزێکی بەمجۆرەی ژنان کولتوورێکی پیاوان نامێنێ نەتوانێ شیبکاتەوە، هیچ هێزێکی ژیان نامێنێ راکێشی نەکات، چالاکییەك نامێنێ توانای ئەنجامدان و بەڕێوەبردنی نەبێت. تاوەکو سەرفرازییەکی ژنان پێشنەخرێت کەلەگەڵ پیرۆزی خواوەندە ژنی میتۆلۆژیاو مێژوو کۆك بێت، ئەوایەکسانی و ئازادی و رەسەنێتی ژیان بەدینایەت. تاوەکو ئەم بەهایانە بەدەست نەهێنرێ، ئەوا ژیان لەدۆخی بەهایەکی لەدەستدراو رزگاری نابێت.

پێویستە لەم چوارچێوەیەدا بەرنامە کێشەی ژن بەشێوەی ماددە رێکبخات. پێویستە تێپەڕبوون لەئابووری پشتبەستوو بەقازانج و کاڵا بۆ ئابوورییەکی پشت ئەستوور بەبەهای بەکارهێنان و دابەشکردن بنەمای هەڵوێستی بەرنامە سەبارەت

بەگۆڕەپانی ئابووری پێکبێنێ. ئەو ئابووریەی قازانجی خرۆشاندووەو هارکردووە, نەك تەنیا کۆمەڵگا بەڵکو ژینگەشی تێکداوە. ئاراستەی بەرەو ژینگەیەك گرتووە ژیان تێیدا ئاستەمە. ئەگەر سیاسەتی ئابووری بۆرژوا نەوەستێندرێ، ئەو شوێنەی پێیدەگات دۆزەخێکی راستەقینەیە. سیاسەتی بۆرژوازی بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج، بەتایبەتیش دەرکەوتنە پێشی توێژەکانی "فینانس" کەتەنیا لەرێگای یاریکردن بەدراو، خراپترین لایەنی جیهانگیری لەناو مرۆڤایەتی دەژێنێ. لەهیچ قۆناخێکی مێژوودا، هیچ چین و توێژێکی کۆمەلایەتی هێندە قازانج و بەهایان بەدەستنەهێناوە. سەرەکیترین فاکتەری گەندەڵی کۆمەڵگا ئەو ئاستەی فینانسە کەئابووری پێیگەیشتووە. هەرچی پیشەسازی و بازرگانییە کە فینانس هەڵیاندەسورێنێ, لەبەرئەوەی بەردەوام ئەو کاڵاو شێوە نابەجێیانە دەخاتە بازارەوە, کەقازانجی زیادی لێدەکەوێتەوە, لەگەڵ ئەو زۆرو زەوەندییەی گوایە بەکارنابردرێ، خەڵکانێکی دیکەش پێکدێنێ کەلەژێر سنووری برسێتی و هەژاری دان. مرۆڤایەتی ناتوانێ چیتر لەمیانەی ئەم سیاسەتەی ئابووری بژی. رۆڵی بنەڕەتی سۆسیالیزم لێرەدا رووبەڕوومان دەبێتەوە. ئەمیش دەتوانرێ لەمیانەی وردەوردە تێپەڕبوون لەکۆمەڵگای کاڵاوە بۆ ئەو کۆمەڵگایەی بەرهەمهێنان کەبۆ بەهای بەکارهێنان بەرهەمدێنێ، لەبەرهەمهێنانێکدا کەقازانج بەبنەمادەگرێ بۆ بەرهەمهێنانێك کەهاوبەشێتی و دابەشکردن بەبنەمادەگرێت، پێناسەبکرێ. ئەمەیە سیاسەتی ئابووری سۆسیالیزم. پێویستە پرەنسیپی ئابووری بەرنامە بەم سیاسەتە ئابوورییە پشت ئەستوور بێت. کاتێك ئەم سیاسەتەی ئابووری پەیڕەوبکرێ، ئەوا بێکاری و هەژاری لەناو دەوڵەمەندێتی، هەبوونی برسێتی لەپاڵ بەرهەمهێنانی زیاد، شانبەشانی قازانجی زیادیش تێکدانی ژینگە، وەك قەدەرێك نامێنێ.

کۆمەڵگایەکی ژینگەپارێزی لەناوەڕۆکدا کۆمەڵگایەکی سۆسیالیستییە. کاتێك لەکۆمەڵگای حوکمڕانی ـــ کەلەگەڵ شارستانییەتدا لەسروشت و ژینگە دابڕاوونامۆبوو ـ بۆ کۆمەڵگای سۆسیالیستی هەنگاونرا هاوسەنگی و کۆمەڵگای ژینگەپارێزی واتاداردەبێت. رزگاری ژینگە لەسایەی سیستەمی سەرمایەداریدا تەفرەدانێکە, خودی سیستەمەکە بەرادەیەك هاوسەنگی ژینگەی تێکداوە خەیاڵ ناکرێت. بەو رادەیەی سیستەم بێکاریگەر بکرێ و سیستەمی کۆمەڵگای سۆسیالیستی پەرەی پێبدرێ، گرفتی ژینگە بەچارەسەری ریشەیی دەگات. ئەمەش بەو واتایە نایەت کەلەئێستاوە هیچ شتێك بۆ ژینگە ناکرێت. بەپێچەوانەوە بۆئەوەی تێکۆشانی ژینگەپارێزی چالاکتربکرێ

پێویستی داکۆکیکردن لەسەر ئەوە هەیە کە لەگەڵ تێکۆشانی گشتی کۆمەڵگا لەناویەکدا بەڕێوەببرێت.

بەتایبەتی پێویستە بەرنامە، بێکاری و گرانی، هەژاری و برسێتی، تێکدانی ژینگەو کاڵابوونی ئەو پەرگەری، بەرهەمهێنانی سنوورنەناس و نەشیاو بۆ بەرهەمهێنان بەموڵکی سیستەمی سەرمایەداری ببینێ، بەشێوەیەکی بەهێزجەخت لەسەرئەوە بکاتەوە کە ئەمە قەدەر نییەو بەئاراستەگرتن بەرەو ئابووری سۆسیالیستی وەك کێشەیەك کۆتایی پێدێت.

بابەتێکی دیکەی پێویستە بەبایەخەوە لەبەرنامەدا پێناسەبکرێ کێشەی بژاری بەهای بەکارهێنان و بەکاڵاکردنی موڵکەکانە. لەکاتێکدا بەکاڵاکردنی موڵکەکان بەرەو رژێمی بەدەستهێنانی قازانج دەچێ، ئەوا جیاوازی لەشێوەی کارکردن ـــ بێکاری، هەژاری ـ دەوڵەمەندی، زۆری ـ نەبوونی، قێزەونی، لۆکس ـ قێزەونی، چەوسێنەر ـ چەوساوە، ژێردەست ـ سەردەست، حاکم ـــ مەحکوم و رەگەزی لەگەڵ خۆیدا پەرەپێدەدات. بەپێچەوانەوە پێشخستنی وەکو بەهای بەکارهێنانی موڵکەکان رێگا لەپێش ئەم دووالیزمانە ناکاتەوە. پێشکەوتنەکان بەگوێرەی کارەکتەری کۆمەڵگای سۆسیالیستی سەرهەڵدەدەن. بۆ نموونە لەهەموو شوێنێك داربەروو بچێنین. داربەروو هێندە بەهای کاڵای نییە. بەڵام بەهایەکی بەرزی بەکارهێنانی هەیە. مێوەی نییە، کەرەستەکانی قاییمەو سێبەرەکەشی زۆرخۆشە. چارەسەرییەکی تەواوە بۆ کێشەی ژینگە. دەتوانێ تەواوی چۆلەوانی رۆژهەڵاتی ناوین بکات بەدارستان، چەندەی بڵێی بەگوێرەی ژینگەپارێزییە. ئەوەی هیچ کارێکی نییە، تەنانەت مرۆڤی

نەخوێندەواریش دەتوانێ داربەڕوو بچێنێ و ئاوی بدات. لەمیانەی پێشخستنی رواندنی سەوزایی و داربەڕوودا جیهان رزگاری دەبێ.

دەشێ پەیوەندی بەرنامە سەبارەت بەئەنتەرناسیۆنالیزم لەهەردوو رەهەندی ناوچەیی و جیهانیدا ئاماژەی پێبکرێت. لەواقیعی کوردستاندا مێژوو و جوگرافیا و گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین وەك گۆشت و ئێسقان لەناویەکتردا دەژین. بەرکەنارکردنی میللیگەرایی لەمیانەی ئەم راستینەوە واتادارتر دەبێ. بەبنەماگرتنی میللیگەرایی لەپەیوەندی و ناکۆکی فەلەستین ــ ئیسرائیل، ریشەی سەرەکی تەواوی کارەسات و بێچارەییەکانە. زیادبوونی میللیگەرایی نەتەوەیی بۆ سەر میللیگەرایی ئایینی هەرهەموو کارەساتەکانی گەورە کردووە. کەچی ئەگەر توانستەکانی چارەسەری دیموکراتییانە بەبنەما بگیرابووایە، ئێش و ئازارێکی کەمتر دەچێژرا، دەشیا رژێمی گونجاوتر لەرۆژگاری ئەمرۆماندا ئاوابکرێ. هەڵوێستی میللیگەرایی دەوڵەتخوازی زێدەڕۆ سەلماندوویەتی کەنەك چارەسەری، بەڵکو سیاسەتێکی مەترسیدارە. ئەگەر رەوتە میللیگەرا دەوڵەتخوازەکان لەکوردستاندا بالادەست بن نەك تەنیا یەك بەڵکو چوار فەلەستین ـ ئیسرائیل دێتەکایەوە. چەندین ئەنجام و ئەزموونی هەیە لەمە وەربیگرین. هەروەها ئەو ئەنجامانەش دەزانرێ کەکێشەکانی چاچان، قەرەباخ، کۆسۆڤۆی رۆژگاری ئەمرۆمان، کێشەکانی ئەرمەنی ـ عوسمانی، کورد ــ کۆمار، عەرەب ــ عوسمانی و کورد ــ ئێراقی، لەقۆناخی نزیکدا رێگایان لەپێش کردۆتەوە. گونجاوترین رێگای بەربەستکردنی کارەساتی نوێ، بەبێ ئەوەی کێشەی کورد بخرێتە دۆخی قڕکردن و نکوڵیکردن و لەبیربردنەوەو سوالکاری، لەمیانەی ریفۆرمێکی بەپرەنسیپ و گەوهەریانەی دیموکراتییانەو ئاشتیخوازانە بەبوێری هەنگاوی چارەسەری بهاوێژێ. فۆرمیلەی گشتی ئەوەش "دەوڵەت + دیموکراسی لەکوردستان"کە وەك گۆڕەپانی خزمەتکردن و ئاسایشی گشتی بەشێوەیەکی بەرجەستە بۆ واقیعی تورکیامان شیکارکرد، بەشێوەیەکی بەرجەستە بەواتای دیموکراتیزەبوونی" رۆژهەڵاتی ناوین + هەستیاری دەوڵەت بۆ دیموکراسی = ئازادی بۆ کوردستان". کوردستانی ئازاد زیاتر واتای کوردستانی دیموکراتە. کۆبوونەوەکانی پرۆتۆ ئەلەگرا لەتەواوی جیهان بۆ کۆنگرەی دیموکراسی جیهانگیری گەلان وەردەچەرخێ کەلەتیشکۆی دەوڵەتدا ناخولێتەوەو پلاتفۆرمێکی دیموکراسییانەی خۆجێیی سەرووی نەتەوەیە. وەك ئەنجام کوردستانی دیموکرات, فیدراسیۆنی دیموکراتییانەی رۆژهەڵاتی ناوین, کۆنگرەی دیموکراسی جیهانگیری, دەشێ ببێتە دروشمی نێونەتەوەیی قۆناخ.

پێویستە مافەکانی تاکەکەسی وەك مافەکانی مرۆڤ جێگای خۆی لەبەرنامەدا بگرێ. پێویستە ئازادی بیرکردنەوە، رادەربڕین "ئیرادەی تاك لەژێرهەر هەلومەرجێکدا پارێزراوبێت. هیچ وڵات، دەوڵەت و کۆمەڵگایەك ناتوانێ لەژێرناوی بەرژەوەندیپەرستی, تاك لەمافەکانی بیرکردنەوە، خۆگوزارشتکردن و نیشاندانی ئیرادەی ئازادانە بێبەش بکات. دەبێ بەدەستهێنانی خاڵی سروشتی (ئۆپتیماڵ) هاوسەنگی نێوان کۆمەڵگابوون و تاکێتی تاك ئامانجێکی سەرەکی بێت. ئازادییەکی کۆمەڵگا کەبەئازادی تاك تێپەڕنەبووبێت، ئازادی تاك کەپشت بەئازادی کۆمەڵگا نەبەستێت، لەکۆتاییدا مەحکومی ژێرکەوتنە. تەنیاکاتێك بزانرێ بەبێ هێرشکردنە سەر مافی بەکۆمەڵگابوون و لەمیانەی ئەوەوە مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ بوونی دەبێ و بەبێ کەوتنە ناو مەیلە بێ خەم و تاکڕەوێتییە زێدەڕۆکانی دەرەوەی کۆمەڵگا بەهاداردەبێ.

نەك هاوکاری نێو نەتەوەیی جاران, بەڵکو پێویستە هەڵوێستێکی سەرووتری نەتەوەیی بەبنەما بگرێ. نەك ئەنتەرناسیۆناڵ، بەڵکو پێویستە سوپەرناسیۆناڵ (سەرووی نەتەوە، لەوڵاتری نەتەوە) بێت. دەبێ مرۆڤەکان بەهاوکارییەك بگەن کەناسنامەی ئایین، نەتەوەو چینی تێپەڕکردبێت. دەشێ هەم هاوکاری رەنج، هەم مرۆڤپەروەری لەسەر ئەم بنەمایە واتادارتر بێ.

پێویستە لەبەرنامەدا بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا پەیوەندی نێوان دیموکراسی و سۆسیالیزم جەختی لەسەربکرێتەوە. بەشێوەیەکی گشتی سۆسیالیزم لەمیانەی گووتەی یەکسانی پێناسە دەکرێ؛ رێگاکەشی لەگەڵ چەمکێك هاوواتاکرا کەدەڵێ بەگشتی کردنی موڵکایەتیدا تێپەڕ دەبێ. پەیوەندییەکەی لەگەڵ دیموکراسی و ئازادی دانەنرا. تەنانەت بەو ئاستە گەیشت کەبگووترێ تەنیا ئاوابکرێ، ئیتر چۆن دەبێ و لەمیانەی کام سیستەم دەبێ گرنگ نییە. لەئاکامدا وەك سەرمایەداری دەوڵەت تووشی گەندەڵی بوو. هەم پێشکەوتنە تیۆرییەکان هەم ئەزموونەکان ئەوەی نیشانداوە تاوەکو دیموکراسی تەواو پراکتیزەنەکرێ، ئازادییەکان پەیرەو نەکرێ، بەسۆسیالیزم ناگەیت. سۆسیالیزم بەدەستی دەوڵەت ئاواناکرێ. لەسەردەمی سۆمەرییەکانەوە هەرەوەزییە بەرفراوانەکانی دەوڵەت لەئارادابووە. بەرفراوانترین بزووتنەوەکانی سۆسیالیستبوون دەوڵەتەکان ئەنجامیانداوە. لەدۆخێکی وەهادا پێویستە دەوڵەت بەسۆسیالیسترین دەزگا بەناوبکرێ. ئەزموونی سۆڤییەت بەردەوامی هەمان مەیلی مێژووییە. هەربۆیە بەناوکردنی ئەو موڵکایەتیکردنە گشتییەی بەدەستی گەل ئەنجامدەدرێ وەك سیستەمی لاساییکردنەوەی گشتگیری بزووتنەوەکانی یەکسانی گونجاوترە. لەجیاتی ئەرباب، دەرەبەگ و سەرمایەدارێك وەك ناسنامەیەکی هاوبەشی هەمووان لەناوەڕۆکدا هەمان رۆڵ دەبینێ. ئەگەر دیموکراسی بەواتای کزترین دەوڵەت بێ، لەمیانەی گەشەکردنی دیموکراسیدا یەکسانی بەدیبێ، دەتوانرێ بگووترێ سۆسیالیزمی راستەقینە بەدیدێ. دەبێ وەك مەرج ئاماژە بەوەش بکرێ کەئەمە بەبێ ئازادی نابێ. کاتێك یەکسانی وەك نەبوونی ستەمکاری لەگەڵ ئازادی دەبێتە یەك تەنیا دەتوانرێ وەك سۆسیالیزم بکرێ بەچەمك و بیرۆکە. ئەو یەکسانییەی لەسەربنەمای زۆرەملێیی بێت ناشێ سۆسیالیزم بێ و ئاستەمە. لەرەوشێکی وەهادا ئەوکۆمەڵگا یەکسانەی لەژێر سایەی ئازادییەکانی پراکتیکێکی بەرفراوانی دیموکراتی سەقامگیربووە سۆسیالیستە.

ئەنجام، هزری گەلاڵەنامەی بەرنامەو ئەو سیستەمە تیۆرییەی پشتی پێدەبەستێ لەمیانەی هێڵە گشتی و سەرەکییەکانی پێشکەشکراوە. پێشبینی چەمکی پرۆگرامێك دەکات کە لەکاریگەرییە دەوڵەتگەرایی و میللیگەرییەکان پاککراوەتەوەو وەرچەرخانێکی کۆمەڵگا بەبنەما دەگرێ کەبەرەو دیموکراسی و ئازادی و یەکسانی دەچێ. لەگەڵ ئەوەی بەرنامەیەکی لیبرالی نییە، رۆڵێکی واقیعی بەدەستپێشخەری تاك دەدات. بەرنامەیەك جێگای باسە کەلەجێگای دەسەڵات دەستڕۆیی دیموکراتییانە، لەجیاتی چاودێری کۆمەڵگا ئازادی، لەجیاتی بازاڕێك لەسەربنەمای لیبراڵی، کاڵاو قازانج بێ بازاڕێکی هاوبەشی بەهای بەکارهێنان بەکاردێنێ، کەئەمەش رێبازێکە هاوسەنگی ماقووڵانەی نێوان تاك و کۆمەڵگا بەبنەما دەگرێ. ئاشکرایە کەئەم بۆچوونانە گەلاڵەنامەی پێشنیازکراوە بۆئەوە پێشکەشکراوە گفتوگۆی لەبارەوە بکرێ، بگۆڕدرێ و لێی زیادبکرێ.

2 ـ لەکاتێکدا لەسەر لەنوێ ئاواکردنەوەی "PKK"دا بەرنامە ناوەڕۆکەکە پێکدێنێ، رێکخستنیش شێوەکەی دیاری دەکات. هەروەکو چۆن تیۆری پرۆگرام دیاری دەکات، ئەوا بەرنامەش رێکخستن دەستنیشان دەکات. رێکخستن وەك بڕبڕەی پشتی پێکهاتەکەیە. چۆن جەستەیەکی بێ ئێسقان وەك تۆپەڵێك گۆشت دەمێنێتەوە، پارتێکی بێ رێکخستنیش لەکۆمەڵەیەکی پووچی بێ ئیرادە رزگاری نابێت. هەروەکو چۆن دوو ئەلیکترۆنی هایدرۆجین و ئەلیکترۆنی ئۆکسجین گەردێکی ئاو پێکدێنن، ئەوا رێکخستنێکی گونجاوی کادیرانیش ئەو بناخەو پەیکەرە پێکدێنێ کەکۆمەڵگای لەسەر بەرزدەبێتەوەو شێوە دەگرێ. لەرەوشێکی وەهادا تاوتوێکردنی مەسەلەی رێکخستن بەشێوەی دوو بەشی سەرەکی گونجاوتر دەبێ: ئەوانیش رێکخستەکردنی کادیران و رێکخستەکردنی جەماوەرە.

أ ـ بەدرێژایی مێژوو ئەو پێکهاتانەش لەپارت دەچوون کەکادیرانێکی خاوەن ئیرادەو بەباوەڕی هەبووە. چەندین پێکهاتەی کە بێ کادیر بوون لەقووڵاییەکانی مێژوودا لەبیر نەکران. لەبەرئەوەی دۆزو پارتەکان لەمیانەی کادیرە بەهێزو تواناکاندا نوێنەرایەتی دەکرێت، بەهەند دادەنرێن. هەروەکو زۆرجار جەختمان لەسەر کردۆتەوە کادیر گوزارشت لەو ملیتان

(خەباتگێر)انە دەكات كەبەباشترین شێوە بنەماكانی بەرنامەو زهنییەتی پارتیان هەرسكردووەو بەشێوەی لافاوێكی جۆشكراو هـەوڵی پراكتیزەكـردن و پێكهێنـانی دەدەن. گروپـی ئـەركانی ئەنجامـدانی وەرچـەرخانە. دەبـێ ئـەو تایبەتمەندێتییانـە لەخۆوەبگرێت كەبتوانێ پەیوەندی نێوان تیۆری و پراكتیك دابنێ، رێكخستنی جەماوەری و چالاكییەكان بەیـەكتر بگەیـەنێ و بتوانێ بەرێوەیان ببات. هەروەها ئەو ناسنامەیەیە كەبەشێوەیەكی هونەرمەندو كارامە ئەخلاقی كۆمەڵگاو خوڵقكاری سیاسـی لەكەسایەتی خۆیدا كۆدەكاتەوە. كاتێك بەپشتبەستن بەم پێناسـەیە تەماشای مێژووی "PKK" و سـەرلەنوێ رێكخستنەوەی بكەین ئەوا چەندین فاكتـەری ئـەرێنی و نـەرێنی بەیەكـەوە دەبیـنین. ئەگـەر تـاوەكو ئـەمرۆ "PKK" لەسـەر پێیانـەو دەژی، ئەمە لەسایەی ئەو كادیرە رەسەنانەیە كەهەریەكەو كۆتەڵێكی مرۆڤایەتییە، لەهەمانكاتدا نەگەیشتنی بەسەركەوتنی تەواویش بەهۆی ئەو كادیرانەوە بووە كە لـەناو كێشەو گـرفتی قورسـدا دەژیـن. هـەم سـەركەوتن، هـەم سـەرنەكەوتن، سەرچاوەكەی بـۆ كـادیران دەگەڕێتـەوە. لەكەسـایەتی كادیرانـدا گلۆڵەیـەكی زەبـەلاحی نـاكۆكی كۆمەڵایـەتی دەركەوتۆتـەڕوو. بـەو رادەیـەی ئـەم ناكۆكییانـە ئاشـكراكراون، هەنـدێكیان لەژێرباریـدا رووخـاون هەندێكیـشیان بەهێزبوونـە. تراژیـدیا، قارەمـانێتی و خیانـەتی كادیران هەمووی لەناویەكدا روویـداوە، سـەرباری هـەموو هەوڵـەكانی پـەروەردەو پراكتیزەكـردن، بـەڵام دیسان بـەو كادیرانـە نەگەیشتین كە بتوانن رێباز پەیرەو بكەن. بنبەسـتبوونەكانی قۆناخـەكانی "PKK" یـی بـوون بەرهـەمێكی ئـەم ناتـەواوی و لاوازییەی كادیرانە. دیسان سەرەكیترین كێشەی پرۆسەی ئاواكردنەوەی لەبەردەسـتدایە كێشەی هـەبوون و نـەبوونی كـادیرانی بەهێزو پێویستە.

چارەسـەركردنی ئـەم كێـشەیە دەشـێ رێگـا لـەپێش ئەوەبكاتـەوە بەشـێوەیەكی سـەركەوتووانە بەرنامـە پراكتیزەبكـرێ. لەرەوشـێكی پێـچەوانەدا بنبەسـتبوونی نـوێ سـەرهەڵدەدات. بـەكادیربوون، كـارێكی ئەشـق و تامەزرۆییـە. ئەمـەش بـەواتای كلیلبوون و وابەستەبوونێكی بەبڕیارو باوەڕییەكی بێسنوور دێت بەئامانجـەكانی خۆیـەوە. ئـەو كەسـایەتییانەی خـاوەنی ئـەم خەسڵەتانە نین و دەخوازن لەرێگای ئارەزووو حەسرەتەكانی دەسەڵاتخوازی بەربەستی بكـەن بـەردەوام رێگـا لـەپێش ئـەنجامی نێگـەتیف دەكەنـەوە. بـەكادیربوون لەئارەزوومەنـدی زیـاتر پێویـستی بـەمرۆڤێكی حەسـرەتداری خـاوەن پێـشبینی تیـۆری و گرێدانێكی قووڵ بەپارت و ئاواكەرەوەی بونیادی پارتی هەیە. كاتێك لـەقۆناخی نوێـدا بـەرەو رێكخـستنەوەی كـادیران دەچـین سروشـتییە كەئـەم تایبەتمەندێتییانـە بەبناخـە دابنـرێ. هـەر رێكخستنێكی كۆمەڵایـەتی، سیاسـی و ئـابووری رشـت دەخـوازێ خاوەنی هەمان چەمكی كادیران و هونەری رێبەرایەتی بێت.

لەبەشەكانی پێشووتردا جەختمان لەسەر ئەوەكردەوە لەكاتێكدا "پ.ك. ك" بـەبڕیاری سـەرلەنوێ ئاواكردنـەوە گەیـشتووە، ئـەو گرفتـە قورسـانە بەبنـەما دەگـرێ كەلەپێـشماندایە. لەكاتێكـدا بـەهادارو هێـژاترین هـەڤاڵان شـەهید دەبـن و ئەوانـەی دەمێننەوە فیداكارانە خەبات دەكەن، چـەندین تـوخمی هەڵپەرسـت، دەسەڵاتپەرسـت و چـەتە وەكـو مۆرانـە لـەناوەوە بـەهاكان دەخۆن. هەروەكو بڵێی راسـتینەی كۆمـەڵگا سـەرلەنوێ لـەناو پـارت دەژێتـەوە. سـەرەڕای ئـەوەی لەهەسـتیارترین كـات و سـاتی مێژووییدا دەژین، ئەو كەسایەتییانەش كەم نین كەبەبێ شەرم داخوازییە تایبەتەكانی خۆیان و ئارەزووەكانی دەسەڵاتپەرسـتی دەسەپێنن. دیسان سەرباری ئـەوەی ئـیش و كـار بەسـەریەكتردا كەڵەكـەبووە، بـەڵام ئـەو كەسـە تەمبەڵانـەش كـەم نـین كـەزۆر لەخوڵقكاری كرێكاری ئاسایی دواكەوتووترەو رۆژی خۆیان بەسەردەبەن. هەوڵیاندا لـەرێگای چـەمكی دەستبەسـەرداگرتن پلـەو پایە بەدەست بێنن. ئەمانە هەڵوێستی منداڵانە بوون، بەڵام مەترسیداربوون.

بەپێی رۆحی بەرپرسیارێتی پێویستەوە لەوە تێنەگەیشتن كاتێك بـەناوی پـارت هەنـدێ دابەشـكردنی كـار ئـەنجام دەدەیـن، دەست لەئارامی خۆمان بەردەدەین و لەپێناو پاراستنی كادیرانەوە خۆمان دەخەینە ژێـر هەڕەشـەی گـەورەوە. كەچـی هەوڵـدرا لـەژێر هۆشـیاری دەرككـردن بـەو تراژیـدیا گەورانـەی دووچـاری دەبینـەوە هـەڤاڵێتی بكـەین. لـەرێگای رەخنـەی بەرفراوانـەوە

بانگهێشتی گیانی بەرپرسیارێتیمان کرد. سەرباری ئەوەی لەبیرەوەری هەزاران هەڤاڵی شەهید بەردەوام جەختمان لەسەر ئەوەکردەوە کەشایستەی چاوەڕوانی و ئومێدەکانی ئەو گەلە بن کەلەژێر باری کێشەی قورسدا دەژین، ئەگەرنا بەپێچەوانەکەی مێژوو لێیان نابووری، دیسان بەشێوەیەکی خولْقکارانە شێوازی سەرکەوتنیان بەدەستنەهێنا. خراپترینیشیان ئەوەبوو کەلەگەڵ دەستپێکردنی قۆناخی ئیمرالی لەسەر میراسی "PKK" کەوتنە ناو گەمەی دەسەڵاتەوە.

لەلایەك ئەو هەڤاڵانەی ئاگریان لەجەستەی پیرۆزیان بەردەداو، ئەو گەلەی فرمێسکی خوێناوی دەباراند، لەلایەکەی دیکەشەوە گروپە دەسەڵاتخوازەکان لەبواری ناوەڕۆك و رواڵەتەوە شایستەی نەریتەکانمان نین، ئەمە ناکۆکییەکی گەورەبوو. سەرلەنوێ چارەسەرکردنی ئەم رەوشە لەناو زەمینەی پارتیبوون دەبووە راسترین هەڵوێست. بێگومان کاتێك لەسەر ئەم بنەمایە هەڵوەستە سەبارەت بەگرفتی کادیران دەکرێت لێکدانەوەو هاوسەنگییەکانی دەسەلات حیسابی بۆ ناکرێت. بەگوێرەی ئەوەی ناتوانین تکا لەوانە بکەین کەگروپیان دروستکردووەو بلێین وەرن با پارتیبوون ئەنجام بدەین، راسترینیان ئەوەیە تیۆری و چەمکی بەرنامەی خۆمان بخەینەروو و ئەوانەی بەشکۆمەندترین باوەڕی و هۆشیارییەوە بانگەشەی ئامادەباشی دەکەن خاوەندارێتی لەمیراسەکەمان بکەن و سەرلەنوێ شێوە بەناوەڕۆکەکەمان بدەن.

هەروەکو دەزانرێ چەندین پاڵێوراوی کادیران لەناو میراسەکەماندا هەیە کەلەبواری چەندایەتی و چۆنایەتیدا دەتوانن چەندین جار پارتی بەخێو بکەن. لەناو ئەمانەدا کۆبوونەوەیەکی خۆبەخشانەو ئازادی هزرو ئیرادە هەنگاونان بەرەو پارتیبوونمان وەك ئەرکێك دیاریکرد. هەوڵماندا کۆمیتەیەکی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی دوانزدە کەسی ئاوابکەین و هەنگاوێك بەرەو پێشەوە بڕۆین. کێشەکە لەوجۆرە نییە لەمیانەی دامەزراندنێکی خێراو بەپەلە چارەسەربکرێ. هیچ دووبارەکردنەوەی ئەوە نییە کەلەرابردوودا ئەنجامدراوە. پێویستە کارکردن لەگەڵ ئەو کادیرە بەپەرۆشانە بەبناخە دابنرێ کەدەتوانن رابردوو قەرەبوو بکەنەوە، ئایندە گەرەنتی بکەن، هیچ کەموکورتییەك ناکەنە بەهانە، دوای ئەوەی کادیرانی خاوەن ئەم چۆنایەتییە بەئەزموونی سەرکەوتووانەی پێویست تێپەربوون، وەك ئەندامی بنەڕەتی بەهەمیشەیی دەتوانن خەبات بکەن. ئەوانەی کەوتوونەتە رەوشی لایەن و گروپچێتی، لەمیانەی هەڵسەنگاندنێکی ریشەیی و رەخنەو رەخنەدان و هەوڵی پراکتیکی دەتوانن لەبارەیانەوە بەئەنجامێك بگەن. دەرك بەوەکراوە کەبەگوێرەی لێکدانەوە کۆنەکان ناتوانن کۆببنەوەو بەئاراستەی پارتیبوون بڕۆن. لێرەدا نەك نیازپاکی بەڵکو پێوانەکان دیاریکەرن. بەڵام تەواوی پەیوەندییەکان لەگەڵ گروپی بەمجۆرە نابڕدرێ, بەڵکو لەژێرچەتری کۆنگرەی گەلدا درێژە بەخەبات دەدرێ. بەمجۆرە پارتێکی دیموکراتی بەر لەهەموو شتێك دەتوانێ دیموکراسی ناوخۆی بسەلێنێ.

مەزەندەناکەم ژمارەیەکی زۆر بۆ رێکخستنی کادیران سوودمەندو پێویست بێ. لەو بڕوایەدام 300 ــ 500 کادیری چۆنایەتی تێردەکات کەبەرنامە جێبەجێ بکات، جەماوەر بخاتە جوڵەوەو لەهەر گۆڕەپانێکدا ببێتە هێزی نوێنەرایەتی.

لەجیاتی رێکخستنێکی ڤاڵبگەرایی میکانیکی کادیران، سروشتییە ئەگەر رێکخستنێکی چالاك و کارا لەلایەن کادیرانەوە هەڵبژێردرێ. نەك تەنیا بۆ پڕکردنەوەی ئەرك و گۆڕەپان, بەڵکو دەبێ بۆ سەرخستنی ئەرکە چاوەڕوانکراوەکان دامەزراندن و ئەرکپێدان ئەنجامبدرێ. پێوانە ئەو ئەرکانەی چاوەڕوانی جێبەجێکردنن و ئەو کادیرانەن کەدەتوانن شایستەی بن.

بەگوێرەی پێویستی دانەیەك یان دەرزنێك کۆمیتەو نوێنەرایەتی ئاوا دەکرێ. بەڵام لەبەرئەوەی کۆمەڵکاری تایبەتمەندێتییەکی پێویستە، بەردەوام نوێنەرایەتی جووت شایانی هەڵبژاردنە. لەجیاتی رێکخستنەکانی کۆمیتەی ناوەندی، مەکتەبی سیاسی و لقەکان، ئەو ئەرك و رۆڵە گونجاوترە کەباسمانکرد. لەجیاتی ئەوەی بەگرفتە رواڵەتییەکانەوە خەریك بیت، پێویستە ئەو چارەسەرییانە هەڵبژێردرێ کەبەگوێرەی ناوەڕۆکە. هەروەکو چۆن کاتێك توانستەکانی چارەسەری لەخۆیاندا دەبینن دەگونجێ پێشنیاز بکەن، دەشێ بەدامەزراندنیش ئەرك بسپێردرێ. بەڵام فشارو ناچارکردن گونجاو نییە.

لەوچەند مانگەی پێشماندا دەتوانرێ ئەرکپێدان بۆ ئەو گۆڕەپانانە بکرێ کەپێویستییەکی زۆری هەیە. لەماوەی شەش مانگدا زۆر بەئاسانی دەتوانرێ ڕێکخستنی کادیرانی (100) کەسی ئەنجامبدرێ. ئەگەری ئەوە هەیە بەگوێرەی پێویستییەکان کەمتر یان زیاتر ئەرکیان پێبدرێ. پێویستە دەستپێشخەری کۆمەڵکاری و تاك لەناویەکدا بەکاربهێنرێ. ڕەچاوکردنەوەی خێرایی شێوازی کارکردن و بۆگەیشتن بەئاکام نیشاندانی ئیرادەی پێویست خاڵی زانراون. بەئەندازەی لێهاتوویی تیۆری و زاڵبوون بەسەر بەرنامە، شێوازی کارو خێراییەکەشی پێویستە. تەواوی جەماوەر، یەکینەکانی پاراستن، خەباتی گۆڕەپانەکانی نهێنی و ئاشکرا، بەهۆی ئەو لیستەی "تیرۆریستی" کە دەزانرێ پێویستییان بەخەباتێکی تایبەت و خولقکارانە هەیە. دەبێ شێوازی ژیان و کار، هێزی جۆش و سەرنجراکێشان لەدەوروبەری خۆی بلاوبکاتەوە. شێوازەکانی سووککردن و بلاوە پێکردن بەلانی کەم هێندەی ئاژاوەگێڕی مەترسیدارە.

بەکورتی سیاسەتی کادیران و بەسەرداچوونی کارو پراکتیك، تەنانەت لەمیانەی بچووکترین ڕێکخستنیشەوە هەڵوێستی هەرەراستە. بەئەندازەی خۆبەخشی خەباتکردن لەناو دیسپلینێکی نموونەیی مەرجە. لەناو میراسی قارەمانێتیدا لەگەڵ گەلێکدا سەری ڕێیگرتووە کەهەڵساوەتە سەرپێیان و بەحەسرەتەوە چاوەڕوانی ئازادییە. لەدوای ئەزموونێکی گەورەو پراکتیکێکی شیتەڵکراو چوونە سەرکار، بەو ئەندازەیەی جێگای جۆشوخرۆشە، ئەوا خەباتێکی بەرهەمدارو هەڵوێستێك وەك مەرج دەسەپێنێ، کەسەرنەکەوتن پەسندناکات. سەرکەوتن لەجێبەجێکردنی ئەرکەکان بەئەندازەی ئەو بەڵێنانەی دراوە، پتەوترین پێودانگە کەناوەڕۆکی ڕاستەقینەی کەسایەتی دەخاتەڕوو.

گرفتێکی دیکەی گرێدراو بەرێکخستنی ناوکی پارتی، سەبارەت بەمەسەلەی پەیڕەوی ناوخۆیە. قاڵبی گشتی دەزانرێ. دەشێ لەماوەی دیاریکراودا کۆنگرە ببەسترێ، لەکۆنگرەکاندا سەرۆك و کۆمیتەی ناوەندی یاخود ئەنجوومەنی بەڕێوەبەرایەتی هەڵدەبژێردرێ، کۆمیتەی ناوەندی دەستەیەکی کارگێڕی بەرتەسك لەناوەخۆی هەڵدەبژێرێ، ئەمانەش سکرتێری گشتی و یاریدەدەرەکانی، دەستە ناوەندییەکان،، کۆمیتەی کۆمەڵکاری و خۆجێییەکانی خواروتر و یەکینەکانی، لقە جەماوەرییەکانی ڕێکخستن و ڕێکخستنە سەکسیۆنەکان ــ دەشێ سەبارەت بەپارچەو وڵاتان بێ ــ لەخۆوەدەگرێ. لەڕەوشێکی وەهادا نیم هەڵسەنگاندنی ئەرێنی یاخود نەرێنی دەرهەق بەم مۆدێلە بکەم. بەڵام لەئەزموونەکانی ڕابردوودا دەزانین کەجاران بەردەوام وەك ڕێگایەکی بەدەوڵەتبوون بەکاردەهێنرا، زیاتر پەرەی بەدەستڕۆیی خۆی دەدا، لایەنی دیموکراسی کارا نەدەکرد. ناڵێین ئەم مۆدێلە تەنیا ئەم ئەنجامەی لێدەکەوێتەوە. ئەوەی دیاریکەرە تیۆری و بەرنامەیە، ئەگەر پەیڕەوی ناوخۆ بەتەنیا وەك ئامراز نەبینرێ، ئەگەر وەك ئامرازی میکانیزمی پراکتیزەکردنی بەرنامە ببینرێ و بەمجۆرە ڕەفتاری لەگەڵدا بکرێ زۆر بەسانایی دەشێ بەرەو دیموکراتیزەبوون بچێ. ئەمەش مەسەلەیەکە پەیوەندی بەناوەڕۆکی کادیرانەوە هەیە. تیۆری، بەرنامە، کادیر، پەیڕەوی ناوخۆو میکانیزم هەرهەمووی لەناو یەکپارچەیی گشتگیردایە.

بەگوێرەی واقیعی کوردستان دەشێ هەر پارچەیەك پێویستی بەرێکخستنی تایبەت هەبێ. پارتی هەر پارچەیەك نەدەتوانێ تەواو سەربەخۆ بێ، تەواو بەناوەندەوە گرێدراو نەبێت، بەڵکو دەشێ شێوازی سەکسیۆنی نیوگرێدراو گونجاوبێ. دەشێ دەستەی پەخش و ڕاگەیاندن، دەستەی ئەکادیمیای زانست و هونەرو دەستەی مافپەروەری و دیسپلین و... هتد وەك نموونەی دامەزراوە ناوەندییەکان نیشانبدرێ. دەشێ وەك یەکینەکانی ژنی ئازاد، یەکێتی لاوانی دیموکراتی، سەندیکاکان، هەرەوەزییەکان، کۆچبەرەکان، جووتیاران، کاسبکاران و خاوەن کارەکان و....هتد بیر لەلقەکانی ڕێکخستنی جەماوەری بکرێتەوە.

بۆ بەڕێوەچوونی میکانیزمی دەستەکان (ألهیئات) ڕێبەرنامە بەرتەسکەکان و دەستپێشخەری کۆمەڵکاری و تاکەکەسی خاڵی پێویستن.

وەك رێساكانی میكانیزم و كاروباری ناوخۆ سەبارەت بەبابەتی پەیڕەوی ناوخۆ دەتوانرێ هەڵوێستە لەسەر مۆدێلی دیكەش بكرێ، لێرەدا تەنیا بەئامانجی سەرنجراكێشان لەئاستی پێشنیازكردندا خواستمان ئاماژە بەهەندێ بۆچوون بكەین.

ئاماژەكردن بەهەندێ خاڵ سەبارەت بەبابەتی "پارتی ئازادیخوازی ژنانی كوردستان ـــ PAJK" بەگرنگ دەبینم كەدەرهەق بەسیاسەتی كادیران پێویستی بەهەڵوێستێكی تایبەت هەیە. لەو بڕوایەدام كە "PAJK" پێویستی بەهەبوونی نوخبەیەكی كادیران هەیە. زۆر لەوەپتر كەمەزەندە دەكرێ. كێشەی ژن رۆڵی كلیل دەبینێ لەچارەسەركردنی تەواوی كێشەكانی دیموكراتیزەبوون، ئازادی و یەكسانی، تەنانەت گرفتەكانی ژینگەش. بەگوێرەی ئەوەی ناتوانین بەیەكجار هەموو ژنان ئازادبكەین، ئاشكرایە پێویستە سەرەتا لەسەر كادیران پەیڕەو بكرێ. نوخبەی "PAJK " كەخۆی ئازاد نەكردبێ، ئایا چۆن دەتوانێ بەكێشەترین ژن و پیاوانی جیهان ئازاد بكات؟. چەندین هەوڵەكانی دیالۆگ و چارەسەركردنی من دەرهەق ئەم بابەتە دەزانرێ. دەبێ ئاماژە بەوەبكەم كەلەو لایەنەوە قووڵتر بوومەتەوەو بڕواكانی خۆم تۆكمەو پتەوتركردووە.

رووبەڕووی راستینەی ژنێكین كەبەدرێژایی مێژووی شارستانییەت وەك یەكەمین چین، رەگەزو نەتەوەی كۆیلە دەركەوتووە. داخستنی (بەستنەوەی) لەناو سۆزانیخانەی تایبەت و گشتی و پراكتیزەكردنی شێوەكانی ئەم كۆیلایەتییەیە. فشار سەرچاوەكەی جەستەیی (بایۆلۆژی) نییە، بەڵكو سەرچاوەكەی كۆمەڵایەتییە. دەزگای ژنایەتی ـــ مێردایەتی لەمیانەی شێوەكانی لەسەردەمە جیاوازەكانی شارستانییەتدا دژ بەژنان و تەواوی كۆمەڵگا بەكارهێنراوە. رەنگدانەوەی شێوەی ئیمپراتۆری سیاسی لەناوماڵدا مێردە. مێرد بەرامبەر بەژن بەردەوام رۆڵی دەسپۆتی بچووك دەبینێ. ئەمە هیچ پەیوەندییەكی بەنیازی كەسێتی تاكەوە نییە. پێویستە وەك پێدراوێكی شارستانییەت دەركی پێبكرێت.

بەدەستەوەگرتنی ئازادی ژن لەكولتووری دایكی ـ ماڵیكەر (خوداوەندە دایك) كەلەمیانەی شۆڕشی كشتوكاڵدا ئاستێكی باشی بڕی، دەشێ راستتربێ. هەرلەبەر ئەم هۆكارە وێناكردنی میتۆلۆژی سێیانەی خوداوەندە "ژن ـــ فریشتە ـــ ئافرۆدیت"م هەڵبژارد تاوەكو خەیالی ژن, كچی ساویلكە نەڕووخێنین، ئەوا بەگەورەیی، رێزو جوانی ژن ناگەین. بەگوێرەی پێودانگەكانی شارستانییەت پیاو سەرچاوەكەی ئیلاهییە و ژن لەتەواوی پێودانگە ئیلاهی، فریشتەو جوانی خستووە.

چەندە كۆن و جێگیریش بووبێ، تەنانەت وەك چەمكێكی نامووس لەناو هەمووتان كارابێت ـــ بە ژن و پیاوەوە ـــ، بەڵام چەمكی ئیستاتیكای (جوانی) ژیانی شۆڕشگێڕیم، لەگەڵ ئەمجۆرە كولتوورەی ژنایەتی و مێردایەتی ناگونجێ.

هەروەها هەوڵی روونكردنەوەی چەمكی تایبەتی خۆم سەبارەت بەدایك دابوو. بەگوێرەی من تاوەكو ئێستا بەبەراورد لەگەڵ پیاو, ژن زیاتر بەرامبەر سروشت هەستیارە. بەجۆرێك لەجۆرەكان پیاو بەردەوامی ژنە. هەروەكو مەزەندە دەكرێ ناوەند نییە. پێدراوە زانستییەكان بەم ئاراستەیە دەچن. راستینەی ئەو چەوسانەوەو فشارە مەزنەی بەسەر ژندا سەپێنراوە, وەهایكردووە تاڕادەیەكی مەزن رووخساری راستەقینەی بشارێتەوەو بیكاتە شتێكی دیكە. گووتەی مۆدەی پیاوان سەبارەت بەژن كەلەژێر ناوی ئایین، فەلسەفە، تەنانەت زانست و هونەردا ئەنجامدراوە بەباس و روونكردنەوەو شێوازێك گەیشتووە بڕوا ناكرێت.

ئەمە هەڵوێستێكی هێندە ناڕەسەن و زۆردارانەیە, ژنی ناچاركردووە ئەو بابەتانە بپەرستێ كەهیچ باوەڕی پێی نییە. من كەئازادیخوازێكی راستەقینەم و هێزەكان هاوسەنگ دەكەم، نابێ چاوەڕوانی ئەوە بكرێ بەشداری گەمەكانی شارستانییەت بكەم، یان پەسندی بكەم. هەروەكو چۆن بەجیهانی خوداوەندە پیاوەكان دڵخۆش نەبووم, زۆرباش لەراستییەكەی و ناوەڕۆكەكەی تێگەیشتووم. دەبێ بزانرێ كەبەشداری ئەم بۆچوونەش ناكەم كەجیهانێكی ئیلاهییە. ئەو ئیلاهیبوونانەی وەك لەدەوڵەت، ئایین، سیاسەت، هونەرو زانست رەنگدەداتەوە تەنیاكاتێك لەلایەن منەوە شیكرانەوە ئەوكاتە سەرنجراكێش دەبن. شانبەشانی ئەوەی ئیلاهیبوونی ژن سەیرو سەرنجراكێش دەبینم پەی بەوەش دەبم كەمەردایەتییەو دیاردەیەكە بەدیهاتنی

قورسە. بەڵام لەوباوەڕەدام تاوەکو پشت بەئازادی ژن و ئەو هێزە نەبەستین کەمسۆگەری دەکات، ئاستەمە لەناو تەمەنێکی هێژای ئاشتیخوازی، جوانی و هەستیاردا بژین. بەپێچەوانەوە پیاوێتییەك لەسەربنەمای کۆیلایەتی ژن بێت، هەروەکو سەردەمی تەمەنی منداڵیم تاوەکو ئێستاش بەسەیرو فێزەونی دەبینم. نابێ چاوەڕوانی ئەرێکردنی ئەم فێزەونییەم لێبکرێ.

لەوانەیە ئەو دیاردەیە بەردەوامییەکەی دیاربکات کەبەئەشق بەناو دەکرێ. بەهەرحاڵ وردەوردە دەرك بەوەدەکرێ کە لەسیاسەتی کادیرانی ژندا ئەشق دەچەسپێنم. لەولاوەی رەهەندی رەگەزی هەوڵدراوە ئەم هەڵوێستە لەناو چەمك و بیرۆکەی کولتووری، سیاسی و ئازادی و یەکسانی پێشبخرێت. شانبەشانی رزگاربوونی ژن لەژێر کۆت و بەندی کولتووری کۆیلایەتیدا، پێویستی بەپێناسەیەکی ئەشق هەیە کەلەمیانەی راوەستەیەکی یەکسان و ئازاد و هاوسەنگییەکی دیموکراتی گۆڕەپانی سیاسی بەدیهاتبێت و رزگاربوون لەکولتووری پیاوسالاری لەخۆوەبگرێ. ئەمە هەڵوێستێکە پەیوەندی سۆزانی (فحوش) رەتدەکاتەوە کە لەنێوان باڵادەستی تامەزرۆیی زایەندی و رووکەشی پیاوو کۆیلایەتی ژنێتی پێشکەوتووە. پێویستە دەرك بەو ئیلاهیبوونە بکرێ کەدەبێ لەنێوان ژن ــ پیاو هەبێ و، ئاستەمە ئەمە لەژێر سایەی شارستانییەتی چینایەتی بەتایبەتیش سیستەمی سەرمایەداری بێتەئاراوە. مەبەستمان لەئیلاهیبوون ئەو هێزەی تێگەیشتنی ژیری سۆزداری و ئەنالیتیکی مرۆڤە کەبەجۆش و خرۆشێکی مەزنەوە هەستی بەخۆیکردو پەی بەچیرۆکی گەردوونی بیست ملیار ساڵی کرد ــ بەگوێرەی دواپێدراوە زانستییەکان ــ. ئەو سروشتەیە کە هەستی بەخۆیکردووە. پێدراوە زانستییەکان ئاماژە بەوەدەکەن. کاتێك دەڵێم ژن گەردوونی و ئیلاهییە مەبەستم ئەم واتایەیە. ئەو واتایەی هەندێ جار لەجیهانی هونەر، سیاسەت، زانست و شۆڕشەکاندا رەنگدەداتەوە، کاتێك لەپەیوەندییەکانی ژن ـ پیاو رەنگدەداتەوە، دەشێ باس لەئیلاهیبوونی پەیوەندییەکە بکەین. پێویستە بەمجۆرەبێ. لەگەڵ ئەوەی ئایینەکان هەست بەمەدەکەن، بەلام لەبەرئەوەی زیاتر ناسنامەی کۆمەڵایەتی ئایدیۆلۆژیای پیاوسالارین، لەمیانەی بەلاوەنانی ژندا, لەراستیدا زیانێکی گەورە بەو ئیلاهیبوونەش دەگەیەنن کەبانگەشەی بۆدەکەن. هەوڵ و کۆششی ئێمە بۆ ئەوەیە بەشێوەیەکی دیموکراتی، ئازادو یەکسان ئەم خوداییەی نێوان هەردوو رەگەز بخەینەڕوو. لەبەرئەوەی روونکردنەوەی زیاتری پێناسەکەی ئێرە شوێنی نییە, کۆتایی پێدێنم.

کەوایە جۆری ئەو پەیوەندییەی لەرۆژگاری ئەمرۆماندا زاڵە ئایا لەگەڵ ئەم پێناسەیە دەگونجێ؟ بەپێچەوانەوە ئایا لەمیانەی ئامرازە بکوژەکانی دەستی کەوەك تەوری رۆما وایە، لەگەڵ گووتە ساختەکانی خۆشەویستی کوشتاری بەکۆمەڵی ژنان و پەیوەندی ئەنجامنادرێ؟ ئایا شێوازی پیاوی بەراز ئاسا سەرهەڵنادات؟ ئەو پەیوەندییەی ژن ــ پیاوی رۆژگاری ئەمرۆمان کەهەوڵی رەواپێدانی دەدرێ لەوانەیە لەسەرووی شێوە فێزەونە دەمامککراوەکانی کۆیلایەتییەوە بێت.

پێویستە لەژێررۆشنایی ئەو واتایە نزیکەی 300 کادیری (نوخبە) PAJK هەڵسەنگێنرێ کە لەگەڵ چەمکەکانی ژنەخوداوەند، فریشتەو پەری بگونجێ. ژنە خوداوەند (خوداوەندە ژن) گوزارشت لەو ژنە دەکات کەدەرکی بەراستینەی گەردوونی خۆی کردووە، لەهاوسەنگی هێزی دیموکراتیدا تەواو لەشوێنی خۆی جێگیربووەو، ئازادی و یەکسانی لەپەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیدا پەیڕەودەکات. ئاشکرایە بەرامبەر ئەم ژنە پیاو جورئەت ناکات ژنێتی و باڵادەستی بەرامبەر بسەپێنێ، تەنیا دەتوانێ رێزو خۆشەویستی خۆی بۆ روونبکاتەوە، ناتوانێ بەزۆرەملێ چاوەڕوانی پەیوەندی رێزو خۆشەویستی و تەنانەت زایەندی بێت. دەبێ ئەمە وەك پرەنسیپێکی سەرەکی ئەخلاقیمان دەرکی پێبکرێت کەکاتێك لەمیانەی هێزی هاوسەنگی دیموکراتی خۆی کرد بەکەسایەتییەکی ئازادو یەکسان، پێویستە چاوەڕوانی رێزو خۆشەویستی بێت لەوژنەی خاوەنی هەمان پێوانەیە. کاتێك ئەم پرەنسیپە ئەخلاقییە پەیڕەوکرا، دەشێ باس لەو دیاردەیە بکەین کەبەئەشق ناودەبرێ، ئەمەش بوویەرێکە لەمیانەی قارەمانێتی تێکۆشانی ئازادی و یەکسانی دیموکراتییەوە پێشدەکەوێت. هەرجۆرە هەڵوێستێکی

دیکە خیانەتکردنە بەرامبەر ئەشق. کاتێك خیانەت لەئەشقیش بکرێ خولقکاری و سەرکەوتن بەدینایەت. لەریزەکانی "PKK"دا ئەشقێکی راستەقینە لەرێگای قارەمانێتییەکەوە بەدیدێت کەبەسەرکەوتن خۆی سەلماندبێ.

کەواتە دەتوانین چ ناوێك لەو راکردنانە بنێین کەژن و پیاو بەجووتە ئەنجامی دەدەن؟ دەتوانین وەك خۆسەلماندنی ئەو ناسنامەیەی کوردان هەڵبسەنگێنین کەکۆتایی پێهاتووە. ئەمە رەوشێکی تراژیدی پڕ لەئێشە کەچەندین هەڤاڵانی 40 ــ 50 ساڵیمان هەم لەناو پەیوەندی کۆیلایەتی کلاسیکیدا ناژین، هەم سەبارەت بەرێبازی ئەشق خاوەنی هزرو پراکتیك نین. تەنانەت بەناویەکداچوونی کۆمیدیاو تراژیدیایە. هەندێکیان هەروەکو بڵێی شێت و هاربوونە. هەندێکیان کاتێك وەك ژن و پیاو دێنە لای یەکتر تێردەبن, هەندێکیان لەخەودا...، هەندێکیشیان هاوسەرێتی وەك بابەتێکی سیاسی دەسەپێنن. هەندێکیشیان لەبەرئەوەی رێگری لەئارەزووەکانیان کرا، نارەزاییبوونێکی بابەتییان بەرامبەر تەواوی ئەرکە شۆڕشگێڕییەکانیان نیشاندا. بەکورتی چاوەڕوانییەکانی سیستەمی زاڵیان سەپاند. لەو هەڤاڵانە تێدەگەم. بەڵام ئێمەی پیاوان و ژنان کەبەگەرمترین ئەزموونەکانی ژیاندا تێپەڕین، بەڵێن و پەیمانی ئازادی و یەکسانیمان بەیەکتردا. سوێندمان خوارد کە ئەم بەڵێنەمان تەنیا لەوڵاتێکی ئازادو کۆمەڵگایەکی دیموکرات پێکدێت. ناتوانن نکوڵی لەوەبکەن کەبۆ پەیوەستبوون بەبڕیارو سوێندەکەمان هەمووجۆرە هەوڵ و کۆششێکم دا.

دەتوانم لەناو ئەم پێناسانەدا پێشنیازی "شەڕی ئەشق" بکەم. پیاوان بەگشتی گومان لەوەدەکەن کاتێك ژن بەسەربەخۆ بەجێبمێنێ هەبوونێکن بۆ هەمووجۆرە خراپییەك کراوەن. ئاشکرایە کەفشارو زۆرداری هەزاران ساڵ لەژێر ئەم هەڵوێستەدا شاراوەیە. بڕوای من بەرگری لەپێچەوانەکەی ئەم هەڵوێستانەی پیاوسالاری دەکات. دادوەری، ئازادی و یەکسانی پێشکەوتنێکی دیاردەگەرایین کەزۆربەفراوانی لەسروشتی ژندا دەژین. هەروەها تادواڕادە ئاشتیخوازە. تەواو پەی بەوە دەبات کەتەنیا دەشێ لەمیانەی پێشخستنی ئەم چەمکانەدا ژیانێکی واتادار بێتەئاراوە. لەچەمکی جوانیشدا هەستیارو بالاترە. دیسان لەبژارەکانیدا سەپاندنی فشارو بێدادی لەمیانەی شەڕ، پێچەوانەی سروشتەکەی و شێوازی بەکۆمەڵگابوونییەتی. دەرککردن بەتەواوی ئەم مەسەلانە گرێدراوی تواناکاری جولانەوەی ئازادی ژنانە. چەندە ئازادانە بجووڵێتەوە، بەو ئەندازەیە دەتوانێ بژاری جوان، دادوەرانەو یەکسان بکات، هەربۆیە بەرجەستەکردن و بەژیانیکردنی چەمکەکانی یەکسانی، دادوەری و جوانی لەناوکۆمەڵگادا بەشێوەیەکی چڕو توندوتۆڵ بەئازادی ژن تێپەڕدەبێت.

پیاوێتییەك بڕوای بەخۆی هەبێت نەك کۆسپ بۆ ئەم شێوازەی ئازادی ژن نانێتەوە، بەڵکو دەبێ بزانێ بەفیداکارترین شێوە یارمەتی و هاوکاری بکات. پێویستە لەجیاتی گووتەی ژنی من، قورسایی بداتە سەرگووتەی ئەو ژنەی پێویستە ئازادببێت. لەرەوشێکی وەهادا دەشێ هەلومەرجەکانی دیاردەی ئەشق دیاریبکرێ. بەرلەهەموو شتێك بۆئەوەی ژن مافی هەڵبژاردن بەتەواوی بەکاربێنێ یەکەمین مەرج ئەوەیە لەئازادی و یەکسانیدا لەگەڵ پیاو بەهێزێکی هاوسەنگ بگات. لەم پێناوەشدا بەدیهاتنی دیموکراتیزەکردنی تەواوەتی کۆمەڵگا مەرجێکی دیکەی لەپێشینەیە. دووەمیان، پێویستە پیاو بەلاوەنانی ئەو پێوانانەی بالادەستی هەزاران ساڵی دژبەژن پەسندبکات کەلەخۆی و کۆمەڵگای پیاوسالاریدا جێگیربووەو، بەمجۆرە لەگەڵ ژن بەهەمان هێزی هاوسەنگ بگەن. ئاشکرایە ئەم تێکۆشانەی ئازادی, دیموکراتی و یەکسانی کە لەم پێناوەدا ئەنجامدەدرێت تاك زیاتر لەدیاردەو چەمکی ئەشق نزیکدەکاتەوە. ئەمەش بەرلەهەموو شتێك بەنکوڵیکردنی ئەشقی سیستەمە پێدراوەکان تێپەڕدەبێت.

دەشێ مەردایەتی راستەقینە لەناو ئەم پێناسانەدا واتاداربێ و جێگای خۆی بدۆزێتەوە. رێز لەپەیوەندیداربوون و مەیلی ئەشقی ئەمجۆرە کەسایەتییانە دەگیرێ. کوڕو کچە ئازاو مەردەکانمان کەخۆیان دەخەنە ناو ئاگرەوە لەهەمانکاتدا ئاگادارییەکە بۆئێمە سەبارەت بەخیانەتکردن لەئەشقەوە. ئەوان بۆ گەلەکەمان و وڵاتەکەمان هەم پرەنسیپ، هەم پەیڕەوکار، هەم قارەمانە

راستەقینەکانی پەیڕەوکردنی ڕێسا پیرۆزەکانی ئەشقن. بەلانی کەم پێویستە ئێمە هێزی ڕێزگرتنمان بەرامبەر ئەم قارەمانانە نیشانبدەین. دەزانم کەئەم پێوانانە زۆر قورسن. بەڵام ئایا چی هەیە لەوە قورستربێ کە لەناو کلێپەی ئاگر بسووتێی !. ئەشق ئەو راستینە دژوارەیە کەدەمانخاتە جەنگەوە. دەشێ ئەو کەسایەتیانە لەناو PAJK سەرهەڵبدەن کەدەخوازن بەمجۆرەبن. لەبەرئەوەی نیشانەکانی ئەوەم بینیوە ئەم هەڵسەنگاندنانە ئەنجامدەدەم. بەلانی کەم دەبێ لەپێش ئەوکەسانە نەبینە بەربەست کەدەخوازن پێهەڵگرتنی بەمجۆرە ئەنجامبدەن و ببنە خاوەن ژیانێکی مەزن. باگفتوگۆ بکەن، خۆیان فێربکەن و پەروەردە بکەن، لەمێژووی نەفرەتلێکراوەوە بۆ مێژووی ئازادی قەڵەمباز ئەنجامبدەن. ڕێساکانی ژیانی ئەشق، خۆشەویستی و ڕێزگرتن پێشبخەن. بابڕیار لەسەر هەمووجۆرە ڕێکخستن و پراکتیکێك وەربگرن. با لەبەستنی کۆنگرەوە تادەگاتە کۆبوونەوەی ڕۆژانە سیستەمی خۆیان ئاوابکەن. بەهێزی راستەقینەی ئەشق بگەن. ئایا شتێکی لەمە هێژاو بەهادرتر دەبێ؟PAJKێك بەم هێزە گەیشتبێت گرفتێك نامێنێ نەتوانێ چارەسەری بکات. ئەرکێك نامێنێ نەتوانێ ئەنجامیبدات.

ئەوانەی خۆشمانی لەگەڵدابێت، لەوانەیە کەسانێك بڵێن ئەمجۆرە چەمکەی ئەشق لەراستینەی کوردو کوردستان ناژی. ئاماژە بەوەدەکەم کەئەم بۆچوونە شایستەی مێژووی گەلەکەمان نییەو لەگەڵی ناگونجێ. دابونەریتی داستانەکانمان لەگەڵ ئەو پێناسانە دەگونجێ کەمن پێشمخستن. واتە داستانەکانی مەمێ ئالان، مەم و زین و دەروێشی عەبدی کەلەچیاکانی بۆتان، سوبحان و شەنگالی نزیکمان روویداوە چەندەی بڵێی نزیك بەئیلاهیبوونن.

لەوانەیە بەهەنووکەییکردن و گونجاندنی داستانەکانی ئەشق لەگەڵ رۆژگاری ئەمڕۆمان زەحمەت بێ. هەروەکو دەزانرێ من و هەڤاڵانی شەهید بەشێوەیەکی قارەمانێتی، فیداکارانە خەباتکارێتی (کرێکاری) ڕێبازی ئەشقمان جێبەجێکرد. گوایە ئەوانەی ئارەزوویان لەئەشقە ئەگەر تاکو ئێستا لەبەهای ئەم هەوڵ و کۆششەم تێنەگەیشتوون یان کوێرن، یان فەسادو یاخود ساختەکارو خیانەتکارن. لەپێناو ئەشقدا چیترمان لێ چاوەڕوان دەکرێ؟.

لەئەرکە شۆڕشگێڕییەکاندا هیچ بەدوای بەدەستهێنانی سەرکەوتن ناڕۆیت، دواتر دەڵێی ئارەزووم لەپەیوەندی بەستنە !. ئاشکرایە کەئەمە هەڵوێستێکی بێشەرمانەیە. لەکوردستان ئەشق بەو رووداوانە ناچێ کە لەفیلمەکانی هۆلیوۆدو یەشیلچام دەبینرێ. بەئەندازەی بلیمەتی و دانایی سەرکەوتن پێویستی بەخوداوەندە ژن و پیاوەکان هەیە. تەنانەت چۆلەکەکانیش لەو شوێنانە هێلانە دروستدەکەن کەدەستی بیانیانی نەگەیشتوێ. ئایا ئەشق دەتوانێ هێلانە لەناو ئەو دڵ و شوێنانە دروستبکات کەتاقوڕقوڕاگە داگیرکراوە؟ هەرهێزێکی پەنای دەبەیتەبەر سەرەتا نازانم چی لەئەشقەکەت دەکات. ئەو ئەزموونەی پێیدا تێپەڕبووم نیشانیدام: بەبێ خیانەتکردن لەئەرکە شۆڕشگێڕییەکان، ئاستەمە بتوانی لەگەڵ ژنێکی سیستەمدا بژیت. دەشێ هاوسەرێتی هەرزان لەریزەکانماندا هەبێ. من ئەمە وەك پەیوەندییەکی کۆیلایەتی شرۆڤە دەکەم کەدەخوازێ بەردەوامی بەهەبوونی جەستەیی (نەوەیی) خۆی بدات. تاکە مەرجی ناوزەدنەکردنی ئەم هەڤاڵانە بەخیانەتکار، جێبەجێکردنی ئەرکە شۆڕشگێڕییەکانیانە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە. ئەگەر ئەرکە شۆڕشگێڕییەکانی بخاتە خزمەتی ئەم پەیوەندییانەی، ئەوەی رووەدەدات خیانەتە. تاڕادەیەکی مەزن مێژووی کوردان لەرێگای ئەم شێوازەی پەیوەندییەوە نقوومی خیانەتکراوە. رەخنەیەکی دیکە ئەوەیە هاوسەرێتییەکی سووك و هەرزان لەسەر حیسابی لەناوچوونی ئەشق پێکدێت. من هێشتا لایەنگری ئەنجامدانی شەڕی ئەشقم. ئەمە تەمەن و سنوور ناناسێ. هەروەکو جەختم لەسەرکردەوە کێ ئەشق بۆئاستی تامەزرۆیی زایەندی بێنێتە خوار، کەواتە خیانەتی لێکردووە. لەهەلومەرجی تێکۆشانماندا ئەشق ئەو باوەڕییەی ئومێد، حەسرەت، ئیرادە، هێزی تێگەیشتن، لێگەڕینی جوانی، بوێری و فیداکارییە لەئەرکەکانماندا کەتاوەکو دوایی بەشێوەیەکی شەرەفمەندانە لەشەڕو ئاشتیشدا پێویستییەکن. شەڕی وڵاتپارێزی، ئازادی و ئاشتی شەرەفمەندانە کەشەڕی ئەشقیشە لەراستینەی PAJK دا ئەو هێزە دەدۆزێتەوە کەبۆ سەرکەوتن پێویستە؛ ژنی ئازادو پیاوی ئازاد دەخولقێنرێن.

ب ـ لەرێکخستندا ئەوەی بەئەندازەی پارتێك تەنانەت زیاتریش وەك دەزگایەك پێویستە کۆما گەل (کۆنگرەی گەل)ە. بەگوێرەی رەوشی بەرجەستەی کوردستان "کۆنگرەی گەل" وەك رێکخستنێکی سەرەکی چەترئاسای گەل پێویستی بەپێناسەیەکی تایبەت بەخۆی هەیە. ئەگەر لەزۆر لایەنەوە هەوڵی پێناسەکردنی بدەین، بەر لەهەموو شتێك کۆنگرەی گەل بەگوێرەی راستینەی پارتێك واتایەکی جیاوازتری هەیە. لەکاتێکدا بواری ئایدیۆلۆژی پارتەکان لەپێشە، کۆنگرە لایەنی سیاسی لەپێشە. گوزارشتی ناسنامەی ئەو گەلەیە کەهۆشیاربۆتەوە، داوای مافەکانی دەکات و لەناو کاروانی ئازادیدا بەرێوەدەچێت. ئایدیۆلۆژیا، چین، رەگەز، نەتەوە، هزرو باوەڕییەکەی هەرچییەك دەبێت بابێت ئۆرگانی هاوبەشی بڕیارو چاودێریکردنی هەرکەسێکە کەئازادی بۆ وڵات و دیموکراسی بۆکۆمەڵگا بخوازێ. پەرلەمان نییە. لەگەڵ ئەوەی ئۆرگانێك نییە یاسای کلاسیك دەربخات، هێزی هەربڕیارو چاودێریەکیشە بۆ ئەوەی گەل لەناو یەکسانی و ئازادی ببێتە خاوەن ژیانێك. ئۆرگانێکی هەم یاسایی، هەم سیاسییە، گەورەترین ئۆرگانی گەلە کە لەتیشکۆی دەوڵەتدا ناخولێتەوە. لەگەڵ ئەوەی ئۆرگانێکی دەوڵەت نییە، بەڵام ئۆرگانێکی ئەلتەرناتیفی دەوڵەتیش نییە. لەسەرووی ئەو دەزگایانەوە دێت کە بۆ چارەسەرکردنی گشت کێشەکانی کۆمەڵگا پێودانگە دیموکراتییەکان بەبنەمادەگرێت. بوارەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، یاسایی، ژینگەیی، راگەیاندن و خۆپاراستن، کە لەجیاتی ئەوەی دەوڵەت ببێتە هێزی چارەسەری فورستری کردەوە، ئەم ئۆرگانە ئەرکی وەرگرتنی بڕیاری پێویست و چاودێریکردنی پراکتیزەکردنێتی، لەناوەوەو دەرەوە بەرزترین هێزی موخاتەبی گەلە.

دەبێ ئەو هەلومەرجە مێژوویی و سیاسییانە باش پێناسەبکرێ کەکۆنگرەی گەلی لەکوردستان هێنائاراوە. لەکاتێکدا لاوازی بۆرژوازی میللیگەرایی و پێکهاتە نادیموکراتییەکەی ئامرازێکی بەرێوەبەرایەتی لەجۆری کۆنگرەی گەلی کردە پێویستییەك، لەهەمانکاتدا هەبوونی دەوڵەتێکی نەتەوەیی سەرکوتکەر کەبەرامبەر دیموکراسی هەستیار نییە دەزگایەکی هاوشێوەی کردووە بەپێویستییەك. نابێتە دەوڵەتی گەل، بەڵام وەك ئۆرگانی بڕیاری دیموکراسی گەل کۆنگرەکەی مەرجە. روونتر بڵێین بەگوێرەی ئەوەی لەچارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی کوردستان دەوڵەتی میللی نابێتە ئامرازی چارەسەری گەل، سیستەمی کۆنگرە وەك گونجاوترین ئامرازی چارەسەری دەمێنێتەوە. بەگوێرەی ئەوەی لەژێر هیچ هەلومەرجێکدا گەل ژیانی کۆیلایەتی جاران پەسندناکات، هەروەها لێگەڕینی دەوڵەتی میللییش مەترسی قووڵکردنەوەی بێچارەیی لەخۆوە دەگرێت، ئەوا گونجاوترین ئامرازی چارەسەری دیموکراتییانە کۆنگرەی گەلە.

سەرەکیترین پرس کەپێویستە پرسیار بکرێ ئەوەیە، ئایا دەشێ دەوڵەتی نەتەوەیی و دیموکراسی گەل بەیەکەوە لەئارادابن. لەچەندین وڵاتی ئەوروپاو پێکهاتەی فیدراڵی ئەمریکا چەندین نموونەمان بەرچاو دەکەوێ کە وەڵامی ئەرێنیمان (پۆزەتیف) دەدەنەوە. هەرچەندە دەوڵەتی میللیگەرایی بۆرژوا، بەشێوەیەکی زێدەڕۆ سنوورەکانی دیموکراسی بەرتەسك بکاتەوە، دیسان گۆڕەپانێکی گرنگی دیموکراسی بۆ گەل دەمێنێتەوە. دەوڵەتەکانی حوکمڕانی سەرکوردستان، لەسەرووی هەمووشیانەوە تورکیا، بەهۆی پێکهاتەی ناوەندی (یونیتار)ی سنوورنەناسیان، شانسێکی ئەوتۆ بۆ ئیرادەی دیموکراسییانەی گەل نارەخسێنن. گوێپێنەدان و بەرکەنارکردن سیاسەتی سەرەکی ناوخۆیە. ئەم رەوشەش بەردەوام یاخیبوون و سەرکوتکردنی گەل لەگەڵ خۆی دێنێتەئاراوە. بەئامانجی کردنەوەی ئەو گرێکوێرەیەی هاتۆتە ئاراوە، دەبێ دەسەڵات و هێزی بڕیارگرتنی کۆنگرەی گەل پێشبخرێت. تاوەکو دەوڵەتە حوکمڕانەکان بەرەو رێککەوتن دێن، بەردەوام پێشخستنی دەزگا دیموکراتییەکانی گەل کەلەدەرەوەی دەوڵەتن ئەرکێکی دەستلێبەرنەدراوە. هەنگاونەنان بەئاراستەی میللیگەرایی و ئاواکردنی دەوڵەتێکی رکابەر، پێویستی بەملکەچکردن بۆ ستاتۆی هەنووکەیی نییە. بەپێچەوانەوە بۆئەوەی ململانێی میللیگەرایی دوولایەنە بەربەست بکرێ، بەردەوام پێویسی بەپێشخستنی کۆمەڵگای مەدەنی و ئامرازەکانی دیموکراسی هەیە. تەنیا هێشتنەوەی کێشە گەورەکانی کۆمەڵگا بۆ ئەو دەوڵەتەی پێشتر ئاواکراوە یان تازە ئاوادەکرێ رێگا لەپێش زیاتر گەورەبوونیان دەکاتەوە. بەسانایی دەوڵەتی

تازە ئاواناکرێت، ئەگەر ئاواشبکرێت ناتوانێ کێشەکان چارەسەر بکات. بیست و دوو دەوڵەتی عەرەبی ئاواکرا، کێشەکانی عەرەب لەجارانیش قورستر بۆوە. ئەو کێشانەی دەوڵەتە نەتەوەییەکانی ئەوروپا خوڵقاندییان، تەنیا لەرێگای یەکێتی ئەوروپاوە کەوتۆتەسەر رێڕەوی چارەسەری. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گوزارشت لەیەکێتی دەوڵەتی 52 ویلایەت دەکات. واتە زۆربوونی دەوڵەت لەچارەسەرکردنی گرفتەکان زیاتر، رۆڵی زیادکردنی کێشەکان دەبینێ. دیسان کاتێك دەوڵەتی کۆن توانستی چارەسەرکردنی بەدەستەوە نەما، سەرەکیترین ئامرازی چارەسەری پەنای دەبردرێتەبەر کۆنگرەی گەلە کەدیموکراسییەتێکە لەتیشکۆی دەوڵەتدا نییە.

وڵاتە پێشکەوتووەکان دوای ئەزموونی شەڕێکی درێژخایەن ئەم مۆدێلەیان پێشخستووە. دەوڵەتەکانی دیکە هێشتا لەدەرککردن بەم شێوازەی چارەسەری دوورن. ئەم شێوازە بەقەرەبوودان لەدەوڵەتی ناوەندی لەقەڵەمدەدات. لای ئەوان تاوەکو رزین و پووکانەوە درێژەدان بەدەوڵەتی نەتەوەیی ناوەندی بەواتای وڵاتپارێزی و وابەستەیی پیرۆزدێت بەدەوڵەتەکەیان. هەروەکو لەیۆگسلافیا، ئێراق و تەنانەت دوورگە بچووکەکەی قوبرس بینرا، ئەمجۆرە چەمك و بیرۆکانە لەکۆتاییدا رووبەڕووی ئەنجامێکمان دەکاتەوە کەچاوەڕوانی نەدەکرا. کۆماری تورکیا هێشتا لەتێگەیشتنی رۆڵ و ئەرکی دیموکراسی دوورە. بەردەوام وەك رکابەرێکی خۆی دەبینێ. سەرباری ئەوەی لەدامەزراندنی کۆماردا کوردان ئەندامی بنەڕەتی بوون، بەڵام کۆمار لەو باوەڕەدایە کەلەرێگای نکوڵیکردنەوە لەکێشەکە رزگاری دەبێت. ناخوازێ لەرۆڵی مێژوویی و ئەمڕۆی کوردان تێبگات و دانی پێدابنێت.

بەسووربوونەوە دووەمین مۆدێلی ئێراق و یۆگسلافیا دەسەپێنرێ. لەمەشدا بڕوای بەگەورەیی وڵات و هێزی سەربازییەوە هەیە. کەچی ئەگەر ئەوە بەراوردبکرێ کەبەگوێرەی ئەوەی ئێرلەندای بچووك بەرامبەر ئینگلتەرا، چاچانەکان بەرامبەر روسیا چیانکرد، ئەوا باشتر دەرك بەرۆڵی کوردان دەکات. کاتێك بە ئەندازەی بەردەوام نەبوون و کورتخایەنی رێگەچارە سەربازییەکان بەها قورسەکەشی رەچاوبکرێت، ئەوا دەرك بەوەدەکەن کەپێشخستنی رێگەچارەی دیکە چەندە بایەخدار و گرنگە. چل ساڵ قوبرس لەناو بێچارەییدا هێڵدرایەوە، چ دەسکەوتێکی لێکەوتەوە؟ زیانەکانی هێندە زۆرن کە لەژمارنایەن.

لەکاتێکدا بەرەو چارەسەری کۆنگرە دەچین، پێویستە بەشێوەیەکی کاریگەرو سەرنجڕاکێش رۆڵی ستراتیژی کوردو کوردستان نیشانی دەوڵەت و کۆمەڵگای تورکیا بدرێ. ستاتۆیەکی کوردستان کەبەرامبەر تورکیا بەکاربهێنرێ بەردەوام دەبێتە کێشە، زیانی ئابووری و هەڕەشەیەکی سیاسی و سەربازییە. ئەمە مسۆگەر بووە کاتێك دەوڵەتی فیدراڵی کوردی میللیگەرایی ـ خێڵایەتی لەباشووری کوردستان ئاوابکرێ ئەوا کاریگەرییەکەی هەمیشەیی دەبێت. هەربۆیە ستاتۆی ئێستای کوردستان بەخێرایی بەو رەوشە گەیشتووە کەدژی کۆماری تورکیا کێشە بخوڵقێنێ. ئەگەر رێگەچارەی دیموکراتییانە نەگیردرێتەبەر ئەوا بزووتنەوە نەتەوە پەرستییەکان دەبنە ناچارییەك. فۆناخێکی بەمجۆرەش دەبێتە ئیسرائیل ـ فەلەستینێکی نوێی پەنجا ساڵی. ئەمجارە ئەوەی لەزووەوە لەئێراق روویداوە، هەروەها ئەو مەترسییەی کە لەئەنجامی ئەزموونی "PKK" لەتورکیا روویداو هەروەکو دەزانرێ دژواربوو، ئەمجارە لەمیانەی ئامادەکاری و پلاننامەی بەرفراوان بەشێوەیەکی بەربڵاوترو دژوارتر دەکەوێتەگەڕ. لەوانەیە دەوڵەت بڕوای بەسیاسەتی باوی سەرکوتکردن بێ. بەڵام تەواو نازانرێ کەپرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوینی گەورە چی لەگەڵ خۆی دێنێ. سەری بۆ هەرجۆرە مەترسییەك کراوەیە. وەرگەڕانی رۆڵی ستراتیژی کوردان بەرامبەر بەتورکیا، ئەنجامی زۆرگرنگ لەگەڵ خۆی دێنێ. چەندین گفتوگۆو داواکاری سەبارەت بەتورکیا دەکاتە رۆژەڤ. کاتێك ئەمە رەچاوبکرێ کەتەکتیکی سەرکوتکردن و خەڵەتاندن خێرا ئەنجامگیرنابێ، ئەوا ئاشکرایە کەهەڵگیرسانی ئاگرێکی نوێ دەبێتە مەترسییەکی چاوەڕوانکراو, ئینجا ئەمە کورتخایەن بێ یان درێژخایەن.

ئیتر لەمە بەدواوە دەبێ ئەوە پشتگوێ نەخرێ و ڕەچاوبکرێ کەهەر هێزو دەوڵەتێك لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەمریکاو ئیسرائیل ڕۆڵی ستراتیژی کوردان هەڵدەسەنگێنن. ئاسوودەبوون لەمیانەی پەسندکردن و سەپاندنی تیرۆریستی "PKK" بەسەر دونیا خۆخەڵەتاندنە. بە پێچەوانەوە ئەمە هۆشیارکردنەوەی جیهانەو سەبارەت بەتورکیا کردنیانە بەخاوەن داواکاری. ئایا لەم پێناوەدا قەرەبووی سیاسی و ئابووری کەم پێشکەشکرا؟ ئاشکرایە کە ئەمە ڕێگایەکی چەوتە. هەروەها کوردان بەهیچ شێوەیەك شایستەی ئەمجۆرە مامەڵەیە نین. دیسان پێشکەوتنێکی سامناکتر، لەم زووانە شتیتری دێتەسەر ئەو دەوڵەتە فیدراڵییەی تورکیا لەپێناو شەڕکردن دژی بزووتنەوەی ئازادی کە "PKK" ڕێبەرایەتی دەکات دیاری هێزە خێڵایەتییەکانی کوردانی کرد. لەباکووریش بۆئەوەی کوردان نەبنە لایەنگرو هەواداری "PKK"بەوە نەوەستا کەنزیکەی سەد هەزار جاشی مووچەدار چەکدار بکات، بەڵکو لەناو دەوڵەتدا پێگەیەکی زۆریش بەسەرپەرشتیاری تەریقەتە میللیگەرا سەرەتاییە دواکەوتووەکان بەخشی. ئەم هێزانە دەرفەتی دروستبوونی دووەمین ئێراق دەرەخسێنن. هەروەها ئەمە لەگەڵ تەواوی بنەماکانی کۆمارگەرایی و دیموکراسی ناکۆکە. کوردستانێك کەئابوورییەکەی ئیفلیجکراوە ئەگەر بەرامبەر تەواوی ئەم گۆڕانکارییانەی نەتەڤێتەوە چی بکات؟.

لەڤۆناخی ئیمرالیدا بۆ بەلاوەنانی ئەم داسەپاندنە بێواتایە هەوڵ و کۆششمان دا. نازانرێ تا چ ڕادەیەك دەرك بەمەکرا. حکومەتە نوێکەی پارتی دادو گەشەپێدان (AKP) بەشێوەیەك کێشەکە بەبێدەنگی تێپەڕدەکات کەهیچ حکومەتێك نەیتوانیوە. وەها مەزندە دەکات لەمیانەی بەجێکردنی هێزی تەریقەتی نەقشبەندی لەناو دەوڵەتدا دەتوانێ کێشەی کورد بەربەست بکات. لەهەڵبژاردنەکاندا دەوڵەت هەمووجۆرە یارمەتییەکی بەم هێزانە بەخشی بۆئەوەی هەڵبژێردرێن. هەڵەیەکی ستراتیژی دەکرێ، کاتێك لەم زووانە ئەنجامەکەی بەدەرکەوت بەرپرسیارەکان دەکەونە ڕەوشێك ناتوانن حیساب بدەن.

لەتورکیا کۆسپی گەورە خرایە بەردەم لێگەڕینەکانمان بۆ چارەسەرییەکی دیموکراتییانەی هاوبەش، ئاشکراش بوو کەدەوڵەت سەرچاوەکەی بوو. هەم لەناوەوە هەم لەدەرەوە کۆسپ خرایە پێش یەکێتی هێزە دیموکراتییەکان. لاتەریککردنی دیموکراسیخوازەکانی کوردانیان وەك پێویستییەکی ئاسایشی میللی لەقەڵەمدا. تەواوی ئەمانە هەڵەیە؛ سووربوونە لەسەر پاراستنی ستاتۆو بێچارەیی. وەها مەزەندە دەکەن گەلی کورد ناتوانێ ڕێگای خۆی دیاری بکات. چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە دەکرێت لەژێر سایەی برسێتی و ستەمکاریدا تەسلیم ببێت. هێزەکانی ئاسایش و دیپلۆماسی تاوەکو ئێستا لەپێناو ئەم ئامانجەی شانبەشانی ئابووری و سیاسەت، سیاسەتە کۆمەڵایەتییەکانیش پراکتیزەدەکەن. هەموویان لەژێر سایەی یەك ستراتیژیدا، لەمیانەی دووڕیانی یان تەسلیمبوون یان مردن گەل ڕووبەڕووی یەکتر دەهێڵێتەوە. حکومەتی A K P هێزی ئایین و تەریقەتەکانیشی خستۆتە سەر ئەم سیاسەتە. ئەو ئاستەی پێیگەیشتووە هەم هاندەرو بزوێنەرە، هەم سووربوون لەسەر چەقبەستبوون نیشاندەدات. تەواوی بانگەوازییەکانی "ئاشتی و چارەسەری دیموکراتییانە" بێ وەڵام مایەوە. هەڵوێستێك کە لەهیچ بزووتنەوەیەکی هاوشێوە چاوەڕواننەکراوەو سوودی بۆ هەموو لایەنێك هەیە بێ وەڵام مایەوە. ئومێدیان یەکینەکانی ئەمریکا لەئێراق و پارچەبوونی "PKK" بوو. کاتێ چارەسەرییەکی دیموکراتییانەی هاوبەش پێشنەکەوێت، ئەو چارەسەرییەی دەکەوێتەگەڕ پۆزەتیڤ ترینیان دەبێتە پێشخستنی دیموکراسی خۆمانە, لەمیانەی هێزی خۆییەوە، ئیتر ئەوەی دەکەوێتە ڕۆژەڤ ڕێگەچارەی کۆنگرەیە.

پێویستە گەلی کوردستان لەتەواوی پارچەکان و دەرەوەی وڵات لەپێناو چارەسەری کۆنگرە سەفەربەر بێت. لەو چوارچێوەیەی پێناسەکرا بەرامبەر بەدواگروپی دەرکەوتووە کۆبوونەوەی کۆنگرەی نائاسایی کۆنگرەی گەل جێگای باسە. کۆنگرە بەشێوەیەکی بەرفراوان گۆڕانکارییە ناوخۆیی و دەرەکییەکان هەڵدەسەنگێنێ. بڕیارەکانی پێویست سەبارەت بەمەسەلە

ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، یاسایی، ژینگەپارێزی، راگەیاندن و پاراستنی خود وەردەگرێ. کۆنسەیەکی بەڕێوەبردن ئەرکدار دەکرێت. چاوەڕوانیکردنی پارچەبوون خەیاڵێکی پووچە.

ئیتر لەهەر پارچەیەکی کوردستاندا بەتەواوی ئەو هێزەی هەیەتی لەپێناو چارەسەری, کۆنگرە خەبات دەکات. لەجیاتی ئەو پەرلەمانە نیشتمانییەی داخراوەو پارتە سیاسییەکانی قەدەخەکراون بەڕێوەبەرایەتییە خۆجێییە دیموکراتییەکان سەفەربەردەکرێت.

لەهەر گوندو گەڕەکێك یەکینەکانی بەڕێوەبەرایەتی خۆیی هەڵدەبژێردرێ و دەکرێتە بەرپرسیار.

لەمیانەی رێگەچارەی دیموکراتییانەوە تەواوی ژیانی گەل رۆشندەکرێتەوە. رێگە درێژخایەنەکانی چارەسەری نیشاندەدرێ. هێزی بڕیاری کۆنگرە لەژێرسایەی هەلومەرج و تواناکاری گونجاودا پراکتیزە دەکرێ. چەندەی بکرێ پەروەردەی خودی گەل ئەنجامدەدرێ. گەل وەك سوالکەرێکی دەوڵەت بەجێناهێڵرێت. دەرفەت بەو یاریانە نادرێ کە لەرێگای برسیکردنەوە گەل راو دەکات. کاتێك هێرش بکرێتە سەر مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە کولتوورییەکان خۆی دەپارێزێ. چۆلکردنی گوندی نوێ بەربەست دەکرێ، ئەوانەی پێشتریش چۆلکرابوون سەرلەنوێ ئاوەداندەکرێنەوە. لەرێگای هەمووجۆرە هاوکارییەکەوە تەگبیر بەرامبەر بەبرسێتی وەردەگیردرێ. لەهەموو بوارێکەوە رێکخستنی نوێ پێشدەخرێت. هەنگاو بۆرێکخستنێکی بەرفراوانی کۆمەڵگای مەدەنی دەهاوێژرێ. قوتابخانەکانی پەروەردەی دیموکراتییانە لەهەر گۆڕەپانێکی نیشتەجێبوونی دانیشتوان سەبارەت بەبابەتی دیموکراسی گەل پەروەردە دەکات.

رێگەچارەی کۆنگرە لەگەڵ هەر دەوڵەتێك بۆچارەسەری ئامادەدەبێت. لەجێگای فشاری میلیگەرایی و نکوڵێکردن، بەسووربوونەوە ئاشتی و برایەتی بەبناخە دادەنێت، ئەوبژارانە دەسەپێنێ کەجوداخوازی و توندوتیژی لەخۆوە ناگرێت. هەروەها ئەوە نیشاندەدات کەبەرامبەر هەر هێرشێك دەتوانێ خۆی بپارێزێ. تەواوی ئەم کۆششانە نەك جوداخوازی, بەڵکو بەواتای تۆکمەکردنی یەکێتییەکی راستەقینەدێت. بەسووربوونەوە جەخت لەسەر ئەوەدەکرێتەوە کەبەرپرسیارانەترین رێگایە بۆ دەرفەت نەدان بەتراژیدیای نوێ. چەندەی دەوڵەتەکان هەوڵی سەرکوتکردنی ئەمجۆرە کۆششانە بدەن، ئەواخۆی بەهێزتر دەکات و وەڵام دەداتەوە. ئەو گەلەی لەژێر هەلومەرجێکی زۆر سەختدایە لەهەموو کاتێك زیاتر بەرێکخستەیەو خاوەن هۆشیارییەو چالاکی دیموکراتییانەی خۆی بەرزدەکاتەوە. تائەو رادەیەی نەکەوێتە ناو هەوڵەکانی میلیگەرایی و پیلانگێڕی، لەئەنجامدانی هەمووجۆرە چالاکییە کۆمەڵایەتی، سیاسی، یاسایی، هونەری، راگەیاندنی و پاراستنی خود دوودڵ نابێ. لەکاتێکدا هێڵە گشتییەکانی قۆناخی نوێ بەمجۆرە دیاریدەکەین کەبەرێگەچارەی کۆنگرە پێناسەمان کرد، ئەوا بەرلەوەی تراژیدیا سەرهەڵبدات بانگەوازی بۆهەرکەسێك دەکەین هەستیاربێ و لەپێناو چارەسەری کۆمەك بکات و رۆڵ ببینێ، ئەمەش بەئەرکێکی مێژوویی دەبینین. شانبەشانی ئەو کورتە هەڵسەنگاندنەی سەبارەت بەپێناسەو پێشکەوتنی کۆنگرەی گەل ئەنجامماندا پێویستە بەشێوەیەکی وردتر هەندێ بابەت تاوتوێ بکەین.

مەسەلەی یەکەم، کێشمەکێشی دەسەڵاتی ناوخۆیە کە لەیەکەمین کۆبوونەوەی کۆنگرەی گەلدا دەستیپێکردووە. لەکاتێکدا گۆڕانکاری ـ وەرچەرخانێکی مەزنی تیۆری، سیاسی و پراکتیکی بۆ چارەسەری دیموکراتییانە رەخساوە. ئەو هەڵوێستانەی سەریانهەڵداوە، بەشێوەیەکی زۆر بوێرانە روونەبێتەوە کەلەراستیدا دەرك بەوە نەکراوە کەسیاسەتی دیموکراتییانەو سیاسیبوون لەناو "PKK"دا بەچ واتایەك دێت و یاخود چۆن بەلاوەنراوە. پێشتر جەختم لەسەر ئەوەکردبۆوە ئەوجۆرە شێوازەی ئەزموونی سیاسی کەبۆتە مولکی چارەگە تەمەنێك پێویستی بەشیکردنەوەیەکی چڕو رەخنە ــ رەخنەدان هەیە. هێزی ئەم هەڵوێستە پێرپێریەتی دەسەڵات (احباب چاوشی) نیشاندەدات کەرێسا ناناسێ، گوێ بەهەلومەرج نادات، دەرك بەوە

ناکات چی لێدەکەوێتەوە، لەناوەڕۆکدا سیاسی نەبووەو ئەماتۆرە. تایبەتمەندێتی ئەو کەسایەتییانەش نیشاندەدات لەجیاتی سەرکەوتن لەئەرکەکاندا خۆی دەخاتە ناو قاڵبە ئایدیۆلۆژییەکان، یاخود خۆی خستۆتە ناو ئارەزووی هەرزانەوە.

لەم هەڵوێستانەدا بیانی و بێ ئاگا نیم. دەشێ وەك بەردەوامی هەڵوێستی ئەو کەسایەتییانە ببینرێ کە لەپێکهاتەی یەکەمین گروپی ئاواکردنی "PKK"دا ئەم شێوازانە دەستییپێکرد، لەدوای راگەیاندنی پارت بەردەوام بوو، لەقۆناخی 15 ی ئاب کەوتوونەتە ناو هەڵوێستێکی تادواراده کەیفی (میزاجی)یەوە کەتائێستا روونەکراوەتەوە، لەقۆناخی 15 ساڵەی شەڕیشدا بەهیچ جۆرێك بەرپرسیارێتییان جێبەجێنەکرد. هەڵەی منیش ئەوەیە، لەژێرناوی "رزگارکردنیان" تادواراده بەشێوەیەکی هەڤاڵێتی لەچوارچێوەی راستینەی دەزگاو رێساکان هەڵوەستەم لەگەڵ کردن. بەردەوام لەمیانەی لۆژیکی "دەبنە خاوەن ئەزموون و چاك دەبن" لێیان نزیکدەبوومەوە. ئەنجام ئەو رەوشە بوو کەتێیکەوتم.

دیسان لەقۆناخی ئیمرالیشدا بەهەڵە هەڵسەنگاندنی رەوشی من، لەمن زیاتر بۆ ئەوکەسانە جێگای ئێشەو پەژارەیەو بەهایان دەکەوێ، کە کەوتوونەتە ناو ئەم هەڵوێستانەو بەهەرزانی بوونەتە ئامراز. کەچی ئاگادارم کردبوونەوەو چەندین نموونەم نیشاندابوون. دوای پارچەبوونی لاشەم دەتوانن هەندێ شت بکەن؛ هەندێ شتیش هەیە لەژێر خاکیش بم ناتوانن ئەنجامی بدەن؛ دیسان دووبارەی دەکەمەوە ئەی نەمگوتبوو: تەنیا بتوانم هەناسە بدەم هەندێ شت هەیە ناتوانن بیکەن. شاخەکان لەدوو بواردا کاریگەریان هەیە: هەم بۆ ئازادکردن، هەم بۆ بەئاژەڵکردن. دیارە لایەنی ئازادکردنەکەی بەهەڵە هەرسکراوە. هەم "PKK"، هەم دەوڵەتە پەیوەندیدارەکانم ئاگادار کردبۆوە. یاریکردن بەمن سوودی بۆهیچ کەسێك نابێ. هەرگیز لەو ناسنامەیەم ناکەومە گومان کەلەبەرامبەر راستییەکان هەرشتێکی لەتوانایدا بووبێت کردوویەتی. هەرچەندە وەکو یەکێکی پێچارەو داماو ببینرێم، بەڵام داخوازی ئەوەشم کردبوو تاوەکو بزانرێ کە وەها نیم. هەروەها داخوازی زانینی ئەوەشم کردبوو ئەگەر بەشان و شەوکەتیش نەبێ، ناتوانرێ بەبێ کەرامەت دابنرێم. بەڵام لەپێناو شێوازی شەڕو ژیانی خۆیان لەهۆش خۆ دەچوون. دیسان دەردەکەوێت ئەوەی بەشێوەیەکی پێگەیشتوو و ئاقڵانە رەفتاری کردووە خۆم بووم، هەر دەبووایە خۆم بم.

راستینەی کۆنگرەی گەل بەردەوام دەبێت کە لەدەرەوە دەوڵەتەکان، لەناوەوەش "لایەنەکان" خواستیان لە پەلوپۆی بخەن، بادەوڵەتەکان بۆدواتر بەجێبهێڵین. ئەوانەی خۆیان بەلایەن بەناو دەکەن نابێ بۆ ساتێکیش لەبیربکەن کە تاکە شتێك دەتوانێ رزگاریان بکات. ئەویش راستینەی سەرکەوتنە لەجێبەجێکردنی ئەرکەکانی سەرشانیان. کارچەندە قورس، گرنگ یاخود سادەو بێ بایەخ بێت، بەپیرۆز پەسندکردنی لەپێناو سەرکەوتنە. من بانگەشەی ئەوە دەکەم: تۆ بڵێی ئەوانەی رێگایان لەپێش ئەم رەوشە کردۆتەوە خاوەنی ئەو مەردایەتییەبن بۆ تاکە رۆژێکیش بێ بۆرزگارکردنی کەرامەتی شۆڕشگێڕی خۆیان بەهای ئەو خەبات و کۆششەمان بزانن کەئەنجاممانداوە؟ لەکاتێکدا من لەکونێکی دوو سانتیمەتری بەئاستەم هەناسە دەدەم و لەپێناو ئەو بەهایانە لەشەڕی پاراستنی کەرامەتی گەلەکەمان هەوڵی ژیاندەدەم، بەهەزارو یەك زەحمەتییەوە هەوڵدەدەم یەکێتی و ئارامی و پەیکەرو ئیرادەم پەرتەوازە نەبێ ـ رووبەڕووی ئەو زەحمەتییانەی تەنانەت ناقوڵاترین کەسایەتیش دوای سێ رۆژ کۆتایی بەژیانی خۆی دێنێ ـ تۆبڵێی ئەم هەڤاڵانە چۆن کەرامەتی خۆیان دەپارێزن، بەشێوەیەکی ئاقڵانەو هەوڵێکی سەرکەوتووانە دەتوانن ئەنجامی بدەن؟.

لەم پێناوەدا بیرمان کردەوەو پێشنیازمان کرد. بڕوام بەوە هێنابوو لەمیانەی بەدەزگابوونێکی لەجۆری کۆنگرەی گەل لەنوێبوونەوەیەکی راستەقینەدا سەردەکەون و کەرامەتیان دەپارێزن، چاوەڕوانیم دەکرد. پێویستە شتێکی دیکەشتان بێنمەوە یاد: گوایە ئەمجۆرە شەڕانەی دەسەڵات پیسترین مردن لەگەڵ خۆیدادێنێ. باهیچ ئارەزووی لێنەکەن. لەکاتێکدا ئەرکی مەزنی بەقەدەر شاخیان لەپێش وەستاوە، ئایا مرۆڤ دەتوانێ ساتێکی خۆشی بۆ ئەم "یاریانەی بێزەنتییەکان" تەرخان بکات؟.

جارێکی دیکە لەمیانەی گووتەکانی تاوانبار ــ بێتاوان، تەنانەت سیخوڕ ــ ئاژاوەچی و کودەتا بیانوو نەبینینەوەو شتەکان روونمەکەنەوە. تەنانەت بەمجۆرەش بێت، نابێ پێڕەو لەپەلوپۆخستنی چارەنووسی گەلێك بێت. دووچاری سەدان نموونەی بەمجۆرە هاتم. بەڵام نەمهێشت تاکە لەکەیەکیش بەئەرکەکانی ئەو ساتەوەختە بکەوێ. هیچ کەسێك بەئەنقەست ناکەوێتە ئەم شەڕەوە کەدەزانێ دەیدۆڕێنێ. ئەم لایەنانە کاتێك بە ئەنقەست کەوتنە ناو شەڕێك کەنەك تەنیا خۆیان، بەڵکو هەموو کەسێك و گەلەکەمان دووچاری زیان و دۆڕاندن دەکات چ ئومێدێکیان هەبوو؟ تەنانەت لایەنێك سەرکەوێت، لەخیانەت خراپتر بیریان لەوە کردۆتەوە کە ئەم دەسکەوتانەی چۆن هەڕاج دەکات؟

لایەنی سەیرتری مەسەلەکە ئەوەیە، چۆن جورئەتیان کرد بەناوی من، لەناو گۆشگیریدا بمخەنە ناو گۆشەگیرییەکی دیکە کەتێکەیشتنی ئاستەمە. پێویستە ئەو ناسنامانە خۆیان بناسن و بەشێوەیەکی راست ئەم مەسەلەیە روونبکەنەوە. مرۆڤ چۆن ئەو دایکەی شیر بڕدەکات کە رۆژانە مەمەی دەمژێت؟ باسی چیرۆکی شەڕی خۆم بۆکردن لەگەڵ دایکم. دەرکی پێدەکرێت و هۆکاری مێژوویی خۆی هەیە. ئەی هۆکاری ئەم هەڤاڵانە چییە؟ نەدۆست نەدوژمن شتێکی لەبارەی بێ بەهابوون و بێ بایەخی من نەگوتووە. ئەی ئەم ناسنامانە پشتئەستوور بەکێ و بەچی باسی بێ بایەخیم دەکەن، یان دەخوازن وەهام لێبێت؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە بۆ پێشکەوتنیان زۆر گرنگە.

بەبیر ئەوکەسانە دێنمەوە کە کەوتوونەتە ناو ئەم رەوشەوە، یان لەوانەیە بەزانینەوە یان نەزانینەوە بکەونە ناو پێگەیەکی هاوشێوەوە. بەشداریکردن لەدۆزی کەرامەتی گەل پێویستی بەمرۆڤی شەرەفمەند، خۆبەخت و خاوەن بانگەشەهەیە. ئەم توانستەیان نەبێت بالەسەرەتاوە بەشداری نەکەن، پلەوپایە وەرنەگرن. باهیچ کاتێك لەبیرنەکەن کەگەڕان بەدوای کورسی و دەسەڵاتخوازی دوژمنایەتیکردنی دیموکراسییە، بەبێ پایەش نەوەستن. چونکە ئەویش نەبوونی بانگەشەیە. نکوڵی لەوەش دەکەن کە بەشێوەیەکی گونجاو رەفتار لەگەڵ دیموکراسی نەکراوە؟ دەرفەتی بەدوا داچوونی هەندێ گۆڕانکاریم بۆرەخسا. ئەو پێڕەوانەی پراکتیزەکراون، تەنانەت پادشاکانیش پەیڕەوی ناکەن. شکاندنی ئیرادەی گەلێکی ئامادە چۆن روونرەکرێتەوە؟ چۆن دەتوانن تاوەکو ئێستا لەمیانەی داخراوبوون بەرووی دیموکراسی لەناو ئێمەدا بژین؟ ئیتر پێویستە لەدیموکراسی تێبگەن. گەورەترین کادیرە کۆنەکانی تورکیا لەمیانەی دیماگۆژی و دەسپۆتیزمەوە ناتوانن سەربکەون. لەرێگای ئەو هەرزەکارانەوە چیتان لەدەستدێت کەهێشتا مووشیان لێنەهاتووە؟ بەزەحمەتییەوە ئەم دێرانە دەنووسم. دەخوازم لەمجۆرە شرۆڤانە رزگارم بێ.

دڵنیام کەئەم هەڤاڵانە لەجێگای من بووانایە چل جار یەکێکی وك منیان پاکتاودەکرد؛ بەڵام من دیسان لەگەڵیاندا درێژە بەکاروانەکە دەدەم. بەڵام ئەوەشی لێ زیاددەکەم: یاری لەگەڵ من مەکەن. چونکە بەشێوەیەکی سامناك پەرێشان دەبن.

لەرەوشێکی وەهادا نیم بتوانم روونکردنەوەی زێدە سەبارەت بەچەندایەتی و چۆنایەتی کۆنگرە ئەنجامبدەم. جگە لەوانەی ئاماژەم پێکردووە دیسان پێشنیازی خۆم سەبارەت بەهەڵبژاردنی ساڵانەی سەرۆکایەتی دووبارە دەکەمەوە، دوای ئەوەی دووخول لەسەریەك هەڵبژێردرا، تەنیا دوای تێپەڕبوونی دوو ساڵی دیکە دەتوانێ خۆی کاندید بکاتەوە، ئەمەش وەك حوکمێکی گرنگی پەیڕەوی دیموکراتییانەی دەبینم. ئەگەر ساڵانەش نەکرێ، دوو قۆناخ گونجاوە. بەڵام لەپارتی و ئەو دامەزراوانەی پێویستی بەپسپۆڕی هەیە دیاریکردنی ماوە پەیوەندی بەرەوش و پێگەی کەسایەتییەوە هەیە.

ئەنجامدانی کۆبوونەوە گشتییەکانی ساڵانەی کۆنگرە لەچەند هەفتەیەکی مانگی نیساندا بەگوێرەی نەریتە مێژووییەکانیشمان گونجاوە. ئەم پێشنیازەش دووبارە دەکەمەوە. ئێستا یان لەداهاتوو دەتوانرێ شارێکی کۆنگرە دەستنیشان بکرێت. ئەمەش هێزو جددیەتی کۆنگرە دیاری دەکات. دەستەکانی کارگێڕی، دیسپلین و سەرۆکایەتی مەسەلەیەکی گشتییە کەلەلایەن کۆنگرەوە هەڵدەبژێردرێ. لەهەڵبژاردنی دەستەی کارگێڕی دەبێ گرنگی بەپێوانەکان و ئاستی بڕیاربوونی

هەڵبژێردراوان بدرێ. بەشێوەی حەوت کۆمیتە پێشنیازی خەباتی کارگێڕی (بەڕێوەبەرایەتی)م کردبوو. دەتوانێ هەم لەناوەوە هەم لەدەرەوە ئەندامەکانی هەڵبژێرێ. جگە لەمە لەو قۆناخانەی کۆنگرە لەحاڵەتی کۆبوونەوەدا نییە، بەرامبەر بەو حەوت کۆمیتەیەی خەبات دەکات، دەتوانێ حەوت کۆمسیۆنی ئامادەکردنی بڕیار لەناوخۆیدا هەڵبژێرێ. ئەمانە لەسەربنەمای لێکۆڵینەوە کۆمەك بەبڕیارو چاودێریکردن دەکەن، پێشنیاز ئامادە دەکەن. بەگوێرەی تایبەتمەندێتی هەر کۆمیتەیەك دەشێ ڕێکخستنەکانی لەشێوازی کۆمەڵە، قوتابخانەو یەکینەکانیان پێوەگرێبدرێت. بەشێوەی هەرەم ئاسا بەرەوخوار دەتوانرێ گرێدراوی کۆمەڵی قوتابخانەو یەکینەکان، بەگوێرەی بنەماکانی، ناوچە، خۆجێیی، گەڕەك و گوند یەکینە ئاوابکرێن. لەهەموو دیموکراسییەکدا پێویستی بەکۆمۆنەکانی گەڕەك و گوندەکان هەیە. لەمیانەی ئەم قاڵبانەی ڕێکخستنەوە تاکێکی جەماوەر نامێنێ کە کۆنگرە دەستی پێنەگات و ڕێکینەخات. بەگوێرەی ڕەوش دەتوانێ ڕێگا یاسایی و نایاساییەکان تاقیبکاتەوە. دەبێ یاساییبوون بەبناخە وەربگیرێت. تەنیا لەمیانەی ڕێکخستنی کۆنگرەوە دەتوانرێ ئیرادەی پارت بەجەماوەری بکرێت. دەشێ یەکینەکانی پاراستن وەك ئەو یەکینانە پێناسەبکرێن کەگرێدراو بەبڕیارەکانی کۆنگرە پێشدەخرێ و دەپارێزرێ. پەیوەندی لەگەڵ پارتە یاساییەکان دەشێ لەئاستی هەواداریدا بێت. بەڕێوەبردنی دامەزراوە یاساییەکان لەڕێگای فەرمانەوە ڕاست نییە. جێگیربوون و دابەشکردنی ئەندامەکان بەگوێرەی بنەماکانی ئەرك و ئاسایش ئەنجام دەدرێ و بڵاودەکرێتەوە. تەواوی ئەم مەسەلانە بەگوێرەی پێداویستییە پراکتیکییەکان بەفراوانی ڕووندەکرێتەوەو تاوتوێ دەکرێ، لەمیانەی هەڵسەنگاندن و بڕیاری بەجێ پڕچەك و بەهێز دەکرێ.

دووەمین مەسەلەی گرنگ سەبارەت بەچۆنییەتی بەردەوامکردن و چارەسەرکردنی ناکۆکی و پەیوەندییەکانی نێوان هێزەکانی چارەسەری کۆنگرەو هێزەکانی دەوڵەتە لەکوردستاندا. دەبێ بەبایەخەوە ئاماژە بەوەبکەین کەئەو ڕێسایەی تاوەکو ئێستا لەشەڕەکانی دەسەڵاتدا پەیڕەوکراوە ڕێسای "یان هەموو یان هیچ" بووە. زۆرکەم ڕێگا بەدەسەڵاتی دوولایەنەو دەستڕۆیی دیموکراتییانە دراوە. کەچی ئەوەی پێویستە سروشتی و ئاسایی بێت بەیەکەوە ژیانی هێزەکانی دیموکراسی و دەسەڵاتە لەناو گشتی پەیوەندی و ناکۆکییەکانی نێوانیان. لەڕاستیدا بەشێوەیەکی باو ڕاستینەی کۆمەڵگا بەمجۆرەیە. بەڵام دانیپێدا نانرێت. بەشێوەیەکی کۆکراوە گوزارشتکردن و پراکتیزەکردنی تابلێی چارەنووس ئامێزانە دەبێت. لەهەڵمەتی 15ی ئابدا ئێمەش لەسەربنەمای ڕێسای "یان هەموو یان هیچ" ڕەفتارمان کرد. ئەمڕۆ لایەنەکان باشتر دەرك بەوەدەکەن کەئەمە پێڕەوێکی ڕاست نەبووە. پێکەوە ژیانی هێزەکانی دەوڵەت و کۆنگرە لەهەمان وڵاتدا پێویستییەکی هەلومەرجەکانی ئەم سەردەمەمانە.

نەدەوڵەتەکان بەڕۆژێك و دەساڵ کۆتاییان پێدەهێنرێ، نەدەتوانرێ ڕاوەستەی دیموکراتییانەی گەل ڕیشەکێش بکرێ و فڕێبدرێ. بەگوێرەی ئەوەی شەڕی بەردەوام بۆ هەردوولاش بەواتای کاولکاری مەزن دێت، پرەنسیپ ئەوەیە: ڕێگای ناوین بەیەکەوە ژیانە، کەبوو بەناچاری ئینجا شەڕە. پێویستە لەقۆناخەکانی داهاتوودا لەتەواوی ناوچەکانی کوردستان بەگوێرەی ئەم پرەنسیپە ژیان و شەڕ ڕێکبخەین. بێگومان دەوڵەتەکان سەرەتا دەخوازن ڕێسای "یان هەموو یان هیچ" پەیڕەوبکەن. بەڵام دەتوانرێ لەمیانەی بەرخودانی خۆپاراستن و دیموکراتییانەوە هەموو هێرشەکان پووچەڵ بکرێنەوە. پێویستە دۆزینەوەی ڕێگای ئەم بەرخودانە ئەرکی سەرەکی تێکۆشانی دیموکراتییانەو سەنتێزی شەڕی خۆپاراستن بێت. لەرابردووشدا قۆناخێکی بەمجۆرە دەرکەوت. بەڵام هەروەکو چۆن لایەنەکان دیموکراتیبوونیان تاقینەکردەوە، شەڕیشیان لەدەرەوەی یاساکان بەڕێوەبرد. ئەو ڕەوشەی ئەمڕۆ فەلەستین ـ ئیسرائیل تێیدا دەژین نموونەیەکی دیکەیە. دووبارەنەکردنەوەی ئەم نموونانە زۆربایەخدارە. لەڕاستیدا ئەوەی لەقۆناخی ئمیرالیدا خوازیاری پێشنیازکردنی بووم دیالۆگ بوو لەپێناو ئاگربەستێکی دوولایەنی و ڕێککەوتنی دیموکراتییانە. بەسووربوونەوە پشتگوێخرا. هەڤاڵەکانیشم دەرکیان بەگرنگی و بایەخی بابەتەکە

نــەکرد. بەتــەکتیکێکی ئاســاییان لەقەڵەمــدا. کەچــی لەکێشمەکێــشی ڕۆژهــەڵاتی ناوینیــشدا دەرکــی پێــدەکرێ، جگــە لەپێشنیازەکەمان ڕێگایەکی دیکەی دەرچوون لەم ڕەوشە بوونی نییە.

هەروەکو دەزانرێ هەندێ شت لەحکومەتەکەی پارتی دادو گەشەپێدان چاوەڕواندەکەین. نامـەشمان بـۆ نووسـیبوون. بـەڵام ئەمڕۆ باشتر ئاشکرابووە ئـەو ڕۆڵـەی لەگـەڵ هێـزە عەشـیرەتگەراو میللیگـەراکانی باشووری کوردسـتان گێڕایـان، بەشێوەیەکی جیـاوازتر لـەڕێگای AKP وە دەخـوازن بیگێـڕن. ئـەو کەمینـە بـەکرێگیراوە بـاوەو هەنـدێ لەکەسایەتییە دیارەکـانی کـوردان، کەلەکوردستاندا لەڕیزی پارتەکانی CHP, MHP, DYP, SP دا بوون لەمیانەی ئاراستەکردنەکانی دەوڵەتـەوە لـە AKPدا کۆبوونـەوە. بۆئـەوەی DEHAP بـسڕنەوە پارەیـەکی زۆریـان خـەرجکرد. پـارتی دادو گەشـەپێدان AKP بـووە ئەدرێـسە نوێیەکـەی حزبـوڵلاو چـەتەکانی سـاڵانی 1990 ــ 2000. لـەژێر پـەردەی تەریقـەتی نەقـشبەندیدا چینی تـازەی پارێزەری دەوڵەت پێکدەهێنرێ. ئەمە گۆڕانکارییەکی زۆر مەترسیدارە. گۆڕانکارییەکە هەم بـۆ گـەلی کوردسـتان، هـەم تورکیـا نـاوەڕۆکی چارەسـەری دیموکراتییانـە پووچـەڵ دەکاتـەوە. لەکوردسـتاندا بەکاریگـەرکردنی تەریقەتگـەرایی و جاشـایەتی و بـەم شـێوەیە بەدەسـتی دەوڵـەت پـەیڕەوکردنی لەسـەر گـەل ڕاگەیانـدنی شـەڕێکی تایبـەتی, لەبنەڕەتـدا هاودەنگبوونـە لەگـەڵ خوڵقانـدنی ئێراقێکی نوێ. لەکاتێکدا لەساڵانی 1950 کاندا بەکرێگیراوە کوردەکان خرانە ناو دەوڵەتەوە، لەبواری ئابوورییەوە بەهێزبوون و نێوانیان لەگەڵ گەل کەلێنی تێکەوت. ڕاستتر ئەوەیە لەڕێگای جیاکـاری و خـەڵاتی ئـابووری ئـەم توێـژەیان لەسـەر گـەل کـرد بـــەزێڕەڤان (پاســـەوان). بەشـــێوەیەکی ڕێـــژەیی ANAP، بەبـــەرفراوانیش AKP، ئەوکۆبوونەوەیـــەی دەوروبەرەکـــەی لەسەربنەمانی میللیگەرای سەرەتایی کوردان و تەریقەتی نەقشبەندییە.

ئـەو پێکهاتـە کۆمەڵایەتییـەی بناخـەی دەوڵـەتی فیـدراڵی ئێـراقیش پێکـدێنێ خـاوەن هـەمان خەسـڵەت و چـۆنایەتییە. بەشـێوەیەکی ئاشـکرانەکراو بـۆرژوازی کـورد لەدەرەبەگایەتییـەوە دەخوڵقێنـدرێ. ڕۆژبـەدوای ڕۆژ زیـاتر دەرکـی پێـدەکرێت کەئەمریکا فورسایی خستۆتە سـەر ئـەم بابەتـە. میللیگـەرایی کـورد بـۆ تـەواوی گـەلانی ناوچـەکە، لەسـەرووی هەمووشـیانەوە لەوانەیە بۆ گەلی کورد ڕێگـا لـەپێش کێشەی گـەورە بکاتـەوە. هەنـدێ کەمینـەی بـەکرێگیراوی نـەریتی بـاویش لـەناو ئەمانـە بەجێدەکرێن. گوایە یارمـەتی دەوڵـەت دەدەن. بەمـەش جاشـە چـەکدارەکان جاشـی ئایدیۆلۆژیـشیان لـێ زیاددەکرێت. ئەمانـە لەپێناو بەرژەوەندی چینایەتی خۆیـان بـەردەوام زیـان بەگـەل دەگەیـەنن و بـەردەوام پێشکەوتنە دیموکراتییەکـەی بەربەسـت دەکـەن. لەچـەندین شـاردا لـەڕێگای ئەمانـەوە شۆڕشـی چەواشـەی دژە دیموکراسـی ئەنجامـدرا. لەچـەندین شـارو شارۆچـکەدا لەســەرووی هەمووشـیانەوە "وان، ئورفـا، مـاردین، ئـاگری، بینگـۆل، سـێرت، بـەتلیس، مـوش، ئادیامـان و عـەنتاب" لـەڕێگای هەڵبژاردنە خۆجێییەکان و لەسایەی پاراستنی دەوڵەت و کۆششی بـەرفراوانی حکومـەت دژە شـۆڕش ئەنجامـدرا. ئـەو پارەیـەی خەرجکراو ئـەو گەمـە سیاسییەی پـەیڕەوکرا دەناسـرێ. گـەل دەخەنـە ئاستی برسـیبوون و فریادڕەسـی ساختەیان پێشکەش دەکـرێ. تـەنیا لـەڕێگای برسـیکردنەوە پـەروەردە نـاکرێن، شۆڕشـی چەواشـەش ئەنجامـدەدرێ. زۆربـەی ڕەفتارەکـانی AKP لەبواری دیموکراسییەوە، بەتایبەتیش سـەبارەت بەکێـشەی کـورد، گومـانی گـەورەی دروسـتکردووە. ڕاگەیانـدنی کۆنگرەی گـەل گوایە"تیرۆریست"ە لەلایەن ئەمریکاو یەکێتی ئەوروپاوە خەڵەتاندنێکە. ئەوەی دەخوازن ئەنجامی بدەن بەخشینی ورەو هێزی نوێیە بەبەکرێگیراوە کوردە نەریتی و کەمینەکان و درێژەدان بەرەوشـی سـیخوڕیانە. ئـەو ڕووداوانـەی لـەئێراق ڕوودەدەن لـەم ڕووەوە ئەزموونبەخشە.

ڕوون و ئاشکرایە هێزەکانی کۆنگرەی گەل هەوڵدەدەن ئەم گەمەیە تێکبدەن. جەختکردنـەوەی دەوڵـەت لەسـەر بـەردەوامی ئەو هێزانە دەبێتە هۆی قووڵبوونەوەی پێکدادانەکان. پێویستە دەوڵەتەکان, بەتایبەتیش کۆماری تورکیا, لەجیاتی سیاسـەتێك

کەلەسەربنەمای پشتبەستن بەم بەکرێگیراوانە بێت، ئاشتی هەمیشەیی و یەکپارچەیی وڵات لەپشتبەستن بەگەل و کارەکتەرە دیموکراتییەکەیدا ببینێتەوە. سووربوون لەسەر بەکرێگیراوە کوردەکان، دەبێتە هۆی قووڵبوونەوەی شەڕو جوداخوازی.

گەلی کوردستان دەرفەت بەکوردستانێك نادات کەلەجیاتی باڵادەستی دەرەبەگەکان ببێتە کوردستانی بۆرژوا بەکرێگیراوەکان. پێویستە دیسان جەختی لەسەربکەمەوە ئەم قۆناخە رێك دەبێتە خولقێنەری ئێراق و فەلەستین ـ ئیسرائیلێکی نوێ. بۆرژوازیەکی دروستکراوی کوردان، بەتایبەتیش دەخوازن لەدیاربەکر (ئامەد) بیخولقێنن. گەلەکەمان لەم ناوچەیە هەروەکو چۆن شەرێکی گەورەی دیموکراسی بەرێوەبردووە رێگای بەفاشیزم نەدا، جێگاو دەرفەت بەفاشیزمی سەوزی کوردانیش نادات. ئەم گەلە لەنموونەی حزبوڵڵادا ئاشنای ئەو فاشیستانە بووە کەدەمامکی کورد دەپۆشن. هەروەکو چۆن جاش و تەسلیمکارەکان دەناسن. بەوە ناخەڵەتێن کەئەمانە دەمامکێکی هاوچەرختریان پۆشیوە. سەبارەت بەم بابەتە دەوڵەت بژارێکی زۆر مەترسیدار هەڵدەبژێرێ. لەقۆناخی داهاتوودا سەبارەت بەدیموکراتەکانی تورکیاش دەکەوێتە ناو هەوڵ و بانگەوازی رێککەوتن و جەخت لەسەر چارەسەری دیموکراتییانە دەکاتەوە. زەحمەتکێشان (رەنجدەران) و گەلی کوردستان ناکەونە ناو ئەم گەمەیەو بەسووربوونەوە درێژە بەرۆڵی مێژوویی دیموکراتییانەی خۆیان دەدەن.

ئاشکرایە هێزەکانی کۆنگرەو دەوڵەت لەقۆناخی داهاتوودا دووالیزمێك پێکدێنن. نەبوونی بەدووالیزمێکی پێکدادان لەنزیکەوە گرێدراوی هەڵوێستی دەوڵەتە. ئەگەر هێرش بکاتە سەر تێکۆشانی دیموکراسییانەی گەل و هێزەکانی پاراستنی گەل، شەڕ هەڵدەگیرسێ. کاتێك ئەو هەوڵانەی رێککەوتنی دیموکراتییانە بەهەند وەربگیرێ کەلەهەموو ئاست و بوارێکدا دەدرێ، بەهەرحاڵ ئەوەی هەرەزێدە سوودمەند دەبێ یەکپارچەیی وڵات و گەلە رەنجدەرەکەمانە. بۆئەوەی نەکەونەوە ناو گەمەی شەڕە کوێرەکانی رابردوو تابڵێی پێویستە هێزەکانی کۆنگرە هەستیاربن؛ بەڵام هەروەکو بڵێی زەوتکردنی مافەکانی تێرناکات دووچاری هێرشیش ببن، هەموو مافێکی پاراستنی بۆدەرەخسێ و بەکاریشی دێنێ. هێزەکانی دەوڵەتی فیدراڵی کوردانیشی لەناودا، پێویستە لەلایەن هێزەکانی تەواوی دەوڵەتانەوە قەدەخەنامە بۆ دامەزراوە دیموکراتییە یاساییەکان و پارتە سیاسییەکان دەرنەخرێ، مۆڵەت بەتێکۆشانی ئازادانەیان بدرێ و، بەئاگربەستێکی دوولایەنە بگەن. ئەگەر ئەم بژارەی رێککەوتنی دیموکراتییانەو ئاشتی بەبنەما وەربگیرێت، بێگومان هێزەکانی کۆنگرەی گەلیش لەمیانەی هەڵوێستە ئەرێنییەکانی پشتگیری دەکات. لەرەوشێکی پێچەوانەدا بەرامبەر هەوڵەکانی پاکتاوکاری و فڕکردن، لەهەر پارچەیەك و لەمیانەی پێڕەوی هەرە گونجاوەوە بەئاستێك دەگات کەراوەستەی دیموکراتییانەی خۆی بەرزتر بکاتەوەو وەڵام دەداتەوە. پێویستە سیاسەتەکان و بەرێوەبەرایەتی قۆناخی نوێی کۆنگرەی گەل وەك پێویستییەکی گرێدان بەرەخنەدان و بەڵێنی بڕیاربوونیان و درێژەدانی تێکۆشان بەتاکەرێگای بوون بەمرۆڤێکی شەرەفمەند لەقەڵەم بدەن.

سێیەمین مەسەلە هەوڵی درێژخایەنی کۆماری تورکیا بۆ بەتیرۆریست لەقەڵەمدانی "PKK" کۆنگرەی گەل و دانانی بەئەرکێکی سەرەکییە. هەروەکو زۆرجار ئاماژەمان پێکردووە، ئەو سیاسەتەی بەهاوبەشی لەگەڵ ئەمریکا بەرێوەدەبردرێ پڕ لەتەڵەزگەیە. پێویستە هیچ کاتێك ئەگەری ئەوە لەبیرنەکرێ کەوەك "بومبەرانگ" بۆیان بگەرێتەوە. ئەو هێزانەی گوایە "PKK"یان بە تیرۆریست پەسندکردووە ئەو سیاسەتەی پەیرەوی دەکەن بەشێوەی "لەگەڵ عەلی نابێ، لەگەڵ وەلی دەبێ "یە و بەهەرحاڵ بەداخوازی و وەستایانەتر دەبن. زۆرباش دەزانرێ دەخوازن تورکیا بەلاوازی بمێنێتەوە. باش دەزانرێ بەردەوام دەخوازن کەلێن و مەودا لەنێوان "PKK" و کۆماری تورکیا هەبێ و بەمجۆرە تورکیا بەلاوازی بمێنێتەوە. پێویستە باش بیر لەئاکامە درێژخایەنەکانی بانگەشەی تیرۆریزم بکرێتەوە. پێویستە لەبیرنەکرێ ئەوانەی ئەمریکا بەتیرۆریست لەقەڵەمی دان دواتر بە چ پێگەیەك گەیشتن. کەچی لەراستیدا خۆ ئاڵاندن لەناوی "PKK" بەدەستی خۆیەوە کەوتنە ناو تەڵەزگەیە. راستینەی باکووری ئێراق (باشووری کوردستان) تادوارادە ئەزموونبەخشە.

لەرێگەچارەی کۆنگرەی گەلدا پێویستە بەردەوام باسی شوێنگەی کوردان لەمێژووی تورکان و شارستانییەتی ئێران و عەرەبەکان بکرێ. پێویستە رۆڵی ستراتیژی کوردان هەم روونبکرێتەوە، هەم بخرێتە رەوشێك کەپراکتیزە بکرێ. لەکوردان زیاتر، دراوسێکان پێویستیان بەرۆڵی ستراتیژی کوردان هەیە. فاکتەری یەکلاکەرەوە لەرووخاندنی رژێمی سەدام، بەشێوەیەکی راست لێکدانەوەی بۆ رۆڵی کوردان نەکرد. هەمان مەترسی بۆ دەوڵەتەکانی دیکەی دراوسێش لەجێگای خۆیدایە. کوردان لەپارچەکانی کوردستاندا دەتوانن یەکبگرن و لەنێوان خۆیان بەستراتیژییەکی هاوبەش بگەن. ئەوەی هەرەزێدە کوردان رووبەڕووی خۆی بکاتەوە، دووچاری گەورەترین زیان دەبێتەوە. ئەرکی کۆنگرەی گەل بینینی ئەم رۆڵە ستراتیژییەو پراکتیزەکردنییەتی. تاوەکو ئێستا نەبینینی و پراکتیزەنەکردنی بەهۆی چۆنییەتی و خەسڵەتی خیانەتی بەکرێگیراوانی کوردە. بەڵام ئاستەمە لەهەلومەرجە نوێیەکاندا ئەم خەسڵەتە بەردەوام بێت. رۆژبەدوای رۆژ کوردان زیاتر لەو رەوشە نزیك دەبنەوە کەدەرك بەستراتیژی خۆیان بکەن و پراکتیزەو بەرجەستەی بکەن. لەمیانەی ئەو نموونە مێژووییانەی ئاماژەمان پێکرد دەبێ بەشێوەیەکی راست شرۆڤە بکرێ کەکوردان و تورکەکان وەك دوو قەوم بەیەکەوە لەناو پێگەیەکی ستراتیژیدا ژیاون و بەشێوەیەکی هاوبەش رەفتاریان کردووە. کوردان ئەم هەڵوێستەیان بۆئەوە نیشاننەدا لەمێژوو بسڕێنەوە؛ وەك ئەنجامی پێداویستی سیاسەتێکی راستەقینەی بینی. کاربەدەستە گرنگەکانی دەوڵەتی تورکیش بەم شێوە شرۆڤەیان کرد. ئەگەر ئەم ستراتیژییە لەجیاتی تورکان لەگەڵ هێزێکی دیکە پەیڕەو کرابووایە (وەکو دەزانرێ وڵاتەکانی ئێران، عەرەب، ئیسرائیل، یەکێتی ئەوروپا، روسیا، ئەرمەنی، یۆنان و هتد داوایان کردووە) ئاشکرایە کەهەرزێدە زیان بەرنەتەوەی تورك دەکەوت. پێویستە لەمیانەی بانگەشە ساویلکەکانی "تیرۆریستی" ئەمە هاننەدرێت. پاکتاوکردنی کۆنگرەی گەل مەحاڵە. گەروابێ بەخراپترین شێوە میراسەکەی لەلایەن هەندێکی دیکەوە بەکاردەهێنرێ. کوردانیش دەرکیان بەوەکردووە کەدژایەتیکردن، بەتایبەتیش دوژمنایەتیکردنی تورکان، بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانیان نییە. دوژمنایەتی کورد ـ تورك واتای چەقبەستنە لە"بدۆڕێ ـ بدۆڕێ". پەیوەندییەکە سوودی یەکێکیان بەواتای زیانی ئەویتریان نایەت. ئەگەر راستینەکانی دەرەوەی سەردەم بەلاوەبنرێ ئەم پەیوەندییە بەردەوام پەیوەندی "سوودمەند بە ـ سوودمەند بە" یە. بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ پەیڕەو دەکرێ سیاسەتی "تورك هەموو شتێکە، کورد هیچ نییە" یە.

دەشێ سیاسەتێکی دژی ئەمەش سەرهەڵبدات. واتە "کورد هەمووشتێکە، تورك هیچ نییە". سیاسەتەکانی لەئارادان بۆ ئەم ڕەوشە هاندەرن. ئاشکرایە کەسووربوون لەسەر ناوزەدکردنی تیرۆریزم و هێرشکردنە سەر هێزەکانی کۆنگرە، بەشێوەیەکی خێرا چەرخی "بدۆڕێ ـ بدۆڕێ" هەڵدەسوڕێنێ. دەبێ باش دەرکی پێبکرێ، بۆئەوەی نەکەوێتە ئەم رێگایەوە هەوڵێکی زۆرماندا. لەبەر هەندێ هۆکاری سادەوە ئەم هەڵوێستە نیشاننەدراوە. هەروەکو چۆن لەم بۆچوونانەشەوە دەرکی پێدەکرێ کەلەم بەرگرینامەیە ئاماژەی پێکراوە، هۆکارە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان رەچاوکراوە. رێگەچارەی کۆنگرەی گەل (کۆماگەل) گونجاوترین رێگای یەکێتی ئازاد، ئاشتی و رێککەوتنی دیموکراتییانەی یەکێتی وڵات و دەوڵەت و گەلە. دەبێ بزانرێ کەسیاسەتێك بەتەواوەتی کوردان لەئامرازی چارەسەری دابتاشێ، سەرکێشی هێزە بەکرێگیراو، دژە ـ کۆمارگەراکان و دژە دیموکراسییەکان و تەریقەتگەراکان بکات هەرەزێدە سوودی بۆ کێ دەبێت. بەهەرحاڵ لەمیانەی ئەو سیاسەتەی سەبارەت بەکوردان پەیڕەو دەکرێ دەرکێ پێکراوە کەبەراستیش بۆچی هێزە دیموکراسیخوازەکانی تورکیا بێکاریگەر کراون. پەندی سێ مەیموونەکە دووبارە دەکەنەوە "نازانم، نەمبینی، نەمبیست" و فێری ئەوە بوونە بڵێن: سیاسەت، بەتایبەتیش ناتوانرێ سیاسەتی سۆسیال ـ دیموکراتی ئەنجامبدرێت.

ئەنجام، کۆنگرەی گەل لەمیانەی هەڵسەنگاندنێکی راست سەبارەت بەقۆناخ، لەجیاتی بوون بەهێزێکی دیموکراتیك، دەبێ ئەوە بسەلمێنێ کەسووربوون لەسەر کەسایەتی سنووردارو بێچارە بەلاوە دەنێ، لەناو راستینەی دامەزراوەکانی و پێودانگە

راستەقینەكانی دیموكراتیبوون لەئەركەكانیدا سەركەوتوو دەبێ. دەبێ ئەوە نیشانبدات كە لەسەركەوتن زیاتر هیچ هەڵوێستێك پەسندناكرێت و، گەمەكانی میللیگەرایی ــ دەرەبەگایەتی پووچەڵ بكاتەوە، بەڕاستیش وەڵامی پێویستییەكانی تێكۆشانی دیموكراتییانەو شەڕی پاراستنی خود دەداتەوەو، بەشێوەیەكی سەركەوتووانە رۆڵی خۆی جێبەجێدەكات.

3 ـ لەچارەسەركردنی كێشەی كورد گرنگی رۆڵی هێزەكانی پاراستنی گەل HPG پارێزراوە. وەك رێكخستنێكی جیاواز لەپارتی و كۆنگرە پێویستە مەسەلەكانی پێگەی لەتێكۆشانی دیموكراسییانەو پەیوەندییەكانی لەگەڵ پارتی و كۆنگرەو شێوازی شەڕكردنی روونبكرێنەوە.

هەروەكو دەزانرێ چەمكی شەڕی قەڵەمبازی 15 ی ئاب (تەباخ) پشتی بەئەزبەرەكردن بەستبوو. ئەویش بەشێوەی: كێشە نەتەوەییەكان تەنیا لەرێگای شەڕەوە چارەسەر دەكرێن؛ لەروشێكی وەهادا پێویستە تادوایی بەشان و باڵیدا هەڵبدرێ، پەنابردرێتە بەر خوداوەندی شەڕ. پێویستە وەك شكۆدارترین پرەنسیپ پەسند بكرێ و پێویستییەكانی ئەنجامبدرێ؛ چونكە سۆسیالیزم وەها دەفەرمووێت، ئاشكرایە ئەمە هەڵوێستێكی دۆگماییانە بوو. لەهەڵسەنگاندنی هەلومەرجە واقیعییەكانی كۆمەڵگاو مێژوو دووربوو. تەنیا هەڵوێستێكی بەپرەنسیپانەی لەگەڵ خۆیدەهێنا. تیۆری شەڕ لەماركسیزمیشدا شینەكرابوویەوە. بەقەرز لەمێژوونووسە دەرەبەگ ــ بۆرژواكانی فەرەنسا وەرگیرابوو. خەباتە سنووردارەكانی ئەنگلسیش لەرۆشنكردنەوەی بابەتەكە دووربوو. بەشێوەیەكی گشتی رۆڵی تیۆری توندوتیژی لەرێكخستنی كۆمەڵگاو دەسەڵات لێتوێژینەوەی سەبارەت نەكرابوو. سەرباری ئەوەی شەڕە نەتەوەییەكان و هێزە باڵادەست و چەوسێنەرەكان بەشێوەیەكی قورس جێگای خۆیان لەكۆمەڵگای بۆرژوازیدا گرتووە، وەك توێژێكی جیاوازی سۆسیالیستی بینرا. تێڕوانین بەم شێوەیە بوو ئەگەر سۆسیالیستی ئەوا شەڕی رزگاری نیشتمانی بەرێوەدەبەیت. لەبەرئەوەی لەبەشی پەیوەندیداردا شیكردنەوەی تایبەت بەشەڕمان پێشخست پێویستی دووبارەكردنەوەی نابینم. هەڵسەنگاندنێك لەو بارەیەوە كرا كەتەنیا شەڕو توندوتیژی دەوڵەت و دەسەڵات دەستنیشاندەكات، هەرسیستەمێكی كۆمەڵگا شەڕێكی لەژێردا شاراوەیە، شەڕ شیكارنەكرێت ناتوانرێ دەسەڵات و كۆمەڵگا, تەنانەت ئابووریش بەتەواوی شیناكرێتەوە. لەمیانەی ئەم هەڵوێستەوە ناتوانرێ بگووترێ كەبەتەواوەتی شەڕ وەك خراپەكاری دەبینرێ. جێگای شەڕو توندوتیژی لەناو كۆمەڵگابوون لێكۆڵینەوەی لەسەردەكرێ. دەخوازین باسی ئەوە بكەین لەئەنجامی شەڕەوە چ دەسكەوتێك بەدەستدێت و چ زیانێكی لێدەكەوێتەوە. بەكورتی شیكردنەوەیەكی سۆسیۆلۆژی ئەنجامدەدرێ.

بەردەوام باسی ئەوەكرا كەقەڵەمبازی 15 ی ئاب پێویستییەك بوو، بەڵام پراكتیزەكردنەكەی پڕ لەهەڵەو كەموكورتی بوو. بەشێوەیەكی بەرفراوان رەخنەو رەخنەدانی ئەم قۆناخەی شەڕ درا كەبەئەندازەی فارەمانێتییە گەورەكانی, ساختەكاری گەورەیشی تێداروویدا، هێندەی دەسكەوتەكانی زیانیشی لێكەوتەوە.HPG ش كەوەك بەردەوامی میراسە گەورەكەی لەدوای خۆی بەجێیهێشت، بێگومان لەروشێكی وەهادا نییە وەك خۆی درێژە بەشێوازی كۆن بدات. بەڵام نابێ بێ رۆڵ و بێكاریش بمێنێ. بەگوێرەی ئەوەی تاكو ئێستا نەئاگربەستێكی هەمیشەیی و نەئاشتی لەئارادا نییە، بەردەوام كێشەكانی HPG، ئەركەكانی كەپێویستە جێبەجێیان بكات و پێگەو پایەی چەندایەتی و چۆنایەتی بەردەوام دەبێتە بابەتی شرۆڤە جیاوازەكان.

بۆئەوەی رێگا بەتێگەیشتنی هەڵەنەدەین پێویستە دووبارە هەڵسەنگاندن سەبارەت بەرۆڵی توندوتیژی لەكوردستان ئەنجامبدەین. رەوشی وڵاتی كوردستان و ئەو كۆمەڵگایەی گەل تێیدا دەژی لەمیانەی یاساكانی فەتحكردن دەستنیشانكراوە. ئەم نەریتەی فەتحكردن كەرەگەكەی بۆ سەردەمی سۆمەرییەكان دەگەڕێتەوەو تا رۆژگاری ئەمرۆمان هاتووە پشت بەچەمكی "ئەوەی حوكمی بكەیت هی تۆیە" دەبەستێت. حاكمییەت و توندوتیژی لەبناخەی تەواوی مافەكاندا دەبینێ. كێ هەرە دوایی فەتحی كردبێت ئەم وڵاتە، ئەم گەلە هی ئەوە. بەتایبەتیش ئیسلامییەت ئەمە بەفەرمانێكی ئایینی پیرۆزەوە دەبەستێتەوە.

میللیگـەرایی بـۆرژواش بەشـێوەیەکی تونـدوتۆڵ خـۆی لەبنـەمای فـەتحکردن ئاڵانـدووە. ئـەوەی دەکەوێتـە سـەرگەلیش، ملکەچکردنی فەتحکردنەکان و گوێڕایەڵیکردنی هەرشتێکە کە دەیڵێن. بەگوێرەی پرەنسیپی شۆڕشگێڕەکان شەڕ بەشێوەیەکی جیاوازتر پێناسە دەکرێ. ئەو شەڕانەی ڕێگا لەپێش سەرکوتکردن و چەوسانەوە دەکاتەوە ڕەوا نییە. هەربۆیە مافی فـەتحکردن خەڵەتاندنێکە. چونکە ئیرادەی ستەمکارەکان نیشاندەدات. ملکەچنەکردن و بـەرخودان ئـەرکێکی پیرۆزە. ئـەو سووکایەتییەی شەڕ ڕێگای لەپێش کردۆتەوە تـەنیا لەمیانـەی کۆتاییهێنـان بەملکەچکردن، بـەلاوەدەنرێت. شـەڕی سـتەملێکراوان پیرۆزە، بـۆ ڕزگاربوون لەو سووکایەتییەی دووچاری هاتوون، کاتێك پێویست دەکات پەنابردنیان بۆشەڕ سەرەکیترین ئامرازی ڕزگارییە.

لەکوردسـتانی ڕۆژگـاری ئەمڕۆمانـدا حوکمڕانـەکانی دەوڵـەت خۆیـان بەفـەتحکاری سـەردەم و زەمـانێکی ئـەم جوگرافیایـە دەبینن. هەمیشەییبوون و حوکمڕانی خۆیان بۆ مافەکانی فەتحکردن دەگەڕێننەوە. خۆیان بەرپرسـیاری ڕەوشـی دواکـەوتوویی گەل و ئەو ڕەوشە نابینن کەدەڵێی هەبوونی خۆی لەدەستداوەو لەهـەمووجۆرە یەکسانی و ئازادییـەك بێبەشـکراوە. ئاشـکرایە کێشەیەکی مەزن لەئارادایە. ناوەڕۆکەکەشی پشت بەتوندوتیژی دەبەستێ. ئەو گەلـە هـەزاران ساڵە لەسـەر ئـەم خاکـە دەژی و بەکورد بەناو دەکرێن، فەرمووی لەهیچ کەسێك نەکردووەو نەیگوتووە وەرن من بخەنـە نـاو ئـەم ڕەوشـەوە. بـەگوێرەی ئـەوەی کارەکتەری ئەم سەردەمەمان دەزانرێ، چۆن ئەم ستاتۆ قورسە بەلاوە دەنرێ؟. ئەمە دوو ڕێگای هەیە: یان لەڕێگای ڕێککەوتنی دیموکراتییانـە، ئەگـەر ئەمـەش نـەبێت، توندوتیـژی بەرامبـەر توندوتیـژی. ژیـانێکی بـەجۆرێکی دیکـە، تـەواو پێـچەوانەی سەردەمە؛ برسێتییە، بێکارییـە، لاڵبـوون و بـێ کولتوورییـە. ئەگـەر لـەو وڵاتانـەی پارچـەکانی کوردسـتانیان لەژێردەسـت دایـە میکانیزمێکی دیموکراسییانە لەئارادابووایە، لەوانەیە پرەنسیپی توندوتیژی جێگای نەبووایە.

ڕاوەسـتەو کـاروانی دیموکراتییانـەی گـەل بۆکـەناڵی چـەوت بگوازرێتـەوەو لەسـەربنەمای بەرژەوەندییـەکانی دەوڵـەت پووچـەڵبکرێتەوە، ڕێگـا لـەپێش لەدەسـتدانی ناوەڕۆکەکـەی دەکاتـەوە. کردەوەکـانی ڕۆژگـاری ئـەمڕۆمان هـیچ پەیوەندییـەکی بەدیموکراسییەوە نییە, کەهەرچوار پێنج ساڵ جارێك لـەڕێگای هەڵبژاردنـەوە دەوڵـەت بـۆ پەرسـتگایەك دەگۆڕن کـەعیبادەتی تێـدا دەکـرێ. فـرە لایـەنی بێـت یـاخود نـا، ئـەوەی لـەڕێگای هەڵبژاردنـەوە ئەنجامـدەدرێ ڕەواپێـدانی دەوڵـەت و گـۆڕینی بەڕێوەبەرایـەتی گشتی دەوڵەتـە بـۆ تـەفرەدان. ئـەم گەمەیـە لـەڕۆژگاری ئەمڕۆمانـدا گرێـدراوی هێـزی زەبـەلاحی ڕێکلامـی سیستەمی سەرمایەدراییە کە بەدیموکراسی بەناودەکرێ. بەرهەمی تەفرەدانی کامپانیایەکە کەچل جار یـەکێکی ئاقـل بەشـێت ناوزەد بکەی، ئیتر وەك شێت دەناسرێ.

ڕاوەسـتەو کـاروانی دیموکراتییانـە بـۆ گـەلان بەرلەهـەموو شـتێك بـەواتای خاوەنـدارێتیکردنی ناسـنامەی خـۆی و، گرێـدان بەئازادی و گەیشتنە بەبەڕێوەبەرایەتی خود. هۆشیاری ناسنامەی خۆی پشت بەڕاستینەی کۆمەڵگاو مێـژووی خـۆی دەبەسـتێ. ئەگەر هۆشیاری بکرێت بەڕێکخستن، دەبێتە هێز، هێزیش ڕێگا لەپێش ئازادی دەکاتـەوە. تـاوەکو گـەلان خۆیـان ڕێکنەخـەن و نەبنەهێز، ئازادنابن. کاتێك ئازادیش دەبێ گەیشتن بەبەڕێوەبەرایەتی خۆی دەبێتە هەنگاوێکی ناچاری و پێویست. ئازادبیت و خۆت بەڕێوەنەبـەیت، لەگـەڵ ئـەقڵ و ئەخلاقـدا ناکۆکـە. کاتێـك لـەم چوارچێوەیەدا دیموکراسـیمان پێناسـەکرد، بـەجێکردنی هۆشیارییەکی هەمیشەیی ناسنامە لەناو گەل، خەباتی ڕێکخستنی لەهـەموو بـوارو ئاستێکداو ڕێبەرایـەتیکردنی ئـەم قۆناخـە، دەشـێ گشتی بەچالاکی و کرداری دیموکراتییانـە بـەناوبکرێ. دەشـێ بـەقۆناخی پەڕینـەوە لەڕاوەسـتەی دیموکراتییانـەوە بـۆ کـاروانی دیموکراتییانـەش بـەناوبکرێ. لـەجیاتی گرێـدانی گـەل بەدەوڵەتـەوە لـەڕێگای ئاوێنـەکانی هەڵبژاردنـەوە، هەوڵـدانی لەپێناو ئازادی و خۆبەڕێوەبردن دەشێ تەنیا وەك چالاکی دیموکراتییانە واتاداربێت. ئەگـەرنا لـەپێناو بەدەسـتهێنانی کورسـی دەسەڵاتی دەوڵەت و حوکمڕانیکردن پاڵپشتی میللەت بەدەستبێنی بەکاریگەرترین زەبر لەدیموکراسی ڕاستەقینە دەدرێت.

لەسەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەمدا تێوەگلانی دیموکراسی بۆناو ئەم ڕەوشەوە، ئەو خیانەتە پێناسە دەکات کەبەرامبەر دیموکراسی ئەنجامدراوە. ڕەوشی قووڵ و بەرفراوان و بەربلاوی ئەو خیانەتەیە کە "ژان ژاك ڕۆسۆ" لەسەدەی هەژدەهەمەوە سەرنجی بۆ ڕاکێشابوو.

بەڕێوەبردنی تێکۆشانی دیموکراسییانەی کوردستان لەچوارچێوەی پێناسەی ئەنجامدراو دەشێ واتایەکی هەبێت. ئەگەرنا گەمەکانی هەڵبژاردنی ئەربابەکان لەناوەڕۆکدا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ کۆبوونەوەی کۆیلەکان و هەڵبژاردنەوەی خاوەنەکانیان نییە کەحوکمڕانییان دەکەن. کاتێك خەباتی دیموکراتییانەی ڕاست ناسنامەی کۆمەڵایەتی گەل، ئازادی و بەڕێوەبردنی خود بەبنەما بگرێت فەراهەم دەبێت. لەکوێ گوندێك، گەڕەکێك و چڤاتی گەل هەبێ، پێویستە لەوێ بەردەوام خەباتی هۆشیارکردنەوەو ڕێکخستن ئەنجامبدرێ؛ بەمجۆرە سەبارەت بەگرفتە سەرەکییەکانی گەل, بەتایبەت گەل کۆبکرێتەوەو بڕیار وەربگیردرێ، ئەرکەکانی جێبەجێکردنی ئەم بڕیارانە دەستنیشانبکرێت، چالاکییەکی ڕاستەقینەی دیموکراسییە. بەگەرمی پێشوازینەکردنی گەل لەپارتە ئایینی ــ میللیگەرایی، ڕاستڕەو ــ چەپڕەوە کارتۆنییەکان بەردەوام لەگۆڕانیان لەرێگای سندووقی هەڵبژاردنەوە لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم ڕاستینەیەیە. لەکوردستان پارتایەتی سیستەم لەقێزەونترین ئامرازەکانی ڕەواییپێدان بەولاوە هیچ ڕۆڵێکی دیکە نابینن. بەئەندازەی تەریقەتە کۆنەکانی ئایین تەڵەکەبازو چەواشەکارو ئامرازی چەوساندنەوەن.

بوون بەپارتێکی دیموکرات و بەڕێوەبردنی چالاکی دیموکراتییانە تادواڕادە کارێکی ڕەسەنانەیە. دیموکراسییەتی ئەسینا کە لەمێژوودا لێی ڕازی نین، تەنیا لەرێگای دیموکراسییەوە توانیویەتی لەلایەك ڕژێمی پادشایەتی ئیسپارتە، لەلایەکی دیکەشەوە مۆنارشی ئیمپراتۆریەتی پارسی دووسەد ساڵە بەربەست بکات و، توانیویەتی لە" سەردەمی زێڕینی" مێژوویی خۆیدا بژی. کاتێك بەراستی دیموکراسی پراکتیزەبکرێ بەئەندازەی ئەوەی ڕژێمێکی سەرفرازییە، لەهەمانکاتدا قوتابخانەو ڕێبازی پێگەیشتنی هاووڵاتی ئازادی هۆشمەندە کەدەتوانێ وڵاتێك و گەل بەرامبەر هەمووجۆرە دەسپۆت و داگیرکارییەك بپارێزێ. لەسیاسەتدا هیچ خەباتێك هێندەی چالاکی دیموکراتییانە هێژاو بەهادارنییە. لەم چوارچێوەیەدا کاتێك گەلان دەبن بەخاوەنی ئەو ڕۆڵانەی ئاشقی دیموکراسین و ئامادەنە لەپێناویدا خەبات بکەن، بۆ ئەو گەورەترین گەرەنتییە. هەرهەوڵێکی لەکوردستاندا لەتیشکۆی دەوڵەت ئەنجامبدرێ، لەژێرناوی کێ و کامە سیفەتیش بەڕێوەبرێت، جگە لەنکوڵیکردنی دیموکراسی هیچ واتایەکی دیکە نابەخشێ. لەکوردستانی ئەمڕۆماندا لەبەڕێوەبردنی بزووتنەوەو هەوڵێکی ڕاستەقینەی دیموکراسی بەولاوە، ناتوانرێت بیر لەپراکتیکێکی بەهادارتر بکرێتەوە.

بەڵام تاوەکو ئێستاش کوردستان زۆر لەدیموکراسییەتێکی هاوچەرخ دوورە. ڕۆژهەڵاتی ناوین لەناو شەڕو ئاژاوەکانی بەر لەدیموکراسیدا دەژی. کوردستان لەناوەندی ئەم شەڕو گێژاوە دایە. لەکام لایەنەوە تەماشابکرێ، گرفتەکانی پاراستنی گەل قورسەو پێویستی بەخاوەنداریکردن هەیە. تەنانەت بەکارنەهێنانی ئامرازێکی گەیاندنی کۆمەڵایەتی وەکو زمان لەناو پێودانگە هاوچەرخەکاندا، بەڵگەیەکی قووڵی کێشەکانی پاراستنە. لەلایەکی دیکەشەوە بەهۆی نەبوونی و بێبەشبوون لەچەندین تواناکاری و لەنێو هەلومەرجی شەڕێکی گشتی بەرخوداندا، پێویستی بەسنووردارکردن و بەرتەسك هێشتنەوەی شەڕ هەیە. ئەو بەرخودانەی بەرامبەر هێزە سیاسی و سەربازییەکانی حوکمڕانانی دەوڵەت ئەنجامدەدرێت، دەشێ ئەو شەڕەی ئەنجامدەدرێ، لەئاستی شەڕێکی چڕی ئاست نزم یان ناوین، هەندێ جاریش بەشێوەی شەڕی یەکینەی بچووك بەڕێوەببردرێ. بەرگرینەکردن و نیشاننەدانی بەرخودان ملکەچکردن دەکات بەرەوشێکی ئەبەدی. لەجیاتی کۆتاییهێنان بەحوکمڕانی دەوڵەتەکان لەرێگای بەرخودانەوە، ڕاکێشکردنی بۆ ڕەوشێکی گونجاو بەرێککەوتنی دیموکراتییانە، بەگوێرەی هەلومەرجەکانی ئەم سەردەمەمان وەکو لەبارترین ڕێگا دەبینرێ. دەشێ ڕۆڵی HPG بەم شێوەیە پێناسەبکرێ: تاوەکو گەیاندنی بەرێککەوتنی

دیموکراتییانە، پێشخستن و پاراستنی دیموکراتیزەکردنی گەلە. کردنەوەی ڕێگای دیموکراتیزەبوون بەهەڵگرتنی ئەو کۆسپانەدا تێپەڕدەبێت کە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەلایەن ئەو هێزانەوە دادەنرێت کەبەزەبری فشاری دەوڵەت بەکرێگیراوێتی دەکەن.

مەرجێکی دیکەی پەسندکردنی شەڕ، شەڕی بەرگریکردنە بەرامبەر ئەو هێرشانەی بەتایبەتی دژی هەبوونی HPG ئەنجامدەدرێ. هەربۆیە ناچارە تادوایی جۆری شەڕی گەریلایی بەکاربێنێ. ئەرکیان چارەسەرکردنی هەموو کێشەکانی جێگیربوون تاوەکو پەیوەندی لەگەڵ گەل، لەلۆژستیك بۆ پەروەردە، فەرماندەیی تادەگاتە پەیوەندییە سیاسییەکانە کەپێویستیین. هەندێ قۆناخ سەرهەڵدەدات، دەبێتە سەرەکیترین شێوەی کۆڵەکەی پشتپێبەستنی گەل و تەواوی هێزە ڕێکخراوەکان. پێشخستن و پاراستنی تەواوی هەوڵە دیموکراتییەکانی دەکەوێتە ئەستۆ. هەربۆیە پێویستە لەبواری سیاسی و ڕێکخستنی بەگوێرەی پێداویستییەکان خۆی پڕچەك بکات. گونجاندنی پێگەی چەندایەتی و چۆنایەتی بەگوێرەی ئەو ئەرکانەی پێویستە جێبەجێی بکات و، دەستنیشانکردنی ستراتیژی و تەکتیکەکانی ئەو ئەرکانەن کە پێویستییان بەشیتەڵکاری هەیە. هەروەها بەرپرسیاری ئاسایشی تەواوی پارت، کۆنگرەو ئەو مرۆڤانەی ناو گەلە, کەلەژێر هەڕەشەو مەترسیدان. ئەم ئەرکە دژوارو گرنگەی بەرامبەر هێزەکانی ئاسایش و سەربازی جێبەجێدەکات کەبەباشی پەروەردەکراون. باسکردنی ڕۆڵی خۆم لەتێکۆشانی چەکداری بابەتێکی دیکەی گرنگە. خەباتەکانم بەر لەقەڵەمبازی 15ی ئاب و دواتریشی دەزانرێ. هەوڵ و کۆششی مەزنم دا. بەڵام لەئەنجامی گۆڕانکارییەکانی یەکەمین پانزدە ساڵی قۆناخەکە جیاوازییەکەی لەگەڵ چەمکی شەڕی من زۆر گەورەبوو. دووبارەی ناکەمەوە کەرەخنە ــ ڕەخنەدانێکی بەرفراوانی سەبارەت ئەنجامدراوە. بەڵام ئەگەر لەسەرەتادا بمزانیبووایە بەم شێوەیە چەواشەکراوە، ئەوا لە 1980 کان یان سەرەتای 1990 کان لەرەوشێکی وەهادا دەبووم کەبەگوێرەی هەلومەرجەکانی وڵات لەکوردستان دەبووم. هۆکاری سەرەکی ئەو ڕەوشەی زۆربەی ئەو گروپانەی ئەرکدارکران خۆیان تێخست، یان لەسروشتی شەڕو توانستی سیاسی و خۆپڕچەککردنی ئایدیۆلۆژی بێئاگابوون، یاخود خاوەن هۆشیاری و پەروەردەیەکی زۆر کەمبوون. خاوەنداریێتی نەکردنی فەرمانداریێتی گرنگترین هۆکاری زیان و سەرنەکەوتنەکان بوو. پێویستە هۆکاری سەرەکی ئەو ڕەوشەی تێکەوتووم لەم ڕاستینەیەدا لێبیگەرێین. تواناکاریەکانم لەبواری تیۆری و پراکتیکی دەیتوانی بەمجۆرە شەڕ بەڕێوەببات. ئەوەی خوازیاربووین پێکیهێنا یاخود نا, پێویستە بەئاشکرایی ئاماژەی پێ بکەم. لەدوای ساڵی 1995 لەجیاتی ئەو خۆدووبارەکردنەوە زێدەڕۆییەی ڕوویدا، بکەوتبووامایە ناو لێگەڕینی ڕیشەیی دەشیا ڕاستربێ. لەساڵی 1993 داچاوەڕوانی کردنی سەرکەوتن لەپێکهاتەی ئەو فەرماندەیی و کادیرانەی هەبوون ڕاست نەبوو. هەڵمەتی 1993 ــ 1995 گرنگ بوو. بەڵام سووربوون لەسەر ئەو کادیرانەی تاقیکرابوونەوەو سەرنەکەوتبوون ڕێگای لەپێش ئەو خۆ دووبارەکردنەوەیە کردەوە کەدەزانرێ. هەروەکو دەزانرێ هەڵمەتەکانی پێشووتریش پشتی بەپێکهاتەیەکی فەرماندەیی ڕشتی ئەوتۆ نەدەبەست.

جیابونەوەکەی ساڵی 1998 لەژێرکاریگەری ئەم ڕاستینانەدا ڕوویدا. دەمتوانی بچمە وڵات. بەڵام ئەمە ڕێگایەك بوو بەهۆی ئەندێشەی ڕێگا لەپێش قرکردنێکی سەرتاسەری دەکاتەوە تاقینەکرایەوە. تاوەکو 11ی ئەیلولی 2002 لایەنگری ئەوەبووم ئەگەر شەڕی چەکداری لەگەڵ کەمترین ڕێککەوتنی چارەسەری دیموکراتییانە ببێتەیەك دەستی لێبەربدرێ. بەڵام دوای 11ی ئەیلول نیازی ڕێککەوتن لای کاربەدەستانی تورك نەبینرا. بەگوێرەی من دوای هەڵبژاردنەکانی 3ی تشرینی دووەمی 2002 چۆن دەرك بەوەکرا کەحکومەت وەڵامی چارەسەرکردن ناداتەوە، دەتوانرا بکەونە ناو شەڕی بەرگری ڕەواوە. بەڵام نەدەبوو من ئەم بڕیارە بدەم. هەلومەرجەکانی زیندانیم بەرگەی ئەمجۆرە بڕیارانە ناگرێ. ڕاست نییە چاوەڕوانی فەرمان لەمن بکەن. تەکتیك و ستراتیژ و شێوازی شەڕی پشتبەستوو بەشیکردنەوەی بەرفراوانی قۆناخی نوێ کاری ئەوکادیرە بەرپرسانەیە کەباوەڕیان بەخۆیان هەیە. بەتەواوی ئەوانم بەسەربەستی هێشت. لەپێناوی من بەکارهێنانی شەڕ وەك

فاکتەرێکی فشار، لەبواری ئەخلاقی راستم نەبینی. شەڕ ئەو چالاکییەیە تەنیا لەپێناو یەکلاییکردنەوەی داخوازییە مێژوویی و ژیانییەکانی گەل پەیڕەو دەکرێت. هەربۆیە گووتبووم بەفراوانی گفتوگۆ لەگەڵ گەل بکەن و خۆتان بڕیار بدەن. ئێستاش خاوەنی هەمان بۆچوونم.

ئاماژە بەهەندێ بۆچوونی تیۆری سەبارەت بەبابەتەکانی شەڕ دەکەم؛ لەم بەرگرینامەیەدا زیاتر پێشمخستووە. سەبارەت بەرۆڵی توندوتیژی لەوڵاتەکەمان و سروشتی شەڕی بەرخودان هەندێ هەڵوێستی بەپرەنسیپانەم هەبوو. ئاشکرایە کەئەمە فەرمان و رێنمایی نییە، بۆچوونێك بوون سەبارەت بەرۆشنکردنەوە. لەم ماوەیەدا هەندێ راسپاردەشم ئاراستەکرد: ئەوانیش سەبارەت بەپێگەی یەکینەکانی ژنان، پێکهێنانی ناوچە تایبەتە دیموکراتییەکان و تایبەتمەندێتییەکانی شەڕی پاراستنی گەل بوو. دەشێ ئەمانەش بۆچوون و پێشنیازێکی جێگای وردبوونەوەو هەڵوەستە کردن بێ. چونکە لەوانەیە هەلومەرجەکانی شەڕ لە 24 کاتژمێردا بگۆڕێن. دەشێ هەرکات و ساتێك پێویستی بەگۆڕینی تەکتیك هەبێ. لەرەوشی وەهادا دەشێ هەموو شتێك بگۆڕدرێ. هەربۆیە نابێ وەك فەرمانێك دەرك بەپێشنیازەکانمان بکرێ. ئیرادەی سەرەکی یەکلاکەرەوە لەشەڕدا شەرڤانەکان (جەنگاوەرەکان) خۆیانن. لەمیانەی تیۆری و کرداریدا بڕیار دەدەن و جێبەجێی دەکەن. خۆیان بەبەرپرسیاری سەرکەوتن و ژێرکەوتن دەبینن. هەلومەرج، هێزەکەیان، ئەزموون و تیۆرییەکەیان چەندەی گونجاو ببینێ، بەرپرسیارێتی خۆیانە شەڕ بکەن، یان خۆیان لەشەڕ بەلاوە بنێن.

تاوەکو ئێستا لەئاستی ئاگادارکردنەوەدا هەندێ بانگەوازیم بۆ هێزەکانی دەوڵەت و کۆنگرە کردووە. کاتێك ئەو هەڵوێستانەی دواییم بینی کەدەخوازێ ئاستی بڕیاربوونی کۆنگرە پووچەڵبکاتەوە، وەك پێویستییەکی بەرپرسیاری مێژوویی بۆچوون و پێشنیازی خۆم لەبارەی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی "PKK" و بەستنی کۆنگرەی نائاسایی لەسەربنەمای وابەستەبوون بەئیرادەی کۆنگرە پێشکەشکرد. بەهاکەی چی دەبێ بابێت تادوا هەناسەکانم لەم بوارەوە ئاماژە بەبۆچوونەکانی خۆم دەدەم. هەرچەندە لاوازی و کەموکوڕی گەیاندن تووڕەو نارەحەتیشمان بکات، ئەوەی لەدەستم هات کردم. هەرە دوایی لەرێگای ئەم بەرگرینامەیە بەشێوەیەکی کۆکراوەو پووختتر بۆچوونەکانی خۆم دەخەمەڕوو.

لەو باوەڕەدام کەهەرەزێدە تاوەکو هاوین کۆنگرە دەبەسترێ. هیوادارم بوویەری نائاسایی روونەدات. ئەو هەڤاڵانەی لەمە بەدواوە خاوەنی بەرپرسیارێتین ئەرکی لە 15ی ئاب گرنگتر چاوەڕوانییان دەکات. ئەوانەی بەناوی پارتی، کۆنگرەو HPG بەرپرسیارێتی و ئەرك دەخەنە سەرشانی خۆیان بەباوەڕی هێزی خۆیان بەرێوەدەچن. لەمن چاوەڕوانیکردن تا دواڕادە بێواتایە. ئەوە سروشتییە تەندرووستیم چەندە نالەباریش بێت، هەوڵدەدەم هێزی گەیشتن بەکۆتاییەکی شەرەفمەندو سەرفرازانە نیشانبدەم. بەلام دەبێ ئاماژە بەوەش بکەم ئەگەر هەڤاڵی راستەقینە بوونایە لەم هەلومەرجەی ئێستادا بەمشێوەیە رەفتاریان نەدەکرد. دەگێڕنەوە کاتێك هەڤاڵ "کەمال پیر" گوێبیستی چالاکی فەرهاد کورتای و هەڤاڵانی دەبێ دەڵێ "ئەنجامدانی ئەم چالاکییە ئەرکی ئێمە بوو"، هەروەکو دەزانرێ بەمجۆرە تامردن مانیگرت. مسۆگەر من لایەنگری چالاکی خۆکوژی نیم و بەهەڵەشی دەبینم. بەلام چالاکییەکانی کەمال پیر، محەمەد خەیری دورموش، مەزلوم دۆغان، فەرهاد کورتای و هەڤاڵانیان وەك چالاکی خۆکوژی هەڵناسەنگێنم. هەروەکو خۆشیان گوزارشتیان لێکردووە، "ئەگەر بچووکترین دەرفەتی ژیانێکی شەرەفمەندانە هەبووایە، ئەوەمان بەبنەمادەگرت و تاکۆتاییش سەرفرازانە دەژیاین" ئەمەش پێوانەکانی ژیانی پێویست دیاریدەکات. تەنیا کردەوەیەك مابۆوە لەپێناو کەرامەتی مرۆڤایەتی ئەنجام بدرێ. ئەو چالاکییەی بەرخودانیشیان ئەنجامدا. هەروەکو دەزانرێ محەمەد خەیری دورموش ئەم ئاستەی بڕیاربوونیان بەگووتەی "سەرکەوتین" هەڵدەسەنگێنێ. دروشمەکەیان "کەرامەتی مرۆڤایەتی سەردەکەوێ"بوو. ئەمەیە نەریتی بەرخودانی شەڕو تێکۆشانمان. دەبێ باش دەرکی پێبکرێ و پراکتیزەبکرێ.

چەندین هەڤاڵتان لەگەڵدایە کەلەزیندانەکان دەرکەوتوون. هێژای ئەوەیە لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێ کەچی لەژیان تێگەیشتوون. هیچ کەسێك چاوەڕوانی ئەو چالاکییە خۆکوژیانەتان لێناکات کەبەدرێژایی قۆناخی 15ی ئاب زۆر جار ئەنجامتاندابوو. ئەمە پەسندیش ناکرێ. بەڵام ناتوانرێ نکوڵی لەم راستییە بکرێ کەهەموو تواناکارییەکانی هەمووجۆرە چالاکییەکی دیموکراتییانەو شەڕی بەرگری ڕەوا (الدفاع المشروع) لە ئارادایەو ناتوانرێ بۆ جموجۆڵی ئازادانە سکاڵا لەهەلومەرجەکانی کات و شوێن بکرێت، هەربۆیە هەلومەرج و توانستی پەیڕەوکردنی هەربژارێك لەپێناو کەرامەتی خۆتان و گەلەکەتان لەئارادایە. باوەڕیمان بەرەخنەدانەکانی دوای 2000 کان هێنابوو و چاوەڕوانی پراکتیکێکی ئەنجامگیرتان بووین. ئەوەی دەرکەوت میراسەکەمانتان لەجێگای لاشەیەك داناو کردتان بەدوو پارچەو وەك وەڵامدانەوەی ئومێدو چاوەڕوانییەکانم بۆمنتان نارد. ئاشکرایە کەئەمە شەڕی کەرامەت و شەرەفمەندی نییە. لەئەنجامی ڕەنج و زەحمەتییەکی زۆرەوە لەسەرووی هەمووشتێکەوە لەشاخەکانی کوردستان و لەناو گەل و مرۆڤایەتی ئازاددان کەئومێدی ئازادییان لێدەکرێ. لەبیرنەکەن تەنیا بۆئەوەی یەکێکتان بەو پلەو پایە بگەن هێندەی ئەم شاخانە هەوڵ و کۆششم دا. بۆخۆم چاوەڕوانی بەرامبەرەکەی ناکەم. بەڵام هەرگیز ئەمجۆرە هەڵوێست و ڕەفتارانەتان ئەرێ ناکەم کەبەواتای یاریکردن بەشەرەف و کەرامەتی گەل دێت. واز لە گەل بێنن، تەماشابکەن و تێبگەن شەرەف و کەرامەتی خۆتان خستۆتە چ ڕەوشێکەوە. ئێمە، من نەکەوتمە ناوهەڵەو کەموکورتییەك کەماف بەم ڕەفتارەتان بدات. من بەشێوەیەکی راست شەڕ لەپێناو کەرامەتی مرۆڤایەتی شرۆڤە دەکەم و درێژە بەبەدواچوونی جێبەجێکردنی پێویستییەکانی دەدەم.

وەك ئەنجام، لەژێر ڕۆشنایی ئەو هەڵسەنگاندن و شیکردنەوە بەرفراوانانەی ئەنجامدرا، هەوڵمدا کێشەو دیاردەی کورد ڕۆشنبکەمەوەو هەندێ پێشنیازی چارەسەرکردن پێشکەش بکەم. دەشێ وەك وەڵامێك بۆ تەواوی ناوەندو دەوروبەرە پەیوندیدارەکان دەرکی پێبکرێت. لەمە بەدواوە وەڵامی هەر ناوەندێکی پەیوەندیدار لەژێر بەڕێوەچوونی بەرپرسیارێتی خۆیدا دەبینرێتەوە.

لەو بڕوایەدام لەم ڕێگایەوە ئاماژەم بەهەندێ هەڵەوکەموکورتی خۆشم کرد سەبارەت بەقۆناخی 15ی ئاب. لەسەرووی هەمووشیانەوە لەسەرەتا روون نەبوو کەچی دەخوازین. پەسند دەکەم کە لەسەرەتاکانی هەشتاکاندا بەپێی پێویستی روون و شیتەڵکار نەبووم و، لەو بڕوایەشدام کە لەرێگای ئەم بەرگرینامانەوە هەڵوێستێکی راستی ڕەخنەدانم نیشانداوە. دووەمین هەڵەو کەموکورتی یەکلانەبوونەوەیە سەبارەت بەبابەتی ئەو چالاکییەی ئەنجامدەدرێ. سەبارەت بەم بابەتەش لەو بڕوایەدام بەیەکلابوونەوە گەیشتین و وەڵامی پێویستمان بۆ لایەنە پەیوەندیدارەکان داوەتەوە. لەمە بەدواوە دووجۆرە چالاکی جێگای باسە.

أ) چالاکی دیموکراتییانەو دەرفەتەکانی چارەسەری. ئاشکرایە کە بەسووربوونەوە هەڵوێستی زۆر بەرفراوانم پێشخست و بژاری بنەڕەتیم بەو لایەنە دایە. لەسەرەتای 1990کاندا نەگەیشتن بەم سافبوونە لەلای خۆیەوە ناتەواوییەکی جددییە.

هەرچەندە درەنگیش بێت؛ سەرباری ئەوەی گەورەترین هەوڵ هی من بێت و گۆشەگیریەکەشی بکێشم، گرنگ ئەوەیە لەهەلومەرجە مێژووییەکانی ئەمڕۆمان و لەدەروازەی گۆڕانکاری گرنگدا توانیومە شێوازێکی چالاکی و ڕێگەچارەی دیموکراتییانە پێشکەش بکەم کەدەرکی پێدەکرێت و دەتوانرێ پراکتیزە بکرێ. بەهەزاران کادیری چالاکی خاوەن بانگەشەی تێکۆشانی دیموکراتییانەو هێزێکی جەماوەری وەهامان هەیە کەبەملیۆنان لەپێناو ئازادی هەڵساونەتە سەر پێیان. هێزێکی خەباتگێڕی و جەماوەری ئەوتۆیە کەدەتوانێ هەمووجۆرە وەڵامێك بداتەوە ئەو کێشەو گرفتانەی بەبێ چەکهەڵگرتن چارەسەردەکرێن. ئەوانەی گوایە خاوەن پایەی ڕێبەرایەتین و بەرپرسیارێتی باڵایان هەیە، کاتێك ئەم دەرفەت و توانستانە بەکارناهێنن، بەرامبەر بەمێژوو خۆیان لەژێرباری بەرپرسیارێتییەکی قورسدا دەهێڵنەوە. دەبێ لەمیانەی هەمووجۆرە

ڕێکخراوێکی دیموکراتی و کۆمەڵگای مەدەنی و کاروانی داواکارییەکانی مافی ملیۆنان کەس ئازادی بۆ وڵات و دیموکراسی بۆ گەل بەدەستبێنن. کەمێك زەمان بۆئەوە پێویستە؛ ئەوەیتریش ڕێبەرایەتییەکی سیاسی دیموکراتییانەیە کەدیموکراسی لەناواخنی خۆیدا هەرسکردووە، باوەڕی بەئامانجی خۆی هەیەو، توانیویەتی وەك گۆشت و نینۆك پەیوەندی لەگەڵ گەل دروست بکات. جەنگاوەرێتییەکی مافپەروەرییە, کاتێك پێویست بکات بتوانێ ئەو یاساییبوونەی دیموکراتی نییە بەئازادی و مافە دیموکراتییەکانی بگەیەنێ.

گوایە سۆسیال دیموکراتی چەپ کەڕێبەرایەتی ئومێدی گەلی بۆ پاشماوەکانی چاخی ناوین بەجێهێشتووە، ئەگەر تۆزقاڵێك شوێنپەنجەی ناسنامەکەی هەبێ، بەبێ جیاوازی نەتەوە، ڕەگەز، ئایین و مەزهەب، لەمیانەی نزمترین ئاستی دیموکراسییەوە، ئەوا لەتورکیاو کوردستانی ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دۆزی ئاشتی، برایەتی، ئازادی و یەکسانی سەردەکەوێت.

ب) دووەمین ڕێگا: سەرباری هەموو بانگەوازی و ئاگادارکردنەوەیەکمان، وەڵام نەدرێتەوە، بەشێوەیەکی وردو تەڵەکەبازانە لەڕێگای پێڕەوەکانی شەڕی تایبەتەوە درێژە بەسەرکوتکردنی هەموو هەنگاوو ئومێدەکانی ئازادی، یەکسانی و دیموکراتی گەلەکەمان و گەلان بدرێت، بەسووربوونەوە ئەو هەڵوێستانە بسەپێنرێ کەلەگەڵ یەکپارچەیی وڵات و، پرەنسیپەکانی کۆمارو شێوازی گوزارشتی هاوچەرخی نەتەوەو گەلانیش کۆك نییە، ئەوا ئەو وەڵامەی دەدرێتەوە، پراکتیزەکردنێکی بەرفراوانی شەڕی پاراستنی خودە. هەروەکو دەزانرێ ئەمە بژاری ئێمە نییە. بەڵام چەندین گەمەو لەیستۆك کەبەڕێوەدەچن ئەوە دەکاتە پێویستییەك لەم بوارە تادواڕادە ئامادەباشی هەبێت و، هەرئان و ساتێك پێویست بێت نابێ لەپێشخستنی شەڕی بەرخودان و پاراستنی خود دوودڵی بکرێت. ئاشکرایە ئەگەر ئەمە لەشێوازو بەڕێوەبەرایەتییەکەی بخوازم بەبەرپرسیار لەقەڵەم نادرێم. نەدەتوانم کۆسپی بۆ بنێمەوە، نەدەتوانم بڵێم مەیکەن. بەرپرسیارێتی مێژوویی لەئەستۆی دەوڵەت و هێزی پاراستن دایە. خۆیان ستراتیژی و تەکتیکەکانی دوولایەنە دیاری دەکەن. پراکتیزەکردنێکی سنووردار یان بەرفراوان، وابەستەی هێزو بەهرەمەندی خۆیانە. پێویستە هەرکەس باش یەکتری بناسێ و بەگوێرەی ئەوە هەنگاو بهاوێژێ.

ناتوانم ئەم بابەتە تێپەڕبکەم و ئاماژە بەم خاڵانە نەکەم: ئاگربەستێکی دوولایەنە دەشێ سەرەتا بەشێوەی ماددەی بەرفراوان رابگەیەندرێ. لەئەگەری شەڕێکی چاوەڕوانکراویشدا دیسان ئەو ڕێسایانەی پێویستە لەشەڕدا گوێڕایەڵی بکرێ سەرەتا بەشێوەی یاداشتنامەیەك ڕاگەیەنرێ و پێشکەشی ناوەندە پەیوەندیدارە نێودەوڵەتییەکان بکرێ. دەشێ بەڵگەی ئاگربەستیش پێشکەش بکرێ. ئەگەر ڕەوشێکی بەمجۆرە سەرهەڵبدات، لەهەلومەرجی کوردستاندا هەردوو هێز دەکەونە ڕەوشی مان و نەمانەوە: هێزەکانی دەوڵەت و کۆنگرە. بەخێرایی پاکتاوکردنی ئەوانەی ناوین دەکەوێتە ڕۆژەڤەوە. دەشێ بانگەوازی ئاراستەی ئەمانەش بکرێ. هەرهیچ نەبێ با لەخۆڕا مەدەنی، بێ لایەنەکان، منداڵ، بەساڵاچووان و ژنان زیانبەخش نەبن. گوێڕایەڵیکردنی لایەنەکان بۆ یاساکانی شەڕ دەشێ دەرگا بۆ ڕێگایەکی مرۆییانە بەکراوەیی بهێڵێتەوە؛ دەشێ بەرەو ئاگربەست بچێ، ڕێگا لەپێش ڕێککەوتنی دیموکراتییانە بکاتەوە. ئاشکرایە بۆ بەردەوامی ژیان، پێویستی بەمرۆڤ و لۆژستیك هەیە. ئەوەی لەبنەڕەتدا گەریلا پشتی پێدەبەستێ شاخ و گەلە. دەشێ شەڕەکان لەشاخ، شاروگوندەکاندا پێشبخرێت. دەست بەسەرداگرتن و ڕێبڕین لەهەموو شوێنێك تاقیدەکرێتەوە. وەرگرتنی سەربازو پارمەتی کارێکن بەردەوام دەتوانرێ ئەنجامبدرێ. هەرکەس ناچارە لەپێناو ژیان بزانێ چۆن ئامانجەکانی دیاری دەکات و جێبەجێی دەکات.

زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵانە بێواتا دەبینم. ئومێدەوارم بەهیچ شێوەیەك نەکەوێتە ڕۆژەڤەوە. بەو ئامانجەی ئاگادارکەرەوەیە دەشێت، دەخوازم ئەگەری سیناریۆیەك بۆ لایەنەکان ڕوونبکەمەوە. لەوانەیە خراپتریش بێ. کاتێك دوا تراژیدییەکانی فەلەستین ــ ئیسرائیل و ئێراق ڕەچاوبکرێت، ئەوا دەرك بەوە دەکرێ کە لەخۆڕا قسەناکەین. وەك پێویستییەکی شیتەڵکردنەوەی ئەو پیلانگێڕییەی لەسەر من پەیڕەوکرا، ئاماژەکردن بەم مەسەلانە بەئەرکی خۆم دەزانم. بەو

باوەڕەییەوە ئاماژە بەوە دەکەم کەلەمیانەی گرێدانێکی گەوهەری دەوڵەت بەدیموکراسی و یەکپارچەیی دیموکراتییانەی وڵات هیچ کێشەیەك لەئارادا نییە لەگەڵ تورکیا چارەسەر نەکرێ. بەگوێرەیّ پێویستییەکانی بیرو باوەڕەکەم، هەرچەندە سنووردایش بێت، بەلام ئەوەی بۆمن واتادارترە بەهێزکردنی بەیەکەوە ژیانی مێژوویی گەلانمانە لەرێگای پرەنسیپە هاوچەرخەکانی دیموکراتی، ئازادی و یەکسانی. راستییەکی حاشاهەڵنەگرە لەم پێناوەدا بۆهەمووجۆرە فیداکارییەك ئامادەم. بابەتی هەرەزێدە لەبەرامبەری دەلەرزم ئەوەیە کەچۆن نەهێڵیم دلۆپە خوێنێکی تاکە مرۆڤێکمان برژێ و یەك ساتی بەئێش و ئازاریان نەبێت. بەلام ئەمەش مەسەلەیەکی زۆرئاشکرایە کەواتای ئەمانەم بەشێوەیەکی بەرفراوان شیکردۆتەوەو لەو ناسنامە مرۆیی، کۆمەڵایەتی و گەلەرییەی خۆم جیاناکەمەوە کەروونمکردەوە. هەڵبەتە جگە لەم خاڵانە چ لایەنێکی ژیان هەیە دەرکی پێبکرێ و نەبە تواناکاریەکانیشی دەگات.

لەوانەیە دیسان بپرسن ئەو بابەتانەی تائێستا لەبەرگرینامە هەوڵی باسکردنت دا چ پەیوەندییەکی بەدۆزەکەی دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا DMME وە هەیە. تەنانەت تەنیا ئەو گۆڕانکارییانەی رۆژانە لەچوارچێوەی پرۆژەی رۆژهەلاتی ناوین هی نوێتری دێتە سەر، ئەوە دەخاتەڕوو کە زۆر لەنزیکەوە پەیوەندی پێوە هەیە. تاوەکو شارستانییەتی رۆژئاوا شینەکرێتەوە، نەدۆزەکەی من، نەپەیوەندی تورکیا لەگەڵ یەکێتی ئەورووپاو ئەمریکا، هەردووکیان بەراستی دەرکیان پێناکرێت. تاوەکو ئەم پەیوەندییانەش شینەکرێتەوە، ئەوا وەڵامێکی راست نادرێتەوە کێشەکانی ژیانی تەواوی گەلانی رۆژهەلاتی ناوین، لە سەرووی هەمووشیانەوە گەلی کوردو تورك کەبووە بەگێژاو و دۆزەخ, لەیەکترجیاکردنەوەی ئەو دۆزانەی رەهەندی کۆمەڵایەتییان هەیەو راکێشانیان بۆ ئاستی کێشەی تاکەکەسی لەلایەن یەکێتی ئەورووپاو دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپاوە، هەروەکو بانگەشەی بۆدەکەن دوورە لەوەی لەبەرژەوەندی مافەکانی مرۆڤ و دیموکراتیزەبوون دابێت، ئەمە بەرژەوەندییەرستی و نەخۆشی زێدەڕۆیی تاکڕەوی شارستانییەتی ئەورووپا نیشاندەدات. بەشی ئەنجامی بەرگرینامە بۆ رۆشنکردنەوەی ئەم بابەتە تەرخان دەکەم. لەرێگایەوە روونەکەمەوە کەدادوەری بۆ تاك تەنیا لەمیانەی دادوەری بۆ کۆمەڵگاکەی فەراهەم دەبێت. ئەوە دەسەلمێنم کە ئازادی تاکێك گرێدراوی ئازادی ئەو گەلەیە کەلەناو کۆمەڵگاکەیدا جێگای خۆی دەگرێت.

## بەشی شەشەم

### رۆڵي دادطاي مافي مرۆظي ئەوروثا و يەكێتي ئەوروثا لەدۆزي عەبدوڵلا ئۆج ئالان

بەشێوەیەکی راست شیکردنەوەی چیرۆکی لەخاچدانی حەزرەتی عیسا کەفاکتەرێکی سەرەکی شارستانییەتی ئەورووپایە رۆڵێکی گرنگ لەرۆشنکردنەوەی دۆزەکەی مندا دەبینێ. لێرەدا لەچۆنییەتی پێشکەوتنی شێوەی بەسەرهاتەکە زیاتر, ناوەڕۆکەکەی ئێمە پەیوەندیدار دەکات. کاتێك دەقەکانی سەبارەت بەم بابەتە لەسەرووی هەمووشیانەوە ئینجیل بەشێوەیەکی کۆمەڵناسی قووڵ لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکرێت, ئەو بۆچوونەی بەگشتی پشتگیری لێبکرێت ئەوەیە؛ ئەو باوەڕو کولتوورەی لەحەزرەتی عیسادا کراوە بەسیمبۆل, پشت بەجیابوونەوەی کۆمەڵایەتی ئەو قۆناخە دەبەستێ کەبەخێرایی پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە. لەلایەك هێزە بیرۆکراتەکان و ئەرستۆکراتە نەریتییەکانی لەدەوروبەری ئیمپراتۆرییەتی رۆما کۆدەبوونەوەو بەشێوەیەکی بەهێز لەناوچەکەدا پێشدەکەوتن, لەلایەکی دیکەش جیهانی هەژارەکان کەلەناو تەواوی گەلان و کولتوورەکاندا بەهەمان خێرایی ژمارەیان لەزیادبووندابوو. لەو قۆناخەدا قودس لەسەرووی ناوەندە گرنگەکانی رۆژهەلاتی دەریای سپی بوو. تیرە عیبرانییەکانیش کەخاوەنی مێژوویەکی درێژخایەن بوون, دووچاری جیابوونەوەی کۆمەڵایەتی هاتن.

یەهودیا میرنشینێکی بچووکی عیبرانییەکانە. ناوەندەکەی شاری قودس بوو، وەك پارچەیەکی جیابوونەوەی کۆمەڵایەتی پیاوە ئاینییەکانیش پارچەبوون. پادشایەتی و چینی باڵای پیاوە ئاینییەکان لەناو یەکێتییەکی توندوتۆڵدان، دوای بەسەرهاتێکی درێژخایەنی بەرخۆدان بەکرێگراوێتییان بۆ ئیمپراتۆریەتی رۆما پەسەندکردووە.

لەرەوشێکی وەهادا کەشێکی بەرفراوانی یاخیبوون زاڵە، چەندین ناوەندی ڕکابەرایەتی سەریانهەڵداوە. ئەسەنییەکان لەسەرووی ئەمانەوە دێن. حەزرەتی یەحیا بەسەرۆکی ئەم تەریقەتە لەقەڵەم دەدرێ. بەتوندی دژی یەهودییە بەکرێگیراوەکان دەوەستن، لەناو میرنشینی یەهودیا و لەئەنجامی تەڵەکەبازییەکانی رەبەجەکان سەری دەبڕدرێ و دەکرێتە قوربانی ئەو ناوەندانەی بەرژەوەندییان تێکچووبوو. بەرلەوەی بکوژرێ، بەجۆرێك لەجۆرەکان حەزرەتی عیسا وەك خەلیفەی حەزرەتی یەحیا دەناسرێ. ئیتر سەرکێشیکردنی ناڕەزایی کۆمەڵایەتی کەوتبووە سەرشانی ئەو، لەناوەرۆکدا شەڕێکی چینایەتی بەرێوەدەبات، بەڵام بەرجەستەبوونی بەشێوەی تەریقەتێکی ئاینی هەژارانە، لەراستیدا لەو قۆناخەدا وەك ئەڵقەیەکی گرنگی نەریتی پێخەمبەرایەتی بەربڵاو شێوەدەگرێت.

جیاوازییەکەی ئەوەیە، بۆ یەکەمین جار لەکۆمەڵی یەهودی دادەبڕێ، وەك گووتەبێژی تەواوی گەلان سەرهەڵدەدات. بەجۆرێك لەجۆرەکان بەرامبەر میللیگەرایی یەهودی نوێنەرایەتی ئینتەرناسیۆنالیزم دەکات. هەڵبەتە تێکەڵاوی (کۆسمۆپۆلیتی) رۆما زەمینەی بابەتی پێویستی ئافراندووە. گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین لەژێر سایەی باڵادەستی رۆمادا جارێکی دیکە وەك خەرمان کۆدەکرێتەوە سەریەك. دوو پارت وەك پارتی هەژاران و دەوڵەمەندان سەریانهەڵداوە. لەسەردەمی هێلینیزمیشدا لەمیرنشینی یەهودیا پارچەبوونێکی هاوشێوە لەئارادابوو: ئەوانیش وەك سادقییەکان و فەریسییەکان بوون. بۆ یەکەمین جار لەرێگەی حەزرەتی عیساوە ئەم نەریتە سنوورەکانی قەومی یەهودی تێپەڕکردو بانگەوازی بۆ هەژارانی گشت قەومەکان دەکرد. کاهینە یەهودییە گەورەکان بەرامبەر ئەمە تۆقابوون داوایان لەوالی رۆمای میرنشینەکەیان "پلاتۆس" کرد حەزرتی عیسا سزا بدرێت، سەرباری ئەوەی وەك تاك سەرەتا پلاتۆس پەسندی نەکرد، بەڵام قورسایی یەهودییە بەکرێگیراوەکان و وەك پێویستی بەرژەوەندی هاوبەش، لەکۆتاییدا لەخاچدانی عیسا پەسند دەکات.

دواتر لەبەسەرهاتی حەواری و عەزیز و عەزیزەکانیدا دەزانین چ جۆرە ئایینێك سەریهەڵدا. گریکەکان (یۆنانییەکان)کە لەرۆما نارەحەتبوون، ئەو قەومە بوون کەبە شێوەیەکی هەرە فراوان تەڤلی "انجمام" ئەم ئاینە بوون. بەرخۆدانێکی قەوم ـ ئاینی پێشدەخەن. لەرێگای ئاینی نوێ بەتایبەتی لەئەنادۆڵ و نیمچە دوورگەی گریك بەجێدەبن، لەگەڵ هاتنی ئیمپراتۆر قوستەنتیندا دەبنە هاوبەشی دەوڵەت و وەك بێزەنتییەکان مۆرکی خۆیان لەرۆژهەڵاتی ئەوروپا دەدەن. دیسان لەقەومە بەهێزەکان و خاوەن کولتوورەکانی قۆناخ، بەتایبەت بەناوی ئاشووری و سوریانییەکان لەرۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەت لەگەڵ ئاینی نوێ ریفۆرمێکی گەورەی کولتووری پێشدەخەن. هەم لەناو ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی، هەم ساسانی پێگەی بەهێزو هاوشێوەیان بەدەستهێنا. لەناو ئەو سێسەد ساڵەی دوای حەزرەتی عیسا لەئەنجامی هەوڵە یەك بەدوای یەکەکانی گەورە قەشەکان ئاینی هەژارەکان بووە ئایدۆلۆژیای رەسمی ئەم دەوڵەتانەو جەماوەرە پەیوەندیدارەکانیان. کریستیانی "مەسیحی" کەپێکهاتەی ئایدیۆلۆژی بنچینەیی دەرەبەگایەتی ئەوروپای چاخی ناوین بوو، لەگەڵ قۆناخی ریفۆرماسیۆن دەبێتە یەکێك لەئایدیۆلۆژیا سەرەکییەکانی لەدایکبوونی سەرمایەداری سەردەمی نوێ.

ئەو پرسیارەی لەمیانەی ئەم باسەکورتەدا لەوەڵامەکەی دەگەڕێم ئەوەیە: کێ خوێنی حەزرەتی عیسای رژاند؟، وەك شەراب نۆشی و بوو بەدونیایی. ئەمە خودی شارستانییەتی رۆژئاوایە. ئیمپراتۆرییەتی رۆما وەك پادشایەتی دونیایی شارستانییەتی ئەوروپا خوێنی حەزرەتی عیسای رژاند، هەرچی پاپایەتییە، ئەم خوێنەی کردە شەراب و خواردییەوە، بوو بەپادشایەتی مەعنەوی ـ ئاخیرەت، بەها مەعنەوییە سەرەکییەکانی شارستانییەتی ئەوروپای پێکهێنا.

هەرچی بەشی حەزرەتی عیسا و هەژارەکانی خەڵوەتگایە بوو بەگەورەترین ئەشکەنجە و بەدواداگەڕان و کوشتن. کاتێك ئەم گۆڕانکارییانەمان شیکردەوە کەبناخەی شارستانییەتی رۆژئاوا پێکدێنێ, ئەوا دەبینین کەسیستەم هەم بکوژی قوربانییە, هەم شکۆدارکار و موژدەهێنەرەکەیەتی.

گرنگترین ناکۆکی شارستانییەتی رۆژئاوا لەم راستینەیەدا شاراوەیە. هەربۆیە نووسەری بەناوبانگی روسی "دەستۆفسکی"لەرۆمانەکانی خۆیدا بەقووڵی باس لەوەدەکات کەچۆن حەزرەتی عیسا سەرلەنوێ لەلایەن ئەو گەورە قەشانەوە لەسێدارە (خاچ) دەدرێ کەلەناوەڕۆکی حەزرتی عیسا نامۆبوون. لەکاتێکدا لەهەندێ رەوشدا کوژراوەکان بکوژەکان دەپەرستن, لەشارستانییەتی ئەوروپادا بکوژەکان قوربانییەکانیانی خۆیان دەپەرستن. لەراستیدا تەنیا گەڕاندنەوەی ئەم راستینەیە بۆ شارستانییەتی ئەوروپا راست نابێت, تەواوی سیستەمە زۆردارەکانی بەکاربردن لەڕێگای خوێن و ئارەقەی نێوچاوانی ستەملێکراوان دەژین. شەڕی تەواوی گەلان بەسەرهاتی رزگاربوونە لەم رەوشە, بەڵام لەئەنجامدا ئەم چیرۆکانەش لەبەرەسەن بینینی ئەربابەکانیان رزگاری نابێ.

بەتەواوی دوو هەزار ساڵ دوای بەسەرهاتی حەزرەتی عیسا, لەشوێنێکی نزیك بەجێگا و کولتوورەکەی, یەکێك لەوانەی دووچاری هەمان رەوش هاتووە منم, ئەمجارە لەجیاتی رۆما, وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا, هێزی ئیمپراتۆرییەتی شارستانییەتی رۆژئاوایە. لەکاتێکدا رۆما هێزی لەدایکبوونی شارستانییەتی رۆژئاوا بوو, ئەمریکا زیاتر لەوە نزیکە ببێتە هێزی لەناوبەر هەروەکو رۆما, بەشێوەیەکی خێرا لەرۆژهەڵاتی ناویندا بڵاودەبێتەوە, پێویستییەکی زۆری بەبەکرێگیراوان هەیە. کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین بەشێوەی هەژاران و دەوڵەمەندەکان تازە بەشێوەیەکی خێرا لەیەك جیادەبێتەوە. لەپاڵ پارتە دەوڵەمەندە نۆکەرەکان, چەندین پارتی هەژارنیش سەریانهەڵداوە. ئەمجارە کوردان هەژارترین گەلانی ناوچەکەن. دووچاری فشارێکی دووقاتی و سێ قاتی دەبێتەوە. لەبەرئەوە ئاماژەی پێنادەم کەدەخوازم وەکو ئەو بم, بەڵام چۆنییەتی لەدایکبوون, شێوازی گەورەبوون, کەوتنە ناو سیستەم, و رکابەرایەتی و شێوازی دەستگیرکردنەکەم لەلایەن شێوەو ناوەڕۆك زۆر نزیکی بەسەرهاتی حەزرەتی عیسایە. هەروەکو دەزانرێ هەژارترین کەسانی رۆژهەڵاتی ناوینم وەك بنکە هەڵبژارد. لێکەڕینی هزری و ئایدیۆلۆژی نوێ زەق و بەرچاوە. کۆمەڵەی گرێدراو پێکهاتبوون. ئیمپراتۆری نوێی رۆما, ئەمریکا و بەکرێگراوەکانی زۆرناڕەحەت ببوون, هەروەها دەوڵەتی یەهودیاش لەناو پەیوەندییەکی بەکرێگراوی توندوتۆڵدایە. لەناو گریکەکانیش (یۆنانییەکان)لایەنگری بەهێزیان هەیە, "کلاندریس"ی یۆنانی لایەنگرێکی توندڕەوی خیانەتە کوشندەکەی یەهودا ئیسکاریۆتە. میرنشینە کوردەکانی یەهودیا ترسێکی گەورەیان لەهەڵکشانی کوردە هەژارەکان هەیە. پێویستی بەتۆکمەکردنی پێگەی تەواوی بەکرێگیراوەکانی ناوچەکە هەیە. شوێنگەی ئایدیۆلۆژی ــ سیاسی من بەسەختی هەموویان ناڕەحەت دەکات. بەرژەوەندییەکان تادواڕادە بۆ پیلانگێڕی لەبارە, تاوەکو بۆ ماوەیەکی دیکە دەسپۆتەکان لەسەرپێیان رابگرن.

هەرهیچ نەبێ سانیت پاولی گەورەحەواری دوای یەك ــ دوجار هاتووچۆ کرا بەقوربانی. رۆما تۆزێك بەسنگفراوانی رەفتاری لەگەڵدا کرد, بەڵام لەیەکەم سەفەرم بۆ ئەوروپا رفێنرام و دەستگیرکرام. پێویست ناکات بەدرێژی باسی بەسەرهاتەکە بکەم و بینووسم, ناوەندی تەواوی مەزهەبەکان گەڕام, کاتێك لەسەر ئاستێکی فەرمی لەدەرگای ئەسینای ناوەندی گریکەکان, و مۆسکۆی روسەکان, و رۆمای لاتینەکانم دا, لەلێکدانەوەو حیسابە بەرژەوەندی پەرستە سەهۆڵ ئاساکانیان, تێگەیشتم کەجێگام نییە. لەبەهای گرانی سیاسەتی پشتبەستن بەدەوڵەتان" هەرچەندە لەناوەڕۆك نەبێ و بەشێوە بێت"رزگارم نەبوو, زۆر بەئاشکرایی نیشانیاندەدا کەئایدیۆلۆژیاکان و دۆستایەتی بەرامبەر بەرژەوەندییەکانیان هیچ بەهاو بایەخێکی نییە. هزرو باوەڕەکانیان لەمێژبوو ببوو بەپارەو پووڵ. بەرژەوەندییەکانی پارە ـ پووڵ چۆنی پێویست بکات, لەمیانەی ئەو پێڕەوانەی پیلانگێڕی کەتێیدا بەئەزموونن, بەشێوەی کارامەیی و وەستاییەکی گەورە جێبەجێیان دەکرد. ئەو دەسەڵات و هێزەی رەوشی

حەزرەتی عیسای یەکلاکردەوە، رۆمابوو. ئەگەر هێزو دەسترۆیی رۆما نەبێ، عیسا نەدەستگیر دەکرێ و نەلەخاچ دەدرێ. دەسەڵاتی یەکلاییکەرەوە لەگرتنی منیشدا ئەمریکایە. ئەگەر ئەمریکا نەبووایە، هەرگیز من دەستگیرنەدەکرام. ئەو رۆڵەی بەکاربەدەستە تورکەکانیان بەخشیوە، لەجەللادی و پاسەوانێتی زیاتر نییە. ئەو رۆڵەی بۆ یەکێتی ئەورووپاش دیاریکراوە، وەك هێزی یاسایی (مافپەروەری) شارستانییەتی رۆژئاوا درکاندنی دوا گووتەی دادگایە. دەشێ تۆڕی ئەم پەیوەندییانە بەرجەستەتر بکەین کەبەشێوەیەکی قەباو گشتی ئاماژەمان پێکرد.

ئیمپراتۆریای بێزەنتی لەرۆژئاوا زیاتر نزیکی هێزی ئیمپراتۆرییەتی رۆژئاوایە. هەرچی سەرگرتنی هێرشی خاچپەرستەکانە لەرۆژهەڵات بەهۆی هاوسەنگی هێزی سەردەمی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی سەرکەوتوو نەبوو. چونکە هەروەکو شارستانییەتی هێلینی دوای ئەسکەندەر لەتوانەوە رزگاری نەدەبوو، لەسەر بنەمای سەرمایەداری هەڵکشاو بۆ یەکەمین جار لەساڵی 1898 ناپلیۆن هێرشێکی تۆکمەی ئەنجامدا. ئەو بەربەستەی رووبەڕووی بوویەوە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بوو.

چەندە سیستەمی سەرمایەداری وەك هێزە باڵادەستەکەی شارستانییەتی نوێ شوێنی خۆی قایمدەکرد، دەبووە ناوەندی شارستانییەتی ئەوروپا. مسۆگەر باڵابوون لەدەست ئەورووپادا بوو. لەکاتێکدا سوڵتانە عەرەبەکان لەکۆتاییەکانی سەدەی پانزەهەم بەناوی شارستانییەتی رۆژهەڵات بۆ یەکجارەکی لەئیسپانیا بەدەرنران. عوسمانییەکانیش لەدووەم گەمارۆی ڤییەننا 1683 بەزیانێکی گەورەو شڵەژاوی دەرکەوتن و بەخێرایی بەرەو قۆناخی دواکەوتنەوە رۆستن. ئیتر مەحاڵ بوو بەرامبەر شارستانییەتی ئەوروپا خۆیان رابگرن کە لەهەڵکشاندا بوو، لەمێژبوو سەردەمی بەسەرچووبوو، لەگەڵ تێکشکانی ناپلیۆن، ئینگلتەرە بوو بەهێزی لەپێشینەی شارستانییەت. ئیمپراتۆرییەتی ئینگلیزیش بەهەستکردن بەو راستییەی باڵادەستی جیهان بەرۆژهەڵاتی ناویندا تێپەڕدەبێت، لەساڵانی 1800 بەدواوە رووی لەناوچەکە کرد، ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی کە لەنێوان روسیای قەیسەری باکوور، لەباشووریش لەلایەن ئیمپراتۆرییەتی ئینگلیز تەنگەتاو بوو، لەمیانەی سیاسەتەکانی هاوسەنگی سەدەیەکی دیکەش تەمەنی خۆی درێژکردەوە. ئەوەی گرنگە سەبارەت بەقوربانییەکانی ئەم سیاسەتەی هاوسەنگییە. لەکاتێکدا هەرسێ قەومی گرنگی ئیۆنییەکانی ئانادۆڵ و، ئەرمەنییەکانی کلیکیا و ئانادۆڵی رۆژهەڵات و ئاشوورییەکانی میزۆپۆتامیا لەئەنجامی گەمەکانی هاوسەنگی تارادەیەکی زۆر پاکتاوبوون، کوردانیش تەنیا توانیان هەبوونی جەستەیی خۆیان بپارێزن.

وڵاتانی ئینگلتەرە، فەرەنسا و روسیا دەیانخواست لەناوچەکە بەکاریگەر بن بەئامانجی قەرەبووسەندن لەعوسمانییەکان ئەو گەلانەی ناوچەیان وەك ئامرازی فشار بەکاردەهێنا کەئاماژەمان پێکردن. لێکدانەوەی بەرژوەندی ماددی سەرمایە لەمێژووی کولتووری هەزاران ساڵەی ئەم گەلە باڵاتر دەبینرا. هەرچەندە تورکە عوسمانییەکان دوادەکەوتن هۆکارەکەیان لەم گەلانەدا دەبینی و تۆزێکی دیکەش هەناسەدانیانی سنووردارادەکرد. کاتێك بەیەکەمین شەڕی جیهانی دەگەیشتین، ئیتر مێژوو رۆحە مەترسیدارەکانی دەرڤاند. لەکاتێکدا ئیۆنییەکان، ئەرمەنییەکان و ئاشوورییەکان لەژێر پاشماوەکانی ئیمپراتۆرییەت لەپەلەقاژەی مەرگدا بوون، کوردەکانیش لەقووڵایی و بەرزایی شاخەکاندا تەنیا دەیانتوانی هەبوونی جەستەیی خۆیان بپارێزن. لەکاتێکدا کێشمەکێشی هەشتسەد ساڵەی نێوان سوڵتانە تورکەکان و هێزە دەرەبەگایەتی و دەوڵەتە سەرمایەدارەکانی ئەوروپا، بەباڵادەستبوونی ئەوروپا ئەنجامگیربوو، تەنیا قوربانییە خەمگینەکانی لەدوای خۆی بەجێدەهێشت. مێژوونووسەکان بەشێوەیەکی راست باسی هۆکار و ئەنجامەکانی ئەم قوربانیانە ناکەن، چونکە رووی ڤێزەون و بکوژی خۆیان لەئاوێنەی راستییەکاندا دەبینن. دەوڵەتە گەورەکانی ئەوروپا بەرامبەر بەئەم رووداوانە بەرپرسیارن کەلەم دووسەد ساڵەی دوایی لەرۆژهەڵاتی ناویندا روویانداوە، پێشتریش هەمان ئەم گەلانە لەناوچەکەدا هەبوون. لەمیانەی ئەو هاوسەنگییانەی لەناو

ئیمپراتۆرییەتدا ئاوایانکردبوو بەلانی کەم لەبواری ئابووری دەوڵەمەندترو لەبواری کولتووریش بەختەوەرتر بوون, لەبواری سیاسیش لەتورکەکان دواکەوتووتر نەبوون. لەئاکامی ئەو بڕوایەی بەئەوروپا هەیانبوو, هەروەها ئەو لێکدانەوە ناواقیعیانەی بوون بەدەوڵەت گەورەترین یاری قوماریان کرد, یارییان پێکرا, لەئاکامدا زۆرخراپیش دۆڕاندیان. بەرماوەکانی شمشێریش بوون بەکۆچبەری وڵاتانی رۆژئاوا. بەرەو ئەمریکا و ئەوروپا رێیان گرتەبەر, هەوڵیاندا لەمیانەی یوتۆپیای "خاکە پیرۆزەکانی بەڵێندراو" خۆیان بژێنن.

هەروەکو دەبینین لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا لەوڵاتەکانی یەکێتی ئەوروپاو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەندێ پەرەسەندنی هاوشێوەی ئەو پێهەڵگرتنانە ئەنجامدەدرێ کەلەساڵی 1896 لەرێگای کۆنگرەی سەهیۆنی یەهودییەکان ئەنجامدرا. دەشێ هیوا و ئومێدیان بەپرۆژەی ئەمریکا سەبارەت بەرۆژهەڵاتی ناوینی گەورە هەبێ. داگیرکردنی ئێراق رێگای لەپێش قۆناخێکی نوێی پڕ لەجۆش کردۆتەوە. کوردان نزیکترین پالێوراون بۆبوون بەهاوپەیمانێکی ساغڵەمی پرۆژەکە. ئامانج گۆڕینی ئەو ژێرخانە ئابووری و سەرخانە سیاسی ـ ئایدیۆلۆژییەیە کەدەبنە کۆسپ و هەڕەشە بەرامبەر بەئیسرائیل و سیستەمی سەرمایەداری لەناوچەکەدا. هەردوو هێزی ئۆرگانیزی سیستەم نەتەوە یەکگرتووەکان و ناتۆ, وەك هێزی چالاکی دیپلۆماسی و سەربازی پرۆسەکە ئەرکیان پێدراوە. گروپی 8 وڵاتیش پشتگیری هێزی ئابووری خۆی کەمناکاتەوە.

گەرەنتی سەرەکی ئەوەیە کۆماری تورکیای خاوەن میراسی عوسمانییەکان چۆن پێشوازی لەم قۆناخە دەکات, نەهەلومەرجی ناوخۆ نەهی دەرەوە بۆ دووەمین قۆناخی رزگاری نیشتمانی لەبار نییە. لەڕەوشی بەرخۆدان بەرامبەر سیستەم, ئەوا لەئێراق ـ یۆگۆسلاڤیا, تەنانەت روسیا سەرکەوتووتر نابێ. تەسلیمبوونی تەواویش لەخزمەتیدا نییە. هەلومەرجەکانی هاوپەیمانێتیش وەکو دوای 1950کان بەرێوەناچێت. ئەوەی دەمێنێتەوە ئەنجامدانی ریفۆرمە, ئەو ئیرادەیەش لەئارادانییە ئەمە ئەنجامبدات. چەندەی بۆبکرێت راکێشان و بەردەوامکردنی وەك سیاسەتێك دیارکردووە. لەمیانەی زهنییەتێکی دوارادە موحافەزەکار کەدرێژەدان بەهەر رۆژێکی تەمەنی ستاتۆکە بەدەستکەوت دەزانێ, کۆماری تورکیا هەوڵی خۆپاراستن دەدات. ئەمەش تارادەیەکی زۆر بەدوا قۆناخەکانی تەمەنی عوسمانی دەچێ.

ئەو پیلانگێڕییەی سەبارەت بەمن ئەنجامدرا, لەژێر ئەم هەلومەرجانە ئەنجامدرا کەکۆماری تورکیا تێیدا دەژی. تاوەکو باش دەرك بەکرۆکی پیلانگێڕی و لایەنەکانی نەکرێ ئەوا ناتوانرێ هیچ گرفتێك چارەسەر بکرێت, ناتوانرێ شرۆڤەیەکی راست سەبارەت بەچارەنووسی کۆماری تورکیا ئەنجامبدرێ. هەرچەندە هەندێ هەڵەو کەموکوڕی جددیش لەئارادابن, بەڵام ناتوانرێ نکۆڵی لەوەبکرێت کەمن بەگشتی تەواوی گەلان, بەتایبەتیش نوێنەرایەتی پێهەڵگرتنە دیموکراتییە گەورەکەی گەلی کوردستان دەکەم. ئاشکرایە تاوەکو چالاکی 15 ی ئاب, هەوڵمدا رێکخستنێکی زهنی پێشبخەم. ناچاربووم ئەمە وەك هۆنینەوەیەکی تێکەڵاوی سۆسیالیزمی بونیادنراوو رزگاری نیشتمانی پێشبخەم, پێویستە ئەمەش پەسند بکەم کەنەمدەتوانی لەمەزیاتر بەرەو پێشەوەی ببەم. ماوەی 15ساڵی نێوان 15ی ئابی 1984 ـ 15 ی شوباتی 1999 قۆناخی چالاکی ئەم رێکخستنەی زهنییەت بوو. ئەو ماوەیە کەچالاکی دەرکەوتەپێش دەتوانرێ بگووترێ بەباشترین شێوە پراکتیکی روونکردەوە. لەمیانەی ئەم قۆناخەی پراکتیکدا دەرفەتی ئەوەش بۆ من رەخسا کەباشتر خۆم بناسم. دەتوانرێ بگووترێ کەبەشێوەیەکی باش تواناکارییەکانی چارەسەری کەسێتی راستینەو گرفتەکانی ئەو دیاردەیەم باش تاقیکردنەوە, کەنوێنەرایەتیم دەکرد, بەڵام کاتێك دەڵێم من, گرنگ ئەوەیە زێدەڕۆیی نەکرێت, ئەوەی من ئامرازێکە. ئەوەی ئاشکرابووە, گەلێکی بەرەچەڵەکی خاوەن راستینەی کۆمەڵایەتییە کەهەزاران ساڵە سەرکوتکراوە. سەرباری ئەوەی بەشێوەیەکی باش ئیلاهیبوونم شیکردۆتەوە, ئەو زمانزانییەی بەکارمهێناوە زیاتر نزیکی زانستیبوونە.

ئەوەی بەرامبەر راستینەی گەلی کوردستان سەریهەڵدا ناڕەحەتییەکی گەورەی فەتحکارەکان و ئەوانەبوو کەبەهەزاران ساڵ بەکرێگیراوێتی دەکەن (لەجووتەی گلگامێش ـ ئەنکیدۆوە تاوەکو دەگاتە ئەوانەی لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا لەبەرچاوانن). لەژێرچەتری ئەمریکای هێزی ئیمپراتۆری قۆناخ لەساڵی 1998 پرۆسەکانی ئەنقەرەو واشنتۆنیان دەستپێکرد. لەسەر پرۆگرامێکی سیاسی رێککەوتن کەبەمانای دەوڵەتی فیدراڵی کوردستان بێت (لەسەرکاغەز). بەرنامەکە لەژێر پاراستنی بەڕێوەبەرایەتی ئەنقەرە بەڕێوەدەچوو, بەرامبەر ئەمەش بڕیاری هاوبەش سەبارەت بەسەری عەبدوڵلائۆج ئالان و بەتیرۆریست لەقەڵەمدانی "PKK" دەدرا. ئەم حوکمەش بەشێوەیەکی بابەتی بەواتای قڕکردن و پاکتاوکردن دەهات. لەگەڵ ئەوەی زۆر بەنهێنی بوو, بەڵام لێکۆڵەرەوەیەکی سیاسی وریا زەحمەتی لەوەدا نەدەبینی تێبگات کەئەم رێککەوتنە "رێککەوتنی 17 ی ئەیلوولی 1998 ئەنقەرە ـ واشنتۆن" پڕە لەناکۆکی و لایەنەکان هەوڵی خەڵەتاندنی یەکتری دەدەن و لەهەڵوێستێکی تەکتیکی زیاتر تێپەڕناکات. لەرێگای ئەم رێککەوتنەوە شاڵاوە گەورەکەی فشارو بەدواداگەڕانی عەبدوڵلا ئۆج ئالان لەسەرتاسەری جیهاندا خێرایی پێدرا. بەلایەنی کەم باڵێکی ئەمریکا بەبڕیاربوونی مسۆگەری نیشاندا, کۆمەکی مەزن و سووربوونی راستڕەوەکانی ئیسرائیلیش رۆڵی لەمەدا هەبوو, لەکاتێکدا ئینگلتەرە نەخشەیەکی باشی دانا ئیسرائیل ـ مۆسادیش لەمیانەی کردارێکی سیخوڕی باش تەڤلی پیلانەکەبوو. پیلانی ئەم پیلانگێڕییەی دوای ئەوە پێشکەوت کەهەوڵی تەقینەوەی بۆمبا یەك تەنییەکەی 6 ی گوڵانی 1996 ئەنجامگیرنەبوو کەسەرۆك وەزیرانی تورکیا "تانسۆ چیلەر" 50 ملیۆن دۆلاری بۆ تەرخانکرد بوو, لەدیمەشق تەقیەوە, دوای ئەوەی لەئەنجامی ئەو رێککەوتنە ئابووری ـ سەربازییەی لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی ئیسرائیل ئەنجامدرا, هاتەئاراوە, لەئەنجامی گووتەی فەرماندەی هێزی وشکانی تورکیا لە 17 ی ئەیلول سەبارەت بەسوریا کەبەواتای دوا ئاگادارکردنەوە دەهات, هەنگاوێکی دیکە بەرەو پێشەوەچوو. کاتێك شەڕ لەگەڵ سوریا کەوتە رۆژەڤەوە, جگە لەگووتەی "چۆن دەخوازی وەها بڕۆ" هیچ هەڵوێستێکی دیکە لەبەڕێوەبەرایەتی سوریا نەبینرا.

دوای بانگهێشتێکی نیو فەرمی کەتاوەکو ئێستاش کرۆکەکەی نەزانراوە بڕیاری "ماجەڕای ئەسینا"م دا, هەنگاونان بۆ شاخەکانی وڵات خەیاڵی من بوو. بەڵام بەهۆی نیگەرانییە ئەخلاقییەکانم ئەم سەفەرەم دواخست کەلەوانەیە رێگای لەپێش مردنی هەزاران کەس بکردبایەوە. بیرم لەوەکردەوە تاقیکردنەوەی شانسی چارەسەری سیاسی لەئەوروپا باشترو گونجاوترە. بەتایبەتیش لەدوای ئەوەی لەساڵی 1997 وە لەلایەن رێکخستنی ئەوروپامان هەندێ زانیارییان بۆ ناردین کەگوایە سەرچاوەکەی سوپایە, ئەم بڕوایەم زیاتر دەرکەوتەپێش, بەڵام ئەوەی لەئەسینای پایتەخت پێشوازی لێکردین خەڵکانێکی دۆست نەبوون, بەڵکو ئەسینای سۆزانییەکەی میتۆلۆژیابوو کەلەناوچاوانی خوداوەندی پیاو "زیۆس" خولقێنراوەو, هیکتۆری قارەمانە بەناوبانگەکەی تروادەی پەلکێشی ناو شەڕێك کرد کەبۆی ئامادەنەبوو. لەناو گۆڕەپانێکی کوشندە لەبەرامبەر تەواوی هێزەکانی شارستانییەتی خاوەن زهنییەتی قازانجی ئابووری منی ناچاری شەڕێك کرد. گوایە لەبەرامبەریشدا "ئەنادۆڵ" و قوبرسی وەرگرت. یاخود بەلایەنی کەم لەم بوارەوە دەرفەتێکی سیاسی دەڕەخسا. هەرکەسێکی وەکو من کەرێبازی سۆسیالیزمی بونیادنراوو رزگاری نیشتمانی ئاویداوە, نەیدەتوانی ئەم فێڵبازییە شیبکاتەوە. بەرامبەر تەڵەکەبازی ئەسینا کەلەمێژوودا زۆر بەناوبانگەو ئەسکەندەرو ناپلیۆنیش باسیانکردووە, پێشەنگ و جوامێرێتی رۆژهەڵاتی ناوین دەیتوانی چی بکات؟.

بابەتی سەرەکی کەپێویستە بەرگرینامەکەم لەقۆناخی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا DMME رەخنەی بکات سەبارەت بەپەیوەندی نێوان تاك و کۆمەڵگایە. هەروەکو لەیەکەم بەشی بەرگرینامەکە بەشێوەیەکی بەرفراوان تاوتوێمان کرد, لەگەشەکردنی جۆری مرۆڤدا بەکۆمەڵگابوون لەپێشەوە دێت. ئەو تاکەی پشت بەکۆمەڵگا نەبەستێت پێناسەکردنیان بریتییە لەتەفرەدان و خەڵەتاندن. لەکۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتدا لایەنی زاڵ بەردەوام بەبناخەگرتنی بەکۆمەڵگابوونە. هەڵوێستێکە

پەیوەنـدی بـەکۆنبوون و پەرەسـەندنی کۆمـەڵگاوە هەیـە. هەرچـی ئـەوەی لەگـەڵ لـەدایکبوونی شارسـتانییەتی رۆژئـاوا دەردەکەوێتـە پـێش تاکڕەوێتییـە. هـەم لەسـەردەمی گریـك, رۆمـا, هـەم دواتـر لەسـەردەمی کرسـتیانی چـاخەکانی نـاوین لەشـرۆڤەکردنیاندا لێگەڕینـەکانی تـاك کـەم نـەبووە, لەرێنیـسانس و دواتـری, هـەروەکو بڵێـی تـاکڕەوێتی شۆڕشـی مێـژوویی بەخۆیەوە بینی. ئەو بەکۆمەڵگابوونـەی بەهـەزاران سـاڵ بەشـێوەیەکی زێـدەڕۆیی لەکۆمـەڵگای رۆژهەڵاتـدا پەرەیـسەندو تـاکی خنکاند, یەك لەدوای یەك لەرێگای رێنیسانس, ریفۆرم, شۆڕشی زانستی و بزووتنەوەی رۆشنگەری پارچـە پارچـەکراو, سـەرەتا هاوسەنگی نێوان کۆمەڵگا ـ تاك ئاواکرا, لەسەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەمیش هەڵکشانی زێدەڕۆیی تاك سـەریهەڵدا, تـاکڕەوێتی مۆرکی خۆی لەم سـەردەمەمان داوە. ئـەمجارەش نەخۆشـی لـەو تاکڕەوێتییـە سەرچاوە دەگـرێ کەسـنوورەکانی تێپـەڕکردووەو کۆمەڵگای کرتاندووەو تێکیداوە. هاوسەنگی تەندرووستانەی نێوان تاك ـ کۆمـەڵگا, هـەروەکو بڵێـی بەشـێوەیەکی ئەوپەڕگـەڕی بـەلای تاکـدا شـکاوەتەوە. بەکۆمـەڵگابوون وەك کۆیلایـەتیبوون هەڵدەسـەنگێندرێ. لەراسـتیدا ئـەمجۆرە تاکڕەوێتییـە لەهەلومەرجەکانی ئەمڕۆماندا بەشێوەیەك بەئاژەڵبوونی پۆست مۆدێرنیزم و لەئاستێکی بەرزدا گەڕانەوەیە بۆ جۆری مرۆڤـە سەرەتاییەکان (نیو مرۆڤ ـ نیو ئاژەڵ).

تـەنیا رەنگدانـەوەی مـافی "سـەرلێدانی کەسـی (شەخـسی) بـۆ دادگـای مـافی مرۆڤـی ئـەوروپا DMME گوزارشـت لەرەنگدانەوەی ئەم نەخۆشییە دەکات لەگۆڕەپانی مافپەروەری(حقوق)دا. ئـەو تاکـەی بەهـەموو شـێوەیەك کۆمەڵایەتییـە, لـەم چوارچێوەیەشدا هەموو شتێکی خۆی بەختکردبێت, دابڕاندنی لەکۆمەڵگاکەی و بەجودابینینی لەگەڵ ئیرادەی گەلەکەی, تەواو فێڵبازییەکی یاساییە. ئەمـە لەگـەڵ چـەمکی دادوەریـش ناکۆکـە کەبنـەمای یاسـا"حقـوق ـ مافپـەروەری" پێکـدێنێ. هـەروەها بەزانینەوە بێت یـان بەنـەزانین, دەبێتـە ئـامرازی شـاردنەوەی راسـتییەکی سیاسـی گـرنگ. بزووتنـەوەی سیاسـی ئـازادی گـەلی کوردسـتان لـەدەرەوەی یاسـا دەهێڵێتـەوە, مافـداری بزووتنـەوەی ئـازادیخوازی کـوردان لـەدەرەوەی رۆژەڤ دەگـرێ, ئەمـەش رێگـا لەپێش پەردەپۆشکردنی ئەو بەرپرسیارێتییە دەکاتـەوە کەئـەمریکا سـەبارەت بەکێـشەی کـورد هەیـەتی. لـەدۆزی لـەیلا زانـا و هەڤاڵەکانی ئەم راستییە زیاتر ریسوا دەبێ و نەنگیان دەردەکەوێ, گوایە لەژێر ناوی خاوەنداریێتیکردن لەگـەلی کـوردی دەرەوە (ئەوانیش لەناو زیندانێکی سەرکراوەدان) و زیندانیانی دیکە جیادەکرێنەوەو هەوڵی رزگـارکردنی مـافی مـرۆڤ دەدرێ. بـەهۆی دۆزەکەم مەحاڵە ئەم فێڵە پەسند بکەم کەسەرچاوەی خۆی لەشارستانییەتی ئـەوروپا وەردەگرێـت. ئـەوەی چـاوەڕوانی دەکـرێ بڕیارێکە هاوسەنگی تاك ـ کۆمەڵگا پەسندبکات.

DMME لەو بڕیارەی کە لە 6 ی گوڵانی 2003 سەبارەت بەمن داویەتی گوایە ئـەو بڕیـارەی دادگـای ئاسایـشی دەوڵـەتی تورکیـا سـەبارەت بـەمن داویـەتی لەمیانـەی بیـانووی "دادگاکـە سـەربەخۆ نـەبووەو بەشـێوەیەکی عادیلانـە دادگـایی نەکراوە"گونجاوی نـەبینیبوو. بەرامبـەر ئەمـەش ئـەو دادگایـە سـەربەخۆ نییـەو ناتوانـێ بڕیـاری راسـت بـدات, لـەو بارەیـەوە بڕیاریدا کەدەستگیرکردنم لەمیانەی بەرفراوانترین پیلانگێڕی سەدەی بیستەم بەگوێرەی یاسایە. ئەم بۆچوونە یاخود بڕیـارە, لەناوەڕۆکی خۆیدا تەواو سیاسییەو بەردەوامی پیلانگێڕییە. پێشتر وەك بەشێکی نەخشەکە دەستنیشانکراوە.

رفاندنم تەواو پێچەوانەی ماددەی "5 لەسەر 2"ی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا PMME و سەرباری ئەوەی گەڕاندنەوەم بۆ ئەو شوێنەی لێی دەستگیرکرام پێویستییەکی یاسایی PMME یە, بەتایبەتیش نەگەڕانەوەیان بـۆ ئیفادەکـانی مـن"ئیفـادە وەرنەگرتنم" بڕیاری لەپێشینەیان ئاشکرادەکات. نەك تاکە بەڵگەیەك, تەنانەت هەزاران بەڵگە سەبارەت بەرفاندنی من هەیە. لەوەش گـرنگتر, مـن لـەو شـوێنە رفێنـدرام کەپێویـستە بـەخاکی ئـەوروپا لەقەڵەمبـدرێ. ئەگـەر دائیـرەی مـەزن "DMME" بخوازێ بەرامبەر بە راستی بەڕێز بێت پێویستە ئیفادەی من وەربگرێ؛ ئەگەر پێویستی ئەمە نـەبینێ, دەبـێ ئیفـادەی دیـلان, کالانـدریس و ئـەوانی دیکـە وەربگـرێ کەشـاهێدی ئـەم مەسـەلەیەن. هـەروەها پێویـستە بەڵگـەو داواکارییـە بـەرفراوان و

بەهێزەکانی پارێزەرەکانم سەبارەت بەم بابەتە رەچاو بکەن. من خۆم لەدادگاییکردن نادزمەوە. دادگاییکردن لەدادگایەکی سەربەخۆ و عادیلانە کەبەگوێرەی رۆحی ئەو پەیمانانە بێ کەتورکیاش ئیمزای کردووە، داوایەکی سروشتی خۆمە، پێویستە سەرەکیترین ئەرکی DMME کردنەوەی رێگای دادگاییکردنێکی بەمجۆرەبێت. یەکەمین هەنگاوی عەدالەتی کرانەوەیەتی لەم بوارەدا. دادگا لەمیانەی ئەو بڕیارەی وەریگرتووە ئەم رێگایە ناکاتەوە. بەپێچەوانەوە، لەسێدارەدان بەربەست دەکات و لەژێر حوکمی ئەبەدی رزینمان گونجاو دەبینێ. مردنت نیشاندەدات، ناچارت دەکات بەپەتا رازی بیت. بەهەرحاڵ هێندە بێ ئاگانیم تاتێنەگەم کەئەمە فێڵێکی هێزە ستەمکارەکانە کە بەهەزاران ساڵە تاقیدەکرێتەوە. بەڕاستیش ئەگەر دائیرەی باڵای DMME بخوازێ رێگای دادگاییکردنێکی عادیلانە بکاتەوە، ئەوا دەبێ ئەم خاڵانە رەچاو بکات.

یەکەمیان: لەئاکامی ئەو بڕیارەی دادگای ئیستیئنافی رۆما داویەتی، ناسنامەکەم پەنابەری سیاسییە. بەڵگەکەی لەدەست دادگادایە.

دووەمیان: بەگوێرەی ئەو بڕیارەی دادگای سزای گرانی ئەسینا دەرهەق بەمن دەریخستووە، پێویستە من لەناو سنوورەکانی وڵاتی یۆناندا بم. واتا، بەگوێرەی یاساو بڕیارەکەی دادگا هێشتا من لەناو سنوورەکانی دەوڵەتی یۆناندام. جێگیرکردنم لەزیندانی تاکەکەسی ئیمرالی پێشێلکردنی یاسایە. ئەمە خاڵێکی زۆرئاشکرایە. ئەو پرسیارەی پێویستە دادگای گەورەی "DMME" بەدوای وەڵامەکەیدا بگەڕێ ئەوەیە: لەکاتێکدا بەگوێرەی یاسا پێویستبوو لەناو سنوورەکانی یۆناندا بم، ئەی چۆن شەش ساڵە لەنێو ژوورێکی تاکەکەسی سزای هەتا هەتاییم (ئەبەدیم) بەسەردا سەپێنراوە؟! تاوەکو وەڵامێکی راست بۆ ئەم پرسیارە نەدۆزرێتەوە، ئەرێکردنی بڕیارەکەی دائیرەی یەکەم، تەواو دەسەلمێنێ کەهەڵوێستێکی سیاسییە. ئەگەر دادگا بخوازێ ئاگاداری وردەکارییەکانی رفاندنم بێت، خاوەنی بڕیاری لەپێشینە نەبێت، پێویستە بەشێوەیەکی بەرفراوان ئەو ئیفادەیەم وەربگرێ کەلێرەدا بەکورتی ئاماژەم پێداو گوێ لەتەواوی ئەو شاهیدانە بگرێ کەگەواهی مەسەلەکەن. ئەگەر بڕیارێکی راست بدات ئەوا من لەناو سنوورەکانی یەکێتی ئەوروپا لەقەڵەم دەدرێم. ئەوکاتە لەلایەن دادگای سەربەخۆوە گوێ لەئیفادەکانی کۆماری تورکیا و لایەنی کورد دەگیردرێ و بەبڕیارێکی یاسایی و عادیلانەدەگەن. کۆماری تورکیا بەردەوام من بەبەرپرسیاری کوشتنی 30 ـ 40 هەزار کەس لەقەڵەم دەدات. چۆڵکردنی نزیکەی چوار هەزار گوندو هەواری لایەنی کوردو نزیکەی 10 هەزار تاوانی بکەری نادیارو نەفیکردن، کۆچبەری، ئەشکەنجەی قورس، شەهیدبوونی نزیکەی 30هەزار گەریلا، پێشێلکردنی تەواوی مافەکانی مرۆڤ و داننەنان بەدیموکراسی، بەشێکی بچووکی ئەم ئامارەیە، بەبێ رەچاوکردنی ئەمە، DMME چۆن دەتوانێ بەبڕیارێك بگات؟.

ئەمە ئامارێکی شەڕە، لەمێژوودا هیچ کەسێکی تیرۆریست ئەو هێزەی نەبووە 30 ـ 40 هەزار کەس بکوژێ، ئەگەر شەڕێك لەئارادابێت بەتایبەتیش ئەگەر وەکو شەڕێکی لاسەنگ لە دژی گەلی کورد پەسند بکرێت، لەدۆخێکی وەهادا پێویستە هاوشێوەی دادگاکانی نورمبێرگی دوای شەڕی دووەمی جیهانی، و دادگای لاهای دوای شەڕی بۆسنا ـ هەرسك و ئەو دادگایانەی دوای ژینۆسایدەکان سەبارەت بەهەندێ وڵاتانی ئەفریقیا لەژێر چاودێری نەتەوەیەکگرتووەکان ئەنجامدرا، ئەوا پێشخستنی دادگاییکردنێکی بەمجۆرە سەبارەت بەمن و لایەنەکان تاکەرێگای دادگاییکردنێکی عادیلانەیە. بەهەزاران دۆزی DMME سەبارەت بەکوردە ستەملێکراوەکان هەیە. ئایا ئەمانە بەهیچ جۆرێك ئاماری شەڕ ناهێننەوە یاد؟. لەمێژوودا بەردەوام کوردان هەڵخەڵەتێنراون. ئایا لەهەلومەرجی زەمینەیەکی وەکو ئەوروپا کەئاشکرایی(شەفافبوون) تێیدا باوە، دیسان درێژە بەهەڵخەڵەتاندن و تەفرەدانمان دەدرێت؟ ویژدانی مرۆڤایەتی چۆن بەرگەی ئەمە دەگرێت؟ ئایا دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا DMME چۆن بەبوێری هاوبەشێتی لەتاوانی گونجاندنی نۆرمەکانی ئەوروپا لەگەڵ ئەو دادگایەدا دەکات کەلەکەسایەتی

مندا لەمیانەی هەزارو یەك تەڵەكەبازییەوە گەلێك دادگایی دەكات كەتائێستا بەشێوەیەكی كرداری و تەواو قەدەخەنامەی سەر زمانە زگماكییەكەی هەڵنەگیراوە.

ئەمجۆرە پرسیارە یاساییانەی دەتوانرێ بەسەدانی دیكەی لێ زیادبكرێ, ئەوكاتە وەڵامیان دەدرێتەوە كەدادگا بسەلمێنێ لەژێر كاریگەری سیاسیدا سەربەخۆیە یان نا, هەروەها دەرفەت بەدادگاییكردنێكی عادیلانە دەدات یان نا؟. ئەگەر رێگای دادگاییكردنێكی عادیلانە نەكرێتەوە, من و هەزاران لەهەڤاڵانم" لەیلا زانا و هەڤاڵەكانیشی لەناودا" لەژێر رەحمی رزاندنی ئەبەدی بهێڵدرێینەوە, ئەوكاتە ناچاردەبین بەئاشكرا بڵێین ئەوەی ئێمەی دادگاییكردووە لەبنەڕەتدا خودی یەكێتی ئەوروپایە, بەرێوەبەرایەتی كۆماری توركیاش تەنیا وەكو ماشەیەك بەكاردەهێنرێت. هەروەكو چۆن دەوڵەتەكانی ئەوروپا بەرپرسیاری لەپێشینەی ئەو شەڕو ڤڕكردن و تواندنەوەن كەلەم دووسەد ساڵەی دوایی بەسەر گەلی كورددا سەپێنرا, و لەساڵانی 1950 بەدواوە ئەمریكاش بەشداری تێداكرد, ئەوا ناچار دەبین بەرڤێكی گەورەو زۆر بەئاشكرا بڵێین هەروەكو لەناوبردنی گەلانی ئەرمەنی, ئیۆن و ئاشووری تێری نەكردووە, ئەمجارە نۆرەی پاكتاوكردنی كوردان هاتووە.

بەشێوەیەكی كورت ئەگەر لەمیانەی تێڕوانینێكی گشتی تەماشابكرێ, لەدۆزەكەمدا لایەنی راستەقینەی وڵاتانی یەكێتی ئەوروپا, كوردان و منم, بەگرێدانی دۆزەكە بۆ توركیا بریتییە لەخەڵەتاندنێك. ئەو هەوڵانەی وڵاتانی ئەوروپا بەیارمەتی ئەمریكا و ئیسرائیل لەپێناو بەدەرخستنی من لەیاسا و مافپەروەری ئەوروپا ئەنجامیانداوە لەبەرچاوان بەئاشكرایی هەڵدەسوڕێ. حكومەتی ئیتاڵیا بەهەموو ئەو هێزو توانایی‌ەی هەیبوو لەم پێناوەدا هەوڵیداوە. فشارێكی سایكۆلۆژی ترسناك پەیڕەوكرا, تواناكارییە دارایی‌ەكانی سەفەربەركرد. سەرباری ئەوەی بەرەو وڵاتانی ئینگلتەراو سوێد هەنگاوم نەهاوێشت, منیان وەك "پیاوی نەخوازراو"(persona non grata) راگەیاند. ئەڵمانیا و فەڕەنسا بەشێوەیەكی فەرمی بەرامبەر كەسایەتی من دادگایان دەستپێكرد. چەندین وڵاتیش پێشوەخت ناعادیلانە جوڵانەوەو ماف پەنابەری منیان رەتكردەوە. بەشێوەیەكی گشتی كامپانیایەكی لەپەلوپۆخستنی "دەروونی" بەرێوەچوو.

ئەو پەیمانە بێدەنگ و نهێنییانە لەژێر ئەو گۆڕانكاری و هەڵوێستانە شاراوەیە كەلەسەر بنەمای بەرژەوەندی ماددی دوای قەڵەمبازی 15 ی ئاب لەگەڵ دەوڵەتی توركیایان بەستووە. زۆر باش دەزانین حكومەتەكانی توركیا تەنانەت نیوەی توركیایان پێشكەش بەوڵاتەكانی ئەوروپاكرد تاوەكو بتوانن لە"PKK"یان دووربخاتەوەو تێكۆشانی ئازادیخوازی كوردان بە"تیرۆریست"لەقەڵەم بدەن. ئەگەر ئەم پەیوەندییانەی بەرژەوەندیپەرستی نەبووایە كەحكومەتەكانی ئەوروپا شاردبوویانەوە, بەڵام سەبارەت بەمەسەلەی من ئاشكرابوو, پێویستبوو یەكسەر مافی پەنابەری سیاسی وەربگرم.

بەهۆی ئەم پەیوەندییە بەرژەوەندیپەرستیانەوە یاسای ئەوروپا"پەیمانی ماف مرۆڤی ئەوروپا" بەئاشكرایی پێشێلكراوە. ئامانجی رفاندنی من بۆ دەرەوەی ئەوروپا دەرخستنم بوو لەچوارچێوەی سنوورەكانی یاسای ئەوروپا. راكێشكردنم بۆ كینیا بەهۆی ئەم پەیوەندییە ڤێزەونەوەبوو بەبەرژەوەندییەكانیانەوە. هەربۆیە ئەگەر بەڕاستی دادگای ماف مرۆڤی ئەوروپا گرێدراوی پەیمان و نۆرمە یاساییەكانی ئەوروپا بێت, ئەوا ناچارە ئەم پێشێلكارییەی یاسا رەتبكاتەوە. ئەگەر دادگاكانی ئیستئناف رۆماو سزا گرانەكانی ئەسینا واتایەكی كرداریشی نەبێت, بەڵام ئەو بڕیارە پۆزەتیڤانەی داویانە DMME ش دەبەستێتەوە. ئەم بڕیارانە, هەم من وەك پەنابەرێكی سیاسی پەسند دەكات, هەم لەسەر خاكی ئەوروپا بەئازاد لەقەڵەمم دەدات. دیسان بەگوێرەی ئەم بڕیارانە ڤۆناخی دادگاییكردنی ئیمرالی و پەیرەوكردنەكەی بەتەواوەتی پێچەوانەی یاساكانی "یاسناسی" ئەوروپایە, بەنەبووی لەقەڵەم دەدات. ئەوەی لەدائیرەی باڵای DMME چاوەڕوانی دەكرێ, بەگوێرەی یاساكانی ئەوروپا دان بەماف ئازادانەمدا بنێ لەئەوروپا"بڕیارەكانی دادگای رۆما و ئەسینا" پێشێلكارییە یاساییەكانی ئیمرالی پەسند نەكات, ئەگەر دادگاییكردنێكیش پێویست بكات "بڕیاری یەكەمین دائیرەی DMME" پێویستە رێگای ئەوەبكاتەوە كەعادیل

و بێلایەن بێت. تەنیا کاتێك لەسەر ئەم بنەمایە بڕیارێکی پۆزەتیڤ دەربکەوێت کەواتە بەگوێرەی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا PMME رەفتارکراوە. لەرەوشێکی پێچەوانەشدا دادگای باڵاش (DMME) لەبوون بەئامرازی پیلانگێڕییەکی سیاسی گەورە رزگاری نابێت.

لەبەر ئەم هۆکارەبوو بەشی زۆری بەرگرینامەکەم بۆ روونکردنەوەی شارستانییەتی ئەوروپا تەرخانکرد. ئەم شارستانێتییە ئێمە لەناو دەبات. سیاسەتمەداران لەپێناو چەند ساڵێکی دەسەڵات و خاتری بەرژەوەندیپەرستی و قازانجی ئەربابەکانیان هیچ لێکدانەوەیەك بۆ سڕینەوەی گەلێك لەمێژوودا ناکەن و لایان بابەتێکی نیگەرانی نییە. ئەمە دەزانین، بەڵام هەرهیچ نەبێت تۆزقاڵێك دادوەری هەبێت، پێویستە دەزگایەکی وەکو "DMME" ئەو رێیەی "دادگاییکردنی رەهەندی کەسێتی"بەرکەنار بکات کەرێگایەکی خۆ دزینەوەیە، بڕیارێك سەبارەت بەگەوهەری رووداوەکە بدات؛ بەلانی کەم پێویستە چۆنییەتی دادگایەکی بابەتی، واقیعی و هاوچەرخ رەچاوبکات و بەگوێرەی ئەوە بڕیاربدات. لەکاتێکدا کۆماری تورکیا لایەنێکی شەڕە"تەواوی جیهان ئەم راستییە دەزانێ، خودی خۆیشی بەئاشکرا ئاماژەی پێدەکات" من و رێکخستنەکەم بەگەورەترین مەترسی راگەیاندووە، چۆن دادگاییکردنێکی عادیل و سەربەخۆ بەڕێوەدەبات؟ چۆن دادگا (DMME) ئەقڵی ئەمە دەبڕێ؟ یاخود هەندێ گەمەیتر هەیەو ئێمە نایزانین؟ لەرەوشێکی وەهادا بۆچی دۆزەکەمی پەسندکرد؟ ئەگەر وەڵامی تەواوی ئەم پرسیارانە نەدرێتەوە "بەشێوەیەکی بڕوابوون"، ئەوەی دەمێنێتەوە دەرککردن بەوە نابێ کەئەوەی لەئارادابوو بەردەوامی گەمەیەکی سیاسی بووە کەپێشتر ئامادەکراوە؟ ئەوکاتە بۆئەوەی نەهێڵم خۆم و گەلەکەم بکرێینە ئامرازێکی ئەم گەمەیە، بەلانی کەم جگە لەجێبەجێکردنی پێویستییەکانی هۆش و ویژدانم چارەیەکی دیکەم نامێنێتەوە. ئەم راستینەیە پێویستی ئەوە دەخاتەڕوو کەلەبواری یاسایی زیاتر، پێویستە سیاسی بێت. کوردان گەلێکن نەلەچوارچێوەی یاسای نەتەوەیی، نەنێو نەتەوەیی، لەهەردووکیاندا جێگیرنەکراون. کاتێك یاسای یەکێتی ئەوروپا بەسوربوونەوە رەهەندی تاکە کەسێتی مەسەلەکە دەسەپێنێ، ئەو راستینە کۆمەڵایەتی و مێژوییە پشتگوێ دەخات کەبناخەکەی پێکدێنێ‌و ئەمە بەواتای ئەوەدێت: کێشەیەك لەئارادانییە، بەرێگای یاسایی چارەسەربکرێت. ئەم چەمکە لەسەردەمی پەیمانی لۆزاندا دەستپێکردووە و تاڕۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوامە. بەرامبەر بە پەسندکردنی کیانی کۆماری تورکیا بەبێ کورد، موسڵ ــ کەرکوك پێشکەش بەئینگلیزەکان کراوە. لەبەرامبەر پەسندکردنی سەرمایەداری وەك سیستەمی کۆماری تورکیا، لەلۆزان پەیمان ئیمزا و ئەرێکراوە. لەکاتێکدا دەوڵەتە رۆژئاواییەکان ئەرمەنی و ئیۆن و ئاشوورییەکانیان وەك کەمایەتی پەسندکرد، هیچ گەرەنتییەکیان سەبارەت بەکوردان پێشکەش نەکردووە. ئەم هەڵوێستەش بەواتای چاوپۆشین دێ بەرامبەر سڕینەوەی کوردان لەبواری کولتووری و سیاسی. پێویستە کاربەدەست و بەرپرسیارانی تورك بەشێوەیەکی باش لەئەنجامی ئەو پەیوەندی، ناکۆکی و پێکدادانە بکۆڵنەوە کە لەم دووسەد ساڵەی دوایی پێیدا تێپەڕبوون. دواکەوتوویی ئەمڕۆی رۆژهەڵاتی ناوین و بێبەشبوونی لەدیموکراسی و ئازادییەکان سەرچاوەکەی وابەستەی پەیوەندییەکانی ئەم ساڵانەیە. دەبێ دواپرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوینی گەورە وەك ئەنجامێکی ناچاری ئەم دووسەد ساڵەی دوایی ببینرێ. پێویستە زۆر بەباشی ناوەڕۆکەکەی بخوێندرێتەوە. بەتایبەتیش پێویستە کوردان لەهەموو بوارێکەوە خۆیان وەك فاکتەری ستراتیژی ئەم پرۆژەیە لەقەڵەم بدەن. یەکێك لەئامانجە سەرەکییەکانی بەرگرینامەکەشم ئەمەیە.

پەیوەندی نێوان قۆناخی دەستگیرکردنی من لەئیمرالی و پێکهاتەی دەوڵەتی فیدراڵی کوردستانی ئێراق(باشووری کوردستان) زۆر ئاشکرایە. کاربەدەستانی کۆماری تورکیا ناچارن ئەم راستییە باش بخوێننەوە: بەرامبەر بەپاکتاوکردنی من و "PKK" ئێوە کوردستانی فیدراڵتان وەك دیاری پێشکەش بەهێزە کوردییە دەرەبەگ ــ بۆرژواکان کرد. ئێوەش بەرامبەر ئەنجامەکانی بەرپرسیارن. ئەمەش دانانی بناخەیەکە کەبەبناخەی پێکدادانەکانی ئەمڕۆی فەلەستین ــ ئیسرائیل دەچێت.

هەروەکو لەڕێگای ئەمە بنەماکانی کۆمارگەرایی شۆڕشگێڕی بەلاوەنرا, لەهەمانکاتدا زەمینـەو هەلومـەرجێك هاتـەئاراوە کـەبۆ هەمووجۆرە گرژی و هاندانێکی میلیگەرایی گونجاوە. دەخوازن لەسایەی گـرژی میلیگـەرایی نـوێ گـەلان بەگژیەکـدا بکـەن و لەژێر رووخساری نوێ درێژە بەحوکمڕانی سیستەمی خۆیان بدەن, پێکدادانی فەلەستین ـ ئیسرائیل تەنانەت کراوە بەکێشەی سەدەی دوایی و رەواترین بیانووی دەستی خراپترین حکومـەت "کاربەدەسـتانی" گـەلی عـەرەب. ئێـستا هەوڵدەدەن کـوردانیش بخەنە ناو چوارچێوەی هەمان گەمەوە.

لەم خاڵەدا ئەو پیلانگێڕییەی بەرامبەر من ئەنجامدرا بووە خاوەن رەهەندێکی نێودەوڵەتی, چونکە هـەروەکو چـۆن مـن و کیانی ئەو بزووتنەوەی نوێنەرایەتیم دەکرد, گوێڕایەڵی ئەم گەمانەی نەدەکرد, لەهەمانکاتـدا خـاوەن پۆتانـسیال "توانـست"ی پووچەڵکردنەوەشی بوو.

کـۆنترۆڵی کـوردان لەدەسـت بزووتنەوەکـەمان دەربێنـێ و هێشتنەوەی لـەژێر کـۆنترۆڵی هێـزە ئیمپریالییـەکان, بایـەخێکی ستراتیژی پێدرا. لەڕێگەی ئەمەشەوە دەوڵەتە نەتەوەییەکانی تورك, فارس و عەرەب پەروەردە دەکران. لـەم پێنـاوەدا بـەدەیان هـەزار کـورد لەئـەورووپاو ئـەمریکا پـەروەردە کـران. بەسـووربوونەوە دەیانخواسـت کوردایەتییـەك دروسـتبکەن کەبـەگوێرەی بیرکردنەوەی خۆیان بێت. لەراستیدا لەساڵی 1945 بەدواوە لەرێگای بنەماڵەی بارزانییەوە پێبـەپێ ئـەو قۆناخـە فـراوان بـوو کەئیـسرائیل دەسـتپێکرد. هـەر لەبـەر ئـەم هۆکارەیـە کـوردان وەك دەسـتگیرانە نوێیەکـەی رۆژئـاوا بوونەتـە جێگـای بایـەخ. دەوڵەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوین کەخاوەن نەریتی فەتحکارین سەرلەنوێ کوردانی خۆیان هەڵسەنگاندەوە. سـوپایەکی هـەوالگری و کوردە جاشەکانیان پێکهێناو خستیانە ژێر فەرمانی هێزەکانی ئاسایشەوە. هەرچی سێهەمین بەشە, واتە هـەژارو رەنجـدەرانی گرووپی کوردان, لەسـەر رێبـازێکی نیـشتمانپەروەری و دیمـوکراتی "PKK" یـان دامەزرانـد. بـەمجۆرە سێ جـۆر گرووپـی کـورد پێکهـات. کـوردانی گرێـدراوی ئـەمریکا, یـەکێتی ئـەوروپا و ئیـسرائیل؛ ئەوانـە ئـەو توێژانـەی چـینی بـالای دەرەبـەگ ــ خێڵەکییەکانی جارانن کەبەرەو بۆرژوابوون ئاراستەیان گرتووە. لەرێگای بەکارهێنانی پارمەتی ماددی دەوڵەتـەکان و هەسـت و سۆزی عەشیرەتگەرایی هەوڵدەدەن بەکاریگەربن. ئێستا بەرنامە سیاسییە سەرەکییەکەی دەوڵەتی فیـدراڵی کـوردە. دیـسان ئـەو کوردانـەی لـەڕێگای پـارەو هەسـتی عەشـیرەتگەرایی خزمـەت بـەهێزەکانی ئاسایـشی دەوڵەتـە نەتەوەییـەکانی تـورك, فـارس و عەرەب دەکەن ئامانجیان تەنیا پارەو دەسەلاتی خۆجێییە. هەرچی ئەوانەن کە لەمیانەی هەستی نیشتمانپەروەری و هۆشـیاری دیموکراتیانەوە لەگەڵ "PKK" دان, ئامانجیـان دیموکراتیزەبـوون و کوردسـتانێکی ئـازادە. ئـەم سێ هـزر و راسـتینە جیـاوازە لەمیانـەی پەیوەنـدی و ناکۆکییـە چـڕەکانییەوە دەشێ بەئاراسـتەی چـەندین پێکهاتـەوە بـچێت. ئـەو کوردسـتانەی لەخـەوی هەزاران ساڵەی هۆشیاربۆتەوەو کەوتووەتە قۆناخێکی بەجموجۆڵەوە, لەئاواکردنی هاوسەنگی نوێی رۆژهەڵاتی ناویندا یەکێکـە لەئەکتەرە لەپێشینەکان. لەچەندین سیناریۆدا دەتوانێ گەلێك رۆڵی جیاواز ببینێ.

کۆماری تورکیا کەلەسەردەمی دامەزراندندا کوردەکانی بەئەندامی بنەڕەتی (رەسەن) دادەنا, گەورەترین هەڵـەو کـەموکوڕی خـۆی ئەنجامـدەدات کاتـێ بـەهۆی ناسـنامەکەیان بەتـەواوەتی کـوردان دەخاتـە پـەراوێزی سیاسـەت و یاسـاو ئەمـەش دەکـات بەپرەنـسیپێکی هەمیـشەیی. مـن بانگەشـە دەکـەم: هێـزە ئیمپریالییـەکان کاتێـك بەرژەوەندییـەکانیان لەگـەڵ بەڕێوەبەرایەتییـەکانی تـورك, عـەرەب فارسـەکان یـەکتر دەبـڕێ, و بـۆ ئـەوەی زیـاتر بەخۆیانـەوە ببەسـتێتەوە یـاخود بـێ کاریگەرییان بکات, ئەم ناکۆکیانە لەبەرژەوەندی کوردەکانی وابەستەی خۆی بەکارهێنا, و بەزانینەوە هەنگاوی بۆ پاکتاوکردنی ئـەو کـوردە رەنجـدەرو هەژارانـە هاوێـشت کـەخاوەن بـژاری ئـازادین و لەکەسـایەتی منـدا نوێنەرایـەتییان دەکرێت. لەکاتێکدا پێکهاتـەی فیـدراڵی کـورد ــ بەقـسە ــ لەباشـووری کوردسـتان بەرهەمەکەیـەتی, ئـەوا هـەنگاوی دیکەشـی بـەدواوە دێ. کاتێـك بەڕێوەبەرایـەتی تورکیـا بەپـشتگیری ئێـران, سـوریاو هەنـدێ لەعەرەبـەکانی ئێـراق هێـرش بکاتـە سـەر کوردەکـان, ئـەو کاتـە

دەکەوێتە تەڵەزگەی ریشەییەوە. نارەحەتی ئێرانی و عەرەبەکان بەرامبەر بەتورکیا مێژووییەو باشدەزانرێ, دوای کوردەکان دژ بەتورکەکان ئاراستە کران, سەرلەنوێ هەندێ کێشەی مێژوویی زیندوودەبێتەوە. لەناو ئەمانەشدا بانگەشەکانی ئیۆنا, ئەرمەنستان,جۆرجیا, ئێران و تەنانەت عەرەبەکانیش زیندوودەبێتەوە کەتاوەکو چیاکانی تۆرۆس بانگەشەی خاوەنداریێتی دەکەن. لەرەوشێکی وەهادا تورکەکان بۆ ستاتۆی سەدەی شانزدەهەم دەگەرێننەوە.

لەکاتێکدا سیاسەتی یاووز سەلیم سەبارەت بەکوردان ئەم مەترسییە بەرکەنار دەکات, لەساڵی 1920یش بەرتەرەفکردنی ئەو مەترسییە لەلایەن مستەفا کەمالەوە لەرێگای ئەو رێککەوتنەوە مسۆگەربووە کەلەسەر بنەمای پەیوەندی ئازادانە لەگەڵ کوردەکانی بەستووە. مێژووی ئەنادۆڵی تورکەکان لەگەڵ پەیوەندی کوردەکان لەناو پەیوەندییەکی دیالەکتیکی توندوتۆڵدایە؛ پارچەکردنی ئەم پەیوەندییەو گۆرینی بەرەوشی دوژمنایەتی, تورکەکان ئاگاداربن یاخود نا, دەبێتە گەورەترین زیانی ستراتیژییان. لەیاخیبوونەکاندا کوموکورِی هی هەردوولایە. میللیگەرایی سەرەتایی و شۆڤێنی, دابونەریتە دەرەبەگایەتییە ئایینییەکان, لەو رەوشەدا نین دەرك بەپەیوەندی ستراتیژی بکەن و بەرێوەی ببن, لەئاکامی زێدەرۆییکردن لەپاکتاوکردنی کوردان, پەیوەندی ستراتیژی گەیشتۆتە کەناری لەناوچوون. مستەفا کەمال و عیسمەت ئینۆنۆ لەدوا قۆناخدا ئەمەیان بینی. بەڵام بەرتەرەفکردنی مەحاڵبووە. لەدوای ساڵی 1950 بەرامبەر بەنکۆڵیکردنی رەچەڵەك سەرلەنوێ بەهێزکردنەوەی دەرەبەگایەتی کوردان زیاتر رێگای لەپێش شکاندنەوەی پەیوەندی ستراتیژی و لەدەستدانی واتاکەی کردۆتەوە. سەنتێزی تورك ــ ئیسلام لەدوای 1980 کان کەئایینگەرایی و تورکایەتییەکی ئەوپەرگەری پەیرەودەکرد, بەتەواوی ئەم پەیوەندییە ستراتیژییەی بەنەبوو لەقەڵەمداوە. بەرامبەر ئەم رەوشە هێزە رۆژئاواییەکان و دەوڵەتەکانی ناوچەکە لەمیانەی چاوپۆشین لە"PKK" نارەزایی باوی خۆیان نیشانداوە. بەڵام پشتگیری مسۆگەری ئێران و سوریاشی لەناودا, هەموویان لەپێکهاتنی دەوڵەتی فیدراڵی رۆڵیان بینی, و لەپێناو بەرۆژەڤکردنی گەمە مێژووییەکان گرنگترین هەنگاویان هاویشت. بزووتنەوەی کوردی گرێدراو بەمیللیگەرایی ناچارە پەیوەندی ستراتیژی باو لەگەڵ تورکەکان ببرِێ. بۆ نموونە: رەوشی ئیسرائیل ــ فەلەستین, روسیا ــ چیچان و پارچەبوونی یۆگۆسلاڤیایە. ئەو سیاسەتە رۆژانەییانەی بریتییە لەخۆخەڵەتاندن, زۆر لەتێگەیشتنی گرنگی پەیوەندی مێژوویی دوورە. لەکاتێکدا میللیگەرایی و ئایینگەرایی چاوی هەمووانی کوێرکردووە, بەرژەوەندیپەرستی سیاسی و ئابووری خستوویەتیە رەوشێك رۆژی دواتریش نەبینێ. لەراستیشدا وچانێکی مەزنمدا تاوەکو کەسێتی من و "PKK" لەگەمەکەدا بەکارنەهێنرێ.

لەقۆناخی داهاتوماندا لەچوارچێوەی پرۆژەی ئەمریکا بۆ رۆژهەڵاتی ناوین گۆرانکارییەکان خێرا دەبن, تاوەکو ئێستا یەکلانەبۆتەوە لەم پرۆژەیەدا تورکیا ئامانجە یان هاوپەیمان و هاوبەش. گوایە بەهێزترین هاوبەشی پرۆژەکەیە, لەساڵی 1990 کانیش زۆر باس لەهاوپەیمانێتی ستراتیژی دەکرا. بەهەرحاڵ ئەنجامەکانی تارادەیەك ئەزموونبەخشە. تورکیا ئامانج بێت یان هاوبەش, مسۆگەر ناتوانێ درێژە بەستاتۆی جاران بدات. سووربوون لەسەر ستاتۆی کۆن, بەواتای یۆگۆسلاڤیا و ئێراقی دووەم دێت. کەچی ئێراق و یۆگۆسلاڤیا دانیان بەچەندین ماڤ میللەتەکەیاندا دەنا. قاڵبە شۆڤێنییەکانی تورکیا لەهەموویان بەهێزترە, ساڵانێکی درێژە گەل لەرێگای ئەم قاڵبە شۆڤێنییانەوە پێدەگەیەنرێ. لەحاڵەتی درێژەپێدانی, شکان مسۆگەرە. تەنانەت پێکدادانەکانی بەرامبەر بە"PKK"ش بۆ نیشاندانی ئەم راستییە بەس بووە. ئەو پێکهاتە کوردو تورکانەی بەمیللیگەرایی بارگاوین پەیوەندی ستراتیژی مێژوویی پارچە پارچە دەکات. بەبروای من لەدوای ساڵانی 1950کان بەئەنقەست ئەم پیلانە پێشخراوە. سەرەتا میللیگەرایی تورك گەیەنرایە فاشیزم و ئایینگەرایی. دەرەوە سەرچاوەکەی ئەم ئەوپەرگەرییەی پێکدەهێنا. دیسان بەرلەشەری یەکەمی جیهانیش لەئەنجامی دەستێوەردانی دەرەوە یان تورکیزم و یان

ئیسلامیزم گەیشتە ترۆپکی خۆی. ئەوەی ئەم راستییەی بینی مستەفا کەمال بوو. ئەو دوو سوورە ئایدیۆلۆژییەی بەربەستکردووە، کرانەوەی بەرووی ولاتپارێزییەك ئەنجامداوە کەبۆ ئازادی کراوەیە.

فاکتەرە ئاژاوەگێڕییەکانی یاخیبوونی کوردان، ئەم سیاسەتەو پەیوەندی ستراتیژی نێوان هەردوولایەنی تێکداوە. دەمارگیری میللیگەرایی لەمیانەی مەزەندەکانی پاکتاوکردنی کوردان لەراستیدا لەمیانەی تەڵەزگەی گەمەکانەوە بووە، کەسایەتییەکی وەك "زیا گۆکالپ" کەبەباوکی میللیگەرایی دادەنرێ گوتوویەتی "تورك بەبێ کورد، کورد بەبێ تورك نابێ". سەرلەنوێ شرۆڤەکردنی هەڵوێستی گۆڕانکارییەکانی دوای ساڵی 1950 سەبارەت بەکوردان بایەخدارە. لەساڵی 2000 بەدواوەش میللیگەرایی کوردان خێرایی پێدراوە. دیسان فاکتەری دەرەکی کاریگەربووە. سەرباری گشت کەموکورتییەکانی دیسان ئەوەی رۆڵی سەرەکی لەپووچەڵکردنەوەی ئەم گەمەیە هەبووە، هەڵوێستی ئەنتەرناسیۆنالی "PKK" بووە سەبارەت بەگەلانی ناوچەکە. یەکسەر پەسندکردنی بە"تیرۆریست"لەقەڵەمدانی "PKK" لەلایەن ئەمریکاوە بەهۆی خۆشویستنی تورکەکان نییە. ئەم بانگەشەیە بەئامانجی قووڵکردنەوەی پێکدادانەکان ئەنجامدەدرێت. ئەمریکاو یەکێتی ئەورووپا لەدەیا یەك و تەنانەت لەسەدا یەکی ئەوەیان بۆ کوردان بکردایە کەبۆ قوبرس ئەنجامی دەدەن لەراستیدا تورکیا دەبوو بەتورکیایەکی دیکە. بەڵام دوور لەمە وەستان. سیاسەتی "کەروێشك رابکەو تانجی بیگرە" پەیڕەوکرا کەشایستەی ئاژەڵەکان دەبینرێ. ناوەندە ئابووری و سیاسییەکانی کەوتبوونە ناو گەندەڵی و بەرژەوەندیپەرستی بەچوار پەلەوە خۆیان لەم سیاسەتەوە ئاڵاند. ئەو خاڵەی کەپێیگەیشتوون کەناری نقوومبوونی تورکیایە. تەواو لەو خاڵەدا، لەگەڵ رادەستکردنەوەی من چاوەڕوانی دەکرا، لەدوای بەرخۆدانێکی قەباو مەرگی من، پەیوەندی کورد ـ تورك تەواو بکەوێتە قۆناخی داڕووخان. بەمجۆرە تەواوی داوەکانی بزاڤی کورد لەدەستێکدا کۆدەبوویەوە. ئەمڕۆ زیاتر دەرکی پێدەکەین کەدواتر چی روویدەدا. مسۆگەر لەرۆژهەڵاتی ناویندا ئیسرائیل پێویستی بەمیللیگەرایی کورد هەیە، میللیگەرایی کورد نەبێ رۆژئاوا ناتوانێ قورسایی تورك، فارس و عەرەب بەو خاڵە بگەیەنێت کەخوازیارێتی. شێوازی بەکارهێنانی "PKK"لەلایەن هەردووکیشیانەوە بەشێوەی تەڵەزگەنانەوە بووە. واتا هەردوو لایەن "کورد ـ تورك"لەسیاسەتی کەروێشك رابکە و تانجی بیگرە، زیانمەندن. لەدوای ساڵی 1925 یش بەمجۆرە بووە. لەدوای دوو هەزارەکان کاتێك میللیگەرایی کورد چەکی تەکنەلۆژی نوێی دەستکەوت، رووبەڕووبوونەوەی ئاستەمە، لەوانەیە هەردوولایەنیش لەبواری سیاسی سەرکەوتن بەدەست نەهێنن، بەڵام مسۆگەر زیانی گەورەیان بەردەکەوێ. وەك هەمووجارێك ئەوانەی سەردەکەون هێزە ئیمپریالییەکانن. هێندەی میللیگەرایی کورد نکۆڵیکردنی کوردان و زەوتکردنی مافەکانیشی بەرامبەر روودانی ئەم بوویەرە وەك یەك بەرپرسیارن. بۆ ماوەی حەفتاو پێنج ساڵ بەبێچارەیی هێشتنەوەی کێشەی کورد، چ دەستکەوتێکی بۆ کۆماری تورکیا هەبوو؟ ئەوە بالەولاوە بمێنێ کەلەسەردەمی نوێی تەکنۆلۆژیادا لەمیانەی سیاسەتی نکۆڵیکردن دەستکەوت بەدەستبهێنێ، بەهەرحاڵ بۆ نەبینینی ئەو راستییەی کەرۆژانە رێگا لەپێش پێکدادانی کورد ـ تورك دەکاتەوە، پێویستە کوێربێت. ئەنجامە خەمگینییەکانی پشتبەستن بەهێزی سەربازی لەیەکێتی سۆڤییەت و ئێراق کەوتەڕوو. هەر لەئێستاوە پەلامارەکانی سەرکوردستان قەیرانی ئابووری لەگەڵ خۆیدا هێناوە. درێژکردنەوەی کێشەی کوردو چارەسەرنەکردنی رەوشی پێکدادان و هەڵگیرساندنی ئەگەری ئاگری شەڕێکی دیکە، دەبێتە هۆکاری رووخانی تەواوەتی یەکێك لەو کۆڵەکانەی کەهەزاران ساڵە تورکەکان لەئەنادۆڵدا دەژیێنێ. دیسان دووبارەی دەکەمەوە، بۆ نەبینینی ئەمە یان دەبێت خائینی نیشتمانی یان دوژمنی گەل بێت.

باهیچ کەسێك چاوەڕوانی ئەوەنەبێت، بزووتنەوەیەك لەخۆیەوە تەسلیم بێت، کەبەرهەمی زەحمەتی و هەوڵ و کۆششێکی مەزن و دژوارە. لەساڵی 1998 وە بەسەبرو ئارامییەکی گەورەوە، لەپێناو بەرژەوەندی و قازانجی تەواوی لایەنەکان، تەواوی ولات و گەلەکەمان، لەمیانەی گشتگیرترین راوەستەی سیاسی و ئایدیۆلۆژی من و رێکخستنەکەم هەڵوێستێکی هەستیارو

بەرپرسیارانەمان پەسەندکردووەو نیشانمانداوە, لەکاتێکدا هەڵوێستی هەڤالان بەئەرێنی دەبینم, ناڵێم کەدەوڵەت بەتەواوەتی پەیوەستدار نەبوو, بەلام دەبێ ئاماژە بەوەش بکەم کەزۆر دووری چارەسەرکردن بوو. رەوشی چاوەڕوانی زیاتر بەتەواوەتی ئەم پرۆسەیە پووچەڵ دەکاتەوە. "PKK" ناتوانێ کوردستان بۆ دواکەوتوویی دەوڵەتە ستاتۆگەراکان و میللیگەرایی سەرەتایی بەجێبێڵێ. "PKK" داسەپاندنێکی وەهای نەبووە: دەبێ منیش خاوەن دەوڵەتێك بم, بەلام هەرگیز دەستبەرداری لەپرۆژەی کوردو کوردستانێکی دیموکرات و ئازاد نەکردووە, و دەستبەرداریشی لێ ناکات. هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە دیالۆگی دیموکراتییانە دەبێتە پێشکەوتووخوازترین و چارەنووسسازترین پەیوەندی مێژوویی. ئەوانەی بەقووڵیی تەماشای مێژووی تورك, کوردو عەرەب بکەن دەبینن کەستاتۆی رۆژهەڵاتی ناوین بەردەوام نزیك بەفیدراسیۆن بووە. تاکە رێگای روونەدانی کێشمەکێشی نەزۆك لەفیدراسیۆندا, دیموکراسی تەواوە. تاوەکو ئێستا مێژوو رێگەچارەیەکی لەو بەکاریگەرتری نەدۆزیوەتەوە.

تورکیا دەتوانێ باشترین رۆڵ لەوەدا ببینێ کەبەگشتی تەواوی کوردان, بەتایبەتیش هەڵمەتی "PKK" نەکەوێتە ناو ئەو گەمە نوێیانەی دژی گەلانی ناوچەکە دەچنرێ و نەکەوێتە ناو پێگەی مەترسیدارەوە. ئەوەی هەرەزێدە لەگەڵ مێژووەکەیان و بەتایبەتیش ریشە ستراتیژییەکەی کوردان دەگونجێ, بینینی ئەم باشترین رۆڵەیە. پاکتاوکردن و سڕینەوەی کوردان لەمێژوودا ئاستەمەو هیچ خێرێکیشی بۆ تورکەکان نابێت. بەپێچەوانەوە راستینەی ژیانی بەیەکەوە گرێدانیان حاشاهەڵنەگرە. وەستان لەدوای ئەم خاڵ و ئاستەوە, دەبێتە هۆکاری پووچبوون و زیاتر تێکدانی ئەگەری ئەو پەیوەندییە ئەرێنییەی نێوان لایەنەکان. ئەگەر دیالۆگی دیموکراتییانە پەیڕەونەکرێت, ئەوا بژاری کوردان دەبێتە هەڵمەتێکی گەورەی ئازادی. هەرچی چۆنییەتی پێشکەوتنی شەڕە هەڵوێستی لایەن و ناوەندەکانی دەرەوە دیاریدەکات.

بەر لەوەی تورکیا کێشەی کورد چارەسەربکات, پێویستە ئەگەری ئەو گۆڕانکارییانە هەڵسەنگێنێ کە لەگەڵ کەوتنە ناو قەیران ـ گێژاوی رۆژهەڵاتی ناوین دێتەئاراوە. هەر لەئێستاوە روونبۆتەوە کەسێ هێز سەبارەت بەکوردستان دەکەونە ناو کێشمەکێشەوە. یەکەمیان ئەمریکاو ئیسرائیل و کوردە بەکرێگیراوەکانیان. دووەمیان هێزە ستاتۆگەراکانی تورك, ئێران و عەرەبەکان و بەشێکی سنوورداری کوردە "جاشەکان" و توێژی عەشیرەتە بەکرێگیراوەکان و بۆرژوای کۆمپرادۆرە. توێژی سێهەم فورساییان زیاترەو لەگەلی هەژارو زەحمەتکێش و ولاتپارێزو دیموکرات پێکدێ. بۆیەکەمین جارە ئەمجۆرە جیابوونەوەیە بەدیدێت. شیمانەی بەهێز ئەوەیە بەپێی بەسەرچوونی کات ئەو کوردە بەکرێگراوانە بتوێنەوە کەشانبەشانی ستاتۆگەراکان دەجوڵێنەوە. دەشێ ئەمجۆرە گۆڕانکارییانە لەئەنجامی پێگەی کوردەکانی ئێراق بێتەئاراوە. ئەگەر بەڕێوەبەرایەتییەکانی تورك, ئێران و عەرەب ریفۆرم سەبارەت بەکوردەکانی ژێردەسەڵاتیان ئەنجام نەدەن, دەشێ لەهەموو ئاستێکدا رێککەوتن لەنێوان کوردە نیشتمانپەروەر ــ دیموکراتەکان و کوردە بەکرێگیراوەکانی ئیمپریالیزم پێشبکەوێ, لەئەنجامدا لەژێر رێبەرایەتی ئەمریکا دەشێ هەموو کوردان لەناو هاوپەیمانێتییەکدا جێگابگرن. ئەگەر دەرفەتێکی رێککەوتن نەبینرێ, ئەوا شیمانە دەکرێ کوردەکانی "PKK" رێبەرایەتیان دەکات لەسەر بنەمای ئاگربەست و رێگەچارەی دیموکراتییانە پەرە بەپەیوەندی لەگەڵ هێزەکانی هاوپەیمان بدات. هەروەکو دەبینرێ لەئەنجامی ئەم پەیوەندییانە, بەڕێوەبەرایەتی عەرەبەکانی ئێراق گورزێکی ستراتیژییان بەرکەوتووە. ئەوەی رژێمی ئێراقی رووخاند رێککەوتنی ئەمریکا و ئیسرائیل و کوردە. بەردەوام بەدواخستنی چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەلایەن تورکیاوە دەشێ رێگا لەپێش هەندێ رووداو بکاتەوە کەچەندین جار لەوەی قوبرس فورسترە. ئەو دەرفەتەی بەکاربردن و پێشخستنی پرۆژەو سەرمایە کەوەك بەشی جیاکاری بەدەوڵەتەکانی رۆژئاوا پێشکەشکراوە, ئیتر لەقۆناخی نوێدا کارا نابێ و لەپەلوپۆ دەکەوێ. لەئەنجامی پرۆژەی رۆژهەلاتی ناویندا ئەگەر تورکیا وەك رێککەوتننامەی سیڤەری دوای شەڕی یەکەمی جیهانیشی لێنەیەت, کۆمار کەوەك

دەوڵەتی ـ نەتەوەیی بەرهەمی هاوسەنگییەکانی "ناوەوەو دەرەوە"یە بەرەوشی ستاتۆگەرایی خۆی نامێنێ. مسوگەر تورکیا لەقۆناخی راگوزارەدایەو چۆنییەتی و ئەنجامی دەرکەوتنی لەئاژاوەکەی گرێدراوی لێکدانەوەیەکی راستی رەوشی خۆی دەبێت. لەجیاتی رێککەوتن لەگەڵ کوردان شەڕ قووڵتربکرێتەوە، دەشێ چاوەڕوانی دۆخێکی نێوان سیفەر و لۆزان بکرێ. چارەسەرییەکی دیموکراتییانەی کێشەی کورد لەگەڵ کوردان ئەگەری رۆڵی رێبەرایەتی تورکیا بۆ رۆژهەلاتی ناوینی دیموکراتییانە بەهێزدەکات. لەرەوشێکی پێچەوانەدا پەیوەندی ستراتیژی مێژوویی بەتەواوی پارچەپارچە دەبێت و مەترسی سنووردارکردنی لەئەنادۆڵ سەرهەڵدەدات. ئەمجۆرە گۆڕانکارییانە هەم لەماوەی کورت، هەم ناوین و درێژخایەندا، بەردەوام لەرۆژەڤی تورکیا دەخولێتەوە، ئەمەش هەندێ جار هێدی، هەندێ جاریش خێرادەبێت. لەسەربنەمایەکی دیموکراسییانەی رێککەوتنەکەی دوای شەڕی یەکەمی جیهانی، نێوان کورد ـ تورکیا، رێگا لەپێش ئەوەدەکاتەوە بەیەکەوە وەك بەهێزترین لایەن"بەگوێرەی مێژووی رابردوو بێت، بەلام ئەمجارە بەشێوەی یەکێتییەکی ئازادانە" لەقەیران ـ گێژاوی رۆژهەلاتی ناوین رزگاریان بێت. لەدۆخێکی پێچەوانەدا کوردستان دەبێتە دووەمین ئیسرائیل.

وەك ئەنجام، دائیرەی گەورەی DMME رووبەڕوی بڕیارێکی مێژووییە کەرێگای دادگاییەکی عادیل و بێلایەن دەکاتەوە، ئەگەر لەکردنەوەی رێگەچارەی دیموکراتییانەی کێشەی کورد رۆڵێك بکەوێتە سەر یاسا (مافپەروەری) ئەویش بەپووچەڵکردنەوەی پیلانگێڕی سیاسیدا تێپەڕدەبێت. هەر لەم رێگایەشەوە رووخساری ئاشتیخوازانەی یاسای یەکێتی ئەوروپا دەردەکەوێتەڕوو. پەیڕەونەکردنی یاسا و مافپەروەری ئەوروپا لەژێر ئەو دادگاییکردنەدا شاراوەیە کە لەیاسای هەلومەرجێکی وەها قورسدا ئەنجامبدرێت. رفاندن بۆ ئەوەبوو، تاوەکو لەچوارچێوەی سنوورەکانی ئەم یاسایەم بەدەربخات. چیرۆك و بەسەرهاتی رفاندن کەدەشێ ببێتە بابەتی رۆمانێك لەمەسەلەیەکی تاکەکەسی زیاتر، گەلێك واتای دیکە دەبەخشێت. چارەکە سەدەیەکە سەوداو مامەڵەیەکی زۆر لەنێوان دەوڵەتەکانی رۆژئاواو تورکیا سەبارەت بەتێکۆشانی ئازادیخوازانەی گەلی کورد ئەنجام دەدرێت. تێکۆشانی گەلەکەمان کەبەهەژاری و ئێش و ئازارێکی گەورەدا تێپەڕی، لەئاکامی چاوچنۆکی سەرمایە بۆ بەدەستهێنانی قازانج، بەشێوەیەکی زۆر هەرزان و ناعادیلانە لەکەسایەتی مندا خراوەتە ئاستێکی سادەی پێشێلکردنی مافەکانی کەسێتی تاك. لەسەر ئەم بنەمایە یەکێتی ئەوروپاو کۆماری تورکیا جارێکی دیکە هەوڵی رێککەوتن دەدەن. ئەوەی لەکەسایەتی منیشدا وندەکات، یاخود دووچاری ونکردن دەکرێ، لەراستیدا گەلی کوردە. گرنگە کە DMME نەبێتە ئامرازی ئەم گەمەیە. لەکاتێکدا لەبەرچاوانە کەتا چ ئاستێك و چۆن دەخوازن یاری بەئیرادەم بکەن، لەمیانەی کامە بەڵگەی یاساییەوە داوای دادگاییکردنێکی عادیل و سەربەخۆ لەتورکیا دەکرێ؟ تەنانەت مامەڵەو رەفتاری بەمجۆرە بەرامبەر ئاژەڵەکانی تاقیگە (مختبر)ش پەیڕەوناکرێ.

ئەم مەسەلەیە لای هەر کەسێکەوە ناسراوە کەبەتایبەتی ئەو دادگاییکردنەی لەتورکیا سەبارەت بەکوردان ئەنجامدەدرێ لەمیانەی ئەو فەرمانانەوە بەڕێوەدەبردرێن، کەلەسەرەوە دێن. دەزگای دادوەری لەسەرووی ناوەندە فاشیستەکانەوە دێ. ئەو رووخسارەی سەبارەت بەکوردان هەیەتی بچووکترین تایبەتمەندێتی یاسایی لەخۆوە ناگرێت، چاوەڕوانیکردنی دادگاییکردنێکی بێلایەن و عادیلانە لەدەزگایەکی بەم چەشنە سووکایەتیکردنە بەمن و گەلەکەم. ناومان و کولتوور و هەبوونمان دانیپێدا نانرێ. یاسا کوردان و کوردایەتی بەنەبوو لەقەڵەم دەدات، کاتێك ئەمە راستینەی یاساکانی تورکیا بێت چۆن دەتوانرێ باس لەدادوەرییەکی عادیل و بێلایەن بکرێ؟!.

بەگوێرەی یاسا نێودەوڵەتییەکان منیان دەستگیرنەکرد. ئایا لەناو سنووری یاسای ئەوروپادا من بەئیرادەی خۆم تەسلیمی تورکیا بووم؟ ئەم راستییەی تەنانەت منداڵانیش دەیبینن و دەیزانن بەبەردەوامی، چۆن یەکەمین دائیرەی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا ناتوانێ ئەم رفاندنە دەستنیشان بکات، کەبەساختەکارانەترین پێڕەوو شێواز ئەنجامدراوە؟! تەنیا یەك تاکە

ڕێگای ڕوونکردنەوە دەمێنێتەوە: DMME بەناوی سیستەم ئەو قەرزەدەداتەوە کەسەرمایەی ئەوروپا لەئەنجامی ئەو شەڕەی تواندنەوەو قڕکردنی گەلی کورد قازانج و دەستکەوتی لەلایەن تورکیاوە بەدەستکەوت, لەراستیدا ئەوەی عادیل نییەو ڕێگای دادگاییکردنێکی بێلایەن دادەخات, بڕیاری یەکەمین دائیرەی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپایە. پێویستە دائیرەی باڵای دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا DMME ئەم بڕیارە هەڵوەشێنێتەوەو پێداویستییەکانی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا PMME جێبەجێ بکات. بەراستی ئەوکاتە ڕێگای دادگاییکردنێکی عادیلانەو بێلایەن دەکرێتەوە. تەنانەت بۆ ساتێکیش بێت دەرفەتی قەرەبووکردن و سارێژکردنی ئەو برین و ئێش و ئازارە گەورانە دەڕەخسێ کەگەلی کوردستان دووچاری هاتووە. ئەوکاتە شانسی ئەوەش دەڕەخسێ کەتورکیا لەسەر ڕێگای یەکێتی ئەوروپا ببێتە گرێدراوی یاسا, تورکیایەك گرێدراوی یاساکانی ئەوروپابێت, دەبێتە گەرەنتییەکی بنەڕەتی ئاشتیش. تەواوی ئەمانە وەك ڕەخنەدانێکی رابردووی پڕ لەشەڕی ئەوروپا کاتێك ئاشتی و مافی مرۆڤی هەڵکشاو وەك شکۆدارترین سەرفرازی پەسند دەکات, دەیسەلمێنێ کەیەکێتی ئەوروپا قەڵای ناقۆڵای یاسا و دیموکراسییە.

## بەشی حەوتەم

### ئەو ناسنامەیەی پێویستە بەشێوەیەکی ڕاسا پێناسە بکرێت

سەرلەنوێ پێناسەنەکردنەوەی ناسنامەکەم لەم بەرگرینامەیەدا دەبوو بەکەموکورتییەکی جددی. لەجیاتی دووبارەکردنەوەی پێناسەی پێشوو, هەندێ خاڵی دیکەی دەخەمە سەر کەتایبەتمەندێتی تەواوکردنی ئەوەی پێشوو لەخۆوە دەگرێت.

کاتێك ئەم بەشەم ئامادەدەکرد, ئەو ناسنامەیەی فیکرمی بەخۆیەوە خەریك کردبوو ئەنکیدۆ بوو. لەکاتێکدا هەوڵمدا دەرك بەو ئەنکیدۆیە بکەم کەلەیەکەم داستانی نووسراوماندا واتە گلگامێش باسی دەکرێ, لەدواییدا تێگەیشتم ئەنکیدۆ هەرکەسێکە کەبەرەو دەوڵەت و شار ڕادەکات. شاری ئورگ یەکەمین شارو دەوڵەتشارە لەمێژوودا, کەناسراوەو چیرۆکەکەی نووسراوە, قارەمانی بەناوبانگ گلگامێش, یەکێك لەپادشا نیو ـ خوداوەندە ناسراوەکانی شاری ئورگە (لەزمانی کوردیدا

گلگامێش بەواتای گای مەزن دێ. دەشێ شیمانەی ئەوەبکرێ داستانەکە سوودی گەورەی لەسەرچاوەکانی کوردە سەرەتاییەکان وەرگرتبێ). لەوانەیە دامەزرێنەری شاری "ئورگ"یش بێ. بەگوێرەی ئەوەی لەداستانەکە دەرکی پێدەکرێ شاری ئورگ زووزوو دووچاری هێرشی بیانییەکان و ئاژەڵەکان هاتووە. لەلایەکەوە شار لەرێگای شورا مێژووییە شکۆدارەکان تۆکمەدەکرێ, لەلایەکی دیکەشەوە لەمیانەی شەڕە دژوارو بەهێزەکانەوە هەوڵی پاراستنی دەدرێت. هەڵبژاردنی جەنگاوەرە لێهاتووەکان لەکۆمەڵگای بیانی دیاردەیەکە بەردەوام لەمێژوودا دەیبینین.

گلگامێشی پادشاش هەوڵیداوە جەنگاوەرە بەهێزەکانی خۆی لەناوچە شاخاوی و دارستانەکانی باکووری ئێراق (باشووری کوردستان)ی ئەمرۆمان کۆبکاتەوە. پێڕەوەکەی زۆر سەیرە, شاری ئورگ ژیانێکی نوێی دۆزیوەتەوە, عەنعەنەی ژیانی شار تادوارادە سەرنجڕاکێشە. ژنە سۆزانییەکان (سۆزانێتی ژن) لەسەرووی فاکتەرەکانی سەرنجڕاکێشیەوە دێت. راستتر ئەوەیە ئەو ژنەی لەپایەی خوداوەندە دایکی پیرۆز خراوەو وردەوردە ئەو ژنە ماوەتەوە کەلەسۆزانیخانە گشتی و تایبەتەکان داخراون, ژیانێکی ئارەزوومەندی ورمەکی لەسەر ئەو ژنانە بۆ پیاوان تابلێی سەرنجڕاکێشە. کۆیلە نوێکە (ژن) توانستێکی بێسنووری ژیانی ئارەزوومەندی پێشکەش دەکات. تێکۆشانی خوداوەندە ژنی ئورگ "ئینانا" بەرامبەر خوداوەندە پیاوی فێڵباز ئەنکی لەخۆڕا نییە. ئینانا (پێشتر لەشاخ ناوی نینهورساکە, ئەمەش بەواتای ژنەخوداوەندی ناوچەی شاخاوی دێت). نوێنەرایەتی دایکی ــ ماڵیکردن دەکات کەشارستانییەتی چاخی بەردینی نوێ (نیئۆلیتیکی) پێشخستووە. ناسنامەی ئەو کۆمەڵگایەیە کەلەدەوروبەری دایك کۆبوونەتەوە. بەهەرحاڵ بابەتێکی هەرەزێدە لەبەرامبەریدا بەرخۆدانی کردووە ئەوەبووە لەسۆزانیخانە گشتی و تایبەتەکان وەك کاڵا پێشکەش نەکرێ. لەبەر ئەم هۆکارەشە شەڕێکی مەزن دەکات لەپێناو پاراستنی پێگەی خوداوەندێتی. لەداستانەکەدا ژنی هەوەسبازی ناسراو وەك فاکتەری سەرەکی گرێدانی ئەنکیدۆ بەشاری ئورگ نیشاندەدرێ. ئەمەش هەڵوێستێکی جێگەی بڕوایە. ئەوەی ئەنکیدۆی بیانی لەکەناری ئاوەکە راودەکات هەمان ژنە. چەندەی ئەنکیدۆ بەژنانی شار گرێدراوە, ئیتر بووە بەباشترین فەرماندە ــ سەربازی گلگامێش. لەداستانی دواتردا بەردەوام وەك نموونەی یەکەم و نەمر باسی ئەزموون و بەسەرهاتی گلگامێش ــ ئەنکیدۆ دەکرێ.

کاتێك یەکەمین چوونی خۆم بۆ خوێندنگای سەرەتایی و شار لەگەڵ چیرۆکی ئەنکیدۆ بەراورد دەکەم. لەوە درەنگ نەکەوتم و تێگەیشتم کەداستان باسی منیش دەکات. لەم بارەیەوە باسکردنی بیرەوەرییەکی خۆم سوودمەندتر دەبێت, لەکاتێکدا منداڵانی دراوسێم هاندەدا بۆ خوێندنی سەرەتایی بچنە گوندی "جەبین"ی گەورە, یەکێك لەمانەش منداڵێکی بەناو شەوکەت بوو. برا بچووکی "جمۆ" بوو کەیەکەمین چالاکی گەریلاییم لەبەرامبەردا ئەنجامدا بوو. دایکی لەسەرووی ژنە هەژارو سەرەتاییەکانی گوندەوە دەهات. بەڵام ئەو شرۆڤەیەی لەرۆژی چوونی شەوکەوت بۆ قوتابخانە کردی, جۆرێك بوو لەهی پرۆفیسۆران دەچوو. ئێستاش لەبیرمە گووتی: ــ "شەوکەتمان بووە بەحکومەت" تەنیا من لەم دوا بەرگرینامەیەمدا توانیم بەباشی واتای ئەم گووتەیە شیبکەمەوە.

ئیتر هەمووماں وەك ئەنکیدۆ کەسایەتییەك بووین کەبەدوای شارو دەوڵەت رامانەدەکرد. لەکۆمەڵگای دایك دادەبڕاین, چەندەی دەچوو بەرامبەر بەباڵابوونی شار گوندمان بەبچووك دەبینی, چەندەی دەچوو گوندەکەمان دەسڕایەوە, چەندەی دەچوو دایکمان گرنگی و بایەخی نەدەما, پەیوەندییەکانی تیرەو بنەماڵەمان بچووك دەبینی, شار ئەو دەوڵەتەی پێشمان وەك موگناتیس ئێمەی رادەکێشا. ئیتر رزگاربوون لەکاریگەرییەکانی سانایی نەبوو, شارو دەوڵەت خۆی لەخۆیدا ئامرازێکی ترسناکی پروپاگەندەیە, هەروەکو بڵێی هەموو شتێکی شار بەشێوەیەکی زۆر جوان و سەرسوڕهێنەر پێشکەشکرابوو. نەدەشیا ئەو سۆزانیانە رەتبکرێنەوە کەلەناو جوانترین پۆشاك و ئارایشت و خشڵدا رازابوونەوە, لەکاتێکدا هەمووشتێك لەپێناو باڵابوونی خۆی بەکاردەهێنا. گوندەکەمان وەك هەتیوێك بێکەس مابووەوە, تەنانەت ئاساییترین فەرمانبەری دەوڵەتیش خواوەندە

نوێیەکەمان بوون. هەرگووتەو پۆشاکێکی خواوەندیبوونی تازەبوون. کاریگەرییەکان بەمجۆرە ئامادەکرا بوون. سەرباری ئەمەش نازناوی "کلکدار"لەکوردەکان نرابوو. ئیتر بۆئەوەی ساتێك زووتر لێی رزگار ببن, فۆرمیلەکەیان بریتیبوو لەشارستانیبوون ـ بەدەوڵەتبوون ـ یەکسانە بەتورکبوون. تەنیا گوندو بنەماڵەی خۆمان بچووك نەدەبینی, ئیتر بەچاوێکی بچووك لەکوردایەتیشمان دەڕوانی. ئیتر ئەمانە وەکو کۆت و زنجیری پێمان دەبینرا. تەواوی دونیامان بەناو ئەم سێکوچکەدا تێپەڕدەبوو: چەندە ببیت بەشارستانی و پیاوی دەوڵەت و بە تورك, بەو ئەندازەیە دەبیتە پیاو. ئەمەبوو تیۆری کۆمەڵگای نوێمان. ئایین و عیرفانمان لەسەر ئەم بنەمایە واتادار دەبوو. سەرلەنوێ لەدەوروبەری ئەم سێینەیە بەکۆمەڵگابوونمان ئەنجامدەدا.

ئەو ئەنجامەی لێرە بەدەستمهێنا بەر لەبەنەتەوەبوون و جیابوونەوەی چینایەتی, شارستانیبوون و بەدەوڵەتبوون لەپێشەوە دێت, بەپێچەوانەی مەزەندەکان شارستانیبوون و بەدەوڵەتبوون وەك دوو فاکتەری سەرەکی بەکۆمەڵگابوون هەرزوو پێشوەخت دەستپێدەکات. پرۆلیتاربوون و سۆسیالیستی وەك بەرهەمێکی شارستانیبوون و بەدەوڵەتبوون, پێشوازی لێکردووین. وەکو سیفەتەکانی خوداوەندی دەوڵەتە. هێشتا لەبواری سۆسیۆلۆژییەوە ئەو کەسایەتییە شیتەڵنەکراوە کەلەناو دەوڵەت و شار پێکهاتووە. کەسایەتی کۆمەڵکاری و لادێ لەگەڵ کەسایەتی شاری و دەوڵەتگەرا دوو دیاردەی سۆسیۆلۆژین کەجیاوازی گەورەیان لەنێواندا هەیە. تاوەکو ئەم دیاردانە شینەکرێتەوە, شیکارکردنی چین, سۆسیالیزم و دیموکراسی زۆر بەناتەواوی دەمێنێتەوە. جیاوازی ناکۆکی ریشەیی لەنێوان کۆمەڵگای کۆمەڵکاری و لادێ لەگەڵ ئەو کۆمەڵگایە هەیە کەشارو دەوڵەت مۆرکی خۆی لێداوە. ئەو کۆمەڵگایەی شارو دەوڵەت مۆرکی خۆی لێداوە چەندە دەوڵەتگەراو دەستڕۆیە, ئەوا کۆمەڵگای لادێش هێندە کۆمەڵکار"یەکسانیخواز" و "دیموکرات" و"ئازاد"ە. لەم چوارچێوەیەدا گرنگترین ناکۆکی مێژوویی لەنێوان کۆمەڵگای شار ــ دەوڵەتگەراو کۆمەڵگای کۆمەڵکاری لادێدایە. تێکۆشانی بنەڕەتی لەنێوان دەستڕۆیی شار ــ دەوڵەتگەراو دیموکراسی و کۆمەڵکاری لادێدایە. زۆر دواتر دەرکم بەم دیاردەیەکرد.

گرتنەبەری رێگای شارو دەوڵەت لەگەڵ تامەزرۆییمان بۆ قوتابخانەی سیاسی و سەربازی تۆکمەتربوو. دەسەڵات دەسەڵات راکێش دەکات, نەك بەرۆیشتنی ئاسایی بەڵکو دەبووایە بەراکردن بگەینە دەسەڵاتی سیاسی و سەربازی. کاتێك بەربەست دەردەکەوت خەمگینی گەورە دایدەگرتم. کاتێك نەمتوانی بچمە خوێندنگای سەربازی خۆم بەبێبەخت دەبینی, جگە لەهێزی سەرنجراکێشی ژنانی شار, لەم قۆناخەدا سەربازێتی هێزێکی سەرنجراکێش بوو. لەژێرسایەی ئەم هەلومەرجانەدا شۆڕشگێڕێتییەکەمان وەك باشترین دەوڵەتگەرایی واتادار دەبوو. سۆسیالیزم وەك رەوشی هەرەلەبارو بێلاری دەوڵەت دەرکی پێدەکرا. لەرێگایەوە لەناو باشترین گەشەکردن و خۆشگوزەرانیدا دەبووین. ئەو وەکو ئامرازێکی نوێ و مۆدێرنی فڕینی ئێمە بوو. هەرچی یاخیبوونەکەمانە وەك گەڕانەوە بۆرابردووو کاردانەوە بەرامبەر نوێ دەرکی پێدەکرا. هەرچی کوردایەتییە بەردەوام وەك گرفتێك هەستی پێدەکرا کەدەخوازێ سەرهەڵبدات.

کاتێك دەوڵەتخوازیمان لەرۆژهەڵاتی ناوین وەك دیاردەیەك خۆی نیشاندا کەدەتوانرێ پێیبگەی, وەك پیاوی ئاقڵمەند باوەڕێمان بەوەهێنا کەلەمیانەی ئەم ئامرازەوە دەتوانین بەرەو ئامانجەکانمان بڕۆین. هەرچەندە بڕوایەکی وەهاشی نەبەخشی, کاتێك تواناکارییەکانی پشتبەستن بەدەوڵەت لەگەڵ ئامانجە شۆڕشگێڕییەکانمان بوو بەیەك, کاروانەکەمان هیچی لەخێرایی خۆی لەدەستنەدا. پێویستە بەئاشکرایی ئاماژەی پێبکەم کەبۆ یەکەمین جار لەم قۆناخەدا هەستم بەوەکرد کەکەسایەتیم دووچاری داماڵینی واتا هاتووە, چەندە تێپەڕدەبوو پیرۆزی ژیان بەهای خۆی لەدەستدەدا. بەمجۆرە تێدەگەیشتم کەلەمیانەی دەوڵەتەوە دەسکەوت و سەرکەوتن بەدیناهێنرێ, لەدەستدەدرێ. ئیتر لەوە کەوتمە گومان. بەسواری ئامێری دەوڵەت بەئامانج بگەین, بەڵام لەبەرئەوەی مەودایەکی زۆرمان بڕیبوو, زۆرلەوە دووربووم سەیرێکی دواوە بکەم و چارەسەری ئەوە بدۆزمەوە

کە چۆن ڕێگایەکی دیکە بگرمەبەر. لەکاتێکدا کۆتاییەکانی ئەو کەسایەتییەم بوو کەسواری دەوڵەت بوو, بەڵام ئەوەش پڕ لەنهێنی بوو کەبەناسنامەی نوێم بەدوای کامە ڕێگادا دەگەڕێم و دەیدۆزمەوە. ئەو دەوڵەتە سۆسیالیستییەی بڕوام پێی هەبوو ئیتر بەڕاستی و واقیعی نەمابوو, غروورم پەنابردنە بەر دەوڵەتی سەرمایەداری پەسندو هەرەس نەدەکرد. هەرچی پەیوەندییەکانمە لەگەڵ دەوڵەتی سوریا, لەبەرئەوەی هەر لەسەرەتاوە لەئاستی تەکتیکیدا بوو بەرگەگرتنی ئاستەم نەبوو. هەم بۆ شاخەکانی کوردستان درەنگ کەوتبووم, هەم ئەنجامەکانی ڕەنجی خۆم نەبینیبوو. خۆم وەکو یەکێك دەهاتەبەرچاو کەدووچاری خیانەت هاتووە. کاتێك لەژێر ئەم هزرو سۆزانە بەرەو ماجەڕای ئەسینا ــ ئەوروپا کەوتمەڕێ زیانی زۆرم بەرکەوتبوو. کاتێك بەرەو دەوڵەت دەچووم بەجۆش و خرۆش و بەئەزبەرەکردن بووم, هەمووشتێك لەپشکۆی بەدەستهێنانی پلە و پایە چڕببووە. دین و ئیمان پلەو پارە بوو. لەمیانەی شۆڕشگێڕێتییەوە ئەمجۆرە کەسایەتییەم بەرکەنار کردبوو, بەڵام ئەم شۆڕشگێڕێتییە, شۆڕشگێڕێتییەك بوو لەگەڵ کەسایەتی دەوڵەتخوازی بەڕێوەدەچوو. لەراستیدا لەجیاتی ئەو دەوڵەتەی لێم دووربوو و پێینەدەگەیشتم, بەرەو ئەو دەوڵەتەی خۆم رامدەکرد کەلێم نزیکە. بەجۆرێك لەجۆرەکانی چەشنی ئایینی نوێ, لێگەڕینی نەتەوەو شەڕەکەی بوو. گیرسانەوەم لەدیاربەکر, دواتر کاروانی سوریا ــ لوبنان هەروەکو بڵێی حەسرەتی دەوڵەتی میللی منی دڵخۆش دەکرد. تەنانەت شەماڵەکەی هەڵیدەکرد.

بەڵام سەرباری ئەو هەوڵ و کۆششە سەرسوڕهێنەرانە ناوەڕۆکی کەسایەتیم هەستی بەوەدەکرد کە لەقووڵاییەوە شتێکم لەدەستداوە. زهنییەتی دەوڵەتخوازی منی لەخۆم رفاندبوو. ئەو سۆسیالیزم و شۆڕشگێڕێتییەی لەچوارچێوەی دەوڵەتدا چڕببووەوە, ئەو گەندەڵییە گشتییەی دووچاری هاتبوو لەکەسێتی منیشدا نیشانیدا, لەسێکوچکەی ئەسینا ــ مۆسکۆ ــ ڕۆما, لەجیهانی لێکدانەوەی سەهۆڵئاسای ئەوروپا ناکۆکییەکەم بەتەواوەتی ئاشکرادەبوو. من نەدەبووم بەپیاوی ئەم دونیایە. نەدەکەوتمە ناو لێکدانەوەکانی سەرمایەداری. فێری ژیانی رۆژئاوا نەدەبووم. رێبواری تەواو ببوو. هەروەکو بڵێی کۆتایی ئۆتۆپیایەکی رووکەشی و خۆڵەمێشی هاتبوو. تەنانەت خیانەت دەیگووت "ئەوا هاتم" واملێهاتبوو هەستم بەهیچ نەدەکرد. چاودێرێکی وریا دەیتوانی پەی بەفێڵبازی یۆنان ببات, بەڵام من بڕوام بەدۆستایەتی هەبوو, درێژەشم پێدا, ناچاربووم بەگوێرەی ئەوەی کەسایەتیم لەسەر بنەمای ئەم دۆستایەتییەی ساڵانی دوایی بەسەربرد, دەبووایە تاکۆتایی بەمشێوەیە بەردەوام بێ, تەنانەت کاتێك دەیگووت "من خیانەتم" من دەمگووت "تۆ دۆستی".

لەمەسەلەی "کەسیرە"شدا بەمشێوەیە بوو, لەراستیدا ژنەکە بەشێوەیەکی مەترسیدار هاواری دەکرد. تاوەکو گەردە بچکۆڵەکانی لاشەی سەرنجی رادەکێشاو دەیگووت "من خیانەتم لێم نزیك نەبیتەوە"منیش دەمگووت"نەخێر تاوەکو ئاشق دەبیت, لەگەڵ مندا دەبێت". ئیتر خۆشەویست و هەڤاڵان و دۆستانم بوونەتە یەك, کاتێك هەمان گۆرانی خیانەتیان دەچڕی؛ منیش دەمگووت "دەڵێن ئەی خۆشەویستم" ناچاربووم ئەمە بڵێم. شۆفێرە یۆنانییەکە کاتێك لەدوورگەی کورفۆ بە جێبی بەرەو ئەو فرۆکەخانەیەی دەبردم کەلێیەوە بەرەو کینیا دەچووین, بەئەنقەست خۆی بەو فڕۆکەیەدا کێشا کەدەبووایە من ببات. منیش هێشتا بڕوام بەدۆستایەتی دەکرد. باسی چاوگرێدان دەکەن !! شتێکی لەمجۆرە روویدابوو. لەراستیدا ئەوەی روویدا ئیفلاسبوونی ئەو کەسایەتییەم بوو کەبەرەو قوتابخانەی سەرەتایی شارو دەوڵەت رایدەکرد. دەبووایە ئیفلاس بکات. ئەو بەهایانەی منیان دروستکردبوو دەبووایە هەموو ئەوشتانە هەڵبژێرن کەپەیوەندی بەشارو دەوڵەتەوە هەبوو. دەوڵەت بڕیاری لەناوبردنی ئەو دەوڵەتەی دابوو کە لەکەسایەتی مندا هەبوو. ئەمە دەوڵەتی گەورەی راستەقینەبوو. دەوڵەتی ئەمریکاو یەکێتی ئەوروپا بوو. ئەگەر نیازم نەبێ ببمە بەندەیەکی ئاساییان, رزگاربوونیان لەمن, بەتایبەتیش رزگاربوونیان لەئەنجامی فرۆشتنێکی بەنرخ, ئەمە راستینەی دەوڵەتی سەرمایەداری بوو. رزگاربوون لەم سیحربازە راستییە, لەو

هەلومەرجانەدا قورسبوو کەتێیدابووین، سەربکەویت ئافەرین! دەتوانی لاشەی رووتت رزگار بکەیت. لێڤی ئاتهۆن سەری خۆی لەدەریا دەرخستبووو خۆی نیشاندەداین.

دەوڵەتی یۆنان لەسەرووی لێڤی ئاتهۆنەکانەوە دێ. بەگوێرەی من تادوایی بەردەوام بوونم لەمیانەی ئەجندای دۆستایەتییەوە راستبوو. ئەمە گرنگترین لایەن بوو کە لەکەسایەتیم مابوویەوە. نەدەبوو یاری لەگەڵ ئەمەدابکەم. خیانەت بۆ ئەوان بێ، دۆستایەتیش بۆ من. لەراستیدا چوونم بۆ کینیا، فرێدانم بوو بۆ تاتارۆسی (بیری دۆزەخ) میتۆلۆژیا (میتۆلۆژیای یۆنان). زۆڵە هاوچەرخەکانی زێوس لەئەنجامدانی ئەم گوناهبارییە دوودڵ نەبوون. رەشپێستە خوێن شیرینەکانی ئەفریقیا لەتارتوس بەباشی ئەرکی خۆیان جێبەجێکرد. لەو خاڵەدابووم کە بەنێوان راستی و خەیاڵ ناودەبرێ. کاتێك منیان لەدۆزەخ هێناو وەکو پرۆمیتۆس لەکەنارەکانی ئیمرالی بەسترامەوە، لەرەوشی مرۆڤێکی نیوەچڵدا بووم، بەلام نەدەزانرا نیوەکەی دیکەی چییە، ئەنکیدۆ بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر جەنگابوو، بەڵام زۆر بەخراپی مردبوو، هیگل دەڵێ:"دەوڵەت ئەو خوداوەندەیە کەبووە بەخاوەن جەستە" پەلاماری تەواوی خوداوەندەکانی جیهان بۆ سەر من، لەراستیدا هەروەکو بڵێی منی بەرەچەڵەکی نیو ــ مرۆڤ، نیو ــ خوداوەندی پرۆمیتۆس گرێدەدا. تەنانەت رۆژێ هەزاران جاریش بشڵەژابووایە، هێزی نوێبوونەوەم نیشاندەدا، تەنانەت رۆژانە لاشەخۆرەکان دەنووکیان لەمێشکیشم بدایە، دیسان وەهام دەکرد کە کاربکات. کۆمەڵگای دەوڵەت و شار تارادەیەك منی لەناو گەدەی خۆیدا هاڕی، بەڵام دیسان رشابۆوە. منیش گەدەکانیانم پارچە نەکردبوو. لەئەنجامدا سەبارەت بەو پرۆسەیە قالبوومەوە کەکۆمەڵگای شارستان ــ دەوڵەتگەراو کۆمەڵکاری لادێ بەگووتەی هاوچەرخ کۆمەڵگای ژینگەپارێزی ـ سۆسیالیستی لەگەڵ یەکتر، نەك لەمیانەی ئاشتییەکی دروستکراو، بەڵکو چۆن دەتوانن لەدۆخی دووالیزمێکی دیالێکتیکی بەیەکەوە بژین؟ لەبەرگرینامەدا بەرشتییەوە هەوڵمدا هەندێ ئەنجام پیشانبدەم کەپێویستییان بەلێکۆڵینەوە هەیە. لەبەرئەوەی بەرهەمی ژیانێکی زۆر سەخت و هزرێکی بێ فێڵە شایستەی لێکۆڵینەوەو بەدەستهێنانی ئەزموونی مەزنە.

چەمکی هەڤاڵێتی کەسایەتییەکەم یەکێك بوو لەناکۆکییەکانی نێوان خۆم و واتاداری. ئەو بانگەشەی ئەوەی دەکرد: لەئەنجامی ئەم چەمکەوە خۆت خەڵەتاندووە. وا مەزەندەدەکەم لێگەڕینە گەورەکەی هەڤاڵێتی و تامەزرۆیی منی هەڤاڵێتی، سەرنجراکێش بینیبوو. لەگەڵ بەهاکانی کۆمەڵگای ئێستادا نەدەگونجا. هەستی بەوەدەکرد بەتەنیا دەمێنمەوەو هەڤالانم بەدوای بەرژەوەندی خۆیاندا رادەکەن. زۆر درەنگ هەستم بەو راستییەکرد. کاتێك گرفتەکە باشترین و دڵسۆزترینیان بێت، چی لەگەڵ هەڤالان دەکرێ، دەتوانی تاوەکو کوێ بڕۆی. بەگوێرەی من کارێك نەبوو نەتوانرێ ئەنجامبدرێ، ئامانجێك لەئارادا نەبوو پێینەگەیت. گرێدانی ریشەیی هەڤاڵێتی دیسان دووانەی گلگامێش ــ ئەنکیدۆی بەبیرهێنایەوە. لەمێژوودا بەردەوام دووانەی بەمشێوازە هەن. لەوانەشە پێویستییەکی دووالیزمی گەردوونی بێت. ئەوانەی دەخوازن کاروانی مەزن ئەنجام بدەن، پێویستییان بەهەڤاڵێتی مەزنیش هەیە. لەگوند کاتێك هێشتا لەتەمەنی منداڵیدا بووم لەناو ئەم لێگەڕینەدا بووم. حەسەن بینداڵ بەرهەمێکی ئەم لێگەڕینەبوو. چەتەی نەفرەتلێکراو چۆن پەی بەمەبردو خستییە ناو پیلانگێڕییەوە، تاوەکو ئێستا بۆ من کێشەیەکە پێویستی بەشیکارکردن هەیە. بەڵام ئەگەر پیلانگێڕی بۆی بلوابایە و ئەو گەمەیەی بەرامبەر هاورێکەم دەستپێکردبوو، بەردەوام بووایە، هەر لەو قۆناخەدا لەوانەیە منیشی بپێکایە. کەواتە هەڤاڵەکەم هەڤاڵێکی مەزن بوو.

کەمال پیریش یەکێك لەهەڤاڵە گەورەکانە، زۆر ئاستەمە یەکێکی دیکە بدۆزینەوە کەهێندەی ئەو بەهەستیاری بژی. چەندە مەزن و شکۆدار بکرێ، لەژیاندا بەرجەستە بکرێ هەرکەمە. لەو بڕوایەدا نیم ئێستاش بەتەواوی لێی تێگەیشتبین و لەژیاندا پەیڕەو کرابێت. گرنگییەکەیان لێرەدایە، لەجیاتی خۆیان، هەڤالانیان دەژیاندو ناچاری ژیانیان دەکردن. کەواتە دەمتوانی هەڤالانی خۆم بئافرێنم. بەهەزاران نموونەی ئەمە بەردەوامبوو. بەڵام ئەوانەش دەرکەوتن کەدەخوازن زۆر خراپ

بەکاریانبهێنن. لەرووداوەکان و گۆڕانکارییەکان دەرکیپێکرا کەبەشێوەیەکی هەرزان و ساختەکارانە پەیوەندی رەسەنی هەڤاڵێتیمان بەکارهێنراوە, تەنانەت زۆر لەمەزەندەکانیش بەربلاوتر بووە, من بەردەوام بڕوام بەگەورەیی هەڤاڵانم هێنابوو. بیرم لەوەکردبووەوە کەبەردەوام بەمجۆرە رۆڵ دەبینن. ئەمەش ئەنجامێکی, هەم بڕوابوونێکی زێدە بەخۆ, هەم خۆ بەهیچ دانان بوو. نەمدەتوانی ئەوە شیبکەمەوە کەکۆمەڵگای چینایەتی, پۆشاکی شارو دەوڵەت تاك دەخاتە ناو کامە قلّف (بەرگ)ەوە. سانایی بوو شێوازی پێکهاتەی خۆم گشتگیربکەم. کاتێك هەرکەسێکم وەکو خۆم دەبینی, لەوانەیە دەمخواست زیاتر لێیان نزیك ببمەوەو یەکێتی دروستبکەم. کەسایەتییەکی سەرسوڕهێنەری یەکگرتن بووم. هەرچەندە پێم ناخۆش بێ, بەلاّم دەبێ پەسندی بکەم لێرەدا زێدەڕۆییم کردو دایکم راست دەرکەوت, یاساکانی دونیا بەشێوەیەکی جیاواز پەیڕەو دەکرا. دەبووایە لەوە تێبگەم کە ئەنجام کەوتنە ناو دۆگماتیزم بوو. لەڕەوشێکدا کارەکان بەباشی بەڕێوە نەدەچوو, مسۆگەر باوەڕیکردن بەپرەنسیپەکان و گوایە رەوش باش دەبێت, لەمێژبوو گەیشتبووە سنوورەکانی دۆگماتیزم. ئەم زهنییەتە بەرەو دووالیزمی رەش ـ سپیشی دەبردیت. یان چاکەیەکی موکەممەل (تەواو)یان خراپەیەکی ئەبەدی. لەوانەیە کەمێك خلّتەی باوەڕی باوی زەردەشتیش بێ.

ئەم چەمکە ریشەییە لەبوارێکەوە خۆی رێکخست. مرۆڤی بەخۆیەوە بەستەوە. لەلایەکی دیکەیەوە واتە خەڵەتاندنی بووە بەربەست کەراستییەکان وەك خۆی نەبینم. پێویستە کاریگەری ئەم چەمکەم لەبنبەستبوونی "PKK" شدا ببینرێ. دووالیزمی رەش ـ سپی هەڵوێستێکی دیالەکتیکی هێندە بەرهەمدار نییە. بەرەو شێوازی هزری رووکەشی و میکانیکیت دەبات. لەئەنجامدا منیش کەوتمە ناو شێوازی هزری رووکەشیو میکانیکی, لەو شێوازە هەمەڕەنگ و زیندووە دوورکەوتمەوە کەدەیتوانی کاراتربێت. دیالەکتیکی رووکەشی لەراستیدا دۆگماتیزمی دیالەکتیکە. ئەمجۆرەی ئایدیالیزم کە لەسۆسیالیزمدا باوە, بەیەخەی منیشەوە نووسابوو. هەربۆیە بەها سەرسووڕهێنەرە بارگاوییەکان بەمەزنایەتی, قارەمانێتی, چاکە, راستی و جوانی ناو "PKK" و دژەکانی دووالیزمێکیان ئاواکردبوو. بەشێوەیەکی گشتی ناسنامە پووچەکان سوود لەم جۆرەی دووالیزمی دیالەکتیکی وەردەگرن. لەراستیدا ئەوانەی پرۆسەی بە "PKK"یی بوونیان لەکەسایەتی خۆیاندا بەرجەستە نەکردووە, خۆیان بە "PKK"یی دادەنێن و تەواوی درندەیی خۆیان بەشێوازێکی ناڤۆلا بەکاردەهێنا, ئەوانەی ناتوانن شوانکارێتی دوو بزن بکەن, بوون بەرێبەری رێکخستنی و فەرماندەی گەریلا, پەرەسەندنێکی بەمەبەست نەبوو. چەمکی سەرەتا "کەنیاز پاك بوو, لەو بڕوایەدا بوو کەهەڤالان باشترین کار بەسەرکەوتووترین شێواز ئەنجامدەدەن"؛ ببووە هۆکار. دەرك بەوەکرابوو لەرێگای ئەم چەمکەوە ناتوانین لەوە سەرکەوتووتر بین. بەلاّم ئەوەش یەکلانەکرابۆوە چۆن بەچەمکێکی نوێی رێکخستنی دەگەین.

کێشەکە خۆی لەقوولاییدا شاردۆتەوە. بەپێی هێزو توانام لەسەرەتای هەشتاکانەوە لەناو هەولێکی وەها گەورەدام کە لەرێگای شیکردنەوەی راستینەی کۆمەلگای کوردەواریدا "تاك" شیکار بکەم و بەوەرچەرخاندا تێپەڕی بکەم. بەلاّم کەسایەتییەك لەبەرامبەرم بوو کەچەندەی شیتەلّم دەکرد دەیگووت"من عینادم " دەستیان لەخۆیان بەرنەدەدا. تەنانەت لەتەوقی سەر تاوەکو نینۆکەکانی پێ لەناو کەسایەتییەکی خیانەتکار, بێ شەرەف, سووکی, ئارەزوومەندی لەناوچوون و دۆڕاندان, بەشێوەیەکی سەیر ئاشقی خۆیان بوون. ئەمە راستینەی مرۆڤایەتی بوو. بەلاّم پێچەوانەی راستینەی خۆی بوو, مرۆڤایەتییەك بوو کۆتایی پێهاتبوو. تەنانەت وەك هەویر خۆم شێلام, کردم بەنان و دەرخواردمدان, دیسان نەدەهاتنەوە سەررێ. لەسەر شێوازی ژیان و شەڕی تایبەت بەخۆیان سووربوون. لەبنەڕەتدا هیچ شتێکی لەدەستنەدەهات. نەك هەر تەنیا رۆڵی عەمباری یەدەگی باروتیان نەدەبینی, تەنانەت ئەوەی دەیگووت "من ناڤۆلاترین میلیتانم" تەمەنی سالێکی تێپەڕ نەدەکرد. عینادی منیش عینادبوو. هەردەبوایە هەڤالان "بژێنم" هەمووشتێکم بەرکەنار کردبوو, کەوتبوومە ناوشەڕی ژیانی

ئەم مرۆڤە گرگانە. هەم خۆشم دەخەڵەتاندو دەمگووت باشترین کەرەستەیە. ئەمە ئەو خاڵە بوو کەدایکم لەبەرامبەری یاخی بوو. هەر لەتەمەنی منداڵیم هەستی بەوەکردبوو کەخۆم دەخەڵەتێنم. کەمال پیرو حەقی قەرار وەك دوو رۆڵەی پاك و بێگەردی قەرەدەنیز (دەریای رەش) بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەرانە بەشێوازی هەڤاڵێتی منەوە بەسترابوونەوە. بۆ ئەوەی بچووکترین زەحمەتی بۆ من دروست نەبێ, بەرلەهەمووان رێگای ئەو کوردستانەیان گرتەبەر کەزمان و نەریتەکەیان نەدەزانی. بەڵام راستنەبوو هەمان هەستیاری لەرۆڵەی ئەم کۆمەڵگایە چاوەڕوان بکرێ کەدووچاری خیانەت هاتبوون. هیچ یەکێکیان بەشێوەیەکی خۆبەخشانە دڵ و مێشکی خۆی نەدەکردە یەك و نەدەکەوتنە رێ. هەروەکو بڵێی دووچاری"بەڵای نامووس" هاتبوون. یاخود بەگوێرەی راستییەکانی خۆیان بەڕێوەدەچوون و لەو بڕوایەدا بوون بەمجۆرە دەتوانن نامووس رزگاربکەن. ئەوەی داکۆکیان لەسەردەکرد, ئەو چەمکەی نامووس و کەرامەت بوو کەپێنج فلس ناکات. هەوڵمدا ئەو بەهایانەیان پێشکەش بکەم کەبنەماڵەو دەوڵەت ناتوانێ پێشکەشیان بکات. ئەوەی پێشکەشم کردن, شتێك بوو بەڕاستی دەیانتوانی نامووسی خۆیانی پێ رزگار بکەن. دیسان لەم خاڵەدا کارنەکردن بەگوێرەی کەرامەتی راستەقینە, وەك کێشەیەکی گەورەی خستیانە بەردەمم. بەشێویەیەکی سەرکەوتووانە یەکەمین هەڵمەتی "PKK" یی بوونم خستە پێشیان. هەریەکەو دەیانتوانی ببن بە"PKK" ییەکی باش, بەڵام تەنازولیان نەکردو ئەمجارە لەشاخەکانی کوردستان, لەتەواوی پارچەکان, لەگوندو شارەکان دووەمین هەڵمەتی گەورەی "PKK"یی بوونم خستەپێشیان. ئەمجارە بەهۆی تواناکارییەکان سەریان سوڕما, بەڵام نەیانخواست تێبگەن.

لەرۆژهەڵاتی ناوین و سوریادا تاکەرۆژێکیش بەئارامی خواردنێکم نەخواردو خەو نەکەوتەچاوانم. ژمارەیەکی زۆری کوڕان و کچانم بەخێوکرد کەدەهەزاریان تێپەڕدەکرد. تەنیا بۆئەوەی بەئازادی بمێنن و کەرامەتیان نەشکێ و گەورەبن, من ئەو داسەپاندنەم لەئامێزگرت کەبەرگەیان ناگیرێ, دواتر تێگەیشتم کە تەنانەت ئەم فیداکارییە بێ هاوتایەشم بەهەڵە شرۆڤە دەکەن. ئەوانەش کەم نەبوون کەبەهەڵەدا چووبوون و وایاندەیانزانی بەشێوەی پادشاکان دەژیم, ئێستاش لەبیرمە, دووران کالکان کەبەخۆی باوەڕەو هەوڵدەدات باش قسە بکات, لەناکاو وەڵامی لێگەڕینی پەیوەندییەکی تەلەفۆنی دایەوە, ئەو پەیوەندییەی چەند خولەکێکی خایاند شێوازی قسەکردنەکەی بەجۆرێك بوو, کۆتایی بەو پەیوەندییە دەهێنا لەگەڵ ئەو شوێنەی کەلێیبووین. گوایە تەواو وەك شۆڕشگێڕان قسەی دەکرد. لەپراکتیکی دواتردا سەیرم کرد بەشێوەیەکی بابەتی چەندە فیداکاریش بێت, بەڵام هەست بەوە ناکات لەسەرەتا تاوەکو کۆتایی لەناو پاکتاوکاریدا دەژی, دەژیێنێ. دەشێ لەکەسایەتی ئەودا دەرك بەوەبکرێت کەچەپی تورك چۆن خۆی پاکتاوکردووە. دووران لەناو ئێمەدا یەکێك لەهەڤاڵە هەرە باشەکانە, ئەی ئەوانی دیکە؟ تەنانەت نەیاندەتوانی سکی خۆشیان تێربکەن. بەتایبەت کاتێك چەکیان بەدەستەوەبێت, ژیانیان وابەستەی پەرچوو (معجزە)ە کانە, دیسان ناچار بووم خەم و پەژارەکانیان بنۆشم. بەداکۆکیکردن (عناد) بەرامبەر بەدایکم دەبووایە باشی هەڤاڵانم بسەلمێنم. کاتێك تەماشای فووڵاییەکانی ئەم دیاردەیە بکرێ, ئەوا دەتوانرێ کەسایەتی هەزاران ساڵەی ئەو کۆمەڵگایە ببینرێ کەوشکی کردووە. کەسایەتییەکی بەندە, کە لەژێرەوە دەبوو بەکۆیلە, لەسەرەوەش دەبوو بەدەسپۆت. بەشێکی زۆری ئەو هەوڵانەی لەپێناو شیکردنەوەو تاودانی ئەم کەسایەتییە خەرجم کردووە, بەپێچەوانەوە دەگەڕایەوە. ئەوانەی لەفەرمانداریێتی تێدەگەیشتن هەروەکو نموونەی پادشای قەرەجەکان بەشێوەی "هەر سەرەتاوە باوکی خۆی لەسێدارە دەدا"بوو, ئەو کارەی هەرەزێدە توانایان بەسەردا دەشکا, یەکتری پاکتاوکردن و لەپەلوپۆخستنی یەکدی بوو. زۆرباش دەزانم یان بەمەبەست, یان لەئەنجامی دەست لەخۆبەردان, بەسەدان هەڤاڵی شاجوانی ئەم جیهانە لەخۆڕاکرانە قوربانی. ساختەکاری و زهنییەتێکی وەهایە, هێندە دڵڕەقە, بۆئەوەی لەهەڤاڵ رزگاری بێت, بەبێ چاو نووقاندن, بۆ مردنی دەنێرێ, ئەمەش بووە بەکارێکی ئاساییان. ئەمجۆرە کەسایەتییانەی پیلانگێڕی کەلەناو ریزەکاندا هەبوون, هەرەدوایی دەیانخواست مەسەلەکە تاوەکو

پاکتاوکردنی من درێژ بکەنەوە, لەمانە ئەو سیانەی (سێکوچکەی) بە "شاهین بالیج, محەمەد شەنەرو جەنگیزحازر" دەناسران, لەسەرەتای 1990 لەناو پەیوەندییەك کەتاوەکو ئێستاش نازانرێ گرێدراوی کوێ بوون بەئامانجی پاکتاوکردنی من, بۆدروستکردنی ئاژاوەگێڕی هاوڕێی منداڵێتی و خەڵکی گوندەکەمان حەسەن بینداڵیان شەهیدکرد, ئەمەش لەژێرناوی قەزاو قەدەرەوە ئەنجامدرا. دوای ئەوە تۆڕێکیان ئاواکردبوو. مەزەندە ناکەم هەموویان سیخوڕی نێردراوبن. شیمانەی لەپێش ئەوەیە بۆئەوەی دەستبەسەر ڕێکخستندا بگرن و پادشایەتی فەرەجەکان پەیڕەوبکەن. پێڕەوەکانی پیلانگێڕییان گرتبووەبەر, بەپێچەوانەی مەزەندەکان سوپای تورك گەریلای تێکنەدەشکاند. ئەم کارە ساختەکاریانەی لەناوخۆ سەریانهەڵدا گەریلای ئیفلیج کرد.

بەمجۆرە بەسەدان هەڤاڵی هەڵبژاردەو بێ هاوتای قارەمانێتی و فیداکاریمان وەك"هەڤاڵ عەگید" لێ شەهیدبوو, کەلێرە ناتوانم ناوی هەموویان بێنم. یەکێك لەبەناوبانگترین چەتەکانیش شەمدین ساقق بوو, تەنیا بەسیستەمی بەندایەتی نەوەستا, بەڵکو یەکێك بوو لەوانەی بەباشترین شێوە پادشایەتی فەرەجەکانی پەیڕەوکرد. جەمیل بایق کەیەکێك لەئەندامە دڵسۆزەکانی کۆمیتەی ناوەندی بوو, گوایە لەجیاتی ئەوەی حیسابی لێ بپرسێ, تەنانەت ئەو توانستەشی نیشاننەدا کەببێتە کۆسپ و نەهێڵێ محەمەد شەنەر, جەنگیزحازر و شەمدین ساقق لەژێر کۆنترۆڵی ئەودا رانەکەن. لەراستیدا ئەگەرهەبوونی من نەبووایە, بەچەند زەبرێك هەموویانیان لەناو دەبرد. تەنانەت هەستیان بەمەش نەدەکرد, هەروەکو دەڵێن بەکەر ناوێرێ و پڕەدداتە کورتان, حیسابی گرانیان لەو داماوانە دەخواست کەلەژێر دەستیاندا بوون. لەکاتێکدا مەیدان بۆ ئەو چاوسوورانە کراوەبوو کەرێکخستن و گەریلایان تەختکرد, سزادانی ئەو مێرمنداڵانەی گرفتی راهاتنیان هەبوو لەژێر بیانووی پێویستییەکانی دیسپلین کارێك بوو کەم بەرچاو نەدەکەوت. یەکێك بەناوی سەلیمە ئاشقن هەبوو. کاتێك لەئورفا مامۆستایەتی دەکرد, یەکێك لەو کەسە یەکەمینانە بوو کەپەیوەندی بەگروپەکەمانەوە کرد, فیداکاربوو, چووە دەرەوە, پەروەردەکرا. کاتێك بیستم لەیەکەمین پراکتیکی کامپەکانی وڵات لەژێر بەرپرسیارێتی دووران و عەلی حەیدەر قەیتاندا کوژراوە حەپەسام, ئەوەی گووتیان ئیفادەیەك بەشێوەی "تەواوی دیسپلینی سەربازی سەراوبن دەکرد, هەموو شتێکی تێکدەدا, هەربۆیە سزادانی بووە ناچاری" ناچاربووم بڕوا بەقسەکەیان بکەم. ئەمەش پێویستی دیسپلین بوو, بەلام رووداوێك بوو لەگۆشەیەکی دڵمدا جێگیرم کردبوو. بەگوێرەی من تاوانەکەی چەندە قورسیش بێت, یەکێك نەبوو بەمجۆرە پاکتاوبکرێ. بەلام نەمدەتوانی شتێك بکەم. دۆگماتیزم بەواتای "سۆسیالیزمی بونیادنراو" دڵی منیشی بەستبوو. لەروسیاش سۆسیالیزمی دەوڵەتگەرا بەهەمان شێوە هێژاترین هاوڕێیانی خۆی کوشتبوو"بووخارین و... هتد". بەملیۆنان گوندی "جووتیار"کوژران و سەراوبن کرابوون. دواتر ئاشکرا دەبوو ئەمە سۆسیالیزم نەبووە, بەڵکو سەرمایەدارییەکی درندەی شێوازی روسیابوو. لەراستیدا ئەمە ئەو رەوشەی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ئومێدی ملیۆنان بوو, کەدووچاری خیانەت هاتبوو, هەروەکو لەچەندین شۆڕشی مەزندا روویداوە, بەزۆری خیانەتەکان دەکەونە خزمەتی خاوەنەکانیان. لەحەزرەتی محەمەد تادەگاتە مەسیحییەکان مێژوو پڕە لەو نموونانە. بەلام لەو بڕوایەدام لەمیانەی ڕێنماییەکی تیۆری پێویست کە لەم بەرگرینامەیە نیشانمداوە, ئیدی ئەمە قەدەرێك نییە. مەزەندە دەکەم تابەخۆم دەگات ئەو کەسایەتییەم شیکردەوە کە ئەم رەوشە دەخوڵقێنێ. کەمێکیش بێت هەوڵێکە مرۆڤ ئارام دەکات.

ئاشکرایە ئەوەی "PKK" بەرامبەر خۆی ئەنجامی دەدا پاکتاوکاری بوو, سەرباری ئەوەی مێژووی هاوچەرخمان هەمووجۆرە قارەمانێتی و دلێری و فیداکارییە گەورەکانی نیشانداوە, بەلام رابردووی نەفرەتلێکراوو جادووگەرەکانی سیستەمی سەرمایەداری بەئاسانی دەرفەتیان بەئازادبوون و مەزنبوونێکی رەسەنانە نەدەدا. سەرباری ئەوەی پێڕەوەکانی ئەم دووسەد ساڵەی دوایی رزگاری نیشتمانی و کۆمەڵایەتیمان تاقیکردەوە, بەلام دەستکەوتەکان سنووردار بوو. ئاشتییەکی

شەرەفمەندانە بەدینەهاتبوو. ئەو پێڕەوەی خوازیاری تاقیکردنەوەی بووم. هەڵمەتی "ئاشتی و رێگەچارەی دیموکراتییانە" بوو کەبەلانی کەم هێندەی 1975 جۆش و خرۆشی دەوروژاند. چاوەڕوان بووم موخاتیبەکانم ئاستێکی بەرزی تێگەیشتن نیشانبدەن و بەشداری بکەن. بەڵام لەبەرئەوەی منیان بەژێرکەوتوو لەقەڵەمدا بەجددیان وەرنەگرت, تەنانەت وەك هەوڵێکی سووکایەتیکردن هەڵیانسەنگاند.چەندە جێگای داخە, کەلەناو پاشماوەی رێکخستنەکانیشمان کەم نین ئەوانەی لەم روانگەوە تەماشای دەکەن, هەندێکیان بەئاشکرا منیان بە" تەسلیمبوون بەبۆرژوا" تاوانباردەکرد. هەندێك لەزۆربەی هەڤاڵانیش وایان مەزەندەدەکرد بەزۆرەملێ بەم خاڵە گەیشتووم, بەگوێرەی خۆی ئامادەکاری بۆ قۆناخی نوێدەکرد، دیسان چەندە جێگای داخە وردەوردە ئاشکرادەبوو ئەو هەوڵانە کەم نین کەدەتوانین بەلێکدانەوەکانی قۆناخی نوێی بەناوبکەین. تەنانەت ئەوانەی نەیاندەزانی میراس چییە، هەریەکەو وەك میراتگرێکی نارەسەن, بەبێ ئەوەی هەستی پێبکەن کەوتنە ناو هەڵوێستەکانی میراتگری. هەرگرووپێك دەیتوانی شتێك بەدەستبێنێ تاوەکو لەسەری بژین. هەستم بەوەکرد.

ئەو مۆدێلەی لەجێگای میراسی "PKK"گونجاوم بینی کەخۆی هەڵوەشانەوە, پێکهاتەیەکی خاوەن گەوهەرێکی دیموکراتییانە بوو. بەم جۆرە بە KADEK دواتریش بەکۆنگرەی گەل گەیشتن. پڕ بە دڵەوە خواستبووم گشت بەرگرینامەکانی قۆناخی ئیمرالی لەسەربنەمای تیۆری و پراکتیکی دیموکراسی پێشبخەم. ئەگەر رووکەشیش بێت ناوەڕۆکەکەی بەمجۆرەبوو. ئەم هەڵوێستە دەیتوانی پاشماوەکانی کۆیلایەتی و دەسپۆتیزم لەکەسایەتییەکاندا شیبکاتەوە. هەڵمەتێکی دیموکراتیانەی واتادار کەلەناو گەل بەڕێوەببردرێت, کۆمەکی بەرێگەچارەی سیاسی و ئاشتیش دەکرد. وەك دەرفەتێکی باش دەتوانرا قۆناخ بەم شێوەیە هەڵسەنگێنرێ. لەکاتێکدا هەڵمەتە زانراوەکەی دوای 11ی ئەیلولی ئەمریکا ئەو هەنگاوانەی وەستاند کەلەکۆماری تورکیا چاوەڕواندەکرا, دەرك بەوەکرا کە لەژێرناوی KADEK جموجۆڵێکی بەرەوپێش و چارەنووسساز ئەنجامنەدرا. تێنەدەگەیشتن کەشەڕی ئاشتی و دیموکراسی لەشەڕە گەرمەکانی سەربازی سەخترە. لەتێگەیشتنی ئەوە دووربوون کەئاشتی لەشەڕ زەحمەتترەو پێویستی بەهەوڵێکی بایەخدارەو تەنیا لەمیانەی رێکخستن و چالاکی مەزنەوە بەڕێوەدەچێت.

لەکاتێکدا حکومەتی هاوپەیمانی DSP,ANAP,MHP کە لە جیهانی خەیاڵیدا دەژیا و سەرۆك وەزیران بولەند ئەجەوید رێبەرایەتی دەکرد, دوای ئەوەی سەراوبن بوو, ئەو کوالسیۆنەی بەناوی پارتی دادو گەشەپێدان AKP بوو سوودی لەم بۆشاییە مێژووییە وەرگرت و رێگای حکومەتی دەگرتەبەر.چەپ و سۆسیال ـ دیموکراتەکان دووربوون لەوەی رووداوەکان شرۆڤەبکەن. دواتر دەمبینی کە کادەك و کۆنگرەی گەلیش لەپێگەیەکی جیاوازتردا نەبوون، و سامناکتریش ئەوەبوو کەلێکدانەوەیان لەسەر ئەو هەوڵە دیموکراتیانە بوو کەبەهەزارو یەك بەڵا بەڕێوەدەبرا. کاتێك ئەمە دەڵێم مەبەستم ئەو دووگرووپە رکابەرەیە کەعوسمان ئۆجەلان و جەمیل بایق رێبەرایەتییان دەکەن, لەژێر هەلومەرجە سەختەکانی گۆشەگیری زۆر بەزەحمەتی زانیاریم پێگەیشت کەهێشتا کۆنگرەی گەل یەکەم هەنگاوەکانی خۆی نەهاوێشتبوو خۆی لەپەلوپۆخست. لەناو بزووتنەوەیەکدا تەنیا ئەو کاتە گرووپچێتی رەوایە کەبەشێوەیەکی بەرجەستە ئیش و کارەکان بەرەو پێشەوە ببات. لەرەوشێکی پێچەوانەدا هەرچەندە نیازپاکیش بن, لەوە رزگاریان نابێ وەك ئاژاوەگێڕی و بزووتنەوەی فەساد هەڵسەنگێنرێت. لەناو "PKK" دا ئەم گرووپگەراییانەی دوواییش, بەشێوەیەکی گشتی لەبەرئەوەی تێکۆشان بنبەست دەکەن و رێگا لەپێش پاکتاوکاری دەکەنەوە نارەوان. مێژووەکەمان ئەم راستییەی سەلماندووە. لەکاتێکدا لەبونیادی کۆماری تورکیا پاشماوەکانی چاخی ناوین لەمیانەی گەمەی دیموکراسیەتێکی تەمومژاوی بەگفتوگۆ هەڵمەتی ئەنجامدەدا, لەپێکهاتەی زهنییەتی پاشماوەی چاخی ناوینی ناو "PKK" شدا, تەنانەت پێویستییان بە "گەمەی دیموکراسی"ش نەبینی, بەگوێرەی ئارەزووی پادشایەتی گوایە گەمەی دەسەڵاتیان پەیرەودەکرد. هەردوو گرووپیش نەك تەنیا دیموکرات نەبوون, هەندێ مەیل و حەسرەتی

کەسێتییان دەسەپاند کە هەوڵە دیموکراسیخوازەکانیان پووچەڵ دەکردینەوە. بەئاشکرا دوای ئەوەی ئەنجامی هەڵبژاردنە خۆجێییەکانم بینی, وامزانی دووچاری دەستدرێژی هاتووم و پێویستی بەرخۆدانم نیشاندا, هەڵوێستێکم نیشاندا کەناتوانرێ یاری بەهەڵمەتی دیموکراتییانەم بکرێ, بەلانی کەم پێویست دەکات تاوەکو رزگارکردنی کەرامەت بەشێوەیەکی بێ پەروا ئەوانە پووچەڵ بکەمەوە کەئەم یارییە دەکەن. کاتێك دەستم دایە نووسینی ئەم بەرگرینامەیە, بینیم کەیەکێتی ئەورووپاش لەناو ئەم گەمەیەدا ماوەتەوە, تێگەیشتم کەوەلامدانەوەیەکی سەرتاسەری پێویستە. کاتێك شەڕی ئەمریکا سەبارەت بەئێراقیشی هاتەسەر, ئەوا پێشخستنی "بەرگرینامەیەکی دیموکراتییانە"ی مێژوویی بایەخداربوو.

مۆدێلی کۆنگرەی گەل تاچەند بلێی چارەنووسسازبوو, لەکاتێکدا هەوڵدەدات لەرێگای دیموکراتیزەبوونەوە کێشەی دەوڵەت چارەسەربکات, ئەوا گرفتەکانی یەکسانی و ئازادی گەل لەژێر سایەی دیموکراتیزەبوون گونجاوترین کرانەوە ئەنجامدەدات. لەهەمانکاتدا لەناو پراکتیکی دیموکراتییانەی چڕدا دەیتوانی بەپەروەردەو فێرکردن کێشەی کەسایەتی چارەسەربکات. بۆ بەلاوەنانی ئەو بنبەستبوونانەی شۆڕشە هاوچەرخەکان تێیکەوتوون جگە لەپێڕەوەکانی کۆنگرەی دیموکراتییانەی گەل ناتوانرێ بیر لەرێگایەکی گونجاوتر بکرێتەوە. لەوانەیە بەسادە ببینرێ, بەڵام دەتوانرێ وەك هێژاترین سەرفرازی دیموکراسییەتی راستەقینەی مێژووو ئەمرۆمان پێناسەبکرێ. لەجیاتی ئەوەی لەمیانی شەڕو تەکنۆلۆژیادا هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەو گیروگرفتەکان بدرێ کەرێگا لەپێش قڕکردنی گشتی و ژینۆساید دەکاتەوە. رێگا لەپێش ئەو رێگەچارە مرۆییانە دەکاتەوە کەلەناو ئاشتی و دیموکراسیدا لایەنی فێرکاری لەپێشەو دەستکەوت بۆ هەموو هەمەڕەنگییەکان بەدەستدێنێ و رێگەچارەیەکی مرۆڤانەیە. ئەو رەخنانەی دەڵێ دیموکراسی زۆر توندنییە, خوێن نارێژێ یاخود وەڵامی هاوسەنگی هێزی سەربازی ناداتەوە, بەهایەکی ئەخلاقی مرۆییانە (انسانی)ی نییە.

هەرچەندە هەوڵە قووڵەکانی دیموکراسی سەبارەت بەکێشەی کورد بەشتێکی سادەو ئاسایی ببینرێ, لەماوەی درێژخایەندا دەتوانێ چارەسەری مسۆگەرو هەمیشەیی بەناوی گەل بەدەستبهێنێ, دەوڵەتەکان ناچاربکات دەست لەکردەوە بێ واتاکانی توندوتیژی بەربدەن. بەمشێوەیە دەتوانێ کۆمەکێکی بەهێز بەو دیموکراتیزەبوونە بکات کەرۆژهەڵاتی ناوین پێویستی پێیە.

پێشتر لەبەرگرینامەدا بناخەی مێژوویی ئەوەم پێشکەش کردبوو. هەروەها لەسەر بنەمای خۆ پاراستن"بەرگری رەوا" تاوەکو بەدیهاتنی ئاشتییەکی هەمیشەیی بەچەکداریش دەیتوانی بەرگری لەخۆی بکات. کاتێك پێویست بکات دەیانتوانی مافەکانی بەرگری رەوا لەهەموو گۆڕەپان و بوارێکدا بەرامبەر رەفتارو کردەوە دژە دیموکراتییەکان بەکاربهێنن. لەم پێناوەدا لەبواری چەندایەتی و چۆنایەتی بەپێی پێویست هێز بەدەستبێنن. دەیانتوانی کولتووری ئەو پارتانە بەلاوەبنێن کەتەسك و دەستڕۆن و لەتیشکۆی دەوڵەتدا دەخولێنەوە, ئەو خەسڵەتە بەدەستبێنن کەبۆ چالاکی دیموکراتییانەی گەل پێویستە, وەرچەرخانی کەسایەتی بەیەکەوە لەگەڵ کۆمەڵگابوونێکی دیموکراتییانە ئەنجامبدەن. توانستە تیۆری و پراکتیکییەکانی ئەم کارە پێشکەش کرابوو, شێواز و قاڵبەکەیان لەبەردەستدابوو. ئەگەر دەرکیان بەناوەرۆکەکەی بکردایە بەشی خۆیان لەئەشقی دیموکراتییانە وەربگرتایە, ئەوا هەرئەندامێکی ئەم چالاکییە لەکارێکدا سەردەکەوت. کاتێك پێشکەوتنی چاوەڕوانکراو روونەدات, ئەوا پێچەوانەکەی پێویستییەکی دیالەکتیکییە. لەساتە هەستیارەکاندا سیاسەت بۆشایی پەسند ناکات. لەکاتێکدا کوردایەتی بەکرێگراو لەسەر بنەمای رێککەوتن لەگەڵ ئەمریکا هەنگاوی گرنگی دەهاوێشت, ئەوانەی پێویست بوو بەناوی گەل سەرکەوتن بەدەستبێنن, تێڕوانین و نیازە ناواقیعییەکان و گروپچێتی تەسك و کەموکورتییە مێژوویی و داخوازییە تایبەتییەکانیان کرد بەکێشەیەك.

گوندێتی هەستی بەوەنەکرد کە کەوتۆتە ناو گەمەیەکی ساختە و دەستکردی دەسەڵاتەوە. ئەوانەی هێزو توانای هەنگاوە مێژووییەکانیان نییە, بەردەوام روو لەشەڕی ناوخێزان دەکەن. لەکاتێکدا پێویست بوو بەشێوەکی ئەرێنی ئەوکێشانە

چارەسەربکەن کە بەتەن لەسەر یەکتر کەڵەکە ببوو و لەئاکامی کرانەوە بەڕووی دەرەوەدا چارەسەری بکەن, لەساتە هەستیارەکاندا کەوتنە ناو ئەو لێکدانەوەیەی بەشی هەر یەکەیان لەمیراس چەندە. ڕەوشی مەترسیداری من ئەم لێکدانەوانەی بایەخدارتر دەکرد. ئەوانەی بەسووپابوونێکی راستەقینەی سیاسی و سەربازی ئاوانەکەن, پشت بەئاواکردنی گروپە خۆجێیی"ئەحباب چاوشی" یەکانی خۆیان دەبەستن کەدەستەو توانستێکی زۆریان لەژێردەستدا کۆببۆوە کەگفتوگۆیەکی زۆری دەهێنا. هیچ گوێی بەوە نەدەدا کەرەنجی مێژوویی دراوە, ئێش و ئازار بینرا, خوێن ڕژێنرا, لەئاستێکی سامناکدا گەل بەرێگای برسیکردن پەروەردە دەکەن و بەهەزاران هەڤاڵ هێشتان لەناو دیوارە بێرۆحەکانی زیندانداندان؟! ئەمانە بایەخدارو گرنگ نابینرێ, خۆیان بەملاو و ئەولادا دەبەن و بەهانە دەدۆزنەوە کەبۆچی پێشنەکەوتووە. دەشێ یەکەمین قۆناخی کۆنگرەی گەل بەمجۆرە وێنەبکرێ. ئەمە ڕەوشێکە سەبارەت بەوانە دەرکی پێدەکرێ کەبەساڵان بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە ئەرکی شۆڕشگێڕی خۆیان جێبەجێنەکرد. بەڵام شرۆڤەنەکردنی ئەو ڕاستینەیەی میراسی "PKK" ئەم شێوازە پەسند ناکات, جارێکی دیکە ئەو ڕاستییەی بەبیر دەهێنانەوە کەتێیدان.

لەسەر ئەم بنەمایە ئاگادارییەکانی "تنبیە"ی خۆم کرد. من هەرلەسەرەتاوە دیاردەی دەسەڵات و دەستڕۆییم خۆشنەویست. بەڵام سەبارەت بەبەڕێوەبردنێکی چاك و ڕێکوپێکی کاروبارەکان زۆر هەستیاربووم. لەژێرهەمووجۆرە هەلومەرجێکدا بەدواداچوونی هەندێ کاری مەزن و پیرۆزی گەل, مەسەلەیەکی باوەڕی بوو. زۆرجار بەمجۆرە ئاگادارم کردوونەتەوە: کاتێك بەراستی وەك نوێنەری من لەمەسەلەکان تێبگەن, ئەوا هەندێ بەهای پارێزراوی گەلی کوردیش بوونی دەبێت. ئەوانەی گوێشیان پێنەدەدا دواتر زوو یان درەنگ تێدەگەیشتن زۆر خراپ سەری خۆیان لەدیوار دەدەن. وردەوردە کاتی تێگەیشتنی ئەوەبوو کەلەناوەوەو دەرەوە سەریان لەدیواردراوە.

ئەوە بابەتێك نەبوو بەهەندی بگرم کەگروپ لەدەرەوەی عوسمان ئۆجەلان یان جەمیل بایقدا هەیە یاخود نا. تەنانەت گروپی بەهێزیشیان هەبووایە, دوعام دەکرد سەرەتا من پاکتاو بکەن. خۆزگە گروپی بەهێزی دەسەڵاتیان هەبووایە, گورزێکیان لەدژبەرەکەیان بووەشاندایە, فەیناکە باسێ گورزیشیان لەمن بووەشاندایە, دیسان دەمگووت ئافەرین, بەڵام ئەگەر گروپی بەمجۆرەش هەبێت, بەئەنقەست یان بێ ئەنقەست هەموو لەبوون بەگروپی پاکتاوکردن رزگاریان نابێت. کەمبوونی ژمارەی یەکێکیان و زیادبوونی ژمارەی ئەویدیکەیان, هێندەگرنگ نەبوو. ڕێکردنەوە لەپێش ڕووداوی بەم چەشنە خۆی لەخۆیدا دواکەوتن و زیانە. زیانێکە لەبواری کات و وزەو کەرامەت.

ئەو بابەتەی زیاتر من پەیوەندیدار دەکات, ئیتر بەهۆی نازناوی "لقب"ی ئۆجەلان بێ یاخود بەهۆی هەڵوێستەکانی گروپی دیکەبێت کە بەمن گەییشتووە, لەکاتێکدا بەرواڵەت دژایەتی یەکتریان دەکرد, ئاگاداری ئەوە نەبوون کەلەناوەڕۆکدا بەمنەوە خەریك دەبن. ڕاستتر ئەوەیە هەروەکو چۆن لەچەندین نموونەی پێشووتردا بینیبوومان, لەمیانەی دوو گروپی ساختەو پراکتیك کارێکیان دەنایەوەو کاردانەوەی خۆیان بەرامبەر من نیشاندەدا. لەم قۆناخەی ئێستادا نەیاندەتوانی ڕاستەوخۆ دژی من بووەستن. تەنیا لەکاتی ڕاکردن دەیانتوانی ئەمە ئەنجام بدەن. ئەمەش بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانیان نەبوو. کۆشش لەدژی من بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆو چاوچنۆکانە بەڕێوەدەچوو, چونکە بەساڵان گەلێك شتیان لەجیکڵدان"گەدە"یان کۆکردبۆوە, تاوەکو لەبەرامبەرم بڕشێنەوە. دەبووایە ڕێگایەك بۆهێنانەوەی بدۆزنەوە. ئەمەش لێکدانەوەی گوندێتی ساویلکەیە. دەبێ ئەوە پەسندبکەن, لەتێگەییشتنی ئەم ڕاستییەدا بەهەڵەدا نەچووم. ئەگەر دروستی و دڵسۆزییان هەبێت, ئەوا تاکەرێگای سەلماندنی خاوەندارێتیکردنە مێژووییەکانە بەرامبەر هەمووجۆرە گەمەو فشارێکی ناوەوەو دەرەوە. ئەگەر تووڕەیی و رقیان ڕەسەن بێ. ئەوا پێویستە لەسەرخستنی ئەو ئەرکانەدا نیشانی بکەن کەتەواوی گەل و

هەڤاڵان چاوەڕوانی دەکەن, ئەمەش ببێتە هەڵوێستی هەرهەڤاڵێك کەدەڵێ "من دڵسۆزم" لەکاتێکدا جارێکی دیکە ئاماژە بەوەدەکەین کەدان بەم مافەدا دەنێین, ئەگەر لایەنەکان قووڵایی رووداوەکان نەزانن, ئەوا من باسی دەکەم, تێیان دەگەیەنم.

لای من گروپەکان لەناوەڕۆکدا هەمان شتن, جیاوازی شێوە هێندە گرنگ نییەو دیسان پێویستە هەندێ شرۆڤەی کورت ئەنجامبدەم. ئەگەر بەهۆی ناتەواوییە جددی و کەمی زانیارییەکان شرۆڤەی هەڵەم هەبێت, هەڵبەتە قەرەبووکردنەوەی ئەمەو گێڕانەوەی ئیعتیباری هەڤاڵان بۆ یەکێك هێندە زەحمەت نییە کەبەردەوام لەناو رەخنەداندا دەژی.

چەندەی بڵێی سەبارەت بەو لادان و گروپگەراییانە قاڵبوومەوە کە لەرووخساردا دژی یەکترن و لەناوەڕۆکدا پەرچەکرداری خۆیان بەرامبەر راستینەی سەرۆکایەتی نیشاندەدەن. ئەوەی لەمێژووی بزووتنەوەکەماندا روویداوە, یەکسانە بەیەکنەگرتن, ئاوانەکردنی بەڕێوەبەرێتی خۆیی, ئاوارەیی و هەڵچوون بەرامبەر یەکتر کەلەراستینەی کۆمەڵگاکەماندا هەیە؛ خۆراکی خۆی لەم کولتووره وەردەگرێ. یەکەمین رێچکە کەئەوانە دەیگرنەبەر تاکڕەوێتی و بەرژەوەندیپەرستی دەخەنەپێش, ئاواکردنی گروپە تەسکە(خۆجێیی ــ پێرپێرێتی)یە. ئەوەی ئەنجامدەدرێ کاریگەربوونە بەسەربەشێکدا. سەرکەوتنی مێژوویی رێکخستنیمان گرێدراوی تێپەڕکردنی ئەم کوولتوورەیە. هەروەها قسەی بێ مانا, ئۆگۆییزمە سەرەتاییەکان و سیاسینەبوونی ناو کۆمەڵگامان لەم هەڵوێستانەدا دەردەکەوێت. دەشێ بەشێوەیەکی فراوان هەڵوەستە لەسەر بناخە ماددییە ــ بابەتییەکەی بکرێ. لەم بارەیەوە شیکردنەوەی بەرفراوانم ئەنجامدابوو.

ئێستاش لەبیرمە, چەندین کەس ئەم بانگەشەیەیان پێشخست کە:"PKK ژیانمان لێدەدزێ", چەندین لادەرو پاکتاوکار لەزیندان یاخود دەرەوە, ئەم بانگەشانەی دەردەخستە پێش. زۆر سروشتییە رێبەرایەتییەك کەدەخوازێ گەلی خۆی رزگار بکات و وڵاتی خۆی ئازاد بکات, لەجیاتی ئامانجە تاکڕەوو تەسکەکان, دەخوازێ ئەندامەکانی رێکخستنەکەی "خۆیشی لەسەرووی هەموویانەوە" لەسەر بنەمایەکی راست ژیان و رۆحی خۆیان لەپێناو ئامانجی بەرزو پیرۆز رێکبخەن و بەکاربێنن. چونکە بەجۆرێکی دیکە نابێت بەرێبەرایەتی رێکخستن. ئەدەبیاتەکانی ژیانی سۆسیال "کۆمەڵایەتی"یش ئامرازێکی ئەمەیە. کاتێك پێویستیش بکات, ئەوانەی ژیانی سیاسی و سەربازییان نەدیوە, ناتوانن ژیانی سۆسیال رێکبخەن, و تەنانەت ئەگەر ئەنجامیشی بدەن, دەبێ باش تێبگەن کەلەژیانێکی نامۆیی بەولاوە هیچ واتایەکی دیکە نابەخشێ. ئەگەر قارەمانێتی راستەقینە لەگەڵ شەرەفی ئازادی هەڵسەنگێنین, ئەوانەی تەنانەت لەنزمترین ئاستیشدا تێکۆشانیان نەگەیاندۆتە سەرکەوتن, هەبوون یاخود نەبوونی ژیانی سۆسیال, خێزان, هاوسەرو منداڵ هیچ واتایەك ناگەیەنێ. پێویستە تێکۆشەرە راستەقینەکان و بەپرەنسیپەکان هیچ کاتێك ئەم راستیانە لەبیرنەکەن, لەڕەوشێکی پێچەوانەدا پێویستە خۆیان بەجۆرێکی دیکە پێناسەبکەن.

هەروەکو دەزانرێ هەوڵێکی زۆرمدا تاوەکو نمونەی رێبەرایەتییەکەم بۆنی بنەماڵەگەرێتی لێنەیەت. من خۆم بەرفراوانترین رەخنەی کردارییم بەرامبەر ئەو مەیلانەی عوسمان پێشخست کەدەزانرێ. سەرباری ئەوە زۆر سەیرە کەپەنا دەبەنەبەر رزگاربوون لەئۆجەلانیزم. سەیرە, لەرۆژنامەیەکدا نووسرابوو"تاوەکو لەکەمالیزم و ئۆجەلانیزم رزگارمان نەبێ, ناتوانین رەوتی چەپ پێشبخەین". هەروەکو دەزانرێ ئەوەی ئەمەی نووسیوە لەناو هەرزانترین ژیانی تاکڕەوێتیدا دەژی. زۆرسەرسەری و بێ ئاگان. هێزی ئەوەیان هەبێت بۆ تاکەرۆژێکیش وەکو من بژین, بەرگەی ژیانی من بگرن, ئەوا ئامادەم تەواوی میراسی خۆم "رێکخستن" پێشکەشی ئەم ساختەکارانە بکەم. ئەمانە هێندە بێئاگاو ساختەکارن, تەنانەت نازانن ئەگەر ئێمە نەبین لەمافی ژیانیش"ژیانی ئاسایی" بێبەش دەبن.

هەروەکو دەزانرێ لەبەرئەوەی عوسمان ئۆج ئالان ماوەیەکی درێژە لەمیانەی کەموکوڕییەکانی دەجووڵێتەوە منیشی خستۆتە رەوشێکی زەحمەتەوە. هەر لەساڵی 1980 کانەوە بەرگەی قۆناخی نەدەگرت. بەسۆزداری "عاتیفی" دەمایەوەو لەبواری تیۆری قووڵنەدەبۆوە. تەنانەت ئەو کارانەی بەهەموو توانای خۆشییەوە هەوڵی بۆ دەدا, لەئەنجامگیربوون دووربوو.

زۆر بەئاسانی دەکەوتە ناو هەڵوێستی رووکەشی و تەفرەدەرانە. ئەو رەوشەی لەشەڕی خیانەتکاری هێزەکانی باشوور لەساڵی 1992 تێیکەوت بێچارەیی بوو. ئەو مەیلەی تێیکەوت مەترسیداربوو, ئەگەر تەدبیرمان وەرنەگرتایە, ئەوا بەبوون بەئامرازێکی بەکارهێنانی دەستی تاڵەبانی ئەنجامگیردەبوو. بەڵام بەشێوەیەکی بابەتی گروپەکانی جەمیل و جەمالی لەفڕکردن رزگار کردبوو. هەڵوێستی من لەم چوارچێوەیەدا بوو: لەجیاتی ئەوەی هەموو شتێك لەدەست بدەین, باخاوەنداریێتی لەو بەهایانە بکەین کەتوانای رزگارکردنیان هەیە. ئەنجامەکانی دادگاییکردنی عوسمان دەزانرێ. لەم رێگایەوە هەوڵمدابوو بەشێوەیەکی درێژ کێشەی بنەماڵەگەریێتی روونبکەمەوە. سەرلەنوێ کەوتبۆوە ناو قۆناخی پێشکەوتن. لەگەڵ ئەوەی هەندێ لەسیاسەتی تەسك دەزانێ, بەڵام لەبەرئەوەی قووڵایی تیۆری نییە, شیمانەی ئەوەهەبوو رێگا لەپێش رەوشی مەترسیداردا بکاتەوە, ئەمە لەکەسیاتییەکەی چاوەڕوان دەکرا. ناوەندێکی ئاقڵ باش هەڵیسەنگێنێ, دەشیا سوودمەندبێ. بۆ ئەمەش پێویست بوو تابڵێی سیاسی و بەتەدبیربێ. نازانم, ئەو پەیوەندییانەی بەو دواییە لەگەڵ ئەمریکا تێیکەوتووە, بەو پەیوەندییە دەچێت کەجاران لەگەڵ تاڵەبانی هەیبوو. گۆڕەپانێکە بۆ هەڵە لەباربوو, بەڵام دەتوانرا بەشێوەیەکی کۆنترۆڵکراو بۆ ئەم پەیوەندییانە بەکاربهێنرێ, مەزندە ناکەم بەتەنیا تائەورادەیە لەگەڵ ئەمریکییەکان کەوتبێتە پەیوەندییەوە, هەبوونی هاوبەشی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەستلێبەرنەدراوە.

دووەمین پەیوەندییەکەی بەشێوەی"ژیانی هاوبەش, هاوسەریێتی, سیاسەتکردن, بەبناخەگرتنی باشوور...هتد" رەنگیدایەوە. ئەم مەیلە دەناسم. ئەگەر بەنیازخراپیش نەبێ, هەروەکو لەساڵی 1992 لەبەدەستهێنانی ئەنجام دووربوو. لەهەڵوێستەکانی کۆماری تورکیاو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەرکی پێکرا کە هەجۆرەیە. من لەساڵی 1992 باوەڕیم بەقۆناخی دیپلۆماسی نەکردبوو. کاتێك لەساڵی 1993 ئۆزال مەیلی خۆی نیشاندا بەشێوەی "هەڵەی منداڵانە دەکات" شرۆڤەم دەکرد. دەزانرێ چی بەسەرهات, مەراق دەکەم کەئەو دیالۆگەی لەئیمرالی پێشناخرێ, چۆن لەئێراق ئەنجامدەدرێ. دیسان ئەگەر دەرفەت هەبێت لەدژی بەکارهێنانی نیم. ئەگەر پەیوەندییە سیاسی و دیپلۆماسییەکان لەگەڵ ئێران, سوریا, ئەمریکا, ی.ن.ك و پ.د.ك لەچوارچێوەی تەسلیمبووندا نەبێت, نەمانخاتە ناو زەحمەتییەوە, بەردەوام تاقیکردنەوەی پێویستییەکی سیاسەتە, بەڵام مەرجی سەرەکی ئەمەش, خاوەنداریێتی پێگەو تێکۆشانێکە لەناو وڵات کەبتوانی پشتی پێببەستی. لەکاتێکدا لەم چوارچێوەیەدا هەڵوێست و بۆچوونەکانی خۆم دیاردەکەم, بابەتەکانی ژیانی هاوچەرخ و هاوسەریێتی پێویستی بەهەڵوەستەیەکی زیاتر هەیە. ئەگەر مەسەلەکە لەسنوورێکی ئاسایی کۆمەڵایەتی, جەستەیی بمابایەوە باسم نەدەکرد. لەبواری کۆمەڵایەتی و کرداری ئەنجامی جددی لەخۆوە دەگرێ, وەکو کەسێتیش لەنزیکەوە من پەیوەندیدار دەکات.

هەستم بەهەوایەکی وەهاکرد هەروەکو بڵێی سەبارەت بەبابەتەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ژن ئەوەی لەناو رەوشێکی ناتەواوو کەموکورتیدا دەبینرێ منم. ئەمە هەڵوێستێکی تادواڕادە جاهیلانەیەو مەترسی نەبینینی تێکۆشانە مەزنەکەمان لەخۆوەدەگرێت, بەشێوەیەکی بێواتا خۆی دەسەپێنێ. کاتێك دەستم بەنووسینی ئەم بەرگرینامەیەکرد, هەوڵمدا بۆ وەڵامدانەوەی هەموو جۆرە چەمکێکی ئەگەری دەرکەوتنیان هەیە, ئەو شەڕەی کۆمەڵایەتی "سۆسیالیستە" بێنمەوە یادم کە لەتەمەنی حەوت ساڵان بەدواوە دەستی پێکردووە. بەرامبەر بەیەکێك کەلەحەوت ساڵییەوە هێزی تێکۆشانی بەرامبەر ماڤی سۆسیالیتەی دایکی کردووە باسی "ژیانی سۆسیالیتەی هاوچەرخ "بکەی شەڕێکە بەرامبەر بەمن. بۆئەوەی زیاتر رۆشنکەرەوەبێت بەشێوەیەکی درێژ هەوڵمدا نموونەی کەسیرە روونبکەمەوە. تێنەگەیشتنی مەسەلەی من و ژن, "ئاپۆ و ژن" نەك تەنیا بۆ "PKK", بەڵکو بۆ سەردەمەکەمان زیانێکە. یەکێکم لەوانەی کەلەم سەردەمەماندا گەورەترین شەڕی لەپێناو ژندا ئەنجامداوە. لەم بارەیەوە بڕوایەکی زۆرم بەخۆم هەیە. باوەڕناکەم یەکێکی دیکە وەکو من هەبێ پەیوەندییە سەربازی, سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی لەتەوەرەی ژندا شیکردبێتەوە. پێویستە ئاماژە بەوەبکەم کەیەکەمین ئەشقی جوامێرترین هاورێ

کچ و کوڕەکانی خۆم بەربەستکرد, کۆسپم بۆنایەوە, لەم پێناوەشدا تەدبیری پراکتیکی و کرانەوەی تیۆری وەهام ئەنجامدا ئەقڵ پەی پێنابات. ئەو توانایەم هەبوو فۆرمیلەکەی دیاری بکەم.

لەبەرئەوەی لەبەشەکانی دیکەدا بەفراوانی باسمکرد, بۆ تەواوکردن ئاماژەی پێدەکەم. بەشێوەیەکی لێهاتووانە نیشانمدا کاتێك لەرەوشی بەرجەستەی رۆژهەڵاتی ناویندا شەڕی "نامووس"کە لەنەریتی دایکم و تەواوی گەلی کورد و گەلانی دیکەوە هاتووە, لەناوەڕۆکە قەباو زایەندییە هەرزانەکەی دەرخرا, چۆن لەناو کۆمەڵگا و سیاسەت و شەڕدا واتادار دەبێ. ئەنجام, ژن یەکەم چین و رەگەزو میللەتی چەوساوەو ستەملێکراوە. مسۆگەرە کەهەر تێکۆشانێکی دیموکراتی و سۆسیالیستی کەوەك میللەت و چین و رەگەز بەئازادی ژندا تێپەڕنەبێت بەئامانجی خۆی ناگات. لەکۆمەڵگای کوردستاندا هەر پەیوەندییەکی هاوسەرێتی و زایەندی و ئەشق کەلەبواری تیۆری و پراکتیکی پشتی بەپێشکەوتنێك نەبەستێت, کەلەسەر بنەمای ژن و یەکسانی بێت, هیچ بەهایەکی نابێت. هەرچەندە پێی ناڕەحەت دەبم, بەڵام دیسان دووبارەی دەکەمەوە لە"سۆزانێتی ماڵی تایبەت و گشتی" بەولاوە هیچ واتایەکی دیکە نابەخشێ. ئەو بەڵێنەی بەرامبەر ژن دراوە, ئەو هەڤاڵێتییەی پەیڕەودەکرێ, لای من واتایەکی قووڵی فەلسەفی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی هەیە, بۆ وڵاتپارێزی و ئازادی و یەکسانی هەوڵی پراکتیکی لەخۆوەدەگرێ. چەندە بەئێش و جێگای داخە کەهەست بەوە ناکرێ هێندەی تیۆری راستەقینەی ئەمە شەڕی مەزنیشم لەپێناودا بەرێوەبردووە.

لەناو ریزەکانماندا کرانەوەی زەمینە بەڕووی ئەشق وەك پێویستییەکی دەستلێبەرنەدراوی ئازادی, شەڕ, یەکسانی و دیموکراسی دەبینم. زەمینەیەك بۆ ئەشق کراوەنەبێ, دیموکراسی و ئازادی و یەکسانی و نیشتمانپەروەری تێدا پێشناکەوێت. تاوەکو هەڵکشانی مەزنی ژن بەدینەیەت, هیچ یەکێك لەدۆزە شەرەفمەندییەکانی گەلان سەرناکەوێت. لەناو بزووتنەوەکەماندا ئازادی ژن لەسەرووی هەموو بەهاکانەوە دێت. تەنانەت بزووتنەوەی ژن یەکێك لەلایەنە سەرەکییەکانی ئەو شۆڕشە کۆمەڵایەتیانەیە کەلەسەرتاسەری جیهان, پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە, شۆڕشی ژن شۆڕشێکە لەناو شۆڕشدا. تێگەیشتن لەو ژنەی ئازاد بووە, سەرلەنوێ تێگەیشتنی مێژوو و کۆمەڵگاو ژیانە. رزگارکردنی ژن لەرەوشی: بوونی بەکەرەستەی سەرەکی کاڵاکردنی زێدەڕۆییانەی زهنییەتی سەرمایەداری و کۆنەپەرستی ئایینی دەرەبەگایەتی یەکێك لەئەرکە سەرەکییەکانە. دیسان رزگارکردنی لەو هاوسەرێتی و ئەخلاقەی پیاوسالاری کەبەبەها زاڵەکانی سەرمایەداری و دەرەبەگایەتی بارگاوی کراوە ئەرکێکی سەرەکییە.

پێویستی روونکردنەوەی زیاتر نابینم. ژن ناچارە لەمیانەی راستینەی پارتی ئازادیخوازی ژنانی کوردستان PAJK دوە رۆڵی خۆی ببینێ. لەدوا شرۆڤەکانمدا بەکارهێنانی گووتەکانی ئافرۆدیتبوون, بەفریشتەبوون و بوونی بەخواوەندە ژن کەزاراوەی میتۆلۆژین, لەناوەڕۆکدا گوزارشت لەسەرهەڵدان بەرامبەر کولتووری پێنج هەزار ساڵەی باڵادەستی پیاوان دەکات. ئەم کولتوورە ژنی خستۆتە رەوشێکی ترسناکەوە. هاوسەرێتی خاوەن ماهییەتی موڵکایەتی یەکێك لەهەرەشە گەورەکانە. تاوەکو ئازادی ژن بەدینەیەت, سەبارەت بەهیچ بابەتێك ناتوانین بوارێکی ژیانی ئازاد بئافرێنین کەواتادارو بەهاداربێ و شایستەی ژیان بێت. دەبێت ژن لەناو شەڕێکی گەورەدا بێت. ئەم شەڕە نەبێت, نیشتمانپەروەری و یەکسانی پێش ناکەوێت. بەپێچەوانەی مەزەندەکان ئەشق پێویستی بەتیۆرییەکی سۆسیۆلۆژی تەواوو پراکتیك هەیە؛ ناتوانرێ ئاستەکەی بۆ ئارەزووی هەرزان (بێنرخ)ی دوو تاك نزمبکرێتەوە. ئەشق پێویستی بەئازایەتی, سەرکەوتن و خۆشەویستییەکی مەزن هەیە. ئەوەی سەرکەوتنی نەبێ ئەشقیشی نابێت, بەردەوام ئەشق رووی لەبەرامبەر ئەو کەسەیە کەلەشەڕی ئازادیدا سەرکەوتووە. ئەو رەنجدەرییەی ئەشق کە من بەدوای کەوتووم دەشێ بەمجۆرە پێناسەبکرێ.

هەڵبەتە دەزانین کەتاکەکان لەدوو رەگەز (جنس) دروستکراون. وەلێ لەمەیدانی شەڕداین, لەبەرئەوەی فەتحکاران هەمووشتێکیان بردووین, ژنمان نییە کەبتوانین بڵێین ژنانی خۆمان. ئەو ژنانەی هەن, ئەوانەن کەخراون, ژنی پووچ و بەکاڵاکراون. پەیوەندی لەگەڵ ئەم ژنانە پێچەوانەی گەوهەری جەنگاوەریی ئازادییە. پەیوەندی ژنە لێگەڕەکانی ئازادی لەگەڵ ئەمجۆرە پیاوانە ناکۆك و پێچەوانەترە. لەمیانەی ئەو بانگەشە گرنگانە درێژە بەخۆی دەدات کە لەسەردەمی ئەفلاتونەوە گووتراوە. هەرچی درێژەدانە بەبەردەوامی رەچەڵەك, پشت بەئارەزووە زایەندییەکانی ناواخن دەبەستێ. ئارەزووی زایەندی ناواخن دەناسم. تاکە گۆڕەپانێکە کەبۆ بەردەوامی ژیانی گەلەکەمان هێڵراوەتەوە. ئەویش بووەتە بەڵایەکی گەورە. گرنگ ئەوەیە بەشێوەیەکی ئیدیال درێژە بەرەچەڵەك بدرێ. ئەویش بەشەڕی فەلسەفی و کۆمەڵایەتی مەزندا تێپەڕدەبێت. ئەنجام, ئەوەی ئەشقی شۆڕشگێڕێتی پێشنەخات, ئەوا شێوازی ژنی بەحیجاب تاقیدەکاتەوە کە لەتورکیا گفتوگۆیەکی زۆری لەسەرکرا. تاوەکو بۆ گۆڕەپانە سیاسی و سەربازییەکان نەگواسترێتەوە, لەرێگای ژنێك کەتەنیا دەتوانێ لەماڵی خۆی بمێنێتەوە, لەسەربنەمای خیانەت نەکردن لەئەرکەکانی دەتوانێ رێگا بەهاوسەرێتی کۆیلایەتی بدات. بەڵام دووبارەی دەکەمەوە, ئەم هاوسەرێتییانە تایبەت بەسیستەمە, پێویستە بوارە سیاسی و سەربازییەکان نەگرێتەوە. لەرەوشێکی پێچەوانەدا تاوەکو دوایی دەرگا بەڕووی کاریگەری بەکۆیلەکردنی ژیانی سەرمایەداری و دەرەبەگایەتی ئاوەڵا دەبێ.

ئەو دیاردەو چەمکەی لای ئێمە بەرجەستەبووە تاڕادەیەکی مەزن مێژووییە. ئەو پێشنیازەی من بەشێوەی دەستەواژەکانی بەخوداوەند بوون (بەفریشتەبوون) بەئافرۆدیتبوون بۆ گروپێك هەڤاڵانی ژنم پێشکەش کرد, لەپێناو شەڕکردن بوو لەدژی ئەو کولتوورە ترسناکەی رۆژهەڵاتی ناوین کەژن دەکات بەکۆیلە. لەم قۆناخەی مێژوودا پێویستی بەمجۆرە ژنە رەسەنانە هەیە. هەڵبەتە بەسەدانیان لەمیانەی هەڵوێستە قارەمانەکانیان بەشەهیدبوون ئەمەیان سەلماند. بیرەوەرییەکانیان واتایەکی گەورەی هەیە. لەوبڕوایەدام کەئێستاش ژمارەیەکی زۆری ژنی قارەمان و مەرد لەنێو ریزەکانماندا هەیە, تازەبەتازە کەسایەتییە گەورەکانی ئەشق و دادوەری و دلێری سەرهەڵدەدەن. نموونە هەڵبژاردەکانی ژیری سۆزداری و ئەنالیتیکی بەبنەمادەگرن, و سەرلەنوێ کەسایەتی خۆیان دەخولقێنن. ئەمەش خاڵێکی واتاداری وەرچەرخانی مێژووییە. تەنانەت منیش ناوێرم کەبانگەشەی خاوەنداریێتی ئەم ژنانە بکەم و ژنایەتییان بەسەردا بسەپێنم. بۆ بەهێزبوونی ژنان هەرچییەك بکەین کەمە. هەڵبەتە ئەوان نوێنەرایەتی ئەشقی کۆمەڵکاری دەکەن. چەندین هەڤاڵ هەن کەجێگای شانازی و سەربەرزین. لەم قۆناخەدا لەو باوەڕەدا نیم کەئەو خۆشەویستییەی تایبەت بووە هیچ خێرو سوودێکی هەبێت. بێگومان لەهەلومەرجی ئاشتیدا هاوسەرێتی ئازاددەبێ. بەڵام لەهەلومەرجی ئێستاماندا, بەتایبەتیش لەگۆڕەپانەکانی شەڕ زۆر زەحمەتە, تەنانەت لەپراکتیکی هاوسەرێتی هەندێ هەڤاڵان "منیشی لەناودا" دەرکەوتووە کەزۆر ئاستەمە.

لەو بارەیەوە ئاگاداری کرۆکی ئەو هاوسەرێتییە نیم کەعوسمان لەگەڵ ئەم ژنە ئێرانییە پێشیخستووە. دەشێ واتای سیاسی هەبێت, و لەوانەیە هاوسەرێتی ئارەزوویێکی هەرزانیش بێت. بەڵام کاتێك وەك پێویستییەکی ژیانی هاوچەرخ ئەمە لەناو بنکە بڵاوبکاتەوە مەیلێکی زۆر مەترسیدارە. تەنانەت نیشاندانی ئەمجۆرە جەسارەتە مەترسیدارە. لەرابردووی هەندێ رێکخستنی چەپی تورك لەرێگای ئەم پێڕەوانە کۆتاییان بەخۆیان هێنا. دووبارە دەیڵێمەوە: بەبێ ئەوەی بکرێتە مەسەلەیەکی سیاسی, ئەوانەی خاوەنی هاوسەرێتی لادێیی, شارستان و بۆرژوای بچووکن, یاخود ئەوانەی تازە دەخوازن ئەمجۆرە هاوسەرێتیانە ئاوا بکەن, بەمەرجێ گرێدراوی جێبەجێکردنی ئەرکی خۆیان بن, بەشێوەیەکی سنووردار لەناو چوارچێوەی مۆڵەتی رێکخستن دەتوانن پەیوەندی بەم چەشنە ئاوا بکەن. ئەمە لەمیانەی بڕیارێکی کەسێتی و ئارەزوومەندی نابێت. قۆناخ تەنیا سەردەمی بەردەوامکردنی رەچەڵەکی جەستەیی نییە, بەڵکو بەرلەهەمموو شتێك قۆناخی بەسەرکەوتن گەیاندنی بانگەشە هزری, سیاسی و وڵاتپارێزییەکانمانە. نزمترین ئاستی هەلومەرجەکانی ئەمە نەڕەخسێ ژنێتی ـ مێردایەتی, منداڵ و ئەشق تەنیا بەڵایەکن,

تاوەکو دوایی ڕێژم بەرامبەر بە ئەشق هەیە, بەڵام تاوەکو ئەو فەلسەفەو کرداره لەئارادا نەبێت کەپێت دەگەیەنێت, دەڵێم نەخێر بۆ تەفرەدانێکی بێ کۆتایی. لەو بڕوایەدام کە لەچوارچێوەی ئەم چەمك و بیرۆکانەدا پێشکەوتنە پراکتیکییەکان ئازادی دەستەبەردەکات و ڕێگای ئەو ئەشق و خۆشەویستییە راستەقینەیە دەکاتەوە کەتامەزرۆی بووین.

ژیانی هاوچەرخ بەواتای ئەو بۆچوونانە نایەت کە بەپشتبەستن بەباشوور ئاوارەبوون لەخۆوە بگرێت. ژیانی قۆناخە نائاساییەکان بەژیانی شۆڕشگێڕی بەناودەکرێ. هەڵوێستەکانی ئاوارەیی"پەنابەری" لەهەموو بوارێکەوە مەترسیدارە, دەشێ بۆ منداڵان و بەساڵاچووان و هەندێ ژنانی ئاسایی باس لەژیانی پەنابەری بکرێ. دەشێ دانیشتوانی کامپی مەخموور وەك پەنابەر پیناسەبکرێن. بەڵام توانەوە لەناو کوردەکانی باشوور خزمەت بەخۆیان و گشتیش ناکات. ئەگەر ئێمەش ژیانی پەنابەریمان لەسوریا پەسند بکردایە, دووچاری ئەم ڕەوشە نەدەبووین. نازانم ئەم خاڵانە باسکراوە یاخود نا, بەڵام بۆچوون و ڕەفتارەکانمان سەبارەت بەبابەتە هاوشێوەکانی ئەمە دەزانرێ. گوێڕایەڵیکردنی دسپلینی کۆنگرەی گەل لەلایەن عوسمان و گروپەکەی کە لەگەڵیدایە تاکە ڕێگای کەرامەت و شەرەفمەندییە. ئەنجامی هەنگاونان بۆ ئەو هەڵوێستانە دەزانرێ کەمامەڵەو سەودا بەنرخ و بەها ڕەسەنەکانی بزووتنەوەکەمان بکەن. خۆ چڕکردنەوەیان لەچواردەوری تیشکۆی سەرکەوتن لەهەموو لایەنێکەوە بایەخدارە. بەئەندازەی پەنابردنەبەر هێزە دەرەکییەکان, ئەوا هەڵوێستە خۆکوژییەکانیش پەسند ناکرێ, لەکاتێکدا لەم بارەیەوە, زانیاری تەواوم پێبگات دەشێ هەڵسەنگاندنی ڕاستتر ئەنجامبدرێ.

نازانم جەمیل, دووران و ڕەزا تا چ رادەیەك بوونەتە گروپ. هەروەکو دیاردەبێ پراکتیکی ڕەزا لەئەوروپا هێندە خولقکارنییە. لەگەڵ ئەوەی نازانم دەستێوەردان بۆ کاروباری پارتی گەلی دیموکراتیDEHAPکراوە یاخود نا, ئەو ئەنجامانەی ڕەنگیانداوەتەوە, نیشانیدەدەن کەرۆڵ و کۆمەکی پێشکەش بەدیموکراتیزەکردن نەکردووە. لەگەڵ ئەوەی بانگەشەی کودەتا بەهەند وەرناگرم, بەڵام ڕەوشی بابەتی ماوەیەکی درێژە لەدەرەوە بۆنی گروپی لێدێت. لەئەنجامدا دووسەری زۆر بێبەرهەم و وێرانکار بووە. سەیرە ئەگەر لەرەوشی خۆیدا بمابایەوە, ئایا بەکوێ دەگەیشت؟. ئەگەر کۆمەڵکارییەکی تۆکمە لەکۆمیتەکان و بەڕێوەبەرایەتی کۆنگرەدا فەراهەم بکرایە, ئەرکە سەرەکییەکان جێبەجێ بکرایە, بەهەرحاڵ لەم قۆناخە هەستیارەدا باشترین هەڵوێست بوو کەچاوەڕوانی دەکرا. بەمجۆرە بەکارهێنانی قۆناخ, بووە بەهەنگاوێکی زۆر دواکەوتووانە؛ بەشێوەیەکی زۆر خراپ کاریگەری کردۆتە سەر گەل و تەنانەت ئێمەش. بەگوێرەی شایستەبوون بەرەخنە ــ ڕەخنەدان ڕەفتارنەکراوە.

بەهەرحاڵ لەکۆنگرەدا ڕووداوەکان بەشێوەیەکی راست هەڵدەسەنگێنرێ, ڕەخنە ــ ڕەخنەدان پەیڕەودەکرێ و نموونەی بەپرەنسیپبوون نیشاندەدرێ. بۆئەوەی لەقۆناخی ڕەخنە ــ ڕەخنەدان, ڕەوشەکە باشتر دەرکی پێبکرێ و روونبکرێتەوە ڕۆشنکردنەوەی ئەم بابەتانە گرنگە کە لەخوارەوە ئاماژەی پێدەکەین:

1 ـ هەروەکو دەرکی پێدەکرێ راستکردنەوەو گیرسانەوەم لەئیمرالی, ڕێگای لەپێش ئەوە کردۆتەوە کەچەندین لەهەڤاڵانی کۆمیتەی ناوەندی لێکدانەوەی خۆیان سەبارەت بەقۆناخی دوای من بکەن. دەبوایە ئەم لێکدانەوانەی وەك ڕەفتارێکی بەرپرسیارانە هەڵسەنگێندرێ, جێگای داخە کە لەسەر بنەمای گریمانەی چەوت دانراوە. ئەم هەڵوێستە لەهەمانکاتدا یەکنەبوونیان لەگەڵ ئەو دەزگایە نیشاندەدات کەوەك "سەرۆکایەتی" موخاتەبەی دەکەن. ئەو تایبەتمەندێتییانەی لەسەرەتاوە هەبوون, ڕەوشی سەخت و هەستیاری منی بەدەرفەت زانی و ئاشکرابووە. کەوتوونەتە ناو چاوەڕوانی, دەمرم یان دەمێنم, چۆکدادەدەم یاخود نا. یەکەمین مەسەلەی ئاشکرا بووە ئەوەیە لەوانەیە بەبێ ئاگایی من ململانێیەکی دەستبەسەرداگرتنی گەریلا, هێزی گەل, ڕێکخستنی سیاسی, میدیا, هێزی ژنان و توانستەی ماددی و بوارەکانی دیکەیان بەڕێوەبردووە. لەراستیدا ئەمە بەردەوامی ئەو مەیلانەیە کە لەدوای پانزەی ئاب یەك لەدوای یەك بەسەرە لەساڵانی 1986,

1987 و بەتایبەتیش 1992 لەتەواوی قۆناخە هەستیارەکاندا کەم یان زۆر خۆی بەدەستەوە داوە. لەمێژووی بزووتنەوەکەماندا ئەم مەسەلانە بەتەواوی وردەکارییەکانەوە دەزانرێ. هەروەکو دەزانرێ منیش ئاگاداری ئەم مەیلانە بووم, بەشێوەیەك کەئەدەبی هەڤاڵێتی تێکنەدات, بەردەوام رەخنەم دەکردو هەوڵی بەلاوەنانیم دەدا. مەسەلەیەکی دیکەی گرنگ کەجارێکی دیکە سەریهەڵدا ئەوەیە کەبەشێوەیەکی دروست و دڵسۆزانە ئەم هەڵوێستەی هەڤاڵێتی منیان شرۆڤە نەکرد.

لەگەڵ ئەوەی بەناوکردنی ئەو گروپچێتییەی بەم دواییە دەرکەوتووە واتادارنابینم, بۆ ئەوەی لایەنەکان باشتر خۆیان بناسن, تەنیا ئاماژە بەسێ ناو دەکەم. پێویست بکات دەتوانرێ بەشێوەیەکی بەرفراوانتریش روونبکرێتەوە. لەکاتێکدا یەکەمین گروپ لەهەڤالان جەمیل بایك, دووران کالکان و رەزا ئالتوون پێکدێ. گروپی دووەم لەعوسمان ئۆج ئالان, نیزامەددین تاش, خدر یالچین پێکدێت. زەحمەتە بەگروپێکی رێکخراو بەناو بکرێن. راستتر ئەوەیە ناوی دەستپێشخەرییان لێبنرێ. هەندێك لەناوەراستیشدا هەن. نازانم ئایا کەسانێکی وایان تێدایە کەبەرەواڵەت و ناوەرۆك گرێدراوی من بن, ئەگەر هەبێت کامانەن. ئەو گروپە 12کەسییەی بۆ کۆمیتەی ئامادەکاری سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی "PKK" ئاواکراوە, تەنیا لەمیانەی کردارەکانیاندا دڵسۆزی و گرێدانیان دیاردەبێت. لەگەڵ ئەوەی هیچ نارەزاییەکم بەرامبەر کەسایەتییەکانیان نییە, قۆناخی راستەقینەی پراکتیکی روونیدەکاتەوە تاچ رادەیەك دەتوانن لەشێوەو ناوەرۆکدا من بەرجەستەبکەن و پەیرەوبکەن. لەم بوارەوە ناخوازم زەحمەتییان بۆ دروستبکەم.

ئەگەر بڵێم شێوازی ململانێ و زهنییەتی هەردوو گروپیش شایستەی نەریتە رەسەن و رێنماییە تیۆرییەکانمان نابینم, بەتایبەتیش کەهێشتا"من" ماوم, دەبێتە شرۆڤەیەکی سووکترین وشە. هیچ چاوەروانیم نەدەکرد تاوەکو ئەم رادەیە چاوچنۆکی دەسەڵات بن و میراسگەرایی بکەن و بکەونە ناو هەڵوێستێکی دژبە بەختەوەری گەل و تێکۆشانەکەمان و بێ رێزیش بەرامبەر من بکرێ. لەم رێگایەوە تۆزێکی دیکە لەنزیکەوە ئاشنای سروشتی راستەقینەی مرۆڤ بووم. دیسان لەوە تێگەیشتبووم کە کەوتوونەتە ناو چ جۆرە نهێلیزم"نکۆڵیکردن"ێکی وشك و زهنییەتی ئەتنیك و چین ناناسن و گوێ بەهیچ ئاگادارکردنەوەیەکی من نادەن, پێویستە تێبگەم, ئەم جۆرە هەڤالانە یان بەشێوەیەکی سەیر خۆیان پەرتەوازەکردووە, یاخود کەوتوونەتە ناو هەندێ بابەتەوە من ئاگادار نیم. هەروەها لەهەڵوێست نیشاندان بەرامبەر یەکتر بەبێ پەروا, جوڵانەوە یان فاکتەرە دەرەکییەکان بەبیری مرۆڤدا دێنێت. یەکسەر دەخوازم ئەوەشی بخەمە سەر بەرامبەر ئەو هەڤالانە وەك کەسێتی رەوشێکی وەهام نییە کەبەشێوەیەکی سۆبژەکتیف و سۆزداری تەماشایان بکەم, یاخود بەگوێرەی ئەوە رەوشیان شرۆڤە بکەم. بەناوی ئەوانەوە دەیڵێم سەرباری ئەو رەوشەی کەتێیدام من لەوان زیاتر بەرامبەر ئەو رەوشە خەمگینم کەخۆیان تێخستووە, واقم ورِدەمێنێ کاتێك هۆکارێکی جددی لەئارادا نییە, چۆن خرانە ناو ئەم رەوشەوە.

سەرباری ئەمەش لەسەر بنەمای سووکایەتی پێکردن, رەفتار بەرامبەر ئەم هەڤالانە ناکەم, سەرەرای ئەوەی باش دەزانم کەهەر دوو گروپیش یارییان لەسەر من کردووە, بەڵام ئەم ئسلوب و شێوازە بەکارناهێنم. تەنیا ئەم راستییانە روونددەکەمەوە:

أ) دەبێت بەشێوەیەکی ئاشکرا و مەردانە هەڤاڵێتی و دۆستایەتی و دوژمنایەتی بەرامبەر من بکرێت. چەندین جار رووبەرووی یەکتر بووینەوە, بەڵام هیچ کاتێك بیرێزییان نیشان نەدەدا. سەرسام دەبم: چۆن دەخوازن بەمجۆرە من لەپەلوپۆ بخەن؟. کەچی بۆ رزگارکردنی کەرامەتی هەر یەکەیان هەوڵ و کۆششێکی یەکجار زۆرم دابوو. دونیا و عالەم دەزانێ بۆ ئەوەی بەر لەخۆم ئەو جێگایانەیان بۆ ئامادەبکەم کەزۆر جوان بوو و بۆنی ئازادی مێژوویی لێدەهات بەشێوەیەکی چەندە سەرسوورهێنەر خەباتم کرد. ناڵێم من بەهاکانم خوڵقاندووە. ئەو بەهایانەیە کەدوای رژانی فرمێسکی گەلە هەژارەکەمان و برسێتی و ترس و ئەو خیانەتانەی دەرهەقی ئەنجامدرا, بەهەزارو یەك رەنج, هەوڵی کۆکردنەوەیمدا. هەرگیز دەستم بۆ بەهاکانی گەل و وڵاتەکەم نەبردووەو نەمتوانی بڵێم بامنیش ببمە خاوەن دەمانچە و ماڵ و هاوسەر. بەهایەکن لەبەرئەوەی

تەواو خۆم شایستەیان نەدەبینی, بەبێ ئەوەی خۆم رەحم بەخۆم بکەم, کەوتوومەتە جموجۆڵ و شەرم کرد تاوەکو لەپێناویدا باشترو جوانترو سەرکەوتووتر بین.

ب) کاتێك رەوش بەمشێوەیەیە, لام سەیرە یەکێك هەڵسێ و بڵێ "حەوت هەزار گەریلام لەپشتە!! ئەوەی خوار تەماشام بکات, چاوی دەردێنم! و بەمجۆرە هەڵوێست نیشان بدات, نانکوێرییە. هەروەکو دەزانرێ ئەو هەڤاڵانەی ئەمە دەڵێن, ئەی هێندەی ئەم ژمارەیە, یان گەریلای دووچاری راکردن کرد, یان لەمیانەی تەکتیکی راستەوە نەیخستە ناو شەڕ و لەناو زەحمەتترین و دژوارترین رەوشدا هێشتیانەوە. هێندەی ئەمەش گرنگی و گوێنەدان بەو هەزاران لاوەی کەهەر یەکەیان جگەرگۆشەیەك بووو لەتەنیشتیانەوە شەهیدبوون, کاتێك بەرامبەر ئەمەش دەکەونە ناو هەڵوێستی تاکڕەوێتی و ئارەزوومەندانە هێندە بەئێشە و نانکوێر(بێ وەفا)ییە. ئایا تاکو ئێستاش گفتوگۆکانی "ئەرك وەردەگرین, وەرناگرین" بەرامبەر ئەم راستییانە چۆن پێناسە بکەین؟. دیسان پێویستە خۆم بکەم بەنموونە, بەهەرحاڵ لەوە تێگەییشتوون, کاتێك لەدەرەوەبووم چۆن بووم, تەنانەت تامم لەنانخواردنێکیش وەرنەدەگرت, لەکاتێکدا شەش ساڵە لەکەش و هەوای دوورگەی ئیمرالی لەمیانەی گرفتەکانی هەناسەدان و پشوودانە سنووردارەکان هەوڵی درێژەدان بەهەبوونی جەستەیی خۆم دەدەم, تەنانەت بۆ تاکەساتێکیش گرنگیم بەخۆم نەدا, لەخۆم نیگەران نەبووم. لەپێناو گەل لەپشتەوە خەنجەر لێدانم پەسند نەکرد. لەحاڵەتێکدا تەواوی هێزەکانی جیهان تۆزقاڵێك دەرفەتی ئومێدیان نەهێشتەوە, لەپێناو هەڤاڵان و گەل, لەپێناوی مرۆڤایەتی هزرو هەڵوێستی باشم ئافراند. ئەوەی مەحاڵ بوو تێیدا سەرکەوتم. هیچ نەبێ مرۆڤ هەوڵیدەدا شایستەی ئەم کۆششە بێ. لەم رێگایەوە پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین, تەنانەت نیشانەدانی ئەو جددییەتەی کەکۆماری تورکیاش نیشانیداوەو پێی رازی نین, نەزانینی ئەزموون وەرگرتن لەرەوشی من و چۆنییەتی هەڵسووڕانی سیاسەتیش, بێ شانسییەکی گەورەیە.

ج) بەڵام ئەو لێکدانەوانەی کردووتانە سەرناگرێت. لەوانەیە هەستی پێناکەن. گوایە لێکدانەوەو شەڕی دەسەڵات بەرێوەدەبەن, بەڵام سەبارەت بەبابەتی دەسەڵات, خاوەن کەسایەتییەکن کەزۆر لەقوڕ بڵاو و شلۆقترە. بۆ یەك رۆژ شانتان بدەنەبەر, هەموو پەرتەوازە دەبن. بەردەوام چاوەڕوانی بەتەربییەبوونم لێکردوون. چونکە دۆست و یاریدەدەرتان نابێ. هەروەکو ئەوانەی پێشوو, ئەوەی چاوەڕوانتان دەکات یان خیانەتێکی ناڕەسەنانە, یان مردنێکی نابەجێ, یاخود بەردەوام رەوشی گرفت نانەوەیە کەئێستا ئەنجامی دەدەن. ئەم ئەڵتەرناتیفانە (بژارانە) رێگای چاك نییە.

بەردەوام بانگەشەی ئەوەکراوە کەمن گەنجێتی ئێوەم رفاندووە, بەڵێ رفاندم. ئەمە ئەرکی مێژوویی منە. لاوێتی ئێوەم دەرفاندو دەمخستە خزمەتی دۆزی ئازادی گەل و وڵاتەکەمان. ئەمە بەشێوەیەکی ترسناك ئێوەی رفئەستوور کردووە. ئەو بڕیارانەی هاوسەرێتی و هاوشێوەکانی کە لەکۆنگرە پێیگەییشتوون جموجۆڵی تۆڵەسەندنەوەیە. رۆڵی کارامەییشتان بچووکناکرێتەوە, رۆڵی ئەو کەرەتان بەعوسمان بەخشی کە "مین" دەتەقێنێتەوە. من بەردەوام لایەنگری ئافراندنی ئەو خۆشەویستییە بووم کەلەسەر بنەماکانی ئازادی خزمەت بەدۆزەکەی من بکات. هەروەکو گووتمان ئێوە نەخۆشەویستی, نەهاوسەرێتی, هیچ یەکێکیان نازانن. ئەوەی لەم بوارەوە ئەنجامی دەدەن, تەنیا جموجۆڵی باوی یەکتر پیسکردنە. ویستم لەوە دوورتان بخەمەوە. دەبێ دڵنیابن تەنیا بۆئەوەی کچە جوانەکانی جیهان و کوڕە خوێن گەرم و مەردەکان رۆژێك ئاشنای خۆشەویستی راستەقینەبن, بۆ چیا پیرۆزەکان سەرمخستن کە لەمێژوودا بەتەختی خوداوەندە ژن و پیاوەکان, بەناو دەکرێ. بەڵام ئایا ئەو دڵ و مێشکەتان هەیە لێی تێبگەن؟. بەبێ ئەوەی خاوەنی هیچ سەرکەوتنێك بن, بەشێکی زۆری ئەو گەنجانەتان بەخاك سپاردو تەنانەت نازانرێ گۆڕەکانیشیان لەکوێیە. لەجیاتی ئەوەی دابنیشن و رۆژانە بیرەوەرییەکانیان نوێ بکەنەوە, ئەوەی بەسەر منیدا دەسەپێنن, ئێوە لەجیاتی من بوونایە چیتان دەکرد؟.

د) دژەتێز بەرامبەر من پێش مەخەن. دەزانم بەرامبەر بەیەکتر چین. هیچ جیاوازییەکیش لەنێوانیاندا نابینم. هەردوو لایەنیش جموجۆڵەکانتان دژی منە. بەدرێژی ناکەومە ناو شرۆڤەکانی سەلماندنی ئەمە، بەڵام ئەم شێوازەی شەڕکردنتان هەڵەیە. لەبەرئەوەی نەمتوانی رێگری لەپێش ئەم شێوازەی شەڕەکەتان بکەم، خۆم تاوانبار دەبینم. بەڵام دیسان من بەلاواز دامەنێن. هێزی ئەنجامدانی شتێکم هەیە. تکای زۆرتان لێدەکەم بۆ بەختەوەری و ئاسایشی گیانی خۆتان لەناو بزووتنەوەکەمان یەکسەر واز لەمجۆرە شێوازو پێڕەوانە بێنن. بەمجۆرە هەرهیچ نەبێ بۆ یەکەمین جار جوامێری دەکەن. نامەوێت هێز لەبەرامبەرتاندا رێکبخەم. تەنانەت نامەوێت ناویشتان ئاشکرا بکەم. داوا لە گەل و بنکەی رێکخراوەکەمان دەکەم لێتان ببوورن. مسۆگەر پێویستە ئێوەش سوود لەم لێبووردنە ببینن و لەمیانەی ژیانێکی درێژدا قەرەبووی بکەنەوە. ئەمە یەکەمین رێگایە.

دووەمین رێگا، ئەگەر لەناو رێکخستن حەوت هەزاریش نەبێ، لەوانەیە هێزی گرووپێك گەریلاتان هەیە. لەپاراستن و شەڕکردندا ئازادن. وەك مەیلێکی جیاواز دەتوانن ناویشی لێبنێن. بەڵام ئەو هێزە دژی من بەکارمەهێنن. چونکە ئەوکاتە ناچاردەبم خۆم بپارێزم. هیچ دیاریش نییە کەکێ ژێردەکەوێ. هەروەها بەشێوەیەکی روون ئامانج و تەکتیکەکانتان، شێوازی شەڕو ئاشتیتان بەرامبەر دۆست و دوژمنان ئاشکرا بکەن. کێن، دژی چین، چۆن دەخوازن شەڕ بکەن. باهەموو کەسێك ئەمە بزانێ تاوەکو لەدەورتان کۆببنەوە. بەمجۆرە ئێوەش بەهای راستەقینەی خۆتان دەسەلمێنن، ئەگەر ئەمە لەسەر بنەمای راستییە گشتییەکان ئەنجام بدەن، منیش پشتگیریتان لێدەکەم. پێوانەکانی دوا بەرگرینامەکەم دیارە. چەندە لەدەستم بێت بەخێرو ئەرێنی نزیکی ئەمجۆرە بەرخۆدان و شەڕە گەوهەرییەتان دەبمەوە. واتە ئەو چەمکەی ئێوە منتان لێبێبەش کرد، من بەرامبەرتانی نیشان دەدەم، ئەم نموونەیە دەبێتە پشتگیرییەك.

بەڵام هەڵوێستم سەبارەت بەچەتەگەرێتی قۆناخی نزیك دەزانن. بەکورتی هێندە لێکدانەوەکانی دەسەڵات تەنیا لەپێناو داواکارییە رەواکانی گەل بێت واتادارە. بۆ ئەمە پێویست ناکات یەکتری تاوانبار بکەن. ئەو شەڕەی چەندین ساڵە ئەنجامی دەدەن لاشەخۆرە دێنێتەوە بیری مرۆڤ. دەبێ دەست لەمە بەردەن، چونکە هەمووتان وەك یەکن و جگە لەیەکبوون و وەڵامدانەوەی داواکارییەکانی گەل هیچ چارەیەکی دیکەتان نییە. ئاشکرایە بەساڵان، بەمانگان لەپەلوپۆخستنی بزووتنەوە لەرێگای تەلەفزیۆن و رۆژنامەکان، تەنیا دەتوانرێ وەك هەولی رکابەرەکان بۆ رووخاندنی بزووتنەوەیەك هەڵسەنگێنرێ. بەڵام دەبێ تێبگەن کەگەلەکەمان هێندە بێخاوەن نییە، گەل و ئەو بەهایانەی مەزەندە دەکەم لێکدانەوەتان سەبارەت کردبێ لەهەموویان بەهێزترو خاوەن بەهایە. ئەگەر ئێمە شایستەی بین، لەهەناوی خۆمان دەگرێت، لەرەوشێکی پێچەوانەشدا لەیەك رۆژدا کۆتاییمان پێدێنێ، دەبێ لەمە تێبگەن. هەرگیز نابێت بۆتاکە ساتێکیش لەبیربکەن کەتاوەکو ئێستاش لەسایەی ئەو هێزو بەهایانەی گەل هەناسە دەدەن کە لەکەسایەتی مندا نوێنەرایەتی دەکرێت.

هەموو شتێك بانگێشتی رەخنەدانێکی جددی و دڵسۆزانە و سادەتان لێدەکات. ئاشکرایە ئەگەر دڵسۆزن لەجێبەجێکردنی پێداویستییەکانی درەنگ ناکەون. لەرەوشێکی پێچەوانەدا بەو واتایە دێت کەرێگاتان رێگای چوارچەتەیە. محەمەد شەنەر و سەلیم چروقایایە، هەندێکیشیان سیخورو ئاژاوەگێرن. گەلەکەمان و گەریلاو رێبەرایەتی ئایدیۆلۆژیمان خۆی دەپارێزێ و هیچ کەسێکیش ناتوانێ کاروانە بەبڕیارەکەی ئازادیمان بەربەست بکات.

2 ــ ئەوانەی باوەڕییان بەپێویستی رەخنەدان، هەمئاهەنگی و ئاوێتەبوونی راست و سەرلەنوێ ئاواکردن هەیە، بەسووربوونەوە لەمیانەی هۆشیاری و بەرپرسیارێتی ویژدانییەوە داخوازی خاوەنداریێتیکردنیان هەیە، بەرگرینامەکەم هێزاترین یارمەتیدەرە. پێویستی رەخنەدان بەئامانجی سەرپۆشکردنی رەوشەکە ئەنجامنادرێ، بەڵکو بۆ وەڵامدانەوەی گەل و مێژوو و بەهای سەرکەوتن ئەنجامدەدرێ. گەیشتن بەهێزی رۆشنبیری بۆ خوازیاران بایەخێکی گرنگی هەیە. هەڵبەتە ئەوانەی

گۆڕانکاری و وەرچەرخانی زهنییەت ئەنجامنەدەن, دەبێ دەرك بەوەش بکەن کەدۆزێکیان نییە ناوی شۆڕش بێت. ئەگەر ساڵانێکی درێژە ژیانییترین کێشە لەرۆژەڤی خۆتان دەهێڵنەوەو چارەسەرتان نەکردووە, ئەوا سەرەکیترین هۆکارەکانی لەخۆماندا دەگەڕێین. لەرێگای گروپچێتی (پێرپێرێتی) لەژێر باری رەوشەکە دەرناکەوین. تاوانبارکردنی دەوروبەرو گروپی دیکە کێشەکان چارەسەرناکات؛ بەڵکو قورستری دەکات.

دوا بەرگرینامەم ئەو مەسەلانە لەخۆوەدەگرێت کەوەڵامی گۆڕانکارییە نوێیەکەی پارادیگما (جیهانبینی) دەداتەوە. شایستەی ئەوەیە رستە بەرستە هەرسبکرێت. بەلانی کەم لەرێگای تێگەیشتن دەتوانێ کۆمەکێکی مەزن بەهێزی تۆکمەبوون بکات. وەکو هەر پەرتووکێکی دیکە ناخوێندرێتەوە. دیدگاو سۆنگەیەکی بەهێز پێشکەش بەسۆسیالیزم و شارستانییەتی هاوچەرخ و ئۆتۆپیای گەلان دەکات. لەو بڕوایەدام بەهای تیۆری و پراکتیکیشی بەرزە. راستتر کرانەوە بۆ قۆناخی لەمجۆرە فەراهەم دەکات. بەشێوەیەکی بەهێز هەڤاڵان پێویستییان بەهەرسکردن هەیە. تەنیا لەرێگای ئۆتۆپیای بەهێز و هزری سۆسیالیستی دیموکراتی و باوەڕییەکان دەتوانرێ سەرکەوتنی پراکتیکی بەهێز بەدەستبهێنرێ. لەرەوشێکی پێچەوانەدا یان لەئەنجامی گەندەڵییەوە دەتوێتەوە, یاخود لەبوون بەئامرازی دەستی هێزی دیکە رزگاری نابێت.

ئەو هەڤاڵانەی پێویستە هەست بەبەرپرسیارێتی مێژوویی بکەن. دەبێ رەخنەدانێکی قووڵ و هۆشیارانە بدەن کەئیدی لەسۆسیالیزمی بونیادنراوو رزگاری نیشتمانی دادەبڕێن کەمەزهەبی سەرمایەداری ئەم سەدو پەنجا ساڵەی دوایی بوون و لەتیشکۆی دەوڵەتگەراییدا چڕبوونەوە, هەروەها هەوڵدەدەن لەمیانەی جۆش و هێزی زهنییەتەوە گەڕانەوەیەکی مەزن بۆ بژاری مێژوویی گەلان ئەنجام بدەن. لەبەرگرینامەدا ئاماژەم پێکرد کەخۆم لەم بوارەدا چ مەودایەکم بڕیوە. لەمن زیاتر هەڤاڵان پێویستیان بەوەرچەرخان و ڤاڵبوونەوەیەکی بەم چەشنە هەیە. هەڵبەتە گەر ئەمە ئەنجامنەدرێ, خۆتان تێیدا ژیاون کەچۆن وەك کوتك لەئەرز دەمێننەوە. رەوشی رەخنەدانتان لەوەوە سەرچاوە ناگرێت کەئێوە یان گروپەکەتان چەندە مافدارن یاخود نا؛ سەرچاوەی خۆی لەو کێشە سەرەکییانەوە وەردەگرێ کەلەبەرگرینامەکەدا ئاماژەم پێکردووە. پێویستە بەمجۆرە هەڵوێست نیشانبدەن. ئەگەر لەمەدا سەرکەوتن بەدەستبێنن هەروەکو بلێی تازە لەدایك دەبن. دڵنیام کاتێك لەمەدا سەرکەوتن, کەسایەتیتان لافاو ئاسا جۆشدەگرێ. بەندێك نامێنێ تێپەڕی نەکات. زۆرباش دەزانن پێویستییەکی زۆرتان بەمەهەیە. لەکاتێکدا سەرکەوتن و ژیانی مەزنمان لەبەر دەستدابێت, بۆچی جەخت لەسەر رەوش و پێگەیەك دەکرێ کەخۆی و دەوروبەر دەخنکێنێ؟

3 ـ هەندێ مەسەلە هەن کەپێویستە سەبارەت بەکەسێتی من روونبکرێتەوە. لەکاتێکدا پەیامەکانی من کۆسپەکانی دەوڵەت تێپەڕدەکات, لەئەنجامی فەرمانێکی سەروو تێپەڕنەبوونی بۆ زیندانەکان بابەتێکی گرنگە........ "سڕاوەتەوە" پەیوەندی بە عوسمانەوە نییە. راستتر, رەوشی عوسمان....... "بەشێك لەم نێوەندەدا هەیە کە سڕاوەتەوە ــ رەشنووسی کتێبەکەش بەمجۆرەیە ـ "

وەها روونبۆتەوە کەنارەزاییەکی دژوار دەرهەق بەمن هەبووە. چۆن لەدەرەوە زانیاریم بۆ رەوانە ناکەن, ئەو رێنمایی و دیدگانەی خواستوومە پێشکەشیان بکەم ساڵانێکە لەبیرکراون. دەزانم ئەمە زۆردەمێك لەپێش هەڵوێستی عوسمان پراکتیزە کراوە. پێویستە ئەم پیلانگێڕییە روونبکرێتەوە کەبەرامبەر کەسانی دیکە نییە, بەڵکو بەرامبەر منەو لەگەڵ گواستنەوەم بۆ ئیمرالی دەستپێکردو ئەحمەد ئۆڤچی ئۆغلو بە ئاشکرا ئاماژەی پێکرد. ناتوانرێ لەمیانەی هەڵوێستە ئاژاوەگێڕییەکان روونبکرێتەوەو بگووترێ"عوسمان ژنی هەڵگرت و رفاندی".

دەشێ هەڵوێستی من لەزیندان پەسند نەکرێ؛ دەشێ بەپێی پێویست بەهەڵوێستێکی شۆڕشگێڕی ــ نیشتمانپەروەری نەبینن. لایەنە پەیوەندیدارەکان دەتوانن بەئاشکرا ئەمە بکەن. رێکخستنیان لەدەستدایە؛ کاتێك بەئاشکرا نایکەن, بەهۆی

ترسیان لەجەماوەرو وابەستەیی گەل بەمنەوەیە. ئاشکرایە کەمنیان بۆ ئامانجەکانی خۆیان بەکارهێناوە، بەڵام ویستوویانە بەتەواوی گۆشەگیرو بێکاریگەرم بکەن.

هەندێ نیشانەی دیکەش هەن. روونکردنەوە زێدە واتادار نابینم. ئەو خاڵانەی دەمەوێت بیزانم ئەمانەن:

أ) ئایا وەك مۆدێلێکی رێکخستنی بەکارهێنراوە؟ بۆچی پەیامەکانم رەوانەی زیندانەکان نەکراوە، میدیا (راگەیاندن)یش باسی نەکردووە؟.

ب) ئەگەر ئەمە راست نییە کە لەکەسێتی عوسماندا خوازراوە لەمن بدرێ، وەڵامەکانی بەرامبەری چییە؟ تەنانەت ویستراوە گشت ئورفاییەکان بخرێنە گۆشەگیرییەوە. سەرباری ئەوەی دەزانرێ من بنەماڵەگەرێتی و شارگەرانیم و نایکەم، ئەم رێچکەیە گیراوەتەبەر.

ج) چۆن دەتوانرێ ئەمانە روونبکرێتەوە کەشیمانەیە تەواوی ئەمانە گرێدراوی منن و بەرێزن، خواستراوە لەپێگەی بەکاریگەر لابرێت؟

د) دوای ئەوەی دەستبەسەر تەواوی رێکخستندا گیرا دەخوازن چی بکەن؟ ئەو کەسانەش هەن کەلەهەوڵە جددیەکانی پاکتاوکردن نیگەران بن. ئایا ئەوانەی لەگەڵ عوسمان رۆیشتن هەموویان بەدوای ژن ـ مێرد کەوتن. لەوانەیە هەندێ لەوانە کەسایەتی خاوەن کەرامەت بن. ئەگەر بەشێوەیەکی لاوازیش بێت، لەوانەیە وابەستەبوونیان بەمن هەبێت. ئایا لەبنەڕەتدا ویستراوە ئەم خاڵە بکرێت بەئامانج؟ ئەم هەڤاڵانە دەترسن. ئەوانەی لەشەڕ نەترسن چۆن دەکەونە ئەم رەوشەوە؟

و) ئەگەر ئەمانە تاوان و کەموکوڕی جددیشیان هەبێت، ئایا بۆ ڤازانجکردنیان پێویستی بەهەوڵ و کۆشش نەبوو؟ بۆچی لەناکاو کەوتنە رەوشی راکردن؟ سەرباری ئەوەی دەزانن کەبۆ ڤازانجکردنی تاکە مرۆڤێك زمانم دەوەرێ و کۆششێکی بێ هاوتام دەکرد، بەمجۆرە خەرجکردنی رەنجی سالانم، دەتوانرێ لەمیانەی کامە هەڵوێستی مرۆڤانە و نیشتمانپەروەری و شۆڕشگێڕییەوە روونبکرێتەوە؟ ئەگەر ئەمانە بەرخۆدانیان بکردایە، بەلانی کەم لەوانەبوو 1000 هەڤاڵ بکوژرایە، چۆن بەرپرسیارێتی ئەمە رووندەکرایەوە؟

ز) لەم ماوەیە جموجۆڵی چەکداری شێوازی کۆن بینرا....... "رەشکراوەتەوە". شتێکی لێتێنەگەیشتم. سەرباری ئەوەی پێشنیازی چالاکی دیموکراتییانەمان کردووە، بەڵام کاتێك گوێی پێنادرێ و حیسابی بۆ ناکرێ ئەمە چۆن رووندەکرێتەوە؟.

و) بەبێ ئاوڕدانەوەو ئاگادارکردنەوەمان خۆپاشداکێشانەوەی DEHAP لەهەڵبژاردنەکان، سەپاندنی گشت پاڵێوراوەکان لەئەنجامی فەرمانی سەروو، نکۆڵێکردنە لەدیموکراسی. تەنیا ئەم خاڵە نیشان دەدات کەرێکخستن لەتەواوی گەوهەرە شۆڕشگێڕی و دیموکراتییەکانی پووچەڵکراوەتەوە. ئەم هەڵوێستە دژە ـ دیموکراتییە لەهەموو شوێنێك پەیرەوکراوە، چۆن رۆشندەکرێتەوە؟. ئایا دەرك بەوەناکرێ کەئەمە هەڵوێستێکی کوشندەیە بەرامبەر بەرێکخستن؟.

هـ) ئەم دەستبەسەرداگرتنەی ئەنجامدراوە، دەشێ بەنیازپاکی ئەنجامدرابێت! بەڵام خواستیان من بێگاریگەر بکەن؟ لەوانەیە ویستوویانە بەتەواوی لەناوم ببەن. یاخود هەندێ هۆکاری دیکە هەیە کەنایزانم. ئایا راستتر نەبوو سەرەتا ئەمانە روونبکەنەوە، مانیفێستۆی خۆتان بلاوبکەنەوە، دواتر دەستبەسەر رێکخستندا بگرن؟ ویستراوە مۆدێلێکی نوێی مافیاگەرایی پەیرەوبکرێت. چۆن ئەمەتان دەرخواردی چەمك و تێگەیشتنی خۆتاندا؟.

ی) بابڵێین دەستتان بەسەر تەواوی رێکخستندا گرت، ئەی ئەوکاتە پێویست ناکات تەکتیك و ستراتیژی خۆتان دیاریبکەن، هێزێکی دەهەزار کەسی بخەنە جووڵەوە؟ بەگوێرەی ئەوەی ئەم هەڵمەتەتان ئەنجامنەدا، دەتانویست هێز بەکوێوە گرێبدەن؟ ئەگەر هێز نەخرێتە ناو کار یان پووچ دەبێ، یان پارچە و پەرتەوازە دەبێت. هیچ بیرتان لەبەرپرسیارێتی ئەمە کردەوە؟ ئایا

بەشێوازو پەیڕەوی کۆن هەنگاونان بۆ وڵات ڕێگا لەپێش ئاژاوەیەك ناکاتەوە؟ ئایا چەتەگەرایەتییەك پێش ناکەوێت کە دە هێندەی دوای 15ی ئاب مەترسیدارتر بێت؟.

دەتوانرێ ئەمجۆرە پرسیارانە زیادبکرێت. دەشێ نیازی هەڤاڵان بەتەواوی بەلایەنی باشیش بێت, بەڵام ئەو پرسیارانەی باسم کرد هەریەکە راستییەکە. شیمانەی بەهێزی دیاردەبێ, هەندێ ڕووداوو مەسەلە لەدەرەوەی ئیرادەی ئێوە پێشکەوتووە. بەهەرحاڵ بەسامناکییەوە دەرك بەوەدەکەن کەشەڕی دەسەڵاتداریێتی ناو ڕێکخستن چ جۆرە ڕەوشێکی مەترسیداری خوڵقاندووە. تێگەیشتوون ئەمە هیچ ئەوەندە سانایی نییە کەمەزەندە دەکرێ.

4 ـ لەوانەیە بڵێن لەژێر هەندێ هەلومەرجدا لەناو ڕێکخستندا شەڕی دەسەڵات پێویستییەکە. پەیڕەوکردنی پرۆسەی لەناوبردنی من, لەوانەیە لەم بوارەوە پێویستی تەگبیر وەرگرتنی لەلای ئێوە پێشخستبێت. لەوانەیە سەرەتا هەردوو گروپ بەنیازپاکی جووڵابنەوە, واتا ئێوە وەك پیلانگێڕی نیازخراپ راناگەیەنم. بەڵام دەبینن شێوازی شەڕی سەربازی و سیاسیتان هەم لەناوەوەو هەم لەدەرەوە بێ نرخ و بەهایە. زیانێکی گەورە لەخۆتان و لە گەل و لەمنیش دەدەن. ئەو کەسایەتییەتان کەسەرچاوەی خۆی لەنیازپاکی وەردەگرێ, بەڵام لەبەرئەوەی بۆ ناسنامەیەکی سەربازی و سیاسی و ڕێکخستنی وەرنەچەرخاند, خاوەن خەسڵەتێکە سەرەتا خۆتان لەناودەبات. کەچی لایەنی زۆر باشیشتان هەیە. هەروەکو بڵێی سوێندتان خواردووە ئەم لایەنانە لەگەڵ خۆتان دەبەنە گۆڕەوە. ئەگەر خوازیاربوونایە, ئایا چی لەمنەوە فێرنەدەبوون و وەرتان نەدەگرت؟ بەهەڤاڵێتی و هاوڕێیەتی چیتان لێم داواکردووەو پێم نەبەخشیوون, پێڕانەگەیشتم؟ کەچی بەڕێوەبەرایەتییەکان زۆر لەوەزیاترە کەلەنێوان خۆتانی دابەش بکەن. ئەم چەتوونییە بۆچی, بۆ خۆتان لەناو دەبەن؟.

5 ـ کاتێك ڕەخنەدان پێشدەخەن بەهەرحاڵ ئاگاداری ئەم لایەنانەش دەبن. لەخۆنوێکردنەوە مەترسن, زۆر لەو کەسایەتییەی ئێستاتان بترسن. چل ساڵە بەرامبەر ئەم لایەنانەتان ئارام دەگرم. نامەوێت لووتی یەکێکتان لەبەر ئەم هۆیە خوێنی لێبێت. بەبێ ترس لەئاییندەتان ببنە خاوەن ڕەخنەدانێکی راستەقینە. بەشێوەیەکی سادەو بێ فیز داوای هەر یەکێك بکەن کەتوانای جێبەجێکردنتان هەیەو بچووکی مەبینن. نەبرشێنەوەو نەدوژمنایەتیش بکەن. لەمیانەی هەڵوێستێکی راستەقینەی دانایی کەشایستەی خۆتان بێ, بەرامبەر بەبیرەوەری هەزارانی وەکو کەمال پیر, مەزلۆم دۆغان بەبەڵێنی و سووربوونێکی گەوهەری ئەرکەکانی خۆتان جێبەجێبکەن.

6 ـ دیارە کەوتوونەتە ناو کێشمەکێشی ڕێبەرایەتی. ئەمە هەم لەبواری کات و هەم لەبواری شێواز هەڵەبوو. بەرلەهەموو شتێك لەرۆڵی سۆسیۆلۆژییانەی من تێنەگەیشتوون. هەربۆیە هەڵەیەکی زۆر دەکەن. لەم قۆناخەی دوایی هەندێ ناوەند منیان وەك "کەمالیزمی کوردان !!" هەڵسەنگاندووە. ئەم دەستەواژەیەیان زیاتر بەلایەنی خراپە بەکارهێناوە. گوایە بۆ پێشکەوتنی چەپ پێویستی بەبەلاوەنانی "کەمالیزم" و "ئۆجەلانیزم" هەیە. سەبارەت بەمەسەلەی کەمالیزم شرۆڤەم کردبوو. داخوازی گواستنەوەی شۆڕشی فەرەنسا زۆر ئاشکرایە. هەربۆیە لەریزی گشتی شۆڕشەکانی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەمدا دەبینرێ. هەروەها زۆرجار ئاماژەم پێکردووە, لەبەرهەلومەرجە خۆجێییەکان (محلی) بەپاشکۆیی و بەستراوەیی ماوەتەوە. زۆرباسی ئەوەشم کرد کەپێویستە لەگەڵ رۆژگاری ئەمرۆماندا بگونجێنرێ. نووسەری ئینگلیزی "ئەندرۆ مانگۆ" کە لەرابردوودا لەبارەی ئەم بابەتەوە شارەزابوو باس لەهەمان هەنووکەییبوون دەکات.

خاڵێکی دیکەی گرنگ ئەوەیە, نەك تەنیا کەمالیزم سەبارەت بەتەواوی نەتەوەی تورك لەو سەردەمەی لەرۆژهەڵاتی ناوین جێگیربوون, پەیوەندییان لەگەڵ کوردان رۆڵی کلیل دەبینێ. سەرباری ئەوەی ئەم پەیوەندییە لەساڵانی 1071 ـ 1515 ـ 1920 لەبواری ستراتیژی بەشێوەیەکی راست بەسترا, لەرۆژگاری ئەمرۆماندا ئەم پەیوەندییە ستراتیژییە ڕووبەڕووی پچڕانە.

هەربۆیە سەرەکیترین خاڵی گونجاندن و هەنووکەییبوون، ئەنجامدانی ریفۆرمێکی گەوهەری و واقیعییە سەبارەت بەپەیوەندی کورد ـ تورك. لەڕەوشێکی پێچەوانەدا پەیوەندی کورد ـ تورك لەوە رزگاری نابێت ببێتە مۆدێلی پێکدادانێکی ستراتیژی.

سەرباری ئەوەی رۆڵی من پێشخستنی جۆرێك لەکەمالیزمی کوردە، بەڵام ئەوەی من جیاوازییەکی زۆر لەخۆوە دەگرێت. ئاشکرایە لەریشەدا من دەوڵەتگەرا نیم، دیموکراسیخوازم. داخوازیم ئەوە نییە کوردان بۆ دەوڵەتێکی میللی بخەمە جووڵەوەو بەدەستڕۆییان بگەیەنم، بەڵکو خوازیارم بەشێوەیەکی ریشەیی لەسەر بنەمای مۆدێلی گەلێکی دیموکرات بەجووڵانەوە و دەسەڵاتیان بگەیەنم. لەکاتێکدا کەمالیزم دەروازەی سەردەمی نیشتمانی رۆژهەڵاتی ناوینی کردەوەو نوێنەرایەتی کرد. ئێمە ناچارین سەردەمی دیموکراتییانەی رۆژهەڵاتی ناوین دەستپێبکەین و نوێنەرایەتی بکەین. جیای قاف لەنێوان هەردووکیاندا نییە، بەڵام ناتوانرێ وەك یەك ببینرێ. مەبەستی سەرەکیشم لەگونجاندن و هەنووکەیی کردنی، لێگەڕینە بەدوای دەرفەتەکانی رێککەوتن یاخود سەنتێزی نێوان تورکیای کەمالیست و دیموکراسیخوازی کوردستان. ئەم رێبازە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە، لەچارەسەرکردنی کێشەکانی کوردو تورکەکانیش رۆڵی کلیل دەبینێ. هەروەها سەرەکیترین ئەڵقەی رزگاربوونە لەگێژاو (کائیوس)ی رۆژهەڵاتی ناوین، هەلومەرجە مێژوویی و ژیۆپۆلیتیکی و کۆمەڵایەتییەکان نیشانیدەدەن کەسەنتێزێکی بەمجۆرە رۆڵێکی مێژوویی مەزن دەبینێ. ئایدیۆلۆژیاکانی دیکەی میلیگەرایی شۆڤێنی "میللیگەرایی راسترەو ـ چەپرەوی تورك" و میللیگەرای سەرەتایی کوردو ئیسلامی یان لەبەدیهێنانی چارەسەری دوورن، یاخود لەو ناوەڕۆکە بێبەشن کەبتوانن خۆیان لەپشتبەستن بەهەژموونگەرایی رزگاربکەن. ریشەی جەماوەری ئەم ئایدیۆلۆژیانە زۆر لاوازبووەو لەناوەڕۆکدا پاشکۆی دەرەوەن. هەربۆیە ئەگەر دەتانەوێ من تێپەڕبکەن بەرلەهەموو شتێك پێویستە مەیلی ئایدیۆلۆژی خۆتان یەکلابکەنەوە. بۆ ئەنجامگیربوون چەواشەکردن و بەکارهێنانی من بێهوودەیە. تەنانەت ئەگەر بشمرم دیسان هەر زەحمەتە. بەسەدان نموونە تاقیکرایەوەو کەوتنە ناو رەوشی زۆر خراپەوە. بەهەرحاڵ توانای تێگەیشتنی ئەم نموونانەتان هەیە. نازانم تا چ رادەیەك دەخوازن بەچەواشەکاری یاخود بەئاشکرایی وەك رکابەر بەرامبەرم قووت ببنەوە. بەڵام پێویستە بەئاشکرا بڵێم سەبارەت بەرێبازێکی واتادار خاوەن لێگەڕین بن و بەدوژمنایەتی ئەنجامی دەدەن، ئەوا وەك مافێکی خۆتانی دەبینم. مسۆگەر ناسنامە دیموکراسیخوازەکەم پێویستی بەمەیە. پێوانە لەپێناسەی ئازادی و نزمترین ولاتپارێزیدا یەکدەگرێتەوە. بەڵام دیسان دروست نەبن و هەڵوێستی پیلانگێڕی نیشانبدەن، ئەوا مافی خۆپاراستنم هەیە. واتە ئەگەر سوود لەگورزێکی کوشندە وەربگرن کەدووچاری من بێت، و بەبێ نیشاندانی بیانوویەکی ئایدیۆلۆژی بەجێ، گوایە بابەتە لاوەکییەکان گەورەبکرێ و بخوازن دەستبەسەر رێکخستندا بگرن، ئەمە دەکەوێتە چوارچێوەی پیلانگێڕی و کودەتا. لەرەوشێکی وەهادانیم کەبڵێم لەدۆخێکی بەمجۆرەدان. لێرەدا تەنیا پێناسەیەك پێشدەخەم. ئەم پێڕەوانە لەجێدا نابینم کەزۆر جار لەکولتووری سیاسی تورکیادا بینراوە. بەگشتی ئەمجۆرە پێڕەوانە زیانبەخشە.

لەم ماوەیەی دواییدا رەوشی گۆشەگیری لەناو گۆشەگیری و ئەگەر تەواو بەجێش نەبێ، بەگوێرەی هەندێ زانیاری پێمگەیشتووە، هەروەکو بڵێی من"خانەدان"ێکم ئاواکردووەو دەخوازن هەڵیوەشێننەوە. نازانم ئەمە تا چ رادەیەك سەرچاوەی خۆی لەکێ و کامە دەزگا وەردەگرێ. دەرکەوتنی مەسەلەی عوسمان و چۆنییەتی شێوازی بەکارهێنانی کاریگەری لەسەر ئەمە هەشبێت، یەکلاکەرەوە نییە. شیمانەی لەپێش ئەوەیە مەیلێکە بەردەوامییەکەی لەدەرەوەو ناوەمان هەیەو ریشەکەی بۆ کۆن دەگەڕێتەوە. میللیگەرایی سەرەتایی کوردان و چەپرەوی تورك ئەم گووتەیە بەکاردێنن. هەروەها بابەتێکە چەندین هەڵگەڕاوە بەفراوانی بەکاریدێنن. سەرەکیترین خەتای گروپەکانی دوایی ئەوەیە ئەزموونیان لەمجۆرە رووداوانە وەرنەگرتووەو یاریکردن لەپێناو رێبەرایەتی بێبەختییەکی گەورەیە. ئەم رەوشە زەقە کەهەردوو گرووپیش بۆ ئەوە کەوتوونەتە ناو ئەم

هەلۆیستە کەگرێدانێکی باشتر بەدەستدێنێ. بەڵام شیمانەی ئەو نزیکبوونەوانەش کەم نییە کەدرووست و دڵسۆزانە نییە, بابەتێکە پێویستی بەئاشکراکردن هەیە.

من دەربازکردنم لەلا خۆشەویستەو پشتگیری لێدەکەم. کامە گروپ لەسەر بنەمایەکی ئەرێنی سەرکەوتووبێ دیسان ئامادەی پشتگیری کردنم. بێگومان پێویست بەرووخاندن ناکات؛ هەلومەرجەکانی من لەزیندان پێویستی بەکودەتاو بەلاوەنان نییە, لەناو رێکخستندا دروستکردنی نارەزایی و پەرچەکردار بەرامبەر بەمن, هەبێ و نەبێ بەئامانجی پاکتاوکردنە. چونکە دەزانرێ پشتگیریمان بۆ هەر تاك و گروپێکی داخوازی سەرکەوتنی هەبێ چەندە بەهێزو ژیانییە, ئاشکرایە کەبێکاریگەرکردن و لەکارخستنی من لەپاکتاوکردن بەولاوە هیچ ئەنجامێکی دیکەی نییە. سەرباری ئەوەی دەزانرێ کەبێ ئامانترین رکابەرانی بنەماڵگەرێتی و خانەدانگەرێتیم, هێندە جەختکردن لەسەر عوسمان راست نابێ. مەیلەکانی ناو رێکخستن بوون بەرێکخستنی دیکە لەژێر ئەم دەمامکە سەرناگرێت. ئەگەر ئەم شیمانەیە تاقیکرابێتەوە, هاوشێوەیەتی, پێویستە گروپەکان سەبارەت بەم بابەتە زۆر وریابن و دەرك بەوەبکەن کەبەشێوەیەکی بابەتی بەواتای چی دێت و لەپراکتیکدا هەلۆێستی رەخنەدان نیشانبدەن. ئاوێتەبوونێکی راست لەگەڵ راستینەی سەرۆکایەتی ناوەرۆکی سیاسەتی کادیرانە, بەر لەهەمووشتێك دەبێ پێویستییەکانی سەربخرێن.

7 ــ دەشێ رەخنەکردنی من سەبارەت بەبابەتی شەرو ئاشتی واتادار بێت. لەژێر کاریگەری پیلانگێری یەکسەر بانگەوازیکردنم بۆ وەستاندنی چالاکییەکان هێندە بەگوێرەی ئسوڵەکان گونجاو نەبووە, بەڵام بەئامانج گرتنی تەواوی بنکە لەلایەن پیلانگێری و کەمیندانانی خیانەت, فاکتەری یەکلاکەرەوەبوون لەم برپارەمدا. ئەمەیان با لەولاوە بمێنێ کەبانگەوازییەکە لەپێناو خۆم بێ, هەروەکو دەزانرێ دژیشم بەکارهێنرا. هەرچەندە بۆ ماوەیەکی درێژ بەبێ چالاکی مانەوەی بنکە بەشێکی سەرچاوەکەی لەمنەوە بگرێ, بەڵام رەوشی بنکەو فەرمانداریێتی دیاریکەربووە. کەچی بەهەڵەداچوونێکی ریشەیی بەمجۆرە دروستبووە: تێروانینێکی وەها دروستکراوە هەروەکو بڵێی هەمووی لەئەنجامی فەرمانی من روویداوە. هەندێ چالاکی و پراکتیك کەسەداسەد هەڵەن, لەژێر بەکارهێنانی ناوی من بەرێوەبرا. ئاشکرایە هەرگیز نەمخواستووە ببم بەئامرازی ئەمە. لەوە بەدواوە ئەمە خاڵێکە هەرەزێدە بەرامبەری وریاو هەستیار دەبم. لەم بارەیەوە هەوڵمدا زۆر هەستیارانە رەفتاربکەم. نەك بۆ من, بەڵکو بەردەوام جەختم لەسەر ئەوەکردەوە کەپێویستە لەپێناو گەل بنکەکەمان لەراستینەی خۆیدا لەهەلومەرجەکانی شەر و ئاشتیدا بگەرێ. پشتبەستنی گروپەکان بەم زەمینەیە دەشیا دەرکی پێبکرێت.

ئیتر پێویستە بەئاشکرا بڵێم لەگەڵ ئەم دوا بەرگرینامەیەمدا بۆچوونەکانم سەبارەت بەبابەتەکانی شەرو ئاشتی بەروونی لەبەرچاوانە. ئەو رەوشەم نییە کەفەرمانی شەرو ئاشتی بدەم. خوازیاریش بم, بەڵام هەروەکو دەبینرێ رەوشەکەم لەبار نییە. بۆ ماوەیەکی درێژ گوێڕاڵیکردنی داخوازییەکانی من, وەك پێویستییەکی رێزگرتنم بینی. بەڵام دەرکەوتەروو کە کاربەدەستانی دەوڵەت واتادارییان نەبینی. واتە دێننە ئاستی گووتەی: ئەگەر هێزیان هەبێت باشەر بکەن. تەنانەت لەگونجاوترین هەلومەرجیشدا نەسەبارەت بەئاگربەستی یەکلایەنە, نەسەبارەت بەبابەتی ئاشتی ئیرادەیەك نیشاندەدەن. وەکو دیاردەبێ دەوڵەت لەپاکتاوکردن بەبرپارە. دەیەوێت ئەمریکاش تێوەگلێنێ. دوو بژارمان لەپێشدا هەیە: یان تەسلیم بوون, یان بەرخۆدان. بەگوێرەی ئەوەی تەسلیم نەبوون ئەوا بەرخۆدان دەکەن, لەرەوشێکی وەهادا پێویستە ساتێك زووتر کۆتایی بەرەوشی گروپچێتی بێنن. ئەگەرنا ئەوەی بەسووربوونەوە درێژەی پێبدات لەبینینی رۆڵی ئاژاوەگێر رزگاری نابێت. پێشخستنی هەمەلایەنەی تەکتیکی و ستراتیژی شەر مەسەلەیەکە تەواو لەژێر بەرپرسیارێتی خۆتاندایە, لەرەوشێکی وەهادان, نەك تەنیا سوپای تورکیا تەنانەت گشت هێزە سیاسی و سەربازییەکان هەڵسەنگێنن کەپەلامارتان دەدەن. ئەرکی خۆتانە یەکتری سەبارەت بەرەهەندە هەمەلایەنەکان و خێرایی شەرو چۆنییەتی پێشخستنی لەشار, گوندو شاخەکان ئاگاداربکەنەوە.

پێویستە پێشوەخت گەل ئاگاداربکەنەوە. پێویستە داخوازی و داواکاری ئاشتی و ئاگربەست بکەن. دەبێ ناوچەکانی شەڕ دیاریبکەن و گرفتەکانی لۆژستیك چارەسەربکەن, دەبێ بزانن چۆن لەبواری چەندایەتی و چۆنایەتی بەهێز دەبن. بەهەرحاڵ تەواوی ئەم بابەتانە تەنیا گرێدراوی هەوڵی خۆتانە.

لەمە بەدواوە چاوتان لەو شێوازە نەبێت کەتاوەکو ئێستا منتان بەکاردەهێنا. بەبڕیارەوە جەختی لەسەر دەکەمەوە کە: ڕەوشی من لەو پێگەیەدا نییە سەبارەت بەپراکتیکتان دۆخ دەستنیشان بکات. تەواو دەبێ بەهێزی خۆیی و تەکتیك و ستراتیژەکەتان ئەنجام بەدەستبێنن. لەڕەوشێکی پێچەوانەدا دەبێتە چاوەڕوانیکردنی کەرامەت لە"ئەولیا" چاخەکەشمان بەگوێرەی ئەوە نییە. گرنگە کە ببن بەهێزی شەڕو ئاشتی. دەوڵەت یاخود دەوڵەتەکان هێزی ڕاستەقینەی شەڕتان نەبینێ هەنگاو ناهاوێژێ. فۆرمیلەی "چەندە شەڕ هێندەش ئاشتی" جێگای باسە. ئەمە تاڵە بەڵام ڕاستییەکە. من گووتبووم باتاکە سەربازو گەریلایەکیش نەمرێ. ئەمە هەڵوێستێکی مرۆڤپەروەرانەبوو. بەڵام دەوڵەت بەهەندی وەرناگرێت, هەروەکو بڵێی ئەنجامی سەربازی بەبنەما دەگرێ, لەوانەیە شەڕێکی زۆر دژواری گەریلاییتان کۆمەك بەئاشتیش بکات.

لەم ماوەیەدا لەجیاتی کوشتن دەتوانرێ بەرگریکردن, دیلگرتن, لەجیاتی زیانی گیانی, زیانگەیاندن بەموڵك وەك بابەتی تەکتیکی بۆ ناچارکردنیان بۆ ئاشتی وەك ڕێبازی چالاکی دەستنیشان بکرێت. دیسان پێشوەخت دیاریکردنی ئاگربەست و دەستنیشانکردنی یاسا و ڕێساکانی شەڕ مرۆڤپەروەرانەترە. ئومێدەوارم لەدووایيدا دەرگای دیالۆگ بکرێتەوە.

هەروەکو دەزانرێ شەڕو ئاشتی دوو بابەتی هەرەزەحمەتن. کەس ناتوانێ نکۆڵی لەوەبکات کەسەبارەت بەهەردوو بابەتیش گەورەترین هەوڵ و کۆششمدا. ئێستاکە لەڕەوشێکی وەهادانیم بەکردارییی کۆمەکی شەڕو ئاشتی بکەم. بەئەندازەی شرۆڤەکردنێکی ڕاست سەبارەت بەسوپای تورك, ئەوا هەڵسەنگاندنی ڕاستینەی شەڕی خۆشتان تەواو لەچوارچێوەی ئەرکتان دایە. ئەو قورساییەی کەوتووەتە سەر من سەرچاوەی خۆی لەوەوە دەگرێت کەهەردوولایەنیش تەواوی باری شەڕو ئاشتیان خستۆتە سەرمن. ئەمە ڕەوشێکی بێڕەحمانەیە. ئیتر جگە لەتاقیکردنەوەی حیساب وەرگرتن لەیەکتر لەڕێگای هەموو شارەزاییەکتانەوە زیاتر چارەیەکی دیکە نییە. واتا "خۆتان لەگەڵ هێزەکانی دەوڵەت". لەمیانەی پاکتاوکردنی خۆبەخۆیی ناتوانن لەژێر ئەم بارە رابکەن. ماوە بەرفراوانی و شێوازی شەڕەکەتان تەواو گرێدراوی شارەزاییتانە. نەگرێدانێکی سۆزداری بەمنەوە, نەپەرچەکردار, هیچ یەکێکیان بارت سووك ناکات. دووبارەو چەند بارە جەختی لەسەر دەکەمەوە, ئەم شەڕە لەمیانەی هێزی هزرو ئیرادەی خۆتان بەڕێوەدەبرێ. بەشێوەیەکی ڕاست و لێهاتووانە هەڵوەستەبکەن. لەمیانەی پەیڕەوە خۆکوژییەکان نەخۆتان و نەکەسی دیکە تەنگەتاو مەکەن. دەبێ دەرك بەوەبکەن کە لەجێبەجێکردنی چاوەڕوانییەکانتان بۆ شیکردنەوەو ئومێدەکانی شەڕو ئاشتیتان زەحمەتی دەبینم.

وەها مەزەندەدەکەم هێشتا پەی بەوە نابەن کەپشت بەمن دەژین. واقیعی و کەم وێنە بن. لەمیانەی ئاواکردنی گروپی سووك و بێ واتا تەنیا ئامادەکاری لەناوچوونی خۆتان دەکەن. تەنیا کاتێك لەلایەن گەل, دۆست و دوژمن ڕێز لەسەرکەوتنەکانتان گیرا شانسی ڕێبەرایەتییتان بۆ دەرەخسێ. ئەوەی دیکە هەمووی جموجۆڵی فەسادە. گەر لەهەڵمەتە مێژووییەکاندا خاوەن سەرکەوتن نەبن, نزیکی بابەتەکانی ڕێبەرایەتی نەبنەوە. هەروەها دووبارە جەختی لەسەر دەکەمەوە: هەردوو گروپیشتان وەك گۆشت و نینۆك پێویستیتان بەیەکترە. ئەوانەی دەرك بەمەدەکەن و چارەسەری ناکەن بەئەنقەست یاخود لەخۆیەوە بکەوێتە پێگەی ڕێبەرایەتی, دەبێتە گەورەترین بەڵای سەر مرۆڤ. جگە لەخۆئالاندن لەو کارانەی دەتوانن بیکەن و تێیدا سەرکەوتووبن هیچ چارەیەکی دیکەتان نەماوە.

8 ـ ئەوەی لەرۆژهەڵاتی ناوینی ئەمرۆماندا پێویستییەکی مێژووییە, کرانەوەی تیۆری و پراکتیکی بزاڤی دیموکراتییە بەرامبەر بەنەریتی دەوڵەتی دەسپۆت. ئەم کرانەوەیە گونجاوترین پێکهاتەی بژاری سیاسی بەگوێرەی داواکارییە

سەرەکییەکانی تەواوی گروپەکانی گەل پێکدێنێ. تێپەڕبوونی گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوین بەقۆناخی شارستانییەتی دیموکراتییانە هاوکاتی ڕەوشی ژیۆپۆلیتیکی جیهان و قۆناخێکی چۆنایەتی زەمەنە مێژوییەکانە. بەلاوەنانی قەیران (گێژاوی) ڕۆژهەڵاتی ناوین لەڕێگای دیموکراسییەوە، دەبێتە فاکتەرێکی دیاریکەری وەرچەرخان لەسەردەمی دەسەڵات ــ شەڕ بۆ سەردەمی دیموکراتیزەبوون.

هەربۆیە دیموکراتیزەکردنی کوردستان ڕۆڵی کلیل دەبینێ. ئەو ڕێگایەی لەڕۆژهەڵاتی ناویندا بەرەو دیموکراسی دەچێ، گرێدراوی ئەو سەرکەوتنەیە کەبژاری دیموکراسییانەی گەلی کوردستان بەرامبەر دەوڵەتی دەسپۆت بەدەستیدێنێ. لەبەرئەم هۆیە پارتیبوونی دیموکراتییانەی گەلی کورد لەهەر پارچەیەکی کوردستاندا بایەخێکی زۆری هەیە. ئەو سەرکەوتنەی بەدەستبهێنرێ دیموکراتیزەبوونی زنجیرە ئاسایی گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوین خێرا دەکات.

بابەتێکی دیکەی جێگای بایەخ سەبارەت بەچۆنییەتی ئاواکردنی پارتێکی دیموکراتییانەیە. بێگومان داسەپاندنی هەڕەمەکی لەسەرەوە، لەگەڵ ناوەڕۆك و شێوەی دیموکراتیزەبوونیش ناکۆکە. کەسێتی گروپەکان تەنیا بەو شێوازەی ئاشقی دیموکراسی بن و بەردەوام پەروەردە، ڕێکخستن و چالاکی لەناو بنکەی جەماوەری ئەنجامبدەن خەسڵەتی دیموکراتی بەدەستدێنن. سیستەمی دیموکراتی خاوەنی پارادیگمایەکی تایبەتی ژیانەو لەگەڵ فەلسەفەو پراکتیزەکردندا یەکپارچەیە. هەڵبژاردن و کورسییەکان بۆ دیموکراسی واتایەکی سنووورداری هەیە. بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەپێناو ئازادی و کەرامەتی گەل دیموکراسی گوزارشت لەڕەوشی هۆشیاری و ڕێکخستەیی دەکات. گوزارشت لەڕەوشی زاڵی گەیشتن بەبەڕێوەبەرایەتی و دەسەڵاتی خۆیی دەکات. پارتێکی راستەقینەو دیموکراتی بەگوێرەی ئەم پێناسەیە بەرفراوانترین ڕێکخستن و چالاکی لەناو بنکەی جەماوەری بەڕێوەدەبات و دەتوانێ خۆی بسەلمێنێ. وەك مێگەل بەستنەوەی گەلێك بەئارەزووەکانی ئەنجامێکی کولتووری دەوڵەتی دەسپۆتەو ڕەوشێکە پێویستە بەردەوام پارتی دیموکراتییانە لەڕێگای تێکۆشانەوە بەرکەناری بکات.

هەر کادیرو ڕێبەرێك خۆی لەناو ڕێکخستن و چالاکی دیموکراتییانەی گەل نەسەلماندبێ نابێ شایستەی سیفەتی دیموکراتی نابێت. کاتێك لەچوارچێوەی ئەم پێناسەیەدا تەماشا بکەین، ئەوا دەزانین کە ئەو مەیلە گروپچێتییەی کەسەریهەڵداوە ئاگایان لەڕێبازی دیموکراسی نییە، ئەوەی دەیزانن سووربوونە لەسەر پەیوەندییە خۆجێیی و شارگەرایی و هاوشێوەکانیان. ئەم چەمك و هەڵوێستانە پەیوەندی بەتێنەگەیشتن و ئاوێتەنەبوون لەگەڵ ڕێبەرایەتی دیموکراتییانەی کۆمەڵگا هەیە کەلەزووەوە شیمانکردۆتەوە. زهنییەتی خۆڵەمێشی کۆمەڵگا و پێوانەکانی لەژێرئەمەدا شاراوەیە. سەرچاوەی خۆی لەوەدەگرێت کە لەمیانەی پەروەردەو کرداردا هێزی بەلاوەنانی نیشانناەدەن و ئیرادەیان بەهێز نییە. نەك تەنیا لەپراکتیکە سنووردارەکانی پارت، زۆرجار لەڕێبازی چالاکی و ڕێکخستنی پارتی یاسایی و کۆنگرەشدا خۆی نیشاندەدات. ئەم گۆڕەپانانە ئەو دەزگا سەرەکییانەن کەلەبواری بەکۆمەڵگانەبوون و گەلەری نەبوون خۆیان دەدەنەدەست. بەشێوەیەکی گشتی لەژێر دەمامکەکانی نهێنیبوون هەموویان لەهەڵوێستەکانی دامەزراندن لەسەرەوە، لەدوور وەستان و کۆنترۆڵکردنی لەژێرەوە کۆدەبنەوە کەوەك هەڵوێستی دەسەڵاتی دەوڵەتگەرایی و پلەداری تاقیکراوەتەوە. تەنیا ئەو ناوەندو هێزو نوێنەرە چینایەتییانە بەمجۆرە ڕەفتاردەکەن کەدیموکرات نین و دەیانەوێ دەسەڵات و دەستڕۆیی و پلەداری لەسەر کۆمەڵگا ئاوابکەن. سۆسیالیزمی بونیادنراویشی لەناودا، هەڵوێستی ڕێکخستنە هاوچەرخەکانی لەتیشکۆی دەوڵەتدا چڕبوونەتەوە لەسەر ڕاستەڕێی ئەم هێڵەدا بووە.

لەو بڕوایەدام بۆ بەلاوەنانی ئەم چەمکە نەریتییەی حوکمڕانی پلەداری دەستڕۆیی و حزبایەتییەی تەسك هەم وەك کەسێتی، هەم وەك ڕێکخستن کۆششێکی مەزنمان کرد. بەشێوەی پێویست دەرك بەوەکراوە ئەم ڕاوەستە دیموکراتییانەی لەسەرەتا بەشێوەیەکی خۆخۆیی پەیرەومان دەکرد، دوای پیلانگێڕییە گەورە نێو دەوڵەتییەکە خستمانە قۆناخێك

کەپێکهاتەیەکی چۆنایەتی بەدەستهێناوەو زیاتر تیۆری و هۆشیارانەترە. ئەو بوێرییەی گروپەکانی دوایی نیشانیاندا ئەمە پشتڕاست دەکات. سیستەمی پاڵێوراوی و هەڵبژاردنی ئەندامەکان کەدەبووایە لەهەموو لایەکەوە لەلایەن گەل ڕێکبخرێ و لەمیانەی ئیرادەی دیموکراتییانەوە دەستنیشان بکرێت، هەوڵدراوە لەرێگای ئەو ئەرکپێدان و دامەزراندنانەوە بەڕێوەبرێ کەدەسەڵاتی پادشایەتیش تێپەڕدەکات. ئەم هەڵوێستانەی لەسەرەوە هەموو شتێك دیاردەکات تابڵێی زیان بەو راوەستە دیموکراتییانەی گەل دەگەیەنێ کەبەهایەکی تایبەتی هەیە. هەڵبەتە ڕێکخستنی گەل لەم خاڵەدا زەق و بەرچاوە کەئەوانەی ئاشقی دیموکراسی نین ئاشکرا دەبن.

ئاستەمە لەرێگای ئەم چەمکەوە بەشێوازێکی دیموکراتییانە خەبات بکرێ. سەرکەوتنیشیان نابێت. رەوشی چەپەکانی تورکیا زۆر بەچاکی ئەم راستییەیان سەلماندووە، مسۆگەر پێویستە ئەم هەڵوێستانەی لەسەرەوە شتەکان یەکلایی دەکات دەستی لێبەربدرێت کەدەرهەق بەگەلی کورد پەیڕەودەکرێت. ئەو گەلەی بەڕاستی بەرەو بوون بەگەلێکی دیموکراتی سەری ڕێی گرتووە. ئەوەی لە پارتی رەنجی گەلhepەوە تاوەکو ـ پارتی گەلی دیموکراتیdehap ڕوویانداوە هۆکاری سەرەکی نەگەیشتن بەرێکخستنێکی دیموکراتییانە، پەروەردەنەکردن و پێنەگەیاندنی کادیرە دیموکراتەکان و بەدینەهاتنی گۆڕانکارییەکی مەزن کەدیموکراتییزەبوون لەگەڵ خۆی بێنێ. ئەمەرەوشێکە بەگشتی چەپ تێیدا دەژی. فاکتەری سەرەکی لەژێرئەمەدا شاراوەیە کولتوورو دەستڕۆیی پلەداری ئاماژەی پێکراوە.

پێویستە باش بزانرێ لەمیانەی دوا بەرگرینامەوە لەبواری تیۆری و پراکتیکی بزووتنەوەکەمان ئاراستەی ڕێبازێکی قووڵی دیموکراتییانەی گرتۆتەبەرو هەرسیکردووە، لەسەر ئەم بنەمایەش لەرێگای هەڵوێستێکی رەخنەدانەوە تەڤلیبوونێکی نوێ ئەنجامبدرێ. تائێستاکەش لەمیانەی پراکتیکی گروپچێتی و دەسڕۆیی و رەخنەدانی رووکەشییەوە درێژەدان بەو راستییەو خەڵەتاندن جگە لەزیان و ژێرکەوتن زیاتر هیچ ئەنجامێکی دیکەی لێناکەوێتەوە. ڕێبازی دیموکراتییزەبوونیان وەك دژەتێزی رێبازی پێنج هەزار ساڵەی کۆمەڵگای دەوڵەتگەراو پلەداری، گوزارشت لەهەڵکشانی دیموکراتییانەی گەل دەکات کەلەمیانەی تیۆرییەکی قووڵ و پراکتیکی رەسەنەوە شێوەی گرتووە. هەرچەندە ڕێکخستن لەناو ڕێکخستن ئاوابکرێت، مەیلی تەسکی"خۆجێیی، ناوچەگەری" پێشبخرێت، تەنانەت وەك چەتەگەرییەتیش رەفتاربکرێ، بەرامبەر بەگرێدانی گەل بەرێبەرایەتی دیموکراتییانە لەشکست رزگاریان نابێ. لەدوا لێکدانەوەکاندا دەردەکەوێ ئەگەر نەوەکانی ئاشق بەدیموکراسی هەبێ، مەحاڵە گەلان لەژێر پەیوەندییە کۆنەکانی کۆیلایەتی و دەسەڵاتە دیماگۆکەکان و دۆگماکانی شۆڕشگێڕ ـ سۆسیالیستە ساختەکان دیل بکرێن.

وەك ئەنجام، ئەو گروپچێتییانەی لەسەرەتای دەستپێکردنی بزووتنەوەی "PKK" لەلایەکەوە ئاسایی دەبینران، لەم قۆناخەی پێیگەیشتووە ئەگەر جەختی لەسەربکرێتەوەو لەگەڵ ئەو پێکهاتانە نەبێتەیەك کەناوەڕۆك و شێوەکەی ئاشکرابووە، ئەوا پاکتاوکاری ئەنجامگیردەبێ. ناتوانرێ بگووترێ مسۆگەر هەموو گروپگەراییەك خراپە، بەڵام مەرجی ئەمە، ئاوێتەبوونە لەئاستی بەرزترو بوون بەهێزی چارەسەری و بەلاوەنانی واتا کۆنەپەرست و شێوە ڕێکخستنە دواکەوتووەکان.

لەو بڕوایەدام ئەو ڕێبازو ئایدیۆلۆژی، سیاسی و ڕێکخستنییەم باش یەکلاکردەوە کەخوازیاربووم لەکەسایەتی خۆمدا پێشیبخەم. مەبەستم لەئایدیۆلۆژیا، راستینەی زهنییەتی شۆڕشگێڕییە؛ پارادیگمای دونیاو گەردوونێکی نوێیە. لەئەنجامی ململانێ گەورەکانی باوەڕی و هزر بەگەوهەری یاساکانی هەڵسووڕانی گەردوون گەیشتن، بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت لەدوا بەرگرینامەکەمدا هەوڵمدا ئەوە نیشانبدەم. لەگەڵ ئەوەی ڕێنیسانسی ئەورووپاش لەگەوهەرەکەیدا هەیە، بەڵام هەوڵەکانی تێپەڕکردنیشی جێگای باسە. لەو بڕوایەدام بەشێوەیەکی لێهاتووانە پارادیگمای پلەداری و دەوڵەتگەراییم شیکردەوە کەلەرۆژهەڵاتی ناویندا سەریهەڵداو گەشەی کرد. هەوڵمدا ئەوە بخەمەڕوو کەچۆن تاکڕەوێتی زێدەڕۆیی دوای رێنیسانسی

ئەوروپاو ئەو کەسێتییەی تاکی تواوەی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین لەپێناسەیەکی راستی کۆمەڵگادا بکەم بەیەك. چەمکی هاوسەنگی تەندروستانەی نێوان تاك و کۆمەڵگا رەچاوکراوە. نەبەناوی تاکرەوێتی دەست لەکۆمەڵگا بەردراوە، نەبەناوی کۆمەڵگاش دەستبەرداری لەکەسێتی تاك کراوە.

ئەو پێگەیشتنەی من مەوداکەیم بڕیوە لەدوو رێگاوە دەتوانرێ هاوڕێیەتی بکرێ: یان تەڤلیبوونێکی سادەو پشتبەستوو بەدڵسۆزی و باوەڕی؛ یاخود تەڤلیبوونێکی بەزانینەوە لەمیانەی هەوڵێکی بەرزی هۆشیاری لێهاتوویی ئایدیۆلۆژی و ناوەرۆکی تیۆری. هەزاران هەڤاڵ کەلە"PKK"دا بەواتای بەهایەکی مەزن دێت، لەسەرووی هەمووشیانەوە حەقی قەرار، کەمال پیر، مەزلوم دۆغان، خەیری دورموش و مەعسوم قۆرقماز لەمیانەی ئاهەنگی هاوسەنگانەی هەردووشێواز تەڤلیبوونی خۆیان نیشانداوە. ئەم بەشداریکردنە گەوهەرییانە تادوایی ئەوانی کردووە بەخاوەنی هەڵوێستی قارەمانانە. بەرامبەر ئەمەش ئەوانەی تەڤلیبوونێکی دڵخوازو دڵسۆزو سادەیان نیشانندەداوە، نەیانتوانیوە لەسەر بنەمای هەوڵە بەرزەکانی تیۆری و ئایدیۆلۆژی تەڤلی ببن بەردەوام پەلەکوتکێیان کردووە؛ هەندێ جار بەشێوەی گروپی خۆجێیەتی(پێڕپێڕێتی) هەندێ جاریش وەکو گروپی پاکتاوکاری و مەیلی چەتەگەرێتی سەریانهەڵداوە. زەحمەتە لەگەڵ ئەوانەدا لەخاڵی هاوبەش بەیەکتر بگەین کەلەهێزی سەرەکی زهنییەتەکەم تێناگات، رێزی ناگرێت، بەشێوەیەکی سادەو پەرفۆرمانسێکی بەرزەوە تەڤلیبوون"بەشداریکردن"ێکی تیۆری ئەنجام نادات، لێرەئەوەی پێویستە بەشداریبکرێت، خاوەنداریێتیکردنی زهنییەتی باڵایە. ئەگەرنا خەڵاتکردنی زهنییەتی دواکەوتوو رێگا لەپێش لادان دەکاتەوە.

دووەمین خاڵ کەپێویستە دەرکی پێبکرێ ئەوەیە: رێبازی سیاسیم لەراوەستەی سروشتی دیموکراتییانەوە، کرانەوەیەکی مەزنی بەرەو دیموکراتیزەبوونێکی هۆشیارو بەچالاکی بەدەستهێناوەو ئاوێتەبوونی لەگەڵ گەل ئەنجامداوە. بەبایەخەوە دەزانرێ، بەدەزگابوونی سەرۆکایەتی لە"PKK"دا لەمنەوە نوێنەرایەتی دەکرێ، لەپێکهاتەکانی رزگاری نیشتمانی و سۆسیالیزمی بونیادنراو رزگاری بووەو گرنگی بەمەیلەکانی ژیانی بۆرژوا نادات. هەم لەبواری تیۆری هەم پراکتیکی رێبازێکی سیاسی یەکسان و ئازادی و دیموکراسییەت لەراستینەی کوردستان سەرکەوتووە کەنەبەشێوەی تەسلیمبوونەو نەلەسەر بنەمای میللیگەرایە. ئەوەی لەبنکەی کادیرانی "PKK"دا چاوەڕوانی دەکرێ هەرسکردنی ئەم رێبازەو بەجەماوەریی کردنییەتی. بەبێ تێگەیشتنی تەواو، نیشانندانی کۆششێکی مەزن لەپێناویدا، ئەو ئسلوبە سیاسییەی پەیڕەوبکەن، زوو یان درەنگ بەشێوەی پاکتاوکاری دژی خاوەنەکانی دەبێتەوە. سیاسەت هونەرێکە لەئاستی بەرزدا پێویستی بەوریابوون و رەوشت هەیە. لاوازی سەرەکی کادیران لەو بارەیەوە سووربوونی بەردەوامیانە لەسەر هەڵوێستەکانی هەڕەمەکی بوون، دوور لەهەستیاربوون و بێبەشبوونی لەهەڵوەستە دینامیکییەکان. ئەو ئەنجامەی لەرێگای ئەم شێوازەوە پێیدەگەیت شکستێکی پێشوەختە؛ بوونە بەئامرازی پاکتاوکاری و پێڕپێڕێتی. کاتێك ئەمە رەچاوبکرێت سیاسەت بۆشایی پەسند ناکات، ژیانێکی تێرو پڕ لەکردار مەرجی سەرکەوتنە.

هەروەکو دەزانرێ لەتەمەنی حەوت ساڵانەوە ژیانێکی رێکخراوو پڕ لەچالاکیم بەبنەماگرتووە. هەڵبەتە رێکخراوبوون پێویستی بەچالاکییە، چالاکیش پێویستی بەرێکخراوبوونە. لایەنی زاڵی ئەمە لەرووخێنەری زیاتر ئاواکردنە. بونیادنان و بەرهەمهێنان مەرجە. زۆر کەم کەوتووینەتە ناو هەوڵەکانی رووخان. تەنیا رووخاندنی ئەو پێکهاتانە گونجاو بینراوە کەرێگای پێشکەوتنە گرنگەکانیان بەربەستکردووە. کەسایەتی چالاکییەك (کردەوەیەك) جێگای باسە کەهەموو جۆرێکی دەستبەسەراگرتن، زەوتکردن و رووخان مەحکوم دەکات. چەمکی هەڤاڵێتیم بەردەوام بەئاراستەی ئامانجی کارەرەسەنەکان بووە. هەرگیز پەیوەندیم لەگەڵ ئەو مرۆڤانە نەبەستووە کەخۆی دەخەڵەتێنێ، رادەبوێرێ و بەدوای بەدەستهێنانی قازانج کەوتووە. پێویستە بەشێوەیەکی تایبەت ئەم لایەنانەی راستینەی سەرۆکایەتی بزانرێ کەمن نوێنەرایەتیم کردووەو بەدوایدا

بچن. لەرەوشێکی پێچەوانەدا ئاستەمە لەرێبەرایەتی مندا باسی یەکێتی سیاسی و ژیانی کرداری (چالاکی) بکرێ. ئەوانەی ژیانێکی چالاکی ئەرێنی (پۆزەتیف) نیشاننەدەن کەبەردەوام لایەنی رێکخراوبوون (رێکخستە)یی لەپێشە، بینینی رۆڵێکی سەرکەوتووانە لەدەزگای رێبەرایەتیدا نزیك بەمەحاڵ بوونە.

لەئەرك زیاتر، پێویستە رێکخراوبوون و چالاکی وەك دۆخێکی ژیان دەرکی پێبکرێ. چۆن بەبێ ئاوو هەوا نابێت، دەبێ بزانرێ کە ژیان بەبێ رێکخراوبوون و چالاکی نابێت و بەواتای راستینەی رێبەرایەتی "سەرۆکایەتی"دێت. ئەگەرنا رێکخستن لەناو رێکخستن، چالاکی سەربەخۆی رووخێنەرو بێواتا و بێئامانج بەردەوام دەبێتە بەڵا. رێکخستنێکی لێهاتووانەو بەرجەستەکردنی بەگوێرەی ناوەڕۆکی رێبازی سیاسی و ئایدیۆلۆژی و ئاوێتەکردنی لەگەڵ چالاکییەکی بەئامانج و بەرهەمدار تاکەجۆری وابەستەبوونە. ئەوەی دەتوانێ ئەنجامگیری بکات ئەو هەڵوێستەیە کەهەوڵە مێژووییەکانی بەفیڕۆ نادات و هەر خشتێك بۆ بەرزکردنەوەی زیاتری تەلارەکە هەڵدەگرێ. جگە لەبەرزکردنەوەی چەمکی رێکخراوەیی و چالاکی رێکخستن ـ تێکۆشانی چەکداریشی لەناودا ـ بۆ ئەم پایەیە لەلایەن بنکەوە دەرفەت و شانسێکی دیکەی سەرکەوتن نییە.

هەڵوێستی ئەخلاقی لای رێبەرایەتی "PKK" کە لەسەربنەمای رێبازی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و رێکخستنی پێکهاتووە، لەمیانەی کۆمەڵگابوونی نوێوە، لەولاوەی یاساو رێساکان گوزارشت لەگرێدانێکی بەحەزو دڵگەرمی دەکات. ئەو بەکۆمەڵگابوونە نوێیە وەك شێوەی لەدایکبوونی ژیان تاوتوێ دەکات. ژیان بەکۆمەڵگابوونە نوێیەکەمانە. لێگەڕینەکانی دەرەوەی ئەمە بۆ ژیان و بۆشاییەکانی خۆدزینەوە، بەواتای شکست دێ. لەژیانێکی باوەڕمەندانە زیاتر، پێشەنگی و لێهاتوویی ژیانێك کەزانستیبوون بەبنەما دەگرێ و ئازادی سیاسی وەك هەوڵەکانی داهێنانی نوێ دەبینێ؛ باوەڕمەندێتی هاوچەرخە. ئەوانەی ئەم هێزەی ئەخلاق نیشاننەدەن هیچ هەوڵێکی لەتووشبوونی لادان رزگاری نابێت. ژیانی ئەخلاقی لەناوەڕۆکی خۆیدا بەردەوام گوزارشت لەنیشاندانی هێزی بەشداریکردنی شێوازی پەیدابوونی کۆمەڵگا دەکات لەمیانەی زهنییەت و ئیرادەی ئازادەوە. بەهاگەورە راستەقینەکانی "PKK" لەلایەن ئەو کەسانەوە بەدیهاتووە کەخاوەنی ئەم راوەستە ئەخلاقییەن. لەراستیدا ئەوەی لەسەر هێڵی "PKK" بخوازێ ببێ بەخاوەنی رێبازێکی ژیان، دەبێ ئەم هێزە ئەخلاقییە نیشانبدات.

بەکورتی ئەم پێناسەیەی سەرۆکایەتی کەناچاربووم لەکەسایەتی خۆمدا نوێنەرایەتی بکەم، هەموو کەسێك ئاراستەی رەچاوکردنەوەی بەشداریکردنی خۆی دەکات و نیشانی دەدات کەچۆن سەرلەنوێ لەگەڵیدا ئاوێتەببێ. رێبەرایەتی ئەم رێبازە تەواوی گەردوون، هەبوونە مرۆییەکان، راستینەی کۆمەڵگامان و ئازادی و دیموکراتی گەل لەهەناوی خۆی دەگرێت. هەرتەنیا نەتەوەیی نییە، بەڵکو گەردوونیشە. ئەگەر کەموکوڕی و هەڵەی هەبێت پێویستە لەم توێژانەدا لێیبگەڕێی. ئەگەرنا لەژێر سێبەرەکەیدا بژیت و مەزەندە بکەی لەمیانەی ئاواکردنی دونیایەکی هەرزانی تاکڕەوێتی و کۆیلەکردن دەتوانێ خۆی بژیێنێ، غەفڵەت و تەنانەت نامۆییشە. بەرگرینامەکەم تەواوی خەسڵەتەکانی ئەم رێبەرایەتییە نیشاندەدات کەبەدیهاتوون. ئەو ئەرکە لەپێشینەیەی دەکەوێتە سەرشانی ئەوانەی سەرنجیان رادەکێشێ و پێیەوە پەیوەستدار دەبن، تێگەیشتنێکی سەرکەوتووانەیە. ئەگەر هەندێ خاڵی ناتەواوو هەڵەبن، نیشاندان و تەواوکردنیان پێویستییەکی هەڤاڵێتییە. لەرووخساردا بەمجۆرە رەفتاربکات و هەروەکو بڵێی بەشداردەبێت و لەکرداریشدا رەوشێکی دیکەی هەبێت، بەگوێرەی پەندی پێشینان"مونافیقێتییە". دەشێ راستینەی سەرۆکایەتیم پەسند نەکرێ. لەم حاڵەدا جیابوونەوە لەرێگای بەیاننامەیەکی گونجاودا مافێکە. لەلایەکەوە بڵێن تێگەیشتم و تەقلی نەبێ یاخود بڵێی تەقلیبووم و پێویستییەکانی جێبەجێ نەکرێت، گوزارشت لەژیانێکی گەندەڵ و بێ بەرپرسیارێتی دەکات کەئەمەش بێواتایەو نابێ هەمیشەیی بێت.

هەرگیز شێوازی سەرۆکایەتیم خۆسەپاندن نییە. لەرێگای باوەڕییەکی مەزن و بلیمەتییەوە تێرخۆراك دەکرێ. ئەوانەی لەم بوارەدا بێ هێزن پێویستە دووربکەونەوە. ئەو تاکانەی سەردەمەکەمان نەخۆشی خستووە، ناتوانن تەقلی ئەم شێوازەی

سەرۆکایەتی ببن. ئەگەر بەشداریش بکەن ئەنجام بەدەستناهێنن. ئەنجامنەدانی بەشداربوونێك بەگوێرەی ئەو پێناسەیەی لەسەرەتاوە سەرلەنوێ بۆ راستینەی سەرۆکایەتیم ئەنجامدا, رۆڵ لەدروستکردنی بناخەکانی گروپچێتی دواییدا دەبینێ. ئەگەر پەیوەندی و رێز بەرامبەر ئێمە هەبێ, بەراستی لەکاروانێکی هاوبەشی ئایدیۆلۆژی, سیاسی و رێکخستنی بەبانگەشەو بەبڕیار بن و بخوازن ببنە خاوەنی چالاکی. نەك من تەڤلی ئەوان بم پێویستە ئەوان تەڤلی من بن. زیندوویی یان مردوویی جەستەم بۆ ئەمە یەکلاکەرەوە نییە. ئەو واتاو ئیرادەو ئەخلاقە پێویستە کەپێیگەیشتووین. ئەمە تەنیا تایبەت بەمن نییە, بەڵکو ئەوەی لەمنـدا گوزارشت دەکرێ راستینەی تەواوی گەردوون, مرۆڤایەتی و کۆمەڵگاکەمانە. پشتئەستوور بەوە سەرلەنوێ بونیادنانەوەی گەلەکەمانە لەناو دیموکراتی, یەکسانی و ئازادیدا.

لەسەر بنەمای بیرەوەری ئەوانەی بەردەوام لەبەرامبەریان دەهەژێین, لەسەرووی هەموویانەوە شەهیدەکانمان, گەلە ستەمدیدەو چەوساوەکەمان و تەواوی بەها رەسەنەکان, لەسەرووی هەمووشیانەوە چەمکی برایەتی و مرۆڤایەتیمان, بانگەوازی دەکەم لەسەر بنەمای ئەو رێبازەمان ببنەیەك کەرێگا لەپێش بەرهەمداری هەڤاڵان دەکاتەوە, جگەلەسەرکەوتن دەرفەت بەکاروانێکی دیکەی ژیان نەدەن. سڵاوو رێز بۆ ئەوانەیە کەلەژێر ئاڵای ئەم بەهارەسەنانەدا کۆبوونەتەوە.

هەروەکو بینرا لەسەرەوە جەخت لەسەر گرنگی رەخنە ــ رەخنەدانێکی دڵسۆزو هاوسەنگانە کرایەوە, تەنیا لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانرێ "PKK"ی راستەقینە ئاوابکرێ. هەڵوێستم سەبارەت بەم بابەتە دەزانرێ. سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی "PKK" راستترین هەڵوێست بوو. بەلاوەنانی ئەو هەڵوێستانەی "PKK" لەپەلوپۆدەخات و نوێی ناکاتەوە, لەبنەڕەتدا بەواتای سەرلەنوێ لەدایکبوون دێت. قۆناخە مێژووییەکان بەواتای ئەرکە مێژووییەکان دێت. ئەوانەی پێویستییەکانی جێبەجێبکەن و مافی خۆی پێبدەن بەردەوام لەدەفتەری کەرامەتی گەلەکەیان و مرۆڤایەتی, ئەو شوێنە بەدەستدێنن کەمافی خۆیانە.

راست دەرککردن بەدوا قۆناخی بەسەرهاتی ژیانم بایەخدارە. بەشێوەیەکی گشتی شرۆڤەنەکردنی ژیانی من بەشێوەکی راست, رێگا لەپێش ئەوەدەکاتەوە هەڤاڵان هەڵەی گەورەبکەن و دەرفەتەکان نەقۆزنەوەو بەفیڕۆی بدەن. بەهایەکەی چی بێت, پێویستە ئەو رەوشە رووکەشیانە دەستی لێبەربدرێت. چونکە هیچ کۆمەکێك بەتاك ناکات. دووبارە هەڵوێستی هەڤاڵ کەمال پیرتان دێنمەوە یاد, بەتایبەتی بەرجەستە کردنی بیرەوەرییەکانی هەڤاڵ کەمال پیر یەکەمین ئەرکی ئەم هەڤاڵانەیە کەلەزیندان ئازادبوون. هەڵبەتە ئەمە وەك رەمزو سیمبۆڵی تەواوی هەڤاڵانی دیکەش دەبینرێ. بەهەزاران بەهای رەسەنی بەمجۆرە هەیە. ئەوانەی لەدەیان یەك شایستەیان بن هیچ ئەرکێك نییە هێزو توانایان بەسەریدا نەشکێ. ئەو هەڤاڵانەی لەکەش و زەمینەیەکی ئازاددان جگەلەسەرکەوتنی واتادار هیچ شتێکی دیکە رزگاریان ناکات. تەواو کاتی بەمەزنی بیرکردنەوەو نیشاندانی هەڵوێستی رەسەن و بەدەستهێنانی سەرکەوتنی ئەنجامگیرە.

هەروەکو دەزانن هاوشێوەی ئامادەکردنی قۆناخی 15 ی ئاب هەوڵێکیشم بۆ ئامادەکردنی ئاشتی دا. بەلانی کەم هێندەی شەڕ, ئاشتیش پێویستی بەتوانستی تیۆری و هێزی خۆڕاگری هەیە. مسۆگەر خەباتێك نییە بەچاوی سووك تەماشای بکرێ. زەحمەتییەکانی لەشەڕ زیاترە. هێندەی بزووتنەوەکەمان گرنگییەکی مەزنم بەهەڵوێستی هاوسەنگانە بەرامبەر دەوڵەتیش دا. بەهەرحاڵ دوای رووداوەکەی سوریا وانەو ئەزموون وەردەگرن. ئەو پەیوەندییانەی هەناسە بەهەناسەو وردەکاری بیرکۆڵینەوە ئاوامانکرد گەیشتە چ رەوشێك ! دەتوانرێ هەمان شت بۆ خەباتی گۆڕەپانی ئەوروپاش بگووترێ. تەنانەت هەمان شت بۆ کۆششەکانی ئاشتی و دیموکراتییانەی تورکیاش لەجێگەی خۆیدایە. نیشاندانی هەڵوێستێك هەروەکو بڵێی شکست قەدەرێکە لەراستیدا ئەنجامێکی کەسایەتییە کۆنە نەخۆشەکانە. کاتێك دەستمانپێکرد لەکیلۆمەترو پێوانەی سفردا بووین, لەناوەڕاستی ماراسۆنێکی نیوە سەرکەوتوودا ئاڵای ماراسۆنمان بەئێوەدا. ئەو وەڵامەی داتانەوە جگە لە"پێیەکانمان لەیەکتر ئاڵا و

کەوتین"هیچ واتایەکی دیکە نابەخشێ. مەسەلەکە ئەوە نییە ژیانێکی پڕ لەخەم و پەژارە بەسەرببەن. خەمی مرۆڤە بێ ئاگاکان هیچ واتایەکی نییە. ئەوەی گرنگە سەرکەوتنە رەسەنەکانی ژیانی پڕ لەخەم و پەژارەیە. ئەوەی شایستەی ئێوەیە, مسۆگەر رێگایەك بدۆزنەوە, بەرامبەرەکەی رەنج و ماف خۆتان لەرکابەرەکانتان, دۆستان و تەنانەت هەڤاڵەکانیشتان بسەننەوە. ئەو هەڵوێستەی شایستەی ئێوەیەو لێتان چاوەڕوانی دەکرێ, لەکەشی ئەفسووناوی من رزگارتان بێ و پێهەڵگرتنێکی سەرکەوتووانە ئەنجامبدەن.

پێویستە بەئاشکرایی ئاماژەی پێبکەم کە لەگونجاوترین هەلومەرجدا کاتێك بەبڕواو متمانەیەکی بێسنوور پشتگیری هەوڵەکانی ئاشتیتان کرد کەبەرامبەر کۆماری تورکیا پێشمخستبوو هەڵوێستێکی هەڤاڵێتی بوو. بەڵام ئەو هەلومەرجانەی تێیدا دەژین, کاتێك دەوڵەت ئەو هەنگاوە مێژووییەی نەهاویشت کەبەگوێرەی من دەبووایە بیهاوێشتایە, ئەمە بەواتای زیانێکی گەورەدێت. لە 11ی ئەیلوولەوە دەوڵەت بەبێ دەنگی رەفتاردەکات. مەزەندە دەکەم گۆڕانکاری و پێشکەوتنەکانی باشووری کوردستان کاریگەری زۆری کرد. تائێستاکەش نازانرێ کۆتاییەکەی چۆن دەبێ. لەو سیاسەتە دانابڕێ کەلەرێگای ئەمریکاوە هەمووشتێك چارەسەربکات. لەئاستێکی سەرسوڕهێنەردا گرێدان بەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەیە. لەساڵانی 1950 کانەوە هەموو شتێکی لەرێگای ئەمریکاوە بەڕێوەبردووە. ئەمریکا گڵۆپی سەوزی داگیرساندووە, تاریکترین فاشیزم پەیڕەوکراوە. تائێستاکەش گۆڕەپانی رەنگی سەوز جێگای بڕیاری گرتۆتەوەو سیستەمێك ئاوا دەکرێ کەدیارنییە چییە. ئەمە راستییەکی دەستلێبەرنەدراوە کەتورکیا بەرەو هاوسەنگی نوێ دەچێ. بەبێ چارەسەرکردنی کێشەی کورد, ئاواکردنی ئەم هاوسەنگیانە بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆی, زۆر لەرەوشی دوای جەنگی جیهانی زەحمەتترە. تەرخانکردنی گشت هێزو توانای بۆ "تیرۆریست لە قەڵەمدانی PKK", هەروەك سیاسەتەکانی سەبارەت بەباشووری کوردستان, ئەگەری لەپێش ئەوەیە ئەنجامێکی پێچەوانەی لێبکەوێتەوە. هەروەکو دەزانن کاتێك بەسووربوونەوە جەختمان لەسەرئەوە کردەوە کە رێگاچارەی دیموکراتییانەی کێشەی کورد تاکەرێگای دەرکەوتنێکی بەهێزی تورکیایەو لەناو قەیران گێژاوی رۆژهەڵاتی ناوین یان وەکو لاوازیمان بینرا, یاخود وەك هەڵوێستێکی تەکتیکی شرۆڤەکرا. پشتیان بەپارچەبوونی "PKK"و هێزەکانی ئەمریکا بەست. چەندەی دەکرێ چەمکی پیرۆزبینینی رێگای سەربازی دەستی لێبەرنادرێ. نازانم چۆن لەگەڵ ئەمریکاوە هێرشیان دەکەنە سەر. دەزانرێ چۆن پەلاماریان دام, بەهەرحاڵ ئێستاش ئەنجامی پێویستی لێوەردەگرن. من ناڵێم پەیوەندیتان لەگەڵ ئەمریکانەبێ. بەڵام ئەوەش ئاشکرابووە کەئەمجۆرە پەیوەندییەش بێواتایە کەکراوەتە موڵکی عوسمان. شیمانەیە دوای کۆنگرە بەیەك دەنگ, لەمیانەی بەبڕیاربوونی پێویست, بەیەکەوە لەسەر بنەمای بەبیرهێنانەوەی بەرپرسیارێتییەکانتان پەیوەندی ببەستنەوە. کۆماری تورکیا ئەم رێگایە هەڵدەبژێرێ.

تەواو لەم خاڵەدا دەخوازم هاوبەشی رەوشی خۆمتان لەگەڵدا بکەم. بەداخەوە پێویستە سەرەتا بڵێم؛ ئەگەر بەمجۆرە بەردەوام بێت, لەقۆناخی پێشماندا شەڕێك چاوەڕوانتان دەکات کەچەندین جار قۆناخی دوای 15ی ئاب تێپەڕدەکات. بۆ بەربەستکردنی هەستیارێتی و وریابوونی من تێرناکات. هیچ رۆڵێك لەمن ناخوازێ. لەوانەیە پیلانی شەڕێك لەئارادابێ کەدەیەوێت تەختتان بکات. واتا دەشێ دەوڵەت خوازیاری سەپاندنی شەڕبێ, دۆخی دەسەڵاتی پارتی دادو گەشەپێدان"akp" لە هی حکومەتەکەی تانسۆ چیلەر باشتر نییە. خراپترین بێ هەستی و ساردو سڕی نیشاندەدات. سەرۆك وەزیران دەڵێ"ئەگەر خۆتان بەکورد بەناو نەکەن, کێشەی کورد نامێنێ" و ئاژاوەکانی سێرت لەوجۆرە نییە کەپەسند بکرێ. تەنانەت ئەو شتانەی پارتی بزووتنەوەی نەتەوەپەرستیmhpنەیکردبوو ئەوان ئەنجامیاندا. شایستەی لێپرسینەوەیە کەلەرێگای بەکارهێنانی چەند کوردێکی میلیگەرایی سەرەتایی خیانەتکار دەیانەوێت چی بکەن؟!.

ئەگەر بەشێوەیەکی ئاشکرا هەنگاوێکی هاوسەنگی ئاشتی و دیموکراتیانە نەهاوێژرێ، ئەوا شەرێکی بەرفراوان چاوەڕوانیتان دەکات. مەزنندە دەکەم هەموو لێکدانەوەکان لەسەر پاکتاوکردنی ئێوەیە. سەرەڕای ئەوەی لەرێگای نامەو پەیامەکانمەوە ئاگاداریيان دەکەمەوە، بەڵام هیچ جددی وەریناگرن. لەراستیدا هەموو توانای خۆم خستەگەڕو لەمیانەی ئەم بەرگرینامەیە لەپێناو رێبازی یەکپارچەیی و ئاشتی و دیموکراتییانە پێشکەشم کرد کەسوودمەندە. نەک تەنیا بۆ ئێوە بەڵکو پێشکەشی بەرپرسیاران و کاربەدەستانی دەوڵەتیشم کردووە. لەبەرئەوە نییە گوایا ماندووبووم و لەپەلوپۆ کەوتووم، لەبەرئەوەی بێواتایەو ئاشکرایە پێویستە جارێکی دیکە حیساب لەیەکتر وەربگرن. واتا ئیتر دەبێ لایەنەکان بیر لەبەرپرسیارێتی من نەکەنەوە؛ ئەمە زۆر شڕکەرە. ئەگەر خاوەن ئیرادەیەکی تۆکمە نەبوومایە، هەمووجۆرە هاندان و وروژاندنێکم دەکرد. نەک لەبەرئەوەی ترسام، بەڵکو بەهۆی نەبوونی تێگەیشتن بۆئەوە ئارامم گرت کەگۆڕانکارییەکان بیانهێنێتەوە رێ. من یەکێکم کەهەڵوێستی فیدائییانە (گیانبازی) زۆر واتادار نابینم، بەڵام ئەو خاڵەی پێیگەیشتووین جموجوڵکردنی لەژێر مەترسی و هەڕەشەکانی مەرگ واتای نەماوە. ئەوەی گرنگە چەمکێکی راستی ئەرك و بەرپرسیارێتییە. بچووکترین دوو دڵی و دڵەڕاوکێم بەرامبەر مردن نییە. ئەگەر مەرگ لەکات و زەمەنی خۆیدا نەبێت تاڵە. ئەو مەرگەی لەکاتی خۆیدا بێت بەهادارە. ئەمە بەوواتایە ناڵێم کەبۆ فیدائیبوون ئامادەم. چەندین ساختەکار مەزندەی ئەوەیان کرد کە من ناتوانم چەند ساڵێك خۆڕاگری و بەرخۆدان بکەم. هەندێ ناوەند لەپێناو بەرژەوەندیپەرستی سیاسی ماوەیەکی درێژ چاوەڕوانی چارەنووس و کۆتایی منیان دەکرد. کێ دەزانێ رەنگە دەوڵەتیش هەوڵیداوە تاقیمبکاتەوە ئاخۆ دەکەومە چ رەوشێکەوە. سکرتێری پێشووی"دەستەی ئاسایشی نەتەوەیی MGM" هەڵسەنگاندنێکی بەمشێوەیەی کرد: سیستەمێکی لەسەر پەیڕەودەکەین کەڤەرەبوو ناکرێتەوە، نەك تەنیا جارێك بەڵكو رۆژانە دەیکوژین. بەڵام خۆڕاگربووم، بەرگەم گرت. پێویست بکات شەش ساڵی دیکەش بەرخۆدان دەکەم. بەڵام ئەوە هێندە گرنگ نییە. خۆڕاگرییەکی باش ئەنجامدراوە. نەك تەنیا لەبواری کات، بەڵکو سەبارەت بەواتاو ناوەڕۆکیش خۆڕاگرییەکی باشە. من یەکێکم بەشێوەیەکی نائاسایی دەزانم چۆن بەرپرسانە رەفتاربکەم. دیسان شتێکم بکەوێتە سەرشان ئامادەم. بەڵام بەڕاستیش لەمەزیاتر نابێ.

دەمەوێ سەبارەت بەبڕوایەك هاوبەشیتان لەگەڵدا بکەم کەلەلای من دەرهەق بەئێوە پێشکەوتووە. لەسیاسەتی خۆم سەبارەت بەکادیران، گرنگی لەپێشینەم بەتەمەندرێژی و ژیانی ئێوەدا، بڕوایەکی زۆرم بەوەکرد کەئەو هەلومەرجانەی دەکەوێتە پێشتان ئێوە فێردەکات. هەروەکو دەزانن ئەم بڕوایەم واقیعی دەرنەکەوت. زێدەڕۆیی لەهەڵوێستی بێ بەرپرسیارێتی کرا. نەتوانیتان من پەیڕەو بکەن، نەخۆتان. بەردەوام رۆڵی من لەوەدا دیاریکەر بوو. تەمەنی زۆربەتان تێپەڕی کردووە. بەگوێرەی من ئەو توانستەی خۆتان لەژیاندا پەیڕەوو بەرجەستەنەکرد کەخاوەنداریێتی دەکەن. پێویستە هۆکارەکەی لەخۆتان بپرسن. هەروەها یارمەتی لەسنووربەدەری من بۆ ئێوەو پێشکەشکردنی بەهایەکی زۆر بەئامادەکراوی رۆڵێکی گەورەی هەبوو. بەڵام هەڕەشەو مەترسی لێرەدایە، ئێوە هەم زۆر بەئاسانی لەهۆش خۆتان دەچن، هەم چەندین بەها لەسەرووی هەمووشیانەوە لاوان و هەڤاڵانی تەنیشتتان رووبەڕووی ڤڕکردن، گەندەڵبوون و بێبەرهەمی هێشتەوە. بەشێوەیەکی شایستە خاوەنداری نەکردنتان لەو هەوڵ و کۆششانەی لەپێناو ژیان دراوە بەردەوام رق و تووڕەیی لای من دروستکردووە. بۆئەوەی رێگری لەژیان و مردنی هەزارانتان بکەین، بێگومان لەسەر رێگای ژیانی ئازادو هاوچەرخ بۆ ئێوەو گەل خوازیار بووم دیسپلینێکی پۆڵایین و شکۆدار پەیڕەوبکەم. ئەمە پێویست بوو. بەڵام پەرچەکردارتان هێندە موحافەزەکار و کۆنەپەرستانە بووە لەروونکردنەوەیدا زەحمەتی دەبینم.

لەراستیدا چاوەڕوانی یەکێتییەکی ئایدیۆلۆژی و سیاسی چوارچوار نەبووم. زۆر چاوەڕوانی ئەوەم کرد ببن بەخاوەنی پراکتیکێك کەهیچ نەبێ کەرامەت رزگار دەکات و دەیپارێزێ. سەرەتا ئەوانەی ئاستی سەرکردایەتی بوون، باش دەزانن چۆن

کاردانەوەیەکتان نیشاندا. لاوانیش نەیانتوانی وەك ئەو بەڵێنەی دابوویان بژین و سەرکەوتن بەدەستبێنن. خۆشتان دەزانن ئەم رەوشەبوو منی خستەدۆخێکی بێ کاریگەرەوە. هەرچۆن هەستم بەوەکرد دەبووایە بەرەو گۆڕەپانی مەیدانی شاخ بێم. ئەگەر بمزانیبایە بەم شێوەیە دەردەکەون, مسۆگەر لەسەرەتای 1980کان بەر لەهەرکەسێك من لەوڵات دەبووم. بەتایبەتیش سەرەتای 1990کان, راستییەکان تاوەکو رادەیەکی مەزن ئاشکرابوون. دەبووایە ئەوکاتەبێم. لەم قۆناخەدا نەهاتنم بۆ وڵات وەك زیانێکی گەورە هەڵدەسەنگێنم. بەڵام هۆکاری تەواوی ئەمانە پاراستن و هەمیشەییکردنی ئێوەیە کەوەك هەڤاڵ دەستنیشانم کردبوون. ئیتر وەك جاران رەخساندنی دەرفەتی ژیان بۆ ئێوەو پشت تێکردن لەسیستەمدا واتای نییە. بەراستی ئەگەر خاوەنی چەمکێکی کەرامەتی زهنییەتی کەمال پیرو هەڤاڵەکانین, ئەوا لەمیانەی ئەزموونە مەزن و کەڵەکەبووەکەتان و هێزی تێگەیشتن ئازادن لەلێپرسینەوەی مێژوویی بەرامبەر ئەو توخم و پێکهاتانەی بێچارەیی, کەسیستەم و نەزانییەکی گەورە دەسەپێنن. ئەمە هەم مافی خۆتانە, هەم ئەرك. پێویستە بەشێوەیەکی دوولایەنەو بەرامبەر مافەکانمان حەڵاڵ بکەین. بەڵام دیسان ئەوەی لەشەڕو ئاشتیدا بنەڕەتییە بەدەستهێنانی مافی ژیانی ئازادە. نابێ سیاسەتێکی بێ واتای " بمرەو بکوژە"مان هەبێت؛ تەنیا لەپێناو ئەرکە مێژووییەکاندا دەشێ مردن و کوشتن واتایەکی هەبێت. هەروەکو هەڤاڵ کەمال پیر گووتوویەتی تەنانەت ئەم شێوەیەی مردن و کوشتن لەبەرئەوەیە کەژیانێکی شەرەفمەندانەتان خۆشدەوێ و دەخوازن شایستەی بن.

لەوانەیە هەندێکتان جەنگاوەری مەردو ئازادبن, ئەوانم هێورکردەوە. لەوانەیە هەندێکتان زۆر بەسانایی بمردنایە, ئەمانەشم بەربەستکرد. ئەو هەوڵانەشم بەربەستکرد کەهیچ شانسی سەرکەوتنی نەبوو. گەلێك شتی خوازیاری ئەنجامدانی بووم ئێوە بەربەستتان کرد. لەئاکامدا ئەو کارانە سەرنەخران کەشایستەی من و ئێوەیە. سەری زۆربەتان سپی بوو, خاوەنی ئەزموونی گەورەن. بەگوێرەی من, بیکەن بەمەسەلەیەکی گەورەی کەرامەت, دەرفەتی سەرکەوتنی گەورەتان هەیە. بەلانی کەم دەتوانن مەترسی پەنابەرێتی بیچرێنن و بەلاوەی بنێن. بەهەرحاڵ دوای ئەو شەهادەتانەی کەبەدەیان هەزاری تێپەڕکرد, دەستی لێبەرنادەن و ناڕەسەنێتی ناکەن. تەنانەت ئەگەر منیش داواتان لێبکەم, پێویستە نەفرین لەهەمووجۆرە ناڕەسەنێتییەك بکەن, و ئەگەر پارچەیەکیش بێت لەسەر داوای ژیانێکی ئازاد لەنیشتمان سووردەبن. ئەمجۆرە بڕیارانە, تەنانەت ئەگەر منیش بم, بەداسەپاندنەکانی دەرەوە نابێ. بەڵکو بەعەزیمەت و ئیرادەی ئازادانەی خۆتان دەبێ. لەبەرئەوەی مەزندەی ئەوەمکرد, بۆیە بەبێ دوودڵی لەبەرگرینامەکەمدا بۆ تەواوی کوردستان فۆرمیلەی "دەوڵەت + دیموکراسی"م پێشخست. لە 15ی ئاب دەمانگووت دەوڵەتەکان (دەسەڵاتدارانی سەر کوردستان) نەمێنن, ئەمە هەڵوێستێکی واقیعی و بەگوێرەی ناوەڕۆکمان نەبووە, تەنانەت دەوڵەتەکانی فەتحکاریش بەلاوە بنرایە, دەوڵەتی کوردی ستەمکار جێگای دەگرتەوە, دیسان پێویستی بەفۆرمیلەی "دەوڵەت + دیموکراسی" دەبوو. هەروەکو چۆن دەڵێن دەوڵەت ئایینی نییە, من باوەڕناکەم نەتەوەیشی هەبێت. دەوڵەت بەردەوام کوالیسیۆنی بەرژەوەندی کەمایەتییەکە. دەوڵەتی عەرەب, عەجەم و تورك رووخسارەکەیەتی یاخود هەڵوێستێکە بەگوێرەی هەلومەرجی سیاسی, ناوەڕۆکەکەی جیاوازە, بەمجۆرەیە کەلەبەرگرینامە بەفراوانی ئاماژەم پێکردووە. نەتەوەکەی چی دەبێت بابێ, ئەگەر ئەوان لەمیانەی رێکخراوەکانی دەوڵەت هەبوونیان هەبێت, ئەوا ئێمەش بەدیموکراسیەتەکەمانەوە هەبوونمان دەبێت. بەتایبەتیش پێویستە دیموکراسییەتە خۆجێییەکان (محلی) سەرەکیترین گۆڕەپانی هەبوونی ئێمە بێت. پێویست بێ لەشاخەکانەوە دەیانپارێزین. گەلەکەمان لەکوێ بێ, لەوشوێنەدا کۆمیتەی دیموکراسیمان دەبێت. پەسند بکرێ بەئاشکرا, ئەگەرنا بەشێوەیەکی نیو نهێنی ـ نیو ئاشکرا بەردەوام دەبێ. دەشێ بپرسن ئایا ئەمە دەکرێ. لەبەرئەوەی چارەیەکی دیکە نییە بەڵێ دەبێ, واتە جگە لەمردن و دیموکراسییەکەمان هیچ بژارێکی دیکەی ژیان نییە.

بەراستی ئەگەر دەوڵەتەکان تەبایی بخوازن ئەوا پێویستییەکانی ئەنجامدەدەن. ئەگەرنا تاکۆتایی خەبات و تێکۆشان ڕێگایەکی پێشەوەبردنی ژیانە. دەبێ بەمجۆرە نزیکی دیموکراسی ببینەوە, بەباوەڕییەوە بزانین پێویستی بەخەباتێکی دامەزراندن هەیە. بەدرێژی ئاماژەم بەبوارە تیۆری و پراکتیکەکەی کرد. بەلانی کەم دەتوانین لەوڵاتدا جێگیربببین, سەرکەوتووانە درێژە بەپاراستن بدەین و لەهەر گۆڕەپانێکی گونجاودا لەبواری چەندایەتی و چۆنایەتی خۆمان بەهێز بکەین. گەلیش بژارێکی دیکەی نەماوە. چەمکی ڕەهای دەستڕۆیی دەوڵەت دەسەلاتی دیموکراسیانەی گەلی کردۆتە ناچارییەك. تەنانەت ناخوازن تێبگەن کەلەکامە سەردەمدا دەژین. تاکەشتێك کەدەیزانن پراکتیزەکردنی فۆرمیلەی"دەوڵەتی دەسەلاتدارو نەتەوەکەی هەمووشتێکن, کوردیش هیچ نییە". هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد چەوتی ئەم فۆرمیلە سەلمێنراوەو ناچار بەرەو ڕاستەکە هەنگاو بهاوێژرێ. لەرەوشێکی وەهادان دەتوانن هەست بەوە بکەن کەئەم هەڵمەتە چەندین لایەنی نوێ لەخۆوە دەگرێت و بەگوێرەی ئەوە تەکتیك و ستراتیژی پێشبخەن.

بەمجۆرە بەپووختی بۆچوونی خۆم سەبارەت بەقۆناخی ئایندە پێشکەشکرد. هەڵوێستی ئێوەو دەوڵەتە پەیوەندیدارەکان نازانم. ئەوەی گرنگە زۆر بەفراوانی وەڵامی ئەو چاوەڕوانیانەم داوە کەلەمن دەکرا. هیچ گومانم لەوەدا نییە کەماقوڵانەترین هەڵوێستم پێشکەش کردووە. لەرەوشێکی پێچەوانەدا, لەماوەی درێژدا هەموویان یەك لەدوای یەك دووچاری ڕەوش و چارەنووسی سەددام دەبنەوە. پێویستە باش دەرك بەرۆڵی ئەو کوردانە بکرێ کەسەددام ڕێکیخستبوون. دەبێ بزانرێ کەبژاری دیکەش لەئارادان. تورکیاو سوریاو ئێران بەرامبەر بەکوردان خۆیان زۆربەهێز لەقەڵەم دەدەن. لەوانەیە بەمجۆرەبێ. بەڵام ئەمە کۆتایی بەهەڕەشەو مەترسییەکان ناهێنێ, زیاتر دەیوروژێنێ. بەڕاستیش پێداگری"عیناد"سەددام سوودمەند نەبوو, کەچی پێداگری و داکۆکی ئەم سێ دەوڵەتە لەهی سەددام زیاترە, نایانەوێ شتێك لەگێژاوی ڕۆژهەڵاتی ناوین تێبگەن. بەشێوەیەکی ئەوپەڕگەری هێزو تەختەکانیان دەپەرستن. بڕوایەکی زێدەیان بەلاوازی کوردان هەیە. ئەوە من ڕق ئەستووردەکات, چونکە لەبەرژەوەندی هیچ وڵات و گەلێکدا نییە. خۆخستنەناو سەرکوتکردنی کوردانیش وەك شێتایەتی ئەم دەوڵەتانە دەبینم. بینین و شرۆڤەکردنی ئێوەش بەگرووپێکی بەرەڵاو تیرۆریست هەڵەیەکی ترسناکە. مار بەبریندارى بەجێبهێڵی زیاتر گەز دەگرێت, نازانم دەیانەوێ چیبکەن.

نەك هەرتەنیا تەسلیمنەبوون, تەنانەت هەندێکتان دەتوانن لەشەڕدا قەڵەمباز ئەنجامبدەن. خۆ ئەگەرگەمژەیی نەکەن دەزانن ئەزموونی زۆرو هێزی خۆڕاگری خۆتان بەکاربێنن و بەهێزی گەریلایی 300 کەسی دەتوانن ڕووبەڕووی هەروڵاتێك ببنەوە. پێویستە بەدرێژی بیر لەمەبکەنەوەو لەدەوڵەتە پەیوەندیدارەکانی بگەیەنن, بەر لەشەڕێکی بەرفراوان دەبێ ئاگربەستی دوو لایەنەو ڕێساکانی شەڕ دیاری بکرێ, ستاتۆی بەڕێوبەرایەتی خۆجێیی ئاوابکرێ و بەخۆتانی گرێبدەن, لەوەڵامدانەوەی بەرامبەرو تادەگاتە دەستگیرکردن پێویستە هەمووشتێکتان بەگوێرەی ڕێساکانی شەڕو ئاشتی ئامادەبکەن و پێشکەشی یەکتری بکەن و بۆ گەلیشی ڕابگەیەنن. ئەمە بوو کەلە 15ی ئابدا نەبوو. زۆر خوازیاری چارەسەرکردنی کێشەکان بووم لەرێگای پرۆسەی کرداری دیموکراسییەوە. بەڵام بەهایەکی ئەوتۆ لەئارادا نییە کەخاوەنی دیموکراسی و شێوازی خەباتکردن بێت, دیسان مەسەلەکە دەکەوێتە سەرشانی شاخەکان. ناڵێم جارێکی دی مێژووو خوداوەندەکان ئەمەدەخوازن, چونکە دەبێتە قەدەرگەرایی. ئەوەشیان نازانم, یەکسەر دەکوژرێت یاخود دەکوژن. مێژوو لەخاڵێکی وەهادایە, ڕووبەڕووی بڕیاردانە یان هەنگاوی دیموکراتی و ئاشتیخوازانە, یاخود شەڕێکی بەرفراوان لەپێناو ئاشتییەکی دیموکراتییانە. دەتوانن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئێرانیش ئاگاداربکەنەوە. دەوڵەتی گەورەن, بەڵکو پێشنیازی ڕێگایەك بکەن, بەڵام ئەگەر بەسووربوونەوە شەڕ بسەپێنرێ, لەمیانەی بڕوابوون بەخۆ کەدەتوانن ئەم بارە هەڵگرن و دەبێ یەك لەدوای یەك هەڵمەتە سەرکەوتووەکانیان نیشانبدەن.

ئـەنجام لـەقۆناخی داهـاتووی پێـشماندا سـێ بـژارو شـێوە ئاڵۆزەکـانی هەوڵـدەدەن لـەئاژاوە(کـائیوس)ی ڕۆژهـەڵاتی نـاوین سەرکێشی بکەن:

یەکەمیان: سیاسەتی ستاتۆگەرایی نەریتی دەوڵەتی فەتحکارییە سەبارەت بەکوردستان. سیستەمی ئاواکراو, چ لـەناوەوە یـان دەرەوە سەرچاوەی گرتبێت بەرامبەر بەفاکتەرە نوێخوازەکانی قۆناخی نوێ بەرخۆدان دەکات. دەیەوێ نکۆڵی لـەکوردان بکـات, ئەگەر سەرینەگرت, دەیەوێ لەمیانەی هەندێ خڵتەوە هەڵیانخەڵەتێنێ. هەرچی سیاسـەتی سـەرەکییە بـەردەوام بـەکارهێنانی قامچییە لەسەرسەری گەلی کـورد. ئەگـەری ئەوەهەیـە تـورك, ئێـران و عەرەبـە سـتاتۆگەراکان بیانـەوێ ڕێککـەوتنێك لـەنێوان خۆیـان بـەرەو پێـشببەن. بەرامبـەر ئەمـەش وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکاو ئیـسرائیل لەتـەواوی پارچـەکانی کوردسـتاندا پشتگیری لەمیللیگەرایی کوردان دەکەن و جەخت لەسەر ستاتۆی فیدراڵی دەکەنەوە. قوبرس پرۆڤـەی ئـەم هەڵوێـستەیە. نـۆرە دەگاتە فەلەستین و کوردستان, هەوڵدەدرێ پێبەپێ ئەم مۆدێلە لەتـەواوی ڕۆژهـەڵاتی نـاوین جێگیربکـرێ. لەکاتێکدا دەوڵەتـە ستاتۆگەراکانی ناوچەکە بەرامبەر ئەمەدەوەستن, لەلایەکی دیکەشـەوە هێـزە باوەکـانی خۆیـان بـەکاردێنن و ژمارەیـەکی زیـاتر کوردە جاش و بەکرێگیراوەکان چەکدار دەکەن. ئەو سیاسەتەی کۆماری تورکیا لەسەر بارزانی و تاڵەبانی بەڕێوەیبرد, شـیمانەی تەشـەنەکردنی ئـەمجۆرە سیاسـەتە هەیـە. لەڕاسـتیدا ئـەوەی لـەژێر دەمـامکی نەقـشبەندێتی لـەناو پـارتی دادو گەشـەپێدان (AKP) ڕۆڵی پێدراوە میللیگەرایی سەرەتای کوردانی باکووری کوردستانە. پێویستە بەم چاوە تەماشای کەسایەتییەکانی وەك جونێد زاپ سوو, مەلیك فورات, حوسێن چەلیك, زەکی ئەرگەزان, موجاهیدجان, مستەفا زەیدان و ئیزۆڵی سیفەرەك و.... هتد بکرێ, بۆرژوای شـاراوەی نیـو دەرەبـەگ ــ نیـو کـۆمپرادۆر خۆیـان دەکـەن بەمیللیگـەرایی سـەرەتایی کـوردان. هـەروەکو بینـرا لەهەڵبژاردنـە خۆجێییەکانـدا ئەمـە ئاشـکرابوو. ئەوانـەی لـەبینگۆل دروشمی"ئیـدریس بتلیـسی لێرەیـە, یـاووز لەکوێیـە"یـان دەگووتەوە لەراستیدا پووختەی مەسەلەکەیان نیشاندەدا. شیمانە دەکرێ لەدەرەوە, بەتایبەتیش لەلایەن وڵاتە یـەکگرتووەکانی ئەمریکا وەك شێوەی ئیسلامی نوێی ناو کوردان بۆتەواوی ڕۆژهەڵاتی ناوین ئامادەدەکرێن. فەتحوللا گولەن بـۆ تورکـەکان چـی بـێ, جونێـد زاپ سـوو و مـەلیك فـورات بـۆ کـوردان هـەمان شـتن. نوێنەرایـەتی سـەنتێزی کـورد ــ ئیـسلام دەکـەن. ڕۆڵـی ئـەو شێوەیەی حزبوللای ڕۆژهەڵاتی ناوین دەبینن کەلایەنگری ڕۆژئاوایە, نوێنەرایەتی شـێوەی کوردەواری زێـدەڕۆیی میللیگـەرایی دەکەن.

تارادەیەکی مەزن کۆماری تورکیا کەوتووەتە ژێرکاریگەری دوو لقی نەقشبەندێتی. کاتێك ڕەجەب تایب ئەردۆغانی سەرۆك وەزیـران دەڵـێ "ئەگـەر بـەکارهێنانی نـاوی کـورد نـەبێ, مەسـەلەی کـوردیش بـوونی نابێـت" هـەروەکو مەسـەلەی حیجاب و هاوشێوەکانی بانگەوازی بۆ تەقیەگەرایی دەکات.

تـاوەکو ئێـستا ئـەم بابەتـە یەکلانەبۆتـەوە ئایـا akp پـارتی دیموکراتـە موحافەزەکارەکانـە یـاخود نـا, بەتایبـەتیش ئـەو ڕاستییەی لەهەڵبژاردنە خۆجێییەکان ئاشکرابوو, ئەو ئەگەرە بەهێز دەکـات کـەپارتێکی ڕاسـتڕەوو پاشکۆن, "پـارتی دەوڵـەتن", دەشـێ گفتوگۆکـانی حیجاب و عەلمانییـەت گەمەیـەکی دروسـتکراو بـێ بـۆ چەواشـەکردنی ڕۆژەڤـی ڕاسـتەقینە. بـۆ بـەخێرایی پڕکردنـەوەی ئـەم بۆشـاییەی کوالیـسیۆنی DSP و ANAP و MHP کەئیفلاسـی کردبـووو نـەفرەتێکی قـووڵی گـەلیان ڕاکێشابووە سەرخۆیان, هەروەها CHP ی دەوڵەتگەراو خاوەن ڕۆڵی "موحافەزەکارانی کۆمـار" لەگـەڵ پـارتی چـەتە ــ کۆنترا DYP بەیەکەوە دروستیانکردبوو, لەمیانەی هەوڵێکی هاوبەشی کۆمپانیـا پاوانخوازەکـانی و مـام ناوەنـدەکان لەگـەڵ بەشـێکی دەوڵـەت, پـارتی دادو گەشـەپێدان AKP دەرخرایـە سەرشـانۆ. شـرۆڤەکردنی تێکەڵـەی ئیـسلامی میـانڕۆو دیمـوکراتی موحافەزەکار وەك سواق و قلفێکی ئایدیۆلۆژی ڕاستترە. لە ANAP ڕاستڕەوترە. گرووپێکی کۆمپانیاکان دێنێتـە بیری مـرۆڤ. بەتایبەتیش بۆئەوەی پشتگیری وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکاو یـەکێتی ئـەوروپا بەدەسـتبێنێ، ڕۆڵـی کوالیـسیۆنی سـەنتێزی

تورك ـ ئیسلام دەبینێ. لەرەوشێكدا پەرەسەندنە كۆمەڵایەتییەكان خیرابێت, لەوانەیە زۆر لە anap خێراتر پەرتەوازە ببێ, ئۆپۆزسیۆنێكی دیموكراتییانەی هاوسەنگ نەبێ, وەك پارتێكی راستڕەوی ناوەندی هەمیشەیی دەبێ. لەوانەیە كوردە نۆكەرەكان لەمیانەی چەمكی میللیگەرای سەرەتایی سوننی ـ نەقشبەندی لەناو akp دا چڕببنەوە. پشتگیری تاڵەبانی و بارزانی لەخۆڕا نییە.

پێویستە باش بخوێندرێتەوە؛ كۆماری توركیا گرێدراو بەدژایەتیكردنی "PKK", بارزانی و تاڵەبانیشی لەناودا, لەگەڵ میللیگەرایی سەرەتایی سوننیە نەقشبەندییەكان لەناو رێككەوتنێكی بەرفراواندایە. ئەم سیاسەتەی لە 1990 كان بەئۆزالەوە دەستپێكردو ئەمریكاش پشتگیری دەكرد, ئێستاكە لەناو توركیا رێگای لەپێش سەخڵەتییەكی مەزن كردۆتەوە. ئایا جەمسەری دەرەبەگ ـ بۆرژوا كوردەكان, ئەمریكا ـ ئیسرائیل ـ یەكێتی ئەوروپا بەبنەمادەگرێ یاخود كۆماری توركیا, لەسەرووی ئەو بابەتانەوە دێ كەپڕ لەكێشمەكێش و ناكۆكییە. بابەتێكە بەردەوام بۆ درزو رێككەوتنی نوێ كراوەیە. رێبازی دیموكراتی, بەرخۆدان و وڵاتپارێزی قۆناخی نوێ كە"PKK" رێبەرایەتی دەكات, ناچارە بەرامبەر بەفشاری ستاتۆگەراكان درێژە بەو هەڵوێستەی بەرخۆدان بدات كەلەساڵانی 1990كان بەڕێوەی دەبرد. چونكە بناخەی رێككەوتنی ستاتۆگەراكان بۆ دژایەتی "PKK" دەگەڕێتەوە.

دووەمین ئەگەری گۆڕانكاری: دەشێ لەهەر دوولایەنەوە سیاسەت و ستاتۆی نوێ سەرهەڵبدات. لەوانەیە لەناو گێژاوی رۆژهەڵاتی ناویندا میللیگەرایی سەرەتایی كوردان بیەوێ مەیلی دەوڵەتێكی جودا بەهێزبكات و خۆی لێ رزگاربكات. دەشێ تەقلیكردنی كوردەكانی ئێران, توركیاو سوریاش بۆ دەوڵەتی فیدراڵی كورد بكەوێتە رۆژەڤەوە. لەرەوشێكی وەهادا رێككەوتنەكەی ئەمریكاو یەكێتی ئەوروپاو ئیسرائیل بەرفراوانتر دەبێ و لەوانەیە بیانەوێ "PKK"ش بەشداری بكات. لەراستیدا دەشێ لەمیانەی ئەو گروپچێتییەی لەناو كۆنگرەی گەل سەریهەڵدا لەناوەڕۆكەكەیدا ئەم داخوازییە ببینرێ. لەساڵی 1991یش داخوازی تاقیكردنەوەی هەبوو. بەڵام تاوەكو "PKK" لەهەموو بوارێكەوە خۆی نەكات بەهێزێكی سیستەماتیك, بەشداریكردن لەڕێگای گروپی جیاوازی هەندێ كەسێتی لەبەرئەوەی رێگا لەپێش توانەوە دەكاتەوە, لەپاكتاوكاری رزگاری نابێت. شەپۆلی میللیگەرایی كورد بەرزدەبێتەوە. لەوانەیە چەند پەرەسەندنێكی لەجۆری ئیسرائیل ــ فەلەستین, ئێراق, قوبرس, چیچان و كۆسۆڤۆ سەرهەڵبدەن. بەرامبەر ئەمەش توركیاو ئێران و سوریا هەوڵدەدەن كەهەڵوێسی هاوبەش نیشانبدەن. هەرچی "PKK"یە پێویستە بەتایبەتی لەسەربنەمای سەرلەنوێ ئاواكردنەوەدا رێبازی كوردستانی ئازاد و دیموكراتیك بپارێزێ. لەهەمانكاتدا هەوڵی بەرزكردنەوەی دەسەڵاتی دیموكراتییانەی گەل دەدات, بەبایەخەوە بنەماكانی تەكتیك و ستراتیژی, پارادیگما, تیۆری تۆكمەو ئاسۆی فراوانی رێبازەكە دەپارێزێ. سەبارەت بەفۆرمیلەی دەوڵەت + دیموكراسی بەسووربوون و خولقكارانە رەفتار دەكات.

سێهەمین ئەگەر: بژاری ئاشتی و رێگا چارەی دیموكراتییە. لەسەر بنەمای سەرلەنوێ بونیادنانەوەی "PKK" و كۆنگرەی گەل "كۆما گەل" خاوەن پێگەی هێزی سەركێشی ئەم قۆناخەن. لەگەڵ قوولكردنەوەی بێچارەیی لەلایەن سیاسەتی نەریتی دەوڵەتە فەتحكارەكان و سیاسەتەكانی میللیگەرایی سەرەتایی كوردان كەئەمریكا پشتگیریان دەكات, دەشێ بژاری ئاشتی و رێگەچارەی دیموكراتییانە پێشكەوتن بەخۆیەوە ببینێ. لەم پێناوەدا بەتایبەتی لەتوركیا لەجیاتی سیاسەتەكانی ئایینی ــ میللیگەرایی راستڕەو وەك ئومێدێك لەدایكبوون و گەشەكردنی سیاسەتی چەپی دیموكرات بایەخدارە. هەروەكو لەتوركەكانی قوبرسدا بینرا پێویستە ئەو ستاتۆیەی جەخت لەسەر بێچارەیی دەكاتەوە لەناو توركەكانی توركیاش لاوازبێ و بەرەو دواوەبچێ. هەرچەندە لەرۆژەڤی توركیادا هێندە خاوەن سەنگیش نەبێ, بەڵام لەراستیدا پارتی akp ئەم بژارەی چەپی بۆخۆی بەكارهێناو گەیشتە دەسەڵات. ئەو قەیران و بێچارەییەی چەپ پێیەوە دەناڵێنێ فاكتەرێكی دیاریكەرە لەسەركەوتنی

پارتی akp دا. تەنانەت بەهۆی نیشانەدانی توانای پەیڕەوکردنی ڕێبازی دیموکراتی لەلایەن dehap ەوە پارتی akp توانی لەکوردستانیش هەنگاو بهاوێژێ. جارێکی دیکە ئاشکرابوو کە سیاسەت بۆشایی ناناسێ. کاتێك لەتورکیاو گشت پارچەکانی کوردستاندا خەباتێکی چڕوپڕی دیموکراتیزەبوون بەڕێوەببرێ، شێوەی دەسەڵاتی دیموکراتیانە ئەم ڕێبازە لەئاستی خەیاڵ دەردەخات و بۆراستی دەگۆڕێ. لەڕاستیدا مەیلی هاوچەرخ بەم ئاراستەیە. بەڵام لەتورکیاو کوردستان ئەم ڕێبازە لەبواری بیرۆکەو پراکتیزەکردندا، بەبێ خەباتێکی خولقکارانە، ڕێبەرایەتی و کادیران دەژی کەپێویستە هەرسی بکەن و بەسووربوونەوە بڕیاری لەسەربدەن. ئەگەرنا بەسەرخستنی دەشێ لەسەرتاسەری ڕۆژهەڵاتی ناوین بیکات بەپێشەنگێکی مێژوویی. کولتووری ڕۆژهەڵاتی ناوین، جوگرافیاو پێکهاتە دیموکراتییەکەی بەگوێرەی فیدراسیۆنی دیموکراتیانەیەو تەنانەت دەیکات بەناچاری، کەخاوەن ڕیشەیی مێژوویی و کۆمەڵایەتییەو بەردەوام جەختی لەسەردەکەمەوە، ئەم ڕێبازە دەکاتە بژارێکی هەرە لەبارو خاوەن دەرفەت.

بەڕۆژەڤبوونی هەر سێ بژار بەشێوەیەکی تێکەڵاو لەبواری پراکتیکی شیاوترە. بژارەکان جیاوازی ڕەش ــ سپی لەخۆوە ناگرێ. بەردەوام لەناو یەکترن، هەندێ جار یەکێکیان، هەندێ جاری تریش ئەوەی دیکە دەشێ ڕۆڵی سەرکێشی ببینێ. بەشێوەی پێکهاتەی دینامیك و گۆڕاو بەدیدێن. لەبەرئەوەی شانس و دەرفەتی چارەسەری درێژخایەنی ستاتۆو میللیگەرایی سەرەتایی سنووردارە، لەداهاتوودا ئەوەی هەرەزێدە لەکوردستاندا دەبێتە ڕۆژەڤ و گفتوگۆی لەبارەوە دەکرێ بژاری ئاشتی و ڕێگەچارەی دیموکراتییانەیە، بەڕێبەرایەتی کۆنگرەی گەل و "PKK"ی سەرلەنوێ ئاواکراوەوە، ناچارە وەك ئومێدی تەواوی گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوین پەرەبسەنێ و سەربکەوێت. هەمووشتێك گرێدراوی هەرسکردنێکی قووڵی ئەم ڕێبازەو پراکتیزەکردنییەتی لەڕێگای هەڵوێستی خولقکارانەوە. لەپەرەسەندنەکانی دواتر دەرکی پێکرا کەئەو "یەکێتی هێزە دیموکراسیخوازەکان" کە لەسەر بنەمای بژاری دیموکراتییانە وەك مۆدێلێکی چاوەڕوانکراو پێشکەشکرا، لەپراکتیکدا هەندێ لاسەنگی جددی دەرکەوتن. شیمانە دەکرێ SHP و بەشێکی DEHAPیەکان هەڵوێستیان لەبەرامبەر ÖDP و DEHAP لەسەربنەمای پاکتاوکردن بووە. بەتایبەتیش ناڕەزاییەکان و هەوڵەکانی گۆشەگیرکردن بەرامبەر عەبدوڵڵا ئۆج ئالان کەگەل خاوەنداریتی لێدەکات و وێردی سەرزمانێتی، ڕاستییەکانی ئاشکرا کردووە. ئاشکرایە بەشێوەیەکی بابەتی هەڵوێستێکی هاوشێوەی CHP و بایکال بووە. پەرچەکرداری گەل بەرامبەر ئەوە لەسندووقەکانی دەنگداندا نیشاندراوە. شانسی یەکێتی هێزە دیموکراتخوازەکان گرێدراوی ئەوەیە کاریگەری زێدەی دەوڵەتخوازی CHP تێپەڕبکەن، لەسەربنەمای باوەڕمەندی بسەلێنن هەروەکو بواری تیۆری، لەبواری پراکتیکیش بژارێکن لەتیشکۆی کۆمەڵگادا چڕبوونەتەوە. بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دژایەتیکردنی ئاپۆچێتی (ئۆجەلانیزم) پەرتەوازەبوونیان لەگەڵ خۆیدا دێنێ. دەبێ "هێزە یەکگرتووەکان" باش بزانن کە گەل دەست لەو پارتەو سیاسەتە سەرەکییەکانی بەرنادات کە لەتیشکۆی دەوڵەتدا نەبێت و ڕاستینەی دیموکراسییەتەکەی تاوەکو دواڕادە ڕێکخراوو هۆشمەندانەبێ.

پوختە

دەشێ ژیانی ڕێکخستنی و کەسێتیم بۆ سێ قۆناخ جیابکرێتەوە. یەکەمین قۆناخ بەبانگەشەی پێویستە بەرامبەر بەدایکم بەکۆمەڵگابوونی خۆم ئاوابکەم دەستپێکرد، دوای کاردانەوە بەرامبەر بنەماڵەو گوند بەچوون بۆ قوتابخانەی سەرەتایی دەستپێکرد. هەنگاونان بۆ قوتابخانەی سەرەتایی یەکەمین هەنگاوی جددی پەیوەستداربوونە بۆ بەدەوڵەتبوون. کەسایەتی یەکەمین هەنگاوی گۆڕان لەکۆمەڵگای کۆمەڵکاری بەرەو کۆمەڵگای دەوڵەتخوازی دەهاوێژێ. لەگەڵ شاریبوون بەڕێوەدەچێ. بەگوێرەی نرخ و بەها کۆمەڵکارییەکانی لادێ بەهاکانی شار بەباڵاتر لەقەڵەم دەدرێ. خوێندنی قۆناخەکانی ناوەندی و دواناوەندی، فەرمانبەرێتی تاگەیشتن بەدوا قۆناخی زانکۆ، ئامادەکاری لەپێشینەبوو بۆ بوون بەپیاوی دەوڵەت (دەوڵەتخواز).

لـەم سـالانەی تەمـەن و ژیانـدا بەشـێوەیەکی وشـك كەسـایەتی شـار ــ دەوڵـەت بەسـەرهەمموو كەسـێكدا زاڵ دەبێـت. ڕەوشـی دواكەوتوویی و نەتەوەی سەركوتكراو بۆ پەرچەكردار بەرامبەر دەوڵەت دەگۆڕێ. لەبنەڕەتـدا هـەواداری بـۆ ڕەوتـی چـەپڕەوی لەلێگەڕین بـەدوای دەوڵـەتێكی عادیـل و یەكسانیخوازو خۆشگوزەران بـەولاوە هـیچ واتایـەكی دیكـە نابەخشێ. لـەم قۆناخـەدا كەسایەتی تاڕادەیەكی مەزن لەزنجیرەكانی كۆمەڵگای بـاوو نـەریتی دابڕێنـراوە. كۆمـەڵگای ڕەسـەنی كۆمـەڵكاری دایكانـەی لادێ تاڕادەیـەكی مـەزن دووچـاری نكۆڵیكردن هـاتووە، لـەجیاتی ئـەو كەسـایەتییەك پێكهـاتووە كـەنكۆڵی لەڕابردووەكـەی دەكـات، بـچووكی دەبـینێ، مەزنایـەتی شـار و دەوڵـەت دەپەرستێ، بەچاوسـووری بـەرەو سیسـتەمی فـەرمی ڕادەكـات و چـەندەی بلێـی مارژینالە. كوشتارێكی تراژیدیانەی كەسایەتی ئەنجامدراوە.

ئـەم كەسـایەتییە نوێیـەی "شـەیدابووە" كۆمــەڵگای كـۆن، دایـك و بـاوك، براكـانی، دراوسـێكانی، لادێكـەی، خزمـانی، بەساڵاچووان، منداڵان، ژنان، ڕەچەڵەكەكەی و جنسەكەی خۆی بـچووك دەبـینێ، لەتـەواوی وڵاتـە تـازە گەشەسـەندووەكان وەك ئافـاتی لێهـاتووە. لەمیانــەی مـۆدێرنیزمێكی بێنـاوەڕۆك بەرامبـەر بەبـەها سـەرەكییەكانی بەكۆمـەڵگابوونی مـرۆڤ لـەناو نـامۆبوونێكی قووڵـدا دەژی. ئـەم كەسایەتییەی لـەژێر بـاڵابوونی حاشاهەڵنەگری سیسـتەمی سـەرمایەداریدا پەرەیسەندووە، تەنانـەت كاتێـك لـەڕێگای كاردانەوەیـەكی سـاختە چـەپڕەوێتی دەكـات دیـسان مارژینـاڵ و بێكاریگـەرە. دابڕانـی لەكۆمـەڵگا قووڵدەبێتەوەو بەردەوام دەبێ. قوتابخانە، كرێكاری شارو فەرمانبەرێتی دەوڵەت كەسایەتی لەمێژوو و نەریتـەكان دادەبـڕێنێ و كردوویــەتی بەكەسـایەتی "تەنەكـە". هەرشـتێك سەرچـاوەی خـۆی لـەم كەسـایەتییە وەربگـرێ كەبێخەمـە، نكۆڵیكـارە، بەمووچـەگرێدراوەو بـۆ سـۆزانێتی شـار لێـدراوە بەرامبــەر سـەرمایەداری و كۆمەڵگاكـەی و بـەهاكانی ئـیفلاس دەكـات. فەراهەمنەكردنی وەرچەرخانێكی ڕاستەقینە لەلایـەن سۆسیالیزمی بونیـادنراو، سۆسـیال ــ دیموكراسـی و ڕزگـاری نیشتمانی لەنزیكـەوە گرێـدراوی ئـەم كەسایەتییەیە. بناخـەی كۆمەڵایـەتی تـەواوی ئایـدیۆلۆژیاو پراكتیكـە چەواشـەكارو فاشیـست و تۆتالیتارەكان پشت بەپێكهاتەی ئەم كەسایەتییە دەبەستێ، ئەو كەسایەتییەی لەڕێگای شۆڕشی فەڕەنسا قەڵەمبازێكی ئەنجامدا، لە 1990 كان سەرنجڕاكێشییەكەی جارانی لەدەستدا، دووبارە بەكەوتنە ناو قۆناخێكی ئاساییەوە ئەنجامگیربووە.

قۆناخی دووەم، ئەمجارە بـەدابڕان لەدەوڵـەت و كۆمـەڵگای بـۆرژواو ئـەزموونی ئـاواكردنی گروپێكـی ئایـدیۆلۆژی سـەربەخۆ دەسـتپێدەكات كـەئامانجی دامەزرانــدنی سیـستەمی كۆمەڵایــەتی و سیاســەتی هاوچــەرخی خۆییــە. لەكاتێكـدا یەكــەمین بەكۆمـەڵگابوون لەسـەر بنـەمای دوعـا ئاینییـەكانی نـاو منـداڵان و چـوون بـۆ قوتابخانـەی سـەرەتایی دەسـتپێكرد، دووەمـین بەكۆمـەڵگابوون لەگـەڵ خوێنـدكارەكانی زانكـۆ لەسـەربنەمای ئایـدۆلۆژیای چـەپڕەوی ــ نیـشتمانی پەرەپێـدرا. هەرچـەندە بەرامبەر شۆڤێنی نەتەوەی سەردەست و بەهاكانی سەرمایەداری بڵاویكردبۆوە. هەوڵی سەرلەنوێ لێگەڕین بەرامبەر كۆمەڵگای خود لەئارادابوو، بەڵام لەبەرئەوەی سوری چەپڕەوو ڕەوتە نیشتمانییەكانی لەئارادابوون ئەو هێزەیان نەبوو پێوانەكانی ژیـانی سـەرمایەداری تێپەڕبكـەن، ئـەم هەوڵانـە لەگەیـشتن بەئامانجـە ڕاسـتەقینەكانی دوورە. ئـەم قۆناخـەی دەتـوانین بەیەكـەمین قۆنـاخی "PKK"یـی بوونیـشی بـەناو بكـەین، لـەجیهانی گـەردەلوولی 1970كـان هـەروەكو گەڵایـەكی وەریـو بڵاودەبێتـەوە. هێنـدەی لـەجیهانی بـاوو نـەریتی دابـڕاوە، لەگـەڵ بـەها گەوهەرییـەكانی سـەرمایەداریش ئاوێتـە نـەبووە. قۆنـاخێكی جـۆری مەزهەبگەرایی و مارژیناڵ لەئارادایە. چـەندین گروپـی لـەم جـۆرە هـەن كەبەهـەمان شـێوە دامـەزراون و بـەخێرایش نـەماون. بەرامبەر ئەو دەوڵەتەی ڕووبەڕووی بووینەتەوە كێشمەكێش و ململانێی لەشێوەی مێروولە و فیل دەسـتپێكردووە. لەمیانـەی لێگـەڕینی تیـۆری و پراكتیكـی داخـوازی سـەرلەنوێ دۆزینـەوەی كۆمـەڵگاو وڵات هەیـە. لەڕاسـتیدا بەدواداچـوونی مـۆدێلی چەپڕەوی لەئارادایە كەلەتەواوی جیهان پـەیڕەو دەكرێ. موتوربەیـەك بـۆ كۆمـەڵگای كـۆن دەكـرێ. لەهەوایـەكی جـۆری ئـەی ئەگەر سەربگرێ چاوەڕوانی سەركەوتن دەكرێ. ئیتر فیكرێكی تایبـەت بـەخۆمان هەیـە. گروپەكـەمان لـەبواری چەندایەتیشدا

پەرەدەسەنێ. شیمانەی سەرگرتنی موتوربەکە بەرزە. هەروەکو نموونەی ئەو کرمەی لەفۆزاخەی خۆی دەرکەوتووە، کاتێك هەنگاومان بۆ دەرەوە هاوێشت، وەك قۆناخی پیاو ماقوڵی و لاوێتی پەسندکرا. ئۆتۆپیاکەمان ئومێدبەخشی بەدیهاتنە. لەپشتگیری گروپەوە گەیشتن بەئاستی بەدەستهێنانی پشتگیری جەماوەریی، متمانەو بڕوابەخۆبوون تۆکمەتردەکات. ئاشنابوون لەگەڵ هێزی چەك دەستپێکرد. گروپی گەریلایی بزووتنەوە هاوچەرخەکان بەشێوەیەکی پەروەردەکراوو چەکدار گەیەنرایە ئەو لوتکەو بەرزاییانەی ولات کەتاوەکو ئەوکاتە ئاستەم بوو. ئیتر نۆرەی هەڵمەتی مێژوویی هاتبوو.

یەکەمین بەشی قۆناخی دووەمی ژیانم سالانی 1972 ــ 1984ی گرتەوە دەشێ لەزۆر لایەنەوە ببێتە رۆژەڤ و بابەتی هەڵسەنگاندن. دەشێ وەك هەڵمەتی هۆشیاربوونەوەی گەلی کوردی هەژار لەسەردەمەکەماندا بەناوبکرێ. دەشێ وەك یەکەمین یاخیبوون و فیشەکی یەکەم بەرامبەر چارەنووسی رەش بەناوبکرێ. دەشێ وەك هاواری شەرەف و کەرامەتیش شرۆڤە بکرێ. دەشێ وەك یەکەمین چالاکی سەرکەوتووی حەزرەتی داودیش بەرامبەر گۆلیاد واتابەخش بێ. دەشێ وەك یەکەمین هەنگاوەکانی هێزی ئازادیش لەقەڵەم بدرێ، دەشێ هەڵمەتی دابڕان لەپێوانە ریشەییەکانی کۆیلایەتی هەزاران ساڵ بێ. قۆناخێکە دەتوانرێ وەك بەدەستهێنانی جیهانبینی نوێ و دووەمین لەدایکبوون پێناسەبکرێ کەسەرکەوتنی تارادەیەك پێویستی بەشانس و رەنج و باوەڕیەوە هەیە.

دووەمین بەشی قۆناخی دووەمی ژیانم ماوەی نێوان 15ی ئابی 1984 ـ 15ی شوباتی 1999 دەگرێتەوە. ئەم پانزە ساڵە وەك دووەمین هەڵمەتی "PKK"یی بوون قۆناخێکی سەرسوڕهێنەرە کەتێکۆشانی چەکداری قورساییەکەی پێکدەهێنێ. دەشێ هاوشێوەی گروپەکانی بابەکی، خەواریجەکان، قرمتییەکان و حەسەن سەباحی مێژووی رۆژهەڵاتی ناوین ببینرێ. لەکاتێکدا بەشی یەکەم (قۆناخی دووەم) لایەنی مەسیحگەرایی لەپێشە، لەبەشی دووەمدا قورساییەکی تێکەڵەی موسەوی و محەمەدی جێگەی باسە."ئەرکی گەیاندن بەخاکی بەڵێنپێدراو"ی گروپێکی کۆچبەران زۆر سەختە کەبەئاستەم و زەحمەتییەوە بەڕێوەدەچن و پێویستی بەهەوڵ و توانستێکی گەورە هەیە، لەکاتێکدا گەیاندنی گروپ لەڕاستینەی حەزرەتی موسا دەچێت، چالاکییەکانی شەڕیش حەزرەتی محەمەدی سەردەمی مەدینە دێنێتەوە بیری مرۆڤ. کەش و هەوایەکی دەروونی باوەڕمەندی و بڕوای بەمجۆرە زاڵە. خۆبەختکردن لەپێناو باوەڕیدا تەواو شێوەیەکی باوەڕمەندانەی هەیە. سۆسیالیزمی زانستی هێزی باوەڕی بەدەستهێناوەو بەمجۆرە بەڕێوەدەچێ. شەڕ چالاکییەکی پیرۆزە، لەکاتێکدا بەپێی کات مرۆڤ و تاك دەبێت بەهیچ، ئامانج دەبێتە هەمووشتێك. تەنانەت هەستکردن بەوەش زۆر سەختە کەدووچاری شێوازە مێژووییەکەی نەخۆشی دەسەڵات هاتووە. کەسایەتی لاوازی لادێ کەبەسالان لەناو هەلومەرجی شارو دەوڵەت خراوەتە ژێر بۆردوومانەوە کەنووسا بەدەسەڵاتەوە زەحمەتە توانستێکی دیکە بناسێ یاخود لەیەکلایەنی مانەوە رزگاری نابێت. ئەو کەسایەتییەی سەرمایەدار بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بەتەنیایی هێشتووەتەوە بەسیستەمێکی مولکی خۆی گرێدەدرێت، دەشێ ئەمجارە لەڕێگەی مەیلێکی پێچەوانەوە لەناو بەکۆمەڵگابوونێکی سەیردا بژی. بەو باوەڕییەی کە سەیرترین تایبەتمەنێتی "باوەڕی پیرۆزترین چالاکییە" هەموو شتێك دەکرێتە قوربانی.

لەڕاستیدا لەجیاتی ئەوەی بڵێ "پیرۆزترین بەها ژیانە"، بەپێچەوانەوە لەئەنجامی بڕوای "ئامانج هەمووشتێکە، ژیان هیچ نییە" کەسایەتییەك دەرکەوتەپێش کەلەئاستی فەناتیزمدا بوو، قەدەرگەرایی و وابەستەبوون بەهەندێ بنەما لەم جۆرەی دۆگماتیزم دەشێ وەك چەشنێکی ئایینیش پێناسەبکرێ. ئەو جیهانبینییەی بەدەستهاتووە واتایی و رووتە. لەکاتێکدا ژیری ئەنالیتیکی گەشەدەسەنێ، ژیری سۆزداری خنکێنراوە، مردن و کوشتن تەواو خراوەتە ئاستی مەسەلەیەکی تەکنیکی. لەدوا شرۆڤەدا دەبینرێ کەئەشقی کارکردنی سەرمایەداری پشتبەستوو بەقازانج لەژێر راستەڕێی ئایدیۆلۆژی بەڕێوەدەچێ. گوێڕایەڵی کارەکتەری گشتی سەردەم کراوە. تەنانەت ئەگەر بەشێوەی مەزهەبێکی جیاوازیش بێت، ئەوەی لەناویدا مەلە

دەكرێ و ژیانی تێدا بەسەردەبرێ جیهانی سەرمایەدارییە، لەمیانەی گشتگیری داتاشراوترین رادەی سۆسیالیزمی بونیادنراو و رزگاری نیشتمانی مەیلی سەرمایەداری توانستی خۆی بەدەستهێنا، بەشێوەیەکی شێتانە بۆ ئاواکردنی پێکهاتەی سیاسی و سەربازییەکەی هەوڵدەدرا. بەجۆرێکی دیکە خۆگونجاندن و رێککەوتن لەگەڵ سەردەم پێکنەدەهات.

بێگومان ئەوجۆرە هەوڵ و کۆششانە لەئاخوڕی بێکەسێکدا ئەنجام نەدەدرا. بەڵکو سیستەم خاوەنی هەبوو. بەگوێرەی یاساو رێساکانی خۆیان پێداویستی جیهانی باڵادەستەکانیان ئەنجامدەدا. دەشێ رۆژی 15ی شوباتی 1999 بۆ من وەك رۆژێك هەڵسەنگێنرێ کەهێزی جیهانی سەرمایەداری ـ کەبووە بەعزرائیل ـ لەگەرووم ئاڵابوو. پێویستە باس لەهەندێ هەڵەی ستراتیژی ئەم قۆناخەی تەمەن بکرێ. یان ئەوەتا دەبووایە ساڵی 1982 کادیرێك بخولقێنم کەبەراستی رێبەرایەتی گروپی چەکداری کردبووایە، لەسەر ئەم بنەمایە رەوانەی وڵات کرابووایە. ئەگەر لەجیاتی ساڵی 1980, کەمال پیرو هەڤاڵەکانی لەساڵی 1982 لەگەڵ گروپێکی بەرفراوانەوە لەرێگای باشوورو رۆژهەڵاتی کوردستان بۆ باکوور رەوانە بکرایە, ئەوا راستتر بووو کرانەوەشی ئەنجامدەدا. سەرەتا ئەرکدارکردنی دووران کالکان و عەلی حەیدەر و محەمەد قەرەسونگور لەناوچەکەدا لەئاستی ستراتیژیدا رێگای لەپێش کەموکورتی کردۆتەوە. دووبارەکردنەوەی قۆناخی رۆژهەڵاتی ناوین, تەنانەت بەشێوەیەکی دواکەوتووتر, بناخەی ئەم هەڵە ستراتیژییەیە. پاشکۆیەتی بە PDK, نامۆبوونی لە گەل, شایستەنەبوون بەهەڤاڵان, خەریکبوون بەکاری نابەجێ, دووبارەکردنەوەی ئەو کارانەی ئەنجامدرا بوون, خۆتێکەڵکردنێکی بێ واتای پێکدادانەکانی نێوان PDK و YNK, نەبینینی توانستەکان و ئەو رەوشەی شەڕی ئێراق ـ ئێران رەخساندی وەك درێژەی ئەم کەموکورتییە ستراتیژییە بەردەوام بوو. وەڵامنەدانەوەی ساتی مێژوویی, نیشاننەدانی شێوازێکی گونجاوی خەبات, شرۆڤەی ئارەزوومەندی بێواتا, بەشێوەی وەشاندنی گورزی کوشندە لەکۆششەکان ئەنجامگیربووە. لەرەوشێکی وەهادا هەوڵ و نیازپاکی تەنیا رۆڵی ئەو بەردانە دەبینێ کەرێگای دۆزەخی پێکهێناوە.

پێشوەخت دەستنیشاننەکردنی مەیلەکانی چەتەگەرێتی کەسەریانهەڵدا, بەپێی پێویست هەڵوێست نیشاننەدان دووەمین کەموکورتی گرنگ و ستراتیژییە. بەجێهێشتنی ئەم رۆڵە بۆ ئەو هەڤاڵانەی جێگای بڕواو متمانەن, ئەنجامێکی دیکەی دۆگماتیزمە. کاتێك ئەو هەموو بەها رەسەنەیان بەفیڕۆدا, مسۆگەر دەبووایە پەی پێ ببەم و سنووری بۆ دابنێم. بەمجۆرە گەورەترین گورزیان لەتەواوی خەباتە رەسەنەکانی "PKK" داوە. بەهەرحاڵ روونکردنەوەی چۆنییەتی و خەسڵەتی هەندێ کەسایەتی ئاستەمە کەببوونە هۆڤ و درندە. بابەتێکی دیکەی پەی پێنابرێ و هەرس ناکرێ بەسانایی تەسلیمبوونی ئەو بنکەیەبوو کە لەئاکامی رەنجێکی زۆر گەورەوە ئامادەکرابوو. چەمکی هەڤاڵێتی من بەئاستی ئەو متمانەو بڕوابوونە گەیشتبوو کەبڵێم: بەردەوام باشترین کار ئەنجام دەدەن, دروستترین و دڵسۆزترین مرۆڤن, هیچ کارێك نییە توانای ئەنجامدانیان نەبێ و حەواری هاوچەرخن, ئەمەش لەئاستی دۆگماتیزمدا بووو کاریگەری لەسەر پێشهاتەکان هەبوو. درەنگ هاتینەوە هۆشی خۆمان, کاتێك بەتەواوی هاتینەوە هۆش خۆمان یاخود هەستمان پێکرد لەبواری ستراتیژی: هەم لەلایەنی کات, هەم لەلایەنی هەوڵە مەزنەکان چەندین بەهامان لەدەستدابوو, لەسەرووی هەمووشیانەوە جەنگاوەرە لاوەکان, گەل, بەهای ماددی و مەعنەوی.

دەبووایە بەشێوەیەکی قووڵتر سوود لەوانەکانی 1992 ـ 1993 ببینم. لەگەڵ قەیرانی ئێراق ـ کوێتی ساڵی 1991 لەگەڵ گروپەکانی وڵات بوومایە راستتربوو. دەبووایە هەنگاوەکەم, ئەنجامدان و جێبەجێکردنی ئەو هەنگاوە بێت کەساڵی 1982 ئەنجاممان نەدا. دەبووایە کارو خەباتەکانی رۆژهەڵاتی ناوین بخەمە پلەی دووەمەوە. بەڵام هەمان هەڵوێست و نزیکبوون ئەو بڕوایەی لەلا دروستکردبووم کەلەئەنجامی تەقویەی چڕو بەردەوامەوە سەرکەوتوو دەبین و لەهەقی دەردەکەوین. بەردەوام لەچاوەڕوانیدا بووم و دەمگوت: لەناو هەزاران کادیر مسۆگەر هەندێ سەرهەڵدەدەن کەبتوانن وەڵامی

قۆناخ بدەنەوە. بەلام ئەو چەتەگەرێتییەی لەناو ڕێکخستندا دەرکەوت و هەڵوێستە نامەسئولانەکانی کۆمیتەی ناوەندی تەواوی ئەو کۆمەك و ماندووبوونەی ئێمەی بەفیڕۆ دەدا. بەشێوەیەکی ئاشکراو بەرچاو مێژوو بەرەو دۆڕاندنی دەبردین. لەڕێگای دیسپلین و فیداکارییەوە نەدەتوانرا بەهاکان لەفەوتان رزگار بکرێ، ئەرکەکان بەسەرکەوتوویی جێبەجێبکرێن. بەرێکەوت بەیەکگەیشتنی سازشی عوسمان بەرامبەر بە YNK کە ملکەچکردنی دێنێتەوە بیری مرۆڤ، لەگەڵ هەوڵە خۆکوژییەکانی جەمیل بایق و موراد قەرەییلان، لەم قۆناخەدا بووە ڕێگر لەپێش زیانێکی گەورەتر. ئەوە ئەم خاڵەبوو کەدەبووایە وانەو ئەزموونی مێژوویی لێوەربگرین. لەگەڵ پشتگوێنەخستنی ناوەوەی وڵات، پێویستی بەرێگەچارەیەکی ریشەیی رەوشی بنکەی کادیرانی ناوەندی هەبوو. قەرەبووکردنەوەی ئەمە لەمیانەی کردنەوەی خوێندنگا لەسوریا تابلێی منی بەربەستکرد. هەوڵ و کۆششەکان واتایەکی ئەوتۆیان نەمابوو. بەتایبەت لەبواری دەستێوەردان (موداخەلەکردن) درەنگ کەوتبووم. دوای لەدەستدانی ئەو هەموو نرخ و بەهایە، ڕوو تێکردنم هەرس نەدەکرد. لەجیاتی ڕێگای سەربازی، کردنەوەی بنبەستبوون لەرێگای سیاسی، تاقیکردنەوەیەکی واتاداربوو. هێرشی سەربازی لەوانەیە بەرەو خۆکوژییەکی گشتگیری ببردینایە. هەرچی تێکۆشانی سیاسییە، دەرفەتی جوڵانەوەیەکی بەتوانستی دەرەخساند. یەك شێوازو دووبارەبوونەوە لەناو بنکە بەردەوام بوو. هەمان شێوازی تێکۆشان تاوەکو قۆناخی کۆنگرەی گەل رەنگیدایەوە. لەراستیدا ریشەی قەیرانەکانی دوایی بەردەوامی ئەو چەمکانەیە کەبۆ سەردەمی گەڕانەوەی وڵات و سەنگەرگرتن دەگەڕێتەوە. رەخنەدان بەشێوەیەکی واتادار ئەنجام نەدراوە. جەختکردن لەسەر کەسایەتی و شێوازی کۆنی کارکردن لەئارادابوو. ئەمەش هەموو کاتێك لەهەرشوێنێك جگە لەزیانی بێواتاو جێبەجێنەکردنی ئەرکەکان و ئێش و ئازار هیچ ئەنجامێکی دیکەی لێنەدەکەوتەوە.

دووەمین قۆناخی ژیان لەبەرئەوەی لەتیشکۆی دەوڵەتخوازیدا بوو، بەلام بەهۆی تایبەتمەندێتییەکانی هەڵوێستی کۆمەڵکاری لەدەستنەدراو پڕ لەناکۆکی بوو. ململانێی ئەم تایبەتمەندێتییانە ئەنجامیان دیاردەکرد. لە15ی شوباتی 1999دا هەمانکات گورزی کوشندە لەکاروانی دەوڵەتخوازی وەشێنراوە. ئەگەر پارتیگەرایی و دەوڵەتگەرایی تیشکۆو تەوەرەی دەوڵەتخوازی نەخۆشییەك بێت، لەرەوشێکی وەهادا ئەو گورزەی تەواوی دەوڵەتەکانی جیهانی سەرمایەداری لەمنیان وەشاند، لەهەمانکاتدا رۆڵی دەرمان و مامانێتی سێیەمین لەدایکبوونی دەبینی.

سێهەمین قۆناخی ژیان، ئەگەر بتوانرێ ناوو ناوەڕۆکەکەی بەژیان ناوزەدبکرێ، دەتوانرێ وەك ئەو قۆناخە دەستنیشان بکرێ کەلە 15ی شوباتی 1999 دەستپێدەکات و تاوەکو کۆتایی بەردەوام دەبێت. خەسڵەتی بەرچاوی ئەوەیە: بەگشتی لەمیانی دابڕان لەتەوەرەی دەوڵەت بەتایبەتیش لەرێگای دابڕان لەژیانی هاوچەرخی سەرمایەداری دەستپێکردووە. دووبارە بەرەو ژیانی سەرەتایی راناکەم. هەڵبەتە بۆ 10 هەزار ساڵ پێش ئێستاش ناگەڕێمەوە. بەلام مسۆگەرە هەندێ بەهاکانی مرۆڤایەتی لەم ساڵانەدا شاراوەیە. ئەو قۆناخەی شارستانییەت بەهەزارو یەك تەڵەکەبازی و ستەمکاری بڕی، تاوەکو لەگەڵ ئاستی زانستی و تەکنۆلۆژی مرۆڤایەتیدا ئاوێتەنەکرێت، ئەوا رزگاری و ئازادی راستەقینەی مرۆڤ بەدینەدەهات.

دابڕان لەژیانی چڕبۆوەی تیشکۆی دەوڵەت و شارستانییەت دواکەوتن نییە، بەپێچەوانەوە دابڕانی بکوژانە لەسروشت، وازهێنان لەکەسایەتی زلکراوو پشتبەستوو بەخوێن و تەڵەکەبازی دەسەڵات، دەرفەتی گەیشتنە بەتەندروسترین شت. لەکۆمەڵگای نەخۆشەوە بۆ کۆمەڵگای تەندروست، لەکۆمەڵگای بۆش و بەخوریکەو دابڕاو لەژینگە، لەو کۆمەڵگایەی لەناو شارستانی ئەوپەڕگەری جۆرێك لەشێرپەنجەدایە، بۆ کۆمەڵگای ژینگەپارێزی؛ لەکۆمەڵگای دەوڵەتگەرایی کەلەسەروو تاخوار لەناو دەستڕۆیی و تۆتالیتاریزمدایە ئاراستەگرتنێك بەرەو کۆمەڵگای کۆمەڵکاری دیموکراتیك و ئازاد ــ یەکسان جێگای باسە. رزگاربوون لەئەڵقەکانی زنجیرەی کوشتاری ئاژەڵانی کولتووری نێچیروانی، کوشتاری شارستانییەت بۆ مرۆڤ، کارەساتی سەرمایەداری سەبارەت بەسروشت لەوانەیە دەرگا لەمرۆڤایەتییەکی نوێ بکاتەوە. کەسایەتییەکی سیاسی ئەخلاقی کەلەگەڵ

ئاژەڵان دۆستبێ، لەگەڵ سروشت ئاشتبووبێتەوە، پشت بەپێکهاتەیەکی هاوسەنگی ژیان ببەستێ، ژیانی پڕ لەئەشق، ئاشتیخوازو ئازاد ـ یەکسان بەبنەمابگرێ، هێزی زانست و تەکنۆلۆژیای ژێر گەمەکانی شەڕو دەسەڵاتی رزگارکردووە، بەلانی کەم هێندەی ئەو هێزەی ئەنکیدۆی بەشارو دەوڵەت بەستەوە، منیش راکێش دەکات و واتادار دەبێ. بەدڵنیاییەوە باس لەحەسرەتێك ناکەم کەبەندیخانەیەکی تاکەکەسی ئافراندبێتی. باس لەجیهانبینییەکی مەزنی هزری و دەروونی دەکەم. لەراستیدا بێزاربووم و نەفرەت لەو ژیانە زاخاوییەی چاوبەستکردن دەکەم کەخاوەن هەڵوێستی جیاکارییە، هێزی گەورە دەپەرستێ و لەژێر مۆرکی خوێنی تەواوی شارستانییەتەکان و سەردەمدا دەبریقێتەوە.

لەمیانەی داواکردنی لێبوردن لەو ئاژەڵانەی لێمداون، ئەو چۆلەکانەی بەهۆی هەبوونی بۆهێڵەکانی کوولتووری نێچیروانی بەبێ چاوتروکاندن سەریانم بڕی و بەفێڵبازی راومکردن، دەمەوێت قۆناخی ژیانی نوێم دەستپێبکەم. لەو بڕوایەدام گەورەترین بەختەوەری لەتەلار و کۆشکە بەنەخش و نیگارەکاندا نییە، بەڵکو لەو مۆڵگانەدایە کەخاوەن ژینگەیەکی سەوزن. لەو باوەڕەدام کاتێك لەناو رەنگ و دەنگ و واتاکاندا گوێ لەسروشت بگیرێ، لەگەڵیدا ئاوێتەبیت بەسەرفرازی ژیان دەگەیت. پێشکەوتنی راستەقینە بەشارە زەبەلاح و دەسڕۆیی دەسەڵاتەکاندا تێپەڕنابێ، بەپێچەوانەوە ئەمانە سەرچاوەی گەورەترین نەخۆشین؛ بەرامبەر ئەمە لەو بڕوایەدام ژیانی شوێنێك کەلادێی کۆن و شاری نوێی تێپەڕکردووەو لەمیانەی دوا پێدراوەکانی زانست و تەکنۆلۆژیا پێشوازی لەژینگەپارێزی شوێنی نیشتەجێبوون دەکات شۆڕشی راستەقینەیە. ئەگەر کاروانێکی ئایندەهەبێت، لەو بڕوایەدام لەسەر بنەمای ئەم راستیانە بێ، واتادارەو بەهای کاروانی دەبێ. دابڕان لەشارستانییەتی چینی پلەداری دەوڵەتگەرایی گەورەترین رەخنەدانە. باوەڕیم بەسەرخستنی هەیە، زیاتر خوازیارم تەقلی جیهانی ئازاد ـ یەکسانی ئۆتۆپیاکانی منداڵێتی مرۆڤایەتی، رەنجدەران، مێژووی لەبیرکراوی گەلان، ژنان، منداڵان و منداڵە بەساڵاچووەکان ببم لەوێ سەرکەوتن بەدەستبێنم.

ئەمانە هەمووی ئۆتۆپیایە، بەڵام هەندێ جار ئۆتۆپیاکان تاکە ئیلهامی فریادڕەسی ژیانی ناو ئەو قاڵبانەیە کە لەگۆڕستان خراپترن. بێگومان سەرەتا لەمیانەی ئۆتۆپیا لەو قاڵبانە دەردەکەوێ کە لەگۆڕەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان خراپترە. رەوشی من لەهی هیچ مرۆڤێکی دیکە ناچێ. نامەوێ لەهی کەسیش بچێ. بەگوێرەی ئەوەی بەشێوەیەکی هەرەباش تێدەگەم و هەستدەکەم، لەسەر رێگای چاکم. ئەو مرۆڤەی واتاو هەست بیژیێنێ بەهێزترین مرۆڤە. مسۆگەرە جارێکی دیکە خەتای وێکچوونی گەورەکان دووبارەناکەمەوە. هەڵبەتە نەهێندە خوازیاری لێکچوونیان بووم، نەتوانیشم. رابردووی مرۆڤایەتی راسترە. بەرامبەری رێزداردەبم، لەوێ لەژیان دەگەڕێم و دەیدۆزمەوە، سەرلەنوێ دەستپێدەکەم. ئایندە جگە لەبەردەوامی میکانیزمی ئەم هەوڵانە زیاتر هیچ شتێکی دیکە نییە. ئایا هەربیر لەخۆم دەکەمەوە؟! نەخێر دەشێ بەرگرینامەکەم تەواوی مرۆڤایەتی فێرە شتێك بکات. دەشێ "PKK"ی کە سەرلەنوێ بونیادنراوەتەوە تەواوی هەڤاڵە رەسەنەکانم، ئەو هەڤاڵانەم کۆبکاتەوە کەخاوەنی هێزی واتا و ئیرادەن. کۆنگرەی گەل دەتوانێ تەواوی گەلی کوردستان و دۆستەکان لەژێر چەترێکی دیموکراتیدا کۆبکاتەوە. بەرامبەر ئەوانەی لەخۆیانەوە هێرشدەکەنە سەر ژیانمان، وڵات و کۆمەڵگاکەمان هێزی پاراستنی گەل hpg دەتوانێ شەڕێکی بەرگریکردن بەڕێوەببات؛ دەشێ حیساب لەبێ مێشك، ستەمکارو زۆردارەکان بپرسێ. رەسەنترین ژنەکانمان دەتوانن لەژێر چەتری pajk کۆببنەوە کەلەژێر پێگەیشتوویی هەمیشەیی خوداوەندەژنەکان و بێگەردی فریشتەو جوانی ئافرۆدیت ئاوێتەی کردوون.

لەکاتێکدا لەمیانەی ئەم بەرگرینامەیە چەمك و خەیاڵی مرۆڤایەتی خۆم پێشکەش بەئۆرگانی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا dmme ئۆرگانی دادوەری یەکێتی ئەوروپا دەکەم کەدوا نوێنەری شارستانییەتە، زۆر بەفیزەو بەخۆی دەنازێ،

**لەچاوەڕوانی ئەرێنی زیاتر، لەبەرئەوەی لەبوون بەئامرازی ڤازانجی سیحراوی سیستەم بەولاوە رۆڵێکی دیکە نابینیێ، ئامادەم بەخەم و پەژارەی خۆم دەکەم. لەگەڵ ئومێدی کۆمەڵگایەکی دیموکرات ـ ئازاد و دادوەر سڵاوو رێزی خۆمتان پێشکەش دەکەم.**

27 ی نیسانی 2004
زيندانی تاكة كةسي /مودانيا/بؤرسا/ئيمرالي
عةبدوللآ ئؤج ئالان